# ژیانەوەی زانستەکانی ئاین



## إحياء علوم الدِّين

## بەرگی سێیەم

پەڕاوەکانی زەکات و ڕۆژو و حەج و ئادابی خوێندنەوەی قورئان و زیکرو نزاو ویردو بێداربوونی شەوان بۆ عیبادەت

دانراوی

ئیمامی غەزالی

خوا لێی ڕازی بێ

وەرگێڕانی

شێخ موحسینی موفتی

# ژیانەوەی زانستەکانی ئاین

# (إحياءُ علومِ الدِّين)


دانراوی

## ئیمامی غەزالی

خوای لێ ڕازی بێت


**بەرگی سێیەم**


**وەرگێڕانی**

**شێخ موحسین ی موفتی**



١٤٣٨ك ٢٠١٧ زاینی

کوردوستان - هەولێر
مزگەوت و مەدرەسەی مەولانا خالیدی نەقشبەندی
لە بڵاوکراوەکانی پەیڕەوانی طەریقەت
ئەهلی سوننەت و جەماعەت
(٣٧)

**ناوی کتێب: ژیانەوەی زانستەکانی ئاین**

دانەر: **ئیمامی غەزالی**

وەرگێڕان و لێکدانەوە و تایپ کردن :

**شێخ موحسین ی شێخ خالدی موفتی**

بەرگی: سێیەم

چاپی یەکەم

**چاپخانەی– ڕۆژهەڵات - هەولێر**

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

بەرگ : خلیل هیدایت مام شێخ



**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی( ٨٦ ) ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێدراوە**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ
وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ
قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ
وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ
وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ

( التوبة/٦٠)

# ژیانەوەی زانستەکانی ئاین
# پێشەوا ئیمامی غەزالی

چـــرای عەشقێــکی نــاوازەی دەروونی
کـە داگیـرساوە وەك دیــارە بە ڕوونی
لە نێو دڵــدا هەمیشە وا کە دەگـــڕێ
چـــرای دینت هەبێ، ناتبــێ نەبـوونی
ئەگەر دڵبەندی ڕێگەو ڕێــڕەوی بیــت
دەتــــارێنــێ لــە ژینــتدا زەبـــــوونی
لە کوێ بێنم چــرایەك وەك غـــەزالی
کە هاودەم بێ دەژی دەستبـــەند و چوونی
چـــرای دینم ئەگەر بیکەم بە ڕووگـــە
غــــەزالی تیا دەبینـم وەك هەســـــوونی
کە بـەرگی سێ دەکـەم بۆ تۆ بەدیـــاری
بە کوردیکەم، لەگەڵ شـەرحی متـــوونی
لەنێــو دەریـاچەکەی عیلمی غـــەزالی
کـە ڕایمــاڵی هەمــوو خڵتــەو چەتــوونی
دەوای دەرمـــانی دەردی خۆت ببیـــنە
لە نێــو ئامێـــزی میـهری پڕ حـەنـوونی
دەروونــی خۆت بنـــاوە بـــەو دەوایە
ئەتۆش (ئەحسەن) گەر ئـــەوداڵی فنـــوونی

١٨/١٧ ی /صەفەری ١٤٣٨کۆچی

# دەستپێکی بەرگی سێیەم

بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحيم

**خوێنەری بەڕێز:** ڕەحمەتی خودا لە **ئیمام فەخری ڕازی بێت کە دەربارەی ئاستی زانستی ئیمامی غەزالی دەفەرموێت:** وەك ئەوەی کە خودا هەموو زانستەکانی لە لوتکەو گومبەدێکدا کۆکردبێتەوە و ئیمامی غەزالیشی پێ ئاشنا کردبێت[1].

**وە پێشەوا(إبن كثير)فەرموویەتی:** غەزالی یەکێکە لە پێشەوایانی پەیڕەوی شافیعی، لە کتێب دانان و ڕێکخستنی بابەت و نزیکخستنەوەی واتاکان و دەستەواژەی پڕ واتای ڕەوانبێژی و لێکدانەوەو نوسین و داڕشتنی بەهێز.

**یان ئیمامی نەوەوی دەربارەی دەفەرموێت:** پێشەواو فەقیهی شارەزاو ، زانای قسەزانی شارەزای عیلمی کەلام و دانەرێکی بەتوانای صۆفی..

**وە پێشەوا (اليافعي) دەربارەی فەرموویەتی:**

خاوەنی پلەی بەرزو باڵا، کە ئەولیا بەرزەکان شایەتی پلەی ڕاستگۆیی و صددیقیی کوبرایان بۆ دابێت، کە گەورەیی ئەو زاتە، هەموو ئاسۆی وڵاتانی گرتۆتەوە، وە بە زۆری دانراوو نوسراوەکانی لەوانی تر جودا دەکرایەوە، کە جێگای پیاهەڵدان و ڕەزامەندی زانایان بووە، ئەوپەڕی زیرەك و قەڵەم ڕەوان و، خاوەنی داڕشتنی بە پێز و دەستەواژەی ئاسان و، شارەزایش لە هەموو بوارەکاندا، تاوای لێ هات: بێ دەنگکردن و بۆڕدانی هەموو خەصمەکانی لا ئاسان تربوو لە خواردنەوەی پەرداخێك ئاو.

**ئیمامی سوهرەوەردیش فەرموویەتی:** ئیحیای غەزالی دیوانی ئیسلامە.

**ئیمامی سوبکیش فەرموویەتی:**ئیحیا لەو پەڕاوانەیە، کە پێویستەموسوڵمانان

---

(١) الوافي بالوفيات(١/١٢٠ــــ٢١٢).

گرنگی و بایەخی پێ بدەن، بۆ ئەوەی بە پێی ڕینماییەکانی بجوڵێنەوە، چونکە کەم وارێکدەکەوێت یەکێك سەرنجی بدات و گۆڕانکاری نەیەت بەسەر حاڵ و بێداربوونەوەیدا.

**شێخی گەورە تاج العارفین** شێخ عبدالله ی عیردەوسی ئەوەندەی خوێند بوویەوە، خەریك بوو هەمووی لەبەر دەکرد، چەندین ساڵ متالای دەکرد، پیت پیت و بابەت بابەت تا گەیشتە ئەوەی بفەرموێت:

هەموو جارێك نهێنی و زانستی زۆر تایبەتی و گەورەترم بۆ دەردەکەوت، ئەگەر مردووەکان زیندوو ببنەوەو وەسێت بکەن بۆ زیندووەکان کە چی بکەن؟ ئەوەندەیان پێدەڵێن کە بەردەوام متالاو پابەندی لە ئیحیا بکەن.

وە هەرکەسێك بە دوای ڕێگەی خوداو پێغەمبەری خوداو عاریف و زانایاندا دەگەڕێت، لە ئەهلی زاهیر و باطین؛ با خەریکی خوێندنەوەی ئیحیا بێت، شایەتی دەدەم هەرکەسێك خۆی بەم کتێبەوە خەریك بکات و پابەندی لێبکات، ئەوا شوێنی ئەصڵی شەریعەت و طەریقەت و حەقیقەت کەوتووە.

**پێشەوا (أبوالحسن الشاذلي) دەفەرموێت:**

ئیحیا زانستت بە میرات دەسدەخات و پێت دەبخشێت .

**ئیبنوحەجەری هەیتەمی دەفەرموێت:** ئەگەر دەتەوێت ڕاستیت بۆ دەربکەوێت، وە بە ڕاستگۆیانە بجوڵێیتەوە، ئەوا پێویستە متالای ئیحیا بکەیت.

**خوێنەری بەڕێز:** کەسایەتی ئیمامی غەزالی، لە هەموو سەدەکاندا پێش بڕکێیەکی لە نێوانی نووسەر و قەڵەم ڕەوان و بیرمەند و زوبان پاراوەکاندا دروست کردووە، هەرگیز کەسێکی دانای وشیاری زانای تێگەیشتوو، ڕووبەڕووی نەوەستاوەتەوە، ئەگەر توێژینەوە لەسەر ژیانی زۆربەی ئەوانە بکەیت، کە هەمیشە کاری ڕەخنەی نابەجێ و بێبنەما و تۆمەتی نەزانین و نەزاندوویی دەدەنە پاڵ ئەم زانا ناودارە، دەبینیت یان لە حەسادەت و بەرچاو تەنگییاندایە، کە دانراوەکانی ئەوان کەس نایبینێت و تام بەرەکەتی نیە و، نوسراوەکانی پێشەوا

غەزالیش ناکەوێتە سەر زەوی، بەڵکوو  صەدان جار چاپ دەکرێنەوەو ڕۆژ بە ڕۆژیش ڕەواجی زیاتر و زۆرتر دەبێت، کەواتە یان نەزانن و لە فەرموودەکانی حاڵی نین، یان زانان و دڵێکی پیسی ڕەشی پڕ لە کینەیان هەیە، یان بەکرێگیراون، بۆ ئەوەی بەرنامە ڕەوشت پەروەرییەکەی غەزالی ڕەد بکەنەوەو، لە جێگەیدا بیرو هزری نامۆو نادروست و بێ واتاو بێ ناوەرۆك بڵاو بکەنەوەو، خەریکی دروستکردنی نەوەیەکی نوێی داعش ئاسا بن، شیرازەی ڕەوشت و بەها پیرۆزەکان بپچڕێنن و، بەربەرەکانێی فیقهی ئیسلامی و پەیڕەوکارانی و، خاوەن مەزهەبە ڕاستەکانیش بکەن، بەڵام لە هەرکوێوە ئەمانە هەوڵیان دابێت، پەتی درۆو پلان و کینەو دوژمنکاریان کورتی هێناوەو ، پلانەکانیان بەسەر خۆیاندا شکاوەتەوە. چونکە بۆ ساتە وەختێك کە گوێ لە غەزالی دەگریت، گیان دەکاتەوە بە بەری لاشەیەکی بێ ڕۆحی پتورکاودا، بە قسە ڕاست و دروست و نەستەق و دانسقەو بەڵگە ئامێزە وە، بەو نوورەوە کە هەموو ڕوداوو دیاردەکانی پێدەبینێت، بەو شارەزاییەی کە لە فیقهی ئیسلامی هەیبووە، کە تەنها زاناکان و داناکان لێی تێدەگەیشتن.

ڕەحمەتی خودا لە خاوەنی ئەو وتە پڕ گەوهەرە کە فەرموویەتی:

کەس زانانێت فەزڵی غەزالی لە چ ئاستێکدایە، مەگەر گەیشتبێتە پلەی کەماڵی دانایی و ژیری[1] ،

ئەوە غەزالییە کە خودا بەرەکەتی خستە تەمەنە کورتەکەیەوە، ئەوەی کەسێکی جەربەزەی ناوازەی بلیمەت بە دووصەد ساڵ پێی نەدەکرا بیکات، ئەو بەو تەمەنە کورتەوە ئەنجامیدا، خودای گەورە نووریشی خستە ناو دڵیەوە، کە لە هەواو ئارەزووی دونیایی دوورکەوتەوەو، هەموو هەنگاوەکانی بەرەو ڕێگای خوداناسی چڕکردەوە و، خۆی گەیاندە لیقای هەمیشەیی پەروەردگاری.

---

(١) بنوارە: طبقات الشافعیة الکبری(٦/٢٠٢).

که مامۆستاکانی خۆی وەك ئیمامی جووەینی شانازیان پێوە دەکرد.
حافیظی عێراقی فەرموویەتی: بەرزترین پەڕاو کە حەرام و حەلاڵت پێ بناسێنێت زاهیری حوکمەکان وشاراوەو نهێنی و وردەکاری ئەو فەرمانانەی بۆ ڕوونکرد بێتیەتەوە،عیلمی زاهیرو باطینی تێکەڵ کردو هەموانی پی سەرسام و شارەزاکرد.

هەزاران فەرموودەی دروست و جوان و پەسەندی لە پەڕاوەکەیدا کۆکردەوە،کە نیشانەیە لە شارەزابوونی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، لەگەڵ ئەوەشدا نەیفەرمووە من (موحەددیث )و زانام، بەڵام سەیری کتێبی (الوجیز)ی بکە، دەقاو دەقی فەرموودەکانی پێغەمبەرە ﷺ کە زانایەکی وەك ئیمامی (الرافعي) لە (العزيز في شرح الوجيز)دا ئەو لایەنە گرنگەی شیتەڵ کردۆتەوە. تاوای لێ هات ڕای کۆی زانایان لەسەر ئەوە دامەزراوە کە غەزالی (موجەددید )و تازەکەرەوەی دین لە سەدەی پێنجەم بە ڕای هەموان ئەو زاتەیە، دین و زانست و بیروباوەڕی تازەکردەوەو لە هەموو ڕوویەکەوە پاراستی، وەك ئیمامی سیوطی لە (**تُحفَةُ المُهتَدين بأَخبارِ المُجَدِّدين**)دا فەرموویەتی:

**والخامِسُ الحَبرُ هوَ الغَزالي وعَدُّهُ ما فيهِ مِنْ جِدالِ**

**کۆدەنگی هەمـــوو زانای لەسەرە غـــەزالی تـــاجی عیلمـی لەسەرە**
**سەرتـــــاپای باڵای تێراوی نوورە چاوی دەروون و دڵ و بەصــــەرە**
**لەسەدەی پێنجا بووبەموجەددید مونکـیری حاڵی لە دیـــن بەدەرە**

بۆیە بلیمەتی و زانایی ئەم زاتە وای لێ کرد، کە گەورەترین دووجەمسەری ژیان پێکەوە ببەستێتەوەو، ئەقڵ و نەقڵ و بەڵگەکانی پێکەوە بەستەوە، وەك خۆی دەفەرموێت:

هەرگیز ناگونجێت ئاڵۆزی و دژایەتی هەبێت لە نێوانی ئەقڵ و دین دا، یان ئەقڵ و شەرعدا، چونکە ئەقڵ وەك بناغەو بنەماکەی وایە، شەرعیش بیناکەیەتی، ناکرێت یەکێکیان بەبێ ئەوی تریان بخەیتە ناو زیهنتەوە، هیچ بناغەیەك سوودی نابێت بەبێبیناکردن، وە هیچ بینایەکیش جێگیر نابێت ، بە

بێبناغەکەی[1]،

لە دەیان و صەدان ڕووی ترەوە پێشەوا غەزالی بوویە پێشەنگی هەموویان و، چەندین سوپای بەرگری کارو دڵسۆز و پەیڕەوی صۆفیی دروست کرد، وەك خۆی بە (نظام الملك) ی فەرموو:

بەڕاستی چەندین بەندەی تایبەتیمان بۆ پێگەیاندویت، ئەگەر هاوار بکەن دونیا لە ژێر چەپۆك و دەسەڵاتیاندا دێتە لەرزین.

**خوێنەری بەڕێز:** ئەم بەرگی شێیەمی(ژیانەوە)، زۆربەی نهێنیە تایبەتیەکانی لەخۆگرتووە، پەڕاوێکیان تایبەت بە چۆنیەتی پاککردنەوەی ماڵ و، دەرکردنی مافی خوداو خەڵکی هەژار تیایدا، کە بەڕاستی ئەو شێوە چارەسەرکردنەی کە ئیمامی غەزالی تیشکی خستۆتە سەر، بەشێوەیەك کاریگەری لەسەر دەروون دەکات، کە ئەوەیش ماڵەکەی نەگەیشتبێتە ئاستی زەکات دان، هەوڵبدات بە گیانی خۆبەخشییەوە خێری زیادە بکات، لەگەڵ دەربڕینی ئەو پەڕی منەتباریی بۆ ئەو کەسەی کە ئەو ماڵەی بۆ پاك دەکاتەوەو لێی وەردەگرێت.

کاتێك ماڵ بەهایەکی ئەوتۆی نەما لە دڵیدا، ئەو کاتە بەخشین و سەرفکردنی لە ڕێی خوادا دەبێتە کارێکی زۆر ئاسایی، بۆیە چاکی بەندایەتی لێدەکات بەلادا و، گەشتی پیرۆزی حەج و عومرە ساز دەکات و، باشترین ماڵ لە پێناوی ئەو زیارەتەدا خەرج دەکات، وە بە هۆی پەڕاوە پەروەردەییەکەی پێشەوا غەزالییەوە، لە نهێنیەکانی حەجکردن حاڵی دەبێت و، تام چێژی ئەو جۆرە بەندایەتییە دەکات و،ئەو ئاسەوارە پیرۆزانە بەسەر دەکاتەوەو، دڵی وریاو زیندوو دەبێتەوە، شەوق و صەفایەکی دەروونی بەهێزی بۆ پەیدا دەبێت.

باوەڕ بکە؛ ئەوەی ئەم بەرگە بخوێنێتەوە، زیاتر کاریگەری لە سەر درووست دەبێت، لەوکەسەی کە زیارەتەکان بکات و نەزانێت چۆن هەڵس و

---

(١) معارج القدس في مدارج النفس( ص/٥٧).

کەوت دەکات، بە تایبەتی زیارەتی حەزرەتی فەخری عالەم ﷺ، کە دڵەکان بەباس و خواسی ئیحیا دەژێنەوە و، زوبان بە پەڕاوی سێیەمی ئەم بەرگەیە بە زیکری خودا پاراو دەبێت، واتە بە چۆنیەتی خوێندنەوەی قورئان و ئادابەکانی، هەروەها چۆنیەتی نزاو لالەو پاڕانەوە لە حزوری خوادا، کە لە پەڕاوی زیکر و دوعاکاندا دەروونی خۆیی پێدەبوژێنێتەوە و، زوبانی پێ پاراو دەکات و، دڵی پێ وریاو بێدار دەکاتەوەو، چاوی پێ تیژ و بینا دەکات و ، پەیوەندی نەپچڕاوی پێدەبەستێت لە حزوری خودای گەورەو میهرەباندا.

تا وای لێ دێت لە پەڕاوێکی تردا؛ چۆنیەتی ویردەکان و ڕێکخستنیان و ، زیندووکردنەوەی شەوان، بە هەستانەوەو بەندایەتی و شەونوێژەوە بۆ ڕووندەبێتەوە.

بەڕاستی ئەوەی تامی شەونوێژ و پاڕانەوەی حزوری خودای نەکردبێت، لەم پەڕاوانەدا نەك هەر لێی تێ دەگات، بەڵکوو تامو چێژیشی دەکات و، ناخی دەروونیشی ئەوداڵی بەندایەتی دەبێت و، وای لێ دێت خۆی بەدوای عیبادەتدا ڕابکات، نەك بە بارێکی گرانی بزانێت و، هەمیشە بێزاری دەربڕێت لێیان و، بەلەشی قورس و گیانی تەمبەڵی و خەواڵوییەوە بچێتە حزوری خودا، کە نەزانێت لە خزمەت کێدا ڕاوەستاوە و چی عەرز دەکات !

چونکە ئەوەی نەتوانێت خۆی بناسێت، ناشتوانێت خودا ناسی بکات! ئەوەیش کە توانی نەفسی سەرکەش و یاخی خۆی بناسێت و، بهێنێتە ژێر باری بەندایەتی و، ئەرکەکانی پێ جێبەجێ بکات، ئەوە بە هۆی کتێبی ئیحیای غەزالی و ئیخلاصی دڵ و نیەتی پاکی خۆیەوە، بارگرانی و تەکلیفەکەی بۆ دەبێت بە خۆشی و، چێژ لە عیبادەتەکەش وەردەگرێت، ئەو کاتە شانازیش دەکات بە خۆیەوە کە دەتوانێت خودا ناسی بکات و، ڕێگاکەی ون نەکردووە و، هەمیشە لە بەرزی و پلەگەنی گەیشتن بە خۆشەویستی خوداو پێغەمبەرداخۆی وەك موریدێکی پەیڕەوی ڕێبازی حەقیقەت و شەریعەت دەبینێتەوە، خودا یار بێت ...

# كِتابُ
# أســـرار الزكاة

## پەڕاوی
# زەكات و نهێنیەكانی

ئەمەیش پەراوی پێنجەمە

لە چواریەكی بەندایەتیەكان

لەپەراوەكانی

## ژیانەوەی زانستەكانی ئاین
## إحياء علوم الدين

دانراوی

## ئیمامی غەزالی

بسم الله الرحمن الرحيم

بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

# کتاب

# أسرار الزكاة

# پەڕاوی

# (زەکات و نهێنیەکانی)

# بسم الله الرَّحمن الرَّحيم

حەمدوسەنا بۆ ئەو خودایەی ئەو خەڵکەی بەختیار کردووە یان بەدبەخت، دەیانمرێنێت و زیندوویان دەکاتەوە، دەیانهێنێتە پێکەنین و دەیانگرێنێت، دەیانهێنێتە بوون و دەیشیان باتەوە، یان لێیان دەگرێتەوە و زیانیان لێبدات، یان پێیان دەبەخشێت و دەیرژێنێت بەسەریاندا، ئەو خودایەی کە هەژاری و دەوڵەمەندبوونی هەموانی بە دەستە، ئەوەی کە گیاندارانی لە تکێ شەهوەت دروست کردووەو گەشەی پێداون، بۆخۆیشی لە هەموو دروستکراوانی جیادەبێتەوە و هیچ پێویستییەکی پێیان نابێت.

لە پاشان هەندێك لە بەندەکانی تایبەتمەند کردووە بە خەصڵەتی جوان و، نازو نیعمەتی ڕژادندووە بە سەریاندا، ئەوەندەی کە پێی دەوڵەمەندبووبن و نیازیان بە کەسی تر نەبێت، وە هەندێکیش لەگەڵ هەوڵی زۆریشدا سەرکەوتوو نابن و بێ تواناو مایە پووچ دەبن، بۆ ئەوەی ڕوبەڕووی تاقیکردنەوەی خودایی ببنەوە، ئایا دەتوانن لێی دەرباز ببن یان نا؟

هەروەها دەرکردنی زەکاتی ماڵیشی کردووە بە بنەمایەکی سەرەکی بۆ دینی ئیسلام، وە ڕوونیشی کردۆتەوە بۆیان، کە تەنها بە فەزڵی خودایە کە هەندێك توانیویانە خۆیان پاك بکەنەوەو، زەکات لە ماڵەکانیان دەربکەن، وە پشت بە دەوڵەمەندی خودایە؛ کە هەندێك توانیویەتی زەکات لە ماڵەکەی دەربکات، چونکە ئەو ڕاستییە دەزانێت، کە ئەو ماڵەش دەری دەکات، لە بنەڕەتدا تەنها ماڵی خودای بەخشیوەتەوە نەك هی خۆی!

صەڵات و سەلامی خودا، لەسەر گەورەو سەروەری هەموان (حەزرەتی) موحەممەدەلموصطەفا، خۆری پرشنگدار و ڕێپێشاندەری هەموان و، سەروەری هەموو دروستکراوان، وە لەسەر ئالوو ئەصحاب و هاوەڵە بەڕێزەکانی، کە هەڵگرانی زانست و دروشمی پیرۆزی تەقواو خۆپارێزین.

**له پاش حەمدو سەنا:**

بەڕاستی خودای گەورە زەکاتی گێڕاوە بە یەکێك لە بنەماکانی ئیسلام، لە دوای باسی نوێژ (کە باڵاترین دروشم و مایەی شکۆمەندی ئیسلامە، باسی زەکاتی کردووە، لە بەرگرنگی و بایەخ پێدانی، وەك قورئان فەرموویەتی:

﴿**وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ**﴾( البقرة٤٣). (واتە لەدوای فەرماندان بە نوێژکردن، فەرمان دەدات کە ماڵەکانتان پاك بکەنەوەو زەکاتی لێدەربکەن).

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی : (**بُنِيَ الإسلامُ علَى خَمسٍ، شَهادةِ أَن لا إلهَ إلاَّ الله، وأنَّ محمَّداً رسُولُ الله، وإقامِ الصلاة وإِيتاءِ الزَّكَاة**)[1]،

(واتە: ئیسلام لە سەر پێنج پایە بیناکراوە (شایەتومان و، نوێژ کردن و زەکات دان)، وە زۆر بەتوندی هەڕەشە دەکاتە سەر ئەوانەی کە کەمتەرخەمی دەکەن لە زەکات دان و لە پاککردنەوەی ماڵەکانیان، وەك فەرموویەتی:

﴿**وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ**﴾ (٣٤/التوبة) واتە: ئەوانەی ئاڵتون و زیو، کۆدەکەنەوە و سەریەکی دەخەن و، لە ڕێگای خوادا سەرفی ناکەن، ئەوانە موژدەیان بدەرێ بە سزای سەختی ڕۆژی دوایی،[2]، واتای ئینفاق و سەرفکردن لە ڕێی خوادا ئەوەیە کە زەکاتی شەرعی لێدەربکەن.

**ئەحنەفی کوڕی قەیس فەرموویەتی** : لەگەڵ چەند کەسێکی قورەیشی دا وەستابووم، ئەبوزەرری غەفاری دای بەلامانداو فەرمووی:

مژدە بەوانە بدە کە ماڵەکانیان کۆ دەکەنەوەو سەرفی ناکەن، کە ئوتووی

---

(١) أخرجه البخاري في كتاب الإيمان، باب بني الإسلام على خمس، (٨)، ومسلم، كتاب الإيمان ، باب بيان أركان الإسلام ودعائمه العظام، (١٦)، من حديث إبن عمر.

(٢) خولاصەی تەفسیری نامی، ١٩٢.

ئاگرین دەهێنرێت بە پشتیاندا و، لە تەنیشتەکانیانەوە دەردەچێت، وە ئوتوویەکیش دەهێنرێت بە گازەرای پشتیاندا و، لە تەوێڵیانەوە دەردەچێت.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە:

ئەو ئوتووە کە لەسەر گۆی مەمکی یەکێکیان دادەنرێت، کاریگەری لەسەر ئەو ئێسکە ناسکانە دەبێت بەملاو لای سەر شانیەوەیە، وە لەسەر ئەو ئێسکانەی سەرشانیان دادەنرێت و، گەرمی و هەژانی ئەو ئازارە دەگات بە هەردوو سەرگۆی مەمکەکانیان و دیانلەرزێنێت.

ئەبوزەرر (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

گەیشتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە ژێر سێبەری کەعبەدا دانیشتبوو، کە منی دی فەرمووی:

**((هُم الأَخسَرونَ ورَبِّ الكعبة، فقلت ومن هم؟ قال: الأَكْثرُون أموالاً، إلا من قالَ هكَذا وهكَذا، مِن بيَن يَديهِ ومِن خَلفهِ، وعَن يَمينهِ وعَن شِمالهِ، وقليلٌ ما هُم، ما مِن صاحِب إبلٍ ولا بقَرٍ ولا غَنَمٍ لا يُؤدِّي زكاتَها إلاَّ جاءَت يومَ القيامَةِ أعظَم ما كانَتْ وأسْمَنهُ، تنطَحُهُ بقُرونِها وتَطؤُهُ بأظلافِها، كلَّما نَفِدَت أُخراهَا عادَت عَليهِ أُولاهَا، حتَّى يَقْضِيَ بينَ النَّاس))**[1]،

(واتە: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە، ئەوانە دۆڕاوو خەسارەتمەندن.

وتم: ئەوانە کێن؟

فەرمووی: ئەوانەن ماڵی زۆریان هەیەو کۆیان کردۆتەوە، مەگەر کەسێك کە بەلای ڕاست و چەپدا و، لە پێشەوەو لە پشتی خۆیەوە بە نهێنی و ئاشکرا بە هەموو لایەکدا لێی ببەخشێت، کە ئەوانەش زۆر کەمن، وە بزانە: کە هەموو خاوەن وشتر و چێل و ئاژەڵ و مەڕو ماڵاتێك ئەگەر زەکاتی لە ماڵەکەی

---

(١) أخرجاه: البخاري، كتاب الأيمان والنذور، باب كيف كان يمين النبي ﷺ (٦٦٣٨) ومسلم، كتاب الزكاة، باب تغليظ عقوبة من لايؤدي الزكاة(٩٩٠).

دەرنەکردبێت، ئەوا بە دڵنیاییەوە وشتر و مانگاو بەران و مەڕو ماڵاتەکەی گەورەتر و قەڵەوتر دەبن و، بە شاخەکانیان ڕووبەڕووی خاوەنەکانیان دەبنەوەو بە توندی شاخیان لێدەدەن و، دەیانخەنە ژێر پێیانەوە، یەك لە دوای یەك دەیانشێلن و شاخیان لێدەدەن، تا ڕیزەکە کۆتایی دێت، ئەوانەی پێشوو سەرەیان دێتەوەو، بەم شێوەیە دوچاری ئەو سزا سەختە دەبن، تا دادگایی ئەو خەڵکەیە بە کۆتا دەگات.)

کەمادەم ئەم سزا سەختانە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە و، بەم شێوە ڕایانگەیاندووە، کەواتە بابەتی زەکات بووەتە یەکێك لە باس و خواسە گەرموگرنگەکان و، زۆر پێویستە نهێنیەکانی زەکات و مەرجە ئاشکرا و شاراوەکانی ڕوون بکرێتەوەو ، لێکدانەوەی تەواو بکرێت بۆ واتاو مەبەستە ئاشکراو نهێنی و شاراوەکانی، لە گەڵ ئەوەی کە بە کورتیش باسی مەرجەکانی ئەو کەسانە بکرێت کە زەکاتیان لەسەر پێویست بووە، یان دروستە کە زەکات وەربگرن.

ئەمەیش ڕوون دەبێتەوە لە باس کردنی ئەم چوار برگەو ناوبڕو(فەصڵ) ەدا، کە باسیان دەکەین:

**ناوبڕی یەکەم:** لە بارەی جۆرەکانی زەکات و هۆکاری پێویستبوونی زەکات.

**دووهەم:** ڕوونکردنەوەی ئاداب و چۆنیەتی زەکاتدان و، مەرجە شاراوەو ئاشکراکانی.

**سێیەم:** ئەوەی وەری دەگرێت و، مەرجەکانی شیاوی ئەو کەسە بۆ وەرگرتنی زەکات و، باسی ئاداب و شێوەی وەرگرتنی زەکات.

**چوارەم:** باسی صەدەقەو چاکەی خۆبەخشی و ، خێرو گەورەییەکانی.

# ناوبڕی یەکەم

## باسی جۆرەکانی زەکات و هۆکارەکانی پێویستیی زەکات،

**زەکاتدان؛ بە پێی پەیوەندارەکانی دەکرێت بە شەش بەشەوە:**

زەکاتی گیانلەبەر و ئاژەڵ و ڕەشەوڵاخ، زەکاتی نەختینە ی زێڕ و زیو و، ماڵی بازرگانی و ، زەکاتی کان و کانزاکان و، زەکاتی دەغڵ و دان و میوە (ئەوانەی دەیەکیان لێدەدرێت) وە زەکاتی سەرفیترە.

# جۆری یەکەم:

## زەکاتی ئاژەڵ و ڕەشەوڵاخ و وشتر و مەڕو ماڵات

پێویستبوونی ئەو زەکاتە و هاوێنەکانی تەنها لەسەر موسوڵمانی سەربەستە، بەڵام باڵغ بوون و ئاقڵی بەمەرج نەگیراوە، بەڵکوو زەکات واجب دەبێت لە ماڵی کەسێکی منداڵ و شێتیشدا، ئەمە ئەو مەرجەیە کە پێویستە لەو کەسەدا بێتە جێ، کە زەکاتی ماڵەکەی دەردەکات.

**زەکاتی ئاژەڵ پێنج مەرجی هەیە:**

دەبێت ئەو حەیوان و گیانلەبەرانە بێت کە بە دەمی خۆیان بلەوەڕن و ، ساڵێك خاوەنیەتی بۆ ئەو ماڵە بەسەر ببات، وە ئەندازەی ماڵەکە گەیشتبێتە ئاستی زەکات دان، بە تەواویش خاوەنی ماڵەکە بێت.

**مەرجی یەکەم:**

ئەو ئاژەڵانە بێت کە بە (نەعەم)ناوبراون، (چونکە زیاتر نیعمەتی خودایان تێدا بەدی دەکرێت و بەرووبووم و زیادبوونێکی بەرچاویان هەیە) کەواتە زەکات تەنها لە وشتر و مانگا و مەڕو ماڵاتدا دەدرێت، بەڵام ئەسپ و هێستر و گوێدرێژ

و ئەوەش لە نێوانی ئاسك و مەڕو ئاژەڵدا لە دایك دەبێت زەكاتی تێدا نیە.

**دووهەم:**

دەبێت بە دەمی خۆی لەو دەشتە بە پوش و پەلاش بلەوەڕێت، كەواتە ئەوەی ئاڵفی بۆ دادەنرێت، یان ماوەیەك بە ئاڵف پێدانی خاوەنەكەی دەژیا و ماوەیەكیش لە لەوەڕگای دەرەوە دەلەوەڕا، ئەگەر مەسرەف و ئەركی بەخێوكردنی زیاتر بوو، ئەوە زەكاتی لێ ناكەوێت.

**سێیەم:**

**گەڕانەوە و تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر ماڵەكەدا:**

**وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی**

**((لازكاةَ في مالٍ حتَّى يَحُولَ عَلَيهِ الحَول))**[1]،

واتە: زەكات پێویست نابێت لە ماڵێكدا ، كە ساڵی بەسەردا نەگەڕابێتەوە.

ئەم فەرمانەیە بەرهەم و بەرووبومی ماڵ ناگرێتەوە، واتە: زەكات پێویستە لەو ماڵە زیادەی كە قازانجی كردووە و، ئەصڵی سەرمایەكەی ساڵی بەسەردا ڕۆشتووە، دەبێت زەكات لە قازانجەكەیشی بدرێت و ئەو زیادەی ماڵە كە پەیدابووە ئەو مەرجەی لەسەر نەگیراوە كە ساڵی بەسەردا بڕوات.

---

(١)رواهُ أبو داوود (١٥٧٣) من حديث علي بإسناد جيد، وابن ماجه(١٧٩٢).من حديث عائشةبإسناد ضعيف، قلت: هذا لفظ ابن ماجه وفي اسناده جارية بن أبي الرحال قال ابن حجر هو ضعيف وقال البيهقي في معرفة السنن (٥٠٢/١)(٦٨٤) ليس بحجة ورواه الدارقطني هكذا من حديث أنس وفي سنده حسان بن سياه، وكذا ابن عدي في الكامل(٣٧٠/٢)،في ترجمته وضعفه، وأما لفظ أبي داود: في اثناء حديث طويل رواه عن عاصم بن حمزة او عن الحرث الاعور عن علي ليس في مال زكاة حتي يحول عليه الحول واختلف في رفعه ووقفه بجرير بن حازم قال كان ابن وهب يزيد في الحديث عن النبي صلي الله عليه وسلم وشعبه وسفيان وغير هما لم يرفعوه. الإتحاف(١٦/٤)

وە هەرچەندێك ماڵەكەی بفرۆشتێت و هێشتا ساڵەكەی تەواو نەبووبێت، یان بیبەخشێت یان مافێكی تری هاتبێتە سەر، ئەوا لەوكاتەوە ساڵەكە دەپچڕێت و بۆی نوێ دەبێتەوە.

## چوارەم:

## خاوەنێتی تەواوی بۆ ماڵەكە هەبێت و بتوانێت سەرفی بكات یان بیبەخشێت:

كەواتە واجبە زەكات دەربكرێت لەو ڕەشەوڵاخ و ئاژەڵەیشدا كەخرابنە ڕەهن و بارمتەوە، چونكە ئەو بۆ خۆی دەستی خۆی بەستووە لە وەی كە ناتوانێت ماڵەكەی بفرۆشێت، یان بیبەخشێت.

بەڵام زەكات پێویست نابێت لە ماڵێكدا كە لێی ون بووبێت، یان داگیركرابێت، مەگەر ئەو كاتەی كە ماڵەكە بە هەموو بەرهەمەكەیەوە بۆی گەڕابێتەوە، ئەو كاتە زەكات پێویست دەبێت لەسەر هەموو ئەو ماوەی كە لە لای نەبووە و ساڵی بەسەردا ڕۆشتووە.

بەڵام ئەگەر ئەوەندە قەرزار بوو كە هەموو ماڵەكەی دەگرتەوە، ئەوا لەسەری نیە كە زەكات بدات، واتە:

بە هۆی قەرزاریيەكەیەوە بە كەسێكی دەوڵەمەند دانانرێت، چونكە دەوڵەمەندی ئەوەیە زیاد لە پێویستی خۆی ماڵی هەبێت و لێی دەربكات[1].

---

(١) ئیمامی غەزالی لە كتێبی (الوجیز)دا فەرموویەتی: ئەگەر ئەوەندەی هەبوو كە نیصابی زەكاتی پێ تەواو دەبوو، ئەوەندەش قەرزار بوو، كە ماڵەكەی هەموو دەگرتەوە، ئەوا وتەی ئاشكرا ئەوەیە كە پێویستە زەكات بدات، بە پێچەوانەی ڕای ئیمامی ئەعزەمەوە، ئەم ڕایەیشیڕای پێشتری ئیمامی شافیعی یە (خودایان لێ ڕازی بێت) كە قەولێكی أبو حنیفە یشی لەسەرە، بنواڕە: الإتحاف( ١٩/٤).

## پێنجەم:

##ماڵەکەی گەیشتبێتە ئاست و نیصابی زەکات:

ئەگەر وشتری هەبێت، ئەوە زەکاتی لێ ناکەوێت مەگەر پێنج وشتری هەبێت، کە ژمارەیان گەیشتە پێنج سەر، ئەوا کاوڕێك دەدرێت لە زەکاتیاندا، کە دەبێت ساڵێکی تەواو کردبێت و پێی نابێتە ساڵی دووهەمەوە، یان دەتوانێت چتیرێك(بزنێك)ێکی دووساڵانەی نێر یان مێ بدات، واتە پێی نابێتە ساڵی سێیەمەوە.

ئەگەر دە سەری هەبوو ئەوا دوو کاوڕ دەدات، ئەگەر پازدە سەر وشتری هەبوو ئەوا سێ کاوڕ دەدات، لە بیست سەردا چوار کاوڕ دەدات، لە بیست و پێنج وشتردا وشترێکی مێی یەك ساڵە دەدات، کە پێی نابێتە ساڵی دووهەمەوە، ئەگەر ئەم جۆرەی نەبوو، ئەوا (ئیبنولەبون)ێك دەدات، واتە وشترێکی نێری دووساڵەی پێ لە سێ ساڵە، یا بشتوانێت وشترێکی مێ بینە بکڕێت لە جۆری (بنت المخاض)،[1].

وە ئەگەر سی وشەش سەر وشتری هە بوو، وشترێکی مێ بینەی دووساڵە و، ئەگەر بگاتە چل و شەش سەر ئەوا (حیقفە)یەك واتە: وشترێکی مێی سێ ساڵەی پێ لە چوار ساڵ دەدات، کە گەیشتیشە شەصت و یەك سەر (جەزەعەیە)ك دەدات، واتە:

وشترێکی مێی چوار ساڵە دەدات، کە پێی خستبێتە پێنج ساڵەوە، وە کە گەیشتە حەفتاو شەش سەر، دوو وشتری مێی یەك ساڵە دەدات، ئەگەر گەیشتە نەوەد و یەك سەر، دوو وشتری مێی سێ ساڵە دەدات، ئەگەر

---

(١) واتە با (ابن لبون) هەرزانتریش بێت، درووستە لە جیاتی (بنت لبون) بیدات لە زەکاتدا، بنواڕە (العزیز) (٢/٤٧٨)، و(مغني المحتاج) (١/٥٥٠).

وشترەکانی گەیشتن بەصەدو بیست و یەك سەر، سێ وشتری مێی یەك ساڵە دەدات، ئەگەر بوو بە صەد و سی وشتر، ئەوا ئەندازەکە ڕێك دەبێتەوەو لە هەموو پەنجا سەرێکدا وشترێکی مێی سێ ساڵە دەدات، یان لە هەر چل سەرێك وشترێکی مێی یەك ساڵە دەدات.

## زەکاتی مانگاو ڕەشەوڵاخ

زەکات لە مانگا و ڕەشەوڵاخدا نیە، مەگەر ژمارەیان گەیشتبێتە سی سەر، ئەگەر گەیشت بە سی سەر دەبێ (تەبیع)ێك، واتە:

گوێرەکەیەکی نێری یەك ساڵە بدات لە زەکاتدا، کە پێی نابێتە دووساڵ، وە لە چل سەردا (موسیننە)یەك.

واتە: نێونێك دەدات، مانگایەکی دووساڵە کە پێی لە سێ ساڵ نابێت، وە لە شەصت سەردا دوو گوێرەکەی نێرینە کە پێی نابێتە دووساڵە بدات، کە لەم ڕاددەیەش تێپەڕی بۆ هەر سی سەرێك، گوێرەکە نێرێکی یەك ساڵە، یان بۆ هەر چل سەرێك نێون مانگایەکی دووساڵە بدات.

## زەکاتی مەڕو بزن:

مەڕو بزن زەکاتیان تێدا نیە، تا دەگەنە چل سەر، کە گەیشت بە چل سەر ئەوا کاوڕێکی یەك ساڵە، یان چتیر (بزنێکی) دوو ساڵە بدات، لە پاشان هیچی تر نادات تا دەگات بە صەد و بیست و یەك سەر، ئەوکاتە دوو سەر دەدات، کە گەیشتە دووصەدو یەك سەر، سێ چتیر واجبە، تا دەگاتە چوارصەد سەر، ئەوکاتە چوار سەر بە زەکات دەردەکات، ئیتر چەندێك سەرکەوێت، هەموو صەد دانەیەك سەرێکی دەدات بە زەکات.

دەرکردنی زەکات لە ماڵی تێکەڵ کراو لە نێوانی دوو هاوبەشدا، بۆ گەیشتنی بە نیصابی زەکاتدان، وەك ئەو ماڵە وایە کە هی یەك کەس بێت، ئەگەر دوو پیاو چل سەریان هەبوو، ئەوا بە هەردوکیان کاوڕێکی لێدەدەن، وە

ئەگەر لە نێوانی سێ کەسدا بە هاوبەشی صەد و بیست سەریان هەبوو، ئەوا لەسەر هەموویان کاورێك دەدرێت.

وە شەراکەت و تێکەڵکردنی ئاژەڵ و ، تێکەڵ کردنی ماڵێك کە زەکاتی لێ دەدرێت بە شێوەی دراوسێتی و جیوار (جوار)[1]، ئەمەیش وەك تێکەڵکردن و شەراکەتی (شیوع) و ڕاگەیێنراو و عەینی وایە. (واتە: هاوبەشی تەواو بن لە مەڕ و ماڵاتەکەدا، کە بەشی هەریەکەیان جیا نەکرێتەوە لە بەشی ئەوی تریان، وەك ئەو وڵاخ و ئاژەڵانەی بە میرات بۆیان ماوەتەوە، یان پێکەوە کڕیویانە، ئەوە شەراکەتەکە(شایع) و بڵاوە لە نێوانیاندا و تێکەڵی تەواو بووە.)[2].

---

(١) شـەراکەتی (جـوار): ئەوەیە مـاڵی هەریەکە لە شـەریکەکان جیـاواز بێـت و، بە ئاسـانی جـودا بکـرێتەوە لەوی تریـان، تەنهـا ئەوەیە کە لە پـاڵ یەك دابـن، وەك مەرجەکانی ڕووندەکاتەوە، وە هەریەکێ لەم ماڵە تێکەڵکراوە کاریگەریـان لەسـەر زەکاتدانەکە هەیە، ماڵی دووکەس یان چەند کەسێك وەك یەك ماڵی لێ دەکەن کە پەیوەنـداری یەك کەس بێـت، جـاری وا هەیە بە هـۆی تـێکەڵ بـوونەکەوە زەکاتەکە پێویسـت دەبێت، یان زیاد دەبێت لەسـەریان، وەك بەدرێژی باسکراوە: بنوارە: الإتحاف(٣١/٤)

(٢) دووجـۆر شـەریکی هەیە: یەکەم: بەشـەکان دیاری نەبن، وەك ئەوە کە دوو کەس چـل سـەر حەیوانیـان بە میـرات بـۆ مـابێەوە، یـان باخێـك ، ئەمە شـەراکەتی عەینـیە، (شـیوع)، دووهەم ئەوەیە: کە بەشـەکان دیـاری بـن، وەك ئەوەی کە یەکێـك بیسـت سـەر حەیـوانی ببێـت و تێکەڵی چـل سـەر حەیـوانی یەکێکی تـری بکـات، ئەمە پێـی دەڵێن شـەراکەتی جیـوار، دەبێ بە هەرکامیـان بێـت وەك یەك زەکات لە ماڵەکەیـان دەربکەن، بەو شـەرتە کە بەشی هەردوکیـان دیـاریی بێـت و وەزعێکی وا نەیەتە پێشـەوە کە ببـێ بە هـۆی جیـایی، بـۆ نمـوونە : لە ئاژەڵـدا جێگەی ئاوخواردن و مۆڵەڕان و جێگەی شـەوو دۆشین و شـوان و فەحلیان جیا

بەڵام مەرجی تێکەڵکردنەکە ئەوەیە کە: شوێنی مانەوەی شەویان یەك بێتشوێنی ئاو خواردنەوە و مۆڵەڕانیان یەك بێت، وە جێگەی دۆشین و شوان و بێرییان یەك بێت،[1]، وە لەوەڕگایان یەك بێت، وە نێریان یەك بێت[2]،وە هەموویان لە ئەهلی زەکات بن.

کەواتە ئەگەر موسوڵمانێك لەگەڵ یەکێکی ئەهلی زیممە، یان لەگەڵ بەندەیەك کیتابەتی لەگەڵدا کرابێت شەراکەت بکەن، کە هەندێکیان ئەهل نین بۆ زەکات دان، ئەوا تێکەڵکردنەکە هیچ کاریگەرییەکی نیە.(چونکە مافی زەکاتدان لەسەر موسوڵمان و خاوەن ماڵە، کە ئەو دوومەرجە لەواندا جێگیر نابێت، ئەهلی زیممە هاو بڕوا نیە، بەندەکەیش خاوەن موڵك نیە).

وە لەدانی زەکاتی وشتردا، هەرچەندێك کە لەسەری پێویست بێت ، دروستە دایبەزێنێت لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی خوارتر، ئەوە دروستە مادەم لە وشترێکی مێچکەی یەك ساڵە تێنەپەڕێت، واتە:

ئەگەر یەکێك واجبی ئەوە بوو وشترێکی مێچکەی یەك ساڵانە بدات و نەیبوو، بەڵام وشترێکی مێچکەی دووساڵانەی هەبوو، ئەوە ئەو دوو ساڵانەیە بدات و دوو کاوڕ یان بیست دیرهەم لە کابرای زەکات وەرگر وەربگرێتەوە بۆ خۆی.

---

نەبێت، بەڵام شەرت نیە دۆشەریان یەك کەس بێت، چونکە هەر خاوەن حەیوانێك شیری حەیوانی خۆی دەدۆشێت و لە ماڵی خۆیدا دەیژەنێت. بنوارە: شەریعەتی ئیسلام، دانراوی ملا عبدالكريم المدرس، بەرگی (١/ ١٩٠).

(١) ئەو فەرموودە بێ هێزە ، کەواتە زیانی نیە ئەگەر هەر یەکەیان بیری تایبەتی خۆی دیار بێت .

(٢) بەڵام ئەگەر دوو جۆرە ئاژەڵ بوون، وەك مەڕو بزن، ئەوە مەرج نیە کە نێریان یەك بێت.

وه بۆ دووساڵه، دەتوانێت چوار کاوڕ بدات یان چل دیرهەم، وه ئەگەر واجبیشی ئەوه بوو که وشترێکی مێچکەی دووساڵه بدات و نەیبوو، ئەوه وشترێکی مێچکەی یەك ساڵانه بدات، لەگەڵ دوو کاوڕ یان بیست دیرهەم.

وه بۆیشی هەیه ئەگەر نزمتری لەسەر واجب بێت و ئەو بەرزتر بدات، مادەم نەگاته وشتر ێکی (جەزەعه) ، واته:

وشترێکی مێی چوار ساڵه که پێی خستبێته پێنج ساڵەوه ئەوا دروسته، بەڵام زیادەکه له زەکات وەرگرەکه و له (بیت المال) وەردەگرێتەوه.

وه ئەگەر تاکه یەك حەیوانی ساغی تێدابێت. نابێت حەیوانی نەخۆش و عەیبدار له جیاتی زەکات وەربگیرێت، ، مەگەر له زەکاتی حەیوانی نەخۆش و عەیبداردا.

وەنابێت له حەیوانه تایبەتیەکان باشەکانیان هەڵبژێرت و لەڕو لاوازەکان و خراپەکان دەربکات ، بەڵکوو له نێوانی زۆر باش و خراپدا هەڵی دەبژێرێت و زەکاتی لێ وەردەگرێت.[1]

وەنابێت حەیوانی زۆرخۆر وەربگرێت، یان ئاوس بێت، یان شیرەخۆره بێت و تازه لەدایك بووبێت، یان نێرینه بێت، مەگەر ئەو حەیوانانەی که زەکاتیان لێدەدرێت نێرینه بن، وەك گوێرەکەی نێر له زەکاتی گادا، هەروەها دروست نیه ئەو دانسقانه وەربگرێت کەزۆر تایبەتمەندن و چاویان لەسەره [2].

(١) واته ئەگەر (بنت لبون)ێکی لەسەر واجب بوو، نابێت بگەڕێت بەشوێن باشترین یان خراپترینیاندا، بەڵکو با له میانی هەردووکیان بێت. الإتحاف٣٢/٤.

(٢) بنواره (المهذب) ٢٠٤/١)، والخلاصه للمؤلف(١٧٩).

# جۆری دووهەم

## زەکاتیماڵێك کە دەیەکی تێدا واجب دەبێت

لە هەموو شتێکدا کە ڕۆزی و قووت و بژێوی خەڵکی بێت و، ئادەمیزاد بتوانێت لە حاڵەتی ئاساییدا پێیان بژی، وە خۆی پێبگات، کە بە باران یان بە ئاوی کارێز، یان بەهۆی نزیکی ڕیشکەکەیەوە لە ئاوەوە، یان بەهۆی چەم و جۆگەی هەڵگیراوەوە ئاو بدرێت،[1]،ئەوە دەیەکی زەکاتی لێدەکەوێت، کە لە دەغڵ و داندا گەیشتبێتە هەشت صەد مەن،[2]

کەمتر لەو ئەندازە زەکاتی لێ ناکەوێت. هەروەها زەکات لە میوەجات و لۆکەو کەتان و هاووێنەکانی ناکەوێت،

---

(١)هەرچەندە هەڵکردنی جۆگەلەکە و ڕاکێشانی ئاوەکەش تێچوویان هەبێت، هەر دەیەکی زەکاتی لێ دەکەوێت.

بۆ ئەوەش کە بە ئاو هەڵگواستن و بە دۆلاب ، یان بە کرێ ئاو بدرێت، ئەوە بیست یەکی بەرهەمەکەی زەکاتی لێ دەردەکرێت.

وە ئەگەر بە هەردووجۆرەکەبوو، ئەوا سێ چارەکە دەیەکی دەکەوێت، واتە دەیەکێکی دەکرێت بە چوار بەشەوە، سێ یەکێکی دەدرێت بە زەکاتدا و بەشێکیشی دەدرێتەوە بە خاوەنەکەی. شەریعەتی ئیسلام، ١٨٩/١.

(٢) واتە پێنج (ویسق) کە بە پێوانە دەکاتە سێ صەد (صاع)وە بە پێوانەی کوردەواری دەکاتە نزیکەی چل و پێنج تەنەکە، بە کێشانەش دەکاتە هەزار و شەشصەد مشت(رطل)ی بەغدادی و .. کێشانەی کوردەواری دەکاتە دووصەدو بیست و پێنج تەورێزی. شەریعەتی ئیسلام/١/١٨٨.

زەكات لەو دەغڵ و دانە دەكەوێت كە مایەی بژێویی ئاسایی خەڵكییە، (ئەوەی زەكاتی لێدەكەوێت' وەك: برنج و گەنم و جۆ و پەڕشە و نیسك و نۆك و ماش و فاسۆلیا و پاقلە و گەنمەشامی و زەڕاتە عەرەبیلە و، هەرزن و ڕەمەدانە و دێمێلەو هەر دەغڵێكی تر كە بەبێ حاڵەتی ناچاری بخورێت)[1].

لە میوەیشدا بریتییە لە خورما و مێوژ، ئەمەیش پێویستە گەیشتبێتە هەشت صەد مەن(پێنج وسق) وەك باسی كرا.

لە خورماو مێوژدا، نەك ڕوتەب و ترێ، كەواتە: لە دوای وشك كردنەوەی و گەیشتنی بە نیصاب و ئاستی زەكاتدان، زەكاتی لێدەردەكرێت.[2]

وە ئەگەر ماڵی دوو شەریك تێكەڵ كران، ئەوا بە یەكێكیان سنووری نیصابەكەی پێ تەواو دەكرێت. ئەگەر پێشتر پێی نەگەیشتبوو، ئەمەش لە ماڵی شەراكەتی عەینی دا، (شیوع) كە ڕوونمانكردەوە، وەك باخێكی هاوبەشیان هەبێت، هەموو میراتگران هەشت صەد مەنیان هەبێت، كەواتە لە سەر هەموویانە كە هەشتا مەن لە مێوژ بدەن بە زەكات ، بە پێی بەشەكانیان.

لێرەدا تێكەڵكردن و شەراكەتی جیوار ڕۆڵ و بایەخێكی نابێت.

وە نابێت نیصابی گەنم بە جۆ تەواو بكرێت، چونكە جۆرەكانیان جودایە، بەڵام دەكرێت نیصابی جۆ بە سولت تەواو بكرێت، چونكە جۆرێكە لە جۆی ترش، یا ئەوەیە كە توێكڵی نیە، وە جۆرەكانیان لە بنەڕەتدا یەكە.

---

(١) شەریعەتی ئیسلام ١/١٨٨.

(٢) مێوژ و خورما كە زەكاتی لێ دەربكرێت، دەبێ لێك بدرێتەوە، چەندێك خورمای تەڕ و چەندێك ترێ ئەگەر وشك بكرێنەوە پێنج وسقەكەی تێدا دەبێت، ئەوە دیاری دەكرێت و كابرای خاوەنی ئازاد دەبێت كە دەسكاری پاشماوەكەی بكات، ئەگەر نا ئەوە ئەو ئەندازە یان قیمەتەكەی لەسەر واجبە كە بیدا بە خاوەن پێداویستییەكان. هەمان سەرچاوە، (١/١٨٨)

ئەمە ئەو ئەندازەیەیە کە پێویستە دەیەکی لێدەربکرێت، مادەم بە ئاوی ڕووبار و چەم و جۆگەلە ئاودێری بکرێت.

بەڵام ئەگەر بە هەڵێنجان و دۆڵاب بوو، ئەوا بیست یەکی دەکەوێت. ئەگەر بە هەردوکیان بوو، ئەوا کامەیان زیاتر بوو، بەو لایەدا دەشکێتەوە.

## چۆنیەتی واجب بوونەکەی:

خورما و مێوژی وشك و، گەنمی وشکیش دوای پوختەکردنەوەی، ئەوا پێویستەبێت کە زەکاتی لێدەربکرێت، نابێت ترێ و خورمای تەڕ لێی بکرێتەوە، کە هێشتا پێنەگەیشتبێت، مەگەر ترسی ئافەتێکی ئاسمانی هەبێت کە زیانی لێبدات، ئەو کاتە بەرژەوەندی لەوەدایە کە نەفەوتێت و بە کاڵی و ترشی لێی بکرێتەوە، ئەو کاتە خورماکە دەکرێتەوە و دەپێورێت، نۆ بەشی بۆ خاوەنەکەی و، بەشێکیشی بۆ هەژاران.

ئەم شێوە دابەشکردنەیش ڕێگریمان لێ ناکات لەوەی کە وتمان:

دابەشکردنی ماڵ وەك فرۆشتن وایەو بە فرۆشتن دەژمێررێت، بەڵکوو لەبەر پێویستی و نەفەوتانی ماڵەکە لە ترسی دەردو ئافەتێکی ئاسمانی ئەو ڕێگەی پێ دراوە کە بەو شێوە دابەش بکرێت و کارئاسانی بۆ کراوە .

## کاتی واجب بوونی زەکات:

ئەو کاتەیە کە بەرهەمەکەی دیار بێت کە پێگەیشتبێت، وە دەنکەکەی توند بووبێت،

## وە کاتی زەکات لێدانەکەیشی :

دوای وشك بوونەوەیەتی.

# جۆری سێیەم:

## زەکاتی نەختینە(ئاڵتون و زیو)

ئەگەر ساڵ سوڕایەوە بەسەر زیوەکەیدا، بە کێشانەی دووصەد دیرهەم زیوی ئامادەکراوی پاڵفتە بە کێشانەی مەککە، (کە دەکاتە صەدو چل مسقاڵ)، ئەوا پێنج دیرهەم زەکاتی لێدەکەوێت.[1]،

وە نیصابی زێڕو ئاڵتونیش، دەبێ بیست مسقاڵی پوخت و پاڵفتەی تەواو کردبێت بە کێشانەی مەککە، ئەوا چوار یەکی دەیەکێکی دەکەوێت، واتە:

چل یەکیان لێدەکەوێت، لە بیست مسقاڵ نیومسقاڵی لەسەرە کە بیدات، وە چەندێکیش زیاد بکات بەو شێوە دەژمێررێت و لێ دەردەکرێت.

وە هەر نەقدێکی ئاڵتوون یا زیو ئەگەر مەعدەنێکی تری تێکەڵاو بوو، ئەوە دەبێ زێڕو زیوە صافەکەی بگاتە ئاستی نیصاب، ئینجا زەکاتی لێدەکەوێت، ئەگینا زەکاتی لێ ناکەوێت.

وە زەکات پێویست دەبێت لەسەر پارچەیەکی زیوی توێنراوە، وە لەسەر ئەو خشڵ و ئاڵتوونێکی حەرام، کە دروست نەبێت بەکاری بهێنێت،[2]،

---

(١)لما روى الشيخان من حديث أبي سعيد: **(ليس فيما دون خمس أواق صدقة)** وكانت الأوقية إذ ذاك أربعين درهما. الإتحاف ٤/٤٠.

(٢)وەکو قاپ وقاچاخی ئاڵتون و زیو کە دروست نەبێت بەکاربهێنرێن بۆ پیاووژن، یان وەکو بازن و پشتوێن و پاوانە بۆ پیاو. یان وەك ڕەختی ئەسپ و دان لەغاوی وڵاخ بۆ هەرکەسێك بێت، ڕاستر ئەوەیە کە زیادەڕەوی لە خشڵدا بۆ ئافرەت حەرامە، وەکو بازنێك کە سەنگەکەی دووصەد مسقاڵ بێت، ئەگەر گەیشتە ئەو ڕاددەیە، ئەوە لە هەموویدا زەکات واجب دەبێت.شەریعەتی ئیسلام (١٧٦/١)،

وەکو قاپ و دەفری زێڕو زیو، یان ڕەختی ئاڵتونی ئەسپ بۆ پیاو، بەڵام لە خشڵی حەڵاڵدا(کە بۆ ئافرەت بێت) زەکاتی لێ ناکەوێت.

وە زەکات پێویست دەبێت لەسەر ماڵێك کە لە قەرزدابێت و توانای هەبێت بەسەریداو بەتەمابێت وەری بگرێتەوە،[1]،

بەڵام تەنها ئەو کاتە پێویست دەبێت لەسەری کەکاتی هاتبێت و قەرزەکەی وەرگرتبێتەوە، بەڵام ئەگەر قەرزەکە وادەی بۆ دانرابوو، ئەوە واجب نابێت لەسەری کە زەکاتی لێبدات مەگەر کاتەکەی هاتبێتە پێشەوەو دەستی کەوتبێتەوە[2]،

---

(١) شەرتی واجب بوونی زەکات لە ئاڵتوون و زیوی بە ڕادەی زەکات گەیشتوودا ئەوەیە: لە مولْکی خاوەنەکەیدا ساڵی بەسەردا هاتبێتەوە، کەواتە ئەگەر ئەو ئەندازە ئاڵتوون یان زیوە تا شەش مانگ هەڵگیرا و پاشان درا بە قەرز، ئەوە لە پاش تەواو بوونی شەش مانگی تر، واجبە خاوەنەکەی زەکاتی لێ بدات، هەمان سەرچاوە١/١٧٦.

(٢) یان خاوەن پارەکە خۆی دەوڵەمەند بێت، ئەوە دەبێت زەکاتی لێ دەربکات، با وەریشی نەگرتبێتەوە، هەروەها زەکات لە جەواهیراتی وەك دوڕرو یاقووت و ئەڵماس و پیرۆزە و پلاتین و شتی وا زەکاتیان لێ ناکەوێت، بنواڕە شەریعەتی ئیسلام، ١/١٧٦

# جۆری چوارەم

## زەکاتی ماڵی بازرگانی

ئەمیش وەك زەکاتی زێڕو زیو وایە، لەو کاتەوەساڵی بۆ دادەنرێت کە بووە بە خاوەنی ئەو نەقدەی کە کاڵاکەی پێ کڕیوە. بە مەرجێك نەقدەکە گەیشتبێتە ڕادەی زەکات، بەڵام ئەگەر پێی نەگەیشتبوو، وە نیصابی زەکاتی پێ تەواو نەدەبوو، یان بە ماڵێکی تر و کاڵایەکی تر، بە نیەتی بازرگانی کڕیبووی، ئەوە بۆ ساڵ تێپەڕبوون لەو کاتەوە بۆی دەژمێررێت کە کڕیویەتی.

وە دەبێ لە نەقدی ڕەواجی شارەکەی زەکاتەکە بدات. وە هەر بەو نەقدە ماڵەکەی دەقرسێنرێت و هەڵدەسەنگێنرێت و کەمی و زۆری دیاری دەکرێت، ئەگەر بە ماڵێکی نەختینە کاڵای بازرگانی کڕی و بە تەواوی گەیشتبووە ڕادەی زەکات، ئەوە هەڵسەنگاندنەکە بەو ماڵە پێ کڕاوە بکرێت، چاکترە لەنەقدی ناو شارەکە[1] ،

ئەوەی نیەتی بازرگانی هێنا بەوماڵەی کە بۆ کەسابەت و قازانج دایناوە، بە تەنها ئەوەی دایبنێت بۆ بازرگانی، سەرەتای ساڵەکەی بۆ دانامەزرێت، مەگەر دەستی کردبێت بە کڕین و فرۆشتن، وە هەرکاتێك نیەتی بازرگانی نەماو پێش

---

(١) بۆ نموونە ئەگەر بە دووصەد دیرهەمی زیوی . واتە صەدو چل مسقاڵی زیو، یان بیست مسقاڵی پاڵفتەی ئاڵتوون ماڵی بازرگانی کڕی بوو، ئەوا زەکاتەکە دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بەو نەقدەی پێی کڕاوە لە زێڕ یان زیو بەوە زەکات دەربکرێت باشترە. بنوارە الإتحاف ٤٤/٤. (واتە نیومسقاڵی لێ دەکەوێت و چەندێکیشی زیاد کردبێت لە ساڵەکەدا دەبێت بیدات و مەرجی تێپەڕبوونی ساڵی ناوێت)

ئەوەی ساڵی بەسەردا ڕۆشتبێت وازی لە بازرگانی بەو ماڵە هێنا ، ئەواساڵەکە دەپچڕێت و زەکاتیشی لەسەر نامێنێت، بەڵام چاکتر وایە لەم حاڵەشدا زەکاتی ئەو ساڵە بدات.

وە هەر قازانجێك لە کۆتایی ساڵدا لەسەر فرۆشتنی کاڵاکانی کردبێتی ئەوا پێویستە لەگەڵ ساڵوەگەڕی ئەصڵی کەسابەتەکەیدا زەکاتی لێدەربکات، وە ئیتر بۆ ئەو قازانجە ساڵی بۆ نوێ ناکرێتەوە، هاوشێوەی بەرووبوومی ئاژەڵداری.

وە ئەو کەسانەی پیشەیان(صراف)سەڕرافی و پارەگۆڕینەوەیە لە ناوەندەکانی ئاڵوگۆڕی دراو پێی هەڵدەستن، بە ئاڵوگۆڕەکەیان ساڵەکەیان ناپچڕێت، وەك چۆن لە بازرگانیەکانی تردا دەپچڕێت[1] ،

وە زەکاتدان لە قازانجی ماڵی قازانج بەشەراکەت(کاسبی بەپارەی خەڵکی)لەسەر کرێکارەکەیە، مەبەستم لە بەشەکەی خۆیدا، با پێش دابەشکردنی قازانجەکەش بێت، کە ئەم ڕایە گونجاوترینە.(وە خاوەن ماڵەکە زەکات لە سەرمایەکەو بەشەقازانجەکەیشی دەدات).

---

(١) ئەم ڕای ئیمامی غەزالی ڕایەکە لە مەزهەبدا، بەڵام لە شەرحی مینهاجدا فەرموویەتی: ئەگەر ماڵێکی نەقدی بە نەقدێکی تر کڕی، ئەگەر بۆ بازرگانی نەبوو، ئەوا ساڵەکە دەپچڕێت، وە ئەگەر بۆ بازرگانیش بوو، ئەوە ڕای درووستتر ئەوەیە کە ساڵەکە دەپچڕێت، وە دەگێڕنەوە (إبن سریج) فەرموویەتی: مژدە بدەن بە سەڕرافەکان کە زەکاتیان لەسەر نیە بنوارە الإتحاف (٤٧/٤)، مامۆستا مەلا کریم یش لە شەریعەتی ئیسلامدا فەرمویەتی: ئەوکەسانەی کە پیشەیان سەڕرافییە، یانی ئاڵوگۆڕی پارەدەکەن بە پارەی تر، زەکاتیان لەسەر نیە بەرامبەر بەو ئەندازە پارەی کە ئاڵوگۆڕی پێ دەکەن، چونکە ئەگەر تەماشای عەین بکەین، ئەو عەینەیان لانامێنێت تا ساڵی بەسەردا بێتەوە، ئەگەر تەماشای وەزعی بازرگانیش بکەین، بازرگانی لە نەختی ئاڵتوون و زیودا نایابە، وەك لە توحفەدا بەیانکراوە، بەڵێ ئەو ئەندازە پارەیەی کە لە ماڵەوە دایناوەو زیادە لەو ئەندازەی کە ئاڵوگۆڕی پێ دەکات، ئەوە زەکاتی لێ دەکەوێت.

# جۆری پێنجەم

## زەکاتی کان و کانزاو گەنجینە

(الركاز) ڕِکاز : واتە ئەو ماڵەی لە ژێر زەویدا پێش هاتنی ئیسلام شاررابێتەوە، وە لە زەوییەکدا بدۆزرێتەوە، کە لە چەرخی ئیسلامدا خاوەنی دیاری نەبیت، ئەو کەسەی دەیدۆزێتەوە ماڵەکە زێڕ بێت یان زیو دەبێ پێنج یەکی بە زەکات بدات، وە پێویستی بەوە نیە ساڵی بەسەردا بێتەوە، باشتریش وایە ئەو مەرجەی لێ نەگیرێت کە دەبێت گەیشتبێتە ڕاددەی زەکات، (واتە ئەگەر ماڵە دۆزراوەکە کەمیش بێت با ئەو ڕێژەیەی لێدەربکات).

چونکە کە دەڵێن پێویستە پێنج یەکێکی بدات، وەك ئەوە وایە کە لە غەنیمەی جەنگدا دەستی کەوتبێت، ئەمەش دوور نیە، چونکە لە هەمان ڕێگەکانی ماڵی دەسکەوتی شەڕەوە سەرفدەکرێت. بۆیە بە پێی ڕای دروست تایبەت دەکرێت بە ماڵی ئاڵتوون و زیوەوە کە دۆزرابێتەوە[١] .

## کانگاو کانزا:

ئەوە جگە لە زێڕو زیو ، هەر کانگایەکی تر دەربکرێت زەکاتی لێ نادرێت، بەڵام لە ئاڵتوون و زیودا دوای پوختەو پاڵفتەکردنی چل یەکی لێدەدرێت، بە

---

(١) مامۆستای مودەڕِس لەبەرگی یەکی شەریعەتەکەیدا لە باسی زەکاتی کان و کانزاکاندا فەرموویەتی: هەرکەسێك لە موڵکی خۆیدا یان لە وێرانەو کەلاوەیەکدا کانێکی ئاڵتوون یان زیوی لێ دەرکرد، واجبە لەسەری چل یەك بدات لە زەکاتدا، وە لە فەرموودەیەکی ئیمامی شافیعیدا هاتووە کە دەبێت پێنج یەکی بدات، لە فەرموودەیەکی تریشدا دەڵێت: ئەگەر بە زەحمەت بۆی دەردەهات، ئەوا چل یەکی بدات، ئەگەر بە ئاسانیش بوو ئەوا با پێنج یەکی بدات.

پێی ڕای دروستتر، بەم پێیە دەبێ نیصابی زەکاتی تێدا هاتبێتە دی، بەڵام ئەوەی کەساڵی بەسەردا هاتبێتەوە دوو ڕای لەسەرە.[1] ،

**ڕایەکی تر دەڵێت:**

پێویستە پێنج یەکی لێدەربکرێت، لەسەر ئەم ڕایە: پێویست ناکات ساڵی بەسەردا بڕوات، بەڵام لەوەدا کە بگاتە ڕاددەی زەکات، ئەوە هەردوو ڕاکە هەیە، گونجاوترین ڕا (خوای گەورەیش زانایە) ئەوەیە:

کە ئەم کانگا دۆزراوەیە، لەوەدا کە چەندێك زەکاتی لێدەربکرێت ، بلکێنرێت و پەیوەست بکرێت بە زەکاتی ماڵی بازرگانیەوە، چونکە ئەمەش جۆرێکە لە هەوڵدان و کەسابەت کردن، وە لە ساڵ بەسەردا چووندا وەك زەکاتی ئەو ماڵانە وایە کە دەیەکی لێدەکەوێت. کەواتە لەم ڕوانگەوە پێویستی بە تێپەڕبوونی ساڵ نیە، ئەمەش هاوسۆزی تێدا دەبینرێت بۆ هەژاران، وە لە بارەی نیصابیشەوە وەك ئەو ماڵانە دەژمێررێت و حیسابی بۆ دەکرێت، کە بۆ زەکاتدان دەیەکیان لێدەردەکرێت.

وە بۆ (إحتیاط) باشتر وایە بۆ ماڵێکی دۆزراوە کە کەم بێت یان زۆر، پێنج یەکی ئەو زێڕو زیوە دۆزراوەیە زەکاتی لێدەربکرێت، وە جگە لە ئاڵتوون و زیو هەر کانگایەکی تریش دۆزرایەوە زەکاتی لێدەربکرێت، بۆ ئەوەی لە ڕای جیاواز دەربچین و باشترینیان جێبەجێ بکەین، چونگە ئەو گومانانە زۆر نزیکن لەو حاڵەتەوە وەك ناکۆکی و دژایەتییان لەگەڵ یەك هەبێت.

وە ئەم بابەتە جێگای مەترسیشە کە ناتوانرێت بە دڵنیاییەوە فەتوایان لەسەر بدرێت، بۆیە وا پەسەندە کە ڕایەك هەڵبژێررێت هیچ دژایەتی و ئاڵۆزییەك دروست نەکات.

---

(١)مەزهەبی شافیعی ، بەمەرجیان نەگرتووە ساڵی بەسەردا بڕوات، بنوارە الإتحاف ٤/

# جۆری شەشەم زەکاتی (فطر) سەرفیترە

سەرفیترە لەسەر زوبانی (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ واجب بووە. [1].

لەسەر هەموو موسوڵمانێکە کە ئەوەندەی ماڵ هەبێت بۆ شەوو ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان، زیاد بێت لە مەسرەف و بژێوی خۆی و ئەوانەی کە نەفەقەیان دەکێشێت، ئەندازەکەی بۆ هەر کەسێك یەك (صاع)ە لە قووتی غاڵبی ئەو شوێنە، لەو لەگەنەی کە پێغەمبەر ﷺ پێوانەی پێدەکرد، کە دوو مەن و دوولەسەر سێی مەنێکە، لە ڕەگەزی خۆراك و بژێوی خۆی دەری دەکات، یان لەوەی خۆی باشتر بێت، ئەگەر خۆی نانی گەنم بخوات دروست نیە سەرفیترەکە لە جۆ دەربکات، وە ئەگەر چەندین جۆری دانەوێڵەی بەکار دەهێنا، ئەوا با لە باشترینیان سەرفیترەکە دەربکات، بەڵام لە هەرکامیان سەرفیترە دەربکات، ئەوە لەسەری نامێنێت و لە کۆڵی دەکەوێت.

دابەشکردنەکەیشی وەك دابەشکردنی زەکاتی ماڵەکەیەتی، پێویستە بیدات بە هەموو هەشت صینفەکە کە زەکاتیان پێدەشێت، [2]، وە بزانە کە دروست نیە بۆ سەرفیترە ئاردی سووس بدرێت (کە کرمێکە دەچێتە ناو گەنمەوەو کلۆری دەکات)، ئەوانە بۆ زەکاتی سەرفیترە ناشێن.

---

(١)كما في البخاري (١٥٠٣) ومسلم(٩٨٤). عن ابن عمر (رضي الله عنهما) قال: **فرض رسول الله ﷺ زكاة الفطر صاعا من تمر. أو صاعا من شعير. على العبد والحر. والذكر والأنثى. والصغير والكبير من المسلمين. وأمر بها أن تؤدىَ قبلَ خروج الناس إلى الصلاة**.

(٢) سەنگی (صاع) دەکاتە چوار صەدو هەشتاو چوار مسقاڵ. بە حیسابی تەنەکەی نەوتیش تەنەکەیەك و شەش مشت بۆ سەرفیترەی شەش کەس بەش دەکات. وە بزانە ئەو فەرموودەی لە (صاع)دا جێگەی ئیعتیبارە نەوەیە: بە حیسابی پێوانەبێت، چونکە سەنگ بە پێی سووکی و قورسی دەغڵەکە دەگۆڕێت. جا ئەگەر عەیارە و پێوانەی صاعی پێغەمبەری ﷺ دەسکەوت ئەوە باشە، ئەگینا دەتوانین بە بە کێشانەیش دەری بکەین.

وه پێویسته لەسەر پیاوی گەورەی ماڵ سەرفیترەی (خۆی بدات) و ئینجا خێزانە موسوڵمانەکەی، وە ئەوانەش لە ژێر موڵکی ئەودان، وە منداڵەکانی، وە هەموو ئەو نزیکانەی لەسەریەتی نەفەقەیان بکێشێت، مەبەستم باوك و باپیر و دایك ونەنك و منداڵەکانیەتی، (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((أَدُّوا صَدَقَةَ الفِطرِ عَمَّن تَمونون))[1] ،واتە: سەرفیترەی هەموو ئەوانە بدەن کە بەخێویان دەکەن و نەفەقەیان لەسەرتانە.

---

(١)) هكذا ذكره ولفظه: أدوا **عن كل حر وعبد صغير أو كبير نصف صاع من بر أو صاعا من شعير أو صاعا من تمر** وقد ذكرهما فيما سبق أخرجه عبد الرازق وأبو داود والطبراني والحاكم وأخرجه من حديث ابن عمر أمر **رسول الله صلى الله عليه وسلم بصدقة الفطر عن الصغير والكبير والحر والعبد ممن تمونون**. قال الحافظ في تخريج الرافعي اخرجه الدارقطني في سننه(١٤١/٢)، والبيهقي في السنن الكبرى(١٦١/٤)(٧٤٧٤)،من طريق الضحاك بن عثمان عن نافع ابن عمراهـ وقال العراقي رواه الدارقطني والبيهقي من حديث ابن عمر وقال البيهقي اسناده غير قوي ا هـ واخرج ابن ابي شيبة في مصنفه(٣٩٧/٢)(١٠٣٥٤)، عن حفص عن الضحاك بن عثمان عن نافع عن ابن عمر نحوه وزاد ان ابن عمر: **كان يعطيه ممن يعول ومماليك نسائه الامكاتبين كاناله لم يكن يعطي عنهما** والضحاك بن عثمان وثقه ابن معين وقال ابو حاتم في الجرح والتعديل ٤٦٠/٤(٢٠٢٩) صدوق وقال ابن سعد كان ثبتا وقد اخرج له مسلم وما ظهر لي معنى قول البيهقي اسناده غير قوي، ثم قال الحافظ في التخريج المذكور (١٨٤/٢)،على حديث ابن عمر السابق ورواه الدارقطني في سننه(١٤٠/٢) من حديث علي، وفيه ضعف. ورواه الشافعي عن ابراهيم بن محمد عن جعفر بن محمد عن ابيه مرسلا اهـ وفي شرح التقريب للعراقي(٥٥/٤)، وعبر ابن حزم هنا بعبارة بشعة فقال: وفي هذا المكان عجب عجيب وهو ان الشافعي رحمه الله لا يقول بالمرسل ثم اخذها هنا بابين مرسل في العالم من رواية ابن أبي يحيى اهـ قال الولي العراقي : ولم ينفرد به ابن أبي يحيى فقد رواه غيره، وقد روي من حديث ابن عمر كما تقدم، ثم ان المعتمد القياس على النفقة مع ما انضم إلى ذلك من فعل راوي الحديث، ففي الصحيحين عنه: انه كان يعطي عن الصغير والكبير ،البخاري (١٥١١)، قال نافع حتى إن كان نبيا اهـ قال الزبيدي: وقول الولي العراقي لم ينفرد به ابن ابي يحيى فقد رواه غيره. يشير إلى مافي

بەندەیەکیش ئەگەر موڵکی دووکەس بێت دەبێت سەرفیترەکەی بدەن، بەڵام ئەگەر کۆیلەکە کافر بوو ئەوا لەسەری نیە بۆی بدرێت.

وە ئەگەر ژنەکە بە خۆبەخشی سەرفیترەی خۆیدا، ئەوا لەسەری دەکەوێت، وە بۆ مێردەکەیشی هەیە بە بێ ئیزنی خێزانەکەی سەرفیترەی بۆ بدات، ئەگەر لە خۆی زیادبوو، ئەوا سەرفیترەی ئەوانە دەدا کە نەفەقەیان دەکێشێت، لە پێشەوە نزیکەکانیان، کە زۆر پێویستە بە خێوی بکات، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دابینکردنی بژێوی منداڵی پێشخستووەلەسەربژێوی خێزان، وەئەو خەرجییەی پێش مەسرەفکێشانی خزمەتچی داناوە [١].ئەمە کۆمەڵە بنەماو ئەحکامێکی فیقهییە،پێویستە پیاوی دەوڵەمەند بیانزانێت، وە هەندێك جار ڕووداوی نایاب ڕوودەدات، جیاواز لەمانە، ئەوە پێویستە پرسیاری لەبارەوە بکات، وەپشت بەو فەتوایە ببەستێت، بەتایبەتی لە کاتێکدا ڕووداوێکی نوێی بۆ دێتە پێشەوە، دوای ئەوەی ئەم ئەندازەیە شارەزایی تەواوی پەیداکرد بەسەر ئەم بابەتانەدا

---

السنن للبيهقي، ١٦١/٤(٧٤٧٢)، ورواه حاتم بن اسماعيل عن جعفر بن محمد عن ابيه عن علي قال: **فرض رسول الله صلى الله عليه وسلم على كل صغير أو كبير أو عبد ممن تمونون صاعا من شعير أو صاعا من تمر أو صاعا من زبيب ،عن كل إنسان**. وفيه انقطاع، وروي الثوري في الجامع عن عبدالأعلى عن ابي عبد الرحمن السلمي عن ابيه قال : **من جرت عليه نفقتك نصف صاع بر او صاع من تمر** وهذا موقوف، وعبد الأعلى ضعيف اهـ قال النووي في المجموع في( ٨٥/٦)شرح المهذب بعد ان ذكر من خرَّج هذا الحديث فالحاصل أن هذه اللفظة (ممن تمونون) ليست بثابتة

(١) فقد روى أبوداوود (١٦٩١) عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: أمر النبي ﷺ بالصدقة، فقال رجلٌ يارسول الله عندي دينار، فقال: تصدق به على نفسك، قال: عندي آخر، قال:تصدق به على ولدك، قال: عندي آخر ، قال: تصدق به على زوجتك، أو قال: زوجك، قال: عندي آخر، قال: أنتَ أبصَرُ، وفي النسائي( ٦٢/٥): تقديم الزوجة على الولد، وأطبق الشا[illegible] على ذلك، أنظر الإتحاف٤(/٧٢-٧٣).

# ناوبڕی دووهەم

## چۆنیەتی زەکاتدان و مەرجە شاراوە و ئاشکراکانی

## ڕوونکردنەوەی مەرجە ئاشکراکان

**بزانە: پێویستە لەسەر ئەو کەسەی زەکات لە ماڵەکەی دەردەکات چاودێری پێنج مەرج و فەرمان بکات:**

### یەکەم: نیەت هێنان:

دەبێبەدڵ نیەت بهێنێت: کە ئەو زەکاتە فەرزە لەسەری و دەبێ بیدات، بەڵام پێویست نیە لەسەری کە ماڵەکە دیاری بکات،[١].

ئەگەر ماڵێکی هەبوو نادیاربوو لەلای نەبوو، زەکاتدەرەکە وتی:

ئەم زەکاتە لە بریتی ماڵە غائیب و نادیارەکەمە، ئەگەر هیچی بەسەر نەهاتبێت و وەك خۆی مابێتەوە، ئەگینا با خێر بێت و وەك صەدەقەو چاکەیەك دەری دەکەم، ئەوە دروستە، چونکە ئەگەر بە ڕاشکاویش نەیلێت، وە بە ڕەهایی باسی بکات و هیچ قەیدێکیشی پێوە نەکردایە، هەر ئەو واتایە دەگەیێنێت.

وە نیەت هێنانی وەلی (ولي) و سەرپەرشتیار دەکەوێتە شوێنی نیەتی شێت و منداڵ، وە نیەتهێنانی سوڵتان، لە جیاتی نیەتی خاوەن ماڵ حیساب دەکرێت کە زەکات لە ماڵەکەی نادات، ئەمەش تەنها پەیوەستە بە دونیاوە کە ئیتر

(١) مەبەست لەو ماڵەیە کە زەکاتی لێدەدات، ئەگەر خاوەنی دووصەد دیرهەمی حازرو دووصەد دیرهەمی غائیب بوو، کە ئامادە نەبوو لەلای، ئەویش دە دیرهەمی لە زەکاتدا دەرکرد بەبێ دیاریکردن، ئەوە درووستە. الإتحاف(٨٩/٤)

داوای زەکاتی لێ ناکرێت، ئەینا لە دوارۆژدا هەر بە قەرزاری دەمێنێتەوە، وە لە گەردنی دا دەمێنێتەوە، مەگەر بە خوایشتی خۆی دەستبکاتەوە بە زەکات دان.

وە ئەگەر یەکێکی لەبری خۆی دیاری کرد و، لە کاتی دانانی وەکیلەکە نیەتی هێنا، نیەتەکەی خستە دەستی وەکیلەکەوە، ئەوە بەسیەتی و دادەمەزرێت، چونکە دانانی کەسێك بۆ نیەت هێنان،وەك نیەت هێنان وایە.

**دووهەم: دوای ئەوەی ساڵی بەسەردا چوو، پەلەبکات لە زەکاتدان،** وە نابێت سەرفیترە دوا بخات لە ڕۆژی جەژن، وە لە کاتی ڕۆژئاوابوونی دوارۆژی ڕەمەزاندا سەرەتای واجب بوونی سەرفیترە دەست پێدەکات، وە هەموو مانگی ڕەمەزان کاتی پەلەکردنە لە دانی سەرفیترەو هەرکاتێك لە مانگەکەدا بیدات دروستە.

ئەوەی بتوانێت و زەکاتی ماڵەکەی دوابخات، ئەوە گونهابار دەبێت و، ئەگەر ماڵەکەیشی فەوتا ئەوا لەسەری ناکەوێت و دەبێت بیبژێرێت، چونکە کەسی شیاوی دەسکەوتووە و نەیداوە پێی، بەڵام ئەگەر گەڕاو کەسی شیاوی دەست نەکەوت (لە هەشت صینفەکە)،کە دروست بێت زەکات وەربگرێت و، ماڵەکیشی فەوتا، ئەوە لەسەری نامێنێت و بۆی دەژمێررێت.

وە دروستە کە پەلەبکرێت لە زەکات دان، بە مەرجێك کە ماڵەکەی نیصابی تەواو کردبێت، وە ساڵیشی بەسەردا تێ پەڕیبێت، وە دروستە زەکاتی دووساڵ پێش بخرێت و بدرێت بە کەسێکی شیاو، بەڵام هەرکاتێك پەلەکرا لە پێشخستنی زەکات و، پێش ئەوەی ساڵ بەسەر ماڵی زەکاتدەرەکەدا بچێت کابرای هەژار مرد، یان وەرگەڕایەوە لە دین، یان بەبێ ئەو ماڵە خێرایەی زەکات، بە ماڵێکی تر دەوڵەمەند بوو، یان ماڵی خاوەن ماڵەکە فەوتاو نەما، یان فرۆشتی، یان لە نیصابی زەکات کەمبوویەوە، یان مورتەد بوویەوە، ئەوە حوکمی ئەو ماڵە کە داویەتی دەگۆڕێت و، بە زەکات ناژمێررێت، وە ناشتوانێت

بیگێڕێتەوەو لێی بسەنێتەوە، مەگەر کاتی خۆی ئەو مەرجەی لەگەڵدا کردبێت، کە لە حاڵەتێکی ئاوادا دەبێت ماڵەکە بگێڕێتەوە.

کەواتە ئەوەی پەلەدەکات لە سەرفکردنی زەکات، دەبێت بۆ خۆیشی چاودێری کۆتای کارەکان بکات و ، بیری بەلای داهاتووی زەکات و فرمانەکەیەوە بێت.

**سێیەم:** نابێت لە بریتی ئەو ماڵەی کە زەکاتەکەی لەسەر واجب بووە، ماڵێکی تر بدات لە زەکاتدا، واتە نرخەکەی هەڵبسەنگێنێ و بیدات، بەڵکوو ئەوەی دەقی لەسەر هاتووە ئەوە بدات لە زەکاتدا، کەواتە: نابێت زیو بدات لە بریتی ئاڵتوونێك کە لەسەری بێت، یان زێڕ بدات لە جیاتی زەکاتی زیو کەپێویستە بیدات، با لە نرخیشدا ئەوەی دەیدا بەهادارتر بێت.

لەوانەیە هەندێك لەوانەی لە مەبەست و ئامانجەکانی شافیعی (خودای لێ ڕازی بێت) باش تێنەگەیشتبێت و ئاسانکاری بکات لە وەرگرتنی بەدیلی زێڕو زیو بە نەقدێکی تر، یان بە نرخەکەیان، ئەو تەنها پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی لاگرنگە، بەڵام ئەمە زۆر دوورە لە گەیشتن بە ناوەرۆکی ئامانجەکان، بەڵێ پڕ کردنەوەی پێداویستی خەڵکی پێویست و خوازراوە، بەڵام ئەوە نابێتە تەواوی مەبەستەکە.

## بەڵکوو پێداویستییە شەرعییەکان بریتین لە سێ بەشی سەرەکی:

### بەشی یەکەم: تەنها (تەعەببودین)

واتە: وەك پابەندبوونی بەندایەتی، پێویستە وەك خۆیان جێبەجێ بکرێن، وە هیچ مەرام و حەزو خواستێك تیایاندا ڕێگەی نابێتەوە، بۆ نموونە تۆڕدانی بەردەکان (ڕەجمی شەیتان( واتە (رَمي الجَمرات) لە ڕۆژەکانی حەجدا، سەیرکە ئەو جێگای (جەمەرات)ە هیچ بەش و حەزێکی بەدی نایەت، کە بەردەکانی

بەردەکەوێت، مەبەستی شەرعی پیرۆزیش ئەوەیە کە ئەو کەسە پابەندی هەبێت بەو فرمانەی دەدرێت بەسەریدا. بۆ ئەوەی کۆیلایەتی و بەندایەتی خۆی بسەلمێنێت و، کارێك ئەنجام بدات کە ئەگەر لە واتاو مەغزاکەیشی حاڵی نەبێت ئەوا نابێت لێی سڵ بکاتەوە،[1]. چونکە ئەوەی مرۆڤ لە واتاکەی حاڵی ببێت و لە مەبەستەکەی تێ بگات، ئەوا پاڵنەرێکی تایبەتی بۆ پەیدا دەبێت لە خودی خۆیەوە کە ئەوکارە ئەنجام بدات، ئیتر کەمتر ئیخلاص و بەندایەتی پێوە دەردەکەوێت، چونکە کاتێك مافی بەندایەتی دەدات و کۆیلایەتی خۆی دەچەسپێنێت، کە کارەکەی هیچ بەش و حەزێکی شەخصی خۆیی تێدا نەبێت، تەنها لە بەر مەعبودی ڕاستەقینە کارەکەی بکات، نەك لەبەر هیچ ماناو مەبەستێکی تر.

وەك دەبینین زۆربەی کردارەکانی حەج بەم شێوەیە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی ئیحرام بەستن دا نیەتی هێناو فەرمووی: [2].

((لبَّيكَ بِحَجَّةٍ حَقاً، تَعَبُّداً ورِقّاً))

واتە: ئامادەی گوێڕایەڵیم و نیەتمە ئیحرام دەبەستم، بە مەبەستی حەجێکی ڕاستەقینەو، دەرخستنی بەندایەتی و ڕاگەیاندنی کۆیلایەتییەکی بێ نیاز.

ئەمە بێدارکردنەوەیەکە، کە بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی حەج، تەنها بە

---

(١) بۆ ئەو کەسانەی کە لە ناخ و ناوەرۆکی مەبەستەکان حاڵی نین و، ئەوەندە پێ نەگەیشتوون شارەزای ئەسرار و نهێنیەکانی شەریعەت بىن. بەڵام ئەوانەی بەرچاویان ڕوون دەبێتەوە، ئەوا لە کاکڵەی بابەتەکان حاڵی دەبن و، دەزانن چ حیکمەتێکی تێدایە کە ئەو بەردانە فڕێ دەدەن و ڕەجمی پێ دەکەن.

(٢)قال العراقي أخرجه البزار ( ١٥١/٢(٥١٤)، والدارقطني في العلل(٣٥/١٢(٢٣٧٩) من حديث أنس اهـ . قال الزبيدي٤(٩٦/): ورواه الديلمي في مسند الفردوس كما في جامع الأحاديث للسيوطي (٢٢/٦)، من حديثه أيضا ولفظه: **لبيك حجّاً حقاً، تعبُداً ورِقاً.**

مەبەستی ملکەچی و گەردن کەچی و فەرمانبەرداری خودایە، بەبێ ئەوەی خۆی پێی داهاتبێت، یان داوای کردبێت کە لە نهێنیەکانی حاڵی بووبێت، تا ئەقڵی بۆی بچێت و حەزو مەیلی بچێتە سەری.

## بەشی دووهەم: لە واجب و پێداویستییە شەرعییەکان:

**مەبەست لێیان بەندایەتی و تەعەببودی نیە، بەڵکوو تەنها ڕازی کردنی ویست و ئەقڵی مرۆڤە**، وەك بژاردنەوەی قەرزی خەڵکی، وە گێڕانەوەی ماڵی داگیرکراو، ئاساییە کە بایەخ بە جۆری کردار و نیەت نەدراوە، کەواتە بەهەر شێوەیەك مافەکە بگاتە دەستی خاوەنەکەی، یان بەدەل و بریتی ئەو مافەی دەستبکەوێت و پێی ڕازی بێت، ئەوە واجبەکەی بەجێ گەیاندووە و، گوتارو (خطابي) شەرعی و فەرمانبەرداری خودایی لەسەر نامێنێت، ئەم دوو بەشەی باسمان کردن، ناکەونە یەك و، لەگەڵ یەك کۆنابنەوە، هەموو کەسێکیش دەتوانێت هەست بەم ڕاستیە بکات.

## بەشی سێیەم:

**ئەو پێکهاتانەیە: کە هەر لە بنەڕەتدا هەردوو فەرمانەکەی مەبەست بووە**، کە بەشی بەندەکانی تێدایە: لەوەی کە لە حیکمەتەکەی تێ بگەن و، بەشی خودایشی تێدایە، کە مرۆڤی (موکەللەف) تاقی دەکرێتەوە، کە مەبەستی بەندایەتی بەجێ بهێنێت، لەم بەشەدا لایەنی بەندایەتی (تەعەببودی) فڕێدانی بەردەکان (رَمي الجمرات)ی تێدایە، وە بەشێکی تریشی تێدایە کەماف دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، ئەم بەشە لە خودی خۆیدا کارێکی پەسەنکراوی ئەقڵییە، کەواتە ئەگەر فەرمانێکی شەرعیشی لەگەڵدا هات، ئەوا پێویستە هەردوو واتاکە کۆبکرێنەوە، واتە: هەردوو مەرامەکەی مەبەستە، بەڵام هەرگیز نابێت مەرامە ناسك و تایبەتییە کە لە بیر بکرێت، کە

واتای تەعەببودی و پابەندبوونی بەندایەتی ڕاستەقینەیە، ئەمەش بەهۆی ئاشکرایی و ڕوونی هەردوو واتاکەیە، کە ڕەنگە واتا ناسکە تایبەتەکە گرنگ و بایەخدارتر بێت،

زەکاتیش لەم شێوەیە کە باسمان کرد، کەسی تر جگە لە ئیمامی شافیعی (خودای لێ ڕازی بێت) دەرکی بەو نهێنیە نەکردووە ، لایەنی یەکەم کە هەژار بگات بە مافی خۆی، ئەوە ڕوون و ئاشکرایەو لێی تێدەگەیت، وە مافی بەندایەتی خودایش، لە درێژەپێدانی بەجێ گەیاندنی ئەرکەکاندا مەبەستی شەرعی پیرۆزە، وە بەم لێکدانەوەیە زەکاتیش چووە ڕیزی نوێژ و حەجەوە، کە ئەمیش یەکێکە لە بنەماکانی ئیسلام، ئاشکرایە ئەوەی تەکلیفی بەندایەتی و زەکاتدانیشی لەسەرە، ڕووبەڕووی ماندووبونێکی زۆر دەبێتەوە، لە جیاکرد نەوەی ڕەگەزەکانی ماڵەکەی، وە دەرکردنی زەکات هەریەکە لە ڕەگەزی خۆی و، هەرجۆرێك و شێوەو ڕەگەزێك بەجیا، وە دابەشکردنیشیان بەسەر هەشت صینف و تاقمدا، کە تەواوی چین و توێژە هەژارو خاوەن پێداویستیەکان بگرێتەوە، وەك لەمەودا باسیان دێت.

ئەو ئاسانکاریەی کە تیایدابێت لە مافی هەژارەکان کەم ناکاتەوەو، ڕێگر نابێت بەرامبەریان، بەڵام زیان بە ماف و بوونی ئیخلاصی بەندایەتی دەگەیێنێت، وە دەبێتە بەڵگە؛ کە بابەتی (تەعەببودی) بە مەبەست وا بڕیار دراوە کە ئەو صینف و بەشانە دیاری کراون کە زەکاتیان لێدەدرێت، یان ئەو جۆرانە باسکراوەو بڕیاردراوە، کە زەکات وەربگرن، کە لە پەڕاوە تایبەتیەکانی فیقهدا مەسەلە کان کە ڕای جیاوازیان لەسەرە باسکراوە.

ڕوونترین بەڵگە ئەوەیە: کە شەریعەتی ئیسلام بڕیاری داوە لەبەرامبەر بوونی پێنج وشتردا کاوڕێك دەدرێت لە زەکاتدا، دەبینیت لە وشترەوە گواستویەتیەوە بۆ کاوڕ، کە دوو ڕەگەزی جیاوازن، ئەی بۆ نەیگواستۆتەوە بۆ هەردوو نەقدەکانی زێڕو زیو؟

ئەگەر وابخەملێنرێت و بڵێن:

چونکە ئەوکاتە ئاڵتون و زیو لە ناو عەرەبەکاندا کەم بووە، ئەم بۆچوونە پوچەڵ دەبێتەوە بەوەی کە لە پێشەوە باسمان کرد[1]،

کە لە هەندێك حاڵەتدا بیست دیرهەم و دووکاوڕی داناوە بۆ بژاردنەوەی ئەو کەمبوونەی کە ڕووی تێدەکات، واتە (جەبری مانەقەصی)بۆ دەکاتەوە، ئەی بۆچی لە بژاردنەوەکەدا ئەندازەی کەمکردنی نرخ و بەهاکەی باس نەکرد، یان بۆچی ئەو جیاوازیەی خەملاندووە بە بیست دیرهەم و دووکاوڕ، ئەگەر بەرگ و پۆشاك و خۆراك هەموو ئەو واتایە بگرنەوەو ئەو کەمبوونە پڕبکەنەوە؟!

ئەم باسەو نموونەکانی کە بەتایبەتی ناوبراون، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زەکات دوورنەخراوەتەوە لە واتای بەندایەتی، وەك چۆن لە حەجدا ئەم ڕاستییە دەبینین، بەڵام ئەوەندە هەیە کە لە زەکاتدا هەردوو واتاکەی کۆکردۆتەوە، ئەوەی تێگەیشتنێکی لاوازی هەیە، ناتوانێت هەردوو واتاکە وەك خۆی دەرك بکات و لە نهێنی هەردووکیان شارەزا ببێت، بۆیە جێگەی ئەوەیە کە بکەوێتە هەڵەوە.

## چوارەم:

### دەبێ زەکات و صەدەقەکەی نەگوازێتەوە بۆ شارێکی تر:

چونکە لە هەموو شارێکدا چاوی هەژارەکان لەسەر ماڵی دەوڵەمەندەکانە، بە گواستنەوەی ئەو زەکاتە، بێ هیوایان دەکات، بەڵام ئەگەر ئەم کارەی کرد ،

---

(١)واتە ئەگەر یەکێك واجبی نەوە بوو وشترێکی مێچکەی یەك ساڵانە بدات و نەیبوو، بەڵام وشترێکی مێچکەی دووساڵانەی هەبوو، ئەوە ئەو دوو ساڵانەیە بدات و دوو کاوڕ یان بیست دیرهەم لە کابرای زەکات وەرگر وەربگرێتەوە بۆ خۆی، وە ئەگەر واجبیشی ئەوە بوو کە وشترێکی مێچکەی دووساڵە بدات و نەیبوو، ئەوە وشترێکی مێچکەی یەك ساڵانە بدات، لەگەڵ دوو کاوڕ یان بیست دیرهەم. وەك پێشتر ڕوونکرایەوە.

ئەوا بەپێی فەرموودەیەك لەسەری دەکەوێت، بەڵام چاکتر وایە خۆی لە کێشەی ڕا جیاوازەکان بەدوور بگرێت و با لە ناو شارەکەی خۆی تەواوی زەکاتەکەی بدات بە ئەوانی شیاون بۆ وەرگرتنی، لە پاشان ڕێگری ناکرێت لەوەی کە ئەگەر بیشیدا بە کەسە نامۆکان کە هاتوونەتە ئەو شارەوە.

**پێنجەم: دەبێ ماڵەکەی دابەش بکات بە ئەندازەی بوونی ئەو صینفانەی کە لەشارەکەیدا زەکاتیان پێدەشێت.**

چونکە گەیاندنی زەکات بە هەموو صینفەکان پێویستەو، بەڵگەی دەقی پیرۆزی قورئانی لە سەرە کە فەرموویەتی: ﴿**وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ**﴾ ( التوبة/٦٠) (واتە: زەکات تەنها بۆ ئەم هەشت صینفەیە: هەژار کە هیچی نەبێت پێی بژی، مسکین، کەمێکی هەبێت بەشی نەکات، وە ئەوانەی زەکاتەکە کۆدەکەنەوە، نەوانەی ئیمانیان هێناوە بەڵام نیەتەکەیان بێ هێزەو ماڵی دونیا دڵیان ڕادەگرێت، وە بەندەیەك کە موحتاجی ماڵ بێت بۆ ئازادبوونی، وە ئەو کەسەی کە لە ڕێگای ڕێکخستنی موسوڵمانان و کاری خێردا قەرزار بووە و ناتوانێت بیداتەوە، ئەوانەی بە خۆڕایی و بێ معاش لە ڕێی خوادا غەزادەکەن، وە ئەو موسافیرانەی مەسرەفیان پێینەماوە و دەستیان لە ماڵی خۆیان بڕاوە، ئەمە لەلایەن خوداوە واجب کراوە و خودا زانایە و کارەکانی پڕ لە پەندیاری و حیکمەتن).[1]

ئەم فەرموودەی خودایە وەك قسەی نەخۆشەکە وایە کە بڵێت:

سێ یەکی ماڵەکەم دەبێ بۆ هەژارو مسکێنەکان بێت، ئەوە دەخوازێت کە هاوبەشبن لە دابەشکردن بەسەریاندا.

(١)ئەم باسکردنی هەشت صینفە، وەك چۆن خولاصەی تەفسیری نامی (١٩٦). ڕاڤەی کردووە ، ئاوا گواستمانەوە، بۆ زیاتر سوودبەخشی، وە چەندێك لەو صینفانە ماون باسیان دێت.

وە دەبێ لە عیبادەت و بەندایەتیشدا،خۆی بپارێزێت لەوەی خۆی لە زاهیرو ڕواڵەتی دەقەکان لابدات.

وە لەم هەشت صینفە لە زۆربەی شارەکاندا ئەم دوانەیان نەماوە:
(یەکەمیان: ئەوانەی دڵیان ڕابگیرێت، وە دووهەمیشیان ئەوانەیە کە زەکات کۆ دەکەنەوە)، وە لە هەموو وڵاتەکاندا ئەم چوار تاقمانە بوونیان هەیە:

هەژار و مسکین و قەرزار و گەشتیار، مەبەستم ئەوانەی ڕێبوارن و شتیان لێبڕاوە، وە دوو تاقمیشیان لە هەندێك شارو وڵاتدا هەن و لە هەندێکیشدا نین: ئەوانەش غەزاکەران (موجاهیدانی ئیسلام)و ،ئەو بەندانەی کە کیتابەتیان بۆ کراوە. کەواتە ئەگەر بۆ نموونە پێنج لەو تاقمانە هەبوون، ئەوا با ماڵەکەی بکات بە پێنج بەشی یەکسانەوەو، هەریەکەیان بەشی خۆیانیان پێ بدات، وە هەموو بەشێکیش بکات بە سێ پشك یان زیاتر، ئیتر یان بە یەکسانی، یان بەبوونی جیاوازی پشکەکان، چونکە واجب نیە لەسەری کە لە نێوانی تاکەکاندا بە یەکسانی بەشیان بدات.

بۆیشی هەیە دابەخشی بکات بەسەر دە یان بیست کەسداو بەشی هەندێکیان کەمتربکاتەوە، بەڵام صینفەکان نابێت زیاد و کەمیان تیا بکات، وە نابێت لە کاتی دابەشکردندا بۆ هەر صینفێك لە سێ کەس کەمتر پێی بدات ئەگەر بوونیان هەبێت.

وە ئەگەر تەنها (صاعێك)لەگەنێك گەنمی لەسەر بوو، بۆ سەرفیترە و پێنج تاقمیش هەبوون کە پێیان بدات، ئەوە لەسەریەتی کە بیگەێنێت بە پانزەکەسدا، ئەگەر بە یەکێکی نەگەیاندو دەیشیتوانی بیگەێنێت ئەوا دەبێت ماڧی ئەو تاکەیە بژێرێت، وە ئەگەر ئەمەی لاگران بوو، لەبەر کەمی ئەوەی کە پێویستە پێیان بدرێت، با ماڵەکەی تێکەڵ بە ماڵی ئەوانە بکات کە لەسەریانە زەکات بدەن، وە هەژارو خاوەن پێداویستییەکان کۆبکەنەوەو زەکاتەکەیان پێ بدەن، تا بەشەکان بگات بەهەموو صینفەکان، چونکە ئەمە کارێکی پێویستە.

# ڕوونکردنەوەی

## وردەکاریی ئادابە شاراوەکان لە زەکاتدا

بزانە: ئەوەی موریدی ڕێگای ئاخیرەتە، لە زەکاتدانەکەیدا چەند وەزیفە و ئەرکێکی لە سەرە:

**ئەرکی یەکەم**: دەبێ لە وە تێبگات چۆن زەکات پێویست دەبێت لەسەری و، واتاکە چییەو، چ جۆرە تاقیکردنەوەیەکی تێدایە، وە بۆچی دانراوە بە یەکێك لە پایە و بنەماکانی ئیسلام، لەگەڵ ئەوەدا کە تەنها بابەتێکی دارایییەو، بەشێك نیە لە عیبادەت، کە بەجەستە ئەنجام بدرێت،

**وە لە زەکاتداندا سێ واتا دەگرێتە خۆ:**

**واتای یەکەم:** داننان بە دوو کەلیمەی (شەهادەت) شایەتومان ڕاگەیاندنی پابەندییە بە تەوحید و یەکتا پەرستی، وە شایەتی دانە بە تاك و تەنهایی خودای پەرستراو، وە مەرجی تەواوکردنی وەفای بەندایەتی ئەوەیە: کە نابێت ئەوەی تەنها خودا دەپەرستێت جگە لەو زاتە خۆشەویستێکی تر بخاتە دڵیەوە، چونکە خۆشەویستی ڕاستەقینە هاوبەشی قەبووڵ ناکات، [(١)].

ئەگەر شایەتی یەکتاپەرستیش تەنها بە زوبان بێت، ئەوە بایەخێکی ئەوتۆی نابێت، پلەی خۆشەویستیش بەوە تاقیدەکرێتەوە کە لە

---

(١) مەبەست هاوبەشییەکی ئارەزوومەندانە، نەك ئەوەی بە ناچاری خۆشی دەوێت، چونکە مرۆڤ چارە نیە ئەوەی چێژی لێ وەردەگرێت خۆشی دەوێت، کەواتە ناگاتە پلەی خۆشویستنی تەواوەتی تا زاتی خودای لەهەردوو حاڵەتی ئارەزوکاری و ناچاریدا خۆش نەوێت، وە جگە لەو زاتە کەسی تر نەیەت بە خەیاڵیدا.

خۆشەویستەکانی تری دووربخرێتەوە، ماڵیش یەکێکە لە خۆشەویستەکان لەلای ئەو خەڵکەیە، چونکە ئامێرێکە تام وچێژی دونیایان پێ نیشان دەدات، وە بەدونیا دڵیان دەبەستێتەوە، وە بێزاریان دەکات لە مردن، لەگەڵ ئەوەشدا کە مردن گەیشتنیشە بە خۆشەویستەکەی کە خودایە، کەواتە بەوە تاقی دەکرێنەوە، کە بزانرێت ئایا ڕاست دەکەن لە خۆشویستنی خوادا، لێرەدا دەسبەرداری ئەو ماڵ و سامانەیان دەبن، کە هەمیشە لەبەرچاویانەو، مەبەست و دولبەری دونیایانە، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی :

﴿إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ﴾ (التوبة/١١١)

واتە: خودای گەورە گیان و ماڵی لە بڕواداران کڕیوە، کەواتە لەبری بەخشینی بەهەشتدا، پەروەردگار ماڵ و گیانی لە ئیمانداران کڕیوە، ئەمەش بە جیهادکردن دەبێت لە ڕێی خوادا، کە چاوپۆشی کردنە لە بەخشینی گیان، لە شەوق گەیشتن بە لیقای خودای (عَزَّ وجَلَّ) دا، وە دیسان چاوپۆشی کردنە لە سەرفکردنی ماڵ، کە ئەمەیان ئاسانترە.

کاتێك لەم واتای سەرفکردن و بەخشینی ماڵە تێگەیشت:

## ئەوکاتە خەڵکەکە دەبن بە سێ بەشەوە:

## بەشی یەکەمیان:

### ڕاستگۆیی و پابەندی بوونە لەتەوحیدەکەیاندا،

وە وەفاداریان بە پەیمانەکەیان کردووە، وازیان لە هەموو ماڵەکانیان هێناوە، نە دینارێك و نە دیرهەمێکیان نەخستە لاوە و پاشەکەوتیان نەکردووە، بەڵکوو ڕازی نەبوون کە هەرگیز وایان لێبێت ئەوەندە ماڵیان هەبێت، کە زەکاتدان بیانگرێتەوە، وەك بە هەندێکیان دەوترا:

ئایا لە دووسەد دیرهەم چەند زەکاتی لێدەکەوێت؟

دەیفەرموو: لەسەر عەوام و خەڵکە ئاساییەکە دەبێ پێنج دیرهەم بدەن، بەڵام

لەسەر ئێمە پێویستە کە هەموو ماڵەکەمان بدەین، [1]،

هەر لەبەر ئەمەبوو کە (حەزرەتی) ئەبوبەکری صددیق (خوای لێ ڕازی بێت) هەموو ماڵەکەی هێنایە بەردەمی پێغەمبەر ﷺ و (حەزرەتی) عومەریش نیوەی هەموو ماڵەکەی هێنایە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ (( **ما أبقَيتَ لأَهلِكَ؟ فقال: أَبقَيتُ مِثلَهُ**[2]، **وقال لأَبي بكر (رضي الله عنه) : ما أَبقَيتَ لأَهلِكَ؟**

---

(١) ئەو عاریفە شەیبانی ڕاعی بووە، کە ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەد زیارەتیان دەکردو بڕوایان پێی هەبوو، جارێك پرسیاریان لێ کرد دەربارەی زەکات: فەرمووی:

لەسەر مەزهەبی ئێوە یان مەزهەبی ئێمە، ئەگەر لەسەر مەزهەبی ئێمە بێت بەندە هیچ ماڵێکی نیە تا زەکاتی لێ بدات، وە لەسەر مەزهەبی ئێوەیش لە هەر چل حەیوانێك یەکێکیان دەدات لە زەکاتدا، ئەبوطالیبی مەککی و شێخی ئیبن و عەرەبی ئەم ڕیوایەتەیان پشت ڕاست کردۆدەوە، الإتحاف ١٠٣/٤. هەروەها لە شێخی (شیبلی) ش دەگێڕنەوە (خودای لێ ڕازی بێت) بنواڕە: (کشف المحجوب) ل/٣٤٧.

(٢)) قال العراقي رواه أبو داود(١٦٧٨) والترمذي (٣٦٧٥) والحاكم في المستدرك(٥٧٤/١(١٥١٠) وصححاه من حديث عمر إلاَّ أنه ليس فيه (فقال النبي صلي الله عليه وسلم: ( **وبينكُما ما بين كلمتيكما**) قال الزبيدي: لفظ أبي داود من حديث عمر بن الخطاب رضي الله عنه قال: **أمرنا رسول الله ﷺ يوما ان نتصدق فوافق ذلك مالأ عندي، فقلت اليوم أسبق أبابكر إن سبقته يوما، فجئت بنصف مالي فقال رسول الله صلي الله عليه وسلم ما أبقيتَ لأَهلكَ؟ قلتُ: مثلَه، قال: وأتى أبي بكر بكلِ ما عنده، فقال: ما أبقيت لاهلكَ؟ قال: أبقيتُ لهُم الله ورسُولَه. قلتُ لا أسابقك إلى شئ أبداً.** قلت: وروي عن يونس عن الحسن مرسلا أنَّه قال لهما: مابين صدقتكما كما بين كلامكما. الإتحاف ١٠٣/٤.

ئەوانەی عاریف و خواناسی ڕاستەقینەن، پلەی جیاوازیان هەیە، چونکە خودا بەپێی پلەکانیان نهێنیەکانیان بۆ ئاشکرا دەکات، هەیانە ئەگەر شتێکیان پێ بدرێت یان لایان بێت، دەزانن ئەوە موڵکی خۆیانە یان نا، ئەو کاتە دەتوانن وەری

بگرن، یان ناتوانن لای خۆیان گلی بدەنەوە، موڵکی ڕاستەقینە هەیە کە پێی بەخشرا بێت لەلایەن خوداوە . ناتوانن خۆیانی لێ دوور بخەنەوە، یان وازی لێ بهێنن، حەزرەتی عوسمان (خودای لێ ڕازی بێت) پێغەمبەرﷺ مژدەی پێدا کە کراسێك دەکرێتە بەرت، نابێت دایبکەنیت تا دێیت بۆ لای ئێمە. خۆ حەزی لە خەلافەت نەدەکرد، بەڵام نەیشی دەتوانی فەرمانەکە بشکێنێت، ئەم جۆرە موڵکە کە مافی خۆیەتی و خودا پێی داوە، وەك خواردن و خواردنەوەی پێویست، ئەوە دەستی بەڕودا نانێت، خۆیشی بە خاوەنی ڕاستەقینەی نازانێت.

موڵکی ئەمانەتیش هەیە، کە دەزانن ماوەیەکی کەم لە بەردەستی ئەوان دەبێت، ئیتر خودا دەیباتەوە، بۆیە ناتوانن خۆیان بە خاوەنی ڕاستەقینەی بزانن، بەڵام بۆ ماوەیەك دەستی بەسەردا دەگرن، چونکە دەزانن دەبێ بەم شێوە بجوڵێنەوە، هەیشە دەزانێت ئەو شتە بەس مادە و وێنەکەی لەلای ئەوە، ئەینا لە ڕاستیدا موڵکی خودایە، جا ئەوانەی ئەهلی کەشفن، خودا لێیان دیاری دەکات، کە ئەوە هی ئەوانە یان نا، یان بۆیان دەردەکەوێت ناوی ئەو شتەی کە لای ئەوانە بەسەر یەکێکی ترەوەیە، بۆیە ناتوانن لای خۆیان بهێڵنەوەو، هەمووی دەدەن بە خاوەنەکەی، بۆیە خاوەنی ئەو جۆرە کەشفە هەموو ماڵەکەی دەخاتە خزمەتی ویستی خوداوە، چونکە نابینێت کە خۆی خاوەنی بێت، وە ئەمەش بۆ هەندێك درووست نیە، چونکە لەمبارەوە فەرموودەیەکمان هەیە: عنْ سَعْدِ بن أبي وقاص - رضي الله عنه -: **قَالَ عَادَنِي رَسُولُ اللَّهِ - صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ مِنْ وَجَعٍ أَشْفَيْتُ مِنْهُ عَلَى الْمَوْتِ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ بَلَغَ بِي مِنْ الْوَجَعِ مَا تَرَى. وَأَنَا ذُو مَالٍ وَلَا يَرِثُنِي إِلَّا ابْنَةٌ لِي وَاحِدَةٌ. أَفَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ لَا. قَالَ قُلْتُ: أَفَأَتَصَدَّقُ بِشَطْرِهِ؟ قَالَ: لَا الثُّلُثُ وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَذَرَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ،** مختصر صحيح مسلم رقم(٩٨٢)، باب وصية النبي ٢٥٩/٢. واتە ڕێگەی بە حەزرەتی سەعد نەدا هەموو ماڵەکەی ببەخشێت، یا نیوەیشی ببەخشێت،

قال: اللهُ ورَسُولُهُ! فقالَ ﷺ بَينَكُمَا مابَينَ كَلامِكُمَا))

فەرمووی: چیت بۆخێزانەکەت هێلاوەتەوە، فەرموویەتی خوداو پێغەمبەرم بۆ هێلاونەتەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: نێوانتان وەك ئەو دوو کەلیمە وایە لە میانتاندا، (حەزرەتی) صددیق لە تەواوی حاڵەتی ڕاستگۆییدا تەنها خۆشەویستەکەیی لای خۆی هێلایەوە، کە خوداو پێغەمبەرەکەیەتی و ، دەستی پێوە گرتن و پێویستی بەهیچی تر نەبوو.

---

چونکە منداڵەکانی بەو شێوە جێ نەهێڵێت کە سبەینێ دەست لە خەڵکی پان بکەنەوە، بۆ حەزرەتی عومەریش پرسی چەندت بۆ منداڵەکانت هێلاوەتەوە، فەرموی : ئەوەندەی کە هێناومە، بەڵام وەك لە فەرموودەکەی هێنامان حەزرەتی صددیق هەموو ماڵەکەی هێنایە بەردەستی، پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو بۆچی وات کردووە، وە نەیفەرموو بۆچی هیچت بۆ منداڵەکانت بە جێ نەهێلاوە، چونکە دەزانێت، (حەزرەتی) ئەبوبەکریش ناترسێت، **لاتَخشَ مِن ذي العَرشِ إقلالاً**، بۆیە ناترسێت کە داهاتوو چی ڕودەدات. لەوەش سەیرتر کە پێویستی بە سەرنج و تێڕامانە، حەزرەت ﷺ گوێی لێوە بوو کە هاوەڵەکەی حەزرەتی صددیق فەرموویەتی: **أبقيتُ لهُم الله ورسُوله**، واتە: خوداو پێغەمبەرم بۆ بەجێ هێلاون، خودای بۆ جێ هێلاون ئاساییە، بەڵام ئەی چۆن پێغەمبەری بۆ بەجێ هێلاون، خۆ ئەم قسە بە وتەی بیدعەچییەکانی ئەم سەردەمە شیرکە، چۆن حەزرەتی ئەبوبەکر ئەم گوناهو شیرکە گەورەیەی کردووە، پەنا بەخودا، یان دەبێ بڵێین: کە ڕاستە کە صددیق کردویەتی . وە پێغەمبەریش ﷺ نارازی نەبووە، بەڵکو خۆشحاڵبووە و. لەبەرچاوی حەزرەتی فاروق وەصفی کردووە، کەواتە ڕاستیەکە ئەم جۆرە قسانە شیرك نین و، ئەوان وانەی تەوحیدیان وتووەتەوە، چۆن خۆیان قسەیەکی نابەجێ دەکەن، ئەگەر ئەو پەنابردن و پەنادانە نەبوایە، ئێستا بە ناچاری دەبێت نموونەی حەزرەتی ئەبوبەکر بە موشریك لە قەڵەمبدرایە، پەنا دەگرم بە خودا.

# بەشی دووهەم:

پلەیان لە خواری پلەی ئەم کۆمەڵەیە کە باسمانکردن، ئەوانەن کە دەستیان بە ماڵەکانیانەوە گرتووە، بەڵام چاودێری کاتە پێویستەکان و بۆنە و موناسەبە خێرو چاکەکان دەکەن و، مەبەستیان لە کۆکردنەوەو پاشەکەوتکردنی ماڵە کانیان ئەوەیە کە بە پێی پێویست سەرفی بکەن، نەك بۆ زیادە ڕابواردن و خۆشگوزەرانی، بەڵکوو و بۆ ئەوەی کە زیادەکەی لە ڕێگا خێرەکاندا سەرف بکات، هەرچۆنێك بۆی ئاشکرا بوو.

ئەمانەیش خاوەنی پرۆژەی خێرین و ناوەستن تەنها بە دیار زەکاتەوە،

وەك هەندێك لە زانایانی تابیعین ڕایان وابووە وەك (ئیبراهیمی نەخەعی و شەعبی و عەطاء و موجاهید)(خوایان لێ ڕازی بێت): کە ماڵ جگە لە زەکات دان مافی تریشی لەسەرە.

پرسیاریان لە (پێشەوا)شەعبی کرد :

ئایا جگە لە زەکات هیچ هەقێکی تر بەسەر ماڵەوە هەیە؟

فەرمووی: بەڵێ، ئەی فەرموودەی خودات نەبیستووە کە دەفەرموێت:

﴿وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ﴾ (البقرة/١٧٧) واتە لەگەڵ ئەوەشدا کە ماڵەکەی خۆیی خۆش دەوێت، ئەوا سەرفی بکات و بیبەخشێت بە خزمان و هەتیوان و، داماوان و ڕێبواران و سواڵکەران و، بەو بەندانەی موحتاجی پارە و ماڵن بەرامبەر ئازادکردنیان) هەروەها ئەم ئایەتەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە کە فەرموویەتی:

﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ ﴾(البقرة/٣) لەو ڕزق وڕۆزییەی پێمانداون لە ڕێگەی خوادا سەرفی دەکەن.وە بە فەرموودەی خودا: ﴿وَأَنْفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ﴾ (٢٢/رعد) [1]،

---

(١) خۆلاصەی تەفسیری نامی (٢٧)، وە ڕاڤەی ئایەتەکانی تریش هەر لەو سەرچاوەوە وەرگیراون.

وە ڕایان وابوو کە ئەم ئایەتانە بە ئایەتی زەکات نەسخ نەبوونەتەوە، بەڵکوو

پەیوەندارە بە مافی موسوڵمان لەسەر موسوڵمانەوە. واتاکەی ئەمەیە کە: پێویستە لەسەر دەوڵەمەند. یان کەسێك ژیانی باشتر بێت، هەر کاتێك کەسێك ببینێت پێویستیەکی هەبێت، دەبێت بچێت بەدەمیەوە و جگە لە ماڵی زەکات پێویستییەکەی بۆ جێبەجێبکات.[1]

بەڵام ئەوەی لە زانستی فیقهە وە لەم بابەتەدا دەردەکەێت و دەیگەێنێت:

ئەوەیە کە لە هەرجێگەیەکدا موسوڵمانێك پێویستی بە یارمەتی هەبوو، یان نارەحەتییەك زۆری بۆ هێنا، لادانی ئەو نارەحەتییە فەرزی کیفایەیە، نابێ هەروا موسوڵمانێك پشتگوێ بخرێت و کەس نەچێت بە دەمیەوە، بەڵام ڕێی تێدەچێت کە بووترێت: ئەوەی خاوەن ماڵ لەسەریەتی لەو حاڵەدا:

بەقەرزیش بێت هاوکاری بکات و زایەی نەکات. ئیتر پێویست نیە پێی ببەخشێت، چونکە ئەو زەکاتی لە ماڵەکەی داوە و پاکی کردۆتەوە، وە دەشگونجێت بوترێت: پێویستە لەسەر کابرای خاوەن پارە، بە خێرایی پێویستیە کەی بۆ دابین بکات و، نەیشی کات بە قەرز بەسەریەوە.

## بەشی سێیەم:

قەرزپێدان و، ناچارکردنی بەرامبەرەکەیەتی (هەژارەکە) کە قەرز بکات، ئەوە دوا پلەی نزمی ڕەشەخەڵکە کەیە، کەوەك (عەوام)و نەخوێندەوار دەژمێررێن، کە تەنها واجبە شەرعییەکان ئەنجام بدەن، نەکەمی دەکەن و نەزیادیشی دەکەن، کە پلەیەکی نزمە لە بتەویی بڕوادا، کە زۆربەی عەوامەکان تەنها ئەوەندەیان لێدەوەشێتەوە، لەبەر زیاتر هۆگربوونیان بە ماڵ و پارەوە، وە

---

(١) قوت القلوب ٢/١٠٦.

لاوازی خۆشەویستیان بۆ دوارۆژ. وەك قورئان لەم بارەوە فەرموویەتی: ﴿إِنْ يَسْأَلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا وَيُخْرِجْ أَضْغَانَكُمْ﴾ (محمد/٣٧)

ئەگەر خودا داوای پارەو دارایيەکانتان لێبکات، وە سوور بێت لەسەر داواکەی و دەسبەردارتان نەبێت، ئێوە ڕژدی پیشان دەدەن و، خودایش پیسکەیی و پوولەکییەکەتان دەردەخات، هەموو خەڵکیش پێتان دەزانێت.[١]،

کەواتە جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوانی بەندەیەکدا کە خودای گەورە ماڵ و گیانی لێ کڕیوە، بۆ ئەوەی بەهەشتی پێببەخشێت، لەگەڵ بەندەیەکی تردا کە ناتوانێت بگات بەو مەرامە، لەبەر ڕژدی و بەخیلی خۆی، ئەمە یەکێکە لە واتاکانی ئەو فەرموودەی، کە خودا فەرمانی داوە بە بەندەکانی کە خێر بکەن و ماڵەکانیان سەرف بکەن.

## واتای دووهەم:

**خۆپاککردنەوە لە صیفەتی ڕژدی و بەخیلی،** ئەم صیفەتە لەوانەیە کە مرۆڤ بە هیلاکدا دەبات، وەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: [٢]،

**((ثَلاثٌ مُهلِكاتٌ: شُحٌّ مُطاع، وَهَوىً مُتَّبَع، وإعجابُ المَرءِ بِنَفسِهِ))**

(ئەوەی مرۆڤ دەفەوتێنێت و بە هیلاکیدادەبات: ڕژدی و بەرچاوتەنگی یە، واتە شوێنی بەخالەت و ویستی ناڕەوای دەروونی بکەوێت، وە شوێن ئارەزووەکانی نەفسی خۆی بکەوێت و، زۆریش بەشان باڵی خۆیدا هەڵبدات و سەرسامبێت بە خۆی) هەروەك خودا ﷻ فەرموویەتی:

﴿وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ (٩/الحشر)

---

(١) خولاصە ١ /٥١٠.

(٢) رواه الطبراني في الأوسط، ٥/٣٢٨، (٥٤٤٨)، وأبو نعيم في الحلية(٣٤٣/٢)، والبيهقي في الشعب(٧٣١/١)(٧٤٥)، ورواه البزاز في مسنده(٤٨٦/١٣)(٧٢٩٣).

ئەوانەن کە سەرفراز دەبن، کە خۆیان لە صیفەتی ڕژدی و ڕەزیلی بپارێزن، لە چواریەکی باسی فەوتێنەرەکاندا بەدرێژی دێینە سەر ئەوەی، کە بۆچی ئەم صیفەتانە فەوتێننەرن و چۆن خۆتیان لێدەپارێزیت.

وە بزانە کە تەنها بەوە صیفەتی بەخیلی لادەچێت، کە زۆر خۆی ڕابێنێت لەسەر بەخشندەیی، خۆشویستنی مرۆڤ بۆ شتێك لاناچێت، تا بە زۆر زاڵ نەبێت بەسەر نەفسی خۆیدا، وە دەبێ ئەو خۆشەویستە لە خۆی دوور بخاتەوە و، لای ئاسایی بێتەوە، کەواتە بەم واتایە زەکات دەبێتە پاکەوەکەر بۆ ماڵەکەی و، خاوەنەکەیشی پاکدەکاتەوە لە چڵك و چەپەڵی ڕژدی و پارەپەرستی، وە ئاستی پاکبوونەوەکەیشی بە ئەندازەی زۆری بەخشندەیی و دەربڕینی خۆشحاڵی و شادمانی بەو سەرف و بەخشینەی کە دەیکات، کە لە ڕێی خوادا بەخشیویەتی کردووە.

## واتای سێیەم: شوکرانەی نیعمەت:

چونکە بەڕاستی خودای گەورە چەندین نیعمەتی ڕژاندووە بەسەر گیان و نەفس و ڕۆحی بەندەکانیدا، کەواتە: بەندایەتییە جەستەییەکان (کە بە جەستە ئەنجام دەدرێت) شوکرانەی نیعمەتی ئەندامەکانی جەستەیەتی، دەرکردنی ماڵیش بە صەدەقەو زەکاتدان، شوکرانەی نیعمەتی ڕزق و ڕۆزی و دارایی خودایە کەپێیبەخشیوە.

بەڕاستی ئەو کەسە خاوەنی نەفسێکی زۆر نزمە، کە هەژارێك دەبینێت لە ژیانێکی تەنگ و بەرتەسکدا دەژی و، پێویستی بە یارمەتی و دەسگیرۆیی ئەوە، کەچی نەفسی نالەباری ڕێگەی پێ نادات کە بچێت بە دەمیەوەو، شوکری خودایش بکات کە دەوڵەمەندی کردووە، کە خەڵکێك پێویستی کەوتۆتە ئەم، بەوەی چل یەکی ماڵەکەی یان دەیەکی پێ بدات ، کەچی خۆی تێ ناگەێنێت و ناچێت بە دەمیەوە.

# ئەرکی دووهەم:

## دەربارەی کاتی زەکاتدان

لە ئادابی کەسێکی دین پەروەرە، کە پەلەبکات لەوەی بگات بە ڕۆژی واجب بوونی زەکات، کە دەری بخات حەزی بەوەیە کە فەرمانبەرداری خودابێت و ، خۆشیش بخاتە دڵی هەژارو داماوەکانەوە.

وە ئەو فرسەتە بقۆزێتەوە کە خودا دەرفەتی پێداوە چاکە بکات، نەوەکو ڕۆژ و پێشهاتێکی بۆ بێتە پێشەوە، کە نەتوانێت ئەو ئەرکە ئەنجام بدات، کە دەزانێت هەموو دواکەوتنێك لەوەختی واجب بوونەکە، لەوانەیە تووشی بەڵاو گوناهێکی بکات.

کەواتە هەرکاتێك دەنگی خێرو چاکەیەك لە ناخیەوە ببیستێت، دەبێت زوو بچێت بە دەمیەوە، ئەوە کاریگەری مەلائیکەی ڕەحمەتە بەسەریەوە.

وە دەبێبزانێت: کە دڵی بڕواداریش وا لە نێوانی دووپەنجەی قودرەتی لە توانایی خوادا، لەوانەیە زوو ئەو دڵەی بە بارێکی تردا وەربگەڕێت و ، لەو کارە خێرەیە پەشیمان ببێتەوە، بۆیە خێرایی مەرجێکی سەرەکی بەختیاری بوونی ئیمانداره. شەیتانیش هەمیشە ترسی هەژاری و نەداری دەخاتە مێشکی مرۆڤەوە، فەرمانی خراپە و کاری نابەجێی پێدەدات، وە خورپەی ڕەش و تاوانکاری دەخاتە مێشك و ناخی مرۆڤەوە ، کە هەوڵدەدات ئیلهام و خەواطیری باشی فریشتەکان بسڕێتەوە..

کەواتە خێرا بکەو چاکە کانت ئەنجام بدە، بافرسەتت لە دەستنەچێت.

وە ئەگەر بیەوێت زەکاتەکەی پێکەوە بدات، با هەوڵیش بدات، مانگێکی تایبەتی بۆ دیاری بکات، با ئەو کات و مانگە لە باشترین و پیرۆزترین

کاتەکان بێت، بۆ ئەوەی نزیکبوونەوەکانی لە خوداوە زیاتر گەشە بسەنێت و، خێرەکانیشی چەندین جار بۆی زیاتر بنووسرێت:

وەك مانگی موحەڕەم، کە سەرەتای ساڵی کۆچییەو، لەو مانگانەیە کە شەڕو هەرای تێدا حەرامەو، دەبێت ڕێزی لێبگیرێت... یان مانگی ڕەمەزان، چونکە پێغەمبەرﷺ لەم مانگەدا لە هەموو کاتەکانی تر سەخی ترو دەسکراوە تربووە، هیچی بەدەستەوە نەدەمایەوە. ڕەحمەتێکی سەراسەری وەك شنە بایەکی ڕەهای گشتگیر وابووە، کە هەموان بگرێتەوە[1]،

وە ئەوەش بزانە: کە ڕەمەزان گەورەییەکی تریشی تێدایە. کە شەوی قەدری پیرۆزە، کە لەو شەوەدا قورئانیش هاتۆتە خوارەوە، وەك (زانای گەورە): موجاهیدیش فەرموویەتی: مەڵێن ڕەمەزان، چونکە ئەوە ناوی پیرۆزی خودایە، بەڵام بڵێن (مانگی ڕەمەزان) [2]،

هەروەها مانگی(ذي الحجة)یش یەکێکە لە مانگە پڕ خێرو بەرەکەتەکان، وە یەکێکە لەو چوار مانگەی کە نابێت شەڕیان تێدا بکرێت، حەجی پیرۆز و (حج الأكبر) لەو مانگەدایە، هەروەها ڕۆژە زانراوو دیارەکانی تێدایە، کە دە ڕۆژی یەکەم و ڕۆژە دیاریکراوەکانیش (لە دوای ڕۆژی یەکەمی جەژن سێ ڕۆژەکەی تر)کە پێیان دەوترێت (أيام التشريق). گەورەترینی ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزانیش، دە ڕۆژی کۆتایی مانگی ڕەمەزانە، وە گەورەترینی ڕۆژەکانی مانگی (ذي الحِجه) یش، دە ڕۆژی یەکەمیەتی ، (کە عەرەفەی پیرۆزیشی تێدایە).

---

(١) رواه البخاري (٦)، ومسلم(٢٣٠٨).

(٢) رواه ابن عساكر عن مجاهد، في (تأريخ دمشق) (٢٣٩/٢٦) وقد جاء مرفوعا عند البيهقي في (السنن الكبرى) (٢٠١/٤). ئەوەی ئیمامی غەزالی وەری گرتووە لە (قوت القلوب) وەری گرتووە، (١٠٧/٢).

# ئەرکی سێیەم

## بە نهێنی و پەنهانی کار بکات:

بەڕاستی کاری خێر بە پەنهانیبکرێت، زۆر دوورترە لەوەی گومانی ڕیاکاری و ناوو شۆرەت و سومعەی پێ ببرێت، وە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

(( أفضَلُ الصَّدَقَةِ جهدُ المُقلِ إلى فقيرٍ في السِّرِ))[1].

(واتە گەورەترین خێر ئەوەیە کەسێکی کەمدەرامەت، هەوڵی خۆی بدات و بە نهێنی و پەنهانی یارمەتی هەژارێك بدات.)

هەندێك لە زانایان فەرموویانە:

سێ خەصڵەت هەن لە گەنجینە نایابەکانی چاکەن:

یەکێکیان شاردنەوەی ئەو خێرو چاکەیە کە دەیکات. کە بەسەنەدی دروستەوە ڕیوایەتیش کراوە.[2]

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (( **إنَّ العبدَ لَيَعمَلُ عَمَلاً في السِّرّ، فَيَكتُبهُ اللهُ لَهُ سِراً ، فَإنْ أظهَرَهُ .. نَقَلَ مِنَ السِرّ وكَتَبَ في العَلانيَةِ ، فَإنْ تَحَدَّثَ بِهِ.. نَقَلَ مِنَ السِّرِ والعَلانيَةِ، وكَتَبَ رِياءً**))[3] ، (واتە: بەڕاستی بەندەی واهەیە، بە پەنهانی کارێکی باش دەکات، خودای گەورە لە پەڕاوە نهێنیەکاندا

---

(١) رواه أحمد في ((المسند)) (١٧٨/٥)، وابن حبان في صحيحه: (٣٦١) من حديث طويل عنده بنحوه، ولفظ المصنف من (القوت: ١٠٧/٢). ولأبي داود (١٦٧٧) والحاكم في المستدرك(٥٧٤/١(١٥٠٩) وصححه، من حديث أبي هريرة (رضي الله عنه) : الصدقة أفضَلُ؟ قال: جُهدُ المُقلِ.

(٢) رواه أبو نعيم في (الحلية) (١١٧/٧)،مرفوعا، وانظر: قوت القلوب (١٠٧/٢).

(٣)رواه الخطيب في تأريخ بغداد(٦١/٦)، مرفوعاً، وقال أبو طالب في قوت القلوب: (١٠٧/٢): **فلو لم يكُن في إظهار الصدقةِ معَ الإخلاصِ إلاَّ فَوتُ ثَوابِ السِرّ، لَكانَ فيهِ نَقصٌ عَظيم.**

بۆی تۆمار دەكات، ئەگەر بە ئاشكرا بیكات، لە دەفتەری نهێنیەكانەوە بۆی دەگوازێتەوە بۆ ناو دەفتەری كارە ئاشكرا كان، خۆ ئەگەر لە لای خەڵكیش باسی بكات، ئەوە لە هەردوو پەڕاوی نهێنی و ئاشكرا دەردەهێنرێت و ، بە كارێكی ڕیاكاری بۆی دەنوسرێت.

وە لە فەرموودەیەكی ناسراوو (مەشهور)دا هاتووە :[1] ((**سَبعَةٌ يُظِلّهُمُ اللهُ يَومَ لاظِلَّ إلاَّ ظِلُّهُ، رَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَلَم تَعْلَمْ شِمالُهُ بِما أَعْطَتْ يَمينُهُ**))

واتە: حەوت تاقم هەن خودا لە ژێر سێبەری تایبەتیدا دایاندەنێت، **یەكێكیان:**

كەسێك چاكەیەك بەدەستی ڕاستی بكات، ئەوەندە بە پەنهانی بێت، كارێ بكات كە دەستی چەپی پێی نەزانێت. واتە لە هەموانی بشارێتەوە.

لە هەواڵیشدا هاتووە: ( **صَدَقةُ السِّرَ تُطفِئُ غَضَبَ الرَّبِ**)[2]، (واتە: چاكەی پەنهانی ئاگری تووڕەیی پەروەردگار دەكوژێنێتەوە)

**وە خودای گەورە فەرموویەتی:**

﴿**وَإِنْ تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ**﴾ (٢٧١/البقرة)

---

(١)رواه البخاري (١٤٢٣) ومسلم( ١٠٣١).

(٢) قال العراقي رواء الطبراني في المكبير(٢٦١/٨(٨٠١٤)، من حديث أبي أمامه، ورواه أبو الشيخ في الثواب والبيهقي في الشعب (٢٤٤/٣(٣٤٤٢)، من حديث أبي سعيد وكلاهما بسند ضعيف، والترمذي وحسّنه من حديث أبي هريرة :**إن الصدقة لتطفئ غضبَ الرَّب.** ولابن حبان في صحيحه(١٠٣/٨(٣٣٠٩) نحوه من حديث أنس وهو ضعيف أيضا، قلت: ورواء الطبراني في الصغير عن عبد الله ابن جعفر العسكري في السرائر عن ابي سعيد ولفظ الترمذي (٦٦٤) وابن حبان عن أنس: **إن الصَّدقة لتطفئُ غضب الرَّب وتدفع ميتة السوء**، وقال الترمذي غريب. قال الزبيدي : فيه أبو خلف، قال ابن عدي في الكامل: لايتابع عليه. الإتحاف( ١١٤/٤).

(واتە: ئەگەر چاکەکانتان لەبەرچاوی خەڵکی بشارنەوەو بە پەنامەکی بیدەن بە هەژارەکان ئەوە بۆتان باشترە لەوەی ئاشکرای بکەن.)

وە سوودی شاردنەوە ئەوەیە: لە ئافەت و دەردی ڕیاو شۆرەت و ناوبانگ ڕزگاری دەبێت، وەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**((لايَقبَلُ اللهُ مِن مُسَمِّعٍ ، وَلاَ مراءٍ، وَلا مَنَّان))**[1]،

(خودای گەورە ئەو چاکانە لەوانە وەرناگرێت کە دەیکەن و دەیدەن بە گوێی خەڵکیدا، یان لە پێناوی تاریف و پیاهەڵداندا بێت ، یان دەیدەنەوە بە ڕویاندا و منەت دەکەن بەسەر ئەوانەدا کە چاکەیان پێ کردوون)

ئەوەی چاکەو خێرەکەی ڕادەگەیێنێت، ئەوا دیارە کەمەبەستی ناوو شۆرەتە، ئەوەش کە لەبەرچاوی خەڵکێکی زۆردا چاکە دەدات، ئەویش مەبەستی ڕیاکارییە، ئەوەیش کە بە پەنهانی و بێ دەنگی صەدەقەیەك دەکات دیارە بە کەسێکی دڵسۆز و موخلیص دادەنرێت).

هەندێك لە زانایان ئەوەندە بە توندی باسی شاردنەوەی چاکەیان کردوە، ڕایان وایە کە ئەوەی ماڵەکە دەبەخشێت، ئەوەندە خۆی دەرنەخات، تەنانەت ئەوەش کە لێی وەردەگرێت نەیناسێت، هەندێکیان خێرەکەیان دەخستە ناو دەستی کوێرێکەوە، هەندێکیشیان لە ڕاڕەوی هەژارەکەدا، یان لە شوێنی دانیشتنیدا دایان دەنا کە بیبینێت و هەڵی گرێت و نەزانێت کێ بووە، وە هەندێکیان لە کاتی نوستنی هەژارەکەدا دەیانخستە ناو گیرفانیەوە، یان لە ڕێگەی کەسێکی ترەوە دەیانگەیاند بە هەژارەکە.

---

(١) رواه ابن مبارك في الزهد(٨٣)، من زيادات نعيم بن حماد، والبخاري في الأدب المفرد(٦٠٦)، موقوفا على عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) بلفظ: (**لايَسمعُ اللهُ مِن مسمِّعٍ ولا من مراءٍ، ولا لاعِب، إلاَّ داعٍ دَعا يثبتُ مِن قَلبهِ،** )وهو بلفظ المصنف في (القوت) (١٠٧/٢).

وە هەندێکیتر شاردنەوەکەیان بە شێوەیەکی مامناوەندی بوو، حاڵی خۆیان دەشاردەوە، یان وەصێتیان دەکرد بۆی کە باسیان نەکات.

هەموو ئەم کارانە لە پێناوی ئەوەدا بکەن بەو خەڵاتەی، کە لە توڕەیی و غەزەبی خودا خۆیان بپارێزن، وە تووشی شۆرەت و ڕیابازی نەبن (١).

بەڵام ئەگەر هەرچییەکی بکردایە هەر یەکێك پێی دەزانی، ئەگەر لە ڕێگەی بریکارێکەوە پێی بگەیێنێت باشترە و، لە شۆرەت و ڕیاکاریش خۆی دەپارێزێت، هەر نەبێت دووچاری یەکێك لەو دوو ئافەتە دەبێت، کە تەنها ڕیاکردنەکەیەو لە ناوبانگ و شۆرەتەکە خۆی دەپارێزێت.

وە لە هەر خێرێکدا مەبەست پەیداکردنی شۆرەت و دەنگوباسی ناو خەڵك بێت، ئەوە کردارەکەی پوچەڵ دەبێتەوە. چونکە مەبەست لە زەکاتدان لادانی ئافەتی بەخیلییە، وە لاوازکردنی خۆشویستنی ماڵە، دیارە کەسێك جاهو مقامی مەبەست بێت، زۆر کاریگەرترە لە خۆشویستنی ماڵ، هەردوو حاڵەتەکەیش لە پاشەڕۆژدا خاوەنەکانیان بە هیلاکدا دەبەن،

بەڵام ئەوەندە هەیە، صیفەتی بەخیلییەکە لە عالەمی میسال دا بۆی وەردەگەڕێت، وەك نموونەی دووپشکێکی گەزندە، وە صیفەتی ڕیایش لە گۆڕەکەیدا بۆی دەگەڕێت بە مارێکی سەرسەخت، کە خۆیشی فەرمانی پێ کراوە هەردووکیان لاواز بکات، یان بیانگوژێت، بۆ ئەوەی ئازارەکەیان هەر نەهێڵێت، یان هەرنەبێ سووکیان بکات.

جا هەرچەندێك بە کارەکەی مەبەستی ڕیاو شۆرەت و ناوبانگ پەیداکردن بێت، وەك ئەوە وایە پارچەیەکی جەستەی دووپشکەکەی، کردبێت بە خۆراکی مارەکە، چونکە هەرچەندێك دوپشکەکە لاواز بکات، ئەوا مارەکە بەهێز دەبێت. خۆ ئەگەر وازی لێهێنایە وەك خۆیان بوونایە، فەرمانەکە سووك تردەبوو.

---

(١) قوت القلوب( ٢/١٠٨).

وە هەرچەندێك بە خواستی ئەم صیفەتە خراپانە بجووڵێیتەوە، ئەوا بەهێزتریان دەکەیت، وە چەندێك بتەوێت لاواز و بێ هێزیان بکەیت، ئەوە دەبێت لە ڕێگەی بەرهەڵستی ڕوبەڕووبونەوەیان بێت.

وە هەرچی ئەوان ویستیان ئەم پێچەوانەکەی ئەنجام بدات، کەواتە چ سوودێك دەبینێت،کارێك بکات بەڕواڵەت دژ بە خواستی بەخیلی و ڕژدی بێت، بەڵام لە ڕاستیدا بەدەم خواستی شاراوەی ڕیاکاری خۆیەوە بڕوات، نزمەکەیان کە کەمتر جێگەی مەترسییە بێ هێزی بکات، بەهێزەکەیان بەهێزتر بکات.

کە لە داهاتوودا لە باسی چوارەکە دەردە کوشندەکاندا (پشت بەخودا) نهێنیەکانیان ڕوونتردەکەینەوە

# ئەرکی چوارەم:

لەهەر کاتێکدا زانی کارە خێرەکەی هاندانی تێدایە بۆ خەڵکی، کە کاری خێر بکەن، ئەوا باشتر وایە بە ئاشکرا خێرەکەی بکات.

با نهێنی خۆیشی بپارێزێت و، ڕێگەی پێینەدات کە خواستی ڕیاکاری زاڵ ببێت بەسەریدا، بەو ڕێگاچارانەی لە داهاتوودا باسیان دەکەین لە (پەڕاوی ڕیادا).

بەڕاستی خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿**إِنْ تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ**﴾ (٢٧١/البقرة)، ( ئەگەر خێرو صەدەقەکانتان بەئاشکراو لە بەرخودا بیکەن، ئەوە کارێکی زۆر باشە) ئەمەش لە کاتێکدایە، حاڵ ومەقام داخوازی ئەوە بکات کە ئاشکرای بکات، یان بە مەستی ئەوەی کەسانێکی تر چاوی لێبکەن، یان لەبەر ئەوەی کە سواڵکەرەکە بەرامبەر کۆمەڵێك خەڵك داوای کردووە، خۆ نابێت واز لەو خێرو صەدەقەیە بهێنیت، بەو بەهانەی لە ڕیاکاری دەترسێت ئەگەر ئاشکرای بکات، بەڵکوو پێویستە خۆیشی لە ڕیا بە پێی توانا بپارێزێت و، صەدەقەکەیش بکات.

ئەمەش ئەوە دەگەێنێت، کە ئاشکراکردنی خێر ، جگە لە ترسی ڕیاو شۆرەت، قەدەغەکراوێکی تریشی تێدایە، کە هەڵماڵینی ڕووی ئەو هەژارەیە، کە لەوانەیە پێی خۆش نەبێت بەبەرچاوی ئەو خەڵکەوە پێی بدات و ، وەك سوالکەرێك بکەوێتە بەرچاویانەوە، بەلام ئەوەی بە ئاشکرا سوال دەکات، ئەوە بۆ خۆی ڕووی خۆیی هەڵماڵیوە، کەواتە بۆ ئەو کەسانە ئەو قەدەغەی سێیەمە نایانگرێتەوە.

ئەمەش وەك ئاشکراکردنی فیسق و خراپی کەسێکە، کە خۆی پێ حەشاردابێت، ئەوە کارێکی قەدەغە کراوە لە ڕووی شەرعەوە، کە نابێ هەوالگریشی بەسەرەوە بکات، یان ناوی بزڕێنرێت و غەیبەتی بکات، بەلام کەسێك بۆخۆی خراپەکانی خۆی ئاشکرا بکات، ئەوا ڕووهەڵماڵینی ئەو کەسە، کە داری (حەددیشی) لێبدرێت لەبەرچاوی خەڵکیدا پێویستەو، خۆیشی خۆی فەزح کردووە، نموونەی ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((مَنْ أَلْقَى جِلبابَ الحَياءِ فَلاَ غَيبَةَ لَهُ))[1].

---

(١)) قال العراقي رواه ابن عدي في الكامل(٣٨٦/١).وابن حبان في الضعفاء(١٥٧/٢)(١٢٧٦) من حديث انس بسند ضعيف اهـ قال الزبيدي ١١٧/٤: ولفظ عدي في الكامل من خلع وأخرجه ايضا الخرائطي في مساويء الأخلاق وأبو الشيخ في الثواب والبزاروالبيهقي والخطيب وابن عسار في تأريخ دمشق (٢٠٤/٣٣، والديلمي في مسند الفردوس(٦١٦/٣)(٥٩٢٥).(والقضاعي في مسند الشهاب(٢٦٣/١)(٤٢٣).وابن النجار والقشيري في الرسالة كلهم من حديث أنس وقال البيهقي في اسناده ضعف، وإن صح حُمل على فاسق مُعلن بفسقه ا هـ ، قال الذهبي في المهذب: أحد رواته أبو سعيد الساعدي مجهول، وفي الميزان ليس بعمدة ثم أورد له هذا الخبر اهـ ، ورواه الهروي في ذم الكلام (٢١٠/٤)، وحسَّنه. وقد رد عليه الحافظ السخاوي في المقاصد، (٥٦٢/١) . والحاصل ان جميع طرق هذا الحديث ضعيفة، فطريق أبي الشيخ والبيهقي فيه ابن الجراح عن أبي سعد الساعدي وقد ذكر حاله، وطريق ابن عدي فيه الربيع بن بدر عن أبان وهذا أضعف من

(واتە: ئەوەی پۆشاکی شەرم و حەیا لەبەری خۆی دابرنێت، ئەوا باسکردنی بە غەیبەت دانانرێت).

وە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿**وَأَنْفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً**﴾ (۲۲/رعد) واتە: ( لەو رزق و رۆزیەی پێمانداون لەرێی خوادا بە نهێنی و بە ئاشكراسەرفی بكەن) كەواتە

---

الاول. ولكن للحديث شواهد تقويه من غير هذه الطرق، فقد أخرج الطبري وابن عدي في الكامل والقضاعي من حديث جعدبة بن يحيى عن العلاء بن بشر عن ابن عينية عن بهز بن الحكيم بن معاوية بن حيدرة عن أبيه عن جده مرفوعا: **ليس لفاسق غيبة**، قال الدارقطني وابن عينية لم يسمع من بهز . وأورده البيهقي في الشعب، ونقل عن شيخه الحاكم انه غير صحيح ولا يعتمد، وأخرجه أبو يعلي والحكيم الترمذي في نوادر الاصول(۲۵۷/۲) . والعقيلي وابن عدي وابن حبان في المجروحين (۲۲۰/۱)، والطبراني في الكبير(٤١٨/١٩)( ١٠١٠)، والبيهقي في السنن الكبرى(٢١٠/١٠)(٢٠٧٠٣)، من طريق الجارود بن يزيد عن بهز فهذا الاسناد بلفظ: **انزعوا عن ذكر الفاجر اذكروه بما فيه يحذره الناس**، وهذا ايضا لا يصح، فان الجارود ممن رمي بالكذب . وقال الدارقطني هو من وضعه، وقد روي ايضا عن طريق يعمر عن بهزم بهذا الاسناد، اخرجه الطبراني في الاوسط عن طريق عبد الوهاب الصغاني عنه وعبد الوهاب كذاب، وللحديث طرق أخرى عن عمر بن الخطاب رواه يوسف بن أبان حدثنا الأبرد بن حاتم أخبرني منهال السراج عن عمر قال السخاوي: وبالجملة فقد قال العقيلي ليس لهذا الحديث أصل من حديث بهزم ولا من حديث غيره، ولا يتابع عليه من طريق تثبت. وأخرج البيهقي في الشعب بسند جيد عن الحسن أنه قال: **ليس في أصحاب البدع غيبة**، ومن طريق ابن عينية انه قال: **ثلاثة ليس لهم غيبة: الامام الجائر. والفاسق المعلن بفسقه. والمبتدع الذي يدعو الناس إلى بدعته** . ومن طريق زيد بن أسلم قال: **إنما الغيبة لمن يعلن بالمعاصي**، ومن طريق شعبة قال: الشكاية والتحذير ليس من الغيبة . وقال عقبة هذا صحيح، فقد يصيبه من جهة غيره أذى، فيشكو و يحكي ما جري عليه من الأذى، فلا يكون ذلك حراما، ولو صبر عليه كان أفضل. وقد يكون مزكيا في رواة الاخبار والشهادات فيخبر بما يعلمه من الراوي أو الشاهد ليتقي خبره أو شهادته، فيكون ذلك مباحا والله أعلم.

ئەمە هاندانێکە بۆ بە ئاشکراکردنی خێرو چاکە، چونکە حەزو ئیرادەی خێری کەسانێکی تری لەسەر بەهێز دەکات، با بەندەی خودا زۆر بە وریاییەوە هەڵس و کەوت لەگەڵ ئەم بابەتەدا بکات، ئاگای لە لایەنە دروست و قەدەغەکراوەکانی بێت، چونکە بە پێی کەسەکان حاڵەت و فەرمانەکانیش گۆڕانیان بەسەردادێت، هەندێك جار بۆ هەندێك کەس ڕاگەیاندن و ئاشکراکردنی خێرەکە باشترە، هەرکەسێکیش لایەنی چاك و خراپەی بابەتێك هەڵبسەنگێنێت و، شوێن هەواو ئارەزوەکان نەکەوێت، ئەوە باشترەکەیانی بۆ دەردەکەوێت و، دەزانێت کام حاڵەتیان شیاو ترە ئەنجامی دەدات.

# ئەرکی پێنجەم:

## با خێرەکەی بە منەتکردن و ئازاردان پووچەڵ نەکاتەوە

خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿لَا تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالْأَذَى﴾ (٢٦٤/البقرة)

واتە: نەکەن منەت بکەن بەسەر ئەو کەسانەی چاکەیەکتان بەرامبەریان کردووە، یان بیکۆڕێننەوەو ئازاریان بدەن.

وە زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەبارەی منەتکردن و ئەزێتدانەوە:

ڕایەك دەڵێت: (مەن) ئەوەیە بیکۆڕێنێتەوەو باسی بکات، ئەزێتدانیش ئەوەیە ئاشکرای بکات.

سوفیانی سەوری فەرموویەتی: ئەوەی منەت بکات بەسەرچاکەلەگەڵ کراودا، صەدەقەو چاکەکەیشی بەتاڵ دەبێتەوە، وتیان: منەتکردن چۆنە؟

فەرمووی: ئەوەیە کە خێرەکەی باسبکات و بیکۆڕێنێتەوە و ڕای بگەێنێت.

**وە زانایەکی تر دەڵێت:** منەتکردن ئەوەیە بەهۆی ئەو بەخشینەوە بۆ مەرامی خۆی بەکاری بهێنێت. وە ئەزێتدانیش ئەوەیە کە عەیبداری بکات بە هەژاری.

وه زانیایەکی تریش دەفەرموێت: منەت ئەوەیە فیزی بەسەردابکات، خۆی بە گەورەو خاوەن فەزڵ دابنێت بەسەریدا، وە ئەزێتدانیش ئەوەیە کە قسەی رەقی بەرامبەر بکات و سەرزەنشتی بکات، کە ئەو بۆچی سواڵ دەکات[1].

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((لايَقبَلُ اللهُ صَدَقَةَ مَنَّانٍ))[2]،خودای گەورە ئەو خێرە لە کەسێکی منەتکار وەرناگرێت، کە چاکەکەی بڵێتەوە.

**وە بەلای منیشەوە:**

منەت کردن ئەصڵ و بنەماو رەچەڵەکێکی هەیە، لە ئەحواڵی پەیوەنداری دڵەو، یەکێکە لە صیفەتەکانی، لە پاشان چەندین لقوپۆی لێدەبێتەوە، لەو کردارە ئاشکرانەی کە بە زوبان و ئەندامەکانی جەستە دەکرێن، ئەصڵەکەی ئەوەیە خۆی وا ببینێت کە چاکەی بەسەریەوە هەیەو. لە ژێر نیعمەتی ئەودایە، بەڵام راستیەکەی دەبوایە هەژارەکە بە خاوەن فەزڵ بزانێت، کە حەقێکی خودایی وەردەگرێت و قەبووڵی دەکات، کە خودای (عَزَّ وجَلْ) پاکی کردۆتەوە و، لە ئاگر رزگاری کردووە، خۆ ئەگەر ئەو هەژارە زەکات و خێرەکەی لێ وەرنەگرتایە، گیرۆدە دەبوو، لە ژێر ئەو باری ئەمانەتەیە دەرنەدەچوو، کەواتە جێگای خۆیەتی کە بچێتە ژێر منەتی هەژارەکەوە، کە ناو لەپی ئەو بوو بە جێگرەوەی خودای (عَزَّ وجَلْ)، کە وەك خودا لێی وەرگـــرتبێت ئاوا بۆی دەژمێررێت، وەك (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

---

(١) ئەم رایانە ئەبو طالیبی مەککی دەیانگێڕێتەوە بنوارە :قوت القلوب:(٢/ ١٠٧).

(٢)هكذا اورده صاحب القوت وقال العراقي لم اجده هكذا انتهى* قلت ومما يناسب الاستدلال به من الاحاديث الواردة في المنان الذي يمن بعطانه ما أخرجه أحمد في مسنده(٢٠٨١١)، ومسلم(١٠٦)، والأربعة من حديث أبي ذر: **ثلاثة لا يكلمهم الله يوم القيامة ولا ينظر إليهم ولهم عذاب أليم. المُسبِلُ أزارَه . والمنَّان الذي لا يُعطي شيئاً إلا منه. والمنفقُ سِلعَته بالحلف الكاذب.**

((إنَّ الصَّدقَةَ تقَع بيَدِ اللهِ تَعالى قَبلَ أَن تَقع في يَد السَّائِل)) [1]،

(واته پێش ئەوەی چاكەو خێرەكەی بكەوێتە دەستی هەژارەكەوە، دەكەوێتە دەستی ڕەحمەتی خوداوە)

كەواتە دەبێ وابیر بكاتەوە، كە ئەو مافەی لەسەریەتی گێڕاویەتیەوە بۆ خودا، هەژارەكەیش لە خوداوە ڕزقەكەی خۆیی وەرگرتووە، دوای ئەوە لە لایەن خێرۆمەندەكەوە دراوە بە خودا، دەی ئەگەر قەرزاری كابرایەك بێت و ئەویش بەندەكەی یان خزمەتكارەكەی بنێرێت و، قەرزەكەی پێدا بنێرێتەوە بۆ خاوەنەكەی، ئەگەر بڕوای وابێت كە دەتوانێت منەتێك بكات بەسەر ئەو خزمەتكارەدا كە قەرزەكەی پێدا ناردۆتەوە، بەڕاستی ئەو كەسە زۆر بێ سەلیقەو نەفامە، چونكە خاوەن منەتی ڕاستەقینە ئەو كەسەیە كە كەفالەتی ژیان و بژێوی كردووە،(كە خودایە)، ئەگینا خۆی ئەو مافەی كە پێویستە لەسەری بیدات، ئەوە پابەندی لێدەكات و، بەدوای كڕینی ئەو پاداشتەوەیە كە خۆشی دەوێت، كەواتە بە دوای كارو مافی خۆی دا دەگەڕێت، ئیتر هیچ مافێكی نامێنێت منەت بەسەر كەسێكی تردا بكات.

وە هەرچەندێك باشتر ئەم سێ واتایە بزانێت كە باسمانكردن، لە بارەی تێگەیشتنی واتاكانی زەكاتەوە، یان هەرنەبێ لە یەكێكیان حاڵی ببێت، ئیتر هەرگیز نابینێت كە چاكەیەكی لەگەڵ كەسێكی تردا كردووە جگە لە خۆی، یان بە سەرفكردنی ماڵەكەی لە پێناوی دەرخستنی خۆشویستنیدا بۆ خودا، یان بۆ

---

(١)قال العراقي رواه الدارقطني في الافراد من حديث ابن عباس وقال غريب من حديث عكرمة عنه والبيهقي في الشعب بسند ضعيف اهـ واورده صاحب القوت ولفظه: **قبل ان تقع بيد السائل** اهـ ورواه الطبراني في الكبير(١١/٤٠٥)، وأبو نعيم في الحلية(٤/٨١). قال الحافظ العراقي: (لم أجده هكذا) إتحاف( ٤/١١٩)، ولكن روى مسلم (١٠٦) مرفوعا: **ثلاثةٌ لايُكلمهم الله يومَ القِيامة: المنَّان الذي لايُعطي شيئاً إلاَّ مِنَّةً**، ....الحديث.

پاکەوەکرنەوەی نەفسیەتی لەنەخۆشی ڕژدی و بەخیلی، یان بۆ شوکرانەبژێری خودایە، کە ماڵ و سامانی پێ بەخشیوە و بە هیوای زیاتربوونیەتی، بە هەر نیەتێك بێت هیچ ئاڵوگۆڕو بازرگانیەکی تێدا نیە لەگەڵ هەژارەکەدا. تا خۆی وادابنێت کە چاکەیەکی هەیە بەسەریەوە، لە ڕواڵەتی واتای وشەی (مەن) ئەو لق وپۆیەیشی لێبوویەوە، کە منەتی بەسەردا بکات، واتە: خێرەکەی باس بکات، یان ئاشکرای بکات، وە داوای پاداشتی لەسەر بکاتەوە، بە سوپاسگوزاری و نزابۆکردنی و، خزمەت و ڕێزلێنان و بە گەورەدانان و هەستان بە جێبەجێکردنی مافەکانی و، پێشخستنی لە دانیشتنە کاندا و، بەدووکەوتنی کاروبارەکانی، کە ئەمانە هەمووی بەرهەمی ئەو منەتەیە کە بیکات بەسەریدا، واتای شاراوەی منەتیش ئەوەیە کە باسمان کرد.

**بەڵام واتای ئازاردان:**

ڕواڵەتەکەی سەرزەنشت و عەیبدار کردن و، بەکارهێنانی وشەی زبر و ، ڕووگرژکردن و ڕووهەڵماڵینی ئەو هەژارەیە، بەبەکارهێنانی چەندین هونەری سووکسەیرکردن.

**وە واتای ئازاردانی شاراوەیشی کە (ڕیشکوو سەرچاوە کەیەتی) دوو فرمانە:**

## یەکەمیان:

دڵگرانی خۆیەتی کە دەستی چووە بەماڵەکەیدا و، ئەو ئەندازەی لە دەستبووەتەوە کە نەفسی تەوساندۆتەوەو، ڕەوشتی تێکداوە و بێ تاقەتی کردووە.

**دووهەم:** وا ببینێت کە خۆی باشترە لەو هەژارە، وە لەبەر ئەوەی کە هەژارەکە پێویستی بە یارمەتی هەیە، کەواتە پلەی ئەو نزمترە، وە سەرچاوەی هەردووکیان واتە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە: نەزانین و تێنەگەیشتنە:

ئەوەی کە پێی ناخۆشە ماڵەکەی سەرف بکات، ئەوە یەکجار نەفامییە، چونکە ئەگەر کەسێك نارازی بێت کە دیرهەمێك سەرفبکات، لە بەرامبەری

قازانجێکدا کە بگاتە هەزار دینار، مانای وایە زۆر نەفام و تێنەگەیشتووە، وە ئاشکرایە کە ماڵەکەیشی دەبەخشێت بە هیوای وەرگرتنی ڕەزامەندی خودای (عَزَّ وجَل)ە، وە پاداشتی ڕۆژی دوایی دەوێت.

ئەمەش زۆر بەنرخترە لەو ئەندازە کەمەی کە لە دەستی بووەتەوە، یان دەیبەخشێتەوە بۆ پاککردنەوەی نەفسی خۆی، لە ڕەزیلەی ڕژدی و پارەپەرستی، یان شوکری خودا بێت و: داوای زیاتریش بکات، کەواتە بیر لە کامیان بکاتەوە، نابێ هیچ ناڕاستیەك لە دڵیدا جێگیر بکات.

دووهەمەکەیشیان دیسان هەر لە نەزانینەوە سەرچاوەی گرتووە، چونکە ئەگەر بزانێت فەزڵی هەژار چەندێکە بەسەر دەوڵەمەندییەوە، وە بشزانێت کە دەوڵەمەندی چەندێك مەترسی تێدایە، ئەوکاتە بە چاوی سووکایەتیەوە سەیری هەژاری نەدەکرد، بەڵکوو تەبەڕوکی بەو ناوەیش دەکرد و، ئاواتی دەخواست کە ئەو پلەی وەرگرتایە، چونکە پیاو چاکە دەوڵەمەندەکان، پێنج سەدساڵ دوای هەژارەکان دەچنە ناو بەهەشتەوە[1].

هەر لەبەر ئەمەیەکە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((هُم الأَخسَرونَ ورَبِّ الكعبة، فقلت ومن هم؟ قال: الأَكْثرُون أموالاً، إلا من قالَ هكَذا وهكَذا، الحديث))**[2].

(واتە: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە، ئەوانە دۆڕاوو خەسارەتمەندن.

وتم: ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانەن ماڵی زۆریان هەیە و کۆیان کردۆتەوە، مەگەر ئەو کەسە خێرۆمەندانەی بە چەپ و ڕاستدا خێر دەکەن و پارە دەبەخشنەوە.

---

(١) كما روى الترمذي (٢٣٥٤)، وابن ماجه(٤١٢٢).

(٢) أخرجاه البخاري، كتاب الأيمان والنذور، باب كيف كان يمين النبي ﷺ (٦٦٣٨) ومسلم، كتاب الزكاة، باب تغليظ عقوبة من لايؤدي الزكاة(٩٩٠). بنوارە ل ١٤ ی ئەم پەڕاوە.

له پاشان چۆن دەبێت بە کەمی و بێبایەخی سەیری هەژارێك بکات؟ کە خودا ئەمی بۆ داناوە کە خزمەتی بکات، چونکە بە هەوڵی خۆی ماڵ پەیدا دەکات و زۆری دەکات، وە خۆیشی ماندوودەکات تا بیپارێزێت و بۆ پێویستی دایبنێت، کەچی پێویستیش کراوە لەسەر شانی کە بە ئەندازەی پێویست بەشی هەژاری لێبدات، وەئەگەر زیاد لە پێویستیبوو لێی بگرێتەوەو پێی نەدات، کە لەوانەیە بەو زیادەیە ئەگەر پێی بدرێت تووشی زیانی بکات.

کەواتە دەوڵەمەندەکە، بەکارهێنراوە لە پێناوی دابین کردنی بژێوی هەژارەکەدا، وە لەوەشدا لێی جیا دەبێتەوە، کە دەبێ دەوڵەمەندەکە چەندین زوڵم و ستەم و ماندوبوون بخاتە ئەستۆی خۆیەوەو، ناڕەحەتی لەئەستۆی خۆی بگرێت، وە هەمویشی لە پێناوی ماڵی دونیادا، تا ماویشە ببێت بە پاسەوانێکی بێبەرابەر بۆ ئەو زیادە ماڵ و سامانەی کۆی کردۆتەوە و، کە مردیش دوژمنەکانی دەیخۆن.

کەواتە؛ هەرچەندێك ناسۆری ژیانی لێ دوور بخاتەوەو، بیگۆڕێتەوە بە شادی، وە فەرەحناك بێت بەوەی کە خودا ڕێنومایی کردووە و یارمەتی داوە کە واجبەکەی بە جێ بگەیێنێت و، هەژارێکیشی بۆ تەرخان کردووە، کە ئەو مافەی لەسەریەتی بە هۆی ئەوەوە لەسەری لابچێت و لێی وەربگرێت، ئەگەر بەم شێوە بیر بکاتەوە، ئەوا نە ئازاری هەژارەکە دەدات و، نە سەرزەنشتی دەکات و، نە ناوچەوانیشی لێ گرژدەکات.

بەڵکوو ئەو حاڵەتانەی بۆ دەگۆڕێت بە گەشانەوەی ڕوخسار و ، ستایشکردنی هەژارەکەو، منەتباری بۆی، کە بووەتە هۆکاری بە جێ گەیاندنی ئەو واجبەی کە لەسەر شانیەتی، ئەمەی باسمان کرد؛ سەرەتاو سەرچاوەی ئەو منەتکاری و ئازار دانەیە کە هەژار ڕووبەڕووی دەبێتەوە لە دەوڵەمەندەوە.

**ئەگەر بلێیت:**

ئەو کەسەی کە خۆی وەك پیاوچاکێك ببینێت، ئەوە فرمانێکی شاراوەو

نادیارە، ئایا نیشانەیەك هەیە كە دڵی خۆی پێ تاقیبكاتەوە، كە بزانێت خۆی بە پیاو باش دانەناوە؟

**كەواتە بزانە:**

كە نیشانەیەكی وردی ڕوون و ئاشكرای هەیە، با وا دابنێت كە ئەگەر هەژارەكە دەستدرێژییەكی كردە سەری ، یان پشتیوانی نەیارێكی ئەمی كرد، ئایا ڕق لێبوون و نارازی بوونی لێی، وە دوورخستنەوەی لە خۆی زیاتر دەبێت لەو كاتەی كە هێشتا خێرەكەی پێینەكردووە؟ ئەگەر زیاد بوو، كەواتە صەدەقەكەی پارێزراوو خاڵی نەبووە لە بۆن و بەرامی منەت و كۆراندنەوە، چونكە بەهۆی ئەو چاكە و خێرەی پێی كردووە چاوەنواڕی زیاتری لێدەكات، نەك ڕووبەڕووی ببێتەوە.

*****     *****  ******

ئەگەر وتت: ئەمەیش نادیارە، چۆن بیزانم؟ خۆ دڵی هەموو كەسێك ئەو حاڵەتەی تێدایە؟ دەرمانەكەی چییە؟

**ئەوە بزانە: دەرمانێكی شاراوەو دەرمانێكی ئاشكرایشی هەیە:**

**شاراوەكە ئەوەیە:** شارەزابوونی بەو ڕاستیانەی خستمانە ڕوو، كە چۆن لە واجبەكانی سەرشانی حاڵی ببێت، وە بزانێت كە هەژارەكە خاوەنی دەستی چاكەیە بەسەر دەوڵەمەندەكەدا، كە بووەتە هۆكاری پاكبوونەوەی دڵ و ماڵەكەی.

**دەرمانە ئاشكراكەیشی** :

ئەو كردارانەی كە ڕووبەڕووی دەبێتەوە و ئەنجامیان دەدات، كە منەتیان لەسەر دەكات، ئەگەر هەڵقوڵاوی ڕەوشتێكی چاكبن، ئەوا دڵیشیان هەمان ڕەنگ و بۆ وەردەگرێت، وەك لە مەودوا لە باسی نهێنیەكاندا لە نیوەی كۆتایی ئەم پەڕاوەدا پشت بە خودا باسی دێت.

(كەواتە چەندێك چاكەكەی بە نەرمی و سۆز و لەسەرخۆیی و گەردن

کەچی وە بکات، ئەوەندە زیاتر سارێژی برین و نەخۆشیەکانی دەکات).

بۆیە هەندێك لە پارەدارە خواناسەکان، صەدەقەکەیان دەخستە بەردەستی هەژارەکەوەو، لە بەردەمیشیدا (دەستەو نەزەر)بە پێوە ڕادەوەستان، بەو هیوایەی کە لێی وەربگرێت، وەك ئەوەی کە خۆی بخاتە ڕیزی سواڵکەرێکەوە و، داوای وەرگرتنی لێبکات، وە زۆریشی پێ ناخۆش بێت، کە ئەگەر هەژارەکە دەستبنێت بەڕوویەوەو لێی وەر نەگرێت.

وە هەندێکی تریان دەستیان درێژ دەکرد بەرە و ڕووی هەژارەکە، وەك ئەوەی کە ئەوان داوای لێبەکەن، بۆ ئەوەی دەستی هەژارەکە بەرزتر بێت[1].

هەر بەم شێوەیە (حەزرەتی) عائیشەو (أم سلمة) (خودایان لێ ڕازی بێت) ئەگە خێرێکیان بناردایە بۆ هەژارێك، دەیان فەرموو بە نوێنەرەکەیان:

گوێ بگرن چ دوعایەکی کرد لەبەری کەن، کە دەیان گێڕایەوە ئەمانیش بە هەمان شێوە نزایان بۆ هەژارەکە دەکرد، تا دوعاکە لە بەرامبەر دوعاکەیان بووەستێەوەو چاکە کەیشیان بە پوختی بۆ بمێنێتەوە، [2].

ئەوان چاوەنواڕی نزایان نەدەکرد، چونکە وەك ئەوە وایە کە پاداشتیان بداتەوە، بەڵام ئەگەر نزای خێریان بۆ بکرایە، لە بەرامبەردا ئەمانیش نزاکەیان بۆ دەکردنەوە، هەر بەم شێوەیەش(حەزرەتی)عومەری کوڕی خەطاب و عەبدوڵلای کوڕی دەجوڵانەوە (خودایان لێ ڕازی بێت)[3].

بەم شێوە خاوەن دڵە زیندووەکان دەرمانی دڵەکانی خۆیان دەکرد، کە بە زاهیر هیچ دەوایەك نیە، بە ئەندازەی ئەم خۆشکاندنەوە و ملکەچ بوون و منەتبەرداریە کاریگەری باشەی لە سەریان هەبێت، وە لە ڕووی باطینیشەوە

---

(١) بنوارە قوت القلوب (١٠٩/٢).

(٢) هەمان سەرچاوە(١٠٩/٢).

(٣) هەمان سەرچاوە( ١٠٩/٢).

بەکارهێنانی ئەو زانیاریانەی باسمان کردن، دەبێتە سارێژکەری برینەکانی، ئەویان لە ڕووی کردارەوە و، ئەمیشیان لە ڕووی زانستەوە، تیماری دڵیش تەنها بە گیراوەو مەرهەمێك دەکرێت کە تێکەڵ کرابێت لە زانست و کردار.

ئەم مەرجانەی کە پێویستە لە زەکاتداندا ڕەچاو بکرێن، وەك خشووع و گەردن کەچی ناو نوێژ وایە، ئەمەش بە فەرموودەی (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ جێگیربووە: ((ليسِ للمَرءِ مِن صَلاتِهِ إلاَّ مَاعقَل منها))[1].

هیچ دەسکەوتێکی نابێت لە نوێژەکەیدا مەگەر ئەوەندەی کە لێی تێگەیشتبێت، واتە: ئەوەندەی دەسکەوتی ڕاستەقینەی هەبێت لە نوێژدا، ئەو ئەندازەیە کە لێی تێ دەگەیشتووە، لە نهێنیەکانی نوێژ کردن حاڵی بووە..

وە هەروەها سەلماوە کە فەرموویەتی ﷺ

((لاَ يَتَقَبَّلُ اللهُ صَدَقَةَ مَنَّانٍ))[2] خودا خێرو چاکەی منەتکار وەرناگرێت.

وە ئەم فەرموودەی خودای گەورەش ئەم واتایە پشت ڕاست دەکاتەوە کە فەرموویەتی: ﴿لَا تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالْأَذَى﴾(٢٦٤/البقرة)

واتە: نابێ منەت بکەن بەسەر ئەو کەسانەی چاکەیەکتان بەرامبەریان کردووە، یان بیکۆرێننەوە و ئازاریان بدەن.

بەڵام فەتوای(فەقیە) بۆ ئەوەی کە بە پێی زاهیری شەرع زەکاتەکە بدات جێگەی خۆی دەگرێت و بەرائەتی زیممەی بۆ دەکرێت، وە دووردەبێت لە لێپرسینەوە، ئەوە بابەتێکی ترەو لە پەڕاوی نوێژ دا هێمامان بۆ کردووە.

---

(١) في الحلية(٦١/٦)، عن سفيان الثوري قال: **يكتب للرجل من صلاته ما عقل منها**، وعند أبو داود (٧٩٦)مرفوعاً( **إن الرجل لينصرفُ وما كُتب لهُ إلا عشر صلاته، تسعها ثمنها، سبعها، سدسها، خمسها** ربعها، ثلثها، نصفها. **فكما أن الخشوع فرض في الصلاة لابدمنه، فكذلك الإخلاص في الزكاة.**

(٢) ئەم فەرموودەو وێنەکانی لە سەرەتای ئەم پەڕاوەدا تەخریجی کراوە بنوارە: ل/٦٤

## ئەركی شەشەم:دەبێ ئەوەی دەیبەخشێت بەكەم بێتە بەرچاوی:

چونكە ئەگەر بە گەورەی بزانێت، تووشی سەرسوڕمانی دەكات، وە ئەم سەرسوڕمانەش بە هیلاكی دەبات، وە كردەوەكانیشی پوچەڵ دەكاتەوە، وەك قورئان فەرموویەتی: ﴿وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنْكُمْ شَيْئً﴾ (٢٤/التوبة) ( لە ڕۆژی جەنگی حونەیندا كە لە خۆتان بایی بوون و بەزۆری خۆتاندا دەتاننازی، بەڵام فریاتان نەكەوت و هیچ سوودێكی پێینەگەیاندن) [١].

وە پێشتر وتوویانە: هەرچەندێك موسوڵمان عیبادەتكردنەكەی بەكەم بێتە بەرچاوی، ئەوە لای خودا بە گەورە دەنوسرێت، وە هەرچەندێكیش گوناهبار گوناهەكەی بە گەورە بزانێت، ئەوەندە لای خودا بچووكتر دەبێتەوە) [٢].

هەروەها وتوویانە: **هیچ چاكەیەك تەواو نابێت مەگەر بە سێ شت نەبێ:** بەكەم سەیركردنی چاكەكەی، كە پێی سەرسام نەبێت، وە بە خێرایی ئەنجامی بدات و بیگەێنێتە دەستی هەژارەكان، وە لەبەرچاوی هەموانیش بیشارێتەوە) [٣].

بەگەورە زانینی كارەكەی بەوە نیە، كە منەتبكات بەسەر چاكە لەگەڵ كراوەكەدا یان ئازاری بدات، چونكە ئەگەر كەسێك ماڵەكەی سەرف بكات و مزگەوتێكی پێ دروست بكات، نوێژی تێدابكرێت، یان ڕباط و خانەقایەك كە ئەهلی عیبادەتی تیا بمێنێتەوە، لەوانەیە كارێكی وەها جۆرە هەستكردنێكی بە

---

(١) خۆلاصەی تەفسیری نامی، ( ١٩٠). تەفسیری زۆربەی ئایەتەكەن لەم سەرچاوە یە سوود وەرگیراوە. زانە: موسوڵمانەكان وتیان بەهۆی زۆریمانەوە ئیتر ناشكێین، ئەوەبوو شكان و لە پاشان خودا یارمەتی بۆ ناردن و سەری خستنەوە، الإتحاف( ١٢٣/٢).

(٢) قوت القلوب( ١١١/٢)

(٣) هەمان سەرچاوە( ١١١/٢).

گەورەیی بۆ دروست بکات، وە فوو بکاتە خۆی کە کارێکی مەزنی کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا منەتکاری تێدا نیەو،ئازاری بۆ کەس دروست ناکات، بەڵکوو سەرسوڕمان و بە گەورەزانین لەهەموو بەندایەتیەکی تریشدا دەگونجێت کە ڕوودات، وە دەرمانەکەیشی وەك دیاریمان کرد : زانین و کردارو عەمەلە:

زانین ئەوەیە: بەو زانستە دەزانێت کە دەیەکی سامان و ماڵەکەی، یان چل یەکی ماڵی ببەخشێت، بەشێکی کەمە لە زۆرێك کە لای خۆی ماوەتەوە، ئەوەتانێ خۆی پێ خڵەتاندووە، کە کەمترین بەشی ماڵەکەی سەرف بکات، وەك لە واتای پێویستی و وجوب ڕوونمانکردەوە، کەواتە دەبێت شەرم بکات لە خۆی، ئیتر ئەوکارە کەمە چۆن دەبێت بە کارێکی گەورەی بناسێنێت؟!

تەنانەت ئەگەر بەخشینەکەیشی بگاتە بەرزترین ئاستی خێرکردن، وە هەموو داهات و سامانەکەیشی خەرجکرد، یان زۆربەی، با ئەو کاتەیش بیر بکاتەوە کە سەرچاوەی ئەو ماڵەکەیشی لە کوێ بووە؟وە بۆ چی سەرفی دەکات؟ ماڵەکەی موڵکی خودای(عَزَّ وجَلْ)ە، وەمنەتی خودای لەسەرە کە پێیبەخشیوە، وە ڕێنمایی کردووەو، یارمەتیشی داوە کە بەخشندە بێت، ئیتر چی بەگەورە بزانێت و بەچی سەرسوڕمانی خۆی دەربخات، کە ئەوەی کردوویەتی هەمووی موڵکی خودایەو، مافی خودایە و، تەنها ئەم هۆکارێك بووە بۆ ئەو بەخشینەی.

ئەگەر خاوەن پلەیەکی ئیمانی وایش بوو، کە چاوەنواڕی پاداشتی خودایی دەکرد، لەو بەخشینەی کە ئەنجامی داوە، کەواتە بۆچی کارێکی وەها بە گەورە بزانێت، کە لە ڕاستیدا چاوەنواڕی پاداشتی زۆر لەوە زیاترە لە خوا ؟!

لەڕووی کاریشەوە: دەبێ ئەو کەمە بەخشینەی کە بە کردار دەیبەخشێت بە هەژارەکە، دەبێبەوپەڕی خەجاڵەتیەوە پێی بدات، کە چەندە پارە ویستەو زۆربەی ماڵەکەی لای خۆی هێڵاوەتەوە و، نەیتوانیوە لە ڕێی خوادا سەرفی بکات، بەو شێوەیەی کە وێنە و شکڵی بە ئەو پەڕی شەرم و شکاندنەوە وە، وەك دیمەنی کەسێك بێت، کە داوای لێبەکەن ئادەی ئەو ئەمانەتەی لاتە

بیگێڕەرەوە، ئەویش هەندێکی بداتەوەو، ئەوی تریشی گلبداتەوە، چونکە لە بنەڕەتدا ماڵەکە هەمووی هی خودایە، وە بەخشینی هەمووی لای خودا جێگای ڕەزامەندییە، بۆیە فەرمانی ئەوەی پێنەداوە کە هەمووی ببەخشێت، بەهۆی ئەوەی کە لەبەر ڕژدی و بەخیلی گران دەکەوێت لەسەری، وەك خودا فەرموویەتی: ﴿إِنْ يَسْأَلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا وَيُخْرِجْ أَضْغَانَكُمْ﴾ (محمد/٣٧)

ئەگەر خودا داوای پارەو داراییەکانتان لێبکات، وەسوور بێت لەسەر داواکەی و دەسبەردارتان نەبێت، ئێوە ڕژدی پیشان دەدەن و، خودایش پیسکەیی و پووڵەکییەکەتان دەردەخات، هەموو خەڵکیش پێتان دەزانێت.(١).

## ئەرك و وەزیفەی حەوتەم:

دەبێباشترین و پاك و نایاب و بەنرخترین و بۆنخۆشترین و خۆشەویسترینی ماڵەکەی هەڵبژێرێت و ببەخشێت:

چونکە خودا خۆی پاکە و بێ کەموکوڕییە و، تەنها شتی پاك وخاوێنیش لە بەندەکانی وەردەگرێت.(( فإنَّ اللهَ تعالى طيبٌ لايَقبَلُ إلاَّ طَيباً))[٢]، وە ئەگەر ئەو ماڵەی زەکاتەکەی لێدەدات ماڵێکی پاك نەبوو، بەڵکوو شوبهەو گومانی حەرام بوونی تێکەڵ بوو، ئەوە لە ڕووی شەرعەوە بە ڕەهایی نابێتە موڵکی شەرعی بۆی، وە جێگەی خۆی ناگرێت، لە خێرو بێری تایبەتیدا .

وە لەو فەرموودەی کە ئەبان ڕیوایەتی کردووە لە (حەزرەتی) ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (خودای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

---

(١) خولاصه ١ /٥١٠.

(٢) كما في مسلم (١١١٥) وأخرجه الترمذي في باب النظافة (٢٧٩٩) من حديث سعد، بلفظ: **إن الله طيب يحب الطيب**، وفي صحيح البخاري (١٤١٠) في أثناء حديث أبي هريرة الآتي ذكره:**من تصدق بعدل تمرة من كسب طيب، ولايقبل الله إلا الطيب** .واتای (طەیب) واتە مونەززەهی، پاکە لە هەموو کەموکوڕییەك، پارێزراوە لە ئافەت وکەمی و هەموو عەیبێك.

((طُوبَى لِعَبدٍ أَنفَق مِن مَالٍ اكتَسبهُ مِن غَير مَعصِيةٍ))[1]

خۆشبەختی بۆ ئەو بەندەی لەماڵێك سەرفدەكات، كە بەبێ ئەوەی تووشی گوناه بووبێت لەسەری پەیدای كردبێت، دەی ئەگەر لە جۆرە باشەكەی ماڵەكەی سەرف نەكات، ئەوە نیشانەی كەمتەرخەم بوونیەتی، كە جۆری ماڵە باشەكەی بۆ خۆی یان منداڵ و خێزانەكەی دابنێت، كەواتە غەیری خودای پێش خستووە بەسەرخودای (عَزَّ وجَلْ) دا، خۆ ئەگەر بەم شێوە پێشوازی لە میوانەكەی بكات و، خۆراكە كۆن و خراپەكەی بۆ دابنێت، ئەگەر پێی بزانێت دڵی پڕ دەبێت لە ڕق و كینە ، كە بەو شێوە هەڵس و كەوتی لە گەڵدا كردووە.

ئەمەش لە كاتێدایە كە لەبەر خودا خێرەكەی كردبێت و، مەرامی تری نەبووبێت، بەڵام ئەگەر سەرنج و مەرامی بۆخۆی و ژیانی دوارۆژی هەبێت، ئەوە هەر لەسەرەتاوە بە داناو فامیدە ناژمێررێت ، كەسێك یەكێكی تر پێش بخات بەسەر خۆیدا، كە بۆیشی دەركەوتووە ماڵی ڕاستەقینەی ئەو ئەوەیە كە پێشتر لە ڕێی خوادا سەرفی كردووە و پێشی كەوتووە، ماڵێك كە خواردوویەتی ئەوا فەوتاوە و لە كیسی چووە، [2]،

ئەوەی ئێستا دەیخوات، تەنها بەجێ گەیاندنی پێویستییەكی كاتی دونیاییە، ئەوە نابێتە ژیری كە ئەوەندە كورت بین بێت سوودێكی كەمی خێرا

---

(١) رواه الطبراني في الكبير(٥/٧١، وأبو نعيم في الحلية(٣/٢٠٢)، والبيهقي في السنن الكبرى، ٤/١٨٢)، من حديث طويل. ومن طريق أبان عن أنس رواه ابن عساكر في (تاريخ دمشق) ٥٤/٢٤٠) واللفظ له. وأخرجه الترمذي في باب النظافة (٢٧٩٩) من حديث سعد، بلفظ: **إن الله طيب يحب الطيب**، وفي صحيح البخاري (١٤١٠) في أثناء حديث أبي هريرة الآتي ذكره، **من تصدق بعدل تمرة من كسب طيب، ولايقبل الله إلا الطيب**.

(٢) وەك موسلیم ڕیوایەتی كردووە: فەرموودەی(٢٩٥٨)، كە تێیدا هاتووە: (**وهَل لكَ يا ابن آدم مِن مالك إلا ما أكلت فأفنيت، أو لبست فأبليت، أو تصدقت فأمضيت**، (أبقيت).

بەرچاوی بگرێت و سوودی بەردەوامی دوارۆژ لە بیر بکات.خودای گەورەیش فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَلَا تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إِلَّا أَنْ تُغْمِضُوا فِيهِ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ (٢٦٧/البقرة)

(واتە: ئەی ئیمانداران، لەو شتە جوان و بەهادارانەی لە کەسابەتدا دەستتان دەکەوێت، یان لەوەی ئێمە لە زەوی بۆمان دەرهێناون خێر بکەن و لە رێی خوادا دەسگیرۆیی هەژارەکان بکەن، نەك لە ماڵە ناشیرین و بێ کەڵکەکانتان کە خۆشتان لە بەرامبەردا پێتان بدرێت وەری ناگرن، مەگەر بە چاوپۆشی و لەبەر هەندێك هۆ وەری بگرن، بزانن خودا دەوڵەمەندەو پێویستی بە ماڵ و دارایی ئێوە نیە، چاکتر وایە بۆ خۆتان کە لە شتە باشەکانتان بدەن بە موستەحەقەکان، با نەدرێتەوە بەسەرتاندا[1]،

کەواتە ماڵە خراپەکان وەرناگرن بۆ خۆتان مەگەر بە ناچاری و شەرم بکەن و چاوی لە ئاستیدا بنوقێنن، کەواتە ئەو ماڵە پێشکەشی خودا مەکەن کە خۆتان پێی قایل نابن[2]،

---

(١) بنوارە بۆ خۆلاصە ٤٥.

(٢)واخرج الترمذي(٢٩ ٨٧)، والحاكم وصححاه وابن ماجه(١٨٢٢)، واللفظ له عن البراء وابن جرير وابن ابي حاتم وابن المنذر وابن مردويه عن البراء بن عازب قال: نزلت هذه الآية فينا معشر الانصار، ثم ساقوا الحديث وفيه قال: **لو انَّ أحدكم أُهدي اليه مثل ما أعطى، لم يأخذ إلا على إغماض وحياء، قال فكنا بعد ذلك يأتي أحدنا بصالح ما عنده**، واخرج ابن جرير عن عبيدة السلماني عن علي رضي الله عنه في قوله: **ولستم بآخذيه إلا أن تغمضوا فيه . يقول : ولا يأخذ أحدكم هذا الردئ حتى يهضم له** واخرج ابن جرير وابن ابى حاتم وابن المنذر من طريق ابن عباس عن علي في قوله: **ولستم بآخذيه** قال: **لو كان لكم على أحَدٍ حق فجاءكم بحق دون حقكم لم تأخذوه بحساب الجيّد حتى تنقصوه. فذلك قوله**

له هه‌واڵ و فه‌رمووده‌دا هاتووه‌: ((سَبَقَ دِرهَمٌ أَلفَ دِرهَم))[1]،

واته‌: دیرهه‌مێك كه‌ له‌ باشترین و پاك و حه‌لاڵترینی ماڵه‌كه‌ی بێت و به‌ ئیخلاصه‌وه‌ سه‌رفی بكات، پێش هه‌زار دیرهه‌م كه‌وتووه‌، كه‌ به‌ شادی و ڕه‌زامه‌ندییه‌وه‌ سه‌رفی كردووه‌.

به‌ڵام ڕیده‌كه‌یت صه‌د هه‌زار دیرهه‌م به‌ نابه‌دڵی ده‌ر ده‌كات له‌ ماڵه‌كه‌ی ، یان خه‌فه‌تی لێده‌خوات، كه‌واته‌ ئه‌وه‌ی بۆ خۆی پێی خۆشه‌ له‌ دڵه‌وه‌، هێشتا نه‌یتوانیوه‌ وه‌ك ئه‌وه‌ بۆ خودایش پێی خۆش بێت، بۆیه‌ خودای گه‌وره‌ ناوی ئه‌و تاقمه‌ی به‌خراپ بردووه‌، كه‌ ئه‌وه‌ی بۆ خۆیان پێی ڕازی نین، پێشكه‌شی به‌ خودا ده‌كه‌ن، یان ئه‌وه‌ی بۆ خۆیان پێیان ناخۆشه‌ كه‌ بوونی كچه‌ ده‌یده‌نه‌ پاڵی خودا (په‌نا به‌خودا) به‌نیسبه‌ت بێباوه‌ڕه‌كانه‌وه‌،

وه‌ك قورئان فه‌رموویه‌تی:

﴿وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ الْكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ الْحُسْنَى لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ النَّارَ وَأَنَّهُمْ مُفْرَطُونَ﴾ (النحل/٦٢)

(هه‌ندێك له‌ قورئان زانه‌كان له‌سه‌ر وشه‌ی (لا) وه‌ستاون، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی به‌ درۆیان بخاته‌وه‌، له‌ پاشان ده‌ست پێده‌كاته‌وه‌ و ده‌فه‌رموێت:

---

**إلا ان تغمضوا فيه، فكيف ترضَون لي ما لا ترضونه لانفسكم .وخفي عليكم من أطيب أموالكم وأنفَسها وهو قوله تعالى: لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون .**

(١) قال العراقي رواه النسائي (٥٩/٥) وتمامه: قالوا وكيف؟ قال: **كان لرجل درهمان تصدق بأحدهما، وانطلق رجل إلى عرض ماله، فأخذ منه مئة ألف درهم، فتصدق بها**) وابن حبان والحاكم وصححه من حديث ابي هريرة اهـ ، قال الزبيدي انظر الإتحاف ١٢٧/٤.: واخرج ابن المنذر عن ابى هريرة قال: **الدرهم الطيب أحب إلى الله من مائة الف، وقرأ ،يا ايها الذين امنوا انفقوا من طيبات ما كسبتم** الايه، وورد تلك الرواية في الدرر المنثور: (٦٢/٢)أيضا.

واتە: ئەوەی کە ئەنجامیان دا، کە خراپەکانیان بۆ خودا داناوە کە بۆ خۆیان پێی ڕازی نەبوون، ئەم کارە دێزو ناشیرینەیان ڕووبەڕووی ئاگری کردنەوە و خرانە ناویەوە.

# ئەرکی هەشتەم:

دەبێ لە زەکات و صەدەقەکەیدا بەدوای کەسانێکی وادا بگەڕێت کە خێرەکەی بۆ زیاد ببێت و بنوسرێت.

بەوە واز نەهێنێت کە زەکاتەکەی بدات بە کەسانێك کە لە هەشت صینفەکەن، چونکە لە هەر یەکەیاندا تایبەتمەندی تریان هەیە، کە بە دوایاندا بگەڕێت،دەبێت چاودێری ئەو تایبەتمەندیانە بکات کە شەش بەشە:

## صیفەتی یەکەم:

با بەدوای ئەوانەدا بگەڕێت کە تەقواکارن و، پشتیان لە دونیا کردووە، کە خۆیان یەکلایی کردۆتەوە بۆ بازرگانی دوارۆژ،[1]،

وەك (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((لا تأكُل إلاَّ طعامَ تَقيٍّ، ولا يأكُل طَعامَك إلاَّ تَقي))**[1]،

---

(١)أخرجه ابو نعيم في الحلية من طريق ابي قلابة عن عبد الله بن عمر قال مرَّ عمر بن الخطاب بمعاذ وهو يبكي، فقال سمعت رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: **احبُّ العباد إلى الله الأتقياء الأخفياء، الذين إذا غابوا لم يُفتقدوا واذا شهدوا لم يُعرفوا أولئك أئمة الهُدى ومصابيح الظُّلَم**) واتە خۆشەویست ترین بەندە لای خودا ئەوانەن کە تەقواکارن و شاراوەن لەبەرچاوی خەڵکی دیار نین، ئەگەر دیار نەبن کەس هەواڵیان ناپرسێت و بەدوایاندا ناگەڕێن، وە ئەگەر ئامادەش بوون لە کۆڕو دانیشتنەکاندا کەس نایان ناسێت، ئەوانە پێشەوای ڕێ پیشاندەری ئەو خەڵکەن و چرای ڕۆشنی ناو تاریکستانەکانن.

نان وخۆراکی کەسێك مەخۆ تەقواکار نەبێت، وە ڕێگە مەدە کەسێك نانت بخوات خۆپارێزو تەقواکار نەبێت، چونکە پیاوی خوداناس ئەگەر بژێوی بۆ دابین بکەیت، یارمەتیشی دەدات بۆ کاری تەقواو خوداپەرستییەکەی، تۆیش دەبیتە هاوبەشی خێرەکەی، کە یارمەتی ئەوت داوە.

هەروەها (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

با تەقواکاران بەشداری خوانەکانتان بن و خۆاردنیان پێ بدەن، وە کردارە خێردارو چاکەکانیشتان بڕوادارەکان بگرێتەوە و بایەخی زیاتریان پێ بدەن.

**((أطعِموا طَعامَكُمُ الأتقياءَ، وأولُوا مَعروفَكُمُ المؤمِنين))**[2].

وە لە خەبەرو هەواڵێکی تردا هاتووە: ئەوانەی خۆشت دەوێن، لە بەر خودا بیانخەرە سەر سفرە و خوانەکەت، یان بەشیان بۆ بنێرە.

**((أضِفْ بِطَعامِكَ مَنْ تُحِبُّهُ في الله تعالى))**[3].

---

(١)قال العراقي رواه أبو داود والترمذي من حديث أبي سعيد بلفظ : لا تصحب إلا مُؤمنا ولا يأكل طعامك إلاَّ تقي، قال الزبيدى١٢٨/٤-١٢٩ وكذلك رواه ابن المبارك في الزهد، ١٢٤/١(٣٦٤)، أحمدفي مسنده(١٠٩٤٤)، والدرامي(٢٠٥٧)،وأبو يعلي في مسنده (٤٨٤/٢ (١٣١٥)، وابن حبان في صحيحه(٣١٤/٢/٥٥٤)، والحاكم في المستدرك (١٤٣/٤(٧١٦٩)، والبيهقي (في شعب الإيمان(٤٢/٧(٩٣٨٢). والضياء، وقال الترمذي حسنٌ. وفي الرياض إسناده لا باس به، وقال الحاكم صحيح، وأقرَّهُ الذهبي إلا أنَّ لفظهم: لا تُصاحب، فالجملة الأخيرة من الحديث هي الموافقة لحديث أبي سعيد.

(٢)قال العراقي رواه ابن المبارك في البر والصلة، في الزهد(٢٤/١(٧٣)، من حديث أبي سعيد الخدري قال ابن طاهر كما في فيض القدير للمناوي (٥٣٨/١)، غريب وفيه مجهول اهـ قال الزبيدي:١٢٩/٤: رواه كذلك ابن ابي الدنيا في كتاب الأخوان ص(٢٣١)(١٩٦)، وابو يعلي في مسنده(٢٥٧)(١١٠٦)، والديلمي في مسند الفردوس(١٣١/٤(٦٤٠٥)،

(٣)) قال العراقي رواه ابن المبارك في الزهد(١٢٤/١(٣٦٦) اخبرنا جويبر عن الضحاك مرسلا اهـ وفي بعض نسخ الكتاب وفي لفظ آخر بدل قوله وفي خبر آخر وهكذا هو نص القوت.

وه هەندێك لە زانایان خێرەكانیان دەدایە هەژارەكانی ئەهلی تەصەوف، پێیان وت: ئەگەر چاكەكەت گشتگیر بوایەو، هەموو هەژارەكان لێی سوودمەند ببونایە، ئایا ئەوە باشتربوو؟ فەرمووی: نەخێر، ئەوانە كۆمەڵێكن تەنها خەفەت و مەراقیان گەیشتنە بە خودا، ئەگەر نەداری و پێویستی و برسێتی ڕوویان تێبكات، ئەوا بیروو خەیاڵیشیان پەرەوازە دەبێت، ئەگەر بیری یەكێكیان كۆ بكەمەوە بۆ لای خودا، پێم باشترە لەوەی بەهەزار كەسی تر ببەخشم كە تەنها ڕوویان لە دونیا كردووە، ئەم فەرموودەیان گێڕایەوە بۆ (حەزرەتی) جونەیدی بەغدادی پەسەندی كرد، وە فەرمووی: ئەوە یەكێكە لە دۆستەكانی خودا، بەڕاستی ماوەیەكی زۆرە لەم قسە جوانترم نەبیستووە.

دەگێڕنەوە كە ئەم پیاوە گوزەرانی ڕووی لەكەمی كردو تێكچوو، ویستی واز لە دوكان و حانووتەكەی بهێنێت، (حەزرەتی) جونەید پارەی بۆ نارد و فەرمووی: بیكە بە كاڵاو بیكە بە سەرمایەت و ، حانوتەكەت بە جێ مەهێڵە، چونكە پیاوی وەكو تۆ بازرگانی زیانی لێ نادات، چونكە حاڵی ئەم پیاوە وابوو كە نرخ و پارەی لە هەژارەكان وەرنەدەگرت[1]،

## صیفەتی دووهەم:

دەبێت ئەو كەسەی خێری پێدەكەیت لە وانە بێت بە دوای زانستدا دەگەڕێن: چونكە ئەو مەسرەف كێشانە یارمەتی دەدات و دەتوانێت خوێندنە كەی پێ تەواو بكات، زانستیش لە هەموو عیبادەتەكان خێری زیاترە، مادام نیەتی باش و پەسەندی لەگەڵدا بێت

عەبدوڵلای كوڕی موبارەك(خودای لێ ڕازی بێت) بەخشینەكانی تایبەتمەند دەكرد بە وكەسانەی بە زانستەوە خەریكن،وتیان بۆچی وادەكەیت؟ فەرمووی:

---

(١) قوت القلوب ١١٣/٢.

من نازانم له دوای مقامی پێغەمبەرێتی، هیچ پلەیەك گەورەتر بێت لە مقامی زانایان، ئەگەر دڵی یەکێك لەو زانایانە سەرقاڵی کاروباری بژێوی ڕۆژانەی ببێت، ئەوا ناتوانێ بۆ وەدەسهێنانی زانستەکان خۆی تەرخان بکات، وە ڕووبکاتە خوێندنی تەواو،کەواتە پێویستییەکانی بۆ بەجێبە جێ بکرێت لە هەموو خێرێك گەورەترە.

## صیفەتی سێیەم:

**دەبێت ڕاستگۆ بێت لە تەقوادا و زانا بێت بە یەکتایی خودا:**

زانابوونی بە تەوحیدو یەکتاپەرستی ئەوەیە: کە بەخششەکەی وەرگرت حەمدوسەناو شوکرانەی خودای (عَزَّ وجَلْ) ی لەسەربکات، وە ئەم نیعمەتە لەوی بناسێت، سەیری هۆکارەکەی نەکات، ئەمە لە هەموان زیاتر توانیویەتی شوکرانەی خودا بکات، چونکە نیعمەتەکان هەمووی لە خاوەنی ڕاستەقینە دەبینێت، وەك لە وەصێتی (حەزرەتی) لوقماندا هاتووە بۆ کوڕەکەی:

لە نێوانی خۆت و خالیقەکەتدا کەس بە بەخشندە و خاوەن نیعمەتی خۆت دامەنێ ، وە نیعمەتی غەیری خودا بە قەرزار باری بزانە[1]

ئەوەیش کە سوپاسگوزاری کەسێکی تر بێت بێجگە لە خودا، وەك ئەوەیە کە خاوەن نیعمەتی ڕاستەقینەی نەناسیبێت، وە هێشتا دڵنیا نەبێت کە هۆکاری گەیاندنی ئەو نیعمەتە ناچارە و، لە ژێر فەرمان و دەسەڵاتی خوادایە، خودای گەورە وا ناچاری کردووە کە ئەو کارە ئەنجام بدات و، ئەگەر بیویستایە ئەو خێرە نەکات، وازی لێدەهێناو یارمەتی نەدەدا، بەڵام خودا خستوویەتیە دڵیەوە کە ئەم خێرو چاکەیە قازانجی دین و دونیاو پاشەڕۆژی پێوە بەستراوە، هەتا زیاتر هۆکاری خێرکردنەکە بەهێزتر بێت، زیاتر ئیرادەی بەهێز دەکات، وە توانای وەگەڕدەخات، وە بەندەیش ناتوانێت ڕووبەڕووی ئەو

---

(١) رواه أحمد في الزهد (٢٢٣٩)، والدينوري (في المجالسة وجواهر العلم).

هێزو تەوژمە بە تینە ببێتەوە کە خودا لە ناخیدا دروستی کردووە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە خێرانە، کە هیچ گومانێکی بەرامبەری نامێنێت، وە هەر خودایشە کە سەرچاوەی ئەو تەوژم و هاندانەیە، وە گیانی بەرەو چاکە دەورووژێنێت، وە لاوازی و گومانەکانی دەڕەوێنێتەوە، وە توانای پێدەبەخشێت کە بە پێی ئەو ناخە شاراوەی کارەکان ئەنجام بدات، هەرکەسێك ئەم دڵنیاییەی بۆ پەیدابوو، ئیتر ناتوانێت سەیری هۆکارە مەجازییەکان بکات، جگە لە هۆکاری ڕاستەقینە، وە بوونی ئەم متمانەیە بە نیسبەت زەکاتدەرەکەوە، زۆر باشترە لە سەناو ستایشی کەسانیتر، چونکە ئەم سوپاسەی ئەم، تەنها جوڵاندنەوەیەکی زوبانەو کەمتر بایەخی دەبێت، بەڵام یارمەتی دانی ئەو بەندە ڕاستەقینەی کە واتای بەندایەتی و یەکتایی خودا دەزانێت، ئەوە چاکەیەکە هەرگیز بە زایە ناچێت.

بەڵام ئەوەی کە لەو پلەدا نیەو ، هەر کە شتێکیان پێدا دەمی دەکاتەوەو بە گەرمی سوپاسگوزاری فێرخواز دەردەبڕێت، ئەوە هەر زوو زوبانیشی دەخرۆشێت بە زەمکردن و ناووناتۆرەی خراپ کاتێك کە پێی نادات، یان لێیدەگرێتەوە و دوعای شەڕیشی لێدەکات، هەریەکە بە حاڵێکی جیاوازەوە.

دەگێڕنەوە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ خێرو چاکەیەکی نارد بەیەکێکدا بۆ هەژارێك و فەرمووی: بزانە چی دەڵێت قسەکەی ڕەوان کە، کاتێك گەیشتە کابراو بەخشینەکەی پێدا، وتی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئەوانە هەرگیز لە بیر ناکات کە لە یادی ئەودان، وە ئەوانەش زایە ناکات کە شوکرانەبژێری خودان، لە پاشان فەرمووی: خودایە تۆ فڵانت لەبیرنەکردووە (واتە مەبەستی خۆیەتی)، وابکە ئەویش تۆ لە بیر نەکات. ئەویش گەڕایەوەو هەواڵی

دا بە پێغەمبەر ﷺ ، زۆر دڵخۆش و شادمانبوو، فەرمووی: زانیم بەو شێوەیە قسە دەکات[١]، بنوارە چۆن تەنها لای بەلای خواداکردەوە.

هەرو ها پێغەمبەر ﷺ بەیەکێکی فەرمووی (تُبْ) تەوبە بکە، فەرمووی: دەگەڕێمەوەو تەوبە دەکەم بۆ لای خودا، نەك بۆ لای موحەممەد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **(عَرَفَ الحَقَّ لأَهلِهِ)**[٢]،

واتە زانی ماف و حەق بگێڕێتەوە بۆ ئەهلی خۆی.

چونکە تەوبەکردن هەر بۆ لای خودا دەکرێت،نەك بۆ لای کەسێکیتر.

---

(١)كذا في القوت (٢/١١٠)، وقال: ( وقد روای هذا عن عمر وعن أبي درداء مع حُدَير، ) وخبر حدير رواه مرفوعا عن ابن عمر بقصة طويلة أبوبكر الخلال في الحث على التجارة والصناعة والعمل)، (١٠٥)واسم هذا الرجل حُدَير، ورواه عن أبي الدرداء موقوفا عليه، على أنه هو المرسل لحدير البيهقي في الشعب، (٤١١٢)وابن عبدالبر في التمهيد(٨١/٢٢)، وابن عساكر في تأريخ دمشق( ٢٤٢/١٢)، وكنية حدير (أبو فوزة)، قال الزبيدي( ١٣١/٤): ذكره ابن عبد البر في الأستيعاب(١٧٢٨/٤(٣١٢١)، في الصحابة، وروى ان الجوزي في صفة الصفوة( ٧٢٣/١)، من طريق خلال قصة حُدَير هذا، وقد ذكره ابن حبان من ثقات التابعين.

(٢) رواه أحمد في المسند ٤٣٥/٣.(١٥١٦٠)، والطبراني في الكبير(٢٨٦/١)(٨٣٩)، والبيهقي في الشعب(٤١١١)، عن الأسود بن سريع (رضي الله عنه) أنه ﷺ أتى بأسير فقال له: **تُب ،** فقال: **أتوب إلى الله ولا أتوب إلى محمد، فقال ﷺ :عرف الحق لأهله**. وقال الزبيدي: ٣١/٤ ،وكذلك رواه الحاكم في المستدرك ٢٨٤/٤، (٧٦٥٤) في التوبة، والبيهقي في شعب الإيمان(١٠٣/٤)(٤٤٢٥)، والضياء في المختارة(٢٥٨/٤)(١٤٥٩)، عنه ولفظهم جميعا قال: **جيئ باسير الى رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال له صلى الله عليه وسلم تب فقال اللهم اني اتوب اليك ولا أتوب الى محمد فقال صلى الله عليه وسلم عرف الحق لاهله خلو سبيله** وقال الحاكم صحيح ورده الذهبي وقال فيه محمد بن مصعب ضعفوه وقال الهيتمي فيه عند احمد والطبراني محمد بن مصعب وثقه احمد في العلل(٥٩٩/٢)(٣٨٤٠)، وضعفه غيره وبقية رجاله رجال الصحيح.

وه کاتێك داوێن پاکی و بەرائەتی (حەزرەتی) عائیشە لە بەسەرهاتی (ئیفك)دا هاتە خوارەوە، (حەزرەتی) ئەبوبەکر (خودای لیٚ ڕازی بێت) فەرمووی: هەستەوە سەری پێغەمبەری خودا ﷺ ماچ بکە، فەرمووی:

وەڵلاهی نایکەم، وە تەنها سوپاسی خودا دەکەم، (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبوبەکر وازی لێبهێنە.

وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: کە (حەزرەتی) عائشە (خودای لیٚ ڕازی بێت) بە (حەزرەتی) ئەبوبەکری(خودای لیٚ ڕازی بێت) فەرموو: بە حەمدی خودا نەك بە حەمدی تۆو هاوەڵەکەت.

حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ ناڕەزایی دەرنەبڕی لەسەر قسەکەی، لەگەڵ ئەوەدا لە ڕێگەی پێغەمبەرەوە ﷺ وەحی پیٚ گەیشتووە.[1]،

ئەوانەی کە شتەکان دەبینن بەبیٚ خودای گەورە ﷻ ئەوە شیمەو خەصڵەتی بێباوەڕەکانە، وەك خودای (عَزَّ وجَلْ) فەرموویەتی:

---

(١)(ولما نزلت براءة عائشة رضي الله عنها في قصة (الإفك) المشهورة، قال لها (**ابو بكر رضي الله عنه، قومي فقَبِّلي رأس رسول الله ﷺ. فقالت: والله لا افعل، ولا أحمَد إلا الله تعالى، فقال رسول الله ﷺ دَعها ياأبا بكر**) قال العراقي رواه ابو داود(٥٢١٩) من حديث عائشة بلفظ فقال أبواي قومي فقبلي راس رسول الله ﷺ فقلت أحمَدُ اللهَ لا إيَّاكُمَا، وللبخاري تعليقا فقال: أبَوايَ قومي إليه فقلت: لا والله لا أقو م اليه ولا أحمد إلاَّ الله، والقصة بطولها رواه البخاري، (٢٦٦١) ومسلم (٢٧٧٠) ( وللطبراني في الكبير(١٢٣/٢٣)(١٦٢)،من حديث ابن عمر قال أبو بكر: **قومي فاحتضني رسول الله ﷺ فقالت لا والله لا أدنو منه** (وفي لفظ إنها قالت لابي بكر (رضي الله عنهما): **بحمد الله لا بحمدِك**) رواه الطبراني من حديث ابن عمر وفي لفظ آخر لابحمدك(**ولا بحمد صاحبك**) رواه الطبراني (١٢٣/٢٣)(١٦٢).(١٦٤)من حديث ابن عباس وله أيضا من حديث عائشة فقالت: بحمد الله لا بحمد صاحبك (**فلم ينكر رسول الله ﷺ عَلَيها ذلِكَ.**)

﴿وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ (٤٥/الزمر) واته: کاتێ ناوی خودا به تەنیاو بێ هاوبەش دەهێنرێت، دڵی بێباوەڕەکان دەتەوسێتەوەو پەرێشان دەبن، کاتێکیش ناوی بتەکان دەهێنرێن کـە لە خوار خواوە دایـــان ناون. دەسبەجێ شادمان دەبن و دەگەشێنەوە[1].

وە ئەوەی کە دەروونی خۆی خاوێن و پوختە نەکاتەوە لە بینینی هۆکارەکان، کە تەنها وەك هۆکار بیانبینێت نەك وەك خاوەنی کاریگەریی، وەك ئەوە وایە کە هێشتا شیرکی شاراوە(خەفی) لە ناو سیرو ناخی دەروونیدا مابێتەوە، کەواتە با لە خودا بترسێت؟

وە بڕوای یەکتاپەرستی خۆی پاك و خاوێن ڕابگرێت و.دووری خاتەوە لە گەردوگۆڵ و شیرك و بۆن و بەرامەکەی.

**صیفەتی چوارەم:** دەبێ خۆی حەشاردابێت و پێداویستییەکانی شاردبێتەوە و ئەوەندە هاوار بەدەم نەبێت و سکاڵای زۆر نەکات:

یان لەو کەسانەبێت کە مەردو ئەهلی شەهامەتن، خەڵکی نەزانن بە نەبوونی و نەدارییان، وەك کەسێکی هەبوو خۆیان دەربخەن، کە کەسێکی هەژارەو لە ناو پۆشاکی دەوڵەمەندی دا دەژی، وەك قورئانی پیرۆز تاریفیان دەکات:﴿يَحسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاءَ مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُمْ بِسِيمَاهُمْ لَا يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾ (٢٧٣ /البقرة)

یەکێ نەیانناسێت بە دەوڵەمەندیان دەزانێت، چونکە نەفسیان بەرزە و دەست لە کەس پان ناکەنەوە، بە شێوەی حاڵیاندا دەردەکەوێت کە هەژار و کەم دەرامەتن، نالکێن بە خەڵکەوە و داوایان لێ ناکەن، عیززەتی

---

(١) خولاصەی تەفسیری نامی /٤٦٣.

نەفسیان هەیەو مەردایەتی خۆیانیان نەدۆڕاندووە، ئێوەش هەر ماڵێك لە ڕێی خوادا سەرف بکەن خودا پێی دەزانێت.

واتە: ئەو هەژارانە کە دەژین و متمانەیەکی بەهێزیان هەیە. وە تـا بڵـێیت خۆڕاگرو نەفس بەرزن، ناپاڕێنەوە و، زۆر ئێخەی خەڵکی ناگرن بۆ سواڵکردن، کەواتە دەبێبەوردی لە گەڕەکەکاندا بگەڕێن بەدوایاندا، وە حاڵەتی شاراوەی ئەوانەش کە ئەهلی خێرن ئاشکرا بکرێت، دیارە بۆ ئەو پێرە خۆڕاگرە خێر بکرێت، پاداشتەکەی چەندین قات زیاترە لە پاداشتی خێرکردن بۆ سواڵکەرە ڕووهەڵماڵراوەکان، کە بە ئاشکرا داوادەکەن و لێیان نابنەوە.

## صیفەتی پێنجەم:

دەبێ ئەوانە کەسانێکیان بەسەرەوە بێت بەخێویان بکەن، یان بەهۆی نەخۆشی و هۆکارێکەوە زیندانی ماڵەوەبن:

واتای فەرموودەکەی خودای مەزنی تێدا بێتە دی:

﴿لِلْفُقَرَاءِ الَّذِينَ أُحْصِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ (البقرة/٢٧٣)

واتە خێر و صەدەقەکانتان بەوانە بدەن، کە کە ڕێیان لە ماڵ و حاڵ و دارایی خۆیان لێ گیراوە، چونکە لە ڕێی خوادا کۆچیان کردووە، لە ڕێگەی ئاخیرەتدا گیریان کردووە، یان لەبەر هەژاری، یان لەبەر بەرتەنگی ژیان، یان لەبەر هەوڵدانیان بۆ چاکسازی دڵەکانیان.

﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِي الْأَرْضِ﴾ ناتوانن بە ئارەزووی خۆیان گەشت و سەفەر بکەن بەسەر زەویدا، چونکە باڵیان بەسراوە و ئەملاو لایان سنووردار کراوە، لەبەر ئەم هۆکارانە بوو کە (حەزرەتی) عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) پارچە ڕانە مەڕێکی دەدا بە ماڵێکی هەژار، واتە: دە مەڕی

پێدەبەخشین یان زیاتر، بۆ ئەوەی لە هەژاری ڕزگاریان بکات،[١].

وە (حەزرەتی) پێغەمبەریش ﷺ بە پێی هەژاری و کڵفەتی ئەو کەسە زەکاتی دەدا پێی، [٢]، وە پرسیاریان کرد لە حەزرەتی عومەر؛

کێیە ئەو کەسەی کە بەڵاو ناسۆری ژیان (جهدالبلاء) زۆری بۆ هێنابێت،

فەرمووی: ئەوەیە کە خێزان و کڵفەتی زۆر بێت و دارایی و بژێوی کەم بێت.

## صیفەتی شەشەم:

دەبێ لە خزم و نزیك و ڕەحمیەتی خۆی بێت، کەواتە لە یەك کاتدا خێرەکەیشی کردووە و، سیلەی ڕەحمیشی بەجێ هێناوە، کە ئەوەش پاداشتێکی بێ سنووری بۆ دابین دەکات.

(حەزرەتی) عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) فەرمووی:

ئەگەر سیلەی ڕەحمی خۆم بەسەر بکەمکەوەو لەگەڵ یەکێك لە براکانمدا بە دیرهەمێك لای لێبکەمەوە، پێم خۆشترە لەوەی کە بیست دیرهەم لە لایەکی تردا سەرفبکەم، وە ئەگەر برایەکم بەسەر بکەمەوە بە بیست دیرهەم، لام خۆشترە کە سەد دیرهەم ببەخشم، وە ئەگەر صیلەی ڕەحمم بە سەد دیرهەم جێبەجێ بکەم، پێم خۆشترە لە وەی بەندەیەك ئازاد بکەم[٣]

هەروەها دۆستەکان و ناسراوو برا خێردارەکانی پێشتر دەخات لە ناسراوە دوورەکان، وەك چۆن خزمەکان پێش ئەوانە دەخات کە دوور و نامـــۆن، بـــا

---

(١) قوت القلوب ١١٢/٢.

(٢) كما عند أبي داوود،(٢٩٥٣)، عن عوف بن مال قال: **كان إذا أتاهُ ﷺ الفَيئَ، قَسَّمَهُ في يَومه، فأعطى الآهلَ حَظَّين، وأعطى الأعزب حظاً**، واتە ئەوەی خێزاندار بوو دوو بەشی پێ دەداو ئەوەش تەنها بوو یەك بەش.

(٣) رواه إبن أبي الدنيا في (العيال)، ٤٤٣، عن ابن عمر (رضي الله عنهما) وهو كذا في القوت ١١٣/٢.

چاودێری ئەم وردەکاریانە بکات.

ئەم صیفەتانە زۆر پێویستە کە بیانهێنێتە دی، وە هەریەکەیان پلەیەکی تایبەتی خۆی هەیە، دەبێبگەڕێت بە شوێن صیفەتە بەرزەکەیاندا، ئەگەر کەسێکی دەست کەوت کە کۆمەڵێ لەم صیفەتانەی لە خۆیدا کۆکردبوویەوە، ئەوە دەسکەوت و خەزنەیەکی نەبڕاوە و مەزنە و لە کیسی خۆیی نەدات، وە هەرچەندێك لەم بوارەدا کۆشش بکات و ڕاستییەکە بپێکێت، ئەوە دوو پاداشت وەردەگرێت، ئەگەر نەیشی پێکا پاداشتێکی هەردەبێت.

## یەکێ لە پاداشتە خێراکانی ئەوەیە:

کە نەفس و دەروونی خۆی پاك دەکاتەوە لە ڕژدی و صیفەتی بەخیلی، وە دڵنیا دەبێت کە خۆشەویستی خودا جێگیرە لە دڵیدا، کە هەوڵی داوە بۆ گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری ئەو.

ئەمەش ئەو صیفەتانەن کەدڵی پێ بەهێز دەبێت لەسەر تاعەت و گوێ ڕایەڵی، وە زیاتر شەوقی لیقای خودای (عَزَّ وجَلْ)و ڕۆژی دوایی لا زیاد دەکات.

## وە پاداشتی دووهەمیش:

ئەوەیە کە دوعاو نزاو هیممەتی ئەو کەسەی بۆ دەگەڕێتەوە کە ئەم خێرەکەی پێ کردووە، چونکە دڵی پیاوچاك و دۆستانی خودا ئاسەوارێکی خێراو شیاو بەجێ دەهێڵن و بەرهەمێکی چاکیشیان لێدەکەوێتەوە بۆ داهاتوو.

ئەگەر ڕاستی و مەبەستی پێکابێت، ئەوە دوو پاداشتەکەی دەستدەکەوێت.

بەڵام ئەگەر نەیپێکا بێت و ئەوەی بە دوایدا دەگەڕا دەستی نەکەوتبوو، ئەوە تەنها پاداشتە یەکەمەکەی دەستدەکەوێت.

ئەمە واتای چەند بارەبوونەوەی پاداشتە، بۆ ئەوانەی ئیجتیهاد و کۆشش دەکەن ، کە ڕێیان لە ڕاست و مەبەست بکەوێت، لێرەداو لە هەموو جێگاکانی تردا، خودای گەورەیش زاناو ئاگادارە.

# ناوبڕی سێیەم

## لە بارەی وەرگری زەکات و هۆکاری شیاوی و وەزیفەی وەرگرتنی

### بەیانی هۆکارەکانی شیاوبوون بۆ وەرگرتنی زەکات

**بزانە:** ئەوەی مافی هەیە زەکات وەربگرێت دەبێت کەسێکی سەربەست بێت، موسوڵمان بێت، لەتایفەی بەنی هاشم و بەنی عەبدولموتەلیب نەبێت، وە دەبێت یەکێ لە هەشت صیفەتەکەی تێدا بێت کە باسیان کراوە لە قورئانی پیرۆزدا، [1].

کەواتە زەکات نادرێت بە کافر و [2]،بەندە و کەسێکی هاشمی و ئەولادی موطەللیبی، بەڵام منداڵ و شێت دروستە بۆیان سەرف بکرێت، ئەگەر لە جیاتی ئەوان سەرپەرشتیارەکەیان وەری بگرێت.

## کەواتە با باسی هەشت صینفەکە بکەین:

---

(١)إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (التوبة/٦٠).

(٢) وبه قال أبوحنيفه وأبو يوسف ومحمد (رضيَ الله عنهم) لقوله ﷺ لمعاذ **خذ من أغنيائهم ورد إلى فقرائهم** ،والمأخوذ من أغنياء المسلمين، فكذا المدفوع إلى فقرائهم وخالفهم زفر من اصحابنا فقال يجوز دفع الصدقه الى الذمي لقوله تعالى: **لا ينهاكم الله عن الذين لم يقاتلوكم فى الدين ولم يخرجوكم من دياركم ان تبروهم وتقسطوا اليهم.** بەلای ئیمامی شافیعی و أبو یوسفەوە خودایان لێ ڕازی بێت)نابێت زەکاتی سەرفیترەو کەفارەتەکانی تریش بدرێت بە کافرو بە ئەهلی زیممە، بەڵام بەلای ئیمامی حەنەفی وە درووستە لەبەر عمومی ئایەتەکە.ولولا حديث معاذ لقال بجواز صرف الزكاة إلى الذمي والحربي خارج بالنص،واخرج أبو بكر بن أبي شيبة عند سعيد بن جبير مرسلا مرفوعا:**لا تصدقوا إلا على أهل دينكم،**ﷺ **تصدقوا على اهل الاديان،** وهو باطلاقه يتناول الزكاة لكن خرجت منه لحديث معاذ.

## پێڕی یەکەم: هەژارەکان

**هەژارو کەمدەرامەت:** ئەو کەسەیە کە سامانی نیەو ناشتوانێت کەسابەت بکات، خۆ ئەگەر ڕۆزی و بژێوی و بەرگی ئەو ڕۆژەی هەبوو، کە تیایدایە ئەوە بە هەژار دانانرێت، بەڵکو ئەوە بە میسکین دەناسرێت، بەڵام ئەگەر تەنها نیوەی بژێوی ڕۆژێکی هەبوو، ئەوە بە هەژار دادەنرێت، وە ئەگەر کراسێکی هەبوو لەبەری کات، بەڵام مەندیلی نەبوو، وە شەرواڵ و خوفی نەبوو لە پێی کات، وە نرخی کراسەکەیش ئەو هەموو پێداویستیانەی پێدابین نەدەکرا، بەو شێوەی کە شیاوی فەقیرێك بێت، کەواتە ئەوە هەژارە، چونکە هەر ئێستا ئەوەی نیە کە پێویستی پێیان هەیە، وە ناتوانێت دابینیان بکات. خۆ نابێت ئەو مەرجە بۆ هەژار دیاری بکرێت و بوترێت: نابێت هیچ بەرگێکی زیادەی هەبێت جگە لە وەی کە عەورەتی دادەپۆشێت، بەڕاستی ئەمە زیادەڕەوی یەو، کەم ڕێدەکەوێت کەسێکی ئەوەندە هەژار هەبێت.

وە دەری ناکات لە حاڵی فەقیری کە ئەگەر بەردەوام سواڵ بکات، بەڵام سواڵەکە وەك کەسابەتی لێ نەکات، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە بتوانێت کەسابەت بکات، ئەوە لە هەژاری دووری دەخاتەوە، ئەگەر بە ئامێرێك دەیتوانی کەسابەت بکات و نەیبوو، ئەوە بە هەژار دەژمێررێت، دروستە لە پارەی زەکات ئەو ئامێرەی بۆ بکڕرێت و بخرێتە سەر کەسابەت. وە ئەگەر توانای کەسابەتێکی هەبوو، بەڵام لە گەڵ کەسایەتی و پیاوەتی هاو وێنەی ئەودا نەدەگونجا، ئەو کەسەش هەر بە هەژار دادەنرێت، وە ئەگەر خەریکی خوێندن بوو، نەیدەتوانی سەرقاڵی کارو کەسابەت ببێت لەبەر خوێندنەکەی، ئەوە بە هەژار ئەژمار دەکرێت و، توانای کار کردنەکەی لە هەژاری دەری ناکات.[1] ،

(١) دیارە مەبەست خوێندنی زانستی شەرعییە، بەڵام زانستەکانی تر وەك ژیربێژی و کەلام

وه ئەگەر خەریکی بەندایەتی بوو، خۆی بۆ تەرخان کردبوو، بە هۆی ویردو زیکرو وەزیفەی بەندایەتییەوە نەیدەتوانی کەسابەت بکات، ئەوە با کەسابەت بکات، چونکە کەسابەت لە پێشترە لە زیادە بەندایەتی، وەك (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((**طَلَبُ الحَلالِ فَرِيضَةٌ بَعدَ الفَرِيضَة**))[1]،

واتە گەڕان بە داوای ماڵی حەڵاڵدا و کەسابەت بە ڕەنجی شان ، لە داوای جێبەجێکردنی فەرزەکان، ئەمیش فەرز و پێویستە.

(حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: (**كَسْبٌ في شِبهَةٍ خَيرٌ مِن مَسألَةٍ**)[2]، واتە ئەگەر کەسابەت لە شتێکدا بکات کە گومانی حەڵاڵی و حەرامیشی تێدا بێت، وە شوبهەیشی تێدابێت، ئەوە باشترە لەوەی دەرگای

---

و فەلسەفە و ڕیازیات و هاو وێنەکانیان ئەوە ناچنە ژێر ئەو حوکمەی کە باسمان کرد، الإتحاف٤/١٣٨.

(١)قال العراقي : أخرجه الطبراني في الكبير (١٠/٧٤(٩٩٩٣). والبيهقي في شعب الايمان(٦/٤٢٠(٨٧٤١)، من حديث ابن مسعود بسند ضعيف اهـ. قال الزبيدي:١٣٨/٤: ولفظهما كسب الحلال، وهكذا رواه القضاعي في مسند الشهاب(١٠٤/١) (١٢١)، كلهم من طريق عباد بن كثير عن الثوري عن منصور عن ابراهيم عن علقمة عن ابن مسعود مرفوعا، وقال الهيثمي في مجمع الزوائد(١٠(٢٩١). تفرد به عابد وهو ضعيف وقال ابو أحمد الفراء كما يرويه الحافظ السخاوي في المقاصد(٥٠٥)، سمعت يحيى بن يحيى يسأل عن حديث عباد في الكسب، فاذا انتهى الى رسول الله صلى الله عليه وسلم قال إن كان قاله قال الحافظ السخاوي في المقاصد وله شواهد بعضها يؤكد بعضاً، منها **طلب الحلال واجب على كل مسلم** رواه الطبراني في الاوسط والديلمي عن انس واسناد الطبراني حسنٌ، ومنها **طلب الحلال جهاد** رواه القضاعي في مسند الشهاب من طريق محمد بن الفضل عن ليث بن أبي سليم عن مجاهد عن ابن عباس.

(٢)رواه ابن أبي الدنيا في (إصلاح المال)، ٣٢٣، وابن عبدالبر في (التمهيد)، (٣٢٩/١٨) بلفظ: (**مكسبةٌ فيها بعضُ الدَّناءةِ خيرٌ مِن مسألَةِ النَّاس**).

سوڵکردن لەسەر خۆی بکاتەوە.

وە ئەگەر نەفەقە کێشـــانی بـــاوکی پێداویســـتیەکانی ڕادەپەڕانـــد، یـــان هەرکەسێکی تـر کە واجـب بـوو لەسـەریان نەفەقەی بکێشـن، ئەوە ئاسـان تـر دەکەوێت لەسەری لە کەسابەتەکە، ئەوکاتە بە هەژار دانانرێت.

## پێڕی دووهەم: مسکینەکانە:

مسـکین ئەوەیە داهـاتەکەی بەشـی بژێـوی ناکات، هەنـدێك جـار خـاوەنی هەزار دیـرهەمە و بە مسـکینیش دادەنرێـت، چـونکە بەشـی ناکـات، هەنـدێ جـاریش تەنهـا پـاچ و زەنگـن و حەبلێکی پێـیەو پێیشـی دەوڵەمەنـد دەبێـت، ئەو خـانووە بچـووکەی تێیـدا نیشـتەجێیە و، ئەو بەرگ و پۆشـاکەی لەبەریایەتی لە مسـکینی دەری ناکات، هەروەهـا کەلـوپەلی ماڵیش، مەبەسـتم ئەو شـتانەیە کە پێویستی پێیانە، کە لەگەڵ حاڵی ئەو دا دەگونجێن.

هەروەهـا هەمـوو پەڕاوە فیقهییەکانیش لە مسـکێنی دەری نـاکەن، تەنـانەت ئەگەر هیچی نەبـوو جـگە لە کتێبەکـانی، ئەوە سەرفیترەیشـی لەسـەر واجـب نابێـت، حـوکمی پەڕاوەکـانیش وەك حـوکمی بەرگ و کەل و پەلی نـاو مـاڵ وایە، چونکە پێویسـتی پێیـانە، بەڵام دەبێـت لەوە تێبگـات کە بۆچی کتێبی دەوێـت، کە پێویستی پێی هەیە، بۆ سێ مەبەستە: بۆ خوێندن و وتنەوە و فێربوون، وە سوود لێ وەرگرتن ، وە متالاکردن و خوێندنەوەی.

بە نیسـبەت ئەوەی کە تەنهـا سـەیری بکـات، ئەوە بە پێویسـت ناژمێررێـت، وەك کۆکردنەوەو هەڵگرتنی پەڕاوە شیعری و مێژووییەکان و هـاو وێنەکانیـان، کە لە پاشـەڕۆژدا سـوودیان لێ نابینێت، لە دونیاشـدا جگە لە سـەیر کـردن و کـات بەسەر بردن و پێداهاتن، هیچ سـوودێکی تریان بۆی نابێت.

ئەو جۆرە ماڵە بۆ کەفارەتی سوێندو زەکاتی سـەرفیترە دەفرۆشـرێت و ناوی مسکینیش لەسەر خاوەنەکەی لادەبات.

**پێویستییەکانی فێربوون و خوێندنیش، سەیر دەکەین:**

ئەگەر مانەوەیان لەبەر کەسابەت بوو، وەك ئەوەی پەروەردەی منداڵی پێدەکرد، یان دەرسی پێدەخوێند، یان کرێی مامۆستای وانەبێژی پێ دابین دەکرد، ئەوە ئالەت و ئامێر و هۆکارەکەیەتی، کە نابێت بۆ پێدانی سەرفیترە بفرۆشرێن، وەك ئامێرو کەرەسەکانی دورین و ڕستن و چنین و خاوەن پیشەکانی تر.

وە ئەگەر دەرس خوێندنیشی بۆ ئەوە بوو کە بە فەرزی کیفایە هەڵسابوو، ئەوە دیسان نابێت بفرۆشرێن، وە ناوی مسکێنیشی لەسەر ڕەشناکرێتەوە، چونکە ئەوە یەکێکە لە پێداویستیەکانی.

وە لە بارەی پێداویستی سوودوەرگرتن و فێربوون لە پەڕاوەکان، وەك ئەوەی کتێبی پزیشکی هەڵبگرێت بەمەبەستی چارەسەرکردنی خۆی، یان پەڕاوی ئامۆژگاری، تا متالای بکات و سوودمەند ببێت لێی، ئەگەر لە شارەکەدا پزیشك و واعیزی تێدا بوو، ئەوە پێویستی بەو پەڕاوانە نامێنێت، ئەگەر نەبوو، ئەوە پێویستی پێیان دەبێت، لەوانەیشە ئاماوەیەکی تر پێویستی بە متالاکردنی کتێبەکان نەبێت، کەواتە دەبێت ئەو ماوە دیاری بکات کە پێویستی پێی دەبێت،

**ڕای شیاوتر ئەوەیە کە بڵێین:**

ئەگەر تا ساڵێك پێویستی بەو کتێبە نەدەبوو، کەواتە نایەوێت، کەواتە هەرکەسێك لە بژێوی ڕۆژی جەژن زیادەی هەبوو ئەوە پێویستە لەسەری سەرفیترە بدات.

کەواتە ئەگەر پێداویستی بژێویمان بە ڕۆژێك دیاریکرد، ئەوا دەبێت پێداویستی ماڵ و کەلو پەل و کەرەستەکان بە ساڵێك دابنێین، نابێت بەرگی هاوین لە زستاندا بفرۆشرێت، یان بەرگی زستان لە هاویندا بفرۆشرێت، کتێبیش زیاتر بە کەرەستەی پێویستی ماڵ دەشوبهێت.

ئەگەر لە کتێبێك دوو دانەی هەبوو، ئەوا پێویستی بە یەکێکیان نیە،

ئەگەر وتی یەکێکیان دروستترە و ئەویشیان جوانترە و پێویستم بە هەردوکیان هەیە، دەڵێین: دروستەکەیان هەڵبگرەو، بۆ پێویستی جوانەکەیان بفرۆشە، ئیتر واز لە سەیر کردن و ڕەفاهییەت بهێنە.

وە ئەگە ردوو نوسخەی هەبوو لە یەك بەشی زانستدا، یەکێکیان بە کورتی و ئەویشیان بە درێژی بوو. ئەگەر تەنها مەبەستی سوود لێ وەرگرتن بوو، ئەوە با کورتەکە بهێڵێتەوە بۆ متاڵاو، ئەویان بفرۆشێت. وە ئەگەر مەبەستی دەرس وتنەوە بوو، ئەوە پێویستی بە هەردوکیان دەبێت، چونکە هەریەکە سودێك دەگەیێنێت لەوی تریان دەستی ناکەوێت.

نموونەی ئەم دیمەنانە بە کۆتا ناگات، لە هونەر و دەرسی (فقە) دا باسیان نەکراوە، بۆیە ئێمە باسمان کردن، چونکە خەڵکێکی زۆر گیرۆدەی ئەم بابەتانە بوون و. بەسەرنج دانی ئەمانە نموونەکانی تریش بپێورێت، بەو شێوەی کە ڕوونمان کردەوە.

چونکە باسکردنی هەموو وێنەکان هەرگیز تەواو نابێت، چونکە هەمان سەرنج دان ڕوو دەکاتە کەرەستەکانی ماڵەوە، جۆر و ژمارە و ئەندازەیان ، وە پۆشاکی بەر، خانووی نیشتەجێ بوون و، لە ڕووی بەرتەسکی و فراوانیەوە، کە بەڕاستی بۆ ئەمانە هیچ سنوورێکی دیاری کراویان نیە.

بەڵام ئەوەندە هەیە (فەقیە) بە ڕای خۆی ئیجتهادیان تێدا دەکات، ئەوەی نزیکە لە ڕاستییە وە سنووری بۆ دەکێشێت، ڕۆدەچێت لە ناو بابەتەکاندا و مەترسی شوبهەو گومانەکانی تێدا دەردەخات و، ئەوەی خاوەنی وەرع و خۆپارێزییە. خۆی لە شوبهەکان دەپارێزێت، واز لەوە دەهێنێت کە گوماناوی بێت.

پلەی ناوەندیش کە لە نێوانی ئەملاو لای بابەتەکاندایە زۆرن، تەنها بە خۆپارێزی و ڕێگەی وەرع دەتوانێت خۆی ڕزگار بکات ، خوای گەورەش زاناترە.

## پێڕی سێیەم: ئەوانەی کۆی دەکەنەوە:

ئەوانەن کە زەکات کۆدەکەنەوە، جگە لە خەلیفەو قازی شەرع والی و سەرپەرشتیاری هەرێمەکان، هەموو عەریف و سەرکار و نووسەر و وەرگر و ژمێریار و خەزنەدار و ئەمین صندووق و ئەوانەش کە دەیگوازنەوە بۆ جێگا پێویستەکان، تا بێ لە کرێی هاو وێنەی کارەکانیان زیادیان بۆ دابنرێت، ئەگەر شتێك لە کرێی هاوکارێکیان زیاد بوو، دەگێڕرێتەوە بەسەرپاشماوەی صینف و پێڕەکانی تردا، وە ئەگەر کەمی کرد، لە ماڵی بەرژەوەندییەکان تەواو دەکرێت.

## پێڕی چوارەم: ئەوانەی دڵیان ڕاگیربکرێت و دابمەزرێت:

ئەو بەرێزانەن کە موسوڵمان بوون و، لەناو هۆزەکانیاندا قسەڕۆشتوو دەمڕاست بوون، کە پێیان بدرێت زیاتر لەسەر دین دادەمەزرێن و، دەبێتە هاندان و ڕاکێشانی دڵی هاو شێوەکانیشیان ، بۆ ئەوەی موسوڵمان ببن.

## پێڕی پێنجەم: ئەوانەی کیتابەتیان بۆ کراوە:

بەشی ئەو بەندەیەی کە کۆمپیالەی بۆ پڕکراوەتەوەو، نوسراوی بۆ ئیمزا کراوە کە ئەگەر ئەوەندەی پەیداکرد خۆی ئازاد بکات، زەکات بەمانەش دەدرێت و، دەدرێت بە گەورەکەی، ئەگەر بە بەندە موکاتەبەکەش بدرێت دروستە، بەڵام (گەورەی بەندەکە) نابێت زەکاتی خۆی بدات بە دەستی بەندە کیتابەت بۆ کراوەکەی خۆیەوە، چونکە هێشتا بەندەی ئەوەو ڕزگاری نەبووە.

## پێڕی شەشەم: قەرزارەکان:

قەرزار ئەوەیە کە هەژارێك بۆ کارێکی باش کە خواپەرستی تێدابێت، پارەکەی قەرز کردبێت، یان کارێکی موباح و دروست بێت . ئەگەر قەرزەکەی بۆ تاوانکاری کردبێت، ئەوە نابێت ماڵی زەکاتی پێبدرێت، مەگەر تەوبەی کردبێت، بەڵام ئەگەر دەوڵەمەند بێت، ئەوا زەکاتی پێ نادرێت، مەگەر بۆ

بەرژەوەندی و کوژانەوەی فیتنەیەك قەرزی کردبێت.

## پێــری حەوتەم: ئەو موجاهیــدە جەنگــاوەرانەن کە لە دیوانی جەنگاوەراندا مووچەیان بۆ دیاری نەکراوە:

ئەوانە پشکێکیان پێدەدرێت با دەوڵەمەندیش بن.

## پێری هەشتەم: ئیبنو سەبیل:

ئەو کەسەیە کە لەشارو وڵاتەکەی گەشتێکی حەڵاڵی دەست پێ کردبێت و شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیی جێ هێڵابێت، ئەگەر هەژار بێت ئەوا پێی دەدرێت . ئەگەر لە شارەکیشــدا کەســێکی گەشــتیار، کە ســەفەرەکەی حەڵاڵ بێــت، پێویستی هەبێت، با لە شارەکەی خۆیشی پارەی هەبێت، ئەوەندەی پێدەدرێت تا بگاتەوە ماڵی خۆی.

**ئەگەر بڵێیت:**

بەچیدا ئەم پێرو تاقمانە دەناسیت؟

دەڵێـین: هەژاری و مســکێنی کـابرا بە قســەی خــۆی بــاوەڕ دەکرێـت و پێـی دەدرێـت، داوای بەڵـگەی لێ ناکرێـت و ســوێنیش نادرێـت، مەگەر بزانرێـت کە درۆزنە، ئەوکاتە بڕوای پێ ناکرێت.(مەگەر بۆ ئەم زەمانە کە درۆو پیلان و فرت و فێڵ ئەوەندە زۆر بووە، کە پێویستە داوای بەڵگەیان لێبکرێت)

ئەوانەش کە دەڵـێن: ئـێمە غەزاکار و گەشـتیارین. ئەوە فرمـانێکە بـۆ داهـاتوو، ئەگەر بڵێـت مـن بڕیـارم داوە و نـیەتم هێنـاوە کە جیهـاد بـکەم، یـان سـەفەرێك بکەم؛ ئەوە پێی دەدرێت، ئەگەر وەفای بە بڕیارەکەی نەکرد لێی وەردەگیرێتەوە.

پاشماوەی صینفەکانی تریش: دەبێت ڕوونکردنەوەیان هەبێت.

ئەمەی کە باســمانکرد، مەرجە دیــاری کراوەکــانە بــۆ ئەو کەســانەی کە دەتــوانن مــافی وەرگرتنــی زەکاتیــان هەبێــت، وە باســی ئەو ئەنــدازەیەی کە بــۆ هەریەکەیان سەرف دەکرێت، ئەوە لەمەودا باسی دەکرێت.

# ڕوونکردنەوەی ئەرکەکانی وەرگری زەکات

## کە بریتییە لە پێنج وەزیفە:

### یەکەم:

دەبێبزانێت کە خودای گەورە پێویستی کردووە کە زەکاتی پێبدرێت، بۆ ئەوەی خەمەکانی نەمێنێت و تەنها یەك خەمی لەبەر بێت :

ئەوەتانێ خودای گەورە بەندەکانی بەوە ڕاهێناوەو بڕیاری داوە لەسەریان، کە یەك جۆر کێشەو خەمیان هەبێت، ئەویش ناسینی خوداو بیرکردنەوەیە لە ڕۆژی دوایی، کە مەبەستی ئایەتە پیرۆزەکەی قورئان ئەوەیە کە:

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذاريات/٥٦)

واتە: (من جنۆکەو ئادەمیزادم بۆهیچ دروست نەکردووە بۆ ئەوە نەبێت کە بمپەرستن) واتە ئەوان گەرنکەچ بن و بەندایەتی ڕاستەقینەم بکەن، منیش خەم و نارەحەتیەکانی ژیانیان دابین دەکەم [1].

بەڵام کاتێك حیکمەتی خودا وای دانابوو کە ئارەزوەکان و پێداویستییەکان زاڵ بکات بەسەر بەندەدا، کە خەمەکانی پەرش و بڵاو دەکەن، فەزڵ و بەخشندەیی خودا وای دەخواست کە نیعمەتێکی تر ببەخشێت بە بەندەکانی، کە پێداویستیەکانیان بۆ جێبەجێ بکات،ماڵی زۆر کرد و خستیە ناو لەپی بەندەکانیەوە، بۆ ئەوە ئامێرو هۆکارێك بێت لەلایان، کارەکانیانی پێ جێبەجێ بکەن، تا بتوانن خۆیان بۆ بەندایەتی تەرخان بکەن، هەندێکیان ماڵەکانیانی

---

(١) خۆلاصەی تەفسیری نامی(٥٢٣. وروى ابن ماجه (٢٥٧) مرفوعا( **من جعلَ الهُمومَ هَمَّاً واحداً، همَّ آخِرَتهِ، كفاهُ اللهُ هَمَّ دنياهُ، ومن تَشَعبت بهِ الهُمومُ في أحوالِ الدنيا، لم يُبالِ اللهُ في أيّ أوديتها هَلَك**) الإتحاف ١٥٤/٤.

زیاد کرد، کردی به بەڵاو تاقیکردنەوە بۆ یان، خستنیە ناو کێشەیەکی مەترسی دارەوە، هەندێکیشیانی خۆشویست، پاراستنی لە دونیا، وەك چۆن کەسێکی دڵسۆز نەخۆشەکەی دەپارێزێت، زیادەکانی لەسەر لابردو، ئەوەندەی پێویستی ژیان و گوزەرانی بوو ئەوەندەی پێدا، ئەمیش لە ڕێگەی دەوڵەمەندەکانەوە، بۆ ئەوەی ئەوان بە پەیداکردن و کۆکردنەوەو پاراستنی ماڵەکەوە ماندووبن و خەریك بن، سوودو زیادەکەیشی بڕژێتە گیرفانی هەژارەکانەوە، بۆ ئەوەی بتوانن خۆیان یەکلایی بکەنەوە بۆ بەندایەتی خودا، وە ئامادەباشی کاتی دوای مردنبن. تا کاتیان بە فیڕۆ نەڕوات و، پێویستی ژیان خەمەگەورەکەی دواڕۆژیان لە بیر نەباتەوە، کەواتە هەژار پێویستە قەدری ئەو هەژارییەی خۆی بزانێت، وە دڵنیا بێت کە فەزڵی خودا بەسەر یەوەیە، ئەوەی کە بۆی داناوەو بۆی هەڵگرتووە، زۆر زیاترە لەوەی پێیبەخشیوە، وەك لە پەڕاوی (فەقر) دا باسی دەکەین و پشت بەخودا لێکۆڵینەوەی تەواوی لە سەر دەکەین.

## دووهەم:

دەبێت سوپاسی ئەو کەسە بکات کە زەکاتەکەی پێدەدات و دوعای خێریشی بۆ بکات، بەشێوەیەك کە سوپاس و سەناو نزاکەی وانەبێت کەئەو زەکاتدەرە واسیطە و هۆکاری ئەم خێرەیە، بەڵکو بەو شێوەی کە زەکات دەرەکە ڕێگەی گەیشتنی نیعمەتی خودایە پێی، مادام خودای گەورە ئەو کەسەی داناوە بەڕێگەی گەیشتنی ئەو ڕزقە، کەواتە ئەوەندەی ماف هەیە کە سوپاس بکرێت نزای خێری بۆ بکرێت، ئەمە دژایەتی نابێت لەگەڵ ئەوەدا کە هەموو نیعمەتەکە هەر لە خوداوە ببینێت، چونکە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ لَمْ یَشکُرِ النّاسَ لَم یَشکُرِاللّهَ)) [1]، ئەوەی سوپاسگوزاری

---

(١)قال العراقي رواه الترمذي(٤٨١١) وحسنه من حديث ابي سعيد وله ولأبي داود وابن حبان

خەڵی نەبێت لە سەر چاکەکانیان، سوپاسی خودایشی نەکردووە.( بە شوکرانە بژێریت بۆ خەڵکی، ڕێگەی شوکرانەبژێری ڕاستەقینەی خودایت لەسەر دەکاتەوە، کەواتە خودای (عَزَّ وجَلْ) ڕێگەی سوپاسگوزاری بەندەکانی داوە، کە دەستی چاکەیان بەسەرمانەوە هەبێت. چونکە لە ڕاستیدا لە چاکەی ئەواندا دەستی بەخشندەی ڕاستەقینەی پەروەرگار دەبینرێت)

خودای گەورە ستایشی بەندەکانی دەکات لەسەر کردەوە چاکەکانیان، کە ئەو پەروەردگاریشیانە، دروستکەری ئەو توانایەیە کە کارەکەیان پێ کردووە، وەك قورئان فەرموویەتی:﴿نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ﴾ (ص/٣٠)

(ئەو بەندەیەکی چاکی خودایە، ئەو هەمیشە بە تەوبە کردن لە گوناە ئەگەڕێتەوە بۆ لای خودا) ئەمەو چەندین بەڵگەی تر.[1] ،

**بائەو کەسەی مافەکەی خۆی وەردەگرێت بڵێت:**

**(طَهَّرَ اللهُ قَلبكَ في قلُوبِ الأَبرار، وزكّى عَمَلَك في عَمَلِ الأَخيار، وصَلّى علَى رُوحِكَ في أرواحِ الشُّهَداء)**

(خودا دڵت پاککاتەوە وەك دڵی پیاوچاکانی پاککرۆتەوە، وە کردارەکانت پاڵفتەو پاککاتەوە، وەك کرداری هەڵبژێرراوانی، وە ڕەحمەت بڕژێت بە سەر ڕۆحەکەتدا، وەك ڕژاندی بەسەر ڕۆحی شەهیدەکانیدا)

وە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**مَن أسْدَى إليكُم مَعروفاً فكافِئوهُ، فإن لَم تَستَطيعُوا فادعُوالَه حتَّى تَعلَموا أنَّكم قَد كافأتُمُوه**))[2].

---

نحوه من حديث أبي هريرة وقال الترمذي(١٩٥٤) حسن صحيح

(١) خۆلاصەی تەفسیری نامی (٤٢٦).

(٢)وقال العراقي رواەأبو داود (١٦٧٢)والنسائي(٢٥٦٧)، من حديث ابن عمر باسناد صحيح بلفظِ من صنع اهـ قال الزبيدي( ١٥٧/٤): وأخرج البيهقي من حديث ابى هريرة بلفظ: **من صنع إليه معروفا فليكافئ به، فان لم يستطع فليذكره فمن ذكره فقد شكره**

ئەوەی چاكەیەكی لەگەڵ كردن، پاداشتی بدەنەوە. ئەگەر نەتانتوانی ئەوا نزای خێری بۆ بكەن، ئەوەنەی بۆ بپاڕێنەوە تا دڵنیا ببن كە پاداشتتان دەوەتەوە.

وە یەكێكی دیكە لە ئادابی سوپاسگوزاری ئەوەیە:

كە ئەگەر هەڵەو كەمییەكی تێدا بێت بیشارێتەوەو، بە سووكی سەیری نەكات و، ئەگەر داوای لە خاوەن زەكاتەكە كردوو یارمەتی نەدا، زەكات وەرگرەكە ناوی بە خراپە نەبات و، ناتۆرەی ڕەزیلی و ڕژدی نەداتە پاڵی، وە لە دڵی خۆی و لای خەڵكیش بەخشین و یارمەتییەكەی بە گەورە لە قەڵەم بدات، چونكە وەزیفەی بەخشەرەكە كەم كردنەوەی بەخشینەكەیەو ،ئەركی وەرگرەكەش ئەوەیە كە بەڕێزەوە تەماشای بكات و خۆی بە منەتباری دابنێت.

هەر بەندەیەك دەبێت بە تەواوی هەستێت بەو مافەی كە لە سەریەتی. ئەمەش هیچ ئاڵۆزی و خراپەیەكی تێدا نیە، چونكە لە بنەڕەتدا ئەوەی دەبێتە هۆی بە گەورە سەیركردنی شتێك، یان بە بچووك سەیركردنی، دژ بەیەك ڕاناوەستن، وە واباشە بۆ بەخشێنەرەكە، كە بە چاوێكی سووكەوە بنوارێت بۆ چاكەكەی خۆی، وە بە پێچەوانەوە بنوارێت بۆی زیانی لێدەكات.

ئەوەش وەری دەگرێت دەبێبە پێچەوانەی ئەو كار بكات،هەر یەكێك لەم دوو هەڵوێستە، ئەو ڕاستییە ناشارێتەوە كە نیعمەتەكە هەر لە خوداوەیە، چونكە ئەوەی سەیری هۆكار دەكات،بە تەنها هۆكارو سەبەبێك سەیری نەكات، ئەوە نەزانینی بە خەرج داوە،ئەو كەسەبەمونكیرو نالەبار دەناسرێت كە بەخشینەكە تەنها لە واسیطەو هۆكارەكە ببینێت و، بەخشێنەری ڕاستەقینە لە یاد بكات.

## سێیەم:

**دەبێ سەیری ئەو ماڵە بكات كە وەری گرتووە:**

ئەگەر لە حەڵاڵی خۆی نەبێت كە وەری بگرێت دەبێ خاوەنی وەرع بێت،

﴿وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ﴾ (الطلاق/٣)

( ئەوەی تەقواكاربێت و خۆپارێز بێت لە حەرام، ئەوا خودای گەورە دەرووی

خێری لێدەکاتەوەو، لەو جێگاوە کە چاوەنواڕی نەکردووە، ئەو پەڕی یارمەتی دەدات) ، ئەوەی لە حەرامدا خۆپارێز بێت و لێی دووربکەوێتەوە، بێ ئومێد نابێت لەدەروازە و فتوحاتی حەڵاڵ کە ڕووی تێدەکات:

با نزیکی ماڵ و سامانی تورکەکان و سەربازی دەسەڵاتدارەکان و، کارمەندی سەلاطینەکان نەبێتەوە، هەروەها توخنی ئەوانە نەکەوێت کە زۆربەی ماڵەکەیان لە حەرامە، مەگەر ڕێگەی ژیان و حەڵاڵدۆزی لا بەرتەنگ بووبێتەوەو نەزانێت ئەوەی وەری دەگرێت خاوەنە دیارەکەی کێیە، ئەو کاتە بە ئەندازەی پێویستی ژیان بۆی هەیە وەری بگرێت. فەتوای شەرعیش لەم بارەوە ئەوەیە کە بیکات بە خێر،(بەشی پێویستی لێ هەڵدەگرێت و پاشماوەکەی دەکات بە خێر) وەك لەمەودوا باسی دێت، چونکە ئەگەر نەیدەتوانی حەڵاڵی دەستبکەوێت، ئەگەر بە ناچاری وەریگرت، ئەوا نابێبە زەکات وەری بگرێت، چونکە زەکات لە ماڵێك دەر ناکرێت کە سەرچاوەکەی حەرام بێت.

# چوارەم:

دەبێ لەوەی کە وەری دەگرێت خۆی لە شوێنی گومان و دوودڵی بپارێزێت: دەبێ تەنها ئەو ئەندازە وەربگرێت کە موباحەو دروستە، وە ئەو بڕە پارەیە وەربگریت کە دەتوانیت خۆت بە کەسێکی خاوەن ماف بزانیت، واتە: لە مافی خۆی زیاتر وەرنەگرێت، ئەگەر زەکات وەردەگرێت بۆ ئازاد کردنی خۆی(وەك بەندەیەکی کیتابەت بۆ کراو) یان وەك قەرزارێك، ئەوا با بە ئەندازەی قەرزارییەکەی وەری بگرێت،

وە ئەگەر لە پاداشتی کارێکدا مافی ڕەوای خۆی وەرگرت، نابێ لە کرێی هاو وێنەی خۆی زیاتر وەربگرێت، ئەگەر زیادەیشی پێدرا، دەبێ ڕازی نەبێت و وەری نەگرێت، چونکە ماڵی ئەو کەسە نیە کەدەیدات، تا بە ئارەزوی خۆی ببەخشێت، (بەڵکوو ماڵی ئەمانەتی خودایەو نابێ خیانەتی لێبکات،

چونکەدروست نیە بە زیادەوە زەکات وەربگرێت، وەك باسی دێت)،

وە ئەگەر سەفەری بوو، لەوە زیاتر وەرنەگرێت کە خۆراکی ڕێگاو کرێی سوار بوونە، تا دەیگەێنێتەوە بە شوێنی مەبەست. وە ئەگەر جەنگاوەر و موجاهید بوو، با تەنها ئەوەندە وەر بگرێت کە بۆ غەزاکە پێویستی پێیەتی، وەك ئەسپ و(هۆکاری سوار بوون) و چەك و نەفەقە و مەسرەف، ئەو ئەندازەیەش بە خەمڵاندن و ئیجتیهاد دەزانرێت، کە سنوورێکی دیاری کراوی بۆ نیە، هەروەها زادو خۆراکی ڕێگە.

**وەرع و خۆپارێزیش ئەوەیە:** کە هەرچی گومان و دوودڵی بۆ دروست دەکات، خۆی لێبپارێزێت بۆ ئەو کارەی دوورە لە شوبهەو گومانەوە.

وە ئەگەر بە هۆی مسکێنی ونەداری و بێ دەرامەتییەوە زەکاتی وەردەگرت، با لە سەرەتاوە سەیری کەلوپەل و کەرەستەی ناو ماڵەکەی خۆی و، بەرگ و کتێبەکانی بکات و، بزانێت شتێکی هەیە کە کاری پێی نەبێت و لە ناوی ببات، یان خۆی یان بەهاو قیمەت و بەنرخییەکەی، کە دەکرێت بیفرۆشێت و یەکێکی ئاسایی پەیدا بکات، هەموو ئەمانەش بە پێی ئیجتیهادی خۆی کار بکات، کارەکەی دوو لایەنی تێدایە، یەکێکیان: زاهیر و دیارە، کە بۆی دەردەکەوێت مافی خۆیەتی زەکات وەر بگرێت، لایەکی تریشی هەیە کە بۆی دەردەکەوێت کە مافی نیەو شیاوی ئەو وەرگرتنە نیە، ئەوەش لە دەوری چاڵ و قەدەغەکراوێك بسوڕێتەوە، ئاخری لەوانەیە تێی بکەوێت، وە باشتر وایە باوەڕ بە قسەی وەرگرەکە بکرێت.

کەسی موحتاج و داماویش بۆ وەرگرتنی زەکات، چەندیین پلەو حاڵی بەرتەسك و فراوانی هەیە، پلەکانی سەرژمێر ناکرێن. هەرکەسێك مەیلی زیاتر بەلای وەرع و خۆپارێزیدا بێت، ئەوا ڕێگا تەسك و بەرتەنگەکان دەگرێتەبەر، ئەوەش کە حەزی لە ئاسانکاری هەیە، ئەوا ڕێگا بەرفراوانەکە دەگرێتەبەر، تا وادەگەێنێت کە پێویستی بە جۆرەها بابەتی بەرفراوانی ژیانە، کە شەریعەتی

پیرۆز لای پەسەند وشیاو نیە.

لە پاشان ئەگەر دڵنیاش بوو کە پێویستی بە بڕێك پارە هەیە، با زیاد لە پێویست وەرنەگرێت، بەڵکوو ئەوەندەی پێداویستیەکانی تەواو دەکات تا کۆتایی ساڵەکە، ئەمە ئەو پەڕی ئەو سنوورەیە کە لەوە زیاتر دروست نیە زیاتر وەری بگرێت، چونکە ئەگەر ساڵێکی تر دووبارە بوویەوە، هۆکاری وەرگرتن و زیاد کردنی بژێوی دووبارە دەبێتەوە، لەو ڕووەیشەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێداویستی ساڵێکی بۆ خێزانی دابین دەکرد **((إدَّخرَ لِعَيالِهِ قوتَ سَنَةٍ))**[1].

ئەم سنووردانانە بۆ ساڵێك گونجاوترە .سنووردانانە بۆ دیاری کردنی ئەندازەی نەفەقەکێشان و هەڵگرتنی بۆیان، خۆ ئەگەر بە ئەندازەی پێویستی مانگێك یان ڕۆژێك هەڵبگرێت، ئەوە نزیك ترە لە تەقواو پشت قایمی و تەوەککولەوە بە خوداوە.

پەیڕەوو مەزهەبی زانایان، ڕای جیاوازیان هەیە لەبارەی ئەندازەی ئەو زەکات و صەدەقەی وەری دەگرێت، هەیانە ئەوپەڕیان لێگرتوە و کەمترین سنووریان بۆ داناوە، تەنها ئەوەندە وەربگرێت، کە بژێوی شەو و ڕۆژی بۆ دابین ببێت و بەس، پشت بەستوو بە ڕیوایەتی سەهلی کوڕی حەنزەڵە (خودای لێ ڕازی بێت)کە پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی نەداوە کەسێك دەوڵەمەند بێت و سواڵ بکات و ، داوای یارمەتی بکات، پرسیاریان کرد دەوڵەمەندی چەندە:

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **((غداءُهُ و عشاءُهُ))**[2]

---

(١) كما في البخاري (٢٩٠٤)، ومسلم (١٧٥٧)، بلفظ: **كانت أموال بني النضير، ممّا أفاء الله على رسولِهِ، ممّا لم يوجف عليه المسلمون بخيل ولا ركاب، فكانت للنبي ﷺ خاصة، فكان ينفق على أهله نفقة سنة، وما بقي يجعله في الكراع والسلاح عدة في سبيل الله)** ولفظ الترمذي: (١٧١٩) **(كان يعزل نفقة أهله سنة)**.

(٢)) قال العراقي: رواه أبو داود (١٦٢٩)، وابن حبان في صحيحه(٢/٣٠٢(٥٤٥)، بلفظ: **(من**

کەواتە ڕۆزی و بژێوی شەوو ڕۆژێکی هەبێت، ئیتر ئەو کەسە دەوڵەمەندە

هەندێکی تر فەرموویانە: ئەوەندە وەر بگرێت تا پێی دەوڵەمەند دەبێت، سنووری دەوڵەمەندیش ئەو ئەندازەیە کە زەکاتی لێدەکەوێت، چونکە خودای گەورە زەکاتی لەسەر واجب نەکردووە، لەسەر دەوڵەمەندەکان نەبێت، کەواتە فەرموویانە: بۆی هەیە بۆ خۆی و هەموو ئەوانەی لە ژێر چاودێری ئەودان ئەوەندە وەربگرن تاوەرگیراوەکەیان دەگاتە ئەو ئاستی نیصابی زەکاتدان.

هەندێکی تریش فەرموویانە: سنووری دەوڵەمەندی پەنجا دیرهەمە، یان نرخی ئەو پەنجایە بە ئاڵتوون، پشت بەستوو بەو فەرموودەی کە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (خودایان لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: **((مَن سأَلَ ولَهُ مالٌ يُغنيهِ، جاءَ يَومَ القِيامَةِ وفي وَجهِهِ خُمُوشٌ)) قيلَ وما غِناهُ؟ قال: خَمسونَ دِرهَماً أو قيمَتُها مِنَ الذَّهَب))**.[1]

---

سأل وله ما يغنيه فانما يستكثر من جمر جهنم) اهـ قال الزبيدي: ١٥٩/٤: وفي رواية وعنده ما يغنيه . وفيه قالوا: وما يغنيه يا رسول الله؟ قال قدر ما يغديه أو يعشيه، وهكذا رواه أحمد في مسنده(١٧١٧٣)، وابن خزيمة في صحيحه(٧٩/٤(٢٣٩١)، وابن جرير والطبراني في الكبير ٩٦/٦(٥٦٢٠)، والحاكم والبيهقي في السنن الكبرى(٢٤/٧(١٢٩٩١)، وقال الطحاوي في تبيين المشكل بسنده: أن سهل بن الحنظلية قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: **من سأل الناس عن ظهر غنى فانما يستكثر من جمر جهنم، قلت يا رسول الله وما ظهر غنى؟ قال أن يعلم أن عند أهله ما يغديهم او ما يعشيهم**

(١)قال العراقي رواه أصحاب السنن ،أبوداود(١٦٢٦)، والترمذي(٦٥٠)، والنسائي(٩٧/٥)، وابن ماجه(١٨٤٠)، وقال الترمذي حسن اهـ قال الزبيدي: ورواه أحمد وابن جرير في تهذيبه والحاكم والبيهقي، وروى أحمد هذا الحديث أيضا بلفظ: من سأل مسئلة وهو عنها غنى جاءت يوم القيامة كدوحا في وجهه، ولا تحل الصدقة لمن له خمسون درهما أو عوضها من الذهب ورواه ابن أبي شيبة عن علي وعبدالله جميعا : **لا تحل الصدقة لمن له خمسون درهما أو عوضها من الذهب**، ولضعف رواية حكيم بن جبير الذي

ئەوەی سواڵ بکات وماڵی هەبێت،لە ڕۆژی قیامەتدا دێت ودەموچاوی هەمووی برینە و ڕوکاوە، وتیان دەوڵەمەندییەکەی چەندە؟ فەرمووی:
پەنجا دیرهەمی زیوی هەبێت، یان بەنرخی ئەوە لە زێڕ، وە دەڵێن ئەم ڕێوایەتە بەهێز نیە.

هەندێکی تریش دیاریان کردووە بە چل دیرهەم، لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە عەطائی کوڕی یەسار به (مونقەطیع) پچڕاوی دەیگێڕێتەوە کە (حەزرەتی) پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((مَن سأَل ولَه أوقيَّة فقَد أَلْحف في السُّؤال))[1]،

ئەوەی داوای زەکات بکات و هۆقۆیەکی هەبێت، ئەوە زۆری داواکردووەو، بە زیادەڕەوی لەسەری دەژمێررێت،

وەهەندێکی تر زۆر بە بەرفراوانی ڕێگەیان داوە بۆ وەرگرتن و دەڵێن:

بۆی هەیە ئەوەندە وەربگرێت کە زەوییەکی بازرگانی، یان خانوویەکی بەسوودی پێ بکڕێت و تا کۆتایی تەمەنی پێی دەوڵەمەند ببێت، یان کاڵایەکی وای پێ بکڕێت و ئامادە بکات، تا کۆتایی تەمەنی لەبەر قازانجەکەی بحەوێتەوە، چونکە ئەمە وای لێدەکات کە ئیتر دەست لەکەس پان نەکاتەوە، وەك (حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) فەرمووی:

---

ضعفة النسائي والخطابي، طلبوا من سفيان الرواية من غيره، فحدثهم عن زبيد عن محمد بن عبدالرحمن مثله فصار الحديث بهذا الطريق قويا، والله أعلم . الإتحاف ٤/ ١٦٠.

(١)قال العراقي رواه أبو داود(١٦٢٧)، (١٦٢٨)، والنسائي(٩٨/٥)(٢٥٩٥)، من رواية عطاء عن رجل من بني أسد متصلا وليس بمنقطع كما ذكر المصنف، لان الرجل صحابي فلا يضر عدم تسميته، وأخرجه أبو داود والنسائي(٢٥٩٥)، وابن حبان من حديث ابي سعيد اهـ زاد هشام في حديثه عند أبي داوود( وكانت الأوقية على عهد رسول الله ﷺ أربعين درهما، وبالأربعين صرح النسائي في جديث آخر(٩٨/٥).ورواه ابن أبي شيبة في مصنفه ٤٠٣/٢(١٠٤٣١)، والطحاوي في شرح معاني الآثار(٣٧٢/٤، وقال الزبيدي (١٦٠/٤). أخرجه ابن خزيمة في صحيحه(١٠٠/٤)(٢٤٤٧).

(إذا أَعْطَيتم فأَغنوا) [١]،

ئەگەر زەکات و صەدەقەتان دا بەیەکێك وای بدەنێ کە دەوڵەمەندی بکەن و پێویستی بەکەسیتر نەمێنێت.

تەنانەت هەندێك وای بۆ چوون :

کە ئەگەر یەکێك هەژار کەوت، بۆی هەیە کە ئەوەندە وەرگرێت تا دەگاتەوە حاڵی پێشووی، با دە هەزار دیرهەمیش وەرگرێت، مەگەر لە سنووری میانەڕەوی دەربچێت، ئەینا بۆی دروستە کە وەریبگرێت.

کاتێك ئەبوطەلحە (خودای لێ ڕازی بێت) باخەکەی سەرقاڵی کردوو ئاگای لای نوێژەکەی نەهێلا، فەرمووی: ئەوا کردم بە صەدەقە، حەزرەت ﷺ فەرمووی :

((إجعَلهُ في قَرابَتِكَ ، فَهُوَ خيرٌ لَكَ)) [٢]

بیدە بە خزمەکانت ئەوە باشترە بۆ تۆ.

ئەویش بەخشی بە حەسان و ئەبو قەتادە، دەی باخێکی چواردەورکراوی گەورە، لە خورما بۆ دووکەس زۆریشەو، دەوڵەمەندیشیان دەکات.

هەروەها (حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) وشترێکی بەخشی لە زەکاتدا بە ئەعرابییەك بەو نێرو مێیەی کە لێی بووە. [٣]،

---

(١) هكذا أخرجه أبو بكر بن أبي شيبة في المصنف(١٠٥٢٦)،عن حفص عن ابن جرير عن عمرو بن دينار قال قال عمر

(٢) لەلایەکەوە هەژارەکانی خزمی خۆی ئەگەر چاویان لێی بووبێت، ڕازی و خۆشحاڵیان دەکات، هەروەها سیلەی ڕەحمیشی بە جێهێناوە لە گەڵیاندا، بەشی یەکەمی ڕیوایەتەکە بنوارە: الموطأ ئیمامی مالیك( ٩٨/١)، وە پاشماوەکەی بنوارە البخاري: (١٤٦١)، ومسلم (٩٩٨).

(٣) رەاه ابن عساكر في تأريخ دمشق(٤٤/ ٣١٦) .

مەبەست لەکەم کردنەوەی وەرگرتن، تا دەگاتە بژێوی شەوو ڕۆژێك، (واتە تەنها بەشی شەووڕۆژێك وەربگرێت) یان هۆقەیەك، ئەوە بۆ دەربڕینی ناپەسەندی سواڵکردن و دەستپانکردنەوەیە لە خەڵك، ئەمە بۆ خۆی لە ڕووی شەرعەوە نەشیاوە. وە حوکمێکی تریشی هەبوو:

کە مەرج نیە بەقەدەر نیصابی زەکاتی هەبێت، ئینجا سواڵکردنی لێ قەدەغە بکەیت.

لەو ڕووەیشەوە کە وەرگرتنی زەکاتی زۆر بە دروست زانراوە، تا زەوی و خانوی پێ بکرێت، ئەمە نزیکە لە گونجانەوە. شێوە ئیسرافێکیشی تێدایە.

بەڵام ئەوەی کە بەشی ساڵێك وەربگرێت، ئەوە حاڵەتێکی میانەڕەوەو، زیاتر وەرگرێت دوچاری مەترسی دەبێت، وە کەمتریش ژیانی لێبەرتەسك دەبێتەوە، ئەم فرمانانە ئەگەر نەتوانرا بخەملێنرێت، ئەوا دەبێبە دڵنیاییەوە ڕای شەرع وەر بگیرێت، موجتەهیدیش تەنها ئەوەندە بۆی هەیە کە حوکم بدات، کە حاڵەتەکەی دێتە بەرچاو.

وە بۆ کەسێکی خۆپارێزی واریعیش: ئەوەی کە پێی دەوترێتئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی

(( إستَفتِ قلبَكَ، وإنْ أفتَوكَ وإن أفتَوك)) [1]،

چونکە گوناهو تاوان دڵ دادەگرێت و ئازاری دەدا، کەواتە ئەوەی زەکات وەردەگرێت، ئەگەر بینی نیگەرانیەك ڕووی لە دڵی کردووە و ئازاری پێدەکێشێت، ئەوا با لە خودا بترسێت و خۆی نەخاتە ژێر باری فەتوایەکەوە کە بۆ ڕوخصەت درابێت و ئەمیش دڵی پێی ڕازی نەبێت.

چونکە فەتوای زاناکان، چەندین قەیدو گرێ و گۆڵی تێدایە، بۆ حاڵەتی زۆر پێویست دەتوانێت سوودیان لێببینیت.

---

(١) رواه أحمد في مسنده(٤/٢٢٨).

وه هەندێك جار خەملاندنی وای تێدایە، کە ڕۆچوون لەو بابەتانەدا، جۆرێکە لە تێکەڵ بوون لەگەڵ گومان و شوبهەدا، با بۆ حاڵەتی پێویست دروستیش بێت ، خۆی لێ نەدا باشترە.

خۆپاراستن لە شوبهەکان لە شیمەی دین پەروەر و خواناسانە، کەبەڕاستی سالیکی ڕێگای دواڕۆژن و خۆیان بۆ ئەو داهاتووە تەرخانکردووە.

## پێنجەم:

## دەبێ پرسیار لە خاوەن ماڵەکە بکات کەچەندێکی لەسەر پێویستە بیدات:

ئەگەر ئەوەی بڕە زەکاتەکەی پێدەدات لەسەرو هەشت یەکی ماڵەکەی بوو، با لێی وەرنەگرێت، چونکە لەگەڵ دوو هاوبەشەکەی تەنها هەشت یەکی ئەو بەشە زەکاتەیان دەکەوێت، کە زەکات دەرەکە لەسەری واجبە

(چونکە پێویستە زەکات بدرێت بە صینفەکان کە بوونیان هەیە، وە هەر پێرێکیش بدرێت بە سێ کەس، کەواتە هەشت یەکی ماڵەکە مافی هاوبەشەکانی دەفەوتێت)

بۆیە دەبێت کەمی کاتەوە، ئەوەندەی بۆ دوو کەس لە صینفەکەی خۆی وەری بگرێت، ئەم پرسیارکردنە پێویستە لەسەر زۆربەی خەڵکەکە، کە بەم ڕێنماییانە ناجوڵێنەوە، یان لەبەر نەزانین، یان لەبەر ئاسانکاری.

لە کاتێکدا دروستە کە ئەو پرسیارە نەکرێت، کە زیاتر گومانی بۆ ئەوە بڕوات کە حەرامی تێدا نیە و مافی خۆیی وەرگرتووە.

وە لەمەودا پشت بەخودا باسی ئەو کاتانە دەکەین کە جێگەی گومانەو پلەی ئەگەرەکان زیاتر دەکات، کە پێویستە پرسیاریان بۆ بکرێت، لە پەڕاوی (حەلاڵ و حەرام)دا ئەگەر خودا مەیلی لێبێت.

# ناوبڕی چوارەم

## باسی صەدەقەی خۆبەخشی و گەورەیی ئەو خێرە و ئادابەکانی وەرگرتن و بەخشینی.

## باسی گەورەیی خێر و بەخشندەیی

**فەرموودەکان:** (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**(تصَدَّقُوا ولَو بتَمرَةٍ، فإنَّها تسُدُّ مِنَ الجائع، وتُطفِئُ الخَطيئةَ كما يُطفِئُ الماءُ النَّار)** [١] خێر و صەدەقە ببەخشنەوە با دەنکە خورمایەکیش بێت ، بۆ کەسێکی برسی جێگەیەکی بۆ دەگرێت، وە هەڵەو تاوانەکانیش دەکوژێنێتەوە، وەك چۆن ئاو بکەیت بەسەر ئاگردا دەیکوژێنێتەوە.

هەروەها حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: **((إِتَّقوا النّارَ ولَو بِشِقِّ تَمرَةٍ، فَإِنْ لَم تَجِدوا فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ))**[٢] خۆتان لە ئاگرپارێزن بابە بەخشینی لەتە خورمایەکیش بێت، ئەگەر ئەوەندەشتان نەبوو ئەوا با بە وشەیەکی پاك و قسەیەکی خۆش بێت و،دڵی یەکێکی پێ خۆش بکەن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( **ما مِن عَبدٍ يتَصَدَّقُ بصَدَقَةٍ مِن كَسبٍ**

---

(١)قال العراقي رواه ابن المبارك في الزهد (٢٢٩/١)(٦٥١). من حديث عكرمة مرسلا ، ولاحمد في مسنده (٢٣٩٨٠)، من حديث عائشة بسند حسن: **استتر من النار ولو بشق تمرة، فانها تسد من الجائع مسدها من الشبعان**. وللبزاز وأبي يعلي في مسنده (٨٦/١)(٨٥)، من حديث أبي بكر: اتقوا النار ولو بشق تمرة، فانها تقيم العوج وتدفع ميتة السوء، وتقع من الجائع موقعها من الشبعان ، واسناده ضعيف. وللترمذي وصححه(٦١٤) وللنسائي في الكبرى٤٢٨/٦(١١٣٩٤)، وابن ماجه (٣٩٧٣)من حديث معاذ: **والصدقةُ تطفئ الخطيئة كما يطفئ الماء النار.**

(٢) رواه البخاري (١٤١٣)، ومسلم (١٠١٦).

**طَيِّـبٍ، ولا يَقبَـل اللهُ إلاَّ طَيِّبـاً، إلاَ كـانَ اللهُ عَـزَّ وجَـلَّ هُـو يأخُـذها بيَمينـهِ، فيربِّيها لَهُ كَما يُربِّي أحَدُكُم فَصيلَهُ أو فلُوَّهُ، حَتَّى تَبلُغَ التَّمرَةُ مِثلَ أُحُد)**[1].

هەر بەنـدەیەك لە كەسـابەتی حەڵاڵ و پـاكی خـۆی خێـرو صـەدەقەیەك بكات، كە خـودا لە ماڵی پاك نەبێت خێـر وەرناگرێت، ئەوا خـودای (عَـزَّ وجَـلْ) بەدەسـتی قـودرەتی و بەرێـزەوە لێـی وەردەگرێـت و، بـۆی پەروەردەدەكـات و گەورەی دەكات، وەك چۆن یەكێ لە ئێوە بەچكە وشترو ئەسپەكەی كە لەشیر دەبـڕێنەوە چـۆن پەروەردەیـان دەكـات، ئـاوا خـودای گەورە ئەو صـەدەقەیە پەروەردەدەكات، تا دەنكە خورمایەك وەك كێوی ئوحود گەورە دەبێت.

وە پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو دەردائی فەرموو: **(إذا طَبختَ مَرقةً، فأكثر ماءَها، ثمَّ انظُر أهلَ بيتٍ مِن جِيرانِك فَاصِبْهُمْ مِنه بمَعرُوف)** [2].

واتە: ئەگەر شلەیەكت لێنا، ئاوی زۆری تێبكەو سەیری ماڵە دراوسێ كانت بكەو، بەسەریان بكەرەوە و، بەشیان بدەو، بە چاكە لەگەڵیان بجوڵێرەوە. هەروەها ددفەرموێت ﷺ:

**((ما أحسنَ عبدٌ الصَّدقةَ إلاَّ أحسَنَ اللهُ الخِلافَةَ عَلى تَركَتِه)**[1].

---

(١)قـال العراقـي رواه البخـاري(١٤١٧) تعليقـا، ومسـلم(١٠١٤) والترمـذي (٦٦١)، والنسائي٤/٤١٨(٧٧٥٩)، في السنن الكبرى واللفظ له وابن ماجه(١٨٤٢)، من حديث أبي هريرة اهـ قال الحافظ الزبيدي(١٦٥/٤): أخرجه البخاري معلقا في كتاب التوحيد بلفظ: **من تصدق بعدل تمرة مِن كسبٍ طيِّب ولا يصعد إلى الله إلّا طيب.**

(٢)قال العراقي رواه مسلم(٢٦٢٥) من حديث أبي ذر قال ذلك له وماذكره المصنف انه قال لابي الدرداء وهم قال الزبيدي(١٦٧/٤): هكذا وقع في سائر نسخ الكتاب وهو تابع لما في القوت، وهكذا هو فيه ولعله وقع تصحيف من النساخ، فان اللفظتين متقاربتان، ثم ان لفظ مسلم: **إذا طبخت مرقة فاكثر ماءها وتعاهد جيرانك**، أو ورده في (البر والصلة) لكن من حديث أبي هريرة لابي ذر وأخرج أبو بكر بن أبي شيبه وأحمد والبزار من حديث جابر بلفظ: **اذا طبختم اللحم فاكثروا المرق فانه أوسع وأبلغ بالجيران** .

(واته: هەر بەندەیەك بە جوانی و ڕووخۆشی و لە ماڵی پاك و حەڵاڵ و بێ منەتکردن و باسکردن، چاکەو صەدەقەیەك بکات؛ ئەوا خودای گەورە بە جوانی ئاگای لە منداڵەکانی دەبێت و سەرپەرشتیان دەکات) .

هەروەها دەفەرموێت ﷺ :

((كلُّ امرئٍ في ظلِّ صَدقَتهِ يَومَ القيامةِ ، حتَّى يُقضَى بينَ النَّاس)) (٢) .

هەمووکەسێك لەژێر سایە و سێبەری صەدەقەو چاکەکەیەتی، لە گەرمای مەحشەردا (کە خۆر بە ئەندازەی میلێك دوور دەبێت لەسەری) ئەوان لە سێبەری چاکەکەیاندا بێ خەم و نارەحەتی دەمێننەوە، تا خەڵکەکە لە لێپێچینەوە و موحاسەبەی خودایی ڕزگاریان دەبێت.

هەروەها دەفەرموێت ﷺ : ((الصَّدقة تسُدُّ سَبعينَ باباً منَ الشَّرِّ))(٣)، واتە: چاکەی خۆبەخش حەفتا دەرگای شەڕو خراپە لەسەر خاوەنەکەی دادەخات.

هەروەها دەفەرموێت ﷺ :((صَدقةُ السِّرِّ تُطفِئُ غَضَبَ الرَّبِّ عزَّوجَلَّ))(٤)، ئەو خێرەی بە پەنهانی و نهێنی دەیکەیت، ڕق و تورەیی پەروەردگار دەکوژێنێتەوە.

---

(١) رواه ابن مبارك في الزهد(٢٢٧/١) (٦٤٦) مرسلا، عن ابن شهاب. بإسناد صحيح، وأسنده الخطيب فيمن روى عن مالك من حديث ابن عمر وضعفه. قال الزبيدي ١٦٧/٤: ابن شهاب هو الزهري، وقد رواه الديلمي في مسند الفردوس ٦٢/٤(٦١٦٩) من طريقه عن أنس.

(٢)قال العراقي: رواه ابن حبان في صحيحه(١٠٤/٨)(٣٣١٠)، والحاكم في المستدرك((٥٧٦/١)(١٥١٧)، وصححه على شرط مسلم من حديث عقبه بن عامر قال الزبيدي(١٦٧/٤): ولفظ الحاكم (حتى يفصل) وأقر الذهبي على تصحيحه، وقال في المذهب اسناده قوي، وقد رواه أحمد في مسنده(١٦٨٨٢)، أيضا ورجاله ثقات.

(٣) رواه الطبراني في الكبير(٢٧٤/٤)، وأخرجه ابن مبارك في البر(ص ١٤٥(٢٨٥)، من حديث أنس بسند ضعيف: إن اللهَ لَيدرءُ بالصَّدَقَةِ سبعينَ باباً من ميتةِ السوء).

(٤) رواه الطبراني في الكبير٢٦١/٨)، والحاكم في المستدرك(٥٦٨/٣)، وقال الزبيدي( ١٦٧/٤): قد تقدم الكلام عليه في الفصل الثاني، وأنه رواه الطبراني في الأوسط، ٣٧٨/٣، ٣٤٥٠)،

هەروەها دەفەرموێت ﷺ:

**((ما الَّذي أعْطَى مِن سَعَةٍ، بأَفضَلَ أجْراً منَ الَّذي يَقبَلُ مِن حَاجةٍ))**[1].

ئەو کەسەی کە لە حاڵەتی هەبوونیدا ماڵەکەی دەبەخشێتەوە، خێری لەوکەسە زیاتر دەستناکەوێت کە لێی وەردەگرێت ) ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێت: ئەو کەسەی کە وەری دەگرێت، مەبەستی ئەوە بێت کە پێویستی نەمێنێ و خۆی تەرخان بکات بۆ بەندایەتی، ئەمە یەکسانە لە پاداشدا لەگەڵ خێرۆمەندەکە کە مەبەستی بتەوکردنی بڕواو دینەکەیەتی..

**(وسئل رسول الله ﷺ أي الصَّدقة أفضَل؟ قال أن تَصَدَّقَ وأنتَ صَحيحٌ شَحيحٌ، تأمَلُ الغِنىَ (البَقاءَ)، وتَخشَى الفاقَة. ولا تُمهِلُ حتَّى إذا بلغَتِ الحُلقوم ، قُلتَ لفُلان كَذا ولِفُلان كَذا، وقد كانَ لفلان)**[2].

(پرسیاریان لە حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ کرد کام خێرو صەدەقە پاداشتی زیاترە؟ فەرمووی: ئەوکاتەی کە لەشت ساغە و، بەهیوای ژیانیت و، ئارەزووی دەوڵەمەندی دەکەیت و، ترسی هەژاربوونت هەیە و، بە هیوای مانەوەی زیاتریت و، لە دەستیشت نابێتەوە، وە ترسی هەژاری و نەبوونیشت هەیە،

---

من حديث أبي سعيد الخدري، ورواه الترمذي كتاب الزكاة (٦٦٤)،عن أنس مرفوعا بأطول منه وقال: حسنٌ غريب.

(١) رواه الطبراني في الأوسط (١٥٠/٨)(٨٢٣١)(٨٢٣٥)، ورواه في الكبير (٤٢٣/١٢)( ١٣٥٧٠)، من حديث ابن عمر بسند ضعيف، وأبو نعيم في الحلية(٢٤٥/٨). وكذا رواه أبو نعيم في الحلية(٢٤٥/٨)، ولفظه ولفظ الطبراني في الاوسط وكذا لفظ ابن حبان: **ما الذي يعطي باعظم أجرا من الذي يقبل إذا كان محتاجا**. وفي مسند الطبراني فقال قال الهيثمي فيه عائذبن شريح صاحب أنس وهو ضعيف وقال الذهبي في الميزان قال أبو حاتم في الجرح والتعديل: ١٦/٧(٧٩): في حديثه ضعف، وقال ابن طاهر ليس بشئ وفيه أيضا يوسف بن أسباط متروك وهذان أيضا في مسند أبي نعيم. ينظر الإتحاف( ١٦٨/٤).

(٢) رواه البخاري (١٤١٩)، ومسلم (١٠٣٢)، من حديث أبي هريرة.

ئەوکاتە خێربکەیت و بەخشندەبیت چاکترە و خێری زیاترە، لەوەی کە گیان بگاتە گەرووت و دڵنیا ببیت لەوەی وادەی مردن هاتووە، ئینجا دەستت بکرێتەوە و ببەخشیت بە فڵان و بە فڵان، کە بە دڵنیاییشەوەماڵەکەیشت دەگات بە فڵان، واتە میراتگرانت بەشی دەکەن و تازە بووە بە موڵکی ئەوان.)

وە ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بە هاوەڵەکانی: **(( تَصَدَّقُوا فقَالَ رَجَلٌ إنَّ عِندي دينارٌ فقالَ أنفِقهُ علَى نَفسِكَ فَقالَ إنَّ عِندي آخرَ. قالَ أنفقْهُ علَى زَوجكَ، فقَال إنَّ عِندي آخرَ قالَ: أَنفِقْهُ علَى وَلدِكَ قالَ: إنَّ عِندِي آخَرَ، قالَ أنفِقهُ علَى خادِمكَ، قالَ إنَّ عِندي آخرَ قالَ أَنتَ أَبْصَرُ بِه))**[1]،

واتە: خێربکەن و ببەخشنەوە، پیاوێك دەڵێت: بەڕاستی من دینارێکم هەیە، فەرمووی: سەرفی کە لە خۆتدا و بۆ بەرژەوەندی خۆت، کابرا دەڵێت: دینارێکی ترم لایە، فەرمووی: سەرفی کە لە خێزانەکەتدا، دەڵێت: دینارێکی ترم لایە، فەرمووی: خەرجی کە لە منداڵەکەتدا، دەڵێت دینارێکی ترم لایە، فەرمووی: سەرفی کە لە خزمەتکارەکەتدا، دەڵێت: دینارێکی ترم لایە، فەرمووی: خۆت باشتر ئاگاداری خۆتیت و چاوساغتریت کە لە چیدا سەرفی بکەیت!

هەروەها دەفەرموێت ﷺ:

**((لا تَحِلُ الصَّدَقةُ لآلِ محَمَّدٍ، إنَّما هِيَ مِن أَوساخِ النَّاس))**[2]،

دروست نیە ئال و نەوەکانی (حەزرەتی) موحوممەد زەکات وەربگرن، چونکە ئەوە چڵکی دەستی خەڵکە، نابێت بەو چڵك و چەپەڵییە خۆیان بڕێنن.

هەروەها دەفەرموێت ﷺ:

**((رَدُّوا مذمَّةَ السَّائِلِ ، ولَو بمِثلِ رَأْسِ الطَّائِرِ مِنَ الطَّعامِ))**[1]،

---

(١) رواه أبو داوود في سننه، (١٦٩١)، والنسائي(٦٢/٥)(٢٥٣٥)، وابن حبان في صحيحه (٣٣٣٧ ) (٨/ ١٢٦)، والحاكم في المستدرك( ٤١٥/١.( ١٥١٥)

(٢) رواه مسلم(١٠٧٢).من حديث مطلب بن ربيعة.

ئەگەر یەکێك داوای لێکردن، ئەوا شتێکی هەربدەنێ لە خۆراك، با بەئەندازەی سەری باڵندەیەکیش بێت. با لەو بارەوە دووچاری لۆمەی خەڵکی نەبن، وە ئەمە کینایەیە لە وەی هەرچەندێك کەمیش بێت. دەستبەڕووی سواڵکەرەوە مەنێن.

هەروەها دەفەرموێت ﷺ: ((لَوصَدقَ السَّائِلُ ما أَفلَحَ مَن ردَّهُ))[2].

ئەگەر سواڵکەرو ئەوەی داوای خێرو زەکات دەکات، ڕاستگۆبێت لە داواکردنەکەی لەبەر پێویستی ئەو داوایەی بکات، ئەوا بە دڵنیایەوە، ئەو کەسەی دەس بەڕوویەوە دەنێت سەرفراز نابێت.

وە (حەزرەتی) عیسی (علیه السلام) فەرموویەتی:

**(مَن رَدَّ سائِلاً خائِباً مِن بَيتهِ، لَم تَغشَ المَلائكَةُ ذلِك البَيت سَبعَةَ أَيَّام)**[3].

ئەوەی بە دڵشکاوی و بێ ئومێدی دەستبەڕووی سواڵکەرێکەوە بنێت و بیگێڕێتەوە، ئەوا فریشتەی ڕەحمەت ماوەی حەفتەیەك ناچنە ماڵەکەیەوە.

پێغەمبەر ﷺ حاڵی وابوو کە دوو کار و شیمە و خەصڵەت هەبوو، نەیدەدا بە دەستی کەسی ترەوە و یارمەتی کەسیشی نەدەویست. بەشەوا خۆی ئاوی دەستنوێژی خۆیی ئامادە دەکرد و ئاوەکەیشی دادەپۆشی، وە هەر خۆیشی بەدەستی پیرۆزی خۆی یارمەتی هەژارانی دەدا .

---

(١) رواه العقيلي في الضعفاء (١/١٢١)، وفيه(رأس الذباب) بدل (رأس الطائر)، ورواه ابن أبي شيبة (٩٩١٥)، عن حميد بن عبدالرحمن قال: **ردّوا السائلَ ولَو بمثلِ رأسِ القَطاط.** )

(٢) رواه الطبراني في الكبير(٨/٢٤٦) بلفظ (**لولا أن المساكين يكذبون ما أفلَح من ردَّهم**) وكذلك هو عند البيهقي في الشعب(٣١٢٦)، وهو بلفظ المصنف رواه ابن عبد البر في التمهيد(٥/٢٩٧).

(٣)وقد روي احمد و البخاري في التاريخ والنسائي من حديث حواء بنت السكن رضي الله عنها رفعته: (**ردوا السائل ولَو لظلف محرق**) يعني : لا تردوه ردَّ حرمان بلا شئ. ولو أنه ظلف ففيه مبالغة وتحذير عن الرد

(( لا يَكِلُ خَصلتينِ إلى غَيرِه، كانَ يضَعُ طَهوُرهُ باللَّيلِ ويُخمِّرُه، وكانَ يُناولُ المِسكِينَ بيَدِه)) [1]،

هەروەها دەفەرموێت ﷺ:

((ليسَ المسكينُ الذي تردُّهُ التَّمرةُ والتَّمرتانِ والُّلقمةُ والُّلقمتان، إنَّما المِسكينُ المُتعَفِّفُ، إقرؤُا إنْ شِئتُم : ﴿ لا يَسألُون النَّاسَ إلحَافاً ﴾ (البقرة /٢٧٣)) [2]،

هەژار بەو کەسە ناڵێن کە خورمایەکی لێرەو لەوێوە بۆ دێت، یان پاروویەکی لەملاو لەولاوە بۆی دەهێنن و دەیخوات، واتە:

داوا دەکات و شتێکی دەستدەکەوێت، بەڵکوو مسکین ئەوەیە کە هیچیشی نیەو، کەسیش پێی نازانێت و، داوایش لەکەس ناکات و خۆیشی ناناسێنێت، ئەگەر دەتانەوێ بیناسن، ئەو فەرموودەیە بخوێننەوە: کە دەفەرموێت:

ئەوانە داواناکەن و خەڵکی تووشی ناچاری ناکەن کە خێریان پێبکەن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺدەفەرموێت:((مامِنْ مُسلم يَكسُو مُسلِماً، إلاَّ كانَ في حِفظِ اللهِ عَزَّوجَلَّ، ما دامَتْ عليهِ مِنهُ رُقعة)) [3]،

(واتە: هەر موسوڵمانێك موسوڵمانێکی تر پۆشتەبکاتەوە، ئەوا بەردەوام لە ژێر چاودێری و پارێزگاری خوادا دەبێت، تا پارچەیەك لەو بەرگەی پێوە بمێنێت)

---

(١)قال العراقي رواه الدارقطني من حديث ابن عباس بسند ضعيف ورواه ابن المبارك في البر مرسلا هـ قال الزبيدي(٤/ ١٧١) : وورواه ابن ماجه(٣٦٢). من حيث ابن عباس قال:

**كان رسول الله ﷺ لايَكِلُ طَهورَهُ إلى أحد، ولاَ صَدَقَتهُ التي يَتَصَدَّقُ بها، يكونُ هُو الذي يَتَولاَّها بنفسهِ)** وأعله الحافظ مغلطاي في شرح ابن ماجه بان فيه علقمه وهو مجهول، ومطهر بن الهيم متروك،

(٢) رواه البخاري (٤٥٣٩)، ومسلم _١٠٣٩) من حديث أبي هريرة، عن عائشة (رضيَ الله عنها)

(٣) رواه الترمذي (٢٤٨٤)بنحوه، وحسَّنهُ والحاكم في المستدرك (٢١٧/٤(٧٤٢٢)، وصحح إسناده، من حديث ابن عباس، وفيه خالد بن طهمان ضعيف. وهو بمعناه عند أبي داوود(١٥٨٢). وانظر الإتحاف ١٧٢/٤.

## ئاسارەکان:

عوروەی کوڕی زوبەیر(خوای لێ ڕازی بێت)دەفەرموێت: [1]،

(حەزرەتی) عائیشە(خوای لێ ڕازی بێت)پەنجا هەزاری کرد بە خێر و صەدەقە، وە بەخشییەوە بەسەر هەژارەکاندا و، سەرپۆشەکەی خۆیشی پینەی پێوە بوو.

موجاهید (خوای لێ ڕازی بێت) لە لێکدانەوەی فەرموودەی خودای (عَزَّ وجَلَّ): ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾(الإنسان/٨) دەفەرموێت: لەگەڵ ئەوەدا کە خۆیان ئارەزویان لێیەتی و، پێویستیشیان پێیەتی کەچی خۆراکەکانیان دەبەخشنەوە بەسەر مسکین و بێباوك و دیلەکاندا .[2]

(حەزرەتی) عومەریش(خوای لێ ڕازی بێت) لە نزاکانیدا دەیفەرموو:

خودایە! زیادەی ماڵ بدە بە هەڵبژاردە و چاکەکانمان، بۆ ئەوەی ئەوانیش بیبەخشنەوە بە خاوەن پێداویستییەکانمان. ،

عەبدولعەزیزی کوڕی عومەیر فەرموویەتی :

نوێژ تا نیوەی ڕێگە دەتگەیێنێت، ڕۆژوو یش دەتگەیێنێتە بەردەرگای پاشا، وە خێرو صەدەقەیش دەتباتە ژوورەوە[3]

وە سالمی ئەشجەعی(ابن أبي جعد) فەرموویەتی:

صەدەقە حەفتا دەرگای شەڕت لەسەر دادەخات و، لێت دووری دەخاتەوە، وە حەفتا جار خێری پەنهانیەکەی زیاترە بەسەر چاکەی ئاشکرادا، وە چەناگەی حەفتا شەیتانیشت بۆ دەشکێنێت[4]،

---

(١) رواه ابن مبارك في الزهد(٧٥٤).

(٢) رواه الطبراني في تفسيره (٢٥٤/٢٩/١٤).

(٣) رواه الدينوري في المجالسة و جواهر العلم(٤٤٠) عن ابن أبي الحواري عن عبدالعزيز بن محمد، و عبدالعزيز روى عنه أحمد بن أبي الحواري، كما في تأريخ دمشق( ٣٣٣/٣٦).

(٤) أوله روى الطبراني في الكبير (٢٧٤/٤)، وآخره رواه ابن مبارك في الزهد(٦٤٩).

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

پیاوێك حەفتا ساڵ بەندایەتی بۆ خودا کرد، لە پاشان کارێکی خراپ و (فاحیشە)لێ ڕوویداو، کردەوەکانی پوچەڵ بوویەوە، لە پاشان بەلای هەژارێکدا تێپەڕی و کەلیرەیەکی پێ بەخشی، خودای گەورە لە گوناهەکانی خۆش بوو، وە خێری هەموو کرداری حەفتا ساڵەکەیشی بۆ گێڕایەوە[1]،

(حەزرەتی) لوقمان (علیه السلام) لەوەصێتەکانی بۆ کوڕەکەی فەرمووی:

---

(١) رواه الحسين بن حرب في (البروالصلة) (٢٧٩)، بلفظ المصنف، ورواه ابن أبي شيبة في (المصنف) (٣٥٣٥٣)، وأبو نعيم في (الحلية) (٢٦٣/١).

ئەبوو بەرەدە دەفەرمویت: کاتێك ئەبو موسا وەفاتی نزیك بوویەوە ، ئەبو بەرەدەی کوڕی بانگ کرد و فەرمووی: یادی ئەو خاوەن کولێرە بکەنەوە، پیاوێك لە دێرەکەیدا خەریکی عیبادەت بوو، ماوەی حەفتا ساڵ، تەنها ڕۆژانی یەك شەممە دادەبەزی، ڕۆژێکی یەك شەممە دابەزی، شەیتانێك خۆی لێ گۆڕی و. چووە سەر شکڵی ئافرەتێکەوەو، حەفتەیەك پێکەوە مانەوە، لە پاشان خۆی لێ ئاشکرا کرد و ئەویش گەڕایە و تەوبەی کرد، هەر هەنگاوێکی دەنا دووڕکات نوێژی دەکرد و سەجدەیەکی دەبرد، شەو گەیشتە دوکانێکەوە، دوانزە هەژاری تێدابوو، بێخودی ڕوی تێکرد و خۆی هەوادایە بەرپێی دوان لە هەژارەکانەوە، ڕاهیبێکیش هەموو شەوێ کولێرەی بۆ دەناردن، هەموو یەکێکیان نانێکی بەردەکەوت، یەکێ لە خاوەن بەشەکان بەری نەکەوت، وتی: ئەوە بۆ بەشی منی تێدا نیە؟ خۆمنیش پێویستم پێیەتی، وتی:

وادەزانی لێت دەگرمەوە؟ وەڵلاهی ئەم شەو بەشت نادەم، کابرای عابیدیش کە تازە تەوبەی کردبوویەوە ، کولێرەکەی خۆی کە وەری گرتبوو، دای بە پیاوەکە، ئەو شەوە کابرای تازە تەوبەکار مرد، کێشانەی حەفتا ساڵ عیبادەتەکەی کرایە بەرامبەر حەوت ڕۆژە خراپەکاریەکەی، هەمووی بەتاڵ بوویەوە، بارسەنگی خراپەکە نەبوویەوە، خراپەکەی زیاتر بوو، بەڵام کولێرەکەی ئەو شەوەی کە وەریگرت و بەخشی بە هەژارەکە، کێشای بە حەوت ڕۆژی خراپەکەدا کێشی کولێرەکە زیاتر بوو، ئەبوو موسا فەرمووی: ڕۆڵە ئاگاتان لە بەسەرهاتی خاوەن کولێرەکە بێت.

ئەگەر هەر تاوان و هەڵەیەکت کرد، خێرا صەدەقەیەك بکە(با بیسرێتەوە).[1]

یەحیای کوڕی معاز (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی:

نابینم دەنکە گەنمێك کێشی بە قەدەر چیاکانی دونیا قورس بێت، مەگەر دەنکێ گەنم کە بە خێرو صەدەقە درابێت.[2]،

(ڕاستە صەدەقە تورەیی خودا ناهێڵێت.وەك ئیبنو عەساکیر لە تەئریخەکەیدا دەیگێڕێتەوە: کاتی خۆی پیاوێك فێربووبوو بە هێلانەی باڵندەیەك، هەرکە بەچکەی هەڵیهێنایە هەڵدەزنی بۆ سەر هێلانەکە و بێچووەکانی دەبرد، ئەم باڵندە بێ زوبانە تینی بۆ هات، ناچار شکاتی گەیاندە حزوری خوا، خودا وەحی بۆ کردو تێی گەیاند کە ئەگەر ئەمجارە ئەو پیاوە هاتەوە، ئەوا لە ناوی دەبەم، بۆ جارێکی تریش کابرا زانی باڵندەکە بەچکەی کردووە، پەیژەیەکی هێنا پیایدا سەرکەوێت، لە ڕێگەدا پیاوێکی هەژاری بینی، کولێرەیەکی پێ بوو پێیبەخشی، لە پاشان ڕۆشت و بێچووەکانی برد، باڵندەکەش هیچی پێینەکراو وتی: ئەی خودایە؛ ئایا تۆ بەڵێنت پێینەدام کە ناهێڵیت و لەناوی دەبەیت؟ خۆ ئەمجارەش گەڕایەوە و بردی، خودای گەورە دیسان ئیلهامی کرد و فەرمووی:

ئەی نازانیت من کەسێك نافەوتێنم کە ئەو ڕۆژە صەدەقەیەك بکات؟ وە دوچاری مردنی خراپی ناکەم، وەك ئیمامی سیوطی لە (الجامع الکبیر) دا باسی دەکات، بۆ ڕاستی فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ **((الصدقة تمنع میتة السوء))**،

(چاکە ناهێڵێت خاوەنەکەی بەشێوەیەکی خراپ بمرێت.)[3]،

**عبدالعزیز ی کوڕی ئەبی ڕواد** دەفەرموێت: کاتی خۆی دەیانووت: سێ شت لە کەنزوگەنجینەکانی بەهەشت یا کانزاکانی چاکە دەژمێررێن،کە بەسەنەدی

---

(١) رواه الحسین بن الحرب،في (البر والصلة) (٢٨١)

(٢)الثعالبي في تفسیره(٢٨١/٢)رواه أبو نعیم في الحلیة( ١١١٧/٧)مرفوعاً،وقوت القلوب١٠٧/٢.

(٣) بنواره الإتحاف( ١٧٣/٤).

دروست گێڕاویەتیەوە: شاردنەوەی نەخۆشی، وە شاردنەوەی خێر و صەدەقە،وە شاردنەوە و باس نەکردنی ئەو بەڵاو موصیبەتانەی دێت بەسەریدا.[1]

حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب(خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: کردەوەکان یەکە یەکەشانازیان بەسەریەکدادەکرد،صەدەقەوتی:من لە هەمووتان گەورەترم.

(**حەزرەتی**) **عەبدوڵلای کوڕی عومەر** جۆرێك لە خورمای تەڕی بە خێر دەبەخشیەوە و دەیفەرموو: بیستوومە لە خودای گەورەوە کە دەفەرموێت:

**﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ﴾**

ناگەن بە خێرو چاکەی شیاو، تا ئەوەی بۆ خۆتان پێتان خۆشە نەیبەخشنەوە لە ڕێی خوادا، خودا ئاگادارە کەمن شیرینی خورمای (سووکەر)م دەوێت و حەزم لێیەتی و دەیشیبەخشمەوە.[2]

**ئیبراهیمی نەخەعی** (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ئەگەر شتێك بۆ خودا بێت و لە پێناوی خوادا بیبەخشم و ئەنجامی بدەم، نامەوێت کە ئەنگی و کەمی تێدا بێت.

**عوبەیدی کوڕی عومەیری لەیسی** (قازی و دادوەری مەککە) فەرموویەتی:

لەڕۆژی قیامەتدا ئەو خەڵکە زیندودەکرێنەوە، بەو شێوەی هەرگیز ئەوەندە برسی و تینوو ڕووت و ڕەجاڵ نەبوون، جا ئەوەی لەبەر ڕەزای خودا نانی بە خەڵکی دابێت، ئەوا خودا تێری دەکات، ئەوەی لەبەر خوا ئاو بۆ خەڵکی بگێڕێت، خودا ئاواشتەی دەکاتەوە، وە ئەوەی کەسانێك لەبەر خودا پۆشتە بکاتەوە خودایش لەو ڕۆژی حەشرەدا پۆشتەی دەکاتەوە.[3]

**حەسەنی بەصری(خودای لێ ڕازی بێت)فەرموویەتی:** ئەگەر خودا بیویستایە

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية،( ١١٧/٧ )، مرفوعاً. وانظر: قوت القلوب (١٠٧/٢).

(٢) عن السيوطي في الدرر المنثور(٢٦٢/٢)، روايته لإبن منذر، عن نافع، عن ابن عمر،

(٣) رواه أحمد في الزهد (١٠٩٢).

هەمووتانی بە دەوڵەمەند دەگێڕاو ، هەژاریی تێدا دروست نەدەکردن، بەڵام هەندێکتانی بـەوانی دیکەتانەوە موبتــەلاو گیـــرۆدە کردووە[1].

**عامری (شەعبی)** (خودای لێخۆش بێت) فەرموویەتی:

هەرکەسێك خۆی لەو کەسەی خێرەکەی پێدەکات بە تامەزرۆ و موحتاج تر نەزانێت بۆ پاداشتی خودایی، ئەوا لێی وەرناگیرێت و، دەدرێتەوە بەسەریدا.

**مالیکی کوڕی ئەنەس (خودای لێخۆش بێت)** فەرموویەتی:

نابینم هیچ خراپییەکی تێدا بێت، کە دەوڵەمەند لەو ئاوە بخواتەوە کە لە مزگەوتەکاندا بۆ خێر دەگێڕرێن، چونکە بۆ ئەوانەیە کە پێویستیان پێیەتی و تینویانە، نەك ئەوانەی کە بە تایبەتی هەژار بن.

وە دەڵێن: **حەسەنی بەصری** (خودای لێ ڕازی بێت) دەڵاڵێکی بەندە فرۆش تێپەڕی بەلایدا، کەنیزەکێکی پێ بوو، لێی پرسی:

ئایا ڕازیتە بۆ نرخەکەی بە دیرهەمێك یان دوو دیرهەم؟ وتی نەخێر،

فەرمووی: دەی برۆ خودا ﷻ بە بەخشینی حۆریەکانی بەهەشت، ڕازی بووە بە وەی لە ڕێی خوادا فلسێك سەرف بکەیت، یان پاروویەك نان ببەخشیت، حۆرییەکت پێدەبەخشێت[2] (مەبەستی پێشەوا حەسەنی بەصری سەوداکردنی کەنیزەك نەبووە، چونکە بۆ ئەو مەبەستە نەچۆتە دەرەوە، وە دەڵاڵەکە تێپەڕیوە بەلایداو، ویستوویەتی تێی بگەیێنێت کە: بازرگانیەکی تر هەیە لە حزووری خوادا بکرێت زۆر بایەخ دارو خێردارترە، کە بەندایەتی بۆ خودا بکات، تەنانەت بە پارچە کولێرەیەکیش حۆرییەکی پێدەبەخشێت...)

---

(١) رواه ابن أبي شيبه في (المصنف) ٣٥٤٧١، وفيه قبل الإستدراك (**ولو شاء لجعلكم فقراء لا غَني فيكم**) عن الحسن مرسلا، **ئەگەر بیشیویستایە هەمووتانی دەکرد بەهەژارو دەوڵەمەندی تێدا درووست نەدەکردن.**

(٢) نثر الدرر( ١٨٣/٥/ ١٨٤).

# باسی حوکمی

## شاردنەوە و ئاشکراکردنی وەرگرتنی صەدەقە

ڕای جیاواز هەیە لەوانە کە خوازیاری دۆزینەوەی ڕێگای ئیخلاص و ڕەزامەندی خودان، هەندێك لە زانایان ڕایان وایە: کە شاردنەوەوی صەدەقەکە باشترە، وە هەندێکی تر مەیلیان بەلای ئاشکرا کردنیەتی، ئێمەش هێما بۆ هەردوو ڕاکە دەکەین، هەریەکەیان چەند واتاو مەبەست و ئافەتی تایبەتی دەگەێنن، لە پاشان ڕووی ڕاستی لەسەر بابەتەکە هەڵدەماڵین و حەقیەتەکەیان بەیان دەکەین:

### باسی شاردنەوەی زەکاتدان:

### پێنج واتای تێدا دەبینرێت:

**یەکەم:** شاردنەوەکە دەبێتە هۆی دەرنەکەوتنی ئەو کەسەی کە زەکاتەکە وەردەگرێت، چونکە بە بەرچاوی خەڵکێکەوە پێی بدرێت، هەست بە کەمی و شکاندنی مروئەتی ئەو کەسەیە و، ڕاگەیاندنی هەژاریەتی، کە بۆ هەژاریش واباشە خۆی دەرنەخات و، بە ناشکرا سواڵ نەکات و، هەموو کەس پێی نەزانێت، مەگەر بە دوایاندا بگەڕێن، کە ئەو پارێزراویی بوونەش نامێنێت،

**دووهەم:** بیشارێتەوە، کە بێ زیان و سالم ترە بۆ دڵ و زوبانی خەڵکی، لەوانەیە ئەو خەڵکە ئیرەیی پێ ببات، یان نارازیبن لەوەی کە بۆچی وەری دەگرێت؟ بۆ کەسابەت ناکات؟ گومانی ئەوەی پێدەبەن کە دەوڵەمەندیشەو وەری دەگرێت! یان دەڵێن: زیاد لە پێویستی خۆی وەری گرتووە، دەی حەسادەت بردن و گومان خراپی و ناوبردنی بە خراپ، لە گوناهە گەورەکانە، بە شاردنەوەی بیانپارێزێت لەو هەموو گوناهانە ئەوە باشترە.

**ئەبووئەییوبی سەختیانی** (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

من جاری وا هەیە بەرگی جوان و نوێ لەبەرناکەم و نایپۆشم، لەبەر دراوسێکەمان تا بە چاوی ئیرەیی وحەسادەتەوە سەیر نەکەن و گوناهبار بن.[1]

هەندێك لە زاهیدە دونیا نەویستەکان فەرموویانە:

زۆر جار ڕێکەوتووە وازمان لە بەکارهێنانی هەندێك شت هێنا بێت، لەبەر خاتری براکانم کە بپرسن: ئەوە لە کوێی هێناوە؟![2]،

ئیبراهیمی تەیمییە (خوای لێ ڕازی بێت) کراسێکی نوێ یان لەبەردا بینی، هەندێك لە براکانی لێیان پرسی: ئەوەت لە کوێ بوو؟ فەرمووی:

براکەم خەیثەمە داویەتی پێم، وە بیشمزانیایە کە خێزانەکەیشي بەم بەخشینەی زانیوە لێم وەرنەدەگرت![3]

**سێیەم:** یارمەتیدانی بەخشەرەکەیە لەسەر ئەوەی خێرەکەی بە نهێنی بمێنێتەوەو، نەبێتە ڕیایی، چونکە خێری بەخشینی صەدەقە بە نهێنی زیاترە لەوەی بە بەرچاوی خەڵکەوە بیکات، یارمەتیدانیش بۆ تەواو کردنی، کارێکی باشەو بە باش دادەنرێت، نهێنیش تەواو نامێنێتەوە مەگەر تەنها لە نێوانی دووکەسدا بێت، هەرچەندێك ئەو نهێنیە کەوتە دەم و زاری کەسانی ترەوە بڵاو دەبێتەوە،

پیاوێك بە ئاشکرا شتێکی دا بە زانایەك ، ئەویش دایەوە بەسەریدا و لێی وەرنەگرت، یەکێکی تر بە پەنهانی شتێکی پێدا ، لەوی وەرگرت.

وتیان بۆچی بەم شێوەت کرد؟ فەرمووی:

---

(١) قوت القلوب( ٢٠١/٢).

(٢)رواه وكيع في (أخبار القضاة) وفيه معنى الخبر الذي قبله، عن محارب بن دثار القاضي.

(٣)رواه هناد في (الزهد) (٦٥٩)، وأبو نعيم في (الحلية)، ١١٣/٤، والخبر عن إبراهيم النخعي لا التيمي، كما في تهذيب الكمال، ٣٧٢/٨، والمصنف تبع صاحب القوت في ذلك ٢٠٢/٢.

ئەمەیان کارە خێرەکەی بە ئەدەبەوە ئەنجامدا. کە چاکەکەی بشارێتەوە منیش لێم وەرگرت، ئەویان چاودێری ڕێساو ئەدەبی تایبەتی نەکرد، منیش کردارەکەیم لا پەسەند نەبوو، بۆیە خێرەکەیم دایەوە بەسەریدا[(١)].

کابرایەکیش لەبەرچاوی خەڵکی شتێکی دا بە یەکێ لە صۆفیەکان، ئەویش لێی وەرنەگرت و پێی دایەوە، پێی وت: بۆچی ڕەددی ئەو خێرەدەکەیتەوە کە خودا بۆی ناردویت و پێی داویت؟ فەرمووی:

بەڕاستی تۆ غەیری خودات کردە هاوبەشی ئەو بەخشینەی کە تەنها هی خودایە، بەوە ڕازی نەبوویت کە خودا چاوی لە خێرەکەتە، ویستت هەموان پێت بزانێت، بۆیە وەرم نەگرت و گەڕاندمەوە بەسەرتا.[(٢)]

یەکێك لە عاریف و خوناسان، دیارییەکیان لە یەکێك وەرگرت، کە بە نهێنی بۆی هێنابوو، پێشتر کە بە ئاشکرا بۆی هێنابوو ڕەدی کردبوویەوە، وتیان بۆچی واتکرد؟ فەرمووی:

تۆ ویستت بە ئاشکرا گوناهێك بکەیت، نەمویست یارمەتی دەرتبم بۆ گوناهەکەت، کاتێك ویستت کە گوێڕایەڵی پەروەردگارت بکەیت، لە سیڕرو نهێنی خۆتدا، ویستم یارمەتی دەرتبم، بۆ تەواو کردنی چاکەکەت[(٣)].

**سوفیانی سەوری** (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ئەگەر بزانم کامەیان ناوی چاکەو خێرەکەی نابات و نایکۆڕێنێتەوە، منیش دیارییەکەیم لێ وەردەگرت[(٤)].

**چوارەم:** بە ڕاستی لە ناچارکردنی وەرگری دیاری و بەخشین کە لەبەرچاوی

---

(١) قوت القلوب (٢/٢٠٢)

(٢)قوت القلوب (٢/٢٠٢)

(٣)قوت القلوب (٢/٢٠٢).

(٤)قوت القلوب ( ٢/٢٠٢).

خەڵکەوە وەربگرێت،ئەوە جۆرێکە لە زیللەت و شکستی دەروونی و، بە سووك سەیر کردن، کەواتە نابێت باوەڕدار قایل بێت بە ژێردەستەیی و زەلیلی خۆی[1]

حاڵی هەندێك لە زانایانیش وابووە، ئەگەر بە پەنامەکی شتێکیان بۆ بهاتایە وەریان دەگرت، وە ئەگەر بەبەرچاوی خەڵکەوە بوایە ڕەدیان دەکردەوە، وە دەیانفەرموو: ئەگەر بە ئاشکرا وەری بگیرن ئەوە نیشانەی زەلیلی و بێ عیززەتی زانستەو، بەسووك سەیرکردنی ئەهلەکەیەتی، کە ئێمە لە پاراستنی ئەو عیززەتە بەرپرسیارین، وە هەرگیز ناتوانم شتێکی وا قەبوڵ بکەم، کە زانستی پێ ڕاسوا ببێت و، ئەهلی عیلمیشی پێ سووك ببێت.

**پێنجەم:** خۆپاراستن لە گومان وشوبهەی هاوبەش پەیدابوون بۆ کارەکەت،

(حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((مَن أُهدِيَ إليهِ هَدِيَّةٌ وَعِندَه قَومٌ... فهُم شُرَكاؤُه فيها))**[2].

ئەوەی دیارییەکی بۆ بێت و کەسانێکیش لەلای دانیشتبن، ئەوانە بەشدارن لە دیارییەکە، وە بەوەش کە وەرەقی زیوی بۆ هێنابێت، یان زێڕو ئاڵتوون بێت، بەوە لە دیار بوون دەرناچێت، چونکە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((أفضلُ ما أهْدَى الرَّجُلُ إلى أخيه وَرِقا، أو يُطعِمُه خُبزاً))**[3].

---

(١)حديث( **لاينبَغي للمؤمنِ أن يذلَّ نفسَه**)، رواه الترمذي (٢٢٥٤) وابن ماجه(٤٠١٦)، والخبر في القوت (٢٠٢/٢).

(٢)قال العراقي: رواه العقيلي وابن حبان في الضعفاء والطبراني في الأوسط(٢٤٧١) والبيهقي من حديث ابن عباس، وأبو نعيم في الحلية(٣٥١/٣) وانظر إلى الإتحاف( ١٧٨/٤).

(٣)هكذا أورده صاحب القوت، وقوله ورقا هكذا بالنصب في سائر الكتاب، ونسخ القوت: ووجدت بخط الحافظ العراقي في نسخة المغني صوابه ورق، قلت: ووجهه أنه مرفوعٌ على الخبرية، وعلى تقديره يبقى المبتدأ بلا خبر فتأمل، قال العراقي رواى ابن عدي في الكامل (٤٣٣/٣)، والبيهقي في الشعب(٧٢٧٣)عن أبي هريرة (رضي الله عنه) **سئل رسول الله ﷺ**

باشترین دیاری بیبات بۆ براکەی، یان دراوێکی وەرەق نەقدییە.(بە بەخشین یان وەك (زەمەخشەری) دەفەرموێت: بە قەرز پێی بدات) یان نانێکی پێ بدات و لە برسێتی ڕزگاری بکات.

کەواتە داناوە کە دەکرێت ئەو نەقد و وەرەقەیە بکرێت بە دیاری، بە وە نابێت لە ناو کۆمەڵێکدا یەکێك تایبەت بکرێت و دیاری پێبدرێت، مەگەر بە ڕەزامەندی هەموان بێت.

ئەمەش خاڵی نابێت لە شوبهەی حەرام بوون، ئایا هەمووی بە دڵ پێی خۆشە، یان ئەگەرەکانی دیکە، بەڵام ئەگەر بیخاتە لاوە و بە پەنامەکی دیارییەکەی پێببەخشێت، ئەو شوبهە و ئەگەرانە هیچی نامێنێت.

---

**أي الأعمال أفضل؟ قال: أن تدخل على أخيك المسلم سرورا، أو تقضي عنه دينا، أو تطعمه خبزا**، .وروى الترمذي مرفوعا: **من منَحَ منيحةَ لبنٍ، أو ورق، أو هدي زقاق، فان له مثل عتق رقبة**، والحديثان يوفيان شاهد المصنف. وحديث ابن عمران: **أفضل العمل عند الله أن يقضى عن مسلم دينه أو يدخل عليه سروراً، أو يطعمه خبزا**، ولأحمد و الترمذي وصححه من حديث البراء : **من منح مِنحة وَرق أو منحة لبن أو أهدى زقاقا فهو كعشاق نسمة** اهـ قال الزبيدي: حديث ابن عمر يصلح أن يكون شاهد للمحملة الثانية وهو ظاهر، وللقائل أن يقول: لم خص الخبز ، مع أن طعام اللحم وغيره من الاطعمة يدخل بالفضيلة؟ فالجواب إنما خصه لعموم تيسير وجوده حتى لا يبقى للمرء عذر في ترك الافضل عن الاخوان يصلح ان يكون أيضا شاهد للجملة الاولى، فان الديون لا تُقضى غالبا لا بدفع النقود ثم ان حديث ابن عمر المذكور أخرجه البيهقي وابن أبي الدنيا في قضاء الحوائج من حديث أبي هريرة سئل رسول الله ﷺ **أي الاعمال أفضل فقال**:

**أفضل الاعمال أن تدخل على أخيك المؤمن سرورا، أو تقضى عنه دينا، أو تطعمه خبزا**.وفي سند البيهقى عمار بن محمد فيه نظر، والوليد بن شجاع قال ابو حاتم لا يحتج به، وأما حديث البراء فيصلح ان يكون شاهدا للجملة الاولى، خاصة وقد رواه ابن حيان وكذلك صححه البغوي تبعا للترمذي وقال الهيتمي رجال أحمد رجال الصحيح، انظر الإتحاف( ١٧٨/٤).

# بەئاشکرا وەرگردتنی زەکات، وە باسکردنی:

## ئەمەش چوار مانا و واتای لێدەکەوێتەوە:

**یەکەم:** زیاتر واتای ئیخلاص و دڵسۆزی و ڕاستگۆیی و خۆپارێزی تێدایە لە وەی کە حاڵی وەرگرەکەی بگۆڕێت. یان تووشی مەرایی و ڕیایی ببێت.

**دووهەم:** لەبەرچاوی خەڵکدا ئەو ناوو شۆرەت و پلەو پایەی نامێنێت کە وەری دەگرێت، وە زیاتر واتای بەندایەتی و هەژاری بەرجەستە دەکات بۆی، ئەوەیشی نامێنێت کە ئیتر پێویستی بەکەس نیە، یان فیز و دەمارێکی هەبێت، بەوەی بە ئاشکرا زەکاتەکە وەردەگرێت لووت بەرزییەکەی دەشکێنێت.

بۆیە عاریفێکی ڕەببانی بە قوتابیەکەی فەرموو:

ئەگەر شتێکت وەرگرت بە ئاشکرا وەری بگریت باشترە، لەبەر دوو هۆکار:

تۆ خۆت مەبەستت ئەوەبێت کە خۆت بشکێنیتەوەو دورکەویتەوە لە نەسەقزلی و دەمار، کەواتە بەمە دینەکەت سەلامەت دەبێت و، کەمتریش تووشی ئافەتەکانی نەفس دەبیت، وە لەبەرامبەریشدا، لە دڵی بەخشەرەکەدا زیاتر خۆشەویست دەبیت و، ڕاستگۆیی و ئیخلاصت دەردەکەوێت بۆی، کە ئەویش بەم شێوەیەی پێ خۆشە کە ئاوا بتبینێت. چونکە چەندێك لەبەرچاوی ئەو مەزنتر ببیت و خۆشتری بوێیت، ئەوەندەش پاداشتی زیاتر دەبێت لە بەخشینەکەیدا، تۆیش پاداشتت دەبێت لای خودا، کە هۆکار بووی بۆ ئەم دڵخۆش کردن و زیادە پاداشتەی زەکاتدەرەکە.[1]،

**سێیەم:** عاریف و خواناس، جگە لە خودا هیچ مەبەست و ئامانجێکی تری نیە سەیری بکات و، چاوەنواڕی لێبکات، کەواتە بەئاشکرا وەری بگرێت،

---

(١) قوت القلوب ٢/٢٠٢.

یان بە نهێنی لای یەکسانە، بەلای ئەهلی تەوحید و یەکتاپەرستانەوە ، نابێت حاڵەتی جیاوازی هەبێت، چونکە جۆرە شیرکێك تێکەڵی کردارەکەی دەبێت، وەك هەندێك لەو عاریفانە فەرموویانە:

ئێمە کاتی خۆی ئەرزش و بەهایەکی ئەوتۆمان بۆ نزاو دوعای ئەوانە دانەدەنا کە بەئاشکرا خێریان وەرنەدەگرت.بەڵام بە نهێنی و پەنامەکی وەریان دەگرت[1]

ئەوەی لابەلای ڕازی بوون یان نەبوونی خەڵکیدا بکاتەوە، نیشانەی نوقسانی حاڵی خۆیەتی، بەڵکوو دەبێت تەنها سەرنجی لە سەر خودای تاك و تەنها بێت، دەگێڕنەوە لە یەکێك لە شێخەکانەوە: کە لەناو موریدەکانیدا زۆر مەیلی دڵی دەدا بەیەکێکیان، ئەمەش موریدەکانی دیکەی نیگەران کردبوو، ویستی مەزنی و هۆکاری لەپێش بوونی ئەم موریدەیان بۆ دەربخات، هەریەکێك لە موریدەکانی سەرو باڵندەی پێدان و فەرمووی:

بچن لە جێگەیەکدا کەس نەتان بینێت، بۆم سەر ببڕن و بیهێننەوە، هەموو ڕۆشتن و دوورکەوتنەوەو، پاش ماوەیەك گەڕانەوەو، هەموو سەریان بڕی بوو، جگە لەو موریدەی کە زیاتر خۆشی دەویست، ئەو باڵندەکەی بە ساغی بۆ هێنایەوە، پرسیاری لە هەموویان کرد، وتیان: ئەوەی شێخەکەمان فەرمانی پێداین، جێبەجێمان کرد، شێخەکەیش بە موریدەکەی فەرموو:

ئەی تۆ بۆچی باڵندەکەت سەرنەبڕی و بە ساغی هێناتەوە، وەك هاوڕێکانت سەرت نەبڕیوە؟ موریدەکە فەرمووی: هەرچیم کرد جێگەیەکم نەدۆزییەوە کە کەسێك من نەبینێت تێیدا ، چونکە خودا لە هەموو جێگاکاندا بوونی هەیە و دەمبینێت، شێخەکەیش فەرمووی: لەبەر ئەمەیە کە مەیلی دڵم زیاتربوو بەلای ئەودا، چونکە لاناکاتەوە تەنها بەلای خوادا نەبێت[2] ،

---

(١) هەمان سەرچاوە.

(٢) الرسالة القشيرية ص/٣٣٤.

**چوارەم:** ئاشکراکردنی وەرگرتنی زەکات، هەستانە بە زیندوکردنەوەی سوننەتی شوکرانە بژێری، وەك خودا فەرموویەتی:

**﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾** (الضحى/١١)

واتە باسی ئەو نیعمەتانەی خودا بکە کە بەخشیونی بە خەڵك، کە بەخشینەوەیشی باشترین جۆری باسکردنیەتی، وە شاردنەوەی بە کوفرانی نیعمەت دەژمێررێت، خودای گەورە زەمی ئەو کەسانەی کردووە کە نیعمەتەکانی خودا دەشارنەوە و، بەبەخیلیش ناوی بردووە، وەك قورئان دەفەرموێت:

**﴿الَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ وَيَكْتُمُونَ مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُهِينًا﴾** (٣٧/النساء) ( کۆتایی ئایەتی پێشوو دەفەرموێت: خودا ئەوانەی خۆشناوێت کە خۆیان ڕژدو پیسکەن، تەنها بەوەیشەوە ناوەستن، بەڵکوو فەرمان بە خەڵکیش دەکەن کە ڕژدو دەس نوقاوبن، هەروەها ئەو دارایی و زانایی و بەهرەی کە هەیانبووە دەیشارنەوە. واتە ئینکاری نیعمەتەکەی خودا دەکەن، بەوەی کە خەڵکی لێبێبەشدەکەن، ئەوەش ئینکاری نیعمەتەکانی خودا بکا کافرە و، ئێمە سزایەکی سەختی سەر شۆڕکەرمان بۆ کافران ئامادە کردووە)[١].

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((**إذا أنعَمَ اللهُ على عَبدٍ نِعمةً أحبَّ أن تُرى عَلَيهِ**))[٢]،ئەگەر خودا بە نیعمەتێك بەندەیەکی بەسەربکاتەوە، پێیخۆشە ئاسەواری نیعمەتەکەی لەسەر ببینرێت.

یەکێك لە عاریفان بە نهێنی شتێکیدا بەیەکێك، ئەویش دەستی لەسەرلاداو

---

(١) خۆلاصەی تەفسیر نامی٨٤.

(٢) رواه أحمد في مسنده (٤٧٣/٣)، وهو عند الترمذي بنحوه(٢٠٠٦).

ڕەدی کردەوەو فەرمووی:

ئەمە بەشێکی دونیاییە، بە ئاشکرا بیدەیت و وەربگیرێت باشترە، بەڵام لەو فرمانانەی کە پەیوەنداری ئاخیرەتن بە نهێنی بێت باشترە[1]،

بۆیە هەندێکیان فەرموویانە: ئەگەر مەبەستت خودایە، کە بەئاشکرا شتێکیان پێدابیت، ئەوا وەری بگرەو، ئەگەر پێویستت نەبوو، ئەوا بەنهێنی ڕەددی بکەرەوە[2]

وە هانی خەڵکی دراوە کە سوپاسی یەکتری بکەن: (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (**مَن لَم يَشكُرِ النَّاسَ لَم يَشكُر اللهَ عَزَّ وجَلْ**) [3]،

(ئەوەی سوپاسی خەڵکی نەکات، مانای وایە ناتوانێت سوپاسگوزاری خوای گەورەش بکات، چونکە هەرخودایە کە ئەو هۆکارەی بۆ ناردووە و نیعمەت و یارمەتی پێدا ڕەوانە کردووە)

سوپاس کردنیش جێگەی پاداشتدانەوەیەك دەگرێتەوە، تا گەیشتووە بەوەی کە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((**مَن أَسدَى إلَيكُم مَعرُوفاً فَكافِؤُهُ، فإن لَم تَستَطِيعُوا فأثنوا عليهِ بهِ خَيراً، وادعُوا لَه حَتَّى تَعلَمُوا أَنَّكُم قَد كَافأتمُوه**))[4]،

ئەوەی چاکەیەکی لەگەڵ کردن، پاداشتی بدەنەوە، ئەگەر نەتانتوانی ناوی بەباشە بەرن و نزای خێریشی بۆ بکەن، ئەوەندەی بۆ بپاڕێنەوە تا دڵنیا ببن کە پاداشتتان داوەتەوە.

کاتێك موهاجیرە کۆچکردووەکان ئەوەندە ستایشی ئەنصارەکانیان کردوو

---

(١) قوت القلوب/٢/٢٠٢.

(٢) هەمان سەرچاوە.

(٣) رواه أبوداود (١٦٧٢)، والترمذي(١٩٥٤).

(٤) رواه أبو داوود (١٦٧٢)، والنسائي(٨٢/٥).

فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا :

کەسمان نەدیوە لەمانە باشتر کەلایان دابەزیوبن، ماڵەکانیان لەگەڵدا بەشکردین، تا ترسمان بۆ پەیدابووە، کە هەموو پاداشتەکە ببەن بۆخۆیان، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی:

**(( کلاً ، ما شَكَرتُم لَهُم ، وأثنَيتُم بِهِ عَلَيهِم))** [1]

واتە نەخێر وانیە، ئەوەی کەئێوەش نزاتان بۆ ئەوان کردووە و سەناو ستایشتان کردوون، بەرامبەر دەبێت لەگەڵ چاکەکانی ئەواندا.

کەواتە دوای ئەو ڕوونکرنەوەیە و، کاتێك کە هەموو واتاکانت بەم شێوە زانی، کەواتە بزانە جیاوازی بیروڕاکان لەم بارەوە لەسەر مەسەلە و پرسەکە نیە، بەڵکوو جیاوازییەکە لەسەر حاڵەکەیانە:

## بۆ ئەوەی زیاتر پەردە لەسەر ئەم بابەتە هەڵبدەینەوە دەڵێین:

ئێمە بە دڵنیاییەوە بڕیارمان نەداوە کە لە هەموو کاتەکاندا شاردنەوە یان ئاشکرا کردن باشتر و خێری زیاترە، بەڵکوو بەپێی نیەتەکان و کەسەکان گۆڕانیش بەسەر ئەم بابەتەدا دێت، کەواتە ئەوەی دڵسۆزە بە پاشەڕۆژی خۆی، دەبێت چاودێری نەفسی خۆی بکات، بزانێت لە چ ئاستێکدا خۆی دەبینێتەوە؟ با بەرەو پەتی سەرکەشی بەرز نەبێتەوە، وە بە فرت و فێڵی لێشێواندنی شەیتانی و، مەکرو حیلەی نەفسی دانەغڵەوێت و دەسخەڕۆ و گیرۆدەنەبێت، هەندێك جار دەبینین زیاتر لە کاتی شاردنەوەدا تووشی پلانی کوشندە دەبێت، کە نەیارە دیارو شاراوەکانی فرت و فێڵی لێبەکەن.

هەرچەندە لە هەردوو بوارەکەدا ئەو دەرفەتە کاریگەری خۆیی هەر دەبێت:

**چۆن فێڵ و پیلان لە ڕێگەی بە پەنهان کردنی بابەتەکانەوە بۆی دێنە ژورەوە**

---

(١) رواه الترمذي (٢٤٨٧)، ولفظ النبي ﷺ ((لا ماذعوتُم اللهَ لَهم، وأثنيتُم عَلَيهم)).

چونکە سرووشتی مرۆڤ زیاتر حەزی لە خۆشاردنەوەیە : چونکە جاهو شۆرەت و پلەو پایەی کەمدەبێتەوە و، لەبەرچاوی خەڵکیدا سووك دەبێت و ئەو بەهایەی نامێنێت و، خەڵکی بەبێ ڕێزیەوە سەیری دەکەن، وە سەیری کابرای بەخشەریش بە چاوێکی ڕێز و گەورەییەوە دەکەن، ئەمە ئەو دەردە شاراوە کوشندەیەیە، کە نەفسی مرۆڤ پێی دەسخەڕۆ دەبێت و، شەیتانیش واتای خێرو پیاو باشی دەکاتە ناو کارەکانیەوە، تا بتوانێت یەکێ لەو پێنج عیللەت و هۆکارەی کە باسمان کردن، بکاتە بیانووی خۆی و بڵێت:

من بۆیە حەزم بە شاردنەوەیەی وەرگرتنی زەکاتەکەیە؛ وە لەبەر یەکێك لەم هۆکارانەیە کە خۆی لابێت بە پیاوێکی باش.

کێشانەو پێوانەی دەرکەوتنی ڕاستی، لە نێوانی هەریەکە لەم دوو لایەنە تەنها دەگەڕێتەوە بۆ یەك شت:

ئەویش ئەوەیە: کە سەرنج و تێڕامانەکانی، بۆ وەرگرتنی صەدەقەیەك بۆخۆی، وەك هەمان سەرنج و تێڕامان بێت، کە بۆ یەکێکی تری هاوێنەی خۆیی دەدات.

ئەگەر دەیەوێت خەڵکەکە بپارێزێت لە غەیبەت و بە خراپ ناوبردن و ئیرەیی و حەسادەت و بەدگومانی، یان حەزناکات ڕووی نهێنیەکانی ئەو خەڵکە هەڵبماڵرێت، وە پێی خۆشە کە یارمەتی بەخشەرەکە بدات، لەسەر بە نهێنیی پێ کردنی بابەتەکەو، پاراستنی زایاریەکانیش، کە خەڵکی بەسووکی سەیری نەکات و عیززەتی خۆییشی لە دەس نەدات، هەموو ئەم حاڵەتانەی لەوانەیە بۆی ئاشکرا ببێت، لە دەرخستنی ڕاستی و ڕاستگۆیی براکەی، جا ئەگەر ئاشکراکردنی حاڵ و فرمانی خۆیی لا گرانتر و قورستر بوو، لە ئاشکرا کردنی حاڵی هاوڕازەکەی، ئەوکاتە ئەگەر وای لێکدابێتەوە کە خۆی پاراستووە لەو واتایانەی کە خستمانە بەرچاو، ئەوە جۆرێکە لە خۆ بەسەهو بردن و هەڵەی کاریگەر، کە بە جوانکاری نەفس و شەیتان لێی دەشێوێنن و فێڵی لێدەکەن،

چونکه زەلیل بوونی عیلم جیایەو، زەلیل بوونی زاناکە خۆی جیاوازە، نابێت خۆی بخاتە شوێنی عیلمەکە، واتە: ئەو بۆ خۆی شین و گریە و، خەم لە ئەصڵی زانستەکە بخوات، نەك لە زانستی زەید یان عەمر کە تووشی نەنگی و کەمی ببێت.

غەیبەت حەرامە، لەو ڕوانگەوە سەیری بکات، کە کەسایەتییەکی پارێزراو دەشکێنێت و ناوی بەخراپە دەبات، نەك لەو لایەنەوە بیری لێبکاتەوە، کە باسی کەسێکی تایبەتی بکرێت.

هەرکەسێك بە وردی ئەم سەرنج و تێڕامانەی هەبێت، ڕەنگە شەیتان نەتوانێت زبانی لێبدات یان بەکاری بهێنێت، ئەگینا بەردەوام کارەکانی زۆر دەبن و، بەختیشی کەم دەبێت.

## لایەنی پێدانی زەکات و ئاشکراکردنیشی:

مەیلی سروشتی مرۆڤ بۆ ئاشکراکردنی کارێك، بۆ ئەوەیە کە دڵی کابرای خێرۆمەند خۆش بکات، وە هاووێنەی ئەویش هانبدات و بیانجوڵێنێت بۆ کاراکردنیان، کەکاری وەها بکەن، یان لەبەر خۆدەرخستنی خۆیەتی لای کەسانی دیکە، کە بزانن چەندێك سوپاسگوزاری کەسێکە، کە چاکەی لە گەڵدا بکات، بۆ ئەوەی ئەوانیش بەو شێوەیە بن، کە ئەمەش دەردێکی کوشندەی شاراوەیە لە ناخدا دروست دەبێت، وە شەیتانیش ناتوانێت ڕاستەوخۆ زەفەر بە موسوڵمان ببات، مەگەر لە ڕێگەی ڕژانی ئەو ژەهرەوە کە بڵاوی دەکاتەوە، لەپاڵ بەرگری کردن لە سوننەت، خەڵکانێکیش تووش بکات. بۆیە دەچرپێنێت بە گوێیدا: شوکرانەی خەڵکی چاك سوننەتەو شاردنەوەی چاکەکانیان وەك ڕیاکاری وایەو، هەمان ئەو چوار واتایەی کە باسمان کرد دەهێنێتەوە بەرچاوی و، بۆ ئەوەی هانی بدات وبە شێوەیەك کاریگەری لەسەر هەبێت، کە چاکەکان بەرامبەری کراوە یان دەیکات ئاشکرای بکات.

مەبەستە شاراوەکەیشی هەر ئەوەبوو کەوتمان.

کەواتە چۆن ئەم بابەتە بکێشین و لە ترازووی بدەین، چڵك و ژەنگی نیەتە خراپەکان لە ئەصڵەکانی جودا بکەینەوە؟

دەبێت سەیری مەیلی دڵ و نەفسی خۆی بکات، لەو سوپاسەی کە دەیکات، ئایا حەزی لەوەیە کە سوپاسەکەی نەگات بە بەخشەرەکە، یان بەوانەی دەیەوێت خێری پێبکەن؟

وە لە نێوانی کۆمەڵێکی تریشدا. کە حەزناکەن بەخشینەکەیان ئاشکرا بکرێت، وە دەیانەوێت بە نهێنی بمێنێتەوە، وە نەریتیشیان وایە کە خێر بەکەسێ نادەن کە نەزانن دەیشارێتەوەو سوپاسیشیان ناکات، جا ئەگەر ئەم دوو حاڵەتەی لا یەکسان بوو. کەواتە ئەوکاتە با بزانێت:

کە هۆکاری سوپاسکردنەکەی پەیڕەوی کردنە لە سوننەت. باسکردنی ئەو نیعمەتەی کە خودا فرمانی داوە بە سوپاسکردنی، ئەگەر بەم شێوەش نەبوو، ئەوا بزانێت: کە فریوی خواردووە و، ڕاستی لێ شێواوە، نابێت باسی بکات.

لە پاشان ئەگەر دڵنیاش بوو کە هۆکاری کارەکانی خۆی پەیڕەوی کردنی سوننەتەو مەبەستی لابەلای نیە، کەواتە با بێئاگانەبێت لەو مافەی کە لەسەریەتی، لەلایەن خاوەن ماڵەکەوە، ئەو کاتە با بنوارێت :

ئەگەر کابرای خاوەن خێر حەزی لە تاریف و پیاهەڵدان بوو، دەبێ ئەم لەسەر ئەو گوناهە یارمەتی نەدات، وە نابێت بە ئاشکرا سوپاسی بکات ، بەڵکو دەبێت بیشی شارێتەوەو ئاشکرای نەکات، چونکە دانەوەی مافەکەی ئەوەیە کەلەسەر حەرام یارمەتی نەدات، ئەوەش کەداوای سوپاسی لێبکات جۆرێکە لە زوڵمکردن.

وە ئەگەر دڵنیا بێت کە حەزی بە سوپاس و پیا هەڵداندا نیە، وە لە خێرەکەیشی ئەو مەبەستەی نیە ، لەم کاتەدا با سوپاسیشی بکات و چاکەکەیشی ئاشکرا بکات، هەر لەبەر ئەمەیشە کە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەوکەسەی کە لەخزمەتی ئەودا تاریف و ستایشیان دەکرد،

فەرمووی: ((ضَرَبتُم عُنُقَه، لو سَمِعَها..ما أَفلَح))[1]، واته: بەڕاستی لە گەردنتان داوە، خۆ ئەگەر بیبیستێت، ئەوا سەرفراز نابێت، چونکە نەفسی پێی خۆشدەبێت و تاریفی بەرەو ڕوویش بۆ ئەو جۆرە کەسانە باش نیە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ ستایشی کۆمەڵێکی دەکرد کە هەموویشیان لە پاڵیدابوون و، بەبەرچاویانەوە تاریفی دەکردن، چونکە متمانەی لەسەر بڕواو یەقینیان هەبووە، وە دەیزانی کە ئەو جۆرە پیاهەڵدانە زیانیان لێ نادات، بۆیە بەیەکێکیانی فەرموو:(( إِنَّهُ سَيِّدُ أَهلِ الوَبرِ))[2] بەڕاستی ئەوکەسە گەورەی پیاوانی ئەهلی سارا و بادییە.

وە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((إذا جاءَكُم كَرِيمُ قَومٍ فَأَكرِموهُم))[3]، ئەگەر ڕێزداری هۆزێك هات بۆ لاتان ئەوا ڕێزی لێبگرن، هەروەها پێغەمبەر ﷺ گوێی لە وتەی پیاوێکەوە بوو کە قسەی دەکرد، وە سەرسام بوو لە ڕەوانبێژی و جوانی قسەکانی، بۆیە

---

(١) رواه البخاري(٢٦٦٢)، ومسلم (٣٠٠٠) دون زيادةِ (لَو سَمِعَها ما أفلَح). وتمامه (( إذا كانَ أحدكم مادِحا لامَحالَة. فليَقل: أحسبُ فلاناً واللهُ حسيبُه. ولا أزكي على اللهِ أحداً. أحسَبه كذا وكذا، إن كان يعلَم ذلك منه.) والزيادة رواها أحمد في المسند(٥١/٥). وبلفظ: ويحك قطعت عنق أخيك، والله لو سمعها ما أفلح أبداً. وذكر الحافظ في (الفتح الباري)( ٢٧٦/٥)، إحتمال أن يكون المثنى هو محجن بن الأدرع الأسلَمي، والمثنَى عليه هو عبدالله (رضي الله عنهم أجمعين)

(٢) رواه الحاكم في (المستدرك)( ٦١١/٣)، قاله ﷺ في حق الحليم الكريم قيس بن عاصم للنقري. وأخرجه البغوي في معجم الصحابة، كما في البدر المنير لابن الملقن٦٦٦/٤، والطبراني في الكبير(٣٣٩/١٨(٨٧٠)، وابن قانع في معجم الصحابة.( ٣٤٨/٣(٨٨٥)، في معاجمهم، وابن حبان في الثقات( ٣٣٨/٣(١١١٠)، من حديث قيس...

(٣) رواه ابن ماجه (٣٧١٢)، قال ﷺ في حق جرير بن عبدالله (رضي الله عنهما) كما في المستدرك ( ٢٩١/٤) ورواه أبوداوود في المراسيل ص/٣٤٧(٥٥١)من حديث الشعبي مرسلا بسند

فەرمووی: **((إِنَّ مِنَ البَيانِ لَسِحراً))**[1]، واتە: هەندێك دەربڕین و وتار هەیە، ئەوەندە كاریگەرە وەك سیحر كار لە دڵ دەكات.

وە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**(إذا عَلمَ أَحدكُم مِن أخيه خَيراً، فليُخبرْهُ، فإِنَّه يَزدادُ رغبَةً في الخَير)**[2]،

(ئەگەر كەسێك لە ئێوە خێرو چاكەو خەصڵەتی باشی لە براكەی بەدی كرد، با هەواڵی پێ بدات، ئەوە یارمەتی ئەو دەدات كە خێرەكانی زیاترو باشتر بكات.)

وە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((إذا مدحَ المؤمِنُ ربّا الإيمان في قلبهِ))**[3]، (مرۆڤی باوەڕدار ئەگەر ستایشی كەسێك بكات، ئەوا بڕوا لەدڵیدا پەروەردە دەكات و گەشەی پێدەدات، چونكە دەزانێت چۆن تاریفی دەكات.)

**(حەزرەتی) سوفیای سەوری** فەرمووی: [4]،

ئەگەر كەسێك ئەوەندە شارەزابێت خۆی بناسێت، ئەوا تاریف و پیا هەڵدانی كەسی تر زیانی لێ نادات.

هەروەها سوفیان بە یوسفی كوڕی ئەسباطی فەرموو:

ئەگەر چاكەیەكم لەگەڵدا كردیت، وە من خۆشحاڵترو شادمان تر بووم پێی

---

صحيح. وقال روى متصلا وهو ضعيف، والحاكم في المستدرك(٣٢٤/٤)(٧٧٩١)، نحوه من حديث معد الأنصاري عن أبيه وصحح إسناده، ولتفصيل أكثر أنظر إلى الإتحاف( ١٨٢/٤)

(١) **رواه البخاري في رجلين خطبًا أمامه ﷺ . حكي أنهما الزبرقان بن بدر و عمر بن الأهتم، كما في فتح الباري(٢٣٧/١٠)**

(٢) رواه الدرقطني في العلل (٣٠٤/٧) (١٣٧١) بنحوه. قال العراقي وراه الطبراني من حديث أسامه بن زيد بسند ضعيف اهـ قلت: وكذا رواه الحاكم ولفظهما: **إذا مدح المؤمن في وجهه ربّا الإسلامَ في قلبهِ** : الإتحاف( ٤/ ١٨٢).

(٣) رواه الطبراني في الكبير (١٧٠/١)(٤٢٤) من حديث أسامة، والحاكم في المستدرك، (٥٩٧/٣). (٦٥٣٥)

(٤) قوت القلوب (٢٠٣/٢).

له تۆ، وه وایشم دهبینی که ئهوه نیعمهتی خودایه (عَزَّ وجَلْ)هو. هی تۆیه و بهسهر منهوهیه، ئهوکاته سوپاسم بکه لهسهری ئهگینا سوپاس مهکه[١]

دهبێ چاودێری وردهکاری ههموو ئهم واتایانه بکات، ئهوانهی که چاودێری دڵیان دهکهن، چونکه ئهو کردارانهی به ئهندامهکانی جهسته دهکرێن، لهگهڵ ئیهمال کردن و بێبایهخ سهیرکردنی ئهو وردهکاریانه، ئهوه دهبێته جێی پێکهنین و گاڵتهپێگردنی شهیتان، وه مایهی بهدبهختی دهبێت، که زۆر خۆی ماندوو دهکات و کهمیش سوودمهند دهبێت.

وه ههر نموونهی ئهم زانستهیه که پێی دهوترێت :

فێربوونی مهسهله و پرسێکی ئهو زانسته؛ باشتره له بهندایهتی کردنی ساڵێکی تهواو، چونکه بهم زانستهیه که عیبادهتی تهواوی تهمهنی مرۆڤ دهژێتهوه و دهمێنێت، وه به نهزانینیشی بهندایهتی تهمهن ههمووی دهمرێت و به فیڕۆ له کیسی دهچێت.

بهکورتی: ئهگهر یارمهتییهکه له بهرچاوی خهڵکدا وهربگرێت و گێڕانهوهیشی بهسهریدا به نهێنی بێت، ئهوه باشترین و بێ زیانترین ڕێڕهوه بۆی.

نابێت به پێی ڕێنماییهك که سهری لێبشوێنێت و گوماناوی بێت بڕوات بهڕێوه، دهبێبهتهواوی بهرچاوی ڕوون بێت و، لهسهر بهصیرهت ههنگاوهکانی بنێت، ئهوکاته بڕیار بدات و لایهك ههڵبژێرێت که لایهنی نهێنی و ئاشکرای لا یهك سان بێت.

ئهمهیه که پێی دهوترێت(گۆگردی سوور)کبریتی ئهحمهرو، ئیکسیری گهوره، که زانین و گهیشتنی بهو ڕاستیانه وهك ئهو کبریتهیه که مسقاڵێکی به ههموو دونیا بهرابهر ناکرێت. وهك باسی دهکرێت و کهسیش نایبینێت، داوامان له خودای گهورهو دلۆڤان و بهڕێزه که به جوانی یارمهتی و هاریکاریمان بکات، ئامین.

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية( ٥٤/٧).

# ڕوونکردنەوەیەك

# کامیان خێردارترە؟

## ئەوەی کە خێر وصەدەقە وەردەگرێت، یاخود زەکات

ئیبراهیمی خەوواص و جونەیدی بەغدادی و کۆمەڵێ لە دۆستانی خودا (خودا لێیان خۆش بێت)ڕایان وایە کە:

وەرگرتنی صەدەقەو خێری خۆبەخشی خێری زیاترە، چونکە وەرگرتنی ماڵی زەکات بەرتەنگ کردنەوەیەکە بۆ مافی زیاتری مسکین و هەژارەکان، کە لەوانەیشە خۆیان ئەو مافە پێویستەیان وەرنەگرتبێت، کە لە ناو هەشت صینفەکەی قورئانی پیرۆز جێگایان ببێتەوە، بەڵام بۆ وەرگرتنی صەدەقە، ئەوە دەرفەتەکە فراوانترەو، مافیان لەڕووی وەرع و خۆپارێزیشەوە باشتر دەستەبەردەکرێت و دووریش دەبن لە هەموو گومانێك.

وە هەندێکیتر لە قورئان خوێنە عابیدەکان ڕایان وایە:

کە وەرگرتنی زەکات خێری زیاترە، چونکە زەکات یارمەتی زەکاتدەرەکە دەدات لەسەر ڕزگار بوونی لەو ئەرك و واجبەی لەسەریەتی.

خۆ ئەگەر هەموو مسکینەکان زەکات وەرنەگرن، ئەوا گوناهبار دەبن، جگە لەوەیش کە زەکات هیچ منەتێکی تێدا نیە، بەڵکوو تەنها مافێکی خودایيە و ڕزقێکی خودای گەورەیە بۆ بەندە موحتاجەکانی داناوە.

وە لەلایەکی ترەوە زەکات وەرگرتن بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانە، وە بەو ئەندازە وەردەگرێت کە پێویستی پێیەتی، مرۆڤیش بۆخۆی دەزانێت چەندێك پێویستی هەیە، وە ئەوەی صەدەقە وەردەگرێت جۆرە بەرپرسیاریيەکی تێدایە، وە بەسەر دینەوە وەری دەگرێت، چونکە زیاتر بەوانە دەدرێت کە وادەزانرێت کە پیاوێکی باشن، وە لە لایەکی ترەوە هاو ڕێزی هەژار و مسکینەکان بێت

باشترەو دوورتری دەخاتەوە لە فیزو دەمار. چونکە زۆرجار کەسێك خێر و صەدەقە وەردەگرێت وەك ئەوەی دیارییەکی وەرگرتبێت، وە لە دیاری جودا نابێتەوە، بەڵام وەرگرتنی زەکات بەڕاشکاوی جۆرە زیللەت و ملکەچ بوونێکی پێوە دیارە، کە پێویستی پێی هەیە.

لە دوای ئەم لێکدانەوەیە:

قسەی ڕاست و ڕەوان لەم بارەوە ئەوەیە کە بڵێین:

ئەم بابەتەش بە پێی حاڵی جیاوازی خەڵکەکە دەگۆڕێت، چ حاڵێك زاڵە بەسەریدا، وە چۆن نیەتێکی دروستی بۆ دێت، ئەگە گومانێکی بۆ پەیدابوو، کە لەوانەیە یەکێ لەو هەشت صینفە نەیگرێتەوە، ئەوا با زەکاتەکە وەرنەگرێت، بەڵام ئەگەر بەدڵنیایی تەواوەوە خۆی بە شیاوی وەرگرتنی زەکات دەزانی، وەك ئەوەی کە قەرزێکی لەسەربوو، کە لە ڕێگەی خێریشدا سەرفی کردبوو، ئەوە بێگومان شیاوی وەرگرتنی زەکاتەو لێی دوودڵ نەبێت.

جا ئەگەر وەرگری خێرەکە سەرپشککرا لە نێوانی وەرگرتنی زەکات یان صەدەقە، سەیر دەکەین: ئەگەر خێرەکە وەرنەگرێت، خاوەن صەدەقەکەیش ئەوماڵەی بەکەسی تر نەدەدا، ئەوا با صەدەقەکە وەرگرێت، چونکە زەکاتە واجبەکە خاوەنەکەی ناچارەو هەر دەبێت لە ماڵەکەی دەری بکات بەهەر کەسێك کە مافی وەرگرتنی هەبێت، بەڵام ئەگەر ماڵەکە لەلایەن خاوەنەکەیەوە دانرابوو بۆ خێرکردن، وە لەوەرگرتنی زەکاتەکەیشدا هیچ کێبڕکێ و بەرتەنگییەکی تێدا نەبوو بۆ هەژارەکان، ئەوکاتە خۆی سەرپشکە لە نێوانوەرگرتنی خێر یان زەکات، فرمانەکەش لە هەردوکیاندا جیاوازە.

بەڵام ئەو ڕاستییەش نابێت لەیاد بکەین، کە لە زۆربەی کاتەکاندا وەرگرتنی زەکات زیاتر شکۆمەندی مرۆڤ دەشکێنێت و، نەفسی زەلیل دەکات، خودای گەورەش زانایە، والله أعلم.

پەڕاوی

نهێنیەکانی زەکات

تەواو بوو

کە پەڕاوی پێنجەمە

لە چواریەکی بەندایەتی،

لە پەڕاوەکانی

(إحياء علوم الدين)

## ژیانەوەی زانستەکانی ئاین

حەمدوسەنا تەنها بۆ خودایە، ئەوەندەی کە شایستەی بێت
بە زاتی بەرزی، وە هەر خودایە کە بۆ هەموو کێشەو گرفتەکان
بەسمانە و کافییە، وە باشترین فریادڕەسە بۆ هەموو ناسۆرەکان
کە تەنها پشت و پەنامانە بۆ هەموو داواکان .

وصلى الله على سيدنا محمد وآله وصحبه وسلم

پشت بەخوا ئەوەی دێت بە دوایدا

پەڕاوی نهێنیەکانی ڕۆژووە

پەڕاوی
نهێنیەکانی ڕۆژوو
گرنگییەکانی

کە پەڕاوی
شەشەمە لە چوار یەکی
بەشی بەندایەتی
لە پەڕاوەکانی

ژیانەوەی
زانستەکانی ئاین

# پەڕاوی نهێنی و گرنگییەکانی ڕۆژوو

**بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبانەوە**

حەمدو سەنا بۆ ئەو خودایەی کە منەتێکی گەورە و گرانی هەیە بەسەر بەندەکانیدا، کە مەکرو فرت و فێڵی شەیتانی لێ دوورخستوونەتەوەو، شەیتانی هیوابڕاوی کردوون و بەئاواتی نەگەیاندوون، چونکە ڕۆژووی کردووە بە قەڵاو مایەی پاراستنی دۆست و بەندەکانی، وە دەرگای بەهەشتیشی بۆ واڵا کردوون و ئاگاداریشی کردوونەتەوە، کە هۆکارو ئامرازی چوونەژوورەوەی شەیتان بۆ ناو دڵەکانیان، گرتنەبەری ڕێگەی ئارەزووەکانی. کە بەزاڵ بوون بەسەریاندا دەبێتە خاوەنی نەفسێکی ئارام و خۆڕاگری بەهێز، کە دەتوانێت دەسەڵات بەسەر نەفس و ئارەزواتدا پەیدا بکات و، ڕێگای فرتووفێڵی شەیتانی لێبگرێت.[١]،

صەڵات و سەلامی بەردەوام و نەبڕاوەی خوداوەند، بۆ حەزرەتی موحەممەد ﷺ، کە سەرمەشق و سەرۆك و ڕێپیشاندەری خەڵکییە بەگشتی، تا دەیانگەێنێتە مەیدانی حەشر، وە بەتایبەتیش پێشڕەوی ئیماندارانە، بۆ ئەوەی بەڕێبازی دروستدا بیانگەێنێتە ئاسۆی سەرفرازی و بەهەشتی هەتاهەتایی، وە هەروەها درووود و ڕەحمەتی خودا لەسەر یارو یاوەرو ئال و ئەصحابی کیرامیشی بێت، کە خاوەنی بیری تیژو ڕای دروست و، کەماڵی ئەقڵ و هۆشدارین.

پاش سەناو ستایش بۆ خودا و، درووودو ڕەحمەت بۆ گیانی پێغەمبەری نازدار و خۆشەویست:

بەپێی فەرموودەی (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ: ڕۆژوو چواریەکی تەواوی ئیمان

---

(١) فەرموودەکانی ئیمامی غەزالی هێمایە بۆ کۆمەڵێك فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ،وەك ئەوەی موسلیم ڕیوایەتی دەکات : ((الصيامُ جُنَّةٌ.)) (١١٥١)، هەروەها فەرموودەی ئەبوهورەیرە کە موسلیم ڕیوایەتی دەکات : ((إذا جاءَ رَمَضان فُتِحَت أبوابُ الجَنَّة)).

و بڕوایه، وەك دەفەرموێت: ((الصَّومُ نِصفُ الصَّبرِ))[1].
واتە ڕۆژوو نیوەی صەبرو خۆڕاگریيە.
وەك فەرموودەيەكی تری پێغەمبەر ﷺ دەيگەيێنێت؛ كە نيوەی ئيمان بە هۆی ئارامی خۆڕاگرتنەوە دەستی دەكەوێت: ((الصَّبرُ نِصفُ الإيمانِ))[2].
وە لەو ڕووەوە كە ڕۆژوو دەدرێتە پاڵ خوداوە، جيادەكرێتەوە لە هەموو ئەركانەكانی تر، چونكە خودای گەورە وەك پێغەمبەر ﷺ لێيەوە دەگێڕێتەوە
ا

(١) رواه الترمذي وحسنه (٣٥١٩)، وابن ماجه(١٧٤٥). وە بەيهەقيش ڕيوايەتی كردووە بە زيادەی: ((واليقين الإيمان كله)) واتە كەسێك متمانە و دڵنيايی تەواوی هەبێت، ئەوە خاوەنی تەواوی ئيمان و بڕوايە.

(٢) أخرجه أبونعيم في الحلية. (٣٤/٥)، والخطيب في التأريخ( ١٣/ ٢٦٦/ ٧١٩٧)، من حديث أنس بن مسعود بسند حسن، وأوقفه الطبراني في الكبير (١٠٤/٩) على عبدالله بن مسعود، (رضي الله عنه) . قال الزبيدي ١٨٧/٤: وأخرجه البيهقي في الشعب ١٢٣/٧، ٩٧١٦)، من هذا الوجه، وقال: تفرد به يعقوب بن حميد . عرفان محمد بن خالد المخزومي، ويعقوب قال الذهبي في ميزان الإعتدال( ٢٧٦/٧)، ضعفه أبو حاتم في الجرح والتعديل ٢٠٦/٩(٨٦١)، وغير واحد.

وە مەبەست لە صەبر گرتن، كاركردنە بە پێی خواستی يەقين و متمانەی بڕواكەی، چونكە بە يەقين دەزانێت كە تاوان كردن زيانی لێ دەدات، وە عيبادەت و گوێڕايەڵيش سوودی پێ دەگەيێنێت، وە بەبێ خۆڕاگريش ئەم كارانەی بۆ ئەنجام نادرێت، كە هاندەری ئيمان و بڕوا پاڵی پێوە بنێت، كە زاڵ ببێت بەسەر هەواو ئارەزووی نەفسی و جينسی و تەمبەڵيدا، كەواتە صەبر بوو بەنيوەی ئيمان، ڕۆژوو يش نيوەی خۆڕاگرتنی تێدايە، چونكە بە ڕۆژوو بوون، نەفسی دووردەخاتەوە لە خواستی ئارەزووەكان، وە هۆكاری تورەبوون و ڕق هەستان، كەواتە نەفس ئەگەر بگات بە تام و چێژی خوازراوی خۆی شادومان دەبێت، وە ئەگەر پێيشی نەگات تورە دەبێت، بەهۆی ڕۆژووەكەوە ئارەزووەكانی لەكۆڵ دەكەوێت، با توورەبوونەكەيشی هەر بمێنێت، هەرچەندە تەواوی پلەی ڕۆژووەوان ئەوەيە كە تورەبوون و ڕق خۆيشی بخواتەوە،

دەفەرموێت: (( **كُلُ حَسَنةٍ بِعَشرٍ أمثالِها إلى سَبعِ مائةِ ضعفٍ إلاَّ الصِّيام، فإنَّهُ لي وأنا أجزي بهِ**))[1]، واتە : هەموو چاکەیەك دەبەرامبەری چاکەکە پاداشتی دەدرێتەوە تا حەوت صەد جار، جگە لە ڕۆژوو نەبێت، ئەوە کردەوەیەکە تایبەتە بە خۆمەوە و خۆیشم پاداشتی ئەدەمەوە.

وە لەم بارەیشەوە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿**إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ**﴾ (الزمر/١٠)

واتە: ئەوەی بەصەبربێت و تەحەمولی مەینەتی فەرمانبەرداری خودا بکات، پاداشتێکی وای دەدرێتەوە ژمارەی ژمێریار پیایدا ناگاتەوە[2]، وە بەڕۆژوو بوون نیوەی خۆڕاگری و صەبرکردنە، پاداشتەکەی هەموو یاسایەکی پێوانە و ژماردنی بەزاندووە.

جگە لەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە باسی گەورەیی بە ڕۆژوو بووندا فەرموویەتی: ((**والَّذي نَفْسي بيَدِهِ لخَلُوفُ فَم الصَّائمِ أطيبُ عندَ اللهِ مِنْ ريحِ المِسك يَقولُ اللهُ عَزَّ وجَلْ إنَّما يَذرُ شهوَتهُ وطَعامَهُ وشَرابَهُ مِن أَجلي، فالصَّومُ لي وَأنَا أَجزي بِهِ**))[3]،

سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە؛ بۆنی دەمی ڕۆژووەوان (کە بە هۆی ڕۆژووەکەوە ناوسکی خاڵی دەبێت و بۆنی دەمی دەگۆڕێت) لام خۆشترە لە بۆنی میسك، (واتە چەندێك بۆنی میسك لای ئێوە خۆشترە، ئەوەندەش بۆنی دەمی ڕۆژووەوانە کە بەهۆی ڕۆژووەکەوە مایەی نزیك بوونەوەیە لە من)خوای گەورە دەفەرموێت:لە بەر من و لە پێناوی ڕەزامەندی مندا واز لە ئارەزوات و خواردن و خواردنەوەی دەهێنێت، دەی ڕۆژو تایبەتە بە منەوە و خۆم پاداشتی ئەدەمەوە.

---

(١) رواه البخاري (١٩٠٤)، ومسلم (١١٥٢).

(٢) خۆلاصەی تەفسیری نامی، مامۆستا مەلا عبدالکریمی مودەڕیس،٤٥٩.

(٣) هەندێکە لەو فەرموودەی پێشتر ڕیوایەتمان کرد (١٩٠٤)، ١١٥١).

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

(( لِلجَنَّةِ بابٌ يُقالُ لهُ : الريَّان، لاَيَدخُلهُ إلاَّ الصَّائِمون.))[1]،

واتە: لە بەهەشتدا دەرگایەکی تێدایە پێی دەڵێن: ڕەییان، واتە ئاواشتەی تینووەکان دەکات، تەنها بەڕۆژووەکان لێیەوە دەچنە ژوورەوە.

وە لە پاداشتی ڕۆژووەکەیدا بەڵێنی پێدراوە کە بە لیقای خودا بگات و پێی شاد ببێتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((للصائِمِ فَرحَتانِ ، فَرحَةٌ عِندَ إفطارِهِ، وفَرحَةٌ عِندَ لِقاءِ رَبِّهِ))[2].

دوو جۆری شادی و خۆشی دەگات بە ڕۆژووەوان:

شادییەکیان لەوکاتەدا کەبەربانگ دەکاتەوەو ڕۆژووەکەی دەشکێنێت و ئەوەی لێی قەدەغە کراوە دەتوانێت بیانکات،وە خۆشیی دووهەمیش ئەو کاتەیە کە بە حزووری خودای خۆی دەگات، کە پاداشتە تایبەتییەکان وەردەگرێت.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:((لِكُلِّ شَيئٍ بابٌ وبابُ العِبادَةِ الصَّومُ))[3]

واتە: هەموو شتێك دەرگایەکی هەیە، دەرگای چوونە ناو عیبادەتیش ڕۆژووە، (چونکە پاڵفتەی مێشك دەکات و، نووری خودا لە ناو دڵی پرشنگ ئەدات و پەیدادەبێت و، حەز لەو بەندایەتییە دەکات) .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کەسێك بەڕۆژو بێت، نوستنەکەیشی بەعیبادەت بۆی دەنووسرێت(( نَومُ الصَّائِمِ عِبادةٌ))[1].

---

(١)رواه البخاري (١٨٩٦)، ومسلم (١١٥٢).

(٢) رواه البخاري(٧٤٩٢)، ومسلم ١١٥١، وقد تقدم بعضه من حديث أبي هريرة.

(٣) أخرجه إبن مبارك في الزهد، [هو فيه ١/ ٥٠٠(١٤٢٣) مرسلا، من حديث حبيب بن ضمرة رفعه، ولم أجده من حديث أبي الدرداء] ومن طريقه أبو الشيخ في الثواب [كما في جامع الأحاديث للسيوطي، ٧٤/٦(١٧٢٨٠) من حديث أبي الدرداء بسند ضعيف، قال الزبيدي١٩٢/٤ : ورواه هناد في الزهد ٣٥٨/٢(٦٧٩)عن ضمُرة بن حبيب مرسلاً، وضمرة تابعي ثِقة، ولفظه: **إن لكل شئ باب وباب العبادة الصيام**

وه ئەبوهورەیرە(خودای لێ ڕازی بێت)دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((إذا دَخلَ شَهرُ رَمَضان، فُتِحت أبوابُ الجَنَّةِ، وَغُلِّقَت أبوابُ النَّار، وَصُفِّدَتِ الشَّياطين، وَنادَى مُنادٍ: يا باغِيَ الخَيرِ: هَلُمَّ، وَياباغِيَ الشَّرِّ أَقصِر))[٢]، واتە: کات یەکەم شەوی مانگی ڕەمەزان هاتە پێشەوە، دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە، وە دەرگاکانی دۆزەخ دادەخرێن، وە شەیتانەکانیش کۆت دەکرێن و دەبەسرێنەوە، وە فریشتەیەکیش بانگ دەکات و هاوار لەو خەڵکە دەکات؛ ئەی ئەوانەی کە بە دوای خێردا دەگەڕێن وەرنە پێشەوەو خێراکەن و زیاتر بەندایەتی بکەن، ئەی ئەوانەش کە بە دوای خراپەو شەڕدا دەگەڕێن، خۆتان بگرنەوە و واز لە خراپە بهێنن.

(زانای ناودار) وەکیع ی کوڕی جەڕاح لە بارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾ (الحاقة/٢٤) دەفەرموێت:

ئەوە ئەو ڕۆژانەیە کە تیایدا بە ڕۆژوو بوون، چونکە وازیان لە خواردن و خواردنەوە هێناوە.[٣]

(١) رواه أبو نعيم في الحلية(٣٥٧/٥)، والبيهقي في الشعب، ٤١٣/٣(٣٩٣٩)، والديلمي في الفردوس(٢٤٨/٤)(٦٧٣٤)من حديث عبدالله بن أبي أوفى الأسلمي، قال البيهقي : عقب إيراده : معروف بن حسان-هو أحد رجاله_ ضعيف، وسليمان بن عمر النخعي أضعف منه، ينظر:الإتحاف ٤/ ١٩٢، ورواه القضاعي في مسند الشعاب (١٠٣٢). قال المناوي في فيض القدير(٢٩١/٦): وفيه أيضا عبدالملك بن عمير. قال أحمد في سؤالات أبي داود ص/٢٩٥(٣٥٤): مضطرب الحديث. قال ابن معين: (كما في تأريخ الإسلام للذهبي(٨ /٤٧٥) مختلطٌ. ثم اعترض المناوي على السيوطي وقال: عجبا منه كيف يذكر هذا الطريق الضعيف بمرة. ويترك طريقا خالية عن كذَّاب، أورده الزين العراقي في أماليه من حديث ابن عمر.

(٢) رواه بتمامه الترمذي(٦٨٢)، وأصله عند البخاري (١١٩٩) ومسلم(١٠٧٩).

(٣) رواه عنه ابن أبي الدنيا في (قصر الأمل) (١٨٩).

پێغەمبەری خودا ﷺ لە پلەی شانازی کردنەوە لە نێوانی کەسێکی دونیا نەویست و ڕۆژوو گرتندا ئەم دووحاڵەتەی بەیەکەوە بەستۆتەوەو فەرموویەتی:

(( **إنَّ اللهَ يُباهي مَلائِكَتَهُ بالشَّابِ العابِدِ فيقول: أَيُّها الشابُّ التَّارِكُ شَهوَتَهُ لِأَجلي، المُبَذِلُ شَبابَهُ لِي، أنتَ عِندي كَبَعضِ مَلائِكَتي**))[1].

خوای گەورە شانازی بەو گەنجە عابید و خواناسەوە دەکات کە بە ڕۆژوو دەبێت و دەفەرموێت: ئەی گەنج کە لە بەرمن وازت لە ئارەزووەکانی نەفست هێناوە ، ژیانی گەنجێتیت بەخشیوە بە من و لە پێناوی مندا سەرفی دەکەیت، تۆ لای من وەك هەندێك لە فریشتەکانم وایت.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە باسی گەورەیی بەرۆژوو بووندا فەرموویەتی:

((**يقول اللهُ تعالى: يا مَلائِكَتي؛ أُنظُروا إلى عَبدي! تَرَكَ شَهوَتَهُ ولَذَّتَهُ وطَعامَهُ وشَرابَهُ مِن أَجلي** ))[2]، خوای گەورە دەفەرموێت:

ئەی فریشتەکانم؛ بنوارن بۆ ئەو بەندەیەم، وازی لە ئارەزووی نەفس و ڕابواردن و تام و چێژی خواردن و خواردنەوەش هێناوە لە پێناوی مندا.

---

(١) رواه ابن عدي في الكامل (٣/٣٥٧)، وأبو نعيم في الحلية(١٣٩/٤). وهو عند ابن مبارك في الزهد(٣٤٦) وغيره من كلام يزيد بن ميسرة، قال الزبيدي ١٩٣/٤: وأخرج الطبراني في الأوسط(٣٦٧/٦) من حديث أبي هريرة قال الله تعالى : **عبدي المؤمن أحبُّ إليَّ مِن بعض ملائِكَتي).**

(٢)قال العراقي لم أجده اهـ قال الزبيدي( ١٩٣/٤): هو من حديث طلحة عن ابن السني الذي قدمناه قبل هذا، قوله: **ترك شهوته** ... تقدم أنه في الصحيحين وهو يذكر المباهاة معه، رواه ابن أبي الدنيا في الجوع،(٣٩)موقوفا على الحسن قال: **(تقول الحوراء لولي الله وهو متكئٌ مَعها على نَهرِ العَسل تعاطيهِ الكأسَ: يا نِعمَ عيشةً! أتدري يا حبيب الله متى زوجَنيكَ مَولاى ؟ فيقول: لاأدري، فتقول: نظر إلَيك في يوم صائف، بعيد الطرَفَينِ وأنتَ في ظَمإٍ هاجرةٍ مِن جَهدِ العَطشِ، فباهى بِك الملائكة وقال: أنظروا إلى عَبدي ! ترك زوجتَه وشهوتَه ولذَّته، وطعامه وشرابَه من أجلي، رغبةً فيما عِندي، أُشهدكم أني قد غفرت له، فغفر لكَ يومئذٍ وزوجنيك)** وهو بلفظ المصنف في القوت (٧٣/١).

هەندێك لە زانایان لە بارەی ئەم ئایەتەوە فەرموویانە:

﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخْفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (السجده/١٧)
هیچ یەكێك لەوانە نازانن لە پاداشتی كردەوە چاكەكانیانداو بە بێ ئاگاداری خۆیان، لەو دونیادا چیمان بۆ ئامادەكردوون، لەو شتانەی چاویان لە خۆشیاندا پێیان فێنك دەبێتەوە.[1]، دەوترێت: ئەوكردارەیان كە بەم شێوە پاداشتیان بۆ دانراوە ڕۆژوو گرتن بووە، چونكە خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ (الزمر/١٠) واتە: ئەوەی بەصەبربێت و تەحەمولی مەینەتی فەرمانبەرداری خودا بكات، پاداشتێكی وای دەدرێتەوە ژمارەی ژمێریار پیایدا ناگاتەوە[2].زۆر بە لێشاوو بەرفراوانی هەگبەی ڕۆژووەوانی بۆ پڕ دەكەن ، بە شێوەیەكی گۆترەو بێ حیساب پاداشتی دەدەنەوە، كە نەچێتە ژێر هیچ كێشانەو پێوانەیەكەوە[3]. ئەمەش ڕاستەو، هەقی خۆیشیەتی بەم شێوە بێت، چونكە ڕۆژووەكە تایبەت لەبەر خاتری خودا بووەو، شەرفداریشی كردووە بەوەی كە نیسبەتی ڕۆژووی داوە لە خۆی، هەرچەندە هەموو بەندایەتییەكانی تریش هەر بۆ خودایە، ئەمەش وەك ماڵی خودا(كەعبە) چۆن دەدرێتە پاڵ خودا، كەچی هەموو زەویش هەر موڵكی خودایەو تەنها كەعبە جیاكراوەتەوە و، تایبەت كراوە بە خوداوە لە بەر دوو واتا:

**یەكەمیان:** ڕۆژوو بۆخۆی وازهێنان و خۆگرتنەوەیە لە خواردن و خواردنەوە و ئارەزووەكان، كە ئەمە نهێنیەكی تێدایە، نەك كارێكی ئاشكرا بێت كە ببینرێت، دەبینین هەموو جۆرەكانی تری بەندایەتی، بەبەرچاوو ئاگاداری خەڵكەوە دەكرێن، بەڵام ڕۆژوو جگە لە خودا كەس نایبینێت، كەواتە:

---

(١) خۆلاصەی تەفسیری نامی ، ٤١٦.

(٢) خۆلاصەی تەفسیری نامی، مامۆستا مەلا عبدالكریمی مودەڕیس(٤٥٩)

(٣) قوت القلوب ( ٧٣/١).

کردارێکی شاراوەی دەرونیە، تەنها بە صەبرو خۆڕاگری ئەنجام دەدرێت.

**دووهەم:** زۆرانبازییە لەگەڵ دوژمنێکی خودای (عَزَّ وجَلْ)داوە هەوڵدانە بۆ تێشکا ندنی، چونکە وەسیلە و هۆکاری دەسەڵاتی شەیتان(لەعنەتی خوای لێبێت) بەسەر مرۆڤدا، تەنها لە ڕێگەی ئارەزووەوەیە، ئەویش بە خواردن و خواردنەوە بەهێز دەبێت، بۆیە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((إِنَّ الشَّيطانَ يَجري مِنِ ابنِ آدَمَ مَجرىَ الدَّم، فَضَيِّقوا مَجارِيَهُ بالجوع))**[1]، واتە: بە ڕاستی شەیتان بە ناو ڕەگ و دەمارەکانی خوێنی نەوەی ئادەمدا

---

(١) رواه البخاري (٢٠٣٨)، ومسلم (٢١٧٤)، دون زيادة (**فضيقوا مجاريه بالجوع**). قال الزبيدى ١٩٤/٤: وذكره المصنف أيضا بهذه الزيادة مرسلا في شرح عجائب القلب وهو في كتاب الشريعة بلفظ: **فسدوا مجاريه بالجوع والعطش** اهـ. وأنا أظن أن هذه الزيادة وقعت تفسيرا للحديث من بعض رواته، فالحقها به من روي عنه، وأما الجملة الاولي منه فأخرجها الشيخان وأبو داود وابن ماجه، وأول الحديث: **أنه ﷺ انطلق مع صفية، فمر به رجلان من الأنصار فدعاهما فقال إنها صفية، قالا : فسبحان الله**، فذكره.

ئیمامی ئەحمەد لە (الزهد) دا گێڕاویەتیەوە (٣٩٤)، وە ئەبو نەعیم یش لە (الحلية) دا (٣٢٩/٢)، لە سابتی بەنانی یەوە دەفەرموێت: هەواڵمان پێگەیشتووە کە شەیتان خۆی ئاشکرا کرد لە (حەزرەتی) یەحیا (عَليه السلام) بینی چەندین نەڵقەی پێوە شۆڕ بوبوویەوە، لە هەموو شتێك، لێی پرسی ئەوانە چین پێتەوە شۆڕ بوونەتەوە؟ وتی: ئەوە ئارەزووەکانە، کە بە هۆیانەوە ئادەمیزاد دەخەمە ناو داوی خۆمەوە، (حەزرەتی) یەحیا فەرمووی: ئایاهێچ یەکێك لەوانە هەیە پەیوەندی بە منەوە بێت، وتی: نەخێر. فەرمووی: ئەی بە هەر هۆیەکەوە بێت دەتوانی من تووشی یەکێ لەو داوانە بکەیت؟ وتی : بەڵێ، لەوانەیە هەندێك جار تێرت خواردبێت و ،بە هۆیەوە لاشەتمان قورس کردبێت لە نوێژو زیکر کردن، فەرمووی: جگە لەوە هیچی تر نیە؟ وتی: نەخێر. فەرمووی: قەیناکە، سوێند بە خوا تاماوم ئیتر خۆم تێر ناکەم، چونکە یەکەم هەڵەو گواناهێك کە تووشی ئادەمیزاد بوو بە هۆی پارووەکەوە بوو. بنوارە: إحياء علوم الدين، دەبەرگە چاپکراوەکە، بەرگی دووهەم: ل/١٠١.

دەگەڕێت، لەهەر جێگایەکەوە خوێنی پێدا بڕوات، فێڵ و کەیدی شەیتان بەو ڕەگ وجێگایانەدا دەڕوات. کەواتە: جێ ڕەوتەکەی بەرتەنگ بکەنەوە بە هۆی خۆ برسی کردنەوە، بۆیە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ بە (حەزرەتی) عائیشەی فەرموو (خودای لێ ڕازی بێت): ((**داوِمي قَرعَ بابِ الجَنَّة. قالت: بِماذا؟ قال ﷺ: بالجوع** ))[1]، بەردەوام لە دەرگای بەهەشت بدە، عەرزی کرد: بە چی لێی بدەم؟ فەرمووی: بە برسێتی و خۆبرسی کردن.

وە لەپاشاندا باسی گەورەیی خۆبرسی کردن دەکەین، لە باسی( **زیانەکانی تامەزرۆیی و ئارەزووی خواردن و چارەسەریەکانی) لە چوار یەکی (المهلكات)دا.**

کاتێك زانیمان کە ڕۆژوو  بە تایبەتی هۆکاری بەرهەڵستی کردن و تێکشکاندنی شەیتانەو، گرتنی ڕێگەو پێگەی هاتنەژوورەوەیەتی، وە بەرتەنگ کردنەوەی جێگاڕەوتی فێڵووتەڵەکەی شەیتانە، بۆیە ئەوەندە شیاوی وەرگرتووە کە بدرێتە پاڵ خوداوە و، تایبەت بکرێت بەو زاتەوە (عَزَّ وجَلْ)، چونکە لە تێکشکاندنی دەسەڵاتی دوژمنی خوادا، سەرکەوتنە بۆ ئیرادەی پەروەردگاری باڵادەست. وە یارمەتی و سەرخستنی بەندکانی خودا لەلایەن خوداوە، بەسراوە بە هەوڵدانی بەندەکان بۆ سەرخستنی ویستی پەروەردگار، وەك خودا ﷻفەرموویەتی: ﴿**إِنْ تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ**﴾(محمد/٧).

ئەگەر ئێوە یارمەتی خودابدەن، خوایش یارمەتیتان دەدات و پێتان ڕاگیرو چەسپاو دەکات، لەسەرەتاوە بە هەوڵ و کۆششی بەندەو، پاداشتیش لەخوداوە یە بە هیدایەت دانی، بۆیە خودای (عَزَّ وجَلْ) دەفەرموێت:

---

(١) قوت القلوب( ١٧١/٢) بقوله وقد روينا عن عائشة (رضي الله عنها) وذكره وزاد: بالجوع والظمأ، قال العراقي لم أجد له أصلا اه قال الزبيدي(١٩٤/٤ ) : وهو في كتاب عوارف المعارف من قول عائشة بلفظ: **(أديموا قرع باب الملكوت يفتح لكم. قالوا كيف نديم؟ قالت بالجوع والعطش والظمأ ).** أهـ

﴿**وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا**﴾ (عنكبوت/٦٩) ئەوانەی لە پێناوی ئێمەدا و بۆلای ئێمە هەوڵیانداوە و تێکۆشاون، ڕێنومایی ڕێگای لای خۆمانیان دەکەین و هیدایەتی خێریان دەدەین. یان دەفەرموێت: ﴿**إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ**﴾ (رعد/١١).خوای گەورە ئەو نیعمەتانەی ڕژاندوویەتی بەسەر بەندەکاندا، لێیان ناگۆڕێت تا خۆیان لە خۆیانی نەگۆڕن، چەندێك ملکەچی ئارەزووەکانیان بوون، ئەوەندەش شەیتان دەتوانێت یاریان پێبکات، ئەگەر ڕوبەڕووی ئارەزواتی خۆیان بوونەوە، کە لەودڕگاو جێگای تەراتێنی شەیشتانە، تا جێگاکەی باش و لەبار بێت، زیاتر سەردانی دەکەن و لێی دانابڕێن، وە هەتا شەیتانیش سەری لێبدات جەلال و گەورەیی خودا بۆ بەندەکەی ئاشکرا نابێت و، ناتوانێت بە لیقای خودا بگات و، هەمیشە پەردەیەك لە نێوانیاندا دەبێت. هەر وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((**لَولاَ أَنَّ الشَّياطِينَ يَحومونَ علَى قُلوبِ بَني آدَم، لَنَظَرُوا إلى مَلَكوتِ السَّماواتِ والأَرضِ**))[1].

ئەگەر شەیتانەکان خۆیان نەدەن بەسەر دڵی ئادەمییە کانداو، پەردەیەکی تاریکی بەسەردانەدەن، ئەوا دەیانتوانی هەموو جیهانە غەیب و نادیارەکان لە ئاسمانەکان ببینن،لەم ڕووەوە ڕۆژوو گرتن بووە بە دەرگای بەندایەتی و،دەبێتە پارێزەر بۆ خاوەنەکەی لە ئاگری دۆزەخ.کەزانیمان ئەوەندەگەورەیە،پێویستە مەرجە ئاشکراو شاراوەکانی ڕوون بکەینەوە،وە باسی ئەرکان و سوننەتەکانی و مەرجە شاراوەکانی لە سێ فەصڵ و ناوبرِدا بکەین:

---

(١) هو عند أحمد في المسند ٢/٣٥٣)، في قصة المعراج مرفوعا، ومنه: **فلما نزلت إلى السماء الدنيا، نظرت أسفل مني، فإذا أنا برَهجٍ ودخانٍ وأصوات. فقلت ما هذا يا جبريل؟ قال: هذه الشياطين، يحومون على أعين بني آدم ألاَّ يَتفكروا في ملكوت السماوات والأرض، ولولا ذلكَ ، لرَءَوا العَجايب.**

# ناوبڕی یەکەم

## لە باسی پێویستییەکانی ڕۆژوو، وە سوننەتە ئاشکراکانی وە ئەگەر بەتاڵ بوویەوە چی پێویستەبیکات

### ئەوەی بە ئاشکرا پێویستە ئەنجامی بدات شەش دانەیە:

### یەکەم: چاودێری کردنی سەرەتاو یەکەم ڕۆژی مانگی ڕەمەزان:

ئەمەیش یان بە بینینی مانگی یەك شەوەیە، ئەگەر بەهۆی هەورو هەڵاوە نەدەبینرا ئەوا سی ڕۆژەی مانگی شەعبان تەواو بکات .

مەبەستیشمان لە بینین، ئەوەیە کە بزانێت هیلال پەیدابووە، ئەمەش بە شایەتی کەسێکی دادپەروەر جێبەجێ دەبێت، بەڵام بینینی هیلال مانگی شەووال پێویستی بە دوو شایەتی عادڵ هەیە، لەبەر گرنگی بەندایەتییەکەیە، کە پێویستی بە زیادە چاودێری و وردبینی و تێڕامانی زیاتر هەیە.

ئەوەش کە گوێی لە کەسێکی عادڵ بێت و، بڕوا بە شایەتیەکەی بکات، وە زیاتر گومانی بۆ ڕاستگۆیی ئەو کەسە دەچوو، پێویستە لەسەر خۆی کە بەڕۆژوو بێت، با دادوەریش حوکم و فەرمانی پێنەدابێت، کەواتە هەموو بەندەیەك لە عیبادەتەکەیدا بە پێی زیادەگومانی دروستی خۆی با کار بکات.

وە ئەگەر لە شارێکدا مانگ بینرا، لە شارێکی تردا نەبینرا، وە کەمتر لە دوو قۆناغ لە نێوانیاندا هەبوو، (واتە: مسافەی کورت کردنەوەی نوێژ، هەشتا کیلۆمەتر کەمتر لە نێوانیاندا ببێت) ئەوە پێویستە لەسەر هەردوو شارەکە کە بەڕۆژوو بن، بەڵام ئەگەر لە دوو (قۆناغ) زیاتر بوو، واتە مسافەی کورت کردنەوەی نوێژ دەبوو، ئەوە هەر شارێك حوکمی سەربەخۆی خۆی دەبێت، تەنها لەو شارە پێویست دەبێت بەڕۆژووبن، کە مانگی تێدا بینراوە.

## دووهەم نیەت هێنان:

پێویستە هەموو شەوێك نیەتێکی تایبەتی بهێنێت بۆ ڕۆژووگرتنی سبەینێ ، وە مەرجە کە نیەتەکە لە کاتی شەودابێت و، بە دڵنیاییشەوە نیەتەکەی دابمەزرێنێت، ئەگەر بەیەك جار نیەتی ڕۆژووی هەموو مانگی ڕەمەزانی هێنا، ئەوە دادی نادات و دانامەزرێت، مەبەستمان لە نیەتی سەربەخۆی هەموو شەوێك ئەمەیە.

وە ئەگەر بەڕۆژدا نیەتی هێنا، ئەوا بۆ ڕۆژوو ی ڕەمەزان دانامەزرێت، بەڵکوو تەنها بۆ بەڕۆژووبوونی خۆبەخشی بۆی دەنووسرێت، بۆیە وتمان دەبێت نیەتەکە لە ناو شەودابێت.

وە ئەگەر نیەتی ڕۆژووی هێنا، یان فەرزی ڕۆژووی هێنا بە ڕەهایی و موتڵەقی، دیسان ئەو نیەتە دانامەزرێت، تا دیاری نەکات لە نیەتەکەیدا کە فەرزی مانگی ڕەمەزانەو، خودا پێویستی کردووە لەسەری.

وە ئەگەر دڵنیا نەبوو لە وەی سبەنێ ڕەمەزانە، ئەوە بە شەوی گومان ناودەبرێت(یوم الشك)، بەم شێوە کە لە شەوی سی شەعباندا بڵێت:

ئەگەر سبەینێ ڕەمەزان بوو ئەوا بەڕۆژوو دەبم، ئەو ڕۆژووەی بۆ نانوسرێت با ڕەمەزانیش بێت، چونکە بەدڵنیاییەوە نازانێت کە سبەینێ ڕەمەزانەو دانی پێدانەناوە، مەگەر نیەتەکەی پشت بەستووبێت بە شایەتێکی دادپەروەرەوە، ئەوکاتە بارێگەیشی تێبچێت کە شایەتەکە هەڵەی کردبێت یان درۆی کردبێت، ئەوا دڵنیایی و عەزم و بڕیاری ئەوکەسە هەڵناوەشێنێتەوە. بەڵام لە کۆتایی ڕەمەزانداکە بۆی دەرنەکەوتبێت سبینێ جەژنە یان ڕەمەزان، ئەوە با نیەتەکەی پشت بە ڕۆژووەکانی پێشوو ببەستێت، چونکە بیست و نۆ ڕۆژی گرتووەو، ئەصڵ وایە سبەینێش ڕەمەزان بێت، وە گومانی هەبێت کە ئایا دوا شەوی ڕەمەزانە یان تەواو بووە، ئەوە نیەتەکەی لاواز ناکات و هەڵی ناوەشێنێتەوە، چونکە دەتوانێت بڵێت: ئەگەر ڕەمەزان نەبوو ئەوا دەیشکێنم، یان ئەگەر بۆ

بەڕۆژوبوونی ڕەمەزان بە هۆی ئیجتیهادەوە بڕیاریدابێت. وەك ئەو کەسەی کە لەژێر زەویدا لەناو چاڵێکدا زیندانی کرابێت، ئەگەر گومانی بەهێزی بۆ ئەوە چوو کە سبەنێ ڕەمەزانە، بەهۆی تێکۆشان و لێکدانەوەو ئیجتیهادەوە، نەك هەروا بە هەڕەمەکی بڕیار بدات، ئەوە بڕیارەکەی بۆ دادەمەزرێت، ئەگەر گومانێکیشی بۆ پەیدابوو، ئەو ئیجتیهادەی هەڵناوەشێنێتەوە.

وە شەوی سی شەعبان (کە بەشەوی شکو گومان دادەنرێت)، هەرچەندە گومانی هەبوو، ئەوا با بە زوبانیش نیەتێکی پڕ لە دڵنیایی بهێنێت، ئەوە بۆی نانوسرێت، چونکە جێگای نیەت ناوی دڵە، ناگونجێت لە لایەکەوە بە دڵنیایی بەزوبان دانی پێدا بنێت، لەلایەکی تریشەوە گومانی لە نێو دڵدا هەبێت. وەك چۆن لە ناوەڕاستی ڕەمەزاندا بڵێت:

ئەگەر بەیانی ڕەمەزان بوو ئەوا بەڕۆژوو دەبم، ئەوە هیچ زیانێکی لێنادات، چونکە تەنها بە زوبان ئەو گومانەی باس کردووە و، بەدڵ دڵنیایە کە بەیانی ڕەمەزانە، جێگای نیەت کە ناو دڵە، ئیتر گومانی دڵەڕاوکێی لێ ناکرێت، بەڵکوو با ئەو قسەش بکات لە دڵدا دڵنیایە کە بەیانی ڕەمەزانە.

ئەگەر کەسێك بەشەو نیەتی ڕۆژووی سبەینێی هێناو، لە پاشاندا شتێکی خوارد، ئەوە زیان لە ڕۆژووەکەی نادات، وە ئەگەر ئافرەتێك لە (سوڕی مانگانەدا بێت) و، نیەتی بەڕۆژووبونی بەیانی هێناو، پێش گزنگی بەرەبەیان پاك بوویەوە، ئەوا ڕۆژووەکەی دروستە.

## سێیەم: خۆگرتنەوەیە لەوەی کە شتێك بە مەبەست و عەمدی بچێتە ناو گەدەیەوە، یان ناو بۆشایی گیانیەوە، بشزانێت کە بەڕۆژووە:

کەواتە ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێتەوە بە خواردن و خواردنەوەو، گەیشتنی هەرشتێك لە ڕێگەی کونەلووتەوە بۆ ناو دەماغ و مێشکی، یان بە هۆی دەستوورو(هۆقنەوە)بێت.

بەڵام ڕۆژووەکەی بەتاڵ نابێتەوە بە خوێن دەرهێنان(بەدەرزی) و کەڵەشاخگرتن و چاوڕەشتن، وە ڕاکێشانی میل بە ناو گوێدا و، ناو کونی میزدا، وە کونی گۆی مەمکی ئافرەتدا، بەو مەرجەی ئەوەی لە ناو میلەکەدایە نەگاتە بۆشایی میزەڵدانی. بەڵام ئەوشتانەی بەبێ مەبەست بە هۆی هەناسەوە دەچنە ناو گەرووەوە، وەك تەپوتۆزی ڕێگاو بان و، مێش و مەگەزکە خۆیان هەوادەنە ناو ژوورەوە، یان لە کاتی ئاو لەدەم ڕاداندا تکێ ئاو بپەڕێتە ناو قورگەوە، ئەوە نایشکێنێت، مەگەر زۆر ئاو بهاوێتە ناو دەمیەوەو خۆی نەپارێزێت و غەرغەرەی پێبکات،ئەوە دەیشکێنێت، چونکە کەمتەرخەمی کردووە، بۆیە وتمان: ئەگەر بە مەبەست و عەمدی بێت.

وتیشمان دەبێ لەبیری بێت کە بەڕۆژووە، تا ئەوکەسانە نەگرێتەوە کە لەبیریان چووە، ئەوە نایشکێنێت. بەڵام ئەو کەسەی لە سەرەتای بەرەبەیانەوە و لە کاتی خۆرئاوادا کاتی بانگی بەیانی و کاتی بانگی ئێوارە بە عەمدی شت بخوات و، دوایش بۆی دەربکەوێت و دڵنیاببێت کە لەکاتی ڕۆژدا شتی خواردووە، ئەوە پێویستە لەسەری کە ئەو ڕۆژە بگرێتەوە، بەڵام ئەگەر بە پێی حوکمی ئیجتیهاد و گومانی خۆی خواردبێتی، ئەوە نایشکێنێت و، لەسەریشی واجب نیە کە بیگێڕێتەوە، بەڵام لەوکاتە تایبەتانەدا کە نزیك بە بەرەبەیان و ئێوارانە، نابێت هیچ شتێك بخوات، بەبێ هەوڵدان و تێکۆشان کە بزانێت کاتی ماوە، یان بەربانگ بووە ئینجا بە گومان و زەننی خۆی خواردن بخوات.

## چوارەم : خۆدوورگرتن لە دروست بوونی سەرجێی خێزانی:

پێناسەو سنووری (دروستبوونیش) ئەوەیە کە دامەن و ئەندامی نێرینەی تا شوێنی خەتەنە بەرێتە ناوی شوێنی ڕەگەزی بەرامبەری، بەڵام ئەگەر لەبیری نەبوو کە بەڕۆژووە و دروست بوو، ئەوە ڕۆژووەکەی ناشکێت، وە ئەگەر بەشەو سەرجێی کردبوو، لە پاشان نووست و بەئاگانەهاتەوە تاڕۆژ بوویەوە، یان هەستاو بینی کە ئیحتیلامی بووە، ئەوە ڕۆژووەکەی ناشکێت، وە ئەگەر

لەکاتی دروست بوونی دا ڕۆژبوویەوە، ئەویش یەکسەر خۆی کێشایەوە، ڕۆژووەکەی دروستە، بەڵام ئەگەر پەلەی نەکرد، ئەوە ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، وە پێویستە کەفارەتی ئەو ڕۆژەش بدات.

## پێنجەم: خۆگرتنەوەو نەکردنی دەست پەڕ:

ئەوەیە کە بە مەبەست ئاوی خۆی (مەنی) بهێنێتەوە، بەهۆی دروست بوونەوە، یان هەر هۆیەکی تر، ئەوە ڕۆژووەکەی دەشکێت، بەڵام بە ماچکردنی خێزانی و لەپاڵیاخەوتن ناشکێت، مەگەر ئاوی بێتەوە، بەڵام کارێکی نەشیاوەو باش وایە نەیکات، مەگەر پیاوێکی پیر بێت، یان بتوانێت خۆی ڕابگرێت، توانای هەبێت کە زاڵ ببێت بەسەر نەفسی خۆیدا، ئەوە ماچ کردن قەیناکەو نەکردنیشی باشترە، بەڵام ئەگەر بترسێت بەهۆی ماچ کردنەوە ئاوی بێتەوە، ئەویش ماچی کرد و ئاویشی هاتەوە، ئەوە ڕۆژووەکەی دەشکێت، چونکە کەمتەرخەمی کردووە.(گوناهبار دەبێت و دەبێ ڕۆژەکە بگرێتەوەو کەفارەتی (جیماعی_سەرجێکردنی ) لەسەر پێویست نابێت.

## شەشەم: خۆگرتنەوە لە خۆ ڕشاندنەوە:

ئەگەر بە مەبەست بە دەستی خۆی خۆی بڕشێنێتەوە، ئەوا ڕۆژوەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر ڕشانەوەکە زۆری بۆ هێنا دەسەڵاتی بەسەردا نەما، ئەوە زیانی نیە، وە ئەگەر بەڵغەمێکی هەڵکەند لە گەرووی، یان لە ناو سینەیدا، ئەوە زیانی بۆ ڕۆژووەکەی نابێت، چونکە هەموو کەس گیرۆدەیە پێیەوە، مەگەر هاتبێتە ناو دەمیەوەو، ئەویش قووتی بداتەوە ئەوکاتە ڕۆژووەکەی دەشکێنێت.

**وە ئەگەر کەسێك ڕۆژوو بشکێنێت، چوار شتی لەسەر پێویست دەبێت:**

گێڕانەوەی ڕۆژووەکەی،وە دەبێ کەفارەتیش بدات، وە فیدیەدان،وەخۆگرتنەوە لە خواردن و خواردنەوە تا ڕۆژەکە تەواو دەبێت، نابێت ئەویش هیچ بخوات.

**گێڕانەوەی:** پێویستی گێڕانەوەی ڕۆژوو، ڕوودەکاتە هەموو موسوڵمانێك کە ئەرکی جێبەجێ کردنی فەرمانی شەرعی ڕووی تێکردبێت، وازی لە ڕۆژووەکە هێنابێت، بە هۆی بەهانەیەکەوە یان بێبەهانە[1].

هەروەها ئەوەی کەوتە سوڕی مانگانەوە،دوایی دەبێت ڕۆژووەکەی بگرێتەوە، هەروەها کەسێك [illegible]ڕابێتەوە لەدین، بەڵام کافر و منداڵ و شێت، ئەوانە لەسەریان نیە بیگرنەوە. وە بەمەرج نەگیراوە لە گێرانەوەی ڕۆژوی ڕەمەزاندا، یەك لەدوای یەك بیانگێڕێتەوە، بەڵکوو هەرچۆن ئارەزووی لێبوو بیانگێڕێتەوە، بەیەکەوە بێت یان جیاجیا.

**کەفارەت** پێویست نابێت کە کەفارەت بدات، مەگەر درووست بووبێت لەگەڵ خێزانەکەیدا، بەڵام ئاوهێنانەوەو خواردن و خواردنەوە، جگە لە درووستبوونی تەواوی سەرجێی هیچی تر کەفارەتی ناخاتەسەر.

کەفارەتیش: ئازادکردنی گەردنی کەسێکە لە کۆیلایەتی، ئەگەر نەبوو یان نەیتوانی، ئەوا با دوومانگی بەردەوام بەڕۆژووبێت، ئەگەر نەیتوانی ئەوا نانی شەصت هەژار بدات، هەریەکەی مستێکی پێ بدات لە گەنم یان جۆ.

پاشماوەی ڕۆژەکەش دەبێت خۆی لە خواردن بگرێتەوە:

ئەوە بۆ کەسێکە کە بە عەمدی شکاندبێتی، یان کەمتەرخەمی تێدا کردبێت، دەبێت تا ئێوارە هیچ نەخوات، بەڵام ئافرەتی نەخۆشی سووڕی مانگانە، ئەگەر لەڕۆژی ڕەمەزاندا پاك بوویەوە، پێویست نیە لەسەری تا ئێوارە خۆی لە خواردن بگرێتەوە، هەروەها کەسێکی گەشتیار کە بگاتەوە ماڵەوەو بەڕۆژوو نەبووبێت، لەسەری پێویست نیە تا ئێوارە خۆی لە خواردن بگرێتەوە، ئەگەر سەفەرەکەی

---

(١) دیارە ئەوەی بە هۆی بەهانەیەکی شەرعییەوە نەتوانێت ڕۆژوو بگرێت و ئومێدی چاکبوونەوەیشی لێ نەکرێت، وەك پیریەتی و نەخۆشی درێژخایەن، ئەوە حوکمی جودایە و تەنها کەفارەتی ڕۆژووەکەیان لەسەر پێویست دەبێت، چونکە لە توانایدا نیە کە بیگرێتەوە.

دووقۆناغ بووبێت .

وە هەروەها پێویستە خۆی لە خواردن و خواردنەوە بگرێتەوە، ئەگەر کەسێکی دادپەروەر شایەتی بینینی مانگی دا لە ڕۆژی گوماندا (يوم الشك).

وە بزانە کەڕۆژوو لەسەفەردا خێری زیاترە لە وەی بەهۆی ڕوخصەتەوە بیشکێنێت، مەگەر نەتوانێت، وە ئەو ڕۆژەی کە دەردەچێت بۆ گەشتەکەی نابێت بیشکێنێت، مادام لەسەرەتای ڕۆژەکەدا لەجێگەی خۆی بووبێت و (موقیم)بێت، هەروەها ئەو ڕۆژەش کەدەگاتەماڵەوە نابێت بیشکێنێت، ئەگەر بە زوبانی بەڕۆژووەوە هاتبێتەوە.

## کەفارەتی ڕۆژوو :

کەفارەت پێویست دەبێت لەسەر ئافرەتی دووگیان کە بە منداڵەوەبێت، یان شیر بدات و منداڵی بەبەرەوەبێت، کە لە ترسی ژیان و برسی بوونی مناڵەکەی شکاندبێتی، ئەوە دەبێت هەموو ڕۆژێك مشتێك گەنم بدات بە هەژارێك و ڕۆژووەوەکیش بگرێتەوە، هەروەها پیاوی پیر کە نەتوانێت بەڕۆژوو بێت،تەنهاکەفارەتەکەی دەدات،هەمووڕۆژێك مشتێك گەنم بدات بە هەژارێت.

## سوننەتەکانی ڕۆژوو: شەشن:

سوننەتە دواخستنی پارشێو تا نزیکتر ببێتەوە لە بانگەوە، وە خێراکردن لە شکاندنی ڕۆژووەکەی لە کاتی لەپێش نوێژدا،[١]،

وە لە دوای لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان ئیتر سیواك بەکار نەهێنێت[٢]،

---

(١).لما رواه أحمد والترمذي والنسائي عن أنس قال كان رسول الله ﷺ **يُفطر على رطباتٍ قبل أن يصلي، فان لم يكن فعلَى تمرات، فان لم يكن حسا حَسوات من ماء.**

(٢)وبه قال الشافعى في المشهور عنه وعبارته في ذلك: **أحبُ السواكَ عند كل وضُوء بالليل والنهار، وعند تغير الفم إلا أني اكرهه للصائم أخر النهار من اجل الحديث في خلوف فم الصائم(أطيبُ عندَ الله مِن ريحِ المِسك)** اهـ وليس في هذه العبارة تقييد ذلك بالزوال،

هەروەها سوننەتە لە ڕەمەزاندا دەسکراوە و سەخی بێت، وەك چۆن لە باسی زەکاتدا باسی ئەو گەورەیی خێرو چاکەیەمان کرد، وە سوننەتە خوێندنەوە و ڕەوانکردن و توێژینەوە بۆ قورئان بکرێت و، مانەوەی زیاتر لە مزگەوتدا بە ناوی (ئیعتیکاف)ەوە، بە تایبەتی لەدەهەمی کۆتای مانگی ڕەمەزاندا، کە ئەمە نەریتی (حەزرەتی) پێغەمبەر بووەﷺ. ((**كانَ إذا دَخلَ العَشرٌ الأَواخِرُ...طوىَ الفِراشَ، وشَدَّ المِئزَرَ، ودَأَبَ معَهُ أَهلَهُ..**))[1].

هەر کە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان بهاتایەتە پێشەوە، جێگاکەی دەپێچایەوەو (ئیتر بیری لە خەو نەدەکردەوە)،خۆی تووندو ئامادەباش دەکرد بۆ بەندایەتی و، خێزانی بئاگادەهێنایەوە و دووریش دەکەوتەوە لێیان، وە شەونخوونیشی دەکێشا بۆ زیکرو نوێژ و خوداناسی، خۆی و خێزانەکانی لەسەر بەندایەتی ڕادەهێنا. هەموو بە پێوە ڕادەوەستان و دەمانەوە، چونکە شەوی قەدری پیرۆزیش لەو دەشەوە دایە، زیاتر ئەو شەوی قەدرە لە تاکەکانیدایە، وە شیاوترو نزیکترینیان شەوەکانی بیست و یەك و بیست و سێ و بیست و پێنج و بیست وحەوتە ، وە مانەوەکان لە مزگەوتدا یەك لەدوای یەك باشترە، ئەگەر نەزری کرد لەسەر خۆی بەردەوام بمێنێتەوە لە مزگەوتدا، ئەوا بە چوونەدەرەوەی یەکلەدوای یەکەکەی دەپچڕێت، مەگەر لەبەر پێویستی بووبێت،وەك ئەوەی دەرچوونەکەی بۆ سەردانی نەخۆشێك بێت، یان ئەسپەردە کردنی مردوویەك، یان سەردانی کەسێك، یان تازەکردنەوەی

---

فلذلك قال الماوردي لم يحد الشافعي الكراهة بالزَّوال، وانما ذكر العَشي فحده الأصحاب بالزوال، وقال الترمذي بعد روايته حديث عامر بن ربيعه: **رأيت النبي ﷺ مالا أحصى يتسوك وهو صائم**. والعمل على هذا عند اهل العلم لا يرون بالسولك للصائم بأسا،

(١) رواه البخاري(٢٠٢٤)،.وفي كتاب الإعتكاف، باب الإجتهاد في العشر الأواخرمن شهر رمضان، (١١٧٤)من حديث عائشة بلفظ: **أحيا الليلَ وأيقظَ أهلَه، وجدَّ ، وشَدَّ المِئزَرَ.**

دەستنوێژ بێت، وە ئەگەر دەرچووە دەرەوە بۆ دەستبەئاو گەیاندن، ئیعتیکاف و مانەوەکەی ناو مزگەوتی ناپچڕێت. وە بۆیشی هەیە لەماڵەوە دەستنوێژ بگرێت، وە نابێ خۆی لابدات بۆ کارێکی تر، وە پێغەمبەری خودا ﷺ نەدەچووە دەرەوە، مەگەر بۆ کاری ئادەمییەك کە بۆی جێبەجێ بکات، [١] وە سەردانی نەخۆشیشی نەدەکرد، مەگەر بەلایدا تێپەڕیبایەو هەواڵپرسیەکی بکردایە[٢].

وە بەهۆی سەرجێکردنی خێزانیەوە؛ پێکەوە بوون و یەك لەدوای یەکی مانەوەکەی دەپچڕێت، بەڵام بە تەنها ماچکردن ناپچڕێت، وە بەکار هێنانی بۆنخۆشی و بەستنی عەقدی نیکاح لە مزگەوتدا زیان لە مانەوەکە نادات، هەروەها بە خواردن و نوستن و شۆردنی دەستەکانی لە تەشتێکدا، وە هەموو ئەمانە پێویستی پێیان دەبێت، بۆ لەدەس نەدانی مانەوەی یەك لەدوای یەکی لە مزگەوتدا، کە پچڕپچڕی تێنەکەوێت، وە ئەگەر هەندێك لاشەی بباتە دەرەوە زیان لە مانەوەکەی نادات، وەك (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ سەری نزیك دەکردەوە لە ماڵەکەی (حەزرەتی) عائیشە دایکی ئیمانداران، ئەویش شانەی دەکرد و دایدەهێناو ڕێکی دەکرد، کە لەناو حوجرەکەی خۆی دا بوو.[٣]

وە ئەو کەسەی نیەتی مانەوەی مزگەوتی هێناوە، هەرچەندێك بچێتە دەرەوە بۆ ڕاپەڕاندنی کارێکی، کە هاتەوە دەبێت نیەتەکەی نوێ بکاتەوە، مەگەر بۆ هەر دە شەوەکەی کۆتایی ڕەمەزان یەك نیەتی مانەوەی هێنابێت، ئەوە لەو حاڵەتەشدا هەروا باشترە کە نیەت نوێ بکاتەوە.

---

(١) كما في البخاري (٢٠٢٩) ومسلم (٢٩٧)

(٢) رواه مسلم من فعل السيدة عائشة (رضي الله عنها) وعند أبي داود (رضي الله عنه) (٢٤٧٢)عنها قالت: وكان النبي ﷺ يمر بالمريض وهو معتكف، فيمر كما هو ولا يعرج يسألُ عنه)

(٣) كما في البخاري(٢٩٦)، ومسلم (٣٩٧). باب جواز غسل الحائض شعر زوجها وترجيله.

# ناوبڕی دووهەم

## باسی نهێنیەکانی ڕۆژوو مەرجە شاراوەکانی

**بزانە!** : ڕۆژوو سێ پلەی هەیە: ڕۆژووی تێکڕای خەڵکەکە، وە ڕۆژووی کەسەتایبەتەکان، وە ڕۆژووی تایبەتیترینەکان

### ڕۆژووی تێکڕای خەڵکەکە:

گرتنەوەی ناوسك و عەورەتە لە خواردن و خواردنەوە و کاری ئارەزووەکانی جەستەیی، وەك بە درێژی ڕوونمان کردەوە.

### ڕۆژووی تایبەتەکان:

پاراستنی گوێ و چاوو زوبان و دەست و قاچ و هەموو ئەندامەکانی جەستەیە لە گوناهو تاوانکردن.

### ڕۆژووی تایبەتیترینەکان:

ئەوە پاراستنی دڵیەتی، وە بەڕۆژووبوونیەتی لەوەی کە بیر لە کارێکی نەفس نزمی و هەموو خەتەرەو خەیاڵاتێکی دونیایی بکاتەوە، بە شێوەیەك کە بە تەواوی دووری بخاتەوە لە هەموو شتێکی دیکە، بێجگە لە خودای (عَزَّ وجَلَّ)، هەرکە بیری لە غەیری خوداو ڕۆژی قیامەت کردەوە، ئەوە ڕۆژووە تایبەتیەکەی دەشکێت و، وەك ئیفطاری کردبێتەوە ئاوای لێ دێت، وە نابێت بیر لە دونیایش بکاتەوە مەگەر دونیایەك مەبەستی بێت خزمەتی دینەکەی پێبکات، چونکە ئەو دونیایە لە کاڵاو بەروبوومی پاشەڕۆژە نەك دونیاویستی، تاوای لێهاتووە خاوەن دڵە زیندووەکان فەرموویانە: ئەوەی بە ڕۆژدا تەنها بیر لەوە بکاتەوە کە شتێك دابینبکات بەربانگی پێبکاتەوە، ئەوە هەڵەیەکی لەسەر دەنووسرێت [1]،

---

(١) قوت القلوب (١١٤/٢) بنحوه.

ئەوە نیشانەیە لەسەرکەمیی متمانەبوونی بە فەزڵ و گەورەیی خودا و، کەمبوونی متمانە و دڵنیایی بەو ڕزق و بژێوییەی کە خودا بۆی دابین دەکات.

ئەمەش پلەی پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و صددیقەکانە، لە نزیکانی دیوانی پەروەردگارن، لەمە زیاتر باسکردنیان درێژ ناکەینەوە. بەڵام بەشێوەیەکی ڕاستەقینە و بە کردار، ئەو حاڵەتی بەڕۆژووبوونە ڕاستەقینە چۆن دێتە دی، بەوەی کە ڕاستی و حەقیقەتی هیممەتی خۆی ڕووی پێبکاتە پەروەردگاری و، بە هەموو توانایەوە واز لە غەیری خودای (عَزَّ وجَلْ) بهێنێت، تا بتوانێت تێکەڵ ببێت لەگەڵ فەرموودەی قورئاندا، وەك ئەوەی لەم حاڵەتەدا بژین کە دەفەرموێت: ﴿**قُلِ اللَّهُ، ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ**﴾ (الأنعام/٩١). تۆ پێیان بڵێ: هەمووی پەیوەندارە بە خوداوە، ئیتر ئەوانەی بێبڕوان بالە گومڕایی و نەهامەتی خۆیاندا بگەوزێن و، بە ئارەزووی نەفسی نالەباری خۆیان بکەن.

بەڵام ڕۆژووی تایبەتەکان، کە بە ڕۆژووی صالح و خواناسەکان دادەنرێت، ئەوەیە کە هەموو ئەندامەکانی لەش و جەستە بپارێزێت لە هەموو شێوەیەکی گوناهکردن، **وە تەواوی ئەو خۆپارێزییە بەم شەش فرمانە دەبێت:**

**یەکەم:** چاوداخستن، وە ڕێگای لێبگرێت کە بە ئارەزووی خۆی بە هەموو لایەکدا چاو بگێڕێت، بە تایبەتی بۆ ئەو شتانەی جێگای ڕەخنەن و، ناپەسەند و نەشیاون، وە نابێت چاو بگێڕێت بۆ هەموو ئەو ئامێرو هۆکارانەی دڵەکان سەرقاڵ و مەشغوڵ دەکەن بە غەیری زیکری خودای (عَزَّ وجَلْ) وە،

وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:((**النَّظرة سهْمٌ مسمُومٌ مِن سِهامِ إبليس، فمَن تَركَها خَوْفا مِن اللهِ، آتاهُ اللهُ إيماناً يجِدُ حلاوتَه في قلبهِ**))[1]،سەیرکردنی نامەحرەم تیرێکی کوشندەی ژەهراوی ئیبلیسە، ئەوەی لە ترسی خودا سەیری

(١)رواه الطبراني في الكبير، ١٧٣/١٠، وأبو نعيم في الحلية١٠١/٦.رواه الحاكم في المستدرك (٣١١/٤)، وصحح إسناده من حديث حذيفة رضي الله عنه وأورده ابن الجوزي في كتابه

نامەحرەم نەکات، خودا بڕوایەکی پێدەدات شیرینیەکەی دەچێتە ناو دڵیەوە.

وە جابیر دەیگێڕێتەوە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (خودایان لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە کە فەرموویەتی: ((**خَمسٌ يُفطِرنَ الصَّائِمَ: الكِذبُ، والغَيبَةُ، والنَّميمَةُ، واليَمينُ الكاذِبَةُ، والنَّظَرُ بِشَهوَةٍ**))[1].

واتە: پێنج صیفەت هەن ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە: درۆکردن و ناوبردنی موسوڵمانان لە پاشەملەو، گەیاندنی قسەی خەڵکی بەیەکتری (هێنان و بردنی قسە)و، سوێند خواردنی درۆو، سەیرکردن ی نامەحرەم بە چاوی ئارەزووەوە.

**دووهەم:** پاراستنی زوبانە لەقسەی نابەجێ و وڕێنە و بێ سوود و، درۆکردن و ناوبردنی خەڵکی و، گەیاندنی قسەوباسی خەڵکی و، هێنان و بردنی قسە و، وتەی خراپ و بێ پەردەو، وشك و دوور لە وەفاو، ڕکەبەری و مەرایی و ناوونانۆرەی خراپ، بەڵکوو دەبێ ناچاری بکەیت کە بێدەنگی هەڵبژێرێت و، سەرقاڵی بکەیت بە زیکری خوداوە و، بە خوێندنەوەی قورئانەوە، ئەمە بکات ئەو کاتە زوبانی بەڕۆژوو بووە.

سوفیانی سەوری(خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: غەیبەتکردن ڕۆژوو

---

تنبيه النائم الغمر على مواسم العمر. بلفظ: **النَّظر إلى المرأة سهمٌ مسموم من سهام إبليس، فمَن تركه ابتغاء مَرضاةِ اللهِ أعطاه الله إيماناً في قلبِهِ يجدُ حلاوتَه .**

(١)وقال العراقي رواه الأزدي في الضعفاء من رواية جابان عن أنس وقوله (جابر) **تصحيف.** قال أبو حاتم الرازي هذا كذب اهـ . قال الزبيدى: ورواه كذلك الديلمي في مسند الفردوس(١٩٧/٢) من حديث جابان عن أنس بلفظ : **خمس خصالٍ يفطرنَ الصائم وينقُضن الوُضوء، فساقه .** قال الزبيدي٢٤٥/٤: ما طريق داود بن رشيد عن بقية فاسناده متقارب وليس فيه من رَمى بالكذب الا أنه ضعيف لضعف محمد بن حجاج والله أعلم ﷺ، وهو كما أورده المصنف عند صاحب القوت: (١١٤/٢)، وروى ابن أبي شيبة في (المصنف) (٨٩٧٥) عرفان عمر (رضي الله عنه) :( **ليس الصيام من الطعام والشراب وحده، ولكنه مِن الكذب والباطلِ، واللغو والحلف).**

بەتاڵ دەکاتەوە، وەك بیشری کوڕی حاریس لێیەوە دەیگێڕێتەوە[١]،

ئیمام لەیس دەیگێڕێتەوە لەموجاهیدەوە(خودای لێ ڕازی بێت)کە فەرموویەتی:

دوو خەصڵەت هەن ڕۆژوو دەشکێنن: غەیبەت و درۆ کردن[٢]،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((إنَّما الصَّومُ جُنَّةٌ، فَإذا كانَ أَحَدُكُم صائِماً..فلاَ يَرفُث ولاَ يَجهَل، وإنِ امرؤٌ قاتَلَهُ أَو شاتَمَهُ..فليَقُلْ: إنِّي صائِمٌ إنِّي صائم))** [٣].

واتە: ڕۆژوو تەنها بریتییە لە خۆپاراستن، کەواتە ئەگەر یەکێك لە ئێوە بەڕۆژووبوو، با قسەی نەفامانەو خراپ و بێ شەرمی نەیەت بەدەمیدا، تەنانەت ئەگەر کەسێك شەڕی پێفرۆشت، یان جنێوو قسەی ناشیرینی پێ وت، با ڕووبەڕووی نەبێتەوەو بڵێت: من بەڕۆژووم، من بەڕۆژووم، واتە: کەسێك بەڕۆژووبێت نابێت شەڕەقسەش بکات.

لە هەواڵ و فەرموودەدا هاتووە: [٤]. **((أنَّ امرأتينِ صامَتا على عَهد رسول الله ﷺ فاجهَدهما الجوعُ والعَطَشُ من آخر النهار،حتَّى كادَتا أن تَتلَفا، فبَعثَتا إلى رسُول الله ﷺ تَستأذنانِه في الإفطار، فأرسلَ إليهما قدحاً و قالَ للرَّسول: قُل لهُما قَيئَا فيهِ ما أكلتُما، فقاءَتْ إحداهُما نِصفَهُ دماً عَبيطاً، ولَحمَاً غَريضاً، وقاءَتِ الأُخرى مثلَ ذلكَ حتَّى ملأَتاهُ، فعَجِبَ الناسُ من ذلكَ، فقالَ رسولُ الله ﷺ هاتانِ**

---

(١)قوت القلوب(١١٤/٢)،سوفیان و ئەوزاعی ڕایان وایە هەرلە ڕاستیدا بەتاڵ دەبێتەوە.

(٢) رواه ابن أبى شيبه في (المصنف)(٨٩٨٠) وهو في القوت(١١٤/٢).

(٣)أخرجه البخاري(١٨٩٤)، والنسائي من طريق مالك وكذا أبو داود وأخرجه مسلم(١١٥٠) والنسائي من طريق سفيان بن عيينة وأخرجه مسلم من رواية المغيرة الحزامي ثلاثتهم عن أبي الزناد عن الاعرج عن أبى هريرة أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال : **الصيام جنة فاذا كان أحدكم صائما فلا يجهل ولا يرفث والباقي سواء.**

(٤)هكذا أورده صاحب القوت٧٥/١) والعوارف وقال العراقي رواه أحمد في المسند(٤٣١/٥) من حديث عبيد مولى رسول الله صلى الله عليه وسلم بسند فيه مجهول.

**صامَتا عَمَّا أحلَ اللهُ لهُما، وأفطَرَتا علَى ما حرَّم اللهُ تعالَى علَيهِما، فقعَدت إحداهُما إلِى الأُخرى فَجَعلتَا تَغتابانِ النَّاسَ، فهذا مَا اكلَتا مِن لحُومِهم))**

واتە: دوو ئافرەت لە سەردەمی(حەزرەتی) پێغەمبەردا ﷺ بەڕۆژووبوون، لە دەمەو ئێوارەدا برسێتی و تینوێتی زۆری بۆ هێنان، وە گەیشتنە ئەو ئاستەی کە بە هیلاکیاندا ببات، کەسێکیان نارده خزمەت (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ کە ڕێگەیان پێبدات ڕۆژووەکەیان بیشکێنن، ئەویش جام و دەفرێکی بۆ ناردن و بە نوێنەرەکەیداو فەرمووی: پێیان بڵێ ئەوەی کە خواردووتانە هەوڵبدەن با برشێنەوە ناوی، یەکێکیان خۆی ڕشاندەوە و نیوەی دەفرەکەی پڕ کرد لە خوێنی تۆخ و گۆشتێکی نەرمی تازەبوو، ئەویشیان بەهەمان شێوە ڕشایەوە ناو دەفرەکە، تا جامەکەیان لێوانکرد، خەڵکەکە سەریان لەم دیمەنە سوڕما.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی پێیان: ئەو دوو ئافرەتە خۆیان گرتەوە لە خواردن و خواردنەوە، کە هەردووکیان خودا بۆی حەڵاڵکردوون، بەڵام ڕۆژووەکەیان شکاند بەوەی کە خودا لێی حەرامکردوون، کە یەکێکیان لە پاڵ ئەویاندا دانیشتوو، دەستیان کرد بە ناوبردنی خەڵکی و غەیبەتکردنیان، وەك دەبینن گۆشتی ئەو خەڵکەیان خواردووە!!

**سێیەم:** گوێ نەگرتنە لە هەموو قسەیەکی نەشیاوو ناپەسەند، چونکە هەرقسەیەك خوا قەدەغەی کردبێت کە بووترێت، حەرامیشە کە گوێی لێبگیرێت، بۆیە خودا ﷻ یەکسانی خستۆتە نێوانی ئەوانەوە کە گوێ دەگرن لە درۆو دەلەسەی خەڵکی و، ئەوانەش کە حەرام خۆری دەکەن، بۆیە دەفەرموێت: گوێ لە درۆکان دەگرن و شتی حەرامیش دەخۆن،﴿**سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ**﴾ (المائدة/٤٢) ئەوانە هەرچی قسەی خراپ و درۆ هەیە دەیبیستن و، حەرامخۆری و سووخۆریش دەکەن.

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿**لَوْلَا يَنْهَاهُمُ الرَّبَّانِيُّونَ وَالْأَحْبَارُ عَنْ قَوْلِهِمُ الْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ السُّحْتَ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَصْنَعُونَ**﴾ (المائده/٦٣)

واتە: بۆچی زانا خوداپەرستەکان و گەورەکانیان ڕێگریان لێ ناکەن لە وتەی گوناهو لە درۆو بوختان، وە لە خواردنی ماڵی حەرام، ئیشێکی زۆر خراپ دەکەن کەلێیان قەدەغە ناکەن[1]، هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ﴾ (النساء/١٤٠)

لەگەڵیان دامەنیشن تا ئەو بابەتە دەگۆڕن و دەچنە سەر باسێکیتر ، ئەگەر گوێیان لێبگرن و دابنیشن، کەواتە ئێوەش وەك ئەوان وان، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:((المُغتابُ والمُستَمِعُ شريكانِ في الإثمِ)) ئەوەی ناوی خەڵکی دەبات بە خراپە و،ئەوەش گوێی لێدەگرێت، هەردووکیان هاوبەشن لە گوناهەکەدا[2]

**چوارەم:** گرتنەوەی هەموو ئەندامەکانی دیکەی جەستەیە لە گوناه، دەست و پێ بگرێتەوە لە ئەنجامدانی هەموو کارێکی خراپ، وە ناوسکی بگرێتەوە لەوەی توخنی هیچ شوبهەو کارێکی گوماناوی نەکەوێت تا کاتی بەربانگ، چونکە هیچ واتایەك نامێنێتەوە بۆ ڕۆژوو، کە واز لە خواردنی خۆراکی حەلاڵ بهێنێت و گۆشتی حەرام بخوات، کە غەیبەتی موسوڵمانانە، واتە: بەحەرام ڕۆژووەکەی بشکێنێت، نموونەی ئەم ڕۆژووەوانە وەك ئەو کەسەوایە کە کۆشکێك درووست دەکات و شارێك وێران دەکات، چونکە خواردنی حەلاڵ زیانەکەی لە جۆرەکەیدا نیە، بەڵکوو لە زۆر خواردنە کەیدایە، ڕۆژوو وەك کەم خواردنی خۆراك وایە سوودی پێدەگەیێنێت، وە کەسێکیش واز لە زۆرخواردنی دەرمان بهێنێت لە ترسی زیانەکانی، ئەگەر لەم

---

(١) خۆلاصە، ١١٨. وە بۆ ئایەتی پێشوویش بنوارە هەمان سەرچاوە ل/١١٥.

(٢) في معناه رواه أبو نعيم في الحلية٩٣/٤. والخطيب في تأريخ بغداد ٢٢١/٨، عرفان ابن عمر (رضيَ الله عنهما) **نهى رسول الله ﷺ عن الغناء والإستماع إلى الغناء، ونهى عن الغيبة والإستماع إلى الغيبة، وعن النميمة والإستماع إلى النميمة)**. وروى الطبري في الأوسط(٣٦/٣)(٢٣٩٣)بسند ضعيف: **نهى رسول الله عن الغيبة وعن الإستماع إلى الغيبة.**

وازهێنانە بایدایەوە بەلای خواردنی ژەمێك زەهردا با كەمیش بێت، ئەوە بە كەسێكی نەفام خۆی دەناسێنێت، دەی خواردنی حەرامیش وەك ئەو ژەهرە كوشندە وایە دین لە ناو دەبات، حەڵاڵ خواردنیش وەك ئەو كەمە دەرمانە سوود بەخشە وایە، كەمەكەی قازانجی لێدەكات و، زۆرەكەیشی زیانی لێدەدات، مەبەستیش لە بەڕۆژووبوون كەمكردنەوەی خواردنی ئەو خۆراكە حەڵاڵەیە تا سوود بە گیانی بگات.

هەروەك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی :

**((كَم مِن صائِمٍ لَيسَ لهُ مِن صِيامِهِ إلاَّ الجُوعُ والعَطَش))**[1]،

چەندین كەس هەن كە بەڕۆژوو دەبن، تەنها برسێتی و تینوێتیەكەیان پێدەبڕێت و هیچ خێرێكیان بۆ نانوسرێت، لەواتای ئەم فەرموودەدا هەندێك فەرموویانە: ئەو كەسەیە كە بە خۆراكی حەرام ڕۆژووەكەی دەشكێنێت، یان دەڵێن: ئەوەیە كە لە خواردنی حەڵاڵ خۆی دەگرێتەوەو ڕۆژووەكەیشی دەشكێنێت بە غەیبەتكردنی حەرام و، خواردنی گۆشتی خەڵكی، هەندێكیش دەڵێن: ئەو كەسەیە كە خێری ناگات، كە ئەندامەكانی جەستەی ناپارێزێت لە گوناهو خراپەكاری[2]،

**پێنجەم:** نابێ لە خۆاردنی حەڵاڵیش زۆر بخوات، لە كاتی ڕۆژووشكاندندا، كە هەموو گەدەی پڕ بكات، هیچ توورەكەو بۆشاییەك نیە كە زیاتر لای خوا بێزراوو قیزەون بێت، لە ناوسكی ئادەمیزاد با لە حەڵاڵیشی پڕ كردبێت،[3].

چۆن سوود لە ڕۆژوو وەردەگرێت و شكست بە دوژمنی خودا دەهێنێت و،

---

(١) رواه أحمد في المسند(٣٧٣/٢)، وبنحوه عن ابن ماجة (١٦٩٠) من حدبث أبي هريرة وأخرجه النسائي في الكبرى (٢٣٩/٣(٣٢٤٩).

(٢) هەرسێ ڕیوایەتەكە خاوەنی (قوت القلوب) باسی كردوون، ١١٤/٢.

(٣) قال الزبيدي ٢٤٨/٤: وروى أحمد في مسنده(١٦٧٣٥)،والترمذي(٢٣٨٠) وابن ماجه

زاڵدەبێت بەسەری داو، ئارەزووەکانی دەشکێنێت، ئەگەر هەموو ئەو شتانەی کە لە ڕۆژدا نەیتوانیوە بیانخوات، هەمووی لە کاتی ئیفطاردا بیانخوات و، لە گەدەی دا کۆیان بکاتەوە؟!

لەوانەیە جۆرەهایەکی تر لە خواردن و خواردنەوە زیاد بکات، تا نەریتی ئێستە وای لێهاتووە، خەڵکی خواردنە خۆشەکان کۆدەکەنەوە و هەڵی دەگرن بۆ ڕەمەزان، ئەوەندەی لەو مانگەدا خواردن دەخورێت، لە چەندمانگێکی تردا ناخورێت، ئاشکرایشە کە مەبەست لە ڕۆژووگرتن سك هەڵگوشاردن و کەمکردنەوەی خواردن و ئارەزووەکانە، تا ڕۆحی مرۆڤ هێز پەیدا بکات بۆ بەندایەتی و خوداناسی، خۆ ئەگەر گەدەی خۆی برسی بکات و، ئارەزواتی بەهێز ببێت و تامەزرۆ بێت بۆ خواردن و، ئێوارەش هەموو جۆرە خۆراك و تاموچێژێکی خۆشی دەرخوارد بدرێت و تێر بکرێت، ئەو کاتە چێژی زیاتر لە خواردنەکە وەردەگرێت و، مەیلی چەند قات زیاد دەکات، لەوانەیە هەندێك حەزو ئارەزووەکانی هەیە بیخرۆشێنێت و بیووروژێنێت، کە ئەگەر ئەو هەموو خواردنە بەتامەی نەخواردایە و لەسەر نەریتی خۆی بوایە ئاوا نەدەورووژا.

کەواتە بزانە کە ڕۆح و گیانی بەڕۆژووبوون و نهێنیەکانی ئەوەیە کە هێزی ئارەزووەکان کەم کاتەوە، کە شەیتان لەو ڕێگەوە زاڵ دەبێت و ڕایدەکێشێت بۆ خراپەکاری، ئەمەش تەنها بە کەمکردنەوەی ئەو خواردن و ئارەزوی خوداردن دەبێت، دەبێ ئەوەندە بخوات کە شەوەکانی تر کە بەڕۆژوونەبووە چەندی خواردووە لێی زیاد نەکات، خۆ ئەگەر ئەوەی شەوانی تریش بخوات و، ئەو برسێتی و ئارەزووە زیادەیش بەکار بهێنێت، ئیتر بەتەمای چ سودێك دەبێت کە

---

(٣٣٤٩)والحاكم في المستدرك(١٣٥/٤)(٧١٣٩) من حديث المقدام بن معدى كرب رضي الله عنه: **ما ملأ آدمي وعاء شرا من بطنه، بحسب ابنِ آدم أكلاتٍ يقمْنَ صَلبَه، فإن كانَ لا محالةَ، فثلثٌ لطعامه، وثلث لشرابه، وثلث لنفسه.**

له ڕۆژووەکەی وەربگرێت؟!

بەڵکوو له ئادابی ڕۆژووگره که بەڕۆژیشدا زۆر نەخەوێت، بۆ ئەوەی هەست بە برسێتی و تینوێتی بکات، وە هەست بکات کە بێهێز و لاواز دەبێت، بۆ ئەوەی دڵی صەفا پەیدا بکات، وە شەویش زیاتر حاڵەتی لاوازیەکەی پێوە دیار بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت نوێژی تەراویح و شەونوێژو ویردەکانی بە ڕۆح سووکی و ئارامییەوە ئەنجام بدات، بەڵکوو شەیتان چواردەوری دڵی نەگرێت و گەمارۆی نەدات، بۆ ئەوەی بتوانێت جیهانی بەربڵاوی ئاسمانەکان ببینێت.

شەوی قەدری پیرۆزیش: بریتییە لەو شەوەی کە هەندێك لە نهێنیەکانی جیهانی مەلەکووتی بۆ ئاشکرا ببێت،(١)، ئەمەش مەبەستی ئایەتە پیرۆزەکەیە کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ (القدر/١)

---

(١) مەبەست جیهانی باڵایە، وەك ئیمامی غەزالی لە جێگەیەکی تردا دەفەرموێت: ئەگەر سالیکی ڕێگای ئاخیرەت گەیشتە ئاسمانی دونیا، ئیتر ئەمین دەبێتەوە لە خەتەرە و لێ شێواندنی شەیتان، وە دەپارێزرێت لێی. شێخ شەمسەددینی کوڕی سودەکین دەفەرموێت: پرسیارم کرد لە شێخی ئەکبەر شێخ محی الدین ی عەرەبی (قدّسَ الله سرّه) لە واتای ئەم فەرمووده، فەرمووی: لێرەدا لێکۆڵینەوەیەك هەیە پێویستە لێی تێبگەن و بزانرێت: ئەم قسە کاتێك جێگیر دەبێت، وە لە ئاسۆی بەرفراوانی دونیادا ئیتر شەیتان پێی ناوێرێت و لێی دوور دەکەوێتەوە، کە جەستەی سالیك بگاتە سەروو ئاسمانی دوونیاوە، کە کەسەکە بمرێت و، نەفسیشی بەرز بووبێتەوە بۆ ئەو جێگایە، بەڵام ئەگەر تەنها لە جیهانی کەشفدا پێی گەیشتبێت، هەروەها کەشفی ئاسمانەکانیش، ئەوە تەنها بە حاڵەتی ڕۆحی تیایانـدادەبێت، وە خەیاڵیشی پێیەوە دەلکێت، شەیتانیش هەندێك پێوانەو زانیاری و قیاساتی خۆی هەیە ، دەزانێت مقامی ئەو عەبدە لە و حاڵەت و دیمەنانەدا لە کوێدایە، بەهۆی هەندێك حاڵەت و مقامەوە کە فرسەتی لێ دەهێنێت، کەلێنێك دەدۆزێتەوە، تا لێیەوە بچێتە ناویەوەو، هەندێك خەیاڵ و گومانی بۆ درووست بکات، جا ئەگەر ئەو سالیکە هەندێك لاوازی تێدا

ئێمە قورئانمان ناردە خوارەوە لەشەوی قەدری پیرۆزدا، جا کەسێك لە نێوانی دڵ و سینەیدا پڕی بکات لە خواردن، ئەوە لەو چاوکرانەوەیە مەحروم و بێبەش دەبێت، پەردە دەدرێت بەسەر بینایی چاوی دڵیدا، کەسێکیش گەدەی خاڵی بکاتەوە، بە تەنها ئەوەندە چاوی دڵی کراوە نابێت، مەگەر هیممەتی ئەوەندە بەرز بەکار بهێنێت، جگە لە خودا دوور بکەوێتەوە لەهەمووشتێك، ئەو کاتە پەردە لە میاندا نامێنێت و نهێنیەکانیش دەبینێت، سەرچاوەو بنەمای هەموو ئەو دەسکەوتانەش لە کەمکردنەوەی خواردنەوە دەستیان دەکەوێت، کە زیاتر ئەم بابەتە لە پەڕاوی خۆراکەکاندا درێژدەکەینەوە.

**شەشەم:** دەبێت دوای ڕۆژوو شکاندنەکەیشی دڵی هەڵپەسێررابێت لە نێوانی ترس و هیوادا، چونکە نازانێت ئایا ڕۆژووەکەی لێ وەرگیراوە، تا لە نزیکان هەژمار بکرێت، یان دراوەتەوە بەسەریدا و لە بێبەش و وەرنەگیراوەکان بێت.

با لە دوای هەموو عیبادەتێك کە لێدەبێتەوە، هەر بەم شێوە بیربکاتەوە، دەگێڕنەوە لە حەسەنی کوڕی (أبي الحسن) ی بەصری وە (خودای لێ ڕازی

---

هەبوو، لەڕوی طەریقەتەوە، ئەوحاڵەتەی لێ وەردەگرێت و، زیاتر لە جەهل و نەزانینی نزیك دەخاتەوەو کاری تێ دەکات. بەڵام ئەگەر سالیکەکە عاریف و بە توانا بوو. یان موریدێکی بەردەستی مورشیدێکی کامل و پێگەیشتووبوو، ئەگەر خۆی لەسەر بەرنامەی سلووکەکەی جێگیر و خۆڕاگر بوو، لەو خەتەرەو خەیاڵاتی شەیتانە ئاگادار دەبێت و، شەیتان ناتوانێت زیانی لێ بدات، بە هۆی هێزی مەعنەوی دەستگیرەکەیەوە، هەمیشە لە پلان و نەخشەی شەیتان حاڵی دەبێت و، هەر جارەی بە شێوەیەکی تۆکمەو بەهێز ڕوبەڕوی دەبێتەوەو، ئەویش جگە لە خەسارەتمەندی هیچی پێ نابرێت، هەرجارەی بە پیلان و فرت و فێڵێکی ترەوە دێتەوەو، هەموو جارێکیش بە عەزم و ئیرادەیەکی تۆکمەو بە هێزترەوە ڕوبەڕوی دەبێتەوە. بۆ زیاتر بنوارە: الإتحاف( ٤/٤٤٩) .

بێت) که تێپەڕی بەلای تاقمێکدا له ڕۆژی جەژندا پێدەکەنین، فەرمووی:

خوای(عَزَّ وجَلْ)مانگی ڕەمەزانی کردووه به مەیدانی کێبڕکێی ئەسپ سواری، تا ئەسپی بەندایەتی تێدا تاوبدەن، هەندێکیان پێشکەوتن و گۆی هونەریان بردەوه، وه هەندێ تاقمیشیان دۆڕان و بێ هیوا مانەوه، ئەوەی زۆر مایەی سەرسوڕمانه، بۆ ئەو کەسەی پێدەکەنێت و یاری دەکات، لەو ڕۆژەدا که ئەوان تێیدا بەرنده و پێشکەوتووبوون، یان دواکەوتووه دۆڕاوەکان تێیدا شکستیان هێناوه، سوێند به خودا! ئەگەر پەرده لەسەر ڕاستییەکان هەڵبدرێتەوه، کەسیان نەیاندەپەرژایه سەر پێکەنین، ئەوانەی چاکەکارانن سەرقاڵی خۆشی وەرگیراوی خۆیان دەبوون و، خەریك نەدەبوون به یاری کردنەوه، ئەوانەش که خراپەکارانن، سەرقاڵی خەفەت و بێ هیوایی دۆڕانی خۆیان دەبوون و، نەیاندەپەرژایه سەر پێکەنین.

دەگێڕنەوه له ئەحنەفی کوڕی قەیسەوه (خودای لێ ڕازی بێت) که پێیان وت: تۆ پیاوێکی پیریت، ڕۆژوو زۆر لاوازت دەکات. فەرمووی:

من ئەو ڕۆژوانه هەڵدەگرم و ئامادەیان دەکەم بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی شەڕێکی درێژخایەن، بەڕاستی خۆڕاگرتن لەسەر بەندایەتی بۆ خودا، ئاسانتره له صەبرو خۆڕاگری لەسەر عەزابی خودا.[1]،

ئەمەی باسمانکرد، واتا شاراوەکانی ڕۆژووه.

**ئەگەر بڵێیت:** ئەوەی تەنها خۆی له ئارەزووه نەفسی و جینسییەکانی پاراست، وه ئەم واتا شاراوانەی بەجێ نەهێنا، خۆ لەلای چینی شەرع زان و فوقەهاكان ڕۆژووەکەی دروسته، ئەمه مانای چی دەگەیێنێت؟

**ئەوه بزانه:** زانایانی زانستی زاهیری، تەنها مەرجه ڕوون و ئاشکراکان باس و

---

(١) رواه ابن سعد في طبقاته (٩٥/٩)، تا دەگاته: بۆ شەڕێکی درێژخایەن.

جێگیر دەکەن و، بەڵگەکانیشیان لەم ڕوانگەوە بێ هێزترە لەو بەڵگانەی کە ئێمە هێناومانەتەوە، لە بەیانی مەرجە شاراوەکاندا، بە تایبەتی بابەتی درۆو غەیبەتکردن و هاووێنەکانی، بەڵام ئەرکی زیاتر لەسەر فوقەهاکان نیە، جگە لەوەی کە تێکڕای غافڵ و بێ ئاگاکان و، ئەوانەی کە ڕوویان لە دونیا کردووە ، ئاسان بێت لەسەریان کە بچنە ژێر ڕکێفیەوە، (ئەوان تەنها مەرجە زاهیریەکانی بێتەدی، حوکمی دروستی بەسەردا دەدەن)، بەڵام زانایانی عیلمی ئاخیرەت.. مەبەستیان لە دروستی فرمانێك ئەوەیە: کە وەرگیراو بێت، وە مەبەستیشیان بە وەرگیراوی ئەوەیە: کە بیگەێنێتە مەبەست، وە وا تێگەیشتوون کە مەبەست لە ڕۆژوو ئەوەیە بیانخاتە سەر یەکێك لە ڕەوشتەکانی پەروەردگار ﷻ کە ڕەوشتی (صەمەدییەتە)، ( یەکێك لەواتاکانی صەمەد ئەوەیە کە بۆشایی ناوسکی نیەو، پڕناکرێتەوە و خواردنی دەرخوارد نادرێت)، هەروەها مەبەست ئەوەیە: کە شوێن ڕەوشت وئاکاری فریشتەکان بکەون، لەوەی کە بە پێی توانا واز لە خۆراك و خواردنەوە دەهێنن، چونکە ئەوانە دوورن لەهەموو ئارەزووەکانەوە، وە مرۆڤیش پلەیەکی هەیە لەسەروو پلەی گیاندارانەوە، چونکە بە نووری ئەقڵ و هۆشمەندی، دەتوانێت ئارەزووە ناپەسەندەکانی تێك بشکێنێت، وە پلەکەیشی لە خوار پلەی فریشتەکانەوەیە، چونکە ئارەزووەکانی زاڵە بەسەریدا، وە گیرۆدەیە بەو حاڵەوە کەدەبێت تێ بکۆشێت، تا ڕزگاری دەبێت لێی ، کەواتە هەرچەندێك ڕۆبچێت لە بازاڕی ئارەزووە، ئەوەندە بەرەو و پێ هەڵخزان و ڕۆچوون بۆ ناو جیهانە خوارووەکان، سەربەرە و خوار دەبێتەوە، وە پەیوەندی دەکات بە کۆمەڵی ئاژەڵ و گیاندارەکانەوە، بەڵام کە ئارەزووەکانی خۆی گرتەوە و زاڵ بوو بەسەریاندا، خۆیشی بەرز دەبێتەوە بۆ ئاستە بەرزەکان، وە دەگات بەو ئاسۆیەی فریشتەکانی تێدا دەژین، فریشتەکانیش نزیکن لە دیوانی پەروەردگاری مەزنەوە، ئەوەش کە شوێن فریشتەکان بکەوێت و، لەسەر ئاکاری ئەوان بێت، ئەوا بەو ڕەوشت و بەها پیرۆزانە نزیك دەبێتەوە

له خوداوه، وەك نزیکی ئەوان، چونکه ئەوەی بشوبهێت به کەسانێکی نزیکەوه نزیکه، ئەوکاته نزیك بوونەکه بۆ شوێن و جێگا نیه، بەڵکوو نزیکی صیفەت و ڕەوشت و ئاکاره.

کەواته؛ ئەگەر دڵنیابووین ئەمەیه نهێنی ڕۆژوو، لەلای زانایانی دەروون ناس و ئەهلی دڵ، کەواته چ بەهایەکی دەمێنێت، ئەگەر ژەمێکی خواردن دوابخرێت و پێکەوه له ئێواراندا به ئارەزوویەکی زیاترەوه قەرەبووی بۆ بکرێتەوه، لەگەڵ ئەوەشدا به درێژایی ڕۆژەکه خۆی نەگرتبێتەوه له ئارەزووەکانی تر، وەك قسەو باسی خەڵکی و، نەزەر و گوناهی تر؟! ئەگەر کاری وا بایەخی هەبوایه، ئەو کاته چ واتایەك دەمایەوه بۆ فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ که فەرموویەتی:

**(( كَم مِن صائِمٍ لَيسَ لهُ مِن صِيامِهِ إلاَّ الجُوعُ والعَطَش ))**[1].

زۆر کەس هەن که بەڕۆژوو دەبن، تەنها برسێتی و تینوێتیەکەیان پێدەبڕێت، وهیچ خێرێکیان بۆ نانوسرێت.

هەر لەبەر ئەم هۆکارانەیه، که (حەزرەتی) ئەبودەرداء فەرموویەتی:

خۆزگه به حاڵی نوستنی داناو هۆشمەندو پۆشتەکان و ڕۆژوو شکاندنیان، چۆن پێش ڕۆژوو کات بەسەربردنی نەفام و بێ ئەقڵەکان دەکەون، که زەڕەیەك له کاری چاکەی خاوەن متمانه و تەقواکارێك باشترو قورسترە له ئەندازەی کێوێك عیبادەتی هەڵەکارو فری وخواردوان[2].

هەر لەبەر ئەمەیه هەندێك له زانایان فەرموویانه: چەندین ڕۆژووەوان هەیه، وەك شکـــاندبێتی ئاوا دەناســــرێت، وە چەندیـــن کەسیـــش هەیه ڕۆژووی شکاندووه، وەك بەڕۆژوو بێت ئاوا حیسابی بۆ دەکرێت.

---

(١) رواه أحمد في المسند (٢/٣٧٣)، وبنحوه عن ابن ماجه (١٦٩٠) من حدبث أبي هريرة وأخرجه النسائي في الكبرى (٣/٢٣٩)(٣٢٤٩).

(٢) رواه أحمد في مسنده(٢/٣٧٣)، وبنحوه ابن ماجه (١٦٩٠).

ئەوەی شكاندبێتی و بەڕۆژوویش بێت: ئەوكەسەیە كە ئەندامەكانی جەستەی لە حەرام و گوناه پاراستبێت، وە ئەشخوات و ئەیشخواتەوە، بەڵام ئەوەی بەرۆژو بێت و شكاندبێتیشی: ئەوە خۆی برسی و تینوو دەكات، بە هۆی بەڕۆژوو بوونەوە، بەڵام زمان و ئەندامەكانی جەستەی بەرەڵا دەكات بۆ گیانی خەڵكی.

وە هەركەسێك لە واتای نهێنیەكانی ڕۆژوو حاڵی ببێت، دەزانێت:

ئەوەی وازی هێنابێت لە خواردن و سەرجێكردنی، بەڵام بەتێكەڵ بوونی لە گوناهدا ئیفطاری كردبێتەوەو ڕۆژووی شكاندبێت، وەك ئەو كەسە وایە كە سێ جار دەستی هێنا بێت بەسەر یەكێك لە ئەندامەكانی دەستنوێژدا، ئەوە بە شێوەی ڕواڵەتی وەك شەرع چی فەرمووە لە بارەی ژمارەوە ئاوای كردووە، بەڵام لە ڕاستیدا وازی لە شۆردن هێناوە، كەواتە لەبەر نەزانینەكەی نوێژەكەی دەدرێتەوە بەسەریدا، جا نموونەی ئەو كەسەی كە بە خواردن ڕۆژووەكەی شكاندبێت و، بە ئەندامەكانی لەشیشی خۆی لە كارە نارەواو ناپەسەندەكان پاراستبێت، وەك ئەوەوایە، كە یەكجار ئەندامەكانی دەستنوێژی شۆردبێت، ئەوە پشت بەخوا نوێژەكەی دروستە، چونكە ئەصڵی دەستنوێژە كەی جێبەجێ كردووە، با فەزڵەكەیشی لە دەستدابێت.

بەڵام نموونەی ئەوكەسەی كە هەردوو بابەتەكەی كۆكردبێتەوە، (واتە: بەڕۆژوبێت و، خواردن و خواردنەوەش نەخوات و، گوناهیش بە ئەندامەكانی نەكات)، وەك ئەوە وایە كە هەموو ئەندامەكانی لەشی سێ جار سێ جار شۆردبێت، ئەوكەسە ئەصڵی واجبەكەو فەزڵ و خێرەكەیشی كۆ كردۆتەوە، كە ئەمە پلەی كەماڵی پێدەڵێن.[١]،

هەروەك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((إِنَّما الصَّومُ أَمانةٌ، فَلْيَحفَظ أَحَدُكُم أَمانتَهُ))[١]،

---

(١) ئەم نموونە ئەبوطالیبی مەككی هێناویەتیەوە لە : قوت القلوب دا (١/٧٥).

واتە ڕۆژوو ئەمانەتێکی خودایيە لەلاتان دانراوە، با هەربەکێك لە ئێوە پارێزگاری لە ئەمانەتەکەی خۆی بکات.

وە کاتێك فەرموودەی خودای (عَزَّ وجَلَّ) ی خوێندەوە:

﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا﴾ (النساء/٥٨)

واتە: خودا فرمانتان پێدەدات، کە هەموو ئەمانەتەکان بگەێننەوە دەستی خاوەنەکانی، وە دەستی خستە سەر چاو و گوێچکەوی و فەرمووی:[١]

((السَّمعُ أَمانةٌ، والبَصَرُ أَمانَةٌ))[٢]، گوێ ئەمانەتەو بیستنیش ئەمانەتە، ئەگەر لە ئەمانەتی ڕۆژوو نەبوایە، ئەوا پێغەمبەر ﷺ نەیدەفەروو:

((فَلْيَقُلْ إِنِّي صائِم))[٣]، با بڵێت من بەڕۆژووم، واتە: من زوبانم لا بەئەمانەت دانراوە تا بیپارێزم، ئیتر چۆن بەرەڵای بکەم، تا بەریدەمە گیانی خەڵکییەوە؟!

**کەواتە :**

دەرکەوت هەموو بەندایەتییەك ڕووی زاهیری و ڕواڵەتی هەیە و، ڕووی شاراوەیشی هەیە، وە توێکڵی ئاشکراو کاکڵەو ناوکرۆکیشی هەیە، توێکڵەکانیشی چەندین پلەی جیاوازیان هەیە.

کەواتە ئارەزووی تەواو ئێستە بەدەست خۆتە، لەوەی کە بە توێکڵەکەی دەسبەرداری کاکڵەکەی ببیت، یان زیاتر خۆت بەولایەدا ساغ بکەیتەوە کە خاوەن دڵە صەفادراوو دەروونە صافەکان پێی گەیشتوون.

---

(١) روى الطبراني في الكبير (١٠/٢١٩) ، وأبو نعيم في الحلية، ( ٤/٢٠١) مرفوعا:
**القتل في سبيل الله يكفر الذنوب كلَّها، أو قال : كلَّ شيءٍ، إلا الأمانة، والأمانة في الصلاة والأمانة في الصوم، والأمانةُ في الحديث،فأشدُ ذلكَ الودائع**

(٢).روى ابن أبي الدنيا في (مكارم الأخلاق) ٢٧٥) عن عبدالله بن عمرو نحوه.

(٣). رواه البخاري (١٨٩٤)، ومسلم (١١٥٠).

# ناوبڕی سێیەم

## باسی ڕۆژووی خۆبەخش و ڕێکخستنی ئەورادەکانی ڕۆژوو

**بزانە:** باشترین ڕۆژوو کە خێری زۆری هەبێت، ئەوەیە کە لە ڕۆژە گەورەکاندا بگیرێت، وە ڕۆژە پیرۆزو گەورەکانیش هەندێکیان لە هەموو ساڵێکدا دووبارە دەبنەوە، وە هەندێکیان لە هەموو مانگێکدا دێنە پێشەوە، وەهەندێکیشیان لە هەموو حەفتەیەکدا.

### ئەوانەی ساڵانە دووبارە دەبنەوە، لە دوای ڕۆژەکانی ڕەمەزان:

ڕۆژی عەرەفەو ، ڕۆژی عاشورا و دەرۆژی یەکەمی مانگی (ذي الحِجَّة) (نۆمینەی حاجیان)و، دە ڕۆژی یەکەمی مانگی موحەڕەم . وە هەموو مانگەکانی حەرام ((ذُوالقَعِدَة و، ذُوالحِجَّة و، مُحَرَّم و. رَجَبْ)، کاتی شیاوی ڕۆژوو گرتنن. کە خێرێکی زۆریان لێوە دەستدەکەوێت، وەحەزرەتی پێغەمبەر ﷺ حاڵی وابوو کە زیاترین ڕۆژووی لە مانگی شەعباندا دەگرت، تا وایان گومان دەبرد کە لەناو مانگی ڕەمەزاندایە[١]،

وە لە فەرموودەدا هاتووە:

(( أَفضَلُ الصِيامِ بعدَ شَهرِ رَمَضانَ، شَهرُ اللهِ المُحَرَّم))[٢]،

گەورەترین و مەزنترین مانگ دوای مانگی ڕەمەزان بۆ ڕۆژووگرتن مانگی موحەڕەمە، چونکە سەرەتای ساڵەو ئەگەر بنەماکەی لەسەر خێر و چاکە دابمەزرێت باشترو پڕ هیواترە بۆ بەردەوامی بەرەکەت لە تەواوی ساڵەکەدا.

---

(١) فقد روى البخاري(١٩٧٠) ومسلم(١١٥٦)عن عائشة (رضيَ الله عنها) كان يصوم شَعبان كُلَّهُ.

(٢) رواه مسلم (١١٦٣). من حديث أبي هريرة.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(( صَومُ يَومٍ مِنْ شَهرِ حَرامٍ، أَفضَلُ مِن ثَلاثِينَ مِن غَيرِهِ، وصَومُ يَومٍ مِن رَمَضان، أَفضَلُ مِنْ ثلاثِينَ مِنْ شَهرِ حَرامٍ))**[1]،

گرتنی ڕۆژێك لە مانگی حەرام، خێری زیاترە لە سی ڕۆژ لە مانگەکانی تردا، وە گرتنی ڕۆژێك لە مانگی ڕەمەزان گەورەترو خێری زیاترە لە ڕۆژووی سی ڕۆژی یەکێ لە مانگە حەرامەکان.

**((مَن صامَ ثلاثَة أَيامٍ مِن شَهْر حَرامٍ، الخَميس و الجُمُعة و السَّبت، كَتبَ اللهُ تعالى لَه عِبادَة تِسعُ مِئَة عامٍ))**[2]،

ئەوەی سێ ڕۆژ لە مانگی حەرام بگرێت، پێنج شەممەو جومعەو شەممە، خودای گەورە بەندایەتی نۆصەد ساڵی بۆ دەنوسێت.

وە لە فەرموودەدا هاتووە:

**(( إذا كانَ النصفُ مِن شَعبانَ، فلاَ صَومَ حتَّى رَمَضان))**[3]،

واتە: ئەگەر نیوەی شەعبان تێپەڕی، ڕۆژوو نامێنێت تا ڕەمەزان دێتە پێشەوە.

بۆیە واباشە کە پێش ڕەمەزان بەچەند ڕۆژێك بەڕۆژوو نەبێت، بەڵام دروستە مانگی شەعبان بلکێنێت بەڕەمەزانەوە، جارێکیان (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ ئەمەی کردووە، [4]، وە چەندین جاریش بۆ ڕۆژوو گرتن ناوبڕی تێ

---

(١) روى الطبراني في الصغير(٧١/٢) مرفوعاً: **من صام يوم عرفة كان له كفارة سَنتينِ، ومَن صامَ يَوما مِن المُحرَمِ فلَهُ بكُلِ يَومٍ ثَلاثون يوماً**.(١٦٤/٢)(٩٦٣). وقال الزبيدي(٢٥٦/٤): عزاه السيوطى فى جامع الكبير (٥١/٧)(٢٠٧٩١) إلى معجمه الكبير

(٢) أخرجه الأزدي في الضعفاء من حديث أنس. رواه أبو نعيم في تأريخ أصفهان. (٣٣٧/١)، وفي (هـ ، ز، و. ) سبع ، بدل تسع، وهي عند ابن عساكر في تأريخ دمشق.( ١١٦/١٩)، وعند الطبراني في الأوسط(١٨١٠)بلفظ سنتين.

(٣) رواه أبوداود(٢٣٣٧)والترمذي وصححه(٧٣٨)والنسائي في الكبرى(٢٩٢٣)، وابن ماجه(١٦٥١).

(٤) سبق تخريج حديث **أن النبي ﷺ كان يصوم شعبان كله، ووصل شعبان برمضان**، رواه

کردووە، لە میانی شەعبان و ڕەمەزاندا[1].

دروست نیە بە عەمدی پێشوازی لە مانگی ڕەمەزان بکات، بەوەی دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ پێشتر بەڕۆژوو بێت، مەگەر هاوکات بێت لەگەڵ ویردێکی خۆیدا، تەنانەت هەندێك لە صەحابە (خودایان لێ ڕازی بێت) پێیان پەسەند نەبووە، کە مانگی ڕەجەب هەمووی بەڕۆژوو بێت، بۆ ئەوەی نەشوبهێ بە مانگی ڕەمەزانەوە[2]

وە بزانە کە مانگە پیرۆزە گەورەکان: (ذي الحجة و موحەڕەم و ڕەجەب و شەعبان)ە مانگە حەرامکراوەکانیش (ذوالقعدة و ذوالحجة و موحەڕەم و ڕەجەب)ە یەکێکیان تاکە، کە مانگی ڕەجەبە، وە سیانیان پێکەوەن، کە مانگەکانی (ذوالقعدة و ذوالحجة و موحەڕەم)ن، وە گەورەترینیان مانگی (ذوالحجة) یە، چونکە مەراسیم و عیبادەتی حەجی تێدایە، وە ڕۆژە دیارو ڕوون و ئاشکراو ژمێرراوەکانیشیان تێدایە (الأيام المعلومات و المعدودات).

وە مانگی (ذوالقعدة) لە مانگە تایبەتەکانە، کە شەڕیان تیا حەرامکراوە، ئەویش لە مانگەکانی حەجی پیرۆزە، وە مانگی شەوال(شەشەڵان) لە مانگەکانی حەجەو، لە مانگە حەرامکراوەکانیش نیە، وە مانگی موحەڕەم و مانگی ڕەجەبیش لە مانگەکانی حەج نین.

وەلە فەرموودەدا هاتووە:

---

أبوداود(٢٣٣٦)، والترمذي(٧٣٦)، والنسائي(٢٣٥٣)، وابن ماجه(١٦٤٨).

(١)قال العراقي: رواه أبو داود(٢٣٢٥) من حديث عائشة قالت: **كان رسول الله ﷺ يتحفظ من هلال شعبان، مالا يتحفظ من غيره، ثمَّ يصومُ لرؤية رمضان، فان غُمَّ عليه عدَّ ثلاثينَ يوماً ثم صام)** و أخرجه الدار قطني و قال اسناده صحيح و الحاكم و قال صحيح على شرط الشيخين.

(٢) روى ابن ماجه (١٧٤٣) عن ابن عباس (رضي الله عنهما) أن النبي ﷺ نهى عن صيام رجب.

**((مامِن أَيامٍ العملُ فيهنَّ أفضَلُ وأَحبُّ إلى اللهِ تعالى مِن أَيَّام عَشْرِ ذي الحِجَّةِ، إنَّ صومَ يومٍ مِنهُ يعْدلُ صِيامَ سنَةٍ، و قيامَ ليلةٍ منهُ تَعدِلُ قِيامَ ليلةِ القَدرِ، قيلَ: ولا الجهادُ في سبيلِ الله، قال: ولا الجِهادُ في سبيلِ الله، إلاَّ مَن عُقِرَ جَوادُه وأُهرِيقَ دمُه ))**[1]

واته: هیچ ڕۆژانێك نیه كاركردن تیایاندا خێر تر بێت له ده ڕۆژی مانگی (ذو الحجة)، چونكه ڕۆژوو گرتن لەیەك ڕۆژیدا وەك بەڕۆژوو بوونی یەك ساڵ وایە، وە هەستانەوە بۆ عیبادەت لە یەك شەویدا، وەك شەونوێژو هەستانەوەی شەوی پیرۆزی قەدر وایە، وتیان: ئەی جیهاد لەڕێی خوادا، فەرمووی: جیهادیش ناگاتەوە بە خێری ئەو ڕۆژەدا، مەگەر كەسێك لە ناو جیهادا ئەسپەكەی لووت و گوێیان بڕی بێت و خۆیشی خوێنی ڕژابێت.

## ئەوانەی كە لە هەموو مانگێكدا دووبارە دەبنەوە:

سەرەتای مانگ و، ناوەڕاستەكەی و، كۆتاییەكەی، وە ناوەڕاستەكەیشی هەر سێ ڕۆژە سپیەكەیەكە بە(أيام البيض)ناوبراوە، ڕۆژانی سیازدەو چواردەو پازدە.

---

(١)قال العراقي رواه الترمذي(٧٥٨) و ابن ماجه(١٧٢٨)من حديث أبي هريرة دون قوله (**قيلَ: ولا الجهادُ في سبيلِ الله، قال: ولا الجِهادُ في سبيلِ الله، إلاَّ مَن عُقِرَ جَوادُه وأُهرِيقَ دمُه**، و عند البخاري(٩٦٩) من حديث ابن عباس: **ما العمل في أيام أفضل من العمل في هذا العشر، قالوا و لا الجهاد، قال و لا الجهاد، إلاَّ رجلٌ خرج يخاطر بنفسه و ماله، فلم يرجع بشئ** اهـ. قال الزبيدي( ٢٥٧/٤): و لفظ الترمذي و ابن ماجه: **ما من أيام أحب الى الله تعالى أن يتعبد له فيها أحب من عشر ذى الحجة ، يعدل صيام كل يوم منها بصيام سنة، و قيام كل ليلة منها بقيام ليلة القدر**، قال الترمذي غريب، لا نعرفه إلا من حديث مسعود بن واصل عن النُهاس، قال: و سألت محمد يعني البخاري عنه، فلم يعرفه، قال الصدر المناوي و غيره، والنُهاس ضعفوه فالحديث معلول. وروى البيهقي في السنن الكبرى: ( ٤ /٢٨٥): **أن رجلا سأل أبا هريرة فقال: إنَّ عليَّ رمضان، وأنا أريد أن أتطوَّع في العشر،؟ قال: لا، بل إبدأ بحق اللهِ فاقضهِ، ثم تطوَّع بَعْدُ مَا شِئتَ**).

**ئەوانەی حەفتانەیە:**

ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممەو جومعان[1]، ئەمەی باسمانکرد ڕۆژە گەورەکانە، واچاکە تیایاندا بە ڕۆژووبێت، وە خێری زیاتریان تێدا بکات، بۆ ئەوەی بە بەرەکەتی ئەم کاتە پیرۆزانە پاداشتی زیاتری دەستبکەوێت.

**بەڕۆژوو بوونی هەموو کاتەکان:**

ئەوە هەموو ڕۆژە گەورە و خێردارەکانیش دەگرێتەوە و، زیادیشی دەبێت بەسەریدا، ئەوانەی هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو دەبن، چەند ڕێگەیەکیان هەیە:

هەندێکیان بەلایانەوە نەشیاوو مەکرووهە؛ چونکە هەندێك هەواڵ و فەرموودەی لەسەر هاتووە، کە وادەگەێنێت پەسەندو شیاو نەبێت هەموو زەمان بەڕۆژوو بیت[2]، بەڵام ڕای دروست ئەمەیە کە لەبەر دووشت مەکرووهە: **یەکەمیان ئەوەیە:**

کە ڕۆژی یەکەمی جەژنەکانی ڕەمەزان و قوربان و، ڕۆژەکانی دووهەم و سێیەم و چوارەمی جەژنی قوربانیش بەڕۆژوو بێت، ئەوە هەموو زەمان بەڕۆژوو بووە.

---

(١) ئەگەر وا ڕێکەوت کە ڕۆژێك پێش جومعە یان لە دوایەوە بەڕۆژوو ببێت، چونکە مەکرووهە بە تەنها ڕۆژی جومعە بە ڕۆژوو بێت. ) قال الزبيدي(٤/٢٥٨): أخرج مسلم (١١٦٢)من حديث أبى قتادة جاء رجل الى النبي ﷺ فقال يا رسول الله كيف نصوم الحديث بطوله و فيه: **وسئل عن صوم يوم الاثنين قال ذاك يوم ولدت فيه، و يوم بعثت، أو أنزل عليَّ فيه،** و أخرج الترمذي(٧٤٧) و ابن ماجه(١٧٤٠) عن أبى هريرة مرفوعا قال: **تعرض الاعمال يوم الاثنين و الخميس. فاحب أن يعرض عملي و أنا صائم.** و أخرجه أبو داود و النسائي من حديث أسامة بن زيد بأتم منه وأما صوم يوم الجمعة فيكره إفراده لما رواه البخاري و مسلم من حديث أبي هريرة: **لا يصومن أحدكم يوم الجمعة، الا أن يصوم قبله أو بعده،** و في رواية لمسلم: **لا تخصوا ليلة الجمعة بقيام من بين الليالى، و لا تخصوا يوم الجمعة بصيام من بين الايام، الا ان يكون في صوم يصومه أحدكم**

(٢) كما روى البخاري (١٩٧٧) ومسلم (١١٥٩) مرفوعا: **(لاصامَ مَن صامَ الأبد).**

**ڕاکەی تریان ئەوەیە:** حەزی لە سوونەت نەبێت دەربارەی ئیفطار و شکاندن، ڕۆژوو بکاتە جۆرە بەستنەوەیەك بۆ نەفسی خۆی، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانێت خودا پێی خۆشە ڕوخصەتەکانیشی بەکار بهێنرێت، وەك چۆن پێی خۆشە بڕیارە تۆکمە و عەزیمەت دارەکانیشی جێبەجێ بکرێت.[1]

ئەگەر یەکێك لەم ئەگەرانەی لە پێش نەبوو، زانیشی کە چارەسەری نەفسی خۆیشی وا لەوەدا کە هەموو زەمان بە ڕۆژوو بێت، ئەوا باوابکات چونکە هەندێك لە صەحابەو تابیعین(خوایان لێ ڕازی بێت)و ئەوانەی بەچاکە و ئیحسان بەدوایاندا هاتوون بەم شێوە هەموو ساڵ بەڕۆژوو بوون.[2]

ئەبوموسای ئەشعەری لە پێغەمبەری خوداوە دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (( **مَن صامَ الدَّهرَ كُلَّهُ ضُيِّقت عَلَيهِ جَهَنَّم**))[3]. **وعَقَدَ تسعين**.

واتە: ئەوەی هەموو زەمان بەڕۆژوو بێت، دۆزەخی لەبەر تەسك دەبێتەوە، واتە جێگەی نامێنێت تیایدا، یان ناچێتە ناویەوە، واتە پەنجەکانی وەك ژمارە نەوەدی لێ کرد،( واتە: پەنجەی ڕاستی شەهادەتی وەك ماری پێچ خواردوو لوول دەکرد و هیچ ڕۆشناییەك نەدات) کە بە تەواوی بەرتەنگ ببێت و، هیچی لێوە نەچێتە ژوورەوە.

لە خواری ئەمەوە پلەیەکی تر هەیە، کە نیوەی هەموو زەمانەکە بەڕۆژوو بێت، بەوەی کە ڕۆژێك بە ڕۆژوو بێت و ڕۆژێکیش بیشکێنێت، ئەمە زیاتر

---

(١) كما روى ذلك أحمد في المسند(١٠٨/٢) إن الله **تعالى يُحب أن تُؤتى رُخَصُه. كما يحبُّ أن تُؤتى عزائمُه.**

(٢) وەك عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر و سەعیدی کوڕی موسەیەب و وەکیع و ئەوانی تر، قال الحافظ الزبيدي٢٦١/٤: **وقد كان على هذا القدم شيخنا الورع الزاهد محمد بن شاهين الدمياطي رحمة الله تعالى كان يوالي الصيام و لم يُر مُفطرا لا سفرا و لا حضرا.**

(٣) رواه ابن حبان في صحيحه(٣٥٨٤) قال العراقي رواه أحمد و النسائي في الكبرى و ابن حيان و حسنه أبو يعلي الطوسي اهـ

نەفسی مرۆڤ نارەحەت دەكات و. دەبێتە مایەی شكست پێ هێنانی، وە چەندین فەرموودە هاتووە دەربارەی گەورەیی ئەم ڕۆژووە، چونكە بەندە ڕۆژێك خۆی ڕادەگرێت و. ڕۆژێكیش شوكرانە بژێری نیعمەتەكانی خودا دەكات. هەروەك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی :

**((عُرضتْ عليَّ مفاتيحُ خزائنِ الدُنيا، وكنُوزُ الأَرض فَرددتُها، وقلتُ أجُوع يوماً و أشبعُ يوماً، أحمدك إذا شبعتُ و أتضرَّع إليكَ إذا جُعتُ))**[1]،

واتە: كلیلی خەزنەكانی دونیا و كەنزو كانزاكانی زەوی یان پێدام، گێڕامەوەو نەمویستن، وتم: ڕۆژێك برسی دەبم و ڕۆژێكیش تێر دەبم، كە تێر بووم سەناو ستایشت دەكەم . وە كاتێكیش برسیم بوو، لێت دەپاڕێمەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (( **أَفضَلُ الصِّيامِ صَومُ أَخي داوود، كانَ يَصومُ يَوماً وَيُفطِرُ يَوماً.**))[2]،باشترین ڕۆژوو، ڕۆژووی برام داوودە، كە ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو، وە ڕۆژێكیش دەیشكاند.

وە هەر لەم بەڵگانەیە كە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ عەبدوڵلای كوڕی عەمردا (خودایان لێ ڕازی بێت) كەوتە قسەكردنەوە، كە ئەیفەرموو:

من لەوە چاكتر دەتوانم بەڕۆژوو بم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

((**صُم يَوماً، وأفطِر يَوماً**)، ڕۆژێك بەڕۆژوو بەو ڕۆژێكیش بیشكێنە،

فەرمووی: من لەوە چاكتر دەتوانم، پێغەمبەر ﷺ فەرموی:

((**لا أفضَلَ مِن ذلِكَ**))[3]، لەوە گەورەترو باشتر نیە.

---

(١)قال العراقي رواه الترمذي(٢٣٤٧) من حديث أبى أمامة بلفظ: **عرض علَيَّ ربِّي ليجعلَ لي بطحاء مكةَ ذهباً**، و قال حسن اهـ قال الزبيدي (٢٦١/٤): و كذلك رواه أحمد(٢١٦٨٦) و تمامه عندهما بعد قوله ذهباً، فقلت: **لا يارب و لكن أشبع يوما و أجوع يوما، فاذا جعت تضرعت اليك وذكرتك و اذا شبعت حمدتك و شكرتك.**

(٢) رواه الترمذي بلفظه، (٧٧٠)، وعند الشيخين من حديث عبدالله بن عمرو الآتي.

(٣) رواه البخاري (١٩٧٦)، ومسلم (١١٥٩).

وە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز مانگێك بە تەواوی بەڕۆژوو نەبووە جگە لە ڕەمەزان نەبێت [1] بەڵکوو لە وانی تردا دەیشکاندو هەمووی نەدەگرت. ئەوەش کەنەتوانێت نیوەی هەموو ساڵەکە بگرێت، قەیناکە با سێ یەکێکی بگرێت، کە ڕۆژێك بەڕۆژوبێت و دوو ڕۆژیش بشکێنێت [2]،

وە ئەگەر لە سەرەتای مانگەوە سێ ڕۆژی گرت و، لە ناوەڕاستیشیدا سێ ڕۆژووە، لە کۆتاییەکەیشیدا سێ ڕۆژی گرت، ئەوە سێ یەکی ساڵیشت گرتووەو دەشکەوێتە کاتە چاك و خێرەکانەوە، وە ئەگەر حەفتانە دووشەممەو پێنج شەممەو جومعەیشت گرت، ئەوا نزیك دەبیتەوە لە گرتنی سێیەکی ساڵەکەوە.

ئەگەر کاتە زۆر خێروچاکەکان دەرکەوتن، باشترین و تەواو ترین ئەوەیە کە مرۆڤ واتای گەورەیی بزانێت، کەمەبەست لێیان تەنها تەصفییەی دڵە، خۆبەکلایی کردنەوەیەتی بۆ بەندایەتی، کە تەنها بە عیبادەتی خوداوە خەریك بێت و لا بەملاولادا نەکاتەوە.

فەقیهو شەرع زان بە وردەکاری خۆی سەیری حاڵە شاراوەکانی ناو دەروونی دەکات و سەرنج دەدات، جاری وا هەیە بەردەوام بەڕۆژوو بێت چاکترە بۆی، وە هەندێك جاریش وا پێویست دەکات کە جگە لە فەرزەکان بەڕۆژوونەبێت، ئەگەر چاودێری دڵ و دەروونی خۆیی کرد و، لە واتای ڕۆژوو تێگەیشت و، زانی چی بۆ خۆی و ڕێبازی سلوك و ڕێگای دواڕۆژی بەکەڵك دێت ، ئەو بڕیارەیان دەدات کە باشتر و گونجاو ترە لەگەڵ دڵیدا، ئیتر مەرج نیە هەموو ڕۆژووەکانی بە شێوەیەکی ڕێکخراو بێت، بۆیە دەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، کە جاری واهەبووە ئەوەندە بەڕۆژوو دەبوو، تاوای لێدەهات خەڵکی بیانووتایە نایشکێنێت، وە جاری وایش هەبوو ئەوەندە دەیشکاند، تا بیانووتایە کە بە

(١) كما في البخاري(١٩٧١) ومسلم(١١٥٦).

(٢) كما في مسلم(١١٦٢) حيث قال ﷺ فيه: وددتُ أَنِي طوَّقتُ ذلكَ.

ڕۆژوو نابێت، یان ئەوەندە دەنووست، تا دەوترا : هەڵناسێتەوە بۆ شەو نوێژ، وە ئەوەندەیش شەو نوێژی دەکرد کە دەوترا: هەرگیز نانوێت[1] ،

ئەمەش بەو پێیەی کە بە نووری پێغەمبەرایەتی بۆی دەردەکەوت، کە مافی پێویست بدات بە کاتەکانی و، بەو شێوەی پێویستە بەندایەتی بکات.

بەڵام هەندێك لە زانایان بەلایانەوە ناپەسەندە، کە زیاتر لە چوار ڕۆژ لەسەر یەك بەڕۆژوو نەبێت، بە پێی ڕۆژەکانی جەژنی قوربان ئەو چوار ڕۆژەیان داناوە، وە فەرموویانە: کە زیاد لە چوار ڕۆژ مرۆڤ بەڕۆژوو نەبێت دڵ ڕەق دەبێت، وە دووچاری نەریتی خراپی دەکات، وە دەرگای ئارەزووەکانی لەسەر دەکاتەوە.

سوێندبێ! حاڵی زۆربەی خەڵکەکە وەهایە، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی شەوو ڕۆژ دوو ژەم نان دەخۆن.

ئەمەی باسمانکرد، تەواوی مەبەستە پێویستەکان بوو، کە ویستمان ڕوونیان بکەینەوە، لە باسەکانی ڕۆژووی خۆبەخشیدا. خوایش زاناترە بەوەی کە ڕاستە

**تەواو بوو پەڕاوی نهێنیەکانی ڕۆژوو گرنگییەکانی،**

**کە پەڕاوی شەشەمە، لە چوار یەکی بەندایەتی**

**لە پەڕاوەکانی ژیانەوەی زانستەکانی ئاین**

**سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوداوەندی گەورەو باڵا دەست وصلی الله علی سیدنا محمد وعلی آله الطیبین الطاهرین، وصحبه أجمعین.**

**پشت بە خودا دەستدەکەین بە پەڕاوی**

**نهێنیەکانی حەج و گرنگییەکانی.**

---

(١) كما في البخاري(١١٤١) ومسلم(١١٥٨)، واللفظ للبخاري عن أنس (رضي الله عنه) قال: **كان رسول اللهِ يفطر من الشهر حتى نظن أن لايصوم، ويصوم حتى نظن أن لا يفطر منه شيئاً، وكان لا تشاء أن تراه من الليل مصلياً إلا رأيته، ولا نائماً إلاّ رأيتهُ.**

# پەڕاوی

# نهێنیەکانی حەج و

## گرنگییەکانی

که پەڕاوی حەوتەمە
لە چواریەکی بەندایەتی
لە
پەڕاوەکانی

# ژیانەوەی زانستەکانی ئایین

كتاب

# أسرار الحَجِّ

ومُهِمَّاتِهِ

وهوَ

الكِتابُ السابِعِ

مِن رُبعِ

العِباداتِ

من كتاب

# إحْياءُ علومِ الدِّين

پەڕاوی

# نهێنیەکانی حەج و گرنگییەکانی

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمْ

## بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی، کە وشەی پیرۆزی یەکتاپەرستی کردووە بە قەڵای قایم و پەناگای متمانەپێکراو بۆ بەندەکانی، وە ماڵی دێرین و ئەصیلی کەعبەی پیرۆزی کردووە بە ژوانگەی دڵان و، پەناگای خەڵکان و هەوارگە و جێگەی ئاسوودەیی هەموان، وە ئەوەندە ڕێزی لێ گرتووە کە داویەتیە پاڵی خۆیەوە و، تایبەتمەندی کردووە بەو شەرەف و میننەتەوە کە داویەتیە پاڵی، کە ئەوەی لە دەوری دەگەڕێ و زیارەتی دەکات، کردوویەتیە پەردەیەکی قایم، خێمەیەکی داپۆشەر لە نێوانی ئەوو بەندەکان و، سزای سەختی دۆزەخی تاودراودا.

صەڵات و سەلامی نەبڕاوەو، درووود و سۆزی بەردەوام بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەری ڕەحمەت و گەورەی ئادەمییەکان (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ، وە لەسەر ئال و ئەصحابی کیرام، سەرکردە و پێشەنگی قافڵەسالارانی ڕێگای حەق و ڕاستی، تا ئەوەندەی کە شایستەی نەبڕاوەیی چاکەکانیان بێت.

**پاش حەمدو سەنا:**

بەڕاستی حەج کردن لە نێوانی ئەرکانەکانی ئیسلام و بنەماکانی دا بەوە ناو دەبرێت، کە تاکە عیبادەتی تەمەنە، وە کۆتایی هەموو ئەرکان و فەرمانەکانە، وە نیشانەی کامڵ بوونی ئیسلام و تەواوێتی ئەم دینە پیرۆزەیە، لە کاتی حەجی پیرۆزدابوو کە خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ، کە لە ڕۆژی عەرەفەدا بوو ڕایگەیاند و فەرمووی: ﴿**الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا**﴾(المائدة/٤)

ئەمڕۆ هەموو ڕێنمایی و پێداویستییەکانی دینی ئیسلامم بۆ تەواو کردن و نیعمەتی هەتاهەتاییم ڕژاند بەسەرتانداو، بۆیشم تەواو کردن، ڕەزامەندیشم بۆتان نیشاندا کە ئیتر ئاینی ئیسلام دین و پەیڕەوی هەتاهەتایی نەگۆڕتان بێت.

وه هەر لە بارەی حەجکردنەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((مَنْ ماتَ وَلَم يَحجَّ، فَلْيَمُتْ إنْ شاءَ يَهودِيّاً، وإن شاءَ نَصرانِيّاً))[1]،

واتە: ئەوەی بمرێت و توانای حەج کردنیشی بووبێت و نەیکردبێت، ئەوا با بۆ خۆی هەڵی بژێرێت: بە جولەکەیی بمرێت، یان بە نەصرانی وەك گاورەکان.

کەواتە ئەو بەندایەتییە زۆر بەگەورەی بزانە، کە بە نەبوونی ئەو ئاینی ئیسلام پلەی کەماڵ لە دەستدەدات ، ئەوەش کە نەیکات یەکسان دەبێت لە گومڕاییدا لەگەڵ گاور و جوولەکەدا.

کەواتە چاکتر وایە هەوڵی تەواو بخەینەکار، بۆ گرنگی پێدان و ڕاڤەکردنی و، باسکردنی ئەرکان و سوننەتەکانی و. ڕوونکردنەوەی ئادابەکانی و. بەیانی گەورەیی و نهێنیەکانی، وەکۆی ئەم بابەتانە هەمووی پشت بە خودای مەزن و یارمەتی دانی لە سێ دەروازەدا ڕوون و ئاشکرا دەبێت:

**دەروازەی یەکەم:** باسی گەورەیی حەجکردن و، گەورەیی شاری مەککەو ماڵی خوداو بەیتی پیروزو، خۆلاصەی ئەرکان و مەرجەکانی پێویست بوونی .

**دەروازەی دووهەم:**

باسکردنی کردارە ئاشکراکانی بە پێی ڕیزبەندی، لەسەرەتای دەسپێکی گەشتی پیروزی حەجەوە تا کاتی گەڕانەوەی.

**دەروازەی سێیەم:** باسی ئادابە وردەکان و نهێنیەنادیارو کردارە شاراوەکانی، با دەستبکەین بە دەروازەو (باب)ی یەکەم:

---

(١)قال العراقي رواه ابن عدى من حديث أبي هريرة والترمذي(٨١٢) نحوه، وقال في اسناده مقال اهـ قال الزبيدي٢٦٨/٤: قد روى هذا الحديث عن أبي أمامة أيضا ولفظه عند الدارمي في سننه(١٨٢٦) والبيهقي في السنن الكبرى(٣٣٤/٤)، **من لم يمنعه من الحج حاجة ظاهرة أو سلطان جائر، أو مرض حابس فمات ولم يحج، والباقي سواء .** وعن سعيد بن منصور وأبي يعلي: **من لم يحبسه مَرض أو حاجة ظاهرة أو سلطان جائر فلم يحج الحديث**

# دەروازەی یەکەم

## باسی گەورەیی حەجکردن و، گەورەیی شاری مەککەو ماڵی خوداو بەیتی پیرۆزو خۆلاصەی ئەرکان و مەرجەکانی پێویست بوونی.

**لەم دەروازەدا دوو ناوبڕی تێدایە:**

# ناوبڕی یەکەم:

## باسی گەورەیی حەجکردن و گەورەیی بەیت و ماڵی دێرینی خوداو گەورەیی مەدینەی پیرۆز (خوابیان پارێزێت) وە باسی خۆسازدان و نیەتی گەشتی تایبەتی بۆ ئەو جێگەو مەشاهیدە پیرۆزانە:

# گەورەیی حەجکردن

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾ (الحج/٢٧)واتە:

جاڕی دە بەناو خەڵکدا، کە بێن بۆ حەج، ئەوانیش دێن بۆلات بەسواری و بەسەر پشتی هەموو وشترێکی لاوازەوە و، لە هەموو ڕێگایەکی دوورەوە.

قەتادە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

کاتێك خودای (عَزَّ وجَلَّ) فەرمانی دا بە (حەزرەتی) ئیبراهیم (سەلامی خودای لەسەر) کە جاڕ بدات و، بانگی خەڵکی بکات بۆ ئەوەی بێن بۆ حەج، بانگی کرد: ئەی خەڵکینە: خودای گەورە ماڵێکی هەیە وەرن زیارەتی بکەن و حەجی ماڵی خودا بکەن.[١]

---

(١) رواه قتادةعن عكرمة بن خالد، كما في مناسك ابن أبي عروبة(٢٢) وتأريخ دمشق ( ٢٠٧/٦.

وه خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ﴾بۆ ئەوەی حازری هەندێ سوود و قازانجی خۆیان بن[1].وتراوە کە ئەو سوودە بەشداری کردنە لە بازرگانی وەرزی حەجدا و، دەستکەوتنی پاداشتی دوارۆژ[2].

کاتێك هەندێ لەزانا پێشینەکان ئەمەیان بیست فەرموویان: سوێند بێت بە پەروەردگاری کەعبە، خودا لێیان خۆش بوو.

وتراوە لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدا: کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَاطَكَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ (الأعراف/١٦).

واتە: شەیتان بەڵێنی داوە لەسەر ڕێگەی مەککە دابنیشێت و، هەوڵی لەخشتە دان و فریودانیان بدات، کە نەهێڵێت ئەو ڕوکنە پیرۆزە بەجێ بهێنن[3].

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (( **مَن حجَّ البَيتَ فَلَم يرفُث ولَم يَفسُق، خرجَ مِنْ ذنوبهِ كَيَومِ ولَدتهُ أُمُّهُ**))[4]. واتە: ئەوەی حەجی ماڵی خودا بکات و قسەی ناشیرین و بێ ئابڕوویی نەیەت بە دەمی دا، یان باسی ڕابواردن و دروست بوون نەکات، وە لە سنووری ڕێنمایی ڕاستەقینە لانەدات، وە خەریکی گوناهو دەمەدەمێ و کاری نابەجێ نەبێت، هەموو گوناهەکانی لەسەر ئەسڕێتەوە، وەك ئەو ڕۆژە تازە لەدایك بووبێت ئاوا پاك دەبێتەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

(( **ما رُؤِيَ الشَّيطانُ في يوْمٍ أصغَرَ وأَذحَرَ ولا أحقَرَ ولا أغيَظَ مِنهُ يومَ عرفَةَ،**

---

(١) خۆلاصەی تەفسیری نامی(٣٣٥).

(٢) رواه الطبراني في تفسيره(١٧/١٠)(٢٥٣)، عرفان مجاهد.

(٣) رواه أبو نعيم في الحلية، ٢٥٣/٤-عن عون بن عبدالله، وروى موقوفا على عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) من رواية الفاكهي في أخبار مكة(١٣٢/٤).

(٤) رواه البخاري(١٥٢١)، ومسلم( ١٣٥٠).

**وما ذلِكَ إلاَّ لِما يَرى مِن تَنَزُّلِ الرَحمةِ، وتَجاوزِ اللهِ عَن الذُّنوبِ العِظام))**[1]،

واتە: هەرگیز شەیتان نەبینراوە بە بچوکی و بێ نرخی و ڕسوایی و تێکشکاوی و پۆرتشکاوی و، ڕق و تووڕەییەوە، وەك ئەوەی لە ڕۆژی عەرەفەدا بینراوە، هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە دەبینێت ئەو هەموو ڕەحمەتی خودایە دەڕژێتە خوارەوە بەسەر ئەوانەدا لە عەرەفەدا ڕاوەستاون، وە قەڵەمی لێبوردنی خودایی هاتووە بەسەر هەموو گوناهە گەورەکانیاندا، وەك وتراوە:

**((إنَّ مِنَ الذُّنوبِ ذنوباً لا يُكَفِرُها إلاَّ الوقُوفُ بِعَرَفة))**هەندێك گوناه هەیە تەنها وەستانی ڕۆژی عەرەفە دەیسڕێتەوە،کەجەعفەری کوڕی موحەممەدی کوڕەزای حەزرەتی عەلی دەیداتە پاڵ حەزرەتی پێغەمبەرەوە ﷺ .[2]

وە هەندێك لە بەرچاو ڕوونە خاوەن کەشفەکان لە نزیکانی دەرگای خودا فەرموویانە: شەیتان لە سەر شێوەی کەسێکی ناسراویدا لە ڕۆژی عەرەفەدا خۆی پیشاندا، بینی جەستەیەکی لاوازو بێ هێز، ڕوزەردو چاو بە گریان و پشت شکاو، لێی پرسی کێ چاوانتی خستۆتە ناو ئەو فرمێسکە بە کوڵانەوە؟ وتی: دەرچوونی حاجیەکان، بۆ لای خودا بەبێ مەبەستی بازرگانی کردن، دەڵێم: ئەمانە کەوتوونەتە ڕێ و، دەترسم بێ هیوا نەبن و، خودا بە دەسبەتاڵی نەیانگێڕێتەوە و منیش دڵگرانی ئەوەم، فەرمووی: ئەی کەواتە چی وا لاوازی کردویت؟ وتی: حیلەی ئەو ئەسپانەی کە لە ڕێی خودای (عَزَّ وجَلْ)دا غاردەدەن و دەچن بۆ غەزاکردن، ئەگەر لە پێناوی ڕەزامەندی مندا بوونایە پێم خۆشتر بوو، فەرمووی: ئەی چی وا ڕەنگی لێبرپویت و ڕوخساری گۆڕیویت؟

وتی: هاوکاری دەستەجەمعی خەڵکی، لەسەر تاعەت و گوێ ڕایەڵی، ئەگەر هەروا هاوڕازو کۆ بوونایە لەسەر گوناهو تاوانکردن، ئەوەم پێ خۆش تر دەبوو.

---

(١) رواه مالك في الموطأ (٤٢٢/١)، عرفان طلحة بن عبيدالله بن كريز مرسلا.

(٢) كذا قال صاحب القوت (١٢٠/٢) ولفظه: وقد رفعه جعفر بن محمد وأسنده....)

فەرمووی: ئەی چی وا پشتی شکاندویت؟ وتی: ئەوەی کە بەندەکان داوای عاقیبەت خێری لە خودا دەکەن، کە تووشی سەلبی سەرەمەرگ نەبن و، بە ئیمانەوە بڕۆن، منیش دەڵێم: خەسارەت مەندی بۆ من، ئەمانە کەی وایان لێ دێت سەرسام ببن بە کردارەکانیان و، پێی موعجەب بن و، دەترسم ئەم ڕاستییەیان زانی بێت، بۆیە نزاو پاڕانەوەیان هەمیشە لە خودایە، کە تووشی بێبڕوایی و سەلبی سەرەمەرگیان نەکات.[1].

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (( **مَن خرَجَ مِن بيتهِ حاجًّاً أَو مُعتَمراً، فَماتَ... أُجريَ لَهُ أَجرُ الحاجِّ المُعتَمِرِ إِلى يَومِ القِيامَةِ، ومَن ماتَ في أَحَدِ الحَرَمَينِ، لَم يُعرَضْ ولَم يُحاسَب، وقيلَ لَهُ أُدخُلِ الجَنَّة** ))[2].

واتە: ئەوەی لە ماڵی خۆی دەرچوو، بە نیەتی حەجکردنی یان عومرە و لە ڕێگەدا وەفاتی کرد، تا ڕۆژی حەشرو زیندووبوونەوە، بە تەنها ڕێکەوتن و نیەتەکەی، بە پاداشتی بەردەوامی حەج و عومرە بۆی دەنووسرێت.

ئەوەش کە لە یەکێك لەحەرەمەکانی مەککە یان مەدینەدا بمرێت، بۆ چوونە ناو بەهەشت ڕێگری لێ ناکرێت و، هیچ لێ پێچنەوەیەکیشی لەگەڵدا ناکرێت، وە پێی دەوترێت: فەرموو بڕۆرە ژوورەوە بۆناو بەهەشت.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((**حجَّةٌ مبرورةٌ خيرٌ مِنَ الدُّنيا وما فيها، وحجَّةٌ مبرورةٌ ليسَ لها جزاءٌ إلاَّ**

---

(١) قوت القلوب ١٢٢/٢، وروى ابن ماجه(٣٠١٣) حديث دعاء النبي في يوم عرفة، وفيه: **فضحك رسول الله ﷺ أو قال تبسم، فقال له أبوبكر وعمر: بأبي أنت وأمي: إن هذه الساعة ماكنت تضحك فيها، فما الذي أضحكك ؟ أضحك الله سِنَّك، قال: إنَّ عدو الله إبليس لما عَلمَ أن اللهَ قدِ استَجابَ دُعائي، وغفر لأُمَّتي، أخذَ الترابَ، فجعل يحثوهُ على رأسهِ، ويدعو بالويل والثبور، فأضحَكني مارأيتُ مِن جزَعهِ.**

(٢) رواه الطبراني في الأوسط(٥٣٨٤)، والبيهقي في الشعب(٣٨٠٢).

**الجَنَّة))**[1]، واته: حەجێکی وەرگیراو باشترە لە هەموو دونیاو ئەوەش لە ناو دونیادایە، وەحەجێکی وەرگیراو، جگە لە بەهەشت هیچ پاداشتێکی تری نیە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**الحُجَّاجُ والعُمَّارُ وَفدُاللهِ (عَزَّ وجَلَ) وَزُوَّارُهُ، إن سألوهُ أَعطاهُم، وإنِ استَغفَروهُ غَفَرَ لَهُم، وإنْ دَعَوا استُجيبَ لَهُم، وإنْ تَشَفَّعوا شُفِعَوا** ))[2]، حاجیەکان و عومرەکارەکان نێرراوو وەفدو زیارەتکارانی خودای گەورەو بەدەسەڵاتن، هەرداوایەك لە خودا بکەن پێیان دەدات، داوای لێخۆش بوونی لێبەکەن، لێیان خۆش دەبێت، نزاو پاڕانەوەی عەرزبکەن دەچێت بەدەمیانەوە، تکا بۆ هەرکەسێکیش بکەن، لێیان وەردەگیرێت و بۆیان جێبەجێ دەکرێت.

وە لە فەرموودەیەکدا کە لە ڕێگەی ئال و بەیتەوە دەیگێڕنەوە بەسەنەدی نەپچڕاو لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی:

(( **أَعظَمُ الناسِ ذَنباً، مَنْ وقَفَ بِعَرَفةَ، فظَنَّ أَنَّ اللهَ تعالى لمْ يَغفِر لَهُ**))[3]،

واتە: گەورەترین گوناهبار ئەو کەسەیە کە لە عەرەفەدا ئامادەبێت و

---

(١) روى البخاري (١٧٧٣) ومسلم(١٣٤٩)ولفظهما: **العمرة الي العمرة كفارة لما بينهما والحج المبرور ليس له جزاء الا الجنة**، ومعنى الشطر الأول: مستفاد من حديثين: مارواه البخاري(٢٧٩٢) ومسلم (١٨٨٠) مرفوعا: (لغدوةٌ **في سبيل اللهِ أو رَوحةٌ خيرٌ مِن الدنيا وما فيها).وما رواه البخاري(١٥٥٠)عن عائشة**(رضيَ الله عنها)**قالت:يارسول الله: نرى الجهادَ أفضل العمل، أفَلا نُجاهد؟ قال: لا، لكِنَّ أفضل الجِهادِ حَجٌّ مبرور)**.وروي أحمد من حديث جابر والطبراني في الكبير من حديث ابن عباس:**الحج المبرور ليس له جزاء إلا الجنة**.

(٢)هكذا هو في القوت(١٢٠/٢) وقال العراقي رواه ابن ماجه(٢٨٩٢) من حديث أبي هريرة بلفظه، دون قوله: وزواره، ودون قوله: إن **سألوه أعطاهم، وان تشفعوا شفعوا**، وله من حديث ابن عمر وسألوه فأعطاهم، ورواه ابن حيان في صحيحه(٣٦٩٢(٥/٩). اهـ قال الزبيدي٢٧٢/٤ ولفظ حديث ابن عمر عند البيهقي: **الحجاج والعمار وفد الله ان سألوه أعطوا وإن دعوا أجابهم وإن أنفقوا أخلف لهم**.

(٣) كذا في القوت(١٢٠/٢)، ورواه الخطيب في المتفق والمفترق (٢١٩).

وەستاوی عەرەفەبێت، وایش گومان ببات کە خودا لێی خۆش نەبووە.

عەبدوڵلای کوڕی عەباس(خودایان لێ ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: (( **يَنزلُ على هذا البَيت في كلِّ يَومٍ مائةٌ وعشرونَ رحمةً، ستُّون للطائفين، وأربعونَ للمُصلِيِّن وعِشرُون للنَّاظرين**))[1]،

واتە: هەموو ڕۆژێك صەدو بیست ڕەحمەتی خودا دەبارێت و دێتە خوارەوە بۆ سەر ئەم ماڵی خودایە، شەست ڕەحمەتیان بۆ تەوافکاران، چل ڕەحمەتیشیان بۆ ئەوانەی نوێژ دەکەن، بیست ڕەحمەتیش بەسەر ئەوانەدا کە سەیردەکەن و بە چاوی گرانبەهاییەوە ڕێزو گەورەیی بۆ بڕیار دەدەن.

لە هەواڵ و خەبەردا هاتوو: (( **استكثروا منَ الطَّوافِ بالبَيتِ فإنَّهُ مِن أَقَلِّ شيء تجدونَه في صُحفِكُم يَومَ القيامَةِ، وأغبطِ عَملٍ تَجِدُونَه**))[2]،

واتە: تا بۆتان دەکرێت طەوافی ماڵی خودا زۆرتر بکەن، چونکە طەواف لەو کردەوە کەمانەیە کە لە ناو دەفتەرو نامە کردەوەکانتاندا بەکەمی دەبینرێت،

---

(١) رواه الطبراني في الكبير(١١/١٩٥)، وأبو نعيم في تأريخ أصفهان، ١/١٥١)، ورواه مسلسلا بالمكيين. الحافظ الزبيدي في الإتحاف( ٤/٢٧٢)،وحسنه المنذري والعراقي والسخاوي، وإذا اجتمعت طرق هذا الحديث ارتقى إلى مرتبة الحسن، والله أعلم. ورواه الأزرقي في (أخبار مكة)، ٢/٨، من كلام حسان بن عطية. ورواه الخطيب في المتفق والمفترق( ٢/٨٥(٢١٩). وأبو منصورشهرداربن شيرويه الديلمي في مسند الفردوس:١/٣٥٩(١٤٥٢) من حديث إبن عمر بإسناد ضعيف.

(٢) لفظ المصنف لهذا الحديث عند صاحب القوت ٢/١١٩، وهو موقوف على سيدنا علي (رضي الله عنه) كما رواه الأزرقي في أخبار مكة، (١/:٢١٨)، بلفظ: **إستكثروا من الطواف بهذا البيت، قبلَ أن يُحالَ بينكم وبينه، فكأني أنظرُ إليهِ حبشياً أصيلع أصيمع، قائماً عليها يهدمها بمسحاته،** فالرواية للقطعة الأولى منه. وقال العراقي رواه ابن حيان في صحيحه(١٥/١٥٣(٦٧٥٣)، والحاكم (١/٦٠٨(١٦١٠) من حديث ابن عمر: **استمتعوا من هذا البيت فانه هدم مرتين ويرفع في الثالثة** وقال الحاكم صحيح علي شرط الشيخين اهـ قال الزبيدي(٤/٢٧٣): ورواه أيضا الطبراني في المعجم الكبير كما في مجمع الزوائد (٣/٢٠٦).

بەڵام یەکێکە لەو کارانەی کە باشترین خێرو قازانجی لێدەبینن لە پاشەڕۆژدا، هەر لەبەر ئەمەیە کە وا چاکە پێش هەموو کارێکی حەج و عومرە دەستبکات بە طەوافی ماڵی خودا.

وە لە فەرموودەدا هاتووە: ((**مَن طافَ أسبوعاً حافِياً حاسِراً، كانَ لَهُ كَعِتقِ رَقَبَةٍ، ومَن طافَ أسبوعاً في المَطَرِ، غُفِرَ لَهُ ما سَلَفَ مِن ذنوبِهِ**))[1].

ئەوەی حەفتەیەك بە پێی پەتی و سەری ڕوتی طەواف بکات، وەك ئەوە وایە کە گەردنی کۆیلەیەکی ئازاد کردبێت، ئەوەش کە حەفتەیەك لە کاتی باراندا طەوافی کردبێت، خودا لە گوناهی لەوەوپێشی خۆش دەبێت.

وە وتراوە: خودای گەورە ئەگەر خۆش ببێت لە گوناهی بەندەیەکی لە

---

(١)ذكر ذلك صاحب القوت:(١١٩/٢): وقال: روى ذلك عن الحسن بن علي (رضي الله عنهما) قاله لأصحابه، ورفعه إلى رسول الله ﷺ وأوله عند الترمذي: (٩٥٩) وحديث الطواف في المطر عند ابن ماجه (٣١١٨).اهـ وقال العراقي لم أجده هكذا وعند الترمذي(٢٩٥٦) (**من طاف بهذا البيت أسبوعا فأحصاه، كان كعتق رقبة**، وحسنه اهـ قال الزبيدى٢٧٤/٤_٢٧٣: وقال الحافظ بن حجر في (تهذيب التهذيب) (١٦٧/٣) حديث الطواف في المطر رواه ابن ماجه(٣١١٨) من حديث أنس بإسناد ضعيف بالمعنى، اهـ قال الزبيدي: ولفظه عن أبي عقال قال: **طفت مع أنس بن مالك في مطر فلما قضينا الطواف اتينا المقام فصلينا ركعتين، فقال لنا أنس أئتنفوا العمل فقد غفر لكم . هكذا قال لنا رسول الله صلى الله عليه وسلم وقد طفنا معه في مطر** . وأخرجه أبو ذر الهروي من طريق داود بن عجلان قال: طفت مع أبي عقال فساقه نحوه، وأما حديث ابن عمر الذي عند الترمذي(٢٩١٩) ففيه زيادة: **لا يضع ولا يرفع أخرى إلا حط الله عنه بها خطيئة وكتب له بها حسنة** ، ورواه كذلك النسائي والحاكم (١٧٩٩/٦٦٤)، وعند ابن ماجه(٢٩٥٦) والبيهقي(١١٠/٥(٩٢١٢) من حديث ابن عمر: **من طاف بالبيت سبعا وصلى ركعتين كان كعتق رقبة**، وعند أحمد في مسنده، (٢٧٨٩٢). والطبراني في المعجم الكبير(٣٩٠/١٢(١٣٤٤٠): **مَن طافَ بِحذاءِ الكعبة أسبوعا يحصيه، كتب لهُ بكُلِّ خطوةٍ حسنة، وكُفِّرَت عنهُ سيِّئة، ورفعت له درجة، وكان له كعتق رقبة.**

جێگەی وەستانی ڕۆژی حەشرو لێ پرسینەوەدا، لە هەمان ئەو کەسانەش خۆش دەبێت، کە لەو جێگەیەدا بوون و هەمان گوناهیان کردووە.[1]،

هەندێك لەزانا پێشینەکان فەرموویانە:

ئەگەر ڕۆژی عەرەفە یەکبگرێتەوە لەگەڵ ڕۆژی جومعەدا، خودا لە گوناهی هەموو ئەهلی عەرەفە خۆش دەبێت[2]، ڕۆژی عەرەفە گەورەترین ڕۆژە لە دونیادا، وە لەو ڕۆژەدا بوو کە پێغەمبەر ﷺ دوا حەجی خوداحافیزی کرد، لە کێوی عەرەفەدا ڕاوەستابوو، کە خودای گەورە ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە، کە فەرموویەتی: ﴿**الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا**﴾(٤/المائدة) ئەمڕۆ دینەکەتانم بۆ تەواو کردن، نیعمەتی خۆمم بە تەواوی و کاملی ڕژاند بەسەرتانداو. بۆم تەواو کردن، وە ڕەزامەندیم نیشان دا بۆتان کە ئیسلام ببێتە ئاین و ڕێبازی هەتاهەتاییتان.

ئەهلی کیتاب کە کتێبە ئاسمانیەکانیان بۆ ڕەوانە کراوە دەڵێن:

ئەگەر ئەم ئایەتە بەسەر ئێمەدا بهاتایەتە خوارەوە، ئەوا ئەو ڕۆژەمان دەگێڕا بە ڕۆژی جەژن، (حەزرەتی) عومەر فەرمووی: شایەتی دەدەم کە ئەو ئایەتە لە ناو دوو جەژندا هاتە خوارەوە بەسەر پێغەمبەردا ﷺ ڕۆژی عەرەفەو ڕۆژی جومعە بوو، کە بە پێوە ڕاوەستابوو لە عەرەفەدا.[3]،

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : ((**اللَّهُمَ اغفِر لِلحاجِ، وَلِمَنِ استَغفَرَ لَهُ الحاجُّ**))[4]، خودایە لە حاجیان و هەموو ئەوانەش خۆش ببیت کە حاجیەکان داوای لێخۆش بوونیان بۆ دەکەن.

---

(١)قوت القلوب ١٢٠/٢.

(٢) قوت القلوب ١٢٠/٢.

(٣) كما في البخاري (٤٥)، ومسلم (٣٠١٧).

(٤) رواه الطبراني في الأوسط(٨٥٨٩) والحاكم في المستدرك(٤٤١/١).

وە دەگێڕنەوە کە عەلی کوڕی مووەفەق چەند حەجێکی بۆ (حەزرەتی) پێغەمبەرﷺ کرد، بەخزمەتی پێغەمبەرﷺ گەیشت فەرمووی:

ئەی کوڕی مووەفەق؛ لە جیاتی من حەجت کرد؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: لەبرێتی منیش تەلبیەت کرد( واتە: لبيك اللهم لبيك)؟

عەرزم کرد : بەڵێ، فەرمووی: دەی منیش لە ڕۆژی قیامەتدا پاداشتی ئەو کارانەت دەدەمەوە ، لە ڕۆژی وەستانی حزوری خوادا بۆ لێپرسینەوە، دەستت دەگرم و دەتخەمە ناو بەهەشتەوە، لەو کاتەدا کە هەموو مەخلووقاتی خودا لە نارەحەتی و سەختی ڕۆژی لێ پرسینەوەدان.[1]

موجاهیدو هەندێکی تر لە زانایان فەرموویانە: حاجییەکان کە دەگەنە مەککەوە، فریشتەکان پێشوازیان لێدەکەن، سەلام لە وشتر سوارەکان دەکەن، وە تەوقە لەگەڵ ئەوانەدا دەکەن کە سواری گوێدرێژ بوون، وە باوەش دەکەن بە ملی پیادەکانداو ئەیان گوشن بە خۆیانەوە[2].

(حەزرەتی)حەسەنی بەصری فەرموویەتی:

ئەوەی یەکسەر دوای ڕەمەزان بمرێت یان دوای غەزایەك یان دوای حەجی ماڵی خودا، ئەوە بە شەهیدی مردووە،[3]

(حەزرەتی) عومەریش فەرموویەتی:

خوا لە حاجیەکان خۆش دەبێت، لەوانەش کە حاجیەکان داوای لێخۆش بوونیان بۆ دەکەن، لە مانگەکانی (ذی الحجة)و موحەڕەم و صەفەردا، وە دە

---

(١) قوت القلوب٢/١٢١.

(٢) روى نحوه البيهقي مرفوعا في (الشعب).(٣٨٠٥). ورواه الفاكهي في أخبار مكة(٢/٢٧٦)، عن عبدالله بن عمر (رضيَ الله عنهما) وعن مجاهد ذكره أبو طالب المكي في قوت القلوب( ٢/١٢٠)

(٣) قوت القلوب٢/١٢٠.

ڕۆژی مانگی ڕەبیعی یەکەم، (مەولوود)[1].

کاتی خۆی لە ڕەویەی پێشینە صاڵحەکان بوو (خوایان لێ ڕازی بێت) کە ئەوانەیان بەڕێدەخستن کە دەچوون بۆ غەزا و جیهاد لە ڕێی خوادا، وە پێشوازی حاجیەکانیان دەکردەوە، وە ناوچەوانیان ماچدەکردن، وە داوای دوعای خێریان لێدەکردن، وە خێرا دەچوون بە دەمیانەوە پێش ئەوەی گیان و ڕۆحیان تێکەڵ و چڵکن ببێتەوە بە گوناه [2].

دەگێڕنەوە لە عەلی کوڕی مووەفەقەوە (خودای لێ ڕازی بێت)فەرموویەتی :

ساڵێکیان حەجم کرد، کاتێك شەوی عەرەفە هاتە پێشەوە، لە مزگەوتی (خیف) لە (مینا) دا نوستم، بینیم لە خەومدا وەك ئەوەی دوو فریشتە لە ئاسمانەوە هاتنە خوارەوە، بەرگی سەوزیان پۆشی بوو، یەکێکیان بانگی لە هاوڕێکەی کرد، ئەی عەبدی خودا؛

ئەویشیان وەڵامی دایەوە بەڵێ ئەی عەبدی خودا؛

فەرمووی: دەزانیت چەند کەس ئەم ساڵ حەجی ماڵی خودای (عَزَّ وجَلْ) یان کردووە؟ فەرمووی: نازانم، فەرمووی:

شەش صەد هەزار کەس حەجیان کردووە، ئەی دەزانی لە چەندێکیان وەرگیراوە؟ فەرمووی: نەخێر نازانم، فەرمووی:

تەنها لە شەش کەسیان وەرگیراوە!

دەفەرموێت: لە پاشان بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان، لەبەرچاوم وون بوون، لە حەیبەتا بێداربوومەوە، زۆر دڵگران و نیگەران بووم بەم هەواڵەیان، مەبەستم بوو چیم بەسەردێت، وتم: ئەگەر حەجی شەش کەس وەرگیرابێت، من دەبێ لە کوێی ئەو شەش کەسەدا جێگەم ببێتەوە،؟!

(١) قوت القلوب٢/١٢٠.

(٢) قوت القلوب٢/١٢٠، لە ڕیوایەتی تردا هاتووە بە بیست. بەڵام دەی مەولوود ڕاستە.

کاتێك لە عەرەفەوە گەڕامەوە، لە لای (مەشعەرولحەرام) دا ڕاوەستام، بیرم لە زۆری ئەو خەڵکە دەکردەوەو، کەمی ئەوانەی لێیان وەرگیراوە، خەو بردمیەوە، بینیم هەمان ئەو دوو مەلائیکە هاتنەوە خوارەوە، یەکێکیان ئەویانی بانگ کردەوە، هەمان قسەو پرسیارەکانی پێشووی دووبارەکردەوە، لە پاشان فەرمووی: دەزانی ئەم شەو خودای (عَزَّ وجَلْ) چ حوکمێکی دا بۆ ئەم حاجیانە؟ فەرمووی : نازانم، فەرمووی:

هەموو صەد هەزار حاجییەکی بەخشی بەیەکێ لەو کەسانەی کە حەجەکەیان لێ وەرگیرابوو، منیش بە ئاگاهاتمەوە و ئەوەندە دڵم خۆش بوو کە حەجی هەمووی وەرگیراوە، کە ناتوانم وەصفی ئەو دڵخۆشییەم بکەم.[1] ،

هەروەها (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:

ساڵێکی تر حەجم کردو کاتێك لە مەناسیکی حەج لێبوومەوە، بیرم لەوانە دەکردەوە کە حەجەکانیان لێ وەرناگیرێت و دەدرێتەوە بەسەریاندا.

وتم: ئەی پەروەردگارم؛ ئەوا من حەجەکەی خۆمم بەخشی، پاداشت و خێرەکەیم دا بەوانەی کە حەجەکانیان لێ وەرنەگیراوە، دەفەرموێت:

لە خەومدا خودای بەدەسەڵاتم بینی ﷻ، پێی فەرمووم:

ئەی عەلی؛ ئەوە بەسەر مندا سەخاوەت دەنوێنیت، کە من صیفەتی سەخاوەت و سەخییەکانیشم دروست کردووە، وە من لە هەموو دەست کراوە و بەخشندەکان، وە لە هەموو بەڕێزو ڕیزدارەکان ڕیزدارو بەخشندەترم، وە هەقی منە کە بەخشندەیی و سەخاوەت بنوێنم لە هەموو کەسانی تر، ئەوا حەجی هەموو ئەوانەی کە لێم وەرنەگرتبوون، بەخشیم بەوانەی کە لێم وەرگرتبوون[2] ،

---

(١)قوت القلوب٢/١٢٠.

(٢) هەمان سەرچاوە ٢/١٢١.

## باسی گەورەیی ماڵی خودا و مەککە.(خودا بیان پارێزێت)

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إنَّ اللهَ تعالى قَد وعَدَ هَذا البَيتَ أن يَحجَّهُ في كلِّ سَنةٍ سِتُ مئةِ ألفٍ، فإن نقَصوا، أكمَلهُم اللهُ تعالى بالملائكَةِ. وإنَّ الكَعبةَ تُحشَرُ كالعَروسِ المَزفُوفَة، وكلُ مَن حَجَّها، يَتعلَّقُ بأستارِهَا، يسعَونَ حَولَها حَتى تَدخُلَ الجنَّةَ، فيَدخُلوُن معَها))[1]،

خودای گەورە بەڵێنی داوە بە کەعبەی پیرۆز کە هەموو ساڵێك شەش صەد هەزار کەس حەجی ماڵی خودا بکات، ئەگەر ژمارەکەیان کەمی کرد، خودای گەورە بە فریشتەکانی ژمارەکەیان تەواو دەکات، وە کەعبە وەك بووکێکی ڕازاوە بۆ مێردەکەی ئاوا حەشر دەکرێت و، هەموو ئەوانەش کە حەجیان کردووە و تەوافیان کردووە. خۆیان بە بەرگ و پۆشاکیدا هەڵدەواسن و، بە چواردەوریدا دەسوڕێنەوە، تا کەعبە دەچێتە ناو بەهەشتەوە و، ئەوانیش لەگەڵیدا دەچنە ناو بەهەشتەوە، هەروەها لە فەرموودەدا هاتووە:

((إنَّ الحجرَ ياقُوتةٌ مِن يَواقيتِ الجنَّةِ، وإنَّه يُبعَثُ يومَ القِيامَةِ ولهُ عَينانِ، ولِسانٌ يَنطقُ بهِ، يشهَد لمِن استلَمَه بِحَقٍّ وَصِدْق)) .[2]

واتە: بەڕاستی بەردە ڕەشەکە یاقووتێکە لە یاقووتەکانی بەهەشت، لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەکرێتەوە و، دووچاوی هەیە کە دەبینن، وە زوبانیشی

---

(١) كذا في القوت٢(/١٢١) وقد رواه الفكاهي في أخبار مكة( ٤٣٦/١)، عن أبي بكر_شك في رفعه_بلفظ: إن الكعبة تحشر يوم القيامة إلى بيت المقدس تزف زف العروس، متعلق بها من حج إليها، فتقول الصخرة: مرحبا بالزائر والمزور، وقال السيوطي في الدرر المنثور(٣٢٩/١: وأخرج الواسطي عن كعب قال: لاتقوم الساعة حتى يزف البيت الحرام إلى بيت المقدس فينقادان إلى الجنة، وفيهما أهلهما، والعرض والحساب ببيت المقدس.

(٢) رواه الترمذي (٩٦١) بلفظ: والله ليبعثنَّه الله يوم القيامة له عينان يبصر بهما، ولسان ينطق به، يشهد على من استلمه بالحق.) وله (٨٧٨) أيضا: إن الركن والمقام ياقوتتان من يواقيت الجنة، طمس الله نورهما،ولو لم يطمس نورهما لأضاءَتا مابين المشرق والمغرب.

هەیە قسەی پێدەکات، وە شایەتی دەدات لەسەر هەموو ئەوانەی بە حەقق و ڕاستییەوە دەستیان پیا هێناوەو سەلامیان لێ کردووە.

وە پێغەمبەری خودا زۆر ماچی بەردەڕەشەی دەکرد، [١]،وە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خودا سوجدەی لەسەر بردووە: ((أنَّ رسولَ اللهِ ﷺ سَجدَ عَلَيهِ))[٢]، واتە تەوێڵ و ناوچەوانی خستۆتە سەر بەردەکە.

((وكانَ يَطوفُ على الراحلَةِ فَيَضَعُ المِحجَنَ عَلَيهِ، ثُمَّ يُقَبِّلُ طَرَفَ المِحجَنِ))[٣]،

وە لەسەر وڵاخەکەی تەوافی دەکردوو، گاڵۆکەکەی لەسەر بەردەکە دادەناو، لە پاشان لایەکی گۆپاڵەکەی ماچدەکرد.

وە (حەزرەتی) عومەریش ماچی بەردەکەی کردو فەرمووی: من دەزانم تۆ بەردێکی هیچ زیان و قازانجێکت نیە. ئەگەر نەمدیبایە پێغەمبەر ﷺ ماچی کردویت، ماچم نەدەکردیت! [٤]، لە پاشاندا ئەوەندە گریا تا دەنگی بەرز بوویەوە، لای کردەوە بینی لە پشتیەوە (حەزرەتی) عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) وەستاوە، فەرمووی: ئەی باوکی حەسەن: ئێرە شوێنی ڕژانی فرمێسك و گریانی بە کوڵە، (حەزرەتی) عەلی فەرمووی: ئەی فەرماندەی موسوڵمانان :

ئەو بەردە زیانیش دەگەێنێت و سوودیشی هەیە،

(حەزرەتی) عومەر فەرمووی: چۆن؟ فەرمووی: خوای گەورە کاتێك بەڵێن و پەیمانی وەرگرت لە هەموو ئەرواحی ئادەمییەکان، کە دەستی هێنا بە پشتیاندا و ڕۆحەکانیانی تێدا ئاشکرابوو، نوسراوو پەیمان نامەیەکی نوسی و

---

(١) تقبيله ﷺ للحجر الأسود عند البخاري (١٥٩٧)، ومسلم(١٢٧٠).

(٢) كما روى ذلك مسلم (١٢٧٥).

(٣) رواه البخاري(١٥٩٧)، ومسلم( ١٢٧٠) وسبق.

(٤)أخرجه البخاري ومسلم من حديث ابن عمر ولفظ مسلم قالْ: **قبَّل عمر بن الخطاب الحجر ثم قال: أما والله لقد علمت انك حجر . ولولا اني رأيت رسول الله ﷺ يقبلك ما قبلتك.**

خستیبه ناو بەردە ڕەشەکەوە؛ فەرمووی: ئەو بەردە شایەتی دەدات بۆ ئیماندارەکان کە وەفایان بووەو زیارەتیان کردووە، وە شایەتیش دەدات لەسەر بێباوەڕەکان، کە ڕەدیان کردۆتەوەو بڕوایان نەهێناوە، [1]،

وتراوە: ئەمەیە واتای ئەو زیکرو ویردەی کە لە کاتی زیارەتکردن و دەست لێدانی بەردە ڕەشەکەدا دەوترێت: ( **اللَّهُمَّ إِيماناً بِكَ، وتَصديقاً بِكِتابِكَ، وَوَفاءً بِعَهدِكَ)**[2]، خودایە ئەم زیارەتکردنەم بۆ دەربڕینی بڕواو متمانەمە بە خوایەتی تۆ، وە بڕوابوونمە بە قورئانەکەت. وە وەفادارمە بەو پەیمان و بەڵێنەی کەداومە پێت، لە جیهانی کۆکردنەوەی ڕۆحەکاندا (عالەمی ئەلەست).

وە دەگێڕنەوە لە حەسەنی بەصریەوە (خوای لێ ڕازی بێت)، کە ڕۆژووی

---

(١)وروى هذه الزيادة الأزرقي في أخبار مكة(٢٥٧/١) والحاكم في المستدرك(٤٥٧/١).وزادا : فقال عمر: **أعوذ باللهِ أن أعيشَ في قَومٍ لستَ فيهم يا با الحَسَن**، بحذف الهمزة تخفيفا،وه له فەرمودەکەدا هاتووە:(**وتسكُبُ العَبَرات**)،جاء رواية لإبن ماجه: (٢٩٤٥) عن ابن عمر (رضي الله عنهما)قال: **استقبل رسول الله ﷺ الحجر، ثم وضع شفتيه عليه يبكي طويلا، ثم التفت فإذا هو بعمر بن الخطاب . فقال: يا عمر: ههنا تسكُب العبرات**،ولفظ المصنف وسياقه من قوت القلوب(١٢١/٢)وقال العراقي هذه الزيادة في هذا الحديث أخرجها الحاكم وقال:ليس من شرط الشيخين اهـ قال الحافظ الزبيدي(٢٧٧/٤)وأخرج الأرزقي هذا الحديث بتلك الزيادة ولفظه: **فقال علي بلَى يا أمير المؤمنين هُو يضرُّ وينفع، قال وبم ؟ قال بكتاب الله عز وجل، قال وأين ذلك في كتاب الله عز وجل؟ قال: قال الله تعالى وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ(١٧٢)قال فلما خلق الله (عَزَّ وجَلَ) آدم، مسح ظهرَه فأخرَج ذريتَه من ظهره، فقررهم أنّه الرب وانّهم العبيد ثم كتب ميثاقهم في رق، وكان هذا الحجر له عينان ولسان، فقال له: إفتح فاك، قال فالقمه ذلك الرق، وجعله في هذا الموضع، فقال تشهد لمن وافاك بالموفاة يوم القيامة، قال: فقال عمر: أعوذ بالله أن اعيش في قوم لست فيهم يا أبا حسن.**

(٢) قوت القلوب( ١٢١/٢) والدعاء مروي عن جمع من السلف،أنظر خلاصة البدر المنير(٨/٢) .

ڕۆژێك لە مزگەوتی حەرامدا، بە صەد هەزار ڕۆژە، وە چاکەو صەدەقەی دیرهەمێك بە صەد هەزار دیرهەمە، هەروەها هەموو چاکەیەك بە صەد هەزار جار پاداشتی دەدرێتەوە[1]،

وە وتراوە: کە تەوافی کەعبە لە بەشێك لە حەوت بەشی شەودا، ئەوەندەی عومرەیەك خێری دەگات، وە سێ عومرەیش وەك حەجێك وایە[2]،

وە لە فەرموودەی دروستدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(( **عُمرةٌ في رَمَضان، كَحجَّةٍ معي**)) واتە: ئەنجامدانی عومرەیەك لە مانگی ڕەمەزاندا وەك ئەوە وایە حەجێکی لەگەڵ مندا کردبێت.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (( **أنا أوَّلُ مَن تَنشَقُّ عَنهُ الأرضُ، ثُمَّ آتي أهلَ البَقيعِ فيحشُرونَ مَعي، ثُمَّ آتي أهلَ مكَّةَ فأُحشَرُ بينَ الحَرَمينْ**))[3]، واتە: من یەکەم کەسم کە زەوی بۆم شەق دەبێت و دێمە دەرەوە، لە پاشان دێمە لای ئەوانەی لە (بەقیع) نێژراون، ئەوانیش هەڵدەستنەوە لەگەڵ مندا، لە پاشان دێمە لای ئەوانەی ئەهلی مەککەن، وە لە نێوانی هەردوو حەرەمەکەدا حەشر دەکرێم.

وە لە فەرموودەیەکدا هاتووە: ((**إنَّ آدمَ عليهِ السَّلام لمَّا قَضَى مَناسكَهُ لقِيَتْهُ الملائِكَة، فقَالُوا بَرَّ حَجُكَ يا آدَم، لقَد حَجَجنَا هذا البيتَ قَبلَك بألفَيْ عَام**)) ، واتە: (حەزرەتی) ئادەم کاتێك مەناسیك و عیبادەتی حەجی تەواو کرد،

---

(١) ذكره في قوت القلوب (١٢١/٢) ، عن ابن عباس وأنس والحسن، متفرقا.

(٢) قوت القلوب(١٢٠/٢.) وروى الطبري في مناسكه عن ابن عباس في حديث طويل: **أن آدم عليه السلام كانَ يطوف بالليل سبعة أسابيع. وبالنهار خمسة**.وكذا كان ابن عمر يفعله أخرجه الأزرقي.

(٣) رواه الترمذي (٣٦٩٢)، وفيه: **ثم أنتظر أهلَ مكة حتى أُحشَرَ بينَ الحَرَمَين**. وقال العراقي رواه الترمذي وحسنه وابن حبان في صحيحه(٣٢٤/١٥)(٦٨٩٩)من حديث ابن عمر اهـ قال الزبيدي(٤/ ٢٧٧) ولفظهما: **أنا اول من تنشق االأرض عنه ثم أبو بكر ثم عمر، ثم آتي أهل البقيع فيحشرون معي ثم انتظر أهل مكة...**

فریشتەکان پێی گەیشتن و وتیان: خودا لێت وەرگرێت ئەی ئادەم، ئێمە لەپێش تۆوە بەدوو هەزار ساڵ لەم ماڵی خودایەدا حەجمان کردووە.[1]

وە لە ئەسەری پیرۆزدا هاتووە: خودای گەورە هەموو شەوێك سەیری ئەهلی سەر زەوی دەکات، یەکەم تاقم کەسەیریان دەکات، ئەهلی حەرەمی مەککەیە، وە یەکەم کۆمەڵیش کە لە ئەهلی حەرەم سەیریان دەکات، ئەوانەن کە لە مزگەتی حەرام و بەیتی پیرۆز دان، ئەوەی ببینێت طەواف دەکات، لێی خۆش دەبێت، وە ئەوەی ببینێت نوێژ دەکات لێی خۆش دەبێت، وە ئەوەش کە دەیبینێت و ڕووە و قیبلە پاڵ کەوتووە و نوستووە.. لەوانیش خۆش دەبێت[2] ،

وە هەندێك لە دۆستانی خودا (خودایان لێ ڕازی بێت) بۆی دەرکەوتووەو خستوویانەتە بەرچاوی و دەفەرموێت: من بینیومە هەموو کەلێنەکان، (واتە ئەو جێگایانەی کە مەترسی ئەوەی هەیە دوژمن هێرشیان لێوە بکات) دەمبینی هەموو سوجدەیان بۆ عەببادان دەبرد[3]، وە دەیشمبینی عەببادانیش سوجدەی دەبرد و ملکەچ دەبوو بۆ شاری (جوددە).[4]

وە دەڵێن: هەرگیز ڕۆژ نانیشێت، ئەگەر یەکێك لە ئەبدالەکان[5]، تەوافی ماڵی خودایان نەکردبێت، وە هەرگیز گزنگی بەرەبەیان هەڵنایەت، ئەگەر

---

(١) رواه الأزرقي في أخبار مكة:(١/١٦و ١/٣٩). . عن ابن عباس ومحمد بن إسحاق بلاغا، والبيهقي في الشعب (٣٧٠٣)، عن وهب بن منبه بنحوه. قال الزبيدي: ورواه الشافعي في مسنده ص/١١٦، موقوفا علي محمد بن كعب القرظي.

(٢) قوت القلوب ( ١٢١/٢).

(٣) شارێکە نزیك سنووری بەصرەیە.

(٤) باسی ئەوەیان کرد ئەگەر یەکێك نوێژ لە (عەببادان)دا بکات، ئەبوتورابی نەخەشی (خودای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: مـن خەوی نـاو حەرەمـم پـێ باشـترە لە نـوێژی نـاو عەببـادان. الإتحاف(٢٧٨/٤).وقال أبوطالب: لأنها (أى جدة) خزانة الحرم، وفرضه أهل المسجد الحرام.

(٥) ئەبدال حەوت کەسن، کەمو زیاد ناکەن، هەریەکەیان لەسەر قەدەمی پێغەمبەرێکن.

یەکێك لە ئەوتادەکان[1]. تەوافیان بە چواردەوری کەعبەو ماڵی خوادا نەکردبێت، ئەگەر ئەم هاتنەیان نەماو پچڕا، ئەوە نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە ئیتر کەعبە هەڵدەگیرێت و، لەسەر زەوی نامێنێت. بۆ بەیانی ئەو خەڵکە دەبینن ئاسەواری کەعبەیشیان لەبەرچاودا نەماوە، ئەمە دوای ئەوە دێت کە حەوت ساڵی تەواو حەج لە کەعبەدا ناکرێت، لە پاشان قورئان لەناو مەصحەفەکان هەڵدەگیرێت و، کاتێك ڕۆژیان لێدەبێتەوە، دەبینن هیچی لێ نەنوسراوەو هەموو کاغەزی سپییە، لە پاشان قورئان لە دڵەکانیش لادەچێت و هەڵدەگیرێت، کەس یەك پیتی قورئانی لەبیر نامێنێت، لەپاشان خەڵکەکە دەگەڕێنەوە بۆ شیعرو گۆرانی وتن و، هەواڵەکانی چەرخی نەفامێتی، لە پاشان دەججال دەردەکەوێت و (حەزرەتی) عیسا(سەلامی خودای لەسەر) دادەبەزێت و، دەججال دەکوژێت، ڕۆژی قیامەتیش لەو کاتەدا بە وێنەی کەسێکی سك پڕەو لە وەختی خۆی دا بێت، هەموو کاتێك بەتەمای توڕدانی سکەکەیەتی.[2].

لە فەرموودەدا هاتووە: (( **إستَكثِروا مِنَ الطَّوافِ بِهذا البَيتِ، قبلَ أن يُرفَع، فقَد هُدِمَ مَرَّتَينِ، وَيُرفَعُ في الثَّالِثَةِ**))[3].واتە: زۆر تەوافی ئەم بەیتە بکەن تا هەڵنەگیراوە، دووجار تێکیانداو ڕوخاندیان و جاری سێیەم هەڵدەگیرێت.

(حەزرەتی) عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: خودا فەرموویەتی: ئەگەر ویستم دونیا تێك بدەم، لە ماڵەکەی خۆمەوە دەست پێدەکەم و تێکی دەدەم،لەپاشان دونیا بە دویدا تێك دەدەم[4]

---

(١) ئەوانیش چوار کەسن زیادو کەم ناکەن و ناوەکانیان(عبدالحي، عبدالعليم و عبدالقادر، عبدالرب)ە، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و باکور و باشوری زەوی دان و کاریان پێ سپێرراوە.

(٢) قوت القلوب(١٢٢/٢).

(٣) رواه ابن حبان في صحيحه، (٦٧٥٣)، والحاكم (٤٤١/١)والبزاز في مسنده(٦١٥٧).

(٤) **ثبت في البخاري(١٥٩١)ومسلم(٢٩٠٩) أن خراب البيت في آخر الزمان على يد السويقتين.**

# گەورەیی خێری مانەوە لە مەککەی پیرۆزدا
## (خوا بیپارێزێت)
## وە باسی کەراهەتی مانەوە تیایدا

ئەو زانایانەی دەترسن و هەمیشە هەنگاوەکانیان بە وریایی دەنێن، لەبەر سێ هۆ پێیان باش نەبووە لە مەکەدا بە هەمیشەیی بمێنیتەوە:

**یەکەم:** ترسی ئەوەی کە پێی دابێت و، لێی بێزار ببێت و، ئەو گەرمی و رێزەی کە دڵی بۆی کوڵدەهات لە دووردوە، لە ناویا نەیمێنێت و لای ئاسایی ببێتەوە، بۆیە (حەزرەتی) عومەر کاتێك کە لێدەبوونەوە لە حەج لێی دەدان،وە دەیفەرموو: ئەی ئەهلی یەمەن بەرە و یەمەنی خۆتان و، ئەی شامییەکان بگەڕێنەوە بۆ شام و، ئەی ئەهلی عێراق بگەڕێنەوە بۆ عێراق[1].

بۆیە (حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) ویستی نەهێڵێت خەڵکی زۆر تەواف بکەن، وە فەرمووی: (دەترسم ئەو خەڵکە بەم ماڵی خوایە دابێن و ئەو سام و هەیبەتە لە دڵ و چاویاندا نەمێنێت) .

**دووهەم:** بەهۆی دوورکەوتنەوەوە لە ماڵی خودا، شەوقی بۆ زیاد ببێت و حەز بەگەڕانەوە بکات بۆ خزمەتی، چونکە خودای گەورە ئەم بەیت و ماڵی خۆیە وای داناوەو، کە بەندەکانی لێی دوورکەوتنەوەو بۆی بگەڕێنەوە، ئاسوودەیی دڵیان لەوێدا دەبیننەوە، هەرگیز مەرام و پێداویستییەکانیان تێیدا تەواو نابێت، یەك لەدوای یەك بۆی دەگەڕێنەوە.

---

(١) قوت القلوب(٢ /١٢٢)، وروى ابن أبي شيبه في المصنف (١٣٤٧٠) عنه قال: ( **لاتقيموا بعد النفر إلا ثلاثا**).

هەندێك لە زانایان فەرموویانە: تۆ لە شارێکی تر بیت و، دڵت وابەستەو خولیاو کوڵهاتوو بێت بۆ دیداری کەعبە و پێیەوە بەسرابێتەوە، چاکترە لەوەی لە ناو کەعبەدابیت و لێی بێزاربیت و، پێی داهاتبیت و، دڵت لە شارێکی تر بێت[1].

وە هەندێ لە زانایانی سەلەف فەرموویانە:

زۆر پیاو هەیە لە خۆراسانەو . نزیکتریشە لەوەی کە لەناو حەرەمدا خەریکی تەوافە[2].

وە دەڵێن: خودای گەورە کۆمەڵە بەندەیەکی هەیە، کەعبە لە دەوری ئەوانەوە تەواف دەکات و دەسوڕێتەوە، بۆ ئەوەی لای خودا نزیکتر ببێتەوە[3].

**سێیەم:** ترسی ئەوەیان هەیە لە ناو حەرەمدا تووشی گوناهو هەڵە ببن، ئەمەیان زۆر جێگەی مەترسییە، وە دەبێتە هۆی جوڵانی غەزەب و تورەبوونی خودا لەو کەسە (پەنا بەخودا)، چونکە ئەوەندە جێگاکە پیرۆزە، ئەوە هەڵناگرێت کە کەس بتوانێت گوناهی تێدا بکات[4].

دەگێڕنەوە لە وەهیبی کوڕی وەردی مەککی کە دەفەرموێت:

شەوێکیان لە حیجری (حەزرەتی) ئیسماعیلدا لە پاڵ کەعبەدا نوێژم دەکرد، لە نێوانی کەعبەو ڕوکنەکانیەوە گوێم لە قسەیەکەوە بوو، دەیفەرموو: سکاڵای خۆم بۆ حزوری خودا دەبەم و، بۆ خزمەتی تۆیش ئەی جوبرەئیل، کە لە تەوافکارانەوە دووچاری چی دێم، کە زۆر قسەی بێزارکەر و گەمەو گاڵتە

---

(١) قوت القلوب (٣/ ١٢٢).

(٢) قوت القلوب٢/١٢٢).

(٣) هەمان سەرچاوە، وە بنوارە: تفسیری ئالوسی،( ١٤/٢٣—١٥.)

(٤) دەگێڕنەوە (حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت)هانی قورەیشییەکانی دەدا کە بچنەوە بۆ ناو لادێکانیان، (إلحَقوا بالأرياف،فهو أعظمُ لأخطارِكم، وأقل لأوزارِكم، رواه الأزرقي في أخبار مكة، ٢/١٢٥،

دەکەن لە چوار دەورمدا، وە دەیکەن بە قاڵەو دەنگ بەرز دەکەنەوە، ئەگەر واز لەم ڕەفتارە ناپەسەندانەیان نەهێنن، ڕاچڵەکێن و ڕاپەڕێنێکی وادەکەم، هەرچی بەردەکانم هەیە هەمووی لێرە هەڵکەنرێت و، بچێتەوە هەمان ئەو شوێنانەی لێیەوە دەرهێنراوە[1]،

عەبدوڵلای کوڕی مەسعودیش (خوایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

هیچ شارێك نیە جگە لە مەککە، ئەگەر کەسێك ئیرادەی خراپەیەك بکات، تا جێبەجێی نەکات لەسەری نانوسرێت، بەڵام لە مەککەدا بە تەنها نیەتی خراپە کردن، لەسەری دەنوسرێت، وە ئەم فەرموودەی خوێندەوە:

کە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿**وَمَنْ يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ**﴾ (٢٥/الحج) واتە: هەرکەسێك ئارەزووی لەوە بێت بەهۆی ستەمکاری خۆیەوە لە ڕێگای ئاین لابدات، سزایەکی سەختی پڕ ئازاری پێ ئەچێژین[2]، واتە تەنها لەبەر ئیرادەکە سزایان دەدەین[3]،

وەك فەرموویانە: وەك چۆن پاداشتی کردەوەی باشە چەندین جار زیاترە، هەروەها تۆڵەی کردەوەی خراپەش زۆر زیاتر دەبێت[4]،

بۆیە (حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی عەباس (خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: ئیحتیکار، واتە: هەڵگرتنی خۆراك بۆ ئەوکاتە کە بەگرانی بیفرۆشێت، ئەوە وەك بێباوەڕی و کوشتارو تاوانکاری بۆی دەژمێررێت[5]،

---

(١) رواه الأزرقي في (أخبار مكة) ١٣/٢.

(٢) خۆلاصه.:( ٢٢٥).

(٣)رواه الأزرقي في (أخبار مكة)( ١٢٧/٢).

(٤)وفي ذلك أخبار، منها ما رواه الأزرقي في أخبار مكة(١٢٨/٢) عن ابن جريج قال: **بلَغني أنَّ الخَطيئَةَ بِمَكة بِمأةِ خطيئَةٍ، والحَسَنةُ على نَحو ذلك.**

(٥) كذا في القوت(١١٩/٢)وروى نحوه الأزرقي في أخبار مكة( ١٢٦/٢عن عمر وابنه (رضي الله عنهما)

هەروەها دەفەرموون: درۆکردنیش بە هەمان تاوان لەسەری دەژمێررێت[1].

(حەزرەتی) عەبدوڵلای کوڕی عەباس فەرموویەتی:

ئەگەر حەفتا گوناە بکەم لە (ڕوکبە)دا[2]، کەلە نێوانی مەککەو طائیف دایە، پێم باشترە لەوەی یەك گوناە بکەم لە مەککەدا.

ئەوەندە خۆیان دەپاراست، هەندێك لەوانەی لە مەککەدا دەمانەوە، لە نزیکی حەرەمدا نەدەچوونە سەرئاو، بەڵکوو دەچوونە دەرەوەی مەککە، بۆ دەستبە ئاو گەیاندن[3]

وە هەندێکیان مانگێك دەمانەوەو شانیان دانەئەدا لەسەر زەوی[4].

وە بۆ ئەوەی لێیان قەدەغە بکەن لە مانەوە لە ناو مەککە، هەندێك لە زانایان ڕێگەیان نەداوە بە پێدانی کرێ بۆ خانوو جێگەی حەوانەوەی

---

(١) وەك چۆن بێ باوەڕی تاوانێکی گەورەیە درۆیش هەروایە، قوت القلوب(١١٩/٢).

(٢) گوندێك بوو لە میانی مەکەو طائف دا، کە لەوێ نیشتەجێ بوو، دەیانووت: بۆچی لەمەکەدا نامێنیتەوە، دەیفەرموو: چی بکەم لە شارێکدا کە گوناە تیایدا چەند بارە دەکرێتەوە لەسەری، وەك چاکە چۆن چەند جار پاداشتی دەدرێتەوە، رواه عبد الرزاق في المصنف(٢٨/٥) والأزرقي في أخبار مكة،.(١٢٥/٢، ١٢٨)، عن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) وكذا هو عن عمر في القوت، ٢/ذ١١٩، وانظر :معجم البلدان:٦٣/٣.

(٣) روى ذلك عن جمع، منهم كما ذكره صاحب القوت: (١١٩/٢): عبدالله بن عمر، وعمر بن عبدالعزيز، ومنهم عبدالله بن عمرو بن العاص. كما في أخبار مكة.( ١٢٣/٢) للأزرقي، ونقل البيهقي في الشعب(٣٧٢٩)، عن محمد بن إبراهيم الزجاجي أنه **بقي أربعين عاما في الحرم لايبول ولايتغوط، بل يخرج إلى الحل.**

(٤) قال الزبيدي(٤ /٢٨٣):وفعل عبدالله بن عمرو من اتخاذ الفسطاطين أخرجه أبو ذر الهروي وخلع النعال بذي طوي نقله الطبري عن ابن الزبير قال:**إذا كانت الأمة من بني اسرائيل لتقدم مكة،فاذا بلغت ذا طوي خلعت نعالها، تعظيما للحرم**،وأخرج ابن ماجه(٣١١٠)في مناسكه عن عياش بن ربيعة عن النبي ﷺ قال: **لاتزال هذه الامة بخير ما عظمت هذه الحرمة، حق تعظيمها لله عز وجل، يعني الكعبة والحرم فاذا ضيعوا ذلك هلكوا.**

حاجیەکان[١]، **هەرگیزیش وا گومان نەبەیت کە:**

کەراهەتی مانەوە لە مەککەدا دژایەتی هەیە لە گەڵ فەزڵ و گەورەیی ئەو جێگا پیرۆزەدا، چونکە ئەو کەراهەتە هۆکارەکەی بۆ لاوازی بڕوای خەڵکەکەیە، وە کەمتەرخەمییان لەوەی کە بتوانن ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن و، مافی ڕێزو بەهای ئەو شوێنە پیرۆزە بپارێزن.

کەواتە مەبەست لەوەی کە باسکرا:

بەڕاستی نەمانەوەی بەردەوام لە مەککەدا باشترە، بۆ ئەوانەیە کە بەکەمتەرخەمی و کەم وکوڕی خۆیانەوە دەمێننەوە، یان پێی داهاتوون و لێی تێر بوون و بێزار دەبن لە مانەوە، ئەینا هەرگیز وا نیە، کە بتوانیت مافی ئەو جێگا پیرۆزە بپارێزیت و بڵێین: نەمانەوە خێری زیاترە. چۆن وانیە کە دەزانین حەزرەتی پێغەمبەرﷺ کاتێك گەڕایەوە بۆ مەککەو، پێی شادبوویەوە **((إستَقبَلَ الكَعبَة وقال: إنَّك لخَيرُ أرضِ اللهِ وأَحبُّ بلادِ اللهِ تَعالَى إليَّ، ولَولَا أَنِّي أُخرِجتُ مِنكِ مَا خَرجْتُ؟! ))**[٢].

واتە: ڕوی لە کەعبە کردو فەرمووی:

تۆ باشترینی ئەرزی خودای ، وە خۆشەویسترینی شار و وڵاتی خودای بە لای منەوە، ئەگەر منیان بە ناچاری دەرنەکردایە، ئەوا دەرنەدەچوومە دەرەوە.

ئەمە ڕاستییەکی دوور لە گومانە، ئەگەر وانیە چۆن تەنها سەیر کردنی کەعبەی پیرۆز بە عیبادەت بۆی دەنوسرێتەوە، چاکەکان تێیدا چەند بەرامبەری بۆ دەنوسرێت، وەك باسمان کرد.

---

(١)وأخرج سعيد بن منصور كما روى الفاكهي في أخبار مكة ٢٤٧/٣، عن مجاهد رفعه: **انَّ مكة حرامٌ حرمها الله تعالى. لا يحلُّ بيع رباعها (جمعُ رِبعٍ) ولا أجور بيوتها** ، واخرج ايضا عن ابن جريج قال اني قرأ كتاب عمر بن عبد العزيز ينهى عن كراء بيوت مكة،

(٢) رواه الترمذي (٣٩٢٥)، وابن ماجه(٣١٠٨).

# گەورەیی شارەکەی حەزرەتی پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر هەموو شارەکانی تر

جگە لە مەککە هیچ شوێنێکی تر نیە گەورەتر بێت لە شارە شیرینەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ، کردەوەکان تیایدا بە هەمان شێوە پاداشتەکەی چەند بەرابەرە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**صَلاةٌ في مَسجِدي هذا خيرٌ مِن أَلفِ صَلاةٍ فيما سِواهُ إلاَّ المَسجِدَ الحَرام**))[1].

واتە: نوێژێك لە مزگەوتەکەی من، خێری زیاترە لە هەزار نوێژ لە هەموو شوێنێکی تردا، جگە لە مزگەوتی حەرام نەبێت.

هەروەها پاداشتی هەموو کارێکی خێر لە مەدینەدا بە هەزار قاتە، وە لەدوای مەدینە بەندایەتی و خێرو چاکە لە زەوی پیرۆز و (بیت المقدس)دا لە هەموان خێری زیاترە، نوێژێك تیایدا بە پێنج صەد نوێژە لە جێگاکانی تر، وە هەروەها هەموو کردەوەیەکی چاکی تر یەك بە پێنج صەدە.

دەگێڕنەوە لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە (خودای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((**صلاةُ في مَسجدِ المَدينة بعَشرَةِ آلآف صلاةٍ، وصلاةٌ في المسجدِ الأقْصَى بألفِ صلاةٍ، وصلاةٌ في المَسجدِ الحَرامِ بمِئَةِ ألفِ صَلاةٍ**))[2].

---

(١) رواه البخاري(١١٩٠)، ومسلم(١٣٩٤).

(٢) كذا في القوت(١٢٣/٢) وقال: روينا عن عطاء عن بن عباس عن النبي ﷺ وذكره بلفظه هنا، وكون الصلاة بألف في بيت المقدس هو عند ابن ماجه(١٤٠٧) ولفظه مرفوعا، وقد سئل عن بيت المقدس (**أرض المحشر والمنشر، أءتوهُ فصلُّوا فيه، فإن صلاةً فيهِ كألفِ صلاةٍ في غيرهِ**). ليس في اسناده من يضَعَّف. وقال الذهبي في ميزان الإعتدال(٣٦٢/٧) انه منكر اهـ وله [ كتاب إقامة الصلاة والسنة فيها باب ماجاء في الصلاة في المسجد الجامع(١٤١٣)من حديث أنس(**صلاةٌ في المسجدِ الأقصى بخَمسينَ ألفَ صلاةٍ. وصلاةٌ في**

واته: نوێژێك له مزگەوتی مەدینه، به دەهەزار نوێژه له پاداشتدا، وه نوێژێك له مزگەوتی ئەقصادا(بيت المقدس)) به خێری هەزار نوێژ بۆی دەژمێررێت، وه نوێژێك له ماڵی خوادا(مزگەوتی حەرام) به صەد هەزار نوێژه.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(( لا يَصبرُ عَلى شِدَّتِها وَلأْوَائِها أحدٌ إلاَّ كُنت لهُ شَفيعاً يومَ القِيامَةِ))**[1].

ئەوەی خۆڕاگربێت لەسەر سەختی و نارەحەتیەکانی، ئەوا من دەبمە شفاعەتکار بۆی له ڕۆژی قیامەتدا.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **(( مَنِ استَطاعَ أن يَمُوتَ بالمَدينة، فَليُمُتْ فإنَّهُ لَم يَمُتْ بِها أحَدٌ،إلاَ كُنتُ لَهُ شَفيعاً يومَ القِيامَةِ))** ئەوەی له ئێوه دەتوانێت له مەدینەدا بمێنێتەوەو بەجێی نەهێڵێت تا تیایدا وەفات دەکات، با بمێنێتەوەو هەوڵبدات له مەدینەدا بمرێت، چونکه هیچ کەسێکی تیا نەمردووه، که من تکاکارو شفاعەتکاری نەبم له ڕۆژی قیامەتدا.[1].

---

**مسجِدي، بخَمسينَ ألفَ صلاةٍ، والصلاةُ في مسجِدِ الرِّباطاتِ ألفَ صلاتٍ)**قال الزبيدي(٢٨٤/٤): اخرجه ابن ماجه من حديث هشام بن عمار حدثنا ابو الخطاب الدمشقي حدثنا رزيق أبو عبد الله الالهاني عن أنس قال قال رسول الله ﷺ : **الرجل في بيته بصلاة، وصلاته في مسجد القبائل بخمس وعشرين صلاة، وصلاته في المسجد الذي يجمع فيه بخمسمائة صلاة، وصلاته في المسجد الاقصى بخمسين ألف صلاة، وصلاته في المسجد الحرام بمائة ألف صلاة**، و رزيق ضعه ابن حبان والراوي له عنه أبو الخطاب، إن كان هو معروف الخياط: فقد ذكره ابن عدي في ترجمته، وان كان هو عمار الدمشقي كما وقع عند الطبراني، فهو مجهول، وعند البيهقى من حديث جابر: **صلاة في المسجد الحرام مائة الف صلاة، وصلاة في مسجدي ألف صلاة، وفي بيت المقدس خمسمائة صلاة**، وعند الطبراني في الكبير من حديث أبي الدرداء مثله إلا انه قال: **الصلاة**.. وفي الحلية لأبي نعيم من حديث أنس: **الصلاة في المسجد الحرام مائة ألف صلاة، والصلاة في مسجدي عشرة الأف صلاة، والصلاة في مسجد الرباطات ألف صلاة**. وانظر الإتحاف (٢٨٥/٤).

(١) رواه مسلم (١٣٦٣).

جگه لەم سێ شوێنەی دیاری کراوە، هەموو شوێنەکانی تر یەکسانن، مەگەر ئەو سەنگەرانەو ئەو جێگایانەی کە بەرامبەری دوژمنە، ئەوە مانەوە تیایاندا و نوێژکردن تیایاندا خێری گەورەی هەیە. هەر لەبەر ئەمەیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( **لا تُشَدُّ الرِّحالُ إلاَّ إلى ثَلاثَةِ مَساجِد، مَسجِدُ الحَرام، ومَسجِدي هذا، والمَسجِد الأَقصى**))[2]، واتە: بەمەبەستی پاداشتی زیاتر خۆی ناخاتە ڕێ بە تایبەتی بۆ یەکێ لەم سێ مزگەوتە نەبێت، مزگەوتی حەرام، وە

---

(١) قال العراقي رواه الترمذي(٣٩١٧) وابن ماجة (٣١١٢).من حديث ابن عمر وقال الترمذي حسن صحيح اهـ قال الزبيدي٢٨٥/٤: ورواه أحمد (٥٤١٤) كذلك بسند رجاله رجال الصحيح خلا عبد الله بن عكرمة، ولم يتكلم فيه أحد بسوء، قاله الهيثمي وكذا رواه ابن أبي شيبه في المصنف٤٠٥/٦(٣٢٤٢)، وابن حبان في صحيحه(٥٧/٩(٣٧٤١). والبيهقي في شعب الإيمان(٤٩٨/٣(٤١٨٥)، ولفظهم كلهم: **من استطاع ان يموت بالمدينة فليمت بها فاني اشفع لمن يموت بها.** والأقرب إلى سياق المصنف حديث صُميتة الليثية : **من استطاع منكم أن يموت بالمدينة، فليمت فإنه لن يموت بها أحد إلا كنت له شهيدا أو شفيعا يوم القيامة**، هكذا رواه الطبراني في الكبير٣٣١/٢٤(٨٢٣)، والبيهقي في الشعب(٤٩٨/٣(٤١٨٤)، وروى مثل ذلك عن سُبعية الأسلمية، ورواه الطبراني خاصة (٣٣٢/٢٤(٣٧٤٢)، من حديث تيمية من ثقيف كانت عند رسول الله صلى الله عليه وسلم وعند ابن حبان في صحيحه (٥٨/٩(٣٧٤٢)عن صفية المذكورة بلفظ : **من استطاع منكم أن لا يَموت إلا بالمدينة فليمت بها، فانه من يمت بها تشفع وتشهد له.**

(٢)الحديث متفق عليه من حديث أبي هريرة وأبي سعيد اهـ البخاري(١١٨٩) ومسلم(١٣٩٧). وە ئیمامی موسلیم لە ڕێگەی زوهەریەوە ڕیوایەتی کردووە: **تشدُّ الرِّحالُ إلى ثلاثَةِ مَساجِد**، بەبێ ئەوەی لە صیغەکەدا نەفی و ئیستیسنای تێدا بێت، واتە: سەفەر ناکات بۆ مزگەوتێك کە نوێژی تیا بکات مەگەر بۆ ئەم سێ مزگەوتە، نەك ئەوەی کە هەر نابێت سەفەر بکات، وە بەلای جمهوری زانایانەوە ئەو نەهییە بۆ تەنزیهە، نەك بۆ تەحریم، واتە واباشترە وا نەیکات، نەك حەرامە ئەگەر بچێت بۆ مزگەوتێکی تر، وەك لەمەودوا باسی دێت.. بنوارە: إتحاف السادة المتقين(٢٨٥/٤).

ئەم مزگەوتەی من، وە مزگەوتی‌و ئەقصا. وە هەندێك لە زانایان ئەم فەرموودەیان بەبەڵگە هێناوەتەوە كە لەخەڵكی قەدەغە دەكەن سەردانی زیارەتگاو قەبرستان و گۆڕی زاناو صاڵحان بكات، ئەوەی من بۆم ڕوون بووەتەوە فەرمانەكە بەم شێوەیە، زیارەتی ئەو جێگایانە فرمانی پێدراوە، نەك دروست نەبێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((كنتُ نَهَيتُكُم عَن زِيارةِ القُبُورِ فَزُورُوهَا، ولاَ تَقولُوا هُجُراً))[1].

واتە: من كاتی خۆی ڕێگەم لێدەگرتن كە زیارەت و سەردانی گۆڕستان و قەبرەكان بكەن، بێداربېنەوە، ئێستا زیارەتیان بكەن و قسەی ناشیرین و خراپیش مەكەن، كە پێچەوانەی بیركردنەوەو پەندوەرگرتن و ئامۆژگاری پەیداكردن بێت لەو سەردانانەتاندا.

فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ تەنها بۆ مزگەوتەكانە، بەهیچ شێوەیەك باسی مەشاهیدو زیارەتگاكانی تێدا نییە، چونكە مزگەوتەكان دوای ئەم سێ مزگەوتەی باسیان كرا یەكسانن، هەموو شارێكیش مزگەوتی تێدایە.

كەواتە هیچ واتایەك نابەخشێت كە بچیت بۆ مزگەوتێكی تر، بەڵام زیارەتگاكان.. یەكسان نین، بەڵكوو بەرەكەتی هەریەكەیان بە پێی پلەو پایەو نزیكییانە لە خوداوە، ﷻ[2].

---

(١) رواه مسلم(٩٧٧)، وأورده المصنف هنا بزيادة : **ولا تقولوا هُجراً**، ورواه النسائي( ٨٩/٤).

(٢) لە هەموو چەرخ و زەمانێكدا كەسانێك پەیدادەبن، دەبنە ڕێگری خێرو چاكە و بە ناوی موحارەبەی بیدعەوە، هەرچی كاری باش و سوننەتی سەلەفی صاڵیحین و، فەرموودەی دۆستانی خودا هەیە ڕەد دەكەنەوە، خۆ ناتوانن بە كەسێكی وەك ئیمامی غەزالی بڵێن: خوێندەوار نیە، بەڵام گوێی لێ ناگرن، وەك دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ نەیفەرمووە زیارەتی جێگاكانی تر مەكەن، فەرموویەتی: بە تایبەتی بۆ غەیری ئەم سێ مزگەوتە مەچن. یەكێ لەوانە مزگەوتەكەی خۆیەتی، كە دەفەرموێت: مزگەوتی من، خۆ

بەڵێ ئەگەر لە جێگایەکدا بێت مزگەوتی تێدا نەبێت، ئەوە دەبێت بۆی بڕوات و بەتەواوی لێی نزیك ببێتەوەو، ماڵەکەیشی بگوێزێتەوە بۆ لای.

بەڕاستی نازانم: خاوەنی ئەو ڕایانەی کە ڕێگری زیارەت دەکەن، ئایا ڕێگەش دەگرن لە زیارەتی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەرەکان (وەك(حەزرەتی) ئیبراهیم و موساو عیساو یەحیاو ئەوانی تر؟! (صەلات و سەلامی خودایان لەسەر) خۆ ئەو ڕێگریانە لە ئەوپەڕی محاڵ و نادروستیدایە، ئەگەر گریمان دروستیش بێت ئەوا گۆڕی پێغەمبەران(صەلات و سەلامی خودایان لەسەر)و زانایان و صاڵحان لە جێگەی خۆیدا مەبەستێکە، کە زیارەتکاران لە نزیکی ئەوانەوە بە مەرامی خێری خۆیان دەگەن، دوور نیە کە مەبەست لەو خۆکۆکردنەوەو گەشت کردنە ئەوە بێت: کە سوودێك بە گیان و ڕۆحی بگەیێنێت، وەك چۆن زیارەتی زانایان لە حاڵی ژیانیاندا خاڵی نیە لە مەرامی پەسەندو شیاو، ئەمە لە بارەی ئەصڵی سەفەرەکەوەیە بۆ لای ئەو مقام و گۆڕستانە پیرۆزانە.

---

نەیفەرمووە ماڵەکەی من، یان مەرقەدەکەی من، فەرموویەتی مزگەوتەکەی من، سەیر ئەوەیە نەزانەکان، دەڵێن زیارەتی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ درووست نیە، یان نابێ ڕوی تێ بکەیت و دۆعا لە حزوری دا بکەیت، نازانن کە فەزڵی مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ئەوەیە، کە نیسبەتی وەلای پێغەمبەر دراوە، ئایا دەگونجێت مزگەوتەکەی ڕێز لێگیراو بێت، بەڵام هیچ ڕێزو بەرەکەتێك بۆ خۆی بڕیار نەدرێت؟! قازی عیاض دەفەرموێت:

کۆی زانایانی ئیسلام ڕایان وایە کە ئەو جێگەی (حەزرەتی) پێغەمبەری تێدا نێژراوە ﷺ لەهەموو پارچەکانی سەر زەوی پیرۆزترو گەورەترە، بە کەعبەیشەوە، لە پاشان مەککەو مەدینە لە هەموو جێگاکانی تر گەورەترە، ثم اختلفوا في أيهما أفضل،فذهب عمر (رضي الله عنه) وبعض الصحابة إلى تفضيل المدينة وقول مالك وأكثر المدنيين،وذهب أهل الكوفة إلي تفضيل مكة، وبه قال ابن حبيب وابن وهب من أصحاب مالك واليه ذهب الشافعي، ولكل دليل والله أعلم الإتحاف (٢٨٦/٤).

له بارەی مانەوەیشی: چاکتر وایە موریدی ڕێگای ئاخیرەت لە جێگەیەکدا بگیرسێتەوە و خەریکی کاری خۆی بێت، ئەگەر مەبەستی گەشتەکەی سوودی زانست نەبێت، ئەگەر مەبەستی زانست بوو، وە لەلای خۆیان دەستی نەدەکەوت، ئەوا بگەڕێ بە شوێن نزیکترین جێگەدا، کە کەمترین هۆکاری دەرکەوتنی تێدابێت و، دینەکەیشی زیاتر سەلامەت بێت، وە دڵیشی بەو شێوە بێت کە بیپەرژێتە سەر ئیصلاحی حاڵی خۆی، وە بشتوانێت بە ئاسانترین شێوە بەندایەتی بکات، ئەمانە باشترینی ئەو بابەتانەن کە کەڵکی لێ وەربگرێت، لە هەر جێگەیەکدا ئەمانەی دەستکەوت با تیایدا جێگیر بێت، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(( **البلادُ بلادُ اللهِ، والخلقُ عبادُ اللهِ، فأيُّ موضِعٍ رأيتُ فيهِ رِفقاً، فأقِمْ واحمدِ اللهَ تعالى**))[1]، وڵات وڵاتی خودایە و، خەڵکیش هەموو بەندەی پەروەردگارن، لەهەر جێگەیەکدا لە هەڵس و کەوتی خەڵکی دا نەرم ونیانیت بینی، تیایدا بمێنەوە و ، سوپاس و ستایشی خودایشی لەسەر بکە.

وە لە فەرموودەدا هاتووە: ((**مَنْ رُزِقَ مِن شيْءٍ فَلْيَلزَمهُ، ومَن جُعِلَت مَعيشَتهُ في شَيءٍ، فَلا يَنتَقِلُ عَنهُ حتى يَتَغَيَّرَ عَلَيهِ**))[2]، هەرکەسێك لە هەرچییەك ڕۆزی و ژیانی خۆیی مسەوگەر کرد، با دەستی پێوە بگرێت و، ئەوەندە کارو کەسابەت نەگۆڕێت، وە هەرکەسێك ژیانی کەوتە سەر شتێکەوە، با پیشەکەی خۆی نەگۆڕێت تا حاڵی دەگۆڕێت و ژیانی تێك دەچێ.

---

(١) رواه أحمد في (مسنده) (١٦٦/١).

(٢) أوله عند ابن ماجه(٢١٤٧) بلفظ: مَن أصاب مِن شيءٍ، فليَلزَمهُ، وتمامه عنده كذلك: **عن نافع بن عطاء قال: كنت أجهز إلى الشام وإلى مصر، فجهزت إلى العراق، فأتيت عائشة أم المؤمنين فقلت لها: يا أم المؤمنين: كنت أجهز إلى الشام، فجهزت إلى العراق، فقالت لاتفعل، مالكَ ولِمتجَرِكَ؟! فإني سمعتُ رسولَ اللهِ ﷺ يقول: إذا سببَ اللهُ لأحَدِكم رِزقا،مِن وجهٍ، فَلا يَدعَهُ حتى يتَغيَّرَ لَهُ أو يَتنَكرَ لَهُ.**

ئەو کاتە با ئەمیش پیشەکەی بگۆڕێت.

هەروەها ئەبونەعیم فەرموویەتی:

سوفیانی ئەوریم بینی (خودای لێخۆش بێت) ئەو دیزەکەی وەك جانتا وابوو دابوی بەسەر شانیداو دەمەکەی گرتبوو بەدەستیەوەو دەڕۆیشت، وتم: بۆ کوێ دەڕۆیت ئەی باوکی عەبدوڵلا؟ فەرمووی: ئەچم بۆ شارێك ئەم دیزەیەم بە دیرهەمێك پڕ بکەم.

واتەشارێك ژیانی تێدا زەحمەت نەبێت و بمپەرژێتەوە سەر کارەکانم.

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: هەواڵیان پێداوم لە شارێکدا کار ئاسانی هەیە، دەمەوێت تیایدا بمێنمەوە، وتی:

جا ئاوا دەکەیت و دوور دەکەویتەوە ئەی باوکی عەبدوڵلا؟! فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر بیستت لە شارێکدا ئاسانکاری هەیە و، شتەکان گران ناکەون لەسەرت، ئەوا ڕووی تێ بکە، بۆ دینەکەیشت باشترەو، خەم و مەراقی ژیانیشت کەمتر دەکاتەوە.[1]

هەروەها دەیفەرموو:

زەمانێکی خراپە تێی کەوتوین، ئەوانەش کەسەری خۆیان کز کردووە،

---

(١) أبو نعيم هو الفضل بن دكين. والخبر في القوت(٢/١٢٣) لەبەر ئەوەی ئیمامی غەزالی باسی (حەزرەتی) سوفیانی ئەوری نەکرد لە کاتی باسی چوار ئیمامەکەدا. بۆیە لێرەوە بەڵێنەکەی دەهێنێتە جێ و ناوە ناوە بە چڕی باسی دەکات.وەك ئەبوطالیبی مەکیش دەفەرموێت: لە قوت القلوب دا: کاتی خۆی موریدو ڕێبوارانی ڕێگای خوداناسی، ئەم شارەوشار دەگەڕان بە دوای خواناساندا تا بەر نەزەرو فیوزاتی ئەوانە بکەوتنایە، وە فێری ئەدەب و مەعریفەت ببونایە لێیانەوە، وە ئەوانەش بە دوای زانستدا دەگەڕان، کۆڵ بەکۆڵ و کتێب بەسەر شانەوە دەگەڕان بە دوای دەرسی بە هێزو زانای ناودارو زانستی ڕاستەقینەدا. الإتحاف ( ٤/ ٢٨٨) .

ئەمین نین لە حاڵی خۆیان، جا ئەبێت حاڵی ئەوانەی ناوبانگێکیان هەیە چۆن بێت؟! ئەمە ئەو زەمانەیە خۆت بگوازیتەوە لەم گوند بۆ ئەو گوند، تا بتوانیت دینەکەت ڕزگار بکەیت لەم هەموو فیتنەی لە ناودایە.[1]،

وە دەگێڕنەوە لە سوفیانەوە (خودای لێخۆش بێت) کە فەرموویەتی:

وەڵلاهی نازانم چ وڵات و شارێك دڵ تیایدا ئارامترە، وتیان: خۆراسان، فەرمووی: چەندەها مەزهەب و ڕای جیاوازو خراپیان هەیە، وتیان: کەواتە وڵاتی شام، فەرمووی: لەوێ بە ئەنگوستی تایبەتی هێمات بۆ دەکرێت و دەناسرێیت و، شۆرەت پەیدادەکەیت، وتیان: ئەی عێراق، فەرمووی: شاری دەسەڵاتدار و ملهوڕەکانە، وتیان: ئەی مەکە؟ فەرمووی: مەککە کیسەکەیشت و خۆیشت دەتوێنێتەوە.[2]

پیاوێکی غەریب و نامۆ پێی وت:

بڕیارم داوە لەمەککەدا بمێنمەوەو دراوسێی ماڵی خودا بم، چ وەصێتێکت هەیە بۆم؟ فەرمووی: وەصێتت بۆ دەکەم کە ئەم سێ خەصڵەتەت تێدابێت: لە ڕیزی یەکەمدا نوێژ مەکە، ڕەفاقەت و هاوڕێیەتی قورەیشی مەکە، ئەگەر چاکەیەکیشت کرد ئاشکرای مەکە.[3]،

بۆیە ڕیزی یەکەمی پێ ناخۆش بوو، تا ناوبانگ دەرنەکات، چونکە ئەگەر دیار نەبوو دەگەڕێن بەدوایدا، وە زیاتر لە خۆجوانکردن و ڕیاکاری و خۆ دەرخستنەوە نزیکی دەکاتەوە.

---

(١) قوت القلوب ( ١٢٣/٢).

(٢) مەبەستی لە گرانی کاڵاکان و زیادە مەسرەفییە، چونکە ئەو کاتە هیچ بەروبوومێکی بژێوی تێدا نەبوو، وە بە هۆی موجاهەدەی نەفس و طاعەتیشەوە جەستەی دەتوێتەوە، بنوارە: قوت القلوب( ١٢٢/٢).

(٣) قوت القلوب (١٢٢/٢). وانظر الإتحاف( ٢٨٧/٤ــــ٢٨٨).

# ناوبڕی دووهەم

## باسی مەرجەکانی واجب بوونی حەج و، دروست بوونی و ئەرکانەکانی و، پێداویستییەکانی و، کارە قەدەغراوەکانی.

## باسی مەرجەکانی حەجکردن

### مەرجەکانی:

دوومەرجمان هەیە بۆ دروستی حەجکردن: کات و موسوڵمان بوون.

کەواتە حەجکردنی منداڵ دروستە، وە ئەگەر فامی کردبێتەوە بەخۆی ئیحرامی خۆی دەبەستێت، ئەینا سەرپەرشتیارەکەی ئیحرامی بۆ دەپۆشێت و نیەتی بۆ دەهێنێت، وە ئەوەی خۆی لە حەجدا دەیکات، بە منداڵەکەیشی دەکات، لە طەواف و صەفاو مەروە و ئەوانی تر.

**کاتەکەیشی:** مانگی شەووال و ذوالقعدة و، نۆی یەکەمی مانگی ذي الحجة یە، تا هەڵاتنی خۆری ڕۆژی یەکەمی قوربان.

کەواتە ئەوەی لە کاتێکی تردا ئیحرامی بەست بە نیەتی حەج کردن، ئەوا بە عومرە دادەمەزرێت. وە هەموو ساڵەکەیش وەختە بۆ ئیحرام بەستن بە نیەتی عومرە، بەڵام ئەوەی خەریکی مەناسیك و عیبادەتی حەج بوو لە ڕۆژانی مانەوەیدا لە(مینا)، ئەوە نابێت ئیحرام بە عومرە ببەستێت، چونکە ناتوانێت کارەکەی تەواو بکات، کە خۆی سەرقاڵی مەناسیکی حەجەو لە مینادایە.

**ئەو مەرجانەی کە حەجەکەی بۆ دەکەوێتە بری ئەو حەجە فەرزەی کە لە ئیسلامدا لەسەری پێویست کراوە، پێنج مەرجن:**

**موسوڵمان بوون و، ئازادی و، باڵغ بوون و، ئاقڵی و، کاتەکەی:**

ئەگەر منداڵێك و کۆیلەیەك ئیحرامیان بەست و، کۆیلەکە ئازاد کراوەو منداڵەکەش لە ڕۆژی عەرەفەدا باڵغ بوو، ئەوا لە بریتی حەجە فەرزەکەی

ئیسلام بۆیان دەژمێررێت، چونکە حەج بریتییە لە عەرەفە. ((**الحج عرفة**))[1]،

وە هیچ خوێنێکیشیان لەسەر نیە، جگە لە کاورێك نەبێت، وە هەمان ئەم مەرجانە پێویستن، کە ئەو عومرەی دەیکات لە بریتی عومرەی فەرزی ئیسلامی لەسەری بکەوێت، تەنا کاتەکە نەبێت، کە عومرە لەهەموو کاتی ساڵدا دەکرێت.

## بە چ مەرجێك حەجەکەی بە سوننەت بۆ دەنوسرێت؟

کەسێکی باڵغی ئاقڵ کە بە قەرزاری نەمابێت، واتە حەجی فەرزی کردبێت و پێشتر ئەنجامی دابێت. یان ئەگەر لە حاڵی کۆیلایەتیدا حەجی کردبێت و بەتاڵ بووبێتەوە، ئەوە دوای ئازاد بوونی دەبێت بیگێڕێتەوەو، لە پاشان حەجە فەرزەکەش بکاتەوە، یان کەسێك نەزرێکی لەسەر بێت، دەبێ لە پێشەوە فەرزەکە بکات، لەپاشان نەزرەکە، یان حەجێکی سوننەت، کە لەکاتی حەجەکەدا بۆی تەواو نەکرابێت، تازە دەبێت دوای حەجە فەرزەکە جارێکی تر ئەنجامی بدات و بە تەواوی بیکات، ئینجا بۆی دروستە لە جیاتی یەکێکی تر حەج بکات. ئەم ڕیزبەندییە پێویستە، ئەگەر پێچەوانەی ئەمەش نیەتی هێنابێت، دەبێت هەر بەم شێوە ئەنجامی بدات.

**وە مەرجەکانی لازم بوون و پێویست بوونی حەج، لەسەری پێنج مەرجە:**
**موسوڵمان بوون وباڵغی و ئاقڵی و سەربەستی و توانای حەج کردن.**

ئەو کەسەی فەرزی حەجی لەسەر پێویست بووبێت، فەرزی عومرەیشی لەسەر پێویستە، وە هەرکەسێك ویستی بچێتە ناو مەککەوە بۆ زیارەت، یان بە

---

(١)وقد روي أحمد فى مسنده(١٨٢٩٧) وأبوداود (١٩٤٩)، والترمذي(٨٨٩)، والنسائي(٣٠١٦)، وابن ماجه((٣٠١٥)، والحاكم في المستدرك(٦٣٥/١(١٧٠٣)، والبيهقي في السنن الكبرى(١٧٣/٥(٩٥٩٣)، من حديث عبد الرحمن بن يعمر: **الحج عرفة، من جاء قبل طلوع الفجر من ليلة جمع فقد أدرك الحج**، الحديث....

نیەتی بازرگانی، بەڵام کەسێك نەبێت کە زۆر پێویستی بەچوونەناو مەککە هەبێت، وەك ئەوانەی ماسی گرەکان، یان پوش وپەڵاش دەکێشن، لەبەر ئەوەی ناکرێت هەموو جارێك ئیحرام ببەستێت، لەسەریان پێویست نابێت. هەرچەندێك ئەمانە بچنە ناو مەککەوە، پێویستە بە پێی فەرموودەیەکی زانایان ئیحرام ببەستن و لەدوای تەواو کردنی حەج یان عومرەکەیەوە خۆیان بکەنەوە.

## بابەتی توانایی دوو جۆرە:

**یەکەمیان**: توانای دەست پێکردنی هەبێت، ئەمەش بە چەند هۆکارێك:

یان مەرجەکە ڕو لەنەفسی خۆی دەکات، وەك ئەوەی کە تەندروست بێت.

یان پەیوەندی بە ڕێگەوبانەوە هەیە، کە دەبێت ڕێگاکە ئەمین بێت و وشکانی و بێ گرێ و گۆڵ بێت، وە دەریایەکی ترسناکی لەبەردەمدا نەبێت، وە دوژمنێکی سەرسەختی بەدەسەڵاتیشی لە پێش نەبێت.

**یان تواناکە پەیوەندی بە ماڵ و داراییەوە هەبێت:**

بەوەی کە مەسرەفی ڕۆشتن و هاتنەوەی هەبێت، تا دەگەڕێتەوە نیشتیمانی خۆی، ماڵ و منداڵی هەبێت یان نەیبێت، چونکە دوورکەوتنەوە لە نیشتیمان ئاسان نیەو زۆر سەختە، وە دەبێت مەسرەف و بژێوی هەموو ئەوانەشی هەبێت لەو ماوەدا کەدەڕوات، کە پێویستە لەسەری بیانژێنێت.

وە دەبێت ئەوەندەی هەبێت، کە توانای بژاردنەوەی قەرزەکانی هەبێت، وە بتوانێت خۆی لەسەر وڵاخ و سواری ڕابگرێت و هەیشی بێت، یان بتوانێت بەکرێ بیگرێت، لەگەڵ (هۆدج) کەژاوەکەیدا کە لە گەرما و ناڕەحەتی دەیپارێزێت، یان تەنها وشترێکی بار هەڵگر بە کرێ بگرێت، کە پێداویستییەکانی خۆیی لەسەر دابنێت و، بشتوانێت و، خۆی ڕابگرێت لەسەری.

**جۆری دووهەم:** ئەوکەسەی کە خۆی نەتوانێت و بەهۆی ماڵەکەیەوە بتوانێت یەکێك بەکرێ بگرێت، دوای ئەوەی ئەو کەسە حەجی فەرزی بۆ خۆی بەجێ هێنا بێت، دەتوانێت بیگرێت بە کرێ و لەم جۆرەدا ئەوەندەی بەسە کە

بژێوی ئەو کەسەیەی پێ دابین بکرێت. کە سواری وشترێکی باربەری بکات و خۆیشی سواری وشترەکە ببێت یان نە؟

ئەگەر کوڕەکەی وتی: خۆم حەجت بۆ دەکەم، ئەوە باوکەکە دەبێتە کەسێکی خاوەن تەوانا، بەڵام ئەگەر بڵێت من پارەت بۆ دەدەم، ئەوە نابێت، چونکە خزمەتکردنی کوڕ بۆ باوکی، جێگای شانازییە بۆ کوڕ، بەڵام خزمەتکرنی بە ماڵ، دەبێتە منەتێکی زیادە، لەوانەیە باوکی نەتوانێت بچێتە ژێر ئەو مننەتە.

وە ئەوەی توانای هەبوو پێویستە حەج بکات، وە بۆی هەیە دوای بخات، بەڵام دواخستنەکەی مەترسیدارە، ئەگەر بۆی کرا، با لە کۆتایی تەمەنیشیدا بۆی ئەنجامدرابێت، ئەوە فەرزەکەی لەسەر نامێنێت، بەڵام ئەگەر مردو ئەنجامی نەدابوو، ئەوە بە تاوانباری و یاخی بوونەوە دەگات بە حزوری خودا.

وە دەبێ لە میراتەکەی حەجی بۆ بکرێت، وەك بژاردنەوەی هەموو قەرزەکانی تری با وەصێتیشی نەکردبێت.

بەڵام ئەگەر ساڵێك توانی حەج بکات و، لەگەڵ خەڵکەکەدا دەرنەچوو بۆ حەج کردن و، پێش ئەوەی ئەوان حەجەکەیان تەواو بکەن، هەر لەو ساڵەدا ماڵەکەی نەماو لە دەستی چوو، لە پاشان مرد، ئەوە دەگات بەخوداو قەرزاریش نابێت، بەڵام ئەوەی ماڵی هەبووبێت و، حەجیشی نەکردبێت و بمرێت، ئەوە ڕوبەڕووی لێپرسینەوەیەکی سەخت دەبێتەوە لە حزوری خوادا، وەك (حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ویستم فەرمانێك بنووسم بۆ وڵات و شارەکان، بەوەی جیزیەو سەرانە دابنێم لەسەر هەموو ئەوانەی کە توانای حەجیان هەیە و نەیانکردووە[1].

هەروەها سەعیدی کوڕی جوبەیر و ئیبراهیمی نەخەعی و موجاهید و طاووس دەفەرموون: ئەگەر یەکێك بناسم کە توانای حەجی بووەو، پێش ئەوەی

---

(١) رواه اللاكلائي في (إعتقاد أهل السنة) ٩٢٤/٢.

حەج بکات مردووە، ئەوا نوێژی لەسەر ناکەم[1].

وە یەکێك لە زانایان دراوسێیەکی دەوڵەمەندی هەبوو، پێش ئەوەی حەج بکات مرد، ئەویش نوێژی لەسەر نەکرد[2].

عەبدوڵلای کوڕی عەباس هەموو کاتێك دەیفەرموو: ئەوەی بمرێت و زەکاتی نەدابێت و، حەجیشی نەکردبێت، داوا دەکات کە خودا ڕێگەی گەڕانەوەی بدات بۆ دونیا، وە ئەم فەرموودەی خودای گەورەی دەخوێنەوە کە فەرموویەتی: ﴿قَالَ رَبِّ ارجِعُونِ،لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ﴾( المؤمنون/٩٩)

خودایە بمگێڕەوە بۆ ئەوەی کردەوەی چاکە بکەم. لەو ماڵەی بەجێم هێشتووە، کە مەبەستی حەج کردنە[3]، (خودایش ڕێگەی پێ نادات).

**ئەو ئەرکانانەی کە حەج بەبێ ئەوان تەواو نابێت؛ پێنج ڕوکنن:**

**ئیحرام و طەواف، وە هاتوچۆی نێوانی صەفاو مەروەو، مانەوەو وەستان لە عەرەفەدا و، بڕینی مووی سەر**

(لەسەر قەولێك کە بەڕوکنی داناوەو قەولێکیش بە واجب)، وە ئەرکانی عومرەیش هەموویانە جگە لە وەستانی عەرەفە نەبێت.

## ئەو واجبانەی بە سەربڕینی حەیوانێك پڕدەکرێنەوە؛ شەشن:

بەستنی ئیحرام لە میقاتەوە کە بۆیان دیاری کراوە. ئەوەی بە بەبەرگی خۆیەوە ئەو جێگەی تێ پەڕاند، ئەوە لەسەریەتی کاوڕێك سەر ببڕێت، ئەوەیش کە بەردەکان توڕنادات، لە ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربان، هەموو یەکڕان کە دەبێت خوێنێکی بۆ بڕێژێت، وە مانەوەی حاجی لە ڕۆژی عەرەفە، تا خۆرئاوابوون و، مانەوەی شەو لە موزدەلیفەو، مانەوەی شەو تابەیانی لە

---

(١) رواه إبن أبي شيبة في المصنف (١٤٦٦٦)،(١٤٦٦٨)، وحكاها في القوت ( ١١٤/٢).

(٢) قوت القلوب ( ١١٤/٢).

(٣) رواه الترمذي(٣٣١٦).

مینا، وه تەوافی خواحافیزی. بۆ نەکردنی هەریەکێك لەم چوار واجبەیە، بە پێی یەکێك لەو دوو قەولەی لەسەری هاتووه، دە بێت خوێنێك برێژێت، تا پینەی کەمییەکی بۆ بکاتەوە، لە فەرموودەی دووهەمدا هاتووه:

کە تەنها واباشە کە خوێنیان بۆ برێژێت، دەنا پێویست نیە لەسەری.

## شێوەکانی کردنی حەج و عومرە، بە سێ شێوەیە:

**یەکەم: (ئیفراد) واتە: بە تاکی:** کە ئەمەیان خێری زیاترە، بەوەی کە تەنها نیەتی حەج بهێنێت و کاتێك کە لێبوویەوە بە تەواوی، بچێتە دەرەوەی مەککە بۆ ئیحرام بەستن، بە نیەتی عومرەو تەواوی بکات، وە باشترین شوێن کە ئیحرامی تیا ببەستێت، جیعرانە یە،[1]، لەپاشان (تەنعیم)ە، لە پاشان (حودەیبییە)، ئەوەی بە نیەتی ئیفراد ئیحرام ببەستێت، هیچ خوێنێکی لەسەر نیە، مەگەر بە خۆبەخشی بیکات.

**دووهەم: پێکەوەبوون(قیران):** ئەوەیە کە هەردوکیان بەیەکەوە کۆ بکاتەوە، وە بلێت: (**لَبَّيْكَ بِحَجَّةٍ وَعُمرَةٍ مَعاً**) واتە: ئامادەی گوێڕایەڵیتم، ئەوا نیەتم هێنا ئیحرام ببەستم بە حەج و عومرە پێکەوە، ئەوکاتە ئیحرامەکەی بە هەردوکیان دەبێت، وە تەنها کارەکانی حەج بکات واجباتی لەسەر نامێنێت، چونکە ئەرکان و پێویستییەکانی عومرە، لە ژێر ئەرکانی حەجدا هەمووی جێی دەبێتەوە، وەك چۆن دەستنوێژ لە ناو کارەکانی وسڵ و خۆشۆردنی جەنابەتدا

---

(١) جیعرانە، کە لەمیانی (مەککەو طائف دایە)(حەوت میل لە مەککەوە دوورە)، تەنعیم: (تەنهاچوار میل لە کەعبەوە دوورە، کە ناسراوە بە مزگەوتی (حەزرەتی) عائیشە،(خودای لێ ڕازی بێت)، حودەیبییە: ناوی بیرێکە لە نزیك مەککەوە، لەسەر ڕێگای جیددە، لە قۆناغێك کەمترە، ئیمامی ڕافیعی دەفەرموێت: ئەوەی خێری زیاتر بێت جیعرانەیە، لە پاشان تەنعیم، ئینجا حودەیبییە، ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت: ئەم ڕایە تەواوە، وە بەلای حەنەفییەکانەوە تەنعیم خێری زیاترە، الإتحاف (٤ /٢٨٩)

جێگەی دەبێتەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە، ئەگەر لە پێش وەستانی عەرەفە، تەواف و صەفاو مەروەی کرد، ئەوە صەفاو مەروەکەی بۆ هەردوو عیبادەتەکە بۆی دەژمێررێت، بەڵام تەوافەکەی بۆ ناژمێررێت، چونکە مەرجی تەوافی فەرز ئەوەیە کە: لە دوای وەستانی عەرەفەوە بیکات، وە ئەو کەسەی هەردوو مەناسیکەکە بەیەك نیەت کۆیان دەکاتەوەو دەیانکات ، پێویستە لەسەری کە کاورێك سەرببڕێت، مەگەر ئەو کەسە خەڵکی مەککە بێت، ئەوە هیچی لەسەر نیە، چونکە میقاتەکەی خۆی بە جێ نەهێڵاوە تا خوێنی لەسەر واجب ببێت، چونکە میقاتی ئەو مەککە خۆیەتی.

**سێیەم:** (تەمەتتوع) واتە: بە نیەتی چێژوەرگرتن، ئەمەش بەوە دەبێت کە ئیحرامی بەستبێت لە میقاتی وڵاتەکەی خۆیەوە بە نیەتی عومرە، وە دوای تەواو کردنی عومرەکەی، خۆی بکاتەوەو، هەموو ئەو شتانەی بۆ کەسێك لە ئیحرامدا حەرام بێت، بۆی حەڵاڵ دەبێت و، دەتوانێت چێژیان لێ وەربگرێت، تا کاتی حەج دێتە پێشەوە، لە پاشان ئیحرام بە حەج دەبەستێت.

## وە ئەو کەسە نابێت بە (موتەمەتتیع) بە پێنج مەرج نەبێت:

**یەکەمیان:** دەبێ لە ئامادەبوانی مزگەوتی حەرام نەبێت، چونکە ئەهلی مەکە میقاتەکەیان ئەصڵی مەککەیە، بە ئەندازەی قۆناغێك لە مزگەوتی حەرامەوە دوور نەبن، ئەوە ئەهلی مەککەن، (واتە مسافەی کورت کردنەوەی نوێژ).

**دووهەم:** دەبێ نیەتی عومرەکە پێش حەجەکە بکات.

**سێیەم:** دەبێت عومرەکەی لە مانگەکانی حەجدا بێت.

**چوارەم:** نابێت بگەڕێتەوە بۆمیقات (ئەو شوێنەی دیاریکراوە ئیحرامی تیا ببەستێت. یان بەو ئەندازەیە بگەڕێتەوە دواوەو دووربکەوێتەوە.

**پێنجەم:** دەبێت حەج و عومرەکەی بۆ یەك کەس بێت.

ئەگەر ئەم صیفەتانەی تیا هاتە جێ، ئەوە دەبێت بە کەسێکی (موتەمەتیع).

وه دەتوانێت دوای تەواو کردنی عومرەکەی خۆی بکاتەوەو، حەرامەکانی بۆ حەڵاڵ ببێتەوە، وە دەبێت کاوڕێکیش سەرببڕێت، ئەگەر نەیتوانی، ئەوا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێت لە کاتی ڕۆژانی حەجکردنی دا، پێش ڕۆژی قوربانی، پێکەوە بە ڕۆژوو بێت، یان جیاجیا، وە حەوت ڕۆژیش دوای گەڕانەوەی بۆ نیشتیمانی خۆی، وە ئەگەر سێ ڕۆژەکەیشی لە مەککە نەگرت، ئەوا کە گەڕایەوە، دە ڕۆژ بگرێت بەیەکەوە یان بە جیاجیا، وە بشزانە کە خوێنی ئەوانەی ئیحرام بە (قیران) دەبەستن، یان بە (تەمەتتوع) دەیبەستن هەر یەکێکە.

## ئەوانەی لە حەجدا حەرامە بیانکات: شەشن:

**یەکەم:** لەبەرکردنی کراس و دەرپێ و شەرواڵ و ،خوفف و لەسەرکردنی مێزەر.

بەڵکوو پێویستە پەشتەماڵێك بپێچێت بە جەستەیەوە، لە ناوك بەرەو خواری داپۆشێت، وە بە پەشتەماڵێکی تر پشت و شانەکانی پێ داپۆشێت، وە جووتێك و سەرپا لە پێبکات، ئەگەر سەرپایی دەس نەکەوت با پارچەیەك وەك خوف، تەنها ژێر پێکانی داپۆشێت تا خواری قولەپێی، ئەگەر پەشتەماڵی دەسنەدەکەوت (نەبوو، یان نەیبوو بیکڕێت،) ئەوا با دەرپێیەك لە پێبکات، وە پشتوێن و نیطاقێك کە پشتی خۆیی پێ توند بکات، یان لە ژێر سێبەری ئەو بارهەڵگرانەی کەژاوەیان بەسەرەوەیە، یان هەرچەترێك کە لە گەرما بیپارێزێت، بەڵام نابێت سەری داپۆشێت، چونکە ئیحرامی پیاو لەسەرپایەتی، کە داپۆشی ئەوە شکاندوویەتی.

وە ئافرەتیش بۆی هەیە بە هەموو بەرگی خۆیەوە بێت، کە دووراویش بێت ئاساییە، وە نابێت ڕوخسارو ناولەپی داپۆشێت، بە دەستەوانەو پەچەو هەرجۆرێکی تر کە پێیەوە بلکێت، چونکە ئیحرامی ئافرەتیش لە ڕوخساریایەتی.

**دووهەم:** بەکارهێنانی بۆنخۆشی: دەبێ خۆی لەهەموو ئەوشتانە بپارێزێت کە داناکان بە بۆنی خۆشی دادەنێن، ئەگەر خۆی بۆنخۆشکرد یان بەرگێکی

پۆشی، بۆن و عەتری لێ درابوو، ئەوە پێویستە خوێنێك برژێت، واتە: كاوڕێك سەربڕێت.

**سێیەم:** سەرتاشین و نینۆككردن:

هەركامیان بكات، دەبێت فیدیە بدات، كە خوێنی كاوڕێكە،(ئەگەر لە سێ موو یان سێ نینۆك زیاتربوو).

وە چاو ڕشتن و چوونە ناو گەرماوو، خوێن گرتن و كەڵەشاخ گرتن و داهێنانی مووی سەرو ڕیش دروستەو هیچی لەسەر نابێت.

**چوارەم:** سەرجێكردنی(جیماع):

ئەوە پێش (تەحەللولی) یەكەم، واتە: یان ڕەجمی شەیتان یان تەوافی تەواو كردبێت، ئەوە نیوە ئیحرام شكاندنێكە، ئەوە حەجەكەی بەتاڵ دەبێتەوە، وە دەبێت وشترێكی پێنج ساڵە، یان مانگایەكی دووساڵە(چێل)، یان حەوت مەڕ یان حەوت بزن سەربڕێت، بەڵام ئەگەر دوای ئیحرام شكاندنی یەكەم بوو، ئەوە تەنها وشترێك سەردەبڕێت و، حەجەكەی بەتاڵ نابێتەوە.

**پێنجەم:** هەموو سەرەتاكانی سەرجێكردنی، وەك ماچكردن و دەستبازی و باوەش پیاكردن، كە دەستنوێژ دەشكێنێت، ئەوە حەرامەو، دەبێ كاوڕێك بدات، هەروەها ئاو هێنانەوەش، وە حەرامە نیكاح و مارەبڕین، بەڵام خوێنی نیە چونكە دانامەزرێت.

**شەشەم:** ڕاوكردن:

حەرامە لەسەریان ڕاوكـردنی نێچیر، كە گۆشتی بخورێت، یان لەنێر و مێیەك بووبێت، كە یەكێكیان حەڵاڵ بێت و ئەویان حەرام، ئەگەر نێچیرێكی كوشت، دەبێت ئاژەڵێكی هاو وێنەی ئەو بكڕێت و سەری ببڕێت، ئەگەر لە شێوەی ئەو نێچیرە كوژراوە وێنەی هەبوو، ئەوا بگەڕێ بە دوایدا و بیهێنێت و سەری ببڕێت و بیكات بە فیدیە، وە نێچیری ناو دەریا حەڵاڵەو فیدیەی ناكەوێت.

# دەروازەی دووهەم

## لە بارەی ڕێکخستنی کردەوە ئاشکراکان، لەسەرەتای سەفەری حەجەوە تا گەڕانەوەی، کە دە ڕستەی تەواوە:

## ڕستەی یەکەم:

### باسی سوننەتەکان لە کاتی دەرچوونی لە ماڵەوە تا کاتی ئیحرام بەستن. ئەمەش هەشت بابەتە:

**یەکەم: لە ماڵەوە:**

پێویستە لە ماڵەوە بە تەوبەی ڕاستەقینە دەست پێبکات، وە ستەمی لە هەرکەس کردبێت و ماڵی داگیرکردبن بۆیان بگێڕێتەوەو، قەرزەکانیان بۆ بژێرێتەوەو، بژێوی هەموو ئەوانەی نەفەقەو مەسرەفیان لەسەر پێویستە دابین بکات تا ئەو کاتەی دەگەڕێتەوە بۆ لایان. وە هەموو ئەو ئەمانەتانەی لەلای دانراوە بیانداتەوە بە خاوەنەکانیان. وە ئەوەندە ماڵی پاکی حەڵاڵ لەگەڵ خۆی هەڵبگرێت، بەشی ڕۆشتن و گەڕانەوەی بکات، بێ ئەوەی لە خۆی بگرێتەوە یان زیادە مەسرەف بکات، بەڵکوو بە شێوەیەك کە بتوانێت دەستی بڵاوبێت و خێرو چاکەی لێبکات، وە بە نەرم و نیانی لەگەڵ هاوڕێکانیدا بجوڵێتەوە و دەستگیرۆیی هەژارەکانیش بکات، وە پێش دەرچوونی لە ماڵەوە صەدەقەیەك بکات و بیبەخشێتەوە، وە وڵاخێکی سواری بەهێز بکرێت بەرگەی ڕێگا بگرێت، وە لاواز نەبێت، یان بە کرێی بگرێت، ئەگەر بە کرێی گرت:

ئەوا با بڵێ بە خاوەنەکەی کە دەیەوێت چی لەسەر بار بکات، زۆر و کەم هەمووی دەخاتە بەرچاوی، وە دەبێت ڕەزامەندی بەکرێدەرەکە وەربگرێت.

## دووهەم: لە بارەی هاوڕێی سەفەرەوە:

پێویستە بگەڕێت بەشوێن هاوڕێیەکی باشدا، حەزی بە چاکە بێت، یارمەتی دەری بێت بۆ کاری باش، ئەگەر شتێکی بیرچوو وەبیری بهێنێتەوە، وە ئەگەر بیری هاتەوە یارمەتی بدات، (نەك لەسەری گران بکات)، وە ئەگەر ترسا هانی بدات و هێوری بکاتەوە، ئەگەر بێ هێز بوو، پاڵپشتی بگرێت و هێزی بۆ پەیدا بکات، وە ئەگەر دووچاری دڵتەنگی هات، ئەوا فێری خۆڕاگری بکات.

وە پێویستە خواحافیزی لە هاوڕێکانی دەورووبەری و دراوسێکانی بکات، کە دەمێننەوە، وە داوای نزاو دوعای خێریان لێبکات، چونکە خودای گەورە فەڕو بەرەکەت دەخاتە نزاو دوعاکانیان، سوننەتیش وایە لە خواحافیزیدا بڵێت: (( **أَسْتَودِعُ اللهَ دينَكَ، وأَمانَتَكَ، وَخَواتيمَ عَمَلِكَ**))[1]،

واتە: داوام لە خودای گەورەیە: کە دین و بڕواکەت بپارێزێت، وە ماڵ و منداڵ و کردەوە چاکەکانت بپارێزێت، کە دوایین کردەوەکانتن.

وە پێغەمبەری خودا بۆ ئەوانەی دەیانویست سەفەر بکەن فەرموویەتی:

(( **في حِفظِ اللهِ وكَنَفهِ، زَوَّدكَ اللهُ بالتَّقوى، وغَفرَ ذَنبكَ، ووَجَّهَكَ بالْخَيرِ أينَما تَوجَّهتَ**))[2]، خوا بتپارێزێت و، لە ژێر سایەو چاودێری خوادابیت، بە پۆشاکی تەقوا دات بپۆشێت و بەهرەدارت بکات و، بۆ هەرکوێ دەڕۆیت ڕووە و خێرت ببات و خێر بهێنێتە ڕێگات.

## سێیەم: لە کاتی دەرچوون لە ماڵ:

پێویستە کە ویستی لە ماڵ دەربچێت: دووڕکات نوێژی(سەفەر)بکات و، لە

---

(١)رواه أبو داوود(٢٦٠٠) والترمذي(٣٤٤٣)، وابن ماجه(٢٨٢٦)، وە سوننەتە ئەوانەش خوا حافیزی لە گەشتیارەکە دەکەن ئەم دوعایانە بکەن ، لەگەڵ خوێندنەوەی (آيةَ الكُرسي)،و دووڕکاتی نوێژی سەفەر و، ئەوەش کە دەمێنێتەوە نزای زیاتر دەکات وەك باسی دەکات.

(٢) رواه الدارمي في سننه(٢٧١٣)، وهو عند الترمذي(٣٤٤٤) بغير(**في حفظ الله وكنفه**).

ڕکاتی یەکەمدا (قل یا أیها الکافرون) بخوێنێت و، لە دووهەمدا سوورەی (**ئیخلاص**)، کەتەواو بوو دەستەکانی بەرزکاتەوە لە حزوی خوادا بە ئیخلاص و صەفای دڵ و نیەتێکی ڕاستگۆیانەوە بڵێت:

**(( اللَّهُمَّ أنتَ الصَّاحِبُ في السَّفرِ، وأنتَ الخَليفَةُ في الأَهلِ والمالِ والوَلَدِ والأَصحابِ، إحفَظنا وَإِيَّاهُم مِن كُلِّ آفَةٍ وعاهَةٍ، اللَّهُمَّ: إنَّا نسأَلُكَ في مَسيرِنا هذا البِرَّ والتَّقوىَ، ومِنَ العَمَلِ ما تَرضَى. اللَّهُمَّ إنَّا نسأَلُكَ أَنْ تُطويَ لَنا الأرضَ، وتُهَوِّنَ عَلَينا السَّفرَ، وأنْ تَرزُقَنا في سَفَرِنا هذا سَلامَةَ البَدَنِ والدِّينِ والمالِ، وتَبلُغَنا حجَّ بيتِكَ وزِيارَةَ قبرِ نبيِّكَ مُحَمَّدٍ ﷺ . اللَّهُمَ إِنِّي أَعوذُ بِكَ مِن وَعثاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ المُنقَلَبِ، وَسُوءِ المَنظَرِ، في الأَهلِ والمالِ والوَلَدِ والأَصحابِ، اللَّهُم: اجعَلنا وإِيَّاهُم في جِوارِكَ، ولا تَسلُبنا وإِيَّاهُم نِعمَتَكَ، ولا تُغَيِّرْ ما بِنا وَبِهِم مِن عافِيَتِكَ))**[١].

ئەی خودایە؛ تۆ هاوڕێی بەردەوامی گەشتەکەمی، تەنها پشت و پەنام بەتۆیە، وە چاودێرو جێنشینی خانەوادە و ماڵ و منداڵ و هاوڕێکانمی، ئێمەو ئەوانیش بپارێزە لەهەموو دەردوو بەڵاو نەخۆشی و ناخۆشیەك، ئەی خودایە داوات لێدەکەم ، لەم سەفەرەدا تووشی خێرو چاکەو تەقواکاری ببین، کردارێك بکەین پێی ڕازی بیت، خودایە دووری ڕێگامان بۆ بهێنەرەوە یەك و کورتی بکەرەوە، سەفەرەکەمان بۆ ئاسان بکەو ئاگات لە ئاین و ماڵ و جەستەشمان بێت و، لەش ساغ و پارێزراومان کە، وە بمانگەێنە بەئاواتمان، حەجی ماڵەکەی تۆ بکەین و، زیارەتی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەرەکەیشت (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ بکەین. خودایە بمانپارێزە لە سەختی و نارەحەتیەکانی سەفەر، وە تووشی خەم و مەراق و دیمەنی ناخۆش و ترسناکمان مەکە لە گەڕانەوەماندا بۆ ناو ئەهل و ماڵ و منداڵ و هاوڕێکانمان،

---

(١) کان بعض من دعاء النبي ﷺ إذا أراد السفر واستوى على مرکوبه، کما في مسلم(١٣٤٣).

خودایە ئێمەو ئەوانیش بخەرە ژێر سایەی خۆتەوە، وە لە نیعمەتەکانی خۆت ئێمەو ئەوانیش بێبەش مەکە، ئەو حاڵی ژیانی پڕ لە ئاسوودەیی و لەش ساغییەشمان لێ تێك مەدە..

## چوارەم: کە گەیشتە دەرگای ماڵەکەیان: دەڵێت:

**(( باسمِ اللهِ، توَكَّلتُ علَى اللهِ، لاحَولَ ولاقُوَّةَ إلاَّ باللهِ، ربِّ أعوذُ بِكَ أنْ أَضِلَّ أَوْ أُضَلَّ، أو أَزِلَّ أَو أُزَلَّ، أَوْ أَذِلَّ أَو أُذَلَّ، أَو أَظلِمَ أَوِ أُظلَمَ، أو أَجهَلَ أَو يُجهَلَ عليَّ، اللَّهُمَّ إنّي لَم أخرُجْ أَشَراً ولاَ بَطراً، ولا رِياءً ولاَ سُمعَةً، بَلْ خَرَجتُ اتِّقاءَ سَخَطِكَ، وابتِغاءَ مَرْضاتِكَ، وَقَضاءَ فَرْضِكَ، واتِّباعَ سُنَّةِ نبيِّكَ، وَشَوقاً إلى لِقائِكَ))**

تەنها بە ناوی خوداوە، پشتم بە خودا بەستووەو هیچ کارو فرمان و توانایەك ناکرێت بە بێ یارمەتی دانی خودا، ئەی پەروەردگار: من پەنات پێدەگرم کەخەڵکی سەرگەردان بکەم، یان سەرگەردانم بکەن، یان کەسانێك بە هەڵەدا ببەم ، یان بۆ خۆم بەهەڵەدا بچم، یان ببمە ژێردەستە، یان خەڵکی بکەمە ژێردەستەو بیان چەوسێنمەوە، یان ستمەکار بم، یان ستەم لێ کراو، یان بە نەفامێتی و نەزاندوویی بجۆڵێمەوە، یان لەگەڵما بجولێنەوە.. ئەی خودایە! من بەو نیەتە دەرنەچوومەتە دەرەوە سنگ دەرپەڕێنم و، خۆم گیف بکەمەوەو، کوفرانەی نیعمەتی تۆ بکەم، ستەم لە بێ تاوان و ڕیاکاری بکەم و ، خۆم لەبەرچاوی خەڵکی دەربخەم، یان ناوو شۆرەت پەیدا بکەم، بەڵکوو بۆ یە دەرچووم؛ خۆم لە توڕەییت بپارێزم، ڕەزامەندیت وەربگرم و، فەرزەکەت بە جێ بهێنم، شوێن سوونەتی پێغەمبەرەکەت بکەوم و، بە شەوق و سۆزێکی بێ پایانەوە بە لیقای تۆ بگەم.

ئەگەر کەوتە ڕێ: بڵێت:

**((اللَّهُمَّ بِكَ انتَشَرتُ، وعَلَيكَ توَكَّلْتُ، وبِكَ اعتَصَمتُ، وإلَيكَ تَوجَّهتُ، اللَّهُمَّ أنتَ ثِقَّتي، وأَنتَ رَجائي، فاكفِني ما أَهَمَّني، وَمَا لاأَهتَمُّ بِهِ، وما أَنتَ أَعلَمُ بِهِ مِنّي، عَزَّ جارُكَ، وجَلَّ ثَناءُكَ، ولاَ إلَهَ غَيرُكَ، اللَّهُمَّ زَوِّدني التَّقوىَ، واغفِر لي ذَنبي،**

وَوَجِّهني للخَيرِ أينَما تَوَجَّهتُ))[1].

ئەی خودایە: بەهۆی تۆوە وا پەلم هاوێشتووە بە هەموو لایەکدا و بڵاوبوومەتەوە، وە پشت بە تۆ وا کەوتوومەتە ڕێ و، تەنها پەنام بەتۆ، بەستووەوە ڕوو لەتۆ دەکەم و، تەنها تۆی کە جێگەی متمانەو بڕوا و هیوای منیت، داوات لێدەکەم مەرام و مەبەستەکانم بهێنەرە دی و، ئەوەی گرنگی پێدەدەم و ئەوەش کە جێگەی بایەخم نیە، ئەوانەش کە تۆ لەمن زیاتر زاناو شارەزای پێیان، بەڕاستی ئەوەی لە نزیکەوە لە ژێر سایەی تۆدا بژی، سەربەرزەو زۆر گەورەو گرنگ و بایەخدارە، هەردەبێ سەناو ستایشی تۆ بکرێت، وە هیچ کەسێك نیە شیاوی پەرستن بێت تۆ نەبێت.

ئەی خودایە: توێشووی تەقواو خۆپارێزیم بۆ پڕ بکەیت ، وە لە گوناهەکانم خۆش ببیت، وە ڕوم بۆ هەر لایەك کرد، ڕوم بەلای خێر و چاکەدا وەرگێڕە.

وە بۆ هەر جێگاو مەنزڵێك بگوازێتەوە با هەمان دوعا بکات.

## پێنجەم: لە کاتی سواربووندا:

ئەگەر سوار بوو ئەوا دەڵێت:

**( باسمِ اللهِ وَ باللهِ واللهُ أكبَرُ. توَكَّلتُ علَى اللهِ ، ولا حَولَ ولاَقُوَّةَ إلاَّ باللهِ العَليِّ العَظيم، ما شاءَ اللهُ كانَ، وَما لَم يَشَأْ لَمْ يَكُنْ. سُبحانَ الذي سَخَّرَ لَنا هذا ومَا كُنَّا لهُ مُقرِنِينَ. وَإنَّا إلى رَبِّنا لَمُنقَلِبون. اللَّهُمَّ إنِّي وَجَّهتُ وَجهي إلَيك. وَفَوَّضتُ أمري كُلَّهُ إلَيْكَ، وَتَوكَّلتُ في جَميعِ أُموري عَلَيكَ. أَنتَ حَسبي وَنِعمَ الوَكيل)**

ئەگەر چووە سەر وڵاخەکە،(یان هەر سوارییەك) یان بە تەواوی سوار بوو، ئەویش لەژێریدا ڕاوەستا، ئەوا حەوت جار دەڵێت:

**(سُبحانَ اللهِ والحَمدُ للهِ، ولاَ إلَهَ إلاَّ اللهُ واللهُ أكبَرُ).**

---

(١) بعضها من دعاء حضرة الرسول إذا أراد الخروج إلى السفر،كما في رواية مسلم (١٣٤٢).

وە دەڵێت: (**الحَمدُ للهِ الذي هَدانا لِهذا ومَا كُنَّا لِنَهتَدِيَ لَولاَ أَنْ هَدانا اللهُ، اللَّهُمَّ؛ أَنتَ الحامِلُ علَى الظَّهرِ. وأنتَ المُستَعانُ عَلى الأُمور**)

واتە: بەناوی خوداو بەیارمەتی خودا، کە لە هەموو دەسەڵاتدارێك گەورە ترە، ئەوا پشت بە خودا، کە هیچ هێزو توانایەك نیە سەرچاوەی لە دەسەڵات و توانای خوداوە وەر نەگرتبێت، ئەوەی خودا بیەوێت ئەوە دەبێت، ئەوەیش مەیلی لێ نەبێت، ئەوە نابێت، پاکو بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە ئەم سوارییەی بۆ ڕەخساندین، خۆ ئێمە توانامان بەسەریدا نەدەشکا ئەگەر ئەو زاتە بۆی ئامادەو فەراهەم نەهێنایانە، وە ئێمە هەر بۆ لای خودا دەگەڕێینەوە، ئەی خودایە؛ ئەوا من ڕووی خۆم بە تایبەتی لە تۆ کرد، وە هەموو کارەکانم سپاردووە و گێڕاومەتەوە بۆ لای فرمانی تۆ، وە لە هەموو فرمانەکانمدا تەنها پشت و پەنام هەر بە تۆیە، تۆم هەبێ پێویستم بە کەسی تر نیەو باشترین کەسێکی کە کارەکانم لە خۆم باشتر بۆ جێبەجێ بکەیت.

وە دوای حەوت جار وتنی:

سوبحانەڵلاهی وەلحەمدولیللاهی وەلائیلاهە ئیللەڵلاهو وەڵلاهو ئەکبەر، دەڵێت:

حەمدو سەنا بۆ ئەو خودایەی کە ڕێنومایی کردین بۆ سەر ئەم ڕێگە ڕاستەو ، وە ئێمە هەرگیز نەماندەتوانی ڕێگای درووست و پەسەند بدۆزینەوە، ئەگەر لوتف هیدایەتی ئەو نەبوایە، ئەی خودایە؛ هەر تۆی کە پشتی ئەم سووارییەت بۆ فەراهەم هێناوین، وە یارمەتیت داوین بۆ ڕاپەڕاندنی هەموو فرمانەکان.

## شەشەم: لە کاتی دابەزین:

سوننەت وایە کە دانەبەزێت تا ڕۆژ گەرم دەکات، بۆ ئەوەی سوود لە ڕۆژەکە وەربگرێت و بتوانێت بەڕێوە بێت، وە زۆربەی ڕۆشتنەکەی بەشەوا بێت، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**(( عَلَيْكُم بالدُلْجَةِ، فَإِنَّ الأَرضَ تُطوىَ باللَّيلِ ما لاَ تُطوىَ بالنَّهارِ))**[1]،

واته: باشتر وایه بەشەو ڕێ بکەن، چونکە زەوی بەشەودا دێتەیەك، بە شێوەیەك کە بە ڕۆژدا نایەتە یەك و کەم نابێتەوە.

با کەمتر بەشەوا بخەوێت، تا زیاتر یارمەتی بدات کە ڕێگەکە ببڕێت، وە هەر کاتێك بڕوانێتەوە بەسەر ماڵ و جێگایەکدا، با بڵێت:

**(اللَّهُمَّ رَبَّ السَّماواتِ السَّبعِ ومَا أَظْلَلنَ، وربَّ الأَرَضينَ السَّبعِ وَما أَقلَلْنَ، وربَّ الشَّياطِينِ ومَا أَضلَلْنَ، ورَبَّ الرِّياحِ ومَا ذَرَينَ، ورَبَّ البِحارِ ومَا جَرَينَ، أَسأَلُكَ خيرَ هذا المَنزِلِ وخَيرَ أَهلِهِ، وأَعوذُ بِكَ شَرَّ هذا المَنزِلِ وَشَرِّ أَهلِهِ وَشَرِّ ما فيهِ، اصرِفْ عَنِّي شرَّ شِرارِهِم).**

ئەی خودایە: پەروەردگاری هەر حەوت ئاسمانەکان و ئەوانە کە سێبەریان بۆ کردوون، ئەی خودای حەوت تەبەقەکانی زەوی و. ئەوانەش کە زەوی هەڵی گرتوون، پەروەردگاری شەیتانەکان و، ئەوانەش کە گومڕایان کردوون، پەروەردگاری (با)یەکان و ئەوانەش کە (با) ئەیانبەن، ئەی خودای دەریاکان و ئەوانەش کە بەسەریدا دەڕۆن، داوات لێدەکەم لە خێرو بێری ئەم جێگاو ئەهلەکەی بێبەشم نەکەیت، وە بم پارێزیت لە شەڕو خراپەکانی ئەم مەنزڵ و جێگاو ئەهلە خراپەکەیشی، وە لە هەموو شەڕێك کە لە ناویایەتی، خودایە شەڕی خراپەکارو شەڕەنگێزەکانیشم لێ دوور خەرەوە.

ئەگەر لەو ماڵ و مەنزڵە دابەزی.. با یەکسەر دووڕکات نوێژ بکات، لە پاشان بڵێت:

**((أَعوذُ بِكَلِماتِ اللهِ التَّامَّاتِ التي لا يُجاوِزُهُنَّ بَرٌّ ولاَ فاجِرٌ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ)).**

واته: پەنا دەگرم بە کەلیماتی خودا، بە قورئان و ناوە جوانەکانی خودا کە

---

(١) رواه أبو داوود(٢٥٧١)، دون: ما لا تطوى بالنهار، وهي عند مالك في الموطأ:٢/٩٧٩) مرسلة.

هیچ کەمی و نەنگییەگ ڕوویان تێ ناکات، وە هەموو کەون و بوونەوەری لەسەر دامەزراوە، کە هیچ چاك و خراپێك ناتوانێت لە سنووری بڕیارو تواناو ئیرادەی خودا لابدات، بەڵام چاکەکان شوێنی کەوتن و، خراپەکانیش پشتیان تێ کرد.، پەنا ئەگەر بەو کەلیماتانە لە شەڕی ئەوانەی دروستیکردوون،.

ئەگەر شەوی بەسەردا هات با بڵێت:

**(یا أرضُ : رَبِي وَرَبُّكِ اللهُ، أعوذُ باللهِ مِن شَرِّكِ. وَشَرِّ ما فيكِ، وَشَرِّ ما دَبَّ عَلَيكِ، أعوذُ باللهِ مِن شَرِّ كُلِّ أَسَدٍ وأَسْوَدَ، وحَيَّةٍ وعَقرَبٍ، ومِنْ شَرِّ ساكِنِ البَلَدِ، وَوالِدٍ ومَا وَلَدَ) :**

﴿وَلَهُ مَا سَكَنَ فِي اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ (الأنعام١٣).

واتە: ئەی زەوی؛

پەروەردگاری من و تۆیش هەر خودایە، پەنا دەگرم بە خودا لە شەڕی تۆو، ئەو شەڕەی کە لە ناوتایە، یان کەوتووە بەسەرتا.

وە پەنا ئەگرم بە خودا: لە شەڕی هەموو شێرو هەموو ڕەشێك، وە شەڕی مارو دووپشك، وە شەڕی ئەو خراپانەی لە ناو شاردا نیشتە جێن، وە پەنا دەگەرم بە خودا لە باوك و ئەوەی لەوانەوە بووە، هەرچی لە شەوو ڕۆژدایە هەمووی موڵکی خودایەو لە ژێر دەستی ئەو دایە، خودا هەموو شت ئەبیسێت و ، زاناو ئاگادارەو هیچی لێ ون نابێت..

## حەوتەم:

## لەبارەی پاسەوانیەوە:

پێویستە بە ڕۆژدا بە وریاییەوە هەڵس و کەوت بکات، لە دەرەوەی کاروانیەکەی بە تەنها نەڕوات، لەوانەیە بیکوژن، یان لێیان دابرێت، وە بە شەویشدا دەبێت زۆر بە ئاگاییەوە بنوێت، ئەگەر لەسەرەتای شەوەوە نوست، با باڵی خۆی لە ژێر سەریدا ڕابخات و سەر بنێتەوە، وە ئەگەر لە کۆتایی شەودا

نووست، با باڵەکانی ڕێك دابنێت و بەرزی بکاتەوەو سەریشی بخاتە ناو لەپیەوە، هەر بەم شێوەیە پێغەمبەر ﷺ لەشەوداو لە سەفەردا ئەنووست،[١]،

چونکە لەوانەیە خەوی قورس بوایە، (بەهۆی بێ ئیسراحەتییەوە) ئەو کاتە ئەگەر خەبەری نەبێتەوە و ڕۆژی لەسەر هەڵبێت و نەزانێت، ئەو نوێژەی کە دەفەوتێت گرانترە لەو خێرەی بە هۆی حەجەکەوە دەستی دەکەوێت.

باشتر وایە لە شەودا دوو هاوڕێ بە سەرەو یەك لە دوای یەك ئێشك بگرن و بنوون، کە ئەمیان خەوت با ئەویان پاسەوانبێت، ئەمە سوننەتە. خۆ ئەگەر دڕندەیەك یان دوژمنێك لە شەو یان لەڕۆژدا بەرەو ڕووی هات، ئەوا با (وریا بێت) و (آيَةَ الْكُرسِي)و ئایەتی:

**﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ. لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ. إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الْإِسْلَامُ﴾** بخوێنێت، وە سوورەتی (الإخلاَصُ) و هەردوو (قُل أَعُوذُ ووەكان) بخوێنێت و بڵێت:

**(باسمِ اللهِ ما شاءَ الله، لاقُوَّةَ إلاَّ بالله. حَسبِيَ اللهُ . تَوَكَّلتُ على اللهِ، مَا شاءَ اللهُ لايَأْتي بالْخَيرِ إلاَّ الله، ما شاءالله، لايَصرِفُ السُّوءَ إلاَّ الله، حَسبِيَ**

---

(١) كما في مسلم (٦٨٣) عن أبي قتادة، قال: كان رسول الله ﷺ إذا كان في السفر، **فعَرَّسَ بلَيلٍ، اضطَجعَ على يَمينهِ، وإذا عرَّسَ قُبَيلَ الصُّبحِ نصَبَ ذِراعَهُ وَوَضَعَ رَأسَهُ عَلى كَفِّهِ)**.وأخرج أحمد في مسنده(٢٢١٢٦)، والترمذي في الشمائل(ص/٢٢٠(٢٦١)، من حديث أبي قتادة بإسناد صحيح، قال الزبيدي: ( ٣٣١/٤): وجدت بخط الشيخ زين الدين القرشي، في هامش نسخة العراقي ما نصه: ليس هو بصحيح في رواية مسلم، وإنما هو زيادة وقعت في حديث أبي قتادة الطويل، في نوم النبي ﷺ وأصحابه في الوادي، وعزاه ابن الجوزي بجميع رواياته في الجامع إلى مسلم، وليس كذلك. ولفظ هذه الزيادة : **كان رسول الله ﷺ إذا عرَّس وعليه ليل توسد يمينه، وإذا عرَّس الصبح، وضع رأسه على كفه اليمنى، وأقام ساعِدهُ)**.

**اللهُ وَكَفَى، سَمِعَ اللهُ لِمَنِ دَعا، ليسَ وَرَاءَ اللهِ مُنتَهى، ولاَ دونَ اللهِ مَلْجا، ﴿كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾**،(٢١/المجادلة)

**تحَصَّنتُ باللهِ العَظيم، واستَغَثتُ بالْحَيِّ الذي لايَموت، اللَّهُمَّ : احرِسنا بِعَينِكَ التي لاَ تَنامُ، واكْنُفْنا بِرُكنِكَ الذي لايُرام، اللَّهُمَّ : ارْحَمنا بِقُدرَتِكَ عَلينَا، فلا نَهلِكُ**[1]**، وأنتَ ثِقَّتُنا، اللَّهُمَّ: إعطِف عَلَينا قُلوبَ عِبادِكَ وَإمائِكَ بِرَأفَةٍ وَرَحمَةٍ إنَّكَ أنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمين)** .

سەرەتا بەناوی خودا، بوونی هەرکارێك تەنها بە مەیلی خودایە، هیچ تەوانایەك نیە هێزت پێ بدات جگە لە خودا، تەنها ئەوم بەسەو پشت و پەنام هەر بە خودایە، گەورەیی و دەسەڵات بۆ خودایە، کەس ناتوانێت خێرت بۆ بهێنێت بێجگە لە خودا، ئیرادە و ئارەزوو هەر بە خودایە.

کەس ناتوانێت شەڕت لێ لادات جگە لە خودا، خودام بەسە و پێویستم بەکەسی تر نابێت، گوێ بیستی هەموو نزاو پاڕانەوەیەکە کە دەکرێت، جگە لە خودا هیچ پەناگایەك نیەو، وە جگە لە پشت بەستن بە خودایشەوە هیچ پشت و پەنایەك نیە هاواری بۆ لا ببەین، واتە:

کەس ناتوانێت دوای هاوار لە خودا کەسێکی تر ببینێتەوە، کۆتای هەموو پەناگاکان بێت و پەنای پێ ببات،

(خودا لە لەوحی قەزا و قەدەری خۆیدا نوسیویەتی و بڕیاری داوە: من و پێغەمبەرانی من زاڵ دەبین بەسەر دوژمناندا، بەڕاستی خودا بەهێزو زاڵ و بە توانایە بەسەر خواستەکانی خۆیدا) [2].

---

(١) أخرجه البيهقي في السنن الكبرى، (١٤٠/١)(٦٤٧)،من طريق ابن إسحاق، من حديث جابرفي حديث فيه: فقال الأنصاري للمهجري: أيُّ الليلِ أحب إليك أن **أكفيكَهُ، أوله أو آخره؟ فقال: بل إكفني أوله، فاضطجع المهاجري** ....الحديث، والحديث عند أبي داود برقم(١٩٨).

(٢) خۆلاصەی تەفسیری نامی(٥٤٣).

ئەوا خۆم قایم کرد بە پەناگرتن تەنها بەخودای گەورە، وە هاوارم برد بۆ لای ئەو زاتە زیندووەی کە هەرگیز نامرێت، ئەی خودایە؛

بمانپارێزە و بەو چاوە قودرەتییەی کە هەمیشە بێدارە و هەرگیز نانوێت، وە بمانخەرە ژێر باڵی ئەو ڕوکن و هێزە لەبن نەهاتووەی کە لە هەموو ڕوکنەکان بەهێزو گەورەترە، کە خودا بۆخۆیەتی و هەرگیز ناڕوخێت، خودایە گیان ڕەحممان پێبکە؛ بەو دەسەڵاتەی هەتە بەسەرمانەوە، هەرگیز نا فەوتێین کە تۆ متمانەدارو جێگە بڕوامانی، دڵی بەندەکانت و کەنیزەکە ئافرەتەکانیشمان بەلادا نەرم بکە، بە ڕاستی هەر تۆی کە لە هەموو خاوەن سۆزەکان بەسۆزو بە ڕەحم و میهرەبان تری.

## هەشتەم:

هەرکاتێك لە ڕۆشتنەکەیدا بەرەو بەرزی دەڕۆیشت، دەیدا بەسەر بەرزایی و گردێکدا، سوننەتە سێ جار (الله أكبر) بکات، لە پاشان بڵێت:

**(اللَّهُمَّ لكَ الشَّرَفُ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ، ولَكَ الحَمدُ عَلى كُلِّ حالٍ).**

خودایە بەرزی و شەرەف و بڵندی هەر شایستە و لایق بە تۆیە، وە لەسەر هەموو حاڵێکیش سەناو ستایش هەر بۆ تۆ پێویستە.

وە هەرچەندێکیش بەرەو نزمی بڕوات، با تەسبیحاتی خودا بکات، وە هەرچەندێك لە گەشتەکەیدا ترسی بێکەسی و بێ هاودەمی بوو، با بڵێت:

**(سُبحانَ اللهِ المَلِكِ القُدُّوس، رَبِّ المَلائِكَةِ والرُّوح، جَلَّلتَ السَّماواتِ بالعِزَّةِ والجَبَروت).**

پاکو مونەززەهی و تەقدیس و بەرزی تەنها بۆخودایە، پەروەردگاری فریشتەکان و جوبرەئیل، ئاسمانەکانی دیارو درەوشاوەو نەخشاندووە بەو عیززەت و دەسەڵاتەی کە هەیەتی و ،هەموان لە ژێر سام و هەیبەتی ئەودان.

# ڕستەی دووهەم:

## لە باسی ئادابی ئیحرام بەستن لە جێگای دیاری کراوەوە، تا دەچنە ناو مەککە،

## ئەمەیش پێنج ڕستەیە:

**یەکەم:** دەبێت خۆی بشۆرێت و نیەتی غوسڵی ئیحرام بهێنێت، مەبەستم ئەوەیە: ئەگەر گەیشتە ئەو جێگای کە دیاری کراوە بۆ (میقات) کە خەڵکی ئیحرامی لێدەبەستن، وە دوای ئەوەی کە بە شێوەیەکی خاوێن خۆی شۆرد، سەرو ڕیشی داهێناو، نینۆکەکانی کرد و، سمێڵی کورتکردەوە، وە هەموو ئەو پاك و خاوێنیانەی ئەنجامدا کە لە باسی تەهارەتدا ڕوونمانکردنەوە، ئینجا ئیحرام دەبەستێت و نیەت دەهێنێت.

**دووهەم:** دەبێبەرگە دووراوەکان دووربخاتەوە و، بەرگی تایبەتی ئیحرام بپۆشێت، کە دووبەرگی سپی دەیانپێچێت بە قەدییەوە و بەسەرشانەکانیەوە، کە ئیحرامی سپی لە هەموو ڕەنگەکانی تر لای خودای گەورە لە پێشترە.

وە خۆی بۆن خۆش دەکات، هەروەها جەستەو بەرگەکەیشی، وە ئەگەر بۆن و بەرامی ئەو بۆنخۆشییەش دوای ئیحرام بەستن بمێنێتەوە ئاساییە، چونکە بریسکەی ئەو میسکەی پێغەمبەر ﷺ بەکاری هێنابوو، لە دوای ئیحرام بینراوە، لەو جێگەیەدا کە پرچی سەری لاداوە، پاشماوەی ئەو میسکەیە کەپێشتر بەکاری هێناوە.[1]

(١) رواه البخاري (٢٧١) ومسلم(١١٩٠).

## سێیەم:

دەبێت دوای لەبەرکردنی پۆشاکەکانی، ئەوەندە بوەستێت تا وڵاخ و کاروانیەکە ئامادەی ڕۆشتن دەبن، یان ئەگەر پیادەبوو، تا ئەوکاتەی دەستبەڕۆشتن دەکات، ئیتر نیەتەکەی بهێنێت (ئیحرام بە حەج یان بە عومرە)، پێکەوە بیانبەستێتەوە، یان بە تاکی و بە ئیفراد، (وەك لە وەجیز یشدا هاتووە: دووڕکاتی سوننەتی ئیحرامیش بکات[١] لەپاشان نیەت بهێنێت)

بەڵام سوننەت وایە لەگەڵ سەرەتای نیەتەکەیدا (تەلبیە)یش بکات، واتە: بڵێت:

**((لبَّيكَ اللَّهُمَّ لبَّيك، لبَّيكَ لاشَريكَ لكَ لبَّيكَ، إنَّ الحَمدَ والنِّعمَةَ لكَ والمُلكَ، لاشَريكَ لَكَ.)**

واتە: ئامادەم و هاتووم بەدەم بانگەوازەکەتەوە، حازری ئیتاعەو گوێڕایەڵیتم، خودایە تاك و تەنهایت و هاوبەشت نیە، من ئامادەباشم، هەرچی حەمدو سەنا هەیە، وە هەموو نیعمەتەکان هەر بۆ تۆیەو لەتۆوەیە، تۆ بێ شەریك و بێ هاوتای، وە ئەگەر زیاتریش بڵێت:

**(لبَّيكَ وسَعدَيكَ، والخَيرُ كلُّهُ بيدَيكَ، والرَّغباءُ إلَيكَ، لبَّيكَ بحَجَّةٍ حقّاً، تَعَبُّداً ورِقّاً، اللَّهُم صلِّ علَى مُحمَّد وَعلَى آلِ مُحمَّد)**[٢]،

---

(١) وعبارته كما في العزيز:الرابعة أن يصلي ركعتي الإحرام. ثم يلبي حيث تنبَعِثُ دابَّته، وفي القديم: بحيث يتحلل عن الصلاة.

(٢) بنحوها عند مسلم (١١٨٤)، وأما إتباع التلبية الصلاةَ على رسول الله ﷺ فقد رواه الدارقطني في سننه (٢/٢٣٨)، عن القاسم بن محمد عند الفراغ منها، **وأن يسألَ الله رضوانَه والجنة ويستعيذ برحمته من النار**. كما رواه الشافعي من حديث خزيمة بن ثابت **أنه ﷺ كان إذا فرغ من تلبيته في حج أو عمرة سأل الله رضوانه والجنةَ واستعاذ برحمتهِ من النار. ثم يدعو بما أحبَّ، ولا يتكلم في أثناء التلبية بامر ونهي وغير ذلك. لكن لو**

ئامادەی گوێڕایەڵیتین و بەختەوەری یەك لەدوای یەك هەر بەتۆو بۆ تۆیە، خێرو چاکە هەمووی بەدەست تۆیە، وە هەموو پاڕانەوەکان بۆلای تۆیە، ئەوا تەلبیەدەکەم بە حەجێکی ڕاست و دروست ، بەندایەتی و کۆیلایەتی خۆم دەسەلمێنم، خودایە صڵاواتی خۆت بڕژێنیت بەسەر گەورەمان (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ ،وە بەسەر ئال و بەیتی (حەزرەتی) موحەممەددا.

## چوارەم:

ئەگەر نیەت و ئیحرامەکەی بەم تەلبیەوە دامەزرا، چاتر وایە کە بڵێت:

**( اللهُمَّ إنِّي أريدُ الحَجَّ فيَسرهُ لِي، وأعنِّي عَلَى أداءِ فَرضِهِ، وتَقبَّلهُ مِني، اللَّهُم إنِّي نوَيتُ أداءَ فَريضَتِكَ فِي الحَجِّ، فَاجْعَلني مِنَ الَّذينَ استَجابُوا لكَ وآمَنُوا بوَعدِك، واتَّبعُوا أمْركَ، واجْعَلني مِن وَفدِكَ الَّذينَ رَضيتَ عَنهُم وارتضيتَ، وقبِلتَ مِنهُم، اللَّهُم فيَسِّر لِي أداءَ ما نَويتُ منَ الحَجِّ، اللَّهُم قَد أحرم لكَ شَعْري ولَحمي ودَمي، وعَصَبِي ومُخِّي وعِظامي، وحرَّمْتُ عَلى نَفسي النِّساءَ والطِّيبَ ولُبسَ المَخيط، ابتِغاءَ وَجهِكَ والَّدارِ الآخرةِ)**

خودایە من تەماداری حەجکردنم بۆم ئاسان بکە، یارمەتیم بدە با فەرزەکانی جێبەجێ بکەم و لێیشم وەربگرە، من نیەتم هێناوە فەرزەکانت لە حەجدا جێبەجێ بکەم، بمگێڕە لەوانەی هاتوون بەدەم فرمان و بانگەکەتەوە، وە بڕوایان بە بەڵێنەکەی تۆ بووە، وە شوێن فەرمانت کەوتوون، وە بمگێڕە لەوتاقم و زیارەتگەرانەی کە دێنە خزمەتت و لێیان ڕازیت و، ڕازیشت دەکەن و، لێیشت وەرگرتوون.

ئەی خودایە؛ بۆم ئاسان بکە ئەوەی نیەتم لێ هێناوە، کە بەباشی حەجەکەم بکەم، خوایە هەموو گیانم ، مووەکانم و گۆشتی گیانم و، خوێن و

---

**سلم عليه رد** ، نص عليه الشافعي في الأمِّ: ( ٣/٣٩٥) وقال النووي: ويكره التسليم عليه في حال التلبية.

ڕەگ و پێست و مۆخ و ئێسك و پروسكی جەستەم. هەمووی ئیحرامی بەستووە بۆ تۆ، وە لەسەر خۆمم حەرام كردووە، ژن و خۆبۆنخۆشكردن و لەبەركردنی بەرگی دووراو، تەنها لە پێناو ڕەزامەندی تۆو سەربەرزی دوارۆژدا.

ئیتر لە وەختی بەستنی ئیحرامەوە، هەموو ئەو شەش شتەی كە حەرامكراون و باسمان كردن لێی قەدەغە دەكرێن و، دەبێ لێیان بە دووربێت.

**پێنجەم:**

سوننەتە تا لە ئیحرامدا بێت، زۆر زۆر تەلبیە بكات، بە تایبەتی لەكاتی قەرەباڵغی ڕێگەوباندا، یان گەیشتنی كاروانیەكان بەیەك، یان لە كاتی كۆبوونەوەی حاجیەكاندا، وە لە كاتی هەموو بەرزبوونەوەو دابەزینێكدا، وە لێبوونەوەی نوێژ و ڕۆژبوونەوەو، شەوداهاتن و گزنگی بەرەبەیاندا، وە دەنگی بەرز بكاتەوە بە شێوەیەك قورگی نەگیرێ و دەنگی نەنووسێت، چونكە خۆ ئەو بانگی كەڕ و كەسێكی دوور ناكات، وەك لە فەرموودەدا هاتووە[١]، بەڵام ژنان وەك نوێژكردن تەنها لەبەر خۆیانەوە تەلبیەدەكەن.

**وە كارێكی ئاساییە كە لە سێ مزگەوتەكەدا :**

(واتە: مزگەوتی حەرام و مزگەوتی خەیف و مزگەوتی میقات، یان: عەرەفات) دەنگی تەلبیە بەرز بكەنەوە، چونكە ئەم جێگایانە شوێنی ئەصڵی عیبادەت و مەناسیكەكانن، بەڵام مزگەوتەكانی تر، ئەوە بە دەنگی نزمیش بێت ئاساییە، وە حاڵی پێغەمبەرﷺ وابوو:

كە ئەگەر سەری سوڕبمایە بەشتێك و پێی خۆش بوایە دەیفەرموو:

**((لبَّيكَ إنَّ العَيشَ عَيشُ الآخِرَة ))**[٢].

ئامادەی بەندایەتی و گوێڕایەڵیم، بەڕاستی ژیان تەنها ژیانی دوارۆژە.

---

(١) رواه البخاري(٢٩٩٢)، ومسلم(٢٧٠٤).

(٢) رواه الشافعي في الأم: (٣٩١/٣)، عن مجاهد مرسلاً.

# ڕستەی سێیەم:

## باسی ئادابی چوونە ناو مەککە و تەوافکردن

## ئەمەش شەش ئادابی هەیە:

### یەکەم:

دەبێ لە (ذو طووا) خۆی بشۆرێت بۆ چوونە ناو مەککە ، [١]،

وە ئەو خۆشۆردنانەی کە شیاوە ئەنجام بدرێن و، سوننەتن لە کاتی حەجکردندا نۆ خۆشۆردنن:

یەکەمیان لە میقاتدایە، خۆی دەشۆرێت بۆ ئیحرام بەستن، وە بۆ چوونەناو مەککە، وەك وتمان لە (ذی طووا) خۆی بشۆرێت، لە پاشان بۆ ڕاوەستانی عەرەفات، وە بۆ مانەوەی موزدەلیفە، وە سێ خۆشۆردنیش بۆ هەرسێ جارەکەی کە ڕەجمی شەیتانیان تیا دەکات، (بۆ کەسێك کە ڕۆژی سێیەمیش بمێنێتەوە لە مینا) بەڵام بۆ ڕەجمی شەیتانی گەورە[٢]،

---

(١) ذی طیـوا. بیرێکی شـاراوەیە، یـان جـێگەیەکە لە نزیـك مەکـکەوە. العسـقلاني في إرشـاد الساري( ٣/١٣٩)، وە بە (ذوطووا) یش خوێندویانەتەوە، وەك ئەبو زەرر لە مشارق الأنوار دا (١/٢٧٦) باسی کردووە، وقد روی البخاري (١٥٧٣) ومسلم (١٢٥٩) حكاية فعله ﷺ لذلك.

(٢) واتە: (جمـرة العقبـة) لە یەکەم ڕۆژی قوربانـدا خۆشـۆردنی ناوێـت،(چونکە تـازە خـۆی شـۆردووە و، کاتیشی زۆر لەبەردەمدایە لە نیوەی شـەوی قوربـانەوە تـا کاتی زەوال بـۆ ڕەجمەکە) ڕەنگە ئەو قەرەباڵغیە درووسـت نەبێت، کە پێویسـت بە خۆشـۆردن بکات، وە خۆیشی بۆ جەژن و عەرەفە شـۆردووە، وەك ئیمامی شـافیعی دەفەرموێت .بەڵام بـۆ ڕۆژەکانی تر لە دوای زەوالەوە دەست پێ دەکات، کاتی گەرمایە، وە زیاتر تێکەڵ دەبن و ماوەکە کەمترەو ،پێویسـتە بۆنی خـۆش بێـت و ، جەسـتەی پـاك بێـت، بـۆیە سـوننەتە خۆی بشوات.

له پاشان خۆی دەشوات بۆ طەوافی هاتنەوە لە مەناسیکەکان، (طواف الإفاضة) وە بۆ طەوافی خواحافیزی، بەڵام ئیمامی شافیعی (خودای لێ ڕازی بێت) لە فەرموودەی تازەیدا باسی تەوافی زیارەت و خواحافیزی باس نەکردووەو هەموو خۆشۆردنەکان دەبنە حەوت خۆشۆردن.

**دووهەم:**

دەبێ لەسەرەتای هاتنە ناو حەرەمی مەککەدا کە هێشتا لە دەرەوەی مەککەیە بڵێت:

**(اللَّهُمَّ هَذا حرَمُك وأمنُكَ، فحَرِّمْ لَحْمي ودَمي وبَشَري علَى النَّار، وأَمِّنِّي مِن عَذابكَ يَومَ تَبعَثُ عِبادَكَ، واجْعَلني مِن أوليائكَ وأهلِ طاعَتِكَ)**

ئەی خودایە؛ ئەوا گەیشتینە حەرەمی تۆ وە، خۆت خاوەنی ئەم جێگا پیرۆزەی، تۆ بڕیارت داوە کە دەبێت هەموو کەس لێرە ئەمین بێت و نەترسێت، کەواتە گۆشت و خوێن و مووی لەش و پێستم بپارێزەو، ئاگریان لەسەر حەرام بکە، وە هەر لە ئێستەوە ئەمینم بکەرەوە لە سزای ئاگر، ئەو ڕۆژەی خەڵکی زیندوو دەکەیتەوە، وە بمگێڕە لە دۆستان و ئەهلی تاعەت و بەندایەتیت.

**سێیەم:**

دەبێت لە لای بەطحاوە بێتە ژوورەوە، کە لە تەنیشتی (کەدائە) وەیە [1] چونکە پێغەمبەر ﷺ کە دەگەیشتە ئەو ئاستە، لە جادەکە لای دەدا و شوێن پێ هەڵگرتنی ئەو زاتە یش سوننەتە، وە ئەگەر لە مەککە چووە دەرەوە، ئەوا با

---

(١)بەطحا جێگەیەکە ووردەبەردی زۆری تێدا کۆدەبێتەوە، لە پاڵ کودائە، کە جێگەی کەژێکە لە مەککەدا کە پێغەمبەر ﷺ تێدەپەڕی بەلایدا، وە لەو جێگە بەرزەوە (ئەوسا)کەعبەی پیرۆز دەردەکەوت، وروى الطبري في تفسيره:(١٣/٨)(٢٨٧) عن ابن عباس: **أم إبراهيم عليه السلام، كان على ثنية كَداء، حينَ دَعا: ﴿ فاجعل أفئِدةً مِنَ النَّاسِ تأوي إِلَيهم﴾** وانظر الإتحاف( ٤/ ٣٤٣).

لاداتەوە بەپاڵ شاخەوە، لەلای خواری مەککەوە دەربچێت، کە پێغەمبەر ﷺ لە سەنیەی کوداوە، واتە لای خوارە دەچووە دەرەوە، بەڵام لای سەرەوە دەهاتە ژورەوە.

**چوارەم:** ئەگەر هاتە ناو مەککەوەو گەیشتە ئەو جێگەی پێی دەڵێن (رأس الردم) (کەکاتی خۆی لەو جێگەوە بەیتیان لێ دیاربوو) کە چاوی بە ماڵی خودا کەوت با بڵێت:

**( لاإِلَهَ إِلاَّ اللهُ واللهُ أَكبَر، اللَّهمَّ أنتَ السَّلامُ ومِنكَ السَّلامُ، وَدارُكَ دارُ السَّلام، تَبارَكتَ ياذا الجَلالِ والإكرام، اللَّهُم إِنَّ هَذا بيتُكَ، عَظَّمتَه وكرَّمتَهُ وشَرَّفتَهُ، اللَّهُمَّ فزِدْهُ تعْظيماً وَزِدهُ تَشرِيفاً وتَكرِيماً، وزِدهُ مَهابَةً وزِدْ مَنْ حجَّهُ بِرّاً وكَرامَةً، اللَّهُمَّ افتَح لِي أَبوابَ رَحمَتِكَ، وأَدخِلْني جَنَّتَكَ، وأَعِذني مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم).**

هیچ پەرستراوێکی حەق نیە جگە لە (الله) نەبێت، تەنها ئەو شایستەی پەرستن و گەورەییە، سەلام و ئاشتی بۆ خۆتی و هەر لەتۆوە بڵاو دەبێتەوە، ماڵەکەی تۆ ماڵی ئاشتیيە، پاك وبێگەردی بۆ تۆ ئەی خاوەنی گەورەیی و رێزو دەسەڵاتی بێ سنوور، ئەی خودایە؛ ئەم ماڵە موڵکی خۆتە، گەورەت کردووەو، رێزو حورمەت و بەرزیت پێ بەخشیوە، دەی خودایە داوادەکەم زیاتر گەورەیی و رێزو پیرۆزی و مەزنایەتی پێببەخشە، سام و هەیبەتی بخەرە ناو دڵەکانەوە، وە ئەوانەش دێن بۆ زیارەتی، زیاتر بە چاکەو رێزەوە پاداشتیان بدەرەوە، خودایە دەروازەکانی رەحمەتی خۆتم لەسەر والاکە، وە بمخەرە ناو بەهەشتەوە، وە بمپارێزە لە شەیتانی دوورخراوە لە رەحمەتی خۆت.

**پێنجەم:**

ئەگەر چووەناو مزگەوتی حەرام و بەیتی پیرۆزەوە، با لە دەرگای بەنی شەیبەوە بچێتە ژوورەوە، وە بڵێت:

**( باسمِ اللهِ وباللهِ ،ومِنَ اللهِ وإلى اللهِ، وفي سبيلِ اللهِ، وعلَى مِلَّةِ رَسولِ اللهِ ﷺ )** تەنها بەناوی خوداوە، وە بەسەبەب و یارمەتی خودا، وە هەموو نیعمەتەکان لەلایەن خوداوە، وە بۆلای ڕەزامەندی خودا، وە لە پێناوی خوادا، وە لەسەر میللەتی (حەزرەتی) پێغەمبەری خودا (صەلات و سەلامی خودای لەسەر)

ئەگەر لە ماڵی خودا نزیك بوویەوە، دەڵێت:

**(الحمدُ للهِ وسَلامٌ علَى عِبادهِ الذينَ اصْطَفَى، اللّهمَ صلِّ علَى مُحمَّد عَبدكَ ونبيِّكَ وَرَسُولِكَ وعَلَى إبراهيمَ خَليلِكَ وعَلى جَميعِ أَنبيائِكَ ورُسُلِكَ)**.

واتە: سوپاس بۆ خودا، سەلام لەسەر بەندە صەفادراوو پاڵفتەکراوەکان، ئەی خودایە صەڵات و ڕەحمەتی خۆت بڕژێنیت بەسەر (حەزرەتی) موحەممەد، بەندەو نێرراوو پێغەمبەرەکەت ﷺ، وە لەسەر خەلیل و خۆشەویستەکەت(حەزرەتی) ئیبراهیم، وە لەسەر تەواوی پێغەمبەران و خاوەن پەیامەکان، لە پاشان با دەستی بەرز بکاتەوەو بڵێت:

**(اللّهُمَّ إنِّي أسألُكَ في مَقامي هَذا، في أوَّلِ مناسِكي أَن تَتقبَّل تَوبَتي وتَتجَاوز عَن خَطيئَتي، وتَضَع عَنيِّ وِزري، الحمدُ للهِ الَّذي بلغَني بيتَهُ الحرامِ الذي جعَلَهُ مثابةً للنَّاسِ وأَمناً، وجعلَهُ مُباركاً وهدًى للعَالمين، اللّهُم : إنِّي عبدُكَ، والبلَدُ بلدُكَ والحَرمُ حرمُكَ، والبيتُ بيتُك، جِئتُكَ أَطلُبُ رحمَتكَ، وَأسأَلُك مَسألَةَ المُضطرِّ الخَائفِ مِن عُقوبَتِكَ، الرَّاجي رَحمتَكَ، الطَّالبِ مَرضاتَكَ)**

ئەی خودایە؛ من لەم شوێنە پیرۆزەی لێی وەستاوم، لەسەرەتای دەست کردنم بە مەناسیکی حەج، داوات لێدەکەم، تەوبەکەم وەربگرە، وە قەڵەمی لێبوردەیی بهێنە بەسەر تاوانەکانمدا، وە بارگرانی و تاوانەکانم لەسەر هەڵگرە، سوپاس بۆ ئەو خودایەی منی گەیاندە ماڵە حەرامکراوەکەی خۆی، کە شەڕو ئاشوبی تێدا قەدەغە کردووەو، گێڕاویەتی بە جێگای ئاشتی و ئاسوودەیی و

ئارامی گیان و ڕۆحی ئادەمیەکان، وە بە موبارەکی و مایەی ڕێنمایی هەموان دروستی کردووە، ئەی خودایە: من بەندەی تۆم، شارو حەرەم و ماڵ و بەیتیش تایبەتە بە تۆوە، هاتووم بۆ خزمەتت، داوای ڕەحمەت و بەخشندەییت لێدەکەم، وەك کەسێك کە ناچار بێت، ئەوپەڕی زۆرم بۆ هاتووەو، لە حاڵەتی مەترسیدام و پەنام بۆ هێناویت، دەترسم لە تۆڵەکانت، وە بەهیوای لێبوردەییشتم، داوام وایە ڕەزامەندیت منیش بگرێتەوە.

**شەشەم:**

دەبێت ڕو بکاتە بەردە ڕەشەکە (حجرالأسود) وە بەدەستی ڕاستی مەسحی بکات، ماچی بکات و بڵێت:

**(اللَّهُمَّ أمانَتي أدَّيتُها وميثاقي وفَّيتهُ، إشهَدْ لي بالمُافاة)**[١]،

واتە: ئەی خودایە ؛ ئەوا ئەو ئەمانەتەی لەسەرم بوو گەیاندم، وەفام کرد بەو بەڵێن و عەهدەی کەدابووم، تۆیش شایەتیم بۆ بدە ئەی بەردەڕەشەکە بەوەی کە وەفام بەجێ هێناوەو، چاوەنواڕی پاداشت دەکەم.

ئەگەر نەیتوانی ماچی بکات، ئەوا با لە بەرامبەریەوە ڕابوەستێت و، ئەو نزاو پارانەوەو بەڵێن نامەیە بڵێتەوە.

لە پاشان لابەلای هیچ شتێکدا نەکاتەوە، جگە لە تەواو کردنی حەوت خولی تەواف نەبێت، کە پێی دەوترێت:

تەوافی هاتن (طواف القدوم)، مەگەر کاتێك بێت خەڵکی خەریکی نوێژی فەرز بن، یان نوێژی فەرز بێتە پێشەوە ئەوکاتە نوێژەکەیان لەگەڵدا دەکات و تەوافەکەیشی تەواو دەکات.

---

(١) في هذا الدعاء إشارةٌ الى الحديث الذي رواه الأورقي في أخبار مكة(٢٥٩/١)عن مجاهد، قال: **يأتي يوم القيامة الركن والمقام كل واحد منهما مثل ( أبي قبيس) يشهدان لمن وافاهما بالموافاة.**

# ڕستەی چوارەم

## لە تەوافکردندا ئەگەر ویستی دەستبە طەواف بکات، بۆ هاتن بێت یان تەوافەکانی تر:

## پێویستە چاودێری هەندێك فرمان هەیە بیانکات:

**یەکەم:** دەبێت ئاگای لە مەرجەکانی نوێژکردن بێت، لە تەهارەت و پاکی لە بێ دەسنوێژی و، نەبوونی پیسی بە بەرگ و لاشەو جێگای تەوافەکە، وە داپۆشینی عەورەتی خۆی، چونکە تەوافکردن بۆ خۆی نوێژە، تەنها ئەوەندە هەیە خودای گەورە ڕێگەی داوە کە قسەی تێدا بکرێت.

وە دەبێت پێش دەسپێکردنی تەواف (إضطباع) بکات، واتە ناوەڕاستی پەشتەماڵەکەی بخاتە بن باڵی لای ڕاستی، وە هەردوو لاکەیشی لەسەر شانی چەپی کۆبکاتەوە، وە لایەکیان شۆڕکاتەوە لە دواوە بەسەر شانی دا ، وە لاکەی تریش بدات بەسەر سینەیدا.

وە لە کاتی دەسپێکردنی طەوافدا، واز لەوتنی تەلبیە بهێنێت وخەریکی ئەو نزاو دوعایانە بێت کە باسیان دەکەین.

**دووهەم:** کاتێك لە (ئیضتیباع) لێبوویەوە.. با ماڵی خودا بخاتە لای چەپیەوە، وە لای (حجرالأسود)دا بووەستێت، تۆزی خۆی بخاتە دواوە، بۆ ئەوەی بەردەکە بکەوێتە بەرامبەری، دەبێبە هەموو لاشەیەوە، لەسەرەتای تەوافەکەیدا بچێت بەبەردەمی هەموو بەردەکەدا، با لە نێوانی ئەوو کەعبەی پیرۆزدا ئەندازەی سێ هەنگاو بەینیان هەبێت، بۆ ئەوەی نزیك بێت لە بەیتەوە، ئەوە خێری زیاترە، وە بۆ ئەوەش کە تەوافەکەی نەکەوێتە سەر (شاذروان)ەوە، ئەوەی بکەوێتەسەری، ئەوە تەوافی لە ناو بەیتدا کردووە، نەیکردووە بە دەوریدا، شازروانیش ئەو زیادەیە لە پانایی دیوارەکانی بەیت، دوای ئەوەی

سەرەوەی دیوارەکە تەسك بوویەوە، ئیتر لەو جێگایەوە تەواف دەست پێدەکات.

## سێیەم: دەبێ پێش ئەوەی لە بەردەکە تێ بپەڕێت بڵێت:

**(باسمِ اللهِ واللهُ أكبَرُ، اللَّهُمَّ إيماناً بِكَ وتَصديقاً بِكِتابِكَ، ووَفاءً بِعَهدِكَ، واتِّباعاً لِسُنَّةِ نبيِّكَ محمَّدٍ ﷺ)**.

بەناوی خوداوە، وە تەنها خوا گەورەی هەموانە، ئەی خودایە؛ ئەوا دەستم کرد بەم زیارەتە بەهۆی بڕوابوونم بە تۆ، وە بەڕاستی زانینم بۆ قورئانەکەت، وە وەفاداریشمە بۆ ئەو پەیمانەی لێت وەرگرتووین، وە شوێنکەوتنیشمە بۆ سوننەتی پێغەمبەرەکەت (حەزرەتی) موحەممەد (صەڵات و سەلامی خودای لەسەر)، لە پاشان دەستدەکات بەتەواف و یەکەمجار کە لەبەردەکە تێدەپەڕێت، دەگاتە لای دەرگای کەعبەی پیرۆز، لەوێدا دەڵێت:

**(اللَّهُمَّ هذا البيتَ بيتُكَ وهذا الحرَمُ حرَمكَ، وهذا الأمنُ أَمنُكَ، وهذا مَقامُ العائِذِ بِكَ مِنَ النَّارِ)**.

ئەی خودایە ؛ ئەم ماڵەماڵی تۆیە، ئەم حەرەمە حەرەمی تۆیە، ئەم هێمنی و ئاسایش و بێ دەنگییە لەتۆوەیە، ئێرەش شوێن و جێگای ئەوانەیە کە پەنات پێدەگرن لە ئاگر. لەکاتی ناوبردنی مقام دا، بەچاوی هێما دەکات بۆ مقامی پیرۆزی (حەزرەتی) ئیبراهیم، (سەلامی خودای لەسەر) وە دەڵێت:

**(اللَّهُمَّ إنَّ بيتَكَ عَظيمٌ، وَوَجهَكَ كَريمٌ، وأنتَ أَرحَمُ الرَّاحمينَ، فَأَعِذني مِنَ النَّارِ، ومِنَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ، وحَرِّمْ لَحمي ودَمي مِنَ النارِ، وَآمِنِّي مِن أَهوالِ القِيامَةِ، واكفِني مؤنةَ الدُّنيا والآخِرةِ)**.

ئەی خودایە بەڕاستی ئەم ماڵەی تۆ گەورەو مەزنە، ڕوخساری پیرۆزی تۆ بەڕێزە، تۆیش لە هەموو بەسۆزەکان بەبەزەیی و بە ڕەحم تری، کەواتە بمپارێزە لە ئاگر، وە لامدە لەشەڕی شەیتانی دوورخراوە، وە گۆشت و خوێن و ئێسکم لە ئاگر بپارێزە، وەلە ناڕەحەتی و سەختییەکانی دوارۆژ بمپارێزە، وە بژێوی و

پێداویستی دونیاو دوارۆژم بۆ دابین و مسەوگەر بکە.

لەپاشان دەس دەکات بەتەسبیحات و حەمدوسەنای خودا کردن تا دەگاتە ڕوکنی عێراقی، لەوێدا دەڵێت:

**(اللّهمّ إني أعوذُ بِكَ مِنَ الشِركِ والشَّكِ، والكُفرِ والنَفاقِ، والشِّقاقِ وسوءِ الأخلاق، وسوءِ المَنظَرِ في الأهلِ والمالِ والوَلَد)،**

خودایە گیان؛ من پەنات پێدەگرم لە شەرێك بۆتۆ دانان و، گومان کەوتنەدڵ و، کوفرو بێباوەڕی و، دووڕوویی و لێکترازان و، دووبەرەکی و بەدڕەوشتی، وە گەڕانەوە بۆ ماڵەوە بەشێوەیەك کە ڕوخسارێکی ناشرینمان نەبێت، یان بچینەوە بەسەر دیمەنی نەخوازراودا، لە خاوخێزان و ماڵ ومنداڵ.

کە گەیشتە (میزاب) پلووسکی ڕەحمەت بڵێت:

**(اللّهمّ أظلّني تَحتَ ظِلِّ عَرشِكَ، يَومَ لاظِلَّ إلاّ ظِلُّ عَرشِكَ، اللّهمّ اسقِني بِكَأسِ مُحَمَّدٍ صلى اللهُ عليهِ وسلَّم، شُربةً لاأظمَأُ بَعدَها أبَداً).**

ئەی خودای میهرەبان؛ لەژێر سێبەری عەرشی خۆت جێگەم بکەرەوە، لەو ڕۆژەی کە هیچ سێبەرێك نامێنێت، جگە لەو سێبەرەی عەرشی تۆ نەبێت، ئەی خودایە؛ بەو جام و گڵاسەی دەستە پیرۆزەکانی (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ لە ئاوی کەوسەر تێراوم بکە، تا هەرگیز ڕوبەڕووی تینوێتی نەبمەوە.

کاتێکیش گەیشتە ڕوکنی شامی دەڵێت: **(اللّهمّ اجعَلهُ حجّاً مَبروراً، وسَعياً مَشكوراً، وذنباً مغفوراً، وتِجارَةً لَن تَبورَ، يا عَزيزُ يا غَفور، ربِّ اغفِرْ وَارحَم، وتَجاوَز عَمَّا تَعلَم، إنَّكَ أنتَ الأعَزُّ الأكرَم)،**

خوایە بیگێڕیت بە حەجێکی وەرگیراوو، صەفاو مەروەیەکی پەسەندو، کۆششێکی سوپاسکراو، وە گوناهێکی لێخۆش بوو، وە بازرگانیەکی بێ زیان وزایەنەبوو، ئەی خاوەنی دەسەڵات و لێبوردەیی، ئەی پەروەردگاری بەبەزەیی، لێم خۆش ببەو بەزەییت بێتەوە پیامدا، لێم ببورە لەوەی دەیزانیت بەرامبەرم، بەڕاستی هەر تۆی کە عەزیزو بەتواناو بەڕێزو دەسەڵاتداریت.

وە لە نێوانی ڕوکنی یەمانی وبەردەڕەشەکەدا بڵێت:

**(اللَّهُمَّ إِنِّي أعوذُ بِكَ مِنَ الكُفرِ ، وأعوذُ بِكَ مِنَ الفقرِ، ومِن عَذابِ القَبرِ، ومِن فِتنَةِ المَحيا والمَمات، وأعوذُ بِكَ مِنَ الخِزيِ في الدُّنيا والآخِرة).**

ئەی خودایە: من پەنات پێدەگرم لە کوفرو بێباوەڕی، پەنات پێدەگرم لە هەژاری، وە لەسزای ناو گۆڕ و هەموو فیتنەو تاقیکردنەوەکانی ژیانی دونیاو دواڕۆژ،وە پەنات پێدەگرم لە هەڵخلیسکان و ڕسوایی ژیانی دونیاو ڕۆژی دوایی.

وە لە نێوانی ڕوکنی یەمانی و بەردە ڕەشەکەدا دەڵێت:

**(اللَّهُمَّ: ربَّنا آتِنا في الدُّنيا حَسَنةً وفي الآخِرَةِ حسَنةً، وقِنا عَذابَ النَّار).**

ئەی خودایە، لە دونیادا چاکەیەکمان پێ بدەو لە دواڕۆژیشدا لەو چاکەو میهرەبانی خۆتە بێبەشمان مەکەو پێمان ببەخشە، وە لە ئاگری دۆزەخیش بمانپارێزە. وە کاتێك گەیشتە بەردەڕەشەکە(حجر الأسود) با بڵێت:

**(اللَّهُمَّ اغْفِرْ لي بِرَحمَتِكَ، أعوذُ بِرَبِّ هذا الحَجَر، مِنَ الدَّينِ والفَقرِ، وضيقِ الصَّدرِ، وعَذابِ القَبرِ)**، خوایە بە ڕەحمی خۆت لێم خۆش ببە، نەك بەهیوای کردەوەکانی خۆم بم، پەنادەگرم بە پەروەردگاری ئەم بەردە، لەوەی دوچاری قەرزو قۆڵەو هەژاری ببم، وەتوشی هەناسەساردی و تەنگەنەفەسی ببم، وە تووشی سزای ناو گۆڕ ببم.

ئیتر لەم کاتەدا خولێك لە تەوافەکانی تەواو دەکات و، بەم شێوەیە حەوت خولی تەواو بەدەوری کەعبەدا دەسوڕێتەوە، وە هەمان ئەم نزاو دوعایانە دەخوێنێت لە هەموو خولەکاندا.

**چوارەم:** لەسێ خوولی یەکەمدا بەشێوەی (ڕەمل) بڕوات، واتە: پەلە بکات لە ڕۆشتنەکەیدا، بە شێوەی هەنگاوی کورت کورت و خێراخێرا، نەك بەشێوەی هەروەلەو توندڕۆشتن، وە لەسەروو ڕۆشتنی ئاساییەوە، بەڵام لە چوار خولەکەی تریدا بە شێوەی ئاسایی دەڕوات.

وە مەبەست لەم توند ڕۆشتن و شێوەی دەرخستنی قۆڵی ڕاستە ئەوەیە:

بیگەێنێت کە بەهێزو بە توانا و چالاك و ئازایە، بە دڵنیاییەوە ئەمەبووە مەرامی یەکەمجار، بۆ ئەوەی چاوشکێنێك بێت بۆ بێبڕواکان و، لەپاشان بوویە سوننەت و هەروا مایەوە.[1] ،

وە باشتر وایە بە خێرایی و هەنگاوی کورت بڕوات، لە گەڵ ئەوەدا نزیك بێت لە بەیتەوە، ئەگەر لەبەر قەرەباڵخی بۆی نەدەکرا، با بچێتە دەرەوە بۆ کەناری حەوشەی کەعبە ، لە دووری کەعبەوە بێت و، بەشێوەی (ڕەمل) بڕوات خێری زیاترە، ، وە سێ جار بە شێوەی ڕەمڵ تەواف بکات، لە پاشان بۆ خولەکانی تر لە کەعبە نزیك ببێتەوە، بۆ ناو قەرەباڵخی و ئیتر بە شێوەی ئاسایی لە خولی چوارەمەوە بڕوات.

وە ئەگەر بۆی دەگونجا لە هەموو خولێکدا دەست لە بەردەڕەشەکە بدات، ئەوە باشترە، وە ئەگەر زۆری و تێرژانی خەڵکەکە نەیدەهێڵا، ئەوا با بەدەس هێمای بۆ بکات و، سەلامی لێبکات و، دەستی خۆی ماچ بکاتەوە.

هەروەها بەم شێوە بکات، لە سەلام کردن لە ڕوکنی یەمانی و دەست پیا هێنانی، وەك دەگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ دەستی دەهێنا بە ڕوکنی یەمانیدا و ڕوومەتیشی دەخستە سەری[2] ،

---

(١) كما روى أبوداوود(١٨٨٧)و، وابن ماجه(٢٩٥٢)، عن عمر بن الخطاب (رضي الله عنه) قال: فيمَ الرملانُ اليومَ والكشفُ عَن المناكب وقد أَطَّأَ الله الإسلام ونفى الكفر وأهله؟ مع ذلك لاندع شيئا كنا نفعله على عهد رسول الله ﷺ . وأما الرمل وحده فقد روى حديثه البخاري (١٦٠٢)، ومسلم (١٢٦٤)، عن ابن عباس (رضيَ الله عنهما) قال: **قدم رسول الله ﷺ وأصحابه فقال المشركون ، إنَّه يقدم عليكم، وقد وهنهم حمَّى يثرب، فأمرهم النبي ﷺ أن يَرملُوا الأشواط الثلاثة، وأن يمشوا ما بين الركنين ، ولم يمنعه أن يأمرهم أن يرملوا الأشواط كلها، إلا الإبقاء علَيهِم.**

(٢) أما إستلام الركن اليماني ، ففي البخاري (١٦٦) ومسلم (١٢٦٧)، وأما تقبيله ( فهو عند

وەئەگەر کەسێك ویستی بە تایبەتی بەردەکە ماچ بکات، وە بۆ ڕوکنی یەمانی تەنها دەستی پیا هێنا، ئەوە باشترە، چونکە ڕیوایەتی ماچکردنی بەردەکە مەشهور ترە.[1]،

**پێنجەم:** ئەگەر حەوت سوڕی تەواڤی تەواو کرد، با بێتە بەردەم جێگای (ئیلتیزام)، لە نێوانی بەردەکەو دەرگای کەعبەدا خۆی پێدا هەڵدەواسێت، جێگای قەبووڵ بوونی نزاو پاڕانەوەیە [2]، با خۆی بلکێنێت بە کەعبەوە و، خۆیی پیاهەڵواسێت، بە تایبەتی بەڕوکنەکانیەوە خۆی هەڵواسێت، وە سنگی بلکێنێت بە بەیتەوە، ڕومەتی ڕاستیش بخاتە سەر کەعبەی پیرۆزو، باڵەکانی و هەردوولەپی درێژکاتەوە بەسەر کەعبەدا و بپاڕێتەوەو بڵێت:

**(اللَّهُمَّ ربَّ البيتِ العَتيق، أعتق رَقَبَتي مِنَ النَّار، وأعِذني مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم، وأعِذني مِن كُلِّ سوء، وقَنِعني بِما رَزَقتَني، وبارِك لي فيما آتيتَني، اللَّهُمَّ؛ اجعَلني مِن أكرَم وَفدِكَ عَلَيكَ)**[3]،

ئەی خودایە؛ پەروەردگاری ئەو بەیت و ماڵەی کە لە هەموو زۆردارێك ئازادت کردووە، گەردنی منیش لە ئاگر ئازاد بکە، وە لە شەڕی شەیتانی ڕەجمکراو بمپارێزە، وە لەهەموو خراپەیەکەوە دوورمخە، وە وام لێبکە ڕازیبم و قەناعەتم هەبێت بەو ئەندازەی کە ڕزقت داوم، وە بەرەکەتیش برژێنە بەسەر ئەو ماڵەی کە پێت داوم، ئەی خودایە؛ وام لێبکە یەکێك بم لەو وەفدە

---

البخاري في (التأريخ الكبير) (١/٢٨١)، وأما تقبيله مع وضع الخد عليه فهو عند ابن خزيمة في صحيحه(٢٧٢٧)، والدارقطني (في سننه) (٢/٢٩٠)، والحاكم في المستدرك (١/٤٥٦).

(١) الأم للشافعي(٣/٤٣٠).

(٢) كما روى ذلك الأزرقي في أخبار مكة (١/٢٧٧).

(٣) ئەم شێوەی کە ئیمامی غەزالی باسی دەکات لە چۆنیتی (مولتەزیم) بۆ دۆعاکانی لەم فەرموودەی أبو داوود وەرگیراوە (١٨٩٩)، وە نەسائی (٥/ ٢٢٠)، وە ئیبن و ماجە(٢٩٦٢).

ڕێزلێگیراوانەی کە سەردانی جەنابتیان کردووە.[1]،

لەپاشان با زۆر سوپاسی خودا بکات، لەم جێگە پیرۆزەدا، وە صڵاوات بدات لە گیانی (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ، وە لەسەر هەموو پێغەمبەران (صەلات و سەلامی خودایان لەسەر)، وە داوا بکات بۆ کارە تایبەتیەکانی خۆی، وە داوای لێخۆش بوون بکات لە گوناهەکانی، هەندێك لە زانایانی پێشینەی صاڵحان ئەیانفەرموو بە ژێردەستەکانیان:

لێم دووربکەونەوە تا لێرەدا لە حزووری خودای خۆمدا دان بە گوناهو تاوانەکانمدا بنێم.

**شەشەم:** ئەگەر لەمەیش لێبوویەوە، پێویستە لە پشتی مقامی (حەزرەتی) ئیبراهیمەوە دووڕکات نوێژ بکات، لە یەکەمیاندا سوورەی (قل یا أیها الکافرون) بخوێنێت، وە لە ڕکاتی دووهەمدا سوورەی (ئیخلاص) بخوێنێت، کە پێیان دەوترێت: دوو ڕکاتی سوننەتی تەواف، وەك زوهەری فەرموویەتی.

هەروا بەسوننەت دانراوەو چەسپاوە؛ وەك پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی[2]،کە بۆ هەموو حەوت سوڕانەوەو تەوافێك دووڕکات نوێژ بکرێت[3]، وە ئەگەر سێ

---

(١) ئەو شێوەی ئیمامی غەزالی باسی دەکات، بۆ مولتەزیم. وەرگیراوە لەو فەرموودەی کە ئەبوداوود ڕیوایەتی کردووە (١٨٩٩)، وە نەسائی (٥/٢٢٠)، وە ئیبن و ماجە(٢٩٦٢).

(٢) قال الحافظ العراقي: رواه ابن أبي حاتم، من حديث ابن عمر، أن **النبي ﷺ قرن ثلاثة أطواف ليس بينها صلاة**، ورواه العقيلي في (الضعفاء) وابن شاهين في أماليه، من حديث أبي هريرة، وزاد: **ثم صلى لكل أسبوع ركعتين**، إتحاف السادة،( ٣٥٧/٤) وعقد ابن أبي شيبة في مصنفه( ٥٥٠/٨)، باب في القران بين الأسباع، ومن رخص في ذلك ولم يرو فيه حديثا مرفوعا، بل نقل فعل ذلك عن عائشة ومجاهد والمسرور بن مخرمة وطاووس وعطاء وسعيد بن جبير، وعلي بن الحسين. (رضي الله عنهم)

(٣) رواه ابن أبي الشيبة في المصنف(١٥٠٢٨)، **مضتِ السُّنَّةُ أن يُصَلَّى لِكُلِّ أسبوعٍ ركعتان، الأسبوع، يعني: سبع طوفات. ويقال: سبوع.**

تەوافی تەواوی کرد، واتە هەرجارەی حەوت کەڕەت تەوافی کردو دیسان دەستی دەکردەوە بە تەوافێکی تر، بەم شێوە تا سێ جار،

واتە: بیست و یەکجار سوڕایەوە بەدەوری کەعبەدا و، هەموو جارێك نیەتی تەوافێکی نوێی دەهێنا، ئەوە کارێکی دروستی کردووەو، دەتوانێت لە پاشان دوو دوو ڕکاتەکان بکاتەوە بە سێ سەلام دانەوە،

وە هەموو حەوت سوڕانەوەیەك بە یەك تەواف دەژمێررێت، وە دوای تەواو کردنی دووڕکاتی تەواف با بڵێت:

**( اللَّهُمَّ يَسِّرْ لِيَ اليُسرى، وجَنِبنِيَ العُسرىَ، واغفِرْ لي في الآخِرَةِ والأُولى، اعصِمني بِأَلطافِكَ حتَّى لاأعصيكَ، وأعِنِّي على طاعَتِكَ بِتَوفيقِكَ، وجَنِّبني مَعاصيكَ، واجعَلني مِمَّن يُحِبُّكَ ويُحِبُّ مَلائِكَتَكَ ورسُلَكَ، ويُحِبُّ عِبادَكَ الصالحين، اللَّهُمَّ حَبِّبني إلى مَلائِكَتِكَ ورُسُلِكَ، وإلى عِبادِكَ الصَّالِحين، اللَّهُمَّ فَكما هَدَيتَني للإسلام، فَثَبِّتني عَلَيهِ بأَلطافِكَ وولايَتِكَ، واستَعمِلني لِطاعَتِكَ وطاعَةِ رسلِكَ ، وأجِرني مِن مُضِلاَّتِ الفِتَنِ)**

واتە: ئەی خودایە؛ کارەئاسانەکانم بۆ وا ئاسان بکە، بتوانم بیانکەم، وە لایشم بدە لە کارە قورسەکان، وە خۆش ببە لە هەموو گوناهە تازە و کۆنەکانم، بە لوتف و میهری خۆت بم پارێزە تا بێ گوێیت نەکەم، وە لەسەر تاعەت و گوێڕایەڵیت یارمەتیم بدە بە ڕێنمایی و تەوفیقی خۆت، وە بمپارێزە لە وەی بکەومە ناو گوناه و بێ فرمانیتەوە، بمگێڕە لەوانەی تۆیان خۆش دەوێت، وە فریشتەو پێغەمبەرەکانتیان خۆش دەوێت، وە بەندە صالّح و خواناسەکانیان خۆش دەوێت.

ئەی خودایە: منیش خۆشەویست بکە لە دڵی مەلائیکەو پێغەمبەرەکانت و، لای بەندە صالّحەکانت .

ئەی خودایە؛ وەك چۆن ڕێنماییت کردم بۆ ئیسلامەتی، دەی لەسەر ڕێگاکەیشی دامبمەزرێنەو، بە لوتف وسەرپەرشتیاری و کەرەمی خۆت، بەکارم

بهێنه له گــوێڕایه‌ڵی خۆتدا، وه فه‌رمـــان به‌رداری

پێغه‌مبه‌ره‌که‌تدا، وه بمپارێزه له هه‌موو هه‌ڵدێرو ڕێگا گومڕاکه‌ره‌کان.

له پاشان بابگه‌ڕێته‌وه بۆ لای(حجرالأسود) به‌ردەڕه‌شه‌که‌و، ده‌ستێکی پیا بهێنێت و کۆتایی به طه‌وافه‌که‌ی بهێنێت،

پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی:

**( مَنْ طافَ بالبَيتِ أُسبوعاً، وصَلَّى رَكعَتَينِ فَلَهُ مِنَ الأَجرِ كَعِتقِ رَقبة)**[١].

ئه‌وه‌ی به ده‌وری که‌عبه‌و ماڵی خوادا حه‌وت جار بسوڕێته‌وه‌و ته‌وافی بكات، وه له‌پاشان دوو ڕكات نوێژیش بكات، وه‌ك ئه‌وه وایه كه به‌نده‌یه‌كی له ڕێی خوادا ئازاد كردبێت.

ئه‌مه‌ی كه باسمانكرد باسی چۆنیه‌تی ته‌وافكردن بوو.

جگه له زۆربه‌ی ئه‌و مه‌رجانه‌ی بۆ نوێژكردن پێویسته، كه له و كه‌سه‌ی ته‌واف ده‌كات ده‌بێت تیایدا بێته دی، هه‌روه‌ها ده‌بێت حه‌وت جاری ته‌واو به چوارده‌وری هه‌موو به‌یتا ته‌واف بكات، وه له به‌رده ڕه‌شه‌كه‌وه ده‌ست پێبكات و ماڵی خودا (به‌یت) بخاته لای چه‌پیه‌وه، وه له ناو مزگه‌وته‌كه‌دا ته‌واف بكات و له ده‌ره‌وه‌ی به‌یت و كه‌عبه‌ی پیرۆز، نه‌ك بچێته سه‌ر (شازروان)، ئه‌و دیواره‌ی له ده‌ره‌وه‌ی حیجره.

وه نابێت بچێته ناو حیجری (حه‌زره‌تی) ئیسماعیلیشه‌وه، چونكه ئه‌وه به ناوه‌وه‌ی كه‌عبه ده‌ژمێررێت، وه ده‌بێت ته‌وافه‌كانی و خوله‌كانی یه‌ك له دوای یه‌ك بێت، نابێت له حاڵی نائاسایی ده‌ربچێت.

له‌دوای ئه‌م مه‌رجانه ئه‌وه‌ی كه باسكراون، هه‌مووی سوننه‌ت و ئاداب و شێوه‌ی كه‌ماڵی ته‌وافه‌و له واجباتی نیه.

---

(١) رواه الترمذي (٩٥٩) والنسائي (٢٢١/٥)، وابن ماجه (٢٩٥٦).

# ڕستەی پێنجەم:

## لەبارەی سەعی نێوانی صەفاو مەروە

ئەگەر لە تەواف لێبوویەوە،[1] با دەرچێت لە حەوشی کەعبە بەرەو صەفا، کە لە بەرامبەری ئەو لایەدایە کە لە ڕوکنی یەمانی و بەردەکە بۆی دەڕۆیت، تا لە دەرگاکە دەچیتە دەرەوە، وە دەگەیتە بەرزایی صەفا، کە کێوی صەفای پێدەڵێن، بە پێپیلکانە بە قەد بەرزایی صەفادا بەرزدەبێتەوە بە ئەندازەی باڵای پیاوێك، پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە بەرزدەبوویەوە تا کەعبەی لێوە دەردەکەوت[2]،

سەرەتای سەعی، لە ئەصڵی سەرکەوتنی بناری گردەکەوە باشەو، سەرکەوتنیشی بۆ سەرتر خێری زیاترەو کارێکی باشترە، بەڵام هەندێك لەو پلەکانانە تازە دروست کراون، نابێبیانخاتە پشتی خۆیەوە، بەڵکوو دەبێ سەرکەوێتەسەریان و، ئینجا دەست پێبکات، بەم شێوە لە سەر صەفاوە سەعی دەست پێدەکات بۆ مەروە، تا حەوت ئەمسەرەو سەر دەکات.

وە کاتێك بەرزدەبێتەوە بۆ سەر صەفا، پێویستە ڕوبکاتە بەیتەوەو لێی دیاربێت و بڵێت:

**( اللَّهُ أَكبرُ، اللهُ أَكبرُ، الحمدُ للهِ على ماهَدانا، الحَمدُ للهِ بِمَحامِدِهِ كلِّها علَى جَميعِ نِعَمِهِ كُلِّها، لاإلهَ إلاَّ الله، وحدهُ لاشَريكَ له، لهُ المُلكُ ولَهُ الحَمدُ يُحيي ويُميتُ بيَدِهِ الخَيرُ، وهُوَ على كلِّ شَيْءٍ قَدير، لاإلهَ إلاَّ اللهُ وَحدَهُ، صَدقَ وَعدَه، ونصَرَ عَبدَهُ، وأَعزَّ جُندَهُ، وهزَمَ الأَحزابَ وحدَهُ، لاإلَهَ إلاَّ اللهُ مُخلِصينَ لهُ الدين، ولَو كَرِهَ الكَافِرون، لاإلَهَ إلاَّ اللهُ مُخلِصينَ لهُ الدِّينَ،**

---

(١) واتە دوای تەواف و دوو ڕکاتەکەو سەلام لە بەردەکەو نزاو دۆعاکان، لەگەڵ خواردنەوەی ئاوی زەمزەم. بنواڕە: الإتحاف ( ٤/ ٣٦٠)

(٢) وەك موسلیم لە فەرموودەیەکی درێژدا باسی دەکات (١٢١٨).

**الحَمدُ للهِ ربّ العَالَمين...**

**﴿فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ ، وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ ، يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ، وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِرُونَ﴾** (٢٠ /الروم)

**اللَّهُمَّ إِنِّي أَسأَلُكَ إيماناً دائماً، وَيَقيناً صادِقاً، وعِلماً نافِعاً، وقَلباً خاشِعاً، ولِساناً ذاكِراً، وأَسأَلُكَ العَفُوَ والعافِيَةَ والمُعافاةَ الدَّائِمة في الدّينِ والدُّنيا والآخِرة )**

دوای دووبارەکردنەوەی بڕیاردانی گەورەیی کە تەنها تایبەتە بە خوداوە، سوپاسی خودا دەکات، کە ڕێنمایی کردووە بۆ ئەو نیعمەتانە، سوپاس بۆ خودا بە هەمو ئەو صیفەتەچاکانەی شایستەی سەناو ستایشە لەسەر هەموو نیعمەتەکانی، هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە (الله)، تاك و تەنهاو بێ هاوەڵە، موڵك و ستایش تەنها بۆ ئەوە، دەمرێنێت و زیندوودەکاتەوە، خێرو چاکەی بەدەستە، وە بە تواناو دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا، تەنها خودایە پەرستراوی ئێمەیە، بەڵێنی خۆیی بردەسەر، یارمەتی بەندەکانی دا، سەرکەوتن و سەربەرزی دا بە سەربازەکانی، وە گرۆو تاقمی ئەحزابەکانی ڕوخاندو تێکی شکاندن.

تەنها خوداوەندی گەورە شایاوی پەرستنە، خاوەنی ئاینی ئیسلامەو، ئێمەش بە ئیخلاص و متمانەی تەواوە بەندایەتی بۆ دەکەین، با کافرەکانیش پێی بێزارو ناڕازیبن، هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە (الله)، بە ئیخلاصەوە تەواوی فەرمانی ئاینەکەمان بۆ حزوری ئەو دەگێڕینەوە، حەمدو سەنای بەردەوامی پەروەردگاری هەردوو جیهان دەکەین، پاکو بێگەردی بۆ خودایە کاتێك دەکەونە ئێوارەوەو، کاتێکیش کە ڕۆژ دەبێتەوە، سەناو ستایش بۆ خودایە لە ئاسمانەکان و لە زەویدا و، کاتێك دەکەونە شەوەو کاتێکیش دەکەونە

نیوەڕۆوە، ئەو خودایە کە زیندوو لە مردوو دەردەکات و مردوویش لە زیندوو، زەویش دەژێنێتەوە پاش مردنی و، ئێوەش هەر بەم جۆرە لە گۆڕ دەردەکرێن و زیندوو دەکرێنەوە، یەکێ لە نیشانەکانی توانایی خودا ئەوەیە:

ئێوەی لە گڵ دروست کردووە، چونکە ئادەمیزاد هەمووی نەوەی ئادەمن و لە گڵ دروست کراون و ، پاش ئەوە ئێوە بڵاوەی لێدەکەن بە هەموو لایەکی جیهاندا.[1]

لەپاشان صڵاوات لە دیداری پێغەمبەر ﷺ دەدات و، دوای ئەم پاڕانەوانەیە بۆ هەرچی دەیەوێت دوعاو نزای خۆی دەکات، لە پاشان دادەبەزێت و دەستدەکات بە سەعی و دەڵێت:

**(ربِّ اغفِر وارحَم ، وتَجاوَز عَمَّا تَعلَم، إنَّكَ أَنتَ الأَعَزُّ الأَكرَمُ، ﴿رَبَّنَا ؛ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾** (البقرة٢٠١)

خودایە ؛ لێم خۆش ببەو بەبەزەیی بە لەگەڵمدا، ئەوەی دەیزانی لە بارەمەوە بە چاوی لێبوردەییوە سەیری بکەو، هەر تۆی بەڕاستی خاوەنی دەسەڵات و، بە بەرزی و شکۆمەندی و خاوەن ڕێزەوە دەمێنیتەوە، ئەی خودایە؛ لە دونیادا چاکەیەکمان پێ بدەو، لە دوارۆژیشدا لەو چاکەو میهرەبانی خۆتە بێبەشمان مەکەو پێمان ببەخشە، وە لە ئاگری دۆزەخیش بمانپارێزە.

وە بە لەسەرخۆیی دەڕوات، تا دەگاتە ئەو میلە سەوزەی (داگیرساوە)، کە یەکەم شتێکە لە صەفاوە کە دابەزی پێی دەگات، لە لای سووچی مزگەوتی حەرامەوەیە، ئەگەر لە نێوانی ئەوو گەیشتن بە ئاستی میلەکە شەش زیراعی ما (سێ مەتر)، دەستبکات بە ڕۆشتنی خێرایی، کە پێی دەوترێت (الرمل)، واتە خێرا

---

(١) خولاصەی تەفسیری نامی(٤٠٦).

ڕۆشتن، بە شێوەی خێراکردنی ڕۆشتن و کورتکردنەوەی هەنگاوەکانی، تا دەگاتە میلە سەوزەکەی تر، ئیتر خاوی بکاتەوەو بە ئاسایی بڕوات.

کاتێك کە دەگاتە مەروە، بەرزبێتەوە، وەك چۆن لە صەفادا بەرز بوویەوە، وە ڕووی خۆی دەکاتە بەرزایی صەفاوە، وە هەمان دوعای پێشوو دەکات، بەم شێوە سەعیەکی تەواوی کردووە، ئەگەر گەڕایەوە بۆ صەفا، دەبێت بە دووجار، بەم شێوە حەوت جار هاتوچۆ دەکات، لە هەر جێگەیەکدا شوێنی خێرایی بێت، خێرای بکات، لە شوێنە ئاساییەکانیشدا خاوی بکاتەوە، وە هەموو جارێکیش سەرکەوێتە سەر صەفاو بەرزایی مەروە.

کاتێك ئەم هاتوچۆیەی تەواو کرد، ئەوە لێدەبێتەوە لە تەوافی هاتن و، لە هاتوچۆی نێوانی صەفاو مەروە، کە هەردووکیان سوننەتن، وە دەستنوێژو پاکوخاوێنیش سوننەتە بۆ هاتوچۆ کردنەکە، بەڵام پێویست نیە، بەڵام بۆ تەواف پێویستە.

وە ئەگەر سەعی تەواو کرد، ئیتر پێویست ناکات دوای ئەوەی وەستانی عەرەفەی تەواو کرد دووبارە ئەم هاتۆچۆو سەعییە بکاتەوە، وە بەم جارەی کە کردوویەتی بەسە بۆ جێبەجێکردنی ڕوکنەکەی، چونکە نەوتراوە:

مەرجی سەعی ئەوەیە کە بکەوێتە دوای وەستانی ناو عەرەفەوە، بەڵام ئەو کردنی صەفاو مەروە لە دواوە، بۆ ئەو کاتەیە کە لە دوای تەوافی ڕوکن کردبێتی، هەموو تەوافێك کە ڕوکنی حەج بێت یان ڕوکنی عومرە بێت، ئەوە دەبێت لە دوای ئەویش سەعی صەفاو مەروە بکرێت.

بەڵێ ئەوەندە هەیە مەرجی هەموو سەعی و هاتوچۆیەك ئەوەیە: کە لە دوای تەوافێکەوە بێت، ئیتر هەر تەوافێك بێت.

کەواتە ئەگەر پێش تەواف سەعی کرد. ئەوا لەسەری ناکەوێت و، دەبێت بیکا تەوە. دیارە مەبەستیش تەوافی خوداحافیزی نیە، چونکە لەدوای خوداحافیزی جارێکی تر مەناسیکی تر ناکرێت، وەك صەفاو مەروەو هاووێنەکانی.

# ڕستەی شەشەم:

## باسی مانەوەی عەرەفە و ئەوەی لە پێشیەوە دەکرێت

ئەگەر حاجی لە ڕۆژی عەرەفەدا گەیشتە عەرەفات، ئەوە با خۆی تەرخان نەکات بۆ تەوافی هاتنی مەککەو چوونە ناو مەککە، لە پێش ئەوەی وەستانی عەرەفەی تەواو دەکات، بەڵام ئەگەر پێش چەند ڕۆژێك گەیشتە بەرەوە، با لە پێشەوە تەوافی قدووم و هاتنە ناو مەککە بکات، وە بە ئیحرامەوە بمێنێتەوە تا ڕۆژی حەوتەمی (ذي الحجة)[1] ، ئەو کاتە ئیمام لە مەککە وتارێك دەدات، لە دوای نیوەڕۆ لەپاڵ کەعبەدا ، وە فەرمان دەدات بە حاجییەکان بکەونە ڕێ بەرەو مینا (مونا)،(ڕۆژی تەرویە)، [2]، وە مانەوەیان لە مونا، وە بۆ بەیانی داهاتوو ڕێبکەون بەرەو عەرەفە، بۆ ئەوەی فەرزی وەستان لە عەرەفە ئەنجام بدەن ، کە دوای زەوال و ترازانی خۆرە لە ناوەڕاستی ئاسمان، چونکە وەختی وەستانی عەرەفە، لە دوای نیوەڕۆوە دەست پێدەکات، تا هەڵاتنی گزنگی بەرەبەیانی ڕۆژی ئایندە، (تا فەجری صادیق)ی ڕۆژی یەکەمی قوربان.

پێویستە حاجی بەرەو (مونا) بە دەنگی تەلبیەو (**لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لبَّيكَ**)ەوە بڕوات، وە وا چاکە لە مەککەوە بە پیادە ڕەوی بڕوات بۆ مونا و بۆ جێبەجێکردنی هەموو مەناسیکەکانی، تا تەواویان دەکات بە پیادە ڕەوی بێت،

---

(١) واتە: ئەگەر بە نیەتی حەج نەهاتبێت، بەڵکو موتەمەتیع بێت، واتە دوای تەواوکردنی مەناسیکی عومرە،دەیشکێنێتوچاوەنواڕی ڕۆژانی حەوتی مانگ دەکات کەحەج دێتە پێشەوە.

(٢) بۆیە پێی دەوترێت ڕۆژی تەرویە، چونکە کاتی خۆی وشترەکانیان تێر ئاو دەکرد بۆ ئەوەی بەرگەی ڕۆژی عەرەفە بگرن ، چونکە لە وێ ئاو نەبوو. وە هەندێك لە زانایان دەفەرموون: لەبەر ئەوەیە کە ئیمام ڕێنماییان دەکات ئەرك و پێداویستییەکانیان چییە، وە دەڵێن: (حەزرەتی) ئیبراهیم لەو ڕۆژەدا بیری لە خەوەکەی کردەوە بۆ سەربڕینی (حەزرەتی) ئیسماعیلی کوڕی. الإتحاف( ٣٦٥/٤).

ئەگەر بتوانێت، وە بە پیادەیی لە مزگەوتی ئیبراهیمەوە (سەلامی خودای لەسەر) تا شوێنی وەستانی عەرەفە خێردارترو گەورەترە.

کاتێك گەیشتە (مونا) نزیك مزگەوتی (خیف) دابەزێت و، بڵێت: **(اللَّهُمَّ هذِهِ مُنىً، فامْنُنْ عَلَيَّ بِما مَنَنتَ بِهِ علَى أولياءِكَ، وأَهلِ طاعَتِكَ)**

ئەی خودایە: ئەمە زەوی مینا یە، (جێگەی خوێن ڕژان و قوربانیکردنە، یان گەیشتن بە مەقصەدو مەرام)، بمخە ژێر ئەو مینەتەی خۆتەوە، کە وەك چۆن مینەتت کردووە بەسەر دۆستان و ئەهلی تاعەتی خۆتدا. با ئەو شەوە لە مینا بمێنێتەوە، ئەمەش تەنها مانەوەی مەنزڵی ئەو شەوەیە و، ئامادەباشییە بۆ داهاتوو، ئەینا هیچ مەناسیکێك پەیوەندی بەو شەوەوە نیە،

ئەگەر ڕۆژی عەرەفەی لەسەر داهات، با نوێژی بەیانی بکات، کە خۆر هەڵات لەسەر چیای ئەبیر[1]،دەکەوێتە ڕێ بەرەو عەرەفات، وە لەڕێگەدا دەڵێت: **(اللَّهُمَّ اجعَلها خيرَ غَدوَةٍ غدوتُها قَطّ، و أَقرَبُها مِن رِضْوانِكَ، و أبعدَها مِنْ سخَطِكَ، اللَّهُمَّ إليكَ غَدوتُ، وإِيَّاكَ اعتَمَدتُ، وَ وَجْهَكَ أَردتُ، فاجعَلْني مِمَّن تُباهي بِهِ اليَومَ، مَنْ هُوَ خَيرٌ مِنِّي وأَفضَل)**[2]،

ئەی خودایە ؛ ئەم دەرچوونەم بگێڕە بە باشترین و خێردار ترین دەرچوون لە ژیانمدا، وە نزیکترینیان بێت لە ڕەزامەندی جەنابت، وە دوورترینیان بێت لە توڕەیی تان. ئەی خودایە؛ من بۆ لای حزوری تۆ ڕێگام گرتۆتەبەر، وە تەنها پشتم بەتۆ بەستووە، وە ڕەزامەندی تۆم مەبەستە، وام لێبکە، لەو کەسانەبم کە شانازیان پێوە بکەیت، بەسەر کەسانێکدا کە زۆر لەمن باشترو گەورەترن.

---

(١) ناوی کەژێکە لە میانی مەککەو مونادایە، لەلای ڕاستی ئەو کەسەیە کە لەپاڵیدا دەیەوێت بچێتە ناو مەککەوە، إتحاف ( ٤ /٤٦٦).

(٢)أراد الملائكة، ففي مسلم: (١٣٤٨)، مرفوعا: **ما مِن يَومٍ أكثرَ مِن أن يعتق الله فيه عبداً من النار من يوم عرفة، وإنه ليدنو ثمَّ يباهي بهم الملائكة فيقول: ما أراد هؤلاء.**

کاتێك هاتە عەرەفات، با خێمەی خۆی لە نزیك مزگەوتی (نەمیرە) هەڵبدات، چونکە هەر لەو شوێنەدا بوو (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ قوببەیەکی وەك کەژاوە هەڵدا، کە لە موو دروست کرابوو[١]، (نەمیرە) لە ناو مەیدانی (عورنە) دایە،[٢]، لە خواری جێگای وەستانەوەیە و، لە پێین و کەناری خوارووی عەرەفەدایە.

حاجی با خۆی بشوات بۆ وەستانی عەرەفە، ئەگەر خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لای دا، ئەو کاتە ئیمام وتارێکی کورتیان بۆ دەخوێنێتەوەو دادەنیشێت، کە وتاری یەکەمە، وە دەستدەکات بە بانگ و ئیمامیش وتاری دووهەم دەست پێدەکات،[٣]، وە بانگوێژەکە قامەتەکە دەلکێنێت بە بانگەکەوەو بەینیان ناخات، ئیمامیش لە وتار لێدەبێتەوە، لە پاشان نوێژی نیوەڕۆو عەسر بە بانگێك و دووقامەت دەکرێت، وە نوێژەکانیش کورت دەکرێتەوە، لە دوای نوێژ دەچن بۆ شوێنی ڕاوەستان، وە نابێت لە شیوی عورنەدا بووەستن، چونکە لە ناو زەوی عەرەفەدا نیە.

وە مزگەوتەکەی (حەزرەتی) ئیبراهیم (سەلامی خودای لەسەر) پێشەکەی لە ناو شیوەکەدایە، دواکەیشی لە عەرەفە دەژمێررێت، کەواتە: ئەوەی لە پێشی مزگەوتەکەوە وەستابێت، ئەوا وەستانی عەرەفەی بۆ ناژمێررێت، وە شوێنی عەرەفە بەو بەردەگەورانە دەناسرێتەوەو جودا دەکرێتەوە، کە لەو

---

(١) وەك لە فەرموودەی موسلم هاتووە، (١٢١٨، کە باسمان کرد.

(٢)عورنە: شیوێکە لە تەنیشتی عەرەفەوەیە، عەرەفە لە دەرەوەی مەککە دەژمێررێت، بەلام عورنە لە حەرەمی مەککەدایە،

(٣) واتە: ئەم وتاری دووهەمەی ئیمام لەگەڵ بانگەکەدایە، وە کۆتایی بە وتارەکەی دەهێنێت لەگەڵ تەواوکردنی بانگوێژەکە لە قامەت کردن، لە پاشان نوێژی نیوەڕۆ و عەسر بە بانگێك و دووقامەت دوکات.

ناوەدا ڕاخراوە، باشتر وایە لە پاڵ ئەو گابەردە زلانەدا بووەستێت، لە نزیکی ئیمامەوە، ڕو لەقیبلە بکات بەسواری.

با لەو جێگەیەدا هەموو جۆرەکانی تەسبیحات و تەمجیدو تەقدیسی پەروەردگار بکات، زۆر زیکری **لاإله إلا الله** و حەمدوسەنای خودای (عَزَّ وجَلْ) بکات، زۆر نزاو پاڕانەوەی هەبێت، تەوبەبکات[1]، با لەو ڕۆژەدا بە ڕۆژوو نەبێت، بۆ ئەوەی هێزی زیاتری هەبێت بۆ پاڕانەوەو ڕاوەستان لە حزوری خوادا، با لە ڕۆژی عەرەفەدا ناوە ناوە تەلبیە بکات و نەیپچڕێت، بەڵکوو باشتر وایە جارێك (**لبَّيْكَ اللَّهُمَ لبَّيكَ**) بکات و ، جارێکیش بە کوڵ دوعا بکات.

وە پێویستە لە کەنارەکانی عەرەفە دوورنەکەوێتەوەو، لێی جیا نەبێتەوە تا خۆر دەنیشێت، بۆ ئەوەی بوونی لەوێدا بەری ڕۆژ و شەویش بکەوێت، وە ئەگەر بۆی بکرێت ڕۆژی هەشتەمیش سەعاتێك لەو ناوەندی عەرەفەدا بووەستێت، نەوەکو هەڵەیەك ڕووی دابێت لە بینینی مانگدا، ئەوە حەزم و ئیرادە بەهێزی پێدەڵێن، وە ئەمینیش دەبێت کە بە دڵنیاییەوە عەرەفەی لەدەستنەچووە.

وە هەرکەسێك وەستانی ڕۆژی عەرەفەی لەکیس چوو، نەیتوانی پیا بگات تا دوای فەجری ڕۆژی قوربان، ئەوە حەجەکەی لە کیس چووەو پێویستە ئیحرامەکەی بشکێنێت، بەوەی دەستبکات بە کارەکانی عومرەو، تەواوی کرد ئیحرام بشکێنێت و، خوێنێکیش بدات، واتە: کاوڕێك سەر ببڕێت لەبەر فەوتانی حەجەکەی، وە پێویستە ساڵێکی تریش بێتەوە و حەجەکەی قەزابکاتەوە.

---

(١) کاتی پاڕانەوەو لاڵەو گریان و فرمێسك ڕشتن و دەربڕینی پەشیمانی و پرمەی گریان و هاوارو ناڵەی دڵ و دەروونە، فقد ثبت کما روى الطبراني في المعجم الأوسط (٢٩١٣) عن أبن عباس (رضي الله عنهما) قال: **رأيتُ النبي ﷺ يدعو بعرفة، بالموقف، ويداه إلى صدره، كإستطعام المسكين**، انظر الإتحاف( ٤/ ٣٧١).

با گرنگترینی کارەکانی لەم ڕۆژەدا نزاو دوعا کردن بێت، لەم شوێنە پیرۆزەداو، لەو جەمع و کۆمەڵە پڕ لە خواناسانەدا ڕجا وایە کە نزاکانی وەربگیرێت و لێی قەبوڵ بکرێت.

دوعای وەرگیراو لە (حەزرەتی) پێغەمبەرەوە ﷺ ، وە لە پێشینەی صاڵحانی ئەو زاتەوە بۆ ڕۆژی عەرەفە، ئەوە لە پێشترە بۆ دوعا پێکردنی لە نزاکانی تر.

کەواتە با بڵێت: **(لا إلهَ إلا اللهُ وحدَه لا شَريكَ لَه، لَهُ الملكُ و لَه الحَمدُ، وَ هوَ حَيٌّ لايَمُوت، بيَدِهِ الخَير، وهُو عَلى كُلِّ شَيئ قَدير**[1]**. اللَّهُم اجعَل فِي قَلبي نُوراً وفِي سَمعي نُورا، وفِي بَصَري نُوراً، وفِي لِساني نُوراً، اللَّهم: اشْرَح لِي صَدري وَيَسِّر لِي أمْري)** [2] دوای شایەتی دان بە کەلیمەی تەوحید، داننان بەوەی کە هەموو موڵك و توانا و کاروبار بەدەست خۆیەتی، بڵێت:

خودایە، نورێك بخەرە ناو دڵمەوە، وە بیخەرە ناو گوێمەوە، وە بیخە ناو چاومەوە، وە زوبانم بەنوور بڕژێنەو با بەنوور قسەبكات، خودایە؛ سینەم گوشاد بکەو، دڵنیای بکە لەسەرڕاستی و، کارەکانیشم بۆ ئاسان بکە.

هەروەها بڵێت:

**( اللَّهمَ ربَّ الحَمدِ، لكَ الحمدُ كَما نَقول، وخيراً مِمَّا نقُول، لكَ صَلاتي ونُسُكي، ومَحيَايَ ومَمَاتي، وإليكَ مآبي، وإلَيكَ ثَوابي، اللَّهُم إني أعُوذُ بكَ مِنْ وسَاوسِ الصُدورِ، وشَتَاتِ الأَمرِ، وعَذابِ القَبرِ، اللَّهُم إنِّي أعوذُ بكَ مِنْ شرِّ ما يَلجُ فِي اللَّيلِ، ومِنْ شَرِّ ما يَلجُ فِي النَّهار، ومِنْ شرِّ ما تَهُبُّ به الرِّياحُ،**

---

(١) رواه الترمذي (٣٥٨٥) مرفوعا، بلفظ: **خير الدعاءدعاء يوم عرفة، وخير ما قلت أنا والنبيون من قبلي: لا اله الا الله وحده لا شريك له، له الملك و له الحمد، وهو على كل شئ قدير**،وإلى قوله: **لاشريك له**، عند مالك في الموطأ، (٤٢٢/١)، مرسلا، وهو بتمامه من رواية ابن بكار،البصري، كمافي جمهرة الأجزاء الحديثية، ص/١٦٨ من دعائه ﷺ يوم عرفة.

(٢)البيهقي في السنن الكبرى،(١١٧/٥)موصولا ببعض الدعاء السابق، من دعائه ﷺ يوم عرفة.

**ومِن شرِّ بَوائِقِ الدَّهرِ)**[1]

ئەی خودای خاوەنی هەموو سەناو ستایشێك، تەنها تۆ شایستەی سوپاسکردنی، سوپاس بۆ تۆ وەك دەیڵێن، وە باشتر لەوەی کە دەیڵێین، نوێژو عیبادەتم بۆ تۆیە، مردن و ژیانم لە لای حزوری تۆیە، وە بۆلای تۆ دەگەڕێمەوە، وە پاداشتدانەوەیشم هەر بۆلای تۆیە، ئەی خودایە؛ من پەنات پێدەگرم لە وەسوەسەی شەیتان بۆ ناو سینەم، وە لە پەرەوازەبوونی کارەکانم، وە لە سزای دۆزەخ ، ئەی خودایە؛ پەنات پێدەگرم لەو شەڕانەی لە شەواندا خۆیان دەکەن بە ژووردا، وە لەو شەڕانەی بە ڕۆژدا دێنە ژوورەوە، یان با هەڵیدەگرێت و دەیخاتەوە، وە پەنادەگرم لە شەڕو موصیبەتی زەمان.

**(اللَّهمَّ إنِّي أعوُذ بكَ مِن تَحَوُّلِ عافِيَتِكَ، وفُجْأَة نِقمَتِكَ، وجَميعِ سَخَطِكَ)**[2]. **(اللَّهمَّ اهدِني بالهُدَى، واغفِرْ لي في الآخرَة والأُولَى**[3]. **يا خَيرَ مَقصودٍ، وأَيْسَر مَنزُولٍ عَليهِ، وأكرَمَ مَسؤُولٍ مَا لَدَيهِ ؛ أَعطِني العَشِيَّةَ أفضَلَ ما تُعطي أحَداً مِن خَلقِكَ وحُجَّاجِ بَيتِكَ، يا أرحَمَ الرَّاحِمِينْ. اللَهُم يا رفيعَ الدَّرجَات، ويا مُنزِّلَ البَركَاتِ، ويَا فاطِرَ الأَرضِينَ والسَّمَواتِ، ضجَّتْ إليكَ الأَصواتُ بصُنُوف اللُّغاتِ، يسألونَكَ الحَاجَاتِ، وحاجَتِي إليك أنْ تَذكُرني**، وفي نسخة:

**وحَاجَتِي أنْ لاَ تَنْسانِي في دار البِلَى إذا نَسِيَنِي أهلُ الدُّنيا،**[4]،

---

(١) رواه الترمذي (٣٥٣٠)، بنحوه، وبعضه بعض حديث البيهقي المتقدم، من دعائه ﷺ يوم عرفة، وقوله ثوابى من الثوب.[1] أي: رجوعي ، أو هو على ظاهره.

(٢) رواه مسلم(٣٧٣٩) من دعائه ﷺ عموما.

(٣) رواه بنحوه الطبراني (٨٧٨) في الدعاء، من دعائه ﷺ يوم عرفة.

(٤) رواه أبو نعيم في الحلية،( ٢٧٥/٧)، عن سفيان بن عيينة، عن أعرابي سمعه يدعو به وهو متعلق بأستار الكعبة.

ئەی خودایە؛ من پەنات پێدەگرم لە وەی کە نگین و عافیەتت لەسەرم نەمێنێت، وە دووچاری تۆڵەی لە ناکاوم مەکە، وە پەنات پێدەگرم لە هەموو تورەبوونێکت.

خودایە؛ بە ڕێنمایی خۆت ڕێگام پێنیشان بدەو، لە هەموو گوناهە ئێستاو لەمێژینەکانم خۆش ببە، ئەی باشترین جێ مەبەستی هەموان و، کە بە ئاسانترین ڕێگا پێت دەگەین و، بە بەرێزترین شێوە وەڵامی داواکانمان دەدەیتەوە، بەخشینی ئەم ئێوارەت با باشترینی بەخشینەکان بێت کەدەیدەیت بەوخەڵکەو بە حاجییەکانی ماڵی خۆت، ئەی لەهەموان بەڕەحم و میهرەبانتر، خودایە؛ خاوەن پلەکانی باڵا، ئەی ئەو زاتەی کە بەرەکەتەکان دادەبەزێنێت، دروستکەری زەوی و ئاسمانەکان، بە هەموو زوبانەکان دەنگو ناڵەی هەموان بۆ حزوری تۆ بەرزدەبێتەوە، منیش خواستم ئەوەیە: کاتێك کە ئەهلی دونیا من لەبیردەکەن، تۆ لەم ژیانی پڕ لە وەیشوومەدا لەبیرم نەکەیت.

**(اللَّهمَّ إنَّك تسْمَعُ كَلامي، وَتَرى مَكاني، وتَعلَم سِرِي وعَلانيَتي، ولا يَخفى عَليكَ شَيْءٌ مِن أمْري، أنا البَائِسُ الفَقيرُ، المُستغيثُ المُستَجير، الوَجِلُ المُشفِقُ، المُعتَرِفُ بذنبهِ، أسْألُكَ مَسألة المِسكِينِ، وأبتَهِلُ إليكَ ابتهَالَ المُذنِبِ الذَّليل، وأدعُوكَ دُعاءَ الخَائِفِ الضَّرير، دعاءَ مَن خَضعَتْ لكَ رقَبتُهُ، وفاضَت لكَ عبَرَتُهُ، وذلَّ لكَ جَسَدهُ، ورغِمَ لكَ أنفُهُ، اللَّهُمَ لا تَجعَلني بدُعائِك ربِّ شَقِيًا، وكُنْ بي رؤوفاً رَحيماً، يا خَيرَ المَسئُولينَ وأكرَمَ المُعْطينَ)**[1].

ئەی خودایە تۆ نزاکانم دەبیستی، شوێنەکەم دەبینی، نهێنی و ئاشکراکانم

---

(١) رواه الطبراني في الصغير (٢٤٧/١)، من دعائه ﷺ يوم عرفة وسيأتي المصنف فيما يلي بمناجاة، قال فيها العراقي: وباقي الدعاء من قول بعض السلف، وفي بعضه ماهو مرفوع، ولكن ليس مقيدا بموقف عرفة.

دەزانی، هیچ شتێکی شاراوەم لێت نیە . منی بێ دەسەڵاتی هەژار، هاوار و پەنام هێناوە، لە حاڵەتێکی ترس و بیمدام، وەك سواڵکەرێك داوات لێدەکەم، بەلاڵەو پەرۆشی گوناهباریمەوە لێت دەپارێمەوە، داوات لێدەکەم وەك ترساوێکی زیان لێکەوتوو، گەردنم لەبەر فەرمانتایە، فرمێسکەکانم نیشانەی ناخی ناو دەروونمە، ملکەچی ئیرادەی تۆم، لە حزورتام، بەزەلیلی و جەستەیەکی بێ هێزەوە، سەرلووتی خۆم بەگڵی بەردەرگای میهری تۆدا دەگەوزێنم، ئەی خودایە! بەدبەخت و بێبەشم مەکە لە دوعاکان، بەسۆزو میهرەبان بە لەگەڵمدا، ئێوە چاکترینی داوالێکراوانن و، باشترینی بەخشێننەرە کانیشن .

**إلهي مَن مَدحَ إليكَ نفسَه، فإنِّي لائِمٌ لنَفْسي، إلهي أخْرَسَت المَعاصي لِساني فمَا لِي وسيلَة مِن عَمَلٍ ولا شَفيعٌ سِوَى الأمَل اللَّهم إنِّي أَعلَم أَنَّ ذنُوبي لم تُبقِ لِي عِندَك جَاهاً ولاَ لِلاِعْتِذارِ وَجهاً، ولكنَّك أكرمُ الأَكرمِينَ.**

**إلَهي إن لَم أَكن أهلاً أَنْ أبلغَ رَحمَتَكَ، فإنَّ رحْمتَكَ أهلٌ أَن تبلُغَني، رَحمتُكَ التي وَسِعَت كُلَّ شَيء، وأَنَا شَيْءٌ.[١]**

**إلَهي إنَّ ذُنوبي وإن كانت عِظاما، فَهي صِغارٌ في جَنب عَفوِكَ، فاغْفِرْها لِي يا كَريم[٢]،**

**إلهي أنتَ أنتَ، وأنَا أنَا، أنا العَوَّادُ إلى الذُّنوبِ، وأنتَ العَوَّادُ إلى المَغفِرة[٣]**

---

(١) رواه هذا الدعاء أبو نعيم في الحلية ( ٢٩٨/٥) عن عمر بن عبدالعزيز وزاد: **اللَّهم إنك خلقتَ قوماً فأطاعوكَ فيما أمرتَهم، وعَمِلُوا في الذي خَلَقتَهم لَهُ، فرَحمتكَ إيَاهم كانت قبل طاعَتِهم لك، يا أرحم الراحمين.**

(٢) رواه ابن عساكر في تأريخ دمشق،( ١٥٦/٣٧)، من دعاء عبدالملك بن مروان، وقال فيه الشعبي: ما حسَدتُ أحداً على كلام تكلَّم به، ما حسدت عبدالملك بن مروان، فإني سمعته يقول: وذكره...

(٣) رواه تمام في فوائده، (١٦٩٨) وابن عساكر في تأريخ دمشق( ١٤٩/٥) مرفوعا: مر رجل ممن

إلهي إن كُنتَ لا تَرحمُ إلا أهل طاعتِكَ، فإلى مَن يفزَعُ المُذنِبُونَ[1]

إلَهي تَجنَّبتُ عَن طاعتِكَ عَمداً، وتوَجَّهتُ إلى مَعصِيتِكَ قَصْداً، فَسُبحانَك!

ما أعظَمَ حُجَّتكَ عليَ، وأكرَمَ عَفوَكَ عَنِي، فَبِوُجوبِ حُجَّتكَ علَيَّ، وانقِطاعِ حُجَّتي عَنكَ، وفَقري إليكَ، وغناكَ عنِي، إلا غفرتَ لي يا أرحَم الرَّاحمين[2]، يا خيرَ مَن دعاهُ داعٍ، وأفضَلَ مَن رجَاهُ راجٍ، بحُرمة الإسلام، وبذمَّةِ محَمَّد عليه السلام، أتوَسَّل إليكَ فاغفِر لي جَميعَ ذُنُوبي، واصرفني مِن مَوقفي هذا، مَقضيَّ الحَوائِج، وهَب لي ما سألتُ، وحَقِق رجَائي فيمَا تَمنَّيتُ، إلَهي دَعَوْتُكَ بالدُّعاء الَّذي عَلَّمتَنيه[3]. فلاَ تَحرِمني الرَّجاءَ الَّذي عَرَّفتَنيهِ، إلهي ما أنتَ صانعٌ العَشيَّةَ بِعَبدٍ مُقِرٍ لَكَ بِذَنبهِ، خاشِعٍ لكَ بذِلِّهِ، مستكينٌ بجُرمهِ، مُتضَرِّعٌ إليكَ مِنْ عَمَلهِ، تائبٌ إليكَ مِن اقترائهِ، مُستغفِرٌ لكَ مِنْ ظُلمهِ، مُبتَهِلٌ إليكَ في العَفو عَنهُ، طالبٌ إليكَ في نَجاحِ حَوائجهِ، راجٍ لكَ في مَوقفِهِ مَع كثرَةِ ذنُوبهِ . فيَا مَلجأَ كُلِّ حَيٍّ، وَوَليَّ كلَّ مُؤمنٍ، مَن أحسَنَ، فبِرَحمَتِكَ يَفُوزُ، ومَن أساءَ فبَخَطيئَته يَهلِكُ.

اللَّهُمَّ إليكَ خَرَجنا، وَبِفَنائِكَ أنَخنا، وإيَّاكَ أملْنا، ومَا عِندَك طَلَبْنا، ولإحسانِكَ تَعرَّضْنا، ورَحمَتِكَ رجَونَا، ومنْ عَذابكَ أشفَقنَا، ولبيتِكَ الحَرامِ حَجَجْنا، يا مَنْ يَملِكُ حَوائجَ السَّائلينَ، ويَعلَم ضمَائِرَ الصَّامِتينَ، يا مَن لَيسَ مَعهُ رَبٌّ يُدْعَىَ، ويا مَن ليسَ فَوقهُ خالقٌ يُخشَى، ويا مَن ليسَ لهُ وزيرٌ يُؤتَى،

---

كان قبلكم بجمجمة، فوقف عليه وجعل يفكر، فقال له: يارب: أنتَ أنتَ، وأنا أنا، أنت العواد بالمَغفِرة، وأنا العوَّاد بالذنوب. فقيل له: ارفع رأسك فأنت العواد بالذنوب، وأنا العواد بالمغفرة '، قال فغفر له.

(١) رواد البيهقي في شعب الإيمان (١٠٣٨)،ضمن مناجاة ليحي بن معاذ الرازي (رضي الله عنه)

(٢) رواه بنحوه أبو نعيم (في الحلية٣٠٤/٧) عن سفيان بن عينة أنه سمع أعرابيا يدعوه في المقام.

(٣) يعني ألهمتنيه ايَّه. إتحاف ٣٧٧/٤.

لاحَاجبٌ يُرشَى، ويَا مَن لا يزدادُ عَلى كَثرةِ السُّؤالِ إلاَّ تَكرُّماً و جُوداً، وعلَى كَثرةِ الحَوائجِ إلاَّ تفضُّلاً وإحسَاناً[1]، اللَّهُمَّ إنَّك جعلتَ لكُلِّ ضَيفٍ قرىً، ونَحنُ أضيَافُكَ، فاجعَل قِرانا مِنكَ الجَنَّةَ[2]، اللَّهُم إنَّ لكُلِّ وفدٍ جائزةٌ، ولِكُلِّ زائرٍ كرامَةً، ولكلِّ سائلٍ عَطيَّةً، ولكلِّ راجٍ ثواباً، وَلكُلِّ مُلْتَمسٍ لِما عِندَكَ جزاءٌ، ولِكُلِّ مُسْتَرحِمٍ عِندَكَ رَحمَةً، ولكلِّ راغبٍ إليكَ زُلفَىَ، ولكُلِّ مُتَوسِّلٍ إليكَ عَفواً، وقَد وفَدْنا إلى بيتكَ الحَرامِ، ووَقفْنا عِندَ هَذهِ المَشاعِرِ العِظامِ، وشاهَدنا هَذهِ المَشاهدِ الكرامَ، رجاءً لِما عِندَكَ فلاَ تُخيِّب رَجائنا، إلهَنا تابعْتَ النِعمَ حتَّى اطمَأنَّت الأنفُس بتَتابُع نِعَمِكَ، وأظهَرتَ العِبَر حتَّى نطقَت الصَّوامتُ بحُجَّتِكَ، وظاهَرتَ المِنَنَ، حَتى اعتَرفَ أولياؤُك بالتَّقصيرِ عنَ حَقِكَ، وَأظهرتَ الآيات حتى أفصَحَتِ السَّمواتُ والأَرضُونَ بأدلَّتِكَ، وقَهرْتَ بقُدرتِكَ حتَّى خَضَعَ كُلُّ شَيئٍ لِعِزَّتكَ، وعَنَتِ الوُجوُه لعَظمَتِكَ، إذا أساءَ عبادُكَ، حلُمتَ وأَمهَلتَ، وإذا أحْسَنُوا تَفضَّلتَ وقَبِلتَ، وإذا عَصَوا.. سَتَرتَ فإذا أذنَبُوا عَفوتَ وغَفرتَ، وإذا دَعَونا أجَبْتَ وإذا نادَينا سَمِعْتَ، وإذَا أقْبَلنا إليكَ قَربْتَ ، وإذا ولَّينا عَنكَ، دعَوتَ..!

إلهَنا إنَّك قُلتَ في كِتابكَ المُبِين، لمُحمَّدٍ خاتَم النَّبيينﷺ ﴿قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنْتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَا قَدْ سَلَفَ﴾، فأَرضاكَ عَنهُمْ: الإقرارُ بكلمةِ التَّوحيدِ بعدَ الجُحُودِ، وإنَّا نَشهَدُ لَكَ بالتَّوحيدِ مُخبتِينَ، ولمُحمَّدٍ نَبيِّكَ ﷺ بالرِّسالةِ مُخلصينَ، فاغْفِرْ لَنا بهذهِ الشَّهادَة سَوالِفَ الإجرَام ، ولا تجعَل حَظَّنا فيهِ أنقَصَ مِن حَظِّ مَن دَخَل في الإسلامِ.

اللَّهمَّ إنَّك أحَببْتَ التَّقرُّبَ إليكَ بعِتْقِ مَا مَلكَتْ أيمَانُنا، ونحْنُ عَبيدُكَ وأنتَ

---

(١) أورد نحوه ابن عبدالبر في بهجة المجالس (٢/٢٧١) عن الأصمعي عن أعرابية تدعو.

(٢) رواه الدينوري في المجالسة وجواهر العلم(ص٣٢) عن الأصمعي كذلك عن أعرابي يدعو في الملتزم.

**أولىَ بالتَّفضُّلِ عَلينَا فاعتِقنَا، وإنَّك أمَرتَنا أنْ نتَصدَّق عَلى فُقَرائِنا، ونحْنُ فقَراؤُكَ، وأنتَ أحقُّ بالتَّطَوُّلِ، فتصَدَّق عَليْنا، ووَصَّيتَنا بالعَفوِ عمَّن ظَلَمَنا، وقَد ظَلَمْنا أنفُسَنا وأنتَ أحقُّ بالكَرَم فاعْفُ عَنَّا، ربَّنا اغفِر لَنا أنتَ مَولانا، ربَّنا آتِنا في الدُّنيا حسنَةً وفي الآخرةِ حَسنَة، وقِنَا برحمتِكَ عَذابَ النَّار.**

وه با هەوڵبدات زۆر نزاو دوعاکەی (حەزرەتی) خضر (سەلامی خودای لەسەر) بکات کە دەڵێن فێری (حەزرەتی) عەلی کردبوو (خودای لێ ڕازی بێت) ، کە ئەوەیە بلێت: ( **يا مَن لا يُشغِلُه شَأنٌ عَنْ شَأنٍ، يامَنْ لا يشغِلُه سَمعٌ عَن سَمعٍ، ولا تَشتبِهُ علَيهِ الأَصواتُ، يا مَن لاَ تَغلطُهُ المَسائِلُ، ولاتَختَلِفُ عَليهِ اللُّغاتُ، يامَن لا يُبرِمُهُ إلحاحُ المُلحِّينَ، ولاتُعجِزُهُ مسئَلةُ السَّائلِينَ، أذِقْنا بَرَدَ عَفوِكَ وحَلاوَةَ رحمَتِكَ).**

## ئەی پەروەردگارم![1] .

ئەوەی ستایشی چاکەکانی خۆی دەکات لە حزورتدا، من بە ئەو پەڕی کەمتەرخەمی لۆمەی دەکەم، گوناە زوبانی لاڵ کردووم، هیچ کردەوەیەکی چاکم نیە پیایدا بنازم، کەسێکیشم نیە تکام بۆ بکات لە حزورتدا، جگە لەوەی هیوام بە لێبودەیی تۆ هەیە.

ئەی خودایە؛ من دەزانم گوناهەکانم هیچ ڕێزو بەهایەکی لای تۆی بۆ نەهێڵاومەتەوە، وە ڕێگەی پۆزش و داوای لێبوردنیشی بۆ جێ نەهێڵاوم، بەڵام تۆ لە هەموو بەڕێزەکان ڕێزدارتری، منیش پشتم بەکەرەمی تۆ بەستووە، خۆ ئەگەر من شیاوی ئەوەم نەبێت بگەمە ئاستی ڕەحمەتی تۆوە، بەڵام سۆزو بەزەیی تۆ شایستەیە کە بگاتە منی دەستبارە، ڕەحمەتی تۆ هەموو شوێنێکی

(١) هەولمدا تەواوی دۆعاکان پێکەوە ودریانبگێڕم، بۆ ئەوەی ئەوانەی دەیانەوێت دەقەکان بە عەرەبی سوودیان لێ ببینن، لە پاڵ یەکدا بن، وە ئەوانەش بە کوردی باشتر لێی حاڵی دەبن لێی تێ بگەن و دۆعای پێ بکەن.

داگرتووەو هەموو شتێکی گرتۆتەوە، منیش یەکێکم لەو شتانە، خودایە ئەگەرچی گوناهەکانم زۆر گەورەن، بەڵام لەپاڵ لێبوردەیی تۆدا وردوو بچوك دەبنەوە، ئەی خاوەنی ڕێزو لێبوردەیی: لێم خۆش ببە.

تۆ تۆیت و منیش منم ئەی خودا! من هەمووجار دەگەڕێمەوە بۆ سەر گوناهە کانم و، تۆیش لێبوردنەکانت بەدوای یەکدا دێن، دەی ئەگەر ڕەحم نەکەی تەنها بە ئەهلی تاعەتی خۆت، ئەی گوناهبارەکان پەناو هاوار بۆ لای کێ بەرن؟!

ئەی خودایە؛ منی بێ خێر بە عەمدی وازم لە تاعەت و بەندایەتی هێناوەو، بە قەصدی ڕوم لە گوناه کردووە، بەڕاستی هەموو بەڵگەکانت بەهێزو گەورەن لەسەرم، ئای کە لێبوردنیشت نیشانەی ڕێزوبەهای تۆیە بۆم، بەوەی کە هەموو بەڵگەکانت سەلماوو چەسپاوە لەسەرم، وە هێچ بەڵگەیەکم پێنیە بەرگری لە خۆیشم بکەم، وە زۆر پێویستم بەلاکرنەوەت هەیە بۆم، وە تۆیش هیچ پێویستییەکت بەمن نیە، کەواتە تەنها بە فەزڵی خۆت لێم خۆش ببە، ئەی چاکترین کەسێك کە بانگی لێکرابێت و ، بەهانایانەوە بچێت، گەورەترین جێگای ئومێدی ئومێدداران، لەبەر خاتری حورمەتی ئەرکانی ئیسلام، وە لەبەر خاتری عەهدو پەناداریی حەزرەتی موحەممەد ﷺ ، تەوەسسول بەوانە دەکەم بۆ تەقەدان لەدەرگای میهرەبانیت، بەڵکوو لە تەواوی گوناهەکانم خۆش ببیت، لەم جێگە پیرۆزەی عەرەفاتدا، وام بو ڕێکبخە کە کارەکانت بۆ ئەنجام دابم، داواکانم پێببەخشە، هیواکانم بهێنەرەدی، لەوانەی کە ئاواتم بۆ خواستوون.

بەو نزاو پاڕانەوانەی ئیلهامی دڵت کردووم، ڕووی دوعام کردۆتە حزورتەوە، بێبەشم مەکە لەو هیوایەی کە بۆ خۆت پێت بەخشیوم..

ئەی خودایە: بڕیاری چیت داوە ئێستا کە بیکەیت، بەرامبەر بەندەیەکی خۆت، کە دانی بەهەموو تاوانەکانیدا ناوە، گەردن کەچ و ملکەچی دەسەڵاتی تۆیە، لەگەڵ گوناهەکانیدا تێوەگلاوەو، دەناڵێنێت لەدەستی کردەوە خراپەکانی و، بە زبانێکی پڕ لە کڕوزانەوەی تەوبەکارانەوە، داوای لێبوردنت لێدەکات، لەو

زوڵم و ستەمەی لە خۆیی کردووە، هانای بۆ هێناویت، کە لێی خۆش ببیت، وە کارەکانی و پێداویستییەکانی بۆ جێبەجێ بکەیت، لەم وەستانەیداو، بەو کۆڵە گوناهەیەوە هیوای لەسەر لێبوردەیی تۆ بەستووە، دەی هۆ پەناگای هەموو زیندوو زینەوەرێك، ئەی سەرپەرشتیای بڕواداران، ئەوەش چاکەیەکی کردبێت بەهۆی ڕەحمەتی تۆوە سەرفراز دەبێت، ئەوەش خراپەی لەگەڵ نەفسی خۆیدا کردبێت، ئەوا بە هۆی هەڵەی خۆیەوە دەفەوتێت.

ئەی خودایە؛ بۆ لای تۆیە دەرچووین، لە پاڵ مەیدانی بەرفراوانی تۆدا کاروانەکانمان خستووە، تەنها هیوایشمان بە تۆیە، داوای شتێك دەکەین کە تەنها لای تۆ بوونی هەیە، دەس و دڵمان گرتۆتەوە بۆ چاکەو ئیحسانت، بەو هیوایەی پرشێك لە ڕەحمەتت بەرمان بکەوێت، ترس و خۆفی سزاو تۆڵەی تۆ لەدڵماندایە، بە قورسایی گوناهەکانمانەوە بۆ لای تۆ ڕامان کردووە، بۆ ماڵەکەی تۆیش نیەتی حەج کردنمان هێناوە، توانای بەڕێخستنی کارو داوای هەموان تەنها لای تۆیە، ناو دەروونی بێدەنگەکان دەخوێنیتەوە، ئەی ئەو زاتەی کە کەسێکت لەگەڵدا نیە داوای لێبکەیت، کەسیش لەسەرتەوە نیە لێی بترسیت، وەزیرێکت نیە کاری خەڵکی وەربگرێت و، کارئاسانی بۆ تۆ بکات، حاجیب و دەرگاوانیشت نیە بەرتیل وەرگرێت، تەنها خۆت بەرزو باڵادەستیت، هەرچەندێکیش داوات لێبکرێت، تۆ زیاتر بەخشندە و کەرەمت دەجۆشێت، وە بەچاوی میهرەبانیەوە دەنواڕیت بۆ داواو مەرامە یەك لەدوای یەکەکان.

ئەی پەروەردگارم؛ تۆ ڕۆزی و جیرەت بۆ هەموو میوانانت بڕیوەتەوە، ئێمەش میوانی تۆین، جیرە و پاداشتی ئێمەش بابەهەشتی بەرینت بێت.

هەموو وەفدێك کە دەچێتە خزمەتی گەورەکەی، خەڵاتێك دەکرێت، هەموو زیارەتکەرێك پاداشت دەدرێتەوە، هەموو دواکارێك بەخشینی خۆی وەردە گرێت، تەنانەت ئەوانەش بەهیوای پاداشتن بێبەش ناکرێن، ئەی خودای میهرەبان؛ دەستی پاڕانەوەمان ڕووی لە کەرەم و لوتفی تۆیە، دەرگای ڕەحمەتت

کراوەو فراوانە، ئەوەی هەنگاوەکانی خێراتر دەکات بۆ لاتان، زیاتر نزیك دەبێتەوە لە حزوورتان، هەموو خاوەن تەوەسولێك لێی دەبوورن، ئێمەش وەفدو میوانی ماڵەکەی تۆین، لەم هەموو جێگای مەناسیك و عیبادەتخانەدا وەستاوین و، ئەم مەنزڵگای فریشتەو پیاوانی خودایەمان بەسەرکردۆتەوەو. هیوامان تەنها بەتۆیەو، تکایە بێ هیوامان مەکە ئەی خاوەنی ڕەحم و بەزەیی.

ئەوەندە یەك لەدوای یەك نیعمەتت ڕژاند بەسەرماندا، تا دڵمان ئارامی و بێ ترسی پەیدا کرد، ئەوەندە دیمەنی پەندئامێزت نیشان داین، لاڵیش هاتە زوبان، بۆ پشت ڕاستی بەڵگەکانت، منەتی خۆتت بەسەر یاندا ئاشکرا کرد، تا ئەولیاکانیش لە حەق تۆدا دانیاننا بە هەموو کەموکورتییەکانیاندا ، ئایەتەکانت پیشان دان، تەنانەت ئاسمانەکان و زەویش بوونە گەواهی بەخشی بەڵگەکانت، توانای خۆتت دەرخست، تا هەمووشتێك ملی ناچاریان لەژێر دەسەڵات و عیززەتی تۆدا ڕاکێشا، هەموو ڕوخسارەکان کەوتن بەڕوودا، ئەگەر بەندەکانت بە خراپی لەگەڵتا جوڵانەوە، بە حیلم و ئارامی جوڵایتەوە و مۆڵەتت پێدان، هەرکە چاکەشیان کرد، ئەوا بە فەزڵی خۆت لێت وەرگرتن، کە یاخی دەبوون، داتدەپۆشین، گوناهیان دەکرد، لێیان خۆش دەبوویت، ئەگەر بە زوبانی ناچاریش دوعات لە خزمەتدا بکەین، دێیت بەدەممانەوە، هاوارت لێبکەین، دەیبیستیت، ڕوت لێبکەین نزیکتردەبیتەوە، کە پشتیشت تێدەکەین، تۆ بانگمان دەکەیتەوە!

ئەی خودایە؛ تۆ لە قورئانەکەی خۆتدا فەرمووتە، بە خاتەمی پێغەمبەران (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ : تۆ بڵێ بە بێبڕواکان، ئەگەر واز بهێنن، ئەوا لەگوناهی ڕابوردوویان خۆش دەبین، تەنها ئەوەندەی لە دوای ئینکاری کردنیان کەلیمەی تەوحید بەکار بهێنن و، ڕێگای هیدایەت بگرنەبەر ، لێیان ڕازی دەبیت، دەی ئێمە بە گەردن کەچی و بڕواو ملکەچی وە، شایەتی تاکو تەنهاییت بۆ دەدەین، وە گەواهی پێغەمبەرایەتی (حەزرەتی) موحەممەدیش بە

ئیخلاصەوە دەدەین، کەواتە بەم شایەتیدانەمان، لە گوناهو تاوانە پێشووەکانمان خۆش ببە، بەشی ئێمەش لە بەشی ئەوانە کەمتر مەکە کە تازە دێنە ناو ئیسلامەوە.

ئەی خودای گەورە؛ تۆ بۆخۆت پێت خۆشە لێت نزیك ببینەوە، بە ئازاد کردنی ئەو بەندەو کەنیزە و کۆیلانەی کە لەبەردەستماندا بن، خۆ ئێمەیش بەندەی ڕاستەقینەی تۆین، تۆیش ئەولاتری کە ئەو فەزڵە لەگەڵ بەندەکانتدا بکەیت، دوات لێدەکەین ئازادمان بکە.

فرمانت پێداوین هەژارەکان بەسەر بکەینەوەو، صەدەقەیان پێبکەین، ئێمەیش هەژاری ڕاستەقینەی بەردیوانی دەسەڵاتداری تۆین، کەواتە بمانبەخشەو خێرمان پێبکە، وەسێتت بۆ کردووین لە ڕێگەی خۆشەویستە کەتەوە، کە لەوانە خۆشببین کە زوڵمیان لێکردووین، ئێمەش زوڵممان لە نەفسی خۆمان کردووە، دەی خوای بەدەسەڵات، کەرەم و بەخشندەیی شایستەی تۆیە لێمان خۆش ببە.

لێمان خۆشبەو لێمان ببورە، ئەی مەولاو پەروەردگارمان، لە دونیادا چاکەو، لە دوارۆژیشدا چاکەی خۆتمان پێببەخشەو، لە ئاگری دۆزەخیش بمان پارێزە، یا أرحم الراحمین....

ئەی ئەو دەسەڵاتدارە بە توانایەی کە هیچ کارو فرمانێك سەرقاڵت ناکات، بیرت بەلای ئەوی تریانەوە نەمێنێت، قسەی هەموان لەیەك کاتدا لە بیستنی قسەی ئەوانی ترت ناکات، دەنگەکانت لێ تێکەڵ نابێت، پرس و بابەتەکان ناتخەنە هەڵەو لێتێك چوونەوە، زوبانەکان هیچ جیاوازییەکت بۆ دروست ناکەن، تۆ بێزار نابیت لە پاڕانەوەو مکوڕی و دووبارەکردنەوەی زۆری بەندەکانت، هەرچەندیشت لێداوا بکەن، ئەوە نیە کەنەتوانیت بۆیان جێبەجێ بکەیت، داوامان وایە بە فێنکایی لێبوردەیی خۆت، دڵەکانمان ئاواشتە بکەیت و، بە شیرینی ڕەحمەتی خۆت، دەروونمان ببوژێنیتەوە ئامین.

با حاجییەکان دوای ئەم نزاو پاڕانەوەیە، بەهەرچۆنێك دڵیان دێتە جۆش لاڵەو پاڕانەوەی خۆیان بکەن،[1]. داوای لێخۆش بوون بۆ خۆی و باوك ودایکی و، هەموو ئیماندارانی پیاوان و ئافرەتان بکات، با زۆر بەکوڵی بپاڕێتەوە، داواکەی زۆر گەورە بکات، بە بایەخەوە بنواڕێت بۆ داخوازیەکانی، شتی گەورەش لە خودا داوا بکات، هیچ شتێك لای خودا گەورە نیە.

**موطریفی کوڕی عەبدوڵلا لە ڕۆژی عەرەفەدا دەفەرموێت:**

خودایە؛ لەبەر من داوا و نزاو خواستی هەموان وەربگرەو ڕەدیان مەکەرەوە[2].

**بەکری کوڕی عەبدوڵلای موزەنیش دەفەرموێت:**

پیاوێك فەرمووی:

کاتێك سەیری ئەهلی عەرەفاتم کرد. وام گومان برد کە خودا لەهەموویان خۆش بووە، ئەگەر منیان لە ناودا نەبوومایە. [3].

---

(١) يقول الحافظ الزبيدي: ( ٤١٢/٤).

وأخرج أيضا عن ابن عساكر قال: **لا أعلمه مرفوعاً قال: يلتقي الخضر وإلياس (عليهما السلام) في كل عام في الموسم . فيحلق كل واحد منهما رأس صاحبه ويفترقان عن هؤلاء الكلمات: ( بسمِ اللهِ ماشاءَ اللهُ، لا يَسُوقُ الخَيرَ إلاَّ الله، بسمِ اللهِ ماشاءَ الله، لا يَصرفُ السُوءَ إلاَّ الله، بسْم اللهِ ماشاءَ الله ، ماكانَ مِن نِعمَةٍ فَمِنَ الله، بِسْم اللهِ ماشاءَ الله، لا حَولَ ولا قُوَّة إلاَّ بالله). قال ابن عباس: من قالهن حين يُصبح ويمسي ثلاث مرات ، أمنهُ الله من الحَرق والغرق والرق، قال عطاء وأحسبه من الشيطان والسُلطان والحيَّة والعقرب.**

(٢) رواه ابن الجوزي في صفة الصفوة (١١٩/٣).

(٣) رواه البيهقي في الشعب ( ٧٩٠٢ ، ٧٩٠٣).

# ڕستەی حەوتەم:

## باسی پاشماوەی کارەکانی حەج، لە دوای وەستانی عەرەفەوە لە مانەوەی (موزدەلیفە) و ڕەجمی شەیتان و قوربانی و سەرتاشین و تەوافکردن

کاتێك حاجییەکان لە دوای خۆرنشینەوەو لە عەرەفەوە هاتنە خوارەوەو کەوتنە ڕێ بەرەو موزدەلیفە، پێویستە بەهێمنی و ئارامی و بێدەنگی بێت، دەبێت خۆی بپارێزێت لە ڕەوتی خێرای ئەسپەکان و، تیژی و قونەی وشترەکان[1]، چونکە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردووە لە خێرایی ڕەوتی وشتر و ئەسپەکان[2]، وە دەیفەرموو:

**( اتَّقوا اللّهَ ، وسيروا سَيراً جَميلاً، لاتَطَؤوا ضَعيفاً، ولاَ تُوجِلوا مُسلِماً.)**[3]،

لەخوابترسن و خۆتان بپارێزن، بە ڕەوتێکی نەرم و هێمنی بڕۆن، کەسە هەژارو لاوازەکان مەکەن بەژێردوە، وە ئازاری موسوڵمانەکان مەدەن و مەیانترسێنن. کاتێك گەیشتە موزدەلیفە[4]، سوننەتە خۆی بشوات، چونکە موزدەلیفە بەشێکە لە حەرەمی مەککە، با بە پاکوخاوێنی بێتە ناویەوە، وە

---

(١) جۆرە ڕەوتێکی وشتر سوارەکانە، کە لێیان دەدەن بە خێرایی و لای چەپ یان لای ڕاستی لە ڕەوتەکەیدا بە خێرایی دەگوێزێتەوەو، بەرەو پێشەوەی دەبات. یان سوارکردنی کەسەکانە لەسەروشتر بەبارەوەو ئەزێتدانیان. یان ئازاردانی خەڵکەکە کە ناچارن بە خێرایی بڕۆن.

(٢) إن رسول الله ﷺ نهى عن وجيف الخيل و إيضاع الإبل، البخاري(١٦٧١)، وأبي داوود(١٩٢٠)، والنسائي(٥/٢٥٧).

(٣) هو في معناه ضمن الحديث السابق، وهو بلفظه مع النعي من رواية ابن البختري، كما في المجموع فيه مصنفاته (٢٠٨).

(٤) چونکە خەڵکی تێدا کۆدەبنەوە بۆیە پێی دەڵێن موزدەلیفە، یان لەبەر ئەوەیە کە (حەزرەتی) ئادەم و حەوا لەوێدا بەیەك گەیشتنەوە.

ئەگەر بتوانێت بەپیادەڕەوی بڕوات، ئەوە باشترە و ڕێزی زیاتری لە حەرەمی مەککە گرتووە،وەلە ڕێگەیشدا بەردەوام دەنگ بەرزدەکاتەوە و تەلبییە دەکات.

کاتێك گەیشتە موزدەلیفە، بڵێت: خوایە ئەمە موزدەلیفەیە، ئەو هەموو زوبان و نەتەوەت لێرەدا کۆکردۆتەوە، ئەو هەموو خواستە تازەو نوێیانەت عەرزدەکەن، منیش بگێڕە لەوانەی داوایان لێ کردوویت و بەدەنگیانەوە چوویت، وە پشتیان پێ بەستوویت و بەهانایانەوەیت.

لە پاشان نوێژی ئێوارەو خەوتنان پێکەوە کۆدەکاتەوەو، لە موزدەلیفە لە کاتی عیشادا دەیان کات، بە تەنها یەك بانگ و دووقامەتەوە، کە سوننەت نەکات لەنێوانیاندا، بەڵام سوننەتی نوێژی مەغریب و نوێژی عیشا و، وەترەکەی پێکەوە دوای نوێژی فەرزەکان ئەنجامیان بدات، لەپێشەوە سوننەتی ئێوارە دەکات، لەپاشان سوننەتی خەوتنان، وەك چۆن لەفەرزەکاندا دەیانکات، هەروەها ئەوەش لە سەفەردا نوێژەکان کۆدەکاتەوە، ئەگەر دوایان بخات بە هەمان شێوە سوننەتەکان دەکات. چونکە بەڕاستی نەکردنی نوێژی سوننەت لە سەفەردا، بە ئەوپەڕی خەسارەت مەندی دادەنرێت.

وە فرماندان بەوەی نوێژە سوننەتەکان یەکسەر لەدوای فەرزەکان بکات، جۆرە زیان دانێکەو یەك لەداوی یەك بوونیش تێك دەدات لە نێوانی سوننەت و فەرزەکاندا، چونکە بەدواهاتنی نوێژە فەرزەکان پێویستە بە نیسبەت ئیمامەوە، لەوانەیشە کەسێکیش لە دواوە شوێن ئیمام بکەوێت و، بپچڕێت لە مەناسیکەکان، کەواتە سوننەتەکان پێکەوە لە دوای فەرزەکان بکرێن، لە جێیە دروست بێت نوێژی سوونەت لەگەڵ فەرزدا بەیەك تەیەممومم بکرێت، چونکەسوننەت شوێنکەوتووی فەرزە، کەواتە باشتر دەکرێت کە پێکەوە کۆ بکر ێنەوەو،لەدوای فەرزەکانیش بەحوکمی شوێن کەوتنیان بۆفەرزەکان پێکەوە بکرێن ئەمەش نابێتە ڕێگر، کە جیاوازییەك هەیە لە نێوانی فەرزو سوننەتدا، کە لە سوننەتدا دەتوانرێت لەسەر وڵاخەکەیشی بیکات، بەڵام بۆ فەرزەکە

ناتوانێت، چونکە باسمان کرد کە ئەو ڕێگە پێدانە لەبەر پێویستی و شوێنکەوتەیی بووە.

لە پاشان ئەو شەوە لە موزدەلیفە دەمێنێتەوە. مانەوەیەك کە بە مەناسیك و عیبادەتی حەج لەسەری دادەنرێت، ئەوەش لە نیوەی یەکەمی ئەو شەوەدا دەکەوێتە ڕێ و شەو نامێنێتەوە، ئەوە لەسەریەتی خوێنێك بدات، وە باشترێش وایە، ئەوانەی دەتوانن ئەم شەوەیش بە پاڕانەوەو عیبادەت بەڕێ بخەن.

لەپاشان هەرکاتێك زیاتر کاتەکە بەرەو نیوەی شەو دەڕۆیشت، ئەوا خۆی ئامادە دەکات بۆ ڕۆشتن. (بەپێی مەزهەبی شافیعی سەعاتێك لە نیوەی شەو بڕوات بەسەو، دەتوانێت بەڕێ بکەوێت) وە بەردەکانی ڕەجمی شەیتان لەوێ هەڵدەگرێت، بەردی ورد و نەرمی زۆری تێدایە، با حەفتا بەرد هەڵبگرێت بۆ هەموو ڕەجمەکان، کە بەشیان دەکات، ئەگەر زیاتریش هەڵبگرێت ئاساییە، چونکە لەوانەیە بەردی لێبکەوێت، با بەردەکان ئەوەندە سووك بێت کە سەری پەنجەکان دایبپۆشن.

لەپاشان با هەر لە تاریکی بەیانیدا پیش ئەوەی ڕۆشنایی بڵاو ببێتەوە نوێژی بەیانی بکات، وە دوای نوێژ بکەوێتە ڕێ، تا ئەوەی گەیشتە کۆتایی موزدەلیفە لە (مەشعەرولحەرام) لابدات، لەسەر چیای (قوزەح) ڕابووە ستێت، خەریکی دوعاکردن بێت، تا نزیکی خۆر کەوتن، وە دەڵێت:

**(اللَّهُمَّ بِحَقِّ المَشعَرِ الحَرام، والبَيتِ الحَرام، والشَّهرِ الحَرام، والرُّكنِ والمَقام، بَلِّغ روح مُحَمَّدٍ مِنَّا التَّحِيَّةَ والسَّلام، وأَدخِلنا دارَ السَّلام، يا ذا الجَلالِ والإكرام)**[1]. خودایە لەبەر خاتری ئەو جێگا پیرۆزەی (مَشعَرِ الحَرام) کە سەرچیای قوزەحە و پێغەمبەر ﷺ دوعای لەسەرکردووە، وە داوات لێدەکەم بە حەقی بەیت و ماڵی خودا، وە مانگەکانی حەرام، وە بە حورمەتی

(١) رواه أبو الشيخ في (طبقات المحدثين) (٤٤١) بنحوه غير مخصوص بمزدلفة

ڕوکن و مقامی (حەزرەتی) ئیبراهیم. بیگەێنە بە ڕۆحی گەورەمان (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ ، لە ئێمەوە ڕێزو سەلام و، لە وڵاتی ئاشتی و سەلام، ئەی خاوەنی گەورەیی و بەرزی و ڕێزو ئیکرام.

لە پێش هەڵاتنی خۆر، لەوێیشەوە دەکەوێتە ڕێ بەرەو ئەو جێگایەی کە پێی دەڵێن: (شیوی موحەسەر)(وادي مُحَسَّر)[1].سوننەتە پەلە لە وڵاخەکەی بکات تا بە خێرایی شیوەکە دەبڕێت، وە ئەگەر پیادەش بێت ئەوا بە خێرایی بڕوات.

لەپاشان ئەگەر ڕۆژی یەکەمی قوربانی لەسەر هەڵات، واتە: ڕۆژی سەربڕین، ئەوا تەلبیەو تەکبیر(الله أكبر)ی جەژن تێکەڵ دەکات بەیەکەوە، جارێ (**لبيك اللهم لبيك**) دەخوێنێت. وەجارێکیش (**الله أكبر**)ی جەژن، تا دەگاتە مینا، شوێنی ڕەجمی شەیتانەکان. کە سێ جێگایە. یەکەم و دووهەم بەجێدەهێڵێت و، لە ڕۆژی سەربڕینی قوربانی دا کاری پێیان نابێت، تا دەگاتە جەمرەی عەقەبە، شەیتانی سێیەم، کە لای ڕاستی ئەوەیە کە ڕووی لە قیبلە کردووە. لەسەر جادەکە، ئەو جێگای بەردەکانی بۆ دەهاوێژێت کەمێك لەبەرزاییدایە، لە بناری شاخەکە، کە جێگەکەی دیارە لە ناو شەیتانەکاندا.

وە دوای ئەوەی خۆر بە ئەندازەی ڕمێك لە کەناری ئاسمان بەرز بوویەوە، دەستدەکات بە ڕەجمی شەیتانی گەورە، وە شێوەکەیشی ئەوەیە کە:

ڕادەوەستێت ڕووە و قیبلە، وە ئەگەر ڕو لە جەمرەکەیش بکات قەیناکە، حەوت جار بەردی بۆ بهاوێت و، هەموو جارێك دەستی بۆ بەرز کاتەوەو لە بڕیتی

---

(١) ئەو جێگەیە فیلەکانی ئەبرەهەی تیا گەمارۆ دراو، کۆبووبونەوە بۆ ڕوخاندنی کەعبە، لەو جێگەیەدا پێغەمبەر ﷺ پەلەی دەکرد، یان لەبەر فراوانی شوێنەکە بوو، یان لەبەر ئەوەیە کە مۆڵگای شەیتانەکانەو، نایەوێت خاوەخاوی تێدا بکات. کەدەکەوێتە میانی موزدەلیفەو میناوە.

تەلبیبە تەکبیر بکات و هەموو هاوێشتنی بەردێك بڵێت: **(اللهُ أكبَـرُ على طـاعَةِ الرَّحمن، ورَغمَ الشَّيطان، اللهُمَّ: تصديقاً بِكِتابِكَ واتِّباعاً لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ)**(١)

خودا گەورەو بێ وێنەیە، بە نیەتی گوێڕایەڵی خودای بەبەزەیی و بە کوێرایی چاوی شەیتان، ئەم بەردانە دەهاوێژم بۆ ڕەجمی شەیتان، بە بڕوابوونم بە قورئانەکەت و، شوێنکەوتنم بۆ سوننەتی پێغەمبەرەکەت ﷺ.

کاتێ بەردەکەی هاوێشت؛ تەلبیەو تەکبیرەکەی دەوەستێنێت ، مەگەر ئەو تەکبیرانە نەبێت کە دوای نوێژە فەرزەکان سوننەتن، لە نیوەڕۆی ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربانەوە، تا کۆتایی هەرسێ ڕۆژەکەی (أيام التشريق) یانزەو دوانزەو سیانزەی مانگ،(واتە: تا چوار ڕۆژەی جەژنی قوربان تەواو دەبێت). لەمرۆژەدا لە هیچ جێگەیەکدا ڕانەوەستێت بۆ دوعا کردن، بەڵکوو دەچێتەوە بۆ جێگای نیشتەجێ بوونی خۆی لەوێ نزاکانی دەکات.

وە صیفەتی تەکبیرکردن ئەوەیە بڵێت: **(اللهُ أكبرُ ألله أكبَرُ، الله أكبر كَبيراً والحَمدُ للهِ كَثيراً، وسُبحانَ اللهِ بُكرةً وأصيلاً، لا إلهَ إلاَّ اللهُ وحدَه لاشَريكَ لَهُ، مُخْلِصينَ لَهُ الدِّينَ، ولَوْ كَرِهَ الكَافِرُونَ، لا إلهَ إلاَّ اللهُ وحْدَهُ، صدَقَ وعْدَهُ، ونَصَرَ عَبدَهُ، و هَزَمَ الأَحزابَ وَحدَهُ، لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ، واللهُ أكبرُ)**

سێ جار (أَللّه أَكبَرُ) دەکات و حەمد و سەنای زۆری خودا دەکات، پاکی و بێ گەردی لە ئێوارەو بەیانیاندا بۆ خودا بڕیار دەدات، تەنها خودای تاك و تەنهایە کە بیپەرستن و، بە دڵسۆزی بەندایەتی بۆ بکەن، با دڵی کافرەکانیشی پێ بتەوسێتەوە، خودا تەنهایە و بەڵێنی خۆی بردە سەر و، یارمەتی بەندەکەی داو، هێرشی ئەحزابەکانی تێك شکاند و، تەنها گەورەیی و شایستەیی پەرستن هەر بۆ خودایە.

لەپاشان ئەگەر دیاری لەگەڵ خۆی هێنابێت با سەری ببڕێت، باشتر وایە بۆ خۆی سەری ببڕێت، وە بڵێت: (بەناوی خوداوەو خودا گەورەیە، ئەمەی

---

(١) رواه ابن أبي الشيبة في المصنف (١٦٠٤٥)والبيهقي في السنن الكبرى (٧٩/٥) عن علي(ر.ض)

سەری دەبڕم ئەی خودایە موڵکی تۆیەو، بە هۆی تۆوەیەو لە پێناوی تۆدایە، لێم وەربگرە، وەك چۆن لە خۆشەویستەکەی خۆت ئیبراهیمی خەلیلت وەرگرت. (**باسم الله والله أكبر، اللَّهُمَّ مِنكَ وبِكَ وَلَكَ، تَقَبَّلْ مِنِّي، كمَا تَقَبَّلتَ مِن خَلِيلِكَ إبراهيم** )[١]، وە بزانە كە قوربانی کردن بە وشتری پێنج ساڵە خێری زیاترە، لەپاشان بە مانگا، لەدوای ئەو بە بەران و کاوڕ، وە کاوڕێك خیری زیاترە لەوەی کە هاوبەشی شەش کەسی تر بێت لە وشترێکدا یان مانگایەکدا، وە خێری مەڕ زیاترە لە بزن، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (**خَيرُ الأُضحِيَّةِ الكَبشُ الأَقرَنُ**)[٢]، باشترینی قوربانی ئەوەیە کە بەبەرانێکی شاخ دار بکرێت..

بەرانی سپی خێری زیاترە لە وەی ڕەش و بۆر بێت، وە (حەزرەتی) ئەبو هورەیرە دەفەرموێت: سپی خێری زیاترە لە قوربانی دا لە سەربڕینی دووئاژەڵی ڕەش[٣]،

وە سوننەتە لێی بخوات، ئەگەر لەوانە بێت کە بۆ دیاری هێنابێتی، وە نابێ قوربانی بکات بە حەیوانی عەیبدار (شەل بێت، یان گوێی قەل بێت، یان

---

(١)ففي الصحيحين من حديث أنس قال ضحى رسول الله ﷺ بكبشين أملحين أقرنين ذبحهما بيده وزاد أبو داوود: (٢٧٩٥) ( **فقد ذبح رسول الله ﷺ كبشين أقرنين أملحين، موجَأين فلما وجهها قال اني وجهت وجهي للذي فطر السماوات والأرض على ملة إبراهيم حنيفا وما أنا من المشركين، إن صلاتى ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين، لاشريك له، وبذلك أمرت وانا من المسلمين، اللهم منك واليك وعن محمد وأمته، بسم الله والله اكبر، وفي الصحيحين من حديث عائشة رضي الله عنها ان النبي ﷺ أمر بكبش اقرن يطؤ في سواد ويبرك في سواد وينظر في سواد، فأتى به ليضحي به، فقال لها ياعائشه هلمَي المدية ثم قال اشحذ بها، ففعلت ، ثم أخذها واخذ الكبش فاضجعه، ثم ذبحه ثم قال: بسم الله اللهم تقبل من محمد وآل محمد، ومن أمة محمد، وضحى به وزاد البخاري ويأكل في سواد**، الإتحاف:( ٤ /٣٩٨).

(٢) رواه أبوداوود(٣١٥٦ )، والترمذي (١٥١٧)، وابن ماجه(٣١٣٠).

(٣) رواه عبدالرزاق (٣٨٧/٤)، ورفعه أحمد في المسند(٤١٧/٢)، والحاكم (٢٢٧/٤).

لووت بڕاو، یان گوێ دڕاوو داتڵیشاو بێت، لەپشتەوە تڵیشابێت، یان لە پێشەوە، یان کون لە گوێیدا بێت، لە پێشەوە یان لە دواوە، یان شاخی شکا بێت، یان شەل بێت، یان گەڕ بووبێت، یان ئەوەندە لاوازبووبێت مۆخ و بەزی پێوە نەمابێت. لە پاشان با سەری بتاشێت، وە سوننەت وایە ڕۆبکاتە قیبلەوە، لە پێشەوەی سەریەوە دەست پێبکات، لای ڕاستی سەری دەتاشێت، تا دەگاتە ئەو دوو ئێسکەی پشتی سەری، لەپاشان ئەولایشی دەتاشێت، وە دەڵێت:

**(اللَّهُمَّ اثبُت لِي بكُلِّ شَعرَةٍ حَسَنةً، وامْحُ عَنِّي بِكُلِّ شَعرَةٍ سَيِّئةً، وارفَعْ لِي بِهَا عِندَكَ درجَةً) والمرأه تقصر من شعرها)**[1]. ئەی خودایە: بە هەموو موویەکی ئەم قوربانیە، چاکەیەکم بۆ بنووسە، وە بە هەموو موویەکی خراپەیەکم لەسەر بکوژێنەرەوە، وە پلەیەکیش بەرزم بکەرەوە.

وە ئافرەتیش لەمووی سەری کورت دەکاتەوە، وە کەسێکیش (ئەصڵەع) بێت، دەبێت مووسەکە بهێنێت بەسەریدا، وە هەرکاتێك سەری تاشی یان کورتی کردەوە، دوای ڕەجمی شەیتانی گەورە، ئەوا بەشی یەکەمی هەڵوەشاندنەوەی ئیحرامی بۆ پەیدا دەبێت، هەموو قەدەغە کراوەکانی بۆ حەڵاڵ دەبێت، جگە لە ئافرەت و نێچیر گرتن نەبێت.

لەپاشان حاجی بەرەو خوار دەبێتەوە بۆ مەککە، وەك دیاریمانکرد ئاوا تەواف دەکات، ئەم تەوافە لە حەجەکەیدا بەڕوکن دادەنرێت، پێی دەوترێت:

تەوافی زیارەت، سەرەتای دروستی کردنی ئەم تەوافە لە دوای نیوەی شەوی جەژنی قوربانە، وە باشترین کات ئەوەیە کە بەڕۆژی یەکەمی قوربان بیکات، ئاخرەکەیشی دیاری نەکراوە، بەڵکوو دەتوانێت هەرکاتێك ئارەزوی لێیەتی ئەو کاتە بیکات، بەڵام تا تەواف نەکات نابێت ئیحرامەکەی بشکێنێت و

---

(١)فيه أثرٌ رواه الفاكهي في أخبار مكة،( ١/ ١٩٠)، **ويُكبِّرُ بعدَ الفَراغِ، ويدفن شَعره، ويصلي بعده ركعتين، وإن قَصَّرَ ،فليقصر الجميع**، انظر الإتحاف( ٤/ ٣٩٩).

بەرگی تر لەبەر بکات، ئافرەتیشی بۆ دروست نابێت، تا تەواف نەکات، ئەگەر تەوافی کرد، ئەو کاتە یەکجاری خۆی لە قەدەغەکراوەکانی ئیحرام و بەرگەکەیشی ڕزگاری دەبێت، وە سەرجێکردنییشی بۆ حەلاڵ دەبێت، تەنها ڕەجمی شەیتانەکانی دەمێنێت بۆ ڕۆژانی (أيام التشريق)و مانەوەیشی ئەو چەندشەوە لە مینا دا، ئەمانەش کۆمەڵە پێداویستییەکە لە دوای لادانی ئیحرامیش بەشێوەی بەندایەتی پەیوەستەبن بە حەجەوە، تا تەواو دەکرێن.

وە چۆنیەتی تەوافی زیارەت و دووڕکاتەکەی، وەك تەوافی هاتن (قدوم) وایە کە پێشتر باسمان کرد، وە ئەگەر هاتوچۆو سەعی صەفاو مەروەیشی کردبێت، ئیتر پێویست ناکات دووبارەی بکاتەوە.

**هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەو ئیحرام شکاندن سێ شتە:**

ڕەجمی شەیتان و سەرتاشین و، تەوافی گەڕانەوە (زیارەت) کە ڕوکنە، هەرچۆنێك دوان لەم سیانەی تەواو کرد، ئەوا (تەحەللولی) یەکەمی تەواو دەبێت، وە ڕێگری لێ ناکرێت لە پێشخستن و دوا خستنی هەریەکێك لەم سێ بەشە، لەگەڵ سەربڕینی قوربانیەکەش، بەڵام باشتر وایە کە ڕەجمەکە بکات و، لەپاشان قوربانی بکات و، لەپاشان سەربتاشێت و لەدواییشدا تەواف بکات.

وە سوننەتیش وایە بۆ ئیمام لەم ڕۆژەدا: لە دوای زەوال وتارەکەی بدات، ئەمەش وتاری خواحافیزی (حەزرەتی) پێغەمبەر بووە ﷺ [1].

**لە حەجدا چوار وتاری تێدایە:** وتاری ڕۆژی حەوتەم، وە وتاری ڕۆژی عەرەفە، وە وتاری ڕۆژی نەحر (قوربان)، وە وتاری ڕۆژی نەفر و بەڕێکەوتنی یەکەم، کە ئەمانە هەمووی لە دوای زەوال دەبێت، وە هەموویشیان بە تاکی دەبێت، تەنها وتاری ڕۆژی عەرەفە و وتاری ڕۆژی جەژن، کە دوو وتارن و

---

(١) كما رواه البخاري (٩٦٨) و مسلم( ١٦٧٩) وهي خطبة النحر.

دانیشتن لە نێوانی وتارەکاندا هەیە. لە پاشان ئەگەر لە تەواف لێبوویەوە، دەگەڕێتەوە بۆ مینا، بۆ مانەوەی شەوو ڕەجمی شەیتانەکان، ئەو شەوە لە مینا دەمێنێتەوە، وە ناو دەبرێت بە شەوی مانەوە، چونکە خەڵکەکە بۆ ڕۆژی دوایی، دوای هاوێشتنی بەردەکان لە مینا دەمێننەوەو بەڕێ ناکەون بۆ هیچ شوێنێك. ئەگەر ڕۆژی دووهەمی جەژنیان بۆ هاتە پێشەوە وە خۆریش لە ناوەڕاستی ئاسمان لایدا، با خۆی بشوات بۆ ڕەجم کردن، وە لە شەیتانی یەکەمەوە دەست پێدەکات، کە لە ڕێگەی عەرەفە وە یەکەمجار دێتە ڕێگەیان، لەلای ڕاستی شەقامە سەرەکییەکەیە، حەوت بەردی بۆ هەڵدەدات و، کاتێك کە لێی تێدەپەڕێت، تۆزێك لادەدات لە لای ڕاستی شەقامەکە، وە ڕو لە قیبلە دەکات و سوپاس و ستایشی خودا دەکات و، خەریکی (لاإله إلا الله) و (الله أکبر) کردن و نزاو پاڕانەوە دەبێت، لەگەڵ ئامادەباشی دڵ و گەردن کەچی ئەندامەکانی جەستەی، بە ئەندازەی خوێندنی سوورەی (البقرة) خەریکی دوعا کردن دەبێت، (واتە سەعاتێك کەمتر نەبێت).

لە پاشان پێش دەکەوێت بۆ شەیتانی ناوەڕاست، وەك یەکەم جار بەردەکانی بۆ دەهاوێژێت، وەك وەستانی ئەوێش بە هەمان شێوە دەوەستێت و نزا دەکات، لە پاشان دەچێت بۆ ڕەجمی شەیتانی گەورە، وە حەوت بەردی تێ دەگرێت، وە بۆ هیچ کارێك نامێنێتەوەو، تەنانەت بۆ دوعاکردنیش نامێنێتەوە و، یەکسەر دەگەڕێتەوە بۆ مەنزڵەکەی خۆی، وە ئەو شەوە لە مینا دەمێنێتەوە، ئەم شەوە پێی دەڵێن: شەوی نەفری یەکەم.

وە دوای بەیانی، وە لە دوای نوێژی نیوەڕۆ، لە ڕۆژەکانی (أیام التشریق)، وەك ڕۆژی پێشوو، بیست و یەك بەرد دەهاوێت بۆ هەرسێکیان، لە پاشان ئارەزووی خۆیەتی لە مینا دەمێنێتەوە، یان دەگەڕێتەوە بۆ مەککە،

جا ئەگەر پێش نوێژی ئێوارە و خۆر نشین لە مینا دەرچوو، ئەوە هیچی لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر مایەوە تا خۆرئاوابوون، ئەوە ئیتر دروست نیە کە

دەربچێت و پێویستە بمێنێتەوە تا ڕۆژی ئایندە، لە ڕۆژی نەفری دووهەمدا بیست و یەك بەردی تر بەهەمان شێوەی ڕۆژەکانی پێشوو بیان وەشێنێت.

بەڵام ئەگەر هەر تەرکی کرد و بەردەکانی نەهاوێشت و، شەویش نەمایەوە لە مینادا، ئەوا دەبێت خوێنێك بڕێژێت، وەهەمووگۆشتەکەی بکات بە صەدەقە.

وە بۆی هەیە لە شەوانی مانەوەی (مینا) دا زیارەتی ماڵی خودا (بەیت) بکات، بەمەرجێك مانەوەی شەو تەنها لە مینا بێت و بگەڕێتەوە بۆی، وەك پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەی دەکرد[1]، وە نابێت ئامادەی جەماعەتەکان نەبێت لە مینادا، لە مزگەوتی (خیف)، چونکە خێرەکەی زۆر گەورەیە.(لە بناری کەژەکەدایە). ئەگەر لە مینا گەڕایەوە و بەرەو مەککە کەوتە ڕێ، باشتر وایە لە (موحەصصەب) بمێنێتەوە[2].

وە نوێژەکانی عەسر و ئێوارەو عیشای تێدا دەکات، وە ماوەیەك سەر بنێتەوەو بخەوێت، ئەوە سوننەتە، کۆمەڵێك لە صەحابە ڕیوایەتیان کردووە[3]

ئەگەر هەرکامێك لە مانەی نەکرد، هیچی لەسەر واجب نابێت. ئەگەر لە مینا گەڕایەوەو بەرەو مەککە کەوتە ڕێ، باشتر وایە لە (موحەصصەب) بمێنێتەوە

وە نوێژەکانی عەسر و ئێوارەو عیشا ی تێدا دەکات، وە ماوەیەك سەر بنێتەوە و بخەوێت، ئەوە سوننەتە، کۆمەڵێك لە صەحابە ڕیوایەتیان کردووە [1] ، ئەگەر هەرکامێك لە مانەی نەکرد، هیچی لەسەر واجب نابێت.

---

(١) روى ذلك إبن أبيشيبه في المصنف(١٤٤٩٢) وأبوداوود في المراسيل(١٥١).

(٢)(نەوجێگای بەردەکانی لێ کۆبووەتەوە، لە میانی هەردوو کێوەکەدایە)

(٣) رواه البخاري(١٧٩٦)، وزاد صلاة الظهر، وهو كذلك عند أبي داوود(٢٠١٣) وقول المصنف: روى ذلك من جمعة الصحابة، فالمراد منهم: أبوبكر وعمر وابن عمر كما في صحيح مسلم(١٣١١) وعثمان كما عند الترمذي(٩٢١)، وابن ماجه(٣٠٦٩) وقد روي إنكاره عن عائشة وابن عباس وطاووس ومجاهد وسعيد بن جبير والله أعلم، إتحاف ٤/ ٤٠٦.

# ڕستەی هەشتەم:

## لەبارەی صیفەتی عومرە و ئەوکردارانەی دوای ئەو دەکرێن تا تەوافی خودا حافیزی.

ئەوەی بیەوێت دوای تەواو کردنی حەجەکەی عومرەیەکیش بهێنێتەوە، یان پێش حەجەکەی بیکات، ئەوا با خۆی بشوات، وە پەشتەماڵی ئیحرام لەبەر بکات، وەك چۆن لە باسی حەجدا باسمان کرد، وە لە میقات و شوێنی دیاری کراوە وە ئیحرام بپۆشێت بە نیەتی عومرە.

خێردارترین جێگەی دیاری کراو بۆ عومرە کردن (جیعرانە)یە، لە پاشان تەنعیم، لە دوای ئەو حودەیبییە،[2] ،وە نیەتی عومرە دەهێنێت و تەلبییە دەکات،(لبیك اللهم لبیك)،وە ڕوو لە مزگەوتی (حەزرەتی) عائیشە دەکات (خودای لێ ڕازی بێت) وە دووڕکات نوێژ دەکات، وە بە هەرچی ئارەزوی لێبوو نزادەکات، لە پاشان دەگەڕێتەوە بۆ مەککە. بەدەم تەلبییە کردنەوە، کە هاتە ناو مزگەوتی حەرامەوە، واز لە تەلبییە دەهێنێت و، حەوت جار تەواف دەکات، لە پاشان حەوت جار سەعی دەکات(صەفاو مەروە)، وەك باسمان کرد، ئەگەر لێبوویەوە ئەوا سەری دەتاشێت و عومرەکەی تەواو دەبێت.

وە ئەوەی لە مەککەدا دەمێنێتەوە، پێویستە زۆر عومرە و تەواف بکات، وە با بەزۆری سەیری بەیت بکات، کاتێ چووە ناو بەیتەوە..با دووڕکات نوێژ بکات

---

(١) رواه البخاري(١٧٩٦)، وزاد صلاة الظهر، وهو كذلك عند أبي داوود(٢٠١٣) وقول المصنف: روى ذلك من جمعة الصحابة. فالمراد منهم: أبوبكر وعمر وابن عمر كما في صحيح مسلم(١٣١١) وعثمان كما عند الترمذي(٩٢١)، وابن ماجه(٣٠٦٩) وقد روي إنكاره عن عائشة وابن عباس وطاووس ومجاهد وسعيد بن جبير والله أعلم. إتحاف( ٤/ ٤٠٦).

(٢)جیعرانە، لەمیانی (مەککەو طائف)دایە.حەوت میل لە مەککەوە دوورە، تەنعیم: (تەنهاچوار میل لە کەعبەوە دوورە، حودەیبییە: ناوی بیرێکە لە نزیك مەککەوە، لەسەر ڕێگای جیددە،

لە نێوانی هەردوو ستوونەکەدا، (وە دەرگای کەعبەی خستە لای پشتیەوە) وە بە پێی پەتی و بە ڕێزو بەهاوە بچێتە ناو بەیتەوە.

وتیان بە ئافرەتێك: ئایا ئەمڕۆ چویتە ناو ماڵی پەروەردگارت؟ فەرمووی:

وەڵلاهی: نابینم ئەم پێیانەم شایستە بێت بۆ ئەوەی تەوافی کەعبە بکات، ئیتر چۆن بە شایستەی دەزانم پێ بخاتە ناو ماڵی پەروەردگارمەوە، کە دەزانم بۆ کوێ ڕۆشتووەو تا کوێ ڕۆشتووە؟![1].

با زۆر ئاوی زەمزەم بخواتەوە، ئەگەر بتوانێت خۆی ئاوەکە هەڵگۆزێت، یان بەدەستی خۆی بیخواتەوە، کەسێکی تر بۆی نەکات، ئەوەندە بخوات تا ئاواشتەدەبێت و لێی تێر دەبێت، وە بڵێت: ( **اللَّهُمَّ اجعَلهُ شِفاءً مِن كُلِّ داءٍ وسُقمٍ، وارزقني الإخلاصَ واليَقينَ والمُعافاةَ في الدُّنيا والآخِرَة**)[2].

ئەی خودایە بیکە بە شیفا بۆ هەموو دەردو نارەحەتیەکانم، وە بەبەرەکەتی ئەم زەمزەمە ئیخلاص و متمانەو لەش ساغیم پێببەخشە، لە دونیاو دوارۆژدا.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی (ماءُ زَمزَمَ لِما شُرِبَ لَهُ)[3].

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية (٨/ ١٥٠) عن وهب بن الورد عن إمرأه قالت ذلك.

(٢)وأخرج سعيد بن منصور عن ابى جريج ان ابن عباس قال: **إذا شربتَ ماء زمزم فاستقبل القبلة، ثم قل: اللهم اجعله** ألخ. وأخرج ابن ماجه(٣٠٦٢) عن ابن عباس قال قال رسول الله ﷺ **إن آية ما بيننا وبين المنافقين انهم لا يتضلعون من ماء زمزم** واخرج الازرقي عنه مرفوعا:**التضلع من ماء زمزم براءة من النفاق،قال ﷺ علامة ما بيننا وبين المنافين لم يشربوا منها قط حتى يتضلعوا**.ومما جاء فى فضل زمزم وبركاتها ما أخرجه الازرقي في التاريخ عن ابن عباس قال: **صلوا في مصلى الأخيار واشربوا من شراب الأبرار. قيل له ما مصلى الأخيار قال تحت الميزاب**. قيل: **وماشراب الأبرار قال ماء زمزم**. وروى البخاري في الصحيح من حديث أبي ذر رضي الله عنه **فنزل جبريل ففرج صدرى ثم غسله بماء زمزم**. وفى حديثه أيضا قال: **ما كان لي طعام إلا ماء زمزم فسمنت، حتى تكسرت عكني، وما أجد على كبدي سخفة جوع**. فقال ﷺ **انها طعام طعم**. وفي البخاري(٥٦١٧) ومسلم(٢٠٢٧) أنه ﷺ **شرب من زمزم قائما**.

(٣) رواه ابن ماجه(٣٠٦٢) ورواه الدار قطني فى سننه(٢/٣٨٩) والحاكم من طريق محمد بن

واتە: ئاوی زەمزەم شیفایەو بۆ هەر مەبەستێکت خواردبێتەوە بۆت جێبەجێ دەبێت.

## ڕستەی نۆیەم: باسی تەوافی خواحافیزی(الوداع)

هەرکاتێك حاجی ویستی بگەڕێتەوە بەرەو نیشتیمانی، دوای تەواوکردنی مەناسیکی حەج و عومرە، با لە پێشەوە کارەکانی تەواو بکات، وە خۆی ڕێك بخات، وە دواکاری با خواحافیزی بێت لە کەعبە، ئەمەش بە حەوتجار تەواف دەبێت بە دەوری ماڵی خوادا، بێ ئەوەی پێویستی بە شێوەکانی (ڕەمڵ و ئیضتیباع ببێت) واتە: خێرا ڕۆشتنی سێ خولی یەکەم و دەرخستنی باڵی ڕاست.

ئەگەر لە تەوافیش لێبوویەوە، با دوورکات نوێژ لە پشتی مقامی (حەزرەتی)ئیبراهیمەوە بکات. وە لە ئاوی زەمزەم بخواتەوەو بچێتە لای دەرگای

---

حبيب الجارودي عن سفيان بن عينة عن ابن نحيج عن مجاهد عن ابن عباس أن رسول الله ﷺ قال : **ماء زمزم لما شرب له، ان شربته تستشفى به، شفاك الله، وان شربته لشبعك اشبعك الله به، وان شربته ليقطع ظمئك، قطعه الله، وهي خدمة(هزمة) جبريل، وسقيا الله اسمعيل**. وأخرجه أبو ذرالهروي في مناسكه مرفوعا وقال الحاكم في المستدرك ٦٤٦/١(١٧٣٩)بعد ايراده وهو صحيح الاسناد. إن سلِم بن مُحمد بن حبيب الجارودي، قال العراقي قال ابن القطان فان الخطيب في تأريخ بغداد(٢٧٧/٢)(٧٥٠) قال فيه كان صدوقا، قال ابن القطان كما في فيض القدير للمناوي(٤٠٤/٥) لكن الراوى عنه مجهول وهو محمد بن هشام هذا معروف موثوق يقال له ابن أبي الدميك. وبخط الحافظ بن حجر ومحمد بن هشام لا بأس به لكنه شذ، والمحفوظ مرسل كذا رواه الحميدي وغيره عن سفيان، وقال في تخريج الرافعي والجارودي صدوق، الا أن روايته شاذة، فقد رواه حفاظ اصحاب ابن عيينة الحميدي وابن أبى عمر وغيرهما عن ابن عيينة عن ابن أبى نجيح عن مجاهد قوله ومما يقوي رواية ابن عيينة ما أخرجه الدينوي في المجالسة (ص/٨٦) من طريق الحميدي قال كنا عند ابن عيينة فجاء رجل فقال يا أبا محمد... **الحديث الذى حدثتنا عن ماء زمزم صحيح؟ قال نعم. قال فاني شربت الآن دلوأ من زمزم على أنك تحدثني بمائة حديث**، وعند ابن عساكر في تأريخ دمشق (٣٠٨/٤٥) : بمأتي حديث، **فقال اجلس فحدثه بمائة حديث** والله أعلم. وانظرالإتحاف( ٤١٢،٤١٣/٤.)

کەعبەوە، سنگ بە دیواری مولتەزیمەوە بنێت ، وە نزاو پاڕانەوەی خۆی بکات، وە بڵێت:(**اللَّهم: البيت بيتُكَ، والعبْد عبدُك وابنُ عبدِكَ وابنُ أمتِكَ،حملتَني عَلى ما سخَّرت لي مِن خَلقِك، حتَّى سيَّرتَني في بِلادكَ، وبلغتَني بنِعمَتِك حتَّى أعَنْتَني على قَضاء مناسكِك،فإن كُنتَ رضيتَ عنِّي فازدَد عنِّي رِضاً،وإلاَّ فَمُنَّ الآنَ قبلَ تَباعُدي عَن بيتِكَ، هذا أوانُ إنصرافي إنْ أذنتَ لي غيرَ مُستبدلٍ بِكَ ولا بِبَيتكَ، ولا راغبٍ عنكَ ولا عَن بيتِكَ، اللَّهُم اصحَبني العافيةَ في بدَني، والعصمةَ في ديني، وأحسِنْ مُنقَلبي وارزُقني طاعتَكَ ما أبقَيتَني، واجمَع لي خَيرَ الدُّنيا والآخِرَة، إنَّك علَى كُل شَيئ قَدير، اللَّهُم لاتَجعل هذا آخِرَ عَهدي بِبَيتِكَ الحَرام، وان جعلته آخرَ عَهدي فعَوِّضني عَنهُ الجنَّة)**[1]،خودایە ئێرە ماڵی تۆیە و بەندەیش بەندەو کوڕی بەندەو کوڕی ئەمەتەی تۆن، تۆ هەڵتگرتووم و ئەو خەڵکەت بۆ ڕەخساندووم، تا منت گەیانۆتە ماڵەکەی خۆت، وە نیعمەتی خۆتت پێداوم، تا بتوانم مەناسیکەکانی حەج تەواو بکەم، ئەگەر لێم ڕازی بوویت، ئەوا زیاتر لێم ڕازی بە، ئەگەر نا پێش ئەوەی لە ماڵەکەت دووربکەومەوە منەتی ڕەزامەندیت بڕژێنە بەسەرمدا، ئەگەر مۆڵەتم بدەیت، کاتی گەڕانەوەم هاتووە، نە خۆت و نەماڵەکەت بە هیچ شتێکی تر ناگۆڕمەوە، خودایە با لەش ساغی هاوڕێی جەستەم بێت، وە دینم پارێزراو بێت، وە بە جوانی بگەڕێمەوە، وە ئەوەندەی دەمژێنیت گوێڕایەڵیتم پێببەخشە، وە داوات لێدەکەم خێری دونیاو پاشەڕۆژم بۆ کۆبکەرەوە، تۆ دەسەڵاتت بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

ئەی خودایە؛ با ئەم جارە دواجاری بەخزمەت گەیشتنی بەیت و ماڵەکەی تۆ نەبێت، ئەگەر بڕیارشوایە دواجار بێت، قەرەبووی ئەم هاتنەم بۆ بکەرەوەو، بەهەشتم پێببەخشە. چاکتروایە چاوی لە بەیت کلانەکات و تا بەجێی دەهێڵێت.

---

(١) روى هذا الدعاءالبيهقي في السنن الكبرى (١٦٤/٥)، عن الإمام الشافعي (رضي الله عنه) .وفيه: **أُحبُ له إذا ودَّع البيتَ** ..

# ڕستەی دەیەم: لە باسی زیارەتی مەدینە و ئادابەکانی

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ زارَني بَعدَ وَفاتي، فكَأَنَّما زارَني في حَياتي))[1]، واتە: ئەوەی دوای مردنم سەردان و زیارەتم بکات، وەك ئەوە وایە کە لە کاتی ژیانمدا زیارەتی کردبم، هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:
((مَنْ وَجدَ سَعةً ولَمْ يَفِدْ إليَّ، فَقَد جَفَاني))[2]، ئەوەی توانای دارایی هەبێت و هیچ کۆسپێك لە ڕێگەیدا نەبێت و نەیەت بۆلام، ئەوە بەڕاستی وشکی و بێ وەفاییم لەگەڵ دەکات.

---

(١)قال العراقي رواه ابن عدي في الكامل (٣٨٢/٢) والطبراني في المعجم الكبير(٤٠٦/١٢)(١٣٤٩٧) والدارقطني في سننه (٢٧٨/٢) والبيهقي في سننه الكبرى (٢٤٦/٥)(١٠٠٥٤) وضعفه من حديث ابن عمر اهـ. قال الزبيدي(٤١٦/٤) : ورواه البزار وأبو يعلي وابن عدي والدارقطني من طريق حفص بن أبى داود عن ليث بن أبى سليم عن مجاهد عن ابن عمرو، ومن هذا الوجه رواه البيهقي ووجه تضعيفه أن رواية حفصا ضعيف الحديث، وان كان أحمد قال فيه صالح وأما الطبراني فرواه في الاوسط (٩٤/١)(٢٨٧) من طريق الليث ابن بنت الليث بن أبى سليم، عن عائشة بنت يونس امرأة الليث بن أبي سليم عن ليث بن أبي سليم وفي هذا الاسناد من لا يعرف، وأخرج سعيد بن منصور عن ابن عمركما في الدر المنثور (٥٦٩/١) مرفوعاً: **من حج فزار قبري بعد وفاتي، فكأنما زارني في حياتي**، وعن حاطب بن أبي الحارث: قال قال رسول الله ﷺ: **مَن زارَني بعد موتي، فكأنما زارَني في حَياتي)**، أخرجه الدارقطني في سننه(٢٧٨/٢)، والبيهقي في شعب الإيمان (٤٨٨/٣)(٤١٥١)، وقال ابن حبان في المجروحين(٧٣/٣)، في سنده نعمان بن شبل، وهو يأتي عن الثقات بالطامات.

(٢) رواه ابن عدي في الكامل(١٤/٧)، والدارقطني في غرائب مالك (كما في المقاصد الحسنة للسخاوي(٦٦٩)(١١٧٨)، وابن حبان في الضعفاء،( ٧٣/٣)(١١٢٨)، والخطيب في الرواة عن مالك كما في البدر المنير لابن الملقن (٦ /٢٩٩) من حديث ابن عمر: **مَن حجَّ ولَم يَزُرني فقَد جَفاني**، وروى ابن النجار في تأريخ المدينة (ص/١٥٥) من حديث أنس( **ما مِن أحدٍ مِن أُمتي لهُ سَعةٌ، ثم لم يَزُرني، فلَيسَ لَهُ عذرٌ**.) وانظر شفاء السقام (ص/٢٧).

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (( **مَنْ جاءَني زائِراً لايُهِمُّهُ إلاَّ زِيارَتي، كانَ حقّاً على اللهِ سُبحانَهُ أَنْ أَكونَ لَهُ شفيعاً**))[1]، ئەوەی بێت بۆ زیارەتم و تەنها ئامانج و مەرامی زیارەت کردنم بێت، خوای گەورە پێویستی کردووە کە من ببمە تکاکار و شفاعەتکاری لە ڕۆژی قیامەتدا.

کەواتە ئەوەی دەیەوێت ڕوو لە زیارەتی مەدینە بکات، با لە ڕێگەدا زۆر صڵاوات لەسەر پێغەمبەری خودا بدات ﷺ. ئەگەر چاوی کەوت بە دار و دیوارو باخ و بێستانەکانی مەدینە، با بڵێت:

(ئەی خودایە ئەمە حەرەمی پێغەمبەرەکەتە، بیگێڕە بە پارێزەری من لە ئاگر، وە مایەی ئەمینی من لە سزاو ناخۆشیەکانی لێپرسینەوەی دوارۆژ).

با پێش ئەوەی بچێتە ناو مەدینەوە لە بیری (حەرە) (بیرێکە لە دەرەوەی مەدینەیە) خۆی بشوات و، خۆی بۆنخۆش بکات و، پوختە ترین و گرانترین بەرگی بکاتە بەری، وە بە ئەو پەڕی گەردن کەچییەوە، لەگەڵ بە گەورە زانینی حەرەمی مەدینەدا بچێتە ژوورەوە، وە بڵێت:

(**باسْمِ اللهِ وعَلَى مِلَّةِ رَسولِ اللهِ ﷺ، ﴿رَبِّ أَدْخِلْنِي مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِي مُخْرَجَ صِدْقٍ وَاجْعَلْ لِي مِنْ لَدُنْكَ سُلْطَانًا نَصِيرًا﴾**، لە پاشان کە ویستی بچێتە مزگەوتەکەیەوە ﷺ ، با لە دەرگای (حەزرەتی) جوبرەئیلەوە بڕوات و پێی

---

(١) رواه الطبراني في الكبيـر( ٢٩١/١٢)، (١٣١٤٩) وأبـونعيم في تـأريخ أصـفهان (٢/ ١٩٠)، وصححه سعيد بن السكن كما في شفاء الأسقام (ص/١٦(٢٠)، والإمام تقي الدين السبكي جمع في شفائه من الأحاديث والأخبار في تأييد هذا المعنى ما هو أغنى. وقال ﷺ : **من زارني بالمدينة محتسبا كنت له شفيعا** أو شهيدا **يوم القيامة** أخرجه البيهقي في السنن الكبرى (٣/ ٤٩٠(٤١٥٧). وعن ابن عمر رفعه من زار **قبري وجبت له شفاعتي** أخرجه الحكيم الترمذي في نوادر الأصول(٦٧/٢) وابن عدي في الكامل٣٥١/٦، والدراقطني في سننه (٢٧٨/٢)، والبيهقي في شعب الإيمان (٣/ ٤٩٠(٤١٥٩)، وفيه موسى بن هلال العبيدي ، قال أبوحاتم في الجرح والتعديل، مجهول، أي مجهول العدالة.

ڕاستی پێش بخات[1]، له پاڵ مینبەرەکەدا دووڕکات نوێژ بکات، هەوڵبدات ستوونی میمبەرەکە بخاته لای ڕاستیەوە. وه ڕوبکاته ئەو کۆڵەکەی(ستوون) که صندووقەکەی لەپاڵدایه، وه ئەو بازنەی که له ڕووی قیبلەوەیه له نێوانی هەردووچاویدا دەبێت، واته لەو جێگەدا ڕابووەستێت که پێغەمبەر ﷺ تیایدا ڕاوەستاوه، پێش ئەوەی شێوەی مزگەوتەکه بگۆڕن، وه هەوڵ بدات لەو مزگەوته یەکەمەدا نوێژ بکات، که هیچی لێ زیاد نەکرابوو، له پاشان بێت بەرەو گۆڕی حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ، له ئاستی ڕوخساری موبارەکیدا بووەستێت، بەو شێوەی که پشت بکاته قیبلەو ڕوبکاته (حەزرەتی) پێغەمبەرەوە، وه ڕوو بکاته دیواری مەرقەدەکەوە، که نزیکەی چوار زیراع (دوومەتر)ێك دوور له ستوونەکەی پاڵ دیواری قەبرەکەوە بێت، وه ئەو چراو شەمعەدانەکه بخاته سەر سەری، ئەمڕۆ ئەو پەنجەرەیه که له بەرامبەری پێغەمبەر ﷺ دروست کراوه[2]، وه بزانه که سوننەت نیه دەستبهێنێت به دیوارەکەدا یان ماچی بکات،[3]،

---

(١)وەبڵێت: باسم الله اللهم رب محمد صل على محمد، رب اغفر لي ذنوبي وافتح لي أبواب رحمتك، إتحاف ٤١٧.

(٢) رواه البيهقي في الشعب(٣٨٧١) عن ابن أبي مليكة.

(٣) ئیبن و عاصمی ئەصفەهانی ڕیوایەتی کردووه له جوزئی ٢٧ دا: له نافیعەوه : که عەبدوڵلای کوڕی عومەر بەلایەوه کەراهەتی هەبووه دەستت بهێنیت بەسەر قەبری پێغەمبەردا ﷺ ، حافزی زەهەبی له (معجم الشيوخ)دا( ٧٣/١) دەفەرموێت: له ڕێگەی ئەحمەدی کوڕی عبدالمنعم ی قەزوینی ڕیوایەتی کردووه، ئەڵێم: بۆیه بەلایەوه کەراهەتی هەبووه، چونکه ئەوەنده نزیك بوونەوه له پێغەمبەرەوه ﷺ بەلایەوه تەرکی ئەدەبه، بەڵام پرسیاریان کرد له ئیمامی ئەحمەد لەبارەی دەست لێدان و ماچکردنی گۆڕی پێغەمبەرەوه، فەرمووی: هیچ خراپی و ڕێگریەکی تێدا نیه، عەبدوڵلای کوڕی ئیمام أحمد یش له باوکیەوه ڕیوایەتی کردووه، ئەگەر وتیان ئەی بۆچی صەحابەکان

مەنعیان کردووە: چونکە ئەوان بە زیندوویی بە خزمەتی گەیشتوون لێی تێر بوون و دەستیان زیارەت کردووەو، هەندێکیشیان قاچیان زیارەت دەکردو، خەریك بوون شەڕیان دەکرد لەسەر پاشماوەی ناوی دەستنوێژەکەی، وە لە ڕۆژی حەجدا مووی موبارەکیان دابەش دەکردو، تەنانەت ئەگەر تف و بەڵغەمیشی فڕێبدایە، نەدەکەوتە سەرزەوی ، بەڵکو هەمیشە ناولەپی یەکێکیانی بۆ دەگیرایەوەو ، دەیهێنا بە دەموچاویدا، کاتێك ئێمە ئەم بەشە گەورەمان بە نسیب نەبوو، ناچار خۆماندا بەسەر گۆڕە پیرۆزەکەیدا، بە شین و گریان و عەشق و ئەوینەوە، ئەی نابینی (سابتی بەنانی دەستی (حەزرەتی) ئەنەسی ماچ دەکرد و، دەیهێنا بە ڕوخساریداو دەیفەرموو: ئەوە دەستێکە بەردەستی پێغەمبەر کەوتووە ﷺ، ئەمەش تەنها زیادە محەببەت و خۆشەویستی پاڵ بە موسوڵمانەوە دەنێت وا بکات، چونکە فەرمانی پێکراوە کە محەببەتی خوداو پێغەمبەری هەبێت، بەڵکو کەسانێکی زۆر هەن (حەزرەتی) ئەبوبەکر و عومەریان لە خۆیان زۆر زیاتر خۆش دەوێت، دەگێڕنەوە کە (جندار) بیستی لەسەر چیای بیقاع کەسێك جنێوێکی بە (حەزرەتی) ئەبوبەکر داوە، یەکسەر شمشێری لێ دەرکێشاو دای لە ملی، خۆ ئەگەر جنێوی بە خۆی و باوکیشی بدایە، نەیدەکوشت، ئایا نەتانبیستووە کە صەحابە لە زۆری خۆشەویستییان بۆ (حەزرەت) ﷺ دەیانووت: ئەرێ سەجدەت بۆ نەبەین؟! دەیفەرموو: نەء، خۆ ئەگەر ڕێگەی بدانایە سوجدەیشیان بۆ دەبرد.. سەجدەی ڕێز لێنان، نەك سەجدەی عیبادەت، وەك چۆن براکانی (حەزرەتی) یوسف سەجدەیان بۆ برد، هەروایشە؛ تەنانەت ئەوانەی سەر بۆ قەبری پێغەمبەر ﷺ دادەنەوێنن، یان دەستی پیا دەهێنن، هەرگیز بەمە کافر نابن، بەڵکو تەنها گوناهبار دەبن، ئەوەندە بزانێت کە ئەم کارە نەهی لێکراوە، هەر بەم شێوەیشە نوێژ کردن ڕوو بە قەبرێك. کە لەمە درێژتر لە (سیر أعلام النبلاء)دا ئیمامی زەهەبی ئەم بابەتەی ڕوون کردۆتەوە( ٤٢/٤، ٢١٢/١١). بەڵام بەداخەوە نەفامەکانی هاو مەشرەبی ئەبوجەهل، لەم سەردەمەدا، ئەوەی بچێت بڵێت بۆ زیارەتی پێغەمبەر ﷺ هاتووم، پێی ڕازی نین، دەڵێن : دەبێت بڵێیت: بۆ زیارەتی (مزگەوتی پێغەمبەر)

بەڵکوو ئەگەر تۆزێك لە دوورەوە بووەستێت ، نزیکترە لە ڕێزگرتنی، لەوەی کە بچێتە سەر گۆڕەکەی، وە بە کەماڵی ئەدەبەوە دەوەستێت و دەڵێت:

**السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا رسول الله، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا نبي الله، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا أمين الله، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا حبيبَ اللهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا صَفوة اللهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا خيرةَ اللهِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا أحمدُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا محمَّد، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا أبا القاسم، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا ماحي، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا عاقب، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا حاشر، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا بشير ،السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا نذير، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا طُهْرْ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا طاهر، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا أكرمَ ولدِ آدمَ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا سيِّد المرسلينَ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا خاتم النبيين، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا رسول ربِّ العالمين، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا قائد الخيرِ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا فاتِحَ البِرِّ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا نبي الرحمة، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا سيِّد الأمة، السَّلاَمُ عَلَيْكَ يا قائدَ الغُرِّ المُحَجَّلين، السَّلاَمُ عَلَيْكَ وعلى أهل بيتكَ الذين أذهب الله عنهم الرِّجسَ وطهَّرهُم تَطهيراً، السَّلاَمُ عَلَيْكَ وعلى أصحابك الطيِّبين، وعلى**

---

هاتووم، ئەوەندە نەفامن نازانن فەزڵی مزگەوتەکە بە هۆی پێغەمبەرەوەیە، ئەویش نیسبەتی داوە لە خۆیەوە، دەفەرموێت: (ومسجدي هذا)واتە ئەم مزگەوتەی من.

وە ڕێگەنادەن کە ڕوو لە قەبرەکەی بکرێت، کە ئیجماعی زانایان لەسەر ئەوەیە جێگە قەبری پێغەمبەر ﷺ لە کەعبەو هەموو کەون و کائیناتیش گەورەترە، وە (حەزرەتی) ئیمامی مالیك (بە خەلیفە مەنصوری) فەرموو: ڕوی لێ بکەو بپارێرەوە، کە وەسیلەی تۆیش و باوکە ئادەمیشتە..

ئەگەر تۆزێك بووەستیت لەو بەردەمەدا چەندین (زەبانیەی دۆزەخ) هاوارت لێ دەکەن و، بە حەرام و شیرك شیرك دوورت دەخەنەوە، خوا هەقی ئەو مەلایین عاشقی پێغەمبەر ﷺ بستێنێت لەوانەش کە ئەو فەتوا ناهەقەیان بۆ داون و، ڕۆژانە مەلایین موسوڵمان کافر دەکەن، خودا پەنامان بدات کە بۆ سەری خۆیان دەگەڕێتەوە.

**أزواجكَ الطاهرات، أمَّهاتِ المُؤمنين ،جَزاكَ الله عنَّا أفضلَ ما جزىَ نَبِيّاً عَن قَومهِ ورَسُولاً عَن أمَّتهِ، وصلى الله عليكَ. كُلَّما ذكركَ الذَّاكِرون، وكُلَّما غفَل عَن ذِكركَ الغافِلون، وصلى اللهُ عليكَ في الأولينَ والآخرين، أفضلَ وأكملَ وأعلَى وأجلَّ وأطيبَ وأطهرَ ما صلَّى علَى أحدٍ مِنْ خَلقه. كما استنقَذَنا بكَ منَ الضَّلالة، وبَصَّرَنا بِكَ مِنَ العَمَايةِ، وهَدانَا بكَ مِنَ الجَهَالة، أشهد أن لا إله الا الله وحدَه لا شريكَ لَهُ، وأَشْهدُ أنَّك عبدُه ورسُولُه وأمينُهُ، وصَفِيُّه وخِيرتُه مِن خَلقهِ، وأشهدُ أنَّك قَد بلَّغتَ الرِّسالةَ وأدَّيتَ الأمانَة، ونصَحتَ الأُمَّة وجاهدْتَ عدُوَّك وهَديتَ أمَّتكَ، وعبَدتَّ ربَّكَ حتى أتَاك اليَقينُ، فصلَّى اللهُ عليكَ وعلى أهلِ بيتِكَ الطَّيِّبينَ الطَّاهِرينَ، وسَلَّمَ وكَرَّمَ وشَرَّفَ وعَظَّم.**

سەلامی خودات لەسەر؛ ئەی نێراوی خوا، سەلامی خوات لەسەر؛ ئەی پێغەمبەری خودا، سەلامی خوات لەسەر؛ ئەی ئەمینداری خودا، سەلامی خوات لەسەر؛ ئەی خۆشەویستی خودا، سەلامی خوات لەسەر؛ ئەی پاڵێوراوی خودا، سەلامی خوات لەسەر؛ ئەی هەڵبژێرراوی خودا، سەلامی خوات لەسەر؛ ئەی پەسەندو شایستە، سەلامی خوات لەسەر؛ ئەی پەسەندکراو، سەلامی خوات لەسەر: ئەی باوکی قاسم، سەلامی خوات لەسەر؛ ئەی ئەوکەسەی کوفرت پێ سڕایەوە، سەلامی خوات لەسەر؛ ئەی ئەو زاتەی بەدوای هەموو پێغەمبەراندا هاتویت، سەلامی خوات لەسەر؛ ئەی ئەوەی لە پێش هەموویانەوە حەشر دەکرێیت، سەلامی خوات لەسەر، ئەی مژدە دەر، سەلامی خوات لەسەر ئەی ترسێنەر، سەلامی خوات لەسەر ئەی پاك و پوخت، سەلامی خوات لەسەر ئەی بەرێزترینی نەوەی ئادەم، سەلامی خوات لەسەر: ئەی گەورەی پێغەمبەران، سەلامی خوات لەسەر: ئەی خاتەمی پێغەمبەران، سەلامی خوات لەسەر: ئەی نێرراوی پەروەردگاری هەموو جیهان، سەلامی خوات لەسەر: ئەی سەرکردەی خێر، سەلامی خوات لەسەر: ئەی فاتیحی دەرگای چاکە. سەلامی خوات لەسەر: ئەی پێغەمبەری

بەبەزەیی، سەلامی خوات لەسەر: ئەی ڕێنومایی کەری ئادەمییەکان، سەلامی خوات لەسەر: ئەی سەرکردەی ناوچاو سپی و دیارەکان، سەلام لەسەر تۆو ئال و بەیتت، کە خودای گەورە لە هەموو چڵك و پیسییەك پاکو خاوێنی کردوون و پوختەو پاڵفتەی کردوون، سەلام لەسەر تۆ و یاران و خانەوادەو دایکانی ئیمانداران، خودا بەباشترین شێوە پاداشتت بداتەوە، کە پاداشتی پێغەمبەرێکی لە قەومەکەیدا دابێتەوە، یان نێرراوێك لە ئوممەتەکەیدا، صەڵات و سەلامی خوات لەسەر؛ هەرکاتێك خاوەن زوبانە پاراوەکان بە یادکردنتەوە زیکرت دەکەن، یان بێ ئاگاکان غافڵن لە یادی تۆ، وە صەڵاتی خوات لەسەر، لە سەرەتاکان و کۆتاییەکان، باشترین و تەواوترین و بەرزترین و نایابترین و، پوختەو پاکترین و، بۆنخۆش و تامدارترین صەڵەوات، کە هیچ کەسێك صڵاواتی وای لێ نەدرابێت، وەك چۆن بەهۆی تۆوە ئێمەی لە گومڕایی ڕزگارکرد، وە کەمو کورتییەکانی پێ نیشانداین، وە ڕێنومایی کردین لە دەربازبوون لە ڕێگەی نەفامی و نەزانین. شایەتی بە یەکخودایی پەروەردگارمان دەدەین، تاك و تەنها و بێ شەریك، وە تۆیش ئەی ڕەهبەری خۆشەویست!

تۆ بەندە و نێرراوی خودایت، ئەمین و پاڵێوراوی، هەڵبژاردەی دروستکراوانی، شایەتی دەدەم کە پەیامەکەت ڕاگەیاند، ئەمانەتت بە هەموان گەیاند، ئامۆژگاری ئوممەتەکەت کرد، جیهادتکرد دژی دوژمنانت، ڕێنومایی گرۆی ئیسلامتکرد، وە بەندایەتی ڕاستەقینەت بۆ خوداوەندت ئەنجامدا، تا گەیشتیت بە متمانەی خۆت، وە تامردن کۆڵت نەدا.

صەڵات و سەلامی خودا؛ لەسەر تۆو ئال و بەیتی هەڵبژێرراوت و، ڕێزو گەورەیی و بەهاو پیرۆزی، شایستەی تۆی گەورەو مەزنمانە. وە هەر کەسێکیش وەصێتی کردبێت کە سەلامی بگەیێنرێت [1] عەرزی بکە سەلامـــت لەســەر لە

(١) ئەمەکاری سەلەفی صاڵحان بووە، روی البیهقي (في الشعب) (٣٨٦٩) قال: کان عمر بن

جیاتی فلان، سەلامت لەسەر لەبری فلان کەس.

لە پاشان بە ئەندازەی باڵێك دێتە دواوەو، سەلام لە (حەزرەتی) ئەبوبەکری صددیق دەکات (خودای لێ ڕازی بێت)، چونکە سەری لە ئاستی شانی پێغەمبەردایە ﷺ . وە سەری(حەزرەتی) عومەریش (خودای لێ ڕازی بێت) لەپاڵ شانی (حەزرەتی) ئەبوبەکردایە.[1] ،لەپاشان بە ئەندازەی باڵێکیش لەو دەکشێتەوەو سەلام لە (حەزرەتی) فارووق دەکات و دەڵێت:

سەلامی خوداتان لەسەر ئەی دوو وەزیرەکەی پێغەمبەری خودا، ﷺ ، یارمەتی دەرە ماندوونەناسەکانی، بۆ بەڕێخستنی کاروباری دینی ئیسلام تا لە ژیاندابوو، وە لەدوای ئەویش بۆ ئوممەتەکەی لە خزمەتدا بوون، شوێن ئاسەواری (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ دەکەوتن، لەسەر سوننەت و ڕەویەو ڕەفتاری بوون، خودای گەورە بە باشترین شێوە کە پاداشتی وەزیری پێغەمبەرەکانی داوەتەوە، لەوە باشتر پاداشتتان بداتەوە، لەپاشان بگەڕێتەوە لەئاستی سەری موبارەکی (حەزرەتی) پێغەمبەردا ﷺ ڕابووەستێت، لە نێوانی قەبر و پایەکەدا، وە ڕوو لە قیبلە بکات و، حەمدو سەنای خودا بکات، تا ئەتوانێت تەمجیدی پێغەمبەر بکات، وە صەڵەواتێکی زۆر لە دیداری (حەزرەتی) فەخری عالەم بدات، لە پاشان بڵێت: ئەی خودایە؛ تۆ خۆت فەرمووتەو ڕاستیشت فەرمووە:

کە ئەگەر بەندەکانم زوڵمیان لە نەفسی خۆیان کرد و، پەنایان بۆ لای تۆ هێناو، لە لای تۆ داوای لێخۆشوونیان بۆ خۆیان کرد و، تۆیش داواو تکات بۆ کردن، ئەوا دەبینن کە خودا بەخشندەو میهرەبانە لە گەڵیاندا و، بەچاوی لێبوردەییەوە سەیریاندەکات:﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ جَاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا

---

عبدالعزيز يوجه بالبريد قاصدا إلى المدينة ليقرئ عنه النبي ﷺ السلام. و أبوزرعة(٣٨٧٥).

(١) نقل ذلك أبوزرعة كما في الشعب (٣٨٧٥).

اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوَّابًا رَحِيمًا﴾ (النساء/٦٤)

ئەی خودایە؛ ئەوا ئێمە هاتین و گوێ بیستی فەرموودەکەت بووین و، ڕوومان لە پێغەمبەرەکەت کرد و، داوای تکاکاریمان لێ کرد، لەو هەموو گوناهەی باری شانی قورس و گران کردووین، تۆبەکارین لە هەموو تاوان و هەڵەکانمان، دانیان پیادەنێین و لێیان پەشیمانین، ئەی پەروەردگاری بەبەزەیی لێمان خۆش ببەو، تکای ئەم پێغەمبەرەتمان بۆ وەربگرە، وە پلەمان بەرزکەرەوە، لەبەر خاتری جاهو مقامی ئەم زاتە و، ڕاستی و ڕێزی لە حزوری خۆتدا. (لەم کاتەشدا دەبێت ڕوبکاتەوە پێغەمبەر ﷺ)

خودایە گیان لە موهاجیرو ئەنصارەکان خۆش ببە، وە لە ئێمەو براکانمان کە بە ئیمان پێش ئێمە کەوتوون لێمان خۆش ببە، ئەی خودای میهرەبان؛ وامەکە کە ئەمە دواجاری بەخزمەت گەیشتنی قەبری پێغەمبەرەکەت و حەرەمی پیرۆزت بێت، لە پاشان با بڕواتە ڕەوضەی پیرۆزەوە، دووڕکات نوێژی تیا بخوێنێت، ئەوەندەی دەتوانێت نزاو پاڕانەوەی زۆری تێدا بکات، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(( مابَيْنَ قَبري وَمِنبَري، روضَةٌ مِن رِياضِ الجَنَّة، ومِنبَري على حَوضي))[1]،

واتە: لە نێوانی ماڵەکەی من، یان گۆڕەکەی من تا میمبەرەکەم (دوانگە) باخچەیەکە لە باخچەکانی بە هەشت. وە دوانگەکەیشم لەسەر حەوزەکەمە، کە کەوسەری پیرۆزە. وە لە پاڵ میمبەرەکەدا نزای زۆر بکات، وە کارێکی باش دەکات کە دەستی بگرێت بە تۆپە خوارووەکەیان، کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی وتاردا دەستی دەخستە سەری[1]،

---

(١) رواه البخاري ( ١١٩٦)، ومسلم( ١٣٩١)، وفيهما (بيتي) بدل (قبري)، وبيته ﷺ هو قبره، وجاء التصريح بلفظ قبري: عند أحمد في المسند(٦٤/٣)، والطبراني في الأوسط (٦١٤)، والبيهقي في السنن الكبرى(٢٤٦/٥).

وە باش وایە کە لە ڕۆژی پێنج شەممەندا بچێت بۆ زیارەتی ئوحود[٢]، وە زیارەتی گۆڕی شەهیدەکان بکات، نوێژی بەیانیش لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ بکات و، لە پاشان بچێتە دەرەوە و بۆ نیوەڕۆ بگەڕێتەوە بۆ مزگەوت.

نابێت نوێژێکی جەماعەتی لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا لەکیس بچێت.

وە چاکتر وایە هەموو ڕۆژێك بچێت بۆ زیارەتی (بەقیع)، لە دوای سەلام کردنی لە پێغەمبەر ﷺ [٣]،وە زیارەتی گۆڕی (حەزرەتی) عوسمانیش بکات، (خودای لێ ڕازی بێت)، وە گۆڕی (حەزرەتی) حەسەنی کوڕی (حەزرەتی) عەلی (خودایان لێ ڕازی بێت)، هەروەها گۆڕی (عەلی کوڕی حوسەین و محمد ی کوڕی عەلی و، جەعفەری کوڕی محمدی تێدایە (خودا لێیان ڕازی بێت).

وە لە مزگەوتی(حەزرەتی) فاطیمەدا نوێژ بکات و، زیارەتی گۆڕی سەید إبراهیمی کوڕی (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ بکات، وە گۆڕی صەفییە خانی ئامۆژنی پێغەمبەر ﷺ ، ئەمانە هەمووی لە بەقیع دان[٤]،

---

(١) تأسيا بفعل السلف الصالح (رضي الله عنهم) روى ابن سعد في طبقاته(٢١٨/١) عن يزيد بن عبدالله بن قسيط قال: **رأيت ناساً مِن أصحاب النبي ﷺ إذا خلا المسجدَ، أخذوا برمّانة المنبر الصعلاء التي تلي القبر بميامينهم،ثم استقبلوا القبلة يدعون**،وروى ابن عساكر في تأريخ دمشق(١٩٢/٥١)عن محمد التيمي قال: **رأيت سعدبن الوقاص وابن عمر(رضي الله عنهما) يأخذان برمانة المنبر ثم ينصرفان**. بەداخەوە ئێستا نەماون .

(٢) چونکە ڕوداوەکە لە ڕۆژی پێنج شەممەدابوو. یان کاتی دەس بەتاڵی ئەهلی مەدینەیە.یان لەبەر فەرمــوودەی پێغەمــبەر ﷺ کە طەبەرانــی لە (الأوســط) دا (٤٨٢٦) گێــڕاویەتیەوە: ((**بورك لأمتي في غَدوَةِ الخَميس**) یان لە هەر ڕۆژێکی تر نەگەر بۆی نەکرا، إتحاف ٤٢٣/٤ ..

(٣) فرمانی خودا هەیە بەم زیارەتکردنە، وەك لە ڕیوایەتی صەحیحی موسلیم دا هاتووە:(٩٧٤).

(٤) بەڕاستی جێگەی داخە، موجەسیمەکان و نەیارەکانی (حەزرەتی) پێغەمبەر و ناحەزانی ئال و بەیت و صەحابەکان، هەموو ئەو جێگە پیرۆزانەیان تێك و پێکداوە، ئەو خەڵکە کەمێکی نەبێــت ســەرگەردان دەســوڕێنەوەو، نــازانن زۆربەی ئەو مەرقەدانە لە کوێن،

وه زۆر باشەکات کە هەموو ڕۆژانێکی شەممە زیارەتی مزگەوتی (قوباء) بکات، وەنوێژی تێدا بکات، لەبەر ئەو فەرموودەی کە دەیگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی:

**(( مَن خرجَ مِن بيتهِ حتَّى يأتِيَ مَسجدَ (قُباءَ) ويُصَلِّيَ فيهِ، كانَ لَهُ عِدلُ عَمرَةٍ))**[1]

ئەوەی لە ماڵی خۆیدەربچێت و نەوەستێت تا دەگاتە مزگەوتی (قوباء) وە نوێژی تیا بکات، خێری عومرەیەکی بۆ دەنوسرێت.

لەپاشدا بچێتە سەر بیری (ئیریس)کە دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ تفی موبارەکی خۆیی تێ کردووە[2]، کە لە پاڵ مزگەوتی قوبا دایە، دەستنوێژی لێبشوات و

---

باوەڕتان هەبێت زۆرم نەوتووە ئەگەر بڵێم: لە چەرخی (حەزرەتی) فەخری عالەم دا بوونایە. ئەمانەو ڕافیزییەکان زۆربەیان شوێن کەوتەی ئەبووجەهل و ئومەییە دەبوون و، لە داهاتویشدا شوێن کەوتەی دەججال دەبن، ئەم هەموو دیمەنی کوشت و کوشتار و قەزف و جنێوو تەکفیرو تەفسیقەی دەیبینین لێیانەوە، لە هەزار بەڵگە بەهێزترە، خودا پەنامان بدات، لە دەست و دەمیان، پێغەمبەر ﷺ دوای شەهید بوونی (حەزرەتی) حەمزە، دڵی نارەحەت بوو، کەس نیە بۆ حەمزەی مامی بگری و. پرسەو سەرەخۆشی لێ بکات، تا هەندێك ئافرەتی ئەنصار بەم ئەرکە هەستان، ئەی ئەبێ ئێستە لەو دڵرەقە ناوچاو تاڵە بێ ئەدەبانە نیگەران نەبێت؟!! کە کەس نازانێت گۆڕی مامەکەی پێغەمبەر لە کوێدایە! یان گۆڕی (حەزرەتی) خەدیجە، کە تا وەفاتیشی کرد هەریادی دەکرد، یان مزگەوتی (حەزرەتی) فاطیمە، یان صەدان شوێن و شوێنەواری پیرۆز. خودایە بەعەدلی خۆت لەگەڵیاندا بجوڵێرەوە و تەفرو تووونایان بکە...... ئامین.

(١) رواه النسائي (٣٧/٢)، وابن ماجه(١٤١٢) .بإسناد صحيح.

(٢) كما روى ذلك البيهقي في (دلائل النبوة)(١٣٦/٦)، عن يحيى بن سعيد عن أنس بن مالك، وقد سأل عن بئر بقباء فَدُلَّ عَلَيها، فقال: **لقد كانت هذه ، وإن الرجل لينضحُ على**

لە ئاوەکەیشی بخواتەوەو، بجوڵێت بۆ مزگەوتی (فەتح) کە لەسەر خەندەقە، وە هەموو مزگەوت و مەشهەدە پیرۆزەکانی تر بڕوات، وەك دەڵێن:

کۆی ئەو جێگاو مزگەوتە پیرۆزانە سی مەشهەدن، ئەهلی مەدینە دەیان زانن، ئەوەندەی لە توانای دا هەبێت زیارەتیان بکات، وە هەروەها زیارەتی ئەو بیرانە بکات کە پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی لێدەگرتن، وە خۆی دەشۆرد و ئاوی لێدەخواردنەوە، کە حەوت بیر بوون، ئەمیش سەریان لێبدات و بۆ تەبەڕوك و شیفا، کە پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەی کردووە.[1]،

وە ئەگەر بتوانێت لە مەدینە بمێنێتەوەو ڕێزو حورمەتی جێگاکانیش ڕابگرێت، ئەوا مانەوەی خێرێکی زۆر گەورەی دەسدەکەوێت.

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی :

ئەوەی لە ناو مەدینەدا خۆی لەسەر نارەحەتی و سەختییەکانی ڕابهێنێت، ئەوا

---

**حماره، فينزح، فنستخرجها له، فجاء رسول الله ﷺ وأمرَ بِذَنوبٍ (دَلوٍ) فسقي، فإمّا أن يكون توضأ منه، أو تفل فيه، ثم أمر بهِ فأُعيدَ في البئر، قال: فَما نزَحَت بَعدُ.)**، وقد بيّن الحافظ الشامي أنها بئر (أريس) في (سبيل الهدى والرشاد).( ٣٤٦/٧) وأريس نسبة إلى رجل من يهود، وهو بلغة أهل الشام (الفلاح). ومنه حديث:**(فإنَّ عليكَ إثمَ الأريسيين)** وهي من أعذبِ آبار المَدينة المنورة.

(١)وتلك الآبار السبعة هي بئر أريس(البخاري، ٣٦٧٤)، ومسلم(٢٤٠٣)، وبئر بيرحاء، في البخاري(٤٥٥٥)، ومسلم(٩٩٨)، وهي بئر أبي طلحة (رضي الله عنه) وبئر رومه، في الترمذي(٣٦٩٩) وهي بئر سيدنا عثمان (رضي الله عنه) وبئر غَرس، في ابن ماجه(١٤٦٨)، **إذ أوصى ﷺ أن يغسل إذا مات بسبع قِرَب منها**، وبئر بُضاعة،في أبي داوود(٦٦)،والترمذي (٦٦) ، والنسائي (١٧٤/١)، وبئر البُصه ، وانظر: خلاصة الوفا (١٢٦/٢)، إذ نسبه لابن عدي، واختلف في السابعه فقيل هى بئر السُقيا، في أبو داوود (٣٧٣٥)، أو العهن، فقد ذهب السيد السمهودي إلى أنها هي بئر اليسيرة كما في خلاصة الوفا، (١٣٨/٢، ١٤٢)، او بئر جمل، كما في البخاري (٣٣٧)، ومسلم (٣٦٩)

من دەبم بە شەفیع و تکاکار بۆی لە ڕۆژی دواییدا.

**(( لا يَصبِرُ علَى لأْوائِها وشِدَّتِها أحدٌ إلاَّ كُنتُ لهُ شَفيعاً يومَ القِيامةِ))**[1].

لەپاشان ئەگەر لەکارەکانی لێبوویەوە، وە بڕیاریدا کە مەدینە بەجێ بهێڵێت، واباشە کە بێتە خزمەتی مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ وە، وەك جاری یەکەم زیارەتێکی بکات، وە خوداحافیزی لە پێغەمبەری خودا بکات، وە داوایش لە خودا بکات جارێکی تر ئەم زیارەتەی بە نسیب بکاتەوە، وە داوای سەلامەتیش بکات لە گەڕانەوەیدا، لە پاشان لە ڕەوزە بچووکەکەدا دووڕکات نوێژ بکات، لەو جێگەی پێغەمبەر ﷺ تیایدا ڕادەوەستا و دەمایەوە، پێش ئەوەی مزگەوتەکە لێی زیاد بکرێت.

کاتێك کە چووە دەرەوە، باپێی چەپی پێش بخات، لەپاشان پێی ڕاستی، وە بڵێت: ئەی خودایە صەلات و سەلامی خۆت برژێنە بەسەر (حەزرەتی) موحەممەد و ئال و ئەصحابیدا، با ئەمەش دواجاری هاتن و بەخزمەت گەیشتنم نەبێت بۆ حزوری پێغەمبەرەکەت . وە گوناهەکانم بەم زیارەتە لەسەر بسڕەرەوە، وە سەلامەتی بکەرە هاوڕێی گەشتەکەم، وە بتوانم بە ئاسانی بگەڕێمەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵ و نیشتیمانم، ئەی لەهەموو بەڕەحمەکان بەسۆز و میهرەبان تر.

وە بە پێی توانای خۆی، با خێر و صەدەقە ببەخشێتەوە بە دراوسێ و نزیکەکانی چواردەوری مەرقەدی پێغەمبەر ﷺ، وە بگەڕێ بەشوێن ئەو مزگەوتانەدا کە لە نێوانی مەککەو مەدینەدان، (ئەگەر لەوێوە ڕۆشتەوە) بۆ ئەوەی نوێژیان تێدا بکات، کە بیست مزگەوتن ([2]

(١) رواه الترمذي (٣٩١٧)، وابن ماجه (٣١١٢).

(٢) روى ذلك في البخاري في صحيحه (٤٨٣،٤٨٤).

# ناوبڕێك

## باسی سوننەتەکانی گەڕانەوە لە سەفەر

پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لە غەزایەك یان لە سەفەری حەج یان هەر گەشتێکی تر بگەڕایەتەوە، لەسەر هەر بەرزاییەك لەو ڕێگەدا کە بەسەریدا دەڕۆیشت سێ (الله أکبر)ی دەکرد، وە دەیفەرموو: (( **لا إِلهَ إلاَّ اللهُ وحدَه لاشَرِيك لَه، لهُ الملكُ ولهُ الحَمدُ وهُو علَى كُلِّ شَيِءٍ قَدير. آيِبونَ تائِبونَ عابِدونَ ساجِدونَ لِربِّنا حامِدون، صَدَقَ الله وَعدَهُ، ونصَرَ عَبْدهُ، وهزَمَ الأَحزابَ وحدَهُ**)[1].

وە لە هەندێك ڕیوایەتدا ئەم زیادەیشی لە گەڵدایە:

**﴿وكلُّ شَيءٍ هالِكٌ إلاَّ وَجهَهُ، لهُ الحُكمُ وإليهِ تُرجَعُونْ﴾** [2]

گەڕاینەوە، تەوبەمانکرد، سوجدە بۆ خودا دەبەین، حەمدوسەنای دەکەین، بەڵێنی خۆیی بردەسەر، عەبدەکەی خۆیی سەرخست، هەموو ئەحزابەکانی تێکشکاند، هەموو شتێك لەناو دەچێت تەنها خۆی نەبێت، حوکم و بڕیار تەنها بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە، وە هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە. پێویستە ئەم سوننەتەیە لە گەڕانەوەیدا بەکار بهێنێت.

وە کاتێك نزیکبوویەوە لە شارەکەی تۆزێك خێراتر بڕوات و بڵێت:

( **اللَّهُمَّ :اجعَلْ لَنا بِها قَراراً ورِزقاً حَسَناً**)[3].

خودایە لەم شارەدا سەقامگیرمان بکەو. ڕزق و بژێوی چاکمان بدە. لە پاشان هەواڵێك بنێرێت بۆ ماڵەوەیان، کە وا گەیشتۆتە بەرەوە، بۆ ئەوەی لە پڕێکدا

---

(١) رواه البخاري (١٧٩٧). ومسلم (١٣٤٤).

(٢)رواه المحاملي في الدعاء (٧٥)

(٣)قال العراقي رواه المحاملي في الدعاء (٩٥) باسناد جيد، أنه ﷺ إذا قدمَ مِن أسفرهِ ، فأشرَف على المدينة ..يسرع السيرَ و يقول: ((**اللهم : اجعل لنا بها قراراً ورِزقاً حسناً**)).

خۆی نەدا بەسەرياندا[1]،ئەمە سوننەتەو نابێت بەشەوداو دوای عیشا یەکسەر خۆی بکات بە ماڵدا، تا هەواڵیان بۆ دەنێرێت، با لە پێشەوە بچێتە مزگەوتێکی نزیکەوە و، سوننەتە دووڕکات نوێژ بکات، پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەی دەکرد[2]،

ئەگەر گەیشتە ماڵەوە با بڵێت:

(( تَوباً تَوباً، لِرَبِّنا أَوباً، لايُغادِرُ عَلَينا حَوباً))[3]،

واتە: تەوبە دەکەین و تەوبە دەکەین، دەگەڕێینەوە بۆ لای خودای خۆمان، کە هیچ گوناهێکمان لەسەر ناهێڵێت .

کاتێك لە ماڵەکەی خۆی دامەزرا، نابێت ئەو نیعمەتە گەورانە لەبیر خۆی بەرێتەوە، کە زیارەتی ماڵی خودای کردووە، وە لە حەرەمی مەککەدا ماوەتەوەو ...رەتی گۆڕی(حەزرەتی) پێغەمبەری کردووە ﷺ، نابێت کوفرانەی ئەم نیعمەتانە بکات، وە نابێت بگەڕێتەوە بۆ حاڵەتی گەمە و گاڵتەو ڕۆچوون لە گوناهو تاونکاری دا.

ئەگەر وای لێ هات، نیشانەی ئەوەیە کە حەجەکەی لێ وەرنەگیراوە، بەڵکوو حەجی وەرگیراو نیشانەکەی ئەوەیە: کە ئیتر ئەوەندە باوەش بە دونیادا نەکات، وە زیاتر حەزی لە وەدەست هێنانی ژیانی پڕ لەسەربەرزی قیامەت بێت، بۆ ئەوەی هەر لە دونیادا خۆی بۆ لیقای خوداوەندی ئامادە بکات و، وەك چۆن زیارەتی بەیتی خودای کردووە، ئاوایش ئامادەباش بێت بۆ گەیشتن بە خزمەتی پەروەردگاری ماڵی خودا.

---

(١) كما في البخاري(٥٠٧٩)، ومسلم(١٨١/١٩٢٨)، إذ قال ﷺ للركب: **إمهلوا حتى ندخُلَ ليلاً، أي: عِشاءً، كي تمتَشِطَ الشُّعثَةُ، وتستحيدَ المَغيبَةُ**، فإعلام الأهلِ مفهوم من سياق الحديث

(٢) كما في البخاري(٤٤١٨)، ومسلم(٧١٦).

(٣) رواه أحمد في المسند(٢٥٥/١)،

# دەروازەی سێیەم

## باسی ئادابە ورد و ناسکەکان و کردارە شاراوەکان بەیان و ڕوونکردنەوەی ئادابە وردەکان کە (دە) ئادابن:

**یەکەم:**

دەبێت ئەو پارەو پولەی سەرفی دەکات حەڵاڵ بێت، وە دەستیشی نەگیرابێت بە کارێکی بازرگانی وەهاوە، کە دڵی لە زیکری خودا لابدات، وە بیری پرش و بڵاوو پەرتەوازە بکات، بۆ ئەوەی تەنها بیرو خەمی سەرەکی بەلای خودا پەرستیوە بێت، وە دڵیشی ئارام و بێ خەفەت بێت، تا بتوانێت ڕووی پێبکاتە زیکری خوداو، ناسین و گەورە زانینی شەعائیرەکانی. لە فەرموودەیەکەوە لە ڕێگەی ئالوبەیتەوە پێمان گەیشتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((إذا كانَ آخرُ الزَّمانِ خرَجَ النَّاسُ إلَى الحج أربعَةَ أصنافٍ سَلاطينُهُم للنُّزهَةِ، وأَغنياؤُهُم للتِّجارَة، وفُقَراؤُهُم لِلمَسأَلَةِ، وقُرَّاؤُهُم للسُّمْعَةِ))**[1]،

واتە ئەگەر ئاخر زەمان هاتە پێشەوە، ئەو خەڵکە کە بۆ حەج کردن دەڕۆن چوار بەشن: دەسەڵاتدارەکانیان بۆ گەشت و نوزهەو کات بەسەر بردن، وە دەوڵەمەندەکەنایان بە مەبەستی بازرگانی، وە هەژارەکانیان بۆ سواڵکردن و خۆ ژیاندن، وە قورئان خوێنەکانیشیان بۆ پەیداکردنی ناووشۆرەت.

---

(١) رواه الخطيب في تأريخ بغداد. (١٠/ ٢٩٦) (٥٤٣٤)، من حديث أنس. بنحوه، وليس فيه ذكر السلاطين، ورواه أبو عثمان الصابوني في كتاب (المئتين) وساق سندها الحافظ الزبيدي في الإتحاف(٤٣٢/٤)، ولفظ المصنف من القوت،( ١١٧/٢)، وكذا سياق المصنف هنا. وأخرجه الديلمي في مسند الفردوس(٤٤٤/٥)(٨٦٨٩).

لەم فەرموودەیەدا هێمای تێدایە بۆ کۆمەڵێك ئامانجی دونیایی، کە دەکرێت ببنە ئامانجی حاجیەکان و پەیوەنداری حەجکردن بێت، کە هەموویان ڕێگر دەبن لە مانەوەی گەورەیی حەج، وە لە زیارەتە تایبەتیەکانی دەردەهێنێت و دووری دەخاتەوە، بە تایبەتی ئەگەر بۆ ئەصڵی حەجەکەیش بازرگانی پێوە بکات. بەوەی کە بە کرێ حەج بۆ یەکێکی تر بکات، واتە: بە کردنی کرداری دوارۆژ، مەبەست پێی ژیانی دونیای بێت، بە ڕاستی خواناسە خۆپارێزو خاوەن دڵە زیندووەکان، ئەم حاڵەتەیان پێ پەسەند نەبووە، مەگەر مەبەستی ئەوە بێت بگاتە مەککەو، ئەوەندەیشی نەبێت کە بیگەیێنێتە بەرەوە، ئەوە بەو نیەتە ئەگەر شتێك وەر بگرێت قەیناکە ، نەك لە پێناوی ئەوەدا پارە وەربگرێت، کە بە هۆی دینەوە دونیای دەستبکەوێت، وە لەم حاڵەشدا کە نیەتەکەی باشە، دەبێت مەبەستی زیارەتی ماڵی خودا بێت و، یارمەتی دانی ئەو برا موسوڵمانەش بێت، کە فەرزەکەی لەسەر نەمێنێت، وە لە نموونەی ئەم پیاوەیە کە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ واتای لێك دەدرێتەوە کە فەرموویەتی :

**(( یَدخُلُ اللهُ سُبحانَهُ بالحَجَّةِ الواحِدَةِ ثلاثةً الجَنَّةَ: المُوصي بِها، والمُنَفِذُ لَها، ومَنْ حجَّ بِها عَنْ أَخيهِ))**[1]،

واتە: بە هۆی تاکە حەجکردنێکەوە، خودای گەورە سێ کەس دەخاتە ناو بەهەشتەوە: ئەوەی وەصێتی کردووە بەوەی حەجی بۆ بکرێت لە ماڵەکەی، وە ئەو کەسەش کە وەسێتەکەی جێبەجێکردووە، وە ئەو کەسەیش کە لە جیاتی براکەی حەجی بۆ کردووە.

من ناڵێم دروست نیە کرێ وەربگرێت، یان حەرامە وەری بگرێت، دوای ئەوەی فەرزی حەجی لەسەر نەمابێت، بەڵام باشتر وایە نەیکات، وە ئەم کارە نەکات بە کەسابەت و هۆی بازرگانی، چونکە خودای (عَزَّ وجَلَّ) دونیا بەهۆی

---

(١) رواه البيهقي في السنن(٥/١٨٠)،(٩٦٣٦) وفي الشعب( ٣٨٢٨).

دینەوە دەبەخشێت، بەڵام سوننەتی خودا وانیە، کە بە هۆی دونیاوە دینی پێببەخشێت، وەك لە فەرموودەدا هاتووە:

**(( مَثَلُ الذي يَغزو في سبيلِ اللهِ(عَزَّ وجَلَّ) ويَأْخُذُ أجراً، مِثلُ أُمِّ مُوسى (عليهِ السَّلام) تَرضَعُ وَلَدَها وتأخُذُ أجرَها))**[١]

واتە: نموونەی ئەو کەسەی کە لەڕێگەی خودا غەزاو جیهاد دەکات و کرێیش وەردەگرێت لەسەر کارەکەی، وەك دایکی (حەزرەتی) موسا وایە، کە منداڵەکەی خۆیشی بە خێو دەکرد و کرێیشی لەسەر وەردەگرت.

کەواتە هەرکەسێك لە وەرگرتنی کرێدا بۆ ڕۆشتنی حەج وەك دایکی موسا وابوو، ئەوە ئاساییە کرێ وەربگرێت، ئەوە بۆیە وەری دەگرێت کە بتوانێت حەجیش بکات و زیارەتیش بکات، وە بەمەبەستی ئەوەی کرێی لەسەر وەربگرێت حەج ناکات، بەڵکوو کرێ وەردەگرێت، بۆ ئەوەی حەجەکەی پێبکات، وەك چۆن دایکی موسا کرێی وەردەگرت، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بتوانێت شیر بەمنداڵەکەی بدات، وە ڕاستییەکەیان لێبشارێتەوە.

## دووهەم:

نابێت یارمەتی دوژمنانی خودا بدات، یارمەتی دەرانی زاڵمەکان، کە باج و سەرانە(مەکس)[٢] بە زوڵم لە خەڵکی وەردەگرن و، ڕێگری زیارەتی بەیتیان لێدەکەن، تا ئەو سەرانەو بەرتیلەیان لێ وەردەگرن. لە ئەمیرەکانی مەککەو ئەعرابەکان، کە ڕێگەکە دەبڕن و باجیان لێ وەردەگرن، هەرچییەك بەمانە بدرێت، وەك یارمەتی دانیانە لەسەر زوڵمەکەیان، وە ئاسانکردن و هاندانێکیشە بۆ ئەوان، وەك ئەوە وایە بە نەفسی خۆی یارمەتییان بدات.

با بەنەرمی بەهانەو پلانێك دابڕێژێت و، خۆی لەو باج و سەرانە ڕزگاربکات،

---

(١) رواه ابن أبي شيبة، في المصنف(١٩٨٨١)، وأبو داوود في المراسيل(٣١٨).

(٢) قال ﷺ فيما رواه أبوداوود (٢٩٣٧): **(لايَدخُلُ الجَنَّةَ صاحِبُ مَكسٍ)**.

ئەگەر نەیتوانی، ئەوا هەندێك لە حوكەما كە قسەكەشیان خراپ نیە كە فەرموویانە: واز هێنان لە حەجێكی سوننەت، كە یارمەتی زاڵمی لێ نەكەوێتەوە، باشترە لەو حەجەی كە یارمەتی تاوانكاری ئەوانی تێدابێت.[1]

ئەم جۆرە تالآنكردن و باج وەرگرتنە، جۆرە بیدعەیەكی خراپە پەیدایان كردووە، ئەگەر ملكەچیان ببین دەبێتە سوننەتێكی بەربڵاوو، بە زیان و ملكەچ بوونی موسوڵمانیش دەشكێتەوە، وەك ئەوەی جزیەو سەرانە بدات.

وە هیچ مانایەكی نیە ئەوەی بڵێت: ئەوەم لێ وەردەگرن و من ناچارم، خۆ ئەگەر لە ماڵەوە دابنیشێت، یان بگەڕێتەوەو واز لەسەفەرەكەی بهێنێت ئەوا هیچیان لێ وەرنەدەگرت، بەڵكوو لەوانەیە بە شێوازێكی تر خۆی وەك دەوڵەمەندێك دەربخات و داوای زیاتری لێبەكەن، خۆ ئەگەر لە بەرگی هەژارێكدا بوایە، ئەو داوای گەورەیان لەسەری نەدەبوو، كەواتە خۆی خۆی ڕاكێشاوە بۆ ئەو حاڵەتەی بە ناچاری سەرانەیان پێ بدات

## سێیەم:

با خۆراك و پێداویستی زیاتری پێ بێت، وە بەدڵێكی كراوەو دوور لەبەرچاو تەنگییەوە لێی سەرفبكات، نە بەشێوەی ئیسراف و، نە بە خۆگرتنەوە، بەڵكوو بە شێوەیەكی مامناوەندی و میانەڕەوی.

مەبەستم لە زیادەڕەوی ئەوەیە: جۆرەها خواردن و خوارنەوە بڕازێنێتەوە وەك نەریتی دەوڵەمەندە بەرچاو برسییەكان، بەڵام زۆر بەخشینەوە هەرچەندێك بێت ئەوە زیادەڕەوی تێدا نیە، چونكە وەك وتراوە:

نەخێر لە زیادەڕەویدا بوونی هەیە، نە زیادەڕەویش خێری تێدا هەیە![2]،

---

(١) قوت القلوب ٢/١١٧.

(٢) ئەمە فەرموودەی حەسەنی كوڕی سەهلە، وەك ابن عبدالبر لە (بهجة النفوس)دا باسی كردووە(٢/٦١٤.

وه زیاده بەخشینی خۆراك و بژێوی ژیان له ڕێگەدا، ئەوه سەرفکردنێکه له ڕێی خودای (عَزَّ وجَلْ) دا بۆی دەژمێررێت، وه هەموو دیرهەمێکیش به حەوت صەد دیرهەم زیاتر خێری بۆ دەنوسرێت.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: له نیشانەی سەخاوەت و بەڕێزی پیاوه، سفرەو خوانی ڕێکوپێکی هەبێت له گەشتەکەیدا، هەروەها دەفەرموێت: گەورەترینی حاجیەکان، ئەو کەسەیه: نیەتی له هەمویان ئیخلاصی زیاتری تێدا بێت، وه پوختەترین و باشترین بەخشندەیی هەبێت له خۆراکدا، وه متمانەیشی بەخودا لەهەموان بەهێزتربێت، [1]،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**الحَجُّ المَبرورُليسَ لَهُ الجَزاءُ إلاَّ الجَنَّة، فقيلَ يارَسول الله: ما بَرُّ الحَجِّ؟ فقال: طيبُ الكَلامِ، وَإطعامُ الطَّعامِ.**)) [2]، واته: حەجێکی وەرگیراو هیچ پاداشتێکی نیه بەهەشت نەبێت، وتیان ئەی پێغەمبەری خودا؛ حەجی وەرگیراو کامەیه، فەرمووی: قسەی خۆش و نەرم و نیان بێت، وه خۆراك ببەخشێتەوەو نانی خەڵکی بدات.

**چوارەم:** واز له (ڕەفەث و فسوق و جیدال) بهێنێت، وەك قورئان باسی فەرمووه: **ڕەفەث:** ناوێکه بۆ هەموو قسەیەکی پوچ و بێبایەخ و گەمەو گاڵتە، وه قسەی بێ شەرمی و بێ پەرده بەکاربهێنێت، وه دواندن و یاری کردن له گەڵ ئافرەت و، باسی دڵداری و باسکردنی بابەتی درووست بوون و سەرجێیی کردن و سەرەتاکانی پەیوەندی، که هەمووی دەبێته هۆی بزواندنی حەزی پیاوو ژن بۆ نزیك بوونەوه له درووستبوونی حەرامکراو، وه هەرچیش پەلکێشت بکات بۆ شتی حەرامکراو حەرام دەبێت.

**فسووق:** ناوێکه کۆی هەموو کارێکی دەرچوون له فرمان و گوێڕایەڵی خودای

(١) قوت القلوب٢/١١٥.

(٢) أوله في الصحيحين، وقد تقدم، وهو بهذا اللفظ رواه أحمد في مسنده(٣/٣٢٥) بنحوه.

(عَزَّ وجَلَّ) دەگرێتەوە.

**جیدال:** زۆر قوڵ داچوونە لە بەربەرەکانێ و دەمەدەمێ و شەڕەقسەدا، وە چەلەحانێکردن لەگەڵیداو، گومان دروست کردن بۆ قسەکانی، کە ڕق و کینە لە دڵیاندا دروست دەبێت بەرامبەر یەك، وە هیممەت و پێکەوە ژیانیان کاڵ دەبێتەوەو، کارێکی نادروستەو هەرگیز لەگەڵ ڕەوشتی بەرزدا ناگونجێت.

(حەزرەتی) سوفیانی ثەوری فەرموویەتی: ئەوەی قسەی بێ پەردەو ناشرین و گەمەو گاڵتە بکات، حەجەکەی بەتاڵ دەبێتەوە[1]،

وەك پێغەمبەر ﷺ قسەی خۆش و، ناندانی خەڵك و، وشەی شیرینی لە نیشانەکانی وەرگیراوی حەجەکە داناوە. وە قسە بەزۆراندان و گومان دروست کردن لەگەڵ وشەی جوان و شیرین یەك ناگرنەوە، کەواتە نابێت ئەوەندە ڕەخنە لە هاوڕێکەی بگرێت، یان لە وشترەوانەکەی، وە نابێ توندو نەگونجاو بێت لە گەڵ هاوڕێکانی و کەسانی تریش دا، بەڵکوو دەبێت نەرم و نیان بێت، ئەوەندە شان دابدات بۆ هەموو نارەحەتییەك کە خەڵکی لەماڵی خوادا بەسەریا بڕوات گوێیان پێینەدات.

کەواتە دەبێت بە ڕەوشتی جوانەوە لە گەڵیاندا بجوڵێتەوە، ڕەوشتی جوانیش تەنها ئەوە نیە کە دوچاری ئێش و ئازاریان نەکات، بەڵکوو دەبێت خەم و پەژارەیی و ناسۆرو ئازارەکانیشیان هەڵبگرێت، بۆیە بە سەفەر وتراوە: سەفەر، چونکە ڕەوشتی پیاوەکان دەردەخات، بۆ یە (حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) بەو کەسەی وای گومان برد کە پیاوێك دەناسێت فەرمووی: ئایا هاوڕێیەتی سەفەرت لە گەڵدا کردووە؟! کە بەڵگەیە لەسەر خووڕەوشتی ئەو کەسەیە، فەرمووی: نەخێر، فەرمــــووی: کەواتە وانابینم کە بیناسیت.[2]،

---

(١) قوت القلوب٢/١١٥.

(٢) رواه ابن أبي الدنيا في الصمت وآداب اللسان (٦٠٧)وبلفظ المصنف هو في القوت: ٢/١١٥.

**پێنجەم:** ئەگەر توانای هەبوو با بە پیادەڕەوی حەج بکات، ئەوە خێری زیاترە، عەبدوڵلای کوڕی عەباس (خودایان لێ ڕازی بێت) لە کاتی وەفاتیدا وە سێتی کرد بۆ کوڕەکانی فەرمووی: ئەی کوڕەکانم: بە پیادەڕەوی حەج بکەن، چونکە حاجییەك بە پێ بڕوات و سوار نەبێت، بە هەموو هەنگاوێك حەوت صەد خێری بۆ دەنوسرێت، لە چاکەکانی حەرەم، وتیان : چاکەی حەرەم کامەیە؟ فەرمووی: چاکەیەکی حەرەم بە صەد هەزار چاکەیە[١]،

وە ئەم پیادەڕەوییە لە ڕۆشتن، بۆ بەجێهێنانی مەناسیکەکانی حەجدا، وە ڕۆشتن بۆ وەستانی عەرەفەو مینادا، خێرو چاکەی زۆر زیاترە لە ڕۆشتنی ڕێگای دەرەوە بۆ ناو مەککە.

وە ئەگەر لە گەڵ پیادە ڕەویەکەدا هەر لە ماڵەوە بە بەرگی ئیحرامیشەوە بێت، وەك وتراوە: ئەوە لە تەواو بوونی پلەکانی حەجە، وەك (حەزرەتی) عومەر و عەلی و ئیبنو مەسعود فەرموویانە (خودایان لێ ڕازی بێت) لە لێکدانەوەی واتای ئایەتی ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ (النساء/٩٥)

وە هەندێك لە زانایان فەرموویانە: بە سواری بێت بۆ حەج خێری زیاترە، چونکە مەسرەفی زیاتردەکات و، پێویستی بە ئاڵف و جێگەی وڵاخەکەیشی دەبێت، وە کەمتر تووشی خۆشکاندنەوەو ئازاردانی خۆی دەبێت، وە سواریش بێت باشتر دەتوانێت بە کاملی مەناسیکەکان جێبەجێبکات.[٢]،

لە کاتی لێکدانەوەی ئەم دەستەواژەیە، جیاکاری و پێچەوانەی ڕا یەکەمەکە نیە، بۆیە پێویستە بابەتەکە شیتەڵ بکرێتەوە، وە بوترێت:

ئەوەی ڕۆشتنی لا ئاسان بوو، ئەوە ڕۆشتن بۆ ئەو خێرترە، ئەگەر

---

(١) رواه الطبراني في الأوسط(٢٦٩٦)، والحاكم في المستدرك(١/٤٦٠)، وبلفظ المصنف رواه أبو ذر الهروي في منسكه كما في الإتحاف ( ٤/ ٤٣٥).

(٢) قوت القلوب(٢/١١٦).

ڕۆشتنەکە لاوازی دەکرد و وای لێدەکرد خراپ لەگەڵ خەڵکیدا بجوڵێتەوەو، مەناسیکەکانیش بە کەموکورتی جێبەجێ بکات، ئەوە بۆ ئەو کەسە سواربوونەکە باشترە، وەك چۆن بەڕۆژوو بوون خێری زیاترە بۆ ئەو کەسەی کە لە سەفەردا بێت، یان نەخۆش بێت، مادەم دوچاری لاوازی و بێهێزی و ڕەوشتنزمی نەکات.

**وەك پرسیارکراوە لە هەندێك لە زانایان:**

ڕۆشتن بە پێ بۆ حەج خێری زیاترە، یان گوێدرێژێك بە دیرهەمێك بە کرێ بگرێت؟ فەرمووی: ئەگەر کێشی دیرهەمەکە لەسەر دڵی قورستر بێت، ئەوە بەکرێ گرتنەکە خێری زیاترە، وە ئەگەر ڕۆشتنەکەی زیاتر لەسەر ناڕەحەت بوو، ئەوە بە پێ ڕۆشتن خێری زیاترە. وەك پیاوە دەوڵەمەندەکان، بە پێ بڕۆن خێری زیاترە بۆیان، چونکە پارە لای ئەوان بەهایەکی نیە[1].

وەك ئەوەی ڕێگەی موجاهەدەی نەفسی لەگەڵدا بەکار هێنابێت، ئەم ڕایەش ڕوویەکی پەسەندی هەیە، بەڵام بەهەر حاڵ باشتر وایە بەپێ بڕوات و ئەو دیرهەمەیش بە صەدەقە بکات بەخێر، ئەوە باشترە لەوەی بیدا لە کرێدا، لەبریتی ئازاردانی وڵاخێکدا، بەڵام ئەگەر نەفسی ئەو کەسە ئەوەندە فراوان نەبوو، کە ئەو دووحاڵەتە کۆبکاتەوە و، لە نێوانی ماندووبونی نەفس و کەمکردنی ماڵ، بۆی لێکنەدەدرایەوە کامێکیان بۆ باشترە یان خراپتر، ئەوکاتە، ئەو ڕایەی لە کۆتاییدا باسیان کرد، ڕێی تێ دەچێت و گونجاو ترە.

**شەشەم:**

دەبێ سواری وشترێك ببێت کە (زامیلە) بێت، واتە: هەموو کەرەستەو پێداویستی سەفەرەکەی پێوە بێت، بەڵام وشترێك کەژاوەی تایبەتی پێوە بەسرابێت، وا چاکە سواری نەبێت، مەگەر لە حاڵەتێکدا کە ترسی لە وشترە

---

(١) قوت القلوب٢/١١٧.

زامیلەكە بێت كە كەرەستەكانی بخات. ئەو كاتە سواری كەژاوەدارەكە ببێت، یان نەتوانێت خۆی بەسەر زامیلەكەوە ڕابگرێت، لەبەر عوزرێك كە هەیبێت، ئەمەش دوو واتا دەگەێنێت:

**یەكەم:** بارسوكییەك بێت بۆ وشترەكە، چونكە خۆی باری هەبێت و ئەمیش سواری بێت ماندوو تری دەكات.

**دووهەم:** خۆی بپارێزێت لە لەبەركردنی بەرگی دەوڵەمەندو ئەوانەی زیادەڕەوی دەكەن و فیزو دەماریان هەیە.

پێغەمبەر ﷺ بەسەر وشترێكەوە حەجی كرد، كە ڕاخەرێكی كۆنی پتوركاو لەسەر پشتی بوو، وە پارچە قەدیفەیەكی ڕزاو، كە چوار دیرهەم نرخی بوو، وە لەسەر ئەو وشترەیشەوە تەواف دەكرد، بۆ ئەوەی خەڵكەكە خوو ڕەوشتی ببینن و ڕێنمایی لێ وەربگرن[1]، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :

((**خُذوا عَنِّي مَناسِكَكُمْ**))[2]، واتە: لە منەوە عیبادەت و مەناسیكی حەجتان وەربگرن.

وەك دەڵێن: یەكەم كەس ئەم كەژاوەو بارهەڵگرانەی داهێنا حەججاج بوو، وە لە كاتی خۆیدا زانایان پێیان پەسەند نەبوو.[3]،

سوفیانی سەوری لە باوكیەوە دەیگێڕێتەوە كە فەرموویەتی:

لە كووفەوە دەرچووم بۆ حەج كردن بەرەو قادسییە، هاوڕێی سەفەرو خەڵكی وڵاتەكانم دەدی، هەموو حاجیەكانم دەبینی سواری وشتر دەبوون ، یان لەسەر

---

(١) كما رواه الترمذي في الشمائل (٣٣٤)، وهو عند ابن ماجه (٢٨٩٠) كذلك، ومع ذلك كان ﷺ يقول: ((**اللَّهمّ اجعلهُ حجًّا لا رِياءَ فيهِ ولا سُمعة**)).

(٢) رواه مسلم (١٢٩٧).

(٣) حكى ذلك الجاحظ في (البيان والتبيين) ٣٠٣/٢) وقال: وقالَ بعضُ رَجّاز الأكرياء :

**أوَّلُ عَبدٍ عَمِلَ المَحامِلا    أخزاهُ ربّي عاجِلاً وآجِلاً**. وسياق المصنف في القوت: ١١٦/٢.

زامیله بوون، (که کەرەستەکانی لێبارکراوە) یان ئەو کیسە گەورانەی کە شت دەخرێتە ناوی، یان لەسەری دادەنیشتن، یان ڕاحیلەکانیان پێ بوو، کە بۆ سواری ئامادەکراوەن، یان بۆ پێشەنگی قافڵە، تەنها دوو کەسم دی لە ناو هەموویاندا کە لەسەر وشتری کەژاوەدار و ڕازاوە بوبن.[1].

عەبدوڵلای کوڕی عەمەریش (خودای لێ ڕازی بێت) کە سەرنجی بدایەتە ئەو بەرگ و پۆشاك و کەژاوەی کە حەجاج دایمەزراندبوو، دەیفەرموو: حاجیەکان زۆرن و کاروانیەکانیش زۆرن.

لە پاشان سەیری پیاوێکی هەژاری کرد، کە بەرگێکی شڕی لەبەردابوو، وە ڕەنگ هەڵبزڕکاو بوو، کیسێکی لە ژێردابوو، فەرمووی:

بەڕاستی ئەمە باشترین حاجییە کەدیبێتم[2].

**حەوتەم:** دەبێ بەرگێکی شڕو کۆنی لەبەردابێت، قژی ئاڵۆزبێت و، نرخ و بەهای بۆ دانەنرێت، هیچ جوانکاریەکی بەکار نەهێنا بێت، وە بەدوای کۆکردنەوەی هۆکارەکانی فیزو دەمارو شانازی کردن و خۆبەگەورە زانیندا نەگەڕێت، نەوەکو لە دیوانی دەمار دارو خاوەن فیزەکان ناونووس بکرێت، وە لە پێڕی هەژار و بێ دەست و بێ کەس و صاڵحەکان دەربکرێت، چونکە بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی داوە بەوەی، کە قژ بەردەنەوە و، ئەوەندە خەریکی ڕێك کردنی نەبن، وە بە پێی پەتی ڕێ بکەن[3]، وە قەدەغەی کردووە لێیان کە زۆر

---

(١) قوت القلوب ٢/١١٦.

(٢) هەمان سەرچاوە.

(٣)قال العراقي رواه البغوي في شرح السنة (١٢/٤٦(٣١١٧) موقوفاً على سيدنا عمر (رضي الله عنه) والطبراني في المعجم الكبير ١٩/٤٠(٨٤) وابن أبي شيبة في المصنف(٢٦٨٤٩) والطبراني أيضاً في الأوسط (٦٠٥٨) : من حديث عبد الله بن أبي حدرد مرفوعا: **تمعددوا**

خۆیان ئالوودەی نیعمەت و دەسبڵاوی و خۆشگوزەرانی بکەن، وەك لە فەرموودەی فوضالەی کوڕی عوبەیددا هاتووە [1]،

وە لە فەرموودەدا هاتووە: ((**إنَّما الحاجُ الشَّعِثُ (التفث) التَّفِلُ**))[2]، حاجی ئەوانەیە کە شڕو وڕ بێنە بەرچاوو، کەمیان هەبێت و جۆرە گۆڕانێك بەسەر ڕوخساریاندا هاتبێت لە کاتی ئیحرامەکەیاندا، کە بایەخ بە جوانکاری نادەن. وەك خوای گەورە بە فریشتەکانی دەفەرموێت: ((**انظروا إلى زُوَّارِ بَيتِي فَقَد جَاؤوني شُعْثاً غُبراً مِن كُلِّ فَجٍّ عَميقٍ**))[3]،

بنوارن، سەیری زیارەتگەرانم بکەن، هاتوون بۆلای من بە بەرگی شڕو کۆن و، سەرو قژی ئاڵۆزەوە لە هەموو ڕێگاو بانێکی دوورو نزیکەوە دێن.

---

**واخشوشِنوا وانتضلوا وامشوا حفاة**. وفيه اختلاف أى في الالفاظ رواه ابن عدى من حديث أبى هريرة وكلاهما ضعيف

(١) رواه أبودوود (٤١٦٠) وهو قوله: **كان ﷺ ينهانا عن كثير من الإرفاء**. وقال: **كان النبي ﷺ يأمُرُنا أن نحتَفِيَ أحياناً**، وروى أحمد في المسند(٢٤٣/٥)، من وصيته ﷺ لمعاذ لما بعثه إلى اليمن: **إيَّاكَ والتَّنعُّمَ**، ولفظه: إيّايَ، لأنَّ راويه هو معاذ عن نفسه. **فإنَّ عباد اللهِ ليسوا بالمتنعمين**. قال الزبيدي: (٤٣٨/٤) وقال أحد في المسند حدثنا يزيد أنبأنا عاصم عن أبي عثمان أن عمر رضي الله عنه قال: **اتزروا وارتدوا، وانتعلوا وألقوا الخِفاف والسراويلات وألقوا الركب، وعليكم بالمَعَدِّيَّةِ، وارمو الاغراض. وذروا التنعُّم وزيَّ العجم، واياكم والحرير**.

(٢) رواه الترمذي (٢٩٩٨) وابن ماجه(٢٨٩٦).

(٣)رواه الحاكم وصححه(٤٦٥/١) (١٧٠٨) من حديث أبي هريرة دون قوله: من كل فج عميق، وكذا رواه أحمد من حديث عبد الله بن عمر وقاله العراقي. قال الزبيدي(٤٣٨/٤): ورواه ابن حيان في الصحيح وكذا أحمد في المسند(٢٢٤/٢)(٧٠٤٩) من حديث أبي هريرة بلفظ فيقول: **انظروا الى عبادي هؤلاء جاؤني شعثا غبرا**، وأخرجه ابن حبان في صحيحه١٦٣/٩(٣٨٥٢) أيضا من حديث جابر وفيه : **من كل فج عميق**. وهذا الخبر والذي قبله ساقه صاحب القوت(١١٦/٢) خبرا وحدا، والمصنف تبع له.

وه خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ﴾ (الحج/٢٩)

ئەوەی لەسەریان حەرام کراوە: وەك ئیحرام شکاندن و سەرتاشین و نینۆك کردن و، هەڵکەندنی مووی بن باڵ و، کورتکردنەوەی سمێل، یا هەمووی بکات. واتە ئەو شڕو وڕی و نارێکییەیان پێوە نەمێنێت،[١].

(حەزرەتی) عومەری کوڕی خەطاب (خودای لێ ڕازی بێت) نامەیەکی نوسی بۆ سەرکردە سەربازەکانی: (**اخلَولِقوا واخشَوشِنوا**)[٢]، بەرگی کۆن و دڕاو لەبەر بکەن و بە زبری بژین، لەسەر جێگا و بەرگی نەرم خۆتان فێر مەکەن.

وەك وتراوە: جوانی حاجیەکان لە ئەهلی یەمەن دا ڕەنگیان داوەتەوە[٣] چونکە بە شێوەیەکی گەردن کەچی و لاوازی و ڕەویەی پێشینە باشەکان دێن بۆ حەج.

دەبێ خۆی لەبەرگی ڕەنگ سوور بپارێزێت، وە لەهەموو ناوو شۆرەتێکیش، وەك گێڕاویانەتەوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ، کە لەسەفەرێکدا بوو: ((**فنزَلَ أصحابَهُ مَنزِلاً، فَسَرَحَتِ الإبِلُ، فنَظرَ إلى أكسِيَةٍ حُمرٍ على الأقتاب، فقال ﷺ : أرى هذِهِ الحُمرَةَ قد غَلَبَت عَلَيكُم ! قالوا: قُمنا إلَيها، ونزَعناها عَن ظهورِنا، حتَّى شَرَدَ بعضُ الإبلِ.**)) [٤]،

هاوەڵەکانی لە جێگەیەکدا دابەزین و، وشترەکانیان بەردا بۆ لەوەڕاندن، سەرنجی دا لە چەند کیسێکی سوور لە جێ کاروانیە بچووکەکە، فەرمووی: دەبینم ئەو ڕەنگەسوورە زاڵ بووە بەسەرتاندا، واتە: سەرقاڵی کردوون بە خۆیەوە، وتیان: هەستاین و ڕەنگەکەمان داڕنی و لایاندا، تاوای لێ هات هەندێك لە وشترەکانمان لەدەستمان بەربوون.

---

(١)كذافي القوت١١٦/٢،ذكره الطبرى عن ابن عباس وعكرمه، ومجاهدفي تفسيره١٠/١٧(١٩٠).

(٢) رواه الحربي في غريب الحديث(خشب) وزاد فيه واخشوشبوا.

(٣) رواه الطبراني في الأوسط(٣٨٨٥)، عن ابن عمر (رضي الله عنهما) مرفوعاً.

(٤) رواه أبو داوود (٤٠٧٠) من حديث رافع بن خديج.

**هەشتەم:**

ئەبێ لەگەڵ وڵاخەکەیشدا نەرم و نیان بێت. باری گرانتر لە تاقەتی خۆیی لێ نەنێت، ئەو کەژاوەو بارە گرانە لە سنووری توانای وشتر بەدەرە.

وە نوستنیش لەسەر وشترەکە بەو بارگرانیەوە ئازاری پێدەدا، کاتی خۆی ئەوانەی خۆیان دەپاراست، وەرعیان دەکرد، لەسەر وڵاخ نەدەخەوتن، مەگەر بە دانیشتنەوە خەوەنوچکە بردبنیەوەو بیانباتەوە، وە لەسەریشی ڕانەدەوەستان بۆ ماوەیەکی زۆر.

هەروەك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((لاتَتَّخِذوا ظُهُورَ دَوَابِّكُم كَرَاسيَّ))**[1]،

واتە : پشتی وڵاخەکانتان مەکەن بە کورسی و لەسەری دابنیشن.

وا باشە کە بەیانیان و ئێواران، واتە ناوە ناوە لەسەر وڵاخەکەی داببەزێت و وچانێکی پێ بدات، ئەمە کارێکی سوننەتە[2]،

وە لەم بوارەدا چەندین ڕەوشت و ئاساری پێشینە صاڵحەکانمان هەیە [3]، وە هەندێك لە زانایان وای بەکرێ دەگرت بە مەرجێك کە دانەبەزێت، وە کرێی تەواوی پێدەدان و دایش دەبەزی، بۆ ئەوەی چاکەیەك لەگەڵ وڵاخەکەدا بکات، وە بخرێتە سەر چاکەکانی، وە لەناو کێشانەی کردەوەکانی خۆی

---

(١) رواه أحمد في المسند (٤٤١/٣)(١٥٢١٩) والحاكم في المستدرك (١٠٩/٢)(٢٤٨٦) وصححه من رواية معاذ بن أنس عن أبيه. قال الزبيدي٤٣٩/٤: رواه ابن حبان في صحيحه (١٢/ ٤٣٧ ) (٥٦١٩) .

(٢) أخرجه الطبراني في الأوسط(٩٢/٧)(٦٩٥)، و رواه البيهقي في السنن الكبرى، ٢٥٥/٥)، عن أنس (رضي الله عنه) قال: كان رسول الله ﷺ إذا صلى الفجر في السفر، مشى ، زاد فيه البيهقي في الآداب ٣٧٥/٢) : قليلاً، وناقته تقاد...

(٣) رواه ابن عساكر في تأريخ دمشق(٤٠٦/٦١): **أن نافع بن جبير كان يحج ماشيا، وناقته أو راحلته تقاد معه.**

دابنرێت، نەك لە كێشانەی كردەوەكانی بەكرێدەرەكە.[1] ،

وە هەركەسێك ئازاری وڵاخێك بدات، وە زیاد لە توانای خۆی باری لێبنێت، لە ڕۆژی قیامەتدا لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەكرێت.

ئەبودەرداء (خودای لێ ڕازی بێت) لە كاتی گیانەڵایدا بەوشترەكەی فەرموو:

ئەی وشتر؛ شكاتم لێ نەكەیت لە حزوری خودای خۆت، من لەسەر و توانای خۆتەوە باری گرانترم لێ نەناویت.[2]

**بەكورتی:**

واتە: لە چاكەكردن لە گەڵ هەموو ئاژەڵێكی زیندوو، لە ئاوپێدان و لەوەڕاندنیەوە پاداشتی خۆیی دەستدەكەوێت.[3] دەبێت ئاگای لە مافی وڵاخ و خاوەنە بە كرێدەرەكەی بێت، وە ئەگەر ساتێك لەسەری داببەزێت دەبێتە وچانێك بۆ وڵاخەكەو، دڵخۆشكردنێكیش بۆ خاوەنەكەی، بە تایبەتی ئەگەر كاتی هاتنەوەی بێت و لەبەرچاوی خاوەنەكەی بێت.

پیاوێك عەرزی ئیبنو موبارەكی كرد:

ئەم كتێبەم بۆ هەڵگرە و لەگەڵ خۆت بیبە، فەرمووی:

با وشترەوانەكە ڕێگەم پێ بدات، چونكە من بەكرێم گرتووە[4]،

بنوارە چۆن خۆی لە گوناه دەپارێزێت لە هەڵگرتنی پەڕاوێك كە كێشێكی وای نیە، ئەمەش ڕێگەی حەزم و ئیرادەی بەهێزی پێدەڵێن لە وەرع و خۆپارێزیدا، چونكە ئەگەر دەرگایەكی كەم لە ئاسانكاری لەسەر خۆی بكاتەوە،

---

(١) قوت القلوب٢/١١٦.

(٢) رواه ابن المبارك فى الزهد (١١٧٣)، وكان إسم هذا البعير(دمون).

(٣) كما رواه البخاري( ٢٣٦٣) ومسلم (٢٢٤٤)، ((في كلِّ كبد حرى أجرٌ)).

(٤) قوت القلوب٢/١١٦.

کەم کەمە ڕایدەکێشێت بۆ چەندین دەروازەی فراوانی تر.

**نۆیەم:**

دەبێت خۆی لە خودا نزیك بخاتەوە بە سەربڕینی قوربانیەك بە خۆبەخشی، با لەسەری واجبیش نەبێت ، وە هەوڵبدات مەڕێکی قەڵەوو بەنرخ سەربڕێت، بۆ ئەوەی خۆیشی لێی بخوات، ئەگەر بە خۆبەخشی صەدەقەکەی کردبێت، بەڵام ئەگەر پێویست بێت لەسەری ، ئەوا نابێت لێی بخوات.

دەڵێن لە تەفسیری فەرموودەی خوادا: ﴿ذَلِكَ وَمَنْ يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ﴾ (٣٢/الحج ) بەگەورە زانینی شەعائیری خودا، بەنیسبەت سەربڕینەوە دەبێت قوربانیەکە تا بتوانێت بەنرخ و قەڵەوو جوان بێت.[١] ،

وە بردنی دیاری لە میقاتەوە خێری زیاترە، ئەگەر توشی ئازارو ماندوبوونی زۆری نەکات، وە بەدوای داشکاندی نرخەکەیدا نەگەڕێت، چونکە کاتی خۆی بۆ سێ شت بە دوای نرخ و بەهادارێکی زۆردا دەگەڕان بیانکرِن، دیاری و قوربانی و ئازادکردنی بەندە، باشترین و خێردارترینیان ئەوەیە کە نرخ و بەهایان لە هەموان گرانتر بێت،

عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەیگێڕێتەوە کە (حەزرەتی) عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) وشترێکی ڕەسەن و نەجیبی کردە دیاری، منیش داوام لێکرد پێم بفرۆشێت بە سێ صەد دینار، ئەویش پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد : کە ئایا بیفرۆشێت و وشترێکی پێنج ساڵەی گەورەتری پێ بکرِێت، فەرمووی:

ئەو کارە مەکەو ئەوەی خۆت کە هێناوتە بە دیاری ، ئەوە سەر ببڕە [٢] ، چونکە کەمێکی جوان و ڕەسەن و تێکسمراو، باشترە لە زۆرێکی پلە نزم تر، چونکە مەبەستەکە گۆشت نیە، بەڵکوو مەبەست پاڵفتەکردنی نەفسی

---

(١) روى الطبري ذلك في تفسيره (١٠/١٧/١٩٨) عن ابن عباس ومجاهد.

(٢) رواه أبو داوود (١٧٥٦) وفيه انحرها ، بدل أهدها.

خاوەنەکەیەتی، وە پاککردنەوەیەتی لە صیفەتی ڕژدی و بەخیلی، وە جوانکردنیەتی بەوەی بە تەواوی توانایەوە تەعزیمی خوداوەندی (عَزَّ وجَلْ)ی بکات، چونکە ئەو گۆشت و خوێنەکەیشی کە دەڕژێت ناگات بە خودا، بەڵکوو ئەو ئیرادەو تەقواکاریە دەگات کە هەیەتی، بۆیە دەبێ بە دوای بەنرخ و بەهاداردا بگەڕێت، ژمارەیان زۆر بێت یان کەم.

پرسیاریان لە پێغەمبەری خودا کرد ﷺ حەجی مەبرورو وەرگیراو **کامەیە؟** ((**ما بَرُّ الحجِّ؟ فقال: العَجُّ والثَّجُّ.**))[1]، واتە وتنی تەلبیە، (**لَبَّيكَ اللَّهُمَّ لَبَّيكَ**) بە دەنگی بەرز، وە قوربانی کردنی وشتری باش.

(حەزرەتی) عائیشە دەیگێڕێتەوە (خودای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**ما عَمِلَ آدَمِيٌّ يومَ النَّحْر أفضل من إهراقهِ دمَاً، وإِنَّها لتأتي يومَ القِيامَةِ بِقرونِها وأَظلافِها، وإن الدَّمَ ليقَعُ مِنَ اللهِ (عَزَّ وجَلَّ)، بمَكان قبلَ أنْ يقَعَ بالأَرضِ فَطِيبُوا بِها نَفْساً**))[2]،

واتە: هیچ کردەوەیەك نیە لە ڕۆژی یەکەمی قورباندا لە سەربڕین و ڕژانی خوێن ی قوربانی خۆش تر بێت، ئەو قوربانیە لە دوارۆژدا دەهێنرێت بە هەموو شاخ و موو سم و نینۆکەکانیەوە، وە خوێنەکەی بەرز دەبێتەوەو پێش ئەوەی بکەوێتە سەر زەوی، لای خودا جێگەی تەواو دەگرێت، دڵتان پێی خۆش بێت، وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە:

((**لَكُم بِكُلّ صوفَةٍ مِن جِلدِها حسَنَةٌ، وكُلُّ قَطرَةٍ مِن دَمِها حسَنةٌ، وإِنَّها لَتوضَعُ في الميزان، فأَبشِرُوا**))[3].

---

(١) رواه الترمذي (٨٢٧)، وابن ماجه(٢٨٩٦).

(٢)قال العراقي رواه الترمذي (١٤٩٣) وحسنه وابن ماجه(٣١٢٦) وضعفه ابن حيان وقال البخاري انه مرسل ووصله ابن خزيمة ..

(٣) كذا في القوت (١١٨/٢) وبنحوه عند ابن ماجه (٣١٢٧)، والبيهقي في السنن الكبرى..٢٨٣/٩.

واتە: چاکەتان بۆ دەنوسرێت بە هەموو پارچە خوریەك لە پێستەکەی چاکەیەکت بۆ دەنوسرێت، وە هەموو تکە خوێنێکی دەڕژێت چاکەیەکە، وە لە سەر کێشانە دادەنرێت، کەواتە مژدەبێت لێتان.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

(( إستَنجِدوا هَداياكُم؛ فإِنَّها مَطاياكُم يَومَ القِيامة))[1]،

واتە: بێن بەدەم قوربانیەکانتانەوەو لە سەریان ڕابووەستن، کاتێك کە سەریان دەبڕن، چونکە ئەو قوربانیانەتان دەبنە وڵاخی سواری بۆتان لە دوارۆژدا و دەتان پەڕێننەوە.

**دەیەم:** دەبێ دڵی لای ئەو چاکە نەبێت کە دەیکات و، چاوی لەسەری نەبێت، یان بیر لە هیچ بەڵاو زیانێك نەکاتەوە کە تووشی بووە لە زیانی ماڵی یان جەستەیی، یان هەر ناڕەحەتییەکی تر، ئەوە نیشانەی وەرگیراوی حەجەکەیەتی، چونکە هەر بەڵایەك لە ڕێگەی حەجدا دوچاری ببێت، وەك ئەوە وایە لە ڕێگەی خوادا خێرو چاکەت بەخشیبێتەوە، هەموو دیرهەمێك بە حەوت صەد جار بۆت دەنوسرێت، وەك ئەو ناڕەحەتیانە وایە لە ڕێگەی جیهادو غەزادا تووشت دێت، کە لە بریتی هەموو ئازارێك پێت گەیشتووە، یان خەسارەت و زیانێك لێت کەوتووە پاداشتت دەدرێتەوەو، لای خودا هیچی زایە نابێت.

دەڵێن: لە نیشانەکانی وەرگیرانی حەجەکەیە، کە واز لەو گوناهو خراپانە بهێنێت کە پێشتر دەیکردن، وە ئەو برا پوچ و بێبایەخانەی کە هەیبوو، بیانگۆڕێتەوە بە برای ڕاستەقینەی چاك و صاڵح، وە دانیشتنە پڕ لە گەمەو گاڵتەکانی بگۆڕێتەوە بە دانیشتنی زیکر و بەندایەتی.[2]

---

(١) رواه الديلمي في الفردوس (٢٦٨) بلفظ: **استفرهوا ضحاياكم، فإنها مطاياكم على الصراط.**

(٢) قوت القلوب( ٢/١١٩).

## ڕوونکردنەوەی کردارە شاراوەکان، وە چۆنیەتی بوونی ئیخلاص لە نیەتدا

## وە ڕێگەی پەند وەرگرتن لەو بینینی مەشاهیدە پیرۆزەکان چۆن بیریان لێبکاتەوە، وە یاداشتی نهێنی و واتاکانیان بکات لە سەرەتای حەجەوە تا کۆتاییەکەی

**بزانە:** سەرەتای کاری حەج تێگەیشتنە، واتە بزانێت کە حەج چ جێگەیەکی گرتووە و، چ بۆشاییەك پڕ دەکاتەوە لە دیندا، لە پاشان حەزو خواستی هەبێت بۆی، دوای ئەوە ئیرادەو نیەتی بخاتە گەڕو، بنەبڕی هەموو ئەو هۆکارانە بکات کە ڕێگری لە چوونەکەی دەکەن، لە پاشان بەرگ و پەشتەماڵی ئیحرام بکڕێت، وە پێویستیی خۆراك و کەرەستەی ئەو ڕێگەوبانە ئامادە بکات، وە وڵاخێکی سواری بەکرێ بگرێت، وە دەستبکات بە دەرچوون، وە ڕێگای سارا بگرێتە بەر، تا دەگاتە شوێنی ئیحرام و نیەت بهێنێت و، لە میقات ئیحرام ببەستێت و، دەستبکات بە تەلبیەکردن، لە پاشان بچێتە ناو مەککەوە، وە کارەکانی مەناسیك هەمووی وەك باسمان کرد تەواویان بکات.

لەهەر یەکێك لەم فرمانانە بۆ کەسێك بیر لەشت بکاتەوە و پەند وەربگرێت، وە بیرهێنانەوەیەکی پەندئامێزی تێدایە، وە ئاگادارکردنەوەیە بۆ موریدی ڕاستگۆ، وە پێناسە و هێمایە بۆ کەسانی زیرەك، کەواتە با ڕەمز دابنێن بۆ دەروازەکانی، تا ئەوەی ئەگەر دەرگاکەی کرایەوە، وە هۆکارەکانی زانرا، ئەوکاتە بۆ هەموو حاجییەك ئەوەندە نهێنی بۆ ئاشکرا دەبێت، کە صەفای دڵ و تەهارەت و پاك و خاوێنی دەروون و، ڕێژەنەی زانست و زانیارییەکانی دەیخوازێت.

**بۆ بابەتی تێگەیشتن** : بزانە: هەرگیز ناگەیت بە خودای گەورە، مەگەر بە خۆ

پاککردنەوە لە هەموو جۆرەکانی ئارەزوات، وە تەنها کارە زۆر پێویستەکان ئەنجام بدەیت، وە خۆت یەکلایی بکەیتەوە بۆ لایەنی خودا پەرستی، لە هەموو جووڵەو ڕۆشتن و هەڵس و کەوتێکتدا، هەر لەبەر ئەمەیشە کە ڕاهیبەکان (نەصاراکان)لە ئاینە پێشووەکاندا لە خەڵکی دوور دەکەوتنەوە، وە بەرزدەبوونەوە بۆ لوتکەی چیاکان و، تێکەڵییان لەگەڵ خەڵکی نەدەکرد، بۆ ئەوەی پەیوەندی و ئونس و محەببەت لە حزوری خوادا پەیدابکەن.

لەبەر خودای (عَزَّ وجَلَّ) وازیان لە تام و چێژی ئەو کاتەی ژیان هێنا، وە هەندێك هەوڵ و موجاهەدەی نەفس و ڕیازەی سەختیان دەکێشا، بە هیوای دەسکەوتی ژیانی دوارۆژ. خودای گەورەیش ستایشی کارەکەیانی کرد و فەرمووی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ﴾(المائدە/٨٢)

هەندێك لەمانە زانان و، بەدوای زانست و ڕاستیدا دەگەڕێن و، هی وایشیان هەیە کە لە پێناوی ڕەزامەندی خوادا وازیان لە ڕابواردنی دونیا هێناوە و، خۆیان لە خەڵکی بە گەورەتر نازانن و، دەعیەو دەماریان نیە[١]،

کاتێك ئەمانە کۆتاییان هات و لەبەرچاودا نەمان، خەڵکەکە ڕوویان لەشوێنکەوتنی ئارەزوات کرد، وە خۆیان لە خۆ تەرخانکردن لە بەندایەتییەوە گواستەوە، بۆ خۆ یەکلایی کردنەوە بۆ ئارەزواتی دونیایی، بۆیە خودای گەورە (حەزرەتی) موحەممەدی کرد بە پێغەمبەر ﷺ و، ناردی بۆ ژیاندنەوەی ڕێگای ئاخیرەت، وە تازەکردنەوەی شوێن پێهەڵگرتنی سوننەتی پێغەمبەرە خاوەن پەیامەکان، بۆیە ئەهلی دیانەتەکانی تر، پرسیاریان لێدەکرد لە بارەی ڕەهبانیەت و گەشتی بەندەکانی خودا و، خۆ یەکلایی کردنەوە بۆ خوداپەرستی، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوای گەورە بۆی گۆڕینەوە بە جیهاد لە ڕێی خوادا، وە وتنی (الله أكبر) بەسەر بەرزاییەکاندا. (( أبدَلَنا اللهُ بِها الجِهادَ والتَّكبيرَ

(١) خۆلاصەی تەفسیری نامی(١٢١).

على كلِّ شَرَفٍ))[1].وە پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ کرد دەربارەی سیاحەتکەران، فەرمووی: (( هُمُ الصَّائِمونَ))[2]، واتە: ئەوانە ڕۆژووەوانەکانن.

خوای گەورە ئەم ئوممەتەی بەوە شەرەفیاب کرد، کە حەجکردنی بۆ خستنە جێگەی ڕەهبانیەتەوە، وەك چۆن ڕاهیبەکان وازیان لە هەموو تام و چێژێکی ژیان دەهێنا، حەجیش بەو شێوەیە. دەبێت واز هێنان بێت لە ئارەزوات، وە بەیت و ماڵەکەی خۆیی بەوە شەرەفیاب کرد، کەداویەتیە پاڵ خۆیەوە، وە دایناوە کە قیبلەگای بەندەکانی بێت، تەنانەت چوار دەورەکەیشی کردووە بە حەرەمی کەعبە، لەبەر زیادە ڕێزگرتن لە ماڵەکەی خۆی، عەرەفاتیشی کردووە بە ناوەندێکی فراوان، بۆ دەرەوەی حەرەمەکەی، وە نیشانە لەسەر ڕێزی حەرەمەکەی:

نێچیرگرتن وڕاوکردن و درەخت بڕینیشی لێ قەدەغەکردوون، وە لەسەر شێوەی پادشا شکۆدارەکان دای ناوە، کە لە هەموو لایەکەوە میوان و خزمەتکارانی سەری لێبدەن و، لە هەموو کەلێن و جێگایەکی دووریشەوە زیارەتی بکەن، بەشێوەی کەسێکی هەژاری شڕی بێ ناونیشان، وەك کەسێکی ملکەچی زەلیلی بێچارە، پەروەردگاری مەزنی ئەم بەیتە گەورەیە، بە شێوەیەکی پڕ لە گەردن کەچی، بۆ حزوری جەلال و گەورەیی خودا.

لەگەڵ ئەوەدا کە داندەنێت بەوەدا کە خودای گەورە، نە بەیت و نەهیچ شوێن و شار و جێگەیەك نایگرێتەوە، بۆ ئەوەی کە زیاتر بەندایەتی و کۆیلایەتی خۆی بسەلمێنێت، وە بەڵگەیەکی بەهێزیش دەبێت لەسەر واتای سەلماندن و

---

(١) رواه ابن المبارك في الجهاد،(١٧) عن عمارة بن غزية مرسلاً، وروى أبوداوود(٢٤٨٦) عن أبي أمامة أن رجلاً قال: يارسول الله: ائذَن لي في السِّياحَةِ. قال النبي ﷺ إنَّ سِياحَةَ أُمَّتي الجِهادَ في سبيلِ الله، وحديث التكبير على كل شرفٍ. رواه البخاري (١٧٩٧) ومسلم (١٣٤٤).

(٢) رواه الحاكم في المستدرك، (٢/٣٣٥)، والبيهقي في السنن الكبرى( ٣٠٥/٤).

ملکەچی بۆ ئەو زاتە بەرزە، بۆیە هەندێك ئەرك و فەرمانی داوە بەسەریاندا، کە ناگونجێت لەگەڵ سرووشتی ئاسایی نەفسدا. وە بەتەنها بە ئەقڵیش ناگاتە واتاو مەبەستەکانی، وەك ڕەجمی شەیتان، وە هاتوچۆی نێوانی صەفاو مەروە و چەندبارەکردنەوەی ئەو مەناسیکانە.

وە بە نموونەی بەجێگەیاندنی ئەم جۆرە کردارانە، کەماڵی کۆیلەیی و بەندایەتی دەسەلمێنێت، چونکە زەکات دان جۆرە نەرم و نیانی و بەزەییەکی تێدایە بە هەژاراندا، ئەقڵ لێی تێ دەگات و، مەیلیشی بەلایدا دەڕوات، وە ڕۆژووگرتن ئارەزوات دەشکێنێت و، شکست بە دوژمنێکی سەرسەختی خودایی دەهێنێت، وە خۆتەرخانکردنێکیشی تێدایە بۆ بەندایەتی، وە دوورکەوتنەوە لە کاروباری بێ هوودە، هەروەها ڕکوع و سوجدەبردن لە نوێژدا واتای گەردن کەچی دەگەیێنێت بۆ خودای (عَزَّ وجَلْ) بە کردارێك کە بۆخۆی ملکەچی تێدا بەدی دەکرێت، وە نەفسی مرۆڤیش پێی دادێت و، هەست بە جۆرێك پەیوەندی مەعنەوی دەکات، کە گەورەیی و مەزنی بۆ خوداوەندی بڕیار دەدات.

بەڵام هاتوچۆی نێوانی صەفاو مەروە و، هاوێشتنی بەردەکان و، کردارە هاووێنەکانی لە حەجدا، هیچ بەشێکی ڕازی کردنی نەفسی تێدا نیە، لە گەڵ ناخی مرۆڤیشدا ناگونجێت، ئەقڵیش بەسەربەخۆیی لە نهێنیەکانی حاڵی نابێت، کەواتە؛ تەنها بە فرمانبەرداری خودا ئەنجامیان دەدات، وە لەو لایەنەوەیە کە ئەوە فەرمانی خودایەو، دەبێت سێ و دووی لێ نەکات و بیکات.

تەنها دەبێت بزانێت؛ کە واجبە شوێن فەرمان بکەوێت، ئەو کاتە هیچ جێگەیەك بۆ خواست و ئیرادەی ئەقڵ نامێنێت، وە نەفس و سرووشتی مرۆڤیش لادەدات لەو شتانەی کە پێوەی داهاتووە، یان مەیلی بەلایاندا دەڕوات، چونکە هەرچی ئەقڵ لە واتاکەی تێگەیشت، سرووشتیش مەیلێکی بەلایدا دەڕوات، ئەو کاتە مەیلەکە دەبێتە یارمەتیدەر بۆ جێبەجێکردنی، وە دەبێتە هاندەر، ئیتر کەمتر واتای کۆیلایەتی و گەردن کەچی لێ وەردەگیرێت،

بۆیە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی حەجەوە بە تایبەتی فەرموویەتی: (( لَبَّيكَ بِحَجَّةٍ حَقّاً، تَعَبُّداً ورِقّاً))[1]، واتە ڕایدەگەیێنێت، کە نیەتی حەجێکی ڕاستەقینەی هەیەو، ئامادەی ئەنجامدانیەتی، بە بێ سڵەمینەوو پرسیارکردن، تەنها دەیەوێت عیبادەت ئەنجام بدات و، کۆیلایەتی خۆی بسەلمێنێت. کە نە بۆ نوێژ و نەبۆ کردارەکانی تر شتی وای نەوتووە.

وە حیکمەتی خودا هەمیشە وای خواستووە، کردارەکانیان بە پێچەوانەی هەواو ئارەزواتیانەوە بێت، وە جڵەوی کرداریشیان بە دەستی شەرعەوە بێت، کەواتە بە پێی سوننەتی ملکەچ بوون و گوێڕایەڵی و خواستی خۆ بەبەندەکردنی خودا، ڕو لە کردارەکانیان دەکەن، کە زۆرترین و خەستترین کاری بەندایەتی و، پاڵفتەکردنی نەفس ڕێی لەواتاکانی ئەو نهێنیانە نەدەکەوت، کە لە حەجدا بوونیان هەیە، کە ناخی مرۆڤ لە مەیل و حەزە تایبەتیەکانەوە بگۆڕێت و، وای لێبکات تەنها مەبەستی خۆ بەبەندە زانین بێت و، هیچ مەیلی بەلای خواستی ئاشکراو نەفسی خۆیەوە نەمێنێت.

کاتێك بۆ ئەم بابەتە گرنگە دەچیت، ئەوکاتە تێدەگەیت؛ کە سەرچاوەی ئەوەی کە نەفست سەری لەو هەموو کردارە تایبەتیانەی ناو حەج سوڕماوە، ون بوون و ڕۆچوونە لە ناو دەریای ئەسراری کارە تەعەببودییەکاندا،( کە دەبێت بیان کەیت وەك بەندەیەك و، ناشبێت بپرسیت بۆچی ؟ یان لەبەرچی!)

ئەم ئەندازە بەسە بۆ تێگەیشتن لە ئەصڵی حەج و مەرامە شاراوەکانی، پشت بە خودای مەزن و دلۆڤان.

### لەبارەی شەوقەوە:

کاتێك شەوقی بۆ پەیدا دەبێت، کە لە نهێنیەکانی حەج حاڵی بووبێت و، تێگەیشتبێت کە بەیت ماڵی خودایەو ،لەسەر وێنەی پادشایەکی خاوەن

---

(١) رواه الرامهورزي في (المحدث الفاصل) ( ص/٦٢٤)، والخطيب في تأريخ بغداد(١٤/ ٢١٨).

شكۆ دانراوە، ئەوەی دەیەوێت زیارەتی بکات، ئەوە زیارەتی خودای (عَزَّ وجَلَّ) دەکات و ، ئەوەی لە دونیادا ڕو لەو کەعبە پیرۆزەیە بکات، زیارەتەکەی زایە نابێت و، لە کاتی خۆیدا پاداشتی ڕاستەقینەی خۆی لە زیارەتەکەی وەردەگرێتەوە، کە سەیرکردن و بە خزمەت گەیشتنی ڕوخساری پیرۆزی پەروەردگارە، لەو جێگەدا کە دەمێننەوەو، هەتاهەتایە تیایدا دەگیرسێنەوە، لەو ڕووەوە کە چاوێکی کورت بینی لاواز لە دونیادا، ئامادەیی نیە کە بتوانێت نوری جەلال و جەماڵی خودا وەربگرێت و سەیری بکات، وە بەرگەی ناگرێت، وە ناتوانێت چاوی پێ بڕێژێت، لەبەر لاوازی چاوەکەی.

بەڵام ئەگەر ژیانی بۆ درێژکرایەوە بۆ مانەوەی هەتاهەتایی لە دوارۆژدا، وە هۆکاری فەنا و تیاچوون و هەڵگوڕانی بەسەرەوە نەما، ئامادەیی پەیدا دەکات بۆ سەیرکردن و بینین، بەڵام بە زیارەتکردن و سەیرکردنی بەیت کە ماڵی خودایە، ئەو مافەی پێدەدرێت کە بتوانێت بە لیقای خودا بگات، بە پێی ئەو بەڵێنەی کە خودا بەفەزڵی خۆی پێی داوە.

کەواتە شەوقی لیقاو بەخزمەت گەیشتنی خودا، هانی دەدات بۆ ئەوەی هۆکارەکانی ئەو بەیەکگەیشتنە جێبەجێ بکات، جگە لەوەی کە کەسێك خۆشەویستی لە دڵیدا بێت، دەگەڕێت بەدوای کردنی هەموو شتێکی تردا کە لە خۆشەویستەکەی نزیکی بخاتەوە، وە بشدرێتە پاڵ دڵبەندەکەیەوە، دەی خۆ دەزانێت کە نیسبەتی (بەیت)یش دراوەتە پاڵ خودا، کەواتە زیاتر شەوقی بۆ زیارەتی بەیت پەیدا دەبێت ، تەنها لەبەر ئەو نیسبەتدانی بەیتەیە بە خوداوە کە دەوترێت ماڵی خودا، جگە لەوەی کە داوای ئەوە دەکات:

پاداشتی باش وەربگرێت بە پێی ئەو گفتەی کە فەرموویانە.

## بوونی ئیرادەو عەزمی بەهێز:

با بزانێت کە بەو ئیرادە بەهێزەیەوە، دەیەوێت لە ماڵ و نیشتیمان دوور بکەوێتەوەو، واز لە بەدواداچوونی چێژ و ئارەزواتی بهێنێت و، ڕوبکاتە ماڵی

خودای خاوەن عیززەت و دەسەڵات.

کەواتە با ڕێزو بەهای ئەو بەیتە بگرێت، وە ڕێزو عەزەمەتی خاوەنی بەیت بزانێت و، بشزانێت کە ئەو کارێکی زۆر گەورەو مەزنی دەست پێ کردووە، هەرکەسێکیش بەدوای کارێکی گەورەو سەختدا بگەڕێت، ئەوا ڕوبەڕووی مەترسی گەورەش دەبێتەوە، کەواتە با عەزم و ئیرادەکەی تەنها لەبەر ڕەزامەندی خودای باڵادەستبێت، وە دوور بێت لەهەموو بۆن و بەرامێکی ڕیاو ناوو شۆرەت و دونیاویستی.

وە دڵنیاش بێت ، کە لە کردارەکەیدا، تەنها ئەوەندەی لێ وەردەگیرێت: کە تەنها لەبەر ڕەزامەندی خودا کردوویەتی، وە خراپترین و بێ شەرم و بێ ئابڕوترین کار ئەوەیە، کەسێك ڕوبکاتە ماڵی مەلیك و پادشای گەورەو، مەبەستیشی یەکێکی تر بێت، کەواتە با لەگەڵ خۆیدا عەزم و ئیرادەکەی یەکلایی بکاتەوە، وە بە ئیخلاص بۆ خودا ڕاستی بکاتەوە، بەوەش ئیخلاصی دەستدەکەوێت: کە هەموو بۆن و بەرامێکی شۆرەت و دەنگوباس پەیداکردن و ڕیاکاری لێ دووربخاتەوە، با ئەوەی دەسکەوتی زۆرە، نەیگۆڕێتەوە بە دەسکەوتێکی کەمی دونیایی کاتی.

## پچڕاندنی پەیوەندییەکان:

واتاکەی بەوەیە: کە زوڵمی لە کێ کردووەو ماڵی کێی لایە، بیگێڕێتەوە بۆیان، وە تەوبەی ڕاستەقینە لە هەموو گوناهەکانی بکات، هەموو زوڵمێك کردبێتی پەیوەندییەکی هەیە، وە هەموو پەیوەندییەکیش وەك خاوەن قەرزەکە وایە، کە دەستی گرتبێت بە پشتی ملی کابراوە، یان لە پشتەوە بەتوندی بەرگەکەی گرتبێت و، هاواری لێبکات بۆ کوێ دەڕۆی؟! ئایا نیازتە بچیت بۆ ماڵی پادشای پادشایان و، لێرەشدا فەرمانەکانت زایە کردووە، وە بایەخت پێینەداوەو ئیهمالت کردووە، ئەوە شەرم ناتگرێت کە بچیتە خزمەتی و، وەك بەندەیەکی تاوانباری یاخی سەیرت بکات و، وەرت نەگرێت و بتگێڕێتەوە؟!

کەواتە ئەگەر حەزت لێیە کە زیارەتەکەت وەربگیرێت، ئەوا فەرمانەکانی جێبەجێ بکە، قەرەبووی ستەمانت بکەرەوە. وە هەر لەسەرەتاوە تەوبە بکە لە هەموو گوناهەکانت، پەیوەندی دڵت بپچڕە بە هەموو لاکردنەوەیەك بۆ دواوە، بۆئەوەی بە دڵ و گیانت تەنها ڕووت لە ماڵی خودا بێت، ئەگەر وا نەکەیت، تەنها ماندووبوونت بۆ دەمێنێتەوە و، پاداشتی گەشتەکەیشت بەدبەختی و دەرکردن دەبێت.

وایش لە نیشتیمانی دووربکەوێتەوە، وەك ئەوەی کە نەیەوێت بۆی بگەڕێتەوە، با وەصێتیش بنووسێت بۆ ماڵ و منداڵ و پێویستییەکانی، چونکە کەسێك لەسەفەردا بێت، مەگەر خودا بیپارێزێت، ئەینا زۆر جار ڕوبەڕووی مەترسی زۆر دەبێتەوە.

لەکاتێکدا پەیوەندییەکانی بە نیشتیمانەکەی دەبڕێت، وابیر بکاتەوە کە ئیتر ئەو بۆ گەشتی درێژخایەنی دوارۆژ بەرێکەوتووە، چونکە ئەو ڕۆژە زۆر نزیکە لێیەوەو، بۆیە ئەم گەشتە پیرۆزەش دەکات، تا توێشوویەکی ئاسانکاری بۆ خۆئامادەکردنی ئەو سەفەرە ئامادە بکات، کە ئەو جێگایە شوێنی ئاسوودەیی و دامەزرانی دەبێت و، هەر بۆ ئەوێش دەگەڕێتەوە، کەواتە نابێت هەرگیز خۆی لەو گەشتە غافڵ بکات، لە کاتێکدا خۆی بۆ سەفەری حەج خستۆتە ڕێ.

## توێشوی ڕێگا:

با پێداویستی خواردن و توێشوی ڕێگای لە جێگەیەکی حەڵاڵەوە پەیدا بکات، ئەوەندەی سووکە لەگەڵ خۆی بیبات، ئەگەر حەزی بە زیاتر دەکرد، ئەوەندەی کە بەشی بکات تا دێتەوە بۆ ماڵەوە، وە جۆرێك نەبوو کە خەسار بچێت و بۆن بکات، با بیریش لەوە بکاتەوە کە سەفەری قیامەت چەندێك درێژترە و پێویستی بە توێشووی زیاتر هەیە، وە تویشووی قیامەتیش تەقواو خۆپارێزییە، وە هەموو شتەکانی تر کە وا گومان ببات توێشووی دوارۆژە، تا لای گۆڕەکەی لەگەڵی دەچن و خیانەتی لێدەکەن و لێی جێ دەمێنن، وەك و

خورماو خۆراکەکان کەزوو تێك دەچن، کە لەکاتی پێویستدابەهانایەوە ناچن و بێ خۆراك دەمێنێتەوەو دەستیشی بە هیچ جێگایەکی تر ناگات، کەواتە با ئاگادار بێت کردارەکانی کە توێشووی دوارۆژینی، هاوڕێی گەشتی قیامەتی بن، نەك دوای مردن هەموو کردارە کان بەهۆی ڕیاکاری و کەمتەرخەمی و کەمو کورتییەوە، لێی بەجێ بمێنن و لەگەڵیا نەچنە ناو گۆڕەکەیەوە.

## لەبارەی سواربوونەوە:

کاتێك وڵاخی بۆ ئامادە دەکەن، با بە دڵ سوپاسی خودا بکات کە بۆی دابین کردووە، کە ماندووبون و ئازاری ڕێگای لەسەر کەمدەکاتەوە، وە لەکاتی سوار بووندا بیر لەو کاتە بکاتەوە کە سواری دەکەن یەکسەر بەرەو ماڵی ئاخیرەتی، وەك ئەو دارەمەیتەی کە بەرێدەخرێت، چونکە لە ڕوویەکەوە کاروباری حەج کردن، وەك کار و فرمانی گەشتی ئاخیرەت وایە.

با سەرنج بدات: ئایا ئەو سوارگەی بۆیان ئامادە کردووە، دەشێت ببێتە توێشووی ڕێگاو، بیگەێنێتە جێگای مەبەست، ئای کە چەندێك ئەو گەشتەیە نزدیکە، بەڵکوو مردنەکەیشی لەو سەفەرەی نزیك تر بێت، لەوانەیە سوارکردنی بۆ ناو دارەمەیتەکە و بەرەو سەر قەبران، خێرا تر بێت لە سوار بوونی خۆی بۆ سەرپشتی ئەو وشترە خێرایەی کە ئامادەی کردووە، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانێت، کە سواربوونی تەرمەکەی لەسەر دارە مەیتەکە بە دڵنیاییەوە دێتە دی، بەڵام ئامادە بوونی ئەسبابی گەشتەکەی کارێکی گوماناوییەو لەوانەیە بۆی نەڕەخسێت.

کەواتە چۆن ئامادە باشی بۆ هەموو ئەگەرەکانی سەفەرە گوماناوییەکەی دەکات و، ئەو هەموو خۆراك و خواردن و کەرەستەیە ئامادە دەکات، کەچی بۆ سەفەری حەتمی دوارۆژی کەلێیشی دڵنیایە کەمتەرخەمی دەکات.

## کڕینی پەشتەماڵی ئیحرام:

با لەو کاتەدا بیر لە کفنەکەی بکاتەوە، چۆن دەیپێچنەوە پێیەوە، ئەویش

بەرگی ئیحرام لەبەردەکات و، پەشتەماڵێکیش دەدا بە شانیدا، لەو کاتەدا کە لە ماڵی خودا نزدیك دەبێتەوە، وە لەوانەیشە بە کامی دڵی خۆی نەگات، بەڵام بە دڵنیاییەوە بە پێچراوەیی دەیگەیێنن بە حزوری خودای خۆی.[1]،

هەر وەك چۆن حاجی بۆ زیارەتی ماڵی خودا دەبێت بەرگێکی تایبەتی لەبەر دابێت، جیاواز بێت لە بەرگ و شکڵی ئاسایی خۆی، هەروایش لە قیامەتدا ناگات بە لیقای خودا، ئەگەر بەرگێکی لەبەردا نەبێت، کە پێچەوانەی بەرگی دونیایی بێت، ئەم بەرگی ئیحرامە، نزیکە لە بەرگی کفنی مردووەوە، کە ئەویش وەك کفن درووماں و تایبەتمەندی بەرگی دونیایی نیە.

**دەرچوونی لە شار:**

کاتێك لە شارەکەی دەردەچێت، با وا بزانێت کە لە خاو خێزان و خزم و کەس و نیشتیمانی دوور کەوتۆتەوەو ، ڕووی لە خودای (عَزَّ وجَلَّ) کردووە، لە گەشتێکدا جیاوازە لەگەڵ سەفەرەکانی دونیادا، با لەدڵی خۆیدا مەرامەکانی ئامادە بکات، کە ئەو چی دەوێت؟ وە زیارەتی کێی مەبەستە؟ ئەو بەڕێکەوتووە بۆ حزوری پادشای هەموو پادشاکان، لە ناو کۆڕی زیارەت گەراندا، کە بانگ کراون و چوون بەدەم بانگەوازەکەوە، هاندراون و شەوقی ئەو گەشتە لە ناو دڵیاندایە، هەڵیان ساندوون و کەوتوونەتە ڕێ، پەیوەندییە دونیاییەکانیان پچڕاندووە، لە خەڵکی جیا بوونەتەوە، ڕوویان لە ماڵی خوداوەندی خۆیان کردووە، کە ئەو پەڕی ڕێزی لێ ناون و گەورە و بەهادار و پیرۆزی کردوون، بۆ ئەوەی دڵنەواییەك بێت بۆ زیارەتگەرانی، کە ئەوەی بە خزمەت کەعبەی شەریفە دەگات، وەك ئەوە وایە بە حزوری خودا گەیشتبێت، تا ئەو کاتەی بەو ئاواتەیش دەگەن، وە بەختەوەر دەبن بە لیقای پەروەردگاریان.

با هیوایەکی بە هێز بخاتە ناو دڵیەوە، کە دەگاتە مەرامەکانی و، خودایش

---

(١) لما ورد (**يحشر الميت في ثيابه**) ولذلك أمر بتحسين الأكفان، أنظر الإتحاف(٤/٤٤٦).

لێی وەردەگرێت، نەك بنازێت بەکردارەکانیدا، کە ماڵ و نیشتیمان و دۆستەکانی بە جێهێڵاوە، بەڵکوو پشت بە بوونی متمانەی تەواوی بە خودا ﷻ ، وە بە هیوای گەیشتنی بەو بەڵێنەی کە داویەتی، بۆ ئەوانەی بە خزمەتی بەیتەکەی دەگەن، با ڕجایشی وابێت، ئەگەر لە ڕێگەدا مردن ئێخەی گرت و نەگەیشتە شوێنی مەبەست، ئەوا دەبێتە میوان و، بە لیقای خودا دەگات، وەك خودا ﷻ فەرموویەتی:[1]، ﴿وَمَنْ يَخْرُجْ مِنْ بَيْتِهِ مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا﴾ (النساء/١٠٠)

واتە: ئەوەی لەماڵی خۆی دەربچێت و نیەتیشی کۆچ کردن بێت بۆ لای خوداو پێغەمبەری خودا، ئەوا پاداشتی حزوری خودا مسەوگەر دەکات، خودا بەخشندەو لێبوردەیە، هیجرەتیش هەموو جۆرەکان دەگرێتەوە، بۆ زانست بێت یان بۆ جیهاد یان بۆ حەج کردن.

## تێپەڕبوونی بە دەشتەکاندا و گەیشتنی بە شوێنی میقات:

کاتێك بەو سارایانەدا تێدەپەڕێت و،دەگاتە شوێنی ئیحرام بەستن و، ئەو هەموو کۆسپ و تەگەرانەش دەبینێت کە دێنە ڕێگای، با بیر لەو کاتە بکاتەوە لە نێوانی دەرچوونی لە دونیاو،گەیشتنی بە لیقای خوداو، میقاتی ڕۆژی دوایی، کە چەندێك لەو ناوەندەدا، تووشی ئەهوال و نارەحەتی لێپرسینەوە دەبێت.

با لە هەوڵدانی چۆنیەتی دەربازبوون لە دزو جەردەی ڕێگا، بیر لە پرسیاری نەکیر و مونکەر بکاتەوە، وە لە سەیرکرنی دڕندەی شیوو دۆڵەکان، دوپشك و کرم و مارو ئەژدەهای قەبری بیر بکەوێتەوە، وە لە دوورکەوتنەوەی لە ماڵ و خزمانی، تەنهایی و بێکەسی و داماوی، ناو گۆڕەکەی بیر بێتەوە، با لە هەموو ترسەکانی لە کردارو گوفتارەکانی تونێشوی ئامادەباشی بۆ دوارۆژی دابین بکات.

---

(١) انظر مارواه البخاري (١٢٦٥) ومسلم (١٢٠٦) عن ابن عباس (رضي الله عنهما)

## ئیحرام و تەلبییەی ناو میقات:

با بزانێت واتای ئەم ئامادەباشییە، چوونیەتی بەدەم بانگەوازی خوداوەیە ﷻ. با بەهیوا بێت لێی وەربگیرێت، وە بترسێت کە پێی بڵێن:

نە لەبیەیك و نەسەعدەیك!! نا لەبۆ ئەو تەلبییەو تەکبیرەی کە دەیکەیت، کەواتە با هەمیشە دودڵ بێت و، لە نێوانی خۆف و ڕجادا بێت، وە بە هیچ شێوەیەك پشت بە تواناو کرداری خۆی نەبەستێت، پشت قایم بێت تەنها بە کەرەم و فەزڵی خودا، چونکە بەڕاستی وەختی (لبيك اللهم لبيك) سەرەتای کارەکەیەتی، جێگای مەترسییەو دەبێت ئاگای لە خۆی بێت.

سوفیانی کوڕی عویەینە فەرموویەتی: عەلی کوڕی حوسەین (خوایان لێ ڕازی بێت) حەجی کرد، کاتێك ئیحرامی بەست و لەسەر وڵاخەکەی ڕاوەستا، ڕەنگی هەڵبزڕکاو لەرز کەوتە گیانیەوە و، ڕاچڵەکینێکی کرد و نەیتوانی تەلبییە بکات، وتیان بۆچی (لبيك) ناڵێیت؟ فەرمووی: دەترسم پێم بڵێن:

نا (لبيك) وە نا (سعديك)، وە تەلبییەکەم لێ وەرنەگرن، کاتێك دەستی پێکرد، خۆی بۆ ڕانەگیرا و، لەسەر وڵاخەکەی کەوتە خوارەوە، ئەو حاڵەتە بەردەوام دایدەگرت تا حەجەکەی تەواو دەکرد لێی نەدەبوویەوە.[1]

ئەحمەدی کوڕی ئەبی الحواری دەڵێت: لە خزمەتی ئەبو سولەیمانی درانیدا بووم، (خوای لێ ڕازی بێت) کاتێك ویستی ئیحرام ببەستێت، تا یەك میل دوور کەوتینەوە تەلبیەی نەکرد، بێ هۆشییەك هات بەسەریدا و دای گرت، لە پاشان بە ئاگا هاتەوەو فەرمووی: ئەی ئەحمەد: خودای (عَزَّ وجَلَّ) نیگای کرد بۆ (حەزرەتی) موسا (عليه السلام): فەرمان بدە بە زاڵمەکانی بەنی ئیسرائیل، واز بهێنن لە زیکر کردنی من، چونکە من ناوی ئەوکەسانەی کە

---

(١) رواه الدينوري في المجالسة وجواهر العلم(١٣٦)، وابن عساكر في تأريخ دمشق(٢٧٨/٤١).

زیکری من دەکەن (چونکە زاڵمن و ماڵ و نانیان حەرامە) بە لەعنەت و بەری بوون لە ڕەحمەتی خۆم ناویان دەبەم!! بێداربە ئەی ئەحمەد:

بیستوومە ئەوەی حەج بکات و، ماڵەکەی حەلاڵ نەبێت و تەلبیەش بکات، خودای(عَزَّوجَلَّ)دەفەرموێت: لا(لبَّيكَ) وە لا(سَعْدَيكَ)،نە وەڵامت دەدرێتەوەوبە (لبيك)،وە نە(سعديك)وسەرفرازیشت بۆ هەیە، تا ئەوکاتەی ئەوەی لە دەستایە دەیگێڕیتەوە بۆخاوەنەکانی،ئێمەیش ئەمین نین کە هەمان شتمان پێ بوترێت[1]

وە کاتێك دەنگ بەرز دەکاتەوە بە (لبيك) و تەلبیەکردن لە میقاتدا، با بیر لەو بانگەی خودابکات کە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ﴾ (الحج/٢) بانگی هەموو خەڵکی بکەن بۆ حەج، بەم بانگە ئەو بانگەتان بیر بێتەوە کە فوودەکرێت بە نەفخی صوردا و، خەڵکی بانگ دەکرێن بۆ زیندوبوونەوە لە گۆڕەکانیان و وەستانی حەشر، وە هەموو بە خێرایی مەیدانی حەشر پڕ دەکەن و، بەدەم بانگی خوداوە دەچن، وە دەکرێن بە دوو بەشەوە، نزیکەکان و بێزراوەکان، وەرگیراوەکان و دوورخراوەو دەرکراوەکان. کە هەموو یەکێك لەسەرەتاوە دڵنیا نیە لە کام پێڕیانە، وەك چۆن حاجییەکان لە جێگای ئیحرام بەستندا دڵنیا نین ، ئایا بۆیان تەواو دەکرێت، وە حەجەکەیان لێ وەردەگیرێت، یان نا؟

## چوونە ناو مەککە:

با لەوکاتەدا دەچێتە ناو مەککەوە، ئەوەی بیر بێتەوە، کە گەیشتۆتە حەرەمێکی پڕ لەئاسوودەیی و هێمن و، دوور لە کێشەو گرفت، هیوای بەهێز بێت، کە ئیتر ئەمین دەبێت لە تۆڵەی خودا، بەڵام لەوەش بترسێت، کە

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية(٢٦٣/٩)، والحديث الذي بلغَهُ ما رواه الطبراني في الأوسط (٥٢٢٤) وإذا أخرج بالنفقة الخبيثة، فوضع رجله في الغرز، فنادى: لبيك .. ناداه مناد من السماء: لا لبيكَ ولا سَعديك، زادُكَ حرامٌ، ونفقتكَ حرامٌ، وحجكَ غيرُ مبرور.

لەوانەیە ئەهل نەبێت بۆ نزیك بوونەوە لە خودای گەورە، لەوانەیە بە هاتنە ناو حەرەمی مەککەوە دەستبەتاڵ بێت و، شیاوی توڕەبوونی پەروەردگاری بێت، بەڵام لە هەموو حاڵەتەکاندا، با ڕجای خێری زیاتر بێت لە ترسەکەی، چونکە کەرەمی خودا گشت گیرەو، پەروەردگارێکی بەبەزەییە و، شەرەف و ڕێزی ماڵی خودا زۆر گەورەیە و، مافی زیارەتگاریش لەبەرچاودایەو، پەناگرتنی ئەوانەش کە دەستی پەناگیریان بە خاوەن پەناوە گرتووە هیواکەیان زایە ناکات.

## کە چاوی بە کەعبە دەکەوێت:

دەبێت گەورەیی بەیتی لە بەرچاوو دڵدا بێت، وای دابنێ کە تۆ خاوەنی بەیتەکە دەبینیت، ئەوەندە ڕێز و گەورەیی بۆ ماڵی خودا بڕیار بدە، وە تکات وابێت کە خودای (عَزَّ وجَلَّ) ڕێگای ئەوەت پێببەخشێت کە چاوت بە ڕوخساری نوربنی خودا ﷻ بکەوێت، وەك چۆن ڕێگەی بینینی ماڵی خودای پێ دایت، وە سوپاسی خودای گەورە بکە کە تۆی گەیاندۆتە ئەو پلەو تۆی لکاندووە بەو پێڕو تاقمانەی میوانداری ماڵی خودایان بە نسیب بووە.

وە لەوکاتەدا بیر بکەرەوە لەو ساتەوەختەی کە هەموو خەڵکی لەبەردەرگای بەهەشتدا کۆ دەبنەوە و، بەتەمای ئیزنی خودان بۆ چوونە ژوورەوە، لە پاشان دەکرێن بە دوو بەشەوە:

هەندێکیان ڕێگەیان پێدەدرێت و، هەندێکیشیان بەڕێ دەخرێن (پەنا بەخودا) هەروەك چۆن حاجییەکانیش هەندێکیان لێیان وەردەگیرێت و، هەندێکیشیان دەدرێتەوە بەسەریاندا، وە لەهەرچی لەو دیمەنانەی دەیبینیت، هەرگیز بێ ئاگا مەبە لە بیرکردنەوە لە نارەحەتیەکانی دوارۆژ، چونکە بە ڕاستی هەموو حاڵ و بارو دۆخی حاجییەکان بەڵگەیەکە لەسەر دیمەن و بەسەرهاتەکانی ژیانی دوارۆژیان.

**تەوافی بەیت:** بزانە؛ تەوافکردن، نوێژو عیبادەتە، با دڵت ئامادەی

تەواوی ئەو کاتە بێت کە دەسوڕێیتەوە بەدەوری دا، لە بە گەورەزانین و ترس و بیم و هیواو موحەببەت، کە لەم پەڕاوەدا بە درێژی باسمان کردن.

وە بزانە کە تۆ لە تەوافدا وەك بە فریشتە نزیك و موقەڕەبەکانی لای خودایت، کە بەدەوری عەرشدا دەسوڕێنەوەو، تەواف بە دەوردا دەکەن.

وا گومان نەبەیت، کە مەبەست لەم تەوافە تەنها سوڕانەوەی جەستەتە بە دەوری کەعبەدا، بەڵکوو مەبەست تەوافی دڵتە بە زیکرو یادی خاوەنی بەیتەکە، بۆ ئەوەی کە دەستت بە زیکر کرد، تەنها زیکری ڕاستەقینەی خودا بێت و، دڵت بەملاو لادا نەڕوات، وە لە زیکریش لێبویتەوە، بە زیکری خودا کۆتایی پێ بهێنیت، وەك چۆن دەستبەتەواف دەکەیت لە ناو بەیتەوەو، کۆتایشی پێدەهێنیت هەر لە ناو بەیتەوە.

وە بزانە تەوافی پەسەندو شایستە، تەوافی دڵە لە حزوری خوداوەندا، وە ماڵەکەی نموونەیەکی ئاشکرایە لە جیهانی موڵکداری دونیادا، بۆ ئەو حەزرەتەی کە بە چاوی سەر لە دونیادا نابینرێت، مادەم لە جیهانی مەلەکوتی خودایی دابێت، وەك چۆن جەستە نموونەیەکی ئاشکرایە لە جیهانی شەهادەو بینراو، بۆ ئەو دڵەی کە بەچاوی ئاشکرا نابینرێت، کە خۆیشی لە جیهانی غەیب و نادیارە، وە جیهانی موڵك و شەهادە و بینراو، دەچێتە ناو جیهانی شاراوەو غەیب و مەلەکووتەوە، بۆ ئەو کەسەی دەروازەکەی بۆ کراوەتەوە، هەر بۆ ئەم لێکدانەوە و پێوانەکارییەیە، کە هێما بەوە دراوە کە (بيت المعمور)[1]، لە ناو

---

(١) ماڵێکی ئاوەدانەو، ڕۆژانە حەفتا هەزار مەلائیکە تەوافی بەدەوردا دەکەن و، لە پاشان تا ڕۆژی قیامەت ناگەڕێنەوە، لەسەرو ئاسمانی حەوتەمەوەیە. اخرج ابن حرير وابن المنزر وابن مردوية والحاكم وصححه البيهقي في الشعب عن انس ان النبي صلى الله عليه وسلم قال **البيت المعمور في السماء السابعة يدخلة كل يوم سبعون الف ملك لا يعودون اليه حتى تقوم الساعة** أنظر الإتحاف( ٤/ ٤٤٨)

ئاسمانەکاندا بە ڕاسەری کەعبەی پیرۆزەوەیە، وە تەوافی مەلائیکەکان بە (بیت المعمور)دا، وەك تەوافی ئادەمییەکان وایە بە چواردەوری کەعبەدا.
وە لەبەر ئەوەی کە پلەو پایەی بەندایەتی زۆربەی خەڵکەکە ناگەنە ئەوەی وەك ئەوان تەواف بکەن، فەرمانیان پێ دراوە کە بە پێی توانا خۆیانیان پێ بشوبهێنن، وە ئەو بەڵێنەیشیان پێ دراوە:
کە هەرکەسێك خۆی وەك تاقمێك لێبکات، ئەوە لەوان ئەژمێررێت، [1]،
ئەوەی دەتوانێت بەم شێوە وریاییە تەواف بکات، ئەوەیە کە دەوترێت:
کەعبە زیارەتی ئەو جۆرە کەسانە دەکات و تەوافی بە دەوردا دەکات، وەك چۆن هەندێك لە وانەی خاوەنی کەشفی ڕاستەقینەن، ئەمەیان بینیوە بۆ هەندێك لە ئەولیاکانی خودا ﷻ.

## دەست هێنان بە بەردەکەدا:

لەکاتێکدا دەستدەهێنیت بە (حجرالأسود)دا، وابزانە کە تۆ بەیعەت بە خودای (عَزَّ وجَلَّ) دەکەیت، کە ئیتر تاعەتی بکەیت، بڕیارەکەت با بەدڵنیایی و متمانەی تەواوەوە بێت، کە وەفا بە بەڵێنەکەت بکەیت، هەرکەسێك هەڵی بووەشێنێتەوەو بەیعەتەکەی بشکێنێت، شیاوی غەزەب و توڕەیی خودا دەبێتەوە، وەك عەبدوڵلای کوڕی عەباس (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:
پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(( الحَجَرُ الأَسوَدُ يَمينُ اللهِ (عَزَّ وجَلَّ) في الأَرضِ، يُصافِحُ بِها خَلْقَهُ كَما يُصافِحُ الرَّجُلُ أَخاهُ))**[2].

(١) حديث : **من تشبه بقوم فهو منهم**. رواه أبودوود (٤٠٣١).
(٢) هو بسياقه هنا رواه الأزرقي في أخبارمكة.( ٢٥٧/١)، موقوفا على ابن عباس وبلفظ: **الركن يمين الله في الأرض. يصافح بها عباده كما يصافح بها أحدكم أخاه**)، هو شطر من حديث رواه الحاكم في المستدك(٤٥٧/١)، عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) مرفوعا. والركن هو الحجر المذكور في الحديث

واتە: بەردە ڕەشەکە دەستی ڕاستی قودرەتی خودای (عَزَّ وجَلْ) ە لە زەویدا، تەوقەی پێدەکات، لەگەڵ خەڵکە دروستکراوەکەیدا، وەك چۆن پیاوێك لە ئێوە دەستدەخاتە ناو دەستی براکەیەوە.[١]،

## خۆ هەڵواسین بەڕوکنەکانی کەعبە و نووساندنی سنگ بە مولتەزیمەوە.

لەکاتێکدا خۆت بە بەیتا یان پاڵ دەرگای کەعبەدا هەڵدەواسیت و، سنگی پێوە دەنێیت، با داواکەت نزیك بوونەوەبێت بە شەوق و موحەببەتی زیاترەوە بۆ کەعبەو خاوەنی ئەو ماڵە پیرۆزە، وە بەهۆی دەست لێدانەوە بەرەکەتت بۆ بێت، بە هیوای پاراستنی خۆت لە ئاگر، لە هەموو بەشێکی جەستەت کە بەر بەیت کەوتبێت.

با نیەتەکەت لە خۆ دانە پاڵ ڕوکنەکانی کەعبەوە، زۆری تکاو پاڕانەوەت بێت کە خودا لێت خۆش ببێت، وە داوای ئەمان و پاراستنی خودایی، وەك گوناهبارێك چۆن خۆی هەڵدەواسێت بە بەرگی ئەو کەسەدا گوناه و خراپەی لە دژی کردووە، کە لێی دەپاڕێتەوە تا لێی خۆش ببێت، وای بۆ دەردەخات هیچ پەنایەکی نەماوە جگە لە خۆهاوێشتنە بەردەرگاکەی، وە کەس ناتوانێت فریارەسی بێت مەگەر لێبوردەیی ئەو دابین بکات،وە دەست لە چاکی بەرنادات، **مەگەر لێی خۆش ببێت و لە داهاتویشدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا نەکات.**

## هاتوچۆی نێوانی صەفاو مەروە لە ساحەکەی تەنیشتی بەیت دا

---

(١)(ئەم جۆرە خیتابەی خودا لەگەڵ بەندەکانیدا، بۆ چۆنیەتی حاڵی کردنی بەندەکانیەتی، وەك چـۆن فەرمـوویەتی: ﴿ إِنَّ الَّـذِينَ يُبَايِعُونَـكَ إِنَّمَـا يُبَـايِعُونَ اللَّـهَ يَـدُ اللَّـهِ فَـوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴾(الفتح/١٠)کەواتە کە دەستیان خستە ناو دەستی پێغەمبەرەوە ﷺ وەك ئەوەوایە دەستیان خستبێتە نـاو دەسـتی قـودرەتی خـوداوە، واتە: ڕاسـتەوخۆ بەیعەتیـان بە خـودا کردبێت، کەواتە ئەمە مەجازە بەکاری هێناوە، دەست هێنان بە (حجر الأسود) یشدا وەك بەیعەتکردن وایە لە حزوری خوادا، نەك ئەوەی کە خودا دەستی هەبێت، (پەنا بەخودا)،

وەك ئەوە وایە بەندەیەك لە ناو مەیدان و موڵكی پادشایەكدا بێت و بڕوات بۆ دەربڕینی ئیخلاصی خۆی، كە بە چاوی بەزەییەوە سەیری بكات، دڵیشی وەك ئەو كەسە وابێت كە چوبێتە لای مەلیكەوەو هاتبێتە دەرەوەو نەزانێت چ حوكمێكی بەسەردا دەدات، وەری دەگرێت یان دووری دەخاتەوە، بەردەوام لەو ساحەو مەیدانەدا دێت و دەچێت، بەو هیوایەی كە ئەگەر جاری یەكەم ڕەحمی پێینەكردبێت، جارەكانی تر ڕەحمی پێبكات، ئەمیش بەم شێوە بە هاتوچۆكانیدا لە نێوانی صەفا و مەروەدا، هەمان حاڵەتی وەبیر بێت و ، بیریش لە تای ترازووی كردەوەكانی بكاتەوە لە ڕۆژی مەحشەردا .

وە نموونەی صەفا بەو لایەبێنێتەوە كە چاكەكانی تێداهەڵدەگیرێت، وە مەروەیش وەك لای هەڵگرتنی خراپەكانی بێت، ئەوەی بیربێتەوە چۆن بەملاو لای تای ترازووەكەدا دێت و دەچێت، بزانێت كامیان بارسەنگی زیاتر دەبێت، ئایا ڕوبەڕووی سزادەبێتەوە، یان لێخۆش بوون و پاداشتی خودایی.

## وەستانی عەرەفە:

ئەو تێڕژانەی دەیبینیت لەو مەیدانەداو، بەرزكردنەوەی دەنگەكان و، ئەو هەموو زمانەی قسەی پێدەكەن و، شوێن كەوتنی هەر تاقم و گرۆیەك بۆ پێشەواكانیان، كە دەچنە سەر مەشاعیرەكان و، جێگا پیرۆزەكان بەسەر دەكەنەوە، دوایان دەكەون و ،شوێن پێیان هەڵدەگرن، بیر لە تێڕژانی ڕۆژی حەشر بكەرەوە لە دوارۆژدا، وە كۆبوونەوەی هەموو گرۆو ئوممەتەكان لەگەڵ پێغەمبەران و پێشەواكانیاندا، وە هەر ئوممەتێك شوێن پێغەمبەرەكەی كەوتووەو، بە تەمای شەفاعەتیانن و ، وە هەموویشیان لەو مەیدانە فراوانەدا سەرسام ماون، ئایا دەستبەرویانەوە دەنێن ، یان وەریان دەگرن.

ئەگەر ئەو دیمەنەت بیر هاتەوە، ئیتر بەدڵیش تا دەتوانیت بە گەردن كەچی و پرمەی گریانەوە بپاڕێرەوە لە خودای (عَزَّ وجَلْ)، كە لە ناو ڕیزی ئەوانەدا حەشرت بكات، كە گرەوی پاشەڕۆژیان بردۆتەوە، وە دڵنیاییش بدە بە خۆت:

که خودای میهرەبان داواکانت لێ وەردەگرێت، چونکە بەڕاستی ڕاوەستانێکی زۆر بەبەرەکەتە، ڕەحمەتیش کە لەلای خودای خاوەن جەلالەوە دێتە خوارەوە بۆ هەموان، کە بە هۆی دڵە عەزیزە زیندووەکانی ئەوتاد و ئەبدالەکانی سەر زەوی، وە چینی پیاو صالِح و خاوەن دڵە هۆشیارەکان، دیارە مەیدانی عەرەفەیش هەرگیز خاڵی نابێت لە کۆمەڵێکی زۆر، لە ئەوتاد و ئەبدال و چەندین گرۆی پیاوچاکان و خاوەن دڵە بەئاگاکان، ئەگەر خەم ومەرام و داوای ئەمانە هەموویان کۆبوویەوە، وە دڵەکانیان بە تەنها خەریکی لاڵەو پاڕانەوە و تکاو ڕجابوون، وە دەستەکانیان بۆ حزوری خودا بەرزکردەوە، مل و گەردنیان درێژکردوو، چاویان بڕی بوویە ئاسمان و لێیان کەلا نەدەکرد، هەموو پێکەوەو بەیەکەوە کۆ بوون و، بەیەك هیممەتەوە خەریك بوون بۆ داوای ڕەحمەتی خودایی، هەرگیز ئەو گومانە نەبەیت کە هیوابڕاو بن، وە کۆششیان بە زایە بڕوات، یان ئەو ڕەحمەتەیان لێبگرێتەوە، کە هە موویان دا بپۆشێت، بۆیە وتراوە: گەورەترین گوناه ئەوەیە، کە ئامادەی ڕۆژی عەرەفات ببیت و وایش گومان ببەیت کە خودا لێت خۆش نەبووە.

کەواتە وای لێ دێتەوە، وەك ئەوەی ئامانج و نهێنی ئەو حەجە کۆبوونەوەی ئەو هەموو خاوەن هیممەتانە و، شکۆمەندجی ئەو نێوەندە باڵایەیە، بە هاوڕێیەتی ئەو هەموو پیاوخواو ئەبدال و ئەوتادانە، لە تەواوی شارو وڵاتەکانەوە کە کۆبوونەتەوەو، بەیەك دڵ و لەیەك کات و لەیەك شوێندا، باشترین هۆکارە بۆ ڕژاندندنی ڕەحمەتی خودای (عَزَّ وجَلْ)، کە بەهۆی کۆبوونەوەی خاوەن هیممەتەکانەوە، ڕەحمی خودایش دێتە خرۆش و، هەموان دەگرێتەوە، [١].

---

(١)عاریفەکان فەرموویانە: ئەگەر (سێ یەکی ئەخیری شەو)سوورەتی (یاسین) ت خوێند بۆ

## ڕەجمی شەیتان:

مەبەستت تەنها بەجێهێنانی فەرمانی خودا بێت، کۆیلایەتی و بەندایەتی ڕاستەقینەی خۆت ئاشکرا بکە، وە هەستانت بێت بە فەرمانبەردای خودای گەورە، بێ ئەوەی ئەم کارەت بەشی ئەوەی تێ بخەیت کە ئەقڵ لێی حاڵی بێت، یان نەفس پێی ڕازی بێت.

وە خۆت وەك(حەزرەتی) ئیبراهیم نیشان بدە (علیه السلام)کە شەیتانی لەعین لەو جێگەیەدا خۆی پیشاندا، کە گومانێکی بۆ دروست بکات، وە لەبارەی حەجەوە شوبهەیەکی بخاتە دڵەوە، یان دوچاری گومانێکی بکات.

خودای گەورەش فەرمانی پێدا، کە بەردی تێ بگرێت، وە دەری بکات، وە هیوا بڕاوی بکات.[1]

**ئەگەر ئەم گومانەهات بە دڵیدا:** ئەو زاتە شەیتان خۆی پێ نیشانداوەو بینیویشیەتی، بۆیە بەردی پێوە ناوە، بەڵام خۆمن شەیتان ڕێگەم پێ ناگرێت؟ ئەوە بزانە ئەو خەتەرەیە بۆ خۆی هی شەیتانە، ئەو خستوویەتیە ناو دڵتەوە، بۆئەوەی عەزم و نیەتت هەڵبکەنێت لە ڕەجم کردنی، وات گومان بخاتە دڵەوە کە ئەو بەرد تێ گرتنە هیچ سوودێکی نیە، وەك یاری مندالان وایە، بۆچی خۆتی پێوە خەریك دەکەیت؟! ئەوە یەکسەر ئەو گومانە لە دڵتدا دەر بکە، بەهۆی وەشاندنی بەردەکانیشەوە، بە ئیرادەیەکی بە هێزەوە لە نەفسی خۆیشتی

---

هەرمەبەستێك خودا بۆت جێ بەجێ دەکات، لەبەر کۆبوونەوەی سێ دڵ، دڵی خوێنەرەکە کە نزایش دەکات، وە دڵی قورئان، کە یاسین دڵی قورئانە، وە دڵی شەویش، کە نیوەی شەوە، لە جێیەك سێ دڵ پێکەوە کۆببنەوەو خودا نزا وەربگرێت، ئەی بە کۆبوونەوەی ئەو هەزان هەزار دڵە چۆن خودا ڕەحمەت نارێژێت، کە لە عەرەفەیشدا بێت، کە بەڕاستی ئەم نهێنیەکی نایابە، بنوارە إتحاف(٤٥٣/٤).

(١) روى هذا الخبر الأزرقي في أخبار مكة ( ٤٣/١).

دووربخەرەوە، ئەوکاتە لووتی شەیتان دەدەیت بە خۆڵدا. وە بشزانە کە ئەگەر بە ڕواڵەت ڕەجمی ئەو شوێنەوارانە دەکەیت، بەڵام لە ڕاستی دا ڕەجمی شەیتانە و، پشتی ئەوی پێدەشکێنیت، وە ناتوانیت لووتی ئەوی پێ لە خۆڵدا بگەوزێنیت، ئەگەر فەرمانەکەی خودا جێبەجێ نەکەیت، بۆ بەگەورە زانینی فەرمانێك، کە نە ئەقڵ لێی حاڵی دەبێت، وە نەبەشی پێخۆش بوونی نەفسیشی تێدایە.(مەگەر بۆ عاریفەکان دەرکەوتبێت).

### سەربڕینی دیارییەکان:

بزانە ئەمەش بە گوێرەی فەرمانبەردای خودایە، واتە نزیك بوونەوەیە لەو زاتە، کەواتە بە تەواوی ئەنجامی بدە، با دیارییەکەت و پارچەکانی تەواو بێت، وە بە هیوابە کە خودا بە هەریەکێك لەپارچەکانی ئەو قوربانی و دیارییە پارچەیەك لە گیانی تۆ ببەخشێت لە ئاگر، وەك بەم شێوەیە نزاکان هاتووە، هەرچەندێك دیارییەکە گەورەتربێت، وە پارچەکانی تەواو و کامڵتربێت، جێگەی باشتر دەگرێت و، چاکتر قوربانی دەبێت و لە ئاگر دەیپارێزێت.

## زیارەتی مەدینە:

کاتێك چاوت کەوت بە دیوارەکانی مەدینە، یەکسەر بیر لەوە بکەرەوە کە ئەوشارەیە خودا بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ هەڵبژاردووە، وە کردوویەتی بە شوێنی کۆچکردنی، وە ئەو جێگایە کە فەرزەکانی خوداو سوننەتەکانی پێغەمبەری تێدا بەیان کراوە، وە ڕووبەڕووی دوژمنانی بوویەوە و، خودای گەورە دینەکەی تێدا سەرخست، تاوەفاتی کردو گەڕایەوە بۆ حزوری خۆی.

وە خودا وای داناوە، کە جێگای ناشتن و مەرقەدی پیرۆزی خۆی و هەردوو وەزیرە کە لە وێدا بێت، کە بە حەقق و ڕاستی هەستاون و لایان نەداوە.

لە پاشان بهێنە بەرچاوی خۆت، جێ پێکانی (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ لەکاتێدا بە مەدینەدا تێ دەپەڕی، وە هەرجێ پێیەك پیادە ڕەوی پیا دەکەیت،

ئەوە جێ پێی پیرۆزی ئەو زاتە خۆشەویستەیە، کەواتە دەبێت بە ئارامی و بەترسەوە پێکانت بگوازیتەوە.

وە بیر لەوەبکەوە، بە کۆڵان و ناوەندەکانیدا دەڕۆیشت، وە خەیاڵی ئەو ڕۆشتنە پڕ لە ئارامی و گەردن کەچییەی بکە، کە چۆن خودای گەورە ناسین و مەعریفەتی خۆیی پێ بەخشی بوو، وە ناوی بەرزکردبوویەوە لە پاڵ ناوی خۆیدا دایناوە، تەنانەت لە گەڵ ناوبردنی خۆیشیدا، ناوی ئەوی پێوە لکاندووە، وە هەرکەسێك سووکایەتی بەرامبەر ڕێزی ئەو زاتە بکات، ئەوا تەواوی کردەوە چاکەکانی پوچەڵ دەبێتەوە، تەنانەت ئەگەر بە بەرزکردنەوەی دەنگیشی بێت بەسەر دەنگی حەزرەتی پێغەمبەر دا ﷺ.

لەپاشان بیر بکەرەوە، خودای گەورە چ منەتێکی گەورەی داوە بەسەر ئەو کەسانەدا کە هاوڕێی بوون و، بە خزمەتی گەیشتوون بەئیمانەوەو، بەختیاربوون بە دیداری موبارەکی و، فەرمایشتەکانیان بیستووە، وە خەم و مەراقێکی زۆر بکێشە کە صوحبەت و بەخزمەت گەیشتنی خۆی و یارانیت بە نسیب نەبووە، (خودایان لێ ڕازی بێت).

لە پاشان ئەوە بەبیر خۆت بهێنەرەوە، کەمادەم لە دونیادا بە دیداری شاد نەبوویت، وە مەترسی ئەوەیشت هەیە کە لە دوا ڕۆژیشدا بە خزمەتی نەگەیت، لەوانەیە لەو جێگەیشدا تەنها بە ئاخ و خەفەتێکی زۆرەوە ببینیت، کە بزانیت ڕێگەی بە خزمەت گەیشتنت لێ گیراوەو، کردەوە خراپەکانت بوونەتە کۆسپی بینینی ئەو زاتەیە، وەك (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(( **يُرفَعُ إِلَيَّ أقوامٌ، فيقولونَ: يا مُحَمَّدُ يا مُحَمدُ؛ فأَقول: يا رَبِّ أَصحابي، فيقولُ: إِنَّكَ لاتَدري مَا أَحدَثوا بَعدَكَ، فَأَقولُ بُعداً وسُحقاً**))[1]، هەندێك لەو خەڵکە بەرز دەکەنەوە بۆ لام، هاوارم بۆ دەهێنن، ئەی

(١)رواه البخاري(٦٥٨٥)، ومسلم (٢٤٩)، دون لفظ النداء.

موحەممەد، ئەی موحەممەد: منیش داوا لە خودا دەکەم: هاوڕێکانم ئەی پەروەردگار، ئەوەیش دەفەرموێت: تۆ نازانیت دوای تۆ چیان کردووە، منیش دەڵێم: دوریان خەنەوە و هەرگیز نەیانبینمەوە!

ئەگەر بۆ جارێکیش وازت لە ڕێز لێنانی شەریعەتەکەی هێنابێت، با بۆ خولەکێکیش بێت، ئەمین مەبە لەوەی کە نەبێتە هۆکاری دوورخستنەوەی تۆ لەو زاتەیە، چونکە وازت لە بەڵگەیەکی شەریعەتەکەی هێناوە.

بەڵام با لەگەڵ ئەوەشدا هیوات بە هێز بێت، کە هیچ شتێك نەبێتە ڕێگر لە نێوانی تۆو خۆشەویستدا، کە خاوەنی بڕواو ئیمانیت، تۆیشی دیاری کردووە لە نیشتیمانی خۆتەوە بۆ زیارەتی ئەو خۆشەویستە، بێ ئەوەی بازرگانی و کاری دونیایی تۆی هێنابێت، بەڵکوو تەنها لەبەر مەحەببەت و شەوقی دڵ و گیانتە، بۆ ئەوەی ئاسەوارە پیرۆزەکانیشی ببینیت، یان بە دیداری دیواری قەبرەکەی بگەیت، کە مادەم نەفسەکەت ڕێگەی پێدایت، تەنها بۆ ئەو مەبەستە بێیت و ئەو زیارەتە بکەیت، چونکە شەرەفی دیداریت نەبووە، کەواتە ئەم نیەتە باشە وادەکات کە خوداوەندی بەبەزەیی، بە چاوی ڕەحم و بەزەییەوە سەیرت بکات.

کە گەیشتیتە مزگەوتەکەی خۆشەویست، ئەوەت لە بیر بێت کە ئەود ئەو ناوەندەیە کە خودای (عَزَّ وجَلَّ) هەڵی بژاردووە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ ، وە بۆ هاوەڵەکەیشی کە یەکەم کەسی ناو موسوڵمانەکان و گەورەترینیانە لە ڕووی ڕێزو هێزەوە،(کەحەزرەتی صددیقی ئەکبەرە،خوای لێ ڕازی بێت)، وە فەرزەکانی خودا بۆ یەکەم جار لەو ناوەندە دا ڕاگەێنراو جێبەجێکرا، وە گەورەترینی دروستکراوانی خودای تێدا کۆبوویەوە، لە زیندووان و لە مردووان.

کەواتە با هیوات بەهێز بێت بە لوتفی خودا، کە بەزەیی پێتدا بێتەوە، کە لەو جێگە پیرۆزەشدا جێگەی کردویتەتەوە، بە خشووع و ملکەچیوە بڕۆرە ژوورەوە، گەورەیی بۆ بڕیار بدە، ئای کە ئەم جێگایە شایستەیە بۆ ئەوەی لە ناو دڵ و ناخی هەموو ئیماندارێکدا جێگەو پێگەی خۆشەویستی تایبەتی

هەبێت، وەك دەگێڕنەوە لە سولەیمانی دارانیەوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە لە خزمەت ئووەیسی قەرەنیدا حەجی کرد (خوای لێ ڕازی بێت)، وە هاتە ناو مەدینەوە، کاتێك لەبەردەمی دەرگای مزگەوتەکەدا ڕاوەستا، وتیان پێی:

ئەوە قەبری (حەزرەتی) پێغەمبەرە ﷺ ، ئیتر بێ هۆش کەوت، کاتێك بە هۆشی خۆی هاتەوە.. فەرمووی: دەرم بهێنن، بەڕاستی ناتوانم تام چێژ لە شارێك ببینم (حەزرەتی) مەحەممەدی تێدا شارابێتەوە و بە ژێر گڵەوە بێت[(١)]،

## زیارەتی خۆشەویست ﷺ

بەڵام زیارەتی (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ دەبێ تایبەتی بێت، لە بەردەمی ئەو زاتەدا وەك چۆن باسمان کرد ئاوا بە ئەدەبەوە ڕابووەستیت، وەك چۆن بە زیندوویی زیارەتی بکەیت، بە مردوویش هەروا زیارەتی دەکەیت. ئەوەندە لە گۆڕە پیرۆزەکەی نزیك دەبیتەوە، کە لە حاڵی حەیاتیدا لە شەخصی بەڕێزی لێی نزیك ببوایتایەتەوە، وەك چۆن ئەوکاتە ئەوەندە ڕێزت لێدەگرت، لێی نەدەکەوتی و ماچت نەدەکرد. (بەبێ ئەدەبیت دەزانی ئەزێتی بدەیت)، بەڵکوو لە دوورەوە لەبەردەمیا ڕادەوەستایت، ئێستەش هەروا بکە، ئەو دەست لێدان و دەست ماچکردنە کاتی خۆی نەریتی جولەکەکان بوو،[(٢)]،

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية (٢٦٢/٩)، وابن عساكر في تأريخ دمشق(٤٥٠/٩)، لە زۆربەی نوسخەکانی تردا لە جیاتی(بلد لي) (بلدي) هاتووە. واتە شارەکەم ئەو شارە نیە کە (حەزرەتی) ﷺ تیا مەدفوون بێت، واتە ناتوانم لەو شارەدا بژیم.

(٢)مەبەست ئەوەنیە کە حەرامە دەست ماچ بکرێت، لە فەرمودەی درووستدا هاتووە کە (حەزرەتی) ئەبوعوبەیدە ی جەڕاح دەستی حەزرەتی عومەری زیارەت کرد. وەك بەیهەقی لە السنن الكبرى دا دەیگێڕێتەوە لە زیاد بن فیاض. لە تمیم بن سەلەمە وە ،کاتێك کە ڕۆیشت بۆ قودس، وە هەردوکیان لە لایەکەوە دانیشتن و دەستیان کرد بە گریان، وە تایفەی تەمیم دەیانووت: دەست ماچ کردن سوننەتە. هەروەها البخاري لە الأدب المفرد(٣١/٨) والأصفهاني في طبقات أصفهان ٢٥٧/٣)،وجوَّد إسناده الحافظ في الفتح (٥٧/١١)، دا

هاتووه له عبدالرحمن بن رزين فەرمووی: دامان بەلای الزبدة دا. وتیان سەلەمەی کوڕی ئەکوەع لێرەیە. صەحابی پێغەمبەر . فەرمووی: چوینە لای و سەلاممان لێ کرد. دەستی خۆی دەرهێناو وەك لەپی وشتر فراوان بوو. فەرمووی: بەم دەستانەم بەیعەتم بە پێغەمبەر ﷺ کردووە. ئێمەیش هەڵسانین و چوین و ماچمان کرد. هەروەها هەندێك لە موسوڵمانان لە غەزایەك گەڕانەوەو پێیان دەوتن: ئێوە ڕاتان کردووە. (حەزرەتی) عومەر دڵنەوایی کردن و ئەوانیش هاتن و دەستی (حەزرەتی) عومەریان ماچ کرد. وە دەفەرموێت: أبو لوبابەو کەعبی کوڕی مالیك و دووهاوەڵەکەی کاتێك هەواڵی تەوبەکەیان بیست کە لێیان وەرگیراوە، هاتن و دەستی پێغەمبەریان ماچ کرد. وەك حافظ فەرمووده (ابن حجر) دەیگێڕێتەوە. وە ماچ کردن بۆ ڕێز لێ گرتن کارێکی پەسەندە، وەك (حەزرەتی) عائیشە باسی هەستان لەبەری پێغەمبەر ﷺ بۆ (حەزرەتی) فاتیمەو ماچکردنی دەکات و، هەرکاتێکیش پێغەمبەر ﷺ تەشریفی بچوایە بۆ لای ، ئەویش هەڵدەستا لەبەری و ماچی دەکرد. وەك أبوداوود ڕیوایەتی دەکات. ئیمامی نەوەوی لە روضة الطالبين دا(١٠/٢٣٦) فەرموویەتی: ولا يكره تقبيل اليد لزهد وعلم وكبر سن، وە هەروەها لە رياض الصالحين ص/٢٥٤. وە بنواڕە فەرموودەکانی أبوداوود(٣٦٥/٦)، والبيهقي في السنن الكبرى(١٠٢/٧)، وفي شعب الإيمان(٤٧٧/٦)، وقال الحافظ إسناده جيد، کە وەفدی عبد قيس هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وە بە خێرایی دادەبەزین و دەچوونە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ دەست و پێیان ماچ دەکرد. ....تاد.

وعن أسامة بن شريك، قال: **قمنا إلى النبي ﷺ فقبلنا يده**، رواه المحاملي في أماليه(٢٥٦/١) وأبوبكر بن المقري في تقبيل اليد(٥٨/١. وقال الحافظ ابن الحجر إسناده جيد في الفتح(٥٧/١١). وعن صفوان بن عسال أن يهوديا قال لصاحبه: إذهب بنا إلى هذا النبي ﷺ ، قال: **فقبلا يَدهُ وقالا: نشهد إنك نبي الله**، رواه الترمذي ٧٧/٥، وقال الحافظ في تلخيص الحبر ( ٩٣/٤) إسناده قوي. وعن عمار بن ياسر (رضي الله عنهما) **أن زيد بن ثابت ركب يوما، فأخذ إبن عباس بركابه، فقال : تنح يا بن عم رسول الله، ﷺ فقال: هكذا أمرنا أن نفعل بعلمائنا، وكبرائنا. فقال زيد: أرِني يَدكَ. فأخرَجَ يَدهُ فقبَّلَها. فقال: هكذا أُمِرنا أن نفعلَ بأهلِ بيتِ رسولنا ﷺ** . وە دەیان بەڵگەی تر هەیە کە حەزرەتی عەلی دەستی مامی ماچ دەکردوو داوای لێ دەکرد کە: ئەی مامە لێم ڕازی بە. وەك ابن المقرى بە درێژی لە تقبيل اليد دا باسی کردووە، وە باسی ثابتی بەنانی دەکات. کەپرسیاری لە زەیدی

وه بزانه: كه پێغهمبهر ﷺ ئاگاداره به ئامادهبوونت و، وهستان و زیارهت و ئیخلاصت، وه صهلات و سهلامێكیش كه دهینێریت ڕاستهوخۆ پێی دهزانێت، تۆیش وێنهی موبارهكی وهك خۆی بخهره ناو خهیاڵی دڵتهوهو. ئێستا له ناو ڕهوزهكهیدا بهرامبهر خۆت دابنێ و، به گهورهترین پلهوه بیخهره ناو دڵتهوه.

دهگێڕنهوه له (حهزرهتی) پێغهمبهر ﷺ كه خودای گهوره لهسهر گۆڕهكهی فریشتهیهكی كردووه به وهكیل، سهلامی ههموو ئهوانهی له ئوممهتهكهی سهلامی لێدهكهن پێی دهگهیێنێت(١).

ئهوه بۆ ئهوانهی كه ئامادهی سهر گۆڕهكهی نابن، ئهی دهبێت چۆن بێت لهگهڵ ئهوانهدا كه نیشتیمانیان به جێهێڵاوهو، شیوو دۆڵێكی زۆریان بڕیوهو شهیدای به خزمهت گهیشتنینی، كه ههرچهنده به خزمهت دیداری جهماڵی ڕوخساری نهگهیشتوون، بهڵام بهوهنده دڵیان دهسرهوێت كه مهشـــاهیده

---

كوڕی ثابت كرد، ئایا دهست بهری پێغهمبهر ﷺ كهوتووه، فهرمووی بهڵێ: فهرمووی: كهواته دهستم بدهرێ با ماچی بكهم و ماچی كرد. تلخيص الحبر( ٩٧/١)، ئهگهر صهحابه بفهرمونێت ئـاوا ئهمرمـان پێكـراوه كه دهسـتی نـالو بهیتی پێغهمـبهر ﷺ مـاچ بكهیـن، ئیتـر چی تێـدا دهمێنێتهوه. بهڵام ئیمامی غهزالی باسی ئهدهبی زیـارهت دهكات، وهك چۆن ئیمـامی نهوهوی تهشـریفی هێنـا بـۆ زیـارهتی ئیمـامی شـافیعی، كه له قهبـرهكهی نزیـك كهوتهوه له دوورهوه ڕاوهستا، عهرزیان كرد بۆچی ناچیته پێشهوه. فهرمووی: ئهگهر ئیمام زیندووبوایه شوێنی من ههرئهوهنـده دهبـوو، نهدهبـوو نزیكتـر بكهوتمـایهتهوه، كهواته بهكارهێنـانی ئهدهب كـارێكی پێویسته بۆ ئهوانهی دهیانهوێت لهگهورهیی (حهزرهتی) پێغهمبهر ﷺ بههرهوهربگرن.

(١) رواه البيهقي في الشعب (٢٧٧٣) وابن عساكر في تأريخ دمشق(٣٠١/٥٤) وفيه: **ثم يوكل الله بذلك ملكاً، يدخله في قبري، كما تدخل الهدايا، يخبرني مَن صلَّى عليَّ بإسمهِ ونسبه إلى عشيرته، فأُثبته عندي في صحيفةٍ بيضاء،** وله ألفاظ أخرى، حكاها الحافظ السخاوي، في (القول البديع) ص/٣١٣، وما بعدها، وللنسائي( ٤٣/٣). **إن لله ملائكة سيَّاحين في الأرضِ يُبَلِّغوني مِن أُمَّتي السَّلام.**

پیرۆزەکان و ئاسەوارە دڵرفێنەکان ببینن.

هەر وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاةً واحِدةً، صلَّى اللهُ عَلَيهِ بِها عَشراً**))[1]. ئەوەی تاکە صڵاواتێکم لێبدات، خودای گەورە لە پاداشتیدا دە صڵاوات و ڕەحمەتی بۆ دەنێرێت.

ئەمە پاداشتی ئەوەیە کە بە زوبانی صڵاواتی لە حەزرەت ﷺ دابێت، ئەی دەبێت پاداشتی ئەوانە چۆن بێت کە دێنە حزوری خۆی.

لە پاشان وەرە پاڵ میمبەری پێغەمبەری خودا ﷺ ، وایش بخەرە دڵتەوە کە (حەزرەت) ﷺ چووەتە سەر میمبەرەکەوە، وە شکۆو ڕوخساری پیرۆزی و جەماڵی بێ وێنەی بخەرە بەرچاوی خۆتەوە، کە بە پێوە ڕاوەستاوە، وا موهاجیر و ئەنصارەکان چاویان بڕیوەتە طەڵعەتی پیرۆزی و، ئەویش (صەلات و سەلامی خودای لەسەر) خەریکە هانیان دەدات بۆ گوێڕایەڵی و تاعەتی خودا، وە وتاری بە پێزیان بۆ دەخوێنێتەوە.

لەم کاتەشدا داوا بکە لە خودای (عَزَّ وجَلْ) کە لە قیامەتدا جیایی نەخاتە نێوانی تۆو حەزرەتەوە ﷺ . ئەگەر لەمانە هەمووی لێبوویەوە:

دەبێ خەم و پەژارەیەکی زۆر دڵی داگرێت، ترس و بیمێکی زۆر ڕووی لێبکات، ئایا حەجەکەی لێ وەرگیراوە، وە لە ناو کۆڕی خۆشەویستاندا جێگیر کراوە؟ یان دەستنراوە بە ڕوویەوەو، خراوەتە ناو تاقمی دەرکراوانەوە؟!

با بە دڵی خۆی و کردەوەکانی خۆیدا ئەم وەڵامە دەست خۆی بخاتەوە.

ئەگەر سەیری دڵی خۆیی کرد، بەراورد لە گەڵ پێشوودا، زۆر بێ مەیل بووە لە دونیای پڕ لە وەیشوومەو سەرکەشی، وە زیاتر حەزی بە وەیە ڕو بکاتە هەوارگەی دڵانی دوارۆژ و، تاقەتی ڕۆحی خۆی بە نزیك بوونەوە لە حزوری خوادا دەردەکات، وە بینی وا خەریکە کردەوەکانی هەمووی بە کێشانەی سەریع

---

(١) رواه مسلم (٤٠٨).

دەڕوات و ئەنجامیان دەدات، ئەوکاتە با متمانەی بە خۆی و وەرگرتنی حەجەکەی هەبێت و، دڵنیا بێت کە خودا حەج لە یەکێك وەردەگرێت کە خۆشی بوێت.

ئەوەیش کە خۆشیویست: سەرپەرشتی دەکات و، ئاسەواری لوتفی خودای پێوە دیار دەبێت، وە هێزو دەسەڵاتی دوژمنەکەی کە شەیتانی لەعینە لێ دوور دەخاتەوە.

ئەگەر ئەم حاڵەتەی لەسەر ئاشکرا بوو، ئەوە نیشانەی وەرگیراوییە، بەڵام ئەگەر کار بە پێچەوانەوە بوو، ئەوە خەریکە بڵێین: لە سەفەرەکەی تەنها ناڕەحەتی و ماندووبونی پێ بڕاوە، (پەنا ئەگرین بەخوای گەورە لە حاڵەتە نەخوازراوە)

**تەواو بوو پەڕاوی نهێنیەکانی حەج و گرنگییەکانی**

**کە پەڕاوی حەوتەمە لە چواریەکی بەندایەتی، لە پەڕاوەکانی**

**ژیانەوەی زانستەکانی ئاین،**

**حەمدو سەنا بۆ خودای پەروەردگاری هەموو جیهانەکان، سوپاسێکی زۆری بێ پایانی بۆنداری تامخۆشی پیرۆزی موبارەك، وەك ئەوەی شایستەتەی ئەو زاتە بێت، هەر ئەویشە کە پشت و پەنامانەو بەسمانە بۆ هەموو کارەکان،**

**وە صەڵات و سەلامی نەبڕاوە لەسەر گەورەترینی مەخلووقاتی خودا گەورەو سەروەرمان (حەزرەتی) مەحەممەد ﷺ پێغەمبەر ی ئەمین و زانای بێ شەهادەو ،دانای بێ خوێندەواری، وە لەسەر ئال بەیتی پاکو خاوێنی ، هەموو ئەوکاتانەی کە زاکیرو دڵ زیندووەکان یادی دەکەن و، هەموو ئەو کاتانەش کە خاوەن دڵە مردووەکان لێی غافڵ و بێ ئاگان،**

**لە دوای ئەم پەڕاوە: پەڕاوی ئادابی تیلاوە و خوێندنەوەی قورئان دێت.**

# كتاب

# آداب تلاوة القُرآن

# پەڕاوی

# ئادابی خوێندنەوەی

# قورئان

## کە پەڕاوی هەشتەمە

## لە چواریەکی بەندایەتی

## لە پەڕاوەکانی

## ژیانەوەی زانستەکانی ئاین

# پەڕاوی ئادابی خوێندنەوەی قورئان

## بِسْمِ اللّٰه الرَّحْمَنِ الرَّحِيمْ

**حەمدو سەنا بۆ ئەو خودایەی کە بە ناردنی پێغەمبەرە خاوەن پەیامەکەی (صەلات و سەلامی خودای لەسەر)و، وە پەڕاوە پیرۆزە نێرراوەکەی، منەتی کردووە بەسەر تەواوی بەندەکانیدا، پێغەمبەرێك کە نوێنەرو نێرراوی خودایەو، قورئانێکیش کە لە هیچ لایەکەوە هەڵەو قسەی پڕوپوچ و نەشیاو رووی تێناکات و، لە لایەن خوداوەندێکی زانای پەندیاری سوپاسکراوەوە نێرراوەتە خوارەوە. وە ڕێگەیەکی فراوانی لەبەردەم بیرمەندو تێگەیشتواندا والاکردووە، کە زیاتر ڕێگای پەندو ئامۆژگاری لێوە فێربن و، چیرۆك و هەواڵەکانی سەرچاوەی پەندو ئامۆژگاریان بێت، وە بەهۆی قورئانەوە ببنە پەیڕەوکارێکی بەرنامەیەکی دروست و، ڕێگایەکی ڕاستی بێ پێچ و پەنا، بەو هەموو حوکم و فەرمانە ئاشکراو ڕوونانەی کە بووەتە سەرچاوەی ڕۆشنایی و، حەڵاڵ و حەرامی پێ لەیەك جودا کراونەتەوەو، مایەبەخشی نوورو تیشکی ناو دەروونی خوداناسانەو، ڕزگارکەری هەموانە لە سەرکەشی و، شیفابەخشی دڵە نەخۆش و زامدارەکانیشە، لە هەموو خەوش و ناسۆرێك.**

ئەوەی پێچەوانەی بجوڵێتەوە لە زاڵمەکان، خودا پشتی دەشکێنێت، ئەوەش بەدوای سەرچاوەی زانستی تردا بگەڕێت و، لەو قورئانە دوورکەوێتەوە خودا گومڕای دەکات. قورئان پەتی بەهێزو قایم و نەپچڕاوە، وە نووری ڕوون و ئاشکرای خودایە، ئەو هێڵە چنراوو پێکەوە گرێدراوە بەهێزانەیە، کە هەرگیز لێك ناترازێن، وە ئەو پەناگایە کە پەنادراوانی دەپارێزێت و، نایاندات بە دەستەوە، چواردەوری هەموو ڕوداوو بابەتی بچوك و گەورەو کەم و زۆری داوەو، هیچ شتێکی لێ ون نابێت و، هەموو شتێکیشی تێدا جێ دەبێتەوە، فرمان و ڕوداوە سەرسوڕهێنەرەکانی هەرگیز نافەوتێت و، شتە نامۆو سەیرو

سەمەرەکانیشی هەرگیز کۆتایی نایەت، هەموو پەندیارە دانامەو تێگەیشتووەکان ناتوانن سەری لێدەربکەن و، گەمارۆی زانستەکانی بدەن و، پەی بەهەموو نهێنیەکانی ببەن، هەرچەندێکیش خوێنەرە شارەزاکان بیخوێننەوە لێی ماندوو نابن و، چەندێك بەرهەمی لێ هەڵبگۆزن هەرگیز لێی تێر نابن، ئەو قورئانەی کە چینە سەرەتاییەکان و داهاتووەکانیشی ڕێنومایی کردو، جنۆکەکانیش دانیان بەم ڕاستیەدا ناوەو ، خۆیان پێ ڕانەگیراو، بە خێرایی گەڕانەوە بۆ لای هاو وێنەکانیان و، هەڕەشەو بێداریان پێ ڕاگەیاندن و، بڕیاریاندا کە ئیتر هاوەڵ بۆ خودا دانەنێن و، شوێن ئەو پەڕاوە پیرۆزە بکەون و دەڵێن: ﴿**إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا، يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ، وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا**﴾ (٢/الجن)

ئەوەی بڕوای پێ هێنا، سەرفراز بوو. ئەوەش وتەکانی لەسەر ئەو فەرموودانە دارِشتەوە، ئەوە ڕاستی کردووە، ئەوەیش دەستی پێوەگرت، ڕێنمایی دروستی وەرگرت و، ئەوەیش کاری پێ کرد، ئەوا بە دڵنیاییەوە سەرفراز بوو.

هەروەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿**إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ**﴾( الحجر/٩) ئێمە بۆ خۆمان بە تایبەتی قورئانمان ناردۆتە خوارەوەو پارێزگاریشی لێدەکەین، (خوداپارێزبەندی پێداوەو، بەکەس هەڵناوەشێتەوە) لەدڵەکانداو لە ناو پەڕاوەکان و، بە بەردەوامی خوێندن و وتنەوەی کردوونی بە هۆکاری پاراستنی، کەبەردەوام بن لە توێژینەوەو هەستان بە مەرج و ئادابەکانی، وە پارێزگاری کردن لە کردارە شاراوەو ئادابە ئاشکراکانی، ئەمەیش پێویستی بە ڕوونکرنەوەو لەسەر وەستانی پێویست هەیە، وەك باسی دەکەین:

**مەبەست و ئامانجەکانی لە چوار دەروازەدا خۆی دەبینێتەوە:**

**دەروازەی یەکەم:** لە بارەی گەورەیی قورئان و ئەهلی قورئان.

**دەروازەی دووهەم:** ئادابی خوێندنەوەی بە شێوەی زاهیرو ئاشکرا.

**دەروازەی سێیەم:** لەبارەی کردارە شاراوەکان لە کاتی خوێندنەوەیدا.

**دەروازەی چوارەم:** تێگەیشتنی قورئان و لێکدانەوەی بە ڕاو بۆچوونی تر

# دەروازەی یەکەم:

## لەبارەی فەزڵی قورئان و ئەهلەکەی

## وە سەرکۆنەکردنی ئەوانەی کەمتەرخەمن لە خوێندنەوەی

## (گەورەیی قورئان)

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ قرأَ القُرآنَ ثُمَّ رَأى أَنَّ أحداً أُوتِيَ أفضَلَ مِمَّا أُتِيَ.. فقَدِ اسْتَصغَرَ ما عَظَّمَهُ اللهُ تَعالى.))[1]،

ئەوەی قورئان بخوێنێتەوەو، وایش بزانێت کەسێك هەیە شتێکی تری پێ درابێت لەوەی ئەو باشتربێت، ئەوە ئەو قورئانەی بچووك کردۆتەوە، کە خودا گەورەی کردووە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (( مامِنْ شَفيعٍ أَفضَلُ مَنزِلَةً عِندَ اللهِ مِنَ القُرآنِ، لانَبِي ولا مَلَكٌ ولاَ غَيرُهُ))[2]،

واتە: هیچ شفاعەتکارێك نیە تکاکەی باشتر وەرگیرێت لە شەفاعەت کردنی قورئان بۆ یەکێك، نە پێغەمبەرو نە فریشتەو، نەکەسی تر.

---

(١)رواه ابن مبارك في الزهد، (٧٩٩) والخطيب في تأريخ بغداد(٤٠٣/٩) وأوقفه البيهقي في الشعب(٢٣٥٢) عن عبدالله بن عمرو بن العاص (رضي الله عنهما) وأخرجه الطبراني في الكبير كما في مجمع الزوائد للهيثمي ( ١٥٩/٧)بسند ضعيف، وقال الزبيدي(٤٦٣/٤) : ورواه محمد بن نصر في كتاب قيام الليل (ص/٢٧٠)، لكنه موقوف على ابن عمر، ورواه الخطيب في تأريخ بغدادعن ابن عمر (٣٩٦/٩).

(٢) رواه عبدالملك بن حبيب من رواية سعيد بن سليم مرسلا، وللطبراني في المعجم الكبير (١٣٢/٩)(٨٦٥٥)، و(١٧٢/١٠)(١٠٤٥٠)من حديث ابن مسعود: **(القرآن شافعٌ مشفع )**، ولمسلم في صحيحه(٨٠٤)، من حديث أبي أمامة: **إقرؤوا القرآن؛ فإنَهُ يَجيئُ يوم القِيامة شَفيعا لصاحبه)** الإتحاف ( ٤٦٣/٤).

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

ئەگەر خودا وای تەقدیر بکردایە قورئانی لە ناو پێستێکدا دابنایە، کە وشکەو هێشتا خۆشەش(دەباغ) یش نەکرابایە ، ئەوا ئاگر نەیدەسووتاند، ئەی چۆن کەسێك دەسوتێنێت هەڵگری قورئان بێت و ڕێزیشی لێبگرێت:

**(( لَو كانَ القُرآنُ فِي إِهابٍ مَا مَسَّتهُ النَّارُ))**[1].

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((أَفضَلُ عِبادَةِ أُمَّتِي تِلاوَةُ القُرآن))**[2]،باشترین و خێردارترین عیبادەتی ئوممەتەکەم خوێندنەوەی قورئانە.(مەگەر زیکری تایبەتی بۆ کاتی تایبەتی)

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(( إِنَّ اللهَ (عَزَّ وجَلَّ) قَرأَ (طـه) و (يـس) قبلَ أَنْ يَخلُقَ الخَلقَ بِأَلفِ عام، فَلَمَّا سَمِعَتِ المَلائِكَةُ القُرآنَ، قال: طوبَى لِأُمَّةٍ يَنزِلُ عَلَيهِ هذا، وطُوبى لأَجوافٍ تَحمِلُ هَذا، وَطُوبَى لأَلْسِنَةٍ تَنطِقُ بِهَذا.))**[3]

خوای گەورە هەردوو سوورەتی (طاها و یاسین) ی خوێندەوە، پێش ئەوەی هیچ کەسێك دروست بکات بە هەزار ساڵ، کاتێك فریشتەکان قورئانیان بیست، فەرموویان: خۆزگە بەو ئوممەتەی ئەم قورئانەی لەسەر دادەبەزێت، خۆش بەختی بۆ ئەو سینەو دەروونانەی ئەم قورئانە هەڵدەگرن، خۆزگەش بەو زوبانانەی بە قورئان قسە دەکەن و دێنە گوفتار.

---

(١) رواه أحمد في المسند(١٥٥/٤)(١٦٩٦٧) ، والطبراني في الكبير (١٧٢/٦).(٥٩٠٠) وابن حبان في الضعفاء(١٤٨/٢). من حديث سهل بن سعيد. والدرمي(٣٣١٠)، وورواه ابن عدي في الكامل(١٥/٦)والبيهقي في الشعب ٥٥٥/٢(٢٧٠٠)والطبراني في الكبير(١٨٦/١٧)(٤٩٨).

(٢) رواه البيهقي في الشعب(١٨٦٥)، وأخرجه أبو نعيم في فضائل القرآن من حديث النعمان.

(٣) رواه الدارمي في سننه(٣٤٥٧)، والطبراني في الأوسط ١٣٣/٥(٤٨٧٣)، والبيهقي في الشعب ٤٧٧/٢(٢٢٢٥)بلفظ: **قبل أن يخلق الله الأرض بألفي عام**. وتكلم بدل تنطق. قال الزبيدي (٤٦٤/٤) وأخرجه أيضا ابن خزيمة في التوحيد(٤٠٣/١)، وابن عدي في الكامل (٢١٦/١)،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

(( **خَيرُكُم مَن تَعَلَّمَ القُرآنَ وعَلَّمَهُ**))[١]، واتە: چاکترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێر ببێت وە خەڵکیشی لێ فێر بکات.

هەروەها دەفەرموێت: ﷺ خودای گەورە فەرموویەتی:

((**يقول اللهُ تَبارَكَ وتَعالَى: مَنْ شَغَلَهُ قِراءَةُ القُرآنِ عَنْ دُعائي ومَسأَلَتي، أعطَيتُهُ أفضَلَ ثَوابِ الشَّاكرين**))[٢].

ئەوەی خوێندنەوەی قورئان سەرقاڵی بکات و نەیپەرژێتە سەر دوعا کردن و داواکردن لە من، بە ئەندازەی پاداشتی شوکرکردووەکان پاداشتی دەدەمەوە،

وە دەفەرموێت: صەلات و سەلامی خودای لەسەر:

(( **ثَلاثَةٌ يَومَ القِيامَةِ علَى كثيبٍ مِن مِسكٍ أَسوَد، لا يَهولُهُم فَزَعٌ ولايَنالُهُم حِسابٌ، حتَّى يَفرغَ مِمَّا بينَ النَّاسِ: رَجُلٌ قَرأَ القُرآنَ ابتِغاءَ وَجهِ اللهِ (عَزَّ وجَلَّ) وأَمَّ بِهِ قَوماً وهُم عَنهُ راضُون**...))[٣]. واتە: سێ کەس هەن لە دوا ڕۆژدا وان لەسەر گردۆڵکەیەك لە میسکی ڕەش، هیچ ترس و بیم و ناڕەحەتی و ترسان و هەرایەك دایانناچڵکێنێت و. لێپرسینەوەیش نایانگرێتەوە، تا هەموو کەسەکان لەلێپێچانەوە لێدەبنەوە: پیاوێك لە پێناوی ڕەزامەندی خودای بە

---

(١) رواه البخاري (٥٠٢٧). من حديث عثمان ابن عفان.

(٢) رواه الترمذي (٢٩٢٦)، بلفظ: **من شغله القرآن وذكري عن مسألتي أعطيته أفضل ما أُعطي السائلين** وقال حسن غريب. قال الزبيدي ٤٦٤/٤ : ورواه الدارمي في سننه (٣٣٩٩)(٣٣٥٦) وأبو نعيم في الحلية ١٠٦/٥)، كسياق الترمذي، وكذلك رواه الطبراني في الدعاء ص/٥١٩(١٨٥١) قال الحافظ ابن حجر في الفتح الباري(٦٦/٩) فيه محمد بن الحسن، وعطية ضعيفان. إلاّ أنهم لا يخرّجون لهما إلاّ في المتابعات،قال ابن عدي ١٧٢/٦(١٦٥٦): في محمد بن الحسن مع ضعفه، يُكتَبُ حديثه. هذا ما يتعلق بحديث الترمذي. ورواه ابن شاهين في الترغيب في فضائل الأعمال (١٥٣).

(٣) رواه الترمذي (١٩٨٦) بنحوه وهو بلفظه عند الخطيب في تأريخ بغداد ( ١٢٤/٤ ).

دەسەڵاتدا قورئان بخوێنێت و، ئیمامەتیش بۆ تاقمێك بكات كە لێی ڕازی بن.

وە دەفەرموێت: صەلات و سەلامی خودای لەسەر:

((أَهلُ القُرآنِ أَهلُ اللهِ وخاصَّتُهُ))[1]

ئەوانەی بە ئەهلی قورئان دەژمێررێن، واتە: لەبەریان كردووە و هۆگری بوون، ئەوانە تایبەتمەندو كەسە نزیكەكانن لە خوداوە، كە بە ئەهلوڵلا و ئەولیا دەناسرێن.

وە دەفەرموێت: صەلات و سەلامی خودای لەسەر:

**((إنَّ هذهِ القُلوبَ تَصدَأُ كما يَصدأُ الحَديدُ. فقيل: يارسول الله: ومَا جَلاءُوها؟ فقالَ تِلاوَةُ القُرآنِ وذِكرُ المَوتِ))(٢).**

بەڕاستی ئەم دڵانە وەك چۆن ئاسن ژەنگ دەیگرێت، ئاوا ژەنگ ڕوویان تێ دەكات، وتیان:

ئەی بەچی پاك دەبێتەوە و شەوقەداتەوە؟ فەرمووی: بە خوێندنەوەی قورئان و بیركردنەوە لە مردن.

وە دەفەرموێت: صەلات و سەلامی خودای لەسەر:

**(( للَّهِ أَشَدُّ أَذَناً إلى قارِئِ القُرآنِ. مِن صاحِبِ القَينَةِ إلى قَينَتهِ))**[3].

وەڵلاهی خودا باشت دەنگی قورئان خوێنەكان دەبیستێت، لە خاوەنی كەنیزەكێك كە لەپاڵیا گۆرانی بۆ بڵێت.

---

(١) رواه النسائي في السنن الكبرى(١٧/٥)(٧٩٧٧) وابن ماجه (٢١٥) والحاكم في المستدرك (٧٤٣/١)(٢٠٤٦) من حديث ابن عمر بسند ضعيف.

(٢) رواه أبو نعيم في الحلية،( ١٩٧/٨)، بغير ذكر الموت، والبيهقي في الشعب(١٨٥٩)قال الزبيدي (٤٦٥/٤): وفي المعجم الصغير للطبراني ( ٣٠٧/١)(٥٠٩) وجلاءها الإستغفار..

(٣) رواه ابن ماجه (١٣٤٠) وأصله في مسلم (٧٩٢) والأذن: الإستماع.

# ئاسارەكان:

ئەبو ئومامەی باهیلی فەرموویەتی:

**(إقرَؤوا القُرآنَ، ولا تَغُرَّنَّكُم هذهِ المَصاحِف المُعَلَّقة، فإنَّ اللهَ لايُعَذِّبُ قَلباً وَعَى القُرآنَ)**[1]،

واتە: چەندێكتان بۆ كرا قورئان بخوێنن، وانەزانن كە ئەو قورئانەی لەبەرگەكاندا هەڵتان واسیوە، ئیتر ئەوە شەفاعەتتان بۆ دەكات، ئەوەندە بزانن كە خودا دڵێك سزا نادات كە لە قورئان گەیشتبێت و، لەبەری بێت و كاری پێبكات، ئەوەی لەبەری كات و سنوورەكانی ببەزێنێت، ئەوە لێی تێنەگەیشتووە.

هەروەها(حەزرەتی)عەبدوڵلای كوڕی مەسعود فەرموویەتی:

ئەگەر ویستتان زانست وەربگرن، ئەوا ناوەرۆكی قورئان بخوێننەوەو، قووڵ بۆی دابچن، چونكە زانستی یە سەرەتایی و كۆتاییەكان هەمووی لە قورئاندایە[2]،

هەوەهاف قورئان بخوێننەوە، لەبەرامبەری خوێندنەوەی هەر پیتێكی قورئانا، دە چاكەتان بۆ دەنوسرێت، ئەوەش بزانن كە من ناڵێم: (الم) یەك

---

(١) رواه الدارمي في سننه بتمامه، وقال الزبيدي(٤/٤٦٥): هذا الأثر مشتملٌ على ثلاث جُمَلٍ: الاولى: **اقرؤا القرآن**. رواه أحمد ومسلم(٨٠٤) من حديث أبى أمامة مرفوعا بزيادة: **فانَّه يأتي يوم القيامة شفيعا لاصحابه**. الثانية: قوله: **ولا تغرنكم** الى آخر الحديث رواه الحكيم الترمذي في نوادر الاصول(٣/٢٥٣) من حديثه مرفوعا بلفظ: **لا تغرنكم هذه المصاحف المعلقة ان الله لا يعذب قلبا وعى للقرآن**. الثالثة: فان الله لا يعذب الخ رواه تمام الرازى في فوائده (٢/٢٦١(١٦٩٠) من حديثه مرفوعاً بلفظ: **اقرؤا القرآن فان الله تعالى لا يعذب قلبا وعى القرآن**. واذا علمت ذلك: ظهر لك ان هذا الاثر ... ليس بموقوف عليه، بل هو مرفوع الى النبى صلى الله عليه وسلم.

(٢) رواه ابن مبارك في الزهد(٨١٤).

حەرفە، بەڵكوو ئەلف پیتێکەو، لام پیتێکەو، میمیش پیتێکی ترە، [1].

هەوەها فەرموویەتی: با هیچ کەسێك لە ئێوە دەربارەی خۆی پرس بەکەس نەکات جگە لە قورئان نەبێت، ئەگەر قورئانی خۆش دەویست و پێی سەرسام بوو، کەواتە خوداو پێغەمبەری ﷺ خۆش دەوێت، وە ئەگەر ڕقی لە قورئان دەبوویەوە، کەواتە ڕقی لە خودای (عَزَّ وجَلْ) و پێغەمبەر ﷺ دەبێتەوە.[2]،

هەروەها عەمری کوڕی عاص فەرمووی: هەموو ئایەتێك لە قورئاندا کە بیزانیت، پلەیەك بەرزت دەکاتەوە لە بەهەشتدا، تا زیاتربێت بەرزتر دەبیتەوە، وە قورئان چرای ناو ماڵەکانتانە [3]

وە فەرموویەتی: ئەوەی قورئان بخوێنێت، پلەی پێغەمبەرایەتی دەخرێتە نێوانی شانەکانیەوە، تەنها ئەوەیە کە وەحی بۆ نایەت، (واتە: لە ژێر سێبەری پلەی کەماڵی ئەو زاتەدا دەژی)

هەروەها ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ئەو ماڵەی قورئانی خودای تێدا دەخوێنرێت، ئەهلەکەی فراوان دەبن، وە بەرەکەتیان تێ دەکەوێت، وە فریشتەکانیش لەو ماڵەدا ئامادە دەبن، بەڵام

---

(١)) رواه البخاري في تاريخه(٢١٦/١(٦٧٩) والترمذي (٢٩١٠) وقال حسن صحيح غريب، وابن الضريس في فضائل القران (ص/٦٦) والحاكم والبيهقي (٣٢٤/٢(١٩٣٣) عن ابن مسعود مرفوعاً بلفظ: من قرأ حرفا من كتاب الله فله به حسنة. والحسنة بعشر أمثالها، لا أقول الــم حــرف، ولكــن الــف حــرف، ولام حــرف، ومــيم حــرف. ورواه ابــن أبــي شــيبة في المصنف(١١٨/٦(٢٩٩٣٣) و الطبراني في الكبير(٧٦/١٨(١٤١) عن عوف بن مالك الاشجعي مرفوعا بلفظ: **من قرأ حرفا من القرآن كتب له حسنة لا أقول الم ذلك الكتاب، ولكن الالف واللام والميم و الذال واللام والكاف** وروى البيهقي في شعب الإيمان (٣٤١/٢(١٩٨٣) عنه بلفظ: **لا أقول بسم الله، ولكن باء وسين وميم ولا أقول ألم، ولكن ألف ولام وميم.**

(٢) رواه ابن المبارك في الزهد(١٠٩٧)، والطبراني في الكبير ١٣٢/٩ بنحوه وهو في القوت(٥٧/١).

(٣) رواه ابن مبارك في الزهد (٧٨٩).

ئەو ماڵە کیتابی خودای (عَزَّ وجَلْ) ی تێدا ناخوێنرێت، تابێت ئەهلی ماڵ کەم و ژیانیان بەرتەسك دەبێتەوە، وە خێری کەم دەبێت و. مەلائیکە تیایدا دەردەچن و شەیتانەکان جێگەیان دەگرنەوە.[1].

پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرمووی:

لە خەومدا بەخزمەت خودا ﷻ گەیشتم ، عەرزم کرد ئەی پەروەردگارم:

گەورەترین هۆکارم پێ نیشاندە، کە نزیکانی خۆت بە هۆیەوە پێت گەیشتوون؟ فەرمووی: ئەی ئەحمەد، بەهۆی کەلامی منەوە کە (قورئانە) دەفەرموێت: عەرزم کرد: بە تێگەیشتنەوە یان بەبێ تێگەیشتن، فەرمووی: بە تێگەیشتنەوە یان بەبێتێگەیشتن[2]

هەروەها موحەممەدی کوڕی کەعب ی قورەظی فەرموویەتی:

کاتێك ئەو خەڵکە لە دوارۆژدا لە خودای (عَزَّ وجَلْ)ە وە گوێ بیستی خۆێندنەوەی قورئان دەبن، وەك ئەوە وایە کە هەرگیز نەیانبیستبێت، [3].

هەروەها فوضەیلی کوڕی عیاض دەفەرموێت: دەبێ هەڵگری قورئان کاری بە کەس نەبێت، وە داوای لە خەلیفەکان و ئەوانەش لە خواری ئەوانەوەن نەبێت، بەڵکوو دەبێت کارو پێداویستی خەڵکەکە بکەوێتە لای ئەوانەوە[4].

هەروەها دەفەرموێت: هەڵگری قورئان هەڵگری ئاڵای ئیسلامە، لەبەر بە گەورە زانینی مافی قورئان، نابێت لەگەڵ کەسانێکدا کە گەمەو گاڵتە دەکەن ئەویش وەك ئەوان بکات، یان دەنگە دەنگ و هەروا هوریا بنێتەوە، لەگەڵ

---

(١) هەمان سەرچاوە(٧٩٩). وە (٧٩٠) .

(٢) رواه ابن الجوزي في مناقب الإمام أحمد ( ص/٥٢٧) (واتە هەرکەسە بە نیسبەتی زانیاری خۆی لە قورئانەوە دەتوانێت بە خودا بگات و لێی نزیك ببێتەوە)

(٣) رواه مرفوعا الديلمي كما في مسند الفردوس (٩٨١).

(٤) رواه الآجري في أخلاق حملة القرآن(ص/٥٠).

ئەوانەدا قسەی پڕو پوچ و بێبایەخ دەکەن.

وە سوفیانی ثەوری (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: هەر کەس دەستی بە قورئان خوێندن کردو خەتمی کرد، فریشتە ناوچەوانی ماچدەکات[1].

هەروەها عومەری کوڕی مەیموون فەرموویەتی:

ئەوەی پەڕاوی قورئان بکاتەوە لە کاتێکدا کە نوێژی بەیانی دەکات، وە صەد ئایەت بخوێنێت، خودای گەورە بە ئەندازەی کاری خێری هەموو ئەهلی دونیای بۆ بەرزدەکاتەوە[2].

وە دەگێڕنەوە کە خالیدی کوڕی عەقەبە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وە عەرزی کرد: قورئانم بەسەردا بخوێنە، ئەویش ئەم ئایەتەی بۆ خوێند:

﴿ **إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ** ﴾(النحل/٩٠)

کە خودا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکەکردن و، چوون بۆ لای خزمان و بەسەرکردنەوەیان و، نەکردن و دوورکەوتنەوە لە هەموو جۆرەکانی خراپە، فەرمووی: بۆم دووبارە بکەرەوە، حەزرەتیش ﷺ بۆی دوبارە کردەوە، خالید فەرمووی:

وەڵلاهی لەم قوررئانەی کە خوێندتەوە بۆم، پڕیەتی لە شیرینی و پاراوی و ئاواشتەیی، خۆشی خستنە ناو دڵ و، خوارووەکەی پڕیەتی لە ئاوو تەڕایی زۆر و، سەرووەکەیشی لێوانە لە بەرو بوومدا ، وە ئەمە هەرگیز قسەی ئادەمییەکان نیە[3].

---

(١) رواه الدينوري في المجالسة وجواهر العلم (ص/٦٩).

(٢) ذكره الزمخشري في ربيع الأبرار (٢/٣٥٤)

(٣) ابن عبدالبر في الإستيعاب(ص/٢٠٠). وروى البيهقي في الشعب (١٣٣) والقائل عنه وهو المشهور في كتب السيرة :وليد بن المغيرة.

(حەزرەتی) حەسەنی بەصریش فەرموویەتی:

وەڵلاهی ئەوەی قورئانی لا بێت کەس لەو دەوڵەمەندتر نابێت، وەك ئەوەی لێی دووربێت کەس نیە لەو داماوو هەژارو بێدەست تر بێت.

فوضەیلیش (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ئەوەی کۆتایی سوورەتی حەشر لە کاتی بەیانیدا بخوێنێت، وە هەر ئەو ڕۆژەیش مرد، بە پلەو پاداشتی شەهیدەکان دەمرێت، وە ئەوەیش لە کاتی ئێوارەدا بیخوێنێت ئەوا هەمان پلەی شەهیدانی بۆ دەنوسرێت[1].

قاسمی کوڕی عبدالرحمن(خودای لێ ڕازی بێت) فەرمووی:

پرسیارم لە هەندێك لە عابیدەکان کرد، لێرە چی هەیە دڵمانبداتەوە و پێیەوە سەرقاڵ ببین، دەستی درێژکرد بۆ قورئانێك و خستییە باوەشیەوەو فەرمووی: ئەم قورئانەیە[2].

وە (حەزرەتی) عەلی کوڕی ئەبی طالیبیش فەرمووی:

سێ شت هەن توانای لەبەرکردن زیاد دەکەن، وە بەڵغەم لادەبەن، سیواك و ڕۆژوو گرتن و خوێندنەوەی قورئان[3]

---

(١) رواه ابن الضريس في فضائل القرآن (ص/١٧٢)(عن الفضيل عن هاشم عن الحسن، وهو عن الحسن بغير طريق الفضيل. رواه الدارمي في سننه،( ٣٤٦٦ ) قال الزبيدي (٤ /٤٦٨: ) روى مرفوعا من حديث أبي أمامة بلفظ: من قرأ خواتم الحشر من ليل أو نهار، فقبض في ذلك اليوم أو الليلة فقد أوجب الجنة. هكذا رواه ابن عدي في الكامل(٣١٧/٣) وابن مردويه والبيهقي في شعب الإيمان ٤٩٢/٢(٢٥٠١) والخطيب في تأريخ بغداد (٤٤٤/١٢)وبلفظ: من قرأ آخر سورة الحشر فمات من ليلته مات شهيدا هكذا رواه أبو الشيخ.

(٢) الخبر في الرسالة القشيرية (ص/٢٠٠).

(٣) چونکە بەڵغەم ئەو تەڕایی و لینجییەی ناو دەماخ لادەبات و هێزی لەبەرکردن لاواز دەکات، سیواکیش تەڕایی دەماخ لادەبات و ڕۆژوو یش ڕەگەکان دەسڕێت و خوێندنەوەی قورئانیش جەستە دەتوێنێتەوە. بە هەموویانەوە زینی مرۆڤ بەهێز دەکات الإتحاف ٤٦٨/٤.

# سەرەکۆنەکردنی ئەوانەی بە غافڵی قورئان دەخوێننەوە

ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێت: (رُبَّ تالٍ للقُرآنِ والقُرآنُ يَلْعَنهُ)[1]،

واتە هەندێ کەس هەن کە بە ڕواڵەت خەریکی قورئان خوێندنە، کەچی قورئانەکە نەفرەت و لەعنەتی لێدەکات.

هەروەها مەیسەرە فەرموویەتی: ئەوەی بە نامۆو غەریب دەژمێررێت: ئەو قورئانەیە کە لە ناو سك و سینەی کەسێکی زاڵم و خراپەکاردایە[2]،

ئەبووسولەیمانی دارانی فەرموویەتی:

زەبانیەکانی دۆزەخ زووتر و خێراتر پەلاماری کەسێکی هەڵگروحافیزی قورئان دەدەن، کە بێ فەرمانی خودادەکەن، لەوانەی کە بت پەرستن، کاتێك کەتاوانکاری دەکەن لە دوای هاتنە خوارەوەی قورئان بۆ سەریان، بە هەڵگرانی قورئان دەوترێت: ئێوە لێ پرسینەوەتان توندترە لە نەزانەکان[3]،

هەندێك لە زانایان فەرموویانە:

ئەگەر ئادەمییەك قورئانی خوێند و ئیستیقامەتی بوو، خودا بەچاوی ڕەحمەتەوە سەیری دەکات، ئەگەر تێکەڵی کرد و، کردەوەی ناجۆری لەگەڵدا کرد، وە دەستی کردەوە بە خوێندنەوەی قورئان، پێی دەوترێت:

چیتە بەسەر خوێندنەوەی کەلامی منەوە ؟![4]،

---

(١) في صحيح مسلم: (٢٢٣): والقرآن حجةٌ لك أو عليك، وانظر إلى ماروا‌ه ابن الضريس في فضائل القرآن (ص/١٠٤)مرفوعا: يمثل القرآن يوم القيامة رجلا........ الحديث.

(٢) بمعناه مرفوعا عن الديلمي في مسندالفردوس(٤٣٠١).

(٣) رواه البيهقي في الشعب (٢٣٨٢) ورواه مرفوعا أبو نعيم في الحلية( ٢٨٦/٨).

(٤)هذا العالم هو يحيى بن الجلاء، رواه البيهقي في الشعب(٢٣٨٢).

ئیبنو ڕەمماح دەفەرموێت:

پەشیمان بوومەوە لە لەبەرکردنی تەواوی قورئان، لەترسی ئەوەی کە پێم گەیشتووە، ئەوانە هەڵگری قورئانن، بەرپرسیارن و وەك ئەوەی لە پێغەمبەران دەپرسن، ئاوا لە ڕۆژی قیامەتدا پرسیاریان لێدەکرێت.[1]،

عەبدوڵلای کوڕی مەسعودیش دەفەرموێت:

دەبێ هەڵگری قورئان بەوەدا بناسرێتەوە، کە لەکاتی خەوتنی خەڵکیدا لەشەودا، ئەو خەریکی خوێندنەوەو شەو نوێژ بێت. وە لەکاتێکدا خەڵکی بەڕۆژدا شت دەخۆن ئەو بەڕۆژوو بێت. وە بناسرێتەوە بە حوزن و خەفەتیدا کە هەموان شاد وفەرەحناکن، وە بە گریانیدا لەکاتێکدا خەڵکەکە پێدەکەنن، وە بەوەی بێدەنگی هەڵبژێرێت، کە ئەوانیتر ڕۆچووبن لە هەموو بابەتێکدا کە جێگەی بایەخیشیان نەبێت، وە بناسرێتەوە بە گەردنکەچیدا، کە خەڵکی لووت بەرزدەکەنەوە، وە دەبێت هەڵگری قورئان دانا و خۆڕاگر و نەرِوخاوو زۆر بێدەنگ و نەرم ونیان بێت، نابێت وشك و ڕیاکار و دەمەدەمێکەر بێت، یان هاوارکەرێت و قیرە بەسەر خەڵکا بکات و، زوبانی تیژ بێت بەرامبەریان[2]،

هەروەك(حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((أَكْثَرُ مُنافِقِي هذهِ الأُمَّةِ قُرَّاءُها))**[3]،

---

(١) رواه مرفوعا من غير طريق ابن الماح ابن عساكر في تأريخ دمشق ١٧٤/٣٢، وهو في الحلية ٢٨١/٧، من كلام سفيان الثوري بنحوه.

(٢) رواه أحمد في الزهد(٦٤)، من زيادات نعيم بن حداد، وأحمد في المسند(١٧٥/٢).

(٣) رواه الطبراني في مسند الشاميين(١٣٤٥) وأبو نعيم في الحلية(١٧٧/٥، قال العراقي رواه أحمد من حديث عقبة بن عامر في مسنده(١٦٩١٦)وعبد الله بن عمرو في مسنده(٦٥٩٦) وفيهما ابن لهيعة اهـ قال الزبيدي(٤٤٦/٤) ورواه الطبراني في الكبير (٨٤١/٣٠٥/١٧) مثل رواية أحمد ورواه كذلك البيهقي في السنن وفي الشعب(٣٦٣/٥)(٦٩٥٩) عن ابن عمر، ورواه كذلك ابن عدى الكامل(١٥/٦)، في ترجمة الفضل بن مختار، قال الهيثمي في مجمع

واته: زۆربەی دوڕوو و مونافقانی ئەم ئوممەتە، قورئان خوێنەکانیەتی.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(( إقرَإِ القُرآنَ مانَهاكَ، فَإِنْ لَم يَنهَكَ...فَلَستَ تَقرَؤُهُ))**[1]، ئەوەندە قورئان بخوێنەرەوە کە بزانیت لە خراپە دوورت دەخاتەوە. ئەینا ئەوە خوێندنی نیەو نەیخوێنیت باشترە، چونکە هیچ سوودێکت لە خوێندنەوەی نەبینیوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((ما آمَنَ بالقُرآنِ مَنِ استَحلَّ مَحارِمَهُ))**[2]،

بڕوای بە قورئان نیە کەسێك کە قورئان شتێکی حەرام کردبێت و ئەو حەلاڵی بکات.

**هەندێك لە زانایانی سەلەف دەفەرموون:**

---

الزوائد(٦/٢٢٩ــــ٢٣٠)أحد أسانيد أحمد ثقات أثبات، وسند الطبراني فيه الفضل بن المختار، وهو ضعيف. والحاكم في تاريخ نيسابور في ترجمة عبد الله بن خالد وهو ضعيف، ولقتلهم كلهم أكثر من منافقي أمتي وهكذا أخرجه ابن أبي شيبة في المصنف( ٧/٧٩(٣٤٣٣٥).

(١) رواه الطبراني في مسند الشاميين، (٢/٢٨٢(١٣٤٥)من حديث عبدالله بن عمر بسند ضعيف، قال الزبيدي٤/٤٦٩: وكذا أبو نعيم في الحلية(٥/١٧٧) ومن طريقهما أخرجه الديلمي في مسند الفردوس(١/٤٣٣(١٧٦٥) وفيه اسماعيل بن عياش. قال الذهبي في الضعفاء ( ص/٨٥/٦٩٧.) ليس بقوى. وقال ابن عدي في الكامل:١/٢٩١(١٢٧) لا يجتج به، ومما يؤيد معنى ما ذكرته في تفسير الحديث المذكور، وما رواه الطبراني في الاوسط من حديث أنس رفعه: **من قرأ القرآن ... يقوم به آناء الليل و النهار ،يحل حلاله ويحرم حرامه ،حرم الله لحمه ودمه على النار. وجعله رفيق السَّفَرة الكرام .حتى اذا كان يوم القيامة كان القرآن حجة له** ،ورواه نحو ذلك البيهقي من حديث أبي هريرة.

(٢)رواه الترمذي (٢٩١٨). من حديث صهيب، وقال: ليس إسناده بالقوي. قال الزبيدي ٤/ ٤٦٩ ورواه الطبراني في الكبير(٨/٣١(٧٢٩٥) والبغوي و البيهقي في شعب الإيمان(١/١٩٨(١٧٣)وقال البغوي: حديث ضعيف ورواه عبد بن حميدفي مسنده (ص/٣٠٨(١٠٠٣) عن أبي سعيد

بەندەی خودا سورەتێك دەكاتەوە و دەیخوێنێت، فریشتەكان ڕەحمەتی بۆ دەنێرن تا لێدەبێتەوە، وە بەندەی وایش هەیە، سوورەتێك دەكاتەوە نەفرەت و لەعنەتی بۆ دەنێرن تا لێدەبێتەوە، وتیان: ئەمە چۆن وادەبێت؟!

فەرمووی: ئەگەر حەڵاڵەكانی حەڵاڵ كرد و، حەرامەكانی بە حەرام دانا، ئەوە ڕەحمەتی بۆ دەنێرن، ئەگەر بە پێچەوانەی كرد، ئەوا نەفرەتی بۆ دەنێرن[1]

وە هەندێك لە زانایان فەرموویانە: بەندەی وا هەیە قورئان دەخوێنێت و قورئانەكە نەفرەتی لێدەكات و بە خۆیشی نازانێت، بۆ نموونە:

دەخوێنێتەوە: ﴿أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ (هود/١٨)،

واتە لەعنەتی خودا لەسەر زاڵمان و، خۆیشی زوڵمی لە نەفسی خۆی كردووە، نەفرەتی خودای لە سەر درۆزنان كردووە:

﴿فَنَجْعَلْ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ﴾ (آل عمران/٦١)[2]،

هەروەها حەسەنی بەصری ڕوو لە قورئان خوێنەكان دەكات و دەفەرموێت:

ئێوە قورئان خوێندنتان كردووە بە چەند قۆناغێك، شەوانیشتان وەك وشترێك لێ كردووە، سواری دەبن و چەند قۆناغێكی پێدەبڕن، واتە بە شەودا چەند بەشێك لە قورئان دەخوێنن، بەڵام ئەوانەی پێش ئێوە وەك چەند پەیام و نامەیەكی خودا سەیریان دەكرد، كەتەنها بۆ ئەوان هاتبێت، بەشەو دەیانخوێندەوەو زۆر بیریان لە واتاو مەبەستەكانی دەكردەوەو، بە ڕۆژیش هەوڵیان دەدا لە خۆیاندا جێبەجێیان دەكرد

هەروەها عەبدوڵلای كوڕی مەسعود دەفەرموێت:

بۆیە قــورئانیان لەسەر دابەزی كە كــاری پێبكەن، ئەمــانیش تەنها توێژینەوەو لێكدانەوەیان كردووەتە جێگەی كارپێكردنی، كەسی واتان هەیە، لە

---

(١) قوت القلوب ٥٨/١.

(٢) قوت القلوب ٥٨/١.

سەرەتای قورئانەوە تا کۆتاییەکەی دەیخووێنێتەوەو، پیتێکیشی لێ فەرامۆش نەکردووە، بەڵام کاری پێینەکردووە.

وە لە فەرموودەی عەبدوڵلای کوڕی عومەر و جوندوبدا (خودایان لێ ڕازی بێت) هاتووە:

**( لقَد عِشنا دَهراً طَويلاً وأحدُنا يُؤتَى الإيمانَ قبلَ القُرآنِ، فتُنزِلُ السُّورَة علَى محمَّدٍ ﷺ فيتَعلَّم حَلالَها وحَرامَها، وآمِرَها وزاجِرَها، وما يَنبغي أَن يَقِفَ عِندَهُ مِنها.**

**ثُمَّ لَقد رأَيتُ رِجالاً يُؤتَى أَحَدُهُمُ القُرآنَ قبلَ الإيمانِ، فيَقرَأُ مابينَ فاتِحَةِ الكِتابِ إِلى خاتِمَتهِ لايَدري ما آمُرُهُ ولا زاجِرُهُ، ولاما يَنبَغي أَنْ يَقِفَ عِندَهُ مِنهُ، فينثُرُه نَثْرَ الدَّقلِ)**[1]،

واتە: زەمانێکی زۆر ژیاین، کە لە پێشەوە ئیمانمان وەردەگرت، پێش ئەوەی قورئان وەربگرین، واتە:

تا کارمان پێینەکردایەو لەسەر ئایەت و فەرموودەکان کە دەهاتنە خوارەوە لەسەر (حەزرەتی) مەحەممەد ﷺ ڕانەوەستاینایەو حەرام و حەڵاڵەکانی فێر نەبووینایە، وە فەرمانمان بە چی پێدەدات و لەچی دەمانگێڕێتەوە، وە دەبێت لەسەر کامیان بەباشی ڕابووەستین،

( تا ئەمانەمان هەمووی نەکردایە قورئانمان نەدەخوێند)

بەو شێوە گرنگی بە قورئان دەدرا.

بەڵام لە پاشان تاقمگەڵیکی زۆرم بینی، کە لەپێش ئەوە لەبارەی ئیمان و حەڵاڵ و حەرامەوە حاڵی بین، تەنها دەقی قورئانەکەیان لەسەرەتاوە تا کۆتایی دەخوێنند، نەیدەزانی فەرمانی بەچی پێدەداو لەچی دەیگێڕێتەوەو نەهی لێدەکات،

---

(١) رواه الحاكم في المستدرك(٣٥/١) قال الزبيدي(٤٧٠/٤): قال السيوطي في الإتقان( ٢٢١/١) هذا الأثر أخرجه البيهقي في سننه عن علي في قوله تعالى: (**ورَتِّلِ القُرآنَ ترتيلا**)

وه دەبێ لەسەر ئایەتێك ڕابووەستێت و، لێ حاڵی ببێـت و جێبـەجێی بکات، وەك بەرو بوومی ڕزیو و خراپ پرش و بڵاوی پێدەکرد.

**وە لە تەوراتیشدا هاتووە:**

ئەی بەندەکەم : ئایا شەرم لە من ناکەیت؟!

لە هەندێك لە برایانتەوە نامەیەکت بۆ دێت، تۆیش لەسەر ڕێگەیت و بۆی لادەدەیت، وە دادەنیشیت و بەوردی سەیری دەکەیت و، پیت بەپیت دەیخوێنیتەوە، بۆ ئەوەی شتێکیت لێ ون نەبێت.

ئەمەیش پەڕاوو نوسراوی منە بۆ تۆم ناردۆتە خوارەوە، بنوارە چۆن ئامۆژگاری و هەواڵەکانم پێ گەیاندوویت، وە چەندین جار بۆم دوپات کردویتەتەوە، بۆ ئەوەی سەرنجی بەرینی و درێژی بابەتەکان بدەیت، تۆیش پشتی تێ دەکەیت، ئایا منت لا کەم بەها ترە لە هەندێ لە براکانت؟!

ئەی بەندەکەم ؛

هەندێك لە هاوڕێ و برایانت لە پاڵتا دادەنیشن، بە هەموو گیانتەوە ڕوویان تێ دەکەیت و، هەموو گیانت دەکەیت بە گوێ و، بەدڵ گوێی بۆ ڕادەگریت، ئەگەر کەسێك قسەیەکی کرد، یان کارێك هاتە پێشەوەو سەرقاڵت بکات لە قسەکانی، هێمای بۆ دەکەیت:

بێدەنگ بە، وازبهێنە، من وەك دەمبینی بەهەموو گیانمەوە ڕوم لە تۆ کردووەو، گوێم لێ گرتوویت و، تۆیش بەدڵ پشتت لە من کردووەو ئاگات لێم نیە.

ئایا منت لا کەم بایەخترە، لە هەندێك لە براکانت؟![1] .

---

(١) قوت القلوب١/٥٩.

# دەروازەی دووهەم

## لەباسی ئادابە ئاشکراکانی خوێندنەوەی قورئان

## کە دە ئادابی هەیە:

### یەکەم: لە بارەی حاڵی خوێنەرەکەوە:

دەبێ دەستی بەدەستنوێژ بێت، بەشێوەیەکی پڕ لە ئەدەب و هێمنی وە ڕاوەستابێت، یان بە پێوە، یان بەدانیشتنەوە، ڕووە و قیبلە، سەردابخات، نە بەچوارمشقی دابنیشێت و نە شانیش دابدات، وە بۆنی فیزو دەماری لێوە نەیێت [1] بەتەنها دابنیشێت، وەك چۆن لە خزمەتی مامۆستاکەی دادەنیشێت.

باشترین شێوە ئەوەیە ئەگەر لە نوێژدابوو بە پێوە بیخوێنێت، وە لە مزگەوتدا بێت، ئەوە لەگەورەترینی کردەوەکان بۆی دەژمێررێت.

ئەگەر بەبێ دەستنوێژ خوێندی، وە لەسەر جێگەیشدا پاڵ کەوتبوو، ئەوە نیسبەتێك خێری دەگات، بەڵام کەمتر لەوان، وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ﴾ (النساء/١)

کەواتە ستایشی هەموانی کرد، ئەوەی بەپێوە، یان بە دانیشتنەوە زیکری خودادەکەن و قورئان دەخوێنێت، یان بە پاڵکەوتنەوە، بەڵام وەك دەبینیت ڕاوەستانی پێشخستووە، لەپاشان دانیشتن، لەپاشان بە پاڵکەوتنەوە.

(حەزرەتی) عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

---

(١) قاچ نەخاتە سەر قاچ و لاقی بۆ ڕانەکێشێت، وە باشتر وایە خۆی بۆنخۆش بکات و دەم بە سیواکەوە: وەك ئیبن ماجە لە (حەزرەتی) عەلی وە ڕیوایەتی دەکات (خودای لێ ڕازی بێت) کە فەرموویەتی: **(أفواهكم طرقُ القُرآنِ فَطَيِّبوها بالسِّواكِ)**الإتحاف( ٤/٤٧٠)

ئەوەی قورئان بخوێنێت و بەپێوە لە نوێژدا ڕاوەستابێت، بە هەموو پیتێك صەد چاکەی بۆ دەنوسرێت، ئەوەش بە دانیشتنەوە لە نوێژدابیخوێنێت، ئەوا پەنجا چاکەی بۆ دەنوسرێت. ئەوەش کە لە نوێژدا نەبێت و دەستنوێژی هەبێت، ئەوا بیست و پێنج چاکەی بۆ دەنووسرێت، ئەوەش کە قورئان بخوێنێت و دەستنوێژیشی نەبێت، ئەوا دە چاکەی بۆ دەنوسرێت[1].

ئەو خوێندنەش کە لەشەو نوێژدا بێت. خێری لە هەموان زیاترە، چونکە دڵ ئامادەو خاڵی ترە لە خەتەرەو خەیاڵات.

وەك ئەبو زەڕی غەففاری فەرموویەتی:

زۆربی سوجدە بردن لە ڕۆژدایەو، درێژی شەونوێژیش بە پێوە لەشەودایە[2]

## دووهەم: ئەندازەی خوێندنی قورئان:

قورئان خوێنەکان هەر تاقمەو نەریتێکی خۆیان هەیە لە زۆر یان کەم خوێندنی قورئان، هەیانە لە شەوو ڕۆژێکدا خەتمەیەك دەکات، وە هەیانە دووخەتمە دەکات، وە هەیشیانە دەیگەێنێتە سێ خەتمەی تەواو.[3]

وە هەندێکیشیان لە مانگێکدا یەك خەتمەی قورئان تەواو دەکەن.

باشترین حاڵەت کە بۆی بگەڕێتەوە فەرمایشتێکی پێغەمبەری خودایە ﷺ ئەوەی خەتمێکی قورئان بکات لە کەمتر لە سێ ڕۆژدا، ئەوا ناتوانێت لێی تێ بگات، وەك فەرموویەتی: (( مَنْ قَرَأَ القُرآنَ فِي أَقلَّ مِنْ ثَلاثٍ، لَمْ يَفقَهْهُ))[4].

---

(١) بنحوه رواه أبو تمام في فوائده (١٣٠٤) مرفوعا من رواية براء بن عازب.

(٢) قوت القلوب١/٤٦.

(٣) ئیمامی نەوەوی لە الأذكار دا ( ل/١٨٩) فەرموویەتی: هەندێکیش گەیاندوویەتیە هەشت خەتمەی تەواو لە شەوو ڕۆژێکدا. چوار خەتمەی بە شەوداو چواریش لە ڕۆژدا، وەك سەییدی بەڕێز ابن الكاتب الصوفي (خودای لێ ڕازی بێت) هەشت خەتمی کردووە.

(٤) رواه بهذا اللفظ أحمد في مسنده(١٦٤/٢)، وهو بنحوه عند أبي داوود (١٣٩٠).

چونکه زیاتر خەتمی بکات، ڕێگری لێدەکات کە بە تەرتیل بیخوێنێت[1]، هەروەك (حەزرەتی) عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) کاتێك بیستی پیاوێك بەپەلە دەیخوێند وەك بیگلّمێنێت،واتە بە پاراوی و فەصیحی نەیدەخوێندو خێرای دەکرد و ددانیشی بە وشەکاندا نەدەنا، فەرمووی:

( إِنَّ هذا مَا قَرأَ القُرآنَ ولاَ سَكَتَ)[2]، واتە: بەڕاستی ئەم کابرا نەبێدەنگ بووەو هیچ نەخوێنێت، نە قورئانیشی خوێندووەو بۆی بژمێررێت.

وە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا بە عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خودایان لێ ڕازی بێت) کە لە یەك حەفتەدا خەتمەی قورئان تەواو بکات[3]،

هەروەها کەمەڵێك لە صەحابەی کیرام (خودایان لێ ڕازی بێت) لە هەموو جومعەیەکدا جارێك خەتمی قورئانیان دەکرد، وەك (حەزرەتی) عوسمان و زەیدی کوڕی ثابت و عەبدوڵلای کوڕی مەسعود و ئوبەیی کوڕی کەعب (خودایان لێ ڕازی بێت) [4]،

---

والترمذي(٢٩٤٩)، وابن ماجه(١٣٤٧).

(١) **ئیمامی تورمذی فەرموویەتی: هەندێك لە زانایان فەرموویانە: نابێت لە سێ ڕۆژ کەمتر بیخوێنێت. وە هەندێك ڕوخصەتیان داوە، وەك دەگێڕنەوە (حەزرەتی) عوسمان لەیەك ڕکاتی وەتردا خەتمی هەموو قورئانی کردووە، وە سەعیدی کوڕی جوبەیر لە کەعبەدا خەتمی هەموو قورئانی لەیەك ڕکاعەتدا کردووە، وە بەلای ئەهلی عیلمەوە خوێندنەوە دەبێت بە تەرتیل و جوانی بێت**، کەواتە وەك ئیمامی نەوەوی لە الأذكار دا (ل/١٩٠) باسی دەکات،وە لە (التبیان) دا (ل/٨٠) **بە پێی تواناو زانایی و ڕەوانی کەخوێندنی کەسەکان دەگۆڕێت، هەندێکی زۆر تایبەتیش هەن کە دەتوانن لە ساتە وەختێکدا تەواوی قورئان بخوێننەوەو لێیشی تێ بگەن، کات و شوێن بۆ ئەهلوڵلا دێتە پێشەوە، یان درێژ دەبێت.**

(٢) رواه ابن مبارك في الزهد (١١٩٧)،

(٣) رواه البخاري (٥٠٥٤)، ومسلم (١١٥٩) حيث قال رسول الله ﷺ: **(فاقرأْهُ في سَبعٍ وَلاَ تَزِد على ذلِكَ).**

(٤) رواه أبو طالب المكي في القوت( ١/ ٤٥) .

## خەتمی قورئان چوارپلەی هەیە:

خەتمێك لە شەووڕۆژێكدا یەك جار بكرێت، كە هەندێك لە زانایان بەلایانەوە ناپەسەندو مەكرووهە.

وە خەتمێكی قورئان، لە هەموو مانگێكدا جارێك، هەموو ڕۆژێك جوزئێك بخوێنێت، ئەمەش ئەو پەڕی كەمكردنەوەیە، وەك چۆن یەكەمەكە ئەو پەڕی زۆرییە، وە لە نێوانی ئەم دوانەدا دوو پلەی ئاسایی هەیە:

**یەكەمیان:** ئەوەیە كە لە هەفتەیەكدا جارێك خەتمی بكات.

**دووهەمیان:** لە هەفتەیەكدا دووجار خەتمی قورئان بكات، نزیك بێت لە سێجارەوە، وە باشترینیان ئەوەیە كە دوو خەتمە بكات لە هەفتەیەكدا، خەتمەیەك بكات بەشەودا و خەتمەیەكیش بكات بە ڕۆژدا، وە خەتمەی ڕۆژەكە لە ڕۆژی دووشەممەدا بێت، لە دووڕكاتی بەیانیدا، یان دوای ئەوە تەواوی بكات، وە خەتمەی شەوەكەیش بكاتە شەوی جومعەوە، لە دوڕكاتەكەی نوێژی ئێواراندا خەتمی بكات، یان دوای ئەو كاتەیە، بۆ ئەوەی بە هەردوو خەتمەكەوە، پێشوازی لە سەرەتای ڕۆژ و سەرەتای شەو بكات، چونكە فریشتەكان (سەلامی خودایان لەسەر)ڕەحمەتی بۆ دەنێرن تابەیانی، ئەگەر بەشەوا خەتمی كرد، وە ئەگەر بە ڕۆژیشدا كردی، ئەوا ڕەحمەتی بۆ دەنێرن تا ئێوارە، كەواتە بەرەكەت تەواوی شەوو ڕۆژەكە دەگرێتەوە.[(١)]،

**وە ئەندازەی درێژكردنەوەی خوێندنی قورئان:**

بەڕاستی ئەو كەسە ئەگەر لە بەندە تایبەتیەكان بوو، كە سالیكی ڕێگای كاركردن بێت،(كاری تری نەبوو سەرقاڵی بكات) ئەوە نابێت لە هەفتەیەكدا لە دوو خەتمە كەمتربكات، بەڵام ئەگەر لە سالیكانی كاری دڵ و تێگەیشتوانی

---

(١) فقد روى الدارمي في سننه(٣٥١٨) عن عبدة بن أبي لبابة: (**إذا خَتَمَ الرَّجُلُ القُرآنَ بِنَهارٍ، صَلَّت علَيهِ الملائِكةُ حتَّى يُمسِيَ. وإن فرَغ مِنهُ ليلاً، صلَّت علَيهِ الملائِكَةُ حتَّى يُصبِحَ**).

بواری بیرمەندی و فیکر بوون، (لەوانە بوو کە خەریکی هەناسە گرتنەوەو زیکری قەلبی بوو)، یان لەوانە بوو کە سەرقاڵی بڵاو کردنەوەی زانست بوو، ئەوە ئاساییە کە لە حەفتەیەکدا تەنها خەتمەیەك بکات.

وە ئەگەر بیرتیژێکی شارەزابوو لە واتاکانی قورئاندا، ئەوە لە وانەیە لە مانگێکدا خەتمەیەکی بەس بێت، چونکە زیاتر پێویستی بە وەستان و تێڕامان سەرنجدان هەیە لەسەر واتاو دەققەکانی.

## سێیەم: لە شێوەی دابەش کردنی خەتمەکە:

ئەوانەی حەفتەی جارێك خەتمەیەك دەکەن، ئەوا قورئان دەکات بە حەوت (حیزبەوە)بەشەوە:

چونکە صەحابەکان (خودایان لێ ڕازی بێت) قورئانیان کردبوو بە حەوت حیزبەوە،[1]،دەگێڕنەوە کە (حەزرەتی) عوسمان (خودای لێ ڕازی بێت) شەوی جومعەی بە سوورەی (البقرة) دەکردەوە تا سوورەی (المائدة)، وە شەوی شەممە لە (الأنعام)ە وە بۆ (هود)، وە شەوی یەك شەممە، لە (یوسف)ەوە تا (مریم)، وە شەوی دووشەممە لە (طــه) وە بۆ (طسـم ی موساو فیرعەون)، وە شەوی سێشەممە لە (العنكبوت)ەوە تا (ص)، وە شەوی چوار شەممە لە (تنزیل)ە وە تا (الرحمن)، وە لەشەوی پێنج شەممەدا خەتمی تەواوی قورئان کە ماوە بیکات[2]،

وە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودیش دەیکرد بە حەوت بەشەوە نەك بەو ڕێکخستنەی کە باسمان کرد[3]

**وتراوە: کە کۆی حیزبەکانی قورئان حەوت بەشە:**

---

(١) روى ذلك أبو طالب في القوت(١/٤٥).

(٢) رواه أحمد في فضائل الصحابة(١/٥١٧).

(٣) قوت القلوب (١/ ٤٥) .

**حیزبی یەکەم:** سێ سوورەتە، **حیزبی دووهەم:** پێنج سوورەتە، **حیزبی سێیەم:** حەوت سوورەتە، **حیزبی چوارەم:** نۆ سوورەتە، **حیزبی پێنجەم:** یازدە سوورەتە، **حیزبی شەشەم:** سیازدە سوورەتە، **حیزبی حەوتەم:** درێژەکانن، لە سوورەتی (قاف)ە وە تا کۆتایی قورئان، بەم شێوە صەحابەکان (خوایان لێ ڕازی بێت) بەش بەشیان کردووە، وە هەر بەم شێوە دەیانخوێندەوە، وە پێغەمبەر ﷺ لەم بارەوە فەرموودەیەکی هەیە:[1]

ئەم دابەش کردنە پێش ئەوە دێت کە ئەو دابەش کردنە نوێیە بکرێت، وەك پێنج یەکی جوزئێك و، دەیەکی جوزئەکان و، جوزئەکانیش کە بەشێکن لە سی بەشی هەموو قورئان، جگە لەو دابەشکردنانە هەرچی تر کرابێت ئەوە تازە پەیدابووە.

## چوارەم: چونیەتی نوسینەوە و نیشانە لەسەر پیتەکان:

باشتروایە کە بە جوانی قورئان بنوسرێتەوە و ڕوونبکرێتەوە، وە ئاساییە ئەگەر نوختەیشی بۆ بکرێت، یان نیشانەی سوور و جیاکەرەوەی تری بۆ دابنرێت، ئەوە لەلایەکەوە جوانکارییەو، ڕوونکردنەوەیشەو، ڕێگاگرتنیشە لە ئاوازو لەحن و هەڵەکاری بۆ خوێنەری قورئان.

کاتی خۆی حەسەنی بەصری و ئیبنو سیرین(خودایان لێ ڕازی بێت) ئەو دابەشکردنی قورئانەیان بە پێنج یەك و دەیەك و جوزئەکان پێ باش نەبوو[2]، وە دەگێڕنەوە لە شەعبی و ئیبراهی نەخەعی وە کە نوختەکردنی قورئانیان

---

(١)وهو ما رواه أبو داوود (١٣٩٣)، وابن ماجه(١٣٤٥)، عن أوس بن حذيفة، قال: ( **سألتُ أصحابَ رسول الله ﷺ كيف يُحَزِّبونَ القُرآن، ؟ قالوا : ثَلاثٌ، وخمسٌ، وسبعٌ، وتسعٌ، وإحدى عشر، وثلاث عشر، وحزب المفصل وحده**).

(٢) واتە ئەو نیشانانەی کە واتای پێنج یەك و دە یەك و بەشبەشکردن و جوزئەکانی قورئان دەگەیێنن، بنوارە: قوت القلوب(١/ ٤٥) .

به ڕەنگی سوور پێ باش نەبووە، کە کرێیشی لەسەر وەربگیرێت، وە دەیان فەرموو: (**جَرِّدُوا القُرآنَ**)[1]، واتە: ڕوتی بکەنەوە لە شتە زیادەکان، واگومان دەبرێت، کە مەبەستیان ئەوەبوو بێت، ئەو دەرگایە نەکرێتەوە و، هەرکەسە بۆ خۆی داهێنانی زیادی بۆ بکات، وە ئەو دەرگایەش دابخەن، وە پارێزگاری لە قورئان بکەن و، پاسەوانێك بن بە دەوری دا، کە کەس گۆڕانکاری بەسەردا نەهێنێت، بەڵام ئەگەر ئەو زیادکردنانە سەری نەدەکێشا بۆ کارێکی قەدەغەکراو، وە ڕای هەموو زانایانی ئوممەتی ئیسلام لەسەر ئەوە جێگیر بوون کە ئەو جوانکارییەی تێدا بکرێت، ئەوە کارێکی ئاساییە، ئەو جۆرە پەیدابووانە نابنە ڕێگر، چونکە زۆر شتی بیدعەو تازەپەیدابوو هەیە، کە کارێکی جوان و پەسەندن، وەك چۆن لە کردنی تەراویح بە جەماعەت وتراوە، کە (حەزرەتی) عومەر دایهێناوە، وە ئەوە بیدعەیەکی جوان و پەسەندە، چونکە بیدعەی ناپەسەند تەنها ئەو داهێنراوانەیە کە لەگەڵ سوننەتێکی دامەزراوی پێشتردا یەکناگرێتەوەو، دەبێتە جێگرەوەی سوننەتێك و گۆڕانی بەسەردا دەهێنێت[2]

وە هەندێك لە زانایان دەیانفەرموو: من لە پەڕاوێکی قورئاندا کە نوختەی بۆ کرابێت قورئاندەخوێنمەوە، بەڵام بۆ خۆم نوختەی بۆ ناکەم[3].

---

(١) روى هذا بطرق عديدة ، وعن الشعبي وإبراهيم النخعي وغيرهما الكثير، رواه ابن أبي داوود في (المصاحف) (٢/٥١١)(٥٢٨).

(٢) وتراوە: کە بیدعەی موباح و درووست ئەوەیە: کە ئەصڵی شەرع شایەت بێت لەسەر جوانی ئەو کارە، یان بەرژەوەندییەك لە ئارادا بێت کە خراپەو مەفسەدەیەکی پێ لەناو ببرێت، ئەوەیش کە ئێمە باسی دەکەین بەرژەوەندی تێدایە، چونکە قورئانی پێ ڕوون دەبێتەوەو ڕوونکردنەوەیش بەرژەوەندی گشتییە، کەواتە: نوختەو نیشانەکان بیدعەی خراپ نین، الإتحاف:( ٤/ ٤٧٧).

(٣) روى إبن أبي شيبة في المصنف(٣٧١٧٨) عن الشعبي أنه قال: سألهُ عن مصحفٍ منقوط: (**إقرأْ علَيهِ ولاَ تنقُطهُ بيَدِكَ**).

هەروەها پێشەوا ئەوزاعی لە یەحیای کوڕی (أبي الكثير) دەیگێڕێتەوە:

کاتی خۆی قورئان ڕووت بوو لەهەموو زیادەیەك لە پەڕاوەکاندا، یەکەم زیادە کە دایان هێنا، دانانی خاڵی سەر پیتەکانی (باء و تاء) بوو، وتیان ئەوە ئاساییە، چونکە دەبێتە نورێك بۆی و، جیای دەکاتەوە، لە پاشان خاڵی گەورەتریان داهێنا لەسەر کۆتایی ئایەتەکان، وتیان:

ئەمەش ئاساییە، کۆتایی ئایەتەکانی پێدەناسرێتەوە، لە پاشان کۆتایی سوورەت و حیزب و کردنەوەی بابەتەکان و ناوبڕەکانی تریان بۆ زیاد کرد[1]،

ئەبوبەکری هەزەلی فەرمووی: پرسیارم لە حەسەنی بەصری کرد: دەربارەی نوختەو خاڵبەندی بۆ قورئان بە ڕەنگی سوور، فەرمووی:

چۆن نوختەی بۆ دەکەن، وتم: وشەکە سەر و بۆری بۆ دەکەن و نیشانەی بۆ دادەنێن بە عەرەبی، فەرمووی:

هیچ ڕێگرییەك نیە لە ئیعرابکردنی قورئان[2]،

خالیدی حەززائیش فەرموویەتی:

چوومە لای ئیبنوسیرین، بینیم لە مەصحەفێکی نوختە بۆ کراودا قورئانی دەخوێند، کە کاتی خۆی ئەو نوختەکارییەی پێ پەسەند نەبوو[3]،

وە دەڵێن: حەجاجی سەقەفی ئەو بوو کە نەقتەی داهێنا و دایمەزراند بۆ سەر قورئان، وە هەموو قورئانخوێنەکانی ئامادەکرد و، سەرژمێری وشەکان و پیتەکانی قورئانیان کرد و، جوزئەکانیان ڕێکخست و، کردیان بە سی جوزء، چەندین بەشی تریان لێ کردەوە.[1]،

---

(١) الخبر في القوت.١/٤٥، وروى ابن أبي داوود في المصاحف (٤٤٥) عن هاروون بن موسى قال: ( **أوَّل مَن نقَطَ المَصاحِفَ يَحيى بن يَعمُر**).

(٢) رواه الهزليُّ مختزلا عن ابن أبي شيبة في المصنف(٣٠٩٤٣) والخبر في القوت:١/١٧١).

(٣) رواه ابن أبي داوود في المصاحف(٤٦٥) وكراهته لنقطه(٤٥١).

## پێنجەم: جوان خوێندنی قورئان (تەرتیل)

ئەوە کارێکی خێرداره بۆ شێوەی قورئان خوێندن، چونکە ئامانج لە خوێندنەوەیدا وەك ڕوونی دەکەینەوە بیرلێکردنەوەیەتی! کە بە هۆی تەرتیلەوە بەو ئامانجە دەگەیت، بۆیە(أم سلمة)تاریفی خوێندنەوەی(حەزرەتی)پێغەمبەری دەکرد ﷺ، وەك چۆن دەیخوێندەوە، ئاوا بڕگە بڕگەو بە جوانی کە واتاو مەبەستەکانی دەربکەوێت، پیت پیت دەیخوێندەوە[٢]،

عەبدوڵلای کوڕی عەباسیش (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ئەگەر تەنها سوورەتی بەقەرەو ئالی عیمران بە تەرتیل و لەسەر خۆ بە بیرکرنەوە لە واتاکەی بیانخوێنمەوە، پێم باشترەکە هەموو قورئان بە خێرایی و تێکەڵی بێت[٣]،

هەروەها فەرمووی: ئەگەر (إذازلزلت) و(القارعة) بخوێنمەوەو بیر لە واتاکانیان بکەمەوە، پێم خۆشترە بە خێرایی و تێکەڵکردنی هەموو ئایەتی سوورەتە کانی بەقەرە و ئالی عیمران بخوێنمەوە[٤]،

وە پرسیاریان لە موجاهید کرد، دەربارەی دوو پیاو چوونە ناو نوێژەوە، وەك یەك بە پێوە مابنەوە لە نوێژدا، بەڵام ئەوەندە هەیە یەکێکیان تەنها سوورەی(بەقەرە)ی خوێندبێت و، ئەویشیان تەواوی قورئانی لەو نوێژەدا خوێندبێت، فەرمووی: ئەو دوانە وەك یەك پاداشت وەردەگرن.[٥]،

---

(١) قوت القلوب ١٧١/١.

(٢) رواه أبو داوود(١٤٦٦)، والترمذي(٢٩٢٧)، والنسائي(١٨١/٢).

(٣) رواه البيهقي في السنن الكبرى(٥٤/٢).

(٤) رواه ابن أبي شيبة في المصنف(٨٨٢٤) وأبو نعيم في الحلية(٢١٤/٣)، عن محمد بن كعب القرظي، ونسبته إلى ابن عباس (رضي الله عنهما) في القوت:٤٦/١.

(٥) قوت القلوب٤٦/١.

وە بزانە کە تەرتیلی قورئان موستەحەبب و پەسەندکراوە، نەك تەنها لەبەر بیرکردنەوە، ئەو کابرا عەجەمەی کە لە واتای قورئانیش ناگات، واباشە بە هێواشی و تێفکرین و بیرکردنەوەوە بیخوێنێتەوە، چونکە ئەمە زیاتر نیشانەیە لەسەر ڕێزگرتنی قورئان و بەبەهادارکردنی، وە زیاتر کاریگەری لەسەر دڵ دەکات، لە بەپەلەکردن و خێرایی و تێکەڵکردنی وشەو ڕستەکان.

## شەشەم: گریان:

واباشە لە خوێندنەوەی قورئاندا گریانی هەبێت ، وەك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : (( **اتلُوا القُرآنَ وابكُوا، فَإنْ لَم تَبكُوا فَتَباكُوا**)[1]،

واتە: قورئان بە جوانی بخوێننەوە و بگرین، ئەگەر گریانتان نەدەهات، ئەوا گریان بەسەر خۆتاندا بهێنن. هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**ليسَ مِنَّا مَنْ لَم يتَغَنَّ بالقُرآنِ**)[2]،

واتە: لەئێمە نیە ئەوەی بە ئاوازو حوزن و سۆزەوە قورئان نەخوێنێتەوە،

صاڵحی مەری فەرموویەتی: لە خەومدا قورئانم بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ دەخوێندەوە،فەرمووی: ئەی صاڵح؛ ئەمە خوێندنەوەکەی،ئەی گریانەکەی؟[3]

عەبدوڵلای کوڕی عەباسیش (خوایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ئەگەر سوجدەی (سُبْحانَ) تان خوێند، پەلەمەکەن لەسوجدەبردن، تا دەگرین، ئەگەر چاوی هەریەکێك لە ئێوە گریانی نەدەهات، ئەوا با بەدڵ بگری کە حاڵی چی بەسەرهاتووە، با خەفەت و خشووع دایبگرێت،[4]،

---

(١) رواه ابن ماجه (١٣٣٧)، من حديث سعد بإسناد جيد، وقال الزبيدي(٤٧٩/٤) : رواه أبو يعلي الموصلي في مسنده،٤٩/٢(٦٨٩)، ومحمد بن نصر في قيام الليلص/٢٠٠،

(٢) رواه البخاري (٧٥٢٧) من حديث أبي هريرة.

(٣) رواه ابن عساكر في تأريخ دمشق ٨٣/٦٥ عن يزيد الرقاشي، وفي القوت: ٤٧/١/ عن البناني.

(٤) قوت القلوب ٤٧/١.

ڕێگەی چۆنیەتی گریان بەسەرخۆدا هێنان ئەوەیە: کە حوزن و خەفەتێك ڕوبکاتە دڵیەوە، چونکە بەو خەمە کە دایدەگرێت گریانی لێدەکەوێتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی ((إِنَّ القُرآنَ نَزلَ بِحُزنٍ، فإذا قَرَأْتُمُوهُ فَتَحازَنوا))[١].

واتە: قورئان خۆی بە حوزنەوە هاتۆتە خوارەوە، کە خوێنتانەوە حوزن و غەم بهێنن بەسەر خوتاندا.

وە چۆنیەتی خۆخەمبارکردن: دەبێت سەرنج لە هەڕەشەو گوڕەشەکانی قورئان و، لە وەعدو فەرمان و نهییەکانی بدات، خۆی خەفەتبار بکات، بێگومان کاریگەریی لەسەری دەبێت و. گریان ڕووی تێ دەکات، ئەگەر بەم حاڵەشەوە خەفەت و گریان ڕووی تێ نەدەکرد، وەك دڵی خاوەن دڵە صەفادراوەکانی لێ نەدەهات، ئەوکاتە با بگری بۆ ئەو دڵە ڕەقەی کە حوزن و گریانی تێدا نیە، کە ئەمەش گەورەتریت بەڵایە بەسەریەوە.

## حەوتەم: دەبێت مافی ئایەتەکان ڕەچاو بخات:

ئەگەر دای بەلای ئایەتی سوجدەدا، ئەوا پێویستە سوجدە ببات، هەروەها ئەگەر یەکێکی تر ئایەتی سوجدەی خوێندەوە، ئەگەر ئەو کەسە سوجدەی برد ئەمیش بیبات، وە دەبێت لەسەر تەهارەت و دەستنوێژ سوجدە ببات.

وە بزانە کە لە قورئاندا چواردە سوجدەی تێدایە، لە سوورەی حەج دا دووسوجدەی تێدایە، وە لە سوورەی(صاد)دا سوجدەی تێدا نیە[٢].

وە کەمترینی سوجدە ئەوەیە کە: ناوچەوانی بخاتە سەر زەوی، وە تەواوترینیشی ئەوەیە کە (الله أكبر) بکات و ئینجا سوجدە ببات، وە لە

---

(١) قوله إن القرآن نزل بحزن، هو قطعة من حديث ابن ماجه المتقدم، وهو بمعناه عموما، وبلفظ الحزن روى الآجري في فضائل القرآن (ص/٨٠)، مرفوعا: **اقرؤوا القُرآن بحُزنٍ؛ فإنَّهُ نزلَ بِحُزنٍ**).

(٢) واتە: سوجدە واجب نیە، سوجدەیش ببات ئەوە کارێکی باشی کردووە، الإتحاف( ٤/٤٨٠).

سوجدەکەیدا نزابکات، بەو شێوەی کە گونجاو بێت لەگەڵ ناوەڕۆکی ئایەتەکەدا، بۆ نموونە ئەگەر ئەم فەرموودەی خودایەی خوێندەوە: ﴿**خَرُّوا سُجَّدًا وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ**﴾(السجدة/١٥) ئەگەر ئایەتەکانی خودایان بەسەر دا بخوێنرێت، ئەوا سەر دادەخەن و سوجدە دەبەن و، تەسبیحاتی خودا دەکەن و، هیچ فیزو دەمارێکیان نیە کە ڕێگەی سەردانەواندن وملکەچییان لێبگرێت.

بۆ یە لەسوجدەکەیدا دەڵێت: ( **اللهُمَّ اجعَلني مِنَ السَّاجِدينَ لِوَجهِكَ، المُسَبِّحينَ بِحَمدِكَ، وأعوذُ بِكَ أَنْ أكونَ مِنَ المُستَكبِرينَ عَنْ أمرِكَ أَو علَى أَولِياءِكَ**)، خودایە؛ بمگێڕیت لە وانەی لەبەر ڕەزای تۆ سوجدە دەبەن، وە پەنا دەگرم بە تۆ کە لە ڕیزی خاوەن فیزو دەمارەکاندابم، لە بەجێ هێنانی فەرمانی تۆ، یان دۆستەکانی تۆ. وە ئەگەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت:

﴿**وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا**﴾ (الإسراء/١٠٩)

بە ڕودا دەکەون و دەگرین و، زیاتر ترسیان لە حزوری خوادا بۆ پەیدا دەبێت، بۆیە لەم سوجدەدا دەڵێن: خودایە بمگێڕی لەوانەی دەگرین و، ڕوو لە تۆ دەکەن و، ملکەچ و گەردن کەچن لە حزوورتدا.

وە لەم سوجدە بردنەدا ئەو مەرجانەی بۆ نوێژ کردن پێویستە، دەبێ بوونی هەبێت، لە داپۆشینی عەورەت و، ڕوکردنە قیبلەو، پاکی بەرگ و جەستە لە پیسی و بێ دەستنوێژی، ئەوکەسەش کە گوێبیستی ئایەتی سوجدە بێت، وە ئامادەنەبوو ئەو کاتە سوجدە ببات، کە خۆی پاککردەوە و دەستنوێژی گرت ، ئەوکاتە سوجدە ببات، وەك وتراوە:

کەماڵی سوجدەکەیش بەم شێوەیە: دەستەکانی بەرزکاتەوە بۆ وتنی (الله أكبر)، لەپاشان (الله أكبر)ی سوجدەبردن ببات، لەپاشان بۆ هەستانەوەیش (الله أكبر) بکات، لە پاشان سەلام بداتەوە بە هەردوو لادا، وە هەندێکیش خوێندنی (تەحییات) یان زیاد کردووە، بەڵام ئەمە هیچ بنەمایەکی نیە، مەگەر

بەپێوەرو قیاس لەسەر سوجدەی نوێژ، ئەمەیش ڕایەکی دوورە، چونکە تەنها فەرمان بە سوجدەکە دراوە، باوەك فەرمانەکە بجوڵێتەوە، وە تەکبیرەی دابەزین بۆ سەرزەوی نزیکترە لە دابەستنی سەرەتاکەیەوە، بەڵام مەرج نیە، وە ئەوانی تر کە باسکرا دووریەکیان تێدایە، (وە ئەگەر لە نوێژدابوو تەنها بۆ دابەزین و هەستانەوە (الله أكبر) بکات، بێ دەستبەرزکردنەوە، وە دەبێبە تەواوی هەستێتەوەو سوننەتیشە تۆزێکی تریش بخوێنێت ئینجا ڕکوع ببات).

وە ئەوەیش کە ئیقتیدای بە ئیمام کردووە، دەبێ لەگەڵ سوجدەی ئیمامدا ئەویش سوجدە ببات، ئەینا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، ئەگەر نەیشی برد ، ئەمیش سوجدە نەبات، بەڵام ئەگەر بۆ خۆی قورئانی دەخوێند و ئایەتی سوجدەی هاتەپێش و لە دوای ئیمامیشەوە بوو، با سوجدە نەبات.

**هەشتەم: دەبێت لە سەرەتای خوێندنەکەیەوە بڵێت:**

**( أعوذُ باللهِ السَّميعِ العَليمِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم، رَبِّ : أعوذُ بِكَ مِنْ هَمزَاتِ الشَّياطِينِ، وأَعوذُ بِكَ ربِّ أَن يَحْضُرون )** پەنا دەگرم بە خودای بیسەرو زانا، لە شەڕی شەیتانی نەفرەت لێ کراو و دەرکراو لە ڕەحمەتی.

ئەی پەروەردگارم: پەنات پێدەگرم لە قسەهێنان و بردن و خەتەرەو وەسوەسەی شەیتان و ئامادەبوونیان، وە لە پاشان سوورەتی (**قُلْ أعُوذُ بِربِّ النَّاسِ**) و سوورەتی(الحَمْد) بخوێنێت،

وە دوای ئەوەی لە هەرسوورەتێك لێبوویەوە بڵێت: صَدقَ اللهُ تعالی، وبَلَّغَ رسُلُ اللهِ ﷺ ، (**اللَّهُمَّ انفَعنا بهِ، وبارِكْ لَنا فيهِ، الحَمدُ للهِ ربِّ العالَمِينَ، وأَستَغفِرُ اللهَ الحَيَّ القَيُومَ**)[1] خودایە سوودمان پێ بگەیێنە بە هۆیەوە، وە بەرەکەتمان بەسەردا بڕژێنە لەم عیبادەتەدا، حەمدو سەنا بۆ خودای پەروەردگاری هەمو جیهان و داوای لێبوردن و لێخۆش بوون لە خودای بەتواناو

---

(١) قوت القلوب ١/٦٠.

دەسەڵاتدارو هەمیشە زیندو دەکەم.

وە لە کاتی خوێندنی قورئاندا، کە دای بەلای ئایەتی تەسبیحاتدا، با (سبحان الله و الله أكبر) بکات، وە ئایەتی دوعا و لێخۆش بوون بوو، ئەوا نزاو (أستغفرالله) بکات، وە هەر ئایەتێت هیوای تێدا ببێت، ئەوا داوا بکات، وە ترسی تێدا هەبوو، پەنا بەخودا بگرێت، بە زوبان یان بەدڵ ئەو نزایانە بکات، با بڵێت: ( **سُبحانَ اللهِ، نَعوذُ باللهِ، اللَّهُمَّ ارزُقنا، اللَّهُمَّ ارحَمنا**).

(حەزرەتی) حوزەیفە فەرموویەتی: نوێژم لە خزمەت پێغەمبەردا کرد (صەلات و سەلامی خودای لەسەر) دەستی کرد بە خوێندنی سوورەی (البقرة)، نەدەڕۆیشت بەلای ئایەتێکدا باسی عەزاب بکات، یەکسەر پەنای بە خودا دەگرت لە سزای خودا، وە بەلای ئایەتی ڕەحمەتدا داوای ڕەحمەتی دەکرد، وە ئایەتێك باسی پاك و بێگەردی خودای تێدا بێت، ئەوا تەسبیحاتی دەکرد.[1]،

کە لێیش بوویەوە.. با ئەوە بڵێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی خەتمی قورئان دەیفەرموو: خودایە بەم قورئانە گەورەیە ڕەحمم پێبکە، بیگێڕە بە نوورو ڕۆشنایی و پێشەواو ڕەحمەت و ڕێپیشاندەرم، خودایە ئەوەی لەبیرم چووەتەوە بیرم بهێنیتەوە، ئەوەی لێی نازانم فێرم بکەیت، ئەو نیعمەتە بیرژێنە بەسەرمدا کە بەیانیان و ئێواران بیخوێنمەوە، وە بیکە بەبەڵگە بۆم، نەك بیکەی بەشایەت بەسەرمەوە، ئەی پەروەردگاری هەموو جیهانەکان.

**(اللَّهُمَّ ؛ ارحَمني بالقُرآنِ العَظيمِ، واجعَلهُ لي إماماً ونُوراً، وهُدىً ورَحمةً، اللَّهُمَّ؛ ذَكِّرني مِنهُ ما نسيتُ، وعَلِّمني مِنهُ ما جَهِلتُ، وارزُقني تِلاوَتَهُ آناءَ اللَّيلِ وأطرافَ النَّهار، واجعَلهُ حُجَّةً لي يا رَبَّ العلَمين)**[2]،

---

(١) رواه مسلم(٧٧٢)، وابن خزيمة في صحيحه(٦٨٤) بنحوه.

(٢)قال العراقي رواه أبو منصور المظفر بن الحسين الأرجاني في فضائل القرآن وأبو بكر بن الضحاك في الشمائل كلاهما من طريق أبي ذر الهروي من رواية داوود معضلا الإتحاف

## نۆیەم: لەبارەی خوێندنەوە بە دەنگی بەرز:

گومان لەوەدا نیە کەدەبێت ئەوەندە دەنگی بەرزکاتەوە کە خۆی گوێی لێبێت، چونکە خوێندنەوە بریتییە لەوەی دەنگەکە بە بڕگەبڕگە بێتە دەرەوە، پیتەکان دەربکەون، وە پێویستی بە دەنگ هەیە، کەمترینی ئەوەیە کە خۆی گوێی لێوە بێت، ئەگەر گوێی لێ نەبێت ئەوا نوێژەکەی لێ وەرناگیرێت، بەڵام ئەو دەنگ بەرزکردنەوەی کەسێکیتر گوێی لێوەبێت، لەلایەکەوە باشە، وە لە لایەکی تریشەوە خراپە.

بەڵگە لەسەر ئەوەی بە بێدەنگی باشترە: ئەودیە کە لە پێغەمبەر ﷺ ی دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: گەورەیی خوێندنی بێدەنگی بەسەر دەنگ بەرزکردنەوەدا، وەك فەزڵی صەدەقەی نهێنی وایە بەسەر خێرکردنی بە ئاشکرادا، (**فَضلُ قِراءَة السرِ علَى قِراءَةِ العَلانيةِ، كفَضلِ صَدَقَةِ السرِّ على صَدقَةِ العَلانِيَّة**)، وە لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت:

ئەوەی بەدەنگی بەرز قورئان دەخوێنێت، وەك ئەوە وایە کە بە ئاشکرا خێر دەکات، وە ئەوەیش کە بە بێدەنگی قورئان دەخوێنێت، وەك ئەوە وایە کە بە بێدەنگی خێر دەبەخشێتەوە:

**(الجاهِرُ بالقُرآنِ كالجاهِرِ بالصَّدَقَة، والمُسِرُّ بِهِ كالمُسِرِ بالصَّدَقَةِ)**[1]،

وە لە فەرموودەی گشتی دا هاتووە:

کردەوەی نهێنی خێـری زیاترە بە حەفـتا جـار لە کردارێك کە بە ئاشکرا

---

(٤٩٢/٤ )، قال في هذا الحديث الحافظ الإمام ابن الجزري ؒ في النشر في القراءات العشر)، ٤٦٤/٢، وهذا الحديث لاأعلَم ورد عن النبي ﷺ في ختم القرآن غيره، أي تخصيص هذا الدعاء، وإلاً فقد أورد هو نفسه مرفوعات في دعائه ﷺ عند الختم عقب هذا القول.

(١)رواه أبو داوود (١٣٣٣) والترمذي(٢٩١٩) والنسائي(٢٢٥/٣) واللفظ الأول للحديث في القوت (٥٩/١) و بنحوه موقوفاً على ابن مسعود (رضي الله عنه).رواه أبو نعيم في الحلية (١٦٧/٤).

بیکەیت، (( **يَفضلُ عَملُ السِرّ على عَمَلِ العَلانِيَّةِ سَبعينَ ضِعفاً**))[1].

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی ((**خَيْرُ الرّزقِ مايَكفي، وخَيرُ الذِكرِ الخَفيُّ**))[2]، (واتە: باشترینی ڕزقی خودا کە پێت بدات، ئەوەیە کە بەشی ژیانت بکات و لێت زیادوکەم نەبێت، وە باشترینی زیکریش ئەوەیە بە بێدەنگی و پەنامەکی بیکەیت، بۆیە ئەهلی طەریقەت زۆربەیان زیری بێدەنگیان بەلاوە گرنگەو، زیکری قەلبیش هەر لەو فەرموودانەوە سەرچاوەی گرتووە) .

هەروەها لە فەرموودەدا هاتووە: ((**لايَجهَرُ بَعضُكُم علَى بَعضٍ في القِرائَةِ بينَ المَغرِبِ والعِشاءِ**))[3]، واتە: با هەندێکتان لە نێوانی نوێژی مەغریب و عیشادا دەنگ بەسەر ئەوانی ترتاندا بەرز نەکەنەوە .

پێشەوا سەعیدی کوڕی موسەییب شەوێکیان لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ دا گوێبیستی دەنگی عومەری کوڕی عبدالعزیزبوو، کەدەنگی بەرزی کردبوویەو دەنگیشی زۆر خۆش بوو، بە غوڵامەکەی فەرموو: بڕۆ بۆ لای ئەو نوێژکەرە و پێی بڵێ:

با دەنگی نزم کاتەوە، غوڵامەکە وتی: ئەم مزگەوتە پەیوەنداری ئێمە نیە و ئەویش بەشی خۆی هەیە لە مزگەوتدا، لەپاشان سەعید دەنگی بەرزکردەوەو فەرمووی: ئەی ئەوکەسەی کە نوێژ دەکەیت؛ ئەگەر مەبەستت بە نوێژەکەت

---

(١)رواه البيهقي في الشعب(٥٥١)، وبنحوه كذلك عن أبي الدرداء (٦٣٩٤).

(٢) رواه أحمد في المسند(١٧٢/١)(١٤٨٠)، وابن حبان في صحيحه(٩١/٣)(٨٠٩)من حديث سعد بن أبي وقاص، قال الزبيدي(٤٩٣/٤) وكذلك رواه البيهقي في الشعب(٥٤٨).٤٠٦/١(٥٥٢)، وعبد بن حميد في مسنده(ص/١٣٧/٧٦). والعسكري في الأمثال، وابو عوانة كلهم من طريق محمد بن عبد الرحمن بن أبي لبيبة، عن سعد غير انه بتقديم الجملة الثانية على الأولى ومحمد بن عبد الرحمن هذا وثقه ابن حبان، وضعفه ابن معين، وبقية رجاله عند أحمد وابن حبانَ رجال الصحيح، وهذا الحديث قد عُدَّ مِن الحكم والامثال.

(٣) رواه أحمد في المسند(٩٦/١).

ڕەزامەندی خودایە. ئەوا دەنگت نزم کەرەوە، وە ئەگەر خەڵکیشت مەبەستە، ئەوە بزانە ئەوانە لای خودا هیچ کەلێنێکت بۆ پڕ ناکەنەوە، ئیتر عومەری کوڕی عبدالعزیز دەنگی نزم کردەوەو ڕکاتەکەیشی بە خێرایی تەواو کرد، کە سەلامی دایەوە نەعلەکانی هەڵگرت و ڕۆشت، کە لەو کاتەدا ئەمیری شاری مەدینەیش بوو[١]، بەڵگەیش لەسەر باشی دەنگ بەرزکردنەوە ئەوەیە کە:

لە پێغەمبەری دەگێڕنەوە ﷺ کە گوێی لە کۆمەڵێك لە صەحابەکانی بوو بەدەنگی بەرز نوێژیان دەکرد، کارەکەی بە دروست زانین[٢].

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**إذا قامَ أحدُكم مِنَ الليلِ يُصَلِّي، فَلْيَجهَرْ بِقِرائتِهِ، فإنَّ الملائِكةَ وعمَّارَ الدارِ يَستَمعونَ إلى قِرائتهِ ويُصَلُّونَ بِصلاتهِ**))[٣]، واتە: ئەگەر یەکێکتان بەشەودا هەستا نوێژ بکات، با خوێندنەکەی بە دەنگی بەرزبێت، چونکە بە ڕاستی فریشتەکان و ئاوەدان کەرەوەکانی ماڵەکەی گوێیشی لێدەگرن و، بە دوایشیەوە نوێژ دەکەن.

وە پێغەمبەر ﷺ دای بەلای سێ لە ئەصحابەکانیدا، (خودایان لێ ڕازی بێت) هەریەکە بەشێوەیەك بوون، دای بەلای (حەزرەتی)ئەبوبەکردا (خودای لێ ڕازی

(١) قوت القلوب ٥٩/١. وقد روى القاسم بن سلام في فضائل القرآن( ص/١٦٩): **سمع رسول الله ﷺ عبدالله بن حذافة يقرأُ في المسجد يجهرُ بقِرائتهِ في صلاةِ النهار، فقال: ياابن حذافة، سَمِّعِ اللهَ ولاَ تُسَمِّعنا!).**

(٢) حيث روى البخاري(٥٠٤٢)، ومسلم (٧٨٨). عن عائشة (رضي الله عنها) قال: **سمع النبي ﷺ قارئاً يقرأُ مِن الليلِ في المسجدِ. فقال: يرحمه الله، لقد أذكَرَني كذا وكذا آيةً أسقطُها مِن سورة كذا وكذا.** وروى البخاري(٤٢٣٢)، ومسلم(٢٤٩٩) مرفوعا: **إنِّي لأعرِفُ أصواتَ رِفقةِ الأشعَريينَ بالقُرآنِ حينَ يَدخُلونَ بالليلِ**....الحديث

(٣) رواه البزاز كما في مختصر زوائد مسند البزاز(١٥٠١، ١٥٦٢)، وقد رواه ابن أبي الدنيا في (التهجد وقيام الليل)، (ص/٣١) وابن الضريس في فضائل القرآن (ص/١١٦)، موقوفا على عبادة بن الصامت، ضمن حديث طويل عند الجميع.

بێت) بەدەنگی نزم قورئانی دەخوێند، لێی پرسی بۆچی دەنگت نزمە؟ فەرمووی: ئەوەی لە حزوریدا موناجات دەکەم دەنگم دەبیستێت، وەدای بەلای (حەزرەتی) عومەردا (خودای لێ رازی بێت) دەنگی بەرز بوو، پرسیاری لێکرد بۆچی دەنگت بەرزە؟ فەرمووی: ئەوانەی خەوەنوچکە دەیانباتەوە خەبەریان دەکەمەوە و بێداریان دەکەمەوە، شەیتانیشی پێ توڕە و تەنگەتاو دەکەم.

لە پاشان دای بەلای(حەزرەتی)بیلالدا، ئەویش ئایەتێکی لەم سوورەتەو ئایەتێکی لە سوورەتێکی تر دەخوێند، پرسیاری لێ کرد بۆچی وادەخوێنێت؟ فەرمووی: پاك و بۆن خۆش تێکەڵ بەیەکدی دەکەم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەمووتان چاکتان کردو ڕاستیتان پێکاوە (( **كُلُّكُم قَد أَحسَنَ وأَصابَ**))[1]،

کەواتە چۆن دەتوانین ئەم فەرموودانە کۆبکەینەوە و لەیەکیاندەین:

بەڕاستی دەنگی نزم دوورترە لە تێکەڵ بوونی ڕیاو خۆدەرخستن، ئەم شێوە باشترە بۆ کەسێك لە خۆی بترسێت، بەڵام ئەگەر لە خۆی نەدەترسا، وە لە دەنگ بەرزکردنەوەکەیدا نوێژی لە کەسێکی تر تێك نەدەدا، ئەوە دەنگ بەرز کاتەوە خێری زیاتر دەبێت، چونکە کرداری زیاتری تێدایە و، کەسانێکی تریش سوودی لێ وەردەگرن، خێرێك کە تەشەنەبکات و سنووری خۆی تێ بپەڕێنێت باشترە لەو خێرەی کە وەستاو بێت و لە خاوەنەکەی جودا نەبێتەوە، هەروەها دڵی قورئان خوێنەکەیش دەکاتەوەو، زیاتر کۆی دەکاتەوە، کە بیر لە واتاکانی خوێندنەوەکەی بکاتەوە، وە بە چاکتر گوێی بە دەنگی خۆیەوە دەبێت، وە خەویش لە خۆی دوور دەخاتەوەو، چالاکی بەهێز تر دەبێت بۆ خوێندنەوە، وە تەمبەڵیشی کەمدەبێتەوە، وە کەسێکی نوستوویش بە ئاگادێنێتەوە، یان کەسێکی بێئاگا چالاك دەکات و، وای لێدەکات کە حەز بە خزمەتی زیاتر بکات.

ئەگەر هەندێك لەم نیەتە باشانەی لەدڵا گەلاڵە ببێت، ئەوە بەرزکرنەوەی

---

(١) رواه أبو داوود (١٣٣٠)، وهو في القوت ١/٥٩.

دەنگ خێری زیاترە بۆی، وە چەندێك نیەتە باشەكانی زیاتر لا كۆبوبێتەوە، پاداشتیشی چەند قات زیاد دەكات، وە زۆری نیەتی خێر، كرداری پیاوچاكان پاڵفتەو خێردارتر دەكات، پاداشتی زیاتریان بۆ دەنوسرێت،كەواتە ئەگەر لە تەنها یەك كرداردا دە نیەتی باشی هەبوو، ئەوە دە پاداشتی چاكی بۆ دەژمێررێت.

بۆیە دەڵێین: خویندنەوەی قورئان لە ناو مەصحەفەكەدا خێری زیاترە، چونكە كاری بینین و هەڵگرتنیشی تێ دەگەوێت، بۆیە پاداشتەكەیشی زیاتر دەبێت، وەك وتراوە: خەتمەیەك لە ناو قورئانەكەدا بیكەیت، بە حەوت بەرامبەرە كە تەنها لەبەر بیخوێنیت، چونكە سەیركردنی قورئانەكە بۆ خۆی بە عیبادەت بۆت دەنوسرێت[1].

وە(حەزرەتی)عوسمان دوومەصحەفی پیرۆزی ئەوەندە خوێندبوویەوەو گرتبوونی بەدەستیەوە كۆن و دڕا بوون،(وە ڕۆژی شەهیدبوونیشی خوێنی ڕژایە سەر مەصحەفەكەی كە تیایدا دەیخوێندەوە،ڕژایەسەر ئایەتی﴿**فسيكفيكهم الله**﴾.

وە زۆر لە صەحابەكان لە ناو قورئانەكەدا دەیانخوێندەوە، وە بەلایانەوە ناپەسەندبوو ڕۆژێكیان بەسەردا تێ بپەڕێت و سەیری ناو قورئان نەكەن[2].

فوقەها و شەرع زانەكانی میصر، لە بەرەبەیانێكدا چوونە خزمەتی ئیمامی شافیعی یەوە، مەصحەفێكی بەدەستەوە بوو، شافیعی پێی فەرموون:

---

(١) قوت القلوب١/٦١. قال النووي في الأذكار ص/١٩٨: **قراءة القرآن في المصحف أفضل من القراءة في حفظه**، هكذا قاله اصحابنا والسلف أيضا، ولم أر فيه خلافاً، قال: ولو قيل انه مختلف باختلاف الاشخاص فيختار القراءة فيه لمن استوى خشوعه وتدبره، لو قرأ من المصحف لكان هذا قولا حسنا اهـ قال السيوطي وحكي الزركشي في البرهان ما يحثه النووي قولا ، وحكي معه قولا ثالثاً: **ان القراءة من الحفظ أفضل مقاما لأنه يحصل له من التدبر والتفكر وجمع القلب والبصر أكثر ممّا يحصل له من المصحف**. وان ابن عبد السلام اختاره، لان فيه من التدبر ما لا يحصل بالقراءة من المصحف اهـ

(٢) قوت القلوب١/٦١.

زانستی (فیقه)له قورئان خوێندن دووری خستوونەتەوە، من کە نوێژی بەیانی دەکەم تا دونیا ڕۆشن دەبێتەوە لە خزمەتی قورئاندا دەبم و دایناخەمەوە[1]

## دەیەم: هەوڵی جوان خوێندنەوەی قورئان بدات و بە

لەراندنەوەی دەنگی، بەبێ درێژکردنەوەی زیادو ڕەچاو نەخستنی ئادابی تەجوید:

ئەمە سوننەتە، بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (( **زَيِّنوا القُرآنَ بِأَصواتِكُم**))[2]، واتە: قورئان جوان بکەن و جوانیەکەی دەربخەن بە دەنگە خۆشەکانتان بیرازێننەوە . هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((**ما أَذَنَ اللهُ لِشَيءٍ أَذَنَهُ لِحُسنِ الصَّوتِ بالقُرآنِ**)[3]،

واتە: خوای گەورە گوێی بۆ هیچ دەنگێ نەگرتووە، بەو ئەندازەی کە گوێ بۆ دەنگێکی خۆش دەگرێت کە قورئان دەخوێنێت.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**ليسَ مِنَّا مَن لَم يَتَغَنَّ بالقُرآنِ**))[4]، ئەو کەسە لە ئێمە نیە کە بە زانینی قورئان و لەراندنەوە و چاك خوێندنی خۆی خەریك نەکات.

وتراوە: کە مەبەست ئەوەیە ئەو کەسە لە ئێمە نیە ئەگەر بیزانێت و خۆی بە دەوڵەمەند نەزانێت، یان ئاوازەکان و لەراندنەوەی جوانی قورئان فێر نەبێت و بەکاریان نەهێنێت، ئەم واتایەش زیاتر لە زمانەوانیەوە نزیکە[5].

---

(١) روا أبو داوود في مناقب الشافعي ( ١٦٠/٢).

(٢) رواه أبو داوود (١٤٦٨)، والنسائي (١٧٩/٢)، وابن ماجه (١٤٣٢).

(٣) رواه البخاري (٥٠٢٣)، ومسلم(٧٩٢)، ولفظه: **ما أذن اللهُ لشيءٍ كأذَنهِ لِنبيٍ يَتَغنَّى بالقُرآنِ يَجهَرُ بهِ.**

(٤) رواه البخاري (٧٥٢٧).

(٥)أما معنى الإستغناء فقد رواه البيهقي في السنن الصغرى(٣٥٢/١) عن سفيان بن عيينة، وأعقبه بقول الشافعي: نحن أعلَم بهذا، لو أراد النبي ﷺ الإستغناء به، لقال: ليسَ مِنا مَن

دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ شەوێکیان چاوەنوارِی (حەزرەتی) عائیشە دەکرد، (خودای لێ ڕازی بێت) ئەویش خێرای نەکرد لە هاتن، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:

((ما حبَسَكِ؟ قالك يارسوُلَ اللهِ : كُنتُ أَستَمِعُ قِراءَةَ رَجُلٍ ما سَمِعتُ أَحسَنَ صَوتاً مِنهُ، فقامَ رسولَ اللهِ ﷺ حتَّى استَمعَ إِلَيهِ طويلاً،ثمَّ رجعَ فقال ﷺ : هذا سالِمٌ مَولَى أَبي حُذَيفَةَ. الحَمدُ للهِ الذي جعَل في أُمَّتي مِثلَهُ))(١).

ئەوە چی دوای خستی؟ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ؛ گوێم لە قورئان خوێندنی یەکێك دەگرت، تا ئێستە دەنگی ئەوەندە خۆشم نەبیستووە، پێغەمبەریش ﷺ هەستاو ماوەیەکی زۆر گوێی لێگرت و گەڕایەوەو فەرمووی: ئەوە دەنگی سالمە، مەولای ئەبو حوزەیفە، سوپاسی خودا دەکەم کە لە ناو ئوممەتەکەمدا نموونەی وەك سالمی تێدایە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ شەوێکیان گوێی گرت لە دەنگی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود، کە (حەزرەتی) ئەبوبەکرو عومەری لە خزمەتدا بوو، ماوەیەکی زۆر وەستان و لە پاشان پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((مَنْ أَرادَ أَنْ يَقرَأَ القُرآنَ غَضّاً كَمَا أنزلَ.. فَلْيَقرَأْهُ علَى قِراءِةِ ابنِ أُمِّ عَبدٍ))[٢]،

ئەوەی دەیەوێت قورئان بە تەواوی و پاراوی و تەڕوبڕیەوە بیخوێنێتەوە وەك

---

لَم يَستَغنِ بالقُرآنِ، فلما قال: **ليس منا من لم يتغنَّى بالقُرآنِ**، علِمنا أن التَّغَنِّيَ بهِ، ومع ذلك فقد نقل الأزهري في تهذيبه(غنَى) عن أبي عبيد في تأييد هذا حيث قال: (قال أبو عبيد: وهذا كلام جائز فاشٍ في العرب، يقولون تغنيت تغنياً، وتغانيت تغانياً، بمعنى استَغنيتُ، وكذاقد روى البيهقي في الصغرى(٣٥٢/١) عن الشافعي قال: **معناه يقرؤون حدرا وتحزينا)**

(١) رواه ابن ماجه (١٣٣٨) ورجال إسناده ثقات. قال الزبيدي (٤٩٨/٤): حديث حسن أخرجه عبدالله بن المبارك في كتاب الجهاد (ص/٩٩(١٢٠).

(٢) رواه النسائي في السنن الكبرى(٨٢٠٠)و( ٧١/٥(٨٢٥٧) وهو عند أحمد في المسند /٢٥)(١٧٦) وعند ابن ماجه(١٣٨)مرفوعا دون القصة. وللترمذي(١٦٩) وقال: حسن صحيح

چۆن هاتۆته خوارەوە، با لەسەر شێوەی خوێندنەوەی کوڕی(أم عبد) بیخوێنێت.

هەروەها پێغەمبەرﷺ بە ئیبنو مەسعودی فەرموو:

قورئانم بۆ بیخوێنەرەوە: فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا؛ بۆتۆی بیخوێنمەوە لە کاتێکدا بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە؟! فەرمووی: ((**إِنّي أُحِبُّ أَن أَسمَعُهُ مِن غَيرِي**)) من حەز دەکەم لە غەیری خۆیشم بیبیسمەوە، ئیتر بۆی دەخوێندەوەو چاوەکانی پێغەمبەرﷺ فرمێسکیان پیا دەهاتە خوارەوە.[١]،

هەروەها پێغەمبەرﷺ گوێی گرت لە خوێندنەوەی ئەبوموسای ئەشعەری و فەرمووی: ((**لَقَد أُوتِيَ هذَا مِزمَاراً مِن مَزامِيرِ آلِ داوود**))بەڕاستی ئەوەندە دەنگی خۆشە، بەشێك لە ئاوازو دەنگی شیرین و خۆشی ئالی داوود پێغەمبەری وەرگرتووە، کە (حەزرەتی) داوود بە ناوبانگ بوو بە دەنگ خۆش.

ئەبو موسا کاتێك ئەم فەرموودەی پێ گەیشت فەرمووی: ئەگەر بمزانیایە ئەی پێغەمبەری خودا تۆ گوێت لێ گرتووە، دەنگم خۆشتر دەکرد.[٢]

هەیسەمی قورئانخوێن لە خەودا بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گەیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێی: تۆ هەیسەمی کە بەدەنگە خۆشەکەت قورئانت جوان کردووە؟ فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: خودا پاداشتی بە خێرت بداتەوە[٣]،

لە فەرموودەدا هاتووە: ئەصحابەکانی پێغەمبەر ﷺ کە کۆبوونایەتەوە، فەرمانیان دەدا بە یەکێکیان کە سوورەتێکی قورئانیان بۆ بخوێنێتەوە[٤]،

---

(١) رواه البخاري(٤٥٨٢)، ومسلم(٨٠٠).

(٢) رواه البخاري (٥٠٤٨) ومسلم(٦٩٣)، وقول أبو موسى من زيادة البرقاني كما في الجمع بين الصحيحين(٣١٥/١).

(٣) رواه ابن أبي الدنيا في المنامات، (٢١٦) وهو الهيثم بن اليمان الرازي.

(٤) قوت القلوب٦٠/١.

کاتی خۆی (حەزرەتی) عومەریش دەیفەرموو بە ئەبو موسا (خودایان لێ ڕازی بێت): خودامان بیر بخەرەوە، ئەویش دەستی دەکرد بە قورئان خوێندن، تاوای لێدەهات کە کاتی نوێژکردن خەریك بوو نیوەی دەڕۆیشت، عەرزیان دەکرد ئەی فەرماندەی موسوڵمانان کاتی نوێژە، نوێژ درەنگە، ئەویش دویفەرموو: ئەی ئێمە لە ناو نوێژدانین؟!

ئەمەش هێمایە بۆ فەرموودەی خودا: ﴿وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ﴾ (عنكبوت/٤٥) [١]،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((مَنِ اسْتَمعَ إِلَى آيَةٍ مِن كِتابِ اللهِ (عَزَّ وجَلْ) كانَت لَهُ نوراً يَومَ القِيامَة))**[٢]،

واتە: ئەوەی گوێ لە ئایەتێکی قورئان و پەڕاوی خودای (عَزَّ وجَلْ) بگرێت، ئەوە بۆی دەبێتە نورێك لە ڕۆژی قیامەتدا ڕێگەی پێدەردەکات. وە لە فەرموودەی تریشدا هاتووە:

دە چاکەی بۆ دەنوسرێت : **((كُتِبَ لَهُ عَشرُ حَسَناتٍ))**[٣]،

وە هەرچەندێك خێری گوێ گرتن لە قورئان زۆر بێت، وە قورئان خوێنەکە هۆکاری ئەو پاداشتە زۆرە بێت، خۆیشی بەشدارە لەو پاداشتەدا، مەگەر بە مەبەستی ڕیاو ناوبانگ و خۆ دەرخستن ئەو قورئانەی خوێندبێت.

---

(١) هەمان سەرچاوە.

(٢) رواه أحمد في المسند(٣٤١/٢)، والدارمي في سننه(٣٤١٠).

(٣) قوت القلوب ٦٠/١، وانظر الإتحاف( ٥٠٠/٤). قال العراقي رواه احمد من حديث ابي هريرة **من استمع الي آية من كتاب الله كتب له حسنة مضاعفة ومن تلاها كانت له نورا إلى يوم القيامة** ،وفيه ضعف وانقطاع، قال الزبيدي(٥٠٠/٤ ) قال الهيثمي في مجمع الزوائد (١٦٢/٧) فيه عباد بن ميسرة ضعفه أحمد وغيره، ورواه ابن عدي في الكامل (٣٨٧/٢) والبيهقي من حديثه: **من استمع حرفا من كتاب الله طاهرا كتب له عشر حسنات، ومحيت عنه عشر سيئات، ورفعت له عشر درجات**، الحديث... وروى الديلمي عن أنس: **من استمع الى كتاب الله كان له بكل حرف حسنة** اهـ

# دەروازەی سێیەم

## لەو کردارە شاراوەنەی کە لە خوێندنەوەی قورئاندا دەبێ ڕەچاو بخرێن

## ئەوەیش دە کردارە:

**تێگەیشتنی ئەصڵی کەلامی خودا، بەگەورەزانینی قسەکردن و فەرموودەی خودا، ئامادەکردنی دڵ لە خوێندنەوەی قورئاندا، بیرلێکردنەوەی، تێگەیشتنی لە واتاکەی. وازهێنان لەو شتانەی دەبنە ڕێگر بۆ تێگەیشتن، وە لەبارەی تایبەتمەندی کردن. وە کاریگەربوون پێی، وەبەرزبوونەوەی پلەو پایە، لە پاشان دەستبەردار بوون لەقورئان.**

### یەکەم: تێگەیشتن لە گەورەیی و بەرزی کەلامی خودا:

وە فەزڵ و میهرەبانی پەروەردگار بەو خەڵکە. کە لە لە عەرشی بەرینی جەلالی خۆیەوە هێناویەتییە خوارەوە، بۆ ئەو پلەی کە هەموان لێی حاڵی بن:

با بنوارێت، چۆن لوتفی لەگەڵ دروستکراوەکانیدا کردووە، واتای فەرموودەکانی پێ گەیاندوون، کە صیفەتێکی ئەزەلی و قەدیمەو، بە زاتی خوداوە ڕاوەستاوە، وای لێ کردووە خەڵکەکە لێی حاڵی بن، وە چۆن ئەو صیفەتە لێیان ئاشکرا بووە، لە شێوەو بەرگی چەندین دەنگ و پیتدا، کە ئەو پیت و دەنگانە لە صیفەتی ئادەمییەکانن، چونکە هەرگیز ئادەمی ناتوانێت لە حەقیقەتی صیفەتەکانی خودا حاڵی ببێت، مەگەر بەهۆی صیفەتە تایبەتیەکانی خۆیەوە نەبێت، وە ئەگەر خۆشاردنەوەی حەقیقەتی جەلال و قەدرگرانی وشەو

کەلیماتی پیرۆزی خودا بەو بەرگی پیت و حرووفانەوە نەبوایە، هەرگیز نەدەکەوتە بەرگوێتەوە بۆ بیستنی کەلامی خودا. شایەتێك هەبێت لە عەرشەوە یان لە خواری زەوییەوە.

خۆ ئەگەر وەك خۆی فەرمایشتی بکردایە، لە گەورەیی دەسەڵات و هێزی کەلامی خودا، نە عەرش و نەزەوی و جێگا خواروەکان هیچیان خۆیان ڕانەدە گرت و، هەمووی دەپووکانەوە. خۆ ئەگەر خودا ﷻ (حەزرەتی) موسای ڕاگیر نەکردایە(سەلامی خودای لەسەر)، نەیدەتوانی گوێ بیستی فەرموودەکانی خودا ببێت، وەك چۆن کێوەکە خۆی ڕانەگرت لەبەردەم بەشێك لە سەرەتاکانی تەجەللیاتی خوداییدا، وە هەپروون هەپروون بوو.

وە ناتوانین لە باسی گەورەیی کەلامی خودا حاڵی ببین، مەگەر بە هێنانەوەی چەند نموونەیەك لەسەر ئاستی تێگەیشتنی خەڵکی.

بۆیە هەندێك لە عاریف و خوداناسان فەرموویانە:

هەموو پیتێك لە کەلامی خودا لە ناو ( لوح المحفوظ)دا گەورەترە لە کێوی قاف.(کە گەمارۆی هەموو دونیای داوە)،[1] وە ئەگەر هەموو فریشتەکانی خوداکۆببنەوە، بۆ هەڵگرتنی تەنها یەك پیتی قورئان ناتوانن، تەنانەت ئیسرافیل(**علیه السلام**)کەمەلائیکەی(لەوحی مەحفوزە)کە لەوحی پارێزراو لە کێوی قاف گەورەترە، تەنها ئەو دێت و هەڵیدەگرێت و، بە ئیزن و ڕێگەپێدان و ڕەحمەتی خودا دەیجوڵێنێت، نەك بە هێزو توانای خۆی، بەڵام خودای (عَزَّ وجَلْ) ئەو تواناو هێزەی پێدەدات و، بۆ ئەو مەبەستە بەکاری دەهێنێت[2]،

بەڕاستی هەندێك لە حوکەماکان دەربڕینێکی جوان و ناوازەیان هەبوو، لە

---

(١) وهو جبل محيطٌ بالأرضين السبع عندهم. روي في ذكره وبيانه آثاراً عن السلف أبو الشيخ في العظمة (١٤٨٤/٤_١٤٩١).

(٢) قوت القلوب( ٤٧/١ )

دەرخستنی شێوەی گەیاندنی واتای کەلام و، دەربڕینی خودا لەگەڵ بەرزی پلەو مقامی ئەو، بۆ ئاستی تێگەیشتنی ئادەمییەکان، لەگەڵ نزمی پلەی ئەمان، وە نموونەیەکی دیکەی بۆ هێنانەوەکە پڕ بەپێستی بابەتەکەیە بەوەی کەئەو زانا پەندیارە، پادشایەکی بانگهێشت کرد بۆ شوێن کەوتنی شەریعەتی یەکێك لە پێغەمبەران،(صەلات و سەلامی خودایان لەسەر) مەلیکەکە هەندێك پرسیاری لێ کرد، ئەویش بەو شێوەی لە توانای ئەودابێت، کە تێی بگات وەڵامی دایەوە:

گەلیك پرسیاری کرد: دەبینی ئەو کەلام و فەرموودانەی کە پێغەمبەران هێناویانە، ئەگەر بڵێیت: ئەوە کەلامی خەڵکی نیە، وە کەلامی خودایە، دەی ئەو خەڵکە چۆن دەتوانن کەلامی خودا هەڵبگرن؟!

حەکیمەکە فەرمووی: ئێمە خەڵکەکەمان بینیوە، لە کاتێکدا ویستیان کە هەندێك لە ئاژەڵ و پەلەورەکان تێ بگەیێنن ، کە چۆن بچنە پێشەوە، یان بۆ دواوە بگەڕێنەوە، یان بەلای ڕاستدا یان چەپدا بڕۆن، بەرەو ڕوویان بێن، یان بگەڕێنەوە دواوە، وە بینیشمان وڵاخ و ئاژەڵ و گیانلەبەرەکان توانای ئەوەیان نیە کە لە قسەی ئادەمییەکان تێ بگەن، کە بەهۆی نووری ناو دڵیانەوە قسەکانی پێدەکەن، لەگەڵ بوونی جوانکاری و ڕێکخستن و هۆنینەوەیدا، کە ئاژەڵەکان لەمان تێنەگەن، دەبێ ئەمان خۆیان دابەزێننە ئاستی تێگەیاندنی ئەوان، کە مەبەستەکانیان بخەنە ناو سینەی ئاژەڵ و گیاندارەکانەوە، بە داهێنانی کۆمەڵە دەنگێك کە شیاوە لەگەڵ سرووشتی ئەواندا، وەك دەنگی قیڕەو بۆڕەو زیکەو فیکەکردن، کە نزیکن لە دەنگی گیاندارەکانەوە، کە دەتوانن وەری بگرن و هەڵیشی بگرن،

هەروەها ئەم خەڵکەیش، ناتوانن کەلامی خودا ﷻ وەك خۆی وەربگرن و هەڵبگرن، بە ئەصڵی حەقیقەت و صیفەتی کەماڵی ئەو کەلامە بەرزەیە، بۆیە لەسەر ئەو حاڵەتەی کە خۆیان پێی داهاتوون و لێی تێدەگەن، حیکمەتی لەبن نەهاتووی پەروەردگاریان پێ وەرگرتووە، وەك چۆن ئاژەڵەکان بە هۆی فیکەو

دەنگی تایبەتییەوە، قسەی خەڵکەکەیان بیست و توانییان هەڵی بگرن، وە ئەمەش نەبووە ڕێگر لەوەی کە کەلامی خودا لەگەڵ ئەوەدا کە بەرگێکی پەیدابووی کراوە بەبەردا، ڕێگر نیە لەبوونی حیکمەت و پەندیاری و صیفەتە نایابەکانی خودایی، لە دووتوێی قسە ئاساییەکاندا، بەشێوەیەك کە قسە ئاساییەکانیش بە هۆی کەلامی خوداوە شەرەفیاب بوون و، ڕێزێکی تایبەتیان پێ بەخشراوە. کەواتە دەنگەکان بۆ حیکمەتەکان بوونە جەستەو نیشتیمان و جێی حەواندنەوەیان، وە حیکمەتەکانیش بوون و هەناسەو ڕۆح و گیانیان بە وشەکان بەخشی.

وەك چۆن جەستەی مرۆڤ ڕێزلێگیراوەو بەبەرزی سەیردەکرێت، چونکە ڕۆحی تێدا جێگیرە، هەر بەو شێوەیش دەنگ و پیتەکانە کەلامی خودا (کە ئەصڵی کەلامەکەیش نین) شەرەف و ڕێز پەیدا دەکەن، چونکە ئەو حیکمەتە گرنگەیان لە ناخدا بەرجەستەبووە، کەلامیش شوێن و جێگەیەکی بەرزو، پلەو مقامێکی باڵای هەیە، دەسەڵاتەکان دەشکێنێت، لە هەموو کارێکی حەقق و باتیڵدا فەرمانی بەجێ یەو قسەی دەڕوات، دادوەرێکی دادپەروەرە و حاکمێکی عادلە، شایەتێکی وەرگیراوو جێگای ڕەزامەندییەو، فەرمان دەدات و نەهی و فرمانی نەکردن بەدەست خۆیەتی، وە هەرگیز باتیڵ و ناڕەوا ناتوانێت بەرامبەری لە گەڵ کەلامی پڕ حیکمەتی خودایی دا بکات، وەك چۆن سێبەر ناتوانێت لەبەردەم تیشکی ڕۆژ و هەتاودا ڕابووەستێت و ڕێگری لێبکات، هەروەها ئادەمی ناتوانێت خۆی بهاوێتە ناوکرۆك و ناواخنی پەرە شاراوەکانی حیکمەتەوە، وەك چۆن ناشتوانێت چاو ببڕێتە ناو قوڵایی تیشکی هەتاوەوەو بە ناخەکەی بگات، لەگەڵ ئەوەشدا بە پێی پێداویستی سوود لە ئەصڵی خۆر وەردەگرن، ئەوەندەی چاویانی پێ زیندوبێت و بژێتەوە دەبینن و سوودی لێ وەردەگرن، کەواتە: کەلامی خودا وەك ئەو پادشایەك وایە، کە ڕوخساری لە خەڵکی نادیارە و، لەودی و پەردەی بینینەوەیەو، فەرمانەکانیشی هەمیشە

لەبەرچاوە، هەروەها وەك ئەو خۆرە وایە، کە ئاشکراو دیارە و لەبەرچاودایە، کەچی ڕەگەزەکانیشی شاراوەیەو نابینرێت، وەك ئەو ئەستێرە وایە کە خەڵکی ڕێگەی خۆیانی پێدەردەکەن و دەبێتە ڕێنومایی بۆیان، کەچی کەسیش ناتوانێت ئەمسەرەو سەری ڕۆشتن و سنوورەکانی دیاری بکات.

وە بشزانە کە کەلامی خودا لەمانە هەمووی بەڕێزو شەرەفمەندترەو کلیلی گەنجینە نایاب و بەنرخەکانە، وە شەراب و ئاوی ژیانی نەبڕاوەیە، ئەوەی کە لێی بخواتەوە هەرگیز نامرێت، وە دەبێتە دەرمانی هەموو دەردەکانی و، ئەوەی لێوانێکی لێبخوات هەرگیز نەخۆش ناکەوێت، [1] ،

ئەم وردەکاری و وەڵامدانەوەی حەکیمە کە باسی کرد، نموونەیەکە لە شێوەی تێگەیشتن لە کەلامی خودایی، وە باس کردن و ڕوونکردنەوەی زیاتر لەم بابەتە، شیاو نیە لەگەڵ زانستی موعامەلەدا، بۆیە دەبێبەوەندە واز بهێنین.

## دووهەم: بەگەورەدانانی خوداوەندی موتەکەللیم:

قورئان خوێن ، لەسەرەتای خوێندنەکەیەوە دەبێت گەورەیی و بەرزی و مەزنی ئەو زاتە بخاتە دڵیەوە، کە خاوەنی وتەو قسەی تەواوو بەپێزە، وە بشزانێت؛ ئەوەی دەیخوێنێتەوە لە ڕەگەزی قسەی خەڵکی نیە، وە لە خوێندنەوەی کەلامی خوادا دووچاری ئەو پەڕی مەترسی دەبێت، چونکە بۆ خۆی فەرموویەتی:﴿لَا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ﴾ (الواقعة/٧٩).

تەنها پاك و پوختەکان دەبێ دەرەوە و ناوەوەیان پاك بێت، ئینجا دەتوانن دەست لە قورئان بدەن، هەروەك چۆن ڕواڵەتی پێستی بەرگەکەی و لاپەڕەکانی پارێزراوە لەوەی پێستی دەستی مرۆڤی بەربکەوێت، مەگەر پاك بێت و دەستنوێژی تەواوی هەبێت، هەروەها شاراوەیی واتا پیرۆزەکانیشی، بە حوکمی

(١) قوت القلوب١/٤٧، لە پاشان دەڵێت : ئەم بەسەرهاتەم لە وەڵامدانەوەی حەکیمەوە بوو بۆ پادشاکە، کە بە جوانی خودا فێری ئەو حیکمەتە ناوازەی کردبوو، ئەو وەڵامەی داوەتەوە.

بوونی عیززەت و باڵادەستی خاوەنەکەی، پارێزراوە لە وەی بە تەنها ناخ و شاراوەیی دڵەوە ببینرێت، مەگەر ئەو دڵە پاك بێت لە هەموو ڕەگەزێکی پیسی و پۆخڵەوات، وە دەبێت دڵی نورانی بووبێت، بە نووری بە گەورەزانین و بە بەهاو قەدرگرانی سەیرکردنی خودابییەوە، ئینجا بۆی هەیە ببینێت، هەروەك چۆن ناشێت هەموو دەستێك بەری پێستی بەرگی قورئانی پیرۆز بکەوێت، هەروایش ناشێت هەموو زوبانێك قورئانی پێ بخوێنرێتەوە، وە هەموو دڵێکیش ناتوانێت واتاکانی قورئان وەربگرێت و لێی حاڵی ببێت، وە هەر لەبەر ئەم بە گەورە زانینەبوو، کە عیکریمەی کوڕی ئەبووجەهل هەرکاتێك پەڕاوی قورئانی بکردایەتەوە، بێ هۆش دەکەوت، وە دەیفەرموو:

(ئەوە فەرموودەی پەروەردگارمە، ئەوە فەرمووده‌ی پەروەردگارمە)[1].

کاتێك وشە پیرۆزەکانی بە گەورە ناسیوەو داناوە، کە ڕێزو بەهای تەواو دابنێت بۆ خاوەنی قسە و کەلامەکە، وە ناتوانێت گەورەیی خاوەن کەلام جێگیر بکات لە دڵیدا، تا بیر لە صیفەت و دەسەڵات و کردارو جەلالی خودا نەکاتەوە، کاتێ ئەوەی لەم بوونەوەرەدایە وەك عەرش و کورسی و ئاسمانەکان و، حەوت تەبەقەی زەوی ونێوانەکانیان و، جنۆکەو مرۆڤ و، وڵاخ و ئاژەڵ و هەموو چوارپەلەکان و، درەختەکانیشی دێ بە مێشك و خەیاڵدا، وە بشزانێت کە خوداوەندی هەموویان و، ڕۆزی بەخش و خاوەن دەسەڵات و تەوانا بەسەر هەمویدا، تەنها خودایەکی تاك و تەنهایە، وە هەمووی لە ژێر دەسەڵات و تەوانایی و فەرمانی ئەودا دێن و دەچن، یان لە نێوانی فەزڵ و سۆزو میهرەبانی خوادان، یان لە نێوانی قەهرو تۆڵەو بێ ئامانی ئەودان، ئەگەر نیعمەتی ڕژاند، ئەوە بە چاکەو فەزڵی خۆیەتی و، کەس ناتوانێت زۆری لێبکات، وە ئەگەر تۆڵەیشی سەندەوە، ئەوە بە پێی عەدل و دادپەروەری خۆی بووە، کە هەر

---

(١) رواه الطبراني في الكبير (٣٧١/١٧)، والحاكم في المستدرك(٢٤٣/٣).

خۆیەتی دەفەرموێت:((هؤلاءِ في الجَنَّةِ ولاَ أُبالي، وهَؤُلاءِ في النَّارِ وَلاأُبالي))[1].

ئەوانەی نامەی کردەوەکانیان دەدرێت بە دەستی ڕاستیانەوە، با بچن بۆ بەهەشت و هیچ باکم پێیان نییە، وە ئەوانەش کە دەدرێت بە دەستی چەپیانەوە بۆ دۆزەخن و باکم بە هیچیان نییە.

کە ئەمەش ئەوپەڕی دەسەڵات و بەرزی و گەورەیی و بێباکی خودا دەردەخات، بەم جۆرە بیرکردنەوانە گەورەیی خودا لە دڵیدا زیاتر جێگیر دەبێت و، لەپاشان گەورەیی کەلامی خودایش دەچەسپێت لە دڵیدا.

## سێیەم: ئامادەباشی دڵ و وازهێنان لە خەتەرە و خەیاڵاتی نەفی:

وتراوە لە تەفسیری فەرموودەی خودا: ﴿يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ بِقُوَّةٍ﴾ (مریم/١٢) واتە: ئەی یەحیا ئەو کتێبە بە هەوڵ و لێبڕان و کۆشش و توندیوە بیگرە، گرتنی بە جیددی واتە: دەبێ خۆی بۆ خوێندنەوەکەی یەکلایی بکاتەوە، بە تەواوی بیرو هۆش و هیممەتی تەنها ڕو لەو بکات.

وتیان بە هەندێکیان: ئەگەر قورئانت خوێند، ئایا شتێکی تر دێت بە خەیاڵتدا؟ فەرمووی: ئایا شتێکی تر هەیە لە قورئان زیاتر خۆشم بوێت تا بیری لێبکەمەوە و بیهێنمە خەیاڵی خۆم.[2]

هەندێك لە زانا پێشینەکان ئەگەر سورەتێکیان بخوێندایەو دڵیان لەلای نەبوایە، دووبارە دەگەڕانەوە سەری و دەیانخوێندەوە.

ئەمەش لەوەوە سەرهەڵدەدات، کە بە گەورەیی سەیری قورئان دەکەن، ئەوەی ئەو صیفەتەی هەبێت، دڵی پێی خۆش دەبێت و، پێی دادێت و لێیشی بێئاگا نابێت، لەقورئاندا زۆر لەو بابەتانە هەیە، کە دڵی پێدەکرێتەوە و لەگەڵیدا دەڕوات، ئەگەر خوێنەرەکە شیاوبێت بۆ ئەو دڵداهاتنە، چۆن بە

(١) حديث القبضتين رواه أبو يعلي في (مسنده) (٣٤٢٢). عن أنس مرفوعا.

(٢) قوت القلوب١/٤٦.

تەمابێت کەسێك بە دوای ئونس و دڵداهاتنندا بگەڕێت بەشتێکی تر، کە بۆخۆی لەناو باخ و بێستانێکی بەرفراواندا، یان لەبەردەم چەندین دیمەنی دڵڕفێندا دەژی و سەیریان دەکات، ئاشکرایە ئەوەیش کە لە ناو قورئاندا بژی، وەك وتراوە: ئەوەندە وێستەگەی پڕ لەسەیرو سەمەرە و، باخ و بێستانی پڕ لە میوەهات و سەمەرو بەروبوومی تێدایە، ئەوەندە کۆشك و تەلاری بەرزو بڵندی لێیە، ئەوەندە ژوانگەو شوێنی شاییکردن و دێباج و بەرگی ئاوریشمی و، باخچەو باخاتی نایاب و خان و شوێنگای ئاسوودەیی و حەوانەوەی لێیە، کە پێویست نەکات دڵ بەملاو لای تردا بڕوات.

ئایەتەکانی کە بە میم دەست پێدەکەن، گۆڕەپان و مەیدانی قورئانە(میم بەبەرچاوەیەو، لێیەوە دەچیتە ناو ئاسۆیەکی فراوانەوە) پیتی(ڕاء)ەکان کە دەرچوونە لە تەنگەلانیەوە بۆ ناو ئاسۆیەکی بەرفراوان، ڕائەکان بێستانەکانی ناویەتی، حائەکان کە نیشانەی حەمدو شوراو دیواری قەڵاکانە، ئەوە سنوورەکانیەتی، ئایەتەکانیش کە بە تەسبیحات دەست پێدەکەن، خەڵوەی ژوان و زاوا بەڕێزەکانی قورئانن، حامیمەکانیش بەرگ و دێباجی ئاوریشمینی ئەو پەڕاوە پیرۆزەن .

ئایەتە درێژەکانیش: باخە پڕ بەرهەمەکانیەتی، مۆتێل و جێگای حەوانەوە کانیش، ئەو شوێنانەن کە سالیکانی ڕێگای ئاخیرەت تێیاندا دەمێننەوەو، بە نهێنیەکان ئاشنادەبن و، واتا شاراوەکان وەردەگرن، کەواتە خوێنەر ئەگەر چوویە ناو کۆڕی مەیدانەوە و، بەری باخەکانی چنی و، چووە ناو کۆشکەکان و زاواکانی بینی و، بەرگی ئاوریشمی پۆشی و، بەباخچەکاندا چاوی گێڕا و، لە ناو خانەکانیشداحەوایەوە، ئیتر دڵی دادێت و دادەمەزرێت و، بیریشی و پەرتەوازە نابێت و ناڕوات بەهیچ لایەکی تردا.

## چوارەم: تێفکرین و ڕۆچوون لە ناو واتاکانیدا:

ئەم حاڵەتە دوای ئامادەباشی دڵ دەست پێدەکات، چونکە دەگونجێت بیر لە

غەیری قورئان نەکاتەوە، بەڵام تەنها گوێ لە قورئانەکە بگرێت بۆ خۆی و، بەدوای واتاکانیدا نەگەڕێت.

کەواتە مەبەستمان لە دوای خوێندنەوە، بیرکردنەوەو قووڵداچوونە بۆ واتاکەی، بۆیە سوننەتە بە تەرتیل و خاوی بخوێنرێتەوە، چونکە جوان خوێندنەوەی ڕواڵەتیی، هۆکاری تێگەیشتن و بیرکردنەوەی ناوەرۆکەکەیەتی، وەك حەزرەتی عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: هیچ خێرو چاکەیەك نیە لەو بەندایەتیەدا کە تێگەیشتنی تێدا نەبێت، وە خێریش نیە لە خوێندنەوەیەکدا بیرکردنەوەی تێدانەبێت[1]،

ئەگەر بیرکردنەوەی بۆ نەدەکرا، مەگەر بە دووبارە خوێندنەوەی ئایەتەکان نەبێت، ئەوا با چەند جارێك بیخوێنێتەوە، مەگەر لە دوای ئیمامەوە بێت، ئەوە دەبێت لەگەڵ ئیمامدا گوێ لە خوێندن ئایەتەکان ئیمام بگرێت، ناکرێت ئەو سەرقاڵی واتای ئایەتێك بێت و، ئیمامیش لە ئایەتێکی تردا بێت، وەك ئەو کەسەی لێ دێت قسەی لەگەڵدا بکەن و، بە وشەیەکی قسەکان سەرسام بووبێت و، هەر بیری لێبکاتەوەو، پاشماوەی ڕستەو فەرمانەکانی تری لەکیس چووبێت و، نەزانێت چی پێ وتووە.

هەروەك چۆن ئەگەر لە ناو تەسبیحاتی ڕکوع بردندا، ئەو بیر لەو ئایەتە بکاتەوە، کە ئیمام لە وەستاندا خوێندوویەتی، ئەمە بە وەسوەسە دەژمێررێت.

دەگێڕنەوە لە عامیرە کوڕی عەبد قەیس کە فەرموویەتی:

وەسوەسە لە نوێژدا دامدەگرێت، وتیان بۆ کاری دونیایی؟ فەرمووی:

ئەگەر سەرەڕمەکان بدەن بە دڵ و هەناومدا، لەوەم پێخۆشترە کە بیری دونیاییم بۆ بێت، بەڵام دڵم سەرقاڵ دەکات، تا لەبیرم بباتەوە کە لە حزوری خوادای (عَزَّ وجَلْ)داوەستاوم، کە چۆن من بتوانم لەوانەبم، کە دەربـــازدەبن

---

(١) رواه الدارمي في سننه(٣٠٥)، وأبو نعيم في الحلية(٧٧/١).

و، نامە بەدەستی ڕاستیانەوە دەدرێت[1].

کەواتە ئەو جۆرە لادانەیشی بە وەسوەسەکرنی شەیتان لەقەڵەمداوە، کە وایشە، چونکە سەرقاڵی دەکات لەوەی کە لە واتای ئەو وشەو ڕستانەدا بیر بکاتەوە کە دەیانخوێنێتەوە، خۆ شەیتان بۆ ئەو کەسانە ناتوانێت بیری دونیایی بخاتە مێشکیانەوە، ناچار هەر بە بابەتێکی دینیەوە سەرقاڵیان دەکات، تا گرنگترەکەی لەدەستبدات.

کاتێك ئەم قسەیان بۆ پێشەوا حەسەنی بەصری گێڕایەوە فەرمووی:

ئەگەر ڕاست بێت ئەوە قسەی ئەو بێت، داوام لە خودایە وامان لێ نەکات کە گیرۆدەی ئەو حاڵەتە ببین.

وە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ بیست جار بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيم ی خوێندەوە، دووبارەی کردەوە[2] بۆ ئەوەی زیاتر لە واتاو ناوەڕۆکەکەی وردبێتەوە.

ئەبوزەڕری غەفاری دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ شەوێکیان شەو نوێژی بۆ کردین، ئایەتێکی خوێندەوەو زۆری دوبارە دەکردەوە، کە ئەمەیە ﴿إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾(المائدة/١١٨)[3] (واتە: ئەگەر سزایان بدەیت،ئەوە بەڕاستی ئەوان کۆیلەو ژێردەستەی خۆتن و،کەس بۆی نیە نەڕەزایی دەرببڕێت،بەڵام ئەگەر بە لوتفی خۆت لێیان خۆش ببیت، ئەوە لە صیفەتی سۆزو کەرەمی خۆت بە دوور نییە، کە لە هەموان بەبەزەیی تریت.)

هەروەها(تەمیمی داری) شەوێك تابەیانی شەونوێژی بەم ئایەتەوە بردەسەر کە دەفەرموێت: [4]، ﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَنْ نَجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ

---

(١) رواه ابن المبارك في الزهد(١٥٦١) بنحوه.

(٢) رواه أبو الشيخ في (أخلاق النبي)(٥٥١).

(٣) رواه النسائي (١٧٧/٢)، وابن ماجه(١٣٥٠).

(٤) رواه ابن مبارك في الزهد،٩٤/٢، والطبراني في الكبير(٥٠/٢).

آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾(٢١/الجاثية)
ئايا ئەو بێبڕوايانەی كاری تاوانكاريیان ئەنجامداوە، واگومان دەبەن بە هەمان شێوەی بڕوادار وچاكەكاران هەڵس و كەوتيان لەگەڵدا بكەين، وەك لە دونيادا ڕايان بواردووە، دوای مردنيشيان هەروادەبن، هەرگیز وانابێت و بڕيارێكی نابارو ناپەسەنديان داوە.هەروەها سەعيدی كوڕی جوبەير، شەوێكيان تابەيانی ئەم ئايەتەی دەووتەوە: ﴿وَامْتَازُوا الْيَوْمَ أَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ﴾ (يس/٥٩)

ئەی تاوانباران دەی ئەمڕۆ كە ڕۆژی لێپرسينەوەيە جياببنەوە لەوانی تر[١].

وەهەندێك لە زانايـــان فەرموويانە: جـــاری واهەيە سورەتێكی قورئان دەخوێنمەوە، هەندێك لە ديمەنەكانی ڕام دەووەستێنێت، هێشتا لێی نەبوومە تەوە بەيانی دەبێتەوە، وە هەندێكی تريان فەرموويانە: هەر ئايەتێك لێی تێنەگەم و دڵيشم لە ناويدا نەبێت، هيچ پاداشتێكی لەبەرامبەردا دانانێم[٢].

دەگێڕنەوە لە ئەبو سولەيمانی دارانيەوە كە فەرموويەتی: ئايەتی وا دەخوێنمەوە چوار شەو يان پێنج شەو لەگەڵيا دەمێنمەوەو بيری لێدەكەمەوە، ئەگەر بۆخۆم واز نەهێنم لە بيرلێكردنەوەی، نا توانم بگوازمەوە بۆ ئايەتێكی تر.

هەندێك لە زانا پێشينەكان فەرموويەتی:

شەش مانگ لە خوێندنەوەو بيركردنەوە لە سوورەتی (هود) دا مابوويەوەو دووبارەی دەكردەوەو سەرنجی دەدا و، هەرچی دەكرد تێر نەدەبوو لە بيركردنەوە لە واتاو مەبەستەكانی. هەندێك لە عاريف و خودناسان فەرموويەتی:

هەموو جومعەيەك خەتمەيەكی قورئان دەكەم. وە خەتمەيەكيشم هەيە

---

(١) رواه القاسم بن سلام، في فضائل القرآن، ص/١٤٨)، وفيه قراءة: **واتَّقوا يَوماً تُرجَعونَ فيهِ إلى اللهِ**)وفي رِوايةٍ( **إذا السَّماءُ انفَطَرَت**)بدلَ ماذكرَ المُصنف، وحكى تكرير الآية عن ابن مسعود، وعمر بن الخطاب، وعامر بن عبد قيس.وأسماء بنت أبي بكر (رضوان الله عليهم)

(٢) هەردوو ڕيوايەتەكە :قوت القلوب، ٦١/١.

مانگێك جارێ تەواو دەبێت، وە خەتمەی ساڵانەیشم هەیە. وە خەتمە یەکیشم هەیە سی ساڵەدەستم پێ کردووە. هێشتا لێی نەبوومەتەوە[1]،

ئەمەیش بە پێی پلەکان و جۆری بیرکردنەوەی لە ئایەتەکان و قووڵ داچوون بۆ واتاو ناوەرۆکەکانی، وەك دووبارە فەرموویەتی:

خۆم خستە شوێنی ئەوانەی بە کرێکاری کاردەکەن. ئێستا وەك ئەوانە کار دەکەم کە هەندێکیان بە ڕۆژانە یەو، هەندێکیشیان حەفتانە کاردەکەن، یان مانگانە، یان ساڵ بەساڵ و، پاداشتی ساڵانە وەردەگرن.

**پێنجەم: لێ تێگەیشتن:** ئەوەیە لە خوێندنەوەی هەموو ئایەتێك، بەدوای ڕوونکردنەوەی واتاکەیدا بگەڕێت کە شیاوو گونجاوە لەگەڵ ئایەتەکەدا، چونکە قورئان بابەتی صیفەتەکانی خودای(عَزَّ وجَلْ)دەگرێتەوە، یان باسی کردارەکانی، یان باسی کاروباری پێغەمبەران (صەلات و سەلامی خودای لەسەر)، وە باسی حاڵی ئەوانەی بەدرۆیان خستوونەتەوە، کە چۆن بە هیلاکدا چوون و فەوتان، وە باسی فەرمانەکانی خوداو کارە قەدەغەکراوەکان، وە باسی بەهەشت و دۆزەخ.

با لە باسی صیفەتەکانی خوداوە دەست پی بکەین:

صیفەتی خودای (عَزَّ وجَلْ) وەك فەرموودەی خودای گەورە: **﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾** (الشورى/١١) ناتوانیت هیچ شتێك بشوبهێنیت بە خودا،وە خودای گەورە بیسەرو بینا و ئاگادارە.

یان فەرموویەتی:**﴿الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ﴾** (حشر/٢٣) خودا ئەو خودایەیە: کە پادشای هەموو جیهانە و، پاکە لە هەموو ناتەواویەك و ،سەلامەتە لە هەموو کەموکورتییەك و، ئاسایشبەخشی

---

(١) هەرسێ ڕیوایەتەکە بنواڕە: قوت القلوب:١/٥٠ . لەگەڵ ئەم هەواڵەدا کە باسی کردووە.

هەموانەو، ئاگادارو پارێزكاری هەموو شتێكەو، زاڵە بەسەر هەرچییەك بیەوێت كە بیكات، هەرچییەكیشی بوێت خەڵكی ناچار دەكات كە بیكەن، گەورەترە لەوەی كە پێویستی بەهیچ شتێك هەبێت، یان هیچ ناتەواوییەكی تێدا بێت، پاكو خاوێنە لەوەی هاوبەش دانەرەكانی هاوبەشی بۆ دابنێن [١]،

با بیر لە واتای ئەم ئایەتانە بكاتەوە. تاخێنیەكانی بۆ دەربكەوێت، كە چەندین واتای سەرنراوەیان تێدایە، مەگەر سەركەوتووە ڕێنومایی كراوەكان پەییان پێببەن، هەر بۆ ئەمەیە كە (حەزرەتی) عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) هێمای بۆ كردووە و فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ شتێكی بە نهێنی پێینەوتووم كە لە خەڵكی شاردبێتەوە، مەگەر شتێك كە بە هۆی بیركردنەوەوە خودا تێگەیشتنێكی تایبەتی بە بەندەیەكی دابێت، كە لە واتاو نهێنیەكانی قورئان زیاتر حاڵی بوبێت[٢]، كەواتە با سووربێت لەسەر ئەو جۆرە بیركردنەوەیە.

عەبدوڵلای كوڕی مەسعودیش فەرموویەتی: ئەوەی زانستەكانی سەرەتاكانی ژیان و كۆتاییەكانی دەوێت، با بگەڕێت بەدوای واتاو مەبەستەكانی قورئاندا، [٣] وە گەورەترینی زانستە قورئانیەكان لە ژێر ناوە پیرۆزەكانی خودای (عَزَّ وجَلْ) و صیفەتەكانیدا جێگایان دەبێتەوە، چونكە زۆربەی خەڵكەكە تەنها

---

(١) خوڵاصەی تەفسیری نامی ٤٤٨.

(٢) رواه النسائی( ٢١/٨) من رواية أبي جحيفة قال سألنا عليا رضي الله عنه فقلنا: **هل عندكم من رسول الله ﷺ شيء سوى القران؟ فقال لا ، والذي خلق الحبَة وبرأ النَّسمةَ، إلاَ ان يُعطي اللهُ (عَزَّ وجَلْ) فهماً في كتابه**، الحديث وهو عند البخاري(٦٩٠٣) بلفظ: **هل عندكم من رسول الله ﷺ ما ليس في القرآن**. وقال مرَةً: **ما ليس عند الناس**، ولأبي داود (٤٥٣٠) والنسائي (٤٧٣٤) فقلنا: **هل عهد إلَيك رسول الله صلى الله عليه وسلم شيئا لم يعهَدهُ إلى الناس، قال: لا إلاَ ما في كتابي هذا**. الحديث. ولم يذكر الفهم من القرآن،

(٣)رواه ابن المبارك في الزهد، وقال الزبيدي: (٥٠٩/٤ ) والديلمي في مسندالفردوس كما في كنز العمال (٢٧٦/١) عن أنس مرفوعا.

ئەوەندەی لێ تێ دەگەن، کە دەگونجێت لەگەڵ تێگەیشتنیاندا، وە نەیانتوانیوە بەقوڵی بۆی دابچن و واتا شاراوەکانی ببیننەوە[1].

## دەربارەی کردارەکانی خودا ﷻ

وەك باسکردنی دروستکردنی ئەرزو ئاسمانەکان و بەدیهێنراوەکانی تر، با ئەوەی دەیخوێنێتەوە صیفەتی بەرزو جەلالی خودای لێ تێ بگات، چونکە بوونی کارێك نیشانەی بکەرەکەیەتی، گەورەیی کارەکە گەورەیی بکەرەکەی دەردەخات، کەواتە لە بینینی دروستکراوەکە، دەبێت تەنها دروستەکەرەکەی ببینێت، نەك کارەکەی، ئەوەی خودای حەقق و ڕاستی ناسی، لە هەموو شتێکدا دەیبینێت، چونکە هەموو شتەکان لەوەوە و بۆ ئەویش دەگەڕێنەوە، وە بەو ئەنجام دەدرێت و تەنها پەیوەنداری ئەویشە.خودا بۆ خۆی هەموو شتێکەو سەرچاوەی هەموویانەو، هەموو شتەکانیش لە خوادا دەبینرێنەوە[2].

ئەوەی نەتوانێت خودای خۆی لە هەموو بینراوەکانیدا ببینێتەوە، وەك ئەوە وایە کە خودای نەناسیبێت، چونکە ئەوەی بە تەواوی بیناسێت، دەزانێت جگە لە خودا هەموو شتێکی تر مایە چەچ و بێبنەمایەو، تەنها بوونێکی ڕۆکەشی هەیە، بۆ ماوەیەکی کەمەو، هەموو شتەکان جگە لە خودا تیا دەچن و دەفەوتێن، چونکە بوونی ڕاستەقینە ئەوەیە: نەبەسرابێت بە هیچ بوونێکەوە، بۆیە بوونەکانی تر هەمووی لە ڕاستیدا ئێستا فەوتاون، نەك ئەوەی لە کاتێکی تردا نەمێنن، بەڵکوو بە پێی ڕابوردوو ئەزەل سەیری بکەیت، لە ڕووی زاتی شتەکانەوە، یان داهاتوو، مادەم بە هیلاکدا دەچێت، کەواتە بوونی سەربەخۆیان نیە، بوونەکەیان بەستراوە بە بوونی خوداوە، وە بە پاڵپشتی تەوانایی خودایە، کەواتە لە ڕێگەی شوێن کەوتنەوە جێگیربوونی بۆ بڕیار

(١) انظر: المقصد الأسنى(ص/٣)

(٢) هەمان سەرچاوە: ل/٤٢

دەدرێت، ئەینا لە ڕێگەی سەربەخۆیی خۆیەوە، تەنها باتڵی و بێبنەمایی تێدا دەبینرێت، ئەمەیش سەرەتایەکە لە باسی بنەماکانی عیلمی موکاشەفە[1]،

بۆیە پێویستە ئەگەر قورئانخوێن ئەم ئایەتانەی خوێندەوە:

﴿أَفَرَأَيْتُمْ مَا تُمْنُونَ﴾ (٥٨) ﴿ أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَحْرُثُونَ﴾ (٦٣) ﴿أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ﴾ (٦٨)﴿ أَفَرَأَيْتُمُ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ﴾ (٧١/الواقعة)

نابێت تەنها سەرنجی ئەو تکە شەهوەت و (مەنی و تۆمە)یە بدات، یان بە سادەیی سەیری ئاوو ئاگرو کێڵگەو جووتکردن بکات، بەڵکوو دەبێت سەرنج بدات، کە لە سەرەتاوە (مەنی) کە نوطفەیەکی بچووکە، پارچەکانی وەك یەکە، لە پاشان سەیر کات، چۆن لە گۆشت و ئێسك و ڕەگ و دەمار پێك دێت، وە چۆن وێنەو شکڵەکانی بە چەندین شێوەی جیاواز دەگۆڕرێت، لە سەر و دەست و پێ و جگەر و دڵ و پارچەکانی تر، هەروەها سەیر بکات چەندین جۆری صیفەتی جیاوازی پەسەندی وەك:

بیستن و بینین و ئەقڵ و قسەو هەستپێکردن و ئەوانی تریشی تێدا پەیدا دەبێت، لە پاشان ئەوانەی تر کە لێی پەیدادەبن، لە صیفەتە ناپەسەندەکان، وەك ڕق و کینەو ئارەزووەکان و فیز و دەمار و، عوجب و نەزانین و بەدرۆخستنەوەو، دەمەدەمێ کردن، وەك خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿أَوَلَمْ يَرَ الْإِنْسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ نُطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُبِينٌ﴾ (يس/٧٧) ئەوانەی دەمەدەمێ و موجادەلە دەکەن و ڕکەبەرایەتی دەکەن و، باوەڕیان بە زیندووبوونەوە نیە، دەڵێن کێ ئەم ئێسکە شکاوو پتورکاوو ڕزیوە زیندوو دەکاتەوە؟

ئەگەر بە باشی سەرنجی کارە سەرسوڕهێنەرەکانی خودا بدات، ئەو کاتە دەتوانێت بەرزتر بنوارێت بۆ ئەوەی لە هەموان سەرسوڕهێنەرترە، کە ئەصڵی دروستکردنەکەیە، کە لەو سەرچاوەوە ئەم کارە نایابانە دەرچووە،

---

(١) زیاتر ئیمامی غەزالی لە کتێبی (مشكاة الأنوار)دا ئەم بابەتەی ڕوونکردۆتەوە ل/٤٥.

ئەویش بەردەوام سەرنجی بەدیهێنراوە جوانەکان دەکات و، بەدیهێنەرەکەی تێدا دەبینێت[1]،

## شارەزابوونی لە ئەحواڵی پێغەمبەران (سەلامی خودای لەسەر):

ئەگەر گوێبیستی ئەوە بووبێت کە چۆن ئەوان بەدرۆ دەخرانەوەو، لێیان دەدرا و، هەندێکیشیان کوژراون، ئەوە دەبێ کە تێ بگات، خودای گەورە پێویستی بە پێغەمبەران و ئەوانەش نیە کە بۆیان نێرراون، وە ئەگەر هەموویان بە هیلاکدابچن، کاریگەرییەکیان لەسەر موڵکی خودا نابێت، وە ئەگەر لە پاشاندا سەرنجی دا، کە خودا یارمەتی داون و سەری خستوون، دەبێ لەوە تێ بگات، کە خودا تەوانایەو دەیشیەوێت یارمەتی حەقق و ڕاستی بدات.

## حاڵی ئەوانەی بە درۆیان دەخستنەوە:

وەك نەتەوەکانی (عاد) و (سەمود) و ئەوەی بەسەریان هات، کە سەرنجی دا، ئەوەی لێ تێ بگات، هەست بە ترسانێکی زۆر بکات لە خودا، کە بەزەبر و دەسەڵات و تۆڵەی خودایی، لەوانەیە هەموو کەسێکی نالەبار، ئەو قەهرو غەزەبەی خودا بیگرێتەوە، کەواتە با پەند وەربگرێت و، ئەگەر تا ئێستە لە بێئاگایی و بێ ئەدەبی و سەرکەشیدا ژیا بێت، وە مۆڵەتی پێ دابێت و سزا نەیگرتبێتەوە، وابزانێت ئەوە کاتێکی سنووردارەو لەوانەیە ئەمیش بەر ئەو تۆڵەو سزایە بکەوێت.

هەروەها ئەگەر باسی بەهەشت و دۆزەخی بیست، وە هەموو ئەو یاسانەی

---

(١) ئیمامی غەزالی (خودای لێ ڕازی بێت)لە(مشكاة الأنوار)دا ل/ ٤٥ فەرموویەتی: لە پاشان بە هەموویەوە دەگەڕێتەوە و بەرزدەبێتەوە بۆ سەرچاوەی بنەڕەتی، نوری هەموو نوورەکان و کانگای یەکەم، کە خودای گەورەیە. تاك و تەنها بێ شەریکە، وە هەموو نوورەکانی تر ئەصڵی نین و خوازراون، نووره حەقیقیەکەش تەنها نوری خودایە .

له قورئاندا هاتوون: خۆ ناتوانێت هەموو ئەو باس و خواسانەی لە قورئاندا هاتووە سەرژمێری هەموویان بکات، چونکە بە کۆتا ناگات، ئەوەندە هەیە هەموو بەندەیەك بە ئەندازەی ئەوەندەی کە پێی دراوە، ئەینا لە ڕاستیدا هیچ تەڕو وشکێك نیە کە لە قورئاندا نەهاتبێت، یان باسی نەکرابێت.

﴿قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنْفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا﴾ (الكهف/١٠٩)پێیان بڵێ: ئەگەر دەریا هەمووی مرەکەب بێت، بۆ نوسینەوەی وتەو فەرموودەو کەلیکمەکانی زانیاری و دەسەڵات و بە توانایی خودا، دەریای سنووردار تەواو دەبێت با ئەوەندەی تریش بهێنیت بۆ یارمەتی دانی، بەڵام کەلیماتی خودا کە ئەزەلییە هەرگیز تەواو نابێت.

هەر لەبەر ئەمەیە کە (حەزرەتی) عەلی فەرموویەتی: ئەگەر بمەوێت باری حەفتا وشتر باردەکەم تەنها لە تەفسیر کردنی سوورەی فاتیحە[1].

کەواتە مەبەست لەوەی باسمانکرد، بێدارکردنەوەیە لە چۆنیەتی کردنەوەی ڕێگای تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز. بۆ ئەوەی دەروازەکەی لەسەر بکرێتەوە، ئەگینا مەبەستمان سەرژمێری هەموو زانستەکان نیە. چونکە ئەوە جێ تەماحی کەس نەبووەو نابێت، ئەگەر کەسێك تێگەیشتنی لە قورئاندا نەبێت، با نزمترینی پلەیش بێت، ئەوا دەچێتە ناو ئەم فەرموودەوە :

﴿وَمِنْهُمْ مَنْ يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّى إِذَا خَرَجُوا مِنْ عِنْدِكَ قَالُوا لِلَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مَاذَا قَالَ آنِفًا أُولَئِكَ الَّذِينَ طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ﴾ (محمد/١٦).

هەندێك لەوانەی لای تۆ دادەنیشن لە دوڕووەکان و گوێت لێدەگرن، دوای ئەوەی چوونە دەرەوە دەپرسن لەوانەی زاناو شارەزان لە هاوڕێکانت، بەشێوەی گاڵتەکردن، ئەوەی ئێستا موحەممەد باسی چی بۆ دەکردین؟

(١) قوت القلوب١/٥٠.

ئەمانە ئەو کەسانەن کە خودا دڵ و دەروونی مۆرکردوون و قسەی چاك وەرناگرن، مۆربوونی دڵ: ئەو ڕێگرانەیە کە لە باسی تێگەیشتندا باسیان دەکەین، وەك وتراویشە:

مورید نابێتە مورید، تا هەموو ئەو شتانەی دەیەوێت لە ناو قورئاندا نەیدۆزێتەوە، وە شتە کەموکوڕیەکانی خۆیی پێ بزانێت و ئەوەیش کە زیادە دەری بخات و بەهۆی خودای سەرپەرشتیارەوە پێویستی بە بەندەکان نەمێنێت[1].

# شەشەم:

## وازهێنان لەوشتانەی دەبنە ڕێگر بۆ تێگەیشتن:

بەڕاستی زۆربەی خەڵکەکە ڕێیان لێ گیراوە کە لە واتاکانی قورئان تێ بگەن، لەبەر چەندین هۆکارو پەردەو حیجابی تایبەتی، کە شەیتان داویەتی بەسەر گوێ و دڵیاندا، چاوی دڵی کوێر کردوون لە حەنای بینینی نهێنیە سەر سوڕهێنەرەکانی قورئاندا، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(( لولاَ أَنَّ الشَّياطِينَ يَحُومُونَ علَى قُلوبِ بَنِي آدَم، لنَظَرُوا إلى الملَكُوتِ)[2].

ئەگەر شەیتانەکان ڕێگرنەبوونایەو پەردەیان نەدایە بە سەر دڵ و چاوی ئادەمییەکاندا، ئەوا دەیانتوانی جیهانی بەربڵاوی خودایی ببینن، وە واتاکانی قورئانیش بەشێکە لە جیهانی مەلەکووتی، وە بزانە هەرچی نەچووە ژێر یەکێك لە ئامێرە هەستیارەکانتەوەو، نەیشت دەتوانی بە حاسەکانت ببینیت، مەگەر بە نووری بەصیرەت و چاوی دڵ نەبێت، ئەوە لە مەلەکووتی خودایە.

(١)قوت القلوب ٥٧/١، عن بعض العارفين

(٢)رواه أحمد في المسند(٣٥٣/٢) في قصة الإسراء مرفوعا

## وه بزانه ئه‌وه‌ی که ڕێگره له تێگه‌یشتن چوار په‌رده‌یه:

## یه‌که‌میان:

وای لێبێت که خه‌می ته‌واوی له‌به‌ر بێت، که پیته‌کان له شوێنی خۆیان به جوانی ده‌ربرێت، شه‌یتانێکیش کراوه‌ته چاودێر به‌سه‌ر ڕاستی و نادروستی ده‌ربڕینی پیته‌کاندا، بۆ ئه‌وه‌ی سه‌رقاڵیان بکات به ڕێکخستن و جوان ده‌ربڕینی پیته‌کانه‌وه‌و له واتای ڕسته‌کان دوریان بخاته‌وه، به‌رده‌وام وه‌سوه‌سه‌یان بۆ دروست ده‌کات تا زیاتر گرنگی به مه‌خره‌ج و ده‌ربڕینی پیته‌کان بده‌ن و مافی خۆیان وه‌ربگرن، هه‌رچه‌نده ئه‌مه له ڕاستیدا کارێکی به جێیه، به‌ڵام نیه‌تی شه‌یتان جیاوازه، ئه‌و مه‌به‌ستیه‌تی هه‌رچۆنێك بکات، بیریان له لای واتاکانی قورئان نه‌هێڵێت، زۆریش به ده‌گمه‌ن ئه‌م فریودانه‌ی شه‌یتان بۆ قورئان خوێنه‌کان ئاشکرا ده‌بێت،که ده‌بنه جێگای گه‌مه‌و گاڵته‌و پێکه‌نینی شه‌یتانی نه‌فره‌تی، به تایبه‌تی ئه‌وانه‌ی که ده‌قاو ده‌ق ڕێنماییه‌کانی جێبه‌جێ ده‌که‌ن(١).

## دووهه‌میان:

به‌و شێوه بێت که شوێنکه‌وتووی مه‌زهه‌بێکی خوێندن و (قیرائه‌ت)بێت، که به ته‌قلید گوێبیستی بووبێت، وه هۆگری بوبێت و پێیه‌وه به‌سرابێته‌وه و لێی لانه‌دات، ته‌نها به‌وه‌ی که گوێی له‌و که‌سه‌بووه که شوێنی که‌وتووه، بێ ئه‌وه‌ی به هۆی بینین و چاوی دڵه‌وه بۆی سه‌لمابێت، ئه‌و که‌سه بیروباوه‌ڕه‌که‌ی ڕێگه‌که‌ی وا لێبه‌رته‌نگ کردۆته‌وه، که واده‌زانێت نابێت بچێته سه‌ر ڕایه‌کی تر،

---

(١) شه‌یتان پێیان ده‌ڵێت، چه‌ندێك حوکمی قورئان پێویسته جێبه‌جێ بکرێت، به هه‌مان شێوه‌یش ده‌بێ وشه‌وڕسته‌و پیته‌کان به ڕێکی بخوێنرێته‌وه،ئه‌مه‌یش عیباده‌ته،وه ده‌یخاته دڵیانه‌وه که به بێ ته‌جویدخوێندنه‌که ده‌بێته له‌حن و ناوازی نادروست و ئه‌گه‌ر چی قسه‌که ڕه‌وایه به‌ڵام نیه‌تی ئه‌وله‌عینه گلاوه و دورخستنه‌وه‌یانه له‌واتای قورئان. الإتحاف ٥١٢/٤.

کەواتە چاوی تەنها ئەو ڕایە دەبینێت کە بیستوویەتی، ئەگەر تیشکی ڕایەکی تر لە دوورەوە بۆی دەربکەوێت، وە واتایەکی تری بۆ بکەوێتە ناو زیهنیەوە، کە نەگونجێت لە گەڵ ڕاو بۆچوونە بیسراوەکەی خۆی، شەیتانی شوێنکەوتن(تەقلید)و پابەندبوون بە ڕا پێشووەکەی، هێرشێکی سەختی دەخاتە سەر، دەڵێت: چۆن خەتەرەی ئاوا ڕوو لە دڵت دەکات، کە ئەمە پێچەوانەی بیروباوەڕی باوباپیرتە؟!

یەکسەر خۆی دەڵێت، ئەم خەتەرەی بۆی هاتووە فریودان و سەرکەشی شەیتانە، بۆیە لێی دووردەکەوێتەوە.

بۆ نموونەی ئەم جۆرو شێوانەیە کە صۆفیەکان فەرموویانە:

(بەڕاستی زانست دەبێتە پەردە. لە نێوانی بەندە و گەیشتن بە خوادا) مەبەستیان لە زانست ئەو عەقیدە و باوەڕەیە کە خەڵکانێك پابەندی پێوە دەکەن و تەنها بە تەقلیدو شوێنکەوتنیش وەریان گرتووە، یان لە ڕێگەی هەندێك ڕاو ڕستەی پڕ لە دەمارگیرییەوە، کە هەندێ شوێن کەوتووی مەزهەب بۆیان باسکردوون و، سەپاندوویانە بەسەریاندا، دوور لەو زانستیيە ڕاستەقینەی کە بە کەشفی ڕاستی و بینینی نهێنیەکان لێی تێ دەگەن و، ئەهلی بەصیرەت شارەزای دەبن، ئەوە کە خۆی ئەوپەڕی ئامانجە کە زانایان پێی بگەن، هەرگیز نابێتە پەردە لە نێوانی بەندەو خالیقدا.

ئەو شوێنکەوتنەش کە باسمان کرد؛ هەندێك جار بۆخۆی کارێکی پوچ و باتیڵە، کەواتە دەبێتە ڕێگر لە گەیاندنی واتا بە خاوەنەکەی، وەك ئەو کەسەی بڕوای وایە،کە واتای(ئیستیوا)کە خودا لەسەر عەرش ڕاوەستاوە،بە ڕاوەستانی دامەزراندن و دانیشتن و حەوانەی لێك بداتەوە. جا ئەگەر خەتەرەیەکی بۆ پەیدابوو، کە بۆ نموونە ناوی (القدوس)، واتە پاك و خاوێنی لە هەموو ئەو صیفەت و شتانەی کە دەدرێنە پاڵی خەڵکەکەیەوە، ئەوکاتە تەقلیدە هەڵەکەی ڕێگەی پێ نادات کە ئەو واتا دروستە جێگیر ببێت لە دڵی دا، وە

ئەگەر ووەرشی بگرێت و جێگیریش ببێت پێویستی بە کەشفێك و چەندین کەشفی تر دەبێت، بەڵام هەوڵدەدات ئەم خەتەرە زانستیانەش لە خۆی دووربخاتەوە، چونکە پێچەوانەی تەقلیدە باتڵەکەی خۆیەتی، کە لەسەرەتاوە واتای جێگیربوونی خودای لەسەر عەرش بە شێوەیەکی هەڵە لێکداوەتەوە.

وە هەندێك جاریش تەقلیدەکەی ڕاست و دروستە، ئەم ڕاستییەش هەر دەبێتە ڕێگر بۆ ئەوەی لە واتای قورئان تێ بگات ، یان لێی ئاشکرا ببێت، چونکە ئەو ڕاستییەی کە داوا لە خەڵکی کراوە کە بڕوایان پێی هەبێت، چەندین پلەوپایەی هەیە، وە ئەو ڕاستییە بنەمایەکی ئاشکرای هەیە، وەك توێکڵ وایە ڕۆچوونێکی شاراوەیشی هەیە، کە بە کاکڵەو ناوەڕۆك ناودەبرێت، وە سروشتی مرۆڤ ئەگەر تەنها لەسەر واتا ئاشکراکان ڕاوەستاو. پەلی نەهاوێشت بۆ ناو کاکڵەو مەبەستە شاراوەکان، دەبێتە ڕێگر لەوەی شارەزای قووڵایی بابەتەکان ببێت و، بگاتە حەقیقەتەکەی، وەك چۆن لە باسی جیاوازی نێوانی زانستی ئاشکراو زانستی شاراوەدا، لە پەڕاوی بنەماکانی بڕوادا باسکمانکرد[1]،

## سێیەمیان:

ئەگەر سووربێت لەسەر گوناهێك، یان صیفەتی دەمارو خۆبەشتزانین زاڵ بێت بەسەریدا، یان شوێن کەوتەی هەواو ئارەزواتی دونیایی و نەفسی بێت، ئەمانە هەمووی هۆکارن بۆ تاریك بوون و ژەنگاوی بوونی دڵی. ئەمەیش وەك چڵك و پیسی سەر ئاوێنە وایە، ئیتر ڕێگە نادات کە پاڵفتەیی و بریقەی ڕاستیەکان،لەسەر شاشەی ئاوێنەکە دەربکەوێت و خۆی نمایش بکات.

ئەمەش گەورەترین پەردە و حیجابە بۆ دڵ، کە زۆربەی ئەو خەڵکەی

---

(١) بنوارە بەرگی دووهەمی ژیانەوەی زانستەکانی ئاین، پەڕاوی دووهەم، ل: ٨٣، ٩٥ بەدواوە .

بێبەشکردووە لە تێگەیشتنی واتاکانی قورئان، وە هەرچەندێك زیاتر ئارەزوات کەڵەکە ببەستێت لەسەر دڵی، پەردەی ڕێگری تێگەیشتنی واتاکانی کەلامی خودا قایم تر دەبێت، وە هەرچەندێك بارسایی حەزو ئارەزواتی دونیایی لەسەر دڵی سووك تر ببێت، ئەوا نزیکترە لەوەرگرتنی واتاکانی کەلامی خوداوە .

دڵ وەك نەینۆك و ئاوێنەوایە، ئارەزواتیش وەك ژەنگ وایە، واتاکانی قورئانیش وەك ئەو وێنانە وان کە لە ئاوێنەدا دەردەکەون، ڕیازە پێکردنی دڵیش، بەوەی ئارەزووەکانی بخەسێنێت، وەك جەلایی و پاڵفتەکردنی ئاوێنەکە وایە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((إذا عَظَّمَتْ أُمَّتي الدِّينارَ والدِّرهَمَ، نُزِعَ مِنه هَيبَةُ الإسلام، وإذا تَرَكوا الأَمرَ بالمَعروفِ والنَّهيَ عَنِ المُنكَرِ، حُرِموا بَرَكَةَ الوَحيِ))**[1]،

ئەگەر ئوممەتەکەم بەچاوی گەورەیی و بەهاوە سەیری دینار ودیرهەمیان کرد، سام و هەیبەتی ئیسلامەتییان لێدەسەنرێتەوە، وە ئەگەر وازیشیان لە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لە خراپە هێنا، ئەوا لە بەرەکەتی وەحی بێبەش دەکرێن.

فوضەیل دەفەرموێت: واتە: لە بەرەکەتی تێگەیشتنی قورئان بێبەش دەبن.[2]، وە بۆ تێگەیشتنی قورئان و پەند لێ وەرگرتنی، بەمەرجگیراوە کە تەوبە بکات وەك دەفەرموێت: بۆ بەرچاو ڕوونی و یادکردنەوەیەکە بۆ هەموو بەندەیەك کە تەوبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ حزوری خودا:

---

(١) رواه ابن أبي الدنيا في العقوبات، (٣٧) عن الفضيل بن عياض معضلا، وهو عند الحكيم الترمذي في (نوادر الأصول)(ص/٢١٦) و ٢/٢٧٠) وقد أورد سند الحكيم الحافظ الزيلعي في تخريج الأحاديث والآثار(٤٧٢/١) عن أبي هريرة مرفوعا.بلفظ:

**اذا عظمت امتي الدنيا نزع منها هيبة الاسلام، واذا تركت الامر بالمعروف والنهي عن المنكر حرمت بركة الوحي. واذا تسابت امتي سقَطتْ مِن عَيْنِ الله.**

(٢) قوت القلوب(٥٨/١).

﴿تَبْصِرَةً وَذِكْرَى لِكُلِّ عَبْدٍ مُنِيبٍ﴾ (٨/ق) یان فەرموویەتی: ﴿وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ (البقرة/٢٦٩). کەس بیرناکاتەوە، یان تەنها ئەوانە بیردەکەنەوە و پەند وەردەگرن، کە دڵیان زیندووەو، دوورە لە غەفڵەت ﴿ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾(رعد/١٩)،کەواتە ئەوانەی سەرکەشی و ژیانی دونیاویستییان هەڵبژارد بەسەر نیعمەتەکانی دواڕۆژدا، لەو کەسانە نین کە دانا و فامیدە بن و، دڵیان زیندووبێت، بۆیە نهێنیەکانی واتای کەلامی خودایان بۆ ئاشکرا نابێت.

## چوارەمیان:

### دەبێت کەسێك بێت کە تەفسیرێکی ڕواڵەتی قورئانی خوێندبێتەوە،

وابزانێت کە واتاکانی قورئان تەنها ئەوانەیە کە پێی گەیشتووە لە تەفسیری ئیبن و عەبباس و موجاهید و ئەوانی تر، جگە لە مانە هەر واتایەکی قورئان لێکدرابێتەوە ئەوە تەفسیرە بە (ڕەئی).

وە هەر کەسێکیش بەڕای خۆی لێکدانەوەی مانای قورئان بکات، وەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی ئەوە شوێنی خۆی لە ناو ئاگردا دابنێت، (( أَنَّ مَنْ فسَّرَ القُرآنَ بِرَأْيِهِ،فقَد تَبَوَّأَ مَقعَدهُ مِنَ النَّار))[1] ئەم تێگەیشتنەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەردەو حیجابە گەورەی نراوەتە سەر دڵیانەوە، لە (دەروازەی چوارەمدا)ڕوونی دەکەینەوە. وە ئەم تێگەیشتنەیش، دژایەتی هەیە لەگەڵ فەرموودەکەی حەزرەتی عەلی دا(خودای لێ ڕازی بێت)

((إلاّ أنْ يَؤتِيَ اللهُ عَبداً فَهما مِنَ القُرآن))

واتە: مەگەر خودا جۆرە تێگەیشتنێك ببەخشێت بە هەربەکێك لە بەندەکانی، خۆ ئەگەر واتای قورئان تەنها ئەو واتایانەبێت کە لە زاناکانەوە گەیشتوون و وەرگیراون، ئیتر هیچ جیاوازیەك ڕووی نەدەدا لە واتاکردنیاندا.

---

(١) رواه الترمذي (٢٩٥١).

## حەوتەم: تایبەتمەندکردنی حوکمەکان:

با وای دابنێت؛ کە فەرمان و وتەو خیطابی خودا ڕاستەوخۆ ڕووی لە خۆی کردووە و ئەو دەگرێتەوە، ئەگەر فەرمان بە کردن یان نەکردنی شتێکی بیست، وای دادەنێت ئەو فەرمانە ڕووی لەو کردووە. ئەگەر گوێ بیستی بەڵێن و هەڕەشەیەك بوو، وابزانێت بۆ خۆیەتی، ئەگەر گوێی بە چیرۆك و بەسەرهاتی ئوممەتە پێشووەکان و پێغەمبەرانەوە بوو، بزانێت کە تەنها گێڕانەوە و چیرۆکخوانی مەبەست نەبووە، بەڵکوو مەبەستی ئەوەیە کە ئامۆژگاری لێ وەربگرێت، با چەندێك حاڵی پێی بگۆڕڕێت، ئەوەندەی لێبکاتە توێشووی داهاتووی، چونکە هەر چیرۆك و بەسەرهاتێك لە قورئاندا هاتبێت، هێنانەکەی بەمەبەست بووە، کە سودێکی تێداهەبێت بۆ (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ و ئوممەتەکەی، بۆیە خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ﴾ (هود/١٢٠)، واتە: دڵی تۆی پێ دابمەزرێنین، کەواتە: دەبێبەندەیش وا دابنێت، کە خودا ویستوویەتی دڵی ئەو جێگیرو دامەزراو بکات، بە چیرۆك و بەسەرهاتی ژیان و، ئەحواڵی ئەو پێغەمبەرانە و، ئارامبوونیان لەسەر ئەو هەموو سزایەی ڕوبەڕوویان بووەتەوە، وە خۆڕاگری و مانەوەیان لەسەر دینەکەیان، کە چاوەنواڕی یارمەتی خودایان کردووە، تا سەرکەوتنی پێ بەخشیون .

چۆن دەبێت وای دانەنابێت؟ کە دەزانێت قورئانیش بە تایبەتی بۆ پێغەمبەر ﷺ نەهاتۆتە خوارەوە، بەڵکوو ڕێنومایی هەموان دەکات و شیفابەخش و نوورو ڕەحمەتە بۆ هەموو جیهانیەکان، بۆیە خودای گەورە فەرمانی بە هەموان داوە کە ستایشی نیعمەتی ناردنی ئەو پەڕاوی قورئانە بکەن، وەك خودا دەفەرموێت: ﴿وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ﴾ (البقرة/٢٣١)، بیر لە نیعمەتەکانی خودا بکەنەوە،

کەنـاردوویەتیە خـوارەوە بـۆ سـەرتان، وە ئەو پەڕاوو حیکمەتیـیش کە بـۆی ناردوون، وە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ (الأنبیـاء/١٠) ئـێمە کیتابێکمـان بـۆ نـاردوونەتە خـوارەوە، پەنـدو ئامۆژگاریتـانی تێدایە، دەی بۆ ئەقڵتان پێی ناشکێت و بڕوای پێ ناهێنن.

یان خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُـمْ يَتَفَكَّـرُونَ ﴾ (النحـل/٤٤) بـۆیە قورئانمـان نـاردەخوارەوە بـۆ لای تـۆ ، تـائەوەی بۆیـان دابەزیـوە تـۆ بـۆ خەڵـکەکەی ڕوون بکەیـتەوە، ئەوانـیش بیـری لێبەکەنەوەو، خۆیانی لەسەر چاك بکەن، ڕێگای دروست هەڵبژێرن.

یان دەفەرموێت: ﴿كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَالَهُمْ﴾( محمد/٣)

واتە: خودا ئاوەها نموونە بۆ خەڵکی دەهێنێتەوە، لە حاڵ و وەزعی خۆیان، کە تاقمێکیان کافرو تاقمێکیان موسوڵمانن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ اتَّبِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ ﴾ (الأعراف/٣)

ئێوە شـوێن ئەو فەرموودانە بکەون، کە لە لایەن خـودای خۆتانەوە بۆتـان هـاتۆتە خـوارەوە، کە پەیڕەوی لێبەکەن، ئەم قـورئـانە بەرچـاوی خەڵکی ڕوون و ڕۆشـن کـردۆتەوە، وە مـایەی خێـرو ڕێنمـایی و ڕەحمەتیشـە، بـۆ ئەو تاقمـانەی متمانەو بڕوای دامەزراویان هەیە: وەك فەرموویەتی:

﴿هَذَا بَصَائِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ (الجاثیة/٢٠).

یان دەفەرموێت:﴿هَذَا بَيَانٌ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِلْمُتَّقِينَ﴾ (آل عمران/١٣٨)

ئەمەی ناردوومانە، ڕێگای ژیان بۆ هەموو کەسێك ڕوون و ئاشکرا دەکات، وە ڕێنومایی ئیماندارانەو، مایەی ئامۆژگاریشە بۆیان.

وە ئەگەر بە خیطـابی خـودایی مەبەسـتی هەمـو خەڵـکەکە بێـت، کەواتە مەبەستی تاکەتاکەکانیشیەتی، کەواتە: ئەو کەسەی قورئان خوێنەکەیە، وەك ئەوە ئـاوایە بە تـایبەتی ڕووی لەو کردبێـت ، ئیتـر ئەو هەقی بەسـەر خەڵکـانی دیکەوە نەبێت؟!

ئەو وادابنێت کە تەنها خۆیەتی و لەگەڵ ئەویەتی، وەك خودا فەرموویەتی

﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لِأُنْذِرَكُمْ بِهِ وَمَنْ بَلَغَ ﴾ (الأنعام/١٩)

خودا ئەم قورئانەی بەوەحی و نیگا ناردۆتە سەرم، کە بتانترسێنم و وەبیرتان بهێنمەوە، وە ئەوەیش کە پێی دەگات.

محەممەدی کوڕی کەعبی قورەضی فەرموویەتی:

ئەوەی قورئانی پێ گەیشتبێت، وەك ئەوە وایە کە خودا بۆخۆی فەرمایشتی لەگەڵدا کردبێت.[١]،

ئەگەر بەم شێوەی دانا و بیری کردەوە، ئیتر بەچاوێکی تر سەیری قورئان دەکات، نەك تەنها وەك کارکردن و کاردانەوەیەك، بەڵکوو بەشێوەیەك دەیخوێنێتەوە، وەك ئەوەی بەندەیەك نامەیەکی لە گەورەو مەولاکەیەوە پێ گەیشتبێت، بۆ ئەوەی سەرنجی بدات و کار بە ناوەڕۆکەکەی بکات.

بۆیە هەندێك زانا فەرموویەتی: ئەم قورئانە چەند نامەو پەیامێکە لە لایەن خودای (عَزَّ وجَلَّ) ەوە بۆمان هاتووەو، پرپەتی لە بەڵێن و بەڵگەنامە، دەبێت لە نوێژەکاندا لێی وردبینەوە، وە لە جێگا خەڵوەتیەکاندا لەسەریان ڕابووەستین، وە لە گوێڕایەڵی و بەندایەتیەکاندا، بە پێی سوننەت و پەیڕەوێکی تەواو شوێنیان بکەوین و جێبەجێیان بکەین[٢]،

مالیکی کوڕی دینار (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ئەی بڕواداران، هێشتا قورئان نەچێنراوە لە دڵتاندا، دەبێ ئەوە بزانن کە قورئان بەهاری دڵی باوەڕانە، وەك چۆن باران هۆکاری وەرزی بەهاری سەر

---

(١) رواه الطبري في تفسيره ٢٠٦/٧/٥) وفيه: فكأنما رأى النبي ﷺ.

(٢) أورده صاحب القوت، ٥٨/١، عن الحسن البصرى (رضي الله عنه).

ڕووی زەوییە[١]،

قەتادە (خودا لێی خۆش بێت) فەرموویەتی:

هیچ کەسێك هاونشینی ئەم قورئانە نەبێت ، ئەگەر زیادو کەمی لەگەڵدا نەکردبێت، وەك خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إِلَّا خَسَارًا﴾ (الإسراء/٨٢)

ئەگەر لەو کەسانەبێت کە بە بڕوادار دەناسرێن، دەبێتە شیفا و چارەسەر بۆیان، بەڵام ئەوانەی زوڵم دەکەن و سنوورەکانی دەبەزێنن و پێی هەڵناستن، ئەوە تابێت زیاتر دوچاری کەموکوڕی و نەهامەتییان دەکات[٢].

## هەشتەم:

## کاریگەری بکەوێتەسەر:

ئەوەیە کە دڵی بە چەندین جۆری جیاجیا بکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە، بە پێی جیاوازی ئایەتەکان، بە پێی شێوەی تێگەیشتنەکەی، هەرجارەی جۆرە حاڵ و وەجد و گەرمییەك ڕوو لە دڵی بکات، یان شێوەی ترس و حوزن و خۆفی خوداو گریان و هیواو ڕجاو حاڵەتی تر، وە هەرچەندێك باشتر لە واتای ئەوەی دەیخوێنێتەوە شارەزاتر ببێت، ئەوا زیاتر ترسان لە خودا زاڵ دەبێت و، زۆربەی حاڵەتەکانی بەم شێوە دەبێت، چونکە بەرتەنگییەك هەست پێدەکەیت لە تێڕامانی ئایەتەکانی قورئان، نابینرێت باسی ڕەحمەت و لێخۆشبوونێك بکرێت،

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية(٣٥٨/٢) ونصه: **يا حملة القرآن ماذا زرع القرآن في قلوبكم، فان القرآن ربيع المؤمن، كما أنَّ الغيث ربيع الأرض، وقد ينزل الغيث من السماوات إلى الارض فينبت الحشيش، فتكون فيه الحبة فلا يمنعها نتَنُ موضعِها أن تهتَز وتخضرَّ وتحسن، فيا حملَة القرآن، ماذا زرع القرآن في قلوبكم؟ أين أصحاب سورة ؟ أين أصحاب سورتين؟ ماذا عملتم فيهما؟**

(٢) رواه ابن مبارك في الزهد (٧٨٨)، والفرياني في (فضائل القرآن) ٧٨، من طريقه.

ئەگەر نەپێچرابێــــت بە هەنـــدێك مەرجەوە، كە تەنـــانەت عـــاریف و خوداناسانیش

ناسین و پێگەیشتنیان لە كورتی دەدات بۆ پێگەیشتنی.

بۆنمـوونە خـودا فەرمـوویەتی: مـن لێبـوردەم بۆیـان: ﴿وَإِنِّي لَغَفَّـارٌ﴾، بەڵام چـوار مەرجی دیـاری كـردووە: ئەو كاتە خـۆش دەبێـت كە: تەوبە بكەن و بـڕوای بتەویان هەبێت، كردەوەی چاكە بكەن و لەسەر ڕێنمایی تەواو بڕۆن بەڕێوە: ﴿لِّمَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى﴾ (٨٢/طه).

وە فەرمـوودەی خـودا: ﴿ وَالْعَصْـرِ . إِنَّ الْإِنْسَـانَ لَفِـي خُسْـرٍ . إِلَّا الَّـذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ (٣/ العصر)

كەسـوێند بە زەمـان دەخـوات و دیـاری كـردووە: ئەو مرۆڤـانە بەختیـارن و خەسـارەت مەنـدنین، كە بـڕوادارین، وە كـردەوەی چاكیـان هەبێـت و، وەسـێت بە حەق و ڕاستی و، وەسێت و بە صەبرو خـۆڕاگری بكەن. وەك دەبینین چـوار مەرجی دیـاری كـردووە. وە ئەگەر بە كـورتیش بەیـانی كردبێـت، تەنهـا مەرجێكی گشتگیری داناوەو دەفەرموێت:

﴿إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾ (الأعراف/٥٦)

ڕەحمەتی خودا نزیكە لە چاكەكارانەوە، وە صیفەتی ئیحسانیش هەموویان لە خـۆ دەگرێـت، ئەوەی لە سـەرەتاوە تـا كۆتـایی قورئـان بخـوێنێتەوە، هەر بەم شێوە لێی حاڵی دەبێت، ئەوەیش بەم شێوە تێ بگات:

دەبێـت هەمیشـە بە حـوزن و خەفەت و ترسـانەوە لە حزوری قورئانـدا بیـر بكاتەوە، بۆیە پێشەوا حەسەنی بەصری (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

وەڵلاهی هیچ بەندەیەك نیە ڕۆژی لێبێتەوەو، بە بڕواوە قورئانی خوێندبێت ، كە كــاریگەری ئەو خوێنـــدنەوەیە زیــاتر حــوزنی دڵــی زیــاد نەكردبێــت و، شادمانیەكانیشی كەمتر نەكردبێتەوەو، گریانی زۆر نەبووبێت و، پێكەنینی كەم

نەکردبێتەوە. وە ماندوبوون و کارو سەرقاڵی زیاد نەبێت و وە ئیسراحەتی کەم نەبێتەوە و کاتی فەراغیشی کەم نەبێتەوە.[١] .

وەهبی کوڕی مونەبیە (خودای لێی خۆش بێت) فەرموویەتی: سەیری ئەو فەرموودە و ئامۆژگاریانەمان کرد، نەمان بینی هیچ شتێك دڵ ناسك بکاتەوەو حوزن و گریان بهێنێت بۆی زیاتر و چاکتربێت لە خوێندنەوەو تێگەیشتن و بیر کردنەوە لە قورئان[٢]،

دیاریبوونی کاریگەری خوێندنەوەی قوئان لەسەری بەوەیە: کە وەك صیفەتی ئایەتە خوێنراوەکەی لێبێت، لەکاتی هەڕەشەکان و بەستنەوەی لێخۆش بوونی خوداوە، بەو کۆمەڵە مەرجانەی کە باسمانکردن، دەبێت لە ترساندا بێتەوەیەك، وەك ئەوەی خەریك بێت بمرێت، وە لەکاتی باسی فراوانی ڕەحمەتی خوادا، وە مژدەی لیخۆشبووندا، ئەوەندە دڵی خۆش ببێت، وەك ئەوەی ئێستا لە خۆشیدا باڵ بگرێتەوە، وە لە کاتی ناوبردنی خوداو صیفەت و ناوەکانیدا، دەبێ سەری گەردن کەچی بۆ جەلال و گەورەیی خوا دابنەوێنێت، وە هەست بەو سام و هەیبەتە بکات لە حزویدا، وە لە کاتی ناوبردنی کافرەکاندا، کە هەندێك قسەدەکەن کە هەرگیز نابێت بدرێتە پاڵ خوداوە. وەك باسی هاوسەر و منداڵ، کە (پەنا بەخودا) دەیدەنە پاڵی، دەبێت ئەوەندە دەنگی خۆی بە سووکی و شەرمەوە دەربڕێت، کە ناڕەوایی و نالەباری گوفتارە کوفرەکەیان دەربخات، وە کاتێکیش کە تاریفی بەهەشت دەکات، وای باس بکات کە خەریکە لە دەروونەوە باڵی بۆ دەگرێتەوە، وەکاتێك باسی ئاگری دۆزەخیش دەکات، دەبێت لەرز بکەوێتە دەمارو ئەندامەکانی لەشیەوە، لەو ترس و بیمەی کە بۆی پەیدا دەبێت و ڕووی تێ دەکات.

---

(١) قوت القلوب (٤٧/١).

(٢) رواه أبو نعيم في الحلية (١٤٢/٨).

هەرلەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ بە عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودی فەرمووە: ((إِقرَأْ عَلَيَّ))، قورئانم بەسەردا بخوێنەرەوە، دەفەرموێت:

لە سوورەی (نیساء)ە وە دەستم پێ کرد، کە گەیشتمە ئایەتی: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلَاءِ شَهِيدًا﴾ (النساء/٤١)

دەبێ حاڵی ئەو کافرانە چی لێبێت، کە پێغەمبەرەکانیان شایەتی لەسەر بێ باوەڕی و خراپییان دەدەن و، تۆیش بهێنین شایەتی لەسەر ڕاستی قسەی پێغەمبەرەکانیان بدەیت،؟[1]، بینیم هەردوو چاوی فرمێسکیان دەڕشت، فەرمووی پێم: ئیتر بەسە،((حَسْبُكَ الآنَ))،[2]،چونکە بینینی ئەو دیمەنە ترسناکە تەواوی دڵ و دەروونی داگرتبوو، کە لە ژێر کاریگەری ئایەتەکەدا بوو. وە هەندێك لەوانەی زۆر دەترسان، لەکاتی بیستنی ئایەتی هەڕەشە ئامێزدا بێهۆش دەکەوتن، وە هەندێك لەوانە لە حەیبەتی بیستنی ئەو ئایەتانەدا مردبوون، [3]، نموونەی ئەم حاڵەتانە لەوە دەری دەکات کە بووترێت:

تەنها قسەو باسەکان دەگێڕێتەوە، ئەگەر وتی:

﴿إِنِّي أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (الأنعام/١٥) واتە: ئەگەر بێگوێی فەرمانی خودا بکەم، من دەترسم لە سزایەکی سەخت و گەورە.

خۆ ئەگەر ئەم قسەی بەڕاست نەبێت، کەواتە چیرۆکێکەو دەیگێڕێتەوە، وە ئەگەر وتی: ﴿رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ﴾ (الممتحنة/٤)

---

(١) خۆلاصە (/٨٥)

(٢) رواه البخاري (٤٥٨٢)، ومسلم (٨٠٠).

(٣) وقد ألَّف الثعلبي في ذلك كتابا سماه(قتلى القرآن) (٤٤٥) عن بهز بن حكيم قال: وانظر الإتحاف(٥١٩/٤) **وكان زرارة بن أوفى قاضى البصرة، وكان يؤم في بني قشير، فقرأ يوماً في صلاة الصبح، فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ (٨) فَذَلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ. خرَّ ميتاً، فكنت فيمن احتمله إلى داره.**

پەروەردگارم، تەنها پشت و پەنامان بە تۆیەو، بۆ حزوری تۆ گەڕاوینەتەوە، ئەگەر حـالەتەکەی لە ڕاستیشـدا لەسـەر تەوەککـول و تەوبە و گەڕانەوە دانەمەزرابوو، ئەوە بە چیرۆکخوان دادەنرێت.

وە ئەگەر وتی:﴿وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَى مَا آذَيْتُمُونَا﴾(إبراهيم/١٢)بڕیاربێت لەسەر ئەو هەموو ئێش و ئازارەی ڕوبەڕووی بووینەتەوە خۆڕاگرین. با لە حاڵەتی صەبرو ئیرادەیەکی بەهێـزدا بێـت، هەتـا شـیرینی خوێندنەوەکە هەست پێبکات، ئەگەر ئەم صیفەتانەی نەبێـت، وە دڵیشی لە نێوانی ئەم حاڵەتانەدا ئەمسەرەو سەر نەکات. کەواتە تەنها بەشـێك کە وەریـدەگرێت لە خوێنـدنەوەکەی، جوڵانـدنی زوبـانیەتی، لەگەڵ ئەوەی کە بە ئاشـکرا لەعـنەت لە خـۆی دەکـات، لەم ئایەتەدا کە بیخوێنێتەوە:

بەری بوون لە ڕەحمەتی خودا لە سەر زاڵمان بێت، ﴿أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ (هود/١٨) وە لە فەرموودەی خوادا:

﴿كَبُرَ مَقْتًا عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ (٣/الصف)

واتە: ئەگەر قسەیەك بۆ خەڵکی بکەن و لە خۆتاندا جێبەجێی نەکەن، ئەوە ڕوبەڕووی توڕەیی و بێزراوییەکی توندی خودایی دەبنەوە.

یان فەرموودەی خودا: ﴿وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُعْرِضُونَ﴾ (١/الأنبياء). ئەوانە لە ناو بێ ئاگاییدا پشتیان لەڕاستیەکان کردووە.

وە فەرموودەی خودای (عَزَّ وجَلَّ) :

﴿فَأَعْرِضْ عَنْ مَنْ تَوَلَّى عَنْ ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا﴾ (النجم/٢٩)

پشـت بـکەرە ئەو کەسـەی ڕو لە زیکـرو قورئانەکەمـان وەردەگێڕێـت، وە تەنها مەبەستیش کە هەیبێت: دابین کردنی ژیانی دونیایە.

وە لە فەرمـوودەی خـودای گەورەدا: ئەوانەی تەوبە نەکەن و نەگەڕێنەوە لە گوناە ، ئەوانە بە زاڵم دەژمێررێن، ﴿وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾

(حجرات/١١)، ئەمانەو كۆمەڵێ ئایەتی تر لەم بارەیەوە.

وە دەچێنە ناو ئەو كۆمەڵە نەخوێندەوارەوە، كە خودا باسیان دەكات و دەفەرموێت: ئەوانە تیایاندایە كە نەخوێندەوارن، شارەزاییان لە ناوەرۆكی ئەو قورئانە پیرۆزە نیە، بەڵكوو تەنها دەیخوێننەوەو بەس،

﴿وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ الْكِتَابَ إِلَّا أَمَانِيَّ﴾.(البقرة/٦٨)،

هەروەها لە فەرموودەی خوادا:﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴾(١٠٥/يوسف)

واتە: گەلێ ئایەت و بەڵگەی بەهێز هەیە لە ئاسمانەكان و زەویدا، كە ئەوانە دەدەن بە لایداو چاویان پێیان دەكەوێت و، ڕوویشیان لێ وەردەچەرخێنن و پەندیشیان لێ وەرناگرن.

چونكە قورئان بۆخۆی ڕوونكەرەوەی ئەو بەڵگەو ئایەتانەیە لە ئاسمانەكان و زەویدا، خۆ ئەگەر باسیان بكرێت و ، ئەمیش لێیان وردنەبێتەوەو بیریان لێ نەكاتەوە، ئەوە پشتی تێ كردوون، بۆیە فەرموویانە:

ئەوەی هەڵگری ئاكارو ڕەوشتی بەرزی قورئانی نەبێت، ئەگەر قورئانی خوێندەوە، ئەوا قورئانەكە بانگی لێدەكات، تۆ چیتە بەسەر كەلامی منەوە، كە حاڵت وایە پشتت لەمن كردووە، بۆچی كەلامی من دەخوێنیتەوە، مادەم ناگەڕێیتەوەو تەوبە ناكەیت، ئەوا بە یەكجاری وازیش لە كەلامی من بهێنە[1] .

نموونەی ئەو تاوانبارەی كە قورئان دەخوێنێت و، دوپاتیشی دەكاتەوە، وەك ئەو كەسە وایە كە نامەیەكی لە لایەن مەلیكەوە پێگەیشتبێت و هەمیشە خەریكی خوێندنەوەی بێت، ئەو بۆی نوسیبێت: كە وڵاتەكەی ئاوەدان بكاتەوەو ئەمیش بەردەوام خەریكی وێرانكاری بێت تیایدا، لەگەڵ ئەوەشدا تەنها خەریكی

---

(١) رواه البيهقي في الشعب(٢٣٨٢).

دیراسەکردنی نامەکەیەتی، خۆ ئەگەر لە کاتی سەرپێچی کردنەکانیدا وازی لە لێکدانەوەو توێژینەوەی نامەکەی پادشا بهێنایە، ئەوە نەدەبووە جێگەی گەمەو گاڵتە پێکردنی، وە شایستەی غەزەب و توڕەیی سەخت نەدەبوویەوە.

بۆیە یوسفی کوڕی ئەسباط فەرموویەتی:

من جاری وا هەیە دەمەوێت قورئان بخوێنم، کە بیر دەکەمەوە لەو هەموو فەرمانە گرنگانەی تێیدایەتی، لە ترسی تۆڕەبوونی خودا ناوێرم بیخوێنم و لادەدەمەوە بەلای تەسبیحات و زیکرو داوای لێخۆشبووندا[١].

ئەوەی پشتی لێ کردووە و کاری پێناکات، ئەو کەسەیە کە قورئان باسی دەکات و دەفەرموێت:

﴿فَنَبَذُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ وَاشْتَرَوْا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ﴾ (آل عمران/١٨٧)، واتە: فەرموودەکانی خودایان خستۆتە پشتیانەوەو نەیان گەیاندووەو، لەبری هەندێك دەسکەوتی بێ نرخی دونیایی فرۆشتویانە و گۆڕیانەتەوە، بەڕاستی کارێکی ناشیرین و بەدیان ئەنجامدا.

هەر لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(( إقرَؤُوا القُرآنَ ما ائتَلَفَتْ عَلَيهِ قُلُوبُكُم، وَلانَتْ لَهُ جُلُودُكُم، فإذا اختَلَفتُم فَلَسْتُم تَقرَؤُنَهُ، وفي بعضِها: فإذا اختَلَفتُم، قوموا عَنهُ)) [٢]

ئەوەندە قورئان بخوێننەوە، کە دڵەکانتان لەسەری کۆ بێت، لێك نەترازێن، وە پێستی لەشتان بۆی نەرم بووبێت، بەدەم ئاوازی خوێندنەوەکەوە بڕوات، واتە (خشية الله) ڕووی تێ بکات. خۆ ئەگەر دڵتان گۆڕاو جیاوازی و نەگونجاویی ڕووی لێ کردن، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە قورئانتان نەخوێندووە،

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية، ٢٤٣/٨، بنحوه، وهو بلفظه في القوت، ٥٨/١.

(٢) رواه البخاري(٥٠٦٠)، ومسلم(٢٦٦٧)، دون قوله: ولانت له جلودكم. واللفظ لصاحب القوت:( ٥٨/١ ).

وه له ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: ئەگەر جیاوازی کەوتە میانتانەوە و، دڵتان کۆ نەبوو لەسەری، ئەوا لەسەر خوێندنەوەکەی هەستن

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ **الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا**﴾ (الأنفال/٢).

ئەوانەن کە ناوی خودایان لە لاباسکرا، دڵیان دائەچڵەکێت و، دەروونیان دەهەژێت، وە ئەگەر ئایەتەکانی خودایان بەسەردا بخوێنیتەوە، بڕوایان زیاتر دەبێت.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی ئەو کەسەی لە هەموان دەنگی خۆشترە، بۆ خوێندەوەی قورئان ئەوەیە: کە گوێت لە دەنگی بوو دەیخوێند، ترس و خۆفی خودای پێوە دیاربێت:

**((إِنَّ أَحسَنَ النَّاسِ صَوتاً بالقُرآنِ، الذي إذا سَمِعتَهُ يَقرَأُ، رأَيتَ أَنَّهُ يَخشَى اللهَ (عَزَّ وجَلَّ)** [١]،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(( لا يُسمعُ القرآنُ مِن أحدٍ أشهى مِنهُ مِمَّن يَخشَى اللهَ عزَّ وجَلَّ))**[٢]،

---

(١)رواه ابن ماجه بسند ضعيف من حديث جابر(١٣٣٩). قال الزبيدي(٥٢١/٤): ورواه البيهقي في شعب الإيمان٣٨٨/٢(٢١٤٥) عن ابن عباس، ورواه الخطيب في تأريخ بغداد( ٢٠٨/٣)، بلفظ: **أحسن الناس قراءةً الذي إذا قرأ رأيت أنه يخشى الله**. وأما حديث جابر ففيه عبدالله بن جعفر وفيه وفي شيخه ابراهيم بن اسمعيل ابن مجمع ضعفٌ، وهذا معنى قول العراقي بسند ضعيف، وأما حديث ابن عمر فروي من طرق منها مرسلٌ، فقد رواه الدارمي في كتاب فضائل القرآن(٣٤٨٩)، نحوه.

(٢) رواه أبو عبدالله الحاكم فيما ذكره أبو القاسم الغافقي في كتاب فضائل القرآن، قال الزبيدي (٥٢٢/٤): قلت: ولم يذكر صحابِيَّهُ، وقد رواه ابن مبارك في الزهد مرسلاً( ٣٧/١ (١١٣) عن طاووس. وقال السبكي لم أجد له إسنادا.

واتە: گوێت لێ نابێت لە کەسێك کە بەتام و چێژتر قورئان بخوێنێت، لەو کەسەی کە ترس و(خشية الله) لە دڵیدا هەیە.

بۆیە مەبەستە کە قورئان بخوێنرێت، تا ئەو واتاو حاڵەتە تایبەتیانە ڕابکێشێت بۆ ناو دڵ و کاری پێبکات، ئەینا جوڵاندنی زوبان، بۆ دەربڕینی پیتەکان ئەرکێکی سووك و ئاسانە. بۆیە یەکێك لە قورئان خوێنەکان دەفەرموێت:

لە خزمەت مامۆستایەکمدا قورئانم خوێند، لەپاشان گەڕامەوە دیسان بۆی بخوێنمەوە، سەرزەنشتی کردم و فەرمووی:

وادەزانیت تەنها ئەوەندەی قورئان بخوێنیتەوە بەسەر مندا ئیتر ئەمە کارت پێ کردووە،؟!

بڕۆ قورئانەکەت لە حزوری خوادا بخوێنەرەوە، بزانە فەرمانت بە چی پێدەدا و چی لێوە فێر دەبیت[1]،

کارو سەرقاڵ بوونی صەحابەکان (خودایان لێ ڕازی بێت) بەمەوەبوو کە بزانن حاڵیان گۆڕاوە و توانیویانە کاری پی بکەن، تا ئەو کاتەی (حەزرەتی) پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، بیست هەزار صەحابەی لە دوا بەجێ ما[2]، تەنها شەش کەسیان هەموو قورئانیان لەبەر بوو، لە دوانیشیاندا ڕای جیاواز هەبوو لەسەریان[3]، ئەوانی تر زۆربەیان سوورەتێك یان دوانیان لەبەر بووە، [1]، وە

---

(١) قوت القلوب( ٥٨/١) ولفظه: فانظر ماذا يسمعك منه، وماذا يفهمك عنه.

(٢) ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێت، تەنها لە مەدینەدا، ئەینا وەك (أبو زرعة) ڕیوایەتی کردووە پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد صەدو چوارده هەزار صەحابەی لێ بەجێما، کە ڕیوایەتی لێ کردوون و فەرموودەی لێ بیستوون. إتحاف( ٥٢٢/٤).

(٣)روى البخاري (٣٧٥٨) ومسلم (٢٤٦٤)، عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنهما) مرفوعا: **إستقرئوا القرآن من أربعة : من عبدالله بن مسعود_فبدأ به_ وسالم مولى أبي حذيفة، وأبي بن كعب، ومعاذ بن جبل**، وروى البخاري(٣٨١٠)، ومسلم(٢٤٦٥) من حديث أنس

ئەوەی کە سوورەتەکانی (البقرة آل عمران) ی لەبەر دەکرد، لە زاناکانیان بوون [٢]. کاتێك یەکێك هات بۆ ئەوەی قورئان فێر ببێت، کە گەیشتە ئایەتی:

**﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴾** (الزلزلة/٨) ئەوەی بە ئەندازەی پارچەی گەردیلەیەك چاكە بكات، پاداشتەکەی دەبینێتەوە، ئەوەش بەو ئەندازە خراپە بكات دەیبینێتەوە، فەرمووی: ئەوەندەم بەسە، ئیتر هەڵساو ڕۆشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

**(( إنصَرَفَ الرَّجُلُ وهُوَ فَقيهٌ ))** [٣] ، ئەو پیاوە ڕۆشت و ئێستا شارەزایە.

---

(رضي الله عنه) قال: **جمع القرآن على عهد رسول الله ﷺ أربعه كلهم من الانصار: أبي ابن كعب ومعاذ ابن جبل و زيد و ابو زيد.** قال قتادة: مَن أبو زيد؟ قال أنس: أحدُ عُمومَتي. وبالروايتين يظهر الخلاف في الإثنين المختلف فيهما.

(١) رواه ابن الأنباري في الصاحف(ذكر سنده القرطبي في تفسيره،( ٤٠/١) عن ابن عمر قال: **كان الفاضل من أصحاب رسول الله ﷺ فى صدر هذه الأمة لايحفظ من القرآن إلا السورةَ ونحوها، ورزقوا العَمَلَ بالقُرآن، وإن أخر هذه الأُمَّةَ يقرؤون القرآن منهم الصبي والأعمى، ولا يرزقون العمل به.**

(٢)روى الترمذي وحسَّنه من حديث أبي هريرة قال: **بعث رسول الله صلى الله عليه وسلم بعثا وهم ذو عدد فاستقرأهم، فأستقرأ كلُ رجل منهم ما معه من القرآن، فأتى على رجل من أحدثهم سنا، فقال ما معك يا فلان؟ قال معي كذا وكذا وسورة البقرة، فقال أمعك سورة البقرة؟ فقال نعم، قال اذهب فانت أميرهم..** الحديث

(٣) أخرجه أبو داود(١٣٩٩)، والنسائي في الكبرى(١٦/٥(٨٠٢٧)، وابن حبان في صحيحه (٥٠/٣(٧٧٣) والحاكم في المستدرك(٥٨٠/٢(٣٩٦٤)، وصححه، من حديث عبدالله بن عمر، قال: أتى رجل رسول الله صلى الله عليه وسلم فقال اقرئني يا رسول الله الحديث، وفيه: **فأقرأه رسول الله ﷺ إذا زلزلت الارض حتى فرغ منها، فقال الرجل: والذى بعثك بالحق، لا أزيد عليها أبدا، ثم أدبر، فقال رسول الله ﷺ أفلح الرويجلُ أفلحَ الرُّوَيجِلُ** ولاحمد في مسنده(٢٠٠٧٠)، والنسائى في الكبرى(٥٢٠/٦/١١٦٩٤) من حديث صعصعة عم الفرزدق أنه صاحب القصة، وقال **حسبي لا أُبالي أن لاأسمعَ غيرها.**

ئەو خوێندنەوەیە ناوازە و نایابە کە خاوەنەکەی ئەو حاڵەتەی بۆ پەیدا ببێت، کە خودا بە منەتێکی تایبەتی دەیخاتە دڵی هەندێك لە بەندەکانی، ئەویش دوای تێگەیشتن لە واتاکەی، ئەینا بە تەنها زوبان جوڵاندن بایەخێکی ئەو تۆی نابێت، ئەمەیشە مەبەست لەم ئایەتە:

﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا، وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى﴾ (طه/١٢٤)

واتە: ئەوەی پشت لەم قورئانە هەڵبکات، ئەوە دوچاری ژیانێکی سەخت و تەنگی دەبێتەوە، وە لە دوارۆژیشدا بە کوێری حەشری دەکەین.

هەروەها فەرموودەی خودا:

﴿كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنْسَى﴾(١٢٦/طه)

ئایەتەکانی منت پێگەیشت و لە بیری خۆتت بردەوە، ئەمڕۆیش تۆ لەبیر دەکرێت و بایەخت پێ نادرێت، واتە: وازت لێ هێناو سەیرت نەکرد و، بایەخت پێینەدا، چونکە کەسێك لە فرمانێکدا کەمتەرخەمی بکات، پێی دەوترێت: لەبیری خۆیی بردۆتەوە.

وە خوێندنەوەی قورئان بەو شێوەی کە مافی خۆیی پێ بدەیت، دەبێت زوبان و دڵ و ئەقڵت هەمووی هاوبەش بن لە گرنگی پێدانی، بەشی زوبان ئەوەیە کە پیت و وشەکانی بپارێزێت و، لە کاتی تەرتیلدا هەڵەی تێدا نەبێت، بەشی ئەقڵیش ئەوەیە کە: واتاکەی لێکداتەوە و تێی بگات، وەبەشی دڵیش ئەوەیە کە: ئامۆژگاری لێ وەربگرێت و، کاریگەری لەسەری پەیدا ببێت و، خۆی لە خراپە بپارێزێت و فەرمانبەرداری بکات.

کەواتە زوبان بە جوانی دەیخوێنێتەوە و، ئەقڵیش واتاکەی وەردەگێڕێت و لێی تێدەگات، وە دڵیش پەند و ئامۆژگاری لێ وەردەگرێت.

## نۆیەم: بەرزبوونەوە:

مەبەستم پێی: ئەوەندە بە خوێندنەوەی قورئان بەرزبێتەوە، تا دەگاتە ئەو ئاستەی کە وەك لە خودای(عَزَّ وجَلْ) ە وە کەلامەکە ببیستێت، نەك لە خۆیەوە، کەواتە سێ جۆر پلەی خوێندنەوە هەیە:

**نزمەکەیان:** دەبێ ئەو بەندەیە وای دابنێت، کە بۆ خودای دەخوێنێتەوە، وە لە حزوریدا ڕاوەستاوە و خودای گەورەیش سەیری دەکات و گوێی لێدەگرێت، کەواتە حاڵەتەکەی کە بەم شێوە بێت، ئەوا داواکردن و خۆساچاندن و لاڵەو پاڕانەوەوەیە، بەشێوەیەك لە نزاو دوعاوە نزیك بێت،

**دووهەمەکەیان:** وای لێبێت، بەدڵی خۆی ببینێت کە خودا ﷻ وا دەیبینێت و، بە لوتف و میهری خۆی دەیدوێنێت و، بە هۆی نیعمەت و چاکەکانیەوە موناجاتی لە حزوری خوادا دەکات ، کەواتە لە حاڵ و مقامی شەرمکردن و بەگەورەزانین و، گوێ گرتن و تێگەیشتندایە لە حزوری خوادا.

**سێیەم:** دەبێت لە خوێندنەوەی قورئانەکەدا خودای تێدا ببینێت، وە لە وشەکاندا صیفەتەکانی خودا ببینێت، سەیری خودی خۆی و خوێندنەوەکەی خۆی نەکات، وە لایشنەکاتەوە بەلای ئەوەدا کە نیعمەتەکانی خودا پەیوەندی بەوەوە هەیە لەو ڕۆووەوە کە نیعمەتەکە بەسەر ئەودا دەبارێت، بەڵکوو تەواوی بیرکردنەوەو بایەخدانی تەنها ڕوو بەو زاتە بێت کە قسەی لە حزوردا دەکات، بیری بەسترابێت پێیەوە، وەك ئەوەی کە بە بینینی ئەو زاتەی قسەی لەگەڵدا دەکات ناتوانێت بیر لەکەسی تر بکاتەوە، ئەمەیش پلەی نزیك و موقورەبینی دەرگای خودایە، وە پلە پێشووەکانیش، بۆ ئەوانەیە کە نامەی کردارەکانیان بە دەستی ڕاستیان دەدرێت، یان موریدی ئەو ڕێگایەن، وە هەرچی لەو سێ ئاستە دەرچوو، یەکێکیان نەیگرتەوە، ئەوە پلەی قورئان خوێنە بێ ئاگاو غافڵەکانە.

## لەبارەی پلەی یەکەمەوە:

ئیمام جەعفەری کوڕی محەممەدی صادق (خودای لێ ڕازی بێت) هەواڵی پیداوین و دەفەرموێت: وەڵلاهی خودای گەورە بە
تەجەللیاتی خۆی، خۆی بۆ ئەو خەڵکە دەرخستووە، بەڵام ئەوانە نایبینن.
هەروەها لەوەڵامی ئەوەدا کە توشی حاڵەتێك هاتبوو، کە بێ هۆشی خستبوو، وە بەڕودا کەوتبوو کاتێ بە ئاگا هاتەوە پرسیاریان لێ کرد ئەویش فەرمووی:

بەردەوام ئەوئایەتەی دەمخوێندەوە دەمهێنا بەسەر دڵمدا، تا وای لێ هات لەوەی کە خاوەنیەتی و قسەی پێکردووە، لەوم بیست کە دەیخوێندەوە، ئیتر جەستەم بەرامبەر توانای بێسنووری ئەو نەیتوانی خۆی ڕابگرێت.
وە لەم پلە بەرزەدا شیرینی و تام و چێژی موناجات و پاڕانەوەی حزوری خودا زیاد دەبێت، بۆیە هەندێك لە حوکەما فەرموویەتی:

کاتی خۆی قورئانم دەخوێندەوە هەستم بە شیرینیەکەی نەدەکرد، تاوام لێ هات، کە دەمخوێندەوە وام دەزانی لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیبیستم کە بۆ صەحابەکانی دەخوێنێتەوە، لەپاشان پلەیەکی تر بەرز بوومەوە، تاوام لێهات، وەك ئەوەی لە (حەزرەتی) جوبرەئیلەوە بیبیستم، (سەلامی خودای لەسەر) کە دەیخاتە ناو دڵی (حەزرەتی) پێغەمبەرەوە ﷺ ، لەپاشان لە پلەیەکی تردا، وەك ئەوەی لە لایەنی خودای (عَزَّ وجَلْ)ە وە ڕاستەو خۆ بیبیستم، من ئێستا لەخاوەنی کەلامەکە خۆیەوە دەیبیستم، لێرەدا ئەو تام چێژو شیرینیەی هەستی پی دەکەم ، ئەوەندە زۆرە، ناتوانم خۆم لەبەری ڕابگرم[1] .

(حەزرەتی) عوسمان و حوزدیفەی یەمانی(خودایان لێ ڕازی بێت)فەرمویانە:

---

(١) بۆ هەرسێ فەرموودەکە بنوارە: قوت القلوب ( ٤٧/١). وە ل(٤٩/١).

ئەگەر دڵەکان پاك ببنەوە، هەرگیز لە خوێندنەوەی قورئان تێر نابن[1]،

بۆیە وایان فەرمووە:

چــونکە ئەوەنــدە پلەیــان بەرزدەبێــتەوە، تــا دەگەنە ئەوەی کە خــودای خاوەنی کەلامەکە لە ناو وتەو فەرموودەو ئایەتەکاندا دەیبینن.

بۆیە سابتی بەنانی (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

بیست ساڵی تەواو ڕیازەی نەفسیم کێشاو جیهادی نەفسیم کرد، وە بیست ساڵی تەواویش لە ناو نیعمەتی خوێندنەوەکەدا ژیام[2].

**وە بە بینینی خاوەنی کەلامەکە:**

کە ئیتر کەســی تری لەبەرچـــاودا نەبێت، ئەوە بەجێهێنانی فەرمانێکی خودایە، کە دەفەرموێت:

﴿**فَفِــرُّوا إِلَــى اللَّــهِ**﴾، واتە: بــا ڕاکردنتــان بــۆ حــزوری خــوادا بێــت، وە فەرمانبەردای ئەم ئایەتەیەبن:

﴿ **وَلَا تَجْعَلُوا مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ**﴾ (الذاريات/٥١)

کەسێکی تر دامەنێن بەخواو پەروەردگاری خۆتان، کەواتە:

ئەوەی خودا لە هەموو شتێکدا نەبینێت، واتە :

کەسێکی تر دەبینێت، وە هەر شتێك بەندە لابکاتەوە بەلایدا جگە لە خودا ، کەواتە لای کــردۆتەوە بەلای شــتێکدا کە تووشــی شــیرکی شــاراوەی دەکـات، بەڵکوو دەبێت بزانێت، کە تەوحیدی ڕاستەقینەی پاڵفتەکراو، ئەوەیە کە لە هەموو شتەکاندا جگە لە خودای گەورە هیچی تر نەبینێت.

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية، ٧/٣٠٠)، وهو في القوت١/٥٠.

(٢) هەمان سەرچاوە ٣٢٠/٢، وە ٥٠/١، لە حلية الأولياء دا.

## دەیەم: ئێخەهەڵتەکانن:

مەبەستم پێی ئەوەیە کە: دەبێت خۆی بەری بکات لە هەموو کەسانی چواردەوری، نابێت بنازێت بە هێز و توانای خۆیدا، وە بکاتەوە بە لای نەفسی خۆیشیدا، بەوەی بە چاوی ڕەزامەندی و پاڵفتەکردنەوە بۆی بنوارێت و تەزکییەی بکات.

لە کاتێکدا ئەو ئایەتانە دەخوێنێتەوە، کە ستایشی پیاوچاك و مژدەبەخشینی تێدایە، خۆی لەو ڕیزەدا نەبینێتەوە، بەڵکوو خوداناسە متمانەدارو صددیق و نزیکەکانی تێدا ببینێتەوە، وە چاو لە ڕێ بێت، بەڵکوو خودای گەورە بیگەیێنێت بەوان.

وە ئەگەر ئایەتی توڕەبوون و سەرکۆنەکردنی یاخی و کەمتەرخەم و تاوانبارانی دەخوێندەوە، خۆی لەو ئاستەدا ببینێتەوەو، وادابنێت کە ئەو هەڕەشانە ڕو لەو دەکەن، بترسێت و بەزەیی بە خۆی دا بێتەوە.

**بۆیە (حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:**

خودایە؛ من داوای لێبوردنت لێدەکەم، لەوەی کە زوڵمم لە نەفسی خۆم کردبێت و، کوفرانەی نیعمەتیشم کردبێت، وتیان:

ئەوە زوڵمەکە دەزانین، بۆچی باسی کوفر دەکەیت؟

ئەویش ئایەتەکەی خودای خوێندەوە کە دەفەرموێت:[1]، ﴿إِنَّ الْإِنْسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ (إبراهيم/٣٤)

خودای گەورە نیعمەتی ڕژاندووە بەسەریدا، یان کوفرانەی دەکات و منەتباری نابێت، یان ستایشی کەسانێکی تر دەکات و لە خودای نازانێت.

**وە بە یوسفی کوڕی ئەسباطی فەرموو:**

---

(١) رواه السيوطي في (الدر المنثور)٤٥/٥، أنه من رواية إبن أبي حاتم. وهو في القوت ٤٩/١.

ئەگەر قورئانت خوێندەوە، بە چی دوعاو نزادەکەیت؟ فەرمووی:
بەچی دوعا بکەم، حەفتا جار داوای لێخۆش بوون دەکەم لەخودا، لەو هەموو کەموکورتیانەی کەهەمە[1].

ئەگەر خــۆی وابینــیەوە کە ئەو پەڕی کەموکــوڕی هەیە لە خوێنــدنەوە کەیدا، ئەو جۆرە بینینە دەبێتە هۆی نزیکبوونەوە و بەرزبوونەوەی، ئەوەی لە نــزیکەوە دووری پــێ نیشــان بــدرێت ، بەهــۆی ئەو تــرس و بــیمەوە کە دای دەگرێـت، ئەوەنـدە لـوتفی لەگەڵـدا دەکرێـت. کە ترسـەکەی دەیبـات بـۆ لای پلەیەکی بەرزتر، بۆ نزیك بوونەوەی زیاتر و، بەرزبوونەوەی یەك لە دوای یەك.
بەڵام ئەوەی نزیکی پێ نیشان بدرێت لە دووریدا، واتە: ڕێگەکەی دووربێت و بە نزیـك بخـرێتە بەرچـاوی، تووشی مەکـری خـودایی دەبێـت و، بـۆ پلەیەکی دوورتر لەو پلە نزمەی کە تێیدا بووە دەیبات.
بۆیە وەك بنەمایەکی سەرەکی، دەبێ بزانێت:
هەرچەنـدێك بە چـاوی ڕەزامەنـدییەوە سـەیری خـۆی بکـات، ئەوە بە خـۆی خـۆی لادەدات و، لە بەرزبـوونەوە بێـبەش دەبێـت، بەڵام ئەگەر ئەو قۆنـاغەی بــڕی و، چــاوی لەســەر خــۆی لادا و، تەنهــا خوداوەنــدی خــۆیی دەبینــی، لە خوێنـدنەوەی کەلامـی خـوادا، ئەوە مەلەکـووتی خـودای بـۆ ئاشـکرا دەبێـت و چاوی دڵی دەکرێتەوە.

**سولەیمانی دارانی (خودای لێخۆش بێت) فەرموویەتی:**

ئیبنـو سـەوبان کە قورئـان خـوێنێکی نـاودارە، بەڵێنی دا بە برایەکی کە لەلای ئەو بەربانـگ بکـاتەوە، بەڵام نەچـوو بـۆلای تـا بـانگی بەیـانی دا، بـۆ ڕۆژی دوایـی بـراکەی بینـی و، پێـی وت: تـۆ گفتـت پێـدام بێـت بـۆلام، بەڵێـنەکەت نەبردەسەر، فەرمووی: ئەگەر ئەو بەڵێنە نەبوایە کە پێم دای، ڕاستییەکەم پێ

(١) قوت القلوب١/٥٨.

نه دەوتی کە بۆچی دوا کەوتووم، کاتێك نوێژی خەوتنانم کرد، وتم:

با نوێژە وەترەکەیش بکەم، پێش ئەوەی بێم بۆلات، چونکە ئەمین نەبووم لەوەی کە مردن ئێخەم پێ بگرێت، کاتێك گەیشتمە دوعاکانی ناو وەتر، باخچەیەکی سەوزیان بۆ بەرزکردمەوە، جۆرەها گوڵی ڕازاوەی بەهەشتی تێدابوو، منیش بەردەوام سەیرم دەکرد و لێی تێر نەدەبووم تا نوێژی بەیانی.

ئەم موکاشەفەو شت بۆ دەرکەوتنانە کاتێك پەیدا دەبێت: کە بە تەواوی خۆی بەری بکات لە نەفسی ، لابەلای نەفس و ئارەزووەکانیدا نەکاتەوە، وە بەپێی حاڵی ئەو کەسە کە بۆی ئاشکرا دەبێت، تایبەتمەندی وەردەگرێت، هەرکاتێك ئایەتە هیوا بەخشەکان بخوێنێت، حاڵەتی مژدەو خۆشی لێ ئاشکرا دەبێت، وەك وێنەی بەهەشت، وەك ئەوەی بەڕاستی بیبینێت ئاوایە، وە ئەگەر ترس زاڵ بوو بەسەریدا، ئاگری دۆزەخی لێ ئاشکرا دەبێت، هەموو جۆرە سزاکانی دەبینێت، چونکە فەرموودەی خودا ئەو بابەتە ئاسانە نەرمانەو، بابەتە توندە ڕەق و زبرەکانیش دەگرێتەوە:

پڕ یەتی لە هیوابەخش و ترسێنەر، بەپێی وەصفەکانی، ئایەتی ڕەحمەت و میهرەبانی و تۆڵەو سزاو سەختی تێدایە، بەپێی بینینی وشەکان و صیفەتەکان، دڵیش گۆڕانی دێت بەسەردا، حاڵەتەکانی دەگۆڕێت.

بۆ هەر حاڵەتێك جۆرێك موکاشەفەی تایبەتی بۆ پەیدا دەبێت، چونکە ناگونجێت حاڵی گوێگرەکە یەك بێت و، کەلامە بیستراوەکە جیاوازبێت، چونکە لەو کەلامەدا ڕەزامەندی تێدایە، وە تۆڕەبوونی تێدایە، کەلامی خاوەنی نیعمەت و زاتێکی تۆڵەسێن، دەسەڵاتدار و خاوەن دەمار، کە گوێ بەکەس نادات، وە بەسۆزو میهرەبان و نەرمە، کە ئیهمالی کەس ناکات.

# دەروازەی چوارەم

## لەبارەی تێگەیشتنی قورئان و ڕاڤەکردنی بە ڕای زانایان، بەبێ بەڵگەی نەقلی

**لەوانەیە بڵێیـت:** لە پێشـەوە فرمـانەکەت زۆر گەورە کـرد، لە بـارەی تێگەیشتنی نهێنیەکانی قورئان، وە ئەوەی بۆ ئەهلی دڵە صەفادراوەکان ئاشکرا دەبێت، لە واتا نهێنیەکان، ئەمە چۆن دەبێتە کارێکی باش، کە پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ فسَّرَ القُرآنَ بِرَأيِهِ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقعَدَهُ مِنَ النَّار))؟![1] .

ئەوەی بە ڕای خـۆی و بە ئارەزووبـازی ڕاڤەو تەفسـیری قورئـان بکـات، بـا شوێنی خۆی لە ناو ئاگردا ببینێتەوە. لەسەر ئەمە زانایان بە ڕواڵەت و زاهیری لێکدانەوەیان، توندترین هێرشیان کردۆتە سەر ئەوانەی توانای کاری مەعنەوی و ڕاپەڕاندنیان هەیە، واتە: (ئەهلی تەصەڕروفن)، لەوانەی تەفسیری قورئانیان کـردووەو دراونەتە پـاڵ ئەهلی تەصـەوف، لە بـارەی تەئویـل کردنـی وشـەکانی قورئـــان، پـێچەوانەی ئەو ڕایـــانەی کە وەرگیـــراون لە ئیبنـــو عەببـــاس و موفەسیرەکانی ترەوە، وە ڕایانگەیاندووە، کە ئەم کارەیان بە کوفر دەشکێتەوە بەسەریاندا. جا ئەگەر ئەوەی ئەهلی تەفسیر وتوویانە ڕاستە؛

کەواتە چ واتـایەك دەگەیێنێـت، تـۆ لە نـاوەڕۆك و واتـای قورئـان بگەیـت، جگە لەوەی کە تەفسیرەکەی کە زانایان کردوویانە بیپارێزێت و تەواو؟!

وە ئەگەر ئەم قسەشیان دروسـت نەبێت، ئەی چی دەکەیت لە واتـای ئەو فەرموودەی کە هێنامانەوە کە دەفەرموێت: ئەوەی بە ڕای خۆی تەفسیری

---

(١) رواه الترمذي(٢٩٥١) من حديث ابن عباس وحسَّنه، والنسائي في الكبرى( ٨٠٨٥/٣١/٥).

قورئان بکات، یا شوێنی خۆی له دۆزەخدا دیاری بکات؟!

**بزانە:** ئەوەی وا گومان ببات، کە واتای قورئان تەنها بریتییە لەو تەفسیرا نەی لە ڕێگەی زاناکانەوە بە زاهیری کراون، ئەوە باس لەسنووری خۆی دەکات، وە لەو ڕوانگەوە ڕاستی کردووە، کە خۆی ئەوەندە توانای هەیە.

بەڵام بەهەڵەداچووە ئەگەر وابزانێت، ئاستی هەموو خەڵکی وەك پلەی زانستی خۆی وایە، کە لە سنوورێکدا ڕاوەستاوە و ناتوانێت لێی دەرباز ببێت، (کە ئەمەش بۆ خۆی یەکێکە لەو هۆکارانەی کە دەبێتە ڕێگر بۆ تێگەیشتنی قورئان، بەڵکوو هەواڵ و فەرموودە و ئاسارەکان نیشانەن لەسەر بەرفراوانی واتاکانی قورئان، بۆ ئەو زانا پێگەیشتووانەی کە ئەهلی زانست و تێگەیشتنن.

**(حەزرەتی) عەلی** (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: مەگەر بۆ کەسێك کە خودای گەورە تێگەیشتنێکی تایبەتی پێببەخشێت،[1]،

کەواتە ئەگەر واتاکەی تەنها ئەو تەفسیرو لێکدانەوانە بێت کە پێمان گەیشتووە، ئەی دەبێ ئەو تێگەیشتنە کامەبێت کە باسی لێدەکات؟!

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((إِنَّ للقُرآنِ ظَهراً وبَطناً، وحدّاً ومَطلَعاً))**[2]، واتە: [3] قورئانی پیرۆز واتای زاهیری هەیەو، واتای باطین و شاراوەیشی هەیە، کە زانا پێگەیشتووەکان لێی حاڵی دەبن، هەروەها سنور و کۆتاییەکی تایبەتی هەیە، ئەوپەڕی هەیەو مەطلەع و سەرەتایەکیشی هەیە.

---

(١) رواه النسائي (٢٣/٨) بنحوه. ولفظ المصنف: **(إلاَّ أَنْ يُؤتِيَ اللهُ عَبداً فَهماً في القُرآن)**.

(٢)رواه ابن حبان في صحيحه(٧٥)، من حديث ابن مسعود مرفوعا بلفظ: **أنزل القرآن على سبعة أحرف، لكل آية منها ظهر وبطن**. وهو عند عبدالرزاق في (المصنف)( ٣٥٨/٣)، بلفظ: **والذي نفسي بيده ما من آية إلا ولها ظهر وبطنٌ، وما فيه حرف إلاَّ ولهُ حدٌّ، ولكل حد مطلع**، من قول الحسن، ولفظ المصنف هنا عند صاحب القوت (٥١/١).

(٣) بۆ زیاتر شیتەڵکردنەوەی ئەم بابەتە بنواڕە : بەرگی دووهەمی ژیانەوەی زانستەکانی ئاین، پەڕاوی (بنەماکانی باوەڕ)،( ل/٧٧ ) .

هەروایش دەگێڕنەوە لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودە وە (خودای لێ ڕازی بێت) کە ڕیــوایەتەکە وەســـتاوە لەســـەری ، وە بەرزی نەکــردۆتەوە و لە زانایـــانی تەفسیریش دەژمێررێت .

## کەواتە بابزانین؛ واتای زاهیرو باطین و حەدد و مەطلەع چییە؟!

**(حەزرەتی) عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:**

ئەگەر بمەوێت بـاری حەفتـا وشـتر بـاردەکەم تەنها لە تەفسـیر کردنـی سـوورەی فـاتیحە[1]، کەواتە دەبێ ئەم فەرمـوودە چی بگەێنێـت، کە دەبینـین زاهیری تەفسیری فاتیحە زۆر بە کەم و کورتی و سنووردار کراوە؟!

**ئەبودەرداء دەفەرموێت:** پیاو نابێتە (فەقیە). شارەزا و تێگەیشتوو نابێت تا چەند ڕوویەك بۆ واتای قورئان نەدۆزێتەوە.[2]،

وە هەندێك لە زانایان فەرموویانە:

بـۆ هەمـوو ئـایەتێکی قورئـان شەسـت هەزار لێکـدانەوە و تێگەیشـتنی هەیە. ئەوەش کە ماوە و پەی پێینەبراوە لەوە زیاترە[3]،

یەکێکی تر فەرموویەتی: قورئان حەفتاو حەوت هەزارو دووصەد زانستی لە خـۆ گرتـووە، چـونکە هەمـوو وشـەیەکی زانسـتێکی سـەربەخۆیە، لە پاشـان ئەمەش چـوار جـار دووچەنـدانە و مـوزاعەف دەبێتەوە و زیـاد دەکات، چـونکە هەموو وشـەیەك واتایەکی ڕواڵەتی و پەنهانی و شاراوەو سنووردار و ئەوپەڕی هەیەو سەرەتاودەستپێکیشی هەیە [4]،

---

(١) قوت القلوب(١/٥٠).وانظر: مسند الإمام علي (ج/١)حسن القبانجي، مكتبة مركز الأبحاث العقائدية، ولطائف المنن للشعراني (١/١٧١) طبعة مصر.

(٢) رواه عبدالرزاق في المصنف(١١/٢٥٥) وأبو نعيم في الحلية(١/٢١١).

(٣) رواه أبو طالب المكي في القوت١/٥٠.

(٤) هەمان سەرچاوە ( ١/٥٧) .

وه چەنـد بـارەكردنەوەی حەزرەتـی پێغەمـبەر ﷺ بـۆ ڕسـتەی (بِسْـمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحيم )بۆ بیست جار، بە بێ مەرام نەبووە خۆ واتاكەی زۆر ئاشكرایە ، ئەگەر مەبەستی تێفكرین و تێگەیشتن نەبووبێت لە واتا شاراوەكانی، یەكێكی وەك حەزرەت ﷺ چ پێویستی بەو هەموو دووبارە كردنەوە هەبووە؟!

ئیبنـو مەسـعود (خـودای لێ ڕازی بێـت) فەرمـوویەتی: ئەوەی زانسـتەكانی سەرەتاكانی ژیان و كۆتاییەكانی دەوێت، با بگەڕێت بە دوای واتاو مەبەستەكانی قورئاندا، [1]،ئەمەش بە تەنها واتا زاهیریەكانی هەرگیز دەستی ناكەوێت.

**پـوختەی قسـە:** هەمـوو زانسـتەكان بە گشـتی دەچـنە نـاو كـردارو صیفەتە پیرۆزەكانی خـودای گەورەوە، وە لە قورئانیشـدا ڕاڤەو شـەرحی زات و كـردار و صیفەتەكانی خـودا كـراوە، ئەم زانسـتانەیش هەرگیـز كۆتاییـان نیە، لە قورئانیشــدا هێمــا بــۆ تێكــڕای ئەم زانســتانە كــراوە، بــۆیە واتاكــانی زۆرە و بەرفراوانەو، بە تەنها لێكدانەوەیەكی ڕواڵەتی بە كۆتا ناگات.

پلەكانی قـووڵـداچوونیش لە فراوانكردنی واتاكانی، دەگەڕێتەوە بـۆ جـۆری تێگەیشـتن لە قورئـان ، وە بە تەنهـا سـەرنجی ڕواڵەتی تەفسـیرو لێكـدانەوەكان بكەیـت، ناگەیت بەو ئامـانجە، بەڵكوو هەمـوو ئەو بابەتـانەی بـووەتە كێشـەی زانا خاوەن بیردۆزەكان و، خەڵكەكە بە گشـتی ڕای جیاوازیـان لەسـەر دەربڕیـوە، لە بیردۆزەكان و بـابەتە عەقڵانیەكان، ئەوە دەبینـین لە نـاو قورئـانـدا چەنـدین ڕەمـزو هێمـای تیـایە، وە نیشـانەو دەلالەتی زۆری تێدایە، كە ئەوانەی دەكرێت بە ئەهلی تێگەیشتن ناو ببرێن،[2] ئەوانە لێی حاڵی دەبن، ئیتر چۆن تەنها بە

---

(١)رواه ابن المبارك في الزهد، وقال الزبيدي(٥٠٩/٤ ) والديلمي في مسندالفردوس كما في كنز العمال( /٢٧٦) عن أنس مرفوعا.و رواه البيهقي في شعب الإيمان (١٨٠٨) والطبراني في الكبير(١٣٥/٩)، ولفظه: (مَن أرادَ عِلمَ الأوَّلين والآخرين، فَلْيُثَوِّرِ القُرآن).

(٢) تا وای لێ هات كە ئیمام، شافیعی (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: **(فليس تنزل بأحد**

وەرگێران و ڕاڤەکردنێکی ڕواڵەتی ئەو هەموو واتاو ڕەمزانە دەگەیێنێت؟!.

هەر لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**(( إقرَؤوا القُرآنَ والتَمِسُواغَرائِبَهُ))**[1].

واتە: بەردەوام قورئان بخوێننەوەو بگەڕێن بە دوای واتا نادیارو نامۆکانیدا.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ لەو فەرموودەی کە (حەزرەتی) عەلی ڕیوایەتی دەکات فەرموویەتی: (( **والذي نَفسي بيَدِه، لتَفتَرِقنَّ أُمَّتي عَن أصلِ دينِها وجَماعَتِها، علَى اثنَتَينِ وسَبعينَ فِرقَةً، كلُّها ضَالَّةٌ مُضِلَّةٌ يَدعُونَ إلى النَّار، فإن كانَ ذلِكَ فَعليكُم بكِتابِ اللهِ تعالى، فإنَّ فيهِ نَبأَ مَنْ كانَ قَبلَكُم ونبأَ (بيانَ) مَا يأتي بعدَكُم، وحُكمَ مابَينَكُم، مَن خالَفَهُ مِنَ الجَبابِرةِ قصَمَهُ الله (عَزَّ وجَلْ)، ومَن ابتَغَى العِلمَ في غيرِهِ... أضلَّهُ اللهُ (عَزَّ وجَلَّ)، وَهوَ حَبلُ اللهِ المَتِين، ونُورُه المُبين، وشِفاؤه النَّافع. عِصمَةٌ لمَن تَمسَّكَ بهِ، ونجَاةٌ لمَن اتَّبَعهُ، لايُعْوَجُّ فيُقَوَّمُ، ولا يَزيغُ فيَستَقيمَ، ولا تَنقَضِي عَجائِبَهُ، ولا يُخلِقُهُ كثرةُ التَّرديدِ، هوَ الذي سمعتْهُ الجِنُّ، فمَا تَناهَى أن ولَّوا إلى قَومِهم مُنذِرِينَ، فقَالوا ياقومَنا إنَّا سَمِعْنا قرآناً عَجَبا يَهدِي إلى الرُّشدِ، مَن قَالَ بهِ صَدَق ومَن عَمِل بِهِ أُجِرَ، ومَن تَمسَّك بهِ هُدِيَ إلى صِراطٍ مُستَقيم**[2].

واتە: سوێند بەوەی منی بە حەق ڕەوانە کردووەو کردوومی بە پێغەمبەر،

---

**من أهل دين الله نازلة، إلا وفي كتاب الله الدليل على سبيل الهدى فيها**)الرسالة(ص/٢٠).

(١) رواه ابن أبي شيبة (٣٠٥٣٢)، وأبو يعلي في مسنده(٦٥٦٠)، وفيهما **(أعربوا)** ، بدل (إقرؤوا)

(٢)قال العراقي هو عند الترمذي(٢٩٠٦) دون ذكر افتراق الأمة بلفظ: **ألا سَتكون فتنة مضِلَّةٌ، فقلت: ما المخرج منها يارسول الله؟ قال كتاب الله، فيه نبأ من كان قبلكم،** فذكره مع اختلاف، وقال غريب وإسناده مجهول، قال الزبيدي(٤٢٠/٤): هو من حديث الحارس الأعور قال الذهبي حديثه في فضائل القران منكر وأورده السيوطي في النوع الخامس والستين من الاتقان(٤٠٤/٤)(٥٨٥٦) بلفظ: **ستكون فتن، قيل وما المخرج منها؟ قال كتاب الله، فيه نبأ ماقبلكم، وخبر مابعدكم، وحكم بينكم،** وقال أخرجه الترمذي وغيره

ئوممەتەکەم جیادەبنەوەو حەفتاو دوو تاقمیان لێ دروست دەبێت، هەموویان گومڕاو گومڕاکەرن، وە بانگی خەڵکی دەکەن بۆ ناو ئاگر، ئەگەر ئەمە ڕوویدا، لەسەرتانە بگەڕێنەوە بۆ کیتابی خودای (عَزَّ وجَلْ)، هەواڵی ئوممەتە پێشووەکانتانی تێدایە، پەندیان لێ وەربگرن، وە هەواڵ و بەسەرهاتوو ڕوداوی لەمەولاتانی تێدایە، وە حوکم و قەزاوەتی نێوانتانی تێدایە، ئەوەی پێچەوانەی بجوڵێتەوە لەدەسەلاتدارە ملهوڕەکان، خودای گەورە پشتی دەشکێنێت، وە هەرکەسێك بە دوای زانستدا بگەڕێت، لەسەرچاوەیەکی تردەوە غەیری قورئان، خودای بەدەسەڵات گومڕای دەکات، قورئان حەبلی بەهێزو نەپچڕاوی خودایە، نورو ڕۆشناییەتی، شیفابەخشی نەخۆشی و ئازارەکانە. ئەوەی دەستی لێبەرنەدا دەیپارێزێت، ئەوەی شوێنی بکەوێت ڕزگاری دەکات، هەرگیز لارو خوار نابێت،، تا پێویستی بەڕاست کردنەوە هەبێت، لە ڕاستی لانادات تا ڕاست بکرێتەوە، وە شتە سەرسوڕهێنەرەکانیشی هەرگیز تەواو نابێت، چەندێکیش بیخوێنیتەوەو هەڵی بدەیتەوە، کۆن و بێزراو نابێت، تا کۆتای فەرموودەکە.

وە لە فەرموودەی حوزەیفەدا هاتووە، کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدا بە دروستبوونی جیاوازی زۆر و تاقم و کۆمەڵی جیاجیا، دەفەرموێت:

وتم ئەی پێغەمبەری خودا؛ فەرمانی چیم پێدەدەیت، ئەگەر کەوتمە ئەو ڕۆژەوە؟ فەرمووی: **تَعلَّم كِتابَ اللهِ، واعمَلْ بما فِيهِ، فهُوَ المَخرجُ مِن ذلِكَ، قال فأعدتُ عليه ثلاثاً. فقالَ ﷺ ثلاثاً : تعلَّم كِتاب اللهِ (عَزَّ وجَلْ) واعْمَل بِما فيه فَفيهِ النَّجاةُ** [1]،

فێری قورئان ببە، کە پەڕاوی خوداوەندە، تەنها ئەوە لەو فیتنە دەربازتان دەکات، دەفەرموێت: سێجار لێم دوبارە کردەوە: ئەویش (صەلات و سەلامی خودای لەسەر) سێ جار دوپاتی کردەوە، کە فێری کیتابی خودا ببە، وە لە

(١) رواه أبو داوود (٤٢٤٤)، والنسائي (في السنن الكبرى) (٧٩٧٨).

خۆتدا فەرمانەکانی جێبەجێ بکە، ڕزگاربوونت لەوەدا دەبێت.

**هەروەها (حەزرەتی) عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:**

ئەوەی لە قورئـان تـێ بگـات و لێـی حـاڵی ببێـت، ئەوا دەتوانێـت، تەواوی زانسـتەکان لێکـدانەوەیان لەسـەر بکـات[1]، هێمـا بەوە دەکـات ، کە قورئـان هێمای بۆ هەموو زانستەکان کردووە.

عەبدوڵلای کوڕی عەباسیش (خودایان لێ ڕازی بێت) دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ (البقرة/٢٦٩)

ئەوەی حیکمەت و پەندیاری پێبدرێت، ئەوە خێرێکی زۆری نەبڕاوەی پێدراوە، فەرموویەتی: مەبەستی ئەوەیە کە تێگەیشتنی واتای قورئانی پێبدرێت[2] ،

خـودای گەورە فەرمـوویەتی: ﴿فَفَهَّمْنَاهَـا سُـلَيْمَانَ وَكُـلًّا آتَيْنَـا حُكْمًـا وَعِلْمًا﴾ (الأنبياء/٧٩) واتە: بابەتەکەمان بە سولەیمان گەیاندو حاڵیمان کرد، وە هەردوکیشـیان توانـای فەرمـانڕەوایی و زانسـتیمان پـێ بەخشـین، ئەوەی پێـی داون، نـاوی بـردووە بە زانسـت و بە حـوکم، وە ئەوەی داویەتـی بە (حەزرەتی) سـولەیمان، جـۆرێکی زیرەکی و تێگەیشـتنی زیـاترە، وە ئەم فەهـمەی لە پێشـی حوکم و زانستەوە داناوە[3] ،

ئەم فرمـان و بابەتـانەی باسـمانکردن، نیشـانەو بەڵگەن لەسـەر ئەوەی کە بـۆ تێگەیشـتن لە واتاکـانی قورئـان، دەرفەتێکی بـاش و فـراوان و زۆر هەیە، وە هێمایشـە بـۆ ئەوەی کە ئەو زانیاریـانەی لە تەفسـیرەکانەوە وەرگیـراون، نـابنە جێگرەوەی هەموو زانست و تێگەیشتنێکی تر کە پێویستە بزانرێت.

کەواتە واتای فەرموودەکەی قورئان ئەوەی تەفسیری قورئان بە ڕەئی بکاتەوە،

---

(١) قوت القلوب (٤٩/٢).

(٢) رواه الطبراني في تفسيره: ( ١١٧/٣).

(٣) قوت القلوب ( ٤٩/١).

وە ڕێگری کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ڕا دەربڕین ، وە فەرموودەکەی (حەزرەتی) ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێت): (کام زەوی هەڵم دەگرێت و: کام ئاسمان ئەمخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە و پەنامدەدات، ئەگەر لەبارەی قورئانەوە بە ڕایەکی خۆم واتای لێك بدەمەوە)[1]، وە ئەو فەرموودانەی تریش لە هەواڵ و ئاسارو فەرموودەکان، کە ڕێگری دەکەن لەوەی لێکدانەوە و تەفسیری قورئان بە ڕای خەڵکی بکرێت، ئەمە لەیەکێك لەم دوو لایەنە دەرناچێت:

یان مەبەست ئەوەیە کە تەنها ئەو فەرموودانە وەربگیرێن کە بە نەقڵ و لەدەم زانا پێشینەکانەوە پێمان گەیشتووە و بیستراوە و، ئیتر واز لە هەڵێنجان و وەرگرتنی ئەحکام بهێنین، وە هەرگیز ڕێگە نەدەین کە بە هۆی تێگەیشتن و فەهمەوە واتایەکی زیاتر دەستبخەین، یان مەبەستێکی تری هەیە کە دەبێ ڕوون بکرێتەوە:

**بەدڵنیاییەوە ئەو ڕووەیان باتیڵە کە هیچ کەس بۆی نەبێت لەسەر قورئان قسە بکات، مەگەر تەنها بە واتایەك کە بیستبێتی، ئەمە بێبنەمایە لەبەر ئەم خاڵانەی خوارەوە:**

**یەکەمیان:** دەبوایە ئەم ڕایە ئەگەر وابوایە. لە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ ببیسرترایە، وە بە سەنەدەوە بدرایەتە پاڵی، ئەمەش چەند جارێك ڕێکەوتووە لە لێکدانەوەی هەندێك ئایەتی قورئاندا، وە ئەوەیش کە ئیبنو عەباس و ئیبن و مەسعود لە لایەنی خۆیانەوە دەیڵێن: دەبێت وەرنەگیرێت، وە بوترێت: ئەوەش تەفسیر کردنە بە (ڕەئی)، خۆ لە پێغەمبەریان ﷺ نەبیستووە و صەحابەکانی تریش (خودایان لێ ڕازی بێت) هەربەم شێوەیە بووە.

**دووهەمیان:** صەحابەکان و ئەوانەی تەفسیری قورئانیان کردووە، لە هەندێك ئایەتدا جیاوازی بیرو ڕایان هەیە، ناتوانین ڕاکانیان کۆبکەینەوەو

---

(١) رواه القاسم بن سلام، في فضائل القرآن(٣٧٥)، وابن عبد البر في الجامع (١٥٦١).

یەکیــان بخەیــن، وە ناشــگونجێت هەمــوو ئەو ڕا جیــاوازانە کە پــێچەوانەی یەکترین، هەمووی لە پێغەمبەرەوە بیسترابێت، وە ئەگەر یەکێکیان بە بیستراو دابنرێت، خـۆ دەبێـت ئەوانی تر وەرنەگیـرێن، کەواتە بە دڵنیـاییەوە دەرکەوت: کە موفەسیرەکانیشی ئەو واتـای خۆیـان بۆیـان دەرکەوتـووە لێکیـان داوەتەوەو، ئیجتیهادیـان تێـدا کـردووە، تەنـانەت لەو سـوورەتانەی کە بە پیتەکـان دەسـت پێـدەکات لەســەرەتای ســوورەتەکانەوە حەوت ڕای جیاوازیــان هەیە، هەرگیــز ناتوانرێت ڕێکبخرێن و، هەموویان یەك سەرچاوەیان بووبێت.

بـۆ نمـوونە: وتـراوە لە (الـــر) ئەوە چەنـد پیتـێکە لە ڕەحمـانەوەیە، وە دەڵـــێن: ئەلــفەکەی نـــاوی (الله)یە، لامەکەی واتـــای (لەطیــف)، ڕائەکەی (ڕەحیم)وەك بفەرموێت: من خودای ڕەحمانوو ڕەحیمم.

وە چەنـــدین ڕای تـــری لەســـەر هەیە، وە ناکرێـــت ئەم ڕا جیـــاوازانە کۆبکرێنەوە، ئیتر چۆن دەگونجێت بووترێت: هەموو ڕاکان بیستراون؟!

**سێیەم:** پێغەمبەر ﷺ نزای کرد بۆ ئیبنوعەباس (خـودای لێ ڕازی بێـت) و فەرمووی: ((**اللهُمَّ فَقِّهـهُ فِي الـدِّينِ وَعَلِّمـهُ التَّأوِيل**))[1]، واتە: خـودایە لە دین شـارەزاو تێگەیشـتووی بـکە، وە فێـری تەئویلی بـکە[2]،جـا ئەگەر تەئـویلەکە بە بیستن لەپێغەمبەرەوە دابنرێت و، وەك تەنزیل و ناردنە خوارەوەی قورئان بێت، وە پارێزراویش بێت وەك قورئان، کەواتە ئیتر چ واتایەك دەمێنێت بۆ نزاکەی پێغەمبەر ﷺ کە تایبەت بە (إبن عباس)ی کردووە؟!

---

(١) رواه البخاري(٢٤٣) وبتمامه عند أحمد في المسند(٢٦٦/١).

(٢) تەئویل ئەوەیە وشەیەك واتایەكی ئاشکرای هەیە، بەڵام تۆ دایدەبڕیت بەسەر واتایەكی تردا یـان واتـا شـاراوەکەیدا، لەبەرامبەری بەڵگەیەکـدا بێـت، ئەوە درووسـتە، یـان لەبەرامـبەر گومانـدابێت ئەوە بـاتیڵە، ئەگەر هەروا کردبێتیشـی ئەوە گاڵتەکردنەو بە تەئویـل دانانرێـت، وەك لە (جمع الجوامع دا )هاتووە لە باسی تەئویلدا.

**چوارەم:** خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ﴾ (نســاء/٨٣) واتە: ئەوانەی هەڵێنجــانی ئەحكــام لە قورئــان دەكەن و، لێــی وەردەگرن، كەواتە سەلماندوویەتی كە زانا مەزنەكان دەتوانن حوكم لە قورئان وەربگرن، ئاشكرایە كە ئەم وەرگرتنە، لەو دیوی بیستنەوەیە لە پێغەمبەر ﷺ، چونكە بیستن دەرهێنانی ئەحكام نیە. كەواتە پوختەی ئەو بەڵگە و ئاسارانەی كە وەرمانگرتووە بۆ تێگەیشتن لە قورئان، دژایەتی هەیە لەگەڵ ئەو خەیاڵەی كە باسیان كردووە، كە نابێت ڕاڤەی قورئـان بە ڕای زاناكان بكرێت، كەواتە ئەو مەرجەیە بـاتیڵە كە دەڵـێن: بـۆ تەئـویلكردن پێویسـتە لەسـەروخۆیانەوە بیستبێتیان، كەواتە دروستە هەریەكێك لەو زانایانە، بە پێی سنووری ئەقڵ و ئاستی تێگەیشتنی حوكمەكان لە قورئان دەرهێنێت و كۆششی خۆی بكات.

## دەربارەی ئەو ڕێگریەی كەكراوە:

لە دوو ڕووەوە ڕێگری كراوە كە نابێت تەفسیری قورئان بە (ڕەئی) بكرێت:

**یەكەم:** لەكاتێكدا خۆی ڕایەكی لەسەر شتێك هەبێت و مەیل و حەزیشی بەلای ئەو ڕایەدا هەبێــت و، بگەڕێــت بە دوای تەئویــل كردنــی قورئــان بە شێوەیەك گونجاوی كات لەگەڵ ڕاو ئارەزواتی خۆیدا، بۆ ئەوەی بیكاتە بەڵگە بـۆ بە دروســت زانینــی مەبەســتەكەی، خـۆ ئەگەر خـۆی ئەو ڕایەی نەبـوایە، هەرگیز ئەو واتایەی بەو شێوە نەبۆ دەردەكەوت، نە باسی دەكرد.

ئەم هەڵویستەیە، جاری واهەیە لەگەڵ بوونی زانستیشدا دەبێت، بە پێی ئـارەزواتی خـۆی تەئویـل دەكـات، وەك ئەو كەسـەی هەنـدێك ئـایەتی قورئـان دەهێنێتەوە بە بەڵگە، بۆ بە دروستدانانی بیدعەكەی خۆی، وە دەشزانێت كە مەبەست لە ئایەتەكە ئەوە نیە، بەڵام دەیەوێت ڕاستییەكە لە بەرامبەرەكەی بشێوێنێت و، بەڵگەی بەم شێوەی بۆ دروست دەكات.

وە هەنــدێك جــار لە ڕووی نەزانیــنەوەیە، لە كاتێكــدا لە ئــایەتەكەدا ئەو ڕایەش هەڵبگرێــت، ئەویــش یەكســەر دەیبــات بەلای ئەو ڕایەدا كە خۆیشــی

مەبەستیەتی، بەو شێوەیە لێك بدرێتەوە. وە ئەو ڕایە بەهێزتر دەكات، بە پێی ڕاو ئارەزواتی خۆی، ئەوكاتە ڕاڤەكردنەكەی بە (ڕەئی) خۆی كردووە، كە بەزۆر ئایەتەكەی دابڕیوە بەسەر ئەو واتادا كە خۆی مەبەستی بووە، خۆ ئەگەر خۆی خاوەنی ئەو ڕایە نەبوایە، ئایەتەكەیشی بۆ ئەو لایە نەدەبرد.

وە هەندێك جار مەبەستێكی دروستی هەیە، دەگەڕێت بە دوای بەڵگەیەكدا لە قورئاندا بیبینێتەوە، بۆ پشتگیری كردنی ئەوەی كە دەیەوێت، وەك ئەو كەسەی بانگی خەڵك بكات لە بەرەبەیاندا بۆ(إستغفار)و داوای لێخۆشبوون، ئەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بهێنێتەوە بە بەڵگە كە فەرموویەتی: ((تَسَحَّروا فإنَّ في السُّحورِ بَرَكةً))[1]،وا گومان ببات كە هەرچەندە مەبەستی پارشێو كردنیشە، بەڵام واتای زیكری پێش نوێژی بەیانیش دەگرێتەوە، یان كەسێك كە بانگەشە بكات بۆ ئەوەی، ئەو خەڵكە خەریكی موجاهەدە و ڕیازەكێشان بن لەگەڵ دڵە ڕەقەكاندا، بۆیە دەڵێت:

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى﴾ (٢٤/طه)

بڕۆ بۆلای فیرعەون كە بەڕاستی ئەو یاخی بووە، وە هێما بكات بۆ دڵی خۆی و بڵێت: مەبەست لە فیرعەون ئەو دڵە ڕەقەی منە!

هەندێك لە واعیزەكان ئەم جۆرە لەسنوور لادانە بەكار دەهێنن، بە نیەتێكی پاك، بۆ جوانكردنی قسەكانیان و، زیادكردنی شەوقی گوێگران، كە ئەمە كارێكی نادروستە، وە هەندێك جاریش (باطینیەكان) بۆ مەبەستە پیس و فاسیدەكانیان بەكاری دەهێنن، وە خەڵكی بۆ مەزهەبە باتیڵەكەیان بانگ دەكەن، قورئان تەئویل دەكەن و، دەیهێننە ئاستی ڕاو بۆچوونەكانی خۆیان، بۆ هەندێك فرمان، كە بە دڵنیاییشەوە دەزانن كە پێچەوانی مەبەستی قورئانە.

ئەم ڕێكارە خراپانە یەكێكە لەو شێوانەی كە قەدەغە كراوە، لە ڕاڤەكردنی

---

(١) رواه البخاري(١٩٢٣)، ومسلم (١٠٩٥).

قورئان به (ڕەئی)، کەواتە مەبەست لە (ڕەئی)، ڕای بێ کەڵك و فاسیدە، کە لەگەڵ ئارەزواتدا یەکبگرێتەوە، بەبێ ئەوەی ئیجتیهادێکی دروستی بۆ کردبێت.

دیارە (ڕەئی)ش ڕای دروست و نادروستی هەیە. هەندێك جار ئەو ڕایەی لەگەڵ ئارەزواتدا دەگونجێت، تا یبەتمەندییەکی پێدەدرێت، بەناوی ئەوەوە کەئەمەیش (ڕەئیە).

**لایەنی دووهەم:** ئەوەیە کە پەلە بکات لە ڕاڤە و لێکدانەوەی واتای قورئان، بەپێی ڕواڵەتی وشەکان کە عەرەبییە، بێ ئەوەی دەری بخات کە گوێی لە تەفسیرەوە بووە، یان لە پێشینەکانەوە ئەو واتایەی گواستۆتەوە، بەتایبەتی لە وشە نامۆ و نادیارو گۆڕاوو نائاشکراکاندا، کە هەندێکیان حەزف و لادان و کورتکردنەوەو، شاردنەوە و پێش خستن و دواخستنیان تێدایە، هەرکەسێك باش ئەو بنەما زانستیانە بە پێی زمانەوانی نەزانێت، وە تەنها بە پێی زاهیری تێگەیشتنی خۆی لە زمانی عەرەبی حوکمەکان لە ئایەتەکە دەربهێنێت، ئەو جۆرە کەسە دەکەوێتە هەڵەی زۆرەوە، وە لەوانە دەژمێررێت کە تەفسیری قورئان بە ڕای خۆیان دەکەن، کەواتە یەکەمجار بۆ ڕواڵەتی لێکدانەکەوە پێویستی بە بیستن و نەقڵکردن لە زاناکانەوە هەیە، بۆ ئەوەی نەکەوێتە ناو هەڵەوە، لەپاشان ئەگەر بیری فراوان بوو، وەشارەزایی زۆر بوو، دەتوانێت واتای تری لێدەربهێنێت.

ئەو وشە نامۆیانەی واتایان نازانرێت، بەبێبیستن لە زاناکانەوە زۆرن، ئێمە هێما بۆ هەندێکیان دەکەین، بۆ ئەوەی بکرێنە بەڵگە بۆ هاو وێنەکانیان، وە بزانرێت کە دروست نیە کەمتەرخەمی و ئاسانکاری بکرێت، لە لەبەر کردنی واتا زاهیریەکاندا، بۆیە پێویستە لەپێشەوە واتا زاهیریەکان باش لەبەر بکرێن، ئینجا بەتەمای ئەوە بێت کە لە واتا شاراوەکان حاڵی ببێت، وە هەرکەسێکیش وای بگەێنێت لە نهێنیەکانی قورئان حاڵی بووە و، تێی گەیشتووە، بەبێ تۆکمەکردنی زانستیەکانی لەبارەی واتا زاهیرییەکانەوە، ئەوە وەك ئەو کەسە

وایە کە ڕایگەیانـدبێت گەیشـتبێتە ناوەنـدی مـاڵەکە و. هێشـتا لەدەرگـای دەرەوەیـش نەهـاتبێتە ژوورەوە، یـان وای گەیانـدبێت لە مەبەسـتی تورکەکـان حاڵی بـووەو، هێشـتا زوبانەکەشـیان فێـر نەبووە، چـونکە زاهیـری لێکـدانەوەی واتـای قورئـان، وەك فێربـوونی زوبـانی میللەتێـك وایە، تـا فێـر نەبیـت لە مەبەستەکانی تریان تێ ناگەیت.

## ئەو بابەتانەی کە تەنها بە بیستن دەبێ واتایان لێك بدرێتەوە چەندین بابەت و هونەری زۆر دەگرێتەوە:

## لەوانە کورتکردنەوەی ڕستەکەیە لە قورئاندا،

بەهـۆی حەزف و لادانـی وشـەیەك بێـت، یـان شـاردنەوەی، وەك ئەوەی کە قورئان دەفەرموێت: ﴿وآتَيْنَا ثَمُودَ النَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا بِهَا﴾ (إسراء/٥٩)

واتە: وشترەکەمان کردە بەڵگەو ئایەتێکی ئاشکرا بۆ نەتەوەی (ثەمود)کە ببێتە هۆی تێگەیشتنی خاوەن ئەقڵەکان، کەچی ستەمیان لێ کردو ، بە زیندویی چـوار پەلیـان بـڕییەوە، کەواتە بە کوشـتنی زوڵمیـان لە خۆیـان کـرد ، ئەوەی بەڕواڵەتیـی زمـانی عەرەبـی سـەرنج بـدات، وا دەزانێـت، وشەی(مبصـرة) واتە وشـترەکە دەیبینـی، وە کـوێر نەبـوو، وە نازانێـت کە ئەو قەومە بەچی زوڵمیـان کرد، وە ئایا زوڵمیان لەوانی تر کردووە، یان لە خۆیان .

یـان فەرمـوودەی خـودای (عَـزَّ وجَـلْ): ﴿وَأُشْـرِبُوا فِي قُلُـوبِهِمُ الْعِجْـلَ بِكُفْــرِهِمْ﴾ (بقــرة/٩٣) واتە: خۆشەویســتی گــوێرەکەکە چوبــووە دڵ و دەرونیـانەوە، وازیـان لێ نەدەهێنـا،چونکە کافر بوون،وایـان دەزانی خـودا لەنـاو سـکی گـوێرەکەکەدایە، مەبەسـت حەزفکردنـی وشەی(خۆشەویسـتی)یە،خۆ گوێرەکە ناچێتە ناو دڵیانەوە ؟!

یان فەرموودەی خودای (عَزَّ وجَلْ) : ﴿إِذًا لَأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ﴾ (إسراء/٧٥) وشەی عەزاب لابراوە، کەواتە ئەگەر نزیکیان

بکەوتیتـایەتەوە، سـزای ژیـان و سـزای مردنمـان بە دووقـات لەخەڵکی تـر دەرخواردەدایت، واتە: دووقـاتی عەزابی ژیـان، نەك دووقـاتی ژیـان عەزابەکە لادراوە، وە وشـەی زینـدووکان و مردووەکـان لابـراوە و، لەبریتیـدا وشـەکانی حەیات و مردن دانراوە، کە لە ڕەوانبێژی زوبانی عەرەبیدا کارێکی ئاساییە.

هەروەها فەرمـوودەی خـودای (عَزَّ وجَلْ): ﴿وَاسْأَلِ الْقَرْيَةَ الَّتِي كُنَّا فِيهَا وَالْعِيرَ الَّتِي أَقْبَلْنَا فِيهَا﴾ (یوسف/٨٢) واتە پرسیار لە گوندەکە بکە، یـان لە وشـترەکان، دەی پسـیار لە خەڵکـی گونـدەکە دەکرێـت، وە لە کـاروانیەکە دەکرێت، نەك لە گوندو وشترەکان، ئەهلەکە لە هەردوکیاندا لادراوە و تیایاندا شاراوەیە، بۆیە ئەم دەربڕینانە لە زوبانی عەرەبیدا بەزۆری هاتووە .

وە فەرمـوودەی خـودای گەورە:﴿ثَقُلَتْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾ (أعراف/١٨٧) واتە: شـارایەوە لەسـەر ئەهلـی ئاسـمانەکان و زەوی، وە هەرشـتێك ئەگەر بشارێتەوە قورس دەبێت لەسەریان، بۆیە وشەی(ثَقُلَتْ)ی بەکارهێناوە، لەبریتی وشـەی (خُفِيَتْ)، وە وشـەی (فِي)دانـراوە لە جیـاتی وشـەی(على)، وە وشـەی (أهل)یش شاراوەتەوە و لەپاشان لایشدراوە، واتە ئەهلی ئاسمانەکان و زەوی .

وە فەرمـوودەی خـودای گەورە: ﴿وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ﴾ (الواقعة/٨٢) لەبەرامبەری سوپاسی خـودا، کە نیعمەتی قورئانی پێ داون، ئێوە ئینکـاری دەکەن و بە درۆی دەخەنەوە، وشـەی شـوکر لێـرەدا لادراوە، واتە شـوکری ئەو ڕزقەی کەپێی داون. وە فەرمـوودەی خـودای گەورە:﴿رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدْتَنَا عَلَى رُسُلِكَ﴾ (ال عمران/١٩٤)

ئەی خودایە؛ پێمان بدە، ئەوەی لەسەر زوبانی پێغەمبەرانت بەڵێنت پێ داوین کەواتە وشەی (أَلْسِنَة) کە زوبانی پێغەمبەرانە لادراوە[1].

---

(١)ئەمانە هەمووی نموونەی کورتکردنەوەی ڕستەیە، بە لادانی وشەیەك بۆ جوانکاری، لە ڕوی زوبانی عەرەبییەوە، کە حەزفی پێ دەڵێن، بە هەرسێ بەشەکەیەوە إتحاف.( ٥٤٥/٤).

وه فەرمــوودەی خــودای گەورە:﴿إِنَّـا أَنزَلْنَـاهُ فِي لَيْلَـةِ الْقَـدْرِ﴾ (١/القـدر)، مەبەستی ناردنە خوارەوەیە، واتە: قورئانە کە ناردوویەتیە خوارەوە و پێشتریش باسی نەکردووە.

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿حَتَّى تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ﴾ (ص/٣٢) مەبەستی لە (هەتاوە) کە لەبەرچاودا نامێنێت و باسیشی نەکردووە.

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى﴾ (زمر/٣) ، ئەوانەی خودایەکی تر دەکەنە سەرپەرشتیاری خۆیان، دەڵێن:

ئێمە بەندایەتیان بۆ ناکەین، تەنها لەبەر ئەوە نەبێت کە لە خوداوە نزیك ببینەوە، وشەی (یقولون: واتە: ئەڵێن) لادراوە.

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿فَمَالِ هَؤُلَاءِ الْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا، مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أَصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ﴾ (٧٩/نساء)

ئەوانە بۆ لەو قسەیان حاڵی نین، کە دەڵێن:

ئەوەی لە خێـر بەرت کەوت و هـاتە ڕێگـات، لە خـوداوەیە، کەواتە وشـەی (یقولــون) واتە: وا دەڵــێن لێــرەدا لادراوە، وە ئەوەیــش کە لە خــراپە بەرت دەکەوێت لە خـۆتەوەیە، ئەگەر ئەوەی مەبەسـت نەبێـت؛ دەبێـتە پـێچەوانەی فەرمـوودەی: ﴿قُـلْ كُـلٌّ مِـنْ عِنْـدِ اللَّـهِ﴾ تـۆ پێیـان بڵێ،هەمـووی لە لایەن خوداوەیە،ئەگەر ئەم تەقدیرەرەی بۆ نەکەین، ئەوا قسەی (قەدەریە)کانواتە موعتەزیلەکان دێتە پێشەوە کە بەهۆی ئو جۆرە ڕایانەوە بە هیلاکدا چوون.[1]

---

(١) ئەوەی پێشتر نموونەی وشەیەك بوو کە بە کینایە گەێنرابێت و شاراوە بێت تیایدا، ئەم دوانەیش بۆ ئەوەیە کە وشەکە شاراوە و کورتکراود بێت. بەتایبەتی حەزفی (قەول)و هێماکردن

**وە هەنــدێکی تریــان ئەوەیە کە لە وشـــەیەکی تــرەوە وەرگیرابێــت و، هەڵیش گەڕابێتەوە،**

وەك فەرموودەی خودای گەورە: ﴿وَطُورِ سِينِينَ﴾ (٢/التين)،

واتە طـوری سـیناء، کە نـاوەکەی هەڵـگەڕاوەتەوە، یـان: ﴿سَـلَامٌ عَلَـى إِلْ يَاسِـينَ] (الصافات/١٣٠)، واتە: سـەلام لەسـەر (إلیـاس)، یـان(إدریس)چونکە لە موصحەفەکەی ئیبنو مەسعود دا (سَلامٌ علَى إدراسِين) نوسرابوو.[١]،

**وە هەر لەوانەیە کە وشـــەکە دووپـــاتکرابێتەوەو بە ڕواڵەت ڕســـتەکە لەیەك بپچڕێت:**

وەك ئەوەی کە خـودای گەورە فەرمـوویەتی: ﴿وَمَا يَتَّبِعُ الَّـذِينَ يَـدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ شُرَكَاءَ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ﴾ (یونس/٦٦)

واتە: ئەوانە کە غەیـری خـودا دەپەرسـتن دوای هاوبەشـی ڕاسـتەقینە نەکەوتـوون، چـونکە خـودا هاوبەشـی نـیە، بەڵکوو دوای گومـان کەوتـوون و درۆزنن، کە دەڵێن: خـودا شـەریك و هاوبەشی هەیە، واتە تەنها گومان دەبەن و شوێن گومان کەوتوون.

هەروەهـا خـودای گەورە فەرمـوویەتی: ﴿ قَـالَ الْمَلَأُ الَّـذِينَ اسْـتَكْبَرُوا مِـنْ قَوْمِهِ لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ﴾ (أعراف/٧٥)،

ئەو کـــۆمەڵەی کە خۆیـــان بەگەورە دادەنـــا لە قەومـــی صـــاڵح، بە موسوڵمانەکانیان وت: کە بێ هێز بوون، واتە:

---

بۆ موعتەزیلەکان، بە پێی فەرموودەی خاوەنی: قوت القلوب١/٥٣.

(١) قوت القلوب١/٥٢، وهو قراءة ابن مسعود. ويحيى والأعمش والمنهال بن عمرو، والحكم بن عتيبة، وقبلها: وإن إدريس، وهو ما يعبر عنه بتخليط العرب بالإسم الأعجمي، كذا في المحتسب٢/٢٢٤.

خـاوەن دەمارەکـان وتیـان بەوانەی ئیمانیـان هێنـاوە لە بێهێزەکـان، کاتێـك وشـەی بێ هێزەکانی بە گشتی باسکرد، لە دواییدا بەوشـەی ئەوانەی کە بڕوایان هێنـاوە لە بێهێزەکـانی دووپـات کـردەوە بـۆ بەیـان و ڕوونکـردنەوە، چـونکە مەبەستەکە هەموویان نیە بەڵکوو هەندێکیانە.

**وە لەوانەیە کە وشەکە پێشکەوتن و دواکەوتنی پێ بکرێت:**

کە گومانی هەڵەی لێبکرێت، وەك فەرموودەی خودای گەورە:

**﴿ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِنْ رَبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُسَمًّى ﴾** (١٢٩/طه) .

ئەگەر پێشـــتر بڕیـــاری دواخســـتنی ســـزای کافرەکانمـــان نەدایە، ئەوا پێویستبوو، کە سزایان پێش بخەین، واتە: (**لولاَ كلِمَةٌ وأجلٌ مسمًّى، لكَانَ لِزاماً**) ئەگەر ئەو بڕیارەو ئەو کاتەدیاری کراوەمان دانەنایە،ئەوا پێویست بوو هەر لە دونیادا سزایان بدەین، وشەکان پێش و دوا خراون، بۆ جوانکاری لە دەربڕیندا. ئەگەر بەم شـێوە نەبـوایە، دەبـوایە (وأجـلٌ )وەك لِزامـاً بە مەنصـوبی بخوێنرایەتەوە.

هەروەهـا خـودای گەورە فەرمـوویەتی: **﴿يَسْـأَلُونَكَ كَأَنَّـكَ حَفِـيٌّ عَنْهَـا﴾** (الأعراف/١٨٧) دەربارەی ڕۆژی قیامەت پرسیارت لێدەکەن، وەك ئەوەی کەتۆ لێی بزانین، وەك دەبینی وشەی (عنها) واتە دەربارەی قیامەت، لادراوە.

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی:

**﴿لَهُمْ دَرَجَاتٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ. كَمَا أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنْ بَيْتِكَ بِالْحَقِّ﴾** (أنفـال/٥) ئەوانە پـلە و پـایەو لێخۆشـبون و ڕزقێکـی باشـیان لای خودایـانەوە هەیە، وەك چۆن خوداوەندت تۆی لەماڵەوە دەرکرد، ئەم قسانە پێکەوە نەبەستراونەتەوە، بەڵکوو پەیوەندی بە فەرموودەیەکی پێشترەوە هەیە:

**﴿قُلِ الْأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ﴾**؛ پێیان بڵێ: ماڵی دەسکەوت و غەنیمەی شەڕ، بۆ خوداو پێغەمبەر دەگەڕێتەوە، **﴿كَمَا أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنْ بَيْتِكَ بِالْحَقِّ﴾**، واتە: دەسـتکەوتە کۆکراوەکـانی شـەڕ هەمـووی گەڕایەوە بـۆ لای تـۆ، چـونکە تـۆ

ڕەزامەندیت دەربڕیوە بە دەرچوونت و، ئەوانیش پێی نارازین. لەنێوانی ئەو دووورستەدا کە پەیوەنداری یەکن. فرمان دراوە بە تەقواو خوداپەرستی و هەندێ کاری تر.

**وە هەر لەم جۆرەیە(کە پێویستی بە بیستنە):**

**خودا ی گەورە فەرموویەتی:**

**﴿حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ﴾** (الممتحنة/٥)

تاوەکو بڕوا بهێنن بە خودای تاك و تەنها، وە ئەم ڕستە لکاوە بە فەرموودەی پێشترەوە: **﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ﴾** کە دەبێت ئەوان سەرمەشقی ڕێگاتان بن، مەگەر ئەوە نەبێت کە ئیبراهیم (سەلامی خودای لەسەر)بە باوکی فەرموو: من داوای لێخۆش بوونت بۆ دەکەم، کە بێباوەڕەکان وتیان، تۆیش وەکو ئیبراهیم بۆ داوای لێخۆش بوون بۆ کافرە پێشووەکانمان ناکەیت، قورئانیش فەرمووی:

لەهەموو شتێکدا با ئیبراهیم پێشڕەوتان بێت، تەنها لەو داوای لێخۆش بوونەدا نەبێت، کە ویستی بۆ باوکی بکات.

**وە هەر لەوانەیە (کە بێبیستن ناتوانیت تەفسیری بکەیت) کە وشەکە بە کینایەبێت و واتاکەی نادیار بێت:**

کە وتەیەکی هاوبەشە لە نێوانی چەندین واتادا، لە وشەیەکدا یان لە پیتێکدا: ئەگەر وشەیەك بێت: وەکو **(الشَّيئ)** و**(القَرينْ)** و **(الأمَّة)** و **(الرُّوح)** و هاووێنەکانیان. هەروەك خودای گەورە فەرموویەتی:

**﴿ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا عَبْدًا مَمْلُوكًا لَا يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ﴾** (نحل/٧٥).

واتە: خودا نموونەی هێناوەتەوە، بە بەندەیەکی کۆیلەی بێ ماڵی بێ دەست، کە نەتوانێت هیچ خێرێك بکات، کەواتە: وشەی (الشيئ)مەبەست پێی نەفەقە کێشان و مەسرەفکردنە، لەوەی کە خودا ڕزقی دابێت.

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَجُلَيْنِ أَحَدُهُمَا أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ﴾ (نحل/٧٦).

وه خـوداى گەوره نمـوونەى هێنـاوەتەوه بە دوو پيـاو. يەكێكيـان كەڕه و توانای هیچی نیه، واته: وشەی (الشيئ) لێرەدا بە واتای ئەوه دێت کە توانای فرمان بە دادگەری و ڕاوەستان و ئیستیقامەتی نیه.

هەروەها خودای (عَزَّوجَلْ) فەرموویەتی:

﴿فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْأَلْنِي عَنْ شَيْءٍ﴾ (الكهف/٧٠)

ئەگەر شـوێنم کەوتیـت لە هـیچ شـتێك پرسـیارم لێ مەکە، مەبەسـتی لە شـتەکان، واتە پرسـیارم لە صـیفاتی پەروەردگـاری لێ مەکە، کە ئەو زانسـتانە دەگرێتەوه کە دروسـت نیە پرسیاریان دەربارە بکرێت، تـا ئەو کەسـە عاریـفە کاتی خۆی هات ڕوونیان دەکاتەوه.

هەروەها خودای (عَزَّوجَلْ) فەرموویەتی:

﴿ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ ﴾ (الطور/٣٥) لێـرەدا وشـەی (الشـيئ) بەواتـای خودایە، لەوانەیە وا گومان ببرێت کە ئەو وشەیە ئەو واتا دەگەیێنێت، کە هیچ شتێك دروست ناکرێت مەگەر لە شتێکەوه، کە ئەویش خودایە.[١]،

**هەروەها ووشەی (قەرین) (هاوتا):**

وەك فەرموودەی خودا: ﴿وَقَالَ قَرِينُهُ هَذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ﴾ (ق/٢٣) مەبەستی لە هاوڕێکەی ئەو فریشتەیە کە کراوە بە چاودێرو سەرپەرشتیای.

وه فەرموودەی: ﴿ قَالَ قَرِينُهُ رَبَّنَا مَا أَطْغَيْتُهُ﴾ (ق/٢٧)

لێرەدا قەرین بە واتای شەیتان دێت.

**وشەی (الأمة): بە هەشت شێوه واتای دێت:**

(١) قال صاحب القوت: ٥٤/١: روينا ذلك عن ابن عباس وعن زيد بن علي (رضيَ الله عنهما) قالا: أي: من غير رب، كيف يكون خلق من غير خالق؟!).

ئوممەت: بە واتای جەماعەت: وەك فەرموودەی خودای گەورە: ﴿وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِنَ النَّاسِ يَسْقُونَ ﴾ (القصص/٢٣)واتە كۆمەڵێك لەو خەڵكەی بینی خەریكی ئاودان بوون،یان بە واتای شوێنكەوتوانی پێغەمبەران دێت، وەك دەڵێیت: ئێمە لە ئوممەتی (حەزرەتی) موحەممەدین ﷺ .

ئوممەت؛ بەواتای: پیاوێك دێت كە هەموو چاكەكانی تێدا كۆبووبێتەوە و شیاوی ئەوە بێت شوێنی بكەویت. وەك باسی (حەزرەتی) ئیبراهیم كە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِلَّهِ ﴾ (نحل/١٢٠).

ئوممەت: بەواتای دین دێت: هەروەك خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِمْ مُهْتَدُونَ ﴾ (٢٢/زخرف) .

ئێمە باوباپیرانمان لەسەر دینێك بوون.

**بەواتای كات و زەمان:** هەروەك خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿إِلَى أُمَّةٍ مَعْدُودَةٍ .﴾ (هود/٨) بۆ تاقم و گرۆیەكی دیاری كراو.

یان فەرموودەی: ﴿ وَادَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ ﴾(یوسف/٤٥) ،دوای ماوەیەك بیری كردەوە.

ئوممەت، بەواتای قامەت و باڵاهاتووە: وەك دەڵێن: فڵان كەس ئوممەتێكی جوانی هەیە، واتە باڵایەكی جوانی هەیە، (فلان حسن الأمة).

ئوممەت: پیاوێكە بە تەنها دینێكی هەبێت، كەس هاوبەشی نەبێت، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((يُبعَثُ زيدُ بنُ عمرو بنِ نُفيلٍ أُمَّةً واحِدةً)) ، واتە: زەیدی كوڕی عەمری كوڕی نوفەیل زیندوودەكرێتەوە بە تەنها بۆ خۆی لەسەر دینێكی تایبەتیە.[1]

بەواتای دایكەش دێت: دەوترێت( هذهِ أُمَّةُ زَيدٍ) ئەوە دایكی زەیدە.

هەروەها وشەی (الروح) بە چەندین واتا هاتووە درێژی ناكەینەوە[1].

---

(١) رواه النسائي في السنن الكبرى(٨١٣١).

## وە هەروەهــا نادیــاربوونی واتــاو مەعنــا لە پیتەکانیشــدا دەردەکەوێت:

وەك فەرمــوودەی خــودای گەورە:﴿فَـأَثَرْنَ بِـهِ نَقْعًـا ، فَوَسَـطْنَ بِـهِ جَمْعًـا﴾ (العادیــات/٥) واتە: جــا بەو هەڵکوتانــدنە ســەر دوژمنەیــان، تــۆزو گەرد بەرز دەکەنەوە، ئینجا دەکەونە ناو کۆمەڵی دوژمنەوە . پیتی(هاء)ی یەکەم، کینایەیە لە و ئەســپانەی زەوی هەڵــدەدڕن، کە ئەســپەکانن. ســمیان دەدەن بەســەر بەردداو ئــاگر لێــێ بەرز دەبێــتەوە، (هــاء)هێی دووهەمیشــیان: کینــایەیە لەو ئەسپانەی لە بەرەبەیاندا هەڵیاندەکوتایە سەر دوژمن، وە خۆیان هەڵدەدەنە ناو کۆڕی دوژمنە بێباوەڕەکانەوە، وە تێکو پێکیان دەشکێنن.

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَأَنْزَلْنَا بِهِ الْمَاءَ﴾، واتە: بە هـۆی هەورەوە بارانمـان ڕژانـدە خـوارەوە، ﴿فَأَخْرَجْنَا بِهِ مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ﴾ (الأعراف/٥٧)، بەهۆی ئەو ئاوەوە هەموو بەرو بووم و ڕووەکەکانمان پێدەرکێشا و ســەوزکرد، کەواتە (بــاء)ی یەکەم بــۆ هەورە، (بــاء) ی دووهەم بــۆ بــاران و ئاوەکەیە، وە نموونەی ئەمانە لە قورئاندا یەکجار زۆرە.

یەکێکی تر لەوانەی بەبێ (بیستن) واتای لێك نادرێتەوە، پلەکارییە لە گەیاندنی واتادا: (بەچەند جارێك مەبەستەکە ڕووندەکاتەوە) وەك فەرموودەی خودای گەورە: ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ﴾ (البقرة/١٨٥):

ئەو مانگە ڕەمەزانەی کە قورئانی تێدا هاتە خوارەوە، دیاری نەکردووە بەشەو هاتۆتە خوارەوە یان بە ڕۆژ، وە بە فەرموودەیەکی تر دەری دەخات کە لە شەو دابووە، بەڵام نافەرموێت لە چ شەوێکدا بووە، ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُبَارَكَةٍ ﴾ (الدخان/٣) بەڵام بەم فەرموودەی خوارەوە دیاری دەکات کە لەشەوی قەدری

---

(١) بەدرێژی لە الإتحاف دا هاتووە ٤/ ٥٥٠.

پیرۆزدا بووە: ﴿إِنَّا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾ (القدر/١) .

که لەوانەیە بە ڕواڵەت وا گومان ببرێت که جیاوازی هەیە لە نێوانی ئەم ئایەتانەدا، بۆیە ئەمەو نموونەی ئەم ئایەتانە هەمیشە پێویستیان بە بیستن و گواستنەوەی فەرموودە و بەڵگە هەیە بۆ ڕاڤەکردنیان.

لەسەرەتای قورئانەوە تا کۆتاییەکەی خاڵی نیە لەم ڕەگەزو شێوەیە، چونکە بە زوبانی عەرەب ناردوویەتیە خوارەوە، کەواتە هەموو شێوەو جۆرە قسەکانیان دەگرێتەوە، لە کورتکردنەوەو درێژ پێدانی بابەتەکەو، شاردنەوەی وشەو، لادان و حەزفکردنی و، گۆڕینی بە وشەیەکی تر و، پێشخستن و دواخستنی، بۆ ئەوەی بێدەنگیان بکات و، ببێتە موعجیزەیەکیش لە بەرامبەریاندا.

کەواتە ئەوەی بڵێت: بە تەنها تێگەیشتنی ڕواڵەتی وشە عەرەبیەکان من دەتوانم ڕاڤەی بکەم، وە دەستی پێ کرد و، بایەخێکی نەدا بە بیستن ی ڕای زاناکان و، نەقڵکردنی بەڵگەو فەرموودەی پێشینەکان، ئەوە لەو کەسانەیە کە تەفسیری قورئان بە (ڕەئی) کردووە و، (هەڕەشەکە دەیگرێتەوە)، وەك ئەوەی لە واتای وشەی (الأمة) تەنها واتا بەناوبانگەکەی تێ بگات و، دڵیشی بەلای ئەو واتادا بڕوات، وە ئەگەر لە جێگەیەکی تردا هەمان وشەی بینیەوە، یەکسەر دڵی بڕوات بۆ واتا بڵاوەکەی، وە واز لەوە بهێنێت کە بەدووی واتا نەقڵییەکانیدا بگەڕێت، ئەم جۆرە هەڵوێستە، دەشێت کە بوترێت کارێکی قەدەغەکراوە، بەبێ تێگەیشتن و گەڕانەوە بۆ نهێنیی واتاکان وەك بەیانمان کرد، کەواتە ئەگەر بۆ نموونەی ئەم فرمانانە، وشەو واتاکانی لەسەرچاوەکانەوە بیست، ئەوە ڕواڵەتی تەفسیرکردنەکەی زانیوە، کە وەرگێڕانی واتای وشەکانە، بەڵام ئەوەندەیش بەس نیە بۆ تێگەیشتن لە حەقیقەتی واتا شاراوەکانی.

بۆ ئەوەی بزانین جیاوازی چییە لە نێوانی حەقیقەتی واتای قورئان و، ڕواڵەتی تەفسیرکردنیدا، دەبێت بە نموونەیەك ڕوونی بکەینەوە:

خودای (عَزَّ وجَلَّ) فەرموویەتی: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ رَمَى﴾ (الأنفال/١٧) لێکدانەوە ئاسایییەکەی دیارە، کە ئەو تیرەنەی تۆ تێت گرتوون، تۆ نەبویت، بەڵکوو خودا خۆی تێی گرتوون و پێیەوە ناون، بەڵام ئەصڵی واتاکەی ڕوون نیە، چونکە سەلماندنی ئەوەی تێدایە، کە تیرەندازیی کراوەو، ئەوەیشی تێدایە کە نەکراوە، کە بە ڕواڵەت دوو واتای دژ بەیەکن، مادەم لەوە تێ نەگات کە لە ڕوویەکەوە تیری وەشاندووە، لە ڕوویەکی تریشەوە ئەو نەیوەشاندووە بەڵکوو خودا تێی هاوێشتوون، چونکە توانای سەرەکی و هێزو ئیرادە هەمووی لای خودایە).

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی : ﴿قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ﴾ (التوبة/١٤) شەڕیان لەگەڵدا بکەن، با خودا بەدەستی ئێوە سزایان بدات، ئەگەر ئەوان شەڕڤانانی مەیدانن، چۆن دەبێت خودا سزادەریان بێت؟
وە ئەگەر خودا سزادەریان بێت و هێزوجوڵان بخاتە ناو دەستیانەوە، کە شەڕی ئەوانی پێبکەن، ئەی فەرمان پێدانیان بەشەڕ کردن چ واتایەکی دەبێت؟

ڕاستی ڕوونکردنەوەی ئەم نهێنیانە، لە ناو دەریایەکی بەرفراوانی زانستی موکاشەفەدا دەردەکەوێت، هیچ کاتێك بە ڕواڵەت تەفسیرکردنی قورئان و واتای زاهیری ناتوانێت ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە، کە دەبێت بیزانێت: پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی کردارەکانی بەندە هەیە بەو توانا پەیدابووەوە کە پێی دراوە، وە دەبێ ڕووی پەیوەندی توانای ئەو کەسە بە توانای ئەزەلییەتی خودای (عَزَّ وجَلَّ)ەوە تێ بگات، تا دوای ڕوون بوونەوەی چەندین فرمانی شاراوەی پەنهانی ئەو نهێنیەی بۆ دەربکەوێت، کە ڕاستە : ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ رَمَى﴾، ئەوە تۆ نیت کە هاوێشتووتە، لە ڕاستیدا هەر خودایە کە تێی هاوێشتوون، لەوانەیە ئەگەر تەواوی تەمەن سەرف بکەیت لە پێناوی دەرخستن و تێگەیشتن لە واتای و نهێنیەکانی ئەو بابەتەوە، بە سەرەتاو پەیوەستەکانیەوە، ئەوا تەمەن بە کۆتادەگات و تۆ هێشتا نەگەیشتویتەتە واتای

ڕاســـتەقین [1] وە تەمەن کۆتـــایی دێـــت و هێشـــتا تەواوی پەیوەســـت و پەیوەندارەکانی بۆ دەرنەکەوتووە.

وە هـیچ وشـەیەك نـیە لە قورئانـدا ئەگەر بتەوێـت ڕاسـتی واتاکەیـت بـۆ دەربکەوێـت، بەبێ ئەم هەوڵ و زانسـت و لێبـڕانە پێـی ناگەیـت، تەنهـا بـۆ پێگەیشـتووە ڕاسیخەکان دەردەکەوێت، ئەویش بەپێی زۆری و سـەرڕێژکردنی زانســـت و صـــەفای دڵەکانیـــان، وە بـــوونی ئەو هۆکـــار و بەدواگەڕان و شـــەونخونیەیان لە بیرکـــردنەوە و خـــۆیەکلایی کردنەوەیـــان، بـــۆ گەیشـــتن بە نهێنیەکان، وە هەریەکەشیان سنوورێکیان هەیە بۆ بەرزبوونەوە تا ئاستێك و، یەکێکـی تـــر لەو بەرزتـــر، بە پێـــی هەوڵ و کۆشـــش و ئـــیخلاص و ڕێنمـــایی و کارئاسانی پەروەردگاریان.

بەڵام زانینی هەموو نهێنیەکان: ئەوەنابێت کەس تەماحی لەو زانینەدا

---

(١) لەو ئەسـرارانەیە: زانینـی پلەکـانی کەمـاڵ و، زانینـی حەزلێبـوون لە گەیشـتن و شـارەزابوونی ئەو پـلە بەرزانەو، زانینی هێنـانەوەی نمـوونە دژبەیەکەکـان و، چـۆنیەتی ڕێکخسـتن و تەوفیقکـردن لە میانیانـدا، وە زانینی ئەوەی کە بـوونی (واجب الوجود) ئایا بە واتای ئەوەیە کە ڕێکاری هۆکاری و سەبەبیەت نەهێڵێت و سەلبی بکات، یان بۆ ئەوەیە کە کردارەکان بداتە پاڵ خۆیەوە، وە ئایا دەزانێت: زانینی عاریف و خواناسەکان تا بەکوێ دەگات و، لە کوێدا کۆتایی پێ دەگات، وە جیاوازی پلەو مقامی عاریفان چییە؟ ئایا زانین و مەعریفەتی عاریفان بە صیفاتی خـودا لە ڕوی حەقـیقەت و ناسینی تەواوەوەیە یـان نـا؟! وە چەنـدین زانسـت و زانینـی تـر، کە بەڕاسـتی مەلەوانی نـاو دەریـای مەعریفەتـی خوداناسـی نەبێـت، کۆلکە زاناکانی ئەم سـەردەمانە، تەنها لە لێوارەکەیدا دەخنکێن و، تەمەنیشیان تەواو دەبێـت، هیچیـان بـۆ سـەوز نابێـت، بـۆ زیـاتر ڕوونکـردنەوە بنوارە: الإتحـاف( ٥٥٣/٤).

هەبێت، تەنانانەت ئەگەر دەریاکان مرەکەب بن و، درەختەکانیش پێنووس بن، نهێنیەکانی کەلیماتی خودا هەرگیز ناگاتە دوا قۆناغ، هەموو دەریاکان بەکۆتا دێن، پێش ئەوەی کەلیماتی خودای (عَزَّ وجَلْ) کۆتایی پێ بێت.

لەم ڕووەوە خەڵکەکە جیاوازیان هەیە لە تێگەیشتن دا، دوای ئەوەی کە هەموویان وەك یەك ڕواڵەتی واتا قورئانیەکانیان زانی، کەئەم زانینە ڕواڵەتیە نە تینوێتی دەشکێنێت و، نە دەیشی گەیێنێتە ئەو ئاستەی کە ئیتر پێویستی بە واتاشاراوەکان نەمێنێت.

نموونەکەی: تێگەیشتنی هەندێك لە خاوەن دڵە زیندووەکانە، لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لە سوجدەکانیدا:

((**أعوذُ بِرِضاكَ مِن سَخَطِكَ، وبِمَعافاتِكَ مِن عقوبَتكَ، وأعوذُ بِكَ مِنكَ لاأُحصي ثَناءً عَلَيكَ أنتَ كَما أثنَيتَ علَى نَفسِكَ**))[1]، واتە: بەهۆی ڕەزامەندی تۆوە پەنات پێدەگرم لە توڕەبوونت، وە بە لێبوردوییتەوە پەنات پێدەگرم لە تۆڵەسەندنەوەت، وە پەنات پێدەگرم لە خۆت و بەخۆت، ناتوانم سەرژمێری هەموو سەناو ستایشەکانت بکەم، کە شایستەی تۆیە، وەك ئەوەی کە خۆت ستایشی خۆتت کردووە.

وتیان بە پێغەمبەر ﷺ : ﴿**وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ**﴾ (١٩/العلق) کەواتە بینی؛ کە نزیك بوونەوەی لە سوجدە بردندایە، بۆیە سەرنجی لە صیفەتەکانی خوادا، پەنای گرت بە هەندێك لە صیفەتەکانی خودا لە هەندێکی تریان، چونکە ڕەزامەندی و توڕەبوون دوو صیفەتی خودایین، لەپاشان نزیك بوونەوەکەی زیاتر بوویەوە لە خوداوە، نزیکیی یەکەم ، کەوتە ناو بازنەی ئەم نزیکبوونەوەیە، تا بەرز بوویەوە بەرەو نزیکی مەعنەوی لە زاتی خودا، بۆیە

---

(١) رواه مسلم(٤٨٦).

فەرمووی: **وأعوذُ بِكَ مِنكَ**، [١]، پەنا ئەگرم بە زاتی خۆت لە زاتی خۆت، لەپاشان ئەوەندەی تر قورب و نزیکبوونەوەی زیادی کرد، تاوای لێ هات: لەو میوانداریی نزیکی حزوورەدا شەرمی کرد، کە پەنا بەزاتی خودا ببات، وەك ئەوەی کە بەتەواوی لە حاڵەتی ئەماندابێت و، لەسەر ڕایەخی نەرمی نزیکییەوە پەنای پێ ببات، بۆیە پەنای بردە بەر سەناو ستایش کردنی پەروەردگار، وە بەوە دەستی پێکرد: **لاأُحصي ثَناءً عَلَيكَ**، وە زانی کەئەم جۆرە ستایشەش کەناتوانێت سەرژمێری هەموو ستایشەکانی بکات، بە کەمتەرخەمی دادەنرێت، بۆیە فەرمووی: **أَنتَ كَما أَثنَيتَ عَلَى نَفسِكَ** ، وەك ئەوەی کە تۆ ستایشی خۆتت کردووە، [٢]،

ئەمەی باسمان کرد، چەندین زانیاری تایبەتی بوون، کە دەکەونە ناو دڵی خاوەن دڵە صەفادراوەکانەوە، لە دوای ئەم ئاستەیش. چەندین قووڵ بۆداچوونی تریشی لەڕێدایە، کە دەبێتە واتای تێگەیشتنی نزیك بوونەوە لە سوجدەبردندا، وە بۆچی نزیك بوونەوەکە تایبەتە بە کاتی سوجدەوە، وە واتای پەناگرتن بە صیفەتێك لە صیفەتێکی تر ، یان بەخۆی لە خۆی، وە نهێنی زۆری تر ، کە پێویستی بە ڕۆچوونی تایبەتی هەیە، وە هەرگیز تەفسیرکردنەوەی وشەکانی قورئان بە ڕواڵەتیی و زاهیری، ئەو واتا گرنگانە ناگەیێنن، وە ئەم لێکدانەوانەیش هەرگیز دژایەتییان نیە لەگەڵ ڕاڤەکردنی ڕواڵەتیدا، بەڵکوو

---

(١) ئەمەیش ڕاکردنێکە لە خوداوە بۆ حزوری خودا، بێ ئەوەی کارو صیفەتەکانی ببینێت، تەنها خۆیی بینیوە، کە ڕادەکات بۆ لای پەروەردگاری، ئیتر کەوتە حاڵەتی فەناوە، لەوەی کە خۆی ببینێت، بەڵکو تەنها خالیقەکەیی لەبەرچاو دەبێت. الإتحاف/٤/٥٥٤.

(٢) هەواڵی بەوەدا کە خودا خۆی ستایشکار و ستایشکراویشە، وە هەموو شتێك لەوە دەستی پێکردووەو، بۆلای ئەویش دەگەڕێتەوە. وەهەموو شتێك بەهیلاکدا دەچێت تەنها ڕوخساری ئەو زاتە نەبێت ﷻ

تەواوکردنی ئەو تەفسیرکردنانەیە کە زاناکان کردوویانە، وە گەیشتنە بە ناوەرۆك و کاکڵەی مەبەستەکان.
ئەمەی سەرەوە ئەو بابەتانەبوو کە ویستمان ڕوونیان بکەینەوە. لە هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە نهێنی و ئەسراری واتای کەلیماتی شاراوەی خودایی، نەك ئەوەی کە دژایەتی لەگەڵ واتا زاهیریەکاندا هەبێت. وە خودای گەورەیش زاناترە .

**پەڕاوی**

**ئادابی خوێندنەوەوە قورئان**

**تەواو بوو، کە پەڕاوی هەشتەمە**

**لە چواریەکی بەندایەتی**

**لەپەڕاوەکانی**

**ژیانەوەی زانستەکانی ئاین.**

**بەدووی دا دێت پەڕاوی**

**زیکرەکان و نزاو پاڕانەوەکان**

**تم كتاب**

**آداب تلاوة القرآن وهو الكتاب الثامن**

**من ربع العبادات من كتب**

**إحياء علوم الدين،والحمد لله حقَّ حمدهِ، وصلاته على خير خلقه، سيِّدنا محمد وعلى آلهِ الطَّاهرينَ، وصحبهِ الأَكرَمين.**

**يتلوهُ كتاب الأذكار والدعوات**

# پەڕاوی

# زیکرەکان و نزاو پاڕانەوەکان

که پەڕاوی هەشتەمە

لە چواریەکی بەندایەتی

لەپەڕاوەکانی

ژیانەوەی زانستەکانی ئاین.

# كتابُ

# الأَذكارْ والدَّعَواتْ

وهو الكتاب التاسع

من ربع العبادات

من كتب

إحياء علوم الدين

# پەڕاوی زیکرەکان و نزاو پاڕانەوەکان

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحمَنِ الرَّحيمْ

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی کە خاوەنی میهر وسۆز و ڕەحمەتێکی بەرفراوان و گشتگیرە، پاداشتی بەندەکانی داوەتەوە کە زیکری خودا دەکەن بە ناوبردن و زیکرکردنیان، وەك فەرموویەتی: ﴿فَاذْكُرونِي أَذْكُرْكُمْ﴾ (البقرە/٢٥٢).

ئێوە یادو ناوی من ببەن، منیش ناوی ئێوە دەبەم. وە هانی داون بۆ ئەوەی هەمیشە لەسەر فەرمانی خۆی داواو نزاو پاڕانەوەی لە خزمەتدا بکەن، وەك فەرموویەتی: ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ (غافر/٦٠). وە تەماحی خستۆتە بەری گوێڕایەڵ و تاوانکار و خەڵکانی دوور و نزیك. کە دەرگای سۆزو ڕەحمەتی کراوەیە و، دەتوانن هەمیشە هیواو ئاواتی نزاو پاڕانەوەکانیان بگەیێننە حزوری (حەزرەتی)خاوەن جەلالی پەروەردگار، کە پەردەی نێوانیانی لەسەر هەڵگرتوون و. دەتوانن داواکانیان بەرز بکەنەوە، وەك فەرمووی:

﴿فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ﴾ (البقرة/١٨٦)

ئەوە من نزیکم و دەچم بەدەم هەموو ئەو کەسانەوە کە هاناو پەنام پێدەبەن و ڕووی نزایانم تێ دەکەن.

وە صەڵات و سەلامی بەردەوام لەسەر (حەزرەتی) موحەممەد گەورەی پەیامبەرانی خودا، وە لەسەر ئال و ئەصحابی کیرام و بژاردە و پاڵفتەکراو، بەشێوەیەکی هەمیشەیی و نەبراوە تا کۆتای زەمان.

لەپاشان: لەدوای خوێندنەوەی قورئان، هیچ بەندایەتیەك نیە کە بە زوبان بکرێت، خێری زیاتر بێت لە زیکری خودای گەورە، وە بەرزکردنەوەی داوا و پێداویستیەکان بە کۆمەڵێك نزای پڕ لە ئیخلاصەوە، بۆ حزوری خودای بەدەسەڵات، کەواتە پێویستە لەپێشەوە باس و ڕاڤەی گەورەیی زیکر بکەین بە پوختی، لەپاشاندا بەشێوەیەکی تێرو تەسەل باسی زیکرە بەناوبانگەکان

دەکەیــن، وە ڕاڤەی گەورەیــی دوعـــاو نزاکـــردن و مەرجەکـــانی نزاکـــردن و گواســتنەوەی ئەو دوعــا مەئســـوورانەی کە پێمانگەیشــتووە، بە تــایبەتی دوعــا تایبەتەکــان، کە هەمـــوو خەصـــڵەتێکی پیـــرۆزی تێـــدایە و، کـــۆکەرەوەی پێداویســـتییەکانەو، مەرامــی دیــن و دونیــای پــێ جێبەجــێ دەبێــت، وە نــزا تایبەتەکانی تریش کە پەیوەندارن بە داوای لێخۆش بوون و پەناگرتن بەخوداو ئەوانی تر.

## ئەوەی مەبەستمانە باسیان بکەین لە پێنج دەروازەدا ڕوونی دەکەینەوە:

### دەروازەی یەکەم:

باسی گەورەیی زیکر و سوودەکانی بەکورتی و بە درێژی.

### دەروازەی دووهەم:

باســی گەورەیــی دوعــاو ئادابەکــانی و گەورەیــی داوای لێبــوردن لە خــوداو صەڵاواتدان لە دیداری (حەزرەتی) موحوممەد ﷺ.

### دەروازەی سێیەم:

لەبـــارەی ئەو دوعـــا مەئســـوورەکان، واتە: لە ئەســـەرو فەرمایشـــتی پێشــینەکانەوە وەرگیرابێــت و، باســی هۆکــاری ئەو نزایــانەو گێڕانەوەیــان بــۆ خاوەنەکانیان کە فەرموویانە.

### دوروازەی چوارەم:

هەنــدێك دوعــای هەڵبژێــرراوی بێ ســەنەد، واتە: نیســبەتی بــۆ خاوەنەکانی نەماوە و باسنەکراوە و لە دوعا مەئسوورەکانیش دەژمێررێن.

### دەروازەی پێنجەم:

ئەو دوعــا مەئســوورانەی لەکــاتی ڕودانــی ڕوداوێکــدا دەوتــرێن ، یــان دەخووێنرێن.

# دەروازەی یەکەم

## باسی گەورەیی زیکر بە کورتی و بەدرێژی، بە بەڵگەی ئایەت و فەرموودە و ئاسارەکان

### پوختەی بەڵگەکان لەسەر گەورەیی زیکر:

### بەڵگە ئایەتیەکان:

فەرموودەی خودای گەورە: ﴿فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ﴾ (البقره/٢٥٢).

ثابتی بەنانی (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: من دەزانم کەی خوداوەندم زیکری من دەکات، لێی سڵەمینەوەو وتیان: چۆن شتی وادەزانیت؟! فەرمووی: ئەگەر من زیکر و یادی ئەوم کرد، ئەویش ناوی من دەبات.[1] .

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا﴾ (٤١/الأحزاب) ناوی خودای گەورە ببەن و زیکری زۆری بکەن.

وە خودای گەورە فەرموویەتی:﴿فَإِذَا أَفَضْتُمْ مِنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُوا اللَّهَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ وَإِنْ كُنْتُمْ مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّالِّينَ﴾(البقرة/١٩٨)

ئەگەر لە عەرەفات گەڕانەوەو، کەوتنە ڕێ بەرەو موزدەلیفە ، لەلای (مەشعەرولحەرام) ناوی خودا بهێنن، وەك ڕێنمایی کردوون ئاوا زیکری بکەن.

خودای (عَزَّ وجَلْ) فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا قَضَيْتُمْ مَنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا﴾ (البقرة/٢٠٠)

واتە کە مەناسیکی حەجتان تەواو کرد، دەس بکەن بەزیکرو یادو باسی گەورەیی خودا، وەك چۆن ناوی باوکتان بە ڕێزو حورمەتەوە دەبەن، بەڵکوو لەوەیش زیاتر و بەهێزتر ناوی خودا ببەن.

---

(١) رواه ابن أبي شيبة في (المصنف) (٣٦٥٢٧)، وأبو نعيم في الحلية(٢/٣٢٤).

وە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ﴾ (ال عمران/١٩١) ئەوانەی زیکری خودا دەکەن بە پێوە و بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشت و بە پاڵەوە.

وە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَاذْكُرُوا اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِكُمْ ﴾ (النساء/١٠٣) وە ئەگەر نوێژتان تەواو کرد، ئەوا بە هەموو شێوەیەکی پەسەند زیکری خودا بکەن، وەك ئیبنو عەباس (خودایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: بەشەوو ڕۆژ و لە ناو دەریاو لە دەشت و سارداو، لە گەشت و گوزەر و لە ماڵەوەو ، لە حاڵی دەوڵەمەندی و هەژاریدا و، لە کاتی نەخۆشی و لەش ساغیدا، وە بەشێوەی ئاشکراو پەنهانی[1] .

خودای گەورە لە باسی خراپەی دوڕووەکاندا فەرموویەتی: ﴿وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ (النساء/١٤٢) زۆر بەکەمی نەبێت ناوی خودا نابەن.

وە خودای (عَزَّ وجَلْ) فەرموویەتی: ﴿وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ وَلَا تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ﴾ (الأعراف/٢٠٥)، زیکری خودای خۆت لە نەفسی خۆتدا بە زاری و کزی و داماوی و ترسەوە، ئەگەریش بە زوبان زیکرت کرد؛ با دەنگت لە ئاشکرایی کەمتر بێت،لە بەیان و ئێوارەو لە هەمووکاتدا ناوی خودا بهێنە،لەوانە مەبە کە بێئاگان لە ناوو یادی خودا

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ﴾ (العنکبوت/٤٥) ئیبنو عەباس (خوایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی : **بە دوو شێوە لێك دەدرێتەوە:**

**یەکەمیان:** زیکری خودای گەورە بۆ ئێوە گەورەترە لە زیکری ئێوە بۆ خودا، **دووهەمیان:** زیکری خودا گەورەترە لە هەموو عیبادەتێك کە زیکری تێدا نەبێت.[2] ، چەندین ئایەتی تر لەم بارەوە هاتووە لە بەیانی گەورەیی زیکردا.

---

(١) رواه الطبري في تفسيره (٣٣٥/٤/٤).

(٢) رواه الطبري في تفسيره(٢٠/١١(٣٣٥).

## بەڵگە فەرموودەکان:

(حەزرەتی) پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

(( ذاكِرُ اللهِ في الغافِلِين، كالشَّجَرَةِ الخَضراءِ في وسَطِ الهَشيمِ))[1]،

زیکری خودا لە ناو کۆمەڵێکی بێ ئاگاو غافڵدا، وەك بوونی درەختێکی سەوزی بەردار وایە، لە ناو کۆمەڵە درەختێکی زڕی وشکی پەلشکاوی ڕزیودا،

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:(( ذاكِرُ اللهِ في الغافِلِين، كالمُقاتِلِ بينَ الفارّين))[2]،

واتە: زیکری خودا لە ناو بێ ئاگاکاندا، وەك کەسێکی موجاهیدی شەڕوانە لە ناو کۆمەڵێکی تێکشاوی ڕاکردوو، کە ناوەندی جیهادیان بەجێ هێڵابێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((ذاكِرُ اللهِ في الغافِلِين، كالحَيِّ بينَ الأَمواتِ))[3]،

ئەوەی لەناو غافڵاندا یادو زیکری ئەڵلا دەکات، وەك کەسێکی زیندوو وایە لە ناو کۆمەڵە مردوویەکدا.

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: خودای گەورە فەرموویەتی:

((أنا معَ عَبدي مَاذكَرني وتَحرَّكَت بي شَفَتاهُ))[1]، من لەگەڵ بەندەکەمدام، هەرکاتێك یادی منی کردو لێوەکانی بە زیکری من جوڵاندەوە.

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية ١٨١/٦، والبيهقي في الشعب(٥٦١)، وفيهما: **مثل الشجرة الخضراء في وسط الشجر**.وقد أورد الزبيدي نص الحديث بطوله، **ذاكر الله في الغافلين مثل الذي يقاتل عن الفارين. وذاكر الله في الغافلين كالمصباح في البيت المظلم، وذاكر الله في الغافلين كمثل الشجرة الخضراء في وسط الشجر الذي تحات من الصرير، وذاكر الله في الغافلين يغفر له بعدد كل فصيح وعجم، وذاكر الله في الغافلين يعَرِّفُهُ الله عزَّوجل مقعدهُ من الجنة**، وعلق على أحد رواة الحديث الذي اتهم بالضعف وهو عمران بن مسلم، فقال الذهبي ٤٨٠/٢(٤٦١٧)، والبخاري في التأريخ الكبير ٤١٩/٦/٢٨٤٢) منكر الحديث، ثم أورد له هذا الحديث

(٢) هو القطعة الأولى من الحديث المخرَّج آنفا.

(٣) قوت القلوب ٢٦٥/٢.

وه پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**ما عمِلَ ابنُ ادَمَ مِن عَمَلٍ أَنجَى لهُ مِن عذَاب اللهِ، مِن ذِكرِ اللهِ (عَزَّ وجَلْ) .قالوا يارَسولَ الله: ولا الجهادُ في سبيلِ الله، قال: ولا الجهادُ في سبيلِ الله، إلاَّ أَن تَضرِب بسَيفِك حتَّى ينقَطعَ، ثمَّ تَضرِبَ بهِ حتى ينقطِعَ، ثُمَّ تَضرِبَ بهِ حتَّى يَنقَطِع**))[٢].

واته: هیچ کردەوەیەکی ئادەمیزاد نیه کە ڕزگاری بکات لە سزای دۆزەخ، باشتر بێت لە زیکری خودا، عەرزیان کرد: تەنانەت جیهادی ڕاستەقینەیش لە ڕێی خوادا ناگات بە زیکری خودا، فەرمووی: تەنانەت ئەویش پیایدا ناگات، مەگەر شمشێرەکەت لە دوژمندا بشکێنیتەوەو دووبارەو سێ بارە لەشەڕو لێدانی بێباوەڕدا شمشێرەکەت بشکێت .

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی

---

(١) أخرجه ابن ماجه(٣٧٩٢) كتاب الأدب. باب فضل الذكر. وابن حبان في صحيحه(٩٣/٣(٨١١)، من حديث أبي هريرة. والحاكم في المستدرك(٦٧٣/١(١٨٢٤)، من حديث أبي الدرداء وقال صحيح الإسناد. قال الزبيدي٥/٥: وعلقه البخاري في صحيحه(كتاب التوحيد باب قول الله تعالى (لاتحرك به لسانك، عن أبي هريرة بصيغة الجزم، وابن حبان أيضا في صحيحه٩٧/٣(٨١٥)، وابن عساكر في تأريخ دمشق٢٥/٢١٢)، وعد مسلم كتاب الذكر (٢٦٧٥)، أنا عند ظن عبدي بي ....بطوله.

(٢) أخرجه ابن أبي شيبة في المصنف(٥٧/٦(٢٩٤٥٢)، و ١٦٩/٧(٣٥٠٤٦). والطبراني في الكبير١٦٦/٢٠(٣٥٢) من حديث معاذ بإسناد حسن. وقال الزبيدي( ٥/٥). رواه أحمد في المسند(٢١٥٧٤) عن معاذبن جبل، قال الهيثمي في مجمع الزوائد( ٧٣/١٠)، رجاله رجال الصحيح. إلا أن زياد ابن أبي زياد راويه لم يدرك معاذا، أى فهو منقطع، و زياد بن أبي زياد إنما رواه عن أبي بحرية عن معاذ، فعلى هذا لا نقطاع. إلا أنّه رواه موقوفا، ورواه مالك في الموطأ (٤٩٠) عن زياد عن معاذ موقوفا ولم يذكر أبابحرية، واسمه عبد الله بن قيس، شامي ثقة تابعي، واما المرفوع فرواه عثمان بن أبي شيبة من طريق أبي الزبير عن طاوس عن معاذ وهو منقطع أيضاً، لان طاووساً لم يلق معاذاً، وقد رواه الطبراني أيضا عن جابر مثله بسند رجاله رجال الصحيح.

**(( مَن أحبَّ أَن يَرتَعَ فِي رِياضِ الجَنَّة، فَليُكثِرْ ذِكرَ اللهِ (عَزَّ وجَلَّ) ))**[1]،

ئەوی پێی خۆشە لە باخچەکانی بەهەشتدا ژیان بەسەر بەرێت و بە خۆشی لێی بگوزەرێت، با زۆر زیکری خودای (عَزَّ وجَلْ) بکات.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ لە وەڵامی پرسیارێکدا کە لێیان کرد، ئایا چ کردارێك خۆدا لە هەموو کردارەکان پیی خۆشترە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە بمریت و زوبانت بە یاد و زیکری خودا پاراو بێت.

**(( أَنْ تَمُوتَ وَلِسَانُكَ رَطْبٌ مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ (عَزَّ وجَلْ)))**[2]،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:**(( أَصبِحْ وأَمسِ ولِسانُكَ رَطبٌ بِذكرِ اللهِ، تَصبَحُ وتُمسي ولَيسَ علَيكَ خطيئةٌ))**[3]،

کارێك بکە بەیانیت لەسەر هات و ئێوارەت بەسەرتا هات، زوبانت پاراوبێت بە زیکری خودا، بۆ ئەوەی ئێوارەو بەیانی کە لەسەر دێت، هیچ هەڵەو تاوانێکت لەسەر نەمێنێت و هەمووی لەسەرت بسڕێتەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **((لذكرُ اللهِ عزَّ وجَل بالغَداةِ والعَشيَ أفضَلُ مِن حَطمِ السَيوفِ فِي سَبيلِ الله، ومن إعطاءِ المال سَحّاً))**[1]،

واتە: زیکری خودا بە بەیانیان و ئێواراندا، باشترو گەورەترە لەوەی شمشێرە

---

(١) أخرجه ابن أبي شيبة في المصنف(٥٨/٦(٢٩٤٥٧)، و ١٧١/٧(٣٥٠٥٩)، والطبراني في الكبير(١٥٧/٢٠(٣٢٦)، من حديث معاذ بسند ضعيف، ورواه الطبراني في الدعاء ص/٥٢٨(١٨٩٠)من حديث أنس . وهو عند الترمذي (٣٥١٠): بلفظ: **إذا مررتم برياض الجنة فارتعوا**...وقد تقدم تخريجه أيضا في كتاب العلم.

(٢) أخرجه ابن حبان مرفوعا في صحيحه(٩٩/٣(٨١٨) والطبراني في الكبير ٩٣/٢٠، وفي الدعاء(ص/٥١٩(١٨٥٢)، وص/ ٥٢٠(١٨٥٣)، والبيهقي في الشهب(٣٩٣/١(٥١٦)، من حديث معاذ.ورواه ابن المبارك في الزهد(١١٤١)، عن الحسن مرسلا،

(٣)رواه أبو القاسم الاصبهاني في الترهيب والترغيب من حديث انس: **من أصبح وأمسى ولسانه رطب من ذكر الله، يُمسي ويصبح وليس عليه خطيئة)** وفيه من لايعرف، إتحاف ٦/٥.

کەت لە ناو شەڕی ڕووبەڕووبوونەوی بێباوەڕاندا بشکێت، وە لەوەش باشترە بە ئەو پەڕی سەخاوەتەوە ماڵ و سامانت ببەخشیتەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((قال الله عزَّ وجَل إذا ذَكرني عبدي في نَفسهِ ذكَرتهُ في نَفسي، وإذا ذكَرني في مَلأٍ ذكَرتُهُ في مَلأٍ خَيرٍ مِنْ مَلَئهِ، وإذا تقرَّبَ مِنيَّ شِبراً تقرَّبتُ منهُ ذراعاً، واذا تقرَّبَ منيَ ذِراعاً تقرَّبتُ منهُ باعاً وإذا مشَى إليَّ هرْوَلتُ إليهِ.))** [٢]،

واتە: خودای گەورەو فەرموویەتی: ئەگەر بەندەکەم لە ناو دڵی خۆیداو لەبەر خۆیەوە یادی من بکات، منیش لای خۆم ناوی دەبەم، وە ئەگەر لە ناو کۆمەڵێکدا ناوم ببات، منیش لە ناو کۆمەڵێکی باشتر لەواندا ناوی دەبەم، ئەگەر بستێك لەمن نزیك ببێتەوە لە ڕووی گوێڕایەڵی و پابەندییەوە، ئەوا منیش باڵێك (زیراع) لێی دێمە پێشەوە، وە ئەگەر باڵێك لێم نزیك ببێتەوە ئەوا من (باع)ێك واتە کەسێك هەردووباڵی کردبێتەوە، ئەوەندە لێی نزیك دەبمەوە، وە ئەگەر بە ئاسایی بێت بۆلام، من بە خێرایی دەچم بە دەمیەوە، (باسکردنی پێوەرەکان، بۆ تێگەیاندنە، ئەینا نە مرۆڤ دەتوانێت بە مسافە نزیك ببێتەوە و نەخودایش بەو پێوەرانە نزیك دەبێتەوە، بەڵکوو تەنها نزیکبوونەوەیەکی تایبەتییە، وە هەروەلە واتە: بە خێرایی دەچێت بە دەمیەوە).

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی :

**((سَبعَةٌ يُظِلُّهمُ اللهُ في ظلِّهِ يَومَ لاظِلَّ إلاَّ ظِلُّهُ، مِنْ جُملَتِهم: (رجلٌ ذكرَ الله**

---

(١) رواه ابن مبارك في الزهد، (١١١٦) وابن أبي شيبة في المصنف١٧٠/٧ (٣٥٠٤٧) (٣٠٠٦٩)، موقوفا على عبدالله بن عمرو بن العاص موقوفا، ورواه مرفوعا بتمامه ابن شاهين في الترغيب والترهيب، ورواه الديلمي في مسند الفردوس٤٥٤/٣(٥٤٠٢)، عن أنس مرفوعا إلى قوله: وفي سبيل الله، إلا أنه قال: خيرٌ، بدل: أفضلُ،

(٢) رواه البخاري (٧٤٠٥) ومسلم(٢٦٧٥).

**خالِياً ففَاضَتْ عَيناهُ مِنْ خَشيَةِ اللهِ ))**[1]،واته: یەکێك لەوتاقمانەی کە خودا دەیخاتە ژێر سێبەری عەرشەوە، پیاوێکە لە جێگەیەکی چۆڵدا یاد و زیکری خودا بکات و، چاوەکانی فرمێسکی لێبڕژێت لەترسی خودا.

هەوەها ئەبودەرداء دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **((أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ وَأَزْكاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ، وَخَيْرٍ لَكُمْ مِنْ إِعْطَاءِ الْوَرِقِ والذَّهَبِ، وَ خيرٌ لَكُم مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ، وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ؟ "قَالُوا: وَمَا ذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: "ذِكْرُ اللَّهِ" (عَزَّ وجَلَ) دائِماً))** [2]،

واتە: ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە باشترینی کردەوەکانتان و، پوختەترینیان بێت لای پادشاکەتان و، لە هەموان زیاتر پلەتان بەرزکاتەوە لە حزوری خوادا و، لە بەخشینەوەی زێڕ و زیو و دراو زیاتر خێرتان بۆ بداتەوە، تەنانەت لەوەش باشتر بێت کە بە دوژمنانتان بگەن و، ئێوە لە گەردنیان بدەن و ئەوانیش لەگەردنی ئێوە بدەن؟ وتیان کامەیە ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: بەردەوام بوون لەسەر زیکری خودای گەورەو باڵادەست.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **(( قال اللهُ (عَزَّ وجَلْ) : مَنْ شَغلَهُ ذِكري عَن مسأَلَتي، أَعطَيتهُ أَفضَلَ ما أُعطي السَّائِلينَ))** ،

واتە: ئەوەی یادو زیکری من ئەوەندەی سەرقاڵکرد، نەیپەرژایە سەرنەوەی داوای شتم لێبکات، زۆر لەوانەی زیاتر پێدەدەم کە داوام لێدەکەن. [3]

---

(١)رواه البخاري (١٤٢٣ ومسلم(١٠٣١).

(٢) رواه الترمذي (٣٣٧٧) وابن ماجه(٣٧٩٠)، ووقع في بعض النسخ زيادة كلمة دائما في آخره. والحاكم في المستدرك٦٧٣/١(١٨٢٥) وصحح إسناده، من حديث أبي الدرداء.

( ) رواه البخاري في التأريخ الكبير(١٠٠/٢)١١٥/٢(١٨٧٩)، والبزار في مسنده ٢٤٧/١(١٣٧)، وفيه صفوان بن أبي الصهباء ذكره ابن حبان في الضعفاء(٣٧٦/١(٥٠٣)، وفي الثقات(٣٢١/٨(١٣٦٦٧) أيضا. وقال الزبيدي(٧/٥): ورواه البخاري أيضا في خلق أفعال العباد ص/١٠٩، والبيهقي في شعب الإيمان، ٤١٣/١(٥٧٣)، عن عمرو عن جابر(رض) ورواه

## بەڵگە ئاسارەكان:

فوضەیلی كوڕی عەیاض فەرموویەتی:

پێمان گەیشتووە كە خودای (عَزَّ وجَلَّ) فەرموویەتی: ئەی كوڕی ئادەم: كاژێرێك لە دوای بەرەبەیان زیكری من بكەن و لە دوای عەسریش بەهەمان شێوە سەعاتێك یادم بكەن، منیش لەو نێوانەیاندا ئاگام لێتان دەبێت[1]،

وە هەندێك لە زانایان فەرموویانە: خودای خاوەنی جەلال و دەسەڵات فەرموویەتی : هەر بەندەیەك سەیری دڵی بكەم و زیاتر زیكری من زاڵ بێت بەسەریدا، پابەندبێت پێیەوە، منیش دەبمە سەرپەرشتیاری و، كاروباری بۆ ڕادەپەڕێنم و، دەبنە هاونشینی و هاوڕازو دڵهاوەری.

حەسەنی بەصری (خوا لێی خۆش بێت) فەرموویەتی:

دوو جۆر زیكر هەیە: زیكرێكی خودای گەورە لە نێوانی خۆت و خوداوەندا، (كە بە زیكری قەلبی ناسراوە) چەند جوان و خێردارو گەورەیە، وە لەمەیش خێردارتر ئەوەیە: لە جێگەیەكدا خودا شتێكی حەرامكردبێت، تۆخودات لەبیر بێت و، زیكری بكەیت و توخنی حەرامەكە نەكەویت.[2]،

وە دەگێڕنەوە: كە هەموو كەسێك بە تووینێتی زیندوودەبێتەوەو بەڕێ دەخرێت بۆ حەشر، جگە لەوانەی كە زیكری خودایان كردووە.

وە معازی كوڕی جەبەل (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: ئەهی بەهەشت تەنها داخ لەو سەعاتە هەڵدەكێشن كە لەدەستیان چووە و زیكری خوای گەورەیان تێدا نەكردووە. خودای گەورەو مەزنیش زاناو ئاگادارە.

---

ابن أبي شيبة في المصنف(٣٤/٦)(٢٩٢٧٣) عن عمرو بن مرة مرسلاً، بلفظ (فوق) بدل(أفضل.

(١) رواه أبو نعيم مرفوعا(٢١٣/٨).

(٢) رواه الطبراني في الكبير(٩٣/٢٠)والبيهقي في الشعب(٥٠٩) عن معاذ(رضي الله عنه)مرفوعا.

# گەورەیی مەجلیسی زیکر

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:((**ماجلَسَ قومٌ مَجلساً يذكُرونَ اللهَ عزوَجلَّ إلاَّ حفَّت بِهمُ الملائِكَة، وغَشِيَتهُم الرَّحمَةُ، وذكَرهُم اللهُ فيمَن عِندهُ**))[1]، لەهەر کۆڕێکی زیکردا تاقمێك دابنیشن و یادی خودای تێدا بکەن، ئەوا فریشتەکان دەوریان لێدەدەن، وە ڕەحمەت دایان دەگرێت و، خودای گەورەیش لەلای هاونشین و نزیکانی دیوانی خۆیدا باسیان دەکات و ناویان دەبات.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((**مامِن قَومٍ اجتَمعُوا يذكُرونَ اللهَ تعالَى لايُرِيدُون بذلكَ إلاَّ وجْههُ، إلاَّ ناداهُم مُنادٍ منَ السَّماء، قُومُوا مَغفُورا لكُم، وقد بدِّلتُ لكُم سيِّئاتُكم حسَناتٍ**))[2].

هەر کۆمەڵێك تەنها لەبەر ڕەزای خودا کۆببنەوەو زیکری خودا بکەن و مەرامی تریان نەبێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە، دەنگێك لە ئاسمانەوە بانگیان دەکات: هەستنەوە و مژدەتان لێبێت، ئەوا لێتان خۆش بووم، وە کردەوە خراپەکانیشم بۆ گۆڕین بە کردەوەی چاکە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:[3]

((**ماقعَدَ قَوْمٌ مَقعَداً لَم يَذكُروا الله تعَالَى فيهِ، ولَمْ يُصَلُّوا عَلى النبيِّ ﷺ، إلاَّ كانَ**

---

(١)رواه مسلم من حديث أبي هريرة(٢٧٠٠)وبلفظ المصنف عند أحمد في المسند(٣/٤٩) كذلك.

(٢)قال العراقي رواه احمد في مسنده(١٢٠٤٥) وأبو يعلي في مسنده(٧/١٦٧)(٤١٤١) والطبراني في الأوسط(٢/١٥٤)(١٥٥٦) بسند ضعيف من حديث أنس. وقال الزبيدي٥/٨: هو مركب من حديثين؛ الاول: عن انس وأحمد وأبي يعلي والطبراني في الاوسط والضياء في المختارة بلفظ: **ماجلس قوم يذكرون الله إلا ناداهم مناد من السماء، قوموا مغفورا لكم.** والثاني: عن سهل بن الحنظلية عند الطبراني في الكبير والبيهقي في السنن والضياء في المختارة بلفظ: **ماجلس قوم يذكرون الله عزوجل فيقومون حتى يقال لهم: قوموا قد غفر الله لكم ذنوبكم ، وبدل سيئاتكم حسنات.**

(٣)قال العراقي: رواه الترمذي(٣٣٨٠) وحسنه من حديث ابي هريرة ، وفيه (ترة) بدل(حسرة).

علَيهِمْ حَسْرَةً يومَ القِيامَةِ)) ، هەر كۆمەڵێك لە شوێنێكدا دابنیشن و زیكری خـودای تێـدا نەكەن و ، صـڵاواتی تێـدا نەدەن لەسـەر پێغەمـبەر ﷺ ، ئەوە لە دوارۆژدا دەبێتە ئاخ و خەفەتێكی زۆر و حەسرەت و پەشیمانی لێ هەڵدەكێشن.

**(حەزرەتی) داوود (سەلامی خودای لەسەر) فەرموویەتی:**

ئەی پەروەردگارم: ئەگەر منت بینی بەسەر مەجلیسی ئەوانەدا كەزیكرەكەم تێپەڕیم و لامنەداو چووم بۆ ناو كۆڕی خەڵكە غافڵ و بێ ئاگا ئەوا پێش ئەوەی بگەمە ناویان قاچەكانم بشكێنە،ئەوە بە نیعمەت و دیارییەكی خۆتی دەزانم[1] ،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی :

**((المَجلسُ الصَّالحُ يُكَفِّرُعَنِ المُؤمِنِ أَلفَيْ ألفِ مَجلِسٍ مِنْ مَجالِسِ السُّوءِ))[2].**

كۆڕی باش و چاكەكاری،دووهەزار كۆڕی خراپ و ناپەسەند دەسڕێتەوە.

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

دانیشـتووی ئاسـمانەكان ئەو مـاڵانە دەبیـنن لەسـەر زەویـدا، كە زیكـری خودای گەورەی تێدا دەكرێت، وەك چۆن ئەستێرەكانی ئاسمان دەبینرێت،[3] ،

سوفیانی كوڕی عویەینە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ئەگەر كۆمەڵێك كۆبوونەوەو زیكری خودایان دەكرد، شەیتان و دونیا كەنارگیر دەبن و، لە سووچێكدا پێكەوە دەكەونە قسەكردن، شەیتان بە دونیا دەڵێت:

نابینیت چی دەكەن؟ دونیایش دەڵێت: وازیان لێبهێنە هەركە لێك ترازان و كۆڕەكەیان بەجێهێڵا، ملیان دەگرم و دەیانخەمە بەردەستەوە

دەگێڕنەوە ئەبوهورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) چووە ناو بـازاڕەوە و بە

---

(١) رواه أحمد في الزهد(٤٥٣) وابن أبي الدنيا في العلم(١٣٩).

(٢)قال الحافظ العراقي ذكره صاحب الفردوس(١٥٨/١)(٥٨٣) من حديث أسد بن وداعة، وهو مرسل، ولم يُخرِّجه ولده، وكذلك لم أجد له اسنادا. الإتحاف ٥ /٩.

(٣) رواه ابن مبارك في الزهد(٩٦٣).

خەڵکەکەی فەرموو : دەبینم ئێوە لێرەدان و. میراتی پێغەمبەریش ﷺ لە مزگەوتدا دابەش دەکرێت، خەڵکەکە ڕۆشتن بۆ مزگەوت و. وازیان لەبازاڕ هێنا، هیچ میراتێکیان نەبینی، گەڕانەوە و وتیان: ئەی ئەبو هورەیرە؛ هیچ میراتێکمان نەبینی لە مزگەوتدا دابەش بکرێت، فەرمووی: ئەی چیتان بینی؟

وتیان: بینیمان کۆمەڵێك لەوێ بوون زیکری خودای (عَزَّ وجَلَّ)یان دەکرد، وە قورئانیان دەخوێندەوە، فەرمووی:

دەی ئەوەی بینیوتانە ئەوە میراتی (حەزرەتی) موحەممەدە ﷺ [1].

ئەعمەش لە ئەبی صالحەوە و. ئەویش لە ئەبوهورەیرە و ئەبو سەعیدی خودریەوە دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی:

**إنَّ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مَلَائِكَةً سَيَّاحِينَ فِي الْأَرْضِ، فَضْلًا عَنْ كُتَّابِ النَّاسِ، إِذَا وَجَدُوا قَوْمًا يَذْكُرُونَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ تَنَادَوْا: هَلُمُّوا إِلَى بُغْيَتِكُمْ. (فَيَجِيئُونَ) فَيَحُفُّونَ بِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: «أَيُّ شَيْءٍ تَرَكْتُمْ عِبَادِي يَصْنَعُونَ؟» فَيَقُولُونَ: تَرَكْنَاهُمْ يَحْمَدُونَكَ وَيُمَجِّدُونَكَ (ويسبحونك) وَيَذْكُرُونَكَ، فَيَقُولُ: «هَلْ رَأَوْنِي؟» فَيَقُولُونَ: لَا. فَيَقُولُ ﷻ : «كَيْفَ لَوْ رَأَوْنِي» ، فَيَقُولُونَ: لَوْ رَأَوْكَ لَكَانُوا أَشَدَّ (تسبيحا)وتَحْمِيدًا وَتَمْجِيدًا وَذِكْرًا. فَيَقُولُ:**

**(وأيَّ شيءٍ يَطلُبونَ؟ «مَا يَسْأَلُونِي؟» فَيَقُولُونَ: (يَطلُبونَكَ) يَسْأَلُونَكَ الْجَنَّةَ، فَيَقُولُ: «وَهَلْ رَأَوْهَا؟» فَيَقُولُونَ: لَا. فَيَقُولُ: «فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْهَا» ، فَيَقُولُونَ: لَوْ رَأَوْهَا لَكَانُوا أَشَدَّ لَهَا طَلَبًا، وَأَشَدَّ عَلَيْهَا حِرْصًا. فَيَقُولُ:**

**«فَمِنْ أَيِّ شَيْءٍ يَتَعَوَّذُونَ؟» فَيَقُولُونَ: مِنَ النَّارِ. فَيَقُولُ: «وَهَلْ رَأَوْهَا؟» فَيَقُولُونَ: لَا. فَيَقُولُ: «فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْهَا» . فَيَقُولُونَ: لَوْ رَأَوْهَا لَكَانُوا أَشَدَّ مِنْهَا هَرَبًا، وَأَشَدَّ مِنْهَا تَعَوُّذًا وَخَوْفًا. فَيَقُولُ: «فَإِنِّي أُشْهِدُكُمْ أَنِّي غَفَرْتُ لَهُمْ» ، فَيَقُولُونَ: فَإِنَّ فِيهِمْ فُلَانًا (الْخَطَّاءَ) لَمْ يُرِدْهُمْ. إِنَّمَا جَاءَ لِحَاجَةٍ. فَيَقُولُ الله (عَزَّ**

---

(١)رواه الطبراني في الأوسط(١٤٥١).

**وجَلَّ): «هُمُ الْقَوْمُ لَا يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ»[1].**

واتە: خـوای گەورە چەنـدین مەلائـیکەی گەڕۆکی هەیە لە زەویـدا، جـگە لەوانەی لەسەرشـانی خەڵکەکـانن، ئەگەرکەسـانێکیان بینـی زیکـری خـودا دەکەن، بانگ لەیەك دەکەن، وەرن ئەوەی بـۆی دەگەڕێن لێـرەن، تـا بەرزایی ئاسمانی دونیا چواردەوریان لێدەگرن، خودای (عَزَّ وجَلْ) دەفەرموێت:

بەندەکانی منتـان چۆن بەجێهێلان؟ دەڵێ": بەجێمـانهێلان خەریکی حەمدو سـەناو تەمجیـدو زیکـرو تەسـبیحاتی تـۆ بـوون، دەفەرموێت: ئایـا منیـان دیـوە؟ دەڵێن: نەخیـر. دەفەرموێـت: ﷻ : ئەی ئەگەر منیـان ببینـایە؟ دەڵێن: باشـتر ئەو تەسبیحات و زیکرو سەنای تۆیان دەکرد، دەفەرموێت:

داوای چی دەکەن؟ عەرزی دەکەن داوای بەهەشت دەکەن، دەفەرموێت:

ئایـا دیویـانە؟ دەڵـێن: نەیانـدیوە، دەفەرموێـت: ئەی ئەگەر بیانبینیـایە؟ دەڵـێن: ئەگەر بیانبینیـایە زیـاتر سـووردەبوون لەسـەر داواکردنی، دەفەرموێـت: ئەی لەچی پەنادەگرن: دەڵێن: لە ئاگر، دەفەرموێت: ئایا بینویانە؟

دەڵێن: نەیانبینیوە. دەفەرموێت: ئەی ئەگەر بیانبینیایە؟ دەڵێن:

زیاتر لێیان ڕادەکرد و نەفرەتیان لێدەکرد، خودای (عَزَّ وجَلْ) دەفەرموێت: ئێوە دەگرم بە شایەت؛ ئەوا من لێیان خۆش بووم، عەرزی خودا دەکەن:

کەسێکیان تێدایە بۆلای ئەوان نەهاتووە، هەڵەکارو تاونبارە!

خـــودای گەورەیـــش دەفەرموێـــت: **ئەوانە قەوم و کـــۆمەڵێکن، کە هەرکەسێك هاونشینیان بێت بەختیارە و بەدبەخت نابێت.**

---

(١) ينظر الدعاء للطبراني ١٨٩٦، باب فضل مجالس الذكر ٥٣٠/١، حَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ، حَدَّثَنِي أَبِي، ثنا أَبُو مُعَاوِيَةُ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَوْ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا شَكَّ الْأَعْمَشُ –ورواه الترمذي (٣٦٠٠)عنهما أيضا، وهو عن أبي هريرة في البخاري (٦٤٠٨)، ومسلم (٢٦٨٩)، بنحوه.

# گەورەیی تەهلیلە (لاإِلَهَ إِلا اللە)

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((أفضلُ ماقلتُهُ أنا والنَّبيُّونَ مِنْ قَبْلي، لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ وحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ))[1]،

واتە: گەورەترین وشە، من و پێغەمبەرەکانی پێش من وتبێتیان: ئەوەیە کە دان بنێین بە یەکتایی خوداو تاك و تەنهایی و بێشەریکی و بێ هاوتاییدا،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

هەرکەسێك رۆژانە صەد جار ئەو درووشمی تاك و تەنهایی و بێ شەریکی و، خاوەنیەتییەی بۆ هەموو موڵك و دەسەڵات و، شایستەیی بۆ سەناو ستایش و، تەوانایی بەسەر هەموو شتێکدا تەنها بۆ خودا بڕیار بدات وە ددانی پێدا بنێت، وەك خێری ئازادکردنی دە بەندەوی بۆ دەنوسرێت ، وە صەد چاکەیشی بۆ دەنوسرێت، وە صەد خراپەیشی لەسەر ڕەش دەکرێتەوە، وە تا ئێوارە دەبێتە پەناگاو قەڵایەك و لە شەیتان دەیپارێزێت، وە هیچ کەس لەوە باشترو خێرتری ناگات، مەگەر کەسێك لەوە زیاتری کردبێت. وەك فەرموویەتی:

((مَنْ قالَ : لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ وحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ ولَهُ الحَمدُ وهُوَ علَى كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ ، في يومٍ مائةَ مرَّةٍ، كانَت لَه عِدلُ عَشرِ رِقابٍ، وكُتِبَت لَه مِئَةُ حَسَنةٍ، ومُحِيَت عنهُ مِئَة سيِّئَةٍ، وكانَت لَهُ حِرزاً منَ الشَّيطانِ يَومَهُ ذلِكَ حَتَّى يُمسِيَ، ولَم يأتِ بأَفضَلَ مِمَّا جاءَ بِهِ، إلاَّ أحدٌ عمِلَ أكثرَ مِن ذلِكَ))[2]،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

ئەوەی دەستنوێژێکی پوخت بگرێت و، چاو بەرزکاتەوە بەرەو ئاسمان کە قیبلە گای دوعا گۆیانە، وە شایەتی بدات بە یەکتایی و بێ هاوتایی خواداو ،

---

(١) رواه الترمذي (٣٥٨٥).

(٢) رواه البخاري (٣٢٩٣)، ومسلم(٢٦٩١).

ڕەوانەکراوی و بەندەیی (حەزرەتی) پێغەمبەردا ﷺ ، هەموو هەشت دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکرێنەوە، لەهەرکامیانەوە ئارەزوی لێبێت پێشوازی لێدەکرێت.

**((مامِنْ عَبدٍ تَوضَّأَ فأَحسَنَ الوُضوءَ، ثُمَّ رَفعَ طَرَفهُ إِلى السَّماءِ فقال: أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ وحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ، وأَشهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبدُهُ ورَسُلُهُ، إلاَّ فُتِحَت لَهُ أَبوابُ الجَنَّةِ(الثَّمانيَةِ) يَدخُلُ مِن أَيِّها شاءَ))**[1].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**(( ليسَ علَى أَهلِ لاإِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحشَةٌ في قُبورِهِم، ولاَ في نشُورِهِم، كأَنِّي أَنظُرُ إِلَيهِم عِندَ الصَّيحَةِ يَنفُضونَ رؤوسَهُم مِنَ التُّرابِ ويَقولُونَ : الحَمدُ للهِ الذي أَذْهَبَ عَنَّا الحَزَنَ، إِنَّ رَبَّنا لَغفورٌ شَكوُرٌ ))**[2].

واتە: ئەوانەی ئەهلی کەلیمەی تەوحیدن، لە گۆڕەکانیاندا و لە حەشر و زیندوبوونەوەیاندا هەست بە نامۆیی ناکەن، ئێستا وەك ئەوەی کە بیانبینم تەپ و تۆزی خۆڵی قەبرەکە لە خۆیان دەتکێنن و دەڵێن: سوپاس بۆ ئەو خودایەی خەمی لەسەر هەڵگرتین، بەڕاستی خودایەکی لێبوردەو شایستەمان هەیە، کە شوکرانە بژێری بین و منەتباری بین.

پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو هورەیرەی فەرموو: هەرچاکەیەك بیکەیت، لە دوارۆژدا دەخرێتە سەر کێشانە و دەکێشرێت، جگە لە لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله نەبێت، ئەوە ناخرێتە ناو کێشانەوە، چونکە کەسێ بە ڕاستگۆیی بیلێت و بۆی بخرێتە ناو کێشانەکەیەوە، وە هەموو ئاسمانەکان و حەوتەبەقەی زەویش بخرێتە تای ترازووەکەی تریەوە، ئەوە کەلیمەی تەوحید بارسەنگی زیاتر و قورستر دەبێت.

---

(١)رواه أبوداوود (١٦٩)، وهو عند مسلم(٢٣٤) بنحوه

(٢) رواهُ الطبراني في الأوسط٩/ ١٧١ (٩٤٤٥) (٩٤٧٤)، والبيهقي في الشعب١/١١٠(٩٩)(١٠٠).وأخرجه أبو يعلي في تخريج الأحاديث والآثار الواقعة في تفسير الكشاف للزيلعي٣/١٥٣(١٠٦٢).

((يا أَبا هُرِيرَة؛ إنَّ كلَّ حَسنَةٍ تعمَلُها، تُوزَن يَومَ القيامةِ إلاَّ شهَادَةَ أَن لاَ إلهَ إلاَّ الله، فَإنَّها لاتوضَع في ميزانٍ، لأنَّها لَو وُضِعَت في ميزانِ مَن قَالَها صَادِقاً، وَوُضِعَتِ السَّمَاواتُ السَّبعُ والأَرَضوُنَ السَّبعُ ومَا فيهنَّ، كانَت لا إلهَ إلاَّ الله أَرجَحَ منْ ذلِكَ))[1]،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی ((لَو جاءَ قائِلُ: لا إلهَ إلاَّ الله صادِقاً بِقُرابِ الأَرضِ ذُنوباً، لَغَفرَ اللهُ لَهُ ذلِكَ))[2]،

ئەگەر ئەوکەسەی کەلیمەی یەکتاپەرستی بەڕاستی وتووە، بێت و بە قەبارەی زەوی گوناهی پێوەبێت، ئەوا خودا لە گوناهەکانی خۆش دەبێت.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ئەی ئەبووهورەیرە؛ ئەوەی لە حاڵی گیانەڵادایەو، مردووانیشتان لا إلـهَ إلاَّ الله یان بەسەرەدا بخوێنن و، بیخەنەسەر زوبانیان با بیڵێنەوە، چونکە کێوی گوناه دائەڕمێنێت و وردوخاشی دەکات، وتیان: ئەوە بۆ مردووەکان وا کاریگەری هەیە، ئەی بۆ زیندووەکان؟ فەرمووی: زیاتر و زیاتر گوناهیان دائەڕمێنێت و دەیڕوخێنێت.

((يا أَبا هريرة؛ لقِّنِ المَوتَى شهادَةَ أن لاَ إلهَ إلاَّ الله، فإنَّها تهدِم الذُّنوبَ

---

(١)وروى الطبراني في الكبير مرفوعا، عن ابن عباس في حديث: **والذى نفسي بيده لَو جيء بالسموات والارضين ومن فيهن وماتحتهن وما بينهن، فوضعت في كفة الميزان، ووضعت شهادة ان لا اله الا الله في الكفة الأخرى، لرجحت بهنَّ**. ونحوه عند النسائى في السنن الكبرى، (١٠٦٠٢) وهو حديث سيدنا موسى المشهور.

(٢)قال العراقي غريب بهذا اللفظ وللترمذي كتاب الدعوات(٣٥٤٠) في حديث لانس: **يقول الله يا ابن آدم: إنك لو اتيتني بقراب الارض خطايا ثم لقيتني لاتشرك بي شيئاً، لاتيتك بقرابهامَغفِرة**، وقال حسن، ولابي الشيخ في كتاب الثواب من حديث انس: **يارب ماجزاء من هلَّل مخلصا من قلبه؟ قال جزاءه ان يكون كيوم ولدته امه من الذنوب**، وفيه انقطاع والذى رواه مسلم (٢٦٨٧) حديث قدسي مرفوعا: **ومن لقِيني بقرابُ الأرض خطيئة، لا يشرك بي شينا، لقيته بمثلها مغفرة**،

**هَـدماً، قلـتُ يـا رسـول الله؛ هـذا للمـوتَى فكَيـفَ للأَحيـاء؟ فقـالَ ﷺ : هِيَ أَهدَمُ وأَهدَم ))**[1]،

هەروەهـا پێغەمـبەری خـودا ﷺ فەرمـوویەتی: (( **مَـن قـالَ لاَ إلـهَ إلاَّ الله مُخلِصـاً، دخَلَ الجَنَّةَ**))[2]، ئەوەی بە بڕواو ئیخلاص وحزوری دڵەوە لا إلهَ إلاَّ الله بکات، ئەوا دەیباتە ناو بەهەشتەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی

**(( لتـدْخلُنَّ الجنَّـة كُلُّكم إلاَّ مَـن أَبَى، وشَـردَ علَى اللهِ (عَـزَّ وجَـلَ) شـرودَ البَعير على أَهلهِ، فقيل: يارسُولَ الله؛ مَن الذي يَأبَى؟ قالَ مَن لَم يَقُل: لاَ إلـهَ إلا الله**[3]، **فَـأَكثِروا مِن قَـولِ لاَ إلـهَ إلا الله، قبلَ أَن يُحـالَ بيـنَكم وبَينَهـا))**، [4] **فإنَّهـا كَلِمةُ التوحيدِ**[5]، **وهي كلِمةُ الإخلاصِ، وهي كلِمة التَّقوى، وهي الكلمةالطيبَةُ، وهي دعـوةُ الحَقِ وهـي العُـروَةُ الوُثقى،**[6] **،وهيَ ثَمَنُ**

---

(١) رواه أبـو نعـيم في معرفـة الصحابة، ٢١٨٩/٤)، مرفوعـا، ورواه عبـدالرزاق في المصنف، ٣٨٧/٣)، موقوفا على عبدالله بن مسعود.

(٢) رواه الطبراني في الأوسـط(١٢٥٧)، وأبـو نعـيم في الحليـة، (٢٥٤/٩)، وتمامـه عنـد الطبراني: **قيل: وما إخلاصها؟ قال: أن تحجزهُ عن محارِمِ الله (عَزَّ وجَلَ)** .

(٣)رواه البخاري(٧٢٨٠) بلفظ: **كل أمتي يدخلون الجنة إلا من أبى**، زاد الحاكم في المستدرك (٢٢/١(١٨٣)وصححها: **وشرد على الله شرود البعير على أهله** قال البخاري : **قالوا يارسول الله ومن يأبى؟ قال من اطاعني دخل الجنة ومن عصاني فقد أبى**، وقطعةُ **فأكثروا**: رواه أبـويعلي فـي مسـنده (٦١٤٧)، وابـن عـدي فـي الكامـل(١٠٤/٤، والخطيـب فـي تـأريخ بغداد(٢٤٨/٣).

(٤) روى أبو الشيخ في الثواب من حديث الحكم بن عمير مرسلا: إذا قلت لاَ إلَهَ إلاَّ الله ، فهي كلمة التوحيد..الحديث، إتحاف ١١/٥.

(٥) رواه أحمد في المسند ٦٣/١،وسماها النبي ﷺ بكلمة الإخلاص عند الطبراني في الدعاء/٤٧٧.

(٦) روى هـذه الكلمـات الـثلاث الطبراني في الـدعاء(١٥٩٨) (١٥٨٠) (١٥٦٥)، عـن ابـن عبـاس (رضي الله عنهما)

**الجَنَّـةِ**[١].)) واته: هەمووتـان دەچـنە نـاو بەهەشـتەوە، مەگەر ئەوەتـان کە نەیەوێت ولـووت و نەفـرەت بکات و لە خـودای گەورە یـاخی ببێـت، وەك چـۆن وشتر لە خاوەنەکەی یاخی دەبێت، عەرزیان کرد :

ئەی پێغەمبەری خـودا ، کێیە ئەوەی کە یـاخی دەبێـت، فەرمـووی: ئەوەی نەڵێـت لا إلـهَ إلاَّ الله، ئەوە یـاخی بـووە، کەواتە زۆر لاَ إلَـهَ إلاَّ الله بـکەن، پـێش ئەوەی ڕێگریتـان لێبکرێـت و، نەتـوانن بیڵـێن، چـونکە لاَ إلَـهَ إلاَّ الله کەلـیمەی یەکتـا پەرسـتییە، وتەی ئیخلاصـە، وتەی تەقـواو خۆپـارێزییە، وتەی پـاك و خاوێنی ئیمانە، بانگەشـەی ڕاستەقینەیە بۆ حەقیقەت، حەبل و پەتی قـایم و نەپچڕاوی متمانە پێکراوە، وە نرخی وەدەستهێنانی بەهەشتە.

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ئایا پاداشتی چاکە جگە لە چاکە دەبێ چیبێت؟ ﴿هَلْ جَزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ﴾ (٦٠/الرحمن)

دەڵێن پاداشتی چاکەی دونیا، ئەوەیە کە وشەی (لاَ إلهَ إلا الله)ی بە نسیب ببێت، وە لە دوارۆژیشدا چوونە ناو بەهەشتە،[٢]

هەروەها فەرموودەی خودای گەورە: ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ﴾ (یونس/٢٦)[٣]، ئەوانەی کردەوەی چاکیان کردووە، ئەوا بەهەشتیان خەڵات دەکرێت و لەویش زیادە تر کە بینینی پەروەردگارە.

بەڕائی کوڕی عازیب دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((مَنْ قالَ : لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ وحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ، لهُ المُلكُ ولَهُ الحَمدُ، وهوعلَى كُلِّ شَيءٍ، قَديرٌ عَشرَ مَرَّاتٍ، كانَتْ لَهُ عِدلَ رَقَبَةٍ أو نسمَةٍ))**[٤]،

---

(١) رواه مرفوعا ابن عدي في الكامل(٣٤٨/٦).

(٢) رواه الطبراني في الدعاء (١٥٤٤)، عن ابن عباس (رضيَ الله عنهما)

(٣) رواه الطبراني في تفسيره(١٣٧/١١/٧).

(٤) رواه أبو داوود الطيالسي في مسنده، ص/١٠٠ (٧٤٠) وابن أبي شيبة في (المصنف) ٦١/٦

ئەوەی ئەو ویردە پیرۆزە بخوێنێت، خێری ئازادکردنی گەردنی کۆیلەیەك یان ڕزگارکردنی کەسێکی بۆ دەنوسرێت.

وە هەوەها عەمری کوڕی شوعەیب دەیگێڕێتەوە لە باوکیەوە و، ئەویش لە باپیریەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : هەرکەسێك ڕۆژی صەد جار بڵێت:
**(( مَنْ قالَ في اليَومِ مِئَةَ مَرَّةٍ: لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ وحدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ. لهُ المُلكُ ولَهُ الحَمدُ، وهو علَى كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ، لَم يَسبِقهُ أحدٌ كانَ قَبلَهُ، ولايُدرِكهُ أحدٌ كانَ بَعدَهُ، إلاَّ مَن عَمِلَ بِأفضَلَ مِنْ عَمَلِهِ))**[1]، ئەوەی ئەم ویردە بخوێنێت، کەسێکی پێش خۆی پێ ناگاتەوە، مەگەر یەکێك لەم باشتر خوێندبێتی.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە بازاڕێك لە بازاڕەکاندا بڵێت: **((لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ وحدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ. لهُ المُلكُ ولَهُ الحَمدُ، يُحيي ويُميتُ وهُوَ حيٌّ لا يَموتُ، بِيَدهِ الخَيرُ، وهو علَى كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ.))**هەزار هەزار چاکەی بۆ دەنوسرێت و هەزار هەزار خراپەی لەسەر دەکوژێتەوە، وە خانوویەکیشی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکرێت[2] .

---

(٣٠٠٦٨) والنسائي في السنن الكبرى٣٥/٦(٩٩٤٦) وابن حبان في صحيحه(١٣٠/٣)(٨٥٠) بلفظ **كعدل نسمة**. الإتحاف ١٢/٥ . وأخرجه الحاكم في المستدرك٦٧٩/١/١٨٤٥) وقال: صحيح على شرط الشيخين، وهو في مسند أحمد دون قوله **(عشر مرات)**

(١) رواه أحمد في المسند(١٨٥,٢٠٤/٢). ورواه الحاكم في المستدرك ٦٧٩/١(١٨٤٣) وإسناده جيد، وأخرجه أحمد في مسنده(٦٩٦٦) بلفظ: مئة، وقال الزبيدي:١٢/٥: ورواه الطبراني في الدعاء ص/١٢٦(٣٣٤)، نحوه، والذي رواه ابن السني في عمل اليوم والليلة ص/٧٠(١٨٣) والخطيب في تأريخ بغداد ٢٥/٣، عن عمر بن شعيب، بلفظ: **مأة مرة إذا أصبح، ومأة مرة إذا أمسى، لم يجد أحد بأفضل من عمله إلاَّ من عمل أفضل من ذلك.**

(٢) رواه الترمذي(٣٤٢٨)، وابن ماجه(٢٢٣٥)، عن عمر (رضي الله عنه) مرفوعا، وأشارالدار قطني في علّلهِ (٤٩/٢)إلى روايته موقوفاوبنى له.. عند أبن السني في عمل اليوم والليلة، ١٨٢.

وه دەگێڕنەوە: کە بەندەیەك بڵێت (**لاَ إِلـهَ إلاَّ اللهُ**) دەچێت بەسەر نامەی کردەوەکانیدا ، بەسەر هەر هەڵەو گوناهێکدا بڕوات دەیسڕێتەوە، تا چاکەیەکی وەك خۆی دەبینێت، ئیتر لەپاڵیدا دادەنیشێت، [1]،

لە فەرموودەی دروستدا هاتووە: لە ئەبو ئەییوبەوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ کە فەرموویەتی: (( **مَنْ قالَ : لاَ إِلـهَ إلاَّ اللهُ وحْدَهُ لاشَرِيكَ لَـهُ، لـهُ المُلْكُ ولَهُ الحَمدُ، وهو علَى كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ، كانَ كَمَنْ أعتَقَ أربَعَةَ أنفُسٍ مِنْ ولدِ إسماعيلَ عليهِ السَّلام** ))[2]، ئەوەی ئەم ویردەی سەرەوە بخوێنێت، وەك ئەوە وایە چوار گەردنی لە کۆیلەیەتی ئازاد کردبێت، لە ئەولادی (حەزرەتی ئیسماعیل (سەلامی خودای لەسەر) .(پێش تر واتاکەی لێکدراوەتەوە)

هەروەها لە فەرموودەی دروستدا هاتووە، لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ کە فەرموویەتی: (( **مَنْ تَعارَّ مِنَ اللَّيلِ ، فقال**، ئەوەی بەشەودا تەپاو تل بدات و لەسەر جێگەکەی خەوی لێبزرێت و بڵێت:

**لاَ إِلـهَ إلاَّ اللهُ وحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لهُ المُلْكُ ولَهُ الحَمدُ، وهو علَى كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ، الحَمدُ للهِ ، وسُبحانَ اللهِ، ولا إِلـهَ إلاَّ اللهُ ، واللهُ أكبَر، ولاَ حولَ ولاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ** ،

ئەم ویردە بخوێنێت و لەپاشان داوای لێخۆشبوون بکات و، هەر نزایەك مەبەستی بێت بیکات، گیرادەبێت، وە ئەگەر هەستێت و دەستنوێژێکیش بگرێت و، دوورکات نوێژ یش بکات، ئەوا نوێژەکەی لێ وەردەگیرێت، **ثُمَّ قال: اللَّهُمَّ اغفِر لي، أو دَعا، استُجيبَ لَهُ، فإنْ تَوضَّأَ وصَلَّى، قُبِلَت صَلاتُهُ**))[3].

---

(١) روى أبو يعلي في مسنده(٣٦١١) مرغوعا: (ما قال عبدٌ لاَ إلهَ إلا الله في ساعة من ليلٍ أو نَهار، إلاَّ طُمِسَت ما في صَحيفَتهِ مِنَ السَّيِّئاتِ حتى يَسكُنَ إلى مِثلِها منَ الحَسَنات).

(٢) رواه البخاري(٦٤٠٤)، ومسلم(٢٦٩٣).

(٣) رواه البخاري (١١٥٤) والتعارُّ: السهر والتقلب على الفراش بالليل.

# گەورەیی تەسبیحات و حەمدوسەنا و زیکرەکانی تر

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ سبَّح دبُرَ كُلِّ صَلاةٍ ، ثلاثاً وثلاثِين مرةً، وحَمِدَ اللهَ ثلاثاً وثلاثِينَ مَرَّةً، وكَبَّر اللهَ ثلاثاً وثلاثين مرَّة، وختَمَ المِئَةَ بِلاَ إلهَ إلاَّ اللهُ وحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ ولَهُ الحَمدُ، وهو علَى كُلِّ شَيءٍ قَديرٌ، غُفِرَت ذُنُبهُ ولَو كانَت مِثلَ زَبَدِ البَحرِ))[١]،

واتە: ئەوە دوای هەموو نوێژێك كە لێبوویەوە، سی و سێ جار (سُبْحانَ اللهِ) سوبحاە نەڵلا بكات و، سی و سێ جار: **الحمد لله** بكات و، سی و سێ جاریش: **أَللهُ أَكْبَرُ** بكات، وە تەواوی صەد جارەكە بەو: **لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ** یە...تا كۆتاییەكەی خەتمی بكات، ئەوە خودا لەگوناهەكانی خۆش دەبێت، ئەگەر وەك كەفی دەریایش زۆر بێت.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((مَن قالَ سُبحانَ اللهِ وبِحَمدِهِ، في يَومٍ مِأَةَ مَرَّة، حُطَّتْ خَطاياهُ وإِن كانَ مِثلُ زَبَدِ البَحرِ))**[٢]، واتە: ئەوەی صەد جار (سوبحانەڵلاهی وبیحەمدیهی) بخوێنێت، گوناهەكانی لەسەر دەسڕێتەوە باوەك كەفی دەریاش وابێت.

دەگێڕنەوە پیاوێك هاتە خرمەت پێغەمبەر ﷺ عەرزی كرد: دونیا پشتی لەمن هەڵكردووە، دەستێشم كورتبووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

**(( فأَينَ أَنتَ مِنْ صَلاةِ المَلائِكَةِ وتَسبيحِ الخَلائِقِ، وبِها يُرزَقونَ؟ قالَ فَقُلت: ومَا ذاكَ يا رَسولَ اللهِ؟ قال: قُل:** ئەی تۆ لەكوێی لە كردنی ئەو دوعایانەی فریشتەكان دەیكەن و ئەو تەسبیحاتەی خەڵكەكە دەیكەن، وتم ئەی پێغەمبەری خودا ئەوە كامەیە: فەرمووی: بڵێ : **سُبحانَ اللهِ وبِحَمدِهِ سُبحانَ اللهِ العَظيم، أَسْتَغفِرُ الله، مئَةَ مرَّةٍ ما بينَ طلُعِ الفَجرِ إلى أَنْ تُصَلِيَ الصُّبحَ،**

---

(١) رواه مسلم (٥٩٧). من حديث أبي هريرة.

(٢) رواه البخاري (٦٤٠٥)، ومسلم ٢٦٩١).

**تأتيكَ الدُّنيا راغِمةً صاغِرةً، ويَخلُقُ اللهُ مِن كُلِّ كَلِمَةٍ مَلَكاً يُسَبِّحُ اللهَ تعَالى إلَى يَـومِ القِيامَـة، لـكَ ثَوابُـهُ))**[1]، واتە: ئەو تەسـبيحاتەيە و صـەد كەڕەت أستغفرالله يـش بـكە، لە نێـوانی هەڵاتنی گزنگی بەرەبەیـانەوە تـا كاتی نـوێژی بەیـانی، ئەوكاتە دونیـا بە ناچـاری و زەلیلی ئەو دێـت بـۆلات، وە خـوای گەورە لەهەر وشـەیەك مەلائیـكەیە دۆووسـت دەكـات تـا ڕۆژی قیـامەت تەسـبیحاتی خودا دەكەن و خێرەكەیشی بۆ تۆ دەنوسرێت.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر عەبدی من وتی **(الحَمْدُ لله)**.. نێوانی زەوی ئاسمان پڕ دەبێت، وە ئەگەر جارێكی تر وتی: **الحَمْدُلله** ... نێوانی ئاسمانی حەوتەم و دوا تەبەقەی خواری زەوی پڕ دەبێت، ئەگەر جاری سێیەم **الحَمْدُلله**ی كرد،خودای گەورە دەفەرموێت:چ داوایەكت هەیە بیكە[2]

ڕیفاعەی زورەقی دەفەرموێت: لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژمان دەكرد، كاتێ لە ڕكوع سەری بەرزكردەوە، وە فەرمووی: (**سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَه**)كابراكە فەرمووی: **رَبَّنا وَلَكَ الحَمدُ، حَمداً كثيراً طيِّباً مُبارَكاً فيهِ**، حەمدو سەنایەكی زۆری پاك و خاوێنی پیرۆزی شایستە بەتۆ، تەنها شیاوی تۆیەو بۆ تۆیە. كاتێك پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەكەی لێبوویەوە فەرمووی: (**مَنِ المُتَكَلِّمُ آنِفاً**) تۆزێ

---

(١)قال العراقي رواه المستغفري في الدعوات من حديث ابن عمر. وقال غريب من حديث مالك ولا أعرف له أصلا في حديث مالك ولأحمد من حديث عبد الله بن عمر(٢/١٧٠) أن نوحا قال لابنه آمرك بلاَ إِلَهَ إِلاَّ الله ... الحديث. ثم قال: **سبحان الله وبحمده فانها صلاة كل شيء وبها يرزق الخلق**، واسناده صحيح اه قال الزبيدي١٣/٥: وروى ابن السني والديلمي من حديث ابن عباس: مَن قال بعد صلاة الجمعة قبل أن يقوم من مجلسه: **سبحان الله وبحمده سبحان الله العظيم أستغره وأتوب اليه مائة مرة، غفر الله له مائة ألف ذنب، ولوالديه أربعة وعشرين ألف ذنب**

(٢)قال العراقي غريب بهذا اللفظ لم اجده إتحاف ١٤/٥.إذ المشهور هو حديث مسلم:(٢٢٣) وفيه: **والحمد لله تملأ الميزان. وسبحان الله والحمد لله تملآن أو تملأ ما بين السماوات والأرض.**

لەمەوبەر کێ بوو ئەو قسانەی کرد؟ فەرمووی: من بووم ئەی پێغەمبەری خودا، پێغەمبەرﷺفەرمووی: ((لَقَد رَأيتُ بِضعَةً وثَلاثينَ مَلَكاً يَبتَدِرُنَها أيُّهم يَكتُبُها أوَّلاً))[1]، بینیم سی وئەوەندەمەلائیکەهەوڵیاندەداکامیان یەکەمجار بینوسێتەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: پاشماوەی کارو کرداره باشەکان کە هەتاهەتایە دەمێننەوە، ئەم زیکرە پیرۆزانەن، کە بە باقیاتی صاڵحات ناوی براوە : ((الباقِياتُ الصَّالِحاتُ هُنَّ لا إلهَ إلاَّ اللهُ و سُبحانَ اللهِ، والحمد لله، واللهُ أكبَر، ولاَ حولَ ولاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ.))[2].

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: لەسەر زەوی کەسێك نیە بڵێت: (( لا إلهَ إلاَّ اللهُ واللهُ أكبَر و سُبحانَ اللهِ، والحمد لله، . ولاَ حولَ ولاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ، إلاَّ غُفِرَت ذُنُوبهُ ولَو كانَ مِثلُ زَبَدِ البَحرِ.))[3]، بەخوێندنی ویردەکان خودا لە گوناهەکانی خۆش دەبێت، با وەکو کەفی دەریاش زۆر بێت.

نوعمانی کوڕی بەشیر لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ئەو زیکرو ناوبردن و باسی جەلالی خودایەی کە دەیکەن لە تەسبیحات و تەهلیله و حەمد و سەنا، کە بەدەوری عەرشی خوادا باڵدەکێشن و دەسوڕێنەوە، وەك کوورەی هەنگ دەنگیان دەبیسترێت و خاوەن زیکرەکان دێننەوە یاد، ئایا ئێوەش حەزناکەن، بەردەوام ویردی (لاَ إلَهَ إلاَّ الله) کانتان لە حزوری خوادا ناوتان وە بیر بێتەوەو یادتان بکرێتەوە[4]،

---

(١) رواه البخاري (٧٩٩) وفيه فلما انصرف: قال: من المتكلم؟ قال أنا، قال رأيت بضعة...

(٢) رواه بلفظ المصنف الضياء في (الأحاديث المختارة) (٣٢٣) موقوفا على عثمان (رضي الله عنه)، وابن حبان والحاكم صححه من حديث أبي سعيد والنسائي في عمل اليوم والليلة ،(٨٥٤) مرفوعا والحاكم من حديث أبي هريرة دون قوله لاحول ولاقوة الا بالله اهـ

(٣) رواه الترمذي (٣٤٦٠)، وجاء في النسخ (عمر) بدل(عمرو)رواه ابن عمر (رضيَ الله عنهما) .

(٤) رواه ابن ماجه(٣٨٠٩). ونص الحديث: ((الذينَ يذكرونَ مِنْ جَلالِ اللهِ وتَسبيحهِ وتكبيرهِ (وتهليله) وتحميده، يَنعطِفن حولَ العَرشِ، لهُنَّ دَوِيٌّ كدَويِّ النَّحلِ، يُذَكِّرنَ

هەروەها ئەبوهورەیرە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:
ئەگەر بڵێم: **سُبحانَ اللهِ، والحمد لله، و لا إلهَ إلاّ اللهُ، واللهُ أكبَر** ،ئەم وتنەم پێ باشترە لەهەموو ئەو نازو نیعمەتانەی کە خۆری بەسەردا هەڵدێت،[1]، وە لە ڕیوایەتێکی تردا ئەم زیادەیشی تێدایە کە بیڵێت:
**ولاَ حولَ ولاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ**، وە فەرمووی: **هِيَ خيرٌ مِنَ الدُّنيا ومَا فيها**[2]،
وتنی ئەم ویردەیە خێر و بێری زیاترە لە هەموو دونیاو ئەوەش لە دونیادایە.

هەروەها سەمورەی کوڕی جوندوب ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: چوار وتە هەن لای خودای گەورە لەهەموو شتێکی پێ خۆشترە: **أحبُّ الكَلامِ إلى اللهِ (عَزَّ وجَلْ) أربَعَةٌ**، وەك فەرموویەتی: **سُبحانَ اللهِ، والحمد لله، و لا إلهَ إلاّ اللهُ، واللهُ أكبَر، لايَضُرُّكَ بأيِّهِنَ بدَأتَ**[3].

ئەوکەلیمانەیش ئاساییە کامیان پێش کامیان بخەیت.

ئەبو مالیکی ئەشعەری دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:(( **الطَّهورُ شطرُ الإيمان، والحَمدُ للهِ تَملؤُ الميزان، وسُبحانَ اللهِ واللهُ أكبرُ تمَلؤُ مابينَ السَّماءِ والأَرضِ، والصَّلاةُ نُورٌ والصَّدقَة بُرهانٌ، والصَّبُر ضياءٌ، والقُرانُ حُجَّةٌ، لَكَ أوْ عَليكَ، كُلُ النَّاسِ يَغدُو؛ فبائِعٌ نَفسَهُ فَمُعتِقُها أو (مُشتَرٍ نَفسَهُ) مُوبِقُها**))[4]،

---

**بِصاحبِهِنَّ. أولا يُحبُّ أحدُكُم أَنْ لايَزالَ عِندَ اللهِ ما يُذَكِّرُ بهِ.))**
**ألا يوالأَ عند اللهِ تعالى مَنْ يُذكِّرُ بهِ.**

(١) رواه مسلم(٢٦٩٥).

(٢) قال العراقي رواه مسلم (٢٦٩٥)باللفظ الاول، وللمستغفري في الدعوات من رواية مالك ابن دينار: ان ابا امامة قال للنبي صلى الله عليه وسلم قلت:**سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله اكبر خير من الدنيا وما فيها**، قال انت أغنم القوم، وهو مرسل جيد الاسناد .

(٣) رواه مسلم (٢١٣٧)

(٤) رواه مسلم (٢٢٣)، بنحوه، وهو بلفظ المصنف هنا، وسبحان الله والله أكبر، رواه الطبراني في الكبير(٣/٢٨٤)، والبيهقي في السنن الكبرى(١/٤٢).

**واته:** پاك و خاوێنی نیوەی ئیمانە، وتنی الحمد لله پڕكەری كێشانەیە، وە (سبحان الله) و (أَللهُ أَكبَرُ) نێوانی ئاسمان و زەوی پڕ دەكەن، وە نوێژ كردن نوورە و صەدەقەكردن بەڵگەی دروستی بڕوایە و ، ئارام گرتن تێشك و ڕۆشناییە و، قورئانلی پیرۆزیش یان بەڵگەیە بۆت، یان بەڵگەیە لەسەرت و دەبێتە خەصمت، ئەو خەڵكەش هەموو دێن و دەڕۆن، هەیانە گیانی خۆی فرۆشتووە بە خوداو نەفسی ئازاد كردووە، هەیشیانە نەفسی خۆی كڕیوەتەوەو بۆئەو هەوڵی داوەو بە هیلاكیدا دەبات.

هەروەها ئەبو هورەیرە فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

**((كَلمتانِ خَفيفَتانِ عَلى اللِّسانِ ثَقيلَتانِ في المِيزانِ، حَبيبَتانِ إلى الرَّحمَنِ: سُبحانَ الله وبِحَمْدِهِ، سُبحانَ اللهِ العَظيم))**[١].

دووشەی پیرۆزن، بۆ دەربڕین سووكن لەسەر زوبان، بەڵام لە كێشانەدا قورسن، وە لای خوداوەندی میهرەبانیش خۆشەویستن، ئەوانە (**سُبحانَ الله وبِحَمْدِهِ، سُبحانَ اللهِ العَظيم**)ن .

ئەبو زەڕی غەفاری (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:

وتم ئەی پێغەمبەری خودا؛ چ قسەو كەلامێك خودای (عَزَّ وجَلْ) زۆری پێ خۆشە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((**مااصطَفَى اللهُ (عَزَّ وجَلَّ) لِمَلائِكَـــتِهِ: سُبحـــــانَ الله وبِحَمْدِهِ، سُبحانَ اللهِ العَظيم**))[٢]، ئەوەی كە خودا بۆ مەلائیكەكانی هەڵبژاردووە: كەهەردوو سوبحانەڵلا كەیە.

ئەبو هورەیرە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خودای گەورە ئەو

---

(١) رواه البخاري(٦٦٨٢)، ومسلم(٢٦٩٤).

(٢) رواه مسلم(٢٧٣١) بنحوه. ودون زيادة (سبحان الله العظيم) وعند الترمذي (٣٥٩٣) بلفظ المصنف، ولفظ المرفوع فيه :(**ما اصطفى الله لملائكته: سبحان ربي وبحمده، سبحان ربي وبحمده**) وانظر الإتحاف ١٥/٥.

واتانەی لە ناو قسەکاندا هەڵبژاردووە: سُبحانَ اللهِ، والحمدلله، و لا إلهَ إلاَّ اللهُ، واللهُ أكبَر. ئەگەر بەندەی خودا وتی (سبحان الله) پاك و خاوێنی بۆ خودا، ئەوا بیست چاکەی بۆ دەنوسرێت، وە بیست خراپەی لەسەر لادەبرێت و دەکوژێتەوە، هەروەها بە وتنی (أَللهُ أَکبَرْ) و ئەوانی تریش بەم شێوەیە[1].

وە جابیر دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی بڵێت: (سُبحـــــانَ الله وبِحَمْدِهِ) ئەوا دار خورمایەکی لە بەهەشتدا بۆ دەنێژرێت[2]، ئەبـو زەڕی غەفـاری (خـودای لێ ڕازی بێـت) دەفەرموێـت: هەژارەکـان هـاتنە خـزمەت پێغەمبەر ﷺ عەرزیـان کـرد: ئەی پێغەمبەری خـودا: دەوڵەمەنـدەکان هەمـوو خێرەکانیـان بـرد بـۆ خۆیـان، وەك ئـێمە نوێژەکانیـان دەکەن و ڕۆژوو دەگرن و خێرو صەدەقەیش بە زیادەی ماڵەکانیان دەکەن، فەرمووی:

دەی ئێـوەیش ئەوەنـیە خـودای گەورە شـتێکی پێیـنەداون کە صـەدەقەی پێبکەن، هەمـوو تەسـبیحاتێك صـەدەقەیەکتان بـۆ دەنوسـرێت، هەمـوو (أَللهُ أَکبَـرْ) یـەك، هەمـوو حەمـدو سـەنایەك، هەمـوو فەرمـان بە چـاکە و ڕێگـری کردنێکتان لە خراپە، چاکەتان بۆ دەنوسرێت،تەنانەت پارووپەك نان دەیخەنە دەمی ماڵ و منداڵتانەوە بە صەدەقە بۆتان دەنوسرێت، وە دروسـتبوونتان لە گەڵ حەلاڵی خۆتانـدا چـاکەیە و پاداشـتی لەسـەرە، وتیـان ئەی پێغەمـبەری خودا؛ چۆن یەکێك ئارەزووی خۆی بشکێنێت و خێریشی دەگات، فەرمووی:

ئەی نابینن ئەگەر لەحەرامدا بیڕشتایە شەڕی بۆ نەدەنووسرا؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: دەی کەواتە ئەگەر لە حەڵاڵدا دایبنێت ئەوا خێری بۆ دەنوسرێت.

(( يَا رَسُولَ اللهِ، ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالْأُجُورِ، يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ

---

(١) رواه النسائي في (عمل اليوم والليلة)(٨٤٦)، وفي ثواب الحمدلله قال: كتب له ثلاثون حسنة، وحطت عنه ثلاثون سيئة .

(٢) رواه الترمذي (٣٤٦٤).

**كَمَا نَصُومُ، وَيَتَصَدَّقُونَ بِفُضُولِ أَمْوَالِهِمْ، فقَالَ ﷺ : " أَوَ لَيْسَ قَدْ جَعَلَ اللهُ لَكُمْ مَا تَصدَّقُونَ بِه ؟! إِنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةً، وَ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةً، وَ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةً، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهيٌ عَنْ مُنْكَرٍ صَدَقَةٌ، وبَضَعُ أَحَدَكُم اللّقمَةَ فِي فِيِّ أَهلِهِ، فَهِيَ لَهُ صَدَقَةٌ، وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيَأتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ؟ قَالَ: "أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ أَكَانَ عَلَيْهِ فِيهَا وِزْرٌ؟ فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ كَانَ لَهُ أَجْرٌ))**[١]،

هەروەها ئەبوزەڕ (خوداى لێ ڕازى بێت)فەرموویەتی: وتم بە پێغەمبەرى خودا ﷺ : خاوەن ماڵەکان تەواوى پاداشتەکانیان برد بۆ خۆیان، ئەوەى ئێمە دەیڵێین ئەوانیش دەیڵێن و، ئەوان خێرو چاکە دەکەن و، ئێمە نیمانە بیکەین، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووى:

ئایا کارێکت پیشان بدەم، کە ئەگەر بیکەیت دەگەیتەوە بەوانەدا کە پێشت کەوتوون، وە ئەوانەش کە لە دواتەوەن پێشیان دەدەیتەوە، مەگەر یەکێکیش هەمان ویردى تۆ بخوێنێت؟

دواى هەموو نوێژێك سى وسێ جار (سبحان الله) بکەو، سى وسێ سێ جار (الحمد لله) بکەو، سى و چوار جاریش(أَللّه أَكبَرُ) بکە و لەسەرى بەردەوام بە.

**((سبقَ أهلُ الأموالِ بالأجرِ، يقُولونَ ما نَقولُ، ويُنفِقونَ وَلا نُنفِق، فقال رسولُ الله ﷺ : أفَلا أدلُّكَ على عَملٍ إذا أنتَ فعلَتَهُ، أدركتَ مَن قَبلَكَ، وفُتَّ مَن بَعدَكَ،، إلاَّ مَنْ قالَ مِثلَ قَولِكَ، ؟ تسبِّحُ اللهَ ثَلاثاً وثلاثِينَ، وتحمَد اللهَ ثلاثاً وثلاثين، وتُكَبِّرُ أربعاً وثَلاثين))**[٢]،

خاتو یوسەیرەیش دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی:
**((عليكُنَّ بالتَّسبيحِ و التَّهليلِ و التَّقديسِ فلاَ تَغْفَلْنَ، و اعقدنَ بالأناملِ فإنَّها**

---

(١) رواه مسلم (١٠٠٦).

(٢) رواه ابن ماجه(٩٢٧)، والمرفوع بصيغة الجمع، وفيه قول ابن عيينة، **لاأدرى أَيَّتهنَّ أربع**، وهو بلفظ المصنف عند النسائي في(عمل اليوم والليلة)(١٤٧)عن أبي الدرداء رضي الله عنه.

مُســتَنطَقاتٌ ))[1] لەســەرتانە ئەی ئافرەتەکــان کە تەســبیحات و تەهلــیلەو تەقدیسی خودا بکەن و هەرگیز غافڵ نەبن، وە بە بڕگەی پەنجەکانی دەستتان ئاگاتان لە ژمارەکان بێت، ویردەکانی پێ بخوێنن، چونکە ئەوانە لە قیامەتدا لێ یان دەپرسن و شایەتی تان لێدەدەن.

عەبدوڵلای کوڕی عومەریش دەفەرموێت:

پێغەمبەرم دەبینی ﷺ بە سەرە پەنجەکانی تەسبیحاتی دەژمارد.[2]

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ وەك ئەبو هورەیرە و ئەبو سەعیدی خودری شایەتی لەسەر ئەدەن کە فەرموویەتی: **((إذا قَالَ العَبدُ لا إلهَ إلاَّ اللهُ و اللهُ أكبرُ قالَ اللهُ عزَّ وَجلَّ صَدقَ عَبدي، لا إلهَ إلا أنَا، و أنا أكبَر، وإذا قالَ العبدُ لا إلهَ إلاَّ اللهُ وحدَهُ لا شَريكَ لَهُ، قالَ اللهُ تَعالَى صَدَقَ عَبدِي، لا إلهَ إلاَّ أنا وحدي لاَ شَريكَ لِي، وإذا قالَ لاإلَهَ إلا اللهُ ولا حولَ ولاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ، يقولُ اللهُ تعَالى صَدَق عَبدي لاَ حَولَ وَ لاَ قُوَّةَ إلاَّ بِي، و مَن قَالهُنَّ عِندَ المَوتِ لا تمَسُّهُ النَّار))** [3]،

واتە: ئەگەر بەندە : **لا إلهَ إلاَّ اللهُ و اللهُ أكبر** ی کرد، خودای (عَزَّ وجَلَّ) دەفەرموێت: عەبدەکەم ڕاست دەکات، هیچ خودایەك نیە تەنها من نەبێت و هاوبەشم بۆ نیە، وە ئەگەر وتی: **لاإلَـهَ إلا اللهُ ولا حـولَ ولاَ قُـوَّةَ إلاَّ بـاللهِ،** خـودای گەورە دەفەرموێـت: بەنـدەکەم ڕاســتەکات، هــیچ هێــزو توانــا و فریادڕەسێك نیە پشت و پەنای من نەبێت، وە هەرکەسێك ئەم ویردە لەکاتی گیانەڵایشدا بڵێت: ئەوا بە دڵنیاییەوە ئاگر بەری لاشەی ناکەوێت.

موصعەبی کوڕی سەعد دەیگێڕێتەوە لە باوکیەوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ کە فەرموویەتی **((أيَعجِزُ أحدُكُم أن يَكسِبَ كُلَّ يَومٍ ألفَ حسَنةٍ؟ فقيلَ له**

---

(١) رواه أبو داوود(١٥٠٥) والترمذي (٣٥٨٣).

(٢) رواه أبو داوود (١٥٠٢) والترمذي(٣٤١١)، وانسائي(٧٩/٣). ووقع في النسخ عمر بدل عمر،

(٣) رواه الترمذي (٣٤٣٠)، وابن ماجه(٣٧٩٤). بنحوه .

**كيفَ ذلكَ يا رسولَ الله؟ فقالَ صلَى اللهُ عليهِ و سلَم: يُسبِّحُ اللهَ تعالى مِئةَ تَسبيحَةً، فيكتَب لَه ألفُ حَسَنةٍ، و يُحَطُّ عنهُ ألفُ سَيِّئةٍ)**[1]،

ئايا كەسێك لە ئێوە ناتوانێت كە ڕۆژانە هەزار چاكە بۆ خۆی دابین بكات؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا چۆن دەتوانێت؟ فەرمووی: (صەلات و سەلامی خودای لەسەر) با صەد كەڕەت تەسبیحات بكات، (سبحان الله)، ئەوە هەزار چاكەی بۆ دەنوسرێت و هەزار خراپەیشی لەسەر هەڵدەگیرێت.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

(( **يا عَبدَ اللهِ ابنَ قَيسٍ، أو يا أبا موسَى: ألاَ أدُلُّكَ علَى كَنزٍ مِن كُنوزِ الجَنَّةِ؟ قال: بلَى ، قال: قُل: لاَحَولَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ بالله** ))[2]، ئەی ئەبوموسای ئەشعەری: ئایا كەنز و غەزنەیەك لە كەنزەكانی بەهەشتت پێ نیشان بدەم؟ فەرمووی: : بەڵێ، فەرموویەتی: : بڵێ: **لاَحَولَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ بالله.**

وە لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە: (( **ألاَ أُعَلِمُكَ كَلِمَةً مِن تَحتِ العَرشِ،: لاَحَولَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ بالله**)) [3]، هەروەها ئەبو هورەیرە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئایا كارێكت پێ نیشان بدەم كە بەشێكە لە غەزەكانی ناوبەهەشت؟ كە لە ژێر عەرشدایە. ئەوەیە كە بڵێیت: هیچ كارو فەرمانێك ناكرێت و پەنایەك نیە مەگەر بەخوداو پەنادانی ئەو نەبێت، خوایش دەفەرموێت: بەندەكەی من خۆی ڕادەستیمان كردووە و فەرمانبەرداری ئێمەیە.(( **ألاَ أدُلُّكَ علَى عَمَلٍ مِن كَنزِ الجَنَّةِ؟ مِن تَحتِ العَرشِ، قَولُ : لاَحَولَ**

---

(١)قال العراقي رواه مسلم(٢٦٩٨) الا انه قال أو تحط، و قال الترمزي(٣٤٣٠) و تحط، كما قال المصنف و قال حسن صحيح ، والنساني في اليوم والليلة (ص/١٥١(٣٠)، وابن ماجه (٣٧٩٤)، والكاكم في المستدرك١/٤٦ (٨) .

(٢) رواه البخاري ٤٢٠٥)، ومسلم (٢٧٠٤) وابن قيس سيدنا أبو موسى الأشعري رضي الله عنه.

(٣).رواه النسائي في السنن الكبرى (٩٧٥٧).

**وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ، يقول الله تعالى: أَسْلَمَ عَبدي واستَسْلَمَ))**[1]،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (( **مَن قال حينَ يُصبِحُ:** ئەوەی کە لەکاتی بەرەبەیاندا بڵێت: ڕەزامەندم بە پەروەردگارو خوداوەندی خۆم، وە ئیسلام ئاینی هەڵبژێرراوی منە، وە قورئان پێشەوامە، وە (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ پێغەمبەرو نێرراوی خودایە، خودای گەورە پێویستی کردووە لەسەرخۆی کە لە دوا ڕۆژدا ڕازی بکات، ئەوەی بیڵێت، خودا لێی ڕازی دەبێت.

**(( رَضيتُ باللهِ رَبّاً، وبالإسلامِ ديناً، وبالقُرآنِ إماماً، وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ نَبِيّاً ورَسوولاً، كانَ حقّاً علَى اللهِ أَنْ يُرضِيَهُ يَومَ القِيامَةِ.))**

وفي رواية: **مَن قالَ ذلِكَ : رضي الله عنه ))**[2]،

هەروەها موجاهید (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:

ئەگەرکەسێك دەرچوو لە ماڵەوەو وتی: **بِسْمِ اللهِ** ، مەلائیکە دەڵێن: ڕێنمای کراویت، وە ئەگەروتی: **توكَّلتُ عَلَى اللهِ**، پشتم بەخودا بەستووە، دەڵێن: ئەوە بەستە و پێویستت بە هیچی تر نابێت، وە ئەگەروتی: **لاَ حولَ ولاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ**، فریشتە دەڵێت: پارێزراویت، شەیتانەکانیش لێی دووردەکەونەوە، دەڵێن: چیتان لە پیاوێك دەوێت ، کە هیدایەتی درابێت پەنای درابێت و پارێزرابێت و هیچ ڕێگەیەکتان نیە بۆ لای[3].

**ئەگەروتت:** بۆچی دەبێت زیکری خودا، لەگەڵ ئەوەی زۆرسووکە لەسەر

---

(١) رواه أحمد في المسند (٢/٢٩٨).أخرجه النسائي في اليوم والليلة(ص/١٤٠)(١٣)، وللحاكم في المستدرك: مَن قال: **سُبحانَ اللهِ، والحمد لله ولا إلهَ إلاَّ اللهُ واللهُ أكبَر، ولاَ حولَ ولاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ، أَسْلَمَ عَبدي واستَسْلَمَ**، وقال: صحيح الإسناد.

(٢) رواه أبوداوود(٥٠٧٢)، والترمذي(٣٣٨٩)، وابن ماجه(٣٨٧٠).

(٣) رواه أبو نعيم في الحلية (٣/٢٩٥) عن مجاهد، وهو عن ابن أبي شيبة في ........................ المصنف(٢٩٨١٤)عنه، عن عبدالله بن ضمرة، عن كعب بن الأحبار، ونحوه عن ابن ماجه، (٣٨٨٦) مرفوعا من غير طريق مجاهد.

زوبان و كەمتریش پێیەوە ماندوو دەبیت، كەچی خێر و سوودی زیاتر بێت لە زۆربەی عیباتەكانی تر، كە ئەوان ماندووبوون و ئەزێتیشیان زیاترە؟

**ئەوە بزانە:** لێكدانەوە و وردبینی لەم بابەتەدا تەنها لە زانستی موكاشەفەدا جێگەی دەبێتەوە، بەڵام ئەو ئەندازەی كە ڕێگە هەیە لە زانستی (موعامەلە)دا باسی بكەین، ئەوەی كە كاریگەری هەیەو بەردەوام سوود دەگەێنێت، ئەصڵی زیكرەكەیە، لەگەڵ ئامادەبوونی دڵدا لە كاتی زیكرەكە، ئەینا تەنها بە زوبان زیكر بكات و دڵ بێ ئاگا بێت، ئەوە زۆر كەم بایەخەو سوودیكەمە،لە فەرموودەكانیشدا بەڵگەمان هەیە گەواهی ئەم ڕاستیەدەدەن [1]،

تەنانەت ئامادەبوونی دڵیش لەكاتی زیكرەكەدا و، بێ ئاگابوون و غافڵ بوون لە خودا و سەرقاڵبوون و خەریك بوونی زۆریشی بە دونیاوە، ئەمەیش كەمتر خێر دەداتەوە، بەڵكوو پێویستە ئامادەبوونەكەی دڵ لە حزوری خوادا بەردەوام بێت، یان زۆربەی كاتەكانی بگرێتەوە، ئەو كاتەیە لە عیبادەتەكانی تر لە پێش تر دەبێت، بەڵكوو بەهۆی زیكرەوە بەندایەتیەكانی تر ڕێزو نزدیكی پەیدا دەكەن، ئەمەش ئامانجی ئەو بەندایەتیایانەیە كە بە كردار ئەنجام دەدرێن.

زیكری خودا سەرەتا و كۆتای هەیە، سەرەتاكەی دەبێتە مایەی ئونس و خۆشەویستی و پێداهاتن، وە كۆتاییەكەیشی دەبێتە هۆی پێكەوە داهاتن و محەببەتی تایبەتی، وە لێیشیەوە سەرڕێژ دەكات و بڵاو دەبێتەوە.

كەواتە ئەوەی مەبەستی سەرەكییە، ئەو داهاتن و خۆشەویستی پەیدا كردنەیە، چونكە مورید لەسەرەتای كارەكانیەوە، لەوانیە زۆر لە خۆی بكات تا

---

(١) خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿رِجَالٌ لَا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ﴾ (نور/٢٧) وروى الترمذي (٣٤٧٩) عن أبي هريرة مرفوعا: (أدعو اللهَ وأنتُم موقِنونَ بالإجابَة. واعلَموا أنَّ اللهَ لايستَجيبُ مِن قلبِ غافِلٍ لاهٍ).

دڵ و زوبانی له وەسوەسە بەدوور خاتەوەو، وەری دەچەرخێنێت بەلای زیکری خودای (عَزَّ وجَلْ)وە، ئەگەر خودا ماوەیەك ڕێنمایی و پشتگیری کرد و، بەردەوام بوو لەسەری، ئەوا زیاتر پێی دادێت و چێژیشی لێ وەردەگرێت، بەڵکوو خۆشەویستی ئەو ناوبراوە لە دڵیشیدا جێگیر دەبێت.

نابێت سەرت لەم کارە سوڕبمێنێت، چونکە جاری واهەیە ناوی یەکێکی نادیار لەلای کەسێکدا زۆر باسدەکرێت، ناوی دەبرێت، وە باسی شیمەو خەصڵەتە باشەکانی دەکرێت، بۆیە هەر لە خۆیەوە خۆشەویستی دەکەوێتە ناو دڵی و، هەندێك جاریش بە هۆی زۆر باس و تاریف کردنیەوە دەبێتە عاشق بۆی و، بە دوای بینینیدا دەگەڕێت، لەپاشان ئەگەر عەشقەکەی بۆ ئەو کەسە بە شێوەیەکی ناچاریش بێت، لە زۆر باسکردن و ناوبردنیدا، هەستی دەگۆڕێت، وە حەزیش دەکات زوو زوو ناوی ببات، وای لێدێت، کە ناتوانێت لە دووری ئەوەوە خۆی ڕاگرێت، چونکە ئەوەی شتێکی خۆش بوێت، زۆر ناوی دەبات، وە کەسێك زۆر ناوی شتێك ببات، با بە ناچاری و زۆر لە خۆکردنیش بێت، ئەوا خۆشی دەوێت، هەر بەم شێوەیەش یەکەمجاری زیکری قەلبی وەك ناچاری و بەسەخۆدا هێنان وایە، تا ئەوەی بەرهەمی ئونس و محەببەتی لێ پەیدا دەبێت، وە یادو زیکرەکە دەبێتە خۆشەویستی، وە خۆشەویستیەکە دەبێتە شەیدابوون، ئەوکاتە ئەوەی بە ناچاری و بە زۆر ئەنجامت داوە، دەبێتە شتێکی پێویست و، ئەوەیش وەك درەختی بەسوودی لێ دێت و، دەبێتە بەرهەمی ڕاستەقینەو، کەڵکی تەواوی لێ وەردەگیرێت.

ئەمەیە واتای ئەو فەرموودەی کە هەندێکیان وتوویانە: ماوەی بیست ساڵ موجاهەدەو ڕیازەی نەفسم کێشاو، لە گەڵیدا خەریك بووم، وە ماوەی بیست ساڵیش لە سایەی نیعمەت و خۆشی و چێژی ئەو هەوڵ و ڕەنجەدا ژیام.[1]،

---

(١)أبو نعيم في الحلية (٢/٣٢٠)ولفظه:الصلاة بدل (القرآن)وهو بلفظ المصنف في القوت ١/٥٠.

ئەو تام چێژەیش کاتێك پەیدا دەبێت، کە پێیەوە داهاتبێت و، خۆشی بوێت و، نەتوانێت لێیی جودا ببێتەوە، ئونس و داهاتنیش بە هۆی بەردەوامی و ماندووبون و خۆڕاگریەکی زۆرەوە پەیدا دەبێت، ماوەیەکی درێژ تا ئەوەی بە ناچاری پێیەوە خەریکە ببێتە کارێکی ئاسایی.

ئەمەیش نابێت بە دوور بزانرێت، کە دەبینین هەندێك خۆراك هەیە ناگونجێت لەگەڵ سروشتی یەکێکدا و، دەیخوات و بەزۆر خۆیی لەسەر ڕادەهێنێت و، بەردەوامیش دەبێت لەسەری، تا دەبێتە خۆراکێکی ئاسایی، تا وای لێ دێت ناتوانێت لێی دوور بکەوێتەوە، وەك وتراوە:

**هي النَّفسُ ماعوَّدتَها تتعَوَّدُ**، واتە: نەفس یەکە م جار بە زۆر و ناچاری کارێکت پێ کرد، پێی دادێت و ئاسایی دەبێتەوە لای.

بۆیە بەندەیش لەم واتادا دەڵێم:

**ئەوە نەفسە دەبێ وابێ ئەگەر ویستی کەوا دابێ**
**کە پێی دابێ، دەبێ ڕابێ بە ناچاری دەبێ دابێ**[١].

لەپاشان ئەگەر بە زیکری خودای (عَزَّ وجَلْ) ئونسی بۆ پەیدا بوو، جگە لەو زیکرە لە حاڵەتەکانی تر خۆی دەپچڕێنێت و، دوور دەکەوێتەوە، تا وای لێ دێت لە کاتی مردنیشیدا، غەیری خودا بە ناچاری لێیی دوور دەکەونەوە، لە ناو گۆڕیشدا نە ماڵ و نە منداڵ و، نە ئەهل و دەسەڵات هیچی نامێنێت، جگە لە زیکری خودی باڵادەست کە هاوڕێی هەمیشەیی دەبێت.[٢]،

---

(١) ویستی دابێ، واتە بیەوێت بە شتێك دابێت، کەمادەم دەیەوێت پێی دابێت، دەبێت زۆری بکات و لەسەری ڕابێت، ئەوکاتە نەفسیش دەبێت قەبوڵی کات و، وەك کەسێك کە گرەوی دۆڕاندبێت و، یاریەکی لێ برابێتەوە چۆن دادەبێت، دەبێت ئەمیش (دا) ببێت .

(٢) واتە زیکری خودا وەك کردارەکانی ترنیە کە دوای مردن ئیتر بپچڕێت، جگە لەو سێ کردارە نەبێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **إذا مات ابن آدم انقطع عنه عمله إلاّ**

کاتێـك بە زیکـری خـودا داهـات، چیـژی لێ وەردەگرێـت، وە تـامو چێـژی زیاتریش بەوە وەردەگرێت، کە پەیوەندی دەپچڕێت لەهەموو ئەو کۆسپانەی کە لە زیکـری خـودا دووری بخـەنەوە، چـونکە پێداویسـتییەکانی ژیـانی دونیـا دەبـنە ڕێگر بۆ ئالوودەیی بە زیکری خودای گەورەوە، بەڵام دوای مردن هیچ کۆسپێك نامێنێــت لە ڕێگەیــدا، وەك ئەوە وایە کە ئیتــر ڕێگــای نێــوانی خــۆی و خۆشەویسـتەکەی واڵاو کـراوە بێـت، ئەو کـاتە زۆر شـادومان دەبێـت، وە لەو زیندانی دونیایە ڕزگاری دەبێت، کە ڕێگرێکی تایبەتی بوو، بۆ ئەو حاڵ و زیکرەی کە دەیویست ئولفەتی لەگەڵدا ببەستێت[1]، بۆیە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((إِنَّ روحُ القُدُسِ نَفثَ في رُوعي،فقال: أَحبِبْ مَن أَحبَبتَ ، فإنَّكَ مُفارِقُهُ))، واتە: جوبرەئیلی ئەمین (سەلامی خودای لەسەر) خستیە ناو دڵمەوە، کە کێت خـۆش بوێت ئارەزوی خـۆتە خۆشـت بوێت، بەڵام ئەوەنـدە

---

مِن ثلاث، الحديث، مەبەست کارە دونیاییەکانی خۆیەتی لێی دەپچڕێت،کە لە (دار الملك) دایە، ئەینـا زیکـری خـودای هەر دەمێنێـت کە لە جیهـانی غەیـب و مەلەکـوتی دایە. الإتحاف( ٥/٢٢) .

(١) شێخی گەورە محی الـدین ی عەرەبی دەفەرموێت: ئەوەی شتێك بناسێت و هەوڵی بۆ بدات، هیممەتی ئەو کەسە پێیەوە دەلکێت، ئەمرۆ بێت یان سبەی و لە داهاتوودا هەر پێی دەگات، ئەگەر دەسـتی کەوت، ئەوە تـایبەت مەنـدی و ڕێزێکـی جیـاوازە لێی گیراوە، بەڵام کەسێك بە ئیخلاصەوە هەوڵی بۆ دابێت و لە دونیادا پێی نەگەیشتبێت، ئەوا بە بێ گومان لە دواڕۆژدا پیی دەگات، چـونکە کاری بۆ کـردووە، بەڵام لە دونیادا هیچ کارت بۆ نەکردبێت، ئەوا لە دواڕۆژدا هیچ پلەیەکت دەستناکەوێت، چونە یەکێك لە ناوەکانی قیامەت (یوم التغابن)ە واتە پچڕانی بەرزبوونەوەی پلەو مقام، بۆ ئەوانە لە دونیـادا هەوڵیـان نەداوە، تەنـانەت ئەوانەیـش لە دونیـادا لە جیهـانی خەویشـدا بەوریایی دەخەون، لە قیامەتاو لە جیهانی بەرزەخیدا پلەو پایەکانیان بەردەوام لە بەرز بوونەوەدا دەبێت، بۆیە پێویستە کارەکانی بە وریایی ئەنجام بدرێت، الإتحاف( ٥/٢٢).

بزانه کەڵێی جودا دەبیتەوە، مەبەستی لە هەموو پەیوەندییە دونیاییەکانە، لە دوای مردن ئیتر هیچی نامێنێت، هەرچی لەسەر زەوی و ناو ئەم جیهانە بێت، ئەوا فەنا و تیاچوون چاوەنوارێ دەکات، تەنها ڕوخساری نوریی پەروەردگاری خاوەن جەلال و ڕێزو گەورەیی دەمێنێتەوە.

بە فەناچوونی دونیا بۆ ئەو کەسەیە کە خۆی دەمرێت، دونیای لێ کۆتایی دێت، تا ئەو کاتەی کە کاتی دونیایش بە کۆتا دەگات، ئەو پێوە داهاتنەیش بە زیکرەوە، بەندەکان لە دوای مردنیش چێژی لێ وەردەگرن، تا ئەو کاتە لە دەچێتە پاڵ دراوسێیەتی و میوانداری خوداوە، ئەوکاتە لە زیکری خوداوە بۆی دەگۆڕێت بە وەصڵ و بەیەك گەیشتن، ئەمەیش دوای زیندووبوونەوەی ئەهلی گۆڕستانەکانە، هەموو کردارە ناوەکی و دەرونیەکانیان لێ ئاشکرا دەکرێت.

نابێت ئەوە ڕەد بکاتوە کە دوای مردن زیکری خودای (عَزَّ وجَلْ) بۆی بەردەوام دەبێت، وە بڵێت: ئەو کەسە خۆی کۆتایی هاتوو، ئیتر چۆن زیکرەکەی دەمێنێت؟

ئەو نەمانە یەکجارەکیە نیە، کە ئیتر زیکری لێ قەدەغە بکرێت، بەڵکوو تەنها نەمانێکی ناو دونیایەو، دوورکەوتنەوەیەکە لە جیهانی موڵك و بینین ، نەك لە جیهانی شاراوە و مەلەکووتی، ئەمەی کە باسمانکرد، هێمایە بۆ فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ ((**القَبرُ إمَّا حُفرَةٌ مِن حُفَرِ النَّارِ، أو رَوضَةٌ مِن رِياضِ الجَنَّةِ**))[1]، واتە: گۆڕ یان دەبێتە چاڵێك لە چاڵەکانی ئاگری دۆزەخ، یان دەبێتە باخچەیەك لە باخچەکانی بەهەشت، وە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ :

(( **أرواحُ الشُّهَداءِ في حَواصِلِ طَيرٍ خُضرٍ**)) واتە: ڕۆحی شەهیدەکان وان لە ناو بۆشایی و گەدەی پەلەوری سەوزدا[2].

---

(١) رواه الترمذي (٢٤٦٠).

(٢) رواه مسلم(١٨٨٧)من حديث أبي مسعود أنه سئل عن هذه الآية: ولا تحسبن...قال أما إنا

وه هەروەها فەرموودەی دروستی پێغەمبەر ﷺ کە دەیفەرموو بە کوژراوەکانی بەدر لە بێباوەڕەکان، ئەی فلانی کوڕی فلان: یەکە یەکە پێغەمبەر ﷺ ناوی دەبردن، (( **هَلْ وجدتُم ما وَعَدَكُم رَبُّكم حقاً.؟ فَإنّي وَجَدتُ ما وعَدَني رَبّي حَقّاً**)) ئایا ئەو بەڵێنەی کە خودا پێی دابوون، دەستان کەوت بەڕاستی؟ من بەڵێنەکەی خودای خۆمم بە دڵنیاییەوە وەرگرت.

(حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) گوێی لە (حەزرەتی) پێغەمبەرەوەبوو ﷺ عەرزی کرد:

ئەی پێغەمبەری خودا ئەوانە چۆن دەبیستن، وە لە کوێ دەتوانن وەڵام بدەنەوە، کە لاشەیان وشك بووە و بۆگەنیان کردووە؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە، ئێوە باشتر لەوان قسەکانی من نابیستن، تەنها ئەوەندەیە کە ناتوانن وەڵام بدەنەوە، ((**والذي نفسي بيدهِ، ما أنتُم بأسمَعَ لِكَلامي مِنهُم، ولكِنَّهُم لايَقدِرونَ أن يُجيبوا**))[1]،

بەڵام بڕواداران و شەهیدەکان، ئەوە بە دڵنیاییەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**أرواحُهم في حَواصلِ طَيرٍ خُضرٍ مُعَلَّقَةٍ تَحتَ العَرشِ**))[2]،

ڕۆحەکانیان وان لە ناو گەدە و سینەی باڵندەیەکی سەوزدا کە لە ژێر عەرشەوە هەڵواسراون، کەواتە ئەم حاڵەتە و ئەو هێمایانەی کە پێی کراوە، ڕێگری ناکات لە وەی کە زیکری خودای (عَزَّ وجَلْ) نەکەن،

خودای گەورە فەرموویەتی:﴿**وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا، بَلْ**

---

قد سألنا عن ذلك، فقال: **أرواحهم في جوف طير خضر**، فلم يسم فيه النبي ﷺ.

ورواه الترمذي(٣٠١١)، وذكر صاحب مسند الفردوس(٢٣٨/١(٩١٤) إن ابن منبع صرح برفعه في مسنده. وعند أبي داود (٢٥٢٠) بنحوه مصرحا برفعه في شهداء أحد.

(١) رواه مسلم فى صحيحه(٢٨٧٥).

(٢) رواه ابن ماجه (١٤٤٩) في أرواح المؤمنين خاصة، والذي سبق في أرواح الشهداء.

**أَحْيَاءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ، فَرِحِينَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ، وَيَسْتَبْشِرُونَ بِالَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِهِمْ مِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾** (آل عمران/١٧٠) .

کەواتە نابێت هەرگیز وای دابنێیت: ئەوانەی لە پێناوی خوادا کوژراون، ئەوە مردوون، بەڵکوو ئەوانە زیندوون، لای خودا ڕۆزیيان پێدەدرێت، شادمانن بەو بەش و لوتفەی کە خودا پێیبەخشیون، دڵخۆشی حاڵی موسوڵمانە ساغەکانی دوای خۆیشیانن، کە هێشتا پێیان نەگەیشتوون، کە ژیانێکی بێ ترس و بیم و خەفەت و پڕ لە خۆشی چاوەنواریان دەکات.

لەبەر ڕێز و شەرەفی زیکری خودای گەورە، پلەو مقامی شەهیدبوون ئەوەندە گەورەبوو، چونکە ئەوەی مەبەستە: خاتیمەو کۆتایی کارەکەیە، مەبەست لە خاتیمە خواحافیزییە لە دونیاو، چوونیەتی بەرە و لیقای خودای (عَزَّ وجَلْ)، دڵیش کە تەنها سەرقاڵی خودای خۆیەتی و، بە تەواوی پچڕاوە لە هەموو پەیوەندییە دونیاییەکان، کەواتە ئەگەر بەندەیەك توانی تەنها بیر لە خودای گەورەی خۆی بکاتەوە، ئەوە هەرگیز ناتوانێت لەسەر ئەو حاڵەتە بمرێت، مەگەر لەڕیزی موجاهیداندا نەبێت، چونکە لەو کاتەدا ئیتر تەماحی لە هەموو خۆشییەکی دونیا دەپچڕێت، پەیوەندی بە ماڵ و منداڵ و کەس و کارەوە نامێنێت، بەڵکە هەموو دونیا دەخاتە ئەو لاوە، چونکە دونیاو ماڵ و منداڵی بۆ ژیان گەرەکە، دەی ئەو ژیانی بەخشیوە بە خودای (عَزَّ وجَلْ) و، بە دوای ڕەزامەندی ئەودا دەگەڕێت، کەواتە ئەمە باشترین خۆ ساغ کردنەوەو یەکلایی بوونەوەیە بۆ خودا، بۆیە شەهید بوون کارێکی زۆر ناوازەیە، ئەوەندە بەڵگەی گەورەیی شەهادەتمان لەدەستایە کە سەرژمێر ناکرێن، لەوانە:

کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی عەمری ئەنصاری لە ڕۆژی ئوحود دا شەهید بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە جابیری کوڕی: ((**أَلاَ أُبشِّرُكَ يا جَابر: قالَ بلَى بشَّرَك اللهُ بالخَير، قال: إنَّ اللهَ عزَّ وَجلَّ أَحيَا أَباكَ وأَقعَدَهُ بَينَ يَدَيهِ، ولَيسَ بَينَهُ وَبَينَهُ سِترٌ، فقَالَ اللهُ تَعَالَى: تمَنَّ علَيَّ ياعَبدي ماشِئتَ أُعطيكَهُ، فقال: يارَبِّ أَنْ**

**تَردَّني إلى الدُّنيا حتَّى أُقتَل فيكَ، وفي نَبيّكَ (ﷺ)مرَّةً أُخرى. فقالَ اللهُ (عَزَّ وجَلْ) سَبَقَ القَضَاءُ منِّي بِأَنَّهُم إلَيها لاَ يَرجِعُون)**[1].

ئەی جابیر ئایا مژدەت پێ بدەم، فەرمووی: بەڵێ خودامژدەی خێرت پێ بدات، فەرمووی: خودای گەورە باوکتی زیندو کردەوە، وە لە بەینی دوودەستەی قودرەتی خۆیدا داینا، هیچ پەردەیەك نەبوو لە نێوانیاندا، خودای گەورە فەرمووی: ئەی بەندەکەم چ ئاواتێکت هەیە و ئارەزووی چی دەکەیت بیڵێ با پێت بدەم، فەرمووی: ئەی پەروەردگارم؛ بمگێڕەرەوە بۆ دونیا تا شەڕ بکەم و جارێکی تریش لە پێناوی تۆو پێغەمبەرەکەتدا بکوژرێمەوە، خودای (عَزَّ وجَلَّ) فەرمووی: بڕیارو قەدەری من بەم شێوە ڕابوردووە، کە نابێت کەس بۆ ئەو دونیایە بگەڕێتەوە.

وە بزانە؛ کە کوشتنەکەی هۆکاری ئەوەبووە کە کۆتایی ژیانی لەسەر زیکر و ئونس و موحەببەت بێت، چونکە ئەگەر نەکوژرابایە، لەوانەیە بگەڕایەتەوە بۆ سەر هەمان سەرقاڵ بوونی بە دونیاوە، وە ئارەزوات دیسان زاڵببێتەوە بەسەریدا، جێگە بە زیکری خودا تەنگ بکات، بۆیە عاریف و خودا ناسان هەمیشە ترسی سەرەکییان لە سووئی خاتیمە بووە، چونکە دڵ با پابەندیشی پەیدا کردبێت بە زیکری خوداوە، لە حاڵەتێکی هەمیشە هەڵگۆڕاندایە، خاڵی نابێت لەوەی کە جارێك لابکاتەوە بەلای دونیادا، لەوانەیە بۆ ماوەیەك ئەو نەخۆشییە دایبگرێتەوە، کەواتە ئەگەر لە کۆتایی ژیاندا جارێك توشی ئەو دەردەببێت و، خۆشەویستی دونیا زاڵ ببێت بەسەریدا، وە بەم حاڵەوە مرد، لەوانەیە ئەو زاڵبوونە هەروا بەردەوامیش بێت و دوای مردنیشی بەم شێوە بمێنێتەوەو لێی نەبێتەوە، ئیتر ئاواتە خواز دەبێت کە بگەڕێتەوە بۆ ژیانی دونیا، چونکە هەست دەکات کە بەشێکی کەمی لەدواڕۆژدا هەیە، چونکە مرۆڤ

---

(١) رواه الترمذي (٣٠١٠) وابن ماجه(١٩٠)،وقوله وفي نبيك عند أبن أبي الدنيا في (المتمنين)٣.

لەسەر ئەو حاڵە دەمرێت کە لەسەری ژیاوە، وە بەو حاڵەتەیشەوە زیندوو دەکرێتەوەو حەشر دەکرێت، کە لەسەری مردووە.

کەواتە سەلامەت ترین حاڵەت ئەوەیە کە پارێزراو بێت لە سەلبی سەرەمەرگ، یان سوئی خاتیمە، وە بە شەهیدی بمرێت، چونکە شەهید ئامانجی وەدەست هێنانی ماڵ نیە، ئان ئەوەی کە پێی بوترێت ئازایە، یان هەر ئامانجێکی تری دونیایی، وەك لە فەرمووده‌دا هاتووە[(١)].

بەڵکوو دەبێت تەنها خۆشەویستی خودای (عَزَّ وجَلْ) و بەرزکردنەوەی کەلیمەی خودا ئاواتی بێت، ئەمەیە ئەو حاڵەتەی ناوەرۆکی ئایەتەکە دەیگرێتەوە کە دەفەرموێت: خودای گەورە گیان و ڕۆح و ماڵی کڕیوە لە موسوڵمانان، لەپێناوی ئەوەدا کە بەهەشتیان پێدەبەخشێت، نموونەی ئەم کەسەیە کە دونیای فرۆشتووە بۆ وەدەستهێنانی قیامەت.

وە حاڵەتی شەهیدیش گونجاوە لەگەڵ واتای ئەوەی کە بڵێیت: **(لا إلهَ إلاَّ اللهُ)** کە هیچ مەرامێکی تری نیە، جگە لە ڕازی کردنی خودا، وە تەنها پەرستراو یێکیشی هەیە کە خودایە، وە هەموو مەبەستەکانی شیاوی ئەوەیە کە بۆی ئەنجام بدرێت، وە پەرستراوەکەیشی خودای بە حەقیەتی، کەواتە ئەم شەهیدە بە زوبانی حاڵی دەڵێت: **(لا إلهَ إلاَّ اللهُ)**، چونکە مەرامێك و ئامانجێکی تری نیە جگە لە خودا، بەڵام ئەوەی بەزوبان بیڵێت و حاڵەکەی یارمەتی دەری

---

(١)روى البخاري (٢٨١٠)ومسلم (١٩٠٤) من حديث ابى موسى الاشعرى رضي الله عنه قال رجل إلى النبي صلى الله عليه وسلم فقال: **الرجل يقاتل للمغنم، والرجل قاتل للذكر، والرجل يقاتل لِيُرى مكانه فمَن في سبيل الله، قال: من قاتل لتكون كلمةُ الله هى العُليا فهو في سبيل الله.** وفي مسلم (١٩٠٥) **إن أول الناس يقضى يوم القيامة عليه رجل استشهد، فأتى به، فعرَّفه نعمه، فعرفها، قال: فما علمت فيها؟ قال: قاتلت فيك حتى استشهدت، قال: كذبت، ولكنك قاتلت لأن يقال : جريئٌ . فقد قيل، ثم أمر به . فسحب على وجهه حتى ألقي في النار...الحديث.**

نەبێت، ئەوە لە ئیرادە و ئارەزوی خوادایە، وە حاڵی جێگەی مەترسی دەبێت.

هەر لەبەر ئەمەیە کە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ زیکری **(لا إلهَ إلاَّ اللهُ)**ی لەهەموو زیکرەکانی بەلاوە خێردارو گەورەترە[1]، وە هەندێك جار بە ڕەهایی و لە جێگەی هاندانەدا ئەمە ڕاگەێنراوە. وە لە هەندێك شوێنی تردا کەلیمەی تەوحیدی بەستۆتەوە بەوەی کە بە ئیخلاصەوە، یان بەڕاستیوە لا إلهَ إلاَّ اللهُ بکات، وەك دەفەرموێت: **((مَنْ قالَ لا إلهَ إلاَّ اللهُ مُخلِصاً))** [2].

ئەوەی بە ئیخلاصەوە بیڵێت، وە واتای ئیخلاصیش ئەوەیە کە حاڵی ئەو کەسە گونجاوو یارمەتی دەری قسەکەی بێت.

ئێمەیش داوا لە خودای گەورە و میهرەبان دەکەین، کە خاتیمەی هەموو کردارەکانمان بە کەلیمەی تەوحید بێت و لە ئەهلی لا إله إلا الله مان بگێرێت، حاڵمان لەسەر ئەو گوتارە بێت و قسەکانمان تەعبیر لەو ناخی دەروونەمان بکاتەوەو، ڕواڵەت و حاڵەتی شاراوەیشمان هەر لەسەر هەمان ڕێبازی نەگۆڕاو بێت، تا دەستمان لە دونیا دەبێتەوە و لێی دووردەکەوینەوە، وابین کەلای بەلادادا نەکەینەوە، وە ئێخەی لێ هەڵتەکێنین و بایەخی پێنەدەین، تا بتوانین بە ڕاستی حەزمان بە لیقای پەروەردگارمان بێت، چونکە ئەوەی حەز بە لیقای خودا بکات، خودایش حەزی بە لیقا و پێگەیشتنی ئەو هەیە، وە ئەوەیش گەڕانەوە و لیقای خودای پێ ناخۆش بێت، ئەوا خودایش حەز بە چارەی ئەو ناکات و حەز بە لیقای ناکات[3]، ئەوەی باسمان کرد، هەندێك بوو لەو ڕەمزانەی لە واتای زیکرکردندا دەکرا کە باسی بکەین، ناکرێ لەمە زیاتر ڕوونی بکەینەوە، کە لە دەرەوەی زانستی (موعامەلەوە) بێت.

---

(١) كما روى الترمذي (٣٣٨٣) وابن ماجه(٣٨٠٠).

(٢) فقيدها بالإخلاص،وهو مروي عند الطبراني في الأوسط (١٢٥٧) وأبي نعيم في الحلية٩/٢٥٤

(٣) كما روى ذلك البخاري (٦٥٠٧) ومسلم (٢٦٨٣)، وسيأتي للمصنف في آخر الكتاب.

# دەروازەی دووهەم

## لە بارەی ئادابی نزاو گەورەیی پاڕانەوە و هەندێك لە دوعایانەی کە لە حەزرەتەوە ﷺ وەرگیراون (المأثورات) وە گەورەیی صەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ وە گەورەیی داوای لێخۆش بوون لە خودا

### گەورەیی نزاو پاڕانەوە

خودای گەورە فەرموویەتی:﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي﴾(البقرة/١٨٦) واتە: ئەگەر بەندەکانم دەربارەی من لێیان پرسیت،پێیان بڵێ: ئەوە من لێیان نزیکم و ئاگام لە حاڵ و کردەوە کانیانە، هەرکەش بانگمبکات ئاگام لێیەو، وەڵامی دەدەمەوەو فریای دەکەوم، کەواتە کە بانگم کردن بۆ عیبادەت و بەگوێکردنم با ئەوان بەگوێم بکەن.[١]،

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾ (الأعراف/٥٥) بەترس و گریان و خوشووعەوە لە خودای خۆتان بپاڕێنەوە بە پەنامەکی، خودا ئەو کەسانەی خۆش ناوێ لە دوعاو پاڕانەوەدالە ڕێگای شەرع لادەدەن و داوای شتی ناڕەوادەکەن، یان بەبێ مەعنا لە دوعاکردندا دەنگ بەرزدەکەنەوە.[٢]،

وە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَنَ أَيًّا مَا

(١) خۆلاصەی تەفسیری نامی (٢٨).

(٢) هەمان سەرچاوە(١٥٧).

تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ﴾ (الإسراء/١١٠) پێیان بڵێ:

داواو نزاکانتان ڕو له خودابکەن، بەناوی (یاالله) وە بانگی بکەن یان بە (یا رحمن)ە وە، درووستەو ئەو خاوەنی هەموو ناوە جوانەکانەو، جیاوازی نیە لە ناوەکاندا، ڕەحمانیش صیفەتی خودایەو دەتوانن بانگی خودای پێبکەن.

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ (غافر/٦٠)

خودای ئێوە فەرموویەتی: ئێوە داوام لێبەکەن و، منیش دێم بەدەمتانەوەو نزاکانتان وەردەگرم، ئەوانەی فیزیان نەهێنێت کە دوعا و بەندایەتی بکەن، ئەوا بە مل شۆڕی و زەلیلییەوە دەدرێنە بەر بۆ جەهەنەم.

نوعمانی کوڕی بەشیر دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((إنّ الدعاءَ هُوَ العِبادَة، ثُمَّ قَرأَ: ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾))[1]، نزاوپاڕانەوە ئەصڵی بەندایەتییە، وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە فەرموویەتی: داوام لێبکەن تا بێم بەدەمتانەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((الدُّعاءُ مُخُّ العِبادَةِ))[2]. نزاو دوعای ڕاستەقینە بە مۆخ و کاکڵەی بەندایەتی دەژمێررێت.

ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەری خوداوە دەگێڕێتەوە ﷺ کە فەرموویەتی:

((ليسَ شَيْءٌ أكرَمَ على اللهِ مِنَ الدُّعاءِ))[3]، واتە: هیچ شتێك نیە، ئەوەندەی نزاو پاڕانەوە لای خودا بەڕێزو خاتر گیراو بێت.

---

(١) رواه أبـو داوود (١٤٧٩)، والترمـذي (٢٩٦٩) والنسـائي في السـنن الكبـرى(١١٤٠٠) وابـن ماجه(٣٨٢٨)..

(٢) رواه الترمذي (٣٣٧١) چونکە لە هەموو کەس هیوا بڕاو دەبێت و تەنها ڕو لە خودا دەکات، ئەمەش بە یەکتاپەرستی ڕاستەقینە بۆی دەژمێررێت، وە کزبو داماوی خۆیشی دردەخات.

(٣) رواه الترمذي(٣٣٧٠) وابن ماجه(٣٨٢٩)

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی

إنَّ العَبدَ لاَ يُخطِئهُ مِنَ الدُّعاءِ إحدى ثَلاثٍ: إمَّا ذَنبٌ يُغفَرُ لَهُ، وإمَّا خيْرٌ يُعَجَّلُ لَهُ، وإمَّا خيرٌ يُدَّخَرُ لَهُ))[1]،

واته: کاتێك که بەندەیەك دوعا دەكات: یەکێ لەم سێ ئامانجە دەپێکێت: یان گوناهەو خودای لێی خۆش دەبێت، یان خێرێکی تایبەتییە، خودا بە خێرایی بۆی دابین دەکات، یان دەبێتە خێر و چاکەیەك كە بۆی هەڵدەگیرێت و لە دوارۆژدا دەبێتە ئەجروپاداشت و بەکەڵکی دێت.

ئەبوزەری غەفاری دەفەرموێت:

(يَكفي مِنَ الدُّعاءِ مَعَ البِرِّ، ما يَكفي معَ الطَّعامِ مِنَ المِلحِ)[2]،

لەگەڵ کردنی چاکەو چاکەکاریدا تەنها ئەوەندەی دوعا دەوێت و پێویستیەتی، بەو ئەندازە خوێ یەی سازکردنی ژەمە خوانێك پێویستیەتی.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((سَلُو اللهَ تَعالَى مِنْ فَضْلِهِ، فإنَّهُ تَعالَى يُحِبُّ أن يُسأَلْ، وأَفضَلُ العِبادَةِ إنتِظارُ الفَرَجِ))[3]،

داوا لە خودا بکەن هەمیشە لە گەورەیی و فەزڵی خوی پێتان ببەخشێت، بەڕاستی خودای گەورە بۆ چاکەی ئێوە پێی خۆشە کەداوای لێبکەن.

---

(١) هو بلفظ المصنف عند الديلمي في مسند الفردوس(٧٤٩)، وبنحوه عند أبو نعيم، في الحلية(٣٢٤/٢)، وهو عند أحمد في المسند١٨/٣، بلفظ:

**ما من مسلمٍ يَدعوا بدَعوةٍ ليس فيها إثمٌ ولا قَطيعةُ رَحم، إلاّ أعطاه الله إحدى ثَلاث، إما أن يُعجلَ لهُ دعوته، وإمَّا أن يَدَّخِرَها لَهُ في الآخِرَةِ، وإما أن يَصرِفَ لَهُ مِنَ السُّوءِ مِثلَها، قالوا إذاً نُكثِرُ، قال: (أَللهُ أَكثَر).**

(٢) رواه ابن مبارك في الزهد،٣١٩)، وأبو نعيم في الحلية(١٦٤/١).

(٣) رواه الترمذي(٣٥٧١).

# ئادابەکانی دوعاکردن کە دە ئاداب لە خۆ دەگرێت

**یەکەم: دەبێ بگەڕێت بەشوێن کاتە پیرۆزو خێردارەکاندا:**

وەك ڕۆژی عەرەفە لە ساڵدا و، ڕەمەزان لە مانگەکاندا و، ڕۆژی هەینی لە حەفتەدا و، کاتی بەرەبەیان لە دوا ساتەکانی شەودا.

وەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿**وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ**﴾ (الذاريات/١٨) لەبەرەبەیاندا داوای لێبوردن لە خودا دەکەن.

وە لەبەر فەرموودەی پێغەمبەرﷺ : ((**يَنزِلُ اللهُ (عَزَّ وجَلْ) إلى سَماءِ الدُّنيا، حينَ يَبقى ثُلُثُ الليلِ الأَخيرُ. فيقول (عَزَّ وجَلْ) : مَن يَدعوني فأَستَجيبَ لَهُ؟ مَنْ يسأَلُني فأُعطِيَهُ؟ مَن يَستَغفِرُني فأَغفِرَ لَهُ؟**))[1]، واتە:

خودای گەورە هەموو شەوێك ڕەحمەت و فەرمانی وەرگرتنی داوای بەندەکانی دادەبەزێنێتە ئاسمانی دونیاو دەفەرموێت: کێ داوایەکی هەیە و بانگم لێدەکات و پەنام بۆ دێنێت تا بۆی جێبەجێ بکەم، کێ داواکارە لێم تا پێی ببەخشم، کێ داوای لێبوردنم لێدەکات تا لێی خۆشببم.

دەڵێن: حەزرەتی یەعقوب(سەلامی خودا لەسەر پێغەمبەرمان و لەسەری) بۆیە بە کوڕەکانی فەرموو: ﴿ **سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّي**﴾ (يوسف/٩٨) لەپاشان داوای لێخۆشبوونتان لەپەروەردگارم بۆدەکەم ، بۆ ئەوەی کاتی بەرەبەیان بێتە پێشەوە تا دوعایان بۆ بکات، کە لەو کاتەدا دەڵێن هەستاوەو منداڵەکانی بانگ کردوو، ئەوانیش لە سەر دوعاکانی ئامینیان دەکرد، خودای گەورەیش نیگای بۆ کرد: ئەوامن لێیان خۆش بووم و، هەموشیانم گێڕان بە پێغەمبەر[2]،

---

(١) رواه البخاري (١١٤٥) ومسلم (٧٥٨).

(٢) تأخيره الدعاء إلى وقت السحر عند الطبري في تفسيره (٨ /١٣(٨٣) وتأخيره الدعاء إلى ليلة الجمعة ،جاء في حديث علي (رضي الله عنه) عند الترمذي(٣٥٧٠)وانظر: الدر المنثور(٥٨٥/٤).

## دووهەم: دەبێت چاودێری حاڵەتە شەریفەکان بکات:

وەك ئەبوهورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە لە کاتێکدا ڕیزی موجاهیدەکان بەرێ دەکەون بۆ جیهاد لە ڕێی خوادا ، وە لەکاتی باران باریندا، وە لەکاتی قامەت کردن و هەستانەوە بۆ نوێژە فەرزەکاندا، ئەو کاتانە بەهەند وەربگرن و نزای بەکوڵیان تێدا بکەن.

وە موجاهید دەفەرموێت: نوێژە فەرزەکان لە باشترین ساتەکاندا دیاری کراون کە بکرێن، لەسەرتانە کە نزاو پاڕانەوەکانتان بخەنە دوای نوێژەکانەوە[(١)].

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((الدعاء بينَ الأذانِ والإقامَةِ لايُرَدُّ))[(٢)] نزاکردن لە نێوانی بانگ و قامەتدا بکرێت، ناگەڕێتەوە و وەردەگیرێت.

هەروەها فەرموویەتی: ((الصائِمُ لاتُرَدُّ دَعوَتهُ)) ڕۆژووەوان نزاو داواکانی نادرێتەوە بەسەریدا و لێی وەردەگیرێت.

**وە لە ڕاستیدا** : ڕێزوو گرنگی کاتەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ بە نرخی و ڕێزو بەپێزی حاڵەتەکان، چونکە کاتی سەحەر و بەرەبەیان کاتی صەفای دەروون و بوونی ئیخلاصە، کە هیچ ئاڵوزی و هانهانیەکی دونیایی سەری لێ تێك نادات، وە ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژی هەینی، کاتی کۆبوونەوەی هیممەتی خاوەن هیممەتەکانە بۆ بەندایەتی و هاوکاری کردنی دڵەکان بۆ ڕاکێشانی ڕەحمەتی خوای (عَزَّ وجَلْ)، ئەمە یەکێکە لە هۆکارەکانی شەرەف و ڕێزی کاتەکان، جگە

---

(١) رواى النسائي في السنن الكبرى(٩٨١٧) عن أنس (رضي الله عنه) إذا **أقيمت الصلاة، فتحت أَبوابُ السَّماء واستجيب الدعاء.**

(٢) رواه النسائي في السنن الكبرى (٩٨١٢).وأخرجه أبو داوود(٥٢١)، والنساني في اليوم والليلة (ص/١٦٧(٦٧)، والترمذي (٣٥٩٥) وحسنه من حديث أنس. وضعفه ابن عدي في الكامل ٤٠٠/١) وابن قطان . وروا النسائي بإسناد آخر جيد. في اليوم والليلة (ص/ ١٦٨(٦٨) وابن حبان في صحيحه(٥٩٣/٤ (١٦٩٦)، والحاكم في المستدرك( ٣١٤/١ (٧١٣)، وصححه.

لەو هۆکارە نهێنیانەی دیکە کە نابێ باسبکرێن و خەڵکی لێیان ئاگادار بن.

وە لە حاڵەتی سوجدە بردنیشدا کاتی وەرگیرانی دوعایە، وە ئەبوهورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

(( **أقرَبُ ما يَكونُ العَبدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ ساجِدٌ، فأكثِروا مِنَ الدُّعاء**))[1]، واتە: نزیکترین کات کە بەندە لە خودای خۆیەوە نزیك بێت، ئەو کاتەیە کە لە سوجدەدایە، دەی لە کاتی سوجدە برددندا زۆر دوعا و پاڕانەوە بکەن.

ئیبنو عەباس دەگێڕێتەوە (خودای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ کە فەرموویەتی: ((**إني نُهيتُ أن أقرأ القُرآنَ راكعاً أو ساجداً. فأمَّا الرُّكوعُ فعَظِّمُوا فيهِ الرَّبَّ تَبارَكَ وتعالَى، وأمَّا السُّجودُ فاجتَهِدُوا فيهِ بالدُّعاءِ. فَإنَّهُ قَمِنٌ أنْ يُستجابَ لكُم**))[2]، واتە: ڕێگریم لێ کراوە کە لە ڕکوع و سوجدەدا قورئان بخوێنم. لە کاتی ڕکوع بردنتان شوێنی بەگەورەزانینی پەروەردگارتانە، تەعزیمی خودای تێدابکەن، وە لە سوجدەیشدا هەوڵبدەن دوعای باش و زۆری تێدا بکەن، کاتی ئەوەیە کە لێتان وەربگیرێت.

**سێیەم: با ڕووەو قیبلە نزاکانی بکات** و ئەوەندە دەستەکانی بەرزکاتەوە سپیایی بن باڵی دەربکەوێت:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆژی عەرەفە ڕووی کردە قیبلە، وە بەردەوام نزای دەکرد تا ڕۆژ ئاوا بوو[3]،

سەلمانی فارسي دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**إنَّ رَبَّكُم حَيٌّ كريمٌ، يَستَحي مِن عَبدِهِ إذا رَفعَ يَدَيهِ إلَيهِ أنْ يَرُدَّهُما صِفراً**))[1]، واتە: پەروەردگارتان زیندووەو بەڕێزو دەستی بەخشینی کراوەیە، شەرمەکات،( واتە:

---

(١) رواه مسلم (٤٨٢).

(٢) رواه مسلم(٤٧٩).

(٣) رواه مسلم مطولا(١٢١٨)وعند النسائي (رضي الله عنه) ٢٥٤/٥) (فرفع يديه يدعوا).

لێ خۆشدەبێت) کەبەندەکەی دەستی بۆ بەرزکاتەوەو بەبەتاڵی بیگێڕێتەوە.

هەروەها ئەنەس دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دەستەکانی ئەوەندە بەرزدە کردەوە لە دوعادا،تا سپیایی بنباڵی دەبینرا،بەڵام بەپەنجەکانی هێمای نەدەکرد.

ئەبوهورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دای بەلای کەسێکدا دوعای دەکرد و، بە هەردوو پەنجەی هێمای پێدەکردن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((أَحِّدْ أَحِّدْ))[2]، واتە: تەنها بە یەك پەنجە هێمای پێبکە، خودا یەکە و تاك و تەنهایە.

ئەبودەرداء(خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: پێش ئەوەی دەستەکانتان کۆت و بەند بکرێن، بەرزی بکەنەوە و دوعای پێبکەن.[3] لەپاش تەواو کردنی دوعاکانی پێویستە دەستە بەرزکراوەکانی بیانهێنێت بە دەم و چاویدا، وەك (حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

(حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ ئەگەر دەستی بەرز بکردایەتەوە بۆ دوعاکردن، داینەدەناو نزمی نەدەکردەوە، تا مەسحی دەم وچاوی پی نەکردایە[4]،

ئیبنوعەباس (خودایان لێ ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێك دوعای بکردایە، هەردوو تەنیشتی لەپەکانی دەگەیاند بە یەکو، ڕووی ناو لەپیشی دەکردە خواری دەموچاوی[5]،

---

(١) رواه أبو داود (١٤٨٨)والترمذي(٣٥٥٦)وابن ماجه(٣٨٦٥).والحاكم ٦٧٥/١(١٨٣٠) صحيح.

(٢) رواه الترمذي (٣٥٥٧) وقال حسن، وابن ماجه(عزاه السيوطي له في جامع الأحاديث ٤٧٤/١٦(٨٧٥٢) والحاكم( في المستدرك(٧١٧/١(١٩٦٥) بإسناد صحيح، والنسائي (٣٨/٣).

(٣) رواه الفريابي في الذكر، الإتحاف ٣٤/٥.

(٤) رواه الترمذي (٣٣٨٦).

(٥) بنحوه عند الحاكم في المستدرك (٥٣٦/١) عن ابن عباس مرفوعا،**إذا سألتم الله فاسألوه ببطون أكفكم، ولا تسألوه بظهورهما، وامسحوا بهما وجوهكم**، وروى أبو نعيم في الحلية (٢١٣/٨) من حديث أنس قال: رأيت رسول الله ﷺ يدعو رافعا يديه باطنهما ممّا يلي وجهه.

ئەمەی کە باسمان کرد چۆنیەتی گرتن و بەرزکردنەوەی دەستیەتی، وە نابێت چاوی بەرزبکاتەوە بۆ ئاسمان، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**لَيَنتَهِيَنَّ أَقوامٌ عَن رَفعِ أبصارِهِم إلى السَّماءِ عِندَ الدُّعاءِ، أَوْ لتَخطِفَنَّ أبصارَهُم**))[١]

دوپاتی دەکەینەوە؛ کەسانێك کە لە کاتی نزاکانیاندا چاوەکانیان بەرز دەکەنەوە بەرەو ئاسمان، جا یان واز لەوە دەهێنن، یان بینایی چاویان لەدەستدەدەن.

**چوارەم:نزمکردنەوەی دەنگ لە نێوانی پەنهانی و دەنگ بەرزکردنەوەدا:**

وەك دەگێڕنەوە کە ئەبومووسای ئەشعەری(خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: لە خزمەت پێغەمبەردابووین ﷺو کاتێك لە مەدینە نزیك بوینەوە، تەکبیری کرد (**أللهُ أكبَرْ**)، خەڵکەکەیش هەموو (**أللهُ أكبَرْ**)یان کرد، وە دەنگیان بەرزکردەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (( **أَيُّها النّاسُ: إنَّ الذي تَدعونَ ليسَ بِأَصَمَّ وَلاَ غائِبٍ، إنَّ الذي تَدعونَ، بَينَكُم وَبَينَ أَعناقِ رِكابِكَمْ**))[٢]

ئەی خەڵکینە: ئەو زاتەی کە ئێوە بانگی لێدەکەن، زاتێك نیە کە نەبیستێت وە ئەوەیش نیە کە دیار نەبێت و پەنهان بێت، ئەوەی بانگی دەکەن لە نێوانی ئێوەو گەردنی وشتروکاروانیەکانتانە.

واتە:حازرەوئامادەیەوپێویست بەهاتوهاوار ناکات.

(حەزرەتی) عائیشە(خوای لێ ڕازی بێت)لە بارەی فەرموودەی خوداوە:﴿**وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا**﴾(الإسراء/١١٠)**أي بِدُعائِكَ**[٣]واتە:نە بەدەنگی بەرز بێت و نەبە دەنگی نزم، فەرمووی: مەبەستەکەی ئەوەیە کە دوعاکانتان با بەرزو نزم نەبێت، واتە لەو میانەدابێت..ئەوەندەی کەخۆت گوێت لە دەنگی خۆتەوە بێت.

---

(١) رواه مسلم(٤٢٩)، وقال: عند الدعاء في الصلاة، أنظر الإتجاف/ ٣٤/٥.

(٢) رواه أبو داوود(١٥٢٦) والترمذي(٣٣٧٤) وهوفي الصحيحين:البخاري(٢٩٩٢) ومسلم(٢٧٠٤)

(٣) رواه البخاري (٦٣٢٧) ومسلم (٤٤٧).

خودای گەورە ستایشی (حەزرەتی) زەکەریا پێغەمبەری بەوەکردووە ﷺ کە بەدەنگێکی نزم و پەنهانی بانگی لە خوداوەندی کردووە لێی پاڕاوەتەوە:

﴿إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاءً خَفِيًّا﴾(مریم/٣) هەروەها فەرموویەتی:

﴿ادْعُوارَبَّكُمْ تَضَرُّعًاوَخُفْيَةً﴾ (الأعراف/٥٥) بە نەرمی و ترس و خشووع و پەنهانی و زوبانی پاڕانەوەوە نزا لە پەروەردگارتان بکەن.

**پێنجەم:نابێ بە زۆر ڕستەی سەجع و قافیەو کێش و سەرەوا لە نزاکانیدا** بەکار بهێنێت،حاڵی ئەو کەسەی دوعا دەکات، دەبێبە حاڵێکی کزۆڵی و پڕ لە پاڕەولاڵەوە بێت، نابێبە فشاروتەکەللوف زۆرەملێ قسەو ڕستەدروست بکات.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((سَيَكونُ قَومٌ يَعتَدونَ فِي الدُّعاءِ))[1].

کۆمەڵێکی وا پەیدا دەبن لە دوعا کردندا، سنوور دەبەزێنن و لە هێڵی ڕاست دەردەچن، وەك ئەوەی بەزۆر نزاکان بەسەر خۆیاندا بهێنن.

هەروەك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴾(الأعراف/٥٥) [2]، هەندێك دەڵێن: مەبەست ئەوانەیە کە وشە سازی دەکەن، بە شێوەی (سەجع)، کەدوای وشەکان ڕێك دەخەن و وەك سەرەوای هۆنراوە ڕێکی دەخەن، باشتر وایە دوعا مەئسوورەکان تێنەپەڕێنێت، ئەگەر وابکات، لەوانەیە بە سنوور بەزاندن بۆی بژمێررێت، داوایەك بکات کە لەگەڵ بەرژەوەندی ئەودا یەك نەگرێتەوە، چونکە هەموو کەس نازانێت دوعای شیاو بکات، بۆیە لە فەرموودە و ئەسەری پیرۆزدا هاتووە:

زاناکان لە بەهەشتیشدابن، خەڵکی ناو بەهەشت پێویستیان پێیان دبێت، چونکە پێیان دەڵێن: ئادەی چ ئاواتێکتان هەیە باسی بکەن، نازانن چ خواست

---

(١) رواه أبـو دوود (١٤٨٠). وفي روايـة: والطهـور، وأخرجـه أيضـا ابـن ماجـه في متـاب الـدعاء (٣٨٦٤٩و وابن حبان في صحيحه(٦٧٦٤)، والحاكم في المستدرك، ٧٢٤/١(١٩٧٩) .

(٢) بنوارە خۆلاصەی تەفسیری نامی( ل/١٥٧) (وە لاپەڕە: (٥٠٤)ی ئەم بەرگە واتاکەی نوسراوە.

و ئاواتێكیان هەبێت تا زاناكان بانگدەكەن و فێریان دەكەن[1].

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( **إيَّاكُم والسَّجعَ في الدُّعاءِ بِحَسَب أحَدِكُم أنْ يقُول: اللَّهُمَّ؛ إنِّي أسألُكَ الجنَّة ومَا قَرُبَ إلَيهَا مِن قَوْلٍ وعَمَلٍ، وأعُوذُ بِكَ مِنْ النَّارِ ومَا قَرَّب إليهَا مِنْ قَولٍ وعَمَلٍ**))[2].

واتە: نەكەن لە نزاكانتاندا توخنی سەجع و قافیەئارایی ببنەوە، ئەوەندە بەسە كە یەكێك لە ئێوە بڵێت: خودایە من داوای بەهەشتت لێدەكەم و، ئەوەی لە بەهەشتم نزیك دەخاتەوە لە قسەو لە كردار، وە پەنات پێدەگرم لە ئاگر و ئەو قسەو كردارانەیش كە لە ئاگری نزیك دەخاتەوە.

وە لە فەرموودەدا هاتووە (وەك باسمان كرد):

((**سيَأتِي قَومٌ يَعتَدونَ في الدُّعاءِ والطَّهور**))[3]

یەكێك لە زانایانی سەلەف دای بەلای چیرۆك خوانێكدا بە شێوەی سەجع دوعای دەكرد: فەرمووی: ئەوە ئەو زۆر وتن و پیاهەڵدانە بەسەر خودادایە دەیكەیت؟! من شایەتی دەدەم كە حەبیبی عەجەمیم بینی دوعای دەكرد و لەمەی زیاتر نەدەوت: خودایە بمانگێڕە بەوانەی كە لە چاكەكانن، ئەی پەروەردگار؛ لە قیامەتدا ڕوومان هەڵنەماڵیت.

ئەی خودایە؛ ڕێنمایی خێرو چاكەمان بكە، خەڵكەكەیش لە هەموو لایەكەوە لە دوایەوە دوعاكەیان دەوتەوە، كە بەیەكێك لەو كەسانە ناسرابوو.

---

(١) كما روي مرفوعا من حديث جابر (رضي الله عنه). رواه ابن عساكر في (تأريخ دمشق ٥٠/٥١)، والديلمي كما في مسند الفردوس(٨٨٠). وانظر الإتحاف ٣٧/٥.

(٢) كما أورده صاحب القوت،(١٦٥/١)، وتقدم حديث ابن عباس السالف الذكر، وقد روى بشأن الدعاء المذكور أبو داوود الطيالسي في مسنده ص/٢١٩)، وابن ماجه (٣٨٤٦)، والحاكم في المستدرك(٥٢١/١) واللفظ له مرفوعا. و أيضا٧٠٢/١(١٩١٤) وقال صحيح الإسناد من حديث عائشة (**عليك بالكوامل**) وفيه : وأسألك الجنة....إلخ

(٣) رواه أبوداوود (٩٦).

که بەرەکەت لە نزاکانیدا هەبوو.

هەندێکی تریان دەفەرموون: بە زوبانی کزی و زەلیلی و پێویستییەوە دوعا بکەن، نەك بە زوبانی قسەزانی و ڕەوانبێژییەوە[1].

وەك دەڵێن: زانا مەزن و ئەبدالەکان تەنها حەوت وشە یان کەمتریان فەرمووە، کە کۆتایی ئایەتەکانی سوورەی (ئەلبەقەرە) گەواهی بۆ دەدەن، خودای گەورە لە هیچ شوێنێدا کە باسی نزای بەندەکانی کردبێت، لەمە زیاتری لێداوا نەکردوون[2]، وە بزانە: مەبەست لە قسەی ڕازاوە و ڕێك خراو بە سەجع، ئەوەیەکە بەدوای وشەسازی و ڕێکخستنی ڕستەدا بگەڕێت، ئەوە لەگەڵ زوبانی پاڕانەوەو لالانەوەدا گونجاو نیە . بنواڕە بۆ دوعاکانی پێغەمبەر ﷺ کە چەندین وشەی ڕێك و پڕواتاو هاوسەنگی تێدایە، بەڵام وشەیەکی خۆڕسکەو بە زۆر ڕێکی نەخستوون، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**أسأَلُكَ الأَمنَ يَومَ الوَعيد، والجَنَّةَ يَومَ الخُلُد، معَ المُقَرَّبِينَ الشُّهُود، والرُّكَّعُ السُّجود، المُوفِينَ بالعُهود، إنَّكَ رَحيمٌ وَدودٌ، وأَنَت تَفعَلُ ما تُريد**))[3] واتە:خودایە داوای ئاسایش و ئاسوودەییت لێدەکەم، لە هاتنی ڕۆژی دیاری کراودا، کە هەڕەشە ئامێزە، وە داوای بەهەشتت لێدەکەم، لە ڕۆژی مانەوەی هەتاهەتاییدا، لەگەڵ ئەو نزیکانەی خاوەنی بینین لە حزووردا، ئەوانە زۆر لە ڕکوع و سوجدەدا ماونەتەوە، وەفا بە بەڵێن و پەیمانیان دەکەن، تۆ ئەی خودایە بەسۆزو میهرەبان و بەبەزەییت، وە هەرچیت بوێت ئەوە ئەنجام دەدەیت. لەگەڵ هاووێنەی ئەم دوعایانە.

کەواتە با زیاتر ئەو دوعایانە بکات کە لە سوننەت و فەرموودەی پیاو

---

(١) قوت القلوب١٦٥/١.

(٢) قوت القلوب ١٦٥/١، ئەوە کە ئەو بەڵگەی هەڵێنجاوەو وەری گرتووە.

(٣) واه الترمذي (٣٤١٩)، ضمن حديث طويل من دعائه ﷺ .

چاکانەوە پێی گەیشتووە، یان بۆ خۆماندووکردن و وشە ڕێکخستن، هەردوعایەکی دیکە کە پڕی بێت لە گەردن کەچی و پاڕانەوە، چونکە ئەوەی لە نزادا زیاتر وەردەگیرێت ملکەچی و پیشاندانی زیللەتە لە حزوری خوادا.

**شەشەم: ملکەچی وگەردن کەچی، وە زاڵ بوونی ترس وخۆف بەسەریدا:**

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿**إِنَّهُمْ كَانُوا يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا وَكَانُوا لَنَا خَاشِعِينَ**﴾ (الأنبياء/٩٠) صیفەت و حاڵیان وابوو، کە دەستوبردیان دەکرد لە کردنی چاکەو بەهیوای چاکەو لەترسی سزای دوارۆژلێمان دەپاڕێنەوەو ملکەچی فەرمانمان بوون[١].

هەروەها فەرموویەتی: ﴿**تَضَرُّعًا وَخِيفَةً**﴾ (أعراف/٢٠٥)، واتە: زیکری خودای خۆت بکە لە نەفسی خۆتداو بە زاری و داماوی و کزی و ترسەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (( **إذا أحبَّ اللهُ عَبداً، ابتَلاهُ حتَّى يَسمَعَ تَضَرُّعَهُ** ))[٢]، ئەگەر خودا بەندەیەکی خۆشویستبێت، تووشی ئێش و ئازارو ناسۆری دەکات، تا کڕوزە و پاڕانەوەی ببیستێت.

**حەوتەم: ئەبێ دوعاکانی بەدڵنیاییەوە بکات و، متمانەی هەبێت لەسەر وەرگرتنی، وە هیوای بەهێز بێت پێی :**

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (( **لايَقُل أحَدُكُم إذا دَعَا: اللَّهُم اغفِر لِي إن شِئتَ، اللَّهُمَّ ارحَمني إن شِئتَ، لِيَعزِمَ المَسأَلَة فَإِنَّه لامُكرِهَ لَهُ** ))[١].

---

(١) خۆلاصە(٣٢٩).

(٢) رواه هناد في الزهد(٤٠٥) والشاشي في مسنده(٦١٢). وفي البخاري(٥٦٤٥) مرفوعا: (**من يرد الله به خيرا يصب منه**) وأخرجه أبو منصور الديلمي في مسند الفردوس( ٢٥١/١(٩٧٢) من حديث أنس إذا أحب الله عبدا صبَّ عليهِ البلاءَ صباً. الحديث... وفيه: **دعه فإني أحب أن أسمع صوته**. وللطبراني في الكبير( ١٦٦/٨(٧٦٩٧)من حديث أسامة مثله. قال الزبيدي ( ٣٨/٥): ورواه البيهقي في الشعب(١٤٥/٧(٩٨٧٧) (٩٣٣١). والديلمي(٢٥١/١(٩٧٠).

ئەگەر یەکێك لە ئێوە دوعای کرد، نەڵێت: خودایە ئەگەر ئارەزووت لێیە، ئەی خودایە؛ لێم خۆشبە، ئەگەر مەیلت هەیە ڕەحمم پێبکە، با بە ئیرادەیەکی بەهێزەوە نزا بکات،خۆ هیچ کەسێك ناتوانێت کارێکی بەسەردا بسەپێنێت.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:(( **إذا دَعَا أَحدُكم فَليُعَظِّم الرَّغبَةَ، فَإِنَّ اللهَ تعالَى لاَ يَتَعاظَمهُ شَيئ**))[2]. واتە ئەوەی داوایەکی هەیە، با هەرچی مەبەست و ئارەزواتی گەورە هەیە داوای بکات، چونکە لای خودا هیچ شتێك گران نیەو، هەمەموو شتێکی وەك یەك لا ئاسانە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:(( **ادعُوا اللهَ وأَنتُم مُوقِنُونَ بالإجابَةِ، واعْلَمُوا أَنَّ اللهَ (عَزَّ وجَلْ) لاَيَستَجيبُ دُعاءً مِنْ قَلبٍ غافِلٍ** ))[3]،

واتە: بپاڕێنەوە لە خوداو کە دوعاتان کرد، دڵنیابن لە قەبوڵبوونی، وە بشزانن کە بەڕاستی خودای گەورە نزا لە دڵێکی غافڵ و بێئاگا وەرناگرێت.

سوفیانی کوڕی عویەینە فەرموویەتی: نەفسی ئێوە حەزی بە هەرچییەك هەبێت، با لە پاڕانەوەدا لێی نەگرێتەوەو داوای بکات، چونکە خودای گەورە تەنانەت داوای خراپترینی دروستکراوانی خۆی وەرگرتووە کە شەیتانە، وەك دەڵێت: ﴿**رَبِّ فَأَنْظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ، قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنْظَرِينَ**﴾ (٣٧/الحجر) پەروەردگارم، بمهێڵەوە و مۆڵەتی ژیانم پێبدە تا ڕۆژی زیندوبوونەوە، فەرمووی: ئوا بڕیارماندا تۆ دەمێنیت و، ئەو مۆڵەتی ژیانەت پێدەدرێت .

**هەشتەم: دەبێ زۆر نزاو پاڕانەوەکانی بڵێتەوەو، سوور بێت لەسەری و ماندوو نەبێت، سێ جار دوپاتی بکاتەوە:**

ئیبنو مەسعود (خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

---

(١) رواه البخاري (٦٣٣٩)، ومسلم (٢٦٧٩).

(٢) رواه مسلم (٢٦٧٩).

(٣) رواه الترمذي (٣٤٧٩).

پێغەمبەرﷺکەنزای بکردایە، سێ جار دووپاتی دەکردەوەو داوایەکیشی بکردایە سێ جار داواکەی دووبارە دەکردەوە.[١] نابێت پەلە بکات و بڵێت: ئەوە بۆچی خودانەهات بەهاوارمەوە،چونکە پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: ((**یُستَجابُ لأحَدِکُم ما لَم یُعَجِّلْ فَیقول: دَعَوتُ فَلَم یَستَجِب لي**))[٢] نزاو داوای هەریەکەتان وەردەگرێت، مادەم پەلە نەکات و بڵێت: من داوام کردوو دیارە قەبوڵی نەکردووە، ئەو پەلە کردنە بێ متمانەیی دەگەیێنێت. وە ئەگەر داوایشت کرد، داوای شتی زۆر بکە، چونکە تۆ داوا لەزاتێکی سەخی و بەرێز دەکەیت،

**هەندێك لە زانایان فەرموویانە**: ماوەی بیست ساڵ دەبێت داوام لە خودا کردووەو هێشتا جێبەجێی نەکردووە و هیوا بڕاویش نەبووم، وداواکەیشم ئەمەیە کە خودا ئەوەندە یارەمەتیم بدات، وازلەو شتانە بهێنم کە پەیوەندیان بەمنەوە نیە، با سەرقاڵی بابەتێك نەبم کە پەیوەندیان بە منەوە نەبێت [٣]،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**إذا سأَلَ أحَدَکُم رَبَّهُ مسألَةً، فتَعرَّفَ الإجابَةَ، فلْیَقُل: الحَمدُ للهِ الذي بِنِعمتهِ تَتِمُّ الصالِحات، ومَنْ أبطَأَ مِنهُ ذلِكَ شَيْءٌ، فَلْیَقُل: الحَمدُ للهِ على كلِّ حالٍ** ))[٤]، ئەگەر یەکێکتان داوایەکی لە پەروەردگاری کرد وبۆی دەرکەوت یان کەوتە دڵیەوە کە نزاکەی وەرگیراوە، با بڵێت: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە هەرچی کاری باش و چاك هەیە بە هۆی نیعمەتی ئەوەوە بە ئەنجام دەگات، وە ئەگەر ماوەیەك درێژەی خایاندو بۆی جێبەجێ نەبوو، ئەوا با بڵێت: حەمدو سەنا بۆ خودا لەسەر هەموو حاڵەتێك.

---

(١) رواه مسلم ١٧٩٤).

(٢) رواه البخاري (٦٣٤٠)، ومسلم (٢٧٣٥).

(٣) هو مؤرق العجلي رحمه الله، روى هذا الخبر أبو نعيم في الحلية(٢/٢٣٥).

(٤) رواه البيهقي في الأسماء والصفاة،ص/١٧٢ كماتروي السيدة عائشة عن رسول الله ﷺ كما رواه ابن ماجه(٣٨٠٣) إذا رأى مايحب قال: الحمدلله ...إلخ وإذا رأى مايكره قال: الحمد لله على كل حال.

**نۆیەم: دەبێ پاڕانەوەکەی بە ناوی خودای(عَزَّ وجَلَّ)وە دەست پێبکات:**

نابێت یەکسەر بە داواکەی دەست پێبکات. حەزرەتی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دەفەرموێت: نەمبیستووە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ کە هەرگیز دەستبە دوعایەك بکات، تەنها بەم شێوە دەستی پێدەکرد:((**سُبحانَ رَبِّيَ العَلِيِّ الأَعلَى الوَهَّاب**))پاکوخاوێنی بێکەموکوڕی بۆپەروەردگاری بەرزوبالاترین وبەخشندەیە[1]

ئەبو سولەیمانی دارانی (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:

هەرکەسێك ویستی داوایەك لە خودای (عَزَّ وجَلْ) بکات، با لە پێشەوە صڵاواتێك لە پێغەمبەر ﷺ بدات، لە پاشان داواکەی بکات، لە دوای تەواو بوونی دوعاکەیشی صڵاواتێکی تر لە پێغەمبەر ﷺ بدات، چونکە خودای گەورەو میهرەبان هەردووصڵاواتەکە وەردەگرێت، لەوەیش بەرزو بەڕێزترە کە ناوەندەکەی(نێوانی هەردووصڵاواتەکەی وەرنەگرێت کە نزاو داواکاریەکانە[2]،

دەگێڕنەوە لە (حەزرەتی) پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی:(( **إذا سأَلْتُمُ اللهَ (عَزَّ وجَلْ) حاجةً، فابدَؤوا بالصَّلاةِ عليَّ، فإِنَّ اللهَ تعالَى أَكرَمُ مِن أَن يُسأَلَ حاجَتَينِ فَيقضِيَ أَحَدَهُما ويرُدَّ الأُخرى**))[3]. واتە: ئەگەر داوای کارێکتان لە خودا کرد لەسەرەتاوە صڵاوات لە دیدارم بدەن، چونکە خودای گەورە لەوە بەڕێزو

---

(١) رواه أحمد في مسنده(٥٤/٤)(١٦١١٣) . والحاكم (٤٩٨/١) .(١٨٣٥) وقال صحيح الإسناد.

(٢) انظر: مطالع المسرات ص/٣٦، وزاد تمام كلامه حيث قال: **وكل الأعمال فيها المقبول والمردوود، إلا الصلاة على النبي ﷺ فإنها مقبولةٌ غير مردودة.**

(٣) رواه أبو طالب المكي في القوت٦/١، وقال العراقي إنه موقوف على أبي الدرداء رضي الله عنه قال الزبيدي٤١/٥: وهو وان كان موقوفا فهو شاهد لقول الداراني، ومما يؤيده أيضا ما اخرجه أبو داود عن فضالة قال: **سمع النبي ﷺ رجلاً يدعو في صلاته ولم يُمجِّد الله ولم يُصل على النبي ﷺ فقال: عَجِلَ هَذا، ثم دعاه فقال: إذا صلى أحدكم فليبدأ بتحميد**

به سۆزتره کەدوو پێداویسی لێداوا بکرێت یەکێکیان جێبەجێ بکات ودواتریان ڕەدبکاتەوە.

## دەیەم: ئەوەیە خاوەنی ئەدەب و ڕەوشتێکی شاراوە بێت:

کە ئەصڵ لە وەرگرتنی نزاکان بۆ ئەو ئەدەبە دەگەڕێتەوە کە بریتییە لە تەوبەکردن و گێڕانەوەی هەر زوڵم و زۆرێك لە هەرکەسێکی کردبێت، وە بە تەواوی دڵ و گیانەوە، هیممەتی دەروونی بخاتە کارو، ڕوو لە خودا بکات:

ئەوە دەبێتە نزیکترین هۆکاری وەرگرتنی دوعاکەی، وەك کەعبی ئەحبار (خوای لێ ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوە کە: گرانی و بێبارانیەکی زۆر لە زەمانی (حەزرەتی) موسادا (سەلامی خودای لەسەر) ڕووی کردە ئەو خەڵکە، ئەویش خەڵکەکەی بردە دەرەوە، تا نوێژی باران بارینیان پێبکات، بەڵام باران نەباری، تا سێ جار دەچووە دەرەوە و نوێژی باران بارینیان دەکرد و نەدەباری، خودای گەورە وەحی کرد بۆ (حەزرەتی) موسا (سەلامی خودای لەسەر): ( من نزا نەلە تۆو نەلە ئوممەتەکەت وەرناگرم، کە کەسیدووزوبان و ئاژاوەگێڕتان تێدابێت، (حەزرەتی) موسا (سەلامی خودای لەسەر) فەرمووی: ئەی خودایە؛

ئەو کەسە کێیە با لە ناو خۆماندا دەری کەین؟ خودای (عَزَّ وجَلَّ) نیگای بۆ کرد، ئەی موسا ؛ من کە ڕێگریتان لێدەکەم قسەو نهێنی یەکتری بۆ یەك بکەن،چۆن خۆم ئەو کارە بکەم؟! بۆیە حەزرەتی موسا بە بەنی ئیسرائلییەکانی فەرموو: هەمووتان پاشگەز ببنەوە و، واز لە دووزوبانی بهێنن و، بگەڕێنەوە بۆ لای خودای خۆتان، ئەوانیش تەوبەیان کرد و، خودایش بارانی بۆ باراندن.

**سەعیدی کوڕی جوبەیر (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:**

---

اللهِ والثناء عليه، ثم يصلي على النبي ﷺ ثم يدعوا بما شاء، ورواه النسائي وزاد فسمع النبي ﷺ رجلا يصلي فمجَّد الله وحمده وصلى على النبي ﷺ فقال ادعُ تُجَب وسَلْ تُعطَ.

له چەرخی یەکێك له پادشاکانی بەنی ئیسرائیلدا، گرانیەك ڕووی له خەڵکی کرد، داوای باران بارینیان کرد و نوێژیان بۆ دەکرد، مەلیکەکە بە (بەنی ئیسرائیلی) وت: یان دەبێت خودای گەورە بارانی ئاسمانمان بۆ بنێرێت، یان ئەزێتی دەدەین، وتیان: چۆن دەتوانیت ئەزێتی خودا بدەیت کە ئەو بەرزو باڵایە، واتە دەستی کەس پێی ناگات؟! پادشا وتی: لێرە دۆست و ئەولیاو ئەهلی تاعەتی ئەو خودایە دەکوژم، بەمە خودا پێی نیگەران دەبێت، دەڵێت: لەپاشان خودای گەورە ئاسمانی بۆ کردنەوە و بارانی بۆ باراندن[١].

سوفیانی سەوری(خوای لێی خۆش بێت)فەرموویەتی. بەنی ئیسرائیلیەکان حەوت ساڵ بێبارانیان بەسەردا هات و، دوچاری قات و قڕی هاتن، وایان لێ هات کە لە زبڵخانە شتیان دەخوارد و، گۆشتی منداڵیان دەخوارد، بەم حاڵەشەوە دەچوونە سەر چیاکان و دەگریان، خودای گەورە وەحی کرد بۆ پێغەمبەرەکانیان (سەلامی خودایان لەسەر): ئەگەر بە پێی خۆتان بێن بۆلام و، ئەوەندە ماندووبن تا پێ و ئەژنۆتان ناسك ببێتەوە، نەتوانێت هەڵتان بگرێت، وە ئەوەندە بەرزببنەوە بۆ سەرکەژەکان، تا خەریك بێت دەستان بگاتە ئاستی ئاسمان، وە ئەوەندە بپاڕێنەوە، تا زوبانتان لاڵ ببێت، ئەوا من وەڵامی نزاو دوعاکانتان نادەمەوە، وە بەزەییم بە گریانەکانتاندا نایەتەوە، هەتا ئەو موڵك و ماڵەی کە زەوتتان کردووەو داگیرکردووە نەیگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان، دوای ئەوەی ئەم کارەیان ئەنجامدا، خودایش بارانی بۆ باراندن.

**مالیکی کوڕی دیناریش (خوای لێی خۆش بێت) دەفەرموێت:**

نەتەوەی بەنی ئیسرائیلی دوچاری قات وقڕی و بێبارانی هاتن، چەندین جار

---

(١)ئەو کەسە تایبەتیانە لە دۆستانی خوا، کاتێك بە لێبڕانەوە داوایان لە خودا کرد، خوایش بارانی بۆ باراندن، نەك لەبەر هەڕەشەی مەلیکەکە، بەڵکو لەبەر نیەت پاکی ئەولیاکان و خۆشەویستی خودا بۆیان، رواه أبو نعیم فی الحلیة (٢٨٢/٤).

دەرچوونەدەرەوەی شار بۆ نزاو پاڕانەوە، خودای گەورە نیگای فەرموو بۆ پێغەمبەرەکەیان، کە پێیان ڕابگەیێنێت، کە ئێوە بە جەستەیەکی پیسەوە دێن بۆلای من، وە دەستێك بۆ دوعا بەرز دەکەنەوە، کە خەڵتانی خوێن ڕشتنتان کردووە، وە ناوسکی خۆیشتان بە حەرام پڕ کردووە، ئێستا بزانن کە تووڕەییم زۆر زیاتر بووە لەسەرتان، وە بەم شێوە تابێت زیاتر لێك دووردەکەونەوە[1]،

ئەبوصددیقی ناجی فەرموویەتی:(حەزرەتی)سولەیمان بۆ داوای باران بارین بە خۆی و نەتەوەکەیەوە چووە دەرەوەی شار، تێپەڕی بەلای مێرویەکدا، بەپشتاکەوتبوو،وەپەلوپۆی بەرزکردبوویەوە بۆئاسمانودەیوت:ئەی پەروەردگار؛ ئێمەیش بەشێکین لە دروستکراونی تۆ، پێویستیمان بە ڕزق و بژێوی تۆ هەیە، ئێمە بە گوناهی ئەوانی ترمەفەوتێنە،(حەزرەتی)سولەیمان فەرمووی: بگەڕێنەوە خودا بە دوعا و نزای غەیری ئێوە بارانی بۆ باراندن، نزای لەوان وەرگرت[2]،

ئەوزاعی دەفەرموێت: خەڵکەکە چوونە دەرەوە بۆ نوێژی باران بارین، بیلالی کوڕی سەید هەستا لە ناویانداو حەمدو سەنای خودای کردو، فەرمووی: ئەی ئامادەبوان:

ئایا ئێوە داننانێن بە خراپەو تاونکاری خۆتاندا، وتیان: وەڵلا ڕاستە و دانی پیادەنێین، فەرمووی: ئەی پەروەردگار؛ ئێمە گوێمان لەوئایەتە بووە کە تۆ فەرمووتە: ﴿مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِنْ سَبِيلٍ﴾ (التوبة/٩١)

کەسی چاکەکار و خاوێن گلەیی لێ ناکرێت، ئێمە دانمان ناوە بە گوناهبا ریماندا، ئەی لێخۆش بوونی تۆ بۆ ئێمەی گوناهبار نەبێت بۆ کێیە؟ کەواتە ئەی خودایە؛ لێمان خۆش ببە، بەزەییت بێتەوە پێماندا، ئاواشتەیشمکان بکە، دەستی بەرزدەکردەوە و ئەوانیش دەستیان بەرزکردەوە، تا بارانی بۆ

---

(١) رواه أبوداوود في الزهد (١٣).

(٢) رواه ابن أبي شيبة في المصنف (٣٠١٠١)وأبو نعيم في الحلية ١٠١/٤.

باراندن[1].

به مالیكی كوڕی دیناریان وت: له خزمەت پەروەردگارتدا دوعامان بۆ بكە، فەرمووی: ئێوە دەڵێن ئەوە بۆ چی باران نابارێت، منیش دەڵێم:
ئەوە چۆنە كە تا ئێستا خودا ڕەحمی پێكردوین و بەردبارانی نەكردووین؟![2]،

دەگێڕنەوە حەزرەتی عیسا(صەلات و سەلامی خودای لەسەر)دەرچووە دەرەوە بۆ دوعای باران بارین، كاتێ گەیشتنە دەشتەكەوە،(حەزرەتی) عیسا (سەلامی خودای لەسەر) پێی فەرموون: ئەوەی تووشی گوناهێك بووە با بگەڕێتەوە، هەموویان گەڕانەوە تەنها پیاوێك لە لاپەڕیانەوە مابوو، ئەو مایەوە، (حەزرەتی) عیسا(سەلامی خودای لەسەر)فەرمووی:ئەوەتۆ هیچ گوناهێكت نیە؟

فەرمووی: وەڵلاهی نازانم گوناهم كردبێت، جگە لەوە نەبێت، كە ڕۆژێكیان نوێژم دەكرد، ئافرەتێك تێپەڕی بە بەردەممدا، بەم چاوەم سەیرێكم كرد، كاتێك كە تێپەڕی، دەستم كرد بە ناو چاومدا وئەوەندەی بەدەستمەوە هات دەرم هێنا، و فڕێمدا بە دوای ئافرەتەكەدا، (حەزرەتی) عیسا فەرمووی:
كەواتە تۆ دوعا بكەو با منیش ئامینت بۆ بكەم، دەفەرموێت: ئیتر ئەو دوعای كرد و ئاسمان بریسكەی داو، هەورگرماندی و بارانیش داباری بەسەریاندا.[3].

هەروەها یەحیای غەسسانی دەفەرموێت: گرانی و بێبارانیەك ڕووی كردە ئەو خەڵكەی لە زەمانی (حەزرەتی) داوودا بوون(سەلامی خودای لەسەر) سێ لە زاناكانیان هەڵبژارد بۆ ئەوەی بچنە دەرەوە و، داوای باران بارین بكەن، كە چوون؛ **یەكێكیان فەرمووی:**

خودای گەورە؛ تۆ لە تەوراتدا فەرمانت پێكردووین؛ كە لەوانە خۆش

---

(١) رواه إبن أبی حاتم في تفسيره (١٠٧٠١).

(٢) رواه أحمد في الزهد(١٨٩٨)، والدينوري في المجالسة وجواهر العلم(ص/١٢٥).

(٣) رواه عبد الرزاق في المصنف (٩٤/٣، والطبراني في الدعاء (٩٦٦) وابن عساكر في تأريخه ٤١١/٤٧.

ببین که زوڵمیان لێکردووین، دەی خودایە ئێمە زوڵممان لە خۆمان کردووە، تۆیش لێمان خۆشبە،

**دووهەمەکەیشیان فەرمووی:** ئەی خودایە؛ تۆ لە تەوراتدا فەرمانت بۆ ناردوینەتە خوارەوە، کە گەردنی کۆیلە و بەندەکانمان ئازاد بکەین، دەی خودایە گیان؛ ئێمە هەموو کۆیلەی ڕاستەقینەی تۆین گەردنمان ئازاد بکە.

**سێهەبیان فەرمووی:**ئەی خودایە؛ لە ناو تەوراتدا فەرموودەی خۆتت ناردۆتە خوارەوە،کەنابێت دەستبەڕووی هەژارەوەبنێین، کە لە بەردەرگاماندا ڕاوەستان، یا ڕەببی ئێمە هەژارونەداری بەرقاپی تۆیـــن، دەرمان مەکـــەو دەستی ڕەحمەت مەنێ بەڕومانەوە، داواکەمان وەربگرە، ئیتر خوای گەورە بارانی بۆ بارانن[1]،

عەطائی سوللەمی فەرموویەتی : خوای گەورە ماوەیەك بارانی لێگرتینەوە و، دەرچووینە دەرەوە بۆ نوێژە بارانە، دیمان (سەعدوونی مەجنوون)کە بەشێت ناسرابوو، لە گۆڕستانەکاندایە، سەیرێکی کردم و فەرمووی:

ئەی عەطاء؛ ئەوە ڕۆژی حەشرە وا ئەو خەڵکە کۆبوونەتەوە،؟ ئایا ئەوانەی ناو گۆڕەکان زیندووبوونەتەوە؟ وتم: نەخێر، ئەوەندە هەیە بارانمان بۆ نەباریوەو، دەمانەوێت داوا لە خودا بکەین بۆ باران بارین، فەرمووی:

ئەی عەطاء؛ بەو دڵانەوە دەپاڕێنەوە کە پەیوەستن بە زەویەوە، یان بە دڵە ئاسمانیەکانەوە؟ واتە بە تەوبە و ئیخلاصەوە، وتم: بەو دڵە ئاسمانیانەوە، فەرمووی: زۆر دوورە ئەی عەطاء! بەوانە بڵێ کە لە گۆماوی بەتاڵدا مەلە دەکەن و درۆدەکەن،ئەوەی کەچاودێریان دەکات بیناو ئاگادارە، لە پاشان بە تیلەی چاوی سەیرێکی ئاسمانی کرد و فەرمووی: ئەی خودای من؛ ئەی گەورەو سەروەرم؛ وڵاتەکەی خۆت بە هۆی گوناهباری بەندەکانتەوە لەناومەبە ، بەڵام داوات لێدەکەم، بەو سیڕرە شاراوەی لە دووتوێی ناوە پیرۆزەکانتدایە، شاردوو

---

(١) رواه ابن أبي الدنيا في التوبة (ص/١٣٩، عن سعيد بن سنان الحمصي.

نتەتەوە لە بەرچاوی غافڵەکان، وە ئەو پەردانەی داوتە بەسەر نیعمەتەکاندا کە هەموو کەس لە تۆیان ناناسێت، داوات لێئەکەم هەر ئێستا بارانمان بۆ ببارێنە، ئاوێکی گشتگیری ئاودێری باش، کە بەندەکانی پێ بژێتەوەو وڵاتەکەی پێ ببوژێتەوە، ئەی ئەو زاتەی کە توانات بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێتەوە.

عەطاء دەفەرموێت: قسەکانی تەواو نەکرد، هەتا ئاسمان هەورەگرمەو بزیسکەی لێ پەیدابوو، شریخانی و وەك دەمی کوندە و شەربە بارانی بۆ بارانین.

ئەویش پشتی هەڵکرد و لەبەر خۆیەوە دەیفەرموو:[1].

نِعمَ الزَّاهِــدونَ والعابِـدونا　　إذْ لِمَـولاهُم أجـاعوا البُطـونا

أَسْهَروا الأَعيُنَ العَليلَةَ حُـبًّا　　فانْقَضَى لَيلُهُم وهُم ساهِرونَا

شَغَلَـتهُــم عِبــادَةُ اللهِ حتَّى　　حَسِبَ النَّاسُ أَنَّ فيهِمْ جُنونا

[ لەحزوری ڕۆحی هەردوو زانا حەزرەتی غەزالی وسەعدونی داناشەیدادا دەڵێم:

باشترین دونیا نەویست و چاکتــرینی عـابیــدە

وا کە مەولا لا وەلا بێ، نەك سکی تێر و گــەدە

شەو بە بێداری بە چاوی پڕ لە ئێش و ئەشکەوە

دڵ لە بۆ عەشقی حەقیقی جێژوان و مەرقەدە

ئەو کەسەرقاڵی فەنایە، لەو جیهانی حەزرەتـــــە

پێی دەڵێ شێتە! خودایـە؛ چەندە نـابووت و بەدە

لـەم هەراو بــەزمی زەمـانە مەرجــە تا ڕۆژی فەنا

(ئەحسەن)ە عەهدو بەڵێنی تا کو بەردی ئەلحەدە

دیــن و مینهــاج و عەقیدەم لەو چـرا بــێ، بێ چرا؟

نەخڵــەتابــی دەس لە چـاکی چاکـەکاران بەر مەدە ][2].

(١) رواه ابن حبيب في عقلاء المجانين، ص/١١٤.

(٢) هۆنراوەی بەندە (ئەحسەن) ٢٠١٦/٨/٢٧، مەولانا

**عەبدوڵلای کوڕی موباەك فەرموویەتی:**

لەساڵێکی زۆر بێبارانی و گرانیدا هاتمە شاری مەدینە، خەڵکەکە دەرچووبوون بۆ داوای باران بارین، منیش لەگەڵیان دەرچووم. بینیم غوڵامێکی ڕەشپێست هات وخراپترین قوماشی کەتانی لەبەردابوو. پارچەیەکیشی بەستبوو بەملیەوە، لەتەنیشتمدا دانیشت، گوێم لێبوو فەرمووی: ئەی خوای من، ڕوخسارەکان بە هۆی گوناهی زۆرو کردەوەی خراپەوە تەڕو پتورکاون، تۆیش بارانت لێ گرتوینەتەوە، بۆ ئەوەی بەندەکانت فێری داب و ئصوڵیان بکەیت، منیش داوات لێدەکەم: ئەی خاوەن حیلم و خۆڕاگری، ئەی ئەو زاتەی کە بەندەکانی جگە لە جوانی هیچی تریان لێی نەبینیوە، داوات لێدەکەم هەر لەم ساتەدا بارانیان بۆ ببارێنیت،ئەم ساتە ئەم ساتە. ئەوەندە ئەم ساتەی دووبارە کردەوە تا هەور ئاسمانی داگرت و،لە هەموو لایەکەوە باران دایکرد.

ئیبنو موبارەك دەفەرموێت: هاتم بۆلای فوضەیلی کوڕی عییاض، فەرمووی: ئەوە چییە بە خەفەتباری دەتبینم. وتم: کەسێکی دیکە جگە لە ئێمە پێشمان کەوت و بەبێ ئێمەو لەبەر خاتری ئەو خوای گەورە کارەکەی بۆ جێبەجێ کردین، کاتێك بەسەرهاتی بەندەکەم بۆ گێڕایەوە فوضەیل هاوارێکی لێبەرزبوویەوەو کەوت بە ڕوداو بێهۆش کەوت.[1] ،

(حەزرەتی) عومەریش داوای باران بارینی بە خاتری(حەزرەتی) عەباس کرد (رضيَ الله عنهما) مامی پێغەمبەر ﷺ. کاتێ (حەزرەتی) عومەر لە دوعاکەی لێبوویەوە (حەزرەتی) عەباس(خودای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: خودایە؛

هەر بەڵایەك هاتبێتە خوارەوە بە هۆی گوناهەوە بووە، وە لایش نەچووە بە تەوبەنەبێت، ئەمانە منیانکردووە بە تکاکار لە حزورتا، لەبەر نزیکیم لە پێغەمبەرەکەتەوەﷺ،دەستمان بەگوناهەوەو ناوچەوانمان بەتەوبەوە،جەنابت

---

(١) رواه الدينوري في المجالسة، ص/٣٩٢، وابن الجوزي في (المنتظم) ضمن خبر طويل.

شوانیت و ونبووەکانت فەرامۆش ناکەیت،پشت شکاوەکان لە جێگەی وێرانەدا زایە ناکەیت و لێیان دەپرسیتەوە، بچووك بێنازوکزۆڵن و گەورە دڵناسك و دەنگی هەموان بەسکاڵاوە لە حزورتدایە. ئاگات لە نهێنی و شاراوەکانە. ئەی خودای فریارەس فریایان بکەوە، پێش ئەوەی نائومێد ببن و بە هیلاکدا بچن، جگە لە کافرەکان کەس لە رەحمەتی خودا بێهیوا نابێت. دەفەرموێت:

هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو،خودای گەورە وەك چیاکان بارانی بۆ نارد[1]،

## گەورەیی صلاوات وباسی فەزڵی پێغەمبەری خودا ﷺ

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ (٥٦/الأحزاب)

بێگومان خوداو فریشتەکانی سلاوات ئەدەن لە پێغەمبەر، واتە خودا رەحمەت دەرێژێ بەسەریا و فریشتەکانی داوای لێبوردنی بۆ لێ دەکەن، دەسا ئەی خاوەن باوەڕەکان! ئێوەیش صەڵاواتی لێبدەن و سەلامی لێبکەن بە سەلامکردن بە دڵ و بە زوبان[2]

دەگێرنەوە کە رۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هاتە ناو صەحابەکان و مژدە و شادی بە روخساریەوە دیار بوو، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

---

(١)قال حسان بن ثابت رضي الله عنه: **سأل الخليفة إذ تتابع جَدبه * فسقوا الغمام بدعوة العباس* عم النبي وصنو والده الذي* ورث الثناء بذاك دون الناس أحيا المليكُ بهِ البلادَ فأصبحَت*مُخضرَّةَ الأجناب بعَد اليَاس.** وأصل القصة في البخاري عن أنس بن مالك (رضي الله عنه)أن عمربن الخطاب كان إذاقحطوا إستسقى بالعباس بن عبدالمطلب ويقول: **اللهم إنا كنا نتوسل إليك بنبينا فتسقينا، وإنا نتوسل إليك بعم نبينا فاسقنا، قال: فيسقون.** من غير ذكر دعاء العباس رضي الله عنه وقد انفرد البخاري بإخراجها، ورواه بلفظه الدينوري في المجالسةص/١٢٤، وابن عساكر في تأريخ دمشق٣٥٨/٢٦.وكان ذلك في عام الرمادة،

(٢) خوڵاصه (٤٢٦).

((إنَّه جَاءني جبريل عليهِ السَّلام فقالَ: أمَا تَرضَى يا مُحمَّد ألاَّ يُصَلِّي عَليكَ أحدٌ مِنْ أمَّتِك صَلاةً واحِدةً، إلاَّ صلَّيتُ عليهِ عَشْراً، ولاَ يسلِّمُ عليكَ أحدٌ مِنْ أمَّتِكَ إلاَّ سلَّمتُ عليهِ عَشْراً))[1]

واته: جوبرەئیل (سەلامی خودای لەسەر) هات بۆ لام و فەرمووی: ئایا بەوە رازی نابێت و دڵخۆشت ناکات کە یەکێك لە ئوممەتت یەك صەڵەواتت لێبدات، ئەوا (خودادەفەرموێت) بە دە بەرابەر پاداشتی دەدەمەوەو ڕەحمەتی بۆ دەنێرم، وە هەرکەسێك سەلامێکت لێبکات، دەجار سەلامی لێدەکەمەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ صَلَّى عليَّ ..صَلَّت عَلَيهِ المَلائِكَةُ مَا صَلَّى عليَّ، فَلْيُقِلَّ عَبدٌ من ذلِكَ أو ليَكثر))[2] ئەوەی صڵاوات لەسەر من بدات، تا ئەو بەردەوام بێت، مەلائیکەیش بەردەوام صڵاواتی لەسەر دەدەن، جا بە ئارەزووی خۆی کەمی دەکات، یان زۆری دەکات مەیلی خۆیەتی.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

((إنَّ أولَى النَّاسِ بي، أكثَرُهُم عليَّ صلاةً))[3]،واته: ئەوانەی لەدوارۆژدا لەهەموو کەس بەمن نزیکترو لەپێشترن، ئەوانەن زیاتر صڵاواتم لەسەر دەدەن. هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتیك(( بِحَسبِ المؤمِنِ مِنَ

---

(١) أخرجه النسائي ٤٤/٣(١٢٩٥)، وابن حبان في صحيحه(١٩٦/٣(٩١٥) باسناد جيد.

(٢)قال العراقي رواه ابن ماجه (٩٠٧)من حديث عامر بن ربيعة باسناد ضعيف، والطبراني في الأوسط ١٨٢/٢(١٦٥٤) باسناد حسن اهـ قال الزبيدي٤٨/٥: ورواه البيهقي في شعب الإيمان ٢١١/٢(١٥٥٧)من حديث عامر بن ربيعه بلفظ: **من صلى علي صلاة صلت عليه الملائكة ما صلى علي فليقلل عبدٌ ذلك أو ليكثر**، وعن أبي طلحة بلفظ: **من صلي علي واحدة صلي الله عليه عشراً، فليكثر عبد من ذلك أو ليقل**، وروى الطبراني في الكبير وأبو نعيم في الحلية،١٨٠/١ والضياء في المختارة(١٨٩/٨(٢١٦) من حديثه بلفظ: **ما من عبد يصلي علي إلاّ صلت عليه الملائكة ما دام يصلي، فليُقل العبد من ذلك أو ليكثر.**

(٣) أخرجه الترمذي (٤٨٤) من حديث ابن مسعود وقال: حسن غريب، ولفظه: **أولى الناس بي**

**البُخلِ، أَنْ أُذكَرَ عِندَهُ فَلاَ يُصَلِّي عَلَيَّ))**[1] باشترین بەڵگە لەسەر بەخیلی و ڕژدی کەسێك ئەوەیە، کە ناوی من لەلایدا ببرێت و گوێ بیستی ناوی من ببێت و صڵاواتم لەسەر نەدات. هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((أَكثِروا مِنَ الصَّلاةِ عليَّ يَومَ الجُمُعَةِ))**[2]،

واتە: لە شەوو ڕۆژی جومعەدا زۆرتر و زیاتر صڵاواتم لەسەر بدەن.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(( مَنْ صلَّى عليَّ مِن أُمَّتي، كُتِبَت لَه عَشرُ حسَنَاتٍ، ومُحيَتْ عنهُ عَشرُ سَيِّئاتٍ))**[3]، ئەوەی لە ئوممەتی من صڵاواتم لەسەر بدات، دە چاکەی بۆ دەنوسرێت و دە خراپە و تاوانیشی لەسەر دەکوژێتەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:**((مَنْ قالَ حينَ يَسمَعُ الأَذانَ والإقامَة، اللَّهُمَّ ربَّ هذهِ الدَّعوةِ التَّامَّة والصَّلاةِ القَائمَة صَلِّ على مُحمَّدٍ عَبدِكَ ورَسُولِكَ، وأعطِهِ الوَسيلَةَ والفَضيلَة والشَّفاعَة يـــوْمَ القِيـــامَة، حلَّـــتْ لهُ شَفاعَتي)**[1] ئەوەی کە گوێی لە بانگ و قامەتەوە بێت و بڵێت: ئەی خودایە؛

---

**يوم القيامة أكثرهم علي صلاة**،وابن حبان قال الزبيدي ٤٩/٥: وكذا رواه البخاري في التأريخ (١٧٧/٥)(٥٥٩)، وقال: صحيح.

(١) أخرجه القاسم بن أصبغ من حديث الحسن بن علي هكذا، والنسائي في السنن الكبرى(٣٤/٥)(٨١٠٠) وابن حبان في صحيحه(١٨٩/٣)(٩٠٩) من حديث أخيه الحسين: **(البخيل من ذُكِرتُ عندَه فلَم يُصَلِّ عليَّ)**، وراه الترمذي (٣٥٤٦) بلفظ: **رَغِم أنف رجُلٍ ذُكرتُ عند فلم يصلِّ عليَّ**، وقال حسن صحيح.

(٢) رواه أبو داوود (١٠٤٧)، والنسائي(٩١/٣) وابن ماجه(١٦٣٧). وابن حبان في صحيحه(١٩٠/٣)(٩١٠)، والحاكم في المستدرك (٤١٣/١)(١٠٢٩)، وقال صحيح على شرط البخاري، من حديث أوس بن أوس.

(٣) أخرجه النسائي في اليوم والليلة(ص/١٦٦)(٦٤). من حديث عمير بن دينار، وزاد فيه: **مخلصامن قلبه، صلى الله عليه بها عشر صلوات، ورفعه بها عشر درجات**، وله في السنن(١٢٩٧)، ولإبن حبان في صحيحه(١٨٧/٣)(٩٠٦)، من حديث أنس نحوه.

ئەی خودایە: خاوەنی ئەم بانگ و بانگەوازە تەواو و ئەم نوێژە پیرۆزەی کە هاتۆتە پێشەوە، ڕەحمەت و میهرەبانی خۆت بڕژێنە بەسەر (حەزرەتی) موحەممەدی بەندە و نێرراوی خۆت، وە هەردوو مقامی پیرۆزی وەسیلە و فەزیلەی پێببەخشە، کە پلەو پایەی ئەوەندە بەرزبێتەوە، تا لە دوارۆژدا زیاتر تکاکاریمان لە حزورتدا بۆ بکات، ئەوەی ئەم نزایەی دوای بانگ و قامەت و هەستانەوە بۆ نوێژ بخوێنێت،ئەوا شەفاعەتی من بۆ خۆی مسۆگەر دەکات.(٢) ،

(١)حديث جابر الذي رواه البخاري(٦١٢)ولفظه: **من قال حين يسمع النداء اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت محمداً الوسيلة والفضيلة وابعثه مقاماً الذي وعدته. حلت له شفاعتي يوم القيامة** وهكذا رواه الطبراني في الأوسط(١٩٦) و رواه أحمد ومسلم واصحاب السنن الأربعة وابن خزيمه وابن حبان و رواه الدار قطني في الأفراد من حديث بلفظ: **من قال إذا سمع النداء: اللهم رب هذه الدعوة التامة آت محمداً الوسيلة وأبعثه المقعد المقَرَّب الذي وعدته وجبَت له الجنة.**

وللمستغفري في الدعوات بسند ضعيف من حديث أبي رافع : **كان رسول الله ﷺ إذا سمع الأذان، فذكر حديثا فيه: وإذا قال قد قامت الصلاة قال: اللهم رب هذه الدعوة التامة** و......وزاد: **وتقبل شفاعته في أمته.** ولمسلم (٣٨٤) من حديث عبدالله بن عمرو:
**إذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل مايقول المؤذن. ثم صلوا عليَّ، ثم سَلوا الله لي الوسيلة،** وفيه: **فمن سأل الوسيلة حلَّت عليه شفاعتي. چ بەڵگەیە لە مە بەهێزتر دەبێت ، کە پێویستی کردووە دوای بانگ کە وەڵامی بڕگەکانی بانگ دەدرێتەوە. صەڵەواتیش لەسەر پێغەمبەر ﷺ بوترێت و بخوێنرێت، خۆ لە ناو بانگەکەدا صڵاواتی تێدا نیە. ئەی بۆچی دەفەرموێت: ثم صلوا عليَّ: کەواتە ئەوەی لە مزگەوتەکانەوەو موسوڵمانان دەیکەن و صڵاوات لە دیداری (حەزرەت) ﷺ دەدەن، کارێکی باشەو پەیڕەوی کردنە لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ . ئەوەیش کە دەڵێت بیدعەیە، بەڵێ بیدعەیەکی حەسەنەیە، بەڵکوو شوێنکەوتن و جێبەجێ کردنی فەرموودەیەکی پێغەمبەرە ﷺ .**

(٢) ئەمە بۆ خۆی بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی کە پێویستە دوای بانگ و دوای قامەت و هەستانەوە بۆ نوێژ ئەو دۆعای وەسیلە و فەزیلەیە بخوێنرێت، وەك لە ڕیوایەتی موسلیمدا

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((مَنْ صَلَّى عليَّ في كِتابٍ، لَم تَزَلِ المَلائِكَةُ تَستَغفِرُ لَهُ مادامَ إسمى في هذا الكتاب.))**[١]، واتە: ئەگەر نوسراوێکیشت نوسی و دانراوێکت هەبوو، وە صڵاواتت لەسەر پێغەمبەر ﷺ دا، تا ئەو صڵاواتە لە ناو نوسراوەکەتدا بەردەوام بێت، ئەوە مەلائیکەی خودا داوای لێخۆش بوونت بۆ دەکەن.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(( إنَّ في الأَرضِ مَلائِكةً سيَّاحينَ، يُبَلِّغونِي عَن أُمَّتي السَّلام))**[٢].

بە ڕاستی فریشتەی گەڕۆکی خودایی هەیە بەسەر جێگاکاندا دەگەڕێن، سەلامی ئەوانەم پێدەگەیێنن لە ئوممەتەکەم کە سەلامم لێدەکەن.

هەروەها دەفەرموێت: **(( ليسَ أحدٌ يُسَلِّمُ عليَّ إلاَّ ردَّ اللهُ عليَّ روحي، حتَّى أَرُدَّ عليهِ السَّلام.))**[٣]، هیچ کەسێك نیە کە سەلامم لێبکات، ئەوا خودای گەورە ڕۆحەکەم دەگێڕێتەوە بۆ ناو لاشەم ووەڵامی سەلامەکەی دەدەمەوە[٤].

---

باسمان کرد کە پێغەمبەر ﷺ فەرمان دەدات، لە دوای بانگ کە تەواو دەبێت، صڵاوات لەسەر من لێ بدەن، وەك لە پەراوێزی ژمارە ٣ ی لاپەڕەی پێشوودا باسمان کرد.

(١) رواه الطبراني في الأوسط(١٨٥٦) والخطيب في شرف أصحاب الحديث(ص/٣٦)، وابن عساكر في تأريخ دمشق (٨٠/٦).

(٢)رواه ابن حبان في صحيحه(٩١٤)، والنسائي ٤٣/٣.

(٣) رواه أبوداوود (٢٠٤١).بسند جيد.

(٤) ئەم فەرموودە ئەوە دەگەیێنێت : کە بۆ چرکە ساتێکیش لاشەی پێغەمبەر ﷺ بە بێ ڕۆح نایکرێت و هەرگیز ڕۆحی لێ جودا نابێتەوە، کە دەفەرموێت: ڕۆحەکەی دەگەڕێتەوە چەندین واتای تری هەیە، لەوانە: ڕۆحی پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لە حزوری خوادایە، بەبێ تێپەڕبوونی کات و زەمان دەتوانێت ڕۆحەکەی بگەڕێتەوەو لە حزوریشدا بێت، وەك چۆن کەسێك سەیری شتێك بکات و چاوی لێ کلانەکات، ناوەناوەیش چاو دەتروکێنێت، کە هیچ کاریگەری لەسەر بینینەکەی مەبەستیەتی

**وتیان:ئەی پێغەمبەری خودا؛چۆن صڵاواتت لەسەر بدەین؟ فەرمووی: (صەلات و سەلامی خودای لەسەر) بڵێن:((اللَّهُمَّ: صلِ علَى مُحمَّد وعلَى آلِ مُحَمَّدٍ عَبدِكَ، وأزْواجِهِ وذُرِيَّتِهِ كمَا صَلَّيتَ علَى إبراهيمَ وآلِ إبراهيم. وَبارِكْ علَى مُحَمَّدٍ وأزواجِهِ وذُرِيَّتهِ،كمَاباركتَ علَى إبراهيمَ وآلِ إبراهيمَ إنَّكَ حميدٌ مَجيدٌ))**

---

ناکات و، چاویش دەنوقێنێت و دەیشی کاتەوە، کە ئەمە لە دونیایەکدایە کە ڕۆشتنی زەمان تیایدا زاڵە، ئەی لەو دونیادا کە هیچ پێوەرێکی دونیایی نایخوێنێتەوە، وە هیچ ئەقڵێك ناتوانێت لێی حاڵی ببێت، مەگەر ببیبنێت، ئیتر دەبێت، ئەو گەڕانەوە چۆن بێت؟! ئەگەر وانیە: چۆن دەکرێت لە کەمتر لە چرکەیەکدا صەدان هەزار صڵاوات لە (حەزرەت)ﷺ لێدەدرێت، وەڵامی هەموویشیان دەداتەوە، ئەگەر دەڵێیت: بە تەواوی حزوری خودای بەجێهێڵاوە . ئەوە ناگونجێت و محاڵە. ئەگەر هەمیشە لەگەڵ لاشەکەیدا بێت، کەواتە گەڕانەوەی ڕۆح چ واتایەك دەبەخشێت؟! کەواتە پێویستە ئێمە بڕوامان دامەزراو بێت، کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە ئاگاداری هەوادارانیەتی، کە صڵاواتی لێ دەدەن، وە ئاگاداری کردەوەی ئوممەتەکەیشێتی ، کە بێ ئەندازە لەویان بەرفراوانترە، بەڵکو ئاگاداری کردەوەی تەواوی ئوممەتەکانی تریشە، بە چاکەو خراپەکانیانەوە، کە هەرگیز لە ژمارە نایەت، کەواتە دەبێت ئەو ویسعەتی سینەو دەروون و تواناو بینین و، گوێگرتن و بیستنەی پێغەمبەرﷺ لە ئاستێکدا بێت، کە ئەقڵی کۆڵی ئێستەی ئێمە، سەری لەبەر دەرناکات، خۆ ئەگەر پێش بیست ساڵ لەمەوبەر بیانوتایە پارچە شتێك هەیە ناوی (میمۆری)یە و، ملوێنێك کتێب و پەڕاو زیاتر دەگرێت، ڕەنگە بەگژ کابرادا بچوینایەتەوە، چونکە فراوانی تێگەیشتن نەگەیشتبووە ئەو ئاستە، بەڵام سبەینێ ئەگەر بڵێن: ئەو پارچە زۆر بچووکە، صەد ئەوەندە زیاتریش دەگرێت، باوەڕ دەکەین، چونکە نموونەکەیمان دیوە، کەواتە دەبێت بەم شێوەیەش باشتر بڕوا بکەین کە پێغەمبەرﷺ خاوەنی زانیاری هەموو زانستەکانی (ئەوەڵین و ئاخیرینە)، وەك خۆی دەفەرموێت و خودا فێری کردووە، ئیتر تەسلیم بوون باوەڕت دەپارێزێت و، صڵاواتدانی زیاتریش ئاسوودەییت پێدەبەخشێت و،نزیکتریشت دەخاتەوە لە (حەزرەتی) پێغەمبەرەوە.

ئەی خودایە؛ صەلەواتی خۆت برژێنە بەسەر پێغەمبەر ی بەندەی خۆت و ئال و بەیت و خێزان و نەوەکانیدا. وەك درووود و ڕەحمەتی خۆتت ڕژاندووە بەسەر (حەزرەتی) ئیبراهیم و ئالی ئیبراهیمدا، هەروەها بەرەکەتی خۆت برژێنە بەسەر ئالی (حەزرەتی) موحەممەد و خێزان و نەوەکانیدا. وەك چۆن ڕژاندووتە بەسەر (حەزرەتی) ئیبراهیم و ئالی ئیبراهیمدا. کە بەڕاستی هەرتۆی کە سوپاسکراوو شایستەی سوپاس و بەرزی مەجدو دەسەڵات بیت.

**وە دەگێڕنەوە کە (حەزرەتی) عومەری کوڕی خەطاب (خوای لێ ڕازی بێت) لە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ بیستیان کە دەگریا. وە دەیفەرموو:**

**بە خۆم و باوك و دایکمەوە بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خودا؛**

ئەو چڵی دار خورمایەی وتارت لەسەری دەدا، کە خەڵکەکە زۆر بوون. میمبەرێکیان بۆ دانایت، بۆ ئەوەی باشتر گوێیان لە دەنگت بێت، لاسکە خورماکە لەدووری و فیراقی تۆ دەیناڵاند و تامەزرۆی بینینی جەنابتی دوکرد، تا بە دەستی خۆت دەستت هێنا بەسەریدا و ئارام بوویەوە. دەی ئوممەتەکەت زیاتر هەقیانە لەدووری تۆ بگرین و بناڵێنن و بیرت بکەن.

**( بأبي أنتَ وأمِّي يا رَسَولَ اللهِ. لقَد كَانَ لَك جِذعٌ تخطُبُ النَّاسَ علَيهِ. فلمَّا كثُرَ النَّاسُ اتَّخذْتَ مِنبراً لِتَسمَعَهُم. فَحَنَّ الجِذْعُ لفِراقِكَ. حَتَّي جَعَلْتَ يَدَكَ عَلَيهِ فَسَكَنَ.فأُمَّتُكَ أَولَى بالْحَنينِ إليكَ لمَّا فَارَقتَهُم)**[1]،نەوەندە لای خودا ڕێزداریت، ئەوەی گوێڕایەڵی تۆ بێت،ئەوا بە تاعەتی خودا بۆیدەژمێررێت، وەك دەفەرموێت: **﴿مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾** (النساء/٨٠). واتە: هەرکەس بە گوێی پێغەمبەری خودای کردبێت، ئەوە بە گوێی خودای کردووە[2].

**بە خۆم و باوك و دایکمەوە بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خودا:**

---

(١)فحديث حنين الجذع متفق عليه، عند(البخاري) (٩١٨،٣٥٨٣) من حديث جابر وابن عمر

(٢) خولاصەی تەفسیری نامی (٩١).

ئەوەندە لای خودا بەڕێزیت، کە هەواڵی پێ دایت کە لێت خۆش بووە، پێش ئەوەی هەواڵت پێ بدات کە بۆچی وات کردووە، وەك فەرموویەتی:

﴿عَفَا اللَّهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنْتَ لَهُمْ﴾ (التوبة/٤٣). .....خوا عەفووت بکات و لێت خۆش بێت، بۆچی ئیزنت دان لە شوێنی خۆیاندا بمێننەوە

**بە خۆم و باوك و دایکمەوە بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خودا:**

ئەوەندە بەڕێزیت لە حزوری خوادا، کە لە دوای هەموو پێغەمبەرانەوە ڕەوانەی کردویت، بەڵام لە پێش هەموویانە ناوت دەبات، ( وە پەیمان نامە بە هەموویان پڕ دەکاتەوە و ناوی تۆیش دەخاتە پێش هەموویانەوە) و دەفەرموێت:

﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنْكَ وَمِنْ نُوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُمْ مِيثَاقًا غَلِيظًا﴾(الأحزاب/٧) یادی ئەوە بکە کە عەعدو پەیمانمان لە پێغەمبەران وەرگرت کەوا ئەو پەیامەی خودا لە ئەستۆی هەموویانی داناوە بە خەڵکی بگەیێنن،لە تۆیشمان وەرگرت و لە نووح و لە ئیبراهیم و لەمووساو لە عیسای کوڕی مەریەمیشمان وەرگرت و پەیمانێکی توندو سەختمان لێ وەرگرتن[1]

**باوك و دایکم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خودا:**

ئەوەندە فەزڵت زۆرە، تەنانەت ئەهلی ئاگر کە لە ناو شیوەکانی دۆزەخدا دەسوتێن، خوازیای ئەوەن کە گوێ ڕایەڵت بوونایە، دەڵێن: ﴿يَا لَيْتَنَا أَطَعْنَا اللَّهَ وَأَطَعْنَا الرَّسُولَا﴾ (الأحزاب/٦٦).بریا بەگەێی خوداو پێغەمبەرمان بکردایە.

**باوك و دایکم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خودا:**[2]

ئەگەر (حەزرەتی) موسای کوڕی عیمران خودای گەورە بەردێکی کردە موعجیزە بۆی، کە چەندین ڕوباری لێدەربچێت، ئەوە سەرسوڕهێنەر تر نیە لەوەی کە لە نێوانی پەنجەکانتەوە ئاو دەهاتە دەرەوە و هەموان پێی

(١) خۆلاصە(٤١٩). ئایەتی پێشویش بنوارە :هەماان سەرچاوە(١٨٤).

(٢) حدیث نبع الماء من بین أصابعه الشریفة ﷺ عند البخاري (١٦٩) ومسلم (٢٢٧٩).

ئاواشتەدەبوون، صەلات و سەلامی خودات لەسەر

**بە خۆم و باوك و دایكمەوە بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خودا!** ئەگەر (حەزرەتی) سولەیمان(سەلامی خودای لەسەر) خودای گەورە (بای) خستبووە ژێر فەرمانیەوە، رێگەی مانگێك رۆشتن و هاتنی پێدەبڕی، لەوە زیاتر جێگەی سەرسوڕمان نیە كە بوراقی بە تۆبەخشی، تا ئاسمانی حەوتەم پێی رۆیشتیت و هەرئەوبەیانیەش گەڕایتەوەو نوێژت لە ئەبطەحدا كرد صەڵاتی خوات لەسەر[1]

**بە خۆم و باوك و دایكمەوە بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خودا!**

ئەگەر (حەزرەتی) عیسا زیندووكردنەوەی مردووی پێ بەخشرا بوو، ئەوە لەو موعجیزە سەیر تر نیە كە كاوڕە برژاوەكە هاتە قسەو هەواڵی پێدایت كە لێی مەخۆ ژەهراوی كراوە، [2]،

**بە خۆم و باوك و دایكمەوە بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خودا!**

(حەزرەتی) نوح دوعای لە قەومەكەی كرد، و فەرمووی: ﴿رَبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا﴾ (٢٦/نوح) ئەی خودایە؛ كەس لەم كافرانە بەسەر ڕوی زەویەوە مەهێڵە،[3]، خۆ ئەگەر هاوشێوەی دوعای نووح پێغەمبەر دوعات لێبكردینایە، هەموو دەفەوتاین، بەڕاستی پشتیان نەوی كردیت و، ناوسكی حەیوانیان لە كاتی نوێژدا خستە سەرسەرت، ڕۆخسارتیان زامداركرد و خوێنی پێدادەهاتە خوارەوە، وە ددانی پێشەوەی موبارەكیشتیان شەهیدكرد[4]. جگە لە نزای خێر هیچ دوعایەكی شەڕت لێ نەكردن، بەڵكوو فەرمووت: خودایە لە

---

(١) حديث الإسراء والمعراج عند البخاري ٣٢٠٧) ومسلم (١٦٤) دون ذكر الصلاة في الأبطح. ئەو شوێنەیە كە ناسراوە بە (المحصب) كە لەگەڵ خێزانی دا هاتەوە و نوێژی بەیانی كرد.

(٢) حديث الشاة المسمومة عند البخاري (٢٦١٧)، ومسلم (٢١٩٠).

(٣) خۆلاصە (٥٧١).

(٤) كان ذلك في غزوة أحد كما في البخاري(٢٩٠٣)، ومسلم(١٧٩٠).

نەتەوەکەم خۆش ببە ئەوانە نازان! ((اللَّهمَّ اغفِر لِقَومي فَإِنَّهُم لا يَعلَمُون))[1]،

**بە خۆم و باوك و دایكمەوە بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خودا؛**

بەڕاستی لەگەڵ کەمبوونی تەمەنی تۆ، ماوەی ساڵەکانی بانگەشەی تۆ، ئەوەندە خەڵکێکی زۆر شوێنت کەوتن، کە بۆ حەزرەتی نوح (سەلامی خودای لەسەربێت) ڕێکنەکەوت کە ساڵانێکی زۆروو تەمەنێکی درێژیشی بەسەر برد، تەنها چەند کەسێك بڕوایان پێ هێنا.

**بە خۆم و باوك و دایكمەوە بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری خودا؛**

ئەگەر تەنها لەگەڵ هاو ڕیزو هاو تاوهاو کوفئی خۆتدا دابنیشتیتایە، ئەوا لەگەڵ ئێمە دانەدەنیشتیت.

ئەگەر ئەوەی مارەت دەکرد دەبوایە هاوشانی خۆت بوایە، ئەوا ئافرەتێك لە خزم و کەسی ئێمە نەدەبوو کە هاوشانت بوایە تا مەرەیان بکەیت، وەکەس نەدەبوو هاونشینت بێت تا نانت لەگەڵ بخوات.

کەچی وەڵلاهی جەنابت لەگەڵ ئێمە کە هاوشانی تۆ نەبوین، دانیشتیت و بەهۆی بەرزی ڕەوشتتەوە قەبوڵتکرد کە هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتانی ئێمەدا بکەیت و ناتدەخواردو، بەرگی خوریت دەپۆشی و[2]،سواری گوێدرێژ دەبوویت.

وە لەدوای بەندەکەتەوە دەڕۆشتیت و سواری وڵاخیش دەبوویت،[3] نانیشت لەسەر زەوی دادەناو دەتخواردو[1].لەبەر گەردنکەچی و بێ فیزی و

(١) مەبەستی ئەوەیە دانیە پاڵی خۆی، بنواڕە: البخاری(٣٠٢٩)، ومسلم(٢٧٤).

(٢) لبسه ﷺ الصوف عند البخاري(٥٧٩٩)، ومسلم(٢٧٤)، وروى الترمذي (٢٤٧٩) عن أبي موسى الأشعري قال: (يا بنيَّ لو رأيتنا ونحن مع رسول الله ﷺ وأصابتنا السماء، **لَحَسِبتَ أنَّ ريحَنا ريحَ الضَّأنِ**)، قال الترمذي: ومعنى هذا الحديث أن ثيابهم كان الصوف، فإذا أصابَهُم المطر، يجئ من ثيابهم ريح الضأن.

(٣) كما في البخاري(٢٩٨٧)، ومسلم(١٧٩٨).

خۆبەکەمـــزانینی خۆت بوو کە پەنجـــەکانت دەلێسایەوە[2]، صەڵاتی خودات لەسەر بێت [3]،

**هەندێك لەزانایان فەرموویەتی:** فەرموودەکانی پێغەمبەرم دەنووسی و تەنها صڵاواتم لە پێغەمبەر ﷺ دەداو دەنوسی و وتەی سەلامم نەدەنووسی، بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گەیشتم لە خەودا فەرمووی: ئەوە صەڵەوات لەسەر من تەواو ناکەیت؟ دوای ئەوە پێکەوە صەلات و سەلامم بۆ دەنوسی[4]،

**هەروەها دەگێڕنەوە لە (أبو الحسن الشافعي) کە فەرموویەتی:**

بەخزمەت (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ گەیشتم لە خەومدا، عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خودا؛ بەچی پاداشتی شافیعی (خودای لێ ڕازی بێت) دراوەتەوە لەبارەی جەنابتەوە کە لە پەڕاوی (الرسالة)دا فەرموویەتی:

**(وصَلى اللهُ على مُحمَّدٍ كُلَّما ذكَرَهُ الذَّاكِرونَ، وغَفَلَ عَنْ ذِكرِهِ الغافِلون)**[5]، صەڵات و ڕەحمەتی خودا لەسەر لەسەر (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ بەقەدەر ژمارەی هەموو ئەوانەی کە زیکر و یادی دەکەن و بە ئەندازەی ئەوانەش کە بێئاگان لە زیکر و یادی ئەو. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەوە پاداشتی دەدرێتەوە کە لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا ڕاناگیرێت و لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت.**(جُزِيَ عَنِّي أَنَّهُ لايوقَفُ لِلحِساب)**[6]

---

(١) فقد روى البخاري(٥٣٨٦)، أنه ﷺ ما أكل على خوان قط.

(٢)كما في مسلم (٢٠٣٤).

(٣) قال الحافظ العراقي: هو غريب بطوله، من حديث عمر، وهو معروف من أوجه، وحكى تخريج قطعهِ، الإتحاف ٥/٥٣.

(٤) رواه الحافظ السلفي في الوجيز في ذكر المجاز والمجيز، ٢٨.

(٥) الرسالة( ١٦)

(٦) رواه ابن عساكر في تأريخ دمشق(٥١/٤٣٦).

# گەورەیی و خێری داوای لێبوردن (إستغفار)

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ﴾ (آل عمران/١٣٥)

واتە: ئەوانەی هەرکاتێ تاوانێکە نارەوایان کرد، یا ستەمیان لە خۆیان کردبە گوناهێکی تر، بیر لە گەورەیی خودا دەکەنەوەو داوای لێخۆشبوونە لێدەکەن و لەو تاوان و ستەمەیان پەشیمان دەبنەوە.

عەلقەمەی شەرعزان وئەسوەدی نەخەعی لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە دەیگێڕنەوە (خودایان لێ ڕازی بێت) : کە لە رتووك و قورانەکەی خودای(عَزَّ وجَلْ)دادووئایەتی تێدایە، هەر کەسێك گوناهی کردبێت و بیانخوێنێتەوەو، دوای لێبووردنیش لە خودا بکات، ئەوا بە دڵنیاییەوە خودا لێی خۆش دەبێت،

ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ، وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ (آل عمران/١٣٥) لە خودا بەولاوە کێ دەتوانێت گوناه بپۆشێت، هەروەها بەردەوامیش نابن لەسەر ئەو گوناهەی کردوویانە و دەزانن ئەو کارەی کردوویانە و ئەزانن ئەو کارەی کردوویانە تاوانەو مایەی سزایە[١] وە فەرموودەی خودای گەورە: ﴿وَمَنْ يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ يَجِدِ اللَّهَ غَفُورًا رَحِيمًا﴾(١١٠/النساء)[٢].هەرکەس کارێکی خراپ بکات کە زیان بە خەڵك بگەیێنێت،یاخۆ کارێکی بەدی وەها بکات و ببێتە هۆی ستەم بۆ خۆی و لەپاشان

(١)خۆلاصە (٦٧) نیوەی ئەم ئایەتە لەسەرتای لاپەڕەکەدا تەفسیری کرا. هەمان سەرچاوە.

(٢)رواه ابن أبي شيبة في المصنف(٣٠١٣٧)، من طريق علقمة، والأسود النخعيين.

له خودای خۆی بپاڕێتەوەو بە پەشیمان بوونەوەوە تکای لێخۆش بوونی لێبکات، ئەوا بۆی ڕوندەبێتەوە کە خودایەکی لێبوردەو بەخشندەی هەیە.

هەروەها فەرموودەی خودا :﴿وَالْمُسْتَغْفِرِينَ بِالْأَسْحَارِ ﴾(آل عمران/١٧) کە ستایشی ئەوانە دەکات بە بەرەبەیاندا، داوای لێخۆش بوون لە خودا دەکەن.

وەخوادی(عَزَّوجَلْ)فەرماندەدات:﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا﴾ (نصر/٣)کە تەسبیحات وسوپاس و ستایشی پەروەردگارت بکە، وە داوای لێخۆشبوونیشی لێبکە،بەڕاستی خودا لێبوردەو بەخشندەیە.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە بەزۆری داوای لێخۆش بوونی لە خودا دەکرد: پاك و بێگەردی بۆ تۆیە کە شایستەی حەمد و سەنای، ئەی خودایە؛ لێم خۆش ببە، تەنها تۆ بەخشندەو میهرەبانیت:

**((سُبحانَكَ اللَّهُمَّ وبِحَمدِكَ، اللَّهُمَّ ؛ اغفِرْ لي، إنَّكَ أنتَ التَّوَّابُ الرَّحيم))**[١]،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:**((مَن أكثَرَ الإستِغفارَ، جعلَ اللهُ عَزَّ وجَلَّ لَهُ مِنْ كُلِّ هَمٍّ فَرَجاً. ومِن كلِّ ضيقٍ مَخرَجاً. ورَزَقَهُ مِن حيثُ لايَحتَسِبُ))**[٢]، هەرکەسێك زۆر (أستغفرالله) بکات، خودای گەورە دەروازەو دەرووی خێری لێدەکاتەوەو خەمەکانی لەسەر لادەبات و لە تەنگانە ڕزگاری دەکات و،لەو جێگەیەشەوە کە بیری لێ نەکردۆتەوە بژێوی مسەوگەر دەکات.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:**((إنِّي لأَستَغفِرُ اللهَ سُبحانَهُ وتعَالَى وأتوبُ إلَيهِ في اليَومِ سَبعينَ مرَّةً))**[٣]،

---

(١) رواه أحمد في المسند(١/ ٤١٠)، وهو عند البخاري(٧٩٤) ومسلم(٤٨٤)في أذكار الركوع والسجود ،دون قوله إنك أنت التواب الرحيم. وأخرجه الحاكم في المستدرك(١/٦٨١(١٨٤٩)من حديث ابن مسعودوقال: صحيح الإسناد إن كان سمع أبوعبيدة من أبيه.

(٢) رواه أبو داوود (١٥١٨) والنسائي في السنن الكبرى(١٠٢١٧)، وابن ماجه(٣٨١٩).

(٣)رواه البخاري(٦٣٠٧)بزيادة (أكثر)وبلفظ المصنف هوعند الترمذي(٣٢٥٩)وابن ماجه(٣٨١٦)

واتە: من ڕۆژانە حەفتا جار داوای لێخۆش بوون لە خودا دەکەمودەگەڕێمەوە بۆ لای و تەوبە دەکەم، ئەم هەموو داوای لێبوردنەیش لە گەڵ ئەوەدایە کە خودا لە گوناهی بەرودوای ژیانیشی خۆش بووە.[1] ،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺفەرموویەتی:جاری وایە کە تەنگژەو نارەحەتییەك دڵم دادەگرێت، بیروهۆشم ئاڵۆزدەکات، کە بەهۆی تاعەتێکەوە لە عیبادەتێکی دیکە بووبێت، یان بیر لەو ئەحکامانە بکاتەوە، کە هێشتا خودا ڕەوانەی نەکردووە، تا وای لێدێت ڕۆژانە صەد جار (أستغفر الله) دەکات، نەك لەبەر گوناهێك کردبێتی ، بەڵکوو لەبەر ئەو بیرو نارەحەتیانەی خەمباری کردووە:
**(( إِنَّهُ لَيُغانُ عَلَى قَلْبِي، حَتَّى إِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللهَ تَعالَى فِي كُلِّ يَومٍ مِئَةَ مَرَّةٍ))**[2]،
هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(( مَنْ قالَ حينَ يأوي إِلَى فِراشِهِ: أَسْتَغفِرُ اللهَ العَظيمَ الذي لاإِلَهَ إِلاَّ هُوَ الحَيِّ القَيومَ وأَتوبُ إِلَيهِ ثَلاثَ مَرَّاتٍ، غَفرَ اللهُ لَهُ ذُنُوبَهُ وإِنْ كانَ مِثلُ زَبَدِ البَحرِ، أَو عَدَد رملِ عالِجٍ، أَو عَدَدِ ورَقِ الشَّجَرِ، أَو عَدَدِ أَيَّامِ الدُّنيا ))**[3]،

ئەوەی لە کاتێکدا دەچێتە سەر جێگاکەی بۆ نوستن سێ جار بڵێت:
**((أَسْتَغفِرُ اللهَ العَظيمَ الذي لاإِلَهَ إِلاَّ هُوَ الحَيِّ القَيومَ وأَتوبُ إِلَيهِ))** خودا لە

---

(١) کەواتە بۆ بەرزبوونەوەی پلەو مقامە، یان ئیستیغفارەکەی بۆ ئەوەیە کە نەوەکوو کەموکوڕییەکی ببێت، یان لا بەلای شتێکدا کردبێتەوە کە نەگونجاو بوبێت الإتحاف٥(/٥٧).

(٢) رواه مسلم(٢٧٠٢) والغين التغطية.

(٣) رواه الترمذي (٣٣٩٧). من حديث أبي سعيد، ورواه البخاري في التأريخ (٣ /٢٧٩) دون قوله يأوي إلى فراشه، وقوله (ثلاث مرات). قال الزبيدي٥/٥٧: ورواه أحمد في مسنده(١٠٦٩٠) ورواه ابن عساكر في تأريخ دمشق ٨٦/٥١)، بلفظ من قال: **أستغفر الله الذي لا اله الا هو الحي القيوم وأتوب اليه ثلاثا. غفر له ذنوبه ولو كانت مثل رمل عالج وغثاء البحر وعدد نجوم السماء،** ورواه ابن السني والطبراني في الأوسط٣٥٦/٧(٧٧١٧) وابن عساكر في تأريخ دمشق(٣٨٢/١٦)، وابن النجار من حديث أنس بنحوه الا انه قال: **صبيحة الجمعة قبل الغداة. وفيه لو كانت أكثر من زبد البحر** وفي الاسناد حنيف الجزري مختلف فيه

گوناهەکانی خۆش دەبێت، با بەقەدەر کەفی دەریا و لمی ناوچەی (عالیج)[1] و ژمارەی گەڵای درەختەکان و ڕۆژەکانی دونیا زۆر بێت.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ لە حەدیسێکی دیکەدا فەرموویەتی: ئەوەی ئەو ئیستیغفارەی سەرەوەبکات،خودالەگوناهەکانی خۆشدەبێت،بالەناوندی تێڕژانی جهادیشداڕایکردبێت:((مَنْ قالَ ذلِكَ ..غُفِرَتْ ذنوبُهُ وإن كانَ فاراً مِنَ الزَّحفِ))[2]

حوزەیفە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

زوبانێکی تیژو توند و ڕەقم هەبوو لە گەڵ خێزانمدا، وتم: ئەی پێغەمبەری خودا؛ ترساوم زوبانم بمخاتە ناو ئاگرەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی:

(( فأَينَ أَنتَ مِنَ الإستِغفار، إِنِّي لأَسْتَغفِرُ اللهَ فِي اليَومِ مأةَ مرَّة))[3]،

ئەی تۆ حاڵت چۆنەو لەگەڵ (أستغفر الله) کردندا، من لە ڕۆژێکدا صەد کەڕەت داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم.

(حەزرەتی) عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی پێم: ئەگەر زانیت بە گوناهێکی خۆت، یەکسەر داوای لێخۆشبوون لە خودا بکەو،لەحزووریدپاشگەزببەرەوە،چونکەپەشیمان بوونەوەو داوای لێخۆشبوون لە گوناه بە تەوبەو گەڕانەوە دادەنرێت: ((إن كُنتِ أَلْمَمْتِ بِذَنبٍ، فاسْتَغفِي اللهَ وتوبِي إلَيهِ، فإنَّ التَّوبَةَ مِنَ الذَّنبِ الإستِغفارُ والنَّدَمُ))[4].

لە کاتی داوای لێخۆش بووندا لە خودا (ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت وەك

---

(١) جێگەیەکە لە ناوچەی (بنی تمیم) ڕمڵی زۆرە.

(٢) رواه أبو داوود (١٥١٧) والترمذي(٣٥٧٧). قال الزبيدي٥/٥٧: ورجاله موثقون،وروى الحاكم في المستدرك(٦٩٢/١(١٨٨٤)من حديث ابن مسعود وقال صحيح على شرط الشيخين.

(٣) رواه الحاكم في المستدرك(٥١٠/١) وأخرجه النسائي في اليوم والليلة(ص/٣٢٩(٤٥١)، وابن ماجه (٣٨١٧)، والحاكم في المستدرك(٤٦٩/٢(٣٧٠٦) وقال: صحيح على شرط الشيخين.

(٤) أخرجه البخاري(٤١٤١)، ومسلم (٢٧٧٠)، دون قوله فإن التوبة...، وزاد : (وتُوبِي إليهِ، فإنَّ العَبدَ إذا اعترَفَ بذَنبهِ ثُمَّ تابَ ، تابَ الله علَيهِ).

نیشانەی تەوازوع و گەردن کەچی): پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو:

((اللَّهُم اغفِر لي خَطيئَتي، وجَهلي وإسرافي في أمْري، ومَا أَنتَ أعلَمُ بهِ مِنّي، اللَّهُمَّ اغفِرْ لي جِدّي وَهَزْلي، وخَطَئي وعَمْدي، وَكُلُ ذَلِكَ عِنْدي، اللَّهمَّ اغْفِر لي مَا قَدَّمتُ ومَا أخَّرْتُ، ومَا أسْرَرتُ ومَا أعْلنتُ، ومَا أنتَ أعْلَمُ بهِ مِنّي، أنتَ المُقدِّمُ وأنتَ المُؤَخِّرُ، وأنْتَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَديرٌ ))[1]. ئەی خودایە: خۆشبە لە گوناهەکانم، کە بە هەڵە و نەزانین و زیادەڕەوی کردوومە، وە لەو تاوانانەیشم خۆشبە کە جەنابت زاناتری پێیان، خوادیە خۆشبە لەوکردارانەی بە ڕاستی کردوومن، یان بە گەمەو گاڵتە، ئەوەی بە هەڵە یان بە قەصدی ئەنجامم داون، هەموو ئەم کەموکورتیانە لە منەوە سەریان هەڵداوەو دەشێت کە کردبێتم. ئەی خودایە؛ لێم خۆشبە، لەوەی پێشتر کردوومە، یان لە دواترەوە دەیکەم، ئەوەی شاردوومەتەوەو، ئەوەی ئاشکرام کردووە، ئەوەش کە تۆ لێی بە ئاگاتری لە من. تۆ هەندێك لە بەندەکانت پێش خستووە، بەوەی بەندایەتیت بۆ دەکەن، وە هەندێکیشیانت دواخستووەو دەسبەرداریان بوویت، تۆ بە تواناو بە دەستەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا.

(حەزرەتی) عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ئەو کاتە پیاو بووم کە فەرموودەیەکم لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیست کە خودای گەورە بەو فەرموودەیەئەوەندەیمەبەستی بوبێت سودی پێ گەیاندووم، وە ئەگەر یەکێك لە صەحابەکان بۆم باس بکات، ئەوا سوێندی دەدەم، ئەگەر سوێندی خوارد بڕوای پێ دەکەم، وە ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێت) ئەو فەرموودەی بۆ گێڕایەوە و ڕاستیشی کردووە کە دەفەرموێت: بیستم لە پێغەمبەری خوداﷺ کە فەرموویەتی:((مامِن عَبدٍ يذنِبُ ذنباً، فَيُحسِنُ الطُّهورَ، فيَقومُ ويُصَلّي رَكعَتَينِ،ثُمَّ يَستَغفِرِ اللهَ (عَزَّ وجَلَّ)إلاَّ غَفرَ اللهُ لَهُ،ثُمَّ تَلاقوله

---

(١) رواه البخاري (٦٣٩٨) ومسلم (٢٧١٩) واللفظ له.

تعالَى:﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوااللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾(آل عمران/١٣٥)[١].

واته: هەربەندەیەك گوناهێك بكات و تارەت و دەستنوێژێكی پوخت و پاك و خاوێن بگرێت، وە هەستێته سەر پێ و، ڕوبكاته قیبلەو دووڕكات نوێژ بخوێنێت، لەپاشاندا داوای لێخۆشبوون لە خودای میهرەبان و بەدەسەلأت بكات، ئەوا بە دڵنیاییەوە خودای گەورە لێی خۆشدەبێت، وە ئایەتەكەیشی خوێندەوە كە پێشتر واتاكەیمان ڕوونكردەوە.

هەروەها ئەبەهورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ كە فەرموویەتی: (( إِنَّ المُؤمِنَ إذا أذنبَ ذَنباً، كانت نُكتَةٌ سَوداءُ في قَلبِهِ، فَإِنْ تابَ ونَزعَ واسْتَغفَرَ، صُقِلَ قَلبُهُ مِنها، فَإِنْ زادَ.. زادَت حتَّى تَعلُوَ قَلبَهُ، فَذالِكَ الرَّانُ الذي ذكَرهُ اللهُ (عَزَّ وجَلَّ) في كِتابِهِ ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ (المطففين/١٤)[٢]واته: بەڕاستی مرۆڤی بڕوادار كە گوناهێك دەكات، خاڵێكی ڕەش دەكەوێتە ناو دڵیەوە، ئەگەر تەوبەی كرد و دەریكێشاو داوای لێخۆش بوونی كرد، ئەوا خودا لای دەبات و، پاك و جەلایی دەكاتەوە، ئەگەر زیاتریشی بكات، بەو پێیە خاڵە ڕەشەكە زیاد دەبێت، تا بەسەر دڵیدا سەردەكەوێت، تا دڵی دادەپۆشێت، كە بە (ران) ناو دەبرێت، لەپاشان مۆردەكرێت، ئەمەش دەرەنجامی كردەوە خراپەكانی خۆیەتی، وەك خودا فەرموویەتی: باوازلەم تاوانانە بهێنن،كەوەك ژەنگ دڵیانی داگرتووە.

---

(١) رواه أبـو داوود(١٥٢١)، والترمـذي(٤٠٦)، والنسـائي في السـنن٦/١١٠(١٠٢٥٠) (١٠١٧٥)وابـن ماجه(١٣٩٥) وحسنه الترمذي، قال الزبيدي٥/٥٨:ورواه أبوداوود الطيالسي في مسنده(١/٢، وأحمد في مسنده(٥٧، وأبـو يعلي في مسـنده(٢٣(١١)، والبيهقي في شـعب الإيمـان(٥/٤٠١(٧٠٧٨)، والضيـاء في المختارة(١/٨٤(٩)، كلهم عن علي وعن أبي بكر (رضيَ الله عنهما) .

(٢) رواه الترمذي(٣٣٣٤) ،وصححه، والنسائي في اليوم والليلة(ص/٣١٦(٩٣٠)، وابن ماجه(٤٢٤٤)، وابن حبان في صحيحه(٣/٢١٩(٩٣٠)، والحاكم في المستدرك(١/٤٥(٦)، وأحمد في المسند(٢/٥٠٩.

هەروەها ئەبوهورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:
کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:(( **إنَّ اللهَ سُبحانَهُ لَيَرفَعُ الدَّرَجةَ للعَبدِ في الجَنَّةِ، فيقولُ يا رَبِّ: أنَّى لي هذهِ؟ فيقول الله (عَزَّ وجَلَّ): باستِغفارِ ولَدِكَ لَكَ**))[1].
بەڕاستی خودای گەورە پلەی بەندەی لە بەهەشتدا بەرز دەکاتەوە، دەڵێت: یارەبی؛ ئەم پلەیەم چۆن دەسکەوتووە؟ خودای گەورەش دەفەرموێت:
بەوەی ڕۆڵەکەت داوای لێخۆش بوونی بۆتکردووە.

وە (حەزرەتی) عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوداوە کە فەرموویەتی: (( **اللَّهُمَّ اجعَلني مِنَ الذينَ إذا أحسَنوا...استَبشَروا، وإذا أساؤوا إستَغفروا**))[2]، خودایە؛ لەو تاقمانەم بگێڕە، کە ئەگەر چاکەیەکیان کرد، شادی و خۆشی دەردەبڕن، وە ئەگەر دوچاری خراپەیەکیش بوون، یەکسەر داوای لێبوردن لە خودا دەکەن.

(( **إذا أذنبَ العَبدُ ذَنباً فقالَ: اللَّهُمَّ ؛ اغفِرْ لي. فيقولُ اللهُ (عَزَّ وجَلَ) : أذنبَ عَبدي ذَنباً، فَعَلِمَ أنَّ لهُ ربَّاً يأخُذُ بالذَّنبِ ويَغفِرُ الذَنبَ، عَبدي : اعمَلْ ما شِئتَ، فقَد غَفَرتُ لكَ**))[3]، هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی هەرکاتێك بەندەیەك تاوانێکی ئەنجامداو وتی: خودایە لێم خۆشبە، خوای گەورە دەفەرموێت: بەندەکەم تاوانێکی ئەنجامداو زانی کە پەروەردگارێکی هەیە و ئەگەر ویستی لەسەرتاوانەکەی سزای دەداو، وەئەگەر ویستیشی لەتاوانەکەی خۆش دەبێت و پێشی دەفەرموێت: ئەی بەندەی من هەرچی دەکەی بیکە،

---

(١) رواه ابن ماجه (٣٦٦٠)، وأحمد في المسند بإسناد حسن٢/٥٠٩(١٠٢٣٢)، قال الزبيدي ٥٩/٥: ويؤيده ما روى أبو نعيم في الحلية ٢/ ٣٤٤)، عن أنس رفعه: **سبعٌ يجري أجرُها للعَبدِ وهو في قَبرِهِ**، وفيه: **أو تركَ ولداً يستَغفِرُ اللهَ له بعد موتِهِ**. .

(٢) أخرجه ابن ماجه( ٣٨٢٠)قال الزبيدي ٥٩/٥: وكذا رواه البيهقي في شعب الإيمان، ٣٧١/٥(٦٩٩٢) بهذا الإسناد.

(٣) متفق عليه ( البخاري (٧٥٠٧)، ومسلم (٢٧٥٨)، عن أبي هريرة. ويكون ذلك بعد ثلاث مرار.

دڵنیابە لێت خۆشبووم. جا هەرکاتێك بەندە تاوانبارەکە بەوشێوەیەداوای لێخۆشبوونی کرد، ئەوە بە بەندەیەکی گوناهکار هەژمارناکرێت، پێی ناوترێت سوورە لەسەر گوناه. ئەگەر ڕۆژانە حەفتا جاریش بگەڕێتەوە سەر گوناهەکەی وەك پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی ((ما أَصرَّ مَنِ استَغفَرَ، وإِن عادَ في اليومِ سَبعينَ مرَّةً))[1]، هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

(( إِنَّ رَجُلا لَم يَعمَل خيراً قطُّ، نظرَ إلى السَّماءِ فقال: إِنَّ لِي رَبّاً، يارَبِّ: اغفِر لي، فقال اللهُ (عَزَّ وجَلَّ): قَد غَفَرتُ لَهُ ))[2]، پیاوێك هیچ کردەوەیەکی چاکەی نەکردبوو، سەیرێکی ئاسمانی کردو وتی: من خودایەکم هەیە، خودایە لێم خۆشبە، خودای (عَزَّ وجَلْ) یش فەرمووی: ئەوا لێت خۆشبووم.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ أذنبَ ذَنباً فَعَلِمَ أَنَّ اللهَ قدِ اطَّلعَ عليهِ، غفَرَ اللهُ لَهُ وإن لَم يَستَغفِر))[3]، هەرکەسێ گوناهێك بکات و بزانێت کە خودا ئاگادارەو ئاگای لێیەتی، ئەوە خودا لێی خۆش دەبێت، با (بە زوبانیش) داوای لێبوردن نەکات، وەك شێخی مەناوی دەفەرموێت: مانای ئەوە نیە هان بدرێت کە گوناه بکات، بەڵکوو مەبەست بێدارکردنەوەیانە لەسەر

---

(١) رواه أبوداوود (١٥١٤)، والترمذي (٣٥٥٩). وقال غريب وليس إسناده بالقوي، قال الزبيدي إنما لم يكن قويا لجهالة مولى أبي بكر الراوي عنه، لكن جهالته لا تضر، إذ تكفيه نسبته إلى الصدِّيق (رضي الله عنه) . قال المناوي في فيض القدير: وفيه أيضا عثمان بن واقد وضعفه أبوداوود نفسه، قلت: لم أره مذكورا في الضعفاء للذهبي، ولا في ذيله، ولعله عثمان بن فائد، فلينظر ذلك.

(٢) رواه ابن أبي الدنيا في (حسن الظن بالله) ص/١٠٣ (١٠٧)،بسند ضعيف عن أبي هريرة.

(٣) أخرجه الطبراني في الأوسط(٣٧٤/٤)(٤٤٧٢)، من حديث ابن مسعود بسند ضعيف، قال الزبيدي ٦٠/٥: وكذلك رواه في الصغير أيضا، وفي الاسناد ابراهيم بن هراسة وهو متروك قاله الهيثمي في مجمع الزوائد(١٠/(٢١١): فهذا معنى قول العراقي بسند ضعيف، وروي الحاكم في المستدرك(٢٧٠/٤)(٧٦٠٩) وأبو نعيم في الحلية(٢٨٦/٨) والطبراني في المعجم الأوسط (١٨٨/٢)(١٦٧٦)عن أنس مرفوعا: من أذنب ذنبا فعلم أن له ربا ان شاءالله ان يغفر له غفر له، وان شاء ان يعذبه عذبه، كان حقاً على الله ان يغفر له، وجابر بن مرزوق نكرة

لێبوردەیی خودا، کە دەبێت ئەمیش زیاتر هۆشیار بێت بەرامبەری.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((يقول اللهُ عَزَّ وجَلَّ: يا عِبادي؛ كُلُّكُم مُذنِبٌ إلاَّ مَن عافَيتهُ، فاستَغفِروني أغفِر لَكُم، ومَن عَلِمَ أَنِّي ذو قُدرَةٍ علَى أن أغفِرَ لَهُ، غَفَرتُ لَهُ ولاَ أُبالي))**[١]،

خودای (عَزَّ وجَلَّ) دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم: ئێوە هەمووتان گوناهبارن جگە لەوانەی کەمن دەیانپارێزم، داوای لێخۆشبوونم لێبەکەن تا لێتان خۆشدەبم، وە هەرکەسێك بە متمانەوە بزانێت کەمن توانای ئەوەم هەیە کەلێی خۆشببم، ئەوا لێی خۆشدەبم و گرنگ نیە بەلامەوە چەندێك گوناهبارە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((مَن قالَ: سُبحانَكَ، ظلَمتُ نَفسي، وعَمِلتُ سوءاً فاغفِرْ لي، فإنَّهُ لايَغفِرُ الذُّنوبَ إلاَّ أنتَ، غُفِرَت لَهُ ذُنُوبهُ ولَو كانتْ كَمَدَبِ النَّملِ))**[٢]،

هەرکەسێك بڵێت: خودایە پاکو خاوێنی بۆ تۆ: زوڵمم لە نەفسی خۆم کردووە، وە کردەوەی خراپم کردووەو، داوات لێدەکەم لێم خۆش ببە، کەس ناتوانێت لە گوناهەکان خۆش ببێت جگە لە تۆ، بە بڕوایەکی بەهێزەوە ئەم قسانەبکات خودا لێی خۆش دەبێت، باگوناهەکانی بە ئەندازانەی ئەو مێرووانە بێت کە بەسەر زەویدا دەڕۆن، وەك زەڕاتی بوونەوەر وابن، خودا لێیان خۆش دەبێت.

وە دەگێڕنەوە کە گەورەترینی نزاو داوای لێخۆشبوون:

**(( اللَّهُمَّ؛ أنتَ ربي وأنا عَبدُكَ خَلَقتَني، وأنا علَى عَهدِكَ ووَعدِكَ ماستَطَعتُ، أعوذُ بِكَ مِن شَرِّ ماصَنعتُ، أبوءُ لكَ بِنعمَتِكَ عليَّ، وأبوءُ علَى**

---

(١) رواه الترمذي( ٢٤٩٥) وابن ماجه( ٤٢٥٧)، وأصله عند مسلم (٢٥٧٧).

(٢) رواه البيهقي في الدعوات الكبير (١٩٠)، ولفظه: عن علي (رضي الله عنه) **أن رسول الله ﷺ أخذ بيده يوماً فقال: ألا أعلمك كلمات تقولهن: لو كانت عليك كعدد الذر ذنوبا ..غفر الله لك على أنه غفور لكَ،؟ لاإله إلاَّ أنت سُبحانكَ وبحمدكَ . عملت سوءاً وظلَمتُ نفسي، فاغفِر لي، إنهُ لايَغفرُ الذُّنوب إلاّ أنتَ.**

نَفسي بِذَنبي، فقد ظلَمتُ نفسي واعتَرَفتُ بِذَنبي، فاغفِرْ لي ذُنوبي ما قَدَّمتُ مِنها وما أَخَّرتُ. فإِنَّهُ لايَغفِرُ الذُّنوبَ جميعاً إلاَّ أَنتَ ))[1].

واته: خودایه تۆ پەروەردگارمی، من بەندەی دروستکراوی تۆم، من تا بتوانم لەسەر گفت و بەڵێنی خۆمم، پەنات پێدەگرم لە هەموو ئەو خراپانەی کردوومن، ئەگەڕێمەوە بۆ لای تۆو منەتباری هەموو ئەو نیعمەتانەم کە رژاندووتە بەسەرمدا، وە لێپرسینەوەی خۆم دەکەمەوە، لەسەر ئەو گوناهانەی کە کردوومن، بەڕاستی زوڵمم لە نەفسی خۆم کردووە، وە دان دەنێم بە تاوانەکانمدا، داوات لێدەکەم تۆیش لێم خۆشببە، ئەو گوناهانەی پێشتر کردوومن، یان لە داهاتوودادەیکەم خۆ کەس نیە پەنای پێببەم و، لەهەموو گوناهەکان خۆشببێت بێجگە لە زاتی تۆ نەبێت.

# ئاسار و فەرموودەکان:

خالیدی کوڕی مەعدان دەفەرموێت: خودای گەورە فەرموویەتی:

خۆشەویست ترینی بەندەکانم لەلای من، ئەوانەن کە بە خۆشەویستی من یەکترییان خۆش دەوێت، وە دڵیان هەمیشە پەیوەستە بە مزگەوتەکانەوە، وە لەبەرەبەیاندا داوای لێخۆش بوون و (إستغفار) لە خودا دەکەن، ئەوانەن کە ئەگەر بمەوێت تۆڵەیەکی سەخت لە ئەهلی سەر زەوی بکەمەوە بە سزادان یادی ئەوان دەکەیمەوە، واز لەوانی تریش دەهێنم و تۆڵەیان لێ ناسەنمەوە[2]، هەروەها قەتادە (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:

---

(١)قال العراقي رواه البخاري من حديث شداد بن أوس دون قوله: وقد ظلمت نفسي واعترفت بذنبي. ودون قوله: ذنوبي ما قدمت منها وما أخرت. ودون قوله : جميعا. قال الزبيدي :٥/٦٠)، ورواه أيضا أحمد وأبوبكر بن أبي شيبة والترمذي والنسائي وابن حبان والطبراني

(٢) رواه ابن مبارك في الزهد(٤١٢)، وأبو نعيم في الحلية(٥/٢١٢، وروى البيهقي في

قورئان ڕێنماییتان دەکات و، دەردوو دەرمانە پێویستەکانتان پێنیشان دەدات، دەردوو نەخۆشیەکانتان گوناهەکانتانە، بەڵام دەرمانی دەردەدەکانتان ئیستیغفارو داوای لێخۆشبوونە لە خودا.

(حەزرەتی) عەلی (كَرَّمَ اللهُ وَجهَهُ)فەرموویەتی: سەرم لەوکەسانە سوڕماوە دەفەوتێن و، هۆکاری ڕزگار بوونیشیان پێیە، وتیان ئەو هۆکارە کامەیە؟ فەرمووی (أستغفر الله) داوای لێخۆش بوونە لەخودا.

هەروەها دەوترا: خودای گەورە (أستغفر الله)ی نەخستۆتە دڵی بەندەکانی لە کاتێکدا ئەگەر بیەوێت سزایان بدات.

فوضەیلی کوڕی عەیاض فەرموویەتی: بەندە کە دەڵێت: أستغفر الله، واتە: لەو گەردو ڕەشایی گوناهە دوورم بخەرەوە و، پاکوو خاوێنم بکەرەوە[1]،

یەکێك لە زانایان فەرموویەتی: بەندە لە نێوانی گوناه و زۆری نیعمەتدا کە ڕژاوە بەسەریدا، ئەوەی بەردەوامی پێدەدات و، دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناهەکانیشی: حەمدو سەناو داوای لێخۆش بوونە لە خودا.[2]

ڕەبیعی کوڕی خەیسەم فەرموویەتی:[3] با یەکێك لە ئێوە نەڵێت: (أستغفرالله وأتوب إليه) واتە: داوای لێخۆش بوون دەکەم و، تەوبەدەکەم لە حزمەتی خوادا، ئەگەر تەوبە نەکات بە گوناهو درۆ لەسەری دەنوسرێت، بەڵکوو بڵێت: خودایە لێم خۆش ببە، خودایە تەوبەم لێوەربگرە.

فوضەیلی کوڕی عەیاض (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:داوای لێخۆشبوون

---

الشعب(٢٦٨٥) مرفوعا: يقول الله (عَزَّوجَل) : **إنِّي لأَهمُّ بأهلِ الأرضِ عذاباً، فإذا نظَرتُ إلى عمَّارِ بيوتي المُتَحابِّينَ فِيَّ، وإلى المُستَغفِرينَ بالأسحار، صَرَفتُ عَنهُم.**

(١) رواه البيهقي في الشعب(٦٧٤٥).

(٢) رواه ابن أبي الدنيا في الشكر(١٥٠).

(٣) رواه ابن أبي حاتم في تفسيره (١٨٩٩).

لەخودابەبێ وازهێنان ودووركەوتنەوە لە گوناهەكان،ئەوە تەوبەی درۆزنەكانە[1]

ڕابیعەی عەدەوی (ڕەحمەتی خودای لێبێت) فەرمووی:

ئەو جۆرە داوای لێخۆشبوونەی كە ئێمە دەیكەین، پێویستی بە داوایەكی زۆرە، بۆ ئەوەی خودا لێمان خۆش ببێتەوە( چونكە قسەی ڕوتی بێ كردار وەرناگیرێت ، ئەگەر حزوری دڵ و كرداری لەگەڵدا نەبێت)[2]

هەندێك لە حەكیمەكان فەرموویانە: هەركەسێك پێش پەشیمان بوونەوە لە گوناهێك، تەنها داوای لێخۆشبوون بكات، ئەوە بەخۆی نازانێت و، وەك كەسێكی گاڵتەجاڕ وایە لە خزمەت خودادا ئاوای بۆ دەنوسرێت[3].

گوێیان بە (ئەعرابیەك) بوو خۆی بە دەرگای كەعبەدا شۆڕكردبوویەوەو دەیفەرموو: خودایە بەڕاستی كە داوای لێخۆشبوونت لێدەكەم و لەگەڵ ئەوەشدا سوورم لەسەر گوناه ئەوە نیشانە خراپیمە، وە ئەگەر وازیش لە (أستغفر الله) بهێنم، لەگەڵ ئەوەدا كە دەزانم ڕەحمەتی تۆ چەندێك فراوانە، ئەوەش نەشیاوو ناتەواوەو نیشانەی دەستبارەییمە، ئای كە چەندێك تۆ بە نیعمەتە جوانەكانت خۆت لەلام شیرین تر دەكەیت و، هیچ پێویستییەكیشت بە من نیە، وە چەندێك من بە تاوان و گوناهەكانم خۆم لە حزورتا دێزو قێزەون دەكەم و چەندێكیش پێویستی بەردەوامم پێت هەیە؟! ئەی ئەو زاتەی كە بەڵێنی دا دەیگەێنێتە جێ، كە گفتیشی دا لێبوردنیشی لەگەڵ دەبێت وچاوپۆش دەكات، گوناه و تاوانە گەورەكانم بپێچە بە لێبوردنە گەورەكانتەوە، ئەی لەهەموو خاوەن سۆزەكان میهرەبان و بەڕەحمتری[4].

---

(١) رواه البيهقي في الشعب (٦٧٧٧) عن ذي النون المصري.

(٢) قوت القلوب١/٦١.

(٣) روى الخبر البيهقي في اشعب(٦٧٧٨).

(٤)رواه اللاكلائي فى إعتقاد أهل السنة(١١٥٢/٣) بنحوه. ونقل نحوه الحافظ في (البيان والتبيين) ٣(/١٧١)، عن شيخ من أعراب طيئ.

ئەبوعەبدوڵلای وەڕراق دەفەرموێت: ئەگەر بە ئەندازەی تکەی بارانەکان و کەفی دەریاکان گوناهباربیت، هەمووی لەسەر دەکوژێتەوە، ئەگەر بەم نزاو پاڕانەوەیە داوا لە پەروەردگارت بکەیت: (**اللَّهُمَّ إِنِّي أستغفِرُكَ مِن كُلِّ ذَنبٍ تُبتُ إِليكَ مِنهُ ثُمَّ عُدتُ فيهِ، واستَغفِرُكَ مِن كُلِّ مَا وَعَدتُكَ بهِ مِنْ نَفْسي، ثمَّ لَمْ أُوفِ لكَ بهِ، وأَستَغفِرُكَ مِنْ كُلِّ عَمَلٍ أَردْتُ بهِ وَجْهَكَ، فَخالَطَهُ غَيرُكَ، وأَستَغْفِرُكَ مِنْ كُلِّ نِعمَةٍ أنعمْتَ بهَا عَلَيَّ، فَاسْتَعنْتُ بِها عَلَى مَعْصِيتِكَ، وأَستَغفِرُكَ يَاعَالِمَ الغَيبِ والشَّهادَةِ، مِنْ كُلِّ ذَنبٍ أَتَيتُهُ في ضِياءِ النَّهارِ وَسَوادِ اللَّيلِ، في مَلَإٍ أَوْ خَلَاءٍ، وسِرٍّ وَعَلانِيَّةٍ يَاحَليمُ**)[1].

واتە: خودایە؛ بەڕاستی من داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم، لە هەرگوناهێ تەوبەم کردووە لێی، وەگەڕاومەتەوەسەری، وە داوای لێخۆش بوونت لێدەکەم لەوانەی کە بەڵێنم پێتداوەو بەجێم نەگەیاندووە، وە داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم، لەو کردەوانەی لە پێناوی تۆدا کردوومەو، کەس و مەبەستی تریشم تێکەڵکردووە، وە داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم، لەبارەی ئەو هەموو نیعمەتانەی لە هەموو ڕوویەکەوە ڕژاندووتە بەسەرمدا، منیش لە کاری تاوانکاریدا بەکام هێناون، وە داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم، ئەی زانا بە هەموو کارووجیهانە بینراوو نەبینراوەکان، (سەبارەت بە بوونەوەر) لە هەموو گوناهێك کە کردبێتم لە ڕۆشنایی ڕۆژدا، یان لە تاریکایی شەودا، لە کاتی ئاشکراو بەرچاوی خەڵکدا، یان لە حاڵەتی پەنهان و نادیاردا، ئەی خاوەنی حیلم و لێبوردەیی لێم خۆشبە.

**دەڵێن: ئەم نزایە کاتی خۆی (حەزرەتی) ئادەم (سەلامی خودای لەسەر) کردوویەتی، هەروەها دەگێڕنەوە کە لە (حەزرەتی) خضر ەوە وەرگیراوە (خوای لێ ڕازی بێت).**

---

(١) قوت القلوب١/٩،بنحوه، قال الحافظ الزبيدي: وقد وقع علينا مسندا، الإتحاف ٥/٦٢.

# دەروازەی سێیەم

## چەندجۆرێك لە نزای وەرگیراو،

## كە دراونەتە پاڵ هۆكارو خاوەنەكانیان ،

### كە شیاوە موریدی ڕاستگۆ بەیانیان و ئێواران و دوای هەموو نوێژەكان بیانخوێنێت،

**لەو دوعامەئسوورانە: نزای پێغەمبەرە ﷺ لە دوای دووڕكاتی بەیانی:**

ئیبنو عەباس (خوایان لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

عەباس (ی باوكم) ناردمی بۆ خزمەت (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ . كەچوومە خزمەتی لە ماڵی مەیموونەی خاڵۆژنم بوو شەو داهاتبوو، ، هەستاو پیش نوێژی بەیانی دوو ڕكات نوێژی كرد . وە فەرمووی:

**((اللَّهُمَّ إِنِّي أَسأَلُكَ رَحْمَةً مِنْ عِندِكَ تَهدِي بِهَا قَلْبِي وَتَجمَعُ بِهَا شَمْلِي ، وَتَلُمُّ بِهَا شَعَثِي، وتَرُدُّ بِهَا أُلْفَتي، وتَصْلُحُ بِها ديني، وتَحْفَظُ بِها غَائِبي، وتَرفَعُ بِها شَاهِدِي، وتُزَكِّي بِها عَمَلي، وتُبَيِّضُ بِها وَجْهي، وتُلهِمُني بِها رُشْدي، وتَعصِمُني بِها مِنْ كُلِّ سُوءٍ، اللَّهُمَّ ؛ أَعطِني إِيماناً صادِقاً، ويَقيناً ليسَ بَعدَهُ كُفرٌ، ورَحمَةً أَنالُ بِها شَرفَ كَرامَتِكَ فِي الدُّنيا والآخِرَة،**

**اللَّهُمَّ ؛ إِنِّي أَسأَلُكَ الفوزَ عِندَ القَضاء، ومَنازِلَ الشُّهَداء، وعَيشَ السُّعَداءِ، والنَّصرَ على الأعداءِ، ومُرافَقَةَ الأَنبياء.**

**اللَّهُمَّ؛إِنِّي أُنزِلُ بِكَ حاجَتي وإِنْ ضَعُفَ رَأيي، وقَصُرَ عَمَلي، وافتَقَرتُ إِلى رَحمَتِكَ، فأَسأَلُكَ يا قاضِيَ الأُمُورِ، وياشافِيَ الصُّدور، كَما تُجيرُ بينَ البُحورِ : أَنْ تُجيرَني مِنْ عَذابِ السَّعيرِ، ومِن دَعوَةِ الثُّبور، ومِنْ فِتنَةِ القُبور.**

**اللَّهُمَّ: ما قَصُرَ عنهُ رأْيي، وضَعُفَ عنهُ عَمَلي، ولَم تَبلُغْهُ نِيَّتي وأُمنِيَّتي مِنْ خيرٍ وعَدتَهُ أَحداً مِنْ عِبادِكَ، أَو خيرٍ أَنتَ مُعطيهِ أَحداً مِنْ خَلقِكَ، فَإِنِّي**

**أَرغَبُ إِلَيكَ فيهِ، وأَسأَلُكَهُ يارَبَّ العالَمِين.**

**اللَّهُمَّ : اجْعَلنَا هادِينَ مُهتَدينَ، غَيرَ ضالِّينَ ولاَ مُضِلِّينَ، حَرباً لأَعدائِكَ وسِلماً لأَولِيائِكَ، نُحِبُّ بِحُبِّكَ مَنْ أَطاعَكَ مِن خَلقِكَ، ونُعادي بِعَداوَتِكَ مَنْ خالَفَكَ في خَلقِكَ.**

**اللَّهُمَّ :هذا الدُّعاءُ وعَلَيكَ الإجابَةُ، وهذَا الجُهدُ وعَلَيكَ التُّكلانُ، وإِنَّا للهِ وإِنّا إِلَيهِ راجِعون، ولاَ حولَ ولا قُوَّةَ إلاَّ باللهِ العليِّ العَظيم.**

**ذاالحَبلِ الشَّديدِ والأَمرِ الرَّشيدِ: أَسأَلُكَ الأَمنَ يَومَ الوَعيدِ، والجَنَّةَ يَومَ الخُلودِ، معَ المُقَرَّبِينَ الشُّهودِ، والرُّكَّعِ السُّجودِ، المُوفينَ بالعُهودِ، إِنَّكَ رَحيمٌ وَدودٌ، وأَنتَ تَفعَلُ ما تُريدُ.**

**سُبحانَ الذي تَعَطَّفَ بالعِزِّ وقالَ بهِ، سُبحانَ الذي لَبِسَ المَجدَ وتَكَرَّمَ بهِ، سُبحانَ الذي لايَنبَغي التَّسبيحُ إلاَّ لَهُ، سُبحانَ ذي الفَضلِ والنِّعَمِ، سُبحانَ ذي القُدرَةِ والكَرَمِ، سُبحانَ الذي أَحصى كُلَّ شيئٍ بِعِلمِهِ.**

**اللَّهُمَّ : اجعَلْ لي نوراً في قَلبي، ونوراً في قَبري، ونوراً في سَمعي، ونُوراً في بَصَري، ونُوراً في شَعَري، ونوراً في بَشَري، ونوراً في لَحمي، ونوراً في دَمي، ونوراً في عِظامي، ونوراً مِن بينِ يَديَّ، ونوراً مِنْ خَلفي، ونوراً عَنْ يَميني، ونوراً عَن شِمالي، ونوراً مِن فَوقي، ونوراً مِن تَحتي.**

**اللَّهُمَّ : زِدني نوراً، وأَعطِني نوراً، واجعَل لي نوراً.**[1] ،

(١) الحديث بلفظ المصنف عند صاحب القوت(٥/١) .ورواه محمد بن نصر في صلاة الوترص/١٢٧، ورواه كذلك الطبراني في الكبير ٢٨٣/١٠. وأبو نعيم في الحلية(٢٠٩/٣. وهو عند الترمذي (٣٤١٩). من غير بعث ابن عباس إلى بيت خاته ميمونة (رضي الله عنهم) قال الزبيدي٦٦/٥: ورواه البيهقي في كتاب الدعوات، ٥١/١(٦٩)، كلهم من طريق داوود بن على بن عبدالله بن عباس، عن أبيه عن جده، وداوود هذا عمُّ المنصور، ولِيَ المَدينةَ والكوفةَ للسَفَّاح، حدَّثَ عنهُ الكبَّار، كالثوري والأوزاعي، وثَّقَهُ ابن حبان في الثقات(٢٨١/٦(٧٧٣٧)، وغيره، وقال ابن معين برواية الدارمي ص/١٠٨(٣١٧): أرجو أنه لايكذب، إنما يحدث

**واتە ئەی خودایە:** داوای ڕەحمەتێکم لە تۆیە بە بێ هۆکار، ڕێنمایی دڵمی پێبکەیت، پرش و بڵاویی و کاروبارمی پێ کۆبکەیتەوە، ئولفەت و داهاتنمی پێ بگێڕیتەوەو ، دینمی پێ ڕێك و ساز بکەیت و ، ئەوانەی لێم نادیارن بە بڕواو ڕەوشتی بەرز بیانپارێزیت پێی، ڕواڵەتی دیاریشمی پێ بەرز بکەیتەوە، کردارەکانی پێ پاڵفتەو زیاد بکەیت، ڕومی پێ سپی بکەیتەوەو، ڕێگای ڕاستم پێ نیشان بدەیت و بیخەیتە دڵمەوە، وە بەو ڕەحمەتە لە هەموو خراپەیەك بمپارێزە.

ئەی خودایە: ئیمانێکی ڕاستەقینەم پێببەخشە، وە متمانەیەك کە کوفرو بێباوەڕی لە دوا نەبێت، وە ڕەحمەتێك شەرەفمەندیی ڕێزو حورمەتی تۆم پێی دەسکەوێت لە دونیاو دواڕۆژدا.

ئەی خودایە: داوای سەرکەوتنت لێدەکەم لە کاتی دادگاو قەزاوەتدا، وە داوای پلەو مەقامی شەهیدەکان و، ژیانی بەختەوەران و سەرکەوتن بەسەر دوژمنان و، هاوڕێ بوونی پێغەمبەرانت لێدەکەم.

ئەی خودایە: پێداویستییەکانی خۆمت دەعەرزدەکەم، ئەگەرچی نەشزانم کامیان خێری منی تێدایە، با کردارەکانیشم پڕبێت لە کەم و کورتی، هەمیشە پێویستم بە ڕەحمەتت هەیە، دوات لێدەکەم ئەی ڕێکخەری هەموو کارەکان، شیفابەخشی سینەو دەروون، وەك چۆن ڕێگە نادەی دەریاکان لە تەنیشت یەکدا تێکەڵ بەیەك ببن، ئاوا من بپارێزە لە سزای ئاگر، لەو بانگەی ئەهلی ئاگر دەیکەن و هاوار دەکەن بە وەیل و هیلاك چوون، وە لە فیتنەو ناڕەحەتیەکانی ناو گۆڕ.

ئەی خودایە: ئەوەی ڕاو ئیجتیهادی من نەیگرتبێت، وە کردارەکانم

---

بحديثٍ واحد، وأوردهُ ابن عدي في الكامل ( ٨٨/٣(٦٣٠) وساق له بضعة عشر حديثاً ثم قال: عندي لابأسَ بِرواياته عن أبيه عن جدهِ، واحتَجَّ بهِ مُسلِم، وخرَّجَ لَهُ الأربعة.

بەرامبەری لاواز بووبێت، وە نیەت پێی نەگەیشتبێت، لەو خێرەی کە بەڵێنت داوە بۆ یەکێك لە بەندەکانت، یان چاکەیەك تۆ دەیبەخشیت بە دروستکراوانت، من ئەوا حەزو خواستم لەو شتانەیەو، داوات لێدەکەم کە پێیان بگەم ئەی خاوەن ڕەحم و میهرەبان.

ئەی خودایە: بمانگێڕە لەوانەی ڕێنمایی کراون و لەسەر ڕێگەی چاکان دەڕۆن، نەك ڕێگەی گومڕاو گومڕاکاران، لەوکەسانە بین کە لەدژ نەیارانت شەڕ و هەڕەشە بین و بۆ خزمەتی دۆستانیشت ئاشتی، بە خۆشەویستی تۆ خۆشمان بوێن، هەموو ئەوانەی کە گوێ ڕایەڵی تۆن لە دروستکراوانت، وە بە دوژمنایەتی تۆ بۆ نەیارانت، ئێمەش دژایەتیان دەکەین، لە ناحەزە دروستکراوەکانت.

ئەی خودایە: ئەوە نزای منە و، تۆیش بە میهرەبانی خۆت لوتف بفەرموون کە بێن بە دەممەوە، ئەمە کۆششمە و پشت و پەنایش تەنها تۆی، ئێمە موڵکی خوداین و، تەنها بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە، هیچ هێزو پەنایەکیش نیە پشتی پێببەستین و هێزمان پێببەخشێت تەنها لە ڕێگەی خودای گەورەدا نەبێت.

ئەی خاوەنی حەبلی مەتین و بەتین و ، دارای فەرمانی پڕ لە دانایی:

لەڕۆژی هاتنە پێشەوەی هەڕەشەکانتدا داوای ئاسوودەیی و ئارامیت لێدەکەم، وە داوای بەهەشتی ڕۆژی هەتا هەتایی دەکەم، ژیانم لەگەڵ نزیکە بینراوەکان و، خاوەن ڕکوع و سوجدە بردووەکاندا بێت، ئەوانەی وەفایان بە بەڵێنەکانیان کرد، بەڕاستی تەنها تۆ خاوەنی نەرمی و سۆز و میهرەبانیت، ئەوەی بشتەوێت ئەنجامی دەدەیت.

پاکو خاوێنی بۆ ئەو خودایەی: کە بەرگی شکۆمەندی و عیززەتی پۆشیوەو ، دەسەڵاتی هەیە بەسەر هەموو خاوەن شکۆیەکدا.

پاکو خاوێنی بۆ ئەو خودایەی: پۆشاکی گەورویی و عەزەمەتی پۆشیوەو ئەوەندەی دیکە پێی ڕێزدارتر دەناسرێیت. پاکو خاوێنی بۆ ئەو خودایەی: کە

جگه لەو نابێت تەسبیحات بۆ هیچ کەسێکە تر.

پاکوو خاوێنی بۆ ئەو خودایەی؛ کە خاوەنی فەزڵ و نیعمەتەکانە.

پاکی و بەرزی بۆ ئەو زاتەی کە خاوەنی تواناو سەخاوەتە، وە سەرژمێری هەموو شتێکی کردووە بەو زانستە نەبڕاوەی کە هەیەتی.

ئەی خودایە: نوورێك بخەرە ناو دڵمەوە،وە نوورێك لە ناو گۆڕەکەم.وە نوورێك لە ناو گوێمدا ئایەتەکانتی پێ ببیستم، وە نوورێك لە ناو چاومدا، وە نوورێك لە ناو مووەکانمدا، وەنوورێك لەناو پێستمدا، وە نوورێك لە ناو گۆشتمدا، وە نوورێك لە ناو خوێنمدا، وە نوورێك لە ناو ئێسکمدا، وە نوورێك لە نێوانی دەستەکانمدا، وە نوورێك لە پشتمەوەو، وە نوورێك لای ڕاستمەوە، وە نوورێك لەلای چەپمەوە، وە نوورێك لەسەر سەرمەوە، وەنوورێك لە بن پێمەوە.

ئەی خودایە؛ زیاتر نوورانیم بکەیت، وە نوورم پێببەخشیت، وە نوورێکی گشتگیریشم پێببەخشیت هەموو نوورە پێشووەکان بگرێتەوە.

## دوعای (حەزرەتی) عائشە:[1].

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) : لەسەرتە کە ئەم دوعایە بخوێنیت کە هەموو واتای نزاو دوعاکانی تری تێدا کۆبووەتەوە:

((عليكِ بالجَوامِعِ الكَوامِلِ: قُولي: اللَّهُمَّ: إنِّي (أسألكَ الصلاةَ علَى مُحمَّد وعَلى آلِ مُحمَّد و) أسأَلُك مِن الخَيرِ كُلِّه عَاجِلِهِ وآجِلِهِ، ما علِمتُ مِنهُ ومَا لَم أعلَم، وأعوذُ بِكَ مِن الشَّرِّ كُلِّه عَاجِلهِ وآجلهِ مَا عَلِمتُ مِنهُ ومَا لَمْ أعلَمْ، وأسأَلُكَ الجنَّةَ ومَا قَرَّبَ إلَيها مِنْ قَولٍ أوْ عَمَلٍ، وأعوذُ بكَ مِنَ النَّارِ ومَا قَرَّبَ إليها مِنْ قَولٍ وعَملٍ، واسأَلُكَ مِنَ الخَيرِ مَا سأَلَكَ عَبدُكَ ورَسُولكَ مُحمَّدٌ صلَى اللهُ عليهِ وسَلَّم، وَأَسْتَعيذُكَ مِمَّا اسْتَعاذَكَ مِنهُ عَبدُكَ

---

(١) بۆیە دراوەتە پاڵ (حەزرەتی) عائیشە،چونکە پێغەمبەرﷺ فێری ئەوی کردووە،إتحاف٥/٦٦.

**وَرَسُولكَ مُحمَّدٌ صلى اللهُ عليهِ وسَلَّم ، وأَسأَلُكَ مَا قَضَيتَ لِي مِنْ أمْرٍ أَنْ تَجْعَلَ عَاقِبَتَهُ رُشْداً، بِرَحْمَتِكَ يَا أَرْحَمَ الرَّاحِمِينْ** [1]،

ئەی خودایە: دوای صڵاواتدان لە سەر(حەزرەتی) موحەممەد ﷺ وئال و بەیتی:

ئەی خودایە: داوات لێدەکەم لە خێروچاکە هەموویم پێببەخشیت، ئەوانەی بە خێرایی بۆم دەنێریت یان لە دواییدا، ئەوەی پێی دەزانم یان پێی نازانم، وە پەنات پێدەگرم لە هەموو جۆرەکانی شەڕ، ئەوەی دەستەو ئێخەیە و، ئەوەش کە لەمەودا ئەگونجێ تووشی ببین، پێیان بزانم یان نەزانم.

وە داوای بەهەشت و هەر هۆکارێکت لێدەکەم لە قسەو کردار کە بۆ لای بەهەشتم نزدیك بخاتەوە، وە پەنات پێدەگرم لە ئاگر و هەر هۆکارێك لە گوتار و کردار کە لە ئاگرم نزیك دەخاتەوە، وە لە خێرو چاکە، داوای ئەوەت لێدەکەم، کە بەندەو پێغەمبەرت (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ داوای لێ کردوویت، وە پەنات پێدەگرم لە هەموو شەڕێك کە بەندەو پێغەمبەرکەت (حەزرەتی)موحەممەد ﷺ پەنای لێ گرتوویت، وە داوایشت لێدەکەم هەر کارێکت بۆ دانام و هێناتە ڕێگام، داهاتوویەکی پڕ لە خێری تێدا بێت، لەبەر خاتری سۆزوڕەحمەتی خۆت،ئەی لەهەموو بەڕەحمەکان بە سۆزو میهرەبان تر.

## نزای (حەزرەتی) فاطیمە (خوای لێ ڕازی بێت) :

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

ئەی فاطیمە: چی ڕێگریت لێدەکات، کە ئەو وەصێتەی بۆت دەکەم بیبیستیت و جێبەجێی بکەیت، کە بڵێیت:

**(( يا حَيُّ يا قَيُّومُ بِرَحمَتِكَ أَستَغيثُ، لاتَكِلْني إِلى نَفسي طَرفَةَ عَين، وأَصلِح لي**

---

(١) رواه ابن ماجه (٣٨٤٦)، وهو في القوت ٨/١. والحاكم في المستدرك(١/٧٠٢ (١٩١٤) وصححه من حديثها، وقال الزبيدي٥/٦٦: وكذلك رواه البخاري في الأدب المفرد، ص/٢٢٢(٦٣٩) وأحمد في المسند ٢٤٤٩٨)، وابن عساكر في تأريخ دمشق٥٤/١١٢).

**شَأْني كُلَّهُ))**[1]، ئەی خاوەنی ژیانی هەتاهەتایی، کە ڕێکخەری هەموو کارەکانیت، پەنام بە ڕەحمەتی تۆ هێناوە، بۆ چاوتروکاندنێکیش مەمدە بە دەستی نەفسی بەدخوومەوە، وە هەرچی کارو بارم هەیە خۆت هەموویم بۆ چاك بکە.

## نزای (حەزرەتی) ئەبوبەکری صدیق

**(خوای لێ ڕازی بێت) :**

(حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ ئەم دوعایەی فێری (حەزرەتی) ئەبوبەکری صددیقی (خوای لێ ڕازی بێت)، کە بڵێت:

**((اللَّهُم أني أسأَلُك بمُحمَّدٍ نبيِّكَ، وإبراهِيمَ خَليلِكَ، ومُوسَى نَجِيِّكَ، وعِيسى كَلِمَتِكَ وَرُوحِكَ، وبتَوراةِ مُوسى، وإنجيلِ عِيسى، وزَبُورِ داوود، وفُرقَانِ مُحمَّدٍ صلَى اللهُ عليهِ وسَلَّم وعلَيهِم أجمَعِين، وبكُلِّ وَحْيٍ أَوْ حَيتَهُ، أو قَضاءٍ قَضَيتَهُ، أو سائِلٍ أعْطَيتَهُ، أَو غَنِيٍّ أقْنَيتَهُ ، أَوْ فَقيرٍ أغْنَيتَه، أوْ ضَالٍّ هَدَيتَهُ، وأسأَلُكَ باسمِكَ الَّذي أنزلتَهُ علَى مُوسى عَليهِ السَّلام، وأسْأَلُكَ باسمِكَ الَّذي بثَثْتَ بهِ أَرزاقَ العِبادِ، وأسأَلُكَ باسمِكَ الذي وضَعتَهُ علَى الأَرضِ فاستَقَرَّت، وأسأَلُكَ باسمِكَ الذي وضَعتَه عَلَى السَّمواتِ فاستَقَلَّتْ، وأَسأَلُكَ باسمِكَ الذي وضَعتَهُ علَى الجِبالِ فَرَسَّتْ، وأسأَلُكَ باسمِكَ الذي استَقَلَّ بهِ عَرشُكَ، وأسأَلُك باسْمِكَ الطُّهْرِ الطَّاهِرِ الأَحَدِ الصَّمَد الوَتْرِ المُبارَك المُنَزَّلِ في كِتابِكَ مِنْ لَدُنْكَ مِنَ النُّور المُبِينِ ، وأسأَلُك باسمِكَ الذي وضَعتَهُ علَى النَّهارِ فاستَنارَ، وعَلى اللَّيل فأَظلَم، وبعَظَمتِكَ وكِبرِيائِكَ، وبنُورِ وَجهِكَ الكَرِيمِ أَنْ تُصَلِيَ علَى سيدنا محَمَّدٍ وآلِهِ، وأَنْ تَرزُقَني القُرآنَ والعِلْمَ بِهِ وتَخلِطَهُ بلَحْمي ودَمِي وسَمْعي وبَصَرى، وتَستَعمِلَ بهِ جَسَدِي بِحَولِكَ**

---

(١)رواه النسائي في السنن الكبرى(١٠٣٣٠) وهو في قوت القلوب ٨/١. وأخرجه النسائي في اليوم والليلة(ص/٣٨١(٥٧٠) والحاكم في المستدرك ٧٣٠/١(٢٠٠٠) من حديث•أنس وقال صحيح على شرط الشيخين.

**وقُوَّتِكَ، فإنَّهُ لاَ حَوْلَ ولاَ قُوَّةَ إلاَّ بِكَ يا أَرحَمَ الرَّاحِمِينَ)**[1]،

ئەی خودایە: من داوات لێدەکەم لەبەرخاترو ڕێزی پێغەمبەرەکەت موحەممەد ﷺ وە ئیبراهیمی خەلیل و خۆشەویستت، وە موسای ڕزگار کراوت، وە عیسای کەلیمەو خەلقکراوو پەیام پێدراوت، وە دروستکراو بە فوویەك لە ڕوحەوە بە فەرمانی خۆت، وە پەنات پێدەگرم: بە تەوراتی موساو، ئینجیلی عیساو زەبووری داوود و قورئانی موحەممەد(صەڵات و سەلامی خودایان لەسەر).

وە داوات لێدەکەم لەبەر خاتری هەموو ئەو نیگایەی بۆ سەر دڵەکانت ناردووتە خوارەوە، وە ئەو قەزاوەت و بڕیارانەی ئەنجامتداون، ئەو بەخشینانەی بە دواکارانتداوە، ئەو دەوڵەمەندانەی هەژارت کردوون و، ئەو هەژارانەی دەوڵەمەندت کردوون، وە ئەو گومڕایانەی ڕێنومابیت کردوون، وە داوات لێدەکەم بەو ناوە پیرۆزەی دات ناوە لەسەر زەوی و ڕای وەستاندووە، وە داتنا لەسەر ئاسمانەکان کە هەڵیگرت و ڕایگرتووە، وە دات بەسەر کێوەکاندا دامەزراوو جێگیری کردون، وە داوات لێدەکەم بەو ناوەی کە عەرشی بەرێنت پێ ڕاگرتووە، وە داوات لێدەکەم بە ناوە پاك و پوخت و پاڵفتەکەت، وە بە ناوە

---

(١) كذا في القوت ٨/١، والحديث بهذه القصة عزّاهُ الحافظ العراقي لأبي الشيخ في الثواب، ومن رواية ابن عباس ماراوه الطبراني في الدعاء (١٣٣٤) ومن رواية ابن مسعود رواه الخطيب في الجامع لأخلاق الراوى وآداب السامع ٣٩٢/٢)، وروى أبو داوود (٥٠٦٧) والترمذي(٣٣٩٢) من تعليم النبي ﷺ أبابكر دعاء: **قل اللهم فاطر السموات والارض عالم الغيب والشهادة، لا اله الا انت رب كل شيء ومليكه، أعوذ بك من شر نفسي، ومن شر الشيطان وشركه، وأن أقترف على نفسي سوءاً أو أجره إلى مسلم**. وروى ابن ابي شيبة واحمد والشيخان، البخاري(٨٣٤) ومسلم(٢٧٠٩) والترمزي والنسائي وابن ماجه وابن خزيمة وابو عوانه وابن حبان والدارقطني في الافراد عن ابي بكر رضي الله عنه قال: قلت لرسول الله صلى الله عليه وسلم علمني دعاء أدعو به في صلاتي، قال قل: **اللهم اني ظلمت نفسي ظلما كثيرا ولا يغفر الذنوب إلا أنت فاغفر لي مغفرة من عندك وارحمني انك انت الغفور الرحيم**.

تاك و فریادڕەس و پشتگیرکراوەکەت، کە لە کیتاب و پەڕاوەکەتەوە ناردووتەتە خوارەوە، لە لای خۆتەوە و لەو نووره ئاشکرایەتەوە سەرچاوەی گرتووە.

وەداوات لێدەکەم بەو نوورەی دات بەسەر ڕۆژدا تیشکی پەیداکرد و دات بەسەر شەودا تاریك بوو، وە داوات لێدەکەم بە عەزەمەت و گەورەیی و دەسەڵاتت، وە بە نووری ڕوی پیرۆزت، صەڵات و سەلام برژێنیت بەسەر (حەزرەتی) موحەممەددا و، فێربوونی قورئانم پێببەخشیت، شارەزام بکەیت لێی، وە لەگەڵ گۆشت و خوێن و گوێ و چاومدا تێکەڵاوی بکەیت، وە بە تواناو دەسەڵات و هێزی خۆت جەستەمی لەسەر بەکار بهێنیت، هیچ هێزو توانایەك بەبێ تۆ ناکرێ و ئەنجام نادرێت، ئەی لە هەموان بەڕەحم و میهرەبان تر.

## دوعای بورەیدەی ئەسلەمی (خوای لێ ڕازی بێت) :

دەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی : ئەی بورەیدە؛

ئایا چەند وشەیەکت فێر نەکەم؟ کە هەرکێك خودا مەیلی خێری لەگەڵیا هەبێت، فێری دەکات و هەرگیزیش لەبیریان ناکات؟ فەرمووی: عەرزمکرد: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا، صەڵاتی خوات لەسەر، فەرمووی: بڵێ:

**(( اللَّهُمَّ إِنِّي ضَعِيفٌ فَقَوِّ فِي رِضَاكَ ضَعْفِي، وخُذ إِلَى الخَيْرِ بِنَاصِيَتِي، واجْعَلِ الإسلامَ مُنتَهى رِضايَ، اللَّهُمَّ: إِنِّي ضَعِيفٌ فَقَوِّنِي، وإِنِّي ذَلِيلٌ فأَعِزَّنِي، وإِنِّي فَقِيرٌ فَأَغْنِنِي، يا أَرحَمَ الرَّاحِمِينَ))**[1].

**واتە: ئەی خودایە؛**

---

(١) رواه ابن أبي شيبة(٢٩٩٦٥)، والرامهورزى ص/٣٤٣)، والحاكم في المستدرك ٧٠٨/١(١٩٣١)، من حديث بريدة وقال: صحيح الإسناد، قال الزبيدي: وكذلك رواه أبو يعلي كما في فيض القدير للمناوي ١١٣/٣)، ورواه الطبراني في الأوسط. ٣٤٦/٦(٦٥٨٥)، من حديث عبدالله بن عمر وفي الاسناد أبو داود الأعمى وهو متروك،انظر الكامل لابن عدي، ٤٨٩/٨((٢٢٤٣)،ولفظهم: **ألاَ أُعملك كلمات من يرد الله به خيرا يعلمهنَّ اياه ثم لا ينسيه**

من لاوازم له ڕەزامەندی خۆتدا بەهێزم بکە. ناوچەوانم بەلای خێردا ببەو، ئیسلامیش بکەرە ئەو پەڕی ئاواتم کە پێی بگەم. ئەی خودایە؛ ئەمن خۆیشم بێ هێزم، لەسەر تەقوا بەهێزم بکە، کزو داماوم شکۆو عیززەتم پێبدە، هەژارم دەوڵەمەندم بکە، ئەی لەهەموان بەڕەحم و میهرەبانتر.

## دوعای قەبیصەی کوڕی موخاریق:

عەرزی پێغەمبەری کرد ﷺ کە نزایەکم فێر بکە بیخوێنم و خودا ی گەورە سوودم پێ بگەیێنێت؛ ئەوا تەمەنم زۆر بووەو، ناتوانم زۆر لەو شتانەی لە پێشتردا دەمکردن ئێستە بیانکەم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بۆ ئاسانکردنی کارو باری دونیات، کە نوێژی بەیانیت کرد سێ جار بڵێ: (( **سُبحانَ اللهِ وبِحَمدِهِ، سُبحانَ اللهِ العَظيمِ وبِحَمدِهِ،لاَحولَ ولاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ العَليِّ العَظيم**))، ئەگەر تۆ بیانڵێیت؛ ئەوا ئەمین دەبیت لە کوێر بوون و بەڵەکی و گولی و شەلەلی، وە بۆ دوارۆژیش کە بەکەڵکت بێت، ئەوا بڵێ:

(( **اللَّهُمَّ: اهْدِني مِنْ عِندِكَ، وأَفِض عليَّ مِنْ فَضلِكَ، وانشُر عليَّ مِنْ رَحمَتِكَ، وأَنزِلْ عليَّ مِن بَرَكاتِكَ، أَمَّا أَنَّهُ إذا وافى بِهِنَّ عبدٌ يومَ القِيامَةِ لَمْ يَدَعهُنَّ .. فُتِحَ لَهُ أَربَعَةُ أَبوابٍ مِنَ الجَنَّةِ يَدخُلَ مِنْ أَيِّها شاءَ**))[1]،

ئەی خودایە؛ لە لایەنی خۆتــەوە ڕێنماییم بکە، لە فەزڵی خۆت برژێنە بەسەرمدا، ڕەحمەتی خۆت با هەموو گیان و جەستەم دابگرێت، بەرەکەتی

---

**ابدا، قل: اللهم اني ضعيف فقو برضاك ضعفي، وخذ إلى الخير بناصيتي، واجعل الاسلام منتهى رضائي، اللهم إني ضعيف فقوني. وإني ذليل فاعزني، وإني فقير فارزقني.**

(١) رواه الطبراني في الكبير (١٨(٣٦٨) وابن السني في عمل اليوم والليلة/١٣٣/١٣٤، بنحوه، ولفظه عند صاحب القوت ٦/١. وهو عند أحمد في مسنده (٢٠٠٧٩) مختصراً من حدبث قُبيصة وفيه رجل لم يسم. قال الزبيدي٦٨/٥: وكذلك رواه الطبري في الكبير ٣٦٨/١(٩٤٠) ورواه أيضا في الدعاء ص/٢٣٣(٧٣٣) من حديث قبيصة.

خۆیشت ببارێنه بەسەرمدا، ئەگەرهەر بەندەیەك ئەم نزایەی بە بەردەوامی کرد، ڕۆژی دواییش وازی لێ ناهێنێت، چوار دەرگای بەهەشتی بۆ دەخرێتە سەر پشت، ئینجاخۆیشی سەرپشك دەکرێت لەهەر کامیانەوە دەچێتە ژورەوە.

## دوعای ئەبودەرداء (خوای لێ ڕازی بێت):

ڕۆژێك وتیان بە ئەبودەرداء:خانووەکەت سووتاوە، ئاگرێك لە گەڕەکەکەیان کەوتبوویەوە، فەرمووی: باوەڕناکەم خوداکاری واناکات، سێ جار دوپاتیان کردەوە، ئەو هەر ئەوەندەی دەفەرموو: کە باوەڕناکەم خودا شتی وابکات!

لە پاشان کەسێك هات و وتی: ئەی ئەبودەرداء؛

ئاگرەکە هەر کە لە ماڵەکەت نزیکبوویەوە یەکسەر کوژایەوە، فەرمووی: دەمزانی، وتیان پێی نازانین کام لە قسەکانت سەرسوڕهێنەر ترە، فەرمووی:

من لە پێغەمبەری خودام بیست ﷺ کە فەرموویەتی:

هەرکەسێك ئەم چەند وشەیە بڵێت، بە شەودا یان بە ڕۆژدا بیڵێت ، هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیێنێت،منیش ئەم نزاو وتانەم خوێندووە:

**((اللَّهُمَّ: أَنتَ رَبِّي لاإِلَهَ إِلاَّ أَنتَ. عليكَ توكَّلتُ. وأَنتَ رَبُّ العَرشِ العَظيم. لاَحولَ ولاَ قُوَّةَ إِلاَّ باللهِ العَليِّ العَظيم. ما شاءَ اللهُ كانَ. ومَا لَم يَشَأْ لَم يَكُنْ. أَعلَمُ أَنَّ اللهَ علَى كُلِّ شَيئٍ قَديرٌ. وأَنَ اللهَ قَدْ أَحاطَ بِكُلِّ شَيئٍ عِلْماً. وأَحصى كُلَّ شَيئٍ عَدَداً. اللَّهُمَّ : إِنِّي أَعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفسي. ومِنْ شَرِّ كُلِّ دابَّةٍ أَنتَ آخِذٌ بِناصِيَتِها. إِنَّ رَبِّي علَى صِراطٍ مُستَقيمٍ))**[١].

ئەی خودایە؛ تۆ پەروەردگاری منی، جگە لە زاتی تۆ هیچکەسێك نیە بە خودای بزانم، پشت و پەنام هەر بە تۆیە، تۆ خاوەن و خالیقی ئەو عەرشە گەورە بەرینەیت، هیچ کارو هێزو بڕیارێك بە بێ خودا ناکرێت و نادرێت، ئەوەی

---

(١) كذا في القوت(٩/١). ورواه الطبراني في الدعاء (٣٤٣) وابن السني في عمل اليوم والليلة ٥٥/(٥٨). مختصراً. الإتحاف: (٦٨/٥).

خودا بڕیاری لەسەر دابێت و مەیلی لێبێت، تەنها ئەوە دەبێت، ئەوەیش مەیلی لێنەبێت نابێت، وە من دەزانم کە خودا تەوانایە بەسەر هەموو شتێکدا، بەڕاستی خودای گەورە بە زانستەکەی هەموو شتێکی تەنیوە، وە سەرژمێری هەموو ژمێرراوێکیشی کردووە. ئەی خودایە: من پەنات پێدەگرم لە شەڕی نەفسی خۆم، وە لە شەڕی هەموو گیاندارێك کە بەسەر زەویدا دەڕوات، کە پێشەسەرو نێوچەوانیان لەبن دەسەلاتی تۆدان، ڕێبازی خودای من ڕێبازێکی دروست و ڕەوایە، هەرگیز لە ڕاستی لانادات.

## دوعای (حەزرەتی) ئیبراهیمی خەلیل

لەسە پێغەمبەرمان و لەسەر ئەویش بێت صەڵات و سەلام:

هەرکاتێك بەیانی بەسەردا بهاتایە فەرمووبەتی:

خودایە ئەمڕۆیش دروستکراوێکی تازەی تۆیە، بە تاعەتی خۆت لەسەرمی بکەیتەوە، وەکۆتاییەکەشی بە لێخۆشبون و ڕەزامەندی تۆ تێی بپەڕێنە، چاکەیەکم بە نسیب بکە لەو ڕۆژەدا کە لێیشم وەربگریت، وە پاڵفتەو زۆری بکەو، چەندجار پاداشتم لە سەری بدەرەوە، هەر کردەوەیەکی خراپیشم کردووە تیایدا، ئەوا لێمخۆش ببە، تەنها تۆ لێبوردەو بەخشندەیت، بەڕێزو بە سۆز و خۆشەویستیت. دەفەرموێت: ئەوەی بەیانی لێهات و ئەم دوعایە بخوێنێت، ئەوا شوکرانە بژێری ئەو ڕۆژەی ئەنجامداوە.[١] ،

## دوعای (حەزرەتی) عیسا

(لەسە پێغەمبەرمان و لەسەر ئەویش بێت صەڵات و سەلام) :

**دەیفەرموو: ئەی خودایە:** ئەوا ڕۆژم لەسەر هەڵات، ناتوانم ئەوەی پێم ناخۆشە لە خۆمی دوور بخەمەوە، وە ناشتوانم ببمە خاوەنی ئەوەی حەزم

---

(١) قوت القلوب١/٩.

لێیەتی، ئەوا ڕۆژم لێبوویەوەو، کارم بەدەستی غەیری خۆمەوەیە و، بوومەتە بارمتەی کردەوەکانم، هیچ هەژارێك نیە لەمن هەژار تر بێت.

ئەی خودایە: دڵی دوژمنەکەمم پێ خۆش مەکە، وە دڵی دۆستەکانیشم پێ ئازار مەدە، وە نارەحەتی و بەڵاکان ڕومەکەرە دین و ئاینمەوە، وە دونیا مەکە بە قیبلەگام، کە ئەو پەڕی خەمی لێ هەڵبگرم، کەسێکیش زاڵ مەکە بەسەرمدا، کەسۆز و بەزەیی نەبێت و ڕەحمم پێینەکات، ئەی لەهەموان بەسۆزو کەرەم و میهرەبانتر[1].

## دوعای (حەزرەتی) خضر (سەلامی خودای لەسەر)

دەڵێن: کەحەزرەتی خضرو ئیلیاس(سەلامی خودایان لەسەر)لەهەموو وەرزێکی ساڵدا کەبەیەك دەگەیشتن، لێك جودا نەدەبوونەوە بەبێ وتنی ئەم وشانە:

**(بسمِ اللهِ، ماشَاءَ اللهُ، لاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ، مَاشاءَ اللهُ، كُلُّ نِعْمَةٍ فَمِنَ اللهِ، مَاشاءَ اللهُ، الخَيرُ كُلُّهُ بِيَدِ اللهِ، مَاشَاءَ اللهُ، لاَ يَصْرِفُ السُّوْءَ إلاَّ اللهُ)**[2].

تەنها بە ناوی خوداوە؛ ئەوەی خودا ویستی لەسەربێت، هەمووشت بە ئارەزوی ئەو دەبێت، هیچ هێزێك نابزوێت بە بێ خودا، هەموو نیعمەتێك تەنها لە خوادوەیەو لەوی بناسە، ئارەزووە هەمووی لەدەست خودادایە، خێرو چاکە بەدەستی خودایە، هەمووشت بەمەیلی خودایە، کەس ناتوانێت خراپەت لەسەر هەڵبگرێت تەنها خودا نەبێت.

ئەوەی کە ڕۆژی لەسەرهەڵدێت سێ جار ئەم نزایە بخوێنێت ، پشت بە خودای مەزن ئەمین دەبێت لە سووتان و خنکان و دزین، ئەگەر خودا مەیلی لێبێت.

---

(١) رواه عبدالرزاق في المصنف(٣٧/١١)، وابن أبي شيبة في المصنف(٣٥٣٧٧) والبيهقي (٢٣٧).

(٢) كذا في القوت( ٩/١). ورواه ابن عدي في الكامل(٣٢٨/٢)، وابن عساكر في تأريخ دمشق (٤٢٧/١٦.) والديلمي كما في مسند الفردوس (٨٨٩٥) وانظر الإتحاف( ٦٩/٥).

## دوعای شێخ مەعرووفی کەرخی (خوای لێخۆش بێت)

محەممەدی کوڕی حەسسان دەفەرموێت: (حەزرەتی) مەعرووفی کەرخی خودای لێخۆش بێت فەرمووی پێم: ئایا دە کەلیمەت فێر بکەم. کە پێنجیان بە کەڵکی دونیات بێن و، پێنجیشیان بۆ دەسکەوتی قیامەت، هەرکەسێك بەم وشانە داوا بکات و بپاڕێتەوە لە خودا، دەبینیت خودا لێی نزیك دەبێت و نزاکەی بە هەند دەبیستێت؟ وتم: کەواتە بۆم بنووسە، فەرمووی:

نەخێر، بەڵام بۆت ئەڵێمەوە وەك چۆن بەکری کوڕی خونەیس (خوای لێخۆش بێت) بۆی وتمەوە:

**(حَسْبِي الله لدِيني، حَسبيَ اللهُ لدُنيايَ، حَسبيَ اللهُ الكريمُ لما أهَمَّني، حَسبيَ اللهُ الحَليمُ القَويُّ لمَن بَغَى عَليَّ، حَسبيَ اللهُ الرَشيدُ لمِن كَادَني بسُوءٍ، حَسبِي اللهُ الرَّحيمُ عنْدَ المَوتِ، حَسْبيَ اللهُ الرَّؤوفُ عِندَ المَسألةِ في القَبرِ، حَسبيَ اللهُ الكَريمُ عِندَ الحِسابِ، حَسبيَ اللهُ اللَّطيفُ عِندَ المِيزانِ، حَسْبيَ اللهُ القَويُّ عندَ الصِّراطِ، حَسْبِيَ اللهُ الذَّي لاإِلهَ إِلاَّ هُو، عَليهِ توَكَّلتُ وهُو ربُّ العَرشِ العَظيمِ)**[1] واتە:

خودای میهرەبانم بەسە بۆ پارێزگاری لە دینم، خودام بەسە بۆ دونیام، خودای بەرێزو کەرەم بەخشم بەسە بۆ هەرچییەك پێم گرنگ بێت، خودای حەلیم و بەهێزم بەسە بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ کەسێکدا هێرشی بۆ هێنابم، یان لەسەرم بە ناهەق دەرچووبێت، بۆ ئەوەی پیلانی خراپم دژ دەگێڕێت، بەسمە بۆ کاتی مردن و کاتی جواب و پرسیاری گۆڕو لێپرسینەوەی ڕۆژی حەشرو کاتی کێشانەو پێوانەی کردەوەکان . خودابەسمە کە فریاد ڕەس و یارمەتیدەرم بێت، ئەو خودایەی بێ هاوتایە، تەنها پشتم بەو بەستووە، کە هەر ئەویشە پەروەردگاری ئەو عەرشە گەورەو بەرفراوانە.

دەگێڕنەوە لە ئەبودەردائەوەکە فەرموویەتی: هەرکەسێك هەموو ڕۆژێك

---

(١)قوت القلوب١/٩، وهو عند الحكيم الترمذي في نوادر الأصول، ص/٢١٧)عند بريدة مرفوعا.

حەوت جار بڵێت: ﴿فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ (التوبة/١٢٩) واتە: ئەگەر پشتیان لێ هەڵکردیت و، نەکەوتنە شوێن یاسای ئیسلام، پێیان بڵێ: یارمەتی و پشتیوانی خودام بەسەو، هیچ خودایە نیە بەڕاستی عیبادەتی بۆ بکرێت ئەو نەبێت، من تەنها پشت بەو دەبەستم، خودا پەروەردگاری عەرشی مەزنە [١]،

خوای گەورە هەموو فەرمان و مەبەستێك کە جێگەی بایەخی بێت بۆی جێبەجێ دەکات، ڕاست بکات یان درۆ بکات.[٢]،

**دوعای عەتەبەی غولام** (خودای لێخۆش بێت) دوای وەفاتی، لە خەودا بینیان و فەرمووی:بەهۆی ئەم چەند وشەوە من خرامە ناو بەهەشتەوە: **(اللَّـهُمَّ یاهَادِيَ الْمُضلِّينَ، ويَاراحِمَ الْمُذنبينَ، ومُقيلَ عَثَراتِ العَاثِرينَ، ارْحَم عَبدَكَ ذَا الخَطَر العَظيم، والمُسلمينَ كُلَّهمْ أَجْمَعينَ، واجْعَلنَا مَعَ الأَخيارِ المَرْزُوقِينَ،الذينَ أنْعَمْتَ عَلَيهِمْ،مِنَ النبيّينَ والصِدّيقينَ والشُهَداءِ والصَّالِحينَ،آمينَ ياربَّ العالَمِينَ)**[٣].ئەی خودایە: ئەی ڕێنماییکاری سەرگەردانەکان، خاوەن بەزەیی بۆ گوناهباران، چاوپۆشی ددکەی لە هەڵەو زەللەکان، دەی کەواتە بە چاوی بەزەییەوە بنوارە بۆ ئەم بەندەیەت، کەلە ناو مەترسیەکی گەورەدایە، وە هەموو موسوڵمانانیش بە گشتی هەمان مەترسی چاوەنواڕیان دەکات و پێویستییان بەو ڕەحمەتەیە،ئێمەش بگێڕە لەو هەڵبژێردرا وانەی لەو نیعمەتە مەزنە بەشیان دراوە، بەهرەی تەواویان وەرگرتووە، لە پێغەمبەران و صددیقین و ڕاستگۆیانی دیوانی خوداپەرستی، لە شەهیدان و صاڵحان و پیاوچاکان،ئامین.ئەی لەهەموو خاوەن ڕەحمەکان میهرەبان و بەڕەحمتر.

---

(١) خوڵاصە (٢٠٧).

(٢) قوت القلوب ١/١٠. وقد رواه أبو نعيم في الحلية ٦/٢٣٨.

(٣) قوت القلوب ١/١٠. وقد رواه أبو نعيم في الحلية ٦/٢٣٨.

## دوعای (حەزرەتی) ئادەم

لەسە پێغەمبەرمان و لەسەر ئەویش بێت صەڵات و سەلام: (حەزرەتی) عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: کاتێك خودای میهرەبان ویستی تەوبە لە ئادەم پێغەمبەر وەربگرێت (سەلامی خودای لەسەر) هەستاو حەوت جار تەوافی بە چواردەوری کەعبەدا کرد، کە ئەو ڕۆژە خانووی لێ نەکرابوو، تەنها گردۆڵکەیەکی بەرزایی بوو، لە پاشان هەستاو دووڕکات نوێژی کرد و فەرمووی: ( اللَّـهُمَّ؛ إنَّكَ تَعلَمُ سِرِي وَعَلانِيَّتِي. فَاقبَلْ مَعْذِرَتِي، وَتعْلَمُ حَاجَتِي، فَاعْطِنِي سُؤلِي، وتَعْلمُ مَا فِي نَفْسِي، فَاغْفِرْ لِي ذَنبي، اللَّهُمَّ إنيَ أسألُكَ إيماناً يُباشِرُ قَلبي، وَيَقِيناً صَادِقاً حَتَّى أَعْلَمَ أَنَّهُ لَنْ يُصِيبَنِي إلاَّ مَا كَتَبتَهُ عَليَّ، فَأرضِنِي بِمَا قَسَمْتَهُ لِي، يَا ذَا الجَلاَلِ والإكْرامِ )

ئەی خودایە؛ تۆ نهێنی و کارە ئاشکراکانم دەزانیت، پۆزش و داوای لێبووردنم لێ وەربگرە، وە پێداویستییەکانم دەزانیت، ئەوەی داوای دەکەم پێم ببەخشە، دەزانیت چی لە ناو دڵمدایە، لە گوناهەکانم خۆش ببە.

ئەی خودایە؛ من داوای بڕوایەکت لێدەکەم، دڵم ڕاستەو خۆ دابگرێت و پڕی بکات، وە متمانەیەکی ڕاستگۆیانەم دەوێت، تا دڵنیا بم کە هیچ شتێکم بەسەر نایەت، ئەگەر خودا لەسەری نەنوسیبم، کەواتە ج بەشێکت بۆ دیاری کردووم ڕازیم بکە لەسەری، ئەی خاوەنی جەلال و کەرەم. خودای گەورە نیگای بۆ کرد: ئەوا من لێتخۆشبووم، وە هەر یەکێك لە نەوە و وەچەکانت بێتە دونیاوە و گوناه بکات و، هەمان ئەم دوعایە بخوێنێت، ئەوا لەویش خۆش دەبم، خەم و نارەحەتیەکانی هەڵدەگرم، بەرچاوی تێر دەکەم و، برسێتی لێ هەڵدەگرم، خۆم بازرگانی بۆ دەکەم و یارمەتی دەدەم، تا وای لێدێت؛ دونیا بە ناچاری دێت بەپیریەوە، با خۆیشی خوازیاری نەبێت.[١]

---

(١) رواه الأزرقي في أخبار مكة، ٢٠/١، عن عبدالله بن أبي سليمان وهو من روايةه السيدة

# دوعای (حەزرەتی) عەلی (خودای لێ ڕازی بێت)

لە (حەزرەتی) پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

**إنَّ اللهَ يُمَجِّدُ نَفسَهُ كُلَّ يَومٍ ويَقول:** واتە: خودای گەورە هەموو ڕۆژێك تاریف و تەمجیدی خۆی دەکات و دەفەرموێت:

**(إنّي أنا اللهُ رَبُّ العالَمين، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا الحَيُّ القَيُّوم، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا العَلِيُّ العَظيم، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا، لَمْ ألِدْ ولَمْ أولَد، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا العَفُوُّ الغَفورُ، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا مُبدِئُ كلِّ شيءٍ وإلَيهِ يَعود، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أناالعَزيزُ الحَكيم، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا الرَّحمن الرَّحيم، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنامالِكِ يَومِ الدِّين،إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أناخالِقُ الخَيرِ والشَرِ، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أناخالِقُ الجَنَّةِ والنَّارِ، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا الواحِدُ الأَحدُ الفَردُ الصَّمَدُ، الذي لَم يَتَخِذ صاحِبَةً ولاَ ولَداً، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أناالفَردُ الوَترُ، إنّي أنا اللهُ لا إلَه إلا أنا عالِمُ الغَيبِ والشَّهادَة، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا المَلِكُ القُدُّوسُ، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا السَّلامُ المُؤمِنَ المُهَيمِنُ، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا العَزيزُ الجَبَّارُ المُتَكَبِّرُ، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا الخالِقُ البارِئُ، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا الأَحدُ المُصَوِّرُ، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا الكَبيرُ المُتَعالُ، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا المُقتَدِرُ القَهَّارُ، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا الحَليمُ الكَريمُ، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا أهلُ الثَّناءِ والمَجدِ، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا أَعلَمُ السِرَّ وأَخفى، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا القادِرُ الرَّزَّاق، إنّي أنا اللهُ لاإلَه إلا أنا فوقَ الخَلقِ والخَليقَة)** [(١)].

---

عائشة، مرفوعاً، رواه الطبراني في الأوسط (٥٩٧١) وهو في القوت ١٠/١.

(١) هەربەم شێوە نوسراوە لە إتحافدا (٧١/٥). هەروەها لە قوت القلوب(١:١٣) لەگەڵ هەندێك پاش و پێشدا،

واتە: لە هەموویدا ڕستەی: (**إنِّي أَنا اللهُ لاإلَه إلا أَنا**)ی تێدایە، هەرکەسێك بەم ناوانە دوعا بکات، با بڵێت:

**إنَّكَ أَنتَ اللهُ الذي لاَ إلهَ إلاَّ أَنتَ**.. لە پاشان ڕستەکانی تری لەگەڵدا بڵێت.

بەڕاستی تۆ ئەو خودایەی کە هیچ پەرستراوێك نیە شیاوی پەرستن بێت جگە لە تۆ، کە زیندوو و هەڵسوڕێنەری کاروباری، بەرز و مەزنیت، لەکەس نەبویت و کەست لێنابێت، لێبوردە و بەخشندەیت، سەرەتای هەمووشتێك بەتۆوەیەو بۆ لای تۆ دەگەڕێتەوە، بەدەسەڵات و پەندیاریت، ڕەحم بەهەموان دەکەیت لە دونیاداو، بە بڕوادارانیش بەتایبەتی لە دواڕۆژدا، پادشای ڕۆژی قیامەتی، خالیقی خێر و شەڕ و بەهەشت وجەهەننەمی، تاکوو تەنها و بێ هاوەڵ و پشت پێبەستووی، کە پێویستت بە ماڵ و منداڵ نەبووە و نابێت، تەنها و وەتر و بێ هاوتای، زانای بەسەر جیهانی ئاشکرا و پەنهاندا، پادشای پاك و بێ خەوشی، سەلامەتی لە هەموو کەمووکورتییەك، ئاسایش بەخشی هەموان و، ئاگادارو پارێزگاری هەموو شتێکیت، زاڵیت بەسەر هەرشتێکدا کە بتەوێت بیکەیت، هەرچی بتەوێت بکرێت، وا لە خەڵکی دەکەیت و ناچاریاندەکەیت ئەوە بکەن، لەوە گەورەتریت کە پێویستیت بە هیچ شتێك هەبێت، یان هیچ ناتەواوییەکت تێدا بێت، صیفەتەکانی عیززەت و جەبەروت و خاوەنی عەزەمەت تەنها شیاوی تۆیە، دروستکاری هەموو جیهانیت و لە نەبوونەوە هێناوتەتە بوون و تاك و تەنهایت، وێنەی هەر دروستکراوێکت بەو شێوە کردووە کە خۆت دەتەوێت، گەورە و باڵادەستیت و، بەتواناو زاڵیت بەسەر هەرچیدا بتەوێت، بەڕاستی تۆ خاوەنی حیلم و کەرەم و خۆڕاگریت و، شیاوی ستایش و سەناو سوپاس گوزاریت، وە زانایت بەسەر هەموو نهێنی و شاراوەکانداو، خاوەنی تەوانایی و دابینکردنی بژێوی ژیانی هەموانیت و، لەسەرو هەموو دروستکراوان و پەیدابووەکانەوەیت.

ئەو کەسەی ئەم نزایە بەو تێروتەسەلییە بکات: لە تاقمی سوجدەبەرو

گەردن کەچ و تەوبەکاران دەژمێررێت. کە دەبێتە دراوسێی(حەزرەتی) موحەممەد و (حەزرەتی) موساو (حەزرەتی) عیسا(صەلات و سەلامی خودایان لەسەر) لە کۆشکی بەرز و شکۆمەنداندا. وە پاداشتی بەندە خواپەرستەکانی بۆ دەنوسرێت لە ئاسمانەکان و زەوی دا. وە صەلات و سەلامی خودا لەسەر گەورەمان حەزرەتی موحەممەد و هەموو بەندەیەکی پاك و پاڵفتە کراو.[1].

## دوعای ئیبنو موعتەمیر (سولەیمانی تەیمییە)

### وە تەسبیحاتەکانی (خودا لێی خۆش بێت)

دەگێڕنەوە کە یونسی کوڕی عوبەید (خوای لێ ڕازی بێت) لە خەودا پیاوێکی بینی لەوانەی لە وڵاتی ڕۆمەکان شەهید بووبوون، فەرمووی پێی:

لەوجیهانەی لای ئێوە، چ کردەوەیەکت بینی لە هەموویان گەورەتر بێت؟

ئەویش فەرمووی: تەسبیحاتەکانی (ئیبنو موعتەمیر)(خوای لێ ڕازی بێت) لە خزمەت خوادا جێگەیەکی تایبەتی هەیە، کە ئەمەی خوارەوەیە:

**(سُبحانَ اللهِ والحَمدُ للهِ ولاإِلَهَ إلاَّ اللهُ واللهُ أكبَرُ، ولاَحولَ ولاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ العَليِّ العَظيم، عَدَدَ ما خَلَق، وعَدَد ما هُوَ خالِقٌ، وزِنَة ما خَلَقَ، وزِنَة مَا هُوَ**

(١) فەرموودەکانی خودا بە ناوی خۆیەوە دەست پێدەکات، إني أنا الله، من خودای تاك و تەنهای ئێوەم، بەڵام وەك ئیمامی غەزالی دەفەرموێت: کە ئێمە نزاکان دەکەین دەبێت بڵێین: تۆ خوداوەندی تاك و تەنهاو بێ شەریکیت، وە تەواوی نزاکان بەم شێوە ڕوی گوتارەکەی لە خزمەتی خودا بێت، بۆیە دووبارەی واتای **(إني أنا الله لا إله إلا أنا)** م نەکردەوە لەبەر درێژی، بەڵام بەشێوەی خیطاب واتای لێك دراوەتەوە. ئەم فەرموودە لە (حەزرەتی) عەلی وە ڕیوایەتکراوە. (خودای لێ ڕازی بێت) بە مەرفوعی ، واتە نیسبەتی داوە لە پێغەمبەرﷺ ، رواه الديلمي كما في مسند الفردوس(٨١١٢)، وهو في قوت القلوب( ١٣/١) كذلك.

**خالِقٌ، ومِلْءَ مَاخَلَقَ،وَمِلْءَ ما هُوَ خالِقٌ، وَمِلْءَ سَمَواتِهِ ومِلءَ أرَضِيهِ، ومِثْلَ ذلِكَ، وأضعَافَ ذلِكَ، وَعَدَد خَلقِهِ وَزِنَةَ عَرْشِه، وَرِضا نَفسِهِ ومُنتَهى رَحْمَتِهِ، ومِدَادَ كَلماتِهِ، ومَبلَغَ رِضَاهُ، وحتَّى يَرضَى، وإِذَا رَضِيَ، وعَدَدَ مَا ذَكرَهُ بِهِ خَلقُهُ فِي جَمِيعِ مَا مَضَى، وعَدَد مَا هُمْ ذَاكِرُوهُ فيمَا بقَيَ، في كُلِّ سَنَةٍ وشَهْرٍ وجُمُعَةٍ، ويَومٍ ولَيلَةٍ وسَاعَةٍ مِنَ السَّاعَاتِ، ونَسْمَةٍ وَنفَسٍ مِنَ الأَنفَاسِ، وأَبَدٍ مِنَ الآبادِ، مِنْ أبَدٍ إِلَى أَبَدٍ، أَبَدَ الدُّنيَا وأَبَدَ الآخِرَةِ، وأكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، لاَ يَنقَطِعُ أوَّلُهُ وَلاَ يَنْفَدُ آخِرُهُ)**[1]،

پاك و خاوێنی و حەمد وسەنا بۆ خودای تاکووتەنهایە و جگە لە زاتی (الله) هیچ خودایەکی دیکە نیەو گەورەیی ڕەها و هێزو توانا تەنها بەخوداو لە خوداوەیە، کە بەئەندازە و ژمارەو کێشی دروستکراوەکانی بێت و ئەوەش لەمەودوا دروستیان دەکات، وە پڕاوپڕی ئاسمانەکان و زەویەکانی، وە هاو وێنەی ئەوە و چەندین جار لەمەش زیاتر، وە بە ژمارەی دروستکراوانی و کێشی عەرشی خودا و، ئەو پەڕی ڕەحمەتی خوداوەندو، مرەکەبی پێویست بۆ نوسینەوەی کەلیماتەکانی کە هەرگیز بە کۆتا ناگات، وە بەئەندازەی ڕەزامەندی خودا تا ڕازی دەبێت، وە ئەوکاتەیش کە ڕازی ببێت، وە بە ژمارەی ئەو کەسانەی پێشتریش ناوی خودایان بردووە، یان لەمەولا تەواوی دروستکراوەکانی ناوی دەبەن، لەهەموو ساڵ و مانگ و هەینی و ڕۆژ و کاژێرو چرکە ساتێکدا، وە لە هەموو کاتی هەناسەو بۆن و بەرامێکدا، تا هەتا هەتایە و لە ئەزەلەوە تا ئەبەد، لە ئەزەلی دونیاوە تا ئەبەدی دوارۆژوو هەتا هەتایی، وە لەوەش زیاتر، نە سەرەتاکەی بپچڕێت و تا بە کۆتایش بگات.

---

(١) كذا في القوت(١٠/١)، وقد روى صيغته عنه الخطيب في الجامع لأخلاق الراوي(٦٥٢/١).

## دوعای ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم (خوای لێخۆش بێت)

ئیبراهیمی کوڕی بەشار کە خزمەتکای بوو، دەڵێت: نزاو پاڕانەوەی ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم لە ڕۆژی جومعەدا کاتی بەیانی و ئێوارە بەم شێوەیە بوو:

**(مَرحَباً بيَومِ المَزيدِ، والصُّبحِ الجَديدِ، والكاتِبِ والشَّهيد، يومُنا هَذا يَومُ عِيد، اكتُب لَنَا مانَقُولُ بِسمِ اللهِ الحَميدِ المَجيد الرَّفيعِ الوَدودِ. الفعَّالِ في خلقِهِ مايُريد، أَصبحْتُ بِاللهِ مُؤمناً وبِلقائهِ مُصَدِّقاً، وبحُجَّتهِ مُعترِفاً، ومِنْ ذَنبي مُستَغفِراً، ولِرُبوبيَّةِ اللهِ (عَزَّوجَلَّ) خاضعاً، ولِسِوَى اللهِ في الأِلهيَّةِ جاحِداً، وإلَى اللهِ سُبحَانَهُ فقيراً، وعلَى اللهِ مُتوَكِلاً، وإلى اللهِ مُنيباً، أُشْهِدُ اللهَ وأُشْهِدُ ملائكتَهُ وأنبيَاءَهُ ورُسُلَهُ وحمَلَةَ عَرْشِهِ، ومَنْ خلَقَهُ، ومَنْ هُوَ خالِقُهُ، بأَنَّهُ هُوَ اللهُ الذي لا إلهَ إلاَّ هُوَ، وحْدَهُ لاَ شَريكَ لَهُ، وأنَّ مُحمَّدَا عَبدُهُ ورَسُولُه ﷺ تسليماً، وأَنَّ الجَنَّةَ حَقٌّ، والنَّارَ حقٌّ، والحَوضَ حَقٌّ، والشَّفاعةَ حَقٌّ، ومُنكراً و نَكيراً حقٌّ، ووَعدَكَ حَقٌّ،وَوَعِيدَكَ حَقٌّ، ولِقاءَكَ حَقٌّ، والسَّاعَةَ آتيةٌ لاَ رَيبَ فيهَا، وأَنَّ اللهَ يبْعَثُ مَن في القُبُور، علَى ذلِكَ أَحيَا، وعَليهِ أمُوتُ، وعَليهِ أُبعَثُ إنْ شاءَ اللهُ .**

**اللَّهُمَّ: أنتَ ربِّي لا إلهَ إلاَّ أنتَ خَلقتَني وأنَا عَبدُكَ، وأنَا علَى عَهدِكَ وَوَعْدِكَ ما اسْتَطَعتُ، فاغْفِرْ لي ذُنُوبي، فإنَّهُ لا يَغفِرُ الذُّنُوبَ إلاَّ أنتَ ،أَعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ ما صَنَعتُ، أَعوذُ بِكَ إلَهي مِن شَرِّ كُلِّ ذي شَرٍّ،**

**اللَّهُمَّ ؛ إِنِّي ظَلَمتُ نَفسي فاغفِرْ لِي ذنوبي، فَإِنَّهُ لايَغفِرُ الذُّنوبَ إلاَّ أَنتَ، واهْدِني لأَحسَنِ الأخلاقِ، فَإنهُ لا يَهدِي لأَحسَنِهَا إلاَّ أَنتَ، واصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَهَا فَإِنَّهُ لا يَصرِفُ سَيِّئَهَا إلاَّ أنتَ،. واهدِني لأَحسَنِ الأَخلاقِ، فإِنَّه لا يَهدِي لأَحسَنِها إلاَّ أَنتَ واصْرِفْ عَنِّي سيِّئَها فإِنَّه لا يَصرفُ سَيِّئُها إلاَّ أنتَ،**

**لبَّيكَ وسَعدَيكَ، والخَيرُكُلُّهُ بِيَدَيكَ، أَنا لَكَ وإِلَيكَ، أَستَغفِرُكَ وأَتُوبُ إِلَيكَ، آمَنتُ اللَّهُمَّ بِمَا أَرسَلتَ مِنْ رَسُولٍ، وآمَنْتُ اللَّهُمَّ بما أنزَلتَ مِن كِتابٍ، وصلَى اللهُ علَى مُحَمَّدٍ النبيِّ الأُميِّ ، وعلَى آلهِ وسَلَّمَ تَسليماً كثيراً، خاتِمِ كَلامي ومِفتاحِهِ، وعلَى أَنبيائهِ ورُسُلِهِ أَجمَعين، آمين يارَبَّ العالَمين.**

**اللَّهُمَّ ؛ أَورِدنا حَوضَهُ، واسقِنا بِكَأسِهِ مَشرَباً رَوِيّاً، سائِغاً هَنِيّاً، لانَظمَأُ**

بَعـدَهُ أَبَـداً، واحشُـرنا في زُمرَتِـهِ غَيـرَ خزَايـا ولاَ نـاكِثِينَ لِلعَهـدِ، ولاَ مُرتـابِينَ ولاَ مَفتونِينَ، ولاَ مَغضُوباً عَلَينا ولاَ ضالِّينَ.

اللَّهُمَّ: اعصِمني مِنْ فِتَنِ الدُّنيَا، وَوفِّقني لما تُحبُّ وتَرضَى . وأَصلِحْ لِي شَأني كُلَّهُ، وثَبِّتني بالقَولِ الثَّابتِ فِي الحَياةِ الدُّنيا وفِي الآخرَة، ولا تَضِلَّني، وإنْ كُنتُ ظالماً.

سُبحانَك سُبحانَكَ ياعَليُّ ياعَظيمُ، يا بارُّ يا رَحيمُ، يا عزيزُ يا جَبَّارُ، سُبحانَ مَنْ سَبَّحَتْ لَهُ السَّمَواتُ بأكنافِهَا، وَسُبحانَ مَن سَبَّحتْ لهُ الجِبالُ بأصْدائِهَا، وسُبْحَانَ مَنْ سَبَّحَتْ لـهُ البِحَـارُ بأمْواجِهـا، وسُـبحانَ مَنْ سَـبَّحَتْ لـهُ الحِيتـانُ بلُغاتِهَا، وسُبحَانَ مَن سَبَّحتْ لهُ النُّجومُ فِي السَّماءِ بإبرَاقِهَا، وسُبحَانَ مَنْ سبَّحَتْ لَـهُ الشَّـجَرُ بأُصُـولِهَا ونَضَـارَتِها . وسُـبحانَ مَـن سَـبَّحَت لَـه السَّـمواتُ السَّـبعُ والأَرضُـونَ السَّـبعُ، ومَـن فـيهِنَّ ومَـنْ عَلـيهِنَّ، سُـبحانَكَ مَنْ سبَّحَ لَـهُ كُلُّ شَـيْءٍ مِنْ مَخلُوقاتـهِ، تَبارَكـتَ وتَعالَيـتَ، سُـبحانَكَ سُبحانَكَ يـا حَيُّ يـا قَيُّـومُ، يـا عَلـيمُ يـا حَليمُ، سُبحانَك لا إلـهَ إلاَّ أَنتَ وحْدَكَ، لاَ شَريكَ لكَ، تُحْيِي وتُمِيتُ وأنتَ حَيٌّ لاَ تَمُوتُ، بيَدِكَ الخيرُ، وأنتَ علَى كُلِّ شَيْءٍ قَديرٌ) [1]، وصلَى اللهُ علَى مُحمَّدٍ وآلـهِ وسَـلَّمَ تسـليماً كَثيـراً. واتاكەیشی بەکورتی بەم شێوەیە: خۆشحاڵم بە هـاتنی ڕۆژی جـومعە کە بەرەکەتـی زیـادەی تێـدایە، لە بەیـانی نـوێ، لەنووسـەری سەرشان و شایەتەکان، ئەمرۆمان ڕۆژی جەژنە، ئەوەی دەیڵێین بینووسە:

بەناوی خـودای سوپاسکراوی خاوەن عیززەت، پلەبەرزی خۆشەویست، هەرچی بیەوێت دەیکات وەك مەیلی لێیەتی، منیش وا ڕۆژمکـردەوە، بە بـڕوای تەواو بە خـودا، بە گەیشـتن پێی لە ڕۆژی لیقـا، دان بە ڕاسـتی بەڵگەکانـدا دەنـێم، داوای لێخۆشـبوون بـۆ گوناهەکـانم دەکەم، ملکەچـی فەرمـانی پەروەردگارم، نکۆڵی خودایەتی غەیری خودادەکەم، هەژاری بەردەستی خودای خـۆمم، پشـت و پەنـای پێدەبەسـتم،وە بـۆ لای ئەو دەگەڕێمەوە،خـودایگەورەو

(١) كذا رواه أبو طالب في القوت،١/٧٣، وأبو نعيم في الحلية، ٨/٣٨)،وقد جاء بعضه مرفوعا.

فریشتەکانی گەواهی دەرن، وە پێغەمبەران و مورسەل و هەڵگرانی عەرش و، ئەوەیش کە دروستی کردووە و، ئەوەش کە دروستکاریەتی، کە بڕوام وایە ئەو خودای منە، کەس خودام نیە جگە لەو، بێ هاوەڵ و تاك و تەنهایە ، (حەزرەتی) موحەممەدیش ﷺ ڕەوانەکراوو بەندەی ئەوە، بەهەشت ڕاستەو، بڕوام بە بوونی دۆزەخ هەیەو حەوزی کەوسەر و شەفاعەت و، نەکیر و مونکەرو، بەڵێنەکانی تۆ و هەڕەشەکانیشت هەمووی ڕاستن، وە ڕاستیشە کە بەلیقای تۆ شاددەبین، ڕۆژی قیامەت دێتە پێشەوە و، هیچ گومانی تێدا نیە، وە هەموو ئەهلی ناوگۆڕ زیندو دەکاتەوە، لەسەر ئەم بڕوایەپشت بەخودا دەژیم و دەمرم و زیندوو دەبمەوە .

ئەی خودایە؛ تەنها تۆ پەروەردگارمی، کەسی تر خودای بەحەقم نیە، منت دروست کردووە، بەندەی تۆم، چەند لە توانامدا هەبێت لەسەر گفت و بەڵێنێك کە پێم داویت، پەنا دەگرم بەتۆ لە شەڕی ئەو خراپانەی کردوومن، وە پەنا ئەگرم پێت لەشەڕی هەموو خاوەن شەڕەکان.

ئەی خودایە؛ زوڵمم لە خۆم کردووە، لێم خۆشبە، کەس ناتوانێت لە گوناهەکانم خۆشببێت جگە لە تۆ، ڕێنماییم بکە بۆ باشترینی ڕەوشت و ئاکار، کەس ناتوانێت جگە لە زاتی تۆ، خووڕەوشتە خراپەکانیشم لێ دوورخەرەوە ، بەکەس دوورناکەوێتەوە بە تۆ نەبێت، ئامادەی گوێڕایەڵیم، بە خۆشحاڵییەوە دێم بە دەم فەرمانتەوە، خێر هەمووی لە دەستەڵاتی زاتی تۆدایە، من موڵکی تۆم و بۆلای تۆش دێمەوە، داوای لێبوردنت لێدەکەم و دەشگەڕێمەوە بۆلات، بڕوام بە هەموو پەیامە نێرراوەکانت هەیە بۆ پێغەمبەرانت، وە صەڵات و سەلامی خودا لەسەر پێغەمبەری نەخوێندەواری دانا، وە لەسەر ئال بەیتی، هەتا هەتایە.

کە کۆتایی قسەکانم و کلیلی دەرگای وتەکانم بەو زاتەیە، وە لەسەر تەواوی پێغەمبەران بە گشتی ، لێمان وەربگرە ئەی پەروەردگاری هەموو جیهانەکان.

خـــودایه ؛ بمـــانگەێنە بە حەوزی کەوســـەر، بە پەرداخە پیـــرۆزەکەی ئاواشـتـەمان بـکە، بە جۆرێـك ئاواشـتـەمان بفەرمـوو کە هەرگیـز تینوومـان نەبێتەوە، وە لە نـاو کـۆمەڵی حەزرەتـدا حەشـرمان بـکە. بەبێ ئەوەی تووشـی سەرشۆڕی و ڕسـوایی و پەیمان شـکاندن ببین. دامەزراوبین و دوور لە گومان و دودڵی و تاقیکردنەوە، نە غەزەب لێگیراو بین و نە گومڕاو سەرلێ شێواو.

ئەی خـودایە؛ بمپـارێزە لە فیتنەکانی دونیـا، بمـخە سـەر ئەو ڕێگـایەی کە پێت خۆشەو جێگای ڕەزامەندیتە، چاکسازی لە هەموو کارەکانمدا بفەرموو، لە دونیـاو دوارۆژدا زوبـانم جێگیـربکە لەسـەر وتەی حەق و ڕاسـتی، بـا زوڵمیشـم کردبێت مەهێڵە گومڕاو سەرلێشێواوم بم.

پـاکی و مـونەززەهی بۆتـۆیە بـۆ تـۆ، ئەی گەورەو مەزن، ئەی بەڕەحـم و بەبەزەیی، ئەی عەزیزو بەدەسەڵات.

پـــاکی بـــۆ ئەو زاتەی کە ئەرزو ئاســـمانەکان و کەنارەکـــان و ، کەژو بەرزاییەکان و دەریـاو شـەپولەکانیش تەسـبیحاتی بـۆ دەکەن. پاکی و بەرزی بـۆ ئەو خـودایەی کە نەهەنگەکـانی دەریـا و زوبـانە جیاوازەکانیـان تەسـبیحاتی بـۆ ئەکەن، وە ئەسـتێرەکانی ئاسـمان و بریسـکەکانی، وە درەخـت و ڕەگ و ڕیشـەو بەرهەمەکـانی، هەرحەوت نهۆمەکـانی ئاسـمان و زەوی، ئەوانەی لەسـەرینی و ئەوانەش لەناویدا دەژین، پاکی بۆ ئەو خودایەی هەمووشتێك تەسبیحاتی بۆ دەکات، بەرزی بڵندی شایستەی تۆیە.

ئەی خاوەنی حیلم و دەسـەڵات و زانـا و شـارەزا، جگە لەتۆ کەس شـیاوی پەرستن نیە، مردن و زیندوکردنەوە بە دەسەڵاتی تۆیە، خێر یش هەر لە ڕێگەی تۆوەیە تۆیە،تۆ زیندویت و هەرگیز نامریت،

وە توانات بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت.

# دەروازەی چوارەم

## چەند دوعایەکی وەرگیراو لە پێغەمبەر ﷺ وە لە صەحابەکان (خودا لێیان ڕازی بێت) سەنەدەکەیان پچڕاوە. هەڵبژاردەو

## کۆی ئەو نزایانەیە کە ئەبوطالیبی مەککی و ئیبنو خوزەیمەو ئیبنو مونزیر) (خودا لێیان خۆش بێت) کۆیان کردۆتەوە[1].

موریدی ڕێگای ئاخیرەت، واباشە کە ڕۆژی لەسەر هەڵان، یەکسەر یەکێك لە ویردەکانی دوعا کردن بێت، وەك لەمەودوا لە پەڕاوی (الأوراد) دا باسی دەکەین، جا ئەگەر تۆ لەوانەیت کە تۆوی کرداری چاکە دەچێنیت بۆ ئەوەی لە دوارۆژدا بەروبوومەکەی بخۆیت. وە چاو لە پێغەمبەر ﷺ دەکەیت لە نزاکانیدا، ئەوا لەدوای نوێژەکانت لە سەرەتای دوعاکانتدا بڵێ:

**سبحان ربِيَ العَلِيِّ الأَعلَى الوَهَّاب**[2]، **لا إلَه إلاَّ اللهُ وحْدَهُ لاشَرِيكَ لَه، لَهُ المُلكُ ولهُ الحمدُ وهُوَ علَى كُلِّ شَيئٍ قَدير.**[3] هەروەها بڵێ:

**رضيتُ باللهِ ربّاً، وبالإسلامِ ديناً، وبمُحَمَّدٍ صلَى اللهُ عليهِ وسلَّم نبيّاً.**

سێ جار ئەم ویردە بخوێنەرەوە، دوای دووپاتکردنەوەی بڕیاردانی گەورەیی و یەکتایی خودا و، پاکی و خاوێنی ئەو زاتە لە هەموو کەموکورتیەك، ڕایشی دەگەیێنێت: کە ڕازیم بەوەی (اللــــه) پەروەردگارمــــە ، وە ئیسلام ئاینمە، وە (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ پێغەمبەرمە و ڕەوانەکراوی خودایە.

---

(١) حيث قال أبوطالب (رضي الله عنه) في القوت( ١٤/١) : وحذفنا ذكر فضائل ذلك وما جاء من الروايات إيجازاً.

(٢) رواه أحمد في مسنده ٥٤/٤، والحاكم في المستدرك٤٩٨/١.

(٣) رواه البخاري (٥٠٧٢)، والترمذي (٢٣٨٩)، وابن ماجه(٣٨٧٠).

**اللَّهُمَّ : فاطِرَ السَّمواتِ والأَرضِ، عالِمَ الغَيبِ والشَّهَادَةِ رَبَّ كُلِّ شَيءٍ ومَليكَهُ أشْهَــــدُ أنْ لاَ إِلـــــهَ إلاَّ أنـتَ أعُوذُ بكَ مِنْ شَــــرِّ نَفسي، ومِنْ شَـرِّ الشَّيــطانِ وشِرِكِه**[1]، ئەی خودایە: دروستکاری ئاسمانەکان و زەوی، زاناو ئاگادار بەسەر هەموو دیارو نادیارەکان، خاوەن و پەروەردگاری هەموو شتێك، شایەتی بە خودایەتی تۆ دەدەم و،پەنات پێدەگرم لە شەڕوداوی نەفس وشەیتان و ئەوەی ڕاماندەکێشێت بۆ دانانی هاوبەش بۆ خوداو هەموو داووپلانێکی شەیتان .

**اللَّهُمَّ: إنِّي أَسأَلُكَ العَفْوَ والعَافِيَةَ في ديني ودُنيَايَ، وأهلي وَمالي.**

**اللَّهُمَّ استُر عَورَاتي وَآمِنْ رَوعَاتي، وأَقِل عَثَراتي، واحْفَظني مِنْ بَينِ يَديَّ ومِنْ خَلفي، وعَن يَميني وعَن شِمَالي، ومِنْ فَوقي، وأَعوُذ بِكَ أن أُغتالَ مِنْ تَحتي**[2]،

ئەی خودایە؛ داوای لێبوردن و لەش ساغیت لێدەکەم ، دووربم لە کێشەکانی دونیاو دوارۆژ، خۆم و خێزان و مندالْم، کەموکوڕییەکانم داپۆشەو ترس و بیم و خەفەتمان بڕەوێنەوەو ، هەڵەکانم کەم کەرەوەو، لەهەموو لایەکەوە کە لەوانەیە دوچاری نارەحەتی ببم، لای ڕاست و چەپ و، پێش و دواو، سەروە خوارەوە بمپارێزە، وە بەتایبەتی پەنات پێدەگرم کە لە خوارەوە بەهیلاکمدا ببەن و بمفەوتێنن.

**اللَّـهُمَّ : لا تُـؤمِنِّي مَكـرَكَ ولاَ تُـوَلِّني غَيـرَكَ، ولا تَرفَـع عَنِّـي سِـتْرَكَ، ولا تُنسِـني ذِكرَكَ، ولاَ تَجْعلني مِنَ الغَـافلينَ**[3]،ئەی خودایە؛ دەسبەردارم مەبە و، مەهێڵە ڕسوابم، تا وام لێبێت ئەمینبمەوە لە مەکری تۆ، وە جگە لە زاتی خۆت

---

(١) رواه البخاري(١١٢٠)ومسلم (٢٧١٩)دون:وعلى كل غيب شهيد.وهي في سياق القوت(١١/١)

(٢) رواه أبو داوود(٥٠٦٧)، والترمذي(٣٥٢٩) وهو من دعاء سيدنا أبي بكر المتقدم تعليقا. والحاكم في المستدرك ٦٩٨/١(١٩٠٢) وصحح إسناده، من حديث ابن عمر حيث قال: **لم يكن النبي ﷺ يدع هؤلاء الكلمات حين يمسي وحين يصبح**. دون قوله : **وأقل عثراتي**.

(٣) رواه الديلمي كما في مسند الفردوس (٢٠١٧)، وابن نجار في ذيله على تأريخ بغداد (٢٢٨/١٦) وليس فيه: **ولا تولني غيرك**، وهي في القوت:( ٣٢/١).

مەهێڵە کەسێکی تر سەرپەرشتیارم بێت، وە پەردەی حورمەت و ڕێزم لەسەر هەڵمەگرە، وە ناوی خۆتم لەبیر مەبەرەوە، وە مەمگێڕە لەوانەی کە بێ ئاگان لە زیکری تۆ.

**اللَّهُمَّ: أنتَ ربي لاَإِلَهَ إلاَّ أنتَ. خَلَقتَني وأنا عَبدُكَ. وأنا علَى عَهدِكَ ووَعدِكَ ماستَطَعتُ، أعوذُ بِكَ مِن شَرِّ ماصَنعتُ، أبوءُ لكَ بِنِعمَتِكَ عليَّ، وأبوءُ علَى نَفسي بِذَنبي، فقد ظَلَمتُ نفسي واعتَرَفتُ بِذَنبي. فاغفِرْ لي ذُنوبي ما قَدَّمتُ مِنها وما أخَّرتُ، فإِنَّهُ لايَغفِرُ الذُّنوبَ جميعاً إلاَّ أنتَ ))**[1]،

**سێ جار ئەم دوعایە بخوێنێت**: واتە: خودایە تۆ پەروەردگارمی،جگە لەزاتی تۆ هیچ خودایەکی بە حەقم نیە، من بەندەی دروستکراوی تۆم، من تا بتوانم لەسەر گفت و بەڵێنی خۆمم، پەنات پێدەگرم لە هەموو ئەو خراپانەی کردوومن، ئەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ و، منەتباری هەموو ئەو نیعمەتانەی کە ڕژاندووتە بەسەرمدا، وە دێمەوە بەسەر نەفسی خۆمدا، لەسەر ئەو گوناهانەی کە کردوومن، بەڕاستی زوڵمم لە نەفسی خۆم کردووە، وە دان دەنێم بە تاوانەکانمدا، داوات لێدەکەم تۆیش لێم خۆش ببە، ئەو گوناهانەی پێشتر کردوومن، یان لە داهاتوودادەیانکەم، خۆ کەس نیە پەنای پێببەم و لەهەموو گوناهەکانم خۆش ببێت بێجگە لە زاتی تۆ نەبێت. وە سێ جار بڵێ:

**اللَّهُمَّ: عافِنِي في بَدَني، وعَافِنِي في سَمْعِي، وعَافِنِي في بَصَرِي، لاَإِلَـهَ إلاَّ أنتَ**[2]، خودایە تەن و جەستەم بپارێزە، لە نەخۆشی و ناخۆشی، وە هێزو توانای بیستن و بینینم ، ئەی ئەو زاتەی کە جگە لە تۆ، کەس شیاوی پەرستن نیە.

---

(١)قال العراقي رواه البخاري (٦٣٠٦)من حديث شداد بن أوس دون قوله: **وقد ظلمت نفسي واعترفت بذنبي**، ودون قوله: **ذنوبي ما قدمت منها وما أخرت**، ودون قوله : جميعا، قال الزبيدي :٥/٦٠)، ورواه أيضا أحمد وابن أبي شيبة والترمذي والنسائي وابن حبان والطبراني

(٢) رواه أبو داوود (٥٠٩٠)، والنسائي في الكبرى(١٠٣٣٢).

**اللَّهُمَّ: إنِّي أسأَلكَ الرِّضَا بعْدَ القَضَاء، وبَردَ العَيشِ بعْدَ المَوتِ، ولَذَّة النَّظَر إلَى وجْهكَ الكَرِيمِ، وشَوقاً إلَى لِقائِكَ، مِنْ غَيرِ ضَرَّاءَ مَضَرَّةٍ، ولاَ فِتنَةٍ مُضِلَّةٍ، وأعُوذُ بكَ أَنْ أَظلِمَ أوْ أُظلَمَ، أو أعتَديَ علَى أحَدٍ أو يُعتَدَى عليَّ، أو أكْسِبَ خطيئَةً أو ذَنباً لا تَغفِرُهُ**[1]

ئەی خودایە؛ داوات لێدەکەم،دوای هەر بڕیارێك كە تۆ بیدەیت ، ڕەزامەندیم پێببەخشیت لەسەری، وە ژیانێکی ئاسوودەی دوای مردن و، تام چێژی بینینین و گەیشتن بە خزمەتی زاتی پیرۆزت و شادبوون بە دیدارت بێبەشم نەکەیت، بێ ئەوەی دوچاری زیان و زیانەڕۆیی ببم، یان توشی فیتنەیەکی گومڕاکەر ببم، وە پەنات پێدەگرم کە زوڵم و ستەم لەکەس بکەم و، کەسیش ستەمم لێبکات،یان دەستدرێژی بکەمە سەرکەس و،کەسیش دەستدرێژیم بکاتەسەر، یان هەڵەیەك ئەنجام بدەم، یان گوناهێك كە تۆ لێم خۆش نەبیت.

**اللَّهُمَّ: إنِّي أَسأَلُكَ الثَّبَاتَ في الأمْرِ، والعَزِيمَة علَى الرُّشدِ، وأسأَلكَ شُكرَ نِعْمَتِكَ، وحُسْنَ عِبادَتِكَ، وأسْأَلُكَ قَلباً خاشِعاً سَليماً، وخُلُقاً مُستَقيماً، ولِساناً صَادِقاً، وعَمَلا مُتَقَبَّلاً، وأسْأَلُكَ مِنْ خَير مَا تَعْلَم، وأَعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ ما تَعلَمُ، وأَستَغفِرُكَ لِمَا تَعلَمُ، فانَّكَ تَعلَمُ ولاَ أعْلَم، وأنتَ علاَّمُ الغُيوب**[2]،

ئەی خودایە؛ داوای خۆڕاگریت لێدەکەم لە فرمانەکانمدا، خاوەن ئیرادەیەکی بەهێزبم لە ڕوشدو تێگەیشتندا، بتوانم سوپاسگوزاری نیعمەتەکانت بم، بەچاکی بەندایەتیت بۆ بکەم، وە داوات لێدەکەم دڵم کەچ کە بۆ زاتی خۆت و دووربێت لە کەموکورتی و، خاوەن ڕەوشتێکی ڕاست و ڕەسەن و ڕاوێستاو بم، زوبانێکی ڕاستگۆو کردەوەیەکی وەرگیراوبم، وە داوات لێدەکەم ڕێم لەباشترینی ئەو کارانە بخەیت کە دەیزانیت، وە دوورمبخەیتەوە

(١)رواه أحمد في المسند( ١٩١/٥) والحاكم في المستدرك. (٥١٦/١). وقال: صحيح الإسناد.
(٢) رواه الترمذي (٣٤٠٧)، والنسائي (٥٤/٣).

له خراپەکان و،داوای لێخۆش بوونیشت لێدەکەم لەو خراپانەی کردوومن و ئاگاداریان بویت،تۆ دەیزانیت و من نایزانم،تۆ زانای بەسەر هەموو نهێنیەکاندا.

**اللَّهُمَّ: اغفِر لي مَا قدَّمْتُ ومَا أخَّرْتُ، وما أسرَرْتُ وما أعلنْتُ. ومَا أنتَ أعلَمُ بهِ منِّي، فإنَّكَ أنتَ المُقدِّم وأنتَ المُؤخِّر، وأنتَ على كُلِّ شَيْئ قَديرٌ، وعلَى كلِّ غَيبٍ شَهيدٌ**[1]، ئەی خودایە؛ لەگوناهەکانی پێشترو دواترم خۆش ببە، ئەوەی بەنهێنی یان بە ئاشکرا کردوومن، ئەوانەی کەلە خۆم زاناتری بەسەریاندا، تۆ هەندێك لە بەنـــدەکانت پــێش خســـتووە بەوەی بەنــــدایەتیت بـــۆ دەکەن، وە هەندێکیشیانت دوا خستووەو دەسبەرداریان بوویت، زاتی تۆ تەوانات بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت، وە هەموو شتێکی نادیاریش دەبینیت.

**اللَّهُمَّ؛ إنِّي أسألكَ إيمَاناً لايَرتَدُّ، ونَعيماً لايَنفَدُ، وَقُرَّةُ عَينِ الأَبَدِ، ومُرافَقَةُ نبيِّكَ مُحمَّد صلَى اللهُ عليهِ وَسلَّم في أعْلَى جَنَّةِ الخُلدِ**[2]،

ئەی خـــودایە؛ بـــاوەڕو ئیمـــانێکم دەوێـــت کە هەرگیـــز هەڵـــگەڕانەوەی بەدوادانەیەت، نیعمەتێکی نەبڕاوەو. نوری چاوێکیشم دەوێت، کە دەوامکردنە لەســـەر زیکـــر و محەببەتـی خـــودا، کە هەرگیـــز لـــێم نەبڕێـــت، وە هـــاوڕێیەتی پێغەمبەرەکەتم پێببەخشە لە بەرزترینی پلەکانی بەهەشتی هەتاهەتاییدا.

**اللَّهُمَّ؛ إنِّي أسأَلُكَ الطَّيِّبـاتِ، وفِعْـلَ الخَيـراتِ، وتَـركَ المُنكَـرات، وحُبَّ المَساكِين، أسْأَلُكَ حُبَّكَ، وحُبَّ مَنْ أحَبَّكَ، وحُبَّ كُلِّ عَمَلٍ يُقَـرِّبُ إلَى حُبِّكَ، وأَنْ تَتُـوبَ عَلَيَّ، وتَغْفِـرَ لي وتَرحَمَني، وإِذَا أَردْتَ بقَـوْمٍ فِتنَـةً، فـاقْبِضْني إلَيـكَ غَيـرَ مَفتُونٍ**[3]، ئەی خودایە؛ من داوات لێدەکەم کە هەموو گوفتارو کردارێکی

---

(١) رواه البخاري(١١٢٠)ومسلم (٢٧١٩)دون وعلى كل غيب شهيد.وهو في سياق القوت(١١/١).

(٢) رواه أحمد في المسند(٤٤٥/١)، والطبراني في الكبير(٦٨/٩)، والحاكم في المستدرك(٥٢٣/١)، من دعاء سيدنا ابن مسعود عندما قال له المصطفى ﷺ (سلْ تُعطَهْ).

(٣) رواه الترمذي(٣٢٣٥).من حديث معاذ. وقال: حسن صحيح، ولم يذكر الطيبات. وهي في

پـاك و خـاوێنم پێببەخشـیت، وە یـارمەتیم بـدەیت لەسـەر بەئەنجامگەیانـدنی هەمـوو كردەوەیەكی چـاكە، بەڵكـوو بتـوانم وازلەكارە نەشـیاوەكان بهێـنم و، هەژارەكانم خۆش بوێت،وەداوات لێدەكەم كە تۆم خۆش بوێت و ئەوانەش كە تۆیـان خـۆش دەوێـت، وە هەمـوو كارێكیشـم خـۆش بوێـت، كە نـزیكم دەخـاتەوە لە خۆشەویسـتی تـۆوە، وە لـێم خۆشـببیت و، لـێم ببوریـت و ڕەحمیشـم پێبكەیت، وە ئەگەر ویستت كۆمەڵێك دوچاری تاقیكردنەوەیەك بكەیت، ئەوا من بگێڕەرەوە بۆ لای خۆت بە ئیمانەوە، كە توشی ئەو تاقیكردنەوە نەبم.

**اللَّهُمَّ: بعِلمِكَ الغَيبَ، وقُدرَتِكَ عَلَى الخَلقِ، أحْيِني مَا كانَت الحَيَاةُ خَيراً لي وتَوفَّني مَا كانَت الوَفَاةُ خَيراً لي، أسألُك الخَشيَةَ في الغَيبِ والشَّهادَة، و كَلمَةَ العَدلِ في الرِّضا والغَضَبِ، والقَصدَ في الغِنَى والفَقْرِ، وأسأَلُكَ لَذَّةَ النَّظرِ إلَى وَجهِكَ، والشَّوقَ إلى لِقائِكَ، وأعُوذُ بِكَ مِنَ ضَرَّاءَ مَضَرَّةٍ، وفِتنَةٍ مُضِلَّةٍ، اللَّهُمَّ زَيِّنَّا بزينَةِ الإيمَانِ، واجْعَلنَا هُداةً مُهْتَدِينَ** [1]،

ئەی خودایە؛ سوێندت دەدەم بەوەی كە غەیب و نەزانراوەكان دەزانیت و،

---

الدعاء للطبراني ص/٤٢٠(١٤١٨)، من حديث عبدالرحمن بن عائش، وقال صحيح الاسناد وقال الزبيدي٥/٧٧: وعن أبي الدرداء رضي الله عنه قال قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: **كان من دعاء داوود عليه السلام يقول: اللهم اني أسألك حبَّك وحب من يحبك والعمل الذي يبلغني حبك، اللهم اجعل حبك أحب إلَيَّ من نفسي و أهلي و من الماء البارد.** قال وكان رسول الله صلى الله عليه وسلم اذا ذُكر داوود عليه السلام، يحدِّث عنه قال: **كان أعبد البشر**، رواه الترمذي واللفظ له، وقال حسن غريب ورواه الحاكم في المستدرك١/٧٠٨(١٩٣٢)، وعن عبد الله بن يزيد الخطمي رضي الله عنه عن رسول الله صلى الله عليه وسلم انه كان يقول: **اللهم ارزقني حبك، وحب من ينفعني حبه عندك، اللهم ما رزقتني حبه فاجعله قوة لي فيما تحب، وما زويت عني مما أحب. فاجعله فراغا فيما تحب.** رواه الترمذي(٣٤٩١) من حديث عطاء بن السائب، وقال حسن غريب

(١) رواه النسائي ٥٤/٣)، والحاكم في المستدرك(١/٧٠٥/١٩٢٣)، وقال صحيح الإسناد.من حديث عمار بن ياسر (رضي الله عنه) : كان رسول الله ﷺ يدعو به.

تەوانایشت بەسەر هەموو درووستکراوێکدا دەشکێت، تەنها ئەوەندەم بژێنە کە ژیان سوودی هەبێت بۆم، وە ئەوکاتەش بممرێنە کە مردن لە بەرژەوەندیمدا بێت، دواکارم لەزاتی تۆ کە لە پەنهانی و ئاشکراییدا ترسی تۆ لە دڵمدا جێگیر بێت، وە قسەی دادگەری بکەم، لە حاڵی تورەیی و رەزامەندیدا، وە دووربم لە دەستبڵاوی لە کاتی هەبوون و نەبووندا، بۆیە داوای ئەوەت لێدەکەم کە چێژ وەرگرم لەوەی بە دیداری جەنابت شاد ببم. وە شەوقی لیقای خۆتم پێببەخشیت، وە پەنات پێدەهێنم، وە پەنادەگرم بەتۆ، کە تووشی زیانێك نەبم کە نەتوانم خۆم بەرامبەری ڕابگرم، وە تووشی هەڵدێرە و سەرگەردانیەکی گومڕاکەریش ببم، ئەی خودایە؛ بە جوانی ئیمان بمانرازێنەوە، کە ڕێنمایی کراوو ڕێپیشاندراو بین.

**اللَّهُمَّ: اقْسِمْ لَنا مِنْ خَشيَتِكَ مَا تَحُولُ بينَنَا و بَينَ مَعاصِيكَ، ومِن طاعَتِكَ ما تُبَلِّغَنا بهِ جنَّتَكَ، ومِنَ اليَقينِ، مَا تُهَوّنُ بهِ عَلَينَا مَصائِبَ الدُنيا**[1]،

ئەی خودایە؛ لە ترس وخۆفی خۆت ئەوەندەمان پێببەخشیت، کە ڕێگربێ لەوەی من بتوانم پەنا بۆ گوناه ببەم، وە لە ئەوەندەشم لە گوێڕایەڵی خۆت بەشبدە،کە بمگەێنێت بە بەهەشت، وە بڕواو متمانەیشم ئەوەندە پێببەخشە، کە هەموو موصیبەت و بەڵایەکی دونیام لەسەر ئاسان و ئاسایی ببێتەوە.

**اللَّهُمَّ: أَلْبِسْ وجُوهَنا مِنكَ حَياءً، وقُلوبَنا بِكَ فَرَحاً، واسكُنْ في نفُوسِنا مِن عَظَمتِكَ، وذلِّلْ جَوارحَنا لِخدمَتِكَ، واجعَلِ اللَّهُمَّ حُبَّكَ أحبَّ إلينَا مِمَّا سِواكَ،**

---

(١) رواه الترمذي (٣٥٠٢)، وتمامه: ومتعنا باسماعنا وابصارنا وقوتنا ما أحييتنا، **واجعله الوارث منا، واجعل ثأرنا على من ظلمنا، وانصرنا على من عادانا، ولا تجعل مصيبتنا في ديننا، ولا تجعل الدنيا أكبر همنا، ولا مبلغ علمنا، ولا تسلط علينا من لا يرحمنا.**

وقال حديث حسن، ورواه النسائي في اليوم والليلة (ص/ ٣١٠)(٤٠١)، والحاكم في المستدرك ١(/ ٧٠٩)(١٩٣٤)، وقال صحيح علي شرط البخاري من حديث ابن عمر **ان النبي صلى الله عليه وسلم كان يختم مجلسه بذلك.**

**واجعَلنا أخشَى لكَ ممَّا سِوَاكَ**[1]،

ئەی خـودایە؛ ڕوخسـارمان بپۆشـە بە شـەرم و حەیـا لە حزوورتـدا، وە دڵەکانمان بۆ خۆت و بەخۆت شادومان بکە. وە ناخ و دەروونمان بە مەزنی و گەورەیی خۆتان ئاوەدان بکەرەوە، ئەندامەکانی جەستەیشمان کەچ و زەلیل بکە بۆ هەستان بە خزمەت بە ئاینەکەت، خودایە وابکە کە خۆشەویستی جەنابت خۆشترین شت بێت لە لامان، وامان لێبکە کە لەهەموان زیاتر ترس و (خشیة الله) لە دڵماندا جێگیر ببێت.

**اللَّهُمَّ: اجعَل أوَّلَ يَومِنا هَذا صَلاحاً، وأوسَطهُ فلاَحاً، وآخِرهُ نجَاحاً، اللَّهُمَّ: اجعل أوَّلهُ رحمَةً، وأوسَطَه نِعمَةً، وآخِرهُ تَكرِمَة وَمَغفِرَةً** [2]،

ئەی خـودایە؛ سـەرەتای ئەم ڕۆژەمـان بە چـاك بگێـڕە، ناوەڕاستەکەیشـی مـایەی سـەرفەرازیمان بێـت، وە کۆتاییەکەیشـی بۆمـان ببێـت بەسـەرکەوتن، خـودایە سـەرەتای ڕەحـمەت و ناوەڕاستەکەیشـی نـیعمەت و، کۆتاییەکەیشـی کەرەم و ڕێزو لێخۆشبوون بێت.

**الحَمدُ للهِ الذي تَواضَع كلُّ شَيءٍ لعظَمَتهِ، وذَلَّ كُلُّ شَيئ لعِزَّتهِ، وخَضَع كُلُّ شَيئ لمَلكِهِ، واستسْلَم كُلُّ شَيئ لِقْدرَته، والحمْدُ للهِ الذي سَكنَ كلُّ شَيئ لِهَيبَتهِ، وأظهَر كُلُّ شَيئ بحِكمَتِه، وتصَاغَر كُلُّ شَيئٍ لِكِبريائهِ**[1]،حەمدوسەنا بۆ ئەو خودایەی

---

(١) قوت القلوب(١١/١) قال الزبيدي (٧٩/٥): ويشهد له مارواه أبو نعيم في الحلية (٢٨٢/٨)، عن الهيثم بن مالك الطائي، **اللهم اجعل حبك أحب الأشياء اِليَّ، واجعل خشيتك أخوف الأشياء عندي، واقطع عنَّا حاجات الدنيا بالشوق إلى لقائك، واذا أقررت أعينَ اهل الدنيا من دنياهم، فاقرر عيني من عبادتك**، وما رواه الطبراني في الأوسط (١٢٠/٦ (٥٩٨٢): عن أبي هريرة : **اللهم اجعلني أخشاكَ حتى كأني أراك**، الحديث...

(٢) رواه ابن مبارك في الزهد، (١٠٨٥)، وابن السني(٣٨) في عمل اليوم والليلة، إلى قوله: وآخره نجاحا، وتمامه عند صاحب القوت(١١/١).وأخرجه عبدالحميد في المنتخب (ص/١٨٨(٥٣١) والطبراني في الدعاء(ص/١١٣(٢٩٦) من حديث ابن أبي أوفى بالشطر الأول فقط.

هەمو شتێك گەردن کەچە لەبەردەم گەورویی و مەزنیەتی ئەودا، وە هەموو شتێکیش بێ هێزو کزو زەبوونە لەبەردەم شکۆمەندی ئەودا، وە هەموو شتێك خۆبداوە بەدەستەوە لەبەردەم تەوانایی ئەودا، حەمدو سەنا بۆ ئەو خودایەی، کە هەموو شتێك ئارام و بێ جوڵەو سەرکزە لەبەردەم سام و هەیبەتی ئەودا، وە بە دانایی و پەندیاری خۆی هەموو شتێکی ئاشکرا کردووە، لەبەردەم دەسەڵات و کیبریای ئەویشدا هەموو شتە گەورەو مەزنەکانیش بچووك و زەبوون دەنوێنێت، وە نرخ و بەهایان نامێنێت.

**اللَّهُمَّ: صلِّ علَى مُحمَّد وعلَى آلهِ وأزواجهِ وذُرِيَّتهِ، وبارك علَى محمَّدٍ وعلَى آلهِ وأزواجه وذُرِيَّتهِ، كمَا باركتَ علَى إبراهيمَ وعلَى آلِ إبراهيمَ، في العالمينَ إنَّك حميدٌ مجيدٌ**[2]، ئەوەش جۆرێکی صلاواتە کە بیدات، واتاکەی چەندجار کراوە.

**اللَّهُمَّ: صلِّ على محمَّد عبدِكَ ونبيِّكَ ورسُولكَ النبِّي الأميِّ، رسُولِ الأميِّينَ، وأعطِهِ المَقامَ المَحمودَ الذي وَعدتَهُ يومَ الدِّين**[3] خودایە پلەو مقامی بەرزو پیرۆز ببەخشە بە(حەزرەتی)موحەممەد ﷺ، کە بەڵێنت پێداوە بۆ ڕۆژی دوایی.

---

(١) رواه الطبراني في الكبير(٤٢٤/١٢) إلى قوله: الحمد لله الذي سكن.. وهو بتمامه في القوت١٢/١.

(٢) رواه البخاري (٣٣٦٩)، ومسلم (٤٠٧) بنحوه.

(٣) قوت القلوب (١٢/١)، دون (رسول الأميين) وسؤال المقام المحمود له ﷺ في البخاري(٦١٤)و عند الطبراني في الكبير٣١٦/٢٣. وللبخاري (٦٣٥٨)من حديث أبي سعيد اللهم صل على محمد عبدك ورسولك، ولابن حبان في صحيحه(٢٩٨/٥(١٩٥٩) والدارقطني في سننه(٣٥٤/١)، والحاكم في المستدرك(٤٠١/١(٩٨٨) والبيهقي في السنن الكبرى(١٤٦/٢(٢٦٧٢)، من حديث أبي مسعود اللهم صل علي محمد النبي الأمي، قال الدار قطني اسناده حسن، وقال الحاكم صحيح وقال البيهقي في المعرفة( ٤٠/٢(٩٠٢) اسناده صحيح وللنسائي من حديث جابر وأبعثه المقام المحمود الذي وعدته وهو عند البخاري وابعثه مقاماً محموداً بهذا اللفظ.

**اللَّهُـمَّ: إجْعَلنَـا مِـن أوليائِـكَ المُتَّقـينَ، وحِزبِـكَ المُفلِحـينَ، وعِبـادِكَ الصَّـالِحينَ، واستَعمِلنَالِمَرضَاتِكَ عَنَّا،ووَفِّقنا لِمَحابِّكَ مِنَّا،وصَرِّفنا بحُسنِ اختِيارِكَ لَنَا، نَسأَلكَ جَوامِعَ الخَيْرِ وفَواتِحَهُ وخَواتِمَهُ،ونعُوذُ بكَ مِن جَوامِعِ الشَرِّ وفَواتِحِهِ وخَواتِمِهِ**[1]

ئەی خـودایە؛ بمـانگێڕە لە دۆسـتە خوداناسـە تەقواکارەکانـت، وە تـاقمە سـەرفرازەکانت، وە بەنـدە صـاڵحە صـەفادراوەکانت، بـۆ ڕەزامەنـدی خـۆت بەکارمـان بهێـنە، یـارمەتی ئەوەمـان بـدە، کە لە پێنـاوی خۆشەویسـتی تـۆدا کاربکەین، وە بمانخەرە سەر ئەو ڕێگەی کە بەجوانی بۆت هەڵبـژاردوین، داوای کۆی هەموو خێرو سەرەتا و کۆتایی چاکەکانت لێدەکەین، وە پەنات پێدەگرین لە کۆمکار و کۆبەندی شەڕو سەرەتاو کۆتاییەکانی.

**اللَّهُمَّ: بقُدرتِك عَليَّ تُبْ عَليَّ، إنَّكَ أنتَ التَّوابُ الرحيمُ، وبحِلمِكَ عَنِّي أُعْفُ عنِّي إنَّك الغَفَّار الحَليم، وبعِلمِكَ بي ارفُق بي، إنَّك أنتَ أرحَمُ الرَّاحمِين، وبمِلْكِكَ لي مَلِّكْني نَفسي، ولا تُسلِّطْهَا عليَّ، إنَّـكَ أنـتَ المَلِـكُ الجَبَّـار، سُـبحانكَ اللَّهُـمَّ وبِحمْدكَ لا إلـهَ إلاَّ أنـتَ، عَمِلتُ سُوءاً وَظلَمتُ نَفْسي، فـاغفِر لي ذَنبي إنَّكَ أنتَ ربِّي، إنَّهُ لا يَغفِرُ الذُّنوُبَ إلاَّ أنتَ**[2]،

ئەی خودایە؛ بەوەی توانات بەسەر مندا هەیە تەوبەم لێ وەربگرە، چونکە

---

(١) قوت القلوب (١٢/١).وقوله (ونسألك جوامع الكلم)بنحوه عند الطبراني في الكبير٣١٦/٢٣.

(٢) قوت القلوب (١٢/١)، وقوله: **سبحانك وبحمدك..** رواه مرفوعا النسائي في عمل اليوم والليلة(٤٣٠). قلت وروي جعفر الفريابي في الذكر عن أبي سعيد الخدري من قال في مجلسه : **سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا اله إلا أنت استغفرك وأتوب إليك، ختمت بخاتم فلم يكسر إلي يوم القيامة**، وروى النسائي في السنن الكبرى(٦،١١٢(١٠٢٥٧) والطبراني في الكبير(٧٢٠/١(١٩٧٠) وأبو نعيم والحاكم والضياء عن نافع بن جبير بن مطعم عن أبيه من قال: **سبحان الله وبحمده، سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك، فإن قالها في مجلس ذكره، كانت له كالطابع يطبع عليه، ومن قالها في مجلس لغوٍ كانت كفارة له.**

هەرتۆ بەخشندە و بەبەزەییت، وە بەوەی کە خاوەنی حیلمیت لەگەڵ مندا، لێم ببورە، تۆ لێبوردە و خاوەن حیلم و ئارامیت، بەوەی شارەزاەی منیت، بە نەرم و نیانی لەگەڵمدا مامەڵە بفەرموو. بەڕاستی تەنها تۆی کە لەهەموو خاوەن بەزەییەکان بەبەزەیی تریت، کەمادەم تۆ خاوەنی منی، فەرمانبدە منیش ببمە خاوەنی نەفسی خۆم، کە زاڵ نەبێت بەسەرمدا، تەنها تۆ مەلیکی خاوەن هێزو دەسەلاتی، پاکی و حەمدو سەنا بۆتۆیە، کەس خودا نیە تۆ نەبێت، خراپەم کردووە،زوڵمم لە خۆم کردووە، لێم خۆش ببە،تەنها تۆ پەروەردگارمی، کەسیش ناتوانێت لە گوناهو تاوان خۆش ببێت بێجگە لەتۆ.

**اللَّهُمَّ: أَلهِمني رُشْدِي وَقِنِي شَرَّ نَفْسي**[1]، ئەی خودایە: فام و تێگەیشتنم پێببەخشە، وە دوورم بخەرەوە لەشەڕی ئارەزوو پەرستی نەفسی خۆم.

**اللَّهُمَّ: ارزُقني حَلالاً لاتُعاقِبُني عَليهِ، وقَنِعْني بِمَا رَزَقْتَني، واسْتَعْمِلْني بهِ صَالحاً تَقبَلُهُ مِني**[2]،

---

(١)قال العراقي رواه الترمذي (٣٤٨٣) من حديث عمران ابن حصين أن النبي ﷺ علَّمه لحَصِينْ وقال الحسن غريب ورواه النسائي في اليوم والليلة والحاكم في المستدرك (٦٩١/١(١٨٨٠) من حديث حصين وأبو عمران وقال صحيح علي شرط الشيخين أهـ قال الزبيدي(٥:٨٠٩): وفي الإصابة للحافظ ابن حجر(٨٤/٢(١٨٨٠) للحافظ ابن حجر في ترجمة والد عمران هو حَصين عن أبيه أتي النبي ﷺ قبل أن يسلم فقال: يا رسول الله: فما أقول الآن وأنا مسلم قال قل: **اللهم اغفر لي ما أسررت وما أعلنت وما أخطأت وما عمدت وما علِمتُ وما جهلت** وسنده صحيح

(٢)قال العراقي رواه الحاكم من حديث ابن عباس **كان النبي ﷺ يدعو اللَّهُمَّ قنعني بما رزقتني وبارك لي فيه واخلف لي عليَّ كلَّ غائبةٍ بخير**، وقال صحيح الإسناد ولم يخرجاه، قال الزبيدي٥/ ٨٠): رواه الحاكم في المستدرك من طريق سعيد بن جبير عن ابن عباس مرفوعا كما ذكروله، وابن أبى شيبة في المصنف(٤٤٣/٣(١٥٨١٦) وسعيد ابن منصور فى السنن والازرقي في تاريخ مكة (٣٤١/١)، عن ابن جبير قال: كان من دعاء ابن عباس الذى لا

ئەی خودایە؛ ڕزقێکی حەڵاڵم پێببەخشە، لێپێچینەوەم لەگەڵدا نەکەیت لەسەری، قەناعەتی تەواوم پێببەخشە بەو بەشەی بە منت بەخشیوە کە نەفسم پێی دابمرکێتەوە، وە بشتوانم لە خێر و چاکەدا بەکاری بهێنم، کە لێم وەربگریت. **أسألُكَ العَفْو والعَافِيَة، وحُسْنَ اليَقينِ، والمُعَافاةَ في الدُّنيَا والأخِرَة**[1]،

داوای لێبوردن و باشی و عافیەت و تەندروستیت لێدەکەم، لەگەڵ متمانەی باش و دووری لە نەخۆشی و ناخۆشی لە دونیا و پاشەڕۆژدا.

**يا مَنْ لاَ تَضُرُّهُ الذُّنوبُ، ولاَ تَنقُصُه المَغفِرَةُ، هَبْ لِي مَا لاَ يَضُرُّكَ، وأعْطِني ما لاَ يَنقُصُكَ**[2]،

ئەی ئەو زاتەی کە گوناهی هیچ کەسێك زیانت پێ ناگەیێنێت، وە لێخۆشبونیشت هەرگیز کەموکورتی ڕوناکاتە زاتت، دەی گوناهەکانم پێببەخشەرەوە، کە سوود بەتۆ ناگەیێنێت، وە بەخشندەیش بە لەگەڵمدا، خۆ هیچ کەم وکورتییەك ڕوو لە زاتت ناکات.

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ﴾ (الأعراف/١٢٦) خودایە ئارامی بەسەر دڵماندا بڕێژەو بە موسوڵمانی بمانمرێنە.

﴿أَنْتَ وَلِيِّي فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ﴾ (يوسف/١٠١) تۆسەرپەرشتیاری منیت لە دونیاو دواڕۆژداو، بەموسوڵمانی گیانم بکێشەو لە زومرەی چاکانیش هەژمارم بکە.

---

يَدّع بين الركن والمقام أن يقول: ربِّ **قنِّعني بمَا رزقتني وبارك لي فيه وأخلف على كل غائبة بخير** ولفظ سعيد والازرقي واحفظني في كل غائبة لي بخير انك على كل شيء قدير.

(١) قال العراقي رواه النسائي (ص/ ٢ . ٥ (٨٨٢) في اليوم والليلة وابن ماجه (٣٨٤٩) باسناد حسن من حديث أبي بكر الصديق بلفظ: **سلُو الله المعافاة، فأنه لم يُؤتَ أحدٌ بعدَ اليقين خيراً مِن المعافاة**، وفي رواية البيهقي في الدعوات (ص/١٨٠ (٢٥٢) **سلُوا الله العفو والعافية**.

(٢) رواه الدينوري في المجالسة وجواهر العلم (ص/٤١٢)، والديلمي كما في (مسندالفردوس) (١٩١٣)، عن سيدنا علي (رضي الله عنه) وهو في القوت( ١٠١٢).

﴿ أَنتَ وَلِيُّنَا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الْغَافِرِينَ. وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ﴾ (الأعراف/١٥٥)

تۆ گەورەو سەرپەرشتیارمانی، تاوانمان ببەخشەو میهرەبانیمان لەگەڵدا بکە، تۆ چاکترین تاوان بەخشی، لەم دونیایەدا بڕیاری نیعمەت و ئەنجامی چاکمان بۆ بدە و، لەو دونیایشدا پاداشت و بەهرەی باش، بێگومان مەیلی ئێمە بۆ لای تۆیە.

﴿رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴾ (الممتحنة/٤)

خودایە؛ ئێمە پشت و پەنامان بەتۆبەستووەو، بۆلای تۆ هاتوینەتەوەو، سەرەنجامیش هەموو هەر بۆلای تۆیە .

﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ (یونس/٨٥) خودایە مەمانخەرە ژێردەستی خودانەناسان و تاوانکاران، کە تووشی سزاو ئاژاوەمان بکەن.

﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا وَاغْفِرْ لَنَا رَبَّنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (الممتحنة/٥) خودایە؛ مەمانکە بە مەیدانی تاقیکردنەوە بۆ کافرەکان، بەوە کە زاڵیان بکەیت بەسەرمانداو، ئەوانیش سزامان بدەن و، ئێمەش لە ئەنجامدا دڵمان بگۆڕێت و ، کەواتە لێمانخۆش ببەو، هەر تۆ خاوەنی عیززەت و حیکمەتی.

﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴾ (آل عمران/١٤٧)

خودایە؛ گوناهمان بپۆشەو لە زیادەڕەویەکانمان ببورە و، دڵمان دامەزرێنە و، پێمان ڕاگیر بکەو، سەرمان بخە بەسەر کافرەکاندا،

﴿رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ﴾ (الحشر/١٠)

خودایە لە ئێمەو ئەو برایانەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە موسوڵمان

بوون، کینەو بەخیلی مەخەرە ناودڵمانەوە بەرامبەر باوەڕداران، خودایە تۆ میهرەبان و بەڕەحمی.

﴿ رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا﴾ (الكهف/١٠) خودایە لەلایەنی خۆتەوە ڕەحمەتمان بدەرێ و لە گوناهەکانمان ببورێ ڕۆزیمان بدەرێ و ، لە فێڵ و زۆری دوژمن ڕزگارمان بکەو لەمکارەدا کە لەسەرینی ڕێگای ڕوشدو ڕاستمان پێ نیشان بدە.

تێگەیشتن و سەرفرازیمان بۆ دابین بکە،

رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ(البقرة/٢٠١)

خودایە لە دونیادا چاکەم پێببەخشە لە لەشساغی و ئاسایش و ماڵ و خێزانی باش و خزمی باش و بەشی حاڵی خۆمان داراییمان پێببەخشە ، لە دوارۆژیشدا پاداشتی چاکمان پێببەخشەو، لە سزای ئاگر بمانپارێزە.

رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الْأَبْرَارِ، رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدْتَنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ (آل عمران/١٩٤)

ئەی خودایە؛ گوێمان لە دەنگی بانگەری ئیمانەوە بوو بۆ بڕوابوونیان بە خوداو ئاینی ئیسلام، ئێمەش بڕوامان هێناوەو موسوڵمان بووین،

کەواتە خودایە؛ لە گوناهە گەورەکانمان ببورەو، تاوانە گەورەکانمان بسڕەوەو، بەگەورەیی و میهرەبانی خۆت لە گوناهە بچووکەکانمان خۆشببەو لەگەڵ زومرەی پیاوچاکاندا بمانمرێنە، ئەو بەڵێنەی لەسەر زوبانی پێغەمبەرانت پێت داوین بۆمان بهێنەرە دی و، لەڕۆژی دوایی سەرشۆڕو ماڵوێران و ناهومێدمان مەکە، تۆ خاوەن بەڵێنی خۆتیت و، بەڵێنەکانت لەکاتی خۆیدا دێنەدی و جێبەجێ یان دەفەرمویت.

﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا، رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا، رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ، وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا

وَارْحَمْنَا، أَنْتَ مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ (البقرة/٢٨٦)

خودایە: لێمان مەگرەو، ئەگەر واجبێکمان لە بیرچوو یان هەڵەیەکمان کرد، سزامان مەدە، خودایە باری گران مەخەرە سەرشانمان، وەك ئەوەی خستووتەتە سەر شانی نەتەوەکانی پێش ئێمە.

خودایە؛ بارێکمان مەدە بەسەردا توانامان بەسەریدا نەشکێت، لە گوناهمان ببورە و، تاوانمان بپۆشەو بەزەییت بێتەوە پیاماندا و، میهرەبانیمان لەگەڵدا بفەرموو، تۆ پەروەردگارمانیت، تۆ گەورەمانیت، تۆ سەرپەرشتیمان دەکەیت، زاڵمان بکە بەسەر بێ دینە کافرەکاندا.[1]

ربِّ أغفرلي ولِوالديَّ وارْحمهُمَا كَمَا ربَّياني صَغيراً، واغفِرْ للمُؤمنينَ والمُؤمِناتِ والمُسلمينَ والمُسلِمَاتِ، الأحياءِ مِنهُم والأَموَات.

خودایە لە خۆم و باوك و دایکم خۆش ببە، وەك منیان بە منداڵی بەخێوکردو پێمەوە ماندووبوون، تۆیش ڕەحمیان پێبکە، وە خۆش ببە لە بڕواداران و موسوڵمانانی پیاوان و ئافرەتان، زیندوو مردووەکانیان.

رَبِّ اغفِرْ وارْحَم، وتَجاوَزْ عَمَّ تَعلَم، وأَنتَ الأَعَزُّ الأَكرَم، وأنتَ خيرُ الرَّاحِمينَ، وأَنتَ خيرُ الغافِرِينَ[2]، خودایە لێمان خۆش ببەو، لەو تاوانانەی تۆ دەیزانیت لە بارەمانەوە لێمان ببورە، تۆ خاونی کەرەم و عیززەتیت، تۆ باشترینی بەخشندە و بەڕەحمەکانیت. وإِنا لله وإِنَّا إِلَيهِ راجعون، ولاَ حولَ ولاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ العَليِّ العَظيم، وحَسبُنا اللهُ ونِعمَ الوَكيل،وصلى اللهُ على سيِّدِنا مُحمَّدٍ خاتَمِ النَّبيينَ وآلِهِ وصَحبهِ وسلَّمَ تَسليماً كثيراً.

---

(١) هەموو واتای ئەم ئایەتانەی پێشەوە لە خوڵاصەی تەفسیری نامی وەرگیراوە ( وەرگێڕ)

(٢) روى بعضة ابن أبي شيبة في المصنف(١٥٨٠٩) موقوفا على سيدنا وهو قوله:رب اغفر ورحم وأنت الأعز الأكرم، والسياق في القوت(١٣/١) ثم قال: فهذا جامع ماجاء من فضائل ما يقال من الدعاء عن المصطفى ﷺ وعن الصحابة وعن أئمة الهدى.

# جۆرەكانی پەناگرتن بە خودا

## كە لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێمان گەیشتووە

**اللَّهُمَّ: إِنِّي أَعوذَ بِكَ مِنَ البُخلِ، وأَعوذُ بِكَ مِنَ الجُبنِ، وأَعوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أُرَدَّ إلى أَرزَلِ العُمر، وأَعوذُ بِكَ مِنْ فِتنَةِ الدُّنيا، وأعوذ بِكَ مِن عَذابِ القَبرِ**[1]،

ئەی خودایە؛ بەڕاستی من پەنات پێدەگرم لە ڕژدی و بەخیلی، وە لە ترسنۆكی و تەمەنێكی وا، كە پیر و زەلیل و بێ دەسەلاَت و كوێرو دەبەنگ ببم، وە پەنات پێدەگرم كە تووشی بەلاَونەهامەتی نەبمەوە لە دونیادا، وەهەروەها پەناتپێدەگرم لە سزای قەبر. **اللَّهُمَّ: إِنِّي أَعوذَ بِكَ مِنْ طَمَعٍ يَهدي إِلَى طَبَعٍ، ومِنْ طمَعٍ فِي غَيرِ مَطمَعٍ، ومِنْ طَمَعٍ حيثُ لاَ مطمَعَ**[2].ئەی خودایە؛

من پەنات پێدەگرم لە تەماحێك سەربكێشێت بۆ ماڵی پیس و چڵك و چەپەڵی دونیا، وە لە تەماحێك لە شتێكدا جێگەی ئەو نەبێت ئاواتی بۆ بخوازم، یان پەنات پێدەگرم لە چاوچنۆكییەك كە ڕێی تێنەچێت بەدەس بێت.

**اللَّهُمَّ: إِنِّي أَعوذَ بِكَ مِنْ عِلمٍ لايَنفَعُ، وقَلبٍ لايَخشَعُ، ودُعاءٍ لايُسمَعُ، ونَفسٍ لاتَشبَعُ، وأَعوذُ بِكَ مِنَ الجوعِ؛ فَإِنَّهُ بِئسَ الضَّجيعُ، ومِنَ الخِيانَةِ؛ فَإِنَّها بِئسَتِ البِطانَةُ، ومِنَ الكَسَلِ و البخلِ و والجُبنِ ومِنَ الهَرَمِ . ومِنْ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرزَلِ العُمُر، ومِنْ فِتنَةِ الدَّجَّالِ، ومِنْ عذابِ القَبرِ، ومِنْ فِتنَةِ المَحيا والمَمات.**

ئەی خودایە: بەڕاستی من پەنات پێدەگرم لە زانستێكی بێ سوود، وە دڵێكی دوور لە خشووع، وە دوعایەكی وەرنەگیراو، وە نەفسێكی تێرنەخواردوو، وە پەنات پێدەگرم لە برسێتی، كە بەڕاستی خراپترین هاوڕێی كاتی نوستنە، چونكە لێی تێك دەدات، وە پەنات پێدەگرم لە ناپاكی و خیانەت، خراپترینی بەرگی شاراوەی دەروونە كە هاوڕێی مرۆڤ بێت، وە پەنات پێدەگرم لە تەمبەڵی و بەخیلی و ترسنۆكی و

---

(١) رواه البخاري (٦٣٧٥) من حديث سعد ابن أبي وقاص.

(٢) رواه أحمد في مسنده(٥/٢٤٧)، والطبع: الدنس.

پیربـوون، لەوەش کە تەمەنـم بگاتە ئاسـتی بێـزاری و زەلیلی و لاوازی، وە لە فیتـنـەی سزای گۆڕو هەموو فیتنەکانی کاتی ژیان و کاتەکانی دوای مردن.

**اللَّهُمَّ: إنَّا نسأَلُكَ قُلوباً أوَّاهَةً مُخبِتةً مُنيبَةً في سَبيلِكَ.**

ئەی خودایە: داوای دڵێکی پڕلە پاڕەو لاڵەت لێدەکەین، پڕ بێت لە کەچ بوون و خشووع و گەڕانەوەی هەمیشەیی بۆ حزوی خودا و لە پێناوی تۆدا بێت.

**اللَّهُمَّ: إنَّا نسأَلكَ عَزائِمَ مَغفِرتِكَ، وَموجِباتِ رحمَتِكَ، والسَّلامَةَ مِنْ كُلِّ إثمٍ، والغنيمة من كُلِّ بِرٍّ، والفَوزَ بالجَنَّةِ والنَّجاةَ مِنَ النَّار**[1].

ئەی خـودایە: ئێمە داوای یارمەتیـت لێ دەکەیـن لەسـەر ئەوکـردارانەی کە جەخـت دەکەنەوە لەوەی لە گوناهەکانمـا خـۆش ببیـت، لەگەڵ وەدەسـتهێنانی ئەو هۆکارانەی کە ڕەحمەتی تۆ مسـەوگەر دەکەن، وە داوات لێدەکەم پارێزراوم بکەیت لە هەمووگوناهێك، وە دەستەبەرکردنی هەموو چاکەیەك، کە بەهەشتی پێببەمەوە ڕزگاریشم ببێت لە ئاگر.

**اللَّهُمَّ: إنِّي أعوذُ بِكَ مِنَ التَّرَدِّي، وأعوذُ بِكَ مِنَ الغَمِّ والغَرَقِ والهَدَمِ، وأعوذُ بِكَ مِنْ أنْ أموتَ في سَبيلِكَ مُدبِراً، وأعوذُ بِكَ أنْ أموتَ في طَلَبِ دُنياً**[2].

ئەی خـودایە: بەڕاسـتی پەنـات پێـدەگرم لە کەوتنەخـوارە و هەڵـدێران، وە لە خەم و مەراق و خنکانـدن و ڕوخـان و داڕمـان، وە پەنـات پێـدەگرم کە پشـت لە ڕاستی بکەم، یان لە جیهاددا لەپشتەوە لێم بدرێت و بمرم،(واتە: ڕاکردووی ناو مەیدانبم)،وە پەنات پێدەگرم لەوەی کە لە پێناوی وەدەسهێننی دونیادا بمرم.

---

(١) الدعاء إلى هنا رواه الحاكم في المستدرك(١/٥٣٣) و(١/٧١٦)(١٩٥٧) وقال صحيح الإسناد، والتعوذ من الأربع الأول عند مسلم(٢٧٢٢). **والإستعاذة من الكسل والبخل والجبن والهرم وفتنة المحيا والممات** عند البخاري (٦٣٦٧).

(٢) رواه أبو داوود (١٥٥٢).[2] والنسائي (٨/٢٨٢)(٥٥٣١/٥٥٣٢)وفيهما : **(وأعوذ بك أن أموت لديغاً، بدل: اللَّهُمَّ، أموت في طلب دنيا.)** والحاكم في المستدرك (١/٧١٣)(١٩٤٨). وصحح إسناده، من حديث أبي اليسر، دون الفقرة الأخيرة.

**اللَّهُمَّ: إنِّ أعوذَ بِكَ مِنْ شَرِّ ما عَمِلتُ، ومِنْ شَرِّ مالَم أَعلَم**، ئەی خودایە: پەنات پێدەگرم لەشەڕی ئەو شتەی کە زانیبێتم یان نەمزانیبێت.[1]

**اللَّهُمَّ: جَنِّبني مُنكراتِ الأَخلاقِ والأعمالِ والأدواءِ والأَهواءِ**[2] ئەی خودایە: لامدە لە ئاکارە ناپەسەندە دەروونیەکان وەك: بەخیلی و ئیرەیی و ترسنۆکی و هاو وێنەکانی،وە کردەوە نادرووستەکان، وەك دزی و زیناو سەرخۆشی، وە ئارەزووە خراپەکانی نەفس و دەردەردە ناهەموارە خەمناکەکان کان، وەك بەڵەکی و گولی و سیل وئەوانی تر، وە بیشم پارێزە لە هەوا پەرستی و هەموو شێوەکانی.

**اللَّهُمَّ: إنِّي أعوذُ بِكَ مِنْ جهدِ البَلاءِ، ودَركِ الشَّقاءِ، وسُوءِ القَضاءِ، وشَماتَةِ الأَعداءِ**[3]، ئەی خودایە: پەنات پێدەگرم، لە بەڵای سەخت و ناهەموار کە بەرگەی نەگرم، وە جێگەی ئەوانەی کە بەدبەخت و ئەهلی شەقاوەتن، وە قەزاوقەدەرێکی بە ئازار، وە لە وەی دوژمنان دڵی خۆیانم پێ خۆش بکەن.

**اللَّهُمَّ: إنِّي أعوذُ بِكَ مِنَ الكُفرِ والدَّينِ والفَقرِ، وأعوذُ بِكَ مِنْ عَذابِ جَهَنَّم، وأعوذُ بِكَ مِن فِتنَةِ الدَّجّال**[4]، ئەی خودایە: پەنات پێدەگرم لە کوفرو

---

(١) رواه ابن ماجه ولفظه: **وأعوذبك من الشر كله عاجله وآجله. ما علمت منه وما لم أعلم**، وهو عند مسلم (٢٧١٦) بلفظ: **(من شر ما عملت ومن شر ما لم أعلم)**. من حديث عائشة ولأبي بكر بن الضحاك في الشمائل في حديث مرسل في الإستعاذة وفيه: **وشر ما أعلم أهـ** وكذلك رواه أبو داود (١٥٥٠) والنسائي (٥٥٢٣)، وابن ماجه(٣٨٣٩) ولفظهم أن النبي صلي الله عليه وسلم كان يقول في دعائه: **اللهم اني أعوذ بك من شر ما عملت ومن شر ما لم أعمل**، وروي أبو داود الطيالسي في مسنده(٢٨) (٢٠٠) من حديث جابر بن سمرة **اللهم إني أسألك من الخير كله، ما علمت منه وما لم أعلم، وأعوذ بك من الشر كله ما علمت منه وما لم أعلم**، وهذا أيضاً شاهد جيد لرواية النسائي .

(٢) رواه الترمذي(٣٥٩١). وحسنه والحام في المستدرك ( ٧١٤/١(١٩٤٩) وصححه، واللفظ له، من حدبث قطبة بن مالك. قال الزبيدي٨٤/٥: وكذا رواه الطبراني في الكبير(١٩/١٩(٣٦).

(٣) رواه البخاري (٦٣٤٧)، ومسلم(٢٧٠٧).

(٤) **التعوذ من الكفر والدِّين** عند النسائي، ٢٦٤/٨)، ومن الفقر مع الكفر عنه كذلك٧٣/٣)،

قەرزاری و هەژاری و، سزای دۆزەخ و فیتنەی دەججال و شوێنکەوتوانی.

**اللَّهُمَّ: إِنِّي أعوذَ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمعي وبَصَري، وشَرِّ لِساني وقَلبي، وشَرِّ مَنِيِّ**[1]،

ئەی خودایە؛ پەنات پێدەگرم لەو شەڕانەی بە هۆی بیستن و بینینەوە دوچارم دەبن، وە هەروەها بە هۆی زوبان ودڵمەوە، وە لەوشەڕو تاوانانەی لە خراپی خۆمەوە سەرچاوەیان گرتبێت و گیرۆدەدەی بوو بم.

**اللَّهُمَّ: إِنِّي أعوذَ بِكَ مِنْ جارِ السُّوءِ في دارِ المُقامَةِ ، فَإِنَّ جارَ البادِيَةِ يَتَحَوَّلُ**[2]،

ئەی خودایە؛ پەنات پێدەگرم لە دراوسێی خراپ لە جێگەیەکدا کە بەردەوام پێکەوە بین، چونکە دراوسێی ڕەوتەنی و کۆچەری ئەگەر خراپیش بن ماوەیەکە.

**اللَّهُمَّ: إِنِّي أعوذَ بِكَ مِنَ القَسوَةِ والغَفلَةِ، والعِلَةِ والذِلَّةِ والمَسكَنَةِ، وأَعوذُ بِكَ مِنَ الفَقرِ والكُفرِ، والفُسُوقِ والشِّقاقِ والنِّفاقِ وسُوءِ الأَخلاقِ وضيقِ الأَرزاق، والسُّمعَةِ والرِّياءِ ، وأَعوذُ بِكَ مِنَ الصَّمَمِ والبُكمِ والعَمى، والجُنونِ والجذامِ والبرَصِ وسَيِّئِ الأَسقامِ**[3]،

ئەی خودایە؛ پەنات پێدەگرم لە گەرد و ژەنگ و ڕەشایی گوناهو غەفڵەت و نەخوشی و دەردو کزی و زیللەت و نەداری، وە پەنات پێدەگرم لە هەژاری و بێباوەڕی و لەڕێلادان و، دووبەرەکی و دووڕوویی و، بەدڕەوشتی و تەنگی ژیان و کەمی بژێوی و حەزکردن بە ناوو ناوبانگ، هەروەها پەنات پێدەگرم لەوەی تووشی کەڕی و لاڵی و کوێری و شێتی و گولی و گەڕی ببم، لەگەڵ نەخۆشییە خراپ و مەترسی دارەکاندا. **اللَّهُمَّ: إِنِّي أعوذُ بكَ مِن زَوالِ نِعمَتكَ، ومِنْ تحَوُّلِ**

---

والتعوذ من عذاب جهنم وفتنة الدجال عند البخاري (١٣٧٧) ومسلم (٥٨٨).

(١) رواه أبوداوود (١٥٥١)، والترمذي (٣٤٩٢)، والنسائي (٨/٢٥٥)، من دعاء علمه النبي ﷺ شَكَلَ بن حميد (رضي الله عنه)

(٢) رواه النسائي (٨/٢٧٤) والكبرى (٧٨٨٦).والحاكم في المستدرك ١/٧١٤(١٩٥١) من حديث أبي هريرة وقال: صحيح على شرط مسلم.

(٣) رواه الطبراني في الصغير(١/١١٤) والإستعاذة من الأربعة الأخيرة عند أبي داوود(١٥٥٤).

**عافِيَتِكَ، ومِنْ فُجأَةِ نقْمَتِكَ، ومِنْ جَميعِ سَخَطِكَ**[1] ، ئەی خودایە؛بەڕاستی من بەڕاستیپەنات پێدەگرم لە نەمان و هەڵگرتنی نیعمەتەکانت، وە لادان و هەڵگوڕانی باری تەندورستیم کە پێت بەخشیوم، وە لەو حاڵەتانی کە دوچاری تۆڵەی خێرات ببمەوە، وە هەموو جۆرەکانی ناڕازیبوون و تۆڕەبوونی تۆ.

**اللَّهُمَّ: إنِّي أعوذُ بكَ مِنْ عذابِ النَّارِ، ومِن فِتنَةِ النَّار، وعَذابِ القبرِ وفِتنَةِ القَبرِ، وشَرِّ فِتنَةِ الغِنَى، وشَرِّ فِتنَةِ الفَقرِ، وشَرِّ فِتنَةِ المَسيحِ الدَّجَّال، وأَعوذُ بِكَ مِنَ المَغرَمِ والمَأْثَمِ**[2] ،ئەی خودایە: بەڕاستی پەنات پێدەگرم لە سزای ئاگرو فیتنەو تاقیکردنەوەکانی ئاگرو تانەو سەرزەنشتەکانی خەزەنەی دۆزەخ، وە پەنات پێدەگرم لە سزای قەبرو پرسیاری نەکیرو مونکەرو تاقیکردنەوەکانی، وە لەشەڕی فیتنەی دەوڵەمەندی و، شەڕی فیتنەی هەژاری و، شەڕی دەججالی چاو کوێر، وە پەنات پێدەگرم لەهەموو حاڵەتێکی قەرزاری و جێگایەکی گوناه .

**اللَّهُمَّ: إنِّي أعوذُ بكَ مِنْ نفسٍ لاتَشبَعُ، وقَلبٍ لايَخشَعُ، وصلاةٍ لاتَنفَعُ، ودَعوَةٍ لاتُستَجابُ، وأَعوذُ بِكَ مِن شَرِّ العُمرِ وفِتنَةِ الصَّدرِ**[3] ،ئەی خودایە: بەڕاستی پەنات پێدەگرم لە نەفسێك تێر نەخوات، وە دڵێك کەچ نەبێت، وە نوژێك سوودی نەبێت، وە نزایەك وەرنەگیرێت، وە پەنات پێدەگرم لە شەڕو خراپەی تەمەن و کینەو پشووی تەنگ و سینەی ناگوشاد.

**اللَّهُمَّ: إنِّي أعوذُ بكَ مِنْ غلبَةِ الدَّينِ، وغَلَبَةِ العَدوِّ، وشَماتَةِ الأَعداءِ**[4] ئەی خودایە؛ بەڕاستی پەنات پێدەگرم لەوەی قەرزاری زۆرم بۆ بهێنێت و دوژمن جێگەم پێ لێژ بکات و، تووشی شاکامی و نەیارانم ببم، کە دڵم بەشکستییەکانم خۆش بکەن،**وصلَى اللهُ علَى سيِّدنا مُحَمَّدٍ وعلَى كُلِّ عَبدٍمُصطَفَى،مِن كُلِّ العالَمينَ آمين.**

---

(١)رواه مسلم في صحيحه.(٢٧٣٩).

(٢) رواه البخاري (٦٣٦٨) (٦٣٧٥)، ومسلم (٢٧٣٩) بنحوه.و (٨٥٩) من حديث عائشة.

(٣) الثلاث الأولى عند مسلم، (٢٧٢٢)، وما بعدها عند أبي داوود، (١٥٢٩) والنسائي ٢٥٥/٨)،

(٤)رواه النسائي(٢٦٥/٨)، وصححه الحاكم على شرط مسلم، في المستدرك ٧١٣/١(١٩٤٥)،

# دەروازەی پێنجەم

## دوعا مەئسوورەکان بە پێی ڕوداوو پێشهاتەکان

ئەگەر ڕۆژبوویەوەو گوێت لە بانگی بەیانی بوو، سوننەتە وەڵامی بانگبێژ بدەیتەوە، وەك باسمان کرد، وە باسی دوعای چوونە سەرئاوو هاتنەدەرەوەو دوعاکانی کاتی شۆردنی ئەندامەکانی دەستنوێژ لە پەڕاوی تەهارەت و پاکو خاوێنی دا.

ئەگەر لە مزگەوتیش دەرچوویت، بڵێ: **اللَّهُمَّ: اجعَلْ في قَلبي نُوراً، وفي لِساني نُوراً ، واجعَلْ في سَمعي نُوراً ، واجعَلْ في بَصَري نُوراً ، واجعَلْ خَلْفي نُوراً، وأَمامي نُوراً ، واجعَلْ مِن فَوقي نُوراً ، اللَّهُمَّ: أَعطِني نُوراً** [1]،

خودایە نوری خۆت بخەرە ناو دڵمەوەو سەر زوبانم و، ناو گوێم و ناوی چاوم و، لە پێشمەوە و ، لە پشت و سەرو خوارمەوە بەنوور ڕووناکی بکەرەوەو ، نوری خۆتم پی ببەخشە.

هەروەها بڵێ:

**اللَّهُمَّ: إِنِّي أَسأَلُكَ بِحَقِّ السَّائِلِينَ عَلَيكَ، وبِحَقِّ مَمْشايَ هذهِ إِلَيكَ، فَإِنِّي لَم أَخرُجْ أَشَراً ولاَ بَطراً، ولاَ رِياءً ولاَ سُمعَةً، خرَجتُ إِتِّقاءَ سَخَطِكَ، وابتِغاءَ مَرْضاتِكَ، فأَسأَلُكَ أَن تُنقِذَني مِنَ النَّار، وأَنْ تَغفِرَ لِي ذُنُوبِي، إِنَّهُ لايَغفِرُ الذُّنوبَ إِلاَّ أَنتَ** [2].

---

(١) رواه البخاري (٦٣١٦)، ومسلم(٧٦٣) من حديث ابن عباس.

(٢) أخرجه ابن ماجه(٧٧٨)، من حديث أبي سعيد الخدري بإسناد جيد،قال الزبيدي ٨٩/٥: وأخرجه أحمد في مسنده(١٠٧٧٢) عن فضيل بن مرزوق وهو في كتاب الدعاء للطبراني، ص/١٤٩(٤٢١)، وأخرجه أبو نعيم الأصبهاني من رواية أبي نعيم الكوفي كلهم عن فضيل بن مروان، وعطية العوفي صدوق في نفسه حسن له الترمذي عدة أحاديث بعضها من أفراده وإنما ضُعِّفَ مِن قبلِ التشيُّع،ومِن قِبل التّدليس وقد روي نحو هذا عن بلال رضي الله عنه.

ئەی خودایە؛ بەڕاستی داوات لێدەکەم لەبەرخاتری ئەوانەی زۆر بە ئیخلاص و نیەت پاکیەوە لە خزمەتدا دەپاڕێنەوە، وە لەبەرخاتری ئەم هاتنەم کە لەبەر ڕەزامەندی تۆبووە، نەبۆ کوفرانەی نیعمەتەو، نەبۆ سنگ دەرپەڕاندنەو، نە بۆ ناودەرکردن و ڕیابازییە، بەڵکوو تەنها لەترسی ئەوە هاتووم خۆم لە تووڕەییت بپارێزم و، ڕەزامەندیت بەدەسبێنم، بۆیە داوات لێدەکەم، بمپارێزە لە ئاگر، وە لە گوناهەکانم خۆش ببە، کەجگە لە تۆ کەس ناتوانێت خۆشبێت لێیان.

ئەگەر بۆ کارێك لە ماڵ چویتە دەرەوە، ئەوا بڵێ:

**باسمِ اللهِ، ربِّ أَعوذُ بِكَ أَنْ أَظلِمَ أَوْ أُظلَمَ، أَوْ أَجهَلَ أَو يُجهَلَ علَيَّ.**(١)،

**بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحيم، لاَحولَ ولاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ العَليِّ العَظيم، باسمِ اللهِ، التِّكلانُ علَى الله.**[٢] ،

بەناوی خودا؛ پەروەردگارم، پەنات پێدەگرم لەوەی کەستەم لەکەس بکەم، یان ستەمم لێبکەن، یان فەرمانەکانی ئاین نەزانم، یان خەڵکەکە زیانم پێبگەیێنێت، بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبانەوە،تواناو هێزو دەسەڵات تەنها لەلای خوداوەیە. بەناوی خوداوەو پشت و پەنامان تەنها بە خودایە.

کاتێك گەیشتیتە مزگەوت و ویستت بچیتە ژورەوە بڵێ: **اللَّهُمَّ؛ صَلِّ عَلَى مُحمَّدٍ وعلَى آلِ مُحمَّدٍ وسَلِّم،اللَّهُمَّ؛ اغْفِر لجَميعَ ذُنوبي، وافتَح لِي أَبوابَ رَحمَتِكَ**[٣]

---

(١) رواه أبو داوود (٥٠٩٤)، والترمذي (٣٤٢٧)، والنسائي (٢٦٨/٨)، وابن ماجه(٣٨٨٤).

(٢) رواه ابـن ماجـه(٣٨٨٥)، بنحـوه. قـال الزبيـدي٥/٩٠: وكـذلك أخرجـه الحـاكم فـي المسـتدرك(٧٠٠/١٩٠٨)، وابـن السـني في عمـل اليـوم والليلـة ص/١٤٦ وروي الطبراني في الكبير، كما في فيض القدير،١٢٤/٥، من حديث بريدة الأسلمي رضي الله عنه رفعه كان إذا خرج من بيته قال: **بسم الله توكلت على الله، لا حول ولا قوة إلا بالله، اللهم إني أعوذ بك أن أضلَّ أو أُضل أو أزلَّ أو أُزل او أَظلم أو أُظلم أو أَجهَل أو يُجهل علي أو أبغي أو يبغي علي** وقد تقدم ذكر أدعية الخروج في كتاب الحج وبسطت عليه الكلام هناك.

(٣) رواه الترمذي (٣١٤) وابن ماجه(٧٧١)، والجملة الأخيرة عند مسلم (٧١٣).

ئەی خودایە: صڵاوات و سەلامی خۆت ببارێنە بەسەر (حەزرەتی) موحەممەددا، ئەی خودایە: لەهەموو گوناهەکانم خۆشبە، وە دەروازەکانی ڕەحمەتی خۆتم لێبکەرەوە. وە لە چوونە ژورەوەدا پێی ڕاستت پێش بخە.

ئەگەر یەکێکت بینی لە مزگەوتدا شتی دەکڕی یان دەیفرۆشت، پێی بڵێ: **لاَأَربَحَ اللهُ تِجارَتَكَ**[1] داوام لە خودایە قازانج لەم بازرگانیەکەتدا نەکەیت.

وە ئەگەر کەسێکت بینی جاڕی دەدا بۆ ون بووەکەی، بە پێی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ پێی بڵێ: خودایە ماڵە ونبووەکەی نەگێڕیتەوە.. **لا رَدَّها اللهُ عَلَيكَ.**[2]

ئەگەر دووڕکات نوێژی بەیانیت کرد بڵێ:

**باسمِ اللهِ.. اللَّهُمَّ: إِنِّي أَسأَلَكَ رَحمةً مِنْ عِندِكَ تَهدي بها قَلبي.**[3].

بەناوی خوداوە، ئەی خودایە: بەڕاستی داوای ڕەحمەتێکی تایبەتی لە تۆ دەکەم، ببێتە هۆی ڕێنمایی دڵ و دەروونم.

ئەگەر چەمیتەوە بۆ ڕکوع، ئەوا لە کڕنووشەکەدا بڵێ: خودایە بۆ تۆ کڕنووشم بردووە، وە خشوع و گەردەن کەچیم بۆتەیە، وە بڕوام بەتۆ هێناوە و، بۆ تۆیە کە موسوڵمان بووم، وە پشتم بە تۆ بەستووە، تۆ خوداوەندی منی، کە ئەندامی بیستن و بینین و گوێگرتن و ئێسك و مۆخ و ڕەگ و پێستم، وە هەموو ئەو ئەندامانەی کە جەستەمی پێڕاوەستاوە، هەموویان ملکەچی تۆن و پەیوەستی پەروەردگاری هەموو جیهانەکانن.

**اللَّهُمَ لكَ رَكَعتُ، ولَكَ خشعْتُ، وبكَ آمنتُ، ولكَ أسلَمْتُ، وعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ.أنتَ رَبِّي خَشَعَ سَمَعِي وبَصَرِي، ومُخِّي وعَظْمِي وَعَصَبي، ومَا اسْتَقَلَّتْ بهِ**

---

(١) رواه الترمذي(١٣٢١).

(٢) رواه مسلم(٥٦٨).

(٣) تا کۆتایی دۆعاکە وەك لە ئیبن و عەباسەوە ڕیوایەتمانکرد، لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، رواه الترمذي(٣٤١٩) والطبراني في الكبير.

**قَدَمِي للهِ رَبِّ العَالَمِينَ**[1]

وه سوننەتە ئەگەر پێت خۆش بوو سێ جار بڵێ: **(سُبحـــانَ رَبِّيَ العَظـيم)**[2] ، پاکی و خاوێنی و دووری لە هەموو کەمووکورتیەك بۆ خودایپەروەردگارو مەزنە، یان بڵێ: بەرزی وخاوێنی و مونەززەهی هەر بۆ تۆیە، پەروەردگاری جوبرەئیل و فریشتەکانیت ، **سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ، ربّ المَلائِكَةِ والرُّوحِ**[3].

ئەگەر سەرت لە ڕکوع بەرزکردەوە، بڵێ:

**سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، ربَّنا لَكَ الحَمدُ. مِلْءَ السَّمَاوات ومِلءَ الأرضِ وَمِلءَ مَاشِئتَ مِنْ شَيءٍ بَعْدُ. أَهلُ الثَّناءِ والمَجدِ. أحقَ ماقالَ العَبدُ، وكُلُّنا لَكَ عَبدٌ. لامانِعَ لِمَا أعطَيتَ، ولاَ مُعْطِيَ لِما مَنَعتَ، ولاَ يَنفَعُ ذا الجَدِّ مِنَ الجَدُّ**[4].

واتە: خودا سوپاسی ئەو کەسەیە دەبیستێت کە دەیکات، پەروەردگارا؛

پڕاوپڕی ئاسمانەکان و زەوی و هەموو شتێك کەویستی تۆی لەسەر بێت، حەمدو سەناو ستایشبێت بۆ تۆ، شایانی ستایش و بەرزی و مەزنیت، ڕاسترین وتە کە بەندەیەك بیڵێت، سەناو ستایشەو، دانپیادانانە بەوەی کە هەموومان بەندەی تۆین، ئەگەرتۆ بە ئێمەی ببەخشیت، کەس ناتوانێت ڕێگری بکات، وە ئەگەر جەنابیشت لەئێمەی بگریتەوە، کەس ناتوانێت پێمان بدات، هیچ هەوڵ و کۆششێك سوودی نابێت ، تەنها لای تۆو لەزاتی تۆوە نەبێت.

**اللَّهُمَّ؛ لكَ سَجدْتُ. وبِكَ آمَنتُ، ولكَ أسلَمتُ. سجَدَ وَجهِي للَّذي خَلقَهُ وصَوَّرَهُ، وشَقَّ سَمْعَهُ وبَصَرهُ. فَتبارَكَ اللهُ أحسَنُ الخَالِقينَ**[5]**.اللَّهُمَّ: سَجَدَ لكَ**

---

(١) رواه مسلم (٧٧١) وأحمد (١/١١٩) في المسند.

(٢)رواه أبو داوود (٨٨٦) وبزيادة: وبحمده. عنده. (٨٦٩) والترمذي (٢٦١) وابن ماجه(٨٨٨).

(٣) رواه مسلم (٤٨٧).

(٤) رواه مسلم (٤٧١,٤٧٧) دون (سمع الله لمن حمده)، وهي عند أبي داوود (٨٤٧)والنسائي(٢/١٩٨).

(٥) إلى هُنا عند مسلم (٧٧١).

**سَوادِي وخَيَالي. وَبِكَ آمَنَ فُؤادِي. أَبُوءُ بنِعْمَتِكَ عليَّ. وأَبُوءُ بِذَنبي. وهَذا مَاجنَيتُ علَى نَفسي، فاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنتَ.**[1] .

ئەی خودایە: سوجدەم بۆتۆ بردووەو، بەتۆ بڕوام هێناوەو، بۆ تۆشە کەموسوڵمان بووم، ئەوا ڕوخسارم سوجدەی برد بۆ ئەو زاتەی کە دروستی کردووە، وە بە جوانترین شێوە وێنەی کێشاوە، هێزی بیستن و بینینی بەخشیوە بۆی دارِشتووە، بەرزی و دەسەڵات بۆ خودایە، کە باشترین دروستکراوی هێناوەتە بوون، ئەی خودایە: ئەوا جەستەو ڕوخسارو هزرو خەیاڵم بۆ تۆ بەرِودا خستە سەر زەوی، وە دڵم بڕوای تەواوی بە تۆ هێناوە، هەمیشە دان دەنێم بە نیعمەتە زۆرەکانت لەسەر من، وە بەگوناهەکانیشم دەگەڕێمەوە، ئەمەبوو کە ستەمم لە نەفسی خۆم کردووە، لێم خۆشبە، پەنام بۆ هێناویت، کەس ناتوانێت لە گوناهەکان خۆشببێت تۆ نەبێت.

یان سێ جار بڵێت: (**سُبْحانَ رَبِّيَ الأعلَى**)،[2] ،

کاتێك لە نوێژەکەی بوویەوە، با بڵێت ئەی خودایە: تۆ خۆت سەلامیت، وە سەلام و سەلامەتی لەتۆوە دەبێت، ئەوەی خاوەن ڕێزو مەزنی و جەلال و کەرەم بەخشییە، وە نزاو دوعاکانی دیکە کە باسمانکردن، واچاکە نزایان پێبکات. **اللَّهُمَّ: أَنتَ السَّلامُ ومِنكَ السَّلامُ، تَبارَكتَ يا ذا الجلالِ والإكرام**[3] ،

جا ئەگەر لە دانیشتنەکەت هەستایت و، ویستت نزایەك بخوێنیت و بیلێیتەوە، کە ببێتە کەفارەتی قسەی پوچ و گەمە و گاڵتەکانت، ئەوا بڵێ:

**سُبحانَك اللَّهُمَّ: وبحمْدكَ، أَشهَد أن لاَّ إِلهَ إِلا أنتَ، أَستَغفِرُكَ وأَتُوبُ**

---

(١) رواه الحاكم في المستدرك، ٥٣٣/١ ، و ١/ ٧١٦(١٩٥٧) ضمن دعاء قد تقدم من حديث ابن مسعود، وقال صحيح الإسناد.. وبحمده، عنده، (٨٦٩) والترمذي (٢٦١) وابن ماجه(٨٨٨).

(٢) رواه أبو داوود(٨٨٦)، وبزيادة (وبحمده)،

(٣) رواه مسلم وفيه **الإستغفار ثلاثاً قَبلَه**، و (٥٩٢) دون ذكر الإستغفار.

**إلَيكَ، عَمِلتُ سُوءاً وَظَلَمْتُ نَفسِي، فاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لاَ يَغفِرُ الذُّنُوبَ إلاَّ أَنتَ**[1]،

پاك و خاوێنی و حەمدو سەنا بۆ تۆیە ئەی خودایە: شایەتی دەدەم کە هیچ خودایەك نیە شیاوی پەرستن بێت جگە لەتۆ، داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات، کاری خراپەم کردووە و ستەمم لە خۆم کردووەو کەسیش ناتوانێت لە گوناهەکانم خۆش ببێت بێجگە لە تۆ.

**لاَإلهَ إلاَّ اللهُ وحدَهُ لاشَريكَ لَهُ، لَهُ المُلكَ ولَهُ الحَمدُ يُحيي ويُميتُ بِيَدِهِ الخَيرُ وهُوَ على كُلِّ شَيئٍ قَدير،**[2]، **باسْمِ اللهِ، اللَّهُمَّ: إنِّي أَسأَلُكَ خيرَ هذهِ السُّوقِ، وخَيرَ مافيها، اللَّهُمَّ: إنِّي أَعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّها وشَرِّ مافيها، اللَّهُمَّ: إنِّي أعوذُ بِكَ أَنْ أُصيبَ فيها يَميناً فاجِرةً، أَوْ صَفقَةً خاسِرةً**[3]،

دوای دووبارەکردنەوەی کەلیمەی تەوحیدو دانان بە خاوەنیەتی خودای گەورە بۆ هەموو موڵك و دەسەڵاتێك،لە پاشان بڵێیت: ئەی خودایە: من داوای خێری ئەم بازاڕەت لێدەکەم و ئەو خێرەی لە ناویایەتی، وە پەنات پێدەگرم لەشەڕی ئەم بازاڕە و ئەو شەڕەش لە ناویایەتی، وە پەنات پێدەگرم کە

---

(١) رواه النسائي في الكبرى(١٠١٨٨)بتمامه، وفي اليوم والليلةص/٣٢٠(٤٢٧)من حديث رافع ، بإسناد جيد، قال الزبيدي٩٩/٥: ورواه الحاكم في المستدرك٧٢١/١(١٩٧٢)، وعن أبي هريرة رضى الله عنه قال قال رسول الله ﷺ **من جلس في مجلس فكثر فيه لغطه، فقال قبل ان يقوم من مجلسه ذلك: سبحانك اللهم إلى قوله: وأتوب اليك، إلاَّ غُفر له ماكان في مجلسه ذلك**، رواه أبو داوود والترمذي(٣٤٣٣) والنسائي والحاكم وابن حبان في صحيحه(٣٥٤/٢(٥٩٤) وقال الترمذي واللفظ له: حسن صحيح غريب هذا الوجه

(٢) رواه الترمذي (٣٤٢٨)، وابن ماجه(٢٢٣٥).وأخرجه الحاكم في المستدرك(٧٢٢/١(١٩٧٤)من حديثه ، ومن حديث ابن عمر ٧٢٢/١(١٩٧٥)، وقال: صحيح على شرط الشيخين.

(٣)قال العراقى رواه الحاكم من حديث بريدة وقال أقر بها لشرائط هذا الكتاب حديث بريدة قال العراقي فيه أبو عمرو جارٌلشُعيب بن حرب، ولعله حفص بن سُليمان الأسدى مختلف فيه، وقال الزبيدي٩٩/٥: رواه الطبراني في الدعاء ص/٢٥٢(٧٩٥) من حديث محمد بن ابان الجعفي، متابعا له عن علقمة بن مرثد، وابن أبان ضعيف، أنظر الكامل لإبن عدي١٢٨/٦.

دوچاری سوێندێکی ناحەق نەبم و ، بە سوێندی درۆ شت بکڕم یان کاڵاکە ساغ بکەمەوە، یان تووشی خەسارەتێك ببم.

جا ئەگەر قەرزداریت هەبوو، ئەوا بڵێ:

**اللَّهُمَّ: اكفِني بِحَلالِكَ عَنْ حَرامِكَ، واغْنِني بفَضلِكَ عَمَّنْ سِواكَ**[1]،

ئەی خودایە: ئەوەندە حەڵاڵم پێبدەیت ، ئاوڕ لە حەرام نەدەمەوە، وە بە فەزڵ و گەورەیی خۆت بمپارێزە لەوەی هانا بۆ کەسێکی دیکە بەرم.

ئەگەر بەرگێکی تازەت پۆشی، بڵێیت: ئەی خودایە؛

بەم بەرگە منت داپۆشی، سوپاس بۆ تۆ،

**اللَّهُمَّ: كَسَوتَني هذا الثَّوب، فلَكَ الحَمدُ. أَسأَلُكَ مِن خَيرِهِ وخِيرِ ما صُنِعَ لَهُ، وأَعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وشَرِّ ما صُنِعَ لَهُ**[2]،داوات لێدەکەم توشی خێرەکەی ببم و ئەو خێرەش کە بۆی دروستکراوە، وە پەنات پێدەگرم لەو شەڕەی تێی دایەو

---

(١) رواه الترمذي (٣٥٦٣). والحاكم في المستدرك(٧٢١/١)(١٩٧٣) وقال صحيح الإسناد .

(٢) رواه أبو داوود(٤٠٢٠)، والترمذي(١٧٦٧)، وقال حسن،وانسائي في اليوم والليلة(ص/٢٣٧)(٣٠٩)،من حديث أبي سعيد الخدري. ورواه ابن السني في عمل اليوم والليلة ص/٢٣٩(٢٧٠) بلفظ المصنف. وقال الزبيدي١٠١/٥: ورواه الحاكم في المستدرك ٢١٣/٤(٧٤٠٨) وابن حبان في صحيحه(٢٣٩/١٢)(٥٤٢٠)وقال الحاكم صحيح على شرط مسلم، وفي الباب عن ابي إمامة رضي الله عنه قال: لبس عمر بن الخطاب رضي الله عنه ثوبا جديدا فقال: **الحمدلله الذي كساني ما أُواري به عورتي واتجمل به في حياتي، ثم عمد الى الثوب الذي أخلق فتصدق به، كان في كنفِ الله وفي حفظ الله وفي ستر الله حيا وميتا** رواه الترمذي(٣٥٦٠) واللفظ له وابن ماجه(٣٥٥٧) والحاكم في المستدرك٢١٤/٤(٧٤١٠) وعن معاذ بن انس رضي الله عنه ان رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: مَن أكل طعاماً الحديث.. وفيه: **من لبس ثوبا فقال: الحمدلله الذي كساني هذا ورزقنيه من غير حول مني ولا قوة، غفر له ماتقدم من ذنبه وما تأخر**، وراه ابو داوود واللفظ له(٤٠٢٣) والترمذي (٣٥٧٠) وابن ماجه والحاكم في المستدرك وقال صحيح على شرط البخاري وقال الترمذي حسن غريب.

بـۆی دروسـتکراوە.  وە ئەگەر شـتێکی شـوومت دی، کە پێی نـیگەران بویـت و خۆشـیت لێی نەدەهات، ئەوا بڵێ: **اللَّهُمَّ: لا يأتي بالحَسَناتِ إلاَّ أنتَ، ولاَ يَذهَبُ بالسَّيِّئاتِ إلاَّ أَنتَ، لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ**[1]،

ئەی خـودایە؛ کەس ناتوانێـت چاکەکـان بهێنێـت بـێجگە لەتـۆ، وە ناتوانێـت خراپەکان لادات جگە لە تۆ، هێزو تواناو پشت و پەنا هەر بە تۆیە.!

وە ئەگەر مانگت بینی نوێ بێتەوە بڵێ:

**اللَّهُمَّ : أَهِلَّهُ عَلَينا، بالأَمنِ والإيمانِ والسَّلامَة والإسلامِ، والتَّوفيقِ لِمَا تُحِبُّ وترضاهُ، والحِفظِ عَمَّن تسْخطُ، ربِّي وَرَبُّكَ الله**، (٢)، وە دەڵێیت:

**هِلالُ رُشـدٍ وخَيرٍ، آمنتُ بِخالِقِكَ**، [3]، **اللَّهُمَّ: إنِّي أَسأَلُكَ خَيرَ هذا الشَّهرِ وخَيرَ القَدَرِ، وأَعوذُ بِكَ مَن شَرِّ يَومِ الحَشرِ** [4]، مانگێکی پڕ لە خێرو خۆشی و بێداری بێـت، بـڕوام بەو زاتەیە کە دروسـتی کردویـت، داوات لێـدەکەم ئەی خودایە؛ ڕێم بخەیت لەوەی خێرو تەقـدیری باشـە بڕیـارت داوە ، وە پەنایشـت پێدەگرم لە ناهەمواریەکانی ڕۆژی زیندووبوونەوە.

وە پێش دوعاکانت لە کاتی بینینی مانگ دا سێ جار (**أَللّه أَكبَرْ**) بکە،[5]،

وە ئەگەر (با) هەڵی کرد بڵێ: **اللَّهُمَّ:إني أسأَلُك خَيرَ هَذا الرِّيحِ وخيرَ مَاأُرسلَتْ بهِ وأعوُذُ بكَ مِنْ شَرِّهَا وشَرِّ مَا فيها وشرِّ ما أُرسَلَتْ بهِ**[6]،

---

(١) رواه أبـو داوود(٤٠٢٠)، والترمـذي(١٧٦٧)، وابـن أبـي شـيبة في مصـنفه(٧٠/٦)(٢٩٥٤١) وأبونعيم في اليوم والليلة والبيهقي في الدعوات (ص/٢٨٧/٢)(٥٠٠) من حديث عروة مرسلا ، ورجاله ثقات.

(٢) رواه الترمذي (٣٤٥١) وابن أبي شيبة في المصنف((٩٨٢٧)وفيه: والحفظ ممّا تسخط.

(٣) رواه أبو داوود(٥٠٩٢) عن قتادة مرسلا، مكَرّراً (**هلال خير ورشد**) ثلاثا.

(٤) رواه أحمد في المسند(٣٢٩/٥).

(٥) رواه عبدالرزاق في المصنف(١٦٩/٤) عن قتاده مرسلا.

(٦) رواه الترمذي ((٢٢٥٢)

ئەی خودایە: داوات لێدەکەم لەخێری ئەم بایەو ئەو خێرەی کە تێیدایەو ئەو خێــرەش کە بــۆت ڕەوانە کــردووە بەشــدارمان بکەیــت، وە لە شەڕەکەشــی بمانپارێزێت، وە ئەو شەڕەی کە تێیدایەو بۆت ڕەوانە کردووە.

وە ئەگەر هەواڵت بۆ هات یەکێك وەفاتی کردووە، بڵێ:

﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾(البقرة/١٥٦)﴿ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ﴾ (الزخرف/١٤)

(ئێمە موڵکی خوداین و، بۆ لای خودا دەگەڕێینەوە. خودایە لە ناو ڕیزی چاکەکارانـدا بماننووســە ، نـاوی کردەوەکـانی بـخەرە شــوێنە بەرزەکـانەوە، لەوانەش کە ماون جێگەکەیـان بەکەسـێکی باش پـڕ بکەرەوە. ئەی خـودایە: بێبەشــمان مەکە لە پاداشــتی ئەم هەواڵە، دوای کـۆچی ئەو نـێمەش تووشــی تاقیکردنەوە نەکەیت، لە ئێمەش و لە ئەویش خۆش ببیت) .

وە ئەگەر چـاکە و خێرێکـت بەخشـییەوە بڵێ: ﴿رَبَّنَـا تَقَبَّـلْ مِنَّـا إِنَّـكَ أَنْـتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ (١٢٧/البقرة) پەروەردگارا ؛ لێمـان وەربگـرە، بەڕاسـتی هەر تۆیـت کە بیسەری داواکانمان دەبیت و ئاگاداریت لە کردەوەکانمان.

وە لە کاتی تووش بوونی خەسارەت و زیانێکدا بڵێ:

﴿عَسَى رَبُّنَا أَنْ يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِنْهَا إِنَّا إِلَى رَبِّنَا رَاغِبُونَ﴾ (القلم/٣٢)

ڕجـــاوایە کە پەروەردگـــار بۆمـــان قەرەبووبکـــاتەوە، بە چـــاکتر لەوەی لەدەستمان چووە، وە ئێمەمەیلمان هەر بەلای خوای خۆمانەوەیە

وەکاتێك دەستبە کارێك دەکەت بڵێ: ﴿رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا.﴾ (الكهف/١٠) ﴿رَبِّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي، وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي﴾ (طه/٢٦) خودایە لەلای خۆتەوە ڕەحمەتێکمان بۆ بنێرە، بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانمان هۆکاری کار ئاسانیمان بۆ ساز بکەو، ڕێگای ڕاستمان پێنیشان بدە، خودایە سینەم بۆ گوشاد فراوان بکەیت و کارم بۆ ئاسان بکەیت ....

وە لەکاتی سەیرکردنی ئاسماندادەڵێیت:﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا، سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ.﴾(آل عمران/١٩١)پەروەردگارا تۆ ئەم ئاسمانە بەرزو بێ عەیبەت

هەروا بە هەوانتە دروست نەکردووە. پاکی بۆتۆیە، بمانپارێزە لە ئاگری دۆزەخ.

﴿تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَاجًا وَقَمَرًا مُنِيرًا﴾ (الفرقان/٦١)

بەرزی و بڵندی بۆ ئەو خودایەی کە لە ناو ئاسمانەکاندا دوانزە مەنزڵ و حەوانگای تێدایە، وە لەناویدا خۆری داگیرساوو مانگی ڕۆشنمان بۆ داناون.

وە ئەگەر دەنگی هەورە گرمەت بیست بڵێ:

﴿سُبحانَ مَنْ يُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ وَالْمَلَائِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ﴾[1] ،

پاکی و بەرزی بۆ ئەو خودایەی کە هەورە گرمە بە زوبانی خۆی تەسبیحات بۆ خودا دەکات، وە فریشتەکانیش لە ترسی هەیبەتی خودادان.

وە ئەگەر هەورە بروسکەت بینی بڵێ:

**اللَّهُمَّ: لاَتَقتُلنا بِغَضَبِكَ، ولاَ تُهلِكنا بِعَذابِكَ، وَعافِنا قبلَ ذلِكَ**[2].

ئەی خودایە: بە غەزەب و تۆڕەبوونی خۆت مەمانکوژە، وە بە سزای خۆت لەناومانمەبە،خودایە بەرلە ڕودانی هەربەڵایەك لەشساغیمان پێببەخشە،

وە ئەگەر باران باری بڵێ: **اللَّهُمَّ**: سَيباً هنيئاً، وصَيِّباً نافِعاً، [3] **اللَّهُمَّ: اجعَلْهُ سيبَ رَحمَةٍ، ولاَ تَجعَلهُ سَيبَ عَذاب** [4] ئەی خودایە؛

بەخشینێکی ئاواشتەکەر بێت، ڕەهێڵەیەکی بەسوودی بێ زیان بێت، خودایە بیگێڕیت بە بارانێکی گشتگیری بەسوود، مەیگێڕە بە بارانێکی زیانبەخش .

ئەگەر حاڵەتی تورەیی ڕوی لێکردی بڵێ: **اللَّهُمَّ: اغْفِر لِي ذَنبي، واذْهَبْ غَيظَ قَلْبي، وأجِرْني مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ** [1]ئەی خودایە: لەگوناهەکانم خۆش ببە،

---

(١) رواه مالك في الموطأ ٢/٩٩٢)، عن عامر بن عبدالله بن الزبير، وأوقفه ابن أبي شيبة علة ابن الزبير في المصنف(٢٩٨٢٤) ورفعه ابن جرير في تفسيره(١٣/٨(١٥٩).

(٢) رواه الترمذي (٣٤٥٠).

(٣) رواه البخاري (١٠٣٢)، وابن ماجه(٣٨٨٩) مجموعاً.

(٤) رواه النسائي في عمل اليوم والليلة (٩٢٢) عن سعيد ابن مسيب مرسلا.

تۆڕەیی و قینی ناو دڵم لابەرە، وە لە شەڕی شەیتانی نەفرەتی بمپارێزە.

وە ئەگەر لە کۆمەڵێك ترسایت بڵێ: **اللَّهُمَّ: إِنَّا نَجعَلُكَ فِي نُحورِهِم، ونَعوذُ بِكَ مِنْ شُرورِهِم.** [٢] ئەی خودایە؛ داوات لێدەکەین کە ئەوانە ڕوبەڕووی مەرگیان بکەیتەوە، وە پەنات پێدەگرین لە خراپ و شەڕەنگێزەکانیان.

وە ئەگەر بۆ جیهاد وڕوبەڕووی دوژمنان ڕۆشتیت بڵێ: **اللَّهُمَّ: أَنتَ عَضُدي ونَصيري، وبِكَ أُقاتِلُ** [٣]، خودایە تۆ پشت و پەناو یارمەتی دەرمیت، تۆ سەرم دەخەیت، وە بە یارمەتی تۆیە من دەجەنگم.

وە ئەگەرگوێت زرنگایەوە، صڵاواتێك لە دیاری (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ بدەو بڵێ: **ذَكَرَ اللهُ بِخَيرٍ مَنْ ذَكَرَني** [٤]،خودای گەورە ستایشی ئەو کەسە بەخێر بکات و پاداشتی بداتەوەکە زیکرو یادی خودای بەبیری من هێناوەتەوە .

---

(١)قال العراقي رواه ابن السني في اليوم والليلة، من حديث عائشة باسناد ضعيف،وقال الزبيدي( ١٠٤/٥): ولفظ ابن السني: **كان إذا غضبَت عائشة عرك بأنفها وقالَ: ياعويش قولي اللهم ربَّ محمَّد، اغفرلي ذنبي واذهب غيظ قلبي وأجرني من مُضلاَّت الفتن.** ورأيت بخط الحافظ السخاوي ما نصه:هو في مسند أحمد (٢٦٠٣٦)في حديث طويل وحسن

(٢) رواه أبو داوود (١٥٣٧). والنسائي في اليوم والليلة(ص/٣٩٢(٦٠١)، من حديث أبي موسى بسند صحيح، قال الزبيدي(١٠٥/٥): وكذا رواه الحاكم في المستدرك( ١٥٤/٢(٢٦٢٩) وابن حبان في صحيحه(٨٢/١١(٤٧٦٥) ولفظ الأربعة: أن النبي ﷺ **كان إذا خاف قوما قال: اللَّهُمَّ:** إلخ، فذكروه، وقال الحاكم صحيح على شرط الشيخين، وأقره الذهبي، ورواه أحمد أيضا في مسنده ( ١٩٢٢) والبيهقي في السنن الكبرى.( ٢٥٣/٥(١٠١٠٥)قال النووي في الأذكار ص/٩٨(٣٥٧)، والرياض ص/١٩٧) (٩٨١) أسانيده صحيحة.

(٣) رواه أبوداوود(٢٦٣٢)، والترمذي(٣٥٨٤)، والنسائي في الكبرى (٨٥٧٦) ورواه أحمد في مسنده(١٢٤٩٨) وابن حبان في صحيحه(٧٦/١(٤٧٦١) والضياء في المختارة(٣٣٩/٦).

(٤) رواه الطبراني في الكبير(٣٢١/١)، وابن السني في عمل اليوم والليلة(١٦٦)، وابن عدي في الكامل(١١٣/٦)، رواه الطبراني في معاجمه الثلاثة،الأوسط (٩٢٢٢) والصغير(٤٥/٢(١١٠٤) وكذا العقيلي١٠٤/٤(١٦٦٣) في الضعفاء، والخرائطي ص/٢٢٧(٥٤٥) في مكارم الاخلاق

ئەگەر بینیت دوعاکەت وەرگیراوە لێت، ئەوا بڵێ: **الحَمدُ للهِ الذي بِعِزَّتِهِ وجَبَروتِهِ تَتِمُّ الصَّالِحات**.سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە بە پشتو پەنای دەسەڵاتی ئەو هەموو کارە خێرەکان تەواو دەبێت، وە ئەگەر دواکەوت، بڵێت: حەمدو سەنا بۆ خودا لەسەر هەموو کات و ساتێکدا: **الحَمدُ للهِ علَى كُلِّ حال**[1]،

وە ئەگەر گوێت لە بانگی ئێوارە بوو، بڵێ: ئەی خودایە: ئەوا شەو داهات و کاتی پێشوازی کردنمانە لەشەوەکەت و ڕۆژەکەیشتمان بە جێهێڵا، ئەوەش دەنگی دوعاکانە ڕوو بە حزوری جەنابت و، ئامادەبوونی بەندەکانە بەدەم بانگ و نوێژەکانتەوە، داوات لێدەکەم کە لێم خۆشبە. **اللَّهُمَّ: هذا إستِقبالُ لَيلِكَ، واستِدبارُ نَهارِكَ،وأَصواتُ دُعائِكَ، وَحضُورُ صَلَواتِكَ،أَسأَلُكَ أَنْ تَغفِرَ لي**[2]

وە ئەگەر خەفەتێك ڕووی تێکردیت، بڵێ: **اللَّهُمَّ: إنِّى عبدُك وابنُ عبدِكَ وابنُ أَمَتِكَ، ناصِيَتِي بيَدِكَ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ، عَدلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ. أَسْأَلُكَ بِكُلِّ إسمٍ هُوَ لَكَ، سَمَّيْتَ بِهِ نَفسَكَ، أَو أَنْزلتَهُ في كِتابِكَ، أَوْ عَلَّمتَهُ أَحَداً مِنْ خَلقِكَ، أَوِ استَأْثَرْتَ بِهِ في عِلمِ الغَيبِ عِنْدَكَ: أنْ تَجعَلَ القرآنَ ربيعَ قلبي، ونُورَ صَدري، وجِلاَءَ غَمِّي، وذِهَابَ حُزني وهَمِّي. قال رسول اللهﷺ: مَا أصابَ أحداً حُزنٌ فَقالَ**

---

واخرون كلهم بلفظ: **إذا طنّت أذن أحدكم، فليَذكرني وليُصَلِّ عليَّ وليَقُل: ذكر الله بخير من ذكرني بخير.** وللسند ضعف بل قال العقيلي أنه ليس له أصل، كذا في المقاصد للسخاوي،(ص/٨٩(٧٠)، لكن قال الهيثمي في مجمع الزوائد(١٣٨/١٠): اسناد الطبراني في الكبير حسنٌ ، وهذا يبطل من زعم ضعفه، فضلاً عن وضعه، كابن الجوزي والعقيلي، ونقل المناوي في شرحه على الجامع، أنه رواه ابن خزيمة في صحيحه، باللفظ المذكور عن ابي رافع وهو ممن التزم تخريج الصحيح فاعرف ذلك.

(١) رواه البيهقي في الأسماء والصفاة، (ص/١٧١). لە پەڕاوی الدعاء بە درێژی باسمان کرد.

(٢) رواه أبو داوود(٥٣٠) دون (وحضور صلواتك) والترمذي (٣٥٨٩) بتمامه، وهو غريب، والحاكم في المستدرك(٦٧٧/١)(١٨٤٠) من حديث أم سلمة دون (وحضور صلواتك)فإنها عند الخرائطي في المكارم الأخلاق ص/١٩٧(٤٦٨) والحسن بن علي المعمري في اليوم والليلة.

هَذا.إلاَّ أَذهَبَ اللهُ (عَزَّ وجَلْ) هَمَّهُ وأَبدَلَ مَكَانَهُ فَرَحاً. فقيلَ يَارَسولَ اللهِ: أَفَلاَ نَتَعَلَّمُهَا؟ فقال ﷺبَلَى. يَنبَغي لِمَن سَمِعَها أَنْ يَتَعلَّمَها[١].

ئەی خـودایە؛ مـن بەنـدە و کـوڕی بەنـدەی تـۆم. کـوڕی کەنیزەکی تـۆم، ناوچەوانم لە ژێر دەسەڵاتی تۆدایە. بڕیاری جەنابتان دادپەروەرانە بەسەر مندا قەڵەمـی لێـدراوە ، لەبەر خـاتری نـاوە جوانەکانـت کە خـۆت بەو نـاوانە نـاو بـردووە، یـاخود لە قورئانـدا نـاردووتەتە خـوارەوە، یـان فێـری یەکێـك لە دروسـتکراوانت کـردووە، یـان لای خـۆت هـێڵاوتەتەوە و کەسـت پـێ ئاگـادار نەکـردۆتەوە، دوات لێـدەکەم کە قورئـان بکەیـتە بەهـاری دڵـم، وە نـووری دەروون و سـینەم، وە بیکەیـتە لابەری خەم و نەمـانی خەفەت و ناڕەحەتیەکانم، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك بە خەمێکەوە بتلێتەوە و پێـی گیـرۆدە بووبێـت، وە ئەم نـزایە بخوێنێـت، ئەوا بە دڵنیـاییەوە خـودا خەمەکانی لادەبـات و، شـادی دەخـاتە دڵـیەوە، عەرزیـانکرد: ئەی پێغەمـبەری خـودا؛ ئایـا فێـری نەبین؟ پێغەمـبەر ﷺ فەرمـووی: بەڵێ پێویسـتە هەرکەسێك بیبیستێت فێری ببێت.

وە ئەگەر بـرین و ئازارێکـت هەبـوو لە جەسـتەی خـۆت، یـان کەسێکی تـر، دوعاکەی پێغەمبەری بەسەردا بخوێنە ﷺ، کە هەرکەسێك سکاڵای بکردایە لە

---

(١) رواه أحمد في المسند(٣٩١/١)(٣٧٠٤)وابن ماجه. وابن حبان في صحيحه(٢٥٣/٣)(٩٧٢) والحاكم في المستدرك٦٩٠/١(١٨٧٧) من حديث ابن مسعود وقال: صحيح على شرط مسلم، إن سلِمَ مِن إرسال عبد الرحمن عن ابيه فانه مختلف في سماعه عن ابيه وقول الحاكم ان سلم من ارسال عبد الرحمن الخ تعقبه الذهبي في مختصره فقال في السند أبو سلمة الجهني ماروى عنه إلا فضيل بن مرزوق، ولا يعرف اسمه ولا حاله. قال الحافظ ابن حجر ولكنه لم ينفرد به وذكره مع ذلك ابن حبان في الثقات.٣١٦/٧(١٠٢٤٥) ثم ساق الحافظ سنده الى علي بن المنذر واخرجه أبو يعلى في مسنده١٩٨/٩(٥٢٩٧) واخرجه ابن السني عن أبي يعلي ص/٣٠١(٣٤٠).

برینێك یان زامێك له سەر جەستەیدا ، پەنجەی شەهادەتی دەخستە سەر زەوی و، لەپاشان بەرزی دەكردەوەو دەیفەرموو:

**باسمِ اللهِ تُربَةُ أَرضِنَا، بِرِيقَةِ بَعضِنا، يُشفي سَقيمُنا بإذنِ رَبِّنا**[1]،

بەناوی خوداوە، خۆڵی زەوی خۆمان، بە تێكەڵكردنی تفی هەندێكمان، دەبێتە هۆكاری چاكبوونەوەی دەردوو برینمان، ئەمەیش بە ئیزنی پەروەردگارمان.

وە ئەگەر ئازارێكت هەبوو، دەستت بخەرە سەر ئازارەكە، وە سێ جار بڵێ: **بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحيم** بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبانەوە ، **وقُلْ سَبعَ مَرَّاتٍ: أَعوذُ بِعِزَّةِ اللهِ وقُدرَتِهِ مِنْ شَرِّ ما أَجِدُ وأُحاذِرُ**[2]،وە حەوت جار بڵێ: پەنادەگرم بە عیززەت و تەوانایی خودا، لە شەڕی ئەو ئێش و ئازارەی كە هەستی پێ دەكەم و ترسم هەیە لێی،

وە ئەگەر تەنگژە و بەڵا و ناڕەحەتییەك ڕووی تێ كردیت، بڵێ:

**لاإِلَـهَ إلاَّ اللهُ العَليُّ الحَليم، لاإِلَـهَ إلا اللهُ ربَّ العَرشِ العَظيم، لاَ إِلَـهَ إلاَّ اللهُ ربُّ السَّماواتِ والأَرضِ ورَبُّ العَرشِ الكَريم**[3].

هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە ئەڵلاه، كەخاوەنی بەرزی و هێمنی وخۆڕاگرییە خاوەنی عەرشی گەورەی مەزنە، هیچ پەرستراوێك بە حەق و ڕاستی نیە جگە لە زاتی (الله) پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی، وە پەروەردگاری عەرشی گەورەی بەرین.

وە ئەگەر ویستت بنویت، لە پێشەوە دەستنوێژێك بگرەو، لەسەر تەنیشتی ڕاست پاڵكەوەو ڕوو لە قیبلە بكەو سی و یەك جار **اللهأَكْبَر** بڵێ و ، سی و سێ

---

(١) رواه البخاري (٥٧٤٥)، ومسلم (٢١٩٤).

(٢) رواه مسلم (٢٢٠٢).

(٣) رواه البخاري (٦٣٤٦) ومسلم (٢٧٣٠)، والترمذي (٣٤٣٥). وعنده لفظة: **العلي الحليم** وفي الصحيحين : **العظيم الحليم**.

جار (سبحان الله) و. سی و سێ جاریش **الحَمْدُ للهِ** بڵێ[1]،له پاشانئه‌م نزایه بخوێنه: **اللَّهُمَّ؛ إنِّي أعوذُ بِرِضاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وبِمُعافاتِكَ مِنْ عُقوبَتِكَ، وأعوذُ بِكَ مِنكَ، اللَّهُمَّ: لاَ أستَطيعُ أنْ أبلُغَ ثَناءً عَلَيكَ ولَو حَرَصتُ، ولكِنْ أنتَ كَما أثنيتَ علَى نَفسِكَ**[2]،**اللَّهُمَّ: باسمِكَ أحيا وأموتُ**[3]،واته:

ئه‌ی خودایه؛ من په‌نادەگرم به ڕەزامەندی تۆ، له توڕەییت، وه به لێبوردەییت، له تۆڵه‌سه‌ندنەوەت، په‌نادەگرم به زاتی تۆ، له هه‌ندێك له صیفه‌ته‌كانی خۆت.ئه‌ی خودایه؛هه‌رچی تواناشم هه‌یه بیخه‌مه كار،ناتوانم وەك پێویست سه‌ناو ستایشت بكه‌م،به‌ڵام به‌وه حه‌مدو سه‌نات دەكه‌م كه خۆت سه‌ناو ستایشی خۆتتكردووه. ئه‌ی خودایه:به‌ناوی تۆوه دەژیم و دەمرم.

**اللَّهُمَّ: ربَّ السَّماواتِ ورَبَّ الأرضِ وربَّ كُلِّ شَيْءٍ ومَليكَهُ، خالِقَ الحَبِّ والنَّوَى، وَمُنَزِّلَ التَوراتِ والإنجيلِ والفُرقانِ، أعوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ ذي شَرٍّ، ومِنْ شَرِّ كُلِّ دابَّةٍ أنتَ آخِذٌ بِناصِيَتِها، أنتَ الأوَّلُ فَلَيسَ قبلَكَ شَيْءٌ، وأنتَ الآخِرُ فَلَيسَ بَعدَكَ شَيْءٌ، وأنتَ الظَّاهِرُ فَلَيسَ فَوقَكَ شَيْءٌ، وأنتَ الباطِنُ فَلَيسَ دونَكَ شَيْءٌ، إقْضِ عَنِّي الدَّينَ، وأغْنِنِي مِنَ الفَقرِ**[4]،

ئه‌ی خودایه؛ په‌روەردگاری ئاسمانه‌كان و زەوی، خاوەنی هه‌موو شتێك و، مه‌لیك و دەسه‌ڵاتداری هه‌موان، دروستكاری هه‌موو تۆم و ناوك و دانه‌وێڵه‌یه‌ك، ئه‌ی ئه‌و زاته‌ی كه ته‌ورات و ئینجیل و قورئانت نارده خوارەوه، په‌نادەگرم به تۆ، به دوورمانخه‌یت له شه‌ڕی هه‌موو خاوەن شه‌ڕێك، وه بمانپارێزه له‌شه‌ڕی هه‌موو ئه‌وانه‌ی به‌سه‌رزەویدا دەگه‌ڕێن و. فه‌رمانیان

---

(١) كما في البخاري (٣١١٣) ومسلم (٢٧٢٧).

(٢) رواه النسائي في عمل اليوم والليلة(٨٩٧) وأصل الدعاء في الصحيح كما سبق.

(٣) رواه البخاري (٧٣٩٤) واللفظ له، ومسلم(٢٧١١).

(٤) رواه مسلم (٢٧١٣)، وأبو داوود (٥٠٥١)، والترمذي( ٣٤٨١)، وقوله ومليكه: من دعاء سيدنا الصديق (رضي الله عنه) المتقدم.

بەدەست تۆوەیە، تۆ سەرەتای هەموو بوونێکیت و، پێش تۆ هیچ شتێك نەبووە، تۆ لە دوای هەمووی دەمێنیت و هیچ شتێك لەدوای تۆ نابێت و نامێنێتەوە، تۆ ئاشکراو دیاریت و هیچ شتێك نیە بڕیاری لەسەر بڕیاری تۆوە بێت، تۆ باطین و شاراوەیت و نزیکترین کەسی بەهەموو شتێك، لە خۆیان بەخۆیان. قەرزەکانم بۆ ببژێرە وە و . لە هەژاریش ڕزگارم بکە.

**اللَّهُمَّ: إِنَّكَ خَلَقتَ نَفسي، وأنتَ تَتَوَفَّاها. لكَ مَماتُها ومَحياها. اللَّهُمَّ: إِنْ أَمَتَّها فاغْفِرْ لَها، وإِنْ أَحْيَيْتَها فاحفَظْها. اللَّهُمَّ: إِنِّي أَسأَلُكَ العافِيَةَ في الدُّنيا والآخِرَة.[1]، بِإِسْمِكَ رَبِّي وضَعتُ جَنبي، فاغْفِرْ لي ذَنبي[2]،اللَّهُمَّ: قِني عَذابَكَ يَومَ تَجمَعُ عِبادَكَ[3]، اللَّهُمَّ: أَسلَمتُ نَفسي إِلَيكَ ، ووَجَّهتُ وجهي إِلَيكَ، وفَوَّضتُ أمري إِلَيكَ، وأَلْجَأْتُ ظَهري إِلَيكَ، رَغبَةً وَرَهبَةً إِلَيكَ، لاَمَلْجَأَ ولاَ مَنجا مِنكَ إِلاَّ إِلَيكَ، آمَنتُ بِكِتابِكَ الذي أَنزَلتَ، وبِنَبِيِّكَ الذي أَرسَلتَ[4]**

ئەی خودایە؛ تۆ نەفس ورۆحی منت دروست کردووەو تۆیش دەیگێڕیتەوە بۆ لای خۆت، مردن و ژیانی تەنها بۆ لای خۆت دەگەڕێتەوە، ئەی خودایە: ئەگەر گیانی منت کێشا، ئەوا لێیشی خۆشبە، وە ئەگەر بەردەوامی ژیانیشت پێبەخشی، ئەوا بیپارێزە. ئەی خودایە؛ من داوای لێبوردن و تەندروستی و لەشساغیت لێدەکەم، لە دونیاو دوارۆژدا، بەناوی تۆوە ئەی خودا، ئەوا تەنیشتم لەسەر جێگاکەم داناو. داوات لێدەکەم لە گوناهەکانم خۆشبیت،

(١) رواه مسلم (٢٧١٢) دون قوله في الدنيا ولآخرة.

(٢)رواه النسائي في اليوم والليلة.وعند أبي داوود (٥٠٥٤)باسم الله وضعت جنبي، اللهم اغفر لي ذنبي، وأخسئ شيطاني، وفُك رهاني، واجعلني في النَدِيّ الأَعلَى، وأصله في الصحيحين

(٤) رواه الترمذي(٣٣٩٨). في الشمائل ص/٢١٦(٢٥٥_٢٥٦)من حديث ابن مسعود، وهو عند أبو درداء(٥٠٤٥)، من حديث حفصة، بلفظ (تبعث) وكذا رواه الترمذي من حديث حذيفة (٣٣٩٨) وصححه، ومن حديث البراء كتاب الدعوات، باب منه (٣٣٩٩) وصححه.

ئەی خـــودایە؛ بمپـــارێزە لە ســـزای ئـــاگر ، ئەو ڕۆژەی هەمـــوو بەنـــدەکانت کـۆدەکەیتەوە ئەی خـودایە: ئەوا گیـانی خـۆمم دایە دەسـتی تـۆ، وە ڕووی ڕوخساری خۆمم کردە تۆوە، وە هەموو فەرمانەکانی خۆمم دایە دەستۆوە، تۆ سەرپشکی هەموو بڕیارەکانمیت، پشتم پێت بەستووە، وە پەنام بۆ هێناویت، بەخۆشـی خـۆم و هەم بە حـاڵەتی تـرس و خـۆفم لە خزمەتـدا،هیچ پشـت و پەنایەکم نیە مایەی ڕزگاریم بێت لە تۆ،بێجگە لە پەناهێنان بۆ تۆ، بڕوام بەو پەڕاوە هێناوە کە ناردووتەتە خوارەوە،وە بەو پێغەمبەرەش کەڕەوانەت کردووە.

ئەمەش با دوا نزات بێت، وەك پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێداوە[1]،

با دوای ئەمەیش بڵێت: **اللَّهُمَّ: أَيْقِظني في أحبِّ السَّاعاتِ إِلَيكَ، واسْتَعمِلني بِأَحَبِّ الأَعمالِ إِلَيكَ، تُقَرِّبُني إِلَيكَ زُلْفى، وتُبعِدُني مِنْ سَخَطِكَ بُعداً. أَسأَلُكَ فَتُعطِيني، وأَستَغفِرُكَ فَتَغفِرُ لي، وأَدعوكَ فَتَستَجيبُ لي.**[2]

ئەی خودایە؛ لەو کاتەی شەودا خەبەرم بکەرەوە، کە لە هەموو کاتەکان پێت خۆشترە، وە بمخەرە سەر ئەو کردەوانەی کە خۆشەویست ترین کردارن لەلای تـۆ کە ئەنجامیـان بـدەم ، لە خـۆتم بە چـاکی نزیـك بخەیـتەوەو، لە کارێکیش دوورم بخەرەوەکە مایەی توڕەبوون و زویر بوونی تۆ بێت ، داوات لێبکەم و پێم ببەخشیت،داوای لێبوردن بکەم و لێم ببوریت، دوعاکانم بکەمە حزورت و لێم وەربگریت. وە ئەگەر بەیانی لە خەو بەئاگا هاتیت؛ ئەوا بڵێ:

**الحَمدُ للهِ الذي أَحْيانا بعدَما أَماتَنا وإِليهِ النُّشُور**[1] **، أَصبَحْنا وأَصْبَحَ المُلْكُ للهِ. والعَظَمَةُ والسُّلْطانُ للهِ. والعِزَّةُ والقُدرَةُ للهِ**[2] **،أَصبَحنا على فِطرَةِ الإِسلام، وكَلِمَةِ الإِخلاصِ، وعَلى دينِ نَبِيِّنا مُحَمَّدٍ صَلَى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم. ، ومِلَّـــةِ أَبيـــنا**

---

(١) رواه البخاري(٢٤٧)، ومسلم (٢٧١٠). فەرمووددەکەی سەرەوەیش هەمان سەرچاوەی هەیە.

(٢) رواه الديلمي كما في مسند الفردوس٤٩٥/١ (٢٠١٧)، وعند ابن النجار في ذيل تأريخ بغداد، ٢٢٨/١٦، مرفوعاً بنحوه، والصواب إنه من قول حبيب الطائي، ينظر الإتحاف ١١٠/٥.

إبراهِيمَ حَنيفاً وَما كانَ مِنَ المُشرِكِينَ[3]،اللَّهمَّ؛ بِكَ أَصبَحنا ، وبِكَ أَمسَينا، وَبِكَ نَحيا، وبِكَ نَموتُ، وإلَيكَ المَصيرُ[4]،اللَّهمَّ؛ إنَّا نسأَلُكَ أَنْ تَبعَثَنَا في هذا اليَومِ إلَى كُلِّ خَيرٍ، ونَعوذُ بِكَ أَنْ نَجتَرِحَ فيهِ سوءاً أَو نَجُرَّهُ إلَى مُسلِمٍ. فَإنَّكَ قُلتَ:
﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ بِاللَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُمْ بِالنَّهَارِ ثُمَّ يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَى أَجَلٌ مُسَمًّى﴾ (أنعام/٦٠)[5]،

واته: سوپاس بۆ ئەو خودایەی زیندووی کردینەوە، دوای ئەوەی مراندینی، وەزیندووبوونەوەی یەکجارەکیش هەر بۆلای خۆی دەگەڕێتەوە، بەیانیمان بەسەداهات و، موڵك و دەسەڵات و تەوانایی هەر بۆ خودایە، ڕۆژمان

---

(١) رواه البخاري(٦٣١٢)، ومسلم(٢٧١١). قال الزبيدي ١١١/٥: حديث ابن مسعود هذا رواه ايضاً أبو داود (٥٠٧١) والترمذي(٣٣٩٠) والنسائي في همل اليوم والليلة(٣٨٢)(٥٧٣) كان نبي الله ﷺ إذا أمسى قال:**أمسينا وأمسى الملك لله وإذا أصبح قال: أصبحنا واصبح الملك لله.**

(٢) رواه بنحوه الطبراني في الأوسط(٩٣٨)٢٨٦/١(٩٣٤) ممن حديث عائشة، وقوله : **أصبحنا وأصبح الملك لله**، عند مسلم (٢٧٢٣). ). قال الزبيدي ١١١/٥: حديث ابن مسعود هذا رواه ايضاً أبو داود (٥٠٧١) والترمذي(٣٣٩٠) والنسائي في همل اليوم والليلة(٣٨٢)(٥٧٣) كان نبي الله ﷺ إذا أمسى قال: أمسينا وأمسى الملك لله وإذا أصبح قال: **أصبحنا واصبح الملك لله.**

(٣) رواه أحمد في المسند(٤٠٧/٣)(٢٠٦٤١)،مرفوعا. والنسائي في عمل اليوم والليلة (ص/١٣٣)(١).من حديث عبدالرحمن بسند صحيح.

(٤) رواه أبوداوود(٥٠٦٨)، والترمذي(٣٣٩١)وحسنه إلا أنه قال: **واليك النشور**، والنسائي في الكبرى(٩٧٥٢)وابن ماجه(٣٨٦٨) وابن حبان في صحيحه(٢٤٤/٣)(٩٦٤)وابن السني٤٩(٥٠).

(٥) كذا في القوت، وبنحوه عند أبي داوود(٥٠٨٣)،والترمذي(٣٥٢٩). قال الزبيدي١١١/٥رواه الترمذي من حديث أبي هريرة **أن أبا بكر الصديق رضي الله عنهما قال يا رسول الله؛ مرني بكلمات أقولهن إذا أصبحت وإذا أمسيت فساقه**، وقد انفرد الترمذي بهذه الزيادة، وقد رواه أبو داود والنسائي في السنن الكبرى(٤٠٨/٤)(٧٧١٥) والحاكم في المستدرك(٦٩٤/١)(١٨٩٢) وابن حبان في صحيحه(٤٤٢/٣)(٩٦٢) بدون هذه الزيادة وقد تقدم ذكره في دعاء أبي بكر رضي الله عنه

لێبوویەوە لەسەر خاوێنی فیطرەتی ئیمان و، کەلیمەی ئیخلاص و دڵسۆزی، وە لەسەر پەیڕەوکردنی ئاینی(حەزرەتی)موحەممەدﷺ وەمیللەتی حەزرەتی ئیبراهیم، کەلەسەر ڕەسەنایەتی و موسوڵمانیەتی مابوویەوە و، هەرگیز هاوبەشی بۆ خودا بڕیار نەداوە، ئەی خودایە: بە توانای تۆوە بەیانیمان کردەوە، وە بەهۆی تۆوە ئێوارەمان لێدەبێتەوە، وە هەروەها مردن و ژیان و داهاتوومان تەنها بەتۆیە و بۆ لای تۆ.

ئەی خودایە: داوات لێدەکەین: لەم ڕۆژەدا بەرەو لای هەموو جۆرەکانی خێرمان بەرێ بخە، پەنات پێدەگرین کە لەم ڕۆژەدا خراپەی تیا بکەین، یان خراپەیەك توشی موسوڵمانێك بکەین، بەڕاستی هەر تۆی کە فەرمووتە: الله ئەو خودایە: کە بەشەو دەتانمرێنێت و دەشزانێت بە ڕۆژدا چیتان کردووە، لەپاشان بۆ سبەینێ زیندووتان دەکاتەوە، تا ئەو ڕۆژەی مۆڵەتی ژیانتان مابێت دەژین و دەمێننەوە.

**اللَّهُمَّ : فَالِقَ الإصبَاحِ وجَاعِلَ اللَّيلِ سَكَناً، والشَّمْس والقَمَر حُسبَاناً، أَسأَلُكَ خَيرَ هَذا اليَومِ وخَيرَ ما فيهِ، ونعوذُ بكَ مِنْ شرِّهِ وشَرِّ ما فيهِ**[1]، ئەی خودایە: ئەی ڕووناکی بەخشی کاتی بەرەبەیان، وە شەویشت گێڕاوە بە کاتی حەوانەوەو ئارامی، ڕۆژوو مانگیش بۆ ژماردن و دیاریکردنی کاتەکان، داوای

---

(١) كذا في القوت:٣٢/١، وإلى قوله حسبانا، عند مالك في الموطأ، ٢١٢/١، بلاغا مرسلا، وتمامه عند أبو داوود، (٥٠٨٤)، بلفظ: **إني أسألكَ خيرَ هذا اليومِ، فتحهُ ونصرهُ، ونوره وبركته وهُداه، وأعوذبك من شر مافيه**، وبنحوه عند الطبراني في الدعاء(٢٩٥). وللدار قطني في الإفراد من حديث البراء :**نسألك خير هذا اليوم وخير ما بعده، ونعوذ بك من شر هذا اليوم وشر ما بعده**، وفي حديث أبي مالك الأشعري الذي تقدم قريباً: **اللهم أني أسألك خير هذا اليوم، وفي آخره : وأعوذ بك من شر ما فيه وشر ما بعده**، وفي اليوم والليلة للحسن بن علي المعمري: **اللهم إني اسألك خير ما في هذا اليوم وخير ما بعده وأعوذ بك من شر هذا اليوم وشر ما بعده.**

خێرو چاکەی ناو ئەمڕۆژەت لێدەکەم، وە ئەو خێرەیش کە لە ناویایەتی، وە پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی ئەم ڕۆژەو، ئەو ناخۆشی و خراپانەش لە ناویایەتی. **بسمِ الله مَا شاءَ الله، لا قُوَّة إلاَّ بالله، كلُ نِعمَةٍ مِنَ الله، ما شاءَ الله، الخَيرُ كلُّهُ بيَدِ الله، ما شاءَ الله، لا يَصرِفُ السُّوءَ إلا الله**[1].

بەناوی خوداوە، ئەوەی خودا ویستی لێبێت، دەبێت، هیچ هێزو پاڵپشتێك نیە بە یارمەتی خودا نەبێت، ئەوەی خودا مەیلی لەسەر بێت هەر ئەوە دەبێت، هەموو نیعمەتێك لە خوداوەیە، ئەوەی خودا پێی ڕازیە؛ هەموو خێرێك بەدەستی خودایە، وە هیچ کەسێکیش ناتوانێت خراپەت لەسەر هەڵبگرێت. **رَضيتُ باللهِ ربّاً، وبالإسلامِ ديناً، وبمُحمَّد ﷺ نبيّاً، ﴿ رَبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴾** (الممتحنة/٤) واتە:

ڕازیم کە (الله) پەروەردگارم بێت، وە بەوەی کە ئیسلام کە ئاینم بێت و(حەزرەتی)موحەممەدیش ﷺ پێغەمبەرم بێت، پەروەردگارا؛ پشتمان بە تۆ بەستووەو، بۆ خزمەتی تۆ دەگەڕێینەوەو، چارەنووس و داهاتویشمان هەر بۆلای تۆیە، وە ئەگەر ئێوارەت لێداهات، هەمان دوعا دووبارە بکەرەوە، لە جیاتی (أصبحنا) بەیانیمان کردەوە، بڵێ: (أمسينا) واتە: ئێوارەمان لێداهات.

لەگەڵ ئەوەشدا بۆ نزای بەیانیان و ئێواران دەڵێیت:

**أعُوذ بكَلِماتِ اللهِ التَّامَّات وأسْمائهِ كُلِّها، مِن شرِّ مَا ذَرأَ وبَرأَ، ومِنْ شَرِّ كُلِّ ذي شَرٍّ ، ومِن شَرِّ كُلِّ دابَّةٍ رَبِّي آخِذٌ بناصِيتِها إنَّ رَبِّي عَلَى صِراطٍ مُستَقيمٍ**[2].

---

(١) كذا في القوت١/٩، ورواه ابن عدي في الكامل(٢/٣٢٨) وابن عساكر في تأريخ دمشق(١٦٤٢٧) والديلمي كما في مسند الفردوس(٨٨٩٥)

(٢)قال العراقي رواه أبو الشيخ في كتاب الثواب من حديث ابن عوف من قال حين يصبح: **أعوذ بكلمات الله التامات التي لا يجاوزهن بر ولا فاجر من شر ما خلق وبرأ وذرأ وأعتصم من شر الثقلين الجن والإنس وإن لدغ لم يضره شيء حتي يمسي،وفيه وان قالهن حين**

پەنا دەگرم بە وتەو كەلیمە تەواوە بێ كەموكورتیەكانی خودا، وە بە ناوە پیرۆزەكانی خودا، لە شەڕی هەموو ئەو شتانەی كە خودا دروستی كردوون و، لە شەڕی هەموو خاوەن شەڕەكان، هەموو ئەوانەی بەسەر زەویدا دەڕۆن، وە جڵەویان لە ژێردەسەڵاتی تۆدایە، ڕێگاكەی خودا ڕاستەو، بەڕاستیش دەمانخاتە سەر ڕێگایەكی ڕاست و بێ پێچ و پەنا.

وە ئەگەر سەیری ئاوێنەیەكت كرد.. بڵێ : سوپاس بۆ ئەو خودایەی لەسەر شێوەو وێنەیەكی ڕاست و جوان دروستی كردووم، وە ڕوخسارێكی جوان و بەڕێزی پێبەخشیوم، وە گێڕاومی بە یەكێك لە موسوڵمانان.(١)

وە ئەگەر خزمەتكارو بەردەستێك یان غوڵامێكت پەیداكرد، یان وڵاخێكت كڕی، ئەوا دەستبخەرە سەر ناوچەوانیان و بڵێ:

خودایە من داوات لێدەكەم، تووشی خێربم لێیەوە . ئەو خێرەی لەسەری داهاتووەو خووی پێوە گرتووە، وە پەنادەگرم بە تۆ لە شەڕی، وە هەر خراپەو شەڕێك كە لە سەری گەورە بووبێت و پێی داهاتبێت.(٢).

---

**يمسي كن له كذلك** وروي ابن عدي في الكامل(٧/٢٤٣)والسنجري في الإبانة من حديث أبي هريرة من قال:**أعوذ بكلمات الله التامات من شرِّ ما خلق. ثلاث مرات لم تضره عقرب حتى يمسي ومن قالها حين يمسي لم تضره حتي يصبح**، ورواه الجماعة إلا البخاري من حديثه بلفظ جاء رجل إلي النبي ﷺ فقال يا رسول الله ما لقيت من عقرب لدغتني البارحة قال: **أما لو قلت حين أمسيت أعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق لم يضرك شيء**.

(١) رواه الطبراني في الأوسط( ١/ ٢٤٠)(٧٨٧)(٧٩١) وابن السني في عمل اليوم والليلة ص/١٣٩(١٦٥).وقال الزبيدي( ٥/ ١١٣): وكذلك رواه البيهقي في الشعب(٤/١١١)(٤٤٥٨)، وروى أبو يعلي أيضا في مسنده(٤/٤٧٨)(٢٦١١)، والطبراني في الكبير(١٠/٣١٤)(١٠٧٦٦)، من حدبث ابن عباس. كان اذا نظر في المرآت قال: **الحمدُ لله الذى حسَّن خلقي وخلقني وزان مني ما شانَ من غيري** الحديث وعن ابن مسعود رضى الله عنه كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يقول: **اللهم انت حسنت خلقي** رواه ابن حبان في صحيحه.

(٢) رواه أبو داوود (٢١٦٠)، وابن ماجه(١٩١٨).

وه ئەگەر پیرۆزبایی یەکێکت کرد بۆ هاوسەرگیری و گواستنەوەی ،بڵێ: خودا بەرەکەت بخاتە ژیانتەوە، وە بەرەکەت برژێنێت بەسەرتدا، وە خێر و بەرەکە تیش لە نێوانتاندا کۆبکاتەوە.**بارَكَ اللهُ فيكَ،وَبارَكَ عَلَيكَ، وجَمَعَ بَينَكُما في خَيرٍ**[1].

وە ئەگەر قەرزت بژاردەوە، بەخاوەن قەرزەکە بڵێ: خودا بەرەکەت بخاتە ماڵ و منداڵ و خانەوادەتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**إنَّما جَـزاءُ السَّـلَفِ الحَمـدُ والأَداءُ**[2]،دەبێـت پاداشـتی خـاوەن قەرزەکە بدرێتەوە بە سەناو سوپاسکردن و، بە دانەوەی ماڵەکەیش بە باشی.

ئەم دوعایانە هەموو موریدێکی ڕێگای ئاخیرەت پێویستی پێیان هەیە کە لەبەریان بکات، وە پاشماوەی دوعاکەنی سەفەر و نوێژ و دەستنوێژ و ئەوانی تر لە پەڕاوی نوێژ و حەج و (تەهارەتدا) باسمان کردن،

**ئەگەر وتت: سوودی دوعا چییە، کە دەزانین ئەوەی خودا بڕیاری لەسەر دابێت گەڕانەوەی نیە؟**بزانە: یەکێ لە بڕیار و قەزاکانی خودا ئەوەیە؛ کە بەڵا دەگێڕێتەوە بە هۆی دوعاوە[3]

(واتە: خـودا بـۆ ئەو کەسـەی کە بەڵاکەی بەردەکەوێـت، وا تەقـدیری کردووە کە دوعا نەکات، وە بۆ ئەوەی کە بەری ناکەوێت، وای تەقدیر کردووە کە دوعـا بکـات و لەسـەری هەڵبگیرێـت) ،کەواتە دوعـاکە هۆکـاری گەڕانەوەی بەڵاکەیە، وە ڕاکێشـەری بەرەکەتە، وەك چـۆن قەڵغانێـك دەبێـتە هـۆی

---

(١) رواه أبو داوود (٢١٣٠)، والترمذي(١٠٩١)، وابن ماجه(١٩٠٥).

(٢) رواه النسائي (٣١٤/٧)، باب الإستقراض(٤٦٨٣)من حديث عبدالله بن أبي ربيعة قال: إستقرض مني النبي ﷺ أَربعين ألفاً، فَجاءَهُ مالٌ فَدَفَعَهُ إِلَيَ،فقال: وذكره . وإسناده جيد.

(٣)ويشهد لذلك ما أخرجه الترمذي(٢٠٦٥) عن ابن أبي خزامة عن ابيه أن **رجلا اتى النبي ﷺ فقال يا رسول الله: أرأيت رُقِيٍّ نسترقي بها، ودواءً نتداوَى به، وتقاةً نتَّقيها، هل تَردُّ مِن قدَر الله شيئاً؟ فقال: هي من قدر الله.** إتحاف السادة المتقين١١٥/٥.

گێـڕانەوەی تیـرەکە، وە ئـاو دەبێـتە هـۆی پێگەیشـتنی ڕووەك و بەروو بـوومی کشتووکاڵی. هەروایش دوعاو بەڵا ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە،[1].

وە مەرج نیە کەسێك دان بەقەزاو قەدەری خوداییدا بهێنێت، ئەو مەرجەی لەسەرگیرابێت، کە نابێت چەك هەڵگرێت، کە دەزانین خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿خُذُوا حِذْرَكُمْ﴾ (النساء/٥١) واتە: ئامادەبی و حەزەری خۆتان وەرگرن، بۆ نموونە: ئەگەر ئاودێری زەویەکە نەکات کە تازە تۆوی ڕشتووە و بڵێت: ئەگەر خودا وا تەقدیریکردبێت کە پێبگات، ئەوا بەبێ ئاویش هەر شین دەبێت، ئەوە پێی دەوترێت: ئەگەر پێشتر خودا وابڕیاری دابێت کە بەبێبارانیش سەوز ببێت، ئەوا پێدەگات، ئەگەرنا وشك دەبێت و شین نابێت.

بەڵکوو قەزاو تەقدیری یەکەمی خودا وایە، کە بوونی کارەکانی بەستووە بە هۆکارەکانیەوە، کە وەك تروکاندنی چاو وایە، یان لەوەش نزیکترە، وە بەستنەوە و جێبەجێ بوونی کارێك لەسەر بوونی هۆکارەکان، بەپێی ڕیزبەندی و یەك لەدوای یەك، ئەوە قەدەری خودایە، ئەوەی خێرێکی تەقدیر کردووە، بەستویەتیەوە بە هۆکارێکەوە، هەروەها ئەوەی بڕیاری شەڕێکی داوە، وایداناوە کە ئەگەر بەرهەڵستی شەڕەکە کارابوو، ئەوا ڕووبەڕووی دەبێتەوە. کەواتە بۆ کەسێك چاوی دڵی کراوە بێتەوە، لە نێوانی ئەم چەند حاڵەتەدا هیچ ئاڵۆزی و دژایەتییەك نابینێتەوە.

لەپاشان ئەوەی باسمان کرد بۆ سوودی زیکرکردن، هەمان سوودیش بۆ دوعاکردن هەیە، کەواتە دەبێت دڵی ئامادەباش بێت لە حزوری خوادا، ئەوەش کۆتا پلەی بەندایەتییە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: الدُّعَاءُ مُخُّ العِبادَةِ[2].

---

(١) روى الطبراني في الأوسط(٢٥١٩)،والحاكم (٤٩٢/١)،مرفوعا:لاَيُغني حَذَرٌ مِنْ قَدَر، والدعاء ينفعُ مِما نزل ومما لم ينزلوإن البلاء لينزل فيتلقاهُ الدعاء يعتلجان إلى يوم القيامة

(٢)رواه الترمذي(٣٣٧١).

نزاو پاڕانەوە مۆخ و کاکڵەی بەندایەتییە، کەواتە زۆربەی خەڵکی دڵیان بەزیکری خودا دانامەزرێن،مەگەر لە کاتی کارو پێداویستییەك ڕووی تێکردبن، یان گیرۆدەی گرفتێك بووبن، مرۆڤ ئەگەر شەڕو خراپە ڕووی تێکرد، ئەوا نزاو پاڕانەوەیەکی درێژو ناجۆری هەیە، پێویستیی ناچاری دەکات پەنا بەرێتە بەردوعاکردن، نزاکردیش ڕووی دڵ دەگێڕێتەوە بەلای خوادا،کە لێی بپاڕێتەوەو ملکەچیی خۆی بنوێنێت، ئەو کاتە زیکری خودای لێپەیدا دەبێت،کە گەورەترینی بەندایەتییە،بۆیە زیاتر توندی بەڵاڕوو لە پێغەمبەران و، پاشان ڕوو لە دۆستانی خودا دەکات، لەپاشان ئەوانەی پلەیان لەوان نزیك دەبێتەوە، چونکە دڵەکان بۆ حزوری خودا وەردەگێڕێت، بە لاڵەو پاڕانەوە، ئیتر خودای لەبیر ناچێتەوە، بەڵام کەسێکی دەوڵمەند، زۆرتر سنگ دەردەپەڕێنێت و، کە بینی پێویستی بەکەس نیە، ئیتر یاخی دەبێت و، بیریشی ناکەوێتەوە کە پەنا بۆ خودا ببات.

ئەمەی باسمانکرد ئەوەندە بوو کە ویستمان لە بارەی زیکرو ویرد و نزاو دوعاوە بۆتانی باس بکەین، پاشماوەکەی لەبارەی خواردن و سەفەرو سەردانی نەخۆش و ئەوانی دیکە، لە جێگەی خۆیاندا پشت بەخودا باسیان دەکرێت، خودا پشت و پەنامان بێت.

پەڕاوی ئەزکارو نزاکان تەواو بوو، کە پەڕاوی نۆیەمە لە چواریەکی بەندایەتی، لە پەڕاوەکانی ژیانەوەی زانستەکانی ئاین. **حەمدو سەنا بۆ خوداو صەڵات و سەلام لەسەر باشترینی دروستکراوانی خودا و ئال و بەیتی بەڕێزی.**

**نۆبەی پەڕاوی: ڕێکخستنی ویردەکانە لە کاتەکاندا، وە باسی شەونوێژکردن.**

# پەڕاوی

## ڕێکخستنی ویردەکان بە پێی کاتەکان

## وەدرێژەباسێکی زیندووکردنەوەی

## شەوان بە بەندایەتی

## ئەمەش پەڕاوی دەیەمە لە چواریەکی

## بەندایەتی

## لە پەڕاوەکانی

## ژیانەوەی زانستەکانی ئاین

# کتاب

# ترتيب الأورادِ في الأوقات

## وتَفصيلِ إِحياءِ اللَّيلِ

## وهو الكِتابُ العاشِر من كُتب

## إِحياء علُوم الدِّين

# كِتابُ
# ترتيبِ الأَورادِ
# في الأَوقاتِ

## وتَفصيلِ
## إِحياءِ اللَّيل

# پەڕاوی
# ڕێکخستنی ویردەکان بە پێی
# کاتەکان

## وە باسکردنی زیاتری
## شەوبێداری و شەونوێژکردن

بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحيمْ

حەمدو سەنای زۆرو بێ پایان دەکەین، بۆ خوداوەندی میهرەبان، لەسەر نیعمەتە زۆرەکانی، وە زیکرێکی شایستەی بەردەوام دەکەین، بۆ خودای گەورە کە هەموو گەردێك لە دڵدا بسڕێتەوەو، لە ژەنگی خۆبەگەورەزانین خاوێنی بکاتەوە .

وە سوپاسیشی دەکەین، کە ڕۆژوو شەوی هێناوە بە دوای یەکدا،کە هەمیشە بتوانین یادی پەروەردگاری تێدا بکەین، یان شوکرانەبژێری بۆ دەربڕین.

هەروەها صەڵات و سەلامی بەردەوام، بۆ سەر ڕۆح و گیانی پیرۆزی پێغەمبەرەکەی بێت ﷺ ، کە بە ڕاستی خودا بە مژدەدەرو ترسێنەر ڕەوانەی کردووە بۆ سەر بەندەکانی، وە لەسەر یارو یاوەرانی بەڕێز و، ئال و بەیتی بەڕێزی بێت، کە تێکۆشان بۆ ئەنجامدانی ئەو پەڕی بەندایەتی و، زیندوکردنەوەی ڕێبازی خوداناسی، بەڕۆژوو شەوو بەیانیان و ئێواران، ماندونەناسانە لە عیبادەتدا بوون، تا هەریەکێکیان بوونە ئەستێرەیەکی پڕشنگداری ئاسمانی دینداری، وە خۆرێکی ئاوانەبووی جیهانی ڕێنمایی و بێدارکردنەوە.

**لەپاش سەناو ستایش**

خودای گەورە زەوی کردووە بە ناوەندێکی حەوانەوەی گوێڕایەڵی دەستەمۆ، تا بەندەکانی تێیدا بگیرسێنەوەو، بیکەنە مەنزڵگای ئاسوودەیی و، کێڵگەی چاندنی تۆوی پێداویستیەکانی بژێوی ژیان و، کەرەستەی گەیاندن و گواستنەوەیانی لێوەبەرهەم بهێنن، بۆ گەشت و گوزار لە ناو نیشتیمانەکانداو، تا هەندێك توحفە و دەسکەوتی نایابی لێ وەبەرهەم بهێنن و، بیکەنە توێشوی کاری ڕۆژانە و کاڵای بەنرخی ڕەوشت بەرزی خۆیان، وە خۆیان لە تەڵەو چاڵ و شیوە پڕ لە نەهامەتیەکانی بپارێزن.

وە بشزانن کە تەمەن وەك ئەو کەشتییەی بەناو دەریادا دەڕوات، ئاوا ئەوانیش

بەرەو کەنــاری دەریــاو کۆتــایی ژیــان بەڕێــدەخات، هەمــوان لەگەشــتێکی هەمیشــەییدان و ســەرەتای مەنزڵی ژیانیــان ئەو کــاتەیە دەچــنە نــاو ســکی دایکیانەوەو، لەپاشان لەدایك دەبن و، کۆتاییەکەشی ناو گۆڕیچەو ئەڵحەدە و، نیشــتیمانیش یــان بەهەشــتە یــان دۆزەخ، تەمەنــیش ئەو مــاوەیە کە لەگەشــتەکەدایە، ســاڵەکانی ژیــانی قۆناغەکــانیەتی، وە مانگەکــانی ســاڵ وەك فەرسەخەکانی درێژایی ڕێگایە، وە ڕۆژەکانیش وەك میلەکانە، وە هەناسەکانیشی بەرامبەرە لەگەڵ هەنگاوەکانــدا، وە گوێڕایەڵیەکەشی ئەو ســەرمایە و کاڵایەیە کە بەدەســتیەوەیەتی، وە کاتەکانیشــی ســەرمایەی مــاڵ و دراوەکــانیەتی، وە ئارەزووەکانی نەفس و مەبەستە شاراوەکانیشی، بەرابەرە لە گەڵ دزوو جەردەو ڕێگرەکاندا، قازانجەکەشی؛ دەستکەوتن و گەیشتن بێت بە لیقای خودای (عَزَّ وجَلَّ)، لە وڵاتــی ســەلام و ئاشــتیدا، لەگەڵ وەدەســتهێنانی مــوڵکێکی گەورەو نیعمەت و بژێوییەکی بەردەوامدا.

وە زیــان و خەسارەتەکەشــی: بــڕیتییە لە دوورکەوتــنەوە لە خــوداو ڕووبەڕووبــوونەوەی کۆت و زنجیــرو ســزای ســەخت و شــیوە ســەختەکانی نــاو دۆزەخ.

کەســێك لە یەکێــك لە هەناســەکانی خــۆی بــێ ئاگابێــت، تــا بەکۆتــای دەگەێنێــت، نەك لە بەندایەتیەکــدا کە لە خــوداوە نزیکــی بکــاتەوە، بەڵکــوو لەژیــانێکی پــڕ لە نەهامەتیــدا، کە بــێ دەســمایە بچێــتە قیــامەت و، خێراتــی دونیاشی بپچڕێت، بەڕاستی ڕۆژێکی پڕ لە زیان و خەسارەت و ئاخ هەڵکێشان چاوەنواڕی دەکات[1]

---

(١) ئەهلی بەهەشت دەبنە میرات گری ئەو جێگای کە دۆزەخیەکان بۆیان دیاری کرابوو، ئەگەر تەقواکــار بوونــایە، ، وە ئەهلــی ئــاگریش دەبــنە میراتگــری ئەو جێگــایەی کە

هەر لەبەر ئەم مەترسیيە گەورەيە، كەسە لێهاتووەكان چاكی مەردانەیان لێ كردووە بەلادا و، وازیان لە تام و چێژەكانی نەفس بەخێوكردن هێناوەو، ماوەی تەمەنی داهاتوویان بە هەند وەرگرتووە، بۆ ئەوەی ئەوەشیان لە دەستنەچێت و ، بە پێی دووبارە بوونەوەی كاتەكان خوێندنی ویردەكانیان بە شێوەیەكی گونجاوو پەسەند ڕێكخستووەو ، سووربوون لەسەر ئەوەی شەوەكان و ڕۆژەكانیش بە عیبادەت ئاوەدان بكەنەوە.

بەو هیوایەی كە زیاتر خۆیان نزیك بكەنەوە لە خودای بەدەسەڵات و پادشای خاوەن بڕیار، تا بە لێبڕانەوە هەوڵ بدەن بۆ دابین كردنی ژیانی هەمیشەیی پڕ لە ئاسوودەیی قیامەت.

كەواتە درێژە پێدانی چۆنیەتی زیكر و ویردەكان و دابەشكردنیان بەسەر كات و عیبادەتەكاندا، دەبێتە ئەركێكی گرنگی ئەو ڕێبوارانەی ڕێگای ئاخیرەت، كە ئەم بابەتە بە چاكی توێژینەوەی لەسەر بكەن ، وەك پێشتر باسمانكرد ئەندازەی كاتەكانیش دیاری بكەن، ئەم بابەتە بایەخدارەش لە نێوانی ئەم دوو دەروازەوە زیاتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە:

## دەروازەی یەكەم:

باسی گەورەیی ویردەكان و چۆنیەتی ڕێكخستنیان بە پێی كاتەكانی شەوو ڕۆژ.

## دەروازەی دووهەم:

لەبارەی چۆنیەتی زیندووكردنەوەی شەو بە عیبادەت ، وە باسی ئەو گەورەییانەی كە پەیوەندارن پێیەوە.

---

بەهەشتییەكان پێیان دەدرا، ئەگەر خراپەكار بوونایە، یەك جێگەی یەك پڕ دەكەنەوە، وە ئەم نموونەی كە ئیمامی غەزالی هێناویەتیەوە، بەو تەشبیە ولێكچوونەی باسی كردووە،لەكتێبێكیدابە درێژتر ڕوونی كردۆتەوە، بنوارە: فضائح الباطنية الغزالي ص/٢٢٥.

# دەروازەی یەکەم

## باسی گەورەیی ویردەکان و ڕێکخستن و حوکمەکانیان

## (گەورەیی خێری ویردەکان)

### وە بەردەوامبوون لەسەریان ڕێگای گەیشتنە بە ڕەزامەندی خودا:

بــزانە: ئەوانەی بە نــووری بەصــیرەت و چــاوی دڵەوە ســەیری شــتەکان دەکەن، دەزانن کە ڕزگاربوون نیە، مەگەر بە گەیشتن بە لیقای خودای (عَزَّ وجَلْ)، وە ڕێگای ئەم پێگەیشتنەیش نـیە، مەگەر بە مردنێـك نەبێـت کە بە گیــانی محەببەتــی تەواوەوە گیــانی ســپاردبێت، وە خودانــاس و عــاریفێکی ڕاستەقینە بێت، وە ئەم خۆشەویستی و پێکداهاتنەشی بۆ نایەتە دی، مەگەر لە ڕێگەی بەردەوام بوون لە باس و یاد و ناوبردنی خۆشەویستەکەی، وە ناگاتە پلەی مەعریفەت و خوداناسی، مەگەر بە بەردەوامی لە بیرکردنەوە لە صیفات و کردارەکــانی خــودا، وە دڵنیابێــت کە لەم بــوونەوەرەدا کەســێك بــوونی ڕاستەقینەی نیە بێجگە لە خوداو کردارەکانی، وە ناتوانێت ئەو کەشی زیکرو یادکردنەیش بـۆ خـۆی فەراهەم بهێنێت، ئەگەر پشـت لە دونیـاو ئارەزووەکـان نەکات، وە تەنها ئەوەنـدە دونیـای بوێت، کە بە پێی پێویست ژیان و بژێوی بـۆ دابین بکات و بەس، هەمـوو ئەمانەیشی بۆ تەواو نابێت، تەنها لەو ڕێگەیەوە نەبێت کە هەمـوو کاتەکـانی شـەوو ڕۆژی لە ئەرکە گرنگەکـانی زیکـر و ویـردو بیرکردنەوەدا بێت.

کـاتێکیش نەفـس بەم زیکـرو ویـردە دادێـت، ناتوانێـت بە تەنهـا کردنـی جـۆرێکی دابکەوێـت، چـونکە مانـدوو دەبێـت و، مەلەل و بـێ تـاقەتی ڕووی تێدەکات، بۆیە دەبێت هونەری زیکرو ویردە جیاوازەکان فێر ببێت و هۆکارەکانی

بخاته بەرچاو، تاوای لێدێت، ئەگەر بیەوێت بیخاتە سەر یەك شێوازی زیکر کردن، تووشیماندووبوون ببێت، کە زۆر بەلایەوە گران دەبێت.

بەڵام خوای گەورە لە هیچ کارێکی بەندەکانی ماندوو نابێت و لە زۆرکردنی زیکرو یادو پاڕانەوەیان بێزار نابێت مەگەر ئەوان بۆ خۆیان بێزار بن، وە لە ئاسەواری لوطفی خودایە، کە پێویستی نەکردووە لەسەر بەندەکانی، بەیەك شێوازو جۆرەوە خەریك بن و بەردەوام بن، بۆیە بەپێی کات و شوێنەکان بۆیان دەگوازێتەوە، بۆ ئەوەی تام و چێژی تریان پێببەخشێت، وە زیاتر خواست و خۆشەویستییان بچێتە سەر زیکرو ویردە نوێ و تازەکانەوە، وە چەندێك زیاتر هۆگریان ببێت، ئەوەندە باشتر چێژیان لێ وەردەگرێت، وە ئەو تام و چێژە بەردەوام دەبێت، بەبەردەوام بوونی لەسەر ویردەکان.

**بۆیە ویردەکان دەکرێن بە چەند بەشێکی جیاوازەوە :**

زیکر و بیرکردنەوەکەش دەبێت هەموویان زۆربەی کاتەکانی بگرێتەوە، چونکە نەفسی مرۆڤ بە پێی سروشتی خۆی ئارەزووی بەلای تام و چێژە دونیاییەکانەوەیە، ئەگەر بەندەیەك نیوەی تەمەنی تەرخان بکات بۆ وەدەست هێنانی کاروباری دونیاو ئارەزووە دروست و موباحەکانی کە ڕێگریان لێ نەکراوە، وە نیوەکەی تریشی تەرخان بکات بۆ بەندایەتی، ئەو کاتە بارسەنگی بەرەو لای دونیاویستییەکە دەبێت، چونکە لەگەڵ هەواو ئارەزووەکانی خۆیشیدا دەگونجێت، وەکاتەکانیش یەکسانن، ئیتر چۆن دەتوانێت ڕوبەڕووی ئارەزووەکانی بووەستێتەوە، کە سرووشت و مەیلی نەفسی بە لایەکیانەوە زیاترە؟ چونکە زاهیر و باتین هەردووکیان دەبنە یارمەتیدەر بۆ کاروبارە دونیاییەکان، وە دڵیش بۆی دەڕوات و، صەفاو خۆشییەکی پێدەگات، بەڵام گێڕانەوەی ئەو دڵە بەرەو عیبادەت، قورسایی و ئەرکێکی گرانەو، کەمتر دڵ دەتوانێت بە تەواوی ئیخلاصەوە لەو نێوەندەدا خۆی ببینێتەوە، مەگەر لە هەندێك کاتدا نەبێت.

کەواتە ئەوەی مەبەستی بێت بچێتە ناو بەهەشتەوەو، لێپرسینەوەیشی لەگەڵ نەکرێت، با هەوڵبدات هەموو کاتەکانی لە گوێڕایەڵیدا بەسەر بەرێت، بەڵام کەسێك تەنها ئەوەندەی بوێت کە بارسەنگی چاکەکانی قورسترو زیاتر بێت لە خراپەکانی، با هەوڵبدات زۆربەی کاتەکانی لە عیبادەتدا بەسەرببات، بەڵام ئەگەر کردەوە چاکەکانی تێکەڵ بەخراپەکان بوو،ئەوە لە حاڵەتێکی مەترسیدار دا دەبێت، بەڵام هیوابڕاویش نابێت، وە لە کەرەمی خودا لێبوردن و بەخشین کارێکی چاوەنوارکراوە، لەوانەیە بەر نەزەر و لێبوردنێکی خودایی بکەوێت.

ئەمەی باسمان کرد، ئەو ئەندازەیە کە بە هۆی نووری بەصیرەتەوە بۆ ئەوانەی چاوی دڵیان کراوەیە بۆیان دەرکەوتووە، ئەگەر تۆ لەوانە نیت، ئەوا گوێ بۆ گوتارو خطاب ی خودای (عَزَّ وجَلْ) بگرە کە ڕوو لە پێغەمبەرەکەی دەکات ﷺ، وە بە نووری ئیمان بیزانەو پەندی لێ وەربگرە، کە خودابە نزیکترینی بەندەکانی کە خاوەنی بەرزترینی پلەکانی تەقوایە دەفەرموێت:

﴿إِنَّ لَكَ فِي النَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا. وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا﴾ (المزمل/٨)

لەبەر ئەوەی بەڕۆژدا سەرقاڵی زۆرت هەیە، جگە لە نوێژە فەرزو سوننەتەکان و بەردەوام بوون لەسەریان، لەوەبەولاوە زیاترت بۆ ناکرێت، کەواتە ناوی خودای خۆتی لێبهێنەو بۆ پاڕانەوە و دابڕان بۆی خۆتی بۆ یەکلایی بکەرەوەو خۆت بۆ بەندایەتی تەرخان بکە.

هەروەها خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا. وَمِنَ اللَّيْلِ فَاسْجُدْ لَهُ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا﴾ (الإنسان/٢٦) واتە: خەریکی نوێژ و زیکری خۆت بە بە بەیانیان و نیوەڕۆ و عەسرانداو نوێژی ئێوارە و خەوتنانیش بکەو شەوگارێکی درێژیش هەیە کە تەسبیحاتی خودای تێدا بکەیت.

وە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ، وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ﴾ (ق/٤٠)

خودای خۆت پاکوو بێگەرد ڕابگرە و، بەر لەهەڵاتنی خۆر لە سبەیناندا نوێژ

بکەو، بەشەویشداهەروا نوێژ بکەو، لەپاش سوجدەبردنی ئەو نوێژانەش هەروا شەونوێژو نوێژی وەتر بکە[1]،

﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ، وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَارَ النُّجُومِ﴾ (الطور/٤٩)

کاتێك لە خەو هەڵدەستیت، یان ڕاست دەبیتەوە بۆ نوێژ، سوپاس و ستایشی خودا بکەو بەشێکی شەویش تەسبیحات و سوپاس و ستایشی بکە، وە هەروەها کاتی ئاوابوونی ئەستێرەکانیش کە ڕۆژ دەبێتەوە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْئًا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴾ (المزمل/٦)

بێ گومان نوێژێك بەشەو بکرێت گرانترە لە نوێژێك بە ڕۆژ بکرێت، چونکە لە خەوهەستانی دەوێت، وە لە ڕووی وتنی ئایەت و دوعاکانیشەوە ڕاسترە، چونکە دونیا کش و ماتەو، هیچ شتێك نیە سەر لە نوێژخوێن تێك بدات.

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمِنْ آنَاءِ اللَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ النَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَى﴾ (طه/١٣٠)هەروەها لە هەندێ کاتی شەوداسوبحانەڵلا بکە،(مەبەست لە شەونوێژە) وە لەکاتی هەردوو چەمکەکەی ڕۆژدا(نوێژی بەیانی و ئێوارە)، ئومێد وایە بەرامبەر بەم تەسبیحات و سوپاسکردنی خودایە، پاداشتێکی وات لە خودای گەورەوە بەربکەوێت، کە جێگای ڕەزامەندی و دڵخۆشیت بێت.

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ﴾ (هود/١١٤) نوێژەکانت ڕاگرە و جێبەجێیان بکە، لە هەردوو لای نوێژو چمکەکانیدا، (نوێژی بەیانی و نیوەڕۆ و عەسر) هەروەها لە چەندکاتێکدا کە نزیکی ڕۆژن، (وەك نوێژەکانی ئێوارە و عیشا)، بەڕاستی کردەوە چاکەکانتان، گوناهە بچوکە کانتان لادەدەن و دەیانسڕنەوە.

**لەپاشان بنواڕە**؛ چۆن تاریفی بەندە سەرفرازەکانی کردووە، وە بەچی وەصفیان

---

(١) هەموو واتای ئایەتەکان سوود لە خۆلاصەی تەفسیری نامی وەرگیراوە. ٥٢٠.

دەكات، ئەوەتانێ خودای (عَزَّ وجَلْ) دەفەرموێت:

﴿أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ. قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ والذينَ لاَيَعلَمونَ﴾ (الزمر/٩)

ئایا كەسێك كە بە كاژێرەكانی شەودا خەریكی چەندین شێوەی عیبادەتەو، لە قیامەتیش دەترسێت و، بەهیوای ڕەحمەتی خودایشە، وەك كەسێكی بێباوەڕی كافر وایە؟ ئایا ئەوانەی زانان و ئەوانەی هیچ نازانن وەك یەك وان؟!

خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾(السجدة/١٦)واتە: بەشەو ڕاستدەبنەوە بۆ خوداپەرستی،وە لە ترسی سزای دۆزەخ،وە بەهیوای وەدەسهێنانی نیعمەتەكانی بەهەشتە كە لە خودای خۆیان دەپاڕێنەوە.

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًا﴾ (الفرقان/٦٤) هەروەها ئەوانەی شەوان بەسەر دەبەن بە سوجدە بردن و نوێژو ڕاوەستان لە نوێژدا بۆ خودا.

خودای (عَزَّ وجَلَّ) فەرموویەتی: ﴿كَانُوا قَلِيلًا مِنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ، وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ (الذاريات/١٨) ئەوانە كەمێك لەشەودا پاڵ دەكەوتن و هەمیشە خەریكی عیبادەت بوون، بەیانیانیش وەك یەكێك گوناهی زۆری بەشەودا كردبێت، هەروا خەریكی داوای لێخۆش بوونن لە خودا.

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿ فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ، وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ﴾ (الروم/١٨) كەواتە پاكی و بێگەردی هەر بۆ خودایە، كاتێك كە دەكەونە ئێوارەوە و كاتێكیش كە ڕۆژدەكەنەوە، وە سەناو ستایشیش هەر بۆ خودایە، لە ئاسمانەكان و لە زەویدا، كاتێك كە دەكەونە شێوان و نیوەڕوانەوە، واتە لە هەموو كاتەكاندا.

وە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾ (الأنعام/٥٢) لەبەر خاتری ڕاگیركردنی دڵی كافرەكان

هەژارە موسوڵمانەکان دەرمەکە، کە بەیـانی و ئێـواران لە خودای خۆیـان دەپاڕێنەوەو، مەبەستیان تەنها ڕەزامەندی خودایە.

ئەم هەموو ڕوونکردنەوانە ئەوەت بۆ دەردەخات کە ڕێگای دواڕۆژ بە چاودێری کردنی کاتەکان دەبێت، وە ئاوەدانکردنەوەی ڕێگاکەیش بە بەردەوامبوون دەبێت لەسەرویردەکان، هەر لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**(( أَحبُ عِبادِ اللهِ إِلَى اللهِ، الذينَ يُراعُونَ الشَّمسَ والقَمَرَ والأَظِلَّةَ، لِذِكرِ اللهِ تَعالَى))**[1]، خۆشەویستترینی بەندەکانی خودا لای خودجای گەورە ئەوانەن کە چاودێری خۆر و مانگ و کاتە سێبەرەکان دەکەن، بۆ ئەوەی زیکری خودایان تێدا بکەن.

هەروك خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿**الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ**﴾(الرحمن/٥) مانگ و ڕۆژ ڕەوتی خۆیان دەکەن و ڕێی خۆیان دەبڕن، لەسەر حیسابێك کە بۆیان دیاری کراوە ، بۆ کاتەکانی هەڵاتن و ئاوابونیان.

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿**أَلَمْ تَرَ إِلَى رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا، ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا**﴾ (٤٥الفرقان/) ئەیا تۆ سەرنج نادەیت لە کاری خودای خۆت، چۆن سێبەری بەسەر پانتایی زەویدا کێشاوە، کە ئەگەر ویستی لەسەربوایە تا کۆتایی دونیا ئەو سێبەرەی بەردەوام دەکرد، پاشان ڕۆژی لەکەناری ئاسمانەوە دەرکرد، دەرکەوتنی ڕۆژمان کردووە بە بەڵگە لەسەر بوونی سێبەر، چونکە لە هەندێك شوێندا جێگیرەو لە هەندێکدا ناجێگیرە.

﴿**وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ**﴾ (یس/٣٩) بۆ مانگیش چەندین جێگاو مەنزڵمان بۆ بڕیار داوەو دیاریمان کردووە بۆی.

﴿**وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُوا بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ**﴾ (الأنعام/٩٧)

---

(١) رواه ابـن مبـارك فـي الزهـد(١٣٠٤)، والطبراني فـي الـدعاء (١٨٧٦)، والحـاكم فـي المستدرك(٥١/١)، وأبو نعيم في حلية الأولياء (٢٢٧/٧).

واته: هەر خـــودای دەســـەڵاتدارە، ئەســـتێرەكانی بـــۆ كـــردوونەتە نیشـــانە و ڕێپیشـاندەر، تـا لە تـاریكی و تنووكییەكانی وشـكانی و، شـەپۆلی دەریـای پـان و بەریـنـدا شـارەزای ڕێگاو بـان بـبن و، بەهـۆی ئەو ئەستێرانەوە بـگەنە ئامـانج و، سەرتان لێ تێكنەچێت و ڕێگاكان ون نەكەن.

وا گومان نەبەیت : كە مەبەست لە ڕۆشتن و ڕێكردنی خۆر و مانگ بەو جوانی ڕێك و پێكییە یە، یـان مەبەسـت لە دروستكردنی سێبەر و ڕۆشـنایی و، نـوور و ئەستێرەكان ئەوە بێـت، كە كۆمەكییـان لێ وەربگیرێـت بـۆ ڕاپەڕانـدنی كاروبـاری دونیـا، بەڵكـوو تەنهـا مەبەسـت ئەوەیە، كە كـات و ئەنـدازەكانیان پـێ دیـاری بكرێـت، وەك نیشـانەیەك بەكـار بهێنـرێن، بەو هـۆیەوە خەریكـی بەنـدایەتی و بازرگانی ڕێگای ئاخیرەت بیت، بەڵگەش لەسەر ئەمە فەرموودەی خودایە:

**﴿وَهُـوَ الَّـذِي جَعَـلَ اللَّيْـلَ وَالنَّهَـارَ خِلْفَـةً لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يَـذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُـكُورًا ﴾** (الفرقـان/٦٢). خـودا ئەو خـودایە، كە شـەوو ڕۆژی كـردووە بە پاشـكۆی یەكتـر و، هەركامیـان بەدوای ئەویانـدا دێـت و دەڕوات، ئەمەی بـۆ پەنـدو ئامۆژگـاری وەرگرتن كردووە، بۆ هەركەسێك بیەوێت پەند وەربگرێت، یان سوپاسی لوطفی خودا بكات، بۆ ئەم مەبەستە كردوونی بە پاشكۆی یەكتری.

**﴿وَجَعَلْنَـا اللَّيْـلَ وَالنَّهَـارَ آيَتَـيْنِ فَمَحَوْنَـا آيَـةَ اللَّيْـلِ وَجَعَلْنَـا آيَـةَ النَّهَـارِ مُبْصِـرَةً لِتَبْتَغُـوا فَضْـلًا مِـنْ رَبِّكُـمْ وَلِتَعْلَمُـوا عَـدَدَ السِّـنِينَ وَالْحِسَـابَ﴾** (الإسـراء/١٢)ئـێمە شەوو ڕۆژمان كردووە بە دوو نیشانەی دەسەڵات و پڕ حیكمەتی كاری خۆمان، كە چۆن بەڕێك و پێكی و، كاری بێ زیاد و كەم بە دوای یەكدا دێن، هەروەها شەومان تاریك و ڕۆژمان ڕووناك كرد، تا لە ڕووناكی ڕۆژدا كەسابەت بكەن و، بە دوای نیعمەتی خـوادا بگەڕێن و ، بەرچاوتـان ڕوون بێت و ، بە هـۆی گـۆڕینی شــەووڕۆژەوە، ژمــارەی ســاڵەكان و، حیســابی كاروبــاری كەســابەتتان بــزانن. كەواتە: ئەو فەزڵەی مەبەســتمانە دەســتمان بكەوێــت؛ وەرگرتنی پاداشــت و لێخۆشبوونی خودایە،داوامان وایە عاقیبەتخێرمان بكات بۆ ئەوەی لێمان ڕازی بێت.

# دیاری کردن و ڕێکخستنی ژمارەی ویردەکان

**بزانە: ویردەکانی ڕۆژ حەوت ویردە :**

لە نێوانی ڕۆژبوونەوە تا خۆرهەڵاتن ویردێك هەیە. وە لە نێوانی هەڵاتنی هەتاو تا لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان دوو ویرد هەیە، وە لە نێوانی زەوالەوە (پاش نوێژی نیوەڕۆ) تا کاتی عەسر، دوو ویردی تر هەیە، وە لە نێوانی عەسرەوە تا خۆر نشین، دوو ویردی تر هەیە.

**شەوانیش چوار ویردی بۆ دانراوە:**

دوو ویرد لە کاتی مەغریبەوە تا ئەو کاتەی خەڵکی دەخەون. وە دوو ویردیشیان لە دوای نیوەی شەوەوە، تا کاتی گزنگی بەرەبەیان و نوێژی بەیانی، ویردێکی دیکەیش هەیە پێی دەوترێت : ویردی نوستن، تایبەتە بە زیکرەکان و دوعاکانەوە. کەواتە با لە سەرەتاوە کاری هەر ویردێك و ئەرکەکانی ڕوونبکەینەوە، وە باسی گەورەییان و ئەوەی پەیوەنداریانە بکەین،

## باسی ویردەکانی ڕۆژ

## ویردی یەکەم: لە نێوانی هەڵاتنی گزنگەوەیە، واتە فەجری صادق، تا کاتی خۆر هەڵاتن:

ئەمە کاتێکی زۆر بەکەڵکە، بەڵگەش لەسەر ڕێزو گەورەیی ئەو کاتە ئەوەیە: کە خودا ﷻ سوێندی پێ خواردووە، وەك فەرموویەتی: ﴿وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾ (التكویر/١٨) سوێند بەبەرەبەیان کە هەناسە دەدات، واتە:

ئەوسێبەرەیە، کە خودا درێژی کردۆتەوە بۆ بەندەکانی، لە نێوانی ڕۆژبوونەوەوە تا خۆرکەوتن، واتە بەرەبەیان کە دەردەکەوێت وڕۆشن

دەبێتەوە، ﴿فَالِقُ الْإِصْبَاحِ﴾ (أنعام/٩٦)، واتە دینگەو ستوونی بەرەبەیانی، لە ناو تاریکایی و ڕەشایی شەودا دەرهێناوە، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾ (الفلق/١)

ئەی موحەممەد بڵێ؛ پەنادەگرم بە پەروەردگاری ڕۆژ و ڕۆشنایی کە هەڵدێت، وە تەواوی ئەو تۆو و تۆماوێك کە لە پشتی باوك و ڕەحەمی دایکەوە دێنە دەرەوە، وەك چۆن لەو تۆوەی دەینێژیت گەنم دەڕوێت و بەرز دەبێتەوە، وە تەوانایی خۆی دەردەبڕێت، بەوەی کە ئەو سێبەرە دەهێڵێتەوە، واتە بە شێوەیەکی لەسەر خۆ، سێبەرەکەی دەمێنێتەوە تا تاریکایی دادێت و نامێنێت،

﴿ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا﴾ (الفرقان/٤)،

ئەوەش کاتی وەرگرتنی سێبەری شەوە، بە کرانەوە و ڕۆشنبوونەوەی نووری هەتاو، وە ڕێنمایی کردنی خودای(عَزَّ وجَلْ)،کە تەسبیحات بکەن لەو کاتانەدا، وەك دەفەرموێت: ﴿فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ﴾ (الروم/١٧)

کەواتە پاکی و بێگەردی هەر بۆ خودایە، کاتێك کە دەکەونە ئێوارەوە و، کاتێکیش کە ڕۆژدەکەنەوە. هەروەها بە فەرموودەی خودای گەورە:

﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ﴾ لەپێش کاتی هەڵاتنی خۆردا، پاك و بێگەردی بۆ خودای خۆت بڕیار بدە و تەسبیحاتی بکە.

هەورەها فەرموودەی خودا:

﴿وَمِنْ آنَاءِ اللَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ النَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَى﴾ (طه/١٣٠)

لەکاتی شەو نوێژو دووچمکەکەی ئێوارە و نیوەڕۆدا، وەك باسمان کرد.

وە فەرموودەی خودا:﴿وَاذْكُرِ اسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا﴾(الإنسان/٢٥)

واتە: خەریکی نوێژ و زیکری خۆت بە، بەیانیان و نیوەڕۆ و عەسران[١]

---

(١) رواه عبدالرزاق في المصنف(٤٧/١١)، عن علقمة بن قيس قال: بلغنا أنَّ **الأرض تعج إلى الله من نومة العالم بعد صلاة الصبح**، وروى البيهقي في الشعب: (٤٤٠٥) عن السيدة فاطمة (رضيَ الله عنها)قالت: **مرَّ بي رسول الله ﷺ وأنا مضطجعة متصبحة، فحرَّكني**

## ڕێکخستنی ویردەکان:

با لەو کاتەوە کە لە خەو بە ئاگادێتەوە، هەوڵی ڕێکخستنیان بدات، کە بێداربوویەوە، پێویستە بە زیکری خودا دەست پێبکات و بڵێت:

**الحمْدُ للهِ الَّذی أحيانَا بعدَ مَا أمَاتَنا وإليهِ النُّشُور**[1].

سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە بە ئاگای هێناوینەتەوە، دوای ئەوەی کە نوستبووین،وە بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوەو کۆدەبینەوە (نوستن وەك مردن وایە) وە هەموو ئەو دوعاو ئایەتانە بخوێنێت، کە لەپەڕاوی نزاکاندا باسمان کردوون، بۆ کاتی لەخەو هەستان.

با لەکاتی دوعا کردندا بەرگێك بپۆشێت و نیەتی ئەوەی هەبێت لەبەر فەرمانی خودا خۆی پۆشتەبکاتەوە، وە بشتوانێت بەندایەتی پێوە بکات، بێ ئەوەی مەبەستی شۆرەت و ناوبانگ و ڕیاکردن بێت. لەپاشان ئەگەر پێویستی هەبێت بچێت بۆ سەر ئاو، با پێی چەپی پێش بخات، وە ئەو دوعایانە بخوێنێت کە ئەو بابەتە لە پەڕاوی تەهارەت (پاکوخاوێنی)دا باسمان کردوون، لە کاتی چوون و هاتنەدەرەوەدا.

لەپاشان بە پێی سوننەت بکات، وە دەستنوێژێکی جوان بگرێت، بە ڕەچاوگرتنی هەموو مەرج و دوعاکان، کە لە باسی تەهارەتدا ڕوونمان کردنەوە، بۆیە یەکەیەکەی عیبادەتەکانمان باس کرد، بۆ ئەوەی لێرەدا تەنها باسی چونیەتی ڕیزبەندی و ڕێکخستنیان بکەین.

ئینجا کە لە کە لە دەستنوێژ لێبوویەوە، دووڕکاتی پێش نوێژی بەیانی بخوێنێت، مەبەست سوننەتی بەیانیە لەماڵەوە، وەك چـــۆن (حەزرەتـــی)

---

**بِرِجلهِ، ثم قال: يا بنيَّة: قومي اشهدي رزق ربك، ولاتكوني من الغافلين. فإنَّ اللهَ يقسم أرزاق الناس ما بين طلوع الفجر إلى طلوع الشمس.**

(١) رواه البخاري(٦٣١٢)، ومسلم (٢٧١١).

پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیەی دەکرد[1]، وە لە دوای ئەنجامدانی دووڕکاتەکە، لەماڵەوە کردبێتی یان لە مزگەوتدا، بادوعاکەی کە ئیبنوعەباس(خودایان لێ رازی بێت)ڕیوایەتی دەکات بخوێنێت کە دەفەرموێت: **اللَّهُمَّ؛ إِنِّي أَسأَلُكَ رَحمةً مِنْ عِندِكَ تَهدي بِها قَلْبي**..تا کۆتایی دوعاکان بخوێنێت[2]

لە پاشان لەماڵ دەرچێت ڕووە و مزگەوت، دوعای چوون بۆ مزگەوتیشی بیر نەچێت[3]، پەلە نەکات لە ڕۆشتندا، بەڵکوو بە هێمنی و ئارامی و سام و ویقارەوە ڕێ بکات، وەك فەرموودەی لەسەر هاتووە[4]،

وە لە ڕۆشتندا با پەنجەکانی دەستی نەکات بەیەکدا، وە پێی ڕاستی بخاتە ناو مزگەوتەوە،وە دوعای مەئسووری چوونە ناو مزگەوت بخوێنێت[5]، لەپاشان ڕووبکاتە ڕیزی یەکەمی ناو مزگەوت، بەڵام پێ بەسەر شان و ملی خەڵکیدا بەرز نەکاتەوە، وە تەنگیان پێ هەڵنەچنێت، وەك باسمانکرد لە پەڕاوی جومعەدا.

لەپاشان ئەگەر لە ماڵەوە دووڕکاتی سوننەتی بەیانی نەکردبوولەوێ بیکات، وە خەریکی دوعاکانی دوای نوێژەکە بێت، بەڵام ئەگەر کردبوونی، ئەوا با دووڕکاتی سڵاوی مزگەوت(تحية المسجد)بخوێنێت، وە چاوەنواڕی جەماعەتیش بکات.

وە باشتر وایە نوێژی بەیانی لە کاتی کۆتایی تاریکیی شەودا بکات، دوای نەخات، چونکە پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەو تاریکاییە دەکرد، [6]، وە بەشێوەیەکی گشتی نابێت جەماعەت نەکات، بە تایبەتی نوێژی بەیانی و عیشا، وەك (حەزرەتی)

---

(١) رواه البخاري(١١٧٣).

(٢) رواه الطبراني في الكبير(٢٨٣/١٠) وأبو نعيم في الحلية(٢٠٩/٣) والترمذي ٣٤١٩).

(٣) رواه البخاري (٦٣١٦)، ومسلم ٧٦٣).

(٤) فيما رواه البخاري (٦٣٦) ومسلم(٦٠٢)مرفوعا : ((**إذا ثوِّبَ للصلاة، فلا يَسعَ إليها أحدكم، ولكن لِيَمش وعليه السكينة والوقار، صَلِّ ما أدركتَ، واقضِ ما سَبَقَكَ**)).

(٥) رواه الترمذي (٣١٤)، وابن ماجه(٧٧١).

(٦) كما في البخاري(٥٦٠) ومسلم (٦٤٦) (( **كان ﷺ يُصلي الصبحَ بِغَلَسٍ**)).

ئەنەسی کوڕی مالیك لە پێغەمبەری دەگێڕێتەوە ﷺ کە لە بارەی نوێژی بەیانیەوە فەرموویەتی: **((مَنْ تَوَضَّأَ ثُمَّ تَوَجَّهَ إِلَى مسْجِدٍ يُصَلِّي فيهِ الصَّلاةَ، كانَ لَهُ بِكُلِّ خَطوَةٍ حَسَنَةٌ، ومُحِيَ عَنهُ سَيِّئَةٌ، والحَسَنَةُ بِعَشرِ أَمثالِها، فَإذا صَلَّى ثُمَّ انصَرَفَ عِندَ طلُوعِ الشَّمسِ، كُتِبَ لَهُ بِكُلِّ شَعرَةٍ في جَسَدِهِ حسَنَةٌ، وانقَلَبَ بِحَجَّةٍ مَبرورَةٍ، فَإنْ جلَسَ حتَّى يَركَع.. كُتِبَ لَهُ بِكُلِّ رَكعَةٍ أَلْفا أَلْفِ حَسَنةٍ، ومَنْ صَلَّى العَتَمَةَ.. فَلَهُ مِثلُ ذلِكَ، وانقَلَبَ بِعَمرَةٍ مَبرورَةٍ))** [1].

ئەوەی دەستنوێژ بگرێت و ڕوبکاتە مزگەوتێکەوە نوێژی تێدا بکات، هەموو هەنگاوێکی چاکەیەکی بۆ دەنووسرێت،وە خراپەیەکی لەسەر دەکوژێتەوە، وە هەموو چاکەیەکیش پاداشتەکەی بە دە چاکەیە، ئەگەر نوێژیکرد و تا کاتی خۆرهەڵاتن (بەئەندازەی ڕمێك)مایەوەو ئیمجا چووە دەردەوە، ئەوە بە ئەندازەی چەندێك موو بە جەستەیەوەتی، ئەوەندە چاکەی بۆ دەنوسرێت، وە بە پاداشتی حەجێکی وەرگیراوەوە دەگەڕێتەوە، وە ئەگەر زیاتریش دابنیشێت تا ڕکوعێك دەبات، ئەوە بە هەر کڕنوشێك کە بیبات خێری دووهەزار هەزار چاکەی بۆ دەنوسرێت، وە ئەوەی نوێژی کاتی (یەکەمی تاریکی شەو) بکات، کە

---

(١) رواه ابن عساكر في تأريخ دمشق،٢١/٤٦)، بنحوه، وانظر: قوت القلوب(١/٢٧) وفي شعب الإيمان للبيهقي بسند ضعيف: من حديث أنس، **ومن صلى المغرب في جماعة، كان له كحجة مبرورة، وعمرة متقبلة.** قال الزبيدي(٥/١٢٧): بل له أصل أخرجه ابن عساكر في التاريخ عن ابن شابور عن سعيد بن ابي طويل،عن أنس بمثل سياق المصنف سواء، إلا أنه قال: بعد قوله مبرورة، **وليس كل حج مبرورا، فان جلس حتى يركع ولم يقل الضحى، كتب له بكل حسنة ألف الف حسنة**، ولكن سعيد راويه عن انس، قال ابو حاتم في الجرح والتعديل(١٥/٦١) منكر الحديث، لا يشبه حديثه حديث اهل الصدق، وأحاديثه عن أنس لا تعرف وقال أبو زرعة كما في فيض القدير (٣/٣٧٩) حدث عن أنس بمناكير . وأما الذى أورده في شعب الايمان فقد أخرجه أيضا الديلمي عن أنس بزيادة: وكأنما قام ليلة القدر، وروى الترمذي من حديثه بلفظ: **((من صلى الفجر في جماعة ثم قعد يذكر الله حتى تطلع الشمس ثم صلى ركعتين كانت له كأجر حجة وعمرة تامة تامة تامة))** وقال حسن غريب

تاریکییەکە لادەچێت و دوای لاچوونی نوورو ڕۆشنایی گزنگی بەرەبەیان دێــت، وەك ئەوەی پێشـــەوەخێری دەگات، وە بە عومرەیەکی وەرگیراوەوە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەی.

وە نەریتی پیاوچاك و صاڵحانی سەلەف(خودایان لێ ڕازی بێت) پێش ئەوەی گزنگ بدات، دەچوونە ناو مزگەوتەوە، یەکێك لە تابیعینەکان فەرموویەتی:

پێش دەرکەوتنی ڕۆشنایی بەرەبەیان، چوومە ناو مزگەوتەوە، گەیشتم بە ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) پێش من لەوێ بوو، فەرمووی: ئەی برازام؛ بۆچی لەم کاتە زووەدا لەماڵەوە دەرچوویت و هاتویت بۆ مزگەوت؟

وتم بۆ ئەوەی بێم بۆ نوێژی بەیانی، فەرمووی: مژدەت لێبێت، کاتی خۆی ئێمە دەرچوون و دانیشتنمان بۆ مزگەوت لەم ساتە وەختەدا، وەك پلەی ئەو کەسانەمان دەژمارد کە دەچوون بۆ غەزا و جیهاد کردن لە ڕێی خوادا، یان فەرمووی: وەك ئەوەی درچووبین لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ .[1]،

(حەزرەتی)عەلی(خوای لێ ڕازی بێت)دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ تەقەیدای لە دەرگاکەیان، ئەوو(حەزرەتی)فاطیمە نوستبوون، فەرمووی: **ألاَ تُصَلُّونَ**؟ ئەوە نوێژ ناکەن، (حەزرەتی) عەلی فەرمووی: منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خودا؛ گیانی ئێمە بەدەستی خودای (عَزَّ وجَلَّ)ە، ئەگەر ویستی لەسەربێت زیندومان دەکاتەوە و لە خەو بێدارمان دەکاتەوە، ئەوا هەڵدەستین، ئیتر پێغەمبەر ﷺ بەجێی هێڵاین و بیستم کە پشتی لە ئێمە کرد، دای بەڕانی خۆیدا و فەرمووی: ﴿**وَكَانَ الْإِنْسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا**﴾ (الكهف/٥٤) حاڵی مرۆڤ وایە، زیاتر حەزی لە قسەکردن و قسە بەزۆراندانە.[2]

لەپاشان پێویستە لە دوای دووڕکاتی سوونەتی بەیانی و تەواوکردنی دوعاکانی،

---

(١) قوت القلوب (٤٣/١).

(٢) رواه البخاري (١١٢٧_٧٣٤٧)، ومسلم(٧٧٥).

خەریکی تەسبیحات و (أستغفرالله)و، داوای لێبوردن بێت لە خودا تا ئەو کاتەی قامەت دەکرێت بۆ نوێژ، وە لەو ماوەدا حەفتا جار بڵێت:

**( أستَغفِرُ اللهَ الذي لاَ إلهَ إلاَّ هُوَ الحَيُّ القَيُومُ وأتُوبُ إلَيهِ).**

وە صەد کەڕەتیش بڵێت: **سُبحانَ الله والحَمدُ للهِ ولا إلهَ إلاَّ اللهُ واللهُ أكبَرُ.**

لەپاشان نوێژە فەرزەکە بکات و، ڕەچاوی هەموو ئەو مەرج و ئادابە ڕواڵەتی و شاراوانە بکات کە باسمانکردن، لە نوێژو لە پێشنوێژیدا، کە هەرکات لە نوێژ بوویەوە، با لە مزگەوتدا دابنیشێت تا کاتی خۆرهەڵاتن، خەریکی زیکری خودا بێت، وەك بە ڕێکی و باشی ڕوونی دەکەینەوە،چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((لأن أقعُدَ في مَجلسٍ أذكُرَ اللهَ فيهِ مِنْ صَلاةِ الغَداةِ إلى طُلوعِ الشَّمسِ، أحبُّ إليَّ مِنْ أن أعتِقَ أربَع رِقابٍ))**(١).

واتە: لە مزگەوتێکدا دابنیشم لە دوای نوێژی بەیانیەوە تا کاتی خۆرهەڵاتن، ئەوەم پێ خۆشترە لەوەی گەردنی چوار کۆیلە بەندە ئازاد بکەم.

وە دەگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ کە نوێژی بەیانی بکردایە، لە شوێن نوێژەکەی خۆی دادەنیشت و هەڵنەدەستا تا خۆرکەوتن[٢]. وە لە هەندێك ڕیوایەتی دیکەدا دوورکات نوێژی دەکرد، واتە: دوای خۆرهەڵاتن.

لە باسی گەورەی ئەم مانەوەدا ڕیوایەتی زۆر هەن سەرژمێر ناکرێن.

وە حەسەنی بەصری (خوای لێ ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەو بابەتانەی کە باسی ڕەحمەتی پەروەردگاری دەکرد و دەیفەرموو:

خودای گەورە فەرموویەتی: (( **یا ابنَ آدَم: اذكُرني مِن بَعدِ صَلاةِ الفَجْر ساعةً، وبَعدَ صَلاةِ العَصرِ سَاعَةً أكْفِكَ مَا بَينَهُما**)) [١]واتە: ئەی نەوەی ئادەم، لە دوای نوێژی بەیانی کاژێرێك یادی من بکەن،وە لە دوای عەسریشەوە بەهەمان

---

(١) رواه أبو داوود (٣٦٦٧).

(٢) رواه مسلم(٦٧٠).

شێوه سەعاتێك زیكرم بكە، من كەم و كورتی نێوانیانت بۆ پڕ دەكەمەوە، وە ئەگەر گەورەیی و بەرەكەتی ئەو زیكرەی بۆ دەركەت، ئەوا با دابنیشێت و، قسە لەگەڵ كەسدا نەكات تا خۆرهەڵدێت، بەڵكوو پێویستە چوار ئەركی سەرەكی جێبەجێ بكات تا كاتی خۆرهەڵاتن، دوعاكان و زیكرەكان، كە دووپاتیان دەكاتەوە بە تەسبیحێكەوە، وە خوێندنەوەی قورئان و بیرلێكردنەوەی.

## باسی دوعاكان:

هەر كە لە نوێژەكەی لێدەبێتەوە، با دەستبە نزاكان بكات و بڵێت: **اللَّهُمَّ: صلِّ علَى محمَّدٍ وعلَى آلِ مُحمَّد، اللَّهُمَّ: انْتَ السَّلامُ، ومِنكَ السَّلام، واليكَ يعُودُ السَّلام، حَيِّنا ربَّنا بالسَّلام، وأدْخِلنَا دارَ السَّلام، تبَارَكتَ يَا ذا الجَلالِ والإِكرَامِ.**

دوای صڵاوات دان لە دیداری(حەزرەتی)پێغەمبەرو ئال و بەیتی بەڕێزی بڵێ:

ئەی خودایە: تۆ خۆت سەلامیت، وە سەلام و سەلامەتی لەتۆوە دەبێت، وە بۆ لای تۆ دەگەڕێتەوە، وە داوام وایە بمانخەرە ناو كۆشكی سەلام و ئاشتییەوە، پاك و بەرزی و بێ گەردی بۆ تۆیە ئەی خاوەنی جەلال و ڕێز و گەورەیی.

**لەپاشان نزاو دوعاكانی بەو دوعایانە دەكاتەوە كە پێغەمبەرﷺ دەستی پێیان دەكرد، كە دەیفەرموو: ((سُبحانَ رَبِّيَ العَلِيِّ الأَعلَى الوَهَّاب))**

پاكو خاوێنی بۆ خودای گەورەو بەزوو بەخشندەو باڵا[٢].

**لاإلَه إلاَّ اللهُ وحْدَهُ لاشَرِيكَ لَه، لَهُ المُلكُ ولهُ الحمدُ يُحيِي ويُميتُ، بيَدِهِ الخَيرُ، وهُوَ علَى كُلِّ شَيئٍ قَدير، لاَ إِلَهَ إلاَّ اللهُ أَهلُ النِعمَةِ والفَضْلِ، والثَّناءِ الحَسَنِ، لاَ إِلَهَ إلاَّ اللهُ، ولاَ نَعبُدُ إلاَّ إيَّاهُ، مُخلِصينَ لَهُ الدِينَ، ولَو كَرِهَ الكافِرونَ.**

هیچ خودایەك نیە شیاوی پەرستنبێت جگە لە (الله)، خاوەنی نیعمەت و

---

(١) رواه أحمد في الزهد(٢٠٣)وأبو نعيم في الحلية. ٢١٣/٨،عن الحسن أبي هريرة (رضي الله عنه)مرفوعا.وذكر العراقي أن ابن مبارك رواه في الزهد عن الحسن مرسلا.الإتحاف ١٢٨/٥.

(٢) رواه أحمد في مسنده (٥٤/٤)(١٦١١٣) ، والحاكم (٤٩٨/١) .(١٨٣٥) وقال صحيح الإسناد،

گەورەیی و ستایشی نایاب و جوانە، بەندایەتی بۆ کەسی تر ناکەین یۆ ئەو زاتە نەبێت، بەدڵسۆزی خۆمانی ڕادەستدەکەین و، ئاینیشمان تەنها تایبەتە بەو، با بێباوەڕەکانیش پێیان ناخۆش بێت، ئێمە سوورین لەسەر بڕوای خۆمان.

لەپاشان دەستبکات بەو دوعایانەی کە لە دەروازەی سێیەم و چوارەمی پەڕاوی دوعاکان بەیانمانکردن، ئەگەر توانی هەموو دوعاکان بخوێنێت، یان ئەوەی زیاتر لەگەڵ حاڵەتی ئەو دەگونجێت لەبەریان بکات، کە سووکتر بێت لەسەر زوبانی و، کاریگەری زیاتر لەدڵی بکات و، نەرمی بکاتەوە.

## باسی زیکرە دووبارەکراوەکان:

ئەو کۆمەڵە زیکرانەیە، کە لەدووپاتکردنەوەیاندا باسی خێرو فەزڵی زۆریان کراوە، بەدرێژی باسمان نەکرد، وە کەمترین شێوەی دووبارەکردنەوەیان دەبێت لە سێ کەڕەت یان حەوت کەڕەت بخوێندرێتەوە، وە زۆربەیشیان دەبێت صەد جار، یان حەفتا جار دووبارە بکرێنەوە، ناوەندەکەیشیان ئەوەیە کە دەجار دوبارەدەکرێنەوە، کەواتە بە گوێرەی کات و دەرفەتی ڕەخساوی خۆی با دووبارەیان بکاتەوە، وە خێری نزا زۆرەکان زیاترە، بەڵام ناوەڕاست و حاڵەتی ناوەندو میانەڕەو ئەوەیە: کە دەجار دووپاتیان بکاتەوە، ئەمە زیاتر گونجاوە بۆ ئەوەی بتوانێت بەردوام بێت لەسەریان، باشترین کاریشی ئەوەیە:

کە بەردەوام بیت لەسەری با کەمیش بێت، وە هەر وەزیفەیەکی گرنگ، ئەگەر نەتوانیت زۆری ئەنجام بدەیت، کەمەکەی بکەیت و بەردەوام بیت لەسەری، ئەوە زیاتر کاریگەری بەجێ دەهێڵێت لەسەر دڵی، لەوەی زۆر بیکات، بەڵام نەتوانێت بەردەوام بێت لەسەری. نموونەی کاریگەری کەمێکی بەردەوام، وەك ئەو نەرمەبارانانە وایە، کە بەردەوام دەبارێت، تەنانەت ئەگەر بشکەوێتەسەر بەردێکی ڕەقیش چاڵی دەکات، بەڵام نموونەی زۆرێکی پرش و بڵاو وەك ئەو ڕەهێڵەیە کە جارێك یان چەند جارێك دەبارێت، وە لە چەند کاتێکی جیاوازدا، بەڵام هیچ کاریگەرییەك لەسەر زەوی دروست ناکات.

## ئەمەش دەجۆرە لە دوعاكان:

**یەكەم:** ئەوەیەكە دەڵێت: **لاإلَه إلاَّ اللهُ وحْدَهُ لاشَريكَ لَه. لَهُ المُلكُ ولهُ الحمدُ. يُحيي ويُميتُ. وَهُوَ حَيٌّ لاَيَموتُ. بِيَدِهِ الخَيرُ. وهُوَ علَى كُلِّ شَيئٍ قَديرٌ**[1]،

هیچ پەرستراوێكی بەحەق نیە جگە لە الله، هیچ هاوبەشێكی بۆ نیە، موڵك و ستایشی ڕاستەقینە تەنها شایستەی ئەوە، هەموان زیندوودەكاتەوە و دەیانمرێنێت و، خۆیشی هەمیشە زیندووە و هەرگیز نامرێت، وە تەوانایشە بەسەر هەموو كارو كردارێكدا.

**دووهەم:** دەڵێت: **سُبحانَ الله والحَمدُ للهِ ولا إلهَ إلاَّ اللهُ واللهُ أكبَرُ. ولاَ حَولَ ولاَ قُوَّةَ إلاَّ باللهِ العَليِّ العَظيم.**[2] ، پاكی و بێگەردی بۆ خودا، سوپاس و ستایش تەنها شایستەی ئەڵلایە، هیچ زاتێك نیە شایاوی پەرستن بێت جگە لە (الله)، هەموو كاروو تواناو دەسەڵاتێك تەنها پشت بە خودا ئەنجام دەدرێت،

**سێیەم:**دەڵێت: **سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ،ربّ المَلائِكَةِ والرُّوحِ**[3]بەرزی وخاوێنی و دووری لە هەمووكەموكورتیك هەر بۆ تۆیە،ئەی پەروەردگاری جوبرەئیل و فریشتەكان.

**چوارەم:** دەڵێت: **سُبحانَ اللهِ العَظيمِ وبِحَمدِهِ**[4]، پاكی و بێ گەردی بۆ خودای گەورەیە، لەگەڵ سەناو سوپاس و ستایشدا.

**پێنجەم** دەڵێت: **أَستَغفِرُ اللهَ الذي لا إِلَهَ إلاَّ هُوَ الحَيَّ القَيومَ وأَسأَلُهُ التَّوبَةَ**[5] ،داوای لێبوردن ولێخۆشبوون دەكەم لەوخودایەی كە تەنهائەوە

---

(١) رواه البخاري(٦٤٠٤)،ومسلم(٢٦٩٣)، والحديث عن فضل التكرار هنا، وفيما سيأتي مطلق.

(٢) رواه أحمدفي المسند(٧٥/٣) بمطلق الإستكثار، ولفظة العلي العظيم عند ابن عدي في الكامل( ١٥/٥).

(٣) رواه مسلم (٤٨٧).و ورد تكرارها عند ابن السني في(عمل اليوم والليلة)(٦٣٩)ولفظه مرفوعا:أكثر من أن تقول،سبحان الملك القدوس رب الملائكة والروح.... وهو في ذهاب الوحشة.

(٤) رواه البخاري (٦٤٠٥)، ومسلم (٢٦٩١).

(٥) قال الحافظ العراقي: رواه المستغفري في الدعوات، من حديث معاذ. **أن من قالها بعد**

پەروەردگارمە، زیندووکارساز و بە توانایە. وە داوای لێدەکەم توانای تەوبەکردنم پێببەخشێت.

**شەشەم بڵێت: اللَّهُمَّ: لامانِعَ لِمَا أعطَيتَ. ولاَ مُعْطِيَ لِما مَنَعتَ. ولاَ يَنفَعُ ذا الجَدِّ مِنكَ الجَدُّ**[1]، ئەی خودایە:

ئەوەی تۆ پێی ببەخشیت کەس ناتوانێت لێی بگرێتەوە، وە ئەوەیش تۆ نەدەیت و لێی بگریتەوە کەس ناتوانێت پێی بدات، هەوڵی هەمو خاوەن هەوڵ و هیممەتێك بەبێ تۆ بێ سوودە و، تەنها لەتۆوە دەبێت سەرچاوە بگرێت.

**حەوتەم بڵێت: لاإلَهَ إلاَّ اللهُ المَلِكَ الحَقُّ المُبِين**[2]

هیچ زاتێك نیە شایاوی پەرستن بێت جگە لە(الله)، کە پادشایەکی ڕاست وبەتوانا و ئاشکراو حاشا هەڵنەگرە.

**هەشتەم بڵێت: باسمِ اللهِ الذي لاَيَضَرُّ معَ اسمهِ شَيْءٌ في الأَرضِ ولاَ في السَّماءِ وهُوَ السَّميعُ العَليم**[3]،

واتە: بەناوی ئەو خودایەی کە لەگەڵ ناوی پیرۆزیداو پشت بەناوی پیرۆزی ئەڵلاه، هیچ شتێك ناتوانێت زیان بەخش بێت، نە لە زەوی و نە لە ئاسماندا، کە هەموو داواکان دەبیستێت و، زانایشە بەسەر هەمو ڕوداوەکاندا.

**نۆیەم بڵێت: اللَّهُمَّ: صَلِّ علَى مُحمَّدٍ عَبدِكَ وَنَبيِّكَ وَرَسُولِكَ النَّبيِّ الأُميِّ وعلَى آلِ مُحَمَّدٍ**[1]، ئەی خودایە؛ تۆ ڕەحمەتی خۆت ببارێنە بەسەر بەندەو

---

**الفجر وبعد العصر ثلاث مرات، كفرت ذنوبه، وإن كانت أكثر من زبد البحر، ولفظه: وأتوب إليه** ، ونحوه عند الترمذي: (٣٣٩٧) كذلك.

(١) رواه البخاري (٨٤٤) ورواه مسلم (٤٧١،٥٩٣) عقب الصلاة وبعد الركوع مطلقا.

(٢) هو عند الدارقطني في العلل، ٣٠٦/٣) ورواه أبو نعيم، في الحلية ٢٨٠/٨) والخطيب في الرحلة في طلب الحديث) **ص**/٢٠٤.

(٣) رواه أبو داوود (٥٠٨٨) والترمذي(٣٣٨٨)، والنسائي في الكبرى (٩٧٥٩)وابن ماجه(٣٨٦٩).

پێغەمبەرو نێرراوی خۆت حەزرەتی موحەممەدی نەخوێندەوارو ئال و بەیتی ئەو سەردارەیە.

**دەیەم بڵێت: أَعوذُ باللهِ السَّميعِ العَليمِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم، اللَّهُمَّ : إِنِّي أَعوذُ بِك مِنْ هَمزَاتِ الشَّياطِينِ، وأَعوذُ بِكَ ربِّ أَن يَحْضُرُون**[٢]،

پەنا دەگرم بە خودای بیسەر و بینەر و زانا، لە شەڕو شوومی شیتانی نەفرەت لێ کراوی دوورخراوە، ئەی خودایە؛ من پەنات پێدەگرم لە قسەهێنان و بردن و، خەتەرەو وەسوەسەی شەیتان و، پەنایشت پێدەگرم لە هاونشینی و ئامادەبوونیان.

## ئەم دە کەلیمەیە:

ئەگەر یەکی دەجار دووبارەی بکەنەوە، دەبێت بەصەد کەڕەت، کەواتە ئەمەیان خێری زیاترە لەوەی تەنها ویردێك صەد جار دووبارە بکاتەوە.

چونکە هەریەکێك لەو دوعایانە، بەرەکەت و تایبەتمەندیەکی خۆیانیان هەیە، وە دڵیش بە هەریەکەیان جۆرە کاریگەرییەکی دەکەوێتە سەر، وە جۆرە چێژێك وەردەگرێت.

وە نەفسی دوعاگۆیش، کاتێك لەم نزاوە دەگوازرێتەوە بۆ نزایەکی تر، ئەوا دەحەوێتەوە، وە دوور دەکەوێتەوە لە مەلەل و لە ماندوبوون.

---

(١) صيغة مركبة من حديثين. ففي البخاري(٤٧٩٨). قولوا: **اللَّهُمَّ: صل على محمد عبدك ورسولك**. الحديث. وعند أبي داوود (٩٧٩) قولوا : **اللَّهُمَّ: صل على محمد النبي الأمي وعلى آل محمد. والإكثار من الصلاة والسلام عليه ﷺ مستفيض من دواوين السنة.**

(٢) رواه الترمذي(٢٨٢٢)، مرفوعا : من قال حين يصبح ثلاث مرات: **أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم، وقرأ ثلاث آيات من سورة الحشر. وكَّلَ الله بهِ سَبعينَ ألفَ ملك يصلون عليه حتى يمسى، وإذا مات في ذلك اليوم.. مات شهيداً. ومن قالَها حين يمسي.. كان بتلك المنزلة.**

## خوێندنەوەی قورئان:

بەباش زانراوە خوێندنەوەی هەندێك لە ئایەتەكانی قورئان، كە لەبارەی گەورەییانەوە چەندین فەرموودەیان لەسەرهاتووە، وەك ئەوەی سوورەتی فاتیحه[1](الحمد)بخوێنیت، وە (آيَةَ الكُرسِيّ)[2] وە كۆتایی(البقرة)[3]، وە ئایەتی پیرۆزی: (ءامَنَ الرَّسُولُ)تا كۆتاییەكەی، وە دوو ئایەتی سوورەی (آلِ عِمران)،

**﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾** (آلِ عِمران/١٨)وە هەردووئایەتی:

**﴿ قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ، وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ، بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، تُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ، وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ، وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ، وَتَرْزُقُ مَنْ تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾** (آلِ عِمران/٢٧)[4].

وە فەرموودەی خودا:

**﴿ لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ**

---

(١) گەورەترینی سوورەتی قورئانە، وەك لە بوخاریدا هاتووە( ٤٤٧٤). ئەم ئایەتانە تەنها هێمایان پێ كراوەو بەشێكی نوسراوە، ئێمە بۆ خوێندنەوەیان تەوامان كردن، بەڵام ڕاڤەمان نەكردن، چونكە زۆر درێژ دەبێتەوە و ئامانجیش تەنها خوێندنەوەكەیانە.

(٢) ئەمیش گەورەترینی ئایەتە لە قورئاندا، وە ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی كردووە(٨١٠).

(٣) لە بوخاریدا باسی گەورەیی كراوە: (٤٠٠٨)، وە لە موسلم یشدا(٨٠٧).

(٤)روى المستغفري في الدعوات من حديث علي، وابن السني في عمل اليوم والليلة: **أن فاتحة الكتاب وآية الكرسى والآيتين من آل عمران شهد الله إلى قوله الاسلام، وقل اللهم مالك الملك، إلى قوله بغير حساب، معلقات ما بينهن وبين الله (عَزَّ وجَلْ) حجاب، لما أراد الله أن ينزلهن، تعَلَّقنَ بالعَرشِ، قُلنَ: ربنا تهبطنا إلى أرضك، وإلى من يعصيك، فقال الله (عَزَّ وجَلْ) بي حلفت: لا يقرؤكن أحد من عبادي دبرَ كل صلاةٍ، إلاَّ جعلت الجنة مثواه، على ما كانَ منهُ، وإلاَّ أَسكَنتهُ حضيرَة القُدسِ**....الحديث.

رَءُوفٌ رَحِيمٌ. فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾(التوبة/١٢٩) [١]،

وه فەرمووده‌ی خودا: ﴿لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ. فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِنْ دُونِ ذَلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا. هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ. لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ. وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا. مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ. وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ. تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا. سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ. ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ. يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ. وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا﴾ (الفتح/٢٩)[٢]، وه فەرمووده‌ی خودای گەوره:

﴿ وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا. وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ. وَلَمْ يَكُنْ لَهُ وَلِيٌّ مِنَ الذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا﴾ (١١١الإسراء)[٣]،

وه پێنج ئایەتی سەرەتای سووره‌تی (الحديد)[٤]، وه سێ ئایەتی کـــۆتایی

---

(١) روى في فضل الآية الخاتمة منها الطبراني في الدعاء(١٠٥٩)، ونقلا للحافظ عن أبي القاسم الغافقي في فضائل القرآن لعبدالملك بن حبيب من رواية محمد بن بكار أن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال: **من لزم قراءة لقد جاءكم إلى آخر السورة لم يمت هدما ولا غرقا ولا حرقا ولا ضربا بحديد** انظر الإتحاف( ٥/ ١٣٣) .

(٢) روى البخاري (٤١٧٧) في فضل السورة عموما قوله ﷺ: **لقد أنزلت علي الليلة سورة لهيَ أحب إليَّ مما طَلعت عليه الشمس ثم قرأ: إنا فتحنا لك فتحا مبيناً (الفتح/١)**، وروى الثعلبي في تفسيره: ٩/٤٠): عن يزيد بن هارون يقول: سمعت المسعودي يذكرُ، قال: **بلغني أن من قرأ في أول ليلة من رمضان:إنا فتحنا لك فتحاً مبيناً في التطوع حفظَ ذلكَ العام.**

(٣)روى أحمد في المسند (٤٣٩/٣) مرفوعا: آية العز: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا﴾ الآية.

(٤) ذكر ابو القاسم الغافقي في فضلائل القرآن من حديث علي: **إذا اردت أن تسأل الله حاجة فاقرأ خمس ايات من اول سورة الحديد:** ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ

سورەتی حەشر [1]

وە ئەگەر ئەو دە ئایەت و ویردانە هەر یەکەیان حەوت جار بیانخوێنێتەوە، کە(حەزرەتی)خضر(سەلامی خودای لەسەربێت)بە دیاری بەخشی بە (ئیبراهیمی تەیمییە، عابیدی بەناوبانگ)(خوای لێ خۆش بێت) وە وەصێتی بۆ کرد کە بەیانیان و ئێواران بیانخوێنێت، ئەوە هەموو فەزڵ و خێرێك تەواو دەکات، وە ئەم دیارییە، کۆی خێری ئەو دوعایانەی باسکراون بۆ کۆدەکاتەوە.

دەگێڕنەوە لە کورزی کوڕی وەبرەی حاریسی.(خوای لێ ڕازی بێت) کە یەکێکە لە ئەبدالەکا[2] فەرموویەتی:

---

الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (١) لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٢) هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٣) الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٤) لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ (٥) يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَهُوَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ﴾ (الحديد/٦) ومن اخر سورة الحشر من قوله لو أنزلنا هذا القُرانَ إلى آخر السورةآ ثم تقول يا من هو كذا إفعل بي كذا، ثم تدعو بما تريد.

(١)﴿لَوْ أَنْزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُتَصَدِّعًا مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ (٢١) هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ عَالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ (٢٢) هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ (٢٣)هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (٢٤حشر) و روى البيهقي في الشعب (٢٢٧١) مرفوعا: من قرأ خواتيم الحشر في ليل أو نهار فمات من يومه أو ليلته، فقد أوجب الجنة.

(٢)ترجمه ابو نعيم في الحلية فقال: كان يسكن جرجان كوفي الأصل، له الصيت البليغ والمكان الرفيع في النسك والتعبد، روى عن طاوس وعطاء والربيع بن خيثم ومحمد القرظي وغيرهم وعنه ابن عطية والجرجاني وابن المبارك وفضيل بن غزوان وابو شبرمة.الإتحاف ١٣٤/٥.

برایەکی خەڵکی وڵاتی شام هات بۆ لام، دیارییەکی بۆ هێنام، فەرمووی: ئەی کورز؛ ئەم دیارییەم لێ وەربگرە، باشترینی دیارییە بۆت، وتم:

ئەی براکەم؛ کێ ئەم دیارییەی پێداویت؟ فەرمووی: ئیبراهیمی تەیمییە پێی داوم، وتم: ئەی پرسیارت نەکرد کێ بەئیبراهیمی دابوو؟

فەرمووی: بەڵێ، فەرمووی: لە ناو حەوشەی کەعبەدا دانیشتبووم، خەریکی لاَ إلَهَ إلاَّ الله و سوبحانەڵلا و، حەمدو سەناو تەمجیدی پەروەردگارم بووم، پیاوێك هات و سەلامی کرد و لای ڕاستمەوە دانیشت، لەم چەرخەدا یەکێکم نەدیبوو ڕوخساری لەو جوانتر بێت، یان بەرگی جوان و پاك و سپی تر بێت، وە کەسیشم نەدیبوو ئەوەندە بۆنی خۆش بێت. وتم: ئەی بەندەی خودا؛

تۆ کێیت و لە کوێ وە هاتویت؟ فەرمووی: من (خضر)م، وتم:

بۆ چی هاتویت بۆ لای من؟ فەرمووی: هاتووم سەلامت لێبکەم ، وە بزانیت کە لەبەر خودای (عَزَّ وجَلَّ) تۆم خۆشدەوێت، وە دیاریەکیشم پێیە، دەمەوێت پێتی ببەخشم، وتم: کامەیە ئەو دیارییە؟ فەرمووی:

لەپێش ئەوەی خۆر هەڵبێت، وە پەل بڵاو بکاتەوە بەسەر زەویدا، وە پێش ئەوەیش کە ئاوا ببێت، ئەمانە بخوێنیت:

سوورەتی **(الحمد)**فاتیحە، و **﴿قُل أعوذُ بِرَبِّ النَّاس﴾** و **﴿قُل أعوذُ بِرَبِّ الفَلَق﴾** و **﴿قُلْ هُوَ اللهُ أحد﴾** و**﴿قُلْ يا أيُّها الكافِرون﴾** و، **(آيَةَ الكُرسِيِّ)** هەموویەکێکیان حەوت جار بیانخوێنیت، لە پاشان بڵێیت: **(سُبحانَ اللهِ والحَمدُ للهِ و لاَ إلَهَ إلاَّ الله و اللهُ أكبَر**،حەوت کەڕەت، وە حەوت صڵاواتیش لە دیداری پێغەمبەرﷺ بدەیت، وە داوای لێخۆش بوون بۆخۆت و باوك و دایکت و بڕواداارنی پیاوو ژن بکەیت، لە پاشان حەوت جار بڵێیت: **اللَّهُمَّ؛ افعَلْ بِي وَبِهِمْ عَاجِلاً وآجِلاً . فِي الدِّينِ والدُّنيا والآخِرَةِ مَا أنتَ لَهُ أهلٌ، ولاَ تَفعَل بِنا يَا مَولاَنَا مَا نَحنُ لَهُ أهلٌ، إنَّكَ غَفوُرٌ حَليم(رحيمٌ)جَوَادٌ كَريمٌ رَؤوفٌ رَحيمٌ.**

وه ئاگـاداربه ئێــواران و بەيانيــان، ئەم ويــردانە بەردەوام بيــت لەســەريان و تەركيان نەكەيت. وتم: حەز دەكەم بزانم ئەم ويردانە كێ پێی داويت،

فەرمووی: (حەزرەتی) موحەممەد ﷺ پێی داوم، وتم:

كەواتە پێم بڵێ پاداشـت و خێرەكەی چەندە؟ فەرمووی: ئەگەر گەيشـتی بە (حەزرەتی) پێغەمبەر ﷺ لەو پرسيار بكە، ئەو وەڵامت دەداتەوە.

**ئيبراهيمی تەيمييە دەفەرموێت:**

شــەوێكيان لە خەومــدا بينــيم، فريشــتەكان هــاتن و، هەڵيــان گــرتم و بردميـان بەرەو بەهەشـت، هەمـوو ئەو شـتانەی بينـيبووی لە نـازو نـيعمەت ، ئەوەنـدەی تـاريف كـرد كە هەرگيـز وەصـف ناكرێـت، فەرمـووی: پرسـيارم لە فريشتەكان كرد: ئەم هەمووە بۆ كێيە؟ فەرموويان:

بۆ ئەو كەسـەيە وەك ئەو كارەی تۆ كـردووتە ئەويش بيكات، وە فەرمـووی: لەبەروبوومەكانيم خوارد و، لە شەرابەكەيشی ئاواشتەيان كردم، فەرمووی:

لەپاشـان پێغەمـبەر ﷺ تەشـريفی هێنـا، حەفتـا پێغەمـبەرو حەفتـا ڕيـز لە مەلائيكە لە خزمەتی دا بـوون، هەمـوو ڕيزێـك بە پانتـايی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئـاوا، سەلامی لێ كردم، وە دەستی گرتم ، وتم ئەی پێغەمبەری خودا؛

خضـر هەواڵی پيـدام كە ئەم فەرمـوودەی لە جەنابـت بيسـتووە، حەزرەت ﷺ فەرمــووی: خضــر ڕاســتی كــردووە، خضــر ڕاســتی كــردووە، هەرچــيش دەگێـڕێتەوە ڕاست دەكات و حەقە، ئەو زانـای سـەر ڕووی زەوی يە، وە سـەرۆكی ئەبدالەكانە، يەكێكە لە سەربازەكانی خودای (عَزَّ وجَلَّ)لە زەويدا.

**وتم: ئەی پێغەمبەری خودا؛**

هەركەسـێك ئەم ويـردانە بخوێنێـت، وە يـان كاريـان پێبكـات و، ئەوەش كە من ديومە ئەو نەيبينێت، ئايا هەندێك لەوانەی پێدەدرێت كە بەمن دراوە؟

فەرمووی: سوێند بەوەی بە حەق و ڕاستی منی ڕەوانە كردووە: دەدرێت بەو كەسەی كە ئەم ويردانە بەكار دەهێنێت و دەيانڵێتەوە، با منيش و بەهەشتيشی

نەبینیبێت، خودا لە هەموو گوناهە گەورەکانی کە کردوونی خۆش دەبێت، وە غەزەب و تــورەیی خــۆیی لەســەر هەڵــدەگرێت، وە فەرمــانیش دەدات بە مەلائیکەی لای چەپی، کە تا ساڵێك هیچ گوناهو خراپەیەکی لەسەر نەنوسن، سوێند بەو زاتەی منی بە ڕاستی ڕەوانە کردووە؛ کەس ناتوانێت ئەم ویردانە بخوێنێت، مەگەر یەکێك خودا بە بەختیاری دروستی کردبێت، وە ئەوەش کە نەیکات و نایانخوێنێت، تەنها لە بەدبەخت و بێبەشەکانە.[1] ،

---

(١) القصة رواها ابن عساكر في تأريخ دمشق، (٤٢٩/١٦)، إلى قوله: **وهو من جنود الله (عَزَّ وجَلَ) في الأرض**، وتمامها عند صاحب القوت، (٧/١)، وقال الحافظ العراقي: . **ولم يصح في حديث قط اجتماع الخضر بالنبي ﷺ ولا عدم اجتماعه ولا حياته ولا موته** اهـ قال الحافظ الزبيدي( ١٣٥/٥): وهي مسئلة شهيرة الاختلاف بين المحدثين والسادة الصوفية والكلام عليها طويل الذيل، وقد اورد الحافظ ابن حجر طرفا منه في الإصابة(٣٢٦/٢(٢٢٧٢) في ترجمة الخضر عليه السلام،وهذا ايضا على قواعد المحدثين لا يستقيم فانها رؤيا منامية وسعد بن سعيد الجرحاني قال البخاري في التأريخ الكبير(٤،٥٦(١٩٤٩): لا يصح حديثه وأبو طيبة ضعفه يحيى بن معين وكرز بن وبرة عن رجل من الشام مجهول لا يُدرَى من هو، ولكن مثل هذا يغتفر في فضائل الاعمال لا سيما وقد تلقته الامة بالقبول والله اعلم.

بوونی (حەزرەتی) خدری زیندە کە لەناو کوردەواریدا بەم شێوە ناوی هاتووە، بووە بە بەشێك لە ژیانی ئیمانداران، چونکە تێکڕای خوداناسە دڵ صەفادراوەکان باسیان کردووە و، چەندین زاناو خواناسی وەك (حەزرەتی) ئیمامی ڕەببانی باسیان کردووەو، کە بە خەوو بە ئاشکرا بە خزمەتی حەزرەتی خضر و ئیلیاس گەیشتوون و، بوونیان هەیەو خۆیان نیشانی دۆستانی خوداو بەشێك لە پیاوە باشەکان دەدەن و، مەئمووری خودان و، زۆربەی موفەسیرەکانیش تەفسیری **(عبدا من عبادنا)** بە (حەزرەتی) خضر دەکەنەوە، وە من بۆخۆم لە چەندین خواناسی وەك (حەزرەتی) شێخ عوسمانی سیراجەددینی نەقشبەندیم بیستووە (قدس سره) کە فەرموویەتی: بە چاوی خۆم دیومەو، کە بەرجەستە بووەو هاتووە بۆ لام و، قسەو حیواری دوورو درێژ کەوتۆتە میانیانەوەو، لە گەوهەری حەقیقەتدا بەدرێژی باسم کردووە، دەمێنێتەوە

وە حاڵی ئیبراهیمی تەیمیيە وابوو، کە ماوەی چوار مانگ دەمایەوە، دەمی بۆ ئاوو نان نەدەبرد، لەوانەیە دوای ئەم خەوەیە ئەم بەهرەیشی وەرگرتبێت، (چونکە ئەوەی لە میوە و ئاوی بەهەشتی خواردە وە، ئیتر تینوو برسی نابێت)

ئەمەی باسمانکرد، وەزیفە و ئەرکی موریدی ئاخیرەتە، بۆ چۆنیەتی خوێندنەوەکانی، ئەگەر شتێکیشی بۆ زیاد کرد، کە دەستی پێ گەیشتبێت لەقورئان، یان تەنها ئەوەندەی خوێندەوە کە باسمان کرد، ئەوە کارێکی باشی

---

ئەوانەی بڕوایان بە تەصەڕوفاتی ئەولیا نیە. ئەگەر وەك گەزۆ و حەڵوا بیشیخەیتە ناو دەمیانەوە ، تفی دەکەنەوە و دەڵێن: بەڕاستی زۆر تفت و تاڵە. داوام وایە لە خودا بەلوتفی خۆی ڕێنومایمان بکات و حەشرمان لەگەڵیان نەکات، وە دوورمان خاتەوە لە ئینکاریکردنی ئەوانەی سنوور بۆ دەسەڵاتی خودا دادەنێن. پەنا بەخودا، وادەزانن ئەگەر یەکێك لە دۆستانی خودا شتێکی پێکرا کە بیکات، ئەوە لە دەسەڵاتی خودای کەمکردۆتەوە، نازانن هەمووی هەر بە تەوانایی و یارمەتی خودا دەیکات. لەوانەی باسی ژیانی (حەزرەتی) خدریان کردووە: أبو عمرو بن صلاح لە فەتاواکانیدا ١٨٥/١، وەك دەفەرموێت: خضر (سەلامی خودای لەسەر) لەوانەیە کە ئێستا دەژین، بەلای جمهوری زانا تایبەتمەندەکانەوە لە صالّح و زانا خوداناسەکانە، تێکڕای زاناکانیش هاوڕان لەگەڵیاندا، تەنها هەندێك لەزانایانی ئەهلی فەرمووده ئینکاریان کردووە، ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت: لە (المجموع)دا (٢٦٩/٥): وهو يحكي عن الخضر عليه السلام: وإنّما ذكره أصحابُنا، وفيه دليلٌ منهم لإختيارهم ماهو المختار وترجيح ماهو الصواب، وهو أن الخضر عليه السلام حيٌّ باقٍ، وهذا قول أكثر العلماء، وقد قال الإمام المفسر القرطبي في تفسيره( ٤١/١١)، وهو يحكي الخلاف، والصحيح القول الثاني ، وهو أنه الحيُّ). وهذا لايمنع وجود أقوال معارضة لذلك، ووجود من فوض الأمر فيه (عليه السلام) إلى الله تعالى، كما فعل الحافظ ابن حجر صاحب الإصابة، (٤٢٨/١)، وقد ذكره في القسم الأول وقال: فهو داخل في تعريف الصحابي على أحد الأقوال، ولم أر من ذكره فيهم من القدماء، مع ذهاب الأكثر إلى الأخذ بما ورد من أخباره، في تعميره وبقائه، ثم أفرد في كتابه : الزهر النضر في نبأ خضر.

ئەنجامداوە، چونکە قورئان هەموو گەورەیی زیکر و دوعاو بیرکردنەوەی تێدا کۆبووەتەوە، هەرچەندێك زیاتر بە بیرلێکردنەوەوە لە خزمەتیدابێت، چاکترو زیاتر لێی سوودمەند دەبێت، وەك لە گەورەیی قورئان و ئادابی خوێندنەوەیدا باسمانکرد.

**باسی بیر لێکردنەوە:** گرنگ ئەوەیە کە یەکێك لە ئەرکەکانی سەرشانی ئیماندار بیرکردنەوە بێت، وە لەمەودوا بە درێژی باس لەوە دەکەین کە پێویستە چۆن بیربکاتەوە، لە پەڕاوی (بیرکرنەوە)دا پشت بە خودا لە چوار یەکی (ڕزگارکارەکان)، بەڵام کۆی ئەو بابەتانەی بیریان لێدەکاتەوە دەگەڕێتەوە بۆ دوو جۆر و دووهونەر:

**یەکەمیان:** پێویستە بیربکاتەوە لەوشتەی کە سوودی پێدەگەێنێت لە عیلمی موعامەلەو لە هەڵسوکەوتەکانیدا، بەوەی لێپێچینەوە لەگەڵ خودی خۆیدا بکات لەبارەی کەموکوڕییەکانیەوە دەربارەی شوکری نیعمەتە ئاشکراو پەنهانەکان،کە نەیشی توانیوە وەك پێویست تاعەتی خودا بکات وشوکرانەبژێریشی بێت، وە ئەرکو وەزیفەی ڕۆژانەیشی دیاری بکات کە لەبەر دەستیدایە، وە تەگبیری ئەوەش بکات بۆلادانی ئەوکۆسپ و تەگەرانەی کە لای دەدەن و،لە خێر و چاکە دووری دەخەنەوە، هەروەها پێویستە بگەڕێت بە دوای کەموکورتیەکانیدا،بۆ ئەوەی کەلێنەکان پڕ بکاتەوەو هەڵەکانیش چارەسەر بکات، وە لەدڵی خۆیشیدا نیەتێکی باش گەڵاڵە بکات، بۆ ڕاست کردنەوەی کارەکانی و، پەیداکردنی ئیخلاصی دڵی، لە چۆنیەتی هەڵسووکەوتی لەگەڵ موسوڵماناندا.[1] ،

---

(١) ڕێبازەکەی بەوە دیاری دەکات کە چۆن هەڵسووکەوت دەکات لەگەڵ خۆی و خزمەتی خالیقەکەیدا، وە لە میانی خۆی و خەڵکی دیکەدا، کە بیر لە فەرمانەکان و شتە بەکەڵك و بەسوودەکانیش دەکاتەوە کە دەبێت بیانکات، وە بیر لەو هەموو داپۆشینەی خودایە بکاتەوە کە ڕووی هەڵنەماڵیوەو خراپەکانی پۆشیوە، داوای

## جۆری دووهەم:

لەبارەی ئەو شتانەی سوودی پێدەگەێنێت لە زانستی موکاشەفە، ئەمەش بەوە دەبێت کە جارێك بیر بکاتەوە لە نیعمەتەکانی خودا، وە یەك لەدوای یەکی ئەونیعمەتە ئاشکراو پەنهانانە، بۆ ئەوەی زیاتر پێیان ئاشنا ببێت، وە شوکری خودایان زیاتر لەسەر بکات، یان بیر لە تۆڵە و هەڕەشە و غەزەبی خودا بکاتەوە، بۆ ئەوەی زیاتر ئاشنا ببێت بەدەسەڵاتی پەروەردگار، کە هیچ پێویستییەکی بەکەس نیە، وە زیاتریش ترسی خودا لەدڵیدا جێگیر ببێت، وە هەریەکێك لەم فرمانانە چەندین جۆگە و هۆبەی لێدەبێتەوە کە هەندێك زیاتر دەرفەتی بیرکردنەوەی بۆ دەڕەخسێنێت و هەندێکیش ناتوانێت بەباشی بیربکاتەوە، کە زیاتر لە پەڕاوی (بیرکردنەوە)دا باسی دەکەین.

کەواتە هەرچەندێك زیاتر توانای بیرکردنەوەی بۆ ئاسان ببێت، ئەوە باشترینی بەندایەتی بەنسیب بووە، کە واتای زیکری خودای تێدا بەرجەستە دەبێت:

### یەکەمیان:

**زیاتر بە ناسینی خودا**(معرفة الله) ئاشنا دەبێت[1]،چونکە بیرکردنەوە، کلیلی دەوازەی ناسین و دەرخستنی شتە نادیار و نەزانراوەکانە.

---

لێبوردنیان لێ بکات، بە دڵێکی پڕ لە لاڵەو گەردن کەچییەوە بپاڕێتەوە لە خودا کە لێی خۆشببێت، وە ڕێنمایی ڕێگای ڕاستی بکات و دڵی لە هەموو پەیوەندییەکی دونیایی خاڵی بکاتەوەو دڵنیاش بێت خودا لێی وەردەگرێت، ئەمە بەشێك بێت لەبیرکردنەوەکانی تا لە زانستی موعامەلەدا بە ئەنجام بگات.

(١) بۆ نموونەچۆن بە هۆی دەستەوە هەست دەکرێت بە شتەکانی ، لە جیهانی هەست پێکراوو (محسوسات)دا، هەروایش بە هۆی بیرکردنەوەوە جیهانی نەبینراوی مەعریفی کەشفی ئیلاهی پێ دەزانرێت، لە دلاقەی بیرکردنەوەوە بۆی دەچیتە ژوورەوە. الإتحاف ١٣٦/٥.

**دووهەم: زیادبوونی خۆشەویستی:**

چونکە دڵ ناتوانێت یەکێکی خۆش بوێت، تا لەناو دڵیدا سام و هەیبەتی جێگیر نەبێت، وە ناشتوانێت گەورەیی و جەلالی خودای بۆ دەربکەوێت ﷻ . مەگەر لە ڕێگەی ناسینی صیفەتەکانیەوە، وە زانینی ئاستی قودرەت و تەواناپی خودا، وە کارە سەرسوڕهێنەرەکانی، کەواتە بەهۆی بیرکردنەوەوە، مەعریفەتی بۆ پەیدا دەبێت، وە بەهۆی ناسین و مەعریفەتیشەوە، گەورەیی خودا دەچەسپێت لە دڵیدا، وە بەهۆی مەزنی و بەگەورە زانینیشیەوە خۆشەویستی ئەوی بۆ پەیدا دەبێت.

هەروەها زیکری خودایش، ئونس و ئالوودەی بۆ دابین دەکات، ئەوەیش جۆرێکە لە خۆشەویستی، بەڵام ئەو خۆشەویستییەی کە بەهۆی ناسین و مەعریفەتی خوداوە دروست بووبێت، ئەوە بەهێزو جێگیرو چەسپاوو مەزنترە.

وە نیسبەتی خۆشەویستی عاریفێکی ڕەببانی، لەگەڵ ئالوودەیی و ئونسی کەسێك، کە بەهۆی زیکرەوە پەیدای کردبێت، بەبێ ئەوەی بە تەواوی چاوی دڵی کرابێتەوە و، بەصیرەتی تەواوی بۆ پەیدا بووبێت:

وەك نیسبەت و ڕێژەی عەشقی کەسێکە، کە بە چاوی خۆی دولبەرەکەی بینیبێت، وە شارەزای ڕەوشت بەرزی و کردارو مەزنایەتی و خەصڵەتە شیاوو پەسەندەکانی بووبێت بە هۆی تاقیکردنەوەی زۆرەوە لێی شارەزابووبێت، لەگەڵ کەسێکی دیکەدا کە شێوە ئونس و خۆشەویستی و پێداهاتنێکی لەگەڵ یەکێکدا پەیدا کردبێت، تەنها بەوەی کە ناوو تاریف و کەسایەتی ئەو کەسەی بەرگوێ کەوتبێت، وەك کەسێکی نامۆ، کە دووربێت لەبەرچاوی، وە نەزانێت کە ڕەوشت و ئاکارو خوو صیفەتەکانی چۆنە، تەنها ئەوەندەی بەر گوێی کەوتبێت کە کەسێکی باشە. دیارە ئەم دوو ناسین و خۆشویستنە جیاوازن و، هەرگیز ناتوانێت وەك ئەوەیانی خۆش بوێت کە هەمیشە لەبەرچاویایەتی و تا ئەندازەیەك لێی شارەزابووە. بۆیە ڕاستیان وتووە

کەدەڵێن: بیستن وەك بینین نیە.[1]

ئەو بەندەخواپەرستانەی بە دڵ و زوبان بەردەوامن لەسەر زیکری خودا، وە بە هۆی بڕوایەکی تەقلیدی و شوێنکەوتنەوە بڕوایان هێناوە بەو پەیامانەی کە پێغەمبەران هێناویانە، ئەمانە لەجوانیی صیفەتەکانی خودا تەنها چەند واتایەکی ڕووکەشییان وەرگرتووە، وەك لەکەسانی دیکەوە بۆیان وەصف کراوە نەك قووڵبۆی داچووبن وشارەزای نهێنیەکان بووبن،بەڵام عاریف وخودا ناسەکان، ئەوان هەندێك ئاشنا بوون بە هەردوو صیفەتی جەلال و جەماڵی خودای گەورە بە چاوی دڵیان بینیوە و، چاوی دڵ و بەصیرەتیان کراوەیە، کە لە چاوی سەر زۆر بەهێزو بیناترە، خۆمەبەست ئەوەنیە کە کەسێك توانیبێتی، هەموو لایەنەکانی ناسینی خودای بۆ دەرکەوتبێت، ئەمە بۆ هیچ بەندەیەك گونجاو نیەو، لە توانایاندا نیە[2]، بەڵام ئەوەندە هەیە هەرکەسە بەو ئەندازە دەبینێت،کە لە لایەنی خوداوە پەردە و حیجابی بۆ لادراوە. وە بزانە کە جەماڵی حەزرەتی خوداوەندی گەورە هەرگیز بە کۆتا ناگات و، کەسیش ناتوانێت نە لە

---

(١) قال الزبيدي( ١٣٦/٥): قد روي ذلك مرفوعا عن ابن عباس. رواه العسكري في الامثال والخطيب في تأريخ بغداد ٥٦/٦، وعن أبي هريرة رواه الخطيب وعن انس رواه الطبراني في الاوسط والخطيب في تأريخ بغداد (٢٧/٨). وعن أنس رواه الطبراني في الأوسط (٩٠/٧ (٦٩٤٣) والديلمي( ٤٠٠/٣(٥٢١٨) ورواه أحمد في مسنده(٢٤٤٣) والضياء في المختارة (٢٠٢/٥(١٨٢٧) بزيادة.: ليسَ المعايَن كالخبر،عن ثمامة بن عبد الله بن أنس عن جده.

(٢) چونکە نهایەتی ناسینی عاریفەکان بۆ خودا، ئەوەیە کە ناتوانن بەتەواوی بیناسن، حەقیقەتی خوداناسین، ئەوەیە کە بگاتە ئەو ئاستەی کە تێبگات لەوە زیاتر ناتوانێت لە حەقیقەت و کونهی خودا حاڵی ببێت، جگە لە خوا محاڵە هیچ کەسێکی تر حەقیقەتی نهێنیەکانی خودایەتی خودا بزانێت، مەگەر تەنها لە ڕێگەی ناوو صیفەتەکانی خوداوە، هەندێك لە مەعریفە و زانستەکانی بۆ خۆی زیاد بکات.

جوانی و جەماڵی خودا تێر ببێت، وە نە لە نهێنی و فراوانی پەردە و حیجابەکانی نێوانی بەندەوخالیق تێبگاتو بتوانێت بگاتە ئەوپەڕی، بەڵکوو ژمارەی پەردەکان کە شیاوی ئەوەیە بە نوور وەصفدار بکرێن، وای لێ هاتووە کە لەوانەیە ئەو کەسەی گەیشتبێتە یەکەم حیجاب، وابزانێت کە گەیشتۆتە ئەصڵی نوورو پەردەکان، کە حەفتا حیجاب لە نێوانیاندایە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(( إِنَ للهِ سَبعينَ حِجَاباً مِنْ نُورٍ، لَوْ كَشَفَها لأَحْرَقَتْ سَبَحَاتُ وَجهِهِ كُلَّ مَا أَدْرَكَ بَصَرَهُ))[1]، بەڕاستی خودای گەورە حەفتا پەردەی نووری هەیەلە نێوان خۆی و بەندکانیدا، ئەگەر پەردە نوورینەکانی لابدات، ئەوا لە گەورەیی و کاریگەریی صیفەتی جەلالی خودای گەورە هەموو بوونەوەر دەسووتێت.

وە بشزانە؛ کە ئەو پەردە و حیجابانەش ڕێکخراون و بە پلەکاری دانراون، وە ئەو نوورانەیش لە پلەو نزیکیدا جیاوازییان هەیە، وەك جیاوازی پلەکانی نێوانی خۆرو مانگ و ئەستێرەیە،[2]، وە لە یەکەمجاردا بچووکەکەیان

---

(١) رواه مسلم (١٧٩) بلفظ: حجابه نور. ولفظ سبعين حجاباً. عند الطبراني في الأوسط (٦٤٠٣) وروى أبو نعيم في الحلية ٥(/٥٥) مرغوعا: يا جبريل: هل ترى ربك؟ قال: إنَّ بيني وبين ربِّي لَسَبعينَ حِجاباً، مِنْ نارٍ أو نور، لَو دَنَوتُ مِنْ أدناها..لاحتَرَقْت. وانظر ما قال المصنف رحمه الله تعالى في مشكاة الأنوار ص/٧٥).

(٢) خوێنەری بەڕێز: بۆ تێگەیشتن لەم فەرموودەیە، پێویستە ئەم ڕوونکردنەوە بخوێنینەوە:

بزانە هەموو شتەکان کە بیاندەیتە پاڵ حاسسەی بینینەوە، سێ بەشیان لێ دەبێتەوە: هەندێکیان بە خۆیان نابینرێن، وەك جیسمە تاریکەکان، وە هەندێکیشیان بە خۆیان دەبینرێن، بەڵام بەهۆی ئەوانەوە شتی تریان پێ نابینرێت، وەکو جیسمە ڕووناکەکان، وەك ئەستێرە و لایەنی ئاگر ئەگەر دانەگیرسابێت، وە هەندێکیشیان بەخۆیشیان دەبینرێن و، جیسمی تریشیان پێ دەبینرێت، وەك خۆرو مانگ ، وە ئاگرو چرای داگیرساویشی داناوە بۆ ئەم بەشی سێیەمە، کە هەندێك جار نەو تیشکانە دەگرێتەوە، کە لە جیسمە ڕووناکەکانەوە دەڕژێنە خوارەوە بەسەریاندا و دەبینرێن، وەهەندێك جاریش مەبەست ئەصڵی ئەو جیسمانەیە کە خۆیشیان ڕۆشنن، کەواتە نوور بریتییە لەوەی

دەبینرێت، لە پاشان ئەوەی لە دوای ئەوەوە دێت، وە هەر لەسەر ئەم بنەمایەشە، هەندێك لە زانایانی ئەهلی تەصەووف تەئویلی ئەو پلانەیان کردووە، کە یەك لەدوای یەك بۆ (حەزرەتی) ئیبراهیم ئاشکرا دەبوو، لە بەرزبوونەوەی ئەحواڵی گەیشتنیدا بە خودا، کە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ﴾ واتە: کاتێك فرمانەکەی لەسەر تاریك بوو، ڕاستیەکەیانی لێ تێکەڵ

---

خۆیشی دەبینرێت و، شتیشی پێ دەبینیت. وەك خۆر. ئەقڵەکانیش با بشبینن پلەیان جیاوازە، هەندێکیان ئەو شتانەی دەیبینن وەك زانینی شتە (زەروریە)کان وایە، کە پێویستییان بە بەڵگە نیە، وە هەندێکیشیان بە بێ لێکدانەوەی ئەقڵ پێی ناگات، مەگەر ئاگادارکردنەوەیەکی تر لە ئەنواری ئاسمانی بێداری بکاتەوە، کە نوورەکانی سەر زەوی هەموویان لە نووره ئاسمانیەکان تیشکیان وەرگرتووە، ئەویش بە پێی پلەکاری، ئەوەی لە سەرچاوەی یەکەمەوە نزیك تر بێت، لەپێشترە کە ناوی نووری لێ بنرێت، چونکە پلەکەی بەرزترە. لە جیهانی بینراویشدا مرۆڤ ناتوانێت دەرکی پێ بکات، مەگەر لەرێگەی ئەم نموونەوە: کە گریمان تیشکی مانگ لە دەلاقەو پەنجەرەیەکەوە بێتە ژوورەوە، وە بیدات لە ئاوێنەیەك، کە بەدیوارێکەوە هەڵواسرابێت، وە تیشکەکەی بدات لە دیوارێکی تر کە بەرامبەری بێت، لەوێیشەوە دابەزێتە خواردوە بۆ سەر زەوی، وە هەر کونیەك لە زەوی ڕۆشن بکاتەوە، ئەوا تۆ دەزانیت کە ئەو نووره تابیعی نووری دیوارەکەیە، ئەویش پەیوەستە بە نووری ئاوێنەکەوە، ئەویش بە نووری مانگەوە، وە نووری مانگەکەیش تابیعی نووری خۆرە، چونکە لە خۆرەوە نوورەکە هەڵدێت بەسەر مانگدا، کە ئەم چوار نووره بەم تەرتیبە دێن، هەریەکەیان پلەیەکی تایبەتی هەیە، هەر بەمشێوەیە ئەنوارە مەلەکوتیەکانیش پلەکانیان جیاوازە و، ئەوەی زۆر نزیکترە، ئەوە لەپێشتر دادەنرێت، وە بشزانە کە نوورەکان وەك زنجیرو ئەڵقەبەندییەك نین کە پێکەوە بەسرابنەوەو کۆتاییان نەیەت، بەڵکو هەموو نوورەکان دەگەن بە نووری ئەصڵی و سەرچاوەی نوورەکان، کە نووری زاتی خودایە،ڕۆشنایەکەی بە خۆیەوەیەتی و،پێویستی بە نووری تر نیە ڕۆشنی بکاتەوە،تەنها لە خۆیەوە هەموو نوورەکان سەرچاوەیان گرتووەبە پێی ریزبەندی. ئەمەش واتای فەرمـوودەکەی ئیمامی غەزالییە کە فەرموویەتی:نوورەکان لە ڕوتبەدا جیاوازن،وەك جیاوازی ڕوتبەو پلەی خۆرو مانگ و ئەستێرەکان. الإتحاف ١٣٨/٥_١٣٩.

بوو،(سەرەتای بیرکردنەوەی بوو) ئەستێرەیەکی بینی، ﴿رَأَى كَوْكَبًا﴾(أنعام/٧٦) واتە: گەیشت بە یەکێك لە پەردە و حیجابە نووریيەکان، بە ئەستێرە دەری بڕیوە و لێکی داوەتەوە، مەبەستی ئەم جیسمە تیشکدارە بینراوانە نەبووە[(١)]، چونکە تاکە نەزان و عەوامەکانیش ئەوەیان لێ شاراوە نیە،

کە شیاو نیە بۆ ناسینی پەروەردگاری خودا ﷻ بە پێی ڕیزبەندی جیسم بۆی بڕیار بدەیت و پێناسەی بکەیت، بەڵکوو ئەم ڕاستییە تەنها بە یەکەم سەرنجدانیان پێی دەزانن، (چونکە یەکەم نەزەری پێغەمبەران دەگاتە سەروو جیهانی هەست و خەیاڵەوە، کە جیهانی قودسییە)، ئیتر شتێك کە نەتوانێت نەخوێندەوارێك فریوبدات، چۆن دەکرێت خەلیلی خودا(عَليه السلام) فریو بدات؟!.

ئەو حیجابانەی کە ناو دەبرێن بە ئەنوار، مەبەست لێیان ئەو نوورانە نیە کە بە چاوی سەر هەستیان پێدەکرێت، بەڵکوو مەبەست پێیان ئەوانەیە کە خودا مەبەستی بووە لە فەرموودەکەیدا :﴿ اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ، الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ، الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ، يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ، زَيْتُونَةٍ لَا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ، يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ، وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ. نُورٌ عَلَى نُورٍ، يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشَاءُ، وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ. وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ (النور/٣٥) [(٢)]، کە تەنها نووری ڕاستەقینەی خودایە. با لەم بابەتە لادەین، کەلە

---

(١) بنوارە بۆ درێژی ئەم بابەتە لە کتێبی (مشكاة الأنوار) ی ئیمامی غەزالی ،ص/٥٥.

(٢) جیهانی مەلەکووتی. واتە: جیهانی غەیبی. وە جیهانی حیسسی، واتە بینراوو موشاهەدە، کە ڕێگەی بەرزبوونەوەیە بۆ عالەمی غەیبی، وە لە میانیاندا موناسەبەیەکی زۆر هەیە، ئەگەر ئەو پێکەوە لکان و پەیوەندییە نەبوایە، هەرگیز مەحسووساتەوە بەرز نەدەبوویەوە بۆ جیهانی نادیار، بۆیە لە بەرامبەری ئەسرارەکانی عالەمی قودسی دا، هاو وێنەی ئەوانە لە جیهانی بینراودا دانراوە، بۆنموونە: ئەگەر لە جیهانی مەلەکووتیدا گەوهەری بەرزی نوورانی هەبێت، کە بە مەلائیکە تەعبیریان دەدرێتەوە، کە نوورەکان دەڕژێنن بەسەر ڕۆحی ئادەمییەکاندا، بۆیە بە ئەرباب ناو براون، کە هەریەکەیان پلەی جیاوازی خۆیانیان

زانستی موعامەلەدا تێی ناگەین و ناگەینە ڕاستییەکانی، مەگەر لە ڕێگەی کەشفی دروستەوە، لەلایەن دەروون پاکە صەفادراوەکان، کەم کەسیش هەیە ئەو دەرگایەی بۆ بکرێتەوە، ئەوەی بۆ تێکرای خەڵکە کە دەگونجێت، تەنها بیرکردنەوەیە لەوەی سوودی پێدەگەیێنێت لە زانستی موعامەلەدا، ئەمەش سوودی زۆرەو کەڵکێ چاکیشیان پێدەگەیێنێت کە ئەم چوار وەزیفەیە: کە دوعا و زیکر وخوێندنەوەی قورئان و بیرکردنەوەیە، دەبێت مورید لە دوای نوێژی بەیانی جێبەجێیان بکات، بەڵکوو دوای لێبوونەوەی لە نوێژەکان و خوێندنی ویردەکانیان، تەنها ئەم وەزیفانەی هەیە: با چەك و قەڵغانەکەی هەڵگرێت و خۆی بۆ بەهێز بکات، ڕۆژوویش ئەو پارێزەرەیە کە ڕێگەی شەیتان و خەیاڵاتی ئەو بەرتەنگ دەکاتەوە، وە لە ڕێگەی ڕوشدو تێگەیشتنەوە دووری دەخاتەوە و لای دەدات،لە دوای ڕۆژ بوونەوە، جگە لە دوورکاتی نوێژی سوونەت، نوێژێکی دیکەنیە تا خۆرهەڵاتن،لەم کاتەدا پێغەمبەری خودا ﷺ وەصەحابەکان خەریکی زیکرەکان دەبوون[1]، ئەمەش لە عیبادەتەکانیتر لەپێشترە، مەگەر خەو زۆری بۆ بهێنێت، ئەوا دەتوانێت نوێژێکی دیکە بکات، ئەو کاتە ڕێگەی لێ ناگیرێت.

---

**هەیە، دیارە پێویستە لە جیهانی بینراودا نموونەیان هەبێت، وەك خۆرو مانگ و ئەستێرکان، ڕیبواری ڕێگەی ئاخیرەتیش، لە پێشەوە پلەکەی بەرزدەبێتەوە. تا ئاستی پلەی ئەستێرەیەك، کە نووری ئەو قۆناغەی بۆ دەرکەوت کە وەك پلەی ئەستێرەکەیە دەڵێت: ئەمە خودای منە! کە ئەو نوورە نیشت، دەڵێت: خۆشیم لەم پلە نایەت، پێویستم بە بەرەوژوور ترە، کە نورێکی بەهێزتر ببینێت لە پلەی هاو وێنەکەی لە عالەمی موشاهەدەدا بێت. وەك خۆر، کە لەو گەورەترە. پلە پلە ئاشنا دەبێت بە نووری حەقیقی، ئیتر نموونەکان و حیجابە نوورانییە دەخاتە ئەولاوە و دەڵێت: وجَّهتُ وجْهِيَ للذي فَطَرَ السَّماواتِ والأرض، تەنها ڕو لە نووری ڕەها دەکات و. نموونەکان بەهایان نامێنێت، ئینجا لە حەقیقەتی بەندایەتی حاڵی دەبێت. بنوارە الإتحاف( ٥/ ١٣٩).**

(١) روى ذلك الخبر أبو داوود (٣٦٦٧).

## ویردی دووهەم: لەنێوانی هەڵاتنی خۆرەوە تا ڕۆشنایی بەیانی:

مەبەست لەو ڕۆشناییە، بەینی خۆرهەڵاتن و کاتی لادانی خۆرە لە ناوە ڕاستی ئاسمان، واتە: ئەگەر ڕۆژ دوانزە سەعات بێت، سێ سەعاتی یەکەمی تێپەڕێت، کەچواریەکی ڕۆژەکەیە، وە لەم کاتەدا دوو ئەرکی تری لەسەرە دەبێت بیانکات:

**ئەرکی یەکەم** : نوێژی (چێشتەنگاو) (الضحی)، لە پەڕاوی نوێژدا وتمان: باشتر وایە کە دووڕکات بکات لە کاتی خۆر هەڵاتندا، کە ئەندازەی ڕمێك لە کەناری ئاسمان بەرزبووبێتەوە و، تیشکەکەی بڵاو بووبێتەوە، وە چوار ڕکات یان شەش، یان هەشت ڕکات بکات،کاتێك کە گەرما دادێت،(سەبارەت بە جێگاو شوێنە گەرمەکاان)(ئەو کاتەی کە بەچکە وشتر بۆ نوستن و حەوانەوە خۆی دەخاتە ژێر سێبەری دایکیەوە، کە ڕمڵ و بەردەکان گەرم دادێن)، وە دەست و پێیەکانی گەرم دەبن کە لەبەر خۆر دەبن.

کاتی ئەو دوو ڕکاتە ئەوەیە: کە خودا مەبەستیەتی و دەفەرموێت:

﴿يُسَبِّحْنَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِشْرَاقِ﴾ (ص/١٨)

واتە: تەسبیحاتی خودا دەکەن، لە کاتی عیشاو لە کاتی خۆرهەڵاتندا، کە بەتەواوی ڕۆشناییەکەی بڵاو دەبێتەوە، کە بەرز بێتەوە لە ئاستی ئەو هەڵم و بوخارو تەپ و تۆزەی سەر زەوی دادەگرێت، چونکە ئەو تۆزو غوبارە نایەڵێت ڕۆشنایی خۆر بە ڕوونی دیار ببێت.

وە کاتی چوار ڕکاتەکە ، ئەو کاتەیە کە ضوحای بەرزی پێدەڵێن، کە خودا سوێندی پێ خواردووە، ﴿ وَالضُّحَى، وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى﴾ (الضحی/٢) سوێند بە کاتی چێشتەنگاو، سوێند بە شەو، کاتێك کە خەڵکی ئارام دەگرن، پێغەمبەر ﷺ دەرچووە دەرەوە بۆ ناو صەحابەکانی،کە لە کاتی خۆر هەڵاتندا نوێژیان دەکرد بەدەنگێکی بەرزهاواری کرد:

**(أَلاَ إِنَّ صَلاَةَ الأَوَّابِينَ، إِذا رَمَضَتِ الفِصالُ)**[١]

**ئاگاداربن:** نوێژی (ئەووابین) ئەو کاتەیە، کە بەچکە لەشیر براوەکان گەرمایان دەبێت و بەرەو سێبەردەکشێن، **کەواتە دەبێت بڵێین:**

ئەگەر تەنها لە یەککاتدا سوننەتی ضوحا دەکات، با لەو کاتی چواریەکی ڕۆژدا بێت کە گەرما بەرزدەبێتەوە، هەرچەندە بەوەی کە لەکاتی دووچەمکی کەراهەتدا کردبێتی ئەصڵی گەورەیی خێرەکەی دەستدەکەوێت، واتە:

کاتی بەرزبوونەوەی خۆر بە قەدەر نیوەی ڕمێك، تاکووپێش کاتی وەستانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان، واتە:

پێش لادانی لە ناوەڕاستی ئاسمان.

کەواتە ناوی ضوحا هەموو ئەو کاتانە دەگرێتەوە، وەك ئەوە وایە کە دووڕکاتەکەی کاتی خۆرکەوتن کەوتبێتە سەرەتای وەختی ڕێگەپێدان بۆ نوێژی چێشتەنگا، وە کاتی بەسەر چوونی کەراهەتەکە.

چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:

**(( إن الشَّمسَ تَطلُع ومَعَها قَرْنُ الشَّيطانِ، فَإنِ ارتَفَعَت فارَقَها))**[٢]،

واتە: خۆر هەڵدێت و لەگەڵیدا شاخە شەیتانیش هەڵدێت، هێز و سەربازو تاقمەکەیشی لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا ئەوانیش بڵاو دەبنەوە و، لەگە بەرزبوونەوەی خۆردا ئەوانیش لێی جودا دەبنەوە،

---

(١) رواه أحمد في المسند(٣٧٤/٤) وهو عند مسلم(٧٤٨) دون ذكر وقت الإشراق.قال الزبيدي(١٤٠/٥): ورواه أحمد في مسنده(١٨٧٧٩)١و ابن أبي شيبة٣٥٣/١(٥١٦) والدرامي(١٤٥٧)، وابن خزيمة في صحيحه(٢٢٩/٢)(١٢٢٧)و غيرها.

(٢) رواه النسائي (٢٧٥/١)، وابن ماجه(١٢٥٣).

کەمترینی بەرزبوونەوەی خۆر ئەو کاتەیە کە تیشکەکەی بەرزبێتەوە لە ئاستی غوبارو هەڵم و تەپ و تۆزی زەویدا، ئەمەش بە شێوەیەکی خەملاندن بەدەردەکەوێت.

## وەزیفەو کرداری دووهەم لەم کاتەدا:

ئەو خێرو چاکانەیە کە پەیوەنداری خەڵکەکەن، کە نەریتیان وایە لە بەیانیان زوودا ئەنجامی دەدەن، وەك سەردانی نەخۆش و بەڕێخستنی جەنازە و ئەسپەردەکردنی و، یارمەتی دان لەسەر چاکەو خۆپارێزی و تەقواو. ئامادە بوونی کۆڕی زانست و هاوڕێنەکانیان لە کاری خێر، کە کاری موسوڵمانێك بەڕێ بخات، یان هەر چاکەیەکی تر ئەنجامی بدات.

ئەگەر هیچ یەکێك لەمانەی لەبەردەمدا نەبوو، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چوار وەزیفەی کە لە پێشەوە باسمانکردن:

زیکرو دوعاو قورئان خوێندن و بیرکردنەوە، یان کردنی نوێژی خۆبەخشی ئەگەر ئارەزووی لێبوو، چونکە لەدوای نوێژی بەیانی کەراهەتی هەیە نوێژی سوننەت بکرێت، بەڵام لەو کاتەدا ناپەسەندییەکەی نامێنێت، ئەوکاتە نوێژ دەبێتە بەشی پێنجەم لەو ئەرکانەی کە بیەوێت ئەنجامیان بدات.

بەڵام لە دوای نوێژی فەرزی بەیانی، ئەوە کەراهەتی هەیە هەر نوێژێکی دیکە بکەیت، ئەگەر هۆکارێکی نەبێت، وە لە بەیانیاندا باشتر وایە تەنها دووڕکاتی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی بکات.

ئەگەر کاتیشی هەبوو سوننەتی دیاری و سڵاوی مزگەوت بکات، لەپاشان بەردەوام بێت لەسەر زیکرو قورئان خوێندن و پاڕانەوە و بیرکردنەوە، ئیتر خۆی سەرقاڵی نوێژکردن نەکات.

## ویردی سێیەم:

**لە دوای کاتی ضوحا و چوارەکی ڕۆژەکەی تا کاتی لادانی خۆر،**

مەبەستمان لە کاتی چێشتەنگاو، نێوانی خۆرهەڵاتن و زەوال، وە کەمێك پێشتریشەوەك ئەوەی کە لە دوای هەموو سێ کاژێرێك فەرمان هەبێت بە نوێژکردن.

کەواتە لە دوای خۆر هەڵاتن ، ئەگەر سێ کاتژمێری تێپەڕاند، ئەوە لەو کاتەدا پێش ئەوەی کاتەکە تێبپەڕێت، با نوێژی ضوحا بکات، ئەگەر سێ کاژێری تری تێپەڕاند، با نوێژی نیوەڕۆ بکات، وە ئەگەر سێ کاتژمێری دیکەی تێپەڕاند، نوێژی عەسر دەکات، لە دوای سێ سەعاتی تر نوێژی ئێوارە دەکات.

وەجێگەی نوێژی چێشتەنگا لە نێوانی خۆرهەڵاتن و، لادانی خۆردایە لە ناوەڕاستی ئاسمان، وەك جێگەی نوێژی عسر کەوتۆتە نێوانی کاتی زەوال و، لادانی خۆر و کاتی خۆرنشیندا، تەنها ئەوەندەیە کە نوێژی ضوحا(چێشتەنگاو) فەرزنەکراوە،چونکە کاتی سەرقاڵی و کارو کەسابەتەو، لەسەریان ئاسان کراوە.

**ئەو ئەرکەی لەم کاتەدا پێویستە بەجێی بهێنێت، جگە لە چوار وەزیفەکە، دوو ئەرکی تری لەسەرە:**

**یەکەمیان:**

خەریك بوونی بە کەسابەت و دابین کردنی بژێوی ژیان و، چوونیان بۆ ناو بازاڕ:

جا ئەگەر بازرگان بوو، دەبێت بە ڕاستگۆیی و ئەمانەتەوە بازرگانی بکات و کاڵاکانی بفرۆشێت، وە ئەگەر پیشەساز بوو، دەبێت بە ئامۆژگاری خێرو، نەرم ونیانی و بەزەییەوە کارەکەی بکات، وە نابێت لە هەموو کارەکانیدا یادی خودای لەبیر بچێت وە هەتا ئەو ئەندازەیە خۆی سەرقاڵی کارو کەسابەت بێت کە بتوانێ پێداویستیەکانی ڕۆژانەی دابین بکات، مادەم هەموو ڕۆژێك بتوانێت، بۆ

ئەو ڕۆژە بژێوی خۆی دابین بکات[1].

جا ئەگەر بەشی ڕۆژێکی دەست کەوت واباشە بگەڕێتەوە بۆ ماڵی خودای (عَزَّ وجَلَّ)، وە خەریکی دابین کردنی توێشووی قیامەتیش بێت، چونکە ئەمەیانی دواتر پێویستتر دەبێت لە توێشووی دونیا. وەزیاتر لێی دەحەوێتەوەو، چێژی لێ وەردەگرێت، کەواتە خەریك بوون بۆ کەسابەتی دوارۆژ، گرنگ و بایەخدارترە لە پێداویستیە کاتیەکانی، وەك وتراوە:

**مرۆڤی بڕوادار لە سێ شوێندا دەبینرێتەوە:**

مزگەوتێك بە عیبادەت ئاوەدانی بکاتەوە، یان ماڵێك کە بیشارێتەوە و نەیخاتە بەرچاوی ئەوکەسانەوە کە پێویست ناکات بیانبینێت، یان خەریکی کارێکی پێویستی خۆی بێت[2].

وە کەم کەس هەیە بزانێت ئەو ئەندازە چەندێکە کە خۆیی پێوە خەریك بکات، چونکە شەیتان هەمیشە ترسی برسێتی و نەداری و گرانییان دەخاتە بەرچاو، وە فرمانی کاری نەشیاوو بێ شەرمییان پێدەدات، ئەوانیش گوێی بۆ شل دەکەن و ، ئەوەندە کۆدەکەنەوە کە نایخۆن و، ترسی هەژاری زاڵ دەبێت بەسەریاندا.

وە خودای گەورەیش بەڵێنی لێخۆشبوون و میهرەبانی خۆی دەڕژێنێت بەسەریاندا، کەچی پشت لە بەڵێنی خودا دەکەن و لێی دەتەکێنەوە.

---

(١) یان بژێوی خانەوادەکەی، وە ئەگەر بتوانێت چەند ڕۆژێك کار بکات و پاشماوەی حەفتە کە خەریکی زیکرو خوداناسی بێت، ئەوە باشەو ڕێگری لێ ناکرێت، الإتحاف٥/١٤٢.

(٢) رواه عبدالرزاق في المصنف(١١(٢١)، وأبو نعيم في الحلية(٢/٣٤١)، عن قتادة، وروى الترمذي (٢٣٤١) مرفوعا: **ليس لابن آدم حقٌ في سِوى هذه الخصال: بيتٌ يسكنهُ، وثوبٌ يُواري عَورَتَه، وجلف الخُبز والماء.**

## کارو فرمانی دووهەم:

قەیلوولەیە، واتە سوننەتە کەمێك بخەوێت لە نیوەڕۆدا، پێش نوێژی نیوەڕۆ، بۆ ئەوەی یارمەتی عیبادەتی بدات، یاخود دوای نوێژ کە یارمەتی هەستانەوەی شەوی بدات، وەك چۆن پارشێوکردن سوننەتە کە ببێتە یارمەتی دەری بۆ ئەوەی بەرگـــەی برسێــتی و تینــوێتی ڕۆژووی ڕۆژەکــەی بگرێت[1]

خۆ ئەگەر شەونوێژی نەبوو، وە بەنەخەوتنیش خەریکی کارێکی باش نەدەبوو بەڵکوو لەوانەیە تێکەڵی غافڵ و بێ ئاگایانی بکردایە، وە قسەی لەگەڵ بکردنایە، ئەوە نووستنەکە بۆی باشترە، بەمەرجێك تەمبەڵی نەکات لەوەی کە نەتوانێت خەریکی زیکرو وەزیفە باسکراوەکای بێت، چونکە هەر هیچ نەبێت لە نوستنەکەیدا بێدەنگەو سەلامەتیشە لەوەی تووشی گواناهی تر ببێت.

**هەندێك لە زانایان فەرموویانە:**

سەردەمێك دێتە پێشەوە بەسەر خەڵکێکدا، کە بێ دەنگی و نووستن لە باشترینی کردەوەکانیان دەبێت،وە چەندین کەسیش هەیە لە عابیدەکان، کە باشترین حاڵیان نووستنە، نەك بە ئاگابوون، چونکە زیاتر ڕیایی دەکەن و دوورن لە ئیخلاصەوە، ئیترئەبێت حاڵی خراپەکاران چۆن بێت؟!

سوفیانی سەوری (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

کاتی خۆی بەلایانەوە باش بوو، لەکاتی دەستبەتاڵبوونیان بخەوتنایە، بۆ ئەوەی سەلامەت بن و تووشی گوناهو ڕیاکاری نەبنەوە ،[2]

کەواتە؛ نوستنەکەی بە مەبەستی ئەوەی خۆی لە گوناہ بپارێزێت و، شەوانیش بتوانێت بەندایەتی بکات، ئەوە بە نزیکیوونەوە لە خودا بۆی دەنوسرێت، بەڵام دەبێت ئاگاداری ئەوەی هەبێت کە پێش لادانی خۆر لە

---

(١) روی ابن ماجه(١٦٩٣)مرفوعا:(استعینوا بطعام السحر علی صیام النهار و بالقیلولة قیام اللیل)

(٢) قوت القلوب١/٩٦. وە بنوارە هەمان سەرچاوە١/١٦.

ناوەڕاستی ئاسمان، بە ئەندازەی دەستنوێژ گرتنێك بەئاگابێتەوە و، بتوانێت خۆی بۆ نوێژی نیوەڕۆ ئامادە بکات، وە پێش دابەستنی نوێژ لە مزگەوتدا ئامادەبێت، ئەوە لە گەورەترینی کردارە خێرەکانە، وە ئەگەر نەنوست و خەریکی کەسابەت و کاری نوێژ و زیکر کردن بوو، ئەو بۆی دەنوسرێت بە خێردارترینی کردەوەکانی لە ڕۆژدا، چونکە ئەو کاتە کاتی غەفڵەت و بێ ئاگایی خەڵکییە لە خودای (عَزَّ وجَلْ)، وە کاتی سەرقاڵییانە بە خەمەکانی دونیاوە، بەڕاستی ئەو دڵەی خۆی تەرخان کردبێت بۆ خزمەتکردنی پەروەردگاری، لە کاتێکدا کە خەڵکی پشتیان لە دەرگای ڕەحمەتی کردووە، ئەو بەندەیە شیاوی ئەوەیە کە خودا پاڵفتەو پاکی بکاتەوە و، نزیکی بکاتەوە لە خۆییتا ئەندازەیەك خودناس بێت.

وە بزانە کە گەورەیی ئەم بێداربوونەوەیە بە ڕۆژدا وەك گەورەیی زیندووکردنەوەی شەوە بە عیبادەت، چونکە شەو کاتی بێئاگایی و نووستنە، ڕۆژیش کاتی غەفڵەت و بێ ئاگایی و شوێن کەوتنی هەواو ئارەزووەوەکانە سەرقاڵ بوونە بە خەم و پەژارەیی کاروباری دونیاوە.

وە یەکێك لە واتاکانی فەرموودەی خودای گەورە:

﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا﴾ (الفرقان/٦٢) **:** خودا ئەو خودایە، کە شەوو ڕۆژی کردووە بە پاشکۆی یەکتر و، هەرکامیان بەدوای ئەویاندا دێت، ئەمەی بۆ هەرکەسێکە بیەوێت پەند وەربگرێت ، یان سوپاسی لوطفی خودا بکات. واتە: یەکێکیان جێگەی ئەویان دەگرێتەوە لە گەورەییدا، وە دووهەمیش: ئەوەیە کە شوێنی دەگرێتەوە، ئەگەر خێرێکی لە یەکێکیاندا لەدەستچوو، لەویاندا دەیکاتەوە و، تایەڵێت لە کیسی بچێت.[(١)] ،

(١) رواه ابن جرير الطبري في تفسيره(١١/١٩)(٣٩) عن عمر وابن عباس والحسن رضي الله عنهم.

## ویردی چوارەم:

### لە نێوانی لادانی خۆر تا کاتی لێبوونەوەی لە نوێژی نیوەڕۆو سوننەت و ڕاتیبەکانی:

ئەمەیش کورتترین ویردی ڕۆژە، وە لە هەموویشیان گەورەترە، جا ئەگەر پێش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان دەستنوێژی گرتبوو، وە ئامادەبوو لە ناو مزگەوتدا، ئەوە هەر کە خۆر لایدا وە بانگوێژ بانگیدا، با پەلەنەکات تا وەڵامی بانگدەر دەداتەوە.

لە پاشان با هەستێت و نێوانی بانگ و قامەت بە زیکری تایبەت زیندووبکاتەوە، ئەمە وەختی ئەو دەرخستنەیە کە خودا فەرمووییەتی:

﴿وَحِينَ تُظْهِرُونَ﴾ (الروم/١٨) [١].

با لەم کاتەدا چوار ڕکات نوێژی سوننەت بەسەر یەکەوە بکات بەیەك سەلامدانەوە، وە تەنها ئەم نوێژەیە کە پێمان گەیشتووە لە نێوانی هەموو نوێژەکانی دیکەدا کە بەیەك سەلامدانەوە دەکرێت[٢]

بەڵام ئەم ڕیوایەتەیش ڕوبەڕووی ڕەخنە بووەتەوە، وەك هەندێك لە زاناکان فەرموویانە، وە بە پێی پەیڕەوی ئیمامی شافیعی (خودای لێ ڕازی بێت) پێویستە وەك هەموو سوننەتەکانی دیکە بە دوو سەلامدانەوە و دووڕکات دووڕکات بیانکات، وە ئەم ڕیوایەتەش جێگیرو درووستە[٣]، با ئەم چوار ڕکاتەیش درێژ

---

(١) قوت القلوب١/١٦_١٧).

(٢) روى ذلك أبو داوود (١٢٧٠)، والترمذي(٤٧٨)، تعليقا، وابن ماجه(١١٥٧).

(٣) إشارة إلى حديث أبي داوود(١٢٩٥)، والترمذي (٥٩٧) والنسائي(٣/٢٢٧)، وابن ماجه(١٣٢٢)، صلاة الليل والنهار مثنى مثنى، أو مطلق الخبر الذي رواه البخاري (٤٧٢) ومسلم(٧٤٩) مرفوعا: صلاة الليل مثنى مثنى.

بكاتەوە، چونكە كاتی كردنەوەی دەرگاكـــانی ئاسمـــانە بەڕەحمـــەت، وەك فەرموودەمان لەمبارەیەوە هێنایەوە لە باسی نوێژی خۆبەخشیدا[١]

با سوورەتی (البقرة) بخوێنێت، یان دوو سوورەتی صەد ئایەتەكان، یان چوار سوورەت لەوانەی زۆر دەخوێنرێنەوە و دووپات دەكرێنەوە، با درێژیان بكاتەوە.

ئەمە ئەو ساتەیە كە نزای تێدا گیرا دەبێت.

وە پێغەمبەر ﷺ پێیخۆش بوو كردەوەی چاكەی تێدا بكات و چاكەكەی بۆ بەرز بێتەوە[٢]،

لە پاشان نوێژی نیوەڕۆ بە جەماعەت بكات، لە دوای چوار ڕكات كە بە درێژی بیانكات، بۆ ئەو ڕۆژانەی كە درێژن، یان بە كورتی بۆ ڕۆژە كورتەكان وەك باسمانكرد، وە هەرگیز ناگونجێت بەیەكجاری نەیانكات.

لەپاش نوێژی نیوەڕۆ دووڕكات سوننەت بكات، وە لەپاشداچوار ڕكات، وەك عەبدوڵلای كوڕی مەسعود دەفەرموێت:

دوای فەرزەكە یەكسەر چوار ڕكات نوێژی سوننەتی بە دوادا بكات[٣]،

وە لەم نوێژە سوننەتانەدا وا چاكە (آيَةَ الكُرسِي) و كۆتایی سوورەتی (البقرة) بخوێنێت، وە هەمان ئەو ئایەتانەی لە ویردی یەكەمدا باسمانكردن بیانخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی كۆی هەموو زیكرو دوعاو خوێندنەوەی قورئان و صەڵەوات و تەسبیحاتی تێدابێت، لە گەڵ شەرەف و ڕێزی ئەو كاتە پیرۆزە.

---

(١) واتە نوێژی سوننەتی ڕەها كە نەبەسرابێتەوە بە كات و مەبەستێكەوە، رواه الترمذي (٤٧٨) عن عبدالله بن السائب (رضي الله عنه) وقال: وفي الباب عن علي وأبي أيوب، وهو عن أبي أيوب عند أحمد في مسنده(٥/٤١٦).

(٢) نفس المصدر السابق.

(٣) قوت القلوب١/٣١.

## ویردی پێنجەم:

### لە دوای ئەم سوننەت و دوعایانەوە تا کاتی عەسر:

وا باشە کە لە مزگەوتدا بمێنێتەوە بە نیەتی (ئیعتیکاف)، خەریکی زیکر و نوێژ و جۆرەکانی خێرو چاکە بێت، وە لە چاوەنواڕی نوێژدا دەبێت بە نیەتی مانەوە لە مزگەوتدا، چونکە یەکێك لە کارە خێردارەکان چاوەنواڕی نوێژە لە دوای نوێژ، ئەمەش سوننەتی پێشینان بووە، یەکێکیان کە لە نێوانی نوێژی نیوەڕۆو عەسردا دەهاتە ناو مزگەوتەوە گوێی بە دەنگی ئەهلی مزگەوتەوە بوو. وەك پوورەی هەنگ دەنگیان دەهات و قورئانیان دەخوێند، جا ئەگەر زانی کە ماڵەوە بۆ ئەو چاکترە کە تووشی ڕیاو خۆ دەرخستن نابێت ، با بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو عیبادەت بکات.

لەم کاتەیشدا کە خەڵکی تیایدا بێئاگان ، ئەو ویردانە زیندوو بکاتەوە، وەك زیندوو کردنەوەی ویردی سێیەمە لە گەورەییدا، وە هەرکەسێك پێش زەوال نوستبێت، لەم کاتەدا کەراهەتی هەیە بخەوێت، چونکە کارێکی ناپەسەندە لە ڕۆژدا دووجار بنوێت، وەك هەندێك لە پەندیاران فەرموویانە:

سێ شت هەیە خودا لەسەریان تووڕە دەبێت: پێکەنین بە بێ هۆکار، وە خواردن بەبێبرسی بوون، وە نوستن بە ڕۆژدا، بێ ئەوەی شەو بێداربووبێت[1] ،

**سنووری نوستن:** شەووڕۆژ بیست و چوار سەعاتە، نوستنی هەشت کاژێر بۆ هەموو شەوو ڕۆژەکە ئەندازەیەکی ئاساییە، ئەگەر ئەو ئەندازەیە بەشەودا نووست، ئیتر هیچ واتایەکی نامێنێت بە ڕۆژیشدا بنوێت، وە ئەگەر هەندێکی کەمتربوو، ئەوا با بەڕۆژ تەواوی بکات، ئەوەندە بەسە ئادەمییەك شەست ساڵ تەمەنی بێت و بیست ساڵی بەخەو بە فیڕۆ لەدەستی داوە، کەواتە ئەگەر هەشت کاژێر بخەوێت، کە سێیەکی ڕۆژەکەیە، واتە: سێ یەکی تەمەنی نوستووە، بەڵام ئەوەندە هەیە، وەك چۆن خۆراك بژێوی ژیانی مرۆڤە،

---

(١) قوت القلوب١/١٧، وبمعناه رواه الطبري في الكبير(١٠/٣١٨).

بەهەمان شێوە نوستنیش خۆراکی ڕۆحییەو پێویستیەکی گرنگە بۆ ژیان، هەروەها وەك چۆن زانست و زیکرکردن خواردنی دڵەو بەو هۆیە دڵ لە جۆشدا دەبێت، کە ناتوانێت ئەو غیزای لێبگرێتەوە[1]، وە ئەندازەی پێویستیش ئەوەندەیە کە باسمان کرد، وە لێکەمکردنەوەیشی دەبێتە هۆی تێکدانی لێدانی دڵ، وە تێکچوونی جەستەی مرۆڤ، مەگەر کەسێك وردە وردە خۆی لەسەر نەخەوتن ڕاهێنابێت، کەوای لێ دێت دەتوانێت نەشخەوێت و تووشی ئاڵوزی و تێکشکاندنی جەستەیش نەبێت. ئەم ویردەیش لە ویردە درێژەکانە، وە چێژیشی لە هەموویان زیاترە، یەکێکە لەو کاتە ئێوارانەی کە لەقورئاندا هێمای بۆ کراوە، وەك دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَظِلَالُهُمْ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ﴾ (الرعد/١٥) واتە:

حەزبکەن و حەزنەکەن ئەوەی وا لە ئاسمانەکان و لە زەویدا خۆیان و سێبەرەکانیشیان ئێواران و سبینان هەر بۆ خودا سوجدە دەبەن، وە کاتێکیش شتە بێگیانەکانیش سوجدە بۆ خودا ببەن، چۆن دەبێت بەندەیەکی ئاقڵ و تێگەیشتوو خۆی لە زیکرو جۆرەکانی عیبادەت غافڵ و بێ ئاگا بکات؟!

## ویردی شەشەم: کە وەختی نوێژی عەسر هاتە پێشەوە، کاتی ویردی شەشەمیش دێتە پێشەوە:

ئەو ویردەیە کە خودای گەورە سوێندی پێ خواردووە، وەك فەرموویەتی:

﴿والعصر﴾سوێند بە ئێواران، ئەمە یەکێکە لە واتای ئایەتەکە، کە مەبەست لە وشەی (**الآصال**) لەیەکێك لەو دوو تەفسیرەیدا، هەر ئەوەیە کە وتمان، هەروەها وشەی عەشی، لە فەرموودەی (وَعَشِيًّا)، یان فەرموودەی خودا:﴿بِالْعَشِيِّ وَالْإِشْرَاقِ﴾(ص/١٨)واتە: لە کاتی عیشاو لە کاتی خۆرهەڵاتندا.

---

(١) رواه أحمد في الزهد(١٠٢٢)، وأبو نعيم في الحلية(٢٣٧/١) من قول معاذ (رضي الله عنه).

وه لەم ویردەدا هیچ نوێژێکی تێدا نیە جگە لە چوار ڕکات نەبێت، لەنێوانی بانگ و قامەتدا، وەك لە نوێژی نیوەڕۆدا باسمان کرد، لە پاشان نوێژە فەرزەکەی دەکات و، خۆی خەریك دەکات بە چواربەشە باسکراوەکەوە، لە ویردە یەکەمەکە، تا ئەو کاتە خۆر بەرز دەبێتەوە تا سەری دیوارەکان، وە زەردو لاواز دەبێت، واتە: بەرەو ئاوابوون دەچێت، باشتر وایە کەمادەم ڕێگەی نوێژ کردنی نیە، خەریکی خوێندنەوەی قورئان بێت، بە تێگەیشتن و بیر لێکردنەوەوە، چونکە لێرەدا واتای زیکرو نزاو بیرکردنەوە کۆدەبێتەوە، زۆرترینی مەبەستەکانی سێ بەشەکە لەم بەشەدا جێگەیان دەبێتەوە.

## ویردی حەوتەم: ئەگەر خۆر بە زەردبوویی دەرکەوت:

بەوەی کە لە زەوییەوە نزیك ببێتەوە، وای لێبێت نوورەکەی کزببێت و تەپ و تۆزو غوبارو هەڵمی سەر زەوی دایبپۆشێت، کە لە سەر زەوی بەرز دەبنەوە و ڕەنگی خۆرەکە زەردواش دەبێت، وەختی ئەم ویردە دێتە پێشەوە، ئەمەیش وەك ویردی یەکەم، کە لە هەڵاتنی گزنگی بەرەبەیانەوەیە تا خۆرکەوتن، چونکە ئەوەیش پێش خۆرنشین، وەك چۆن ئەویان پێش خۆر هەڵاتنە، ئەمەیش مەبەستی ئەو ئایەتەیەکە دەفەرموێت:

﴿ فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ﴾ (الروم/١٧) پاك و بێگەردی بۆ خودا، لەو کاتانەدا کە ئێوارانتان لێ دێت و، لە کاتی بەیانیانیشدا، کە ئەمەش چمکی دووهەمە لە فەرموودەی خودا: ﴿وَأَطْرَافَ النَّهَارِ﴾(طه/١٣٠)

(پێشەوا)حەسەنی بەصری فەرموویەتی: زیاتر کاتی عیشایان بە گرنگ و گەورەدەژمارد لەوەی کە بایەخ و ڕێزیان لە بەیانیان گرتبێت[١]،

وە هەندێك لە زانایانی سەلەف فەرموویانە: کاتی خۆی سەرەتای ڕۆژبان

---

(١) قوت القلوب١/١٨.

بۆ دونیا دادەناو، کۆتاییەکەیشی بۆ کاری قیامەت[1]،

لەم کاتەدا واباشە خەریکی تەسبیحات و، بە تایبەتی داوای لێخۆشبوون لە خودا بکات، وە ئەوانی دیکەیش کە لە ویردی یەکەم باسمان کردن، وەك ئەوەی تەوبە بکات و، داوای لێخۆشبوون و تەسبیحاتی خودا بەم شێوە بکات و بڵێت: **أَستَغفِرُ اللهَ الذي لاَ إِلَه إلاَّ هُوَ الحَيُّ القَيُّومَ، وأَسأَلُهُ التَّوبةَ، وسُبحانَ اللهِ العَظيمِ وبِحَمدِهِ**، کە وەرگیراوە لە و ئایەتە پیرۆزە :

**﴿وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ﴾** (غافر/٥٥)

واتە: داوای لێخۆش بوونی گوناهەکانت لە خودا بکە، وە لە بەرەبەیان و ئێوارانـدا تەسبیحات و سوپاسی خودای خۆت بکە .

وە باشتر وایە داوای لێخۆش بوونیش بە ناوەکانی خودابکات کە لە قورئاندا هاتووە، وەك ئەوەی بڵێت:

داوای لێبوردن دەکەم لە خودا چونکە لێبوردەیە، یان تەوبەم لێ وەردەگرێت، یان لە هەموان بەڕەحم و بەسۆز ترە، وە لە هەموان لێبوردەترە:

**(أَستَغْفِرُاللهَ إنَّه كَانَ غَفَّاراً، أَستَغْفِرُاللهَ إنَّه كانَ تَوَّاباً، ربِّ اغْفِرْ وارحَمْ وأنتَ خيرُ الرَّاحِمِينَ، فاغفر لنا وارحَمْنا وأنتَ خَيرُ الرَّاحِمِينَ، فأغفِرْ لَنَا وارْحَمْنا وأنتَ خَيرُ الغافِرِينَ)**.

وە کارێکی باش دەکات ئەگەر لە دوای نوێژی ئێوارەو خۆرئاوابوون سوورەتی **(والشَّمْسِ وضُحَاهَا)** و **(واللَّيلِ إذَا يَغشَى)** و هەردوو **(قُلْ أَعُوذُ)**ووەکان بخوێنێت، وە کاتێك خۆری لەسەر ئاوادەبێت، دەمی بە **(أستغفر الله)** وە بێت.

ئەگەر گوێبیستی بانگ بوو دەڵێت: خودایە ئەوە هاتنەپێشەوەی شەوی تۆیە، وە پشت هەڵکردنی ڕۆژەکەی تۆیە، ئەمەش دەنگی نزاکانە لە حزوورتدا،بەم شێوە دوعاکان دەکات، وە وەڵامی بانگیش دەداتەوە، لە پاشان دەستدەکات

---

(١) هەمان سەرچاوە.

به نوێژی ئێواره، وه بەخۆرئاوابوونیش کۆتایی به ویردەکانی ڕۆژ دێت. پێویسته سەرنجی حاڵی خۆی بدات ولێپرسینەوه له گەڵ خۆیدا بکات، ئەوا قۆناغێکی ژیانی ئەو ڕۆژەی به کۆتا هات، ئایا وەك دوێنێ وابوو که زەرەرمەند بێت، یان خراپتر بوو که نەفرەت لێکراو بێت، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((لاَ بُورِكَ فِي يَومٍ لاَ أَزدَادُ فيهِ خَيراً))[1]، پیرۆز نەبێت ئەو ڕۆژەی کردەوەی خێری زیاتری تێدا نەکەم.

ئەگەر هەستی به خۆی کرد که تەواوی ڕۆژەکه ڕووی له خێربوو به ناسۆرەکانی دڵشاد بوو، ئەوه جێگەی مژدەیه بۆی، با سوپاسی خودا بکات که ڕێنمایی کردووەو، لەسەر ڕێگەی ڕاست ڕاگیری کردووه.

وه ئەگەر بزانێت کاره باشەکانی له پاشەکشەدایه، ئەوا هێشتا کاتی شەوی له پێشدا ماوه،با لێببڕێت ئەوەی له کیسی چووه وەدەستی بهێنێتەوه، که دەزانێت ئەو چاکانه بیکات خراپەکانی دەسڕێتەوه، با سوپاسی خودا بکات که لاشەیەکی تەندروست و سەلامەتی هەیه، وه پاشماوەیەکی تەمەنی ماوه، له سەرەتای ئەو شەوەوه که لەبەردەمیدایه، بۆ ئەوەی کەموکورتیەکانی خۆی پڕ بکاتەوه.

وەدەبێت ئەو ڕاستییه له دڵی خۆیدا بچەسپێنێت، وه بڕوای خۆی دابمەزرێنێت، که ڕۆژی تەمەنی خۆی ئاوادەبێت و، ڕۆژێك دێت خۆری ژیانی لەسەر بنیشێت و، جارێکی دیکەیش ئەو ڕۆژەی بۆ هەڵنایەتەوه.

ئیتر هەرگیز دەرگای پاشگەزبوونەوەو پۆزش و تەوبەکردنی لەسەر ناکرێتەوه، تەمەنیش تەنها چەند ڕۆژێکی ژیانەو به کۆتا هاتنی ڕۆژه تاکەکانی هەموویشی کۆتایی دێت .

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية( ١٨٨/٨)،وابن عبدالبر في جامع بيان العلم وفضله (١١٠٨) واللفظ له، ولفظه هناك (علما) بدل (خيرا) ولفظه هنا رواه الأزدي في (أوهام الحاكم)ص/٥١.

# باس و ڕوونکردنەوەی ویردەکانی شەو

## کە بریتییە لە پێنج ویرد:

## ویردی یەکەم: کاتێك خۆرئاوا دەبێت و نوێژی ئێوارەی

### کرد خەریکی زیندوکردنەوەی نێوانی ئێوارە و عیشا دەبێت:

کۆتایی ئەم ویردە ئەو کاتەیە کە سوورایی کەناری ئاسمان بەتەواوی نامێنێت، واتە لاچوونی ئەو سوورایییەی کە بە نەمانی کاتی نوێژی عیشا دێتە پێشەوە، کە خودای گەورە سوێندی پێ خواردووە و فەرموویەتی:

﴿فَلَا أُقْسِمُ بِالشَّفَقِ﴾ (الإنشقاق/١٦) واتە : سوێند بێت بەو کاتەی لە نێوانی مەغریب و عیشا دایە، کە نوێژ کردن تێیدا ئەو سەرەتای شەوە دەگرێتەوە، کە لە قورئاندا ستایشی کراوە، چونکە دەستپێکی ساتەکانی شەوە، واتە:

کاتێکە لەو کاتانەی کە قورئان باسی کردووە و دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آنَاءِ اللَّيْلِ فَسَبِّحْ﴾ (طه/١٣٠)،کە بریتییە لە نوێژی (الأوابین) لە کاتە تایبەتەکانی شەو دا ئەنجامیان دەدات، وە هەڵدەستنەوەو جێگەی خەوتنیان بە جێ دەهێڵن و، دەستبە شەو نوێژو بەندایەتی دەکەن، ئەمەیش مەبەستی ئەم ئایەتەیە کەخودای گەورە فەرموویەتی: ﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ﴾ (السجدة/١٦)

کە حەسەنی بەصری(خوای لێ ڕازی بێت) بەم شێوەیە دیگێڕێتەوەو کوڕی (ئیبنو زیاد) دەیداتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ کە پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئەم فەرموودەیە: ((الصَّلَاةُ بينَ العِشاءَينِ)) دیسانەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((عَلَيكُم بالصَّلاةِ بينَ العِشاءَينِ، فَإِنَّها تَذهَبُ بِمُلاغاتِ النَّهارِ، وتُهَذِّبُ آخِرَهُ))[1]،

---

(١)قال العراقي: نسبه المصنف هذا إلي ابن أبي الزناد معترض إنما هو اسماعيل بن أبي زياد رواه أبو منصور الديلمي في مسند الفردوس(١٨/٣)(٣٠٢٩) من رواية اسماعيل بن أبي زياد

واته: پێویسته لەسەرتان که له نێوانی نوێژی مەغریب و عیشادا نوێژه سوننەتەکان بکەن، چونکه کردەوه پوچ و گەمەو گاڵتەکانی ڕۆژتان لا دەبات، وه کۆتاییەکەیشی پوخت و پاڵفته دەکاتەوه، کاتەکانی که بۆ هوودە بەسەرتان بردووه، لەسەرتان لادەبات.

وه پرسیار کرا له ئەنەسی کوڕی مالیك(خودای لێ ڕازی بێت)دەربارەی کەسێك له نێوانی مەغریب و عیشادا بنوێت، فەرمووی: کاری وا مەکە، ئەوه ئەو ساته وەختەیه که ئایەتەکەی قورئان مەبەستیەتی که دەفەرموێت:

تەنیشتیان بەرزدەکەنەوه و لەسەر جێگاکانیان هەڵدەستن:

﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ﴾ (السجدة/١٦)[١]، وه له دەروازەی دووهەمدا به درێژی باسی زیندوکردنەوەی ئەو ماوەی نێوانی ئێوارەو عیشایه دەکەین.

**وه ڕێکخستنی ئەم ویردە بەم شێوەیە:**

**له دوای مەغریب، لەسەرەتاوه دووڕکات نوێژی سوننەت بکات، سوورەتەکانی ﴿ قل یا أیها الکافرون﴾ و ﴿قل هو الله أحد﴾یان تێدا بخوێنێت، یەکسەر دوای فەرزەکەبیانکات، بۆ ئەوەی قسەو کارێکی بکەوێته بەینەوه، له پاشان**

---

الشامي عن الأعمش حدثنا أبو العلاء العنبري عن سلمان قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: **عليكم بالصلاة بين العشاءين، فإنها تذهب بملاغاة النهار ومهذبة آخره**، واسماعيل هذا متروك يضع الحديث، قاله الدارقطني في سؤالات البرقاني ﷺ(١٣/١)(٤) واسم أبي زياد: مسلم، وقد اختلف فيه على الأعمش أهـ ولابن رادوية من حديث أنس، أنها نزلت في الصلاة بين المغرب و العشاء ، والحديث عند الترمذي(٣١٩٦) وحسَّنه، بلفظ: **نزلت في إنتظار الصلاة التي تدعى العتمة**. قال الزبيدي(١٥١/٥): هو في كتاب الديلمي ومهذبة آخره ، وقد ذكر الذهبي إسماعيل هذا في ديوان الضعفاء(٨٢/١)(٦٦٢) وأنه روي عن أبي عون، وأنه كان ممن يضع الحديث، ونقله عن الدراقطني وذكر اسماعيل بن أبي زياد آخر ويعرف بالشقري، قال ابن معين وهو كذاب،ولكن المراد هو الأول المعروف الشامي. وانظر القوت (١٩/١)، وفيض القدير ٣٤٤/٤.

(١) قوت القلوب( ١٩/١) وقريب منه ما روي عنه في التعليق السابق.

چوار ڕکات نوێژی سوننەت بکات، ئەمەیان درێژ بکاتەوە، لە پاشان بەردەوام نوێژ بکات چەندێکی بۆکرا، تا سوورایی کەناری ئاسمان نامێنێت.

وە ئەگەر مزگەوتەکە نزیکی ماڵەوەیان بوو، ئاساییە ئەگەر ئەو نوێژانە لە ماڵەوە بیانکات، ئەگەر نیەتی ئیعتیکاف و مانەوەی لە مزگەوتدا نەهێنابێت، بەڵام ئەگەر مانەوەی مەبەست بێت و چاوەنواڕی نوێژی عیشا بکات، ئەوە خێری زیاترە، ئەگەر ترسی ئەوەی نەبێت تووشی ڕیاو خۆدەرخستن ببێت.

## ویردی دووهەم: لە هاتنەپێشەوەی کاتی عیشاوە دەست پێدەکات، تا کاتی نوستن:

ئەمەیش سەرەتای بتەوبوونی تاریکایی شەوە، خودای گەورە سوێندی پێ خواردووە کە فەرموویەتی: ﴿وَاللَّيْلِ وَمَا وَسَقَ﴾(الإنشقاق/١٧) واتە: سوێند بەشەو کە تاریکاییەکەی کۆدەکاتەوە، هەروەها فەرموودەی خودا: ﴿إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ﴾ (الإسراء/٧٨) واتە: تا ئەو کاتەی تاریکاییەکەی زۆر بەهێز دەبێت.

**وە ڕێکخستنی ئەم ویردە: بە لەبەرچاوگرتنی سێ مەرج دەبێت:**

**یەکەم:** دەبێت جگە لە نوێژی خەوتنان دە ڕکات نوێژ بکات، چواریان پێش دەستپێکردنی فەرزەکەیە، بۆ زیندووکردنەوەی ئەو ماوەیە، لە نێوانی قامەت و بانگداندا، وە شەشڕکاتیش لە دوای فەرزەکەوەیە، دووڕکات بە جیاو چوار ڕکاتی تریش دوای ئەو، وە ئایەتە تایبەتیەکانی تێدا دەخوێنێت، وەك کۆتایی (البقرة) و **(آية الكرسي)** و، سەرەتای سوورەتی (الحديد) و، کۆتایی سوورەتی (الحشر) و ئەوانی تر.

**دووهەم:** دەبێت سیازدە ڕکات نوێژ بخوێنێت و کۆتاییەکەیان بە تاك بێت، ئەم ژمارەیە زۆرترینی ئەو ئەندازەیە کە دەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە کردوونی[1]

---

(١) رواه أبو داوود،(١٣٦٢)عن عائشه (رضيَ الله عنها) **(ولم يكن يوتر بأنقص من سبع، ولا**

کەسانی داناو ژیر لەسەرەتای شەووە ژاکی لێهەڵدەماڵن، بەهێزەکانیش کە دەتوانن لەخەوهەڵبستن دەیخەنە کۆتایی شەووە، وەکەسێك خاوەنی ئیرادە یەکی بەهێز بێت،باشترو وایە کە هەر لەسەرەتاوە خۆی بۆ تەرخان بکات، چونکە لەوانەیە بەئاگانەیەتەوە، یان زۆر بەقورسی و گرانی هەستێتەوە، مەگەر خووی پێوە گرتبێت، ئەوە دواخستنی ئەو نوێژو هەستانەیە خێری زیاتر دەبێت بۆی.(١)

لەپاشان با لەم نوێژانەدا، ئەندازەی سێصەد ئایەت بخوێنێت، لە سوورەتە تایبەتەکان، کە پێغەمبەر ﷺ زیاتر دەیخوێندن، وەك (یس) و سورەتی (لقمان)و[٢]،سوورەتی(الدخان)و (الملك) و (الزومر) و (الواقعة).

خۆ ئەگەر نوێژیشی نەکرد؛ با واز لە خوێندنەوەی ئەم سوورەتانە نەهێنێت، یان هیچ نەبێت هەندێکیان بخوێنێت، بەڕاستی لە سێ فەرموودەدا ڕیوایەت کراوە، کە پێغەمبەر ﷺ هەموو شەوێك سوورەتە بەناوبانگەکانیانی دەخوێند، (سەجدە) و (تبَارَكَ المُلك) و [٣]، (الزمر) و (الواقعة)،[٤].وە لە ڕیوایەتێکی دیکەدا سوورەتەکانی (زوممەر) و (بني إسرائيل)(الزمر والإسراء).[٥]

---

**بأكثر من ثلاث عشرة**).

(١) روى أبو داوود (١٤٣٤) أن النبي ﷺ **قال لأبي بكر (رضي الله عنه) متى توتر؟ قال: أوتر من أول الليل، وقال لعمر (رضي الله عنه) متى توتر؟ قال: آخر الليل، فقال لأبي بكر: أخذ هذا بالحزم، وقال لعمر: أخذ هذا بالقوة؟**

(٢) واته سوورەتی (سەجدە) بنوارە: بصائر ذوي التمييز(٣٧٣/١).

(٣) روى الترمذي (٣٤٠٤) عن جابر (رضي الله عنه) قال: **كان النبي ﷺ لاينام حتى يقرأ تنزيل السجدة، وتبارك.**

(٤)فعن ابن مسعود رضي الله عنه رفعه: **من قرأ سورة الواقعة في كل ليلة، لم يصبه فاقة أبدا**، رواه الحارث بن أبي أسامة ٧٢٩/٢( ٧٢١) والبيهقي وابن عساكر . وعن ابن عباس مرفوعاً: **من قرأ كل ليلة إذاوقعت الواقعة لم يصبه فقر أبدا** رواه ابن عساكر

(٥) روى الترمذي (٣٤٠٥) ،عن عائشة (رضي الله عنها) قال: **كان النبي ﷺ لاينام حتى يقرأ**

وه له ڕیوایەتێکی تردا ، پێغەمبەر ﷺ هەموو شەوێك سوورەتە تەسبیح تیا کراوەکانی دەخوێند، (کە ئەم پێنج سوورەتەن: **الحدید و الحشر و الصف و الجمعة و التغابن**)، وە دەیفەرموو:

ئایەتێکیان تێدایە، خێردارترە لە هەزار ئایەت، [1]، زاناکان کردبوویان بەشەش سوورەت، سورەتی﴿**سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى**﴾شیان دەخوێند، چونکە لە فەرموودەدا هاتووە، کە پێغەمبەر ﷺ سوورەتی ﴿**سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى**﴾ی پێ خۆش بووە [2]، وە هەروەها لە سێ ڕکاتی وەتردا ئەم سێ سوورەتەی دەخوێند:

﴿**سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى**﴾ وە ﴿**قل یا أیها الکافرون**﴾ و (**الإخلاص**) ئیخلاص، وەکاتێك نوێژی وەتری تەواوکرد سێ جار دەیفەرموو: (**سُبحانَ المَلِكِ القُدُّوس**) پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خودایە کە خاوەنی هەموو شتێکەو، پاك و بێ گەردە لەهەموو کەموکورتییەك[3].

## سێیەم: نوێژی وەترە: با پێش ئەوەی بنوێت، بە تاکە ڕکاتێکی وەتر

**کۆتایی** بە نوێژەکانی بهێنێت، ئەگەر نەریت وخوی وانەبێت کە شەو نوێژ بکات، ئەبوهورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: (( **أوْصَاني خَليلي ﷺ ألاَّ أنامَ إلاَّ علَى وَترٍ**))[4] ،خۆشەویستی هەمیشە لەیادم ئامۆژگاری کردووم کە نەخەوم هەتا کۆتانوێژی وەتر دەخوێنم .

بەڵام ئەگەر خوو نەریتی وابوو کە هەڵدەستایەوە بۆ شەونوێژ، ئەوە

---

**الزمر و بني إسرائیل، وسورة بني إسرائیل هي سورة الإسراء.**

(١) رواه أبو داوود(٥٠٥٧)، والترمذي (٢٩٢١)،وقال: حسن. والنسائي في الكبرى(٧٩٧٢). و (١٧٩/٦)(١٠٥٥٠) من حديث عرباض بن ساريه.

(٢) رواه أحمد في المسند(٩٦/١).

(٣) رواه أبوداوود (١٤٢٣)، والنسائي( ٢٤٤/٣)، واللفظ عنده . وابن ماجه(١١٧١).

(٤) رواه البخاري (١٩٨١)، ومسلم (٧٢١).

باشتروایه وەترەکەیشی دوا بخات بۆ دوای شەو نوێژەکەی،وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((صَلاةُ اللَّيلِ مَثنَى مَثنَى، فَإذا خِفتَ الصُّبحَ فأَوتِرْ بِرَكعَةٍ))[1]،واتە: شێوازی شەونوێژ با دووڕکات دووڕکات بکرێت و سەلامیان تێدا بدەرەوە، ئەگەر ترسایت کە بەیانی هاتبێتە پێشەوە، بەیەك ڕکاتی وەتر کۆتایی پێ بهێنە.

(حەزرەتی)عائیشە(خودای لێ ڕازی بێت)فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای شەویشەوە و لە ناوەڕاستیشەوە و لە کۆتاییەکەیشی کۆتایی هێناوە بەیەك ڕکات وەتر،کاتی وابووە وەترەکەی تا نزیکی بەرەبەیان درێژەی کێشاوە[2]

هەروەها (حەزرەتی) عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

نوێژی وەتر بە سێ شێوە دەکرێت: دەتوانیت لە سەرەتای شەوەوە ڕکاتێك نوێژ بکەیت و، لە پاشان دووڕکاتی سوننەتیش بکەیت، بەوەی کە ڕابردووە دەبێتە وەتر، وە دەشتوانیت ڕکاتێك وەتر بخوێنیت و، کە لە خەویش هەستایت، ڕکاتێکی تر بخوێنیت، ئەو کاتە جووت دەبێتەوە، وە لە کۆتایی شەونوێژەکانتدا دوارکاتیش بە وەتر کۆتایی بە نوێژەکانت دەهێنیت، وە دەشتوانیش هەرلەسەرەتاوە وەتر نەخوێنیت تا کۆتایی شەو، یەکجار بە ڕکاتێکی وەتر کۆتایی بە نوێژەکانت بهێنیت.[3] ، ئەمەی لێدەگێڕنەوەو، ڕێگەی یەکەم و سێهەم باشترە کە ئەنجام بدرێت. بەڵام ڕێگری کراوە لە هەڵوەشاندنەوەی وەتر، وەك لە ڕیوایەتی دروستدا هاتووە، نابێت هەڵی بوەشێنیتەوە[4].

---

(١) رواه البخاري(٤٧٢)، ومسلم (٧٤٩).

(٢)أوتر رسول الله ﷺ أول الليل ووسطه واخره وانتهى وتره إلى السحر رواه البخاري (٤٧٢) ومسلم (٧٤٥) واللفظ له.

(٣) قوت القلوب١/٣١

(٤) إذا أوترت من اوبه، فلا توتر من آخره، البخاري(٤١٧٦)عن عائذ وقد سئل عن نقض الوتر.

وە بە شێوەیەکی ڕەهایش هاتووە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( **لاَ وِتْرَانِ فِي لَيلَةٍ** ))[1]، واتە لە یەك شەودا دوو وەتر ناکرێت و نا خوێنرێت.

وە ئەگەر کەسێك دوودڵ بوو لەوەی بە ئاگا بێتەوە، هەندێك لە زانایان بەلایانەوە جوان بووە (کارێکی ناسك ئەنجام بدات) کە لە دوای ڕکاتی وەترەکەی، کە دەچێتە سەر جێگاوە بۆ نوستن، بە دانیشتنەو دووڕکات نوێژی تربخوێنێت، کە پێغەمبەر ﷺ خۆی ڕادەکێشا بەرەو جێگای نوستن و، ئەم دوو ڕکاتەی دەخوێند، وە سوورەتەکانی **(الزلزلة)** و **(التَّكاثُر)**ی دەخوێند، چونکە هەڕەشەو بێدارکردنەوەی تێدایە.

وە لە ڕیوایەتێکی دیکەشدا هاتووە کە ﴿**قُل يَاأَيُّها الكَافِرون**﴾ەی خوێندوە، چونکە خۆی بەری دەکات لەوەی هاوبەش بۆ خودا دابنێت، وە شەهادەتی یەکتاپەرستی تێدایە بۆ خودای(عَزَّ وجَلْ) [2]دەڵێن: ئەگەر بەئاگا هاتەوە،ئەو دووڕکاتەی بە دانیشتانەوە کردوونی خێری یەکڕکات نوێژی بە پێوەی هەیە، ئیتر بۆی هەیە لە دوای شەونوێژ لە کۆتاییەکەیدا ڕکاتێکی تر وەتر بخوێنێت، وەك ئەوەی کە ڕابردووەکانی بۆ بووبێت بە جووت، کە نوێژێکی جوان دەبێت تاکێکی تریان بە دوادا بهێنێت، کە ئەبوطالیبی مەککی(خودای لێ ڕازی بێت) ئەم وردەکارییەی بەلاوە جوان بووە و فەرموویەتی: سێ کرداری پەسەندی تێدایە:

ئەوەی کە هیوای بە ژیان ئەوەندە درێژ نیە کە دەمێنێت تا نیوەی شەو، بۆیە هەر لەسەرەتاوە وەترێك دەکات، وە ئەنجامدانی وەترەکەیشی بۆ دەنوسرێت، وە لە کۆتایی شەویشدا وەتری خۆی دەکات[3].

---

(١) رواه أبو داوود (١٤٣٩)، والترمذي(٤٧٠)، والنسائي(٣:٢٢٩).

(٢) ورد قراءة السور الثلاثة معا في الوتر عند أحمد في المسند(٨٩/١) والبيهقي في السنن الكبرى(٣٣/٣) ولم يذكر الزحف إلى الفراش والسياق لصاحب القوت ٢٠/١.

(٣) قوت القلوب٢٠/١.

ئەوەی فەرموویەتی وایە، بەڵام لەوانەیە ئەگەر ئەو دوو ڕکاتەی سەرجێگا بکات، ئەو ترسەیش پەیدا ببێت کە نوێژەکەی دەکات بە دوانە، ئیتر بەئاگا بێتەوە یان نەیەتەوە، وە وەترەکەی یەکەمیشی هەڵدەوەشێتەوە، کەواتە لەو حاڵەتەدا ئەگەر بەئاگابێتەوە، وای بۆ دەژمێررێت کە دوانەی کردووە، بەڵام ئەگەر نووست و خەبەری نەبوویەوە، حیسابی وەتری بۆدەکرێت، ئەمە جۆرە سەرنجێکی لەسەر دەبێت، مەگەر بە دروستی لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەم کردارەی لێ ڕیوایەتکرابێت، کە لە پێشەوە وەترێکی کردبێت و، لە دوای هەستانیشی وەترێکی تری کردبێت. لەم حاڵەتەدا وای لێ تێ دەگەین؛

کە ئەو دووڕکاتەی سەرجێگا کە بە دانیشتنەوە دەیانکات، ئەوە لە وێنەو ڕواڵەتدا بە جووت و دوانە دەژمێررێن، بە لام لە واتا و گەیاندندا بە یەك دانەو بە یەك ڕکاتی وەتر حیساب دەکرێن.

واتە: ئەگەر بەئاگا هاتەوە، وەك ئەوەیە کە وەتری نەکردبێت، وە ئەگەر بە ئاگایش نەهاتەوە؛ وەك ئەوەیە کە وەتری خۆی کردبێت.

لە دوای سەلامدانەوەی نوێژی وەتر واچاکە بڵێت:

**(سُبحانَ الملكِ القُدُّوسِ، ربِّ الملائكةِ والرُّوحِ، جَلَّلْتَ السَّمواتِ والأَرضَ بالعَظَمَةِ والجَبروتِ، وتَعزَّزتَ بالقُدرَة، وقهَرتَ العِبادَ بالمَوتِ)**[1]،

مەبەستی ئەوەیە: پوختی و بێگەردی بۆ مەلیکی پاك و پارێزراو لە هەموو کەمییەك، پەروەردگاری فریشتەکان و جوبرەئیل، ئاسمانەکان و زەویت بە گەورەیی وجەبەرووتی خۆت درەوشـــاندۆتەوە،وە بە تـــواناو دەسەڵاتی خۆت بەهـێزو ڕاگیراوت کردوون،وە بە مراندنیشیان زاڵ دەبیت بەسەر بەندەکانتدا.

وە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ هێشتا وەفاتی نەکردبوو، کە وای لێ هاتبوو زۆربەی نوێژەکانی بە دانیشتنەوە دەکرد جگە لە نوێژە فەرزەکان.[1]،

---

(١) قوت القلوب١/٢٠، والجملة الأولى منه رواها أبوداوود(١٤٣٠) والنسائي(٣/٢٤٤).

واتە: کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ تەمەنی گەورەبوو، وە قورسیش بووبوو، ئیتر زۆربەی نوێژەکانی بە دانیشتنەوە دەکرد، جگە لە فەرزەکان.

وەدەیفەرموو: ((للقَاعدِ نِصفُ أجرِ القَائِم، وللنَّائمِ نِصفُ أجرِ القَاعِدِ))[٢]، واتە: کەسێك بە دانیشتنەوە نوێژ بکات، نیوەی خێری ئەوەی دەستدەکەوێت کە بە پێوە نوێژ دەکات، وە ئەوەش بە پاڵکەوتنەوە بیکات نیوەی خێری نوێژی دانیشتووی بۆ دەژمێررێت، ئەمەش بەڵگەیە، کە نوێژی سوننەت بە پاڵکەوتنەوە لە شێوەی نوستندا دروستە

## ویردی سێیەم: نوستن:

لاري تێدا نیە، کە ئەمە لە ناو ویردەکانی شەو دابنرێت، چونکە ئەگەر ڕەچاوی ئادابەکانی بکرێت، وەك عیبادەت دەژمێررێت، دەگێڕنەوە کە ئەگەر کەسێك بە پاکی و بەدەستنوێژەوە و بەزیکری خودای گەورەوە بنوێت، تا بە ئاگادێتەوە وەك نوێژخوێنێك بۆی دەنوسرێت، وە فریشتەیەك دەچێتە ناو بەرگەکەیەوە، ئەگەر لە کاتی نوستنەکەیدا جوڵایەوە و زیکرێکی خودای (عَزَّ وجَلْ) کرد، ئەوا مەلائیکەکەیش نزای خێری بۆ دەکات و، داوای لێخۆشبوونی لە خودا بۆ دەکات[٣]،

وە لە فەرمووده‌دا هاتووە: ئەگەر بەندە لەسەر پاك و خاوێنی نوست، ڕۆحەکەی بەرز دەکرێتەوە بۆ عەرشی خودا(٤)

---

(١) رواه البخاري(٥٩٠) ومسلم(٧٣٢) ولفظه لعائشة (رضي الله عنها) (لمَّا بَدَّنَ رسول اللهِ ﷺ وثَقلَ، كانَ أكثَرُ صَلاتهِ جالِساً).دیارە مەبەست زیاتر ئەو کاتەیە کە نەخۆش کەوت و توانای کەم بوبوویەوە.

(٢) رواه البخاري (١١١٥).

(٣) رواه إبن مبارك في الزهد( ١٢٤٤) وابن حبان في صحيحه (١٠٥١).

(٤) رواه ابن مبارك في الزهد(١٢٤٥) موقوفا على أبى الدرداء (رضي الله عنه) ولفظه:

ئەمەی باسمان کرد بە نیسبەت ڕۆحی تێکڕای خەڵکە بڕوادارەکەیە، ئەی دەبێت حاڵی ئەوانە چۆن بێت کە عابیدە تایبەتمەندەکانن، یان زاناو خاوەن دڵە زیندووە صەفادراوەکانن؟

دیارە ئەوانە لە نوستنەکەیشیاندا نهێنی زۆریان بۆ ئاشکرا دەکرێت، بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (( **نَومُ العالِمِ عِبادَةٌ ، ونَفَسُهُ تَسبيحٌ**))[1]،

نوستی زانای خوداناس بە عیبادەت بۆی دەنوسرێت، وە هەناسەکانیشی بە تەسبیحات.

هەروەها معازی کوڕی جەبەل بە ئەبوموسای ئەشعەری پرسی: (خودای لێیان ڕازی بێت) : بۆ هەستانەوەی شەو بۆ عیبادەت چی دەکەییت؟

فەرمووی: شەو هەمووی هەڵدەستم، هیچ کاتێکی بەخەو نابەمەسەر، وە هەتا تێرو ئاواشتە دەبم قورئانی تێدا دەخوێنم، بەردەوام دەبم و لێی جودا نابمەوە، کات لەدوای کات و یەك لەدوای یەك، [2]،

معاز فەرمووی: بەڵام من دەنووم و، چاوەنواڕی پاداشتیشم لە نوستنەکەمدا، وەك چۆن لە هەستاوەمدا چاوەنواڕی دەکەم، ئەم قسەیان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەرﷺ فەرمووی:

(( **معاذٌ أفقَهُ مِنكَ**))[3]، واتە: موعاز لە تۆ زیاتر لە شەرع شارەزایە.

---

**إذا نام الإنسان ..عرج بروحه حتى يوتى به إلى العرش، فإن كان طاهرا، أذن لها بالسجود، وإن كان جنبا لم يؤذن لها بالسجود.**

(١) رواه الديلمي في مسند الفردوس((٦٧٣١)، ويشهد للجملة الأولى ما رواه أبو نعيم في الحلية ٣٨٥/٤) مرفوعاً( **نومٌ على علمٍ خيرٌ مِن صلاةٍ على جهل**).

(٢) فتح الباري ٦٢/٨.

(٣) رواه البخاري(٤٣٤٢) ومسلم(١٨٢٤)، دون قوله: **معاذ أفقه منك**، وروى عبدارزاق في المصنف ٣٥٧/٣) فكأن معاذ بن جبل فضل عليه، وروى أبو إسماعيل الهروي في ذم الكلام وأهله (٤٣٤) (**فكان معاذ أفضل منه**).

# ئادابەکانی نوستن دە دانەن:

## یەکەم: پاك و خاوێنی و سیواك کردن:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( إذا نَامَ العَبدُ علَى طَهَارَةٍ، عُرِجَ بِرُوحِه إِلى العَرشِ، فكانَتْ رُؤيَاهُ صَادِقَةً، وإنْ لَمْ يَنَم عَلَى طَهَارةٍ، قَصرتْ رُوحهُ عن البُلوغِ، فتِلكَ المَنامَاتُ أضْغاثُ أحلاَمٍ لا تَصْدُقُ))[1]،

ئەگەر لەسەر تەهارەت و بەدەستنوێژەوە بنوێت، ڕۆحەکەی بەرزدەکرێتەوە تا عەرش، خەو بینینەکانیشی ڕاست دەردەچێت، بەڵام ئەگەر لەسەر پاکی و بە دەستنوێژەوە نەنوستبوو، ئەوا خەوەکانی پڕوپوچ و خەیاڵ بازیی و هاشەو پاشەیەو، ڕۆحەکەی ناگاتە جێگای مەبەست و، خەوبینینەکانیشی ڕاست دەرناچێت. مەبەست تەهارەت و پاکی ڕواڵەتی و شاراوەکانیشیەتی، کە پاکی شاراوە و باطینی زیاتر کاریگەری هەیە لەسەر ئاشکرابوونی پەردە شاراوەکان.

## دووهەم:

**دەبێ سیواك و هۆکارەکانی پاك و خاوێنی لە تەنیشت سەریدا دابنێت و لێیەوە نزیك بێت**؛ وە نیەتیشی وا بێت، هەر کە خەبەری بوویەوە یەکسەر هەستێت بۆ بەندایەتی، وە هەرجارێك بە ئاگابێتەوە سیواك بکات، هەندێك لە پێشینەکان بەم شێوەیان دەکرد،[2]،

---

(١) رواه الحاكم في المستدرك(٣٩٦/٤)بنحوه، ولفظه عند صاحب القوت، قال العراقي رواه الطبراني في الأوسط(٥٢١٧) من حديث علي: **(ما من عبد ولا أمة ينام فيستثقل نوماً إلا عُرج بروحهِ إلى العرش فالذي لا يستيقظ إلا عند العرش فتلك الرؤيا التي تكذب)** وسنده ضعيف أ هـ قال الزبيدي ( ١٥٨/٥ ): ورواه الحاكم في المستدرك( ٤/ ٤٣٩ ) (٨١٩٩) وصححه وتُعُقِبَ ولفظهُ: **فيمتلئ نوماً فيستثقل**.

(٢) قوت القلوب٣٣/١.

وە دەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە هەموو شەوێك چەند جار لە خەو هەڵبستایە و چەندێکیش بیویستایە بنوێتەوە سیواکی دەکرد، [1].

وە ئەگەر کەسێك لەبەر ماندووبوون و تەمبەڵی بۆی نەدەکرا، لەسەر دەستنوێژو پاکی بنوێت، واباشە مەسحی ئەندامەکانی لەشی بکات بە ئاو، ئەگەر ئاویشی دەس نەدەکەوت، ئەوا با دابنیشێت و ڕوو لە قیبلە بکات و، خۆی خەریك بکات بە زیکر و نزاو، بیرکردنەوە لە تەوانایی و نیعمەتەکانی خودای (عَزَّ وجَلَّ)، ئەوە جێگەی شەو نوێژی بۆ دەگرێتەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((مَنْ أتى فِراشَهُ وهُو يَنوِي أن يقُومَ يُصلِّي مِنَ اللَّيلِ، فغَلَبَتهُ عَينَاهُ حتَّى يُصبِحَ كُتِبَ لَهُ مَا نَوَى، وكَان نَومُه صَدقَةً عليهِ مِنَ اللهِ تعَالى))**[2]، ئەوەی بچێتە سەر جێگای نووستن و، نیەتیشی وابێت کە هەستێتەوە بۆ شەو نوێژ، بەڵام خەو زۆری بۆ هێناو زاڵ بووبەسەر چاوەکانیدا تا بەیانی، ئەوەی نیەتی لێ هێناوە بۆی دەنوسرێت، وە نوستنەکەیشی بەخشینێکی خودایيە پێی داوە.

## سێیەم: ئەوەی وەسێتێکی هەبێت نابێت سەر بنێتەوە و بخەوێت،

تا وەسێتەکەی دەنووسێتەوە، چونکە دڵنیا نیە لەوەی گیانی دەکێشرێت، یان نا، وەك وتوویانە: ئەوەی بەبێ وەسێت کردن بمرێت، لە جیهانی بەرزەخدا

(١) رواه مسلم (٧٦٣).

(٢)قال العراقي رواه النسائي(٢٥٨/٣) وابن ماجه(١٣٤٤) من حديث أبي الدرداء بسند صحيح قال الزبيدي:( ٥ /١٥٨): وكذلك رواه الطبراني في الكبير والحاكم في المستدرك(٤٤٥/١(١١٧٠)والبيهقي في السنن الكبرى(١٥/٣(٤٥٠٠) ورواه ابن حبان في صحيحه أيضا(٣٢٣/٦(٢٥٨٨)،والحاكم والطبراني أيضاً من حديث أبي ذر وأبي الدرداء معاً، وروى أبو نعيم في الحلية( ٣٢٦/٨)من حديث عمر بن الخطاب رضي الله عنه: **من نام عن حزبه، وقد كان يريد أن يقوم به، فإن نومه صدقة تصدق الله بها عليه، وله أجر حزبه.**

ڕێگەی قسەکردنی پێ نادرێت تا ڕۆژی قیامەت، مردووەکان سەری لێدەدەن و قسەی بۆ دەکەن، بەڵام ئەو ناتوانێت وەڵامیان بداتەوە، ئەوان بەیەکتری دەڵێن: ئەم هەژارە بۆیە قسەی بۆ ناکرێت، چونکە بەبێ وەسێت مردووە[1]،

ئەم وەسێت کردنە زۆر باشە، نەوەکو تووشی مردنی لە ناکاودا ببێت، وە مردنی لە ناکاو، کار ئاسانیە بۆ موسوڵمان، مەگەر بۆ یەکێك کە ئامادەباشی مردنی نەبێت، وە باری لەش و پشتی بە گوناهو زوڵم کردن لە خۆی و خەڵکی قورس بێت و، ئامادەباشنەبێت و نەیپەرژێتە سەر مردن.[2]،

**چوارەم: دەبێت تەوبەی لە هەموو گوناهەکانی کردبێت و،**

ئینجا بنوێت، دڵی هیچ کینەو ڕقێکی تێدا نەبێت بەرامبەر بە موسوڵمانان، بیر لەوەنەکاتەوە زوڵم لە هیچ کەسێك بکات، وە نیەتی هیچ تاوانێکیشی نەبێت کە هەستاو بە ئاگاهاتەوە بیانکات، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**((مَن آوَى إلى فِراشِهِ لاَ يَنوِي ظُلمَ أحَدٍ، ولا يَحقِدَ علَى أحَدٍ، غُفِرَ لهُ مَا اجتَرَمَ))**[3]، ئەوەی سەر بخاتە سەر جێگای نووستن و بە نیاز بێت بنوێت، نیەتیشی نەبێت نە زوڵم لە کەسێك بکات و، نەکینە و ڕقیشی بەرامبەری کەسێك هەبێت، ئەوا خودا لە تاوانەکانی خۆش دەبێت.

**پێنجەم: نابێت زۆر لە نازوو نیعمەتی خۆشدا بژی:**

---

(١) كذا في القوت(١/٣٣) وروى الديلمي كما في مسند الفردوس( ٥٩٤٥)مرفوعا : **من لم يُوصِ لَمْ يؤذن له في الكلام مع الموتى . قيل يارسول الله ويتكلمون؟ قال: نعم، ويتزاورون**، أنظر: الإتحاف( ١٥٨/٥). ورواه أبو الشيخ كما في شرح الصدور للسيوطي(ص/٢٦١) وابن ماجه(٢٧٠١)، في كتاب الوصايا من حديث جابر: **من مات على وصية مات على سبيل وسنة، ومات على تقى وشهادة، ومات مغفورا له.**

(٢) قوت القلوب/١/٣٣.

(٣) كذا في القوت(١/٣٣)وقد روى الشهاب في مسنده( ٩ (٤٢٥)والخطيب في تأريخه (٩٤/٤) وابن عساكر في تأريخ دمشق(٢٧٣/٥٣)مرفوعا:**من أصبحَ لايَهمُّ بظلمِ أحدٍ،غُفرَ له ماجترم.**

وەك ڕایەخ و جێگەی نەرم و نیان، بەڵکوو لێیان دوور بێت، یان کەمیان بکاتەوە، هەندێك لە زانایانی سەلەف پێیان خۆشنەبوو ئامادەباشی بۆ نوستن بکەن، ئەمەیان بە ئەرکێکی زیادە لەقەڵەم دەدا، تەنانەت کۆمەڵی صوففە (أهل الصفة) نەریتیان وابوو کە هیچ شتێکیان نەدەخستە نێوانی جەستەیان و گڵی سەر زەوییەوە . وە دەیان فەرموو: لەم گڵە دروست کراوین و بۆ ناو ئەم گڵەیش دەگەڕێینەوە، وایان دەبینی کە ئەم جۆرە سادەییە لە ژیاندا سوودی زیاترە بۆ نەرمی و ناسکی دڵیان و گەردن کەچی خۆیان، [(١)]،

کەواتە هەرکەسێك نەفسی ئەوەندە ڕێگەی پێ نادات بۆ سەر زەوی شۆڕی کاتەوە، با نەفسەکەی کەم کاتەوە و زۆر بایەخی پێینەدات.

**شەشەم: نابێ بنوێت تا نوستن زۆری بۆ دێنێت:**

هەوڵنەدات بەزۆر نوستن ڕاکێشێت، مەگەر بەو نیەتەی کە بنوێت و لە کۆتاییدا بۆ شەو نوێژ هەستێتەوە، چونکە پیاوچاکان تاخەو زۆری بۆ نەهێنانایەخۆیانیان ڕادەست نەدەکرد، وە خواردنیان بەشی ژیان بووە، وە قسەکردنیان بە پێی پێویست بووە، بێ دەنگییان پەندیاری بووە، زانستەکانیان هێزوتەوانایی بووە، بۆیە بەو شێوە تاریف کراون، کە کەمێك لە شەواندا دەنوستن و دەحەوانەوە.

وە ئەگــەر خەوتــن زۆری بۆ بهێنایــە لە کاتی نوێــژو زیکرەکانیدا، کە نەیدەزانی چی دەڵێت و شەکانی لێ تێکەڵ دەبوو، با بنوێت و بحەوێتەوە، تا بزانێت چی دەڵێت، وەك حاڵی عەبدوڵلای کوڕی عەبــاس (خودایان لێ ڕازی بێت) کە پێی ناخۆشبــوو بــە دانیشتنەوە بنوێت [(٢)]،

وە لە فەرموودەدا هاتووە: لەگەڵ شەوداو ململانێ مەکەن وزۆرانی

---

(١) قوت القلوب١/٣٣.

(٢) هەمان سەرچاوە.١/٢١.

لەگەڵدا مەگرن، کە خەو زۆری بۆ هێنان بنون و بحەوێنەوە(( **لا تُكابِدُوا اللَّيلَ**))[1]. عەرزی پێغەمبەریان کرد ﷺ کە فلان کەس شەو نوێژدەکات و، کە زۆری بۆ هات خۆی بە پەتێکەوە ڕادەگرێت و هەر بەردەوام دەبێت، پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێ کردو فەرمووی: ((**لِيُصَلِّ أحَدُكُم مِنَ اللَّيلِ ماتَيَسَّرَ لَهُ، فَإذا غَلَبَهُ النَّومُ فَليَرقُدْ**))[2]هەریەك لە ئێوە چەندێکی بۆ ئاسانە شەو نوێژ بکات، ئەگەر خەو زۆری بۆ هێنا ئەوا پاڵبکەوێت بۆ نووستن.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**تَكَلَّفوا مِنَ العَمَلِ ما تُطيقُونَ، فَإنَّ اللهَ لاَ يَملُّ حتَّى تملُّوا**))[3]ئەوەندە کار بگرنە ئەستۆی خۆتان کە بۆتان ئەنجام بدرێت و پێتان بکرێت، کە بەردەوام بن لەسەری، وە خودا پاداشتان لەسەر هەڵناگرێت، کە بە هۆی ماندووبوونەوە کارەکانتان وەستاندبێت، یان پاداشتان لەسەر لانابات، وە خودا ماندوونابێت مەگەر خۆتان حەزتان لە داواکردن نەمابێت و ماندووبوون، ئەینا بەردەوام میهری خودا لەگەڵتاندایە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**خَيرُ هذا الدِّينِ أيسَرُهُ**))[4]، واتە: باشترین هەڵبژاردە و کرار لەم ئاینەدا ئاسانترینیانە

---

(١) رواه الخطيب في موضح أوهام الجمع والتفريق، ٣٨٢/٢) ورواه الديلمي في مسند الفردوس(٧٤٦٠). مرفوعا: **لا تكابدوا هذا الليل، فإنكم لا تطيقونه، وإذا نعس أحدكم فلينم على فراشه، فإنه أسلم له**. وعند ابن أبي شيبة في المصنف(٣٥٧٠٨) والطبراني في الكبير ١٠٦/٩) موقوفا على ابن مسعود ج **(لا تغالبوا هذا الليل)**...الحديث.

(٢) كذا في القوت٢١/١)، ورواه البخاري (١١٥٠) ومسلم (٧٨٤)، وهي أم المؤمنين زينب بنت جحش، وفيهما (فليقعد) بدل(فليرقد)، أي يتمها قاعدا، وجاء لفظ فاليرقد عند البخاري، ٢١٢، ومسلم (٧٨٦)، مرفوعا: **إذا نعس أحدكم وهو يصلي فليرقد حتى يذهب عنه النوم، فإن أحدكم إذا صلى وهو ناعس لايدري : لعله يستغفر فيسب نفسه**.

(٣) رواه البخاري ٤٣، ٦٤٦٥)، ومسلم(٧٨٢).

(٤) رواه الطيالسي في مسنده(١٢٩٦)، وأحمد في مسنده(٤٧٩/٣)، والبخاري في الأدب المفرد (٣٤١) ولفظه: **خيرُ دينكم أيسَرهُ**.

وتیان: فڵان کەس ئەوەندە نوێژ دەکات کە نانوێت، وە ئەوەندە بەڕۆژوو دەبێت، هەرگیز نایشکێنێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ((**لكنّي أُصلّي وأنامُ، وأصُومُ وأُفْطِرُ، هذهِ سُنَّتي فمَنْ رَغِبَ عَنهَا فليسَ مِنِيّ**))[1]، بەڵام من نوێژیش دەکەم و دەشنووم، وە بەڕۆژووش دەبم و هەندێ ڕۆژیش پێ نابم، ئەمە سوننەت و ڕەویەی منە، ئەوەی لە سوننەتی من لابدات لە ڕێڕەوی من لایداوە:

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**لا تُشادّوا هَذا الدِّين ،فإنَّهُ متينٌ، فَمَنْ يشادُّهُ يَغلِبْهُ، فَلاَ تُبَغِّضْ إلى نَفسِكَ عبادة الله (عَزَّ وجَلْ)**))[2]،

هەرگیز ئەم ئاینە بە توندی مەگرن و ململانێی لەگەڵ مەکەن، کە دوایی بۆتان ڕاگیرنەکرێت،چونکە ئەم دینە بەهێزو مەتینە، وە ئەوەندە باری خۆت لەم دینە گران مەکە، کە بۆت هەڵنەگیرێت،ئەوەندە بە قووڵی بۆی دامەچۆ کە دوایی نەتوانیت بەڵێنەکانت ببەیتە سەرو بێزاربیت و واز لە کردارە کەمەکانیش بهێنیت. وات لێبێت ڕقت لە بەندایەتیش ببێتەوە.

**حەوتەم:سوننەتەڕووەوقیبلە بخەوێت:ئەم ڕووکرنەش بە دووشێوەیە:**

**یەکەم:** وەك کەسێك لەکاتی گیانکێشاندالەسەر پشت ڕاکشابێت، ڕووکردنە قیبلەکەی بەو شێوەیە کە ڕوخسارو هەردوو قاچەکانی ڕووە و قیبلە بێت.

---

(١) رواه النسائي ٤/٢١٠) دون ذكر الجملة الأخيرة منه، وهو مجملا في حكاية الرهط الذين سألوا عن عبادته ﷺ وكأنهم تقالُّوها عند البخاري (٥٠٦٣) ومسلم(١٤٠١) ولفظ المصنف في القوت١/٢١.

(٢) أخرجه النسائي(٢٣٩٠)، من حديث عبدالله بن عمر، دون قوله هذه سنتي، وهذه الزيادة لإبن خزيمة في صحيحه(٩٩/١)(١٩٧)،من رغب عن سنتي فليسمني.وهي متفق عليها، ورجح البخاري في التاريخ إرساله وروى البزار في مسنده من حديث جابر بلفظ:**أن هذا الدِّينَ متينٌ فأوغلوا فيهِ برفقٍ، فإنَّ المُنبَتَّ لا أرضاً قَطعَ ولاَ ظهْراً أبقَي**، وفي سنده متروك وروي أحمد من حديث أنس: **أن هذا الدين مَتين فأوغلوا فيهِ برِفق، وألاَ يُغالَ الدخول في الشيء**.

دووهەم: وەك پێشوازیکردنی ناو ئەڵحەد، لەسەر لای ڕاستی بنوێت، بەو شێوە ڕووی لەگەڵ پێشەوەی جەستەی لە قیبلە بێت، ئەگەر لەسەر لای ڕاستی بێت.

**هەشتەم: دوعاکردن لە کاتی نوستندا:** دەڵێت: بەناوی تۆوە ئەوا لاتەنیشتم داناوە و بەرزیشی دەکەمەوە، (باسمِكَ اللَّهُمَّ ربِّي وضَعتُ جَنبي. وبِاسمِكَ أرفعُهُ) تا کۆتایی ئەو نزا وەرگیراوانەی کە لە پەڕاوی (دوعاو نزاكان)دا باسمانکردن.

وە باش وایە ئایەتە تایبەتەکان بخوێنێتەوە، وەك: (آية الكرسي) وكۆتایی (البقرة)و ئەوانی دیکە. وە ئایەتی: ﴿وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ، إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾(البقرة/١٦٤) بخوێنێت، وەك دەگێڕنەوە هەرکەسێك لە کاتی نوستندا بیانخوێنێت، خودا یاوەری دەبێت و لەبەر کردنی قورئانی بۆ دەپارێزێت و لەبیری ناچێتەوە.

واتە: خودای ئێوە تاقە خودایەکەو خودای دیکە نیە ئەو نەبێت، بەخشندەو میهرەبانە،بێگومان لە دروستکردنی ئەرزو ئاسمان و دوابەدوای یەکاهاتنی شەوو ڕۆژداو، جیاوازیان لە کورتی و درێژی و قازانج و مەبەستدا و، لە پێدانی بیر و هۆشدا بە بنیادەم بۆ دروستکردنی کەشتی هەمەجۆر، کە لە دەریادا هاتو چۆ دەکەن و، قازانج بە خەڵك دەگەیێنن بە بازرگانی و شتی دیکە، هەروەها لەو ئاوو بارانەدا کە خودا لە ئاسمانەوە دەیبارێنێت و، زەوی پێ زیندوو دەکاتەوە پاش مردنی و، سەوزی دەکات پاش وشکبوونی و، ئەو هەموو گیان لەبەرانەی تێیدا بڵاوی کردوونەتەوە، هەروەها لە ڕامکردن و وەرچەرخاندنی هەور و با لە نێوان ئاسمان و زەویدا، لە هەموو ئەمانەدا نیشانە و بەڵگەی گەورەیی و دەسەڵاتداری و تاقانەیی خودا هەیە بۆ ئەوانەی خاوەن ئەقڵن و بیر دەکەنەوە[1]

(١) خولاصەی تەفسیری نامی ل/ ٢٥

هەروەها لە سوورەتی (الأعراف) ئەم ئایەتانە بخوێنێت:

﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا، وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ، ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ، وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾ (٥٦)

واتە: خودای ئێوە خودایێکە؛ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە لە شەش ڕۆژداو، بووبە فەرمانڕەوا بەسەر عەرشدا و، بە هێزی خۆی شەو دەکاتە پەردەو ڕۆژی پێ دادەپۆشێت، وە بەپەلە دێت بە دوایدا وەك ئەوەی بیەوێت بیگرێت، هەروەها خۆر و مانگ و ئەستێرەکانی دروستکردوون، کە هەموویان ڕامن لەبەردەستیدا و، بە ئارەزوو و خواستی ئەو دەسوڕێنەوە، هەر خودایە دەتوانێت هەموو شت دروست بکات و، هەر ئەوە فەرمان ڕەوا، خودا پاك و بێ گەردە و، لە هەموو ئەندێشەو خەیاڵێك بەرزترەو، پەروەردگاری هەموو عالەمە[1]، وە کۆتایی سوورەتی ئیسرا (بنی إسرائيل) بخوێنە کە دەفەرموێت:

﴿ قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَنَ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى، وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا ، وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ وَلِيٌّ مِنَ الذُّلِّ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًا ﴾ (الإسراء/١١١) [2].

واتە: تۆ بڵێ: بە (یا الله) بانگ بکەنە خودا، یان بە(یا رحمن)، دروستەو هیچ ڕێگرییەکی لێ نەکراوە، هەردوکیان جوانن و، خودا ناوی جوانجوانی هەیە، نوێژ بە دەنگی بەرزمەکە کە کافرەکان گوێیان لێبێت و دەستبکەن بەجنێودان، بەدەنگی نزمی وەهایش مەیکە کە تەنانەت خۆیشت نەیبیستیت، لە نێوانی ئەم دوو جۆرەدا ڕێگایەکی مام ناوەندی، نە بەرزو نە نزم بگرەوە.

(١) خوڵاصەی تەفسیری نامی: ل/١٥٧.

(٢) رواه ابن مبارك في الزهد (١٢٤٤)، وابن حبان في صحيحه(١٠٥١).

تۆ بڵێ: سەناو ستایش بۆ ئەو خودایە نەوەی بۆ خۆی بڕیارنەداوەو ، هاوبەش و هاوکاریشی نییە لە کارو کردارەکانیدا، هەروەها یارمەتیدەریشی ناوێت لەبەر کزبوون و داماوی، چونکە هەرگیز کز نابێت تا پێویستی بە یارمەتی دەر هەبێت، وە بە گەورەی جیهانی دابنێت و بڵێ: خودا لە هەموو گەورەیەك گەورەترە [1]، ئەو کاتە مەلائیکەیەك دەچێتە ناو پێستەکەیەوە، فەرمانی پێدەدرێت کە بیپارێزێت، وە هەمیشە داوای لێخۆش بوونی لە خودا بۆ دەکات.

لە پاشان هەردوو( قُلْ أعوذُ) ووەکان بخوێنێت، وە فوو بکات بە دەستی خۆیداو، دەستبە دەم و چاوو تەواوی جەستەیدا بهێنێت، بەم شێوەیە گێڕاو یانەتەوە کە پێغەمبەرﷺ کردوویەتی[2]،

هەروەها با دە ئایەت لە سەرەتای سوورەتی (الکهف) بخوێنێت، وە دە ئایەتیش لە کۆتاییەکەی، ئەم ئایەتانە بۆ بە ئاگاهاتنەوەیە بۆ هەستان بۆ شەو نوێژ[3]،

حەزرەتی عەلی حاڵی وابوو کەدەیفەرموو: نابینم یەکێك خاوەنی ئەقڵێکی تەواو بێت و بخەوێت، پێش ئەوەی دووئایەتی کۆتای سوورەتی(البقرة)ی نەخوێندبێت.[4]

هەروەها با بیست و پێنج جار بڵێت: **سُبحانَ اللهِ والحَمدُ للهِ ولا إلهَ إلاَّ اللهُ واللهُ أكبَرُ**. بۆ ئەوەی کۆی ئەم چوار وشەیە بکاتە سەد کەڕەت.

**نۆیەم: پێش ئەوەی خەو بیباتەوە بیر لەوە بکاتەوە کە نوستن جۆرێکە لە مردن، وە بەئاگاهاتنەوەیش جۆرێکە لە زیندووبونەوە:**

خودای گەورە لە قورئاندافەرموویەتی: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنْفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي

---

(١) خۆلاصە ل/٢٩٣.

(٢) رواه البخاری (٥٠١٨).

(٣) قوت القلوب(١/٣٢).

(٤) قوت القلوب١/٣٢، وەك لە پێشەوە باسی گەورەیی ئەم ئایەتانەمان ڕوونکردەوە.

مَنَامِهَا﴾ (الزمر/٤٢) خودا گیانی هەموو زیندوویەك وەردەگرێتەوە لە كاتی مردنیدا، وە گیانی ئەوانەش وەردەگرێتەوە لە كاتی نوستنیاندا كە هێشتا نەمردوون.

یان فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُمْ بِاللَّيْلِ﴾ (الأنعام/٦٠) هەر خودا خۆیەتی كە بەشەوداو لە كاتی خەودا دەتانمرێنێت، كەواتە ناوی بردووە بە وەفاتكردن، وەك چۆن كەسێك بە ئاگابێت هەندێك شتی بۆ دەردەكەوێت و دەبینێت كە جیاوازە لە گەڵ حاڵەتی نوستنیدا، هەروەها كەسێكیش كە زیندوو دەكرێتەوە ئەوەی دەبینێت نە بە مێشكیدا هاتووە و نە بەیەكێك لە ئەندامە هەستیارەكانیشی هەستی پێ كردووە، كەواتە ژیانی نوستن كە لەنێوانی ژیان و مردندایە، وەك ژیانی بەرزەخی وایە، كە لە نێوانی دونیاو پاشەڕۆژدایە.

(حەزرەتی)لوقمان بەكوڕەكەی فەرموو: ئەی كوڕم ئەگەر گومانێكت هەیە بەرامبەر مردن؟ ئەوا مەنوو، وەك چۆن دەنویت ئاوایش دەمریت، وە ئەگەر گومانت لە زیندووبوونەوە هەیە؟ ئەوا بێدار مەبەرەوە، وەك چۆن بە ئاگادێیتەوە، ئاوایش لە دوای مردنت زیندوودەبیتەوە[1]

كەعبی ئەحبار(خودای لێ ڕازی بێت)فەرموویەتی:

ئەگەر نوستیت؛ ئەوا بەلای ڕاستدا ڕابكشێ، وە ڕووی خۆت بكەرە قیبلەوە، ئەوە مردنەو خۆتی بۆ ئامادە بكە.

هەروەها (حەزرەتی) عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

پێغەمبەر ﷺ دوا نزاو دوعای كە لەپێش نوستندا دەیكرد، كە دەستی ڕاستی دەخستە ژێر گۆنای، وە دەبینێت كە لەو شەوەدا دەمرێت بۆیە دەیفەرموو: ((اللَّهُمَّ: ربَّ السَّمواتِ السَّبعِ ورَبَّ العَرشِ العَظيم، ربَّنَا ورَبَّ كُلِّ شَيءٍ ومَليكَه)) تەواوی نزاكە لە پەڕاوی دوعاكاندا باسكراوە.[2]،

---

(١) قوت القلوب١/٣٤. ڕیوایەتەكەی پێشویش هەمان سەرچاوەیە.

(٢) رواه النسائي في الكبرى(١٠٥٥٧).

کەواتە پێویستە بەندە سەرنج ی خۆی بدات بزانێت لەسەر چ حاڵ و بیرێك دەنوێت؟ وە چی زاڵە بەسەریدا، ئایا خۆشەویستی خودا و پێغەمبەری خودایە، یان خۆشەویستی دونیایە؟ واش دابنێت کە بەرەو مردن دەڕوات، وە لەسەر چ حاڵەتێك خەوی لێ کەوتووە لەسەر ئەو حاڵە زیندوو دەبێتەوە، چونکە مرۆڤ لەگەڵ ئەوکەسەدایە و لەگەڵ ئەو شتەدا حەشر دەکرێت کە خۆشی دەوێت.

## دەیەم: کاتێکیش بە ئاگادێتەوە دوعا بکات:

وە لە کاتی بەئاگاهاتنەوەکانیدا و تەپاوتلی سەر جێگەیدا، هەرچەندێك بە ئاگابێتەوە ئەوە بڵێتەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەیفەرموو: ((**لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ الوَاحِدُ القهَّارُ، ربُّ السَّمواتِ والأَرضِ وما بَينَهُما العَزيزُ الغفَّارُ**))[1] هیچ خودایەك نیە شیاوی پەرستن بێت جگە لە (الله)، خاوەن و تاکوتەنهاو بەزەبرو پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و نێوانەکانیانە، خاوەنی دەسەڵات و شکۆمەندی و لێبووردەیی.

هەوڵی ئەوە بدات دوا شت لە کاتی نوستندا کە بە خەیاڵی دڵیدا دێت زیکری خودای گەورە بێت، وە یەکەم شتیش کە بێت بەدڵی دا، لە کاتی بەئاگا هاتنەوەیدا زیکری خودا بێت، ئەمە نیشانەی خۆشەویستییە، ئەوەی لەم کاتانەدا لە ناو دڵدا لێی جودا نەبێتەوە ئەوەیە کە زاڵە بە سەر دڵیدا، کەواتە با دڵی تاقی بکاتەوە بزانێت چی زاڵە بەسەریدا، نیشانەیە لەسەر ئەوەی ناو دەروونی بە چ خۆشەویستییەکەوە سەرقاڵە، بۆیە ئەم زیکرانەیش باشە کە بکرێن، تا دڵەکان ڕابکێشن بۆ زیکری خودا و ئالوودەبوونیان پێیەوە.

ئەگەر بە ئاگایش هاتەوە با بڵێت: (**الحمدلله الذی أحیانا بعد ما أماتنا وإلیه النشور**).. ( حەمدو سەنا بۆ ئەو خودایەی زیندووی کردینەوە، دواى

(١) رواه النسائي فى الكبرى(١٠٦٣٤) وابن السني فى (عمل اليوم والليلة) (٧٥٧).

ئەوەی کە مراندینی، وە تەنها بۆ لای ئەویشە کە دەگەڕێینەوەو زیندوو دەکرێینەوە، تا کۆتایی ئەو نزایانەی باسمانکردن بۆ کاتی بە ئاگا هاتنەوە.

## ویردی چوارەم: سەرەتاکەی لەوکاتەوەیە کە نیوەی یەکەمی شەو دەڕوات، تا ئەو کاتەی کە شەش یەکێکی شەو دەمێنێت:

لەم کاتەدا با هەستێ بۆ نوێژی تەهەججود، ئەم ناوە لەوەوە وەرگیراوە کە لە دوای نوستن هەوڵو کۆشش بکات و هەستێتەوە بۆ شەو نوێژ، کە پێی دەوترێت تەهەججود. ئەمەیش ناوەڕاستی شەوە، وەك ئەو ویردە وایە کە دوای نیوەڕۆ دەخوێنرێت، کە ئەویش ناوەڕاستی ڕۆژە، وە خودا سوێندی پێ خواردووە و فەرموویەتی: ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى﴾ (الضحى/٢) سوێند بە شەو کاتێك ئارام و کش و مات دەبێت، [1]، ئارامییەکەیشی ئەو بێدەنگی و هێمنییەیە کە لە نیوەی شەودا چڕەش کەم دەبێتەوە، هەموو چاوەکان نوستوون، مەگەر چاوی قودرەتی خودای زیندوی کارسازی بەدەسەڵات، کە هەرگیز خەوو وەنەوز نایباتەوە، هەروەها وتوویانە: کە (إذا سجى) بە واتای ئەوەیە:

کە شەوگار درێژ دەبێتەوە و دەخاێنێت، یان ئەوکاتەی کە تاریك دادێت[2].

وە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد: چ کاتێکی شەو باشتر نزاو دوعای تێدا دەبیسرێت ؟ فەرمووی: ((جوف الليل) واتە نیوەی شەو[3].

(حەزرەتی) داوود (سەلامی خودای لەسەر)فەرموویەتی:

**(إلهي إنيِّ أحِبُّ أن أتَعبَّد لكَ، فأيُّ وقتٍ أفضَل؟ فأوحَى اللهُ تعالى إليه: يا داود؛ لا تقُم أوَّلَ اللَيلِ ولاَ آخِرَهُ، فإنه من قَام أوَّلَه نامَ آخِرَهُ، ومَن قَام آخِره لَم يَقُم أوَّلَهُ، ولكِنْ قُمْ وسْطَ اللَّيلِ حتَّى تَخْلُوَ بي وأخلُوَ بكَ، وارفعْ إليَّ حَوائِجَكَ)**[1]،

---

(١) روا ذلك ابن جرير في تفسيره (١٥/٣٠)(٢٨٩) عن قتادة والضحاك.وانظر القوت١/٢١.

(٢) هەمان سەرچاوە ل(٢٨٨) لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە (خودای لێ ڕازی بێت) .

(٣) رواه أبو داوود (١٢٧٧) والترمذي (٣٤٩٩).

خودایه دەمەوێت بەندایەتیت بۆ بکەم ، چ کاتێك خێری زیاترە؟ خودای گەورە نیگای بۆ کرد و فەرمووی:

ئەی داوود؛ نەسەرەتای شەو و نەکۆتاییەکەیشی، چونکە ئەوەی سەرەتاکەی هەستێتەوە کۆتاییەکەی دەنوێت، وە ئەوەی کۆتاییەکەی هەستێتەوە سەرەتاکەی هەڵناستێت، بەڵام تۆ لە ناوەڕاستی شەودا هەستەوە، بۆ ئەوەی بە تەنهاو خەڵوەتی تۆ لەگەڵ من و منیش لە گەڵ تۆ بم، وە کارو پێداویستییەکانت بەرز کەرەوە بۆ لام.

وە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، چ کاتێکی شەو خێری زیاترە؟ فەرمووی: ئەو نیوەی شەوەی کە ماوەتەوە،((**نصفُ اللَّيلِ الغابِرْ**))[٢].

وە لە کۆتایی شەودا وەك لە فەرموودەدا هاتووە:

عەرشی خودا دێتە لەرزین [٣]، وە هەروەها بڵاوبوونەوەی با لە بەهەشتی هەتاهەتایی، وە دابەزینی خودا بە ڕەحمەتی خۆی بۆ ئاسمانی دونیا، وە هەندێکی تر لە هەواڵەکان کە لە شەودا دەبن[٤].

---

(١) قوت القلوب ٢١/١.

(٢) رواه أحمد في المسند(١٧٩/٥) ولفظه: **جوف الليل الغابر**، وابن حبان في صحيحه(٢٥٦٤) ولفظه: نصف الليل أو جوف الليل، دون لفظ الغابر.

**(٣) رواه ابن أبي شيبة (٣٥٣٩٢) وأبو نعيم في الحلية(٢٠٣/٦)، عن سعيد الجريري أن داوود قال: يا جبريل:أي الليل أفضل؟ قال: ما أدرى، غير أني أعرف أن العرش يهتز من السحر.**

**(٤) رواه البخاري (١١٤٥)، ومسلم(٧٥٨)، وانتشار الرياح: القوت: (٢١/١) والسياق عنده.**

# ڕێکخستنی ئەم ویردە

دوای لێبوونەوەی لە دوعاکان کە بۆ کاتی خەبەر بوونەیە، با دەستنوێژێك بگرێت، بە تەواوی سوننەت و ئادابەکانیەوە، وە بڕوات بۆ جێگای نوێژەکەی، وە ڕوو لە قیبلە بکات و ڕابووەستێت و بڵێت:

(( **الله أكبَرُ كبيراً والحَمدُ للهِ كثيراً، وسُبحانَ اللهِ بُكرَةً وأصيلاً**)) لە پاشان دەجار تەسبیحات بکات(سوبحانەڵلا)، وە دەجار (ألحمدلله)، وە دەجار(لاَ إلَهَ إلاَّ الله)، وە بڵێت: ( **ألله أكبَرُ ذُوالملكُوتِ والجَبرُوتِ، والكبريَاءِ والعَظمَةِ، والجَلالِ والقُدرَةِ**)[1]، گەورەیی بۆ خودایە کە خاوەنی موڵك و دەسەڵاتە، خاوەنی گەورەیی و کیبریاو جەلال و توانا و زاڵ بوونە. با ئەم وتانەیش بڵێت کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ وەرگیراوە، کە بۆ شەو نوێژ هەڵبسایەتەوە دەیفەرموو:

(**اللَّهُمَّ: لكَ الحمدُ أنتَ نورُ السَّمواتِ والأرض، ولكَ الحَمدُ أنتَ بهاءُ السَّموات والأرضِ ولكَ الحمدُ أنتَ زينُ السَمواتِ والأرضِ، ولكَ الحمد أنتَ قيُومُ السَّمواتِ والأرضِ ومَنْ فيهن، ومَنْ عَلَيهِنَّ، أنتَ الحقُّ ومِنكَ الحَقُّ، ولِقاؤُكَ حقٌّ، والجنَّةَ حقٌّ، والنَارَ حقٌّ، والنُّشورَ حقٌّ، والنبيّونَ حقٌّ، ومحمَّدٌ ﷺ حَقٌّ.**

**اللَّهُمَّ: لكَ أسلمتُ وبكَ آمنتُ وعليكَ توكَّلتُ، وإلَيكَ أنبتُ، وبكَ خاصَمتُ وإليكَ حاكَمتُ، فاغْفِر لي مَا قدَّمتُ ومَا أخَّرتُ وما اسررت وما أعلنت، أنت المقدم وأنت المؤخر لا إله إلا أنت**[2]،

**اللَّهُمَّ: آتِ نفسي تقْواها وزَكِّها أنتَ خيرُ مَن زكَّاهَا، أنتَ ولِيُّها ومَولاهَا،**[3]،

**اللَّهُمَّ: اهدِني لأحسَنِ الأعمَالِ لا يَهدي لأحْسَنِها إلاَّ أنتَ، واصْرفْ عنِّي سيِّئَها، لا يَصْرفُ عنِّي سيِّئَها إلاَّ أنتَ،**[1]،

---

(١) رواه الطيلسي في مسنده(٤١٦) مصرحا بصلاة الليل . وأبو داوود (٨٧٤)والنسائي٢/٢٣١.

(٢) إلى هنا رواه البخاري (١٢٠) ومسلم (٧٦٩) بألفاظ متقاربة.

(٣) رواه أحمد في المسند (٢٠٩/٦) في قيام الليل، وهو عند مسلم (٢٧٢٢) من دعائه ﷺ .

**أَسأَلُك مَسأَلةَ البائسِ المِسكين، وأَدعُوكَ دعاءَ المُفتَقِر الذَّليل، فلاَ تَجْعَلني بدُعائِكَ ربِّ شقِيًّا، وكُنْ بي رؤوفاً رحيمَاً، ياخَيرَ المَسؤولينَ وأَكرمَ المُعطِينَ**[٢]،

ئەی خودایە: تەنها تۆ شایسەتی ئەوەی کە سوپاست بکەین، تۆ سەرچاوەی نووری ئاسمانەکان و زەویت، تۆ مایەی ڕەونەق و جوانیەکانیانیت، سوپاس بۆ تۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویت، تۆ هەڵسوڕێنەرو جێبە جێکاری هەموو کارەکانیت، ئەوەی لە ناو ئاسمانەکان و زەویدایە و لەسەریان دەژین، تەنها تۆ حەققیت و، ڕاستی لە تۆوەیە و لیقاو پێگەیشتنت حەققە و، بەهەشت و دۆزەخ و زیندووبوونەوە و پێغەمبەران هەموویان حەقق و ڕاستن و (حەزرەتی) موحەممەدیش ڕاستە و متمانەمان لەسەریان دامەزراوە.

ئەی خودایە: بۆ تۆ موسوڵمان بووم و، بەتۆ بڕوام هێناوە و ، پشت و پەنام لەسەر تۆیە و، بۆ لای تۆ گەڕاومەتەوە و، بەتۆیە توانای ڕوبەڕو بوونەوەم هەیەو، سکاڵاو دادوەریم بۆ لای تۆیە،

ئەی خودایە: لێم خۆش ببە لەوەی پێشتر کردوومە، یان لە دواترەوە دەیکەم، ئەوەی شاردوومەتەوەو ئەوەی ئاشکرام کردووە، ئەوەش کە تۆ لێی بە ئاگاتری لە من. تۆ هەندێك لە بەندەکانت پێش خستووە، بەوەی بەندایەتیت بۆ دەکەن، وە هەندێکیشیانت دوا خستووە و دەسبەرداریان بوویت، هیچ کەسێك شیاوی پەرستن نیە جگە لە تۆنەبێت.

ئەی خودایە؛ نەفسێکی تەقواکارم پێببەخشیت، پاکی بکەرەوە تەنها تۆ دەتوانی پاڵفتە و پاکژی بکەیتەوە، تۆ سەرپەرشتیار و خاوەنی گیانی منی.

ئەی خودایە؛ ڕێنمایی کردارەچاکەکانم بکە، کە کەس ناتوانێت ئەو

---

(١) رواه النسائي بلفظ: **لأحسن الأعمال وأحسن الأخلاق**، وهو عند مسلم (٧٧١) بلفظ الأخلاق، بدل: الأعمال، وفيه زيادة من أوله

(٢) رواه الطبراني في الصغير(١/٢٤٧).

ڕێنماییە بکات جگە لە تۆ، خراپەکانم لێ دوورخەرەوە کە کەس ناتوانێت ئەو کارەم لەگەڵ بکات تۆ نەبێت.

وەك کەسێکی هەژاری بێدەسەڵات لە دەرگاتا کەوتووم و داوات لێدەکەم وەك زەلیلێکی بێچارەو بێ دەسەڵات، خودایە بەدبەختم مەکەو، نزاکانم مەدەرەوە بەسەرمدا و، بە میهرو سۆزو نەرمی بەزەیی خۆتەوە بۆم بنواڕە، ئەی ئەو زاتەی لە هەموو کەسێك چاتر بەدەم داوای داواکارانەوە دەچیت، وە لەهەموان بەخشندە و میهرەبان تریت.

(حەزرەتی) عائشە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لەشەودا هەڵبستایە بۆ نوێژکردن، سەرەتای نوێژەکەی بەم نزایە دەکردەوە:

**اللَّهُمَّ: ربَّ جبرائيلَ وميكائيلَ واسرافيلَ، فاطِرَ السَّمواتِ والأَرضِ، عالمَ الغَيبِ والشَّهادةِ أنتَ تَحكُم بينَ عِبادِكَ فيمَا كانُوا فيهِ يَختَلِفونَ، اهدِني لِمَا اختُلِفَ فيهِ مِنَ الحَقِّ باذْنِكَ، أنتَ تَهدِي مَن تَشاءُ إلى صِراطٍ مُستَقِيمٍ** [1].

ئەی خودایە؛ پەروەردگاری جوبرەئیل و میکائیل و ئیسرافیل،ئەی دروستکەری زەوی وئاسمانەکان،زانا بەسەر هەموو شتە بینراووجیهانە شاراوەکان، تۆ دادوەری نێوانی بەندەکانت دەکەیت، لە هەموو جیاوازییەك لە نێوانیاندا بووبێت، ڕێنماییم بکە بۆ گەیشتن بە ڕاستی، لەو بابەتانەی جیاوازی بیروڕایان لەسەر بووە، کە بە ئیزنی تۆ ڕاستیەکەم بۆ دەربخەیت، بەڕاستی تەنها تۆی کە ڕێنمایی ئەوانە بکەیت کە مەیلت بۆیان هەیە، ڕێگای ڕاستیان پێ نیشان بدەیت. لە پاشان نوێژەکەی بە نزای (کردنەوەی) نوێژ بکاتەوە، وە دوو ڕکاتی خێرا دەکات و، لە پاشان دوو دوو نوێژە سوننەتەکان دەکات و کۆتاییشیان بە نوێژێکی وەتر(تاك)دەهێنێت، ئەگەر پێشتر نوێژی وەتری نەکردبێت.

وە باشتر وایە نێوانی هەموو دوو ڕکاتێك سەد کەڕەت سوبحانەڵلا و تەسبیحات

---

(١) رواه مسلم (٧٧٠).

بكات، بۆ ئەوەی کە چالاکی زیاد بکات و توانای نوێژکردنی نویێ ببێتەوە.

وە ڕیوایەتی دروست ئەوە دەگەیێنێت: کە پێغەمبەر ﷺ بەشەودا لەسەرەتاوە دوو ڕکاتی سووکی ئەنجامداوە، لەپاشان دوو ڕکاتی درێژ، لەپاشان دووڕکاتی تر کورتتر لەوەی دووهەم، بەم شێوە بەردەوام ڕکاتەکانی کورتتر دەکردەوە، تا دەگەیشتە سیانزە ڕکات، [1].

وە پرسیار لە(حەزرەتی)عائیشە کرا (خوای لێ ڕازی بێت)ئایا پێغەمبەر ﷺ لە شەو نوێژدا دەنگی بەرز دەکردەوە یان بە نزمی دەیخوێند، فەرمووی: (**رُبَّمَا جَهَرَ، وَرُبَّمَاأَسَرَّ**)هەندێك جار بە دەنگی بەرزو هەندێك جاریش بە نزمی دەیخوێند.[2]

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**صَلاةُ اللَّيلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذا خِفتَ الصُّبحَ فَأَوتِرْ بِرَكعَةٍ**))[3]، واتە: نوێژەکانی شەو دوودوو بیانکە، ئەگەر ترسی نزیك بوونەوەی بەیانیت بوو، ئەوا بە ڕکاتێکی وەتر کۆتایی پێ بهێنە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((**صَلاةُ المَغرِبِ أوترتْ صَلاةَ النَّهارِ، فَأَوتِروا صَلاةَ اللَّيلِ**))[4]، واتە: نوێژی مەغریب کۆتایی هێنانە بە نوێژەکانی ڕۆژ بە وەتر کە سێ ڕکاتە، ئێوەیش شەونوێژ بەتاکی کۆتایی پێ بهێنن. ئەو ڕیوایەتە دروستەی زیاتر لە (حەزرەتی) پێغەمبەرەوە ﷺ پێمان گەیشتووە، ئەوەیە کە سیانزە ڕکات شەو نوێژی کردووە.[5]

---

(١)وقد صح في صلاة النبي صلي الله عليه وسلم أنه صلى أولا ركعتين خفيفتين ثم ركع ركعتين طويلتين، ثم صلي ركعتين دون اللتين قبلهما، ثم لم يزل يقصر بالتدريج إلى ثلاث عشرة ركعة) قال العراقي رواه مسلم (٧٦٥).

(٢) رواه أبو داوود(٢٢٦)، والترمذي(٤٤٩)، والنسائي(٢٢٤/٣)، وابن ماجه(١٣٥٤).

(٣) رواه البخاري (٤٧٢)، ومسلم(٧٤٩).

(٤) رواه عبدالرزاق في المصنف(٢٨/٣)، وأحمد(في المسند) (٣٠/٢).

(٥) رواه مسلم(٧٦٥)، والنسائي (٢٣٧/٣).

لەم ڕکاتانەی شەو دەیانکات، ئەو ئایەتانە بخوێنێت کە کردوونی بە ویردی خۆی، یان ئەو سوورەتە تایبەتیانەی کە ئاسانن لەسەری، ئەمەش لە حوکمی ئەو ویردانەدایە کە بەردەوام دەبێت تا شەش یەکی شەو دەمێنێت.

## ویردی پێنجەم: بەشی شەش یەکی ئەخیری شەو:

ئەمەش کاتی گزنگی بەرەبەیانە، خودای گەورە لە بارەی ئەو ساتەوە دەفەرموێت:﴿وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾(١٨/الذاريات)بەبەرەبەیاندا داوای لێبوردن لە خودا دەکەن، هەندێك دەفەرموون: مەبەستی ئەوەیە کە نوێژ دەکەن، کە لە ناویدا داوای لێبوردنی زۆری تێدایە،[1]، ئەم کاتەش نزیکە لە کاتی ڕۆژبوونەوەوە، کە مەلائیکەکانی شەو دەڕۆن و مەلائیکەکانی ڕۆژ دێنە پێشەوە..

سەلمانی فارسی فەرمانی دا بە براکەی (ئەبودەرداء) (خودایان لێ ڕازی بێت) لەو شەوەدا کەسەردانی کرد، لە فەرموودەیەکی درێژدا لە کۆتاییەکەیدا دەفەرموێت: کاتێك شەو داهات، ئەبودەرداء ڕۆشت بۆ ئەوەی شەو نوێژ بکات، سەلمان فەرمووی پێی: بنوو، ئەویش نوست، لە پاشان هەستاوە کە شەو نوێژ بکات، دیسان فەرمووی: بنوو، ئەویش نووستەوە، کاتێك بەیانی هاتە پێشەوە هەڵیساندو فەرمووی: ئێستا هەستەوە، ئیتر هەڵسان و دەستیان کرد بە نوێژ کردن، فەرمووی: بزانە کە نەفسی خۆیشت بۆ حەوانەوەی مافی لەسەرت هەیە، وە میوانیشت مافیان لەسەرت هەیە، وە خێزانیشت مافیان لەسەرت هەیە، مافی هەموو خاوەن مافەکان بدە، ئەمەش ئەو کاتە بوو کە خێزانی ئەبودەرداء هەواڵی دا بە سەلمانی برای : کە مێردەکەی شەو ناخەوێت و هەر

---

(١) روى ذلك الطبري في تفسيره(٢٦/١٣)(٢٤٥) عن ابن عمر والضحاك ومجاهد، قال أبو طالب المكي في القوت(٢١/١): وكذلك قوله تعالى: وقرآن الفجر ، يعني به الصلاة وكنى بذكر القران والاستغفار عن الصلاة لأنهما وصفان منها. كما قيل للصلاة الإستغفار، لانه يطلب بها المغفرة، وتكون هذه الصلاة في السحر بدلا عن السجود الى طلوع الفجر الثاني.

نوێژەکات، هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و ئەم هەواڵەی پێدا، ئەیش فەرمووی: (صدق سلمان)[1]، واتە سەلمان ڕاست دەکات.

ئەمەیش ویردی پێنجەمە کە سوننەتە پارشێویش لەم کاتەدا بکرێت، کە ڕۆژ بوونەوە نزیك دەبێتەوە[2].

لەکاتی ئەم دوو ویردەدا ئەرکی چییە؟ چاك وایە نوێژ بکات، ئەگەر ڕۆژ بوویەوە ئیتر وەختی ویردەکانی شەو نامێنێت، وە کاتی ویردی ڕۆژ دێتە پێشەوە، هەڵدەستێت و دووڕکات نوێژی سوننەتی بەیانی دەکات، کە ئەستێرەکان وردە وردە دیارنامێنن و ون دەبن، کە مەبەستی فەرموودەکەی قورئانیش ئەوەیە کە دەفەرموێت: ﴿فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَارَ النُّجُومِ﴾ (٤٩/الطور) .

لە پاشان ئەم ئایەتە بخوێنێتەوە: خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (آل عمران/١٨) خودای گەورەو مەلائیکەکان و خاوەن زانستەکان و ئەوانەی بە دادوەری ڕاوەستاون شایەتی دەدەن کە تەنها خودایەك شیاوی پەرستن بێت زاتی (الله)یە، کە خاوەنی شکۆمەندی و پەندیاری و دەسەڵاتە.

لە پاشان بڵێت: منیش شایەتی دەدەم بەوەی کە خودا شایەتی لەبارەی خۆیەوە داوە، هەروەها تەصدیقی شەهادەتی مەلائیکەکان و، خاوەن زانستەکان دەکەم لە دروستکراوەکانی، وە ئەم شایەتیدانەم بە ئەمانەت لە حزوری خوادا دادەنێم، داوای لێدەکەم بۆم بپارێزێت تا لەسەر ئەو شەهادەتەوە بمرم، ئەی خودایە؛ خراپەو گوناهەکانمی پێ بکوژێنەرەوە، وەبیکە بە زەخیرەو توێشووی قیامەتم، وە بیپارێزە بۆ من کە شـــایەتیم بۆ بدات،وە لەسەری بممرێنەو تا بە لیقای تۆ دەگەم بێ ئەوەی بیگۆڕم و لێی لابدەم[1]،

---

(١) رواه البخاري(١٩٦٨)، ولفظ المصنف في القوت:٢١/١.

(٢) قوت القلوب ٢١/١(فمن لم يتسحر في أوله.. بغته الفجر) .

ئەمە جۆری ڕێکخستنی دوعاکانە بۆ بەندەکان، وە کاتی خۆی پێیان خۆش بوو کە بۆ ئەم دوعاو نزایانە هەموو ڕۆژێك چوار جۆریان کۆبکەنەوە:

بەڕۆژوو بوون و صەدەقەکردن با کەمێکیش بووبێت، وە سەردانی نەخۆشێك، وە ئەسپەردەکردنی جەنازەیەك، لە فەرموودەدا هاتووە: ((مَنْ جمَعَ بينَ هذهِ الأَربَعِ فِي يَومٍ.. غُفِرَ لَهُ )) وە لە ڕیوایەتێکی تردا((دخلَ الجَنَّةَ)) [٢]،

واتە: ئەوەی هەرکەسێك ئەم چوار صیفەت و چاکەیە لە خۆیدا کۆبکاتەوە، ئەوا خودا لێی خۆش دەبێت، وە دەچێتە ناو بەهەشتەوە.

ئەگەر توانی هەندێکیان ئەنجام بدات و هەندێکیانی بۆ نەدەکرا، ئەوا پاداشتی ئەوەی دەدرێتەوە کە هەمووی جێبەجێ کردبێت، بە هۆی نیەت باشیەکەیەوە.

وە کاتی خۆی پێیان ناخۆش بوو کە ڕۆژێکیان لێبڕوات و چاکەو خێرێکیان تێدا نەکردبێت، با بەبەخشینی دەنکە خورمایەکیش بووبێت، یان سەلکە پیازێك، یان پارچە نانێك. چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

((الرَّجُلُ فِي ظِلِّ صَدَقَتِهِ حتَّى يُقضَى بينَ النَّاسِ))[٣]. واتە: پیاو لە ژێر سایەی صەدەقەو چاکەکانیایەتی، تا ئەو ڕۆژەی دادوەری خەڵکی دێتە پێش.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: ((إتَّقوا النَّارَ ولَو بِشِقِّ تَمرَةٍ))[٤]،

واتە: خۆتان لە ئاگر بپارێزن با بە بەخشینی لەتە خورمایەکیش بێت.

---

(١) قوت القلوب(٢٢/١) والدعاء الأخير منه رواه الترمذي (٥٧٩) وابن ماجه(١٠٥٣).

(٢) رواه مسلم(١٠٢٨)، ولفظه عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: **قال رسول الله ﷺ من أصبح منكم اليوم صائما، قال أبوبكر (رضي الله عنه) أنا، قال: فمن تبع منكم اليوم جنازة؟ قال أبوبكر (رضي الله عنه) : أنا، قال: فمن أطعمَ منكمُ اليومَ مسكيناً؟ قال أبوبكر (رضي الله عنه) : أنا، فقال رسول الله ﷺ : ما اجتمعن في أمرئٍ إلاَّ دخلَ الجنَّة، ورواية( غفر له)** أوردها صاحب القوت( ٤٢/١).

(٣) رواه ابن حبان في صحيحه(٣٣١٠)، والحاكم في المستدرك(٤١٦/١).

(٤) رواه البخاري (١٤١٣)، ومسلم (١٠١٦).

(حەزرەتی) عائیشە دەنکە ترێیەکی دا بە سواڵکەرێك و ئەویش لێی وەرگرت، هەندێك لەوانەی لە لای بوون سەیری یەکترییان دەکرد،وەك ئەوەی بە بێ نرخ سەیریان کردبێت،ئەویش فەرمووی:چیتانە! ئەوەی کە من پێم دا چەندین مسقاڵی وردی زۆری تێدایە (ئەوەی کە خۆر لێی بدات دەردەکەوێت)[1]،

وە پێشینەکان پێیان باش نەبووە دەس بەرووی سواڵکەرەوە بنرێت، چونکە ڕەوشتی پێغەمبەرﷺ وابووە: داوای هەرچییەکیان لێبکردایە نەیدەفەرموو نیە، ئەگەر نەیشی توانیایە بێدەنگی هەڵدەبژارد[2]،

وە لە فەرمودەدا هاتووە: (( **يُصبحُ ابنُ آدَم وعَلى كُلِّ سُلامىَ مِن جَسَدِهِ صَدَقةٌ، فأمرُكَ بالمَعروفِ صدَقَةٌ، ونَهيُكَ عَن المُنكَرِ صَدَقةٌ، وحَملُكَ عَنِ الضَّعيفِ صدَقةٌ، وهِدايَتُكَ إلى الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ، وإماطَتُكَ الأَذَى صَدَقَةٌ، وركعَتَا الضُّحَى تَأْتِي عَلى ذلِكَ كُلِّهِ، أَو تَجمَعُ ذلِكَ كُلَّهُ** ))[3]،

ئادەمیزاد ڕۆژی لێدەبێتەوە، هەمووبڕگەیەکی جەستەی کە سێصەدوشەست بڕگەیە صەدەقەیەکیان لەسەرە، فەرمانکردنت بە چاکە صەدەقەیەو، ڕێگەگرتنت لە خراپە بەچاکەبۆت دەنوسرێت، شتێك بۆکەسێکی بێ هێز هەڵبگریت صەدەقەیە، وە هەروەها ڕێنمایی ڕێگای کەسێك بکەیت، وە تەنانەت بەردو کۆسپێك لەڕێگەی خەڵکدا لابدەیت هەمووی بە چاکە بۆت دەنووسرێت، تا هاتە سەر باسی لاَ إِلَهَ إلاَّ الله و سوبحانەڵلا کردن و لە پاشان فەرمووی: ئەو دووڕکاتەی سوننەتی ضوحاو چێشتەنگایش کە دەیان کەیت خێرەکەی دێت بەسەر هەموویاندا، یان خێری هەموویان کۆدەکاتەوە.

(١) قوت القلوب١/٤٢.

(٢) رواه مسلم(٢٣١١)، والبزاز(٦٤٣٩).

(٣) رواه البخاري(٢٩٨٩)، ومسلم (٧٢٠) واللفظ له.

# جیاوازی ویردەكان بە گوێرەی جیاوازی حاڵەتەكان

بزانە: ئەوەی موریدی وەرگرتنەوەی بەروبوومی كێڵگەكانی ژیانی دوارۆژ بێت، سالیك و ڕێبواری ڕێگای قیامەت بێت، یەكێك لەم شەش حاڵەتە دەیگرێتەوە، یان ئەو كەسە عابیدە و كاتەكانی بۆ بەندایەتی تەرخان دەكات، یان زانایەو خەڵكی لێی سوود مەند دەبن، یان فێرخوازە، یان كاربەدەست و فەرمان ڕەوایە، یان كاسبكارە، یان كەسێكی یەكتاپەرستە، كە ڕۆچووبێت لە زیكرو یادی خودای بەدەسەڵاتداو وازی لە هەموو شتێكی تر هێنابێت.

## یەكەم: عابید

ئەوەی خۆی تەرخان كردووە بۆ بەندایەتی بۆ خودای(عَزَّ وجَلْ)، هیچ كارێكی نیە جگە لە بەندایەتی نەبێت، خۆ ئەگەر واز لە عیبادەت بهێنێت بێ كار دەمێنێتەوە، ئەو كەسە بەپێی ئەو ڕێكخستنەی كە بەسمانكرد ویردەكانی بكات.

بەڵێ، دوور نیە كە وەزیفەكەیشی گۆڕانی بەسەردا بێت، بەوەی كە زۆربەی كاتەكانی، یان بە نوێژ، یان بە خوێندنەوەی قورئان، یان بە تەسبیحات بەسەر بەرێت، وەك دەزانین كە لە صەحابەكان هەندێكیان لە ڕۆژێكدا ویردەكەی دوانزەهەزار تەسبیحات بووە[١]،

وە هەندێكی تریان لە ناودا بوو كە سێ هەزار تەسبیحاتی كردووە، وە هەندێكیان ویردەكەیان سێ صەد ڕكات تا شەش صەد ڕكات نوێژی بووە، تا دەیانگەیاندە هەزار ڕكات، وە كەمترینی ئەوەی لەو كەسانەوە پێمان گەیشتووە، لە شەووڕۆژێكدا صەد ڕكات نوێژ بووە[٢]،

---

(١) وەك ئەبوهورەیرە (خودای لێ ڕازی بێت) روی ذلك عنه ابن أبي شيبه في المصنف (٢٧٢٦٩) وابن عساكر في تأريخ ٦٧(٣٦٣).

(٢) قوت القلوب١/٤٠-٤١.

وه هەندێکیان زۆربەی ویردەکەیان خوێندنەوەی قورئان بووە، هەندێکیان لە ڕۆژێکدا یەك خەتمی تەواوی قورئانی دەکرد، وە لە هەندێکیشیان دەگێڕنەوە کە دوو خەتمی قورئانیان کردووە، وە هەندێکیشیان شەووڕۆژێکیان بەسەر دەبرد، تەنها لە بیر کردنەوەی یەك ئایەتدا، وە بەردەوام دەیوتەوە.

یەکێك لەوانە کورزی کوڕی وەبرە بووە، کە لە مەککەدا نیشتە جێ بوو، لە هەموو ڕۆژێکدا حەفتا جار بە تەواوەتی تەوافی کەعبەی دەکرد، هەر تەوافێك حەوت جار سوڕانەوەیە بە دەوری ماڵی خوادا، لەگەڵ ئەمەیشدا لەو شەووڕۆژەدا دوو خەتمی قورئانی دەکرد، ئەو ڕۆشتنە پێوانەکەی دە فەرسەخی دەکرد، وە لە گەڵ هەموو تەوافێکیشدا دوو ڕکات نوێژی دەکرد، هەمووی کردیە دووصەدو هەشتا ڕکات نوێژ، وە دوو خەتمی قورئان، وە دە فەرسەخ ڕۆشتن، کە پێوانەی پیادەڕەوی تەوافەکانی بووە[١].

**ئەگەر وتت:** کام لەم ویردانە لە هەموویان لە پێشترە کە کاتەکانی پێ بدات؟ بزانە: خوێندنەوەی قورئان بە پێوە لە ناو نوێژدا لەگەڵ بیرکردنەوەدا، هەموو ویردە نایابەکان کۆدەکاتەوە، ئەوەندە هەیە لەوانەیە کە نەتوانێت بەردەوام بێت لەسەری، کەواتە گەورەیی ئەم ویردانە دەگۆڕێت بە گۆڕانی کەسەکان و حاڵەکانیان، وە مەبەستیش لەویردەکان تەزکییەو پاڵفتەکردنی دڵ و دەروونی خاوەنەکەیەتی، وە ڕازاندنەوەیەتی بە زیکری خودای (عَزَّ وجَلْ)، تا پێی دابێت و، ئالوودەی زیکرو یادی خودا ببێت.

کەواتە مورید دەبێت سەیری دڵی خۆی بکات؛ بزانێت کام لەم ویردانە باشترو زیاتر کاریگەریی هەیە لەسەر دەروونی، با لەسەر ئەو ویردە بەردەوام بێت، ئەگەر هەستی کرد لێی ماندوو بووە، با بیگوازێتەوە بۆ زیکر و ویردێکی تر.

بۆیە دەبینین باشترین هەڵبژاردە بۆ زۆربەی کەسەکان وەك وتمان؛

---

(١) وەك لە قوت القلوب دا هاتووە(٤١/١)،

دابەشکردنی ئەم خێرە جیاوازانەیە بەسەر کاتە جیاوازەکاندا، وە خۆی بگوازێتەوە لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تر، چونکە زۆربەی سرووشتی تاکەکان ماندووبوونە لەوەی لەسەر یەك جۆر بەردەوام بن، تەنانەت حاڵی یەك کەسیش لەسەر حاڵەتێك نامێنێت و، جیاوازی لێ پەیدا دەبێت. بەڵام ئەگەر لە نهێنی و حیکمەتی وردەکان تێگەیشتنی پەیداکرد، ئەوکاتە با شوێنی واتاکانیان بکەوێت، بۆ نموونە ئەگەر جۆرێکی تەسبیحاتی بیست، وە هەستی پێ کرد کە کاریگەری لەسەر دڵی پەیداکردووە، با بەردەوامی لەسەر بکات، مادەم کاریگەری لەسەر دڵی هەبێت.

دەگێڕنەوە لە ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەمەوە (خودای لێ ڕازی بێت) کە لە یەکێك لە ئەبدالەکانی گێڕاوەتەوە:

کە شەوێکیان لەسەر کەناری دەریایەك هەستاوە و شەونوێژی دەکرد، دەنگێکی بەرزی دەبیست بە تەسبیحاتەوەو کەسیشی نەدەبینی، فەرمووی: تۆ کێیت کە دەنگت دەبیستم و خۆت نابینم؟ فەرمووی: من یەکێکم لە فریشتەکان، کاروباری ئەم دەریایەم پێ سپێرراوە، لەوەتەی خودا دروستی کردووم، ئەم جۆرە تەسبیحاتەی بۆ دەکەم، وتم: ناوت چییە؟ فەرمووی: موهەلهیائیل! وتم: پاداشتی چەندێکە کەسێك بیخوێنێت؟ فەرمووی: هەرکەسێك صەد کەڕەت بیخوێنێت.. نامرێت تا هەر لە دونیادا جێگەی خۆی دەبینێت لە بەهەشتدا، یان جێگاکەی بۆ دەبینن[1]،

تەسبیحەکەیش ئەمەیە:(( **سُبحانَ اللهِ العَليِّ الدَّيّان، سُبحانَ اللهِ الشَّديدِ الأَركانِ، سُبحانَ مَنْ يَذهَبُ بالليلِ ويَأتي بالنَّهار، سُبحانَ مَنْ لاَيشغِلُهُ شانٌ عَنْ شانٍ، سُبحانَ اللهِ الحَنَّانِ المَنَّانِ، سُبحانَ اللهِ المُسَبّحِ في كُلِّ مَكانٍ**))

پاکی و بێگەردی بۆ خودای بەرزو بڵند، کە پاداشتی بەندەکانی دەداتەوە،

(١) قوت القلوب١/٤٠.

سوبحانەڵلا چەندێك ئەركان و پایەكانی عیززەت و گەورەیی و عەرشەكەی بتەوو بەهێزە، سوبحانەڵلا كە شەو دەڕوێنێت و ڕۆژیش دەهێنێت، وە هیچ كارێك سەرقاڵی ناكات و نەتوانێت كارێكی تر بكات، سوبحانەڵلا! چەندێك بەسۆزو نەرم و میهرەبانی، پاكی بۆ ئەو خودایەی لە هەموو جێگەیەكەوە تەسبیحاتی بۆ دەكەن. ئەم تەسبیحاتە و هاووێنەكانی ئەگەر مورید بیبینێت و، كاریگەری لەسەر دڵی هەبێت، با بەردەوام پێیەوە خەریك بێت، وە هەرچییەكی تریش زانی كە دڵی پێی ئاسوودەیەو، دەروازەی خێری لێدەكاتەوە، ئەوا با بەردەوام بێت و وازی لێ نەهێنێت.

## دووهەم: ئەو زانایەی كە بە فەتواكانی، یان بە دەرس وتنەوەی، یان بە دانراوەكانی، خەڵكی لێی سوودمەند دەبن:

ڕێكخستنی ئەورادی ئەم زانایە جیاوازە لەگەڵ ویردی عابیدەكە، چونكە زاناكە پێویستی بە متاڵای پەڕاوەكان هەیە، وە پێویستی بە نوسین و دانان و گەیاندن هەیە، وە بە دڵنیاییەوە پێویستی بە كاتێكی تایبەتی هەیە، ئەگەر دەگونجا كاتەكانی خۆیی بۆ تەرخان بكات، ئەوە لەهەموو ویردێكی تر باشترە بۆی، با دوای نوێژە فەرزەكان و سوننەتە ڕاتیبەكان خەریكی ئەو كارانە بێت، چونكە سوودەكەی بۆ كەسانێكی تر دەبێت.

بەڵگەیشمان بۆ ئەم بابەتە: هەموو ئەوانەیە كە باسمانكردووە لە گەورەیی فێربوون و فێركردندا لە (پەڕاوی زانست)، چۆن دەبێ وانەبێت؟

كە لە ئەصڵی زانستدا فەرمانی تێدایە، بە بەردەوام بوون لەسەر زیكری خوداوەندی گەورە، وە سەرنجدان لەوەی كە خودا فەرموویەتی و پێغەمبەریش ﷺ گەیاندوویەتی، كە مایەی گەیاندنی سوود و قازانجیشە بۆ خەڵكی، وە هۆكاری ڕێنماییشیانە بۆ سەر ڕێگای ڕاست، زۆر جار ڕێ دەكەوێت فێربوونی تەنها یەك پرسی گرنگ، دەبێتە هۆی چاكسازی لە عیبادەتی تەواوی

تەمەنیدا، کە ئەگەر فێری نەبوایە، لەوانەبوو لەسەر هەڵە بڕۆشتایەو بەندایەتیەکەیشی زایە ببوایە.

ئەو زانستەی کە مەبەستمانە و،پێشی دەخەین بەسەر عیبادەتدا، ئەو زانستە یە کەحەزو خواستی خەڵکی ڕادەکێشێت بۆبیرکردنەوە لەدوارۆژو،دروستکردنی گیانی دونیا نەویستی،یان ئەو زانستەی یارمەتیان دەدات لەسەر سلوك و گرتنە بەری ڕێگای ئاخیرەت،بۆیە فێری دەبن،کە کۆمەکی دۆزینەوەی ئەو ڕێگەی دوارۆژەیان پێبکات،نەك ئەو زانستە دونیاییانەی کە زیاتر تەماح و حەز و خۆشەویستی دونیاوجاهو کەسایەتی ناوخەڵکوشۆرەتیان لە دڵا بۆ زیاد دەکات.

کەواتە باشتر وایە بۆ زانا، کە کاتەکانی بکات بە چەند بەشێکەوە؛ دیارە ئەگەر هەموو کاتەکانیشی بۆ وەرگرتنی زانست تەرخانی بکات، لێی ماندوو دەبێت و بەرگە ناگرێت، کەواتە پێویستە لە دوای نوێژی بەیانی تا خۆر هەڵاتن تەرخان بکات بۆ زیکرو ویردەکان، وەك لە زیکری یەکەمدا باسمان کرد.

وە لە دوای خۆرکەوتن تا گەرم بوونی خۆر، خەریکی فێرکردن و وانە وتنەوە بێت، ئەگەر کەسانێکی لابوو، کە حەزیان دەکرد لە زانستە دوارۆژییەکان خۆیان فێر بکەن، بەڵام ئەگەر کەسێکی وای دەس نەدەکەوت، با ئەو کاتە خۆی خەریك کات بە بیرکردنەوەوە، وە بیر لەو پرسە گرنگ و نارەحەتە ئاینیانە بکاتەوە، کە واتاکانیان بە ئاسانی نازانرێن، چونکە دڵێکی صەفادراوو پاڵفتەکراو، دوای ئەوەی لە زیکرەکەی لێدەبێتەوە، وە پێش ئەوەی سەرقاڵی کاروباری دونیاببێت، چاکتر دەتوانێت بە بیرتیژییەوە پرسە قورس و گرانەکان لێکدانەوەیان بۆ بکات.

وە لەکاتی گەرمیی ڕۆژدا تا کاتی عەسر تەرخان بکات بۆ نوسین و، دانانی کتێب و متاڵاکردنی پەڕاوەکان، واز لەم ئەرکەی نەهێنێت، مەگەر لە کاتی خواردن و دەستنوێژونوێژە فەرزەکان و،کەمە نوستنێکی پێش نیوەڕۆ بارۆژیش درێژ ببێت.

وە لە کاتی عەسرەوە تا کاتی زەردایی کەنارەکانی ئاسمان، با خەریك بێت بەو

دەرسانەی دەخوێنرێنەوە بۆی، لە تەفسیر و فەرموودە و زانستە بەسوودەکان.

وە لە کاتی زەردایی کەنارەکانی ئاسمانەوە تا خۆر ئاوابوون، با خەریکی زیکرو ویردو تەسبیحات و داوای لێخۆش بوون بێت لە خودا.

کەواتە ویردی یەکەمی پێش هەڵاتنی خۆر، بە هۆی کاری زوبانەوە دەیکات، وە ویردی دووهەمیشی بە کرداری دڵ دەبێت و دەنوسرێت، ئەمەیش بە بیرکردنەوە دەبێت تا خۆرگەرم بوون، وە ویردی سێیەم تا کاتی عەسر تەرخانە بە کاری چاوو دەست، بە موتاڵاکردن و نوسین، وە ویردی چوارەم:

لە عەسرەوە بە هۆی بیستن و گوێ بیستییەوە ئەنجام دەدرێت، بۆ ئەوەی دەست و چاوی پێ ئاسوودە بێت، چونکە نوسین و متاڵاکردن لە دوای عەسرەوە، لەوانەیە کە زیان بە چاوی بگەیێنێت، وە لە دوای زەردبوونی کەنارەکانی ئاسمان بگەڕێتەوە بۆ زیکری زوبان، کەواتە:

ساتە وەختێك نامێنێت کە بە فیڕۆ لەدەستی بدات، هەمووی بە کرداری ئەندامەکانی لەش و ئامادەباشی دڵەوە پێی سەرقاڵ دەبێت.

وە لە شەویشدا باشترین بەشکردنی کاتەکانی، بەو شێوەیە کە ئیمامی شافیعی دیاری کردووە، کە شەوەکەی بۆ دەکات بە سێ بەشەوە:

بەشێکی بۆ خوێندنەوەی پەڕاوەکان، وە ڕێکخستنی زانستەکانی، کە سەرەتای شەوەکەیەتی، وە سێیەکێکی تریشی بە نوێژەوە خەریك بکات، وە سێیەکی ئەخیریشی بە نوستن بباتەسەر، ئەم دابەشکردنە بۆ شەوی زستان ئاسانە، بەڵام لە شەوانی هاویندا لەوانەیە نەتوانێت بەم شێوەیە بەردەوامبێت لەسەری، مەگەر ماوەیەکی زیاتر بە ڕۆژدا نوستبێت، ئەمەی کە ڕامانگەیاند، پێمان باشە بەم شێوەیە زانا کات و ویردەکانی دابەش بکات [1].

---

(١) غەزالی ئەم ئیحیایەی لە ماوەی صەد ڕۆژدا نوسیوە بە زیکرو تیلاوەیشەوە، إتحاف ١٧٣/٥.

## سێیەم: فێرخواز:

خەریکبوون بە فێربوونەوە خێردارترە لە خەریك بوون بە زیکر وسوننەتەکانەوە[1]، حوکمەکەی وەك و کاری زانا وایە کە خەریکی زانستە، چۆن ئەو تەرتیبی ویردەکانی کرد، ئەمیش بەهەمان شێوە ویردەکانی ڕێك بخات، ئەوەندە هەیە کە خەریکی فێربوون دەبێت، وەك چۆن زانا خەریکی فێرکردنی خەڵکی دەبێت، وە فێرخواز خەریکی نوسینەوە و نوسینی پەراوێزو کۆمێنت لەسەر نوسینی پەڕاوەکان دەبێت، وەك چۆن زانا خەریکی نوسین و دانانی پەڕاوە.

وە کاتەکانیشی وەك لە پێشەوە بۆ زاناکان باسمان کرد. ئاوا ڕێکیان بخات.

وە هەموو ئەو باسانەی لە گەورەیی زانست و فێربووندا بەبەڵگە هێنامانەوە، دەریدەخات کە فێربوونیش ئەوەندە خێری هەیە، بەڵکوو تەنانەت ئەگەر فێرخوازیش نەبوو، بەو شێوەی کە بتوانێت با ڕای خۆی و پەراویزی تایبەتی لەسەر نووسراوەکان بنوسێت و بخوێنێت، بۆ ئەوەی ببێت بە زانا، ئەگەر ئەمەیشی پێینەکرێت، تەنها ئامادەبوونی بۆ دانیشتنەکانی زیکرو ئامۆژگاری و زانست وەرگرتن، ئەوە خێردارترە بۆی، لەوەی کە خەریکی زیکرو ویردەکانی بەرەبەیان و دوای خۆر کەوتن و کاتەکانی تر بێت، چونکە سوودی لێ وەردەگرێت، وەك لە فەرموودەدا هاتووە:

ئامادەبوونی دانیشتنێکی زیکرو وەبیرهێنانەوە، لای خودا گەورەترە لە هەزار ڕکات نوێژی سوننەت، وە لە ئامادەبوونی ئەسپەردەکردنی هەزار جەنازە و، سەردانی هەزار نەخۆش![2]

---

(١) بەڵکو خەریك بوون بە زانست بۆخۆی خەریك بوونە بە زیکر، چونکە ئەو عیلمەی فێری دەبێت، بەو هۆیەوە دەتوانێت و دەزانێت زیکری خودایش بە چاکی بکات. کەواتە بە زیکر بۆی دەژمێررێت، الإتحاف( ١٧٣/٥).

(٢) قوت القلوب ٦٧/١، وانظر الإتحاف( ٩٩/١).

وه لەم بارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( **إذا رأيتُمْ رياضَ الجَنَّةِ فارْتَعُوا فيها، فقيلَ يارسولَ الله: ومَا رِيَاضُ الجَنَّةِ؟ قالَ حِلَقُ الذِكرِ**))[1].

واتە: ئەگەر داتان بەلای باخچەی بەهەشتدا ئەوا لابدەن و لێی بەهرەمەند بن، وتیان ئەی پێغەمبەر خودا؛ باخچەی بەهەشت کامەیە؟ فەرمووی: دانیشتنە بۆ زیکر کردن بە ئەڵقە و خڕی.

کەعبی ئەحبار (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ئەگەر پاداشتەکانی دانیشتنی زیکرەکان بۆ ئەو خەڵکە دەربکەوتایە، ئەوا شەڕیان لەسەردەکرد، تا بەریان بکەوێت، تەنانەت خاوەن ئیمارەت و فەرماندەکانیش وازیان لە فەرماندەیی دەهێنا، وەك بازاڕیەکان وازیان لەبازاڕ دەهێناو، هەموو ڕوویان لە زیکر دەکرد[2].

هەروەها (حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: پیاوی وا هەیە لە ماڵەکەی دەردەچێت، گوناهی وای بەسەرشانەوەیە، بە قەدەر کەژەکانی (تهامه)، ئەگەر گوێبیستی ئامۆژگاریەکانی زانایەك ببێت، دەترسێت و لە گوناهەکانی پەشیمان دەبێتەوە، وە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو، تەنها گوناهێکیشی بەسەر شانەوە نەماوە، هەرگیز واز لە مەجلیسی زاناکان مەهێنن، چونکە خودای (عَزَّ وجَلْ) لەسەر زەویدا خاکێکی دروست نەکردووە گەورەتر و پیرۆزتر بێت لەو جێگەی زاناکانی تێدا دادەنیشن و، ئامۆژگاری دەکەن.

پیاوێك وتی بە حەسەنی بەصری (خودای لێ ڕازی بێت): سکاڵای دڵ ڕەقی خۆم بۆ حزوری خودا دەبەم، فەرمووی: کەواتە دڵت نزیك بکەرەوە لە دانیشتنەکانی زیکرو یادەکان[3].

---

(١) رواه الترمذي(٣٥١٠). وصححه.

(٢) نسبه الحافظ الزبيدي في الإتحاف( ١٧٤/٥): أبي نعيم في الحلية.

(٣) رواه البيهقي في الشعب(٦٩١).

عەمماری زاهید و دونیا نەویست، ئافرەتێکی صاڵیحەی بینی مسکینەی (طەففاویە) بوو، وە هەمیشە بەردەوام بوو لەسەر زیکر و حەلقەی زیکر، فەرمووی: مەرحەبا ئەی میسکینە! فەرمووی: ئەوە چی دەڵێت؟ وانابێت، ئەو مسکینە و حاڵەتە هەژاریە ڕۆشت و ئێستا دەوڵەمەندی هاتووە، فەرمووی: چۆن؟ ئافرەتە صاڵحەکە فەرمووی: چی دەڵێیت بەرامبەر کەسێك، کە هەموو بەهەشتی خراوەتە بەردەست ، خۆی و هەموو دەروناوو کەنارەکانی.

فەرمووی: بەچی ئەم خەڵاتەت وەرگرتووە؟ فەرمووی: بەو دانیشتنانەی لە ناو ئەڵقەی زیکرو یادی خوادا بەشداریم کرد و لێی بەهرەمەند بووبووم[1] .

**کورتەی ئەم بابەتە:** ئەو گرێ و گۆڵانەی کە بە هۆی ئامۆژگاریی زانایەکی ڕەوشت بەرزەوە چاك دەبێت و، گومانێك کە هەیبێت برەوێتەوە، بە تایبەتی لاچوونی خۆشویستنی دونیا، ئەوە زۆر گەورە و چاکترو بە پێزترە، لە چەندین ڕکاتی زۆری نوێژ، کە دڵی لە کاتی نوێژەکەدا سەرقاڵی خۆشویستنی دونیا ببێت.

## چوارەم: ئەو کاسبکارەی کە بۆ بژێوی ژیانی خانەوادەکەی پێویستی بە هەوڵ و کەسابەت هەیە:

بۆی نیە خێزانەکەی زایە بکات و، خۆیشی خەریکی بەندایەتی بێت، بەڵکوو ویردی ئەم خاوەن پیشەیە لە کاتی صنعەتکاریدا چوونە ناو بازاڕە، وە خەریك بوونی کارەکەیەتی، بەڵام ئەوەندە هەیە، نابێت زیکری خودا لەبیر بکات لەکاتی کەسابەت کردنەکەیدا، بەڵکوو بەردەوامیش بێت لەسەر زیکر و تەسبیحات و خوێندنەوەی قورئان، ئەو ویردانە لەوانەیە کە کۆیکاتەوە لەسەر کارەکەی، تەنها ئەوەندەی بۆ ناکرێت کە لەگەڵ کارەکەیدا نوێژیش زۆر بکات، مەگەر باخەوان بێت، ئەوە دەتوانێت لەگەڵ زیکرو کارەکـــەیشی دا، نوێــژ و ویردەکانیشی بخوێنێت.

---

(١) رواها ابن أبي الدنيا في المنامات(١٤٧)، والدينوري في المجالسه وجواهر العلم (ص/٥٩٥).

لەپاشان با سەیری خۆی بکات، هەرکاتێك بەشی ژیانی ئەو ڕۆژەی پەیدا کرد، ئەوا با بگەڕێتەوە بۆ ڕێکخستنی ویردەکانی، وە ئەگەر بەردەوامیش بوو لەسەر کەسابەت و زیادەکەیشی کرد بە خێرو صەدەقە، ئەوە لە هەموو ئەو ویردانەی کە باسمان کرد خێری زیاترت بۆ دەنوسرێت، چونکە ئەو عیبادەتەی سوودەکەی سەردەکێشێت بۆکەسانێکی تر، چاکترە لەو عیبادەتەی تەنها لە جێگەی خۆی و بۆ خۆی دەمێنێتەوەو، کەسێکی تر لێی بەهرەمەند نابێت.

هەروەها چاکە و صەدەقە لەسەر ئەم نیەتەیە، عیبادەتێکە لە خودای گەورەوە نزیکی دەخاتەوە، لە پاشان کەسانێکی تریش لێی سوود مەند دەبن، وە بەرەکاتی دوعاو نزای موسوڵمانانیش بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، ئیتر پاداشتەکەی چەندین بەرابەر زیاد دەبێت.

## پێنجەم: فەرماندار:

وەك پێشەواو قازی و دادوەرو، سەرپەرشتیاری کاروباری موسوڵمانان، ئەو کەسەی کە ئەم بەرپرسیارییەی هەبێت، ئەوا هەستانی بە کاری موسوڵمانان، وە جێبەجێکردنی ئامانج و مەبەستەکانیان بە پێی شەریعەتی ئیسلام، وە بە دڵسۆزی و ئیخلاصەوە، خێری زیاترە لەو ویردانەی کە باسمان کرد.

کەواتە پێویستە لەسەری، بە ڕۆژدا خەریکی ڕاپەڕاندنی کاروباری خەڵکی بێت و، تەنها فەرزەکان ئەنجام بدات و، بە شەویشدا ویردە باسکراوەکان بخوێنێت. وەك چۆن (حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) دەیکرد، وەك دەفەرموێت: من چیبکەم لە نوستن، خەوتن چیم بۆ دەکات، ئەگەر بە ڕۆژدا بنووم موسوڵمانەکان و کارەکانیان زایە دەکەم، وە ئەگەر بە شەویشدا بمرم، ئەوا خۆم زایە دەبم[1].

---

(١) رواه الدينوري في المجالسة(ص/٦٠٤)، وابن عساكر في تأريخ دمشق(٢٧٣/٤٤)، وكان هذا جوابا لابن العاص سأله: بلغني يا أمير المؤمنين أنك لا تنام بالليل ولا بالنهار إلا مغلبا.

لەمەی باسمان کرد ئەوەی لێ تێ گەیشتم، کە دووشت هەیە پێش ئەو عیبادەتانە دەکەوێت کە بە جەستە ئەنجام دەدرێن:

**یەکەمیان:** خەریك بوون بە فێربوونی زانست، وە **دووهەمیان:** هەڵس و کەوتی نەرم و نیانی لەگەڵ موسوڵمانان و بەرژەوەندییەکانیاندا، چونکە ئەم کارانە بۆ خۆیان بە کردارێکی پەسەند دەژمێررێن، وە عیبادەتێکیشی گەورەترە لە بەندایەتیەکانی تر، چونکە سوودەکەی لەسنووری خۆی نامێنێتەوەو خەڵکێکی تریش دەگرێتەوە، بۆیە پێش جۆرەکانی تری بەندایەتی دەکەون.

## شەشەم: ئەو یەکتاپەرستەی کە بەتەواوی بیروهزری لای خوداوەندی تاك و تەنهایە و، رۆچووە لە یەکتا پەرستی دا:

کە رۆژی لێ هەڵدێت، تەنها یەك خەمی لە پێشە[1]، ئەویش هەوڵدانیەتی بۆ خۆشویستنی خوداو، تەنها لەویش بترسێت، وە بە هیوای رزق و بژێوی لەکەسەوە نیە لەو زاتەوە نەبێت، وە سەیری هەرشتێك بکات بەرواڵەت هەرچییەك بێت ئەو خودای گەورەی تێدا دەبینێت.

کەواتە ئەوەی پلەی بەندایەتی بەرز بێتەوەو بگاتە ئەم پلەیە، پێویستی بەوە نیە کە جۆری ویردەکانی جیاواز بن و، گۆڕانکاریان تێدا بکات، بەڵکوو ویردەکانی دوای بە جێهێنانی فەرزەکان دەبێتە یەك ویرد، کە ئامادەبوونی دڵیەتی لە حزوری خودای خۆیدا، لە هەموو حاڵەتەکاندا، ئەوانە خەتەرەیەك روو ناکاتە دڵیانەوە لە حزورو ئامادەباشی دووریان بخاتەوە، وە هەرگیز گوێیان

---

(١) روى الحاكم في المستدرك(٤٤٣/٢)، مرفوعا: (**مَن جعلَ الهُمومَ هَمّاً واحداً. كفاهُ اللهُ هَمَّ دُنياهُ، ومَنْ تَشَعَّبَت بهِ الهُمومُ، لَمْ يُبالِ اللهُ في أيِّ أودِيَةِ الدُّنيا هَلَكَ**)، وروى ابن مبارك في الزهد(٨٥٨) عن الحسن (رضي الله عنه) قال : قال عامر بن عبد قيس لقومٍ ذكروا الدنيا: **وإنَّكم لَتَهتَمُّونَ؟! واللهِ لئِن استَطعتُ ..لأجعلنَّها همّاً واحداً. قال الحسن: ففعل والله ذلك حتى لحق بالله.**

به دەنگێکی نامۆ نازرنگێتەوە، سەرقاڵی بابەتێکی تریان بکات، وە دیمەنێك یان تابلۆیەکی کێشراو نایەتە بەرچاویان، کە پەند و ئامۆژگاری لێ وەرنەگرن، وە بیرکردنەوەی باشتریان پێ بدات وحاڵێکی باشتریان پێببەخشێت،وایان لێ دێت هیچ هۆکارێك نایانبزوێنێت و نایانجوڵێنێت خودا نەبێت، وە هیچ شتێکیش نایانسرەوێنێت و دایان نامرکێنێتەوە جگە لە خوداوەندی گەورەیان نەبێت.

حاڵی ئەو جۆرە کەسانە دەشێت بۆ ئەوەی کە هۆکار بێت بۆ زیاد بوونی حاڵەتەکانیان و، کردنەوەی زیاتری چاوی دڵیان و، نەمانی دیمەن و وێنە ڕوکەشیەکان و، بینینی وێنە ڕاستەقینەکان و واتا و ناوەرۆکەکانیان،کە هەموو شتێك هەر لە خوداوە ببینێت و بەخواوە بیبینێت، ئیتر جۆری بەندایەتی بۆ ئەو جۆرە کەسانە جیاوازیەکی نابێت، چونکە ئەوانە بە گیان و دڵەوە بۆ حزورو لیقای خودایی ڕایان کردووە، بەڵکوو ببێتە مایەی بیرکردنەوەیان.

وەك خودای گەورەفەرموویەتی:﴿لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ.فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ﴾(٤٩/الذاريات)

وە فەرموودەکەی خودای گەورەیان تێدا دێتە جێ کە دەفەرموێت:

﴿وَإِذِ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ، فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ يَنْشُرْ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ رَحْمَتِهِ﴾ (الكهف/١٦)، کەمادەم کەناریان گرت لە بێباوەڕەکان و، تەنها بەندایەتیشیان بۆ خودا دەکرد، کەواتە پەناببەن بۆ ئەشکەوتەکەو، چاوەنواڕی لێشاوی کەرەمی خودایی بکەن، کە دەیرژێنێت بەسەرتاندا، بۆیە خۆیان بەخوداوە دەوڵەمەندکردووە و، لا بەهیچ لایەکی تردا ناکەنەوە، وەك خودای گەورە هێما بەحاڵی ئەوانە دەکات کە دەچن بۆ حزوری خوداو بەتەمای ڕێنمایی ئەو زاتەن و دەڵێن: ﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَى رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾[1](الصافات/٩٩)

ئەمە دوا پلەی بەرزبوونەوە و پێگەیشتنی صدديق و عاریفەکانە، وە

---

(١) ڕۆشتن بۆ لای خودا، دەوڵەمەندبوونە بە خودا خۆی ، وە لە پێناوی خوادا، بە شێوەیەك کە هیچ هەواڵێکی تری نامێنێت لە غەیری خوداوە، بنواڕە الإتحاف ١٧٦/٥.

ناشتوانن بەم پلەیە بگەن، ئەگەر بە ڕیزبەندی و ڕێکوپێکی ئەو ویردانە نەخوێنن، بە بێ پچڕان و بەبەردەوامی بۆماوەیەکی درێژخایەن.

وە نابێت مورید بەوە سەرکەش ببێت، کە ئەو حاڵەتە ببیستێت و ڕای بگەێنێت کە ئەو پێی گەیشتووە و، ئیتر واز لە وەزیفەو ویردەکانی بهێنێت.

وە دەبێت بزانێت: کە نیشانەی گەیشتن بەو پلەو مقامە ئەوەیە: کە شەیتان نەتوانێت هیچ وەسوەسەو چرپەیەك بدات بە گوێیدا، وە خەتەرەی گوناهو تاوانکردنیش نەچێتە ناو دڵیەوە، وە هێرشی ناسۆرو نارەحەتیەکانی ژیان بێزاری نەکات، وە تەواوی کارە گرنگ و گەورەکانیش تورەی نەکات، کە خۆڕاگری لەدەس بدات، بەڕاستی کەم کەسی وا هەیە بتوانێت دارای ئەم صیفەتانە بێت، دەبێ کێ بێت کە خاوەنی ئەو پلەو مقامانەبێت؟!

کەواتە پێویستە لەسەر هەموان وەك باسمانکرد، بە ڕیزبەندی ویردەکانی بە جێ بهێنێت و، بەردەوام بێت لەسەریان، وە هەموویشیان دەبنە ڕێگەی لیقا و گەیشتن بە ڕەزامەندی خودا، خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَى شَاكِلَتِهِ، فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَى سَبِيلًا﴾ (الإسراء/٨٤) تۆ بڵێ: هەرکەس لەسەر ڕەوشت و مەزاج و عادەتی خۆی ئیش دەکات و دەجوڵێتەوە، جا خودای ئێوە باشتر دەزانێت کێ ڕێگای ڕاستی باشتر گرتووە[١].

کەواتە هەموویان ڕێنماییکراون و هەندێکیان باشتر ڕێگای هیدایەتیان گرتووە.

لە فەرموودەدا هاتووە: (( **الإيمانُ ثلاثٌ وثلاثوُنَ وثلاثُ مِئَةِ طَرِيقَةٍ، مَن لَقِيَ اللهَ (عَزَّ وجَلَّ) بالشَّهادَةِ على طَرِيقٍ مِنهَا دَخَل الجَنَّةَ** ))[٢].

---

(١) خۆلاصە، ل/٢٩٠.

(٢) كذا لفظه في القوت(٨٣/١)، وقد رواه الطبراني في الأوسط (٧٣٠٧) واللاكلائي في إعتقاد أهل السنة (٩٧٩/٥) وأبو نعيم في معرفة الصحابة(١٩٠٤/٤)، والبيهقي في الشعب(٨١٩٠) بلفظ: **الإيمان ثلاث مئة وثلاث وثلاثون شريعة، من وافى الله تعالى بشريعة دخل الجنة.**

که ئیمان سێ صەدو سی وسێ ڕێگەیە، ئەوەی بە خودای گەورە بگات بەشایەتدان و باوەڕبوون بە یەکێك لەم ڕێگانە ، دەچێتە بە هەشتەوە .

وە هەندێك لە زانایان فەرموویانە: ئیمان؛ سێ صەد و سیازدە جۆرو ڕەوشتی هەیە، بە ئەندازەی ژمارەی پێغەمبەران، هەر بڕوادارێك لەسەر یەکێك لەو ڕەوشتانە دەبێت، کە دەبێتە سالیك و ڕێبواری ڕێگای خودناسی، کەواتە خەڵکەکە با ڕێگەکانیشیان جیاوازبێت لە بەندایەتی دا، هەموویان لەسەر هێڵی ڕاستن، وەسیلە دەگرن بۆ لای خودا، کام ڕێگەیان بەلاوە نزیکتربێت، بەری نادەن و، بە هۆیەوە خۆیان نزدیك دەکەنەوە لە خوداوە،[١] ،

﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَى رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ﴾ (الإسراء/٥٧)

بەڵام جیاوازییەك کە هەیانبێت لە پلەکانی نزیکییاندایە بە خوداوە، نەك لە ئەصڵی پەیوەندییان بە خوداوە، وە هەرکامیان نزیکتربێت، باشتر خودا دەناسێت، وە ئەوەی خوداناستر بێت، پێویستە کە عابید و بەندەی ڕاستەقینەتر بێت، ئەوەش بیناسێت، ناتوانێت بەندایەتی بۆ کەسی تر بکات.

ئەوی گرنگەو ئەصڵی هەموو ویردەکانە بۆ هەموو چین و توێژەکان، بەردەوامییانە لەسەر ویردەکان، چونکە مەبەست لەم ویردانە گۆڕینی صیفەتە شاراوەکانی دەروونیانە، کرداره تاکەکان کاریگەرییان کەمترە، بەڵکو لەوانەیە هەست بە کاریگەری و ئاسەوارێشیان نەکرێت، ئەوەی کاریگەری بەهێز دەبێت، کە کۆی هەموو ویردەکان جێبەجێ بکات، کەواتە ئەگەر تاکە ویردو وەزیفەیەکی ئەنجامداو، ئاسەواری لە دڵیدا بە جێ نەهێلا، وە یەکسەر بەدوای ئەو ویردەدا ویردو کاری دووهەم و سێیەمیشی بەدوادا نەهێنا، ئەوا ئاساری کرداره یەکەمەکە بەتەواوی دەسڕێتەوە، وەك ئەو فەقیهەی دەیەوێت شارەزاو

(١) هەرچەندە هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە بۆ حاڵی کەسانێکی ترە. بەڵام لێرەدا پێشەوا غەزالی بۆ مەبەستی پشتڕاست کردنەوەی فەرموودەکەی خۆی بەبەڵگە هێناویەتیەوە.

تێگەیشتووی نەفس بێت و زاڵ ببێت بەسەری دا، بەڕاستی ناتوانێت ئەو فیقهو تێگەیشتنە پەیدا بکات، بەبێ ئەوەی کردارەکانی زۆر زۆر دووپات نەکاتەوە.

بۆ نموونە: ئەگەر شەوێك کردارێکی زۆری دووبارە کردەوە و، لە پاشان بۆ مانگێك و حەفتەیەك وازی لێ هێناو نەچوویەوە بەلایاندا، لەپاشان گەڕایەوە سەری و شەوێکی تر بە زۆری ئەنجامی دایەوەو زۆریش دووبارەی کردەوە، ئەوە کاریگەری لەسەری نابێت، بەڵام ئەگەر کرداری تاکە شەوەکانی دابەش بکات بەسەر تەواوی ئەو شەوانەدا کە وازی لێ هێناوەو، هەموو شەوێك بەو پێیە چەند سەعاتی بەردەکەوێت بیکردایە، ئەوا کاریگەری پەیدا دەکرد لەسەری.

لەبەر ئەم نهێنیەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(( أحَب الأعمَالِ إلى اللهِ أدوَمُها وإنْ قَلَّ))[1]،

باشترینی کردەوەکان لای خودا کە پێی خۆش بێت ، ئەوەیە کە بەردەوام بێت لەسەری، با کەمیش بێت.

وە پرسیار لە (حەزرەتی) عائیشە کرا(خودای لێ ڕازی بێت)لەبارەی کردارەکانی پێغەمبەری خوداوە ﷺ فەرمووی:

(( كانَ عَمَلُهُ ديمَةً، وكانَ إذا عَمِلَ عَمَلاً ..أثبتَهُ))[2]،

واتە: پێغەمبەر ﷺ کارەکانی بە بەردەوامی دەکرد و لەسەری بوو، وە هەر کارێکی بکردایە بە تۆکمەیی و تەواوی ئەنجامی دەدا.

هەر لەبەر ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(( مَنْ عَوَّدَهُ اللهُ تعالَى عِبادَةً، فَتَرَكَها مَلالَةً، مَقَتَهُ اللهُ عَزَّ وجَلْ))[3]،

ئەگەر خودا عیبادەتێکی بەیەکێك ببەخشێت ، وای لێ کرد کە خووی پێوە

---

(١) رواه البخاري (٦٤٦٤)، ومسلم(٧٨٣).

(٢) رواه البخاري (١٩٨٧) ومسلم (٧٤٦—٧٨٣).

(٣) قوت القلوب ٨٤/١.

بگرێت و، لەپاشان بەهۆی ماندووبوونەوە لێی بێتاقەت بوو، ئیتر وازی لێ هێنا، ئەوا خودای گەورە لێی دەڕەنجێت .

ئەمەیش هۆکاری ئەوەبو کە پێغەمبەر ﷺ لە دوای نوێژی عەسر دووڕکاتی گێڕایەوە، کە بەهۆی هاتنی وەفدێکەوە نەیتوانی لەکاتی خۆیدا بیکات، لەپاشان بەردەوام ئەو دووڕکاتەی لە دوای عەسریش دەکرد، بۆ ئەوەی وازی لێ نەهێنێت، بەڵام لەماڵەوە نەك لە مزگەوت، بۆ ئەوەی کەسی تر شوێنی نەکەوێت. وەك (حەزرەتی) عائیشـــە و (أم سلمــة) (خودایان لێ ڕازی بێت) دەیگێڕنەوە[1] ،

**ئەگەر وتت:**

ئایا کەسێکی تر بۆی هەیە شوێن ئەم کردارەی پێغەمبەرە ﷺ بکەوێت، کە دەزانین نوێژ کردنی دوای عەسر کاتێکی ناپەسەندو مەکرووهە؟

## ئەوە بزانە:

ئەو سێ واتایەی باسمانکردن لە بارەی کەراهەتەوە، بۆ ئەوەیە کە خۆی بپارێزێت و خۆی بشوبهێنێت بە خۆرپەرستەکانەوە، یان سوجدە ببات لەو کاتەدا کە شاخەشەیتان هەڵدێت لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا، یان لەبەر ئەوەیە کە بحەوێتەوە و ئیسراحەتێك بکات، نەوەکو ماندوو ببێت و لێی بێزار ببێت...

ئەم سێ واتایە هیچ کامیان لە کردارەکەی پێغەمبەردا ﷺ جێگیر نابێت، کەواتە بۆ پێغەمبەر ﷺ تایبەتە و، ناتوانرێت کەسی تر قیاسی بکرێتە سەر ئەو.

چونکە وەك زانیمان، پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەوەیش ئەنجامی دەدا نەك لە مزگەوت ، بۆئەوەی کە کەسانێکی تر چاوی لێ نەکەن.

---

(١) رواه البخاري (٥٩٠، ١٢٣٣)، ومسلم (٨٣٤، ٨٣٥)، وهاتان الركعتان كانتا بعد الظهر.

## دەروازەی دووهەم:

## باسی ئەو هۆکارانەی کاری شەو نوێژ ئاسان دەکەن، وە ئەو شەوانەی کە واچاکە بە عیبادەت زیندوویان بکاتەوە، وە باسی گەورەیی زیندووکردنەوەی شەوان و نێوانی مەغریب و عیشا و چۆنیەتی دابەش کردنی شەو.

### باسی گەورەیی زیندووکردنەوەی نێوانی مەغریب و عیشا

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی : وەك (حەزرەتی) عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) دەیگێڕێتەوە:

(( إنَّ أفضَلَ الصَلَواتِ عِندَ اللهِ عَزَّ وجَلَّ صَلاةُ المَغرِبِ، لَمْ يَحطَّها عَنْ مُسافِرٍ ولاَ عَنْ مُقيم، فَتَحَ بِها صَلاةَ اللَّيلِ، وخَتَمَ بِها صَلاَةَ النَّهارِ، فَمَنْ صَلَّى المَغرِبَ وصَلَّى بَعدَها رَكعَتَينِ، بَنَى اللهُ عَزَّ وجَلَّ لَهُ قَصرَينِ في الجَنَّة، قال الراوي: لاأدري مِنْ ذَهَبٍ أَو فِضَّةٍ، ومَنْ صَلَّى بَعدَها أَربَعَ رَكَعاتٍ غَفَرَ اللهُ لَهُ ذَنبَ عشرينَ سَنَةً، أَو قالَ: أَربَعينَ سَنَةً ))[1]،

واتە لە خێردارترین نوێژەکان لای خودای گەورە نوێژی مەغریبە، نە لەسەر کەسێك لەسەفەردا بێت یان لە ماڵەوە بێت کەمی نەکردۆتەوە، نوێژکردنی ڕۆژی پێ کۆتا هێناوە، وە نوێژی شەوی پێ کردۆتەوە، ئەوەی نوێژی

---

(١) كذا الحديث في القوت( ٢٩/١): عن هشام بن عروة عن أبيه عن عائشة (رضي الله عنها) قال العراقي رواه أبو الوليد يونس بن عبدالله الصفار في كتاب الصلاة. الإتحاف.( ١٧٩/٥). ورواه الطبراني في الاوسط(٦٤٤٥) مختصرا واسناده ضعيف أهـ، ورواه ابن شاهين في الترغيب ، وقد ساق سنده الحافظ الزيلعي في تخريج الأحاديث والآثار٣/٣٦٠).

نێواره بكات و دووڕكاتیش له دوایەوه سوننەت بكات، خودای بەدەسەڵات دوو كۆشكی نایابی بۆ دروست دەكات له بەهەشتدا (له ئاڵتوون، یان له زیو)، وه ئەگەر چوار ڕكات نوێژ بكات، خودای میهرەبان له گوناهی بیست ساڵی (یان چل ساڵی) خۆش دەبێت.

هەروەها(أم سلمة)دەیگێڕێتەوه له ئەبوهورەیرەوە(خوایان لێ ڕازی بێت)[1]، كه پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( **مَنْ صَلَّى سِتَّ رَكَعَاتٍ بعْدَ المَغربِ عَدَلتْ لَه عِبادةَ سَنةٍ كامِلَةٍ، أو كأنَّهُ صلَّى لَيلَةَ القَدْرِ**))[2]،

ئەوەی شەش ڕكاتی سوننەت بكات له دوای نوێژی مەغریب، بەقەدەر عیبادەتی یەك ساڵی بۆ دەنووسرێت، یان وەك ئەوه وایه كه له شەوی قەدری پیرۆزدا نوێژی كردبێت.

وه سەعیدی كوڕی جوبەیر دەیگێڕێتەوه له ثەوبانەوه كه پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:((**مَن عكَف نفْسَهُ ما بينَ المَغربِ والعِشاءِ في مَسجدِ جماعَةٍ، لَم يتكلَّم إلاَ بصَلاةٍ أو قُرآنٍ، كانَ حقّاً علَى اللهِ أن يَبنيَ لهُ قَصرينِ في الجنَّة، مَسيرَة**

---

(١) له قوت القلوب دا هاتووه، كه باوكی سەلەمه ڕیوایەتی كردووه له ئەبو هورەیرەوە، كه عبدالله ی كوڕی ڕافیعی حەضرەمی تابیعی میصریيه، شێخی زوبەیدیش ئەم ڕایەی پەسەند كردووه، بنواڕه: الإتحاف( ١٧٩/٥).

(٢)رواه الترمذي (٤٣٥) وابن ماجه(١١٦٧)، بلفظ: اثنتي عشرة سنة، وضعفه الترمذي، وأما قوله: **كأنَّه صلى ليلة القدر**، فهو من قول كعب الاحبار ،كما رواه أبو الوليد الصفار والديلمي في مسند الفردوس ، كما في الجامع الصحيح للسيوطي (٢٦٢/٧(٢٢٣١٥)من حديث ابن عباس: **من صلى أربع ركعات بعد المغرب، قبل أن يكلم أحداً رُفِعَت له في عليين، وكان كمَن أدرك ليلة القدر بالمسجد الأقصي**، وسنده ضعيف أهـ قلت: لفظ الحديث الذي رواه الترمذي وضعفه: **من صلى بعد المغرب ست ركعات لم يتكلم فيما بينهن بسوء، عدلن له بعبادة ثنتي عشرة سنة**، قال الزبيدي:( ١٧٩/٥): وسبب ضعفه أن فيه عمر بن أبي خشعم قال البخاري منكر الحديث، وضعفه جدا.

**كُلِّ قَصرٍ مِنهُما مِئَةُ عامٍ. ويغرِسَ لهُ بينهمَا غِراساً. لَوْ طافَهُ أهلُ الدُّنيا لوَسِعَـهُم))**[1]، ئەوەی لە مزگەوتێكدا جەماعەتی تیادا بكرێت بمێنێتەوەو خۆی ڕابگرێت و جگە لە نوێژو خوێندنەوەی قورئان هیچ قسەیەكی تێدا نەكات، ئەوا خودای گەورە پێویستی كردووە لەسەر خۆی كە دوو كۆشكی لە بەهەشتدا بۆ دروست بكات، وە ئەوەندە درەخت لە نێوانیاندا بنێژێت، كە ئەگەر هەموو خەڵكی سەر زەوی بەدەوریدا بگەڕێن جێگەی هەموویان ببێتەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(( مَن ركَع عَشْرَ رَكعاتٍ مابَينَ المَغرِبِ والعِشاء، بنَى اللهُ لهُ قصْراً في الجَنَّة فقالَ عُمَر رضي الله عنه: إذاً تُكثُرُ قصُورُنا يا رَسوُلَ الله، فقالَ صلَى اللهُ عليهِ وسلَّم: اللهُ أكثَرُ وأفضَل أو قال: أطيَبُ))**[2]،

ئەوەی دوای نوێژی مەغریب دە ڕكات نوێژی سوننەت بكات،خودای گەورەكۆشكێكی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەكات، (حەزرەتی)عومەر فەرمووی: كەواتە كۆشكی زۆرمان دەبێت ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟! فەرمووی: خودا زۆرتر و گەورەترە، یان پاك پوخت و بۆنخۆش ترە.

---

(١) كذا في القوت،( ١/ ٣٠)، ورواه أبو الفضل الوهري في (جزء يضم حديثه) (٢ ٠ ٥)، وقال ابن الملقن في البدر المنير(٧٧٠/٥): رواه الحاكم أبو أحمد في كناه، وقال الحافظ الزبيدي:( ١٧٩/٥): وبخط الحافظ ابن حجر: أسنده الديلمي من حديث ثوبان.

(٢) رواه ابن مبارك في الزهد، من رواية عبد الكريم بن الحرث مرسلا أ هـ قال الحافظ الزبيدي: (١٨٠/٥) : ورواه محمد بن نصر في الصلاة له من روايته مرسلا مختصرا ولم يذكر قول عمر، والحديث بتمامه أورده صاحب القوت من طريق محمد بن أبي الحجاج سمع عبدالكريم بن الحرث، يحدث أن رسول الله صلى الله عليه وسلم: فساقه. وعبدالكريم بن الحرث الحضرمي المصري العابد من رجال مسلم والنسائي روى عن المستورد بن شداد وجماعة، وعنه الليث وبكر بن مضر توفي سنة ١٣٦ قاله الذهبي في الكاشف.

ئەنەسی کوڕی مالیك(خوای لێ ڕازی بێت)دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **من صلَّى المغربَ في جَماعَةٍ ثم صلَّى بعدَها ركعَتَين، ولَا يَتكلَّم بشيْءٍ فيما بَينَ ذلِكَ مِنْ أمرِ الدُّنيا، يَقْرأ في الرَّكعَة الأولي بفَاتِحَةِ الكِتاب وعَشرِ آيات من أوَّلِ (سورَةِ البقَرَة) وآيتَينِ مِنْ وسَطِها: ﴿وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ ، إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ﴾..... إلي آخرِ الآية، و﴿قُل هُوَ اللهُ أحَدٌ﴾خمسَ عَشَرَة مَرَّةً، ثُمَّ يَركَعُ ويَسجُدُ. فإذا قامَ في الرَّكعَةِ الثَّانية قَرأَ: (فاتِحَةَ الكِتَاب) وآيةَ الكُرسِيِّ، وآيتَين بعدَها إلى قولِهِ: ﴿أُولئِكَ أصحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُون﴾، وثلاثَ آياتٍ مِن آخِرِ البَقَرَةِ مِن قَولِهِ عزَّ وَجَلَّ: ﴿لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِنْ تُبْدُوا مَا فِي أَنْفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُمْ بِهِ اللَّهُ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ، آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ﴾** ....إلي آخرها، و **﴿قُل هُوَ اللهُ أحَدٌ﴾ خمسَ عشَرَةَ مَرَّةً، ووَصَفَ مِن ثَوابِهِ في الحَديثِ مَا يَخرُجُ عَنِ الحَصْرِ)**[1].

واتە: ئەوەی بە جەماعەت نوێژی مەغریب بکات و، لە پاشان دووڕکات نوێژی سوننەت بکات، وە لە بارەی کاروباری دونیاوە هیچ قسەیەك لە نێوانیادا نەکات، لەڕکاتی یەکەمدا دوای سوورەتی فاتیحە دە ئایەتی سەرەتای سوورەتی (البقرة) بخوێنێت، وە دوو ئایەتیش لە ناوەڕاستەکەی.. **وَإِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ**....تا کۆتایی ئایەتەکە، وە پانزەجار سوورەتی (ئیخلاص) بخوێنێت، لە پاشان بچەمێتەوەو ڕکوع بەرێت و، لەپاش هەستانەوە سوجدە بەرێت، وە کە هەستایەوە بۆ ڕکاتی دووهەم، فاتیحە بخوێنێت، وە(**آية الكرسي**) بخوێنێت، وە دوو ئایەتیش لە دوایەوە تا دەگاتە: **أُولئِكَ أصحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُون،**

---

(١) كذا في القوت ، ٣٠/١: وسرد ما له من الجزاء طويلا. قال الحافظ العراقي: رواه أبو الشيخ في (الثواب) من رواية زياد بن ميمون عنه مع اختلاف يسير. وهو (ضعيف). إتحاف ١٨٠/٥، وانظر (تنزيه الشريعة) ١٢٣/٢.

وە سێ ئایەتی تریش لە کۆتایی سوورەی(البقرة) بخوێنێت:

لە فەرموودەی خوداوە: **لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَافِي الْأَرْضِ**، تاکۆتایی سوورەتەکە بخوێنێت، وە پانزە جاریش سوورەی ئیخلاص بخوێنێت، ئەوەندە پاداشتی هەیە کە سەر ژمێر ناکرێت.

هەروەە کورزی کوڕی وەبرە کە لە (ئەبدال)ەکانە فەرمووی: وتم بە خضر (سەلامی خودای لەسەر) شتێکم فێر بکە هەموو شەوێك بیکەم، فەرمووی:

ئەگەر نوێژی مەغریبت کرد، هەستەوە تا کاتی نوێژی عیشا دێتە پێشەوە خەریکی نوێژ کردن بە، بێ ئەوەی کە قسە لەگەڵ کەسێك دا بکەیت، وە تەنها ڕو لە نوێژەکەت بکە کە لە ناویدایت، وە دوای هەموو دووڕکاتێك سەلام بدەرەوە، وە لە هەموو ڕکاتێکدا سوورەی فاتیحە یەکجار بیخوێنە، وە سێ جار سوورەی (قل هو الله أحد) بخوێنە، وە کە لێبوویتەوە لە نوێژەکەت بڕۆرەوە بۆ ماڵەکەت، وە قسە لەگەڵ کەسدا مەکە، وە دووڕکات نوێژیش لەوێ بکە، وە جارێك سوورەی فاتیحە و، سوورەی ئیخلاص حەوت جار لە هەردوو ڕکاتەکەدا بخوێنە، لە پاشان دوای سەلامدانەوە سوجدەیەك بەرەو، لە سوجدەکە دا حەوت جار داوای لێخۆش بوون لە خودا بکە، وە حەوت کەڕەتیش بڵێ: **سُبحانَ اللهِ والحَمدُ للهِ ولا إلهَ إلاَّ اللهُ واللهُ أكبرُ ولاحَولَ ولا قُوَّةَ إلاَّ باللهِ العَليِّ العَظيمْ**، لە پاشان سەرت بەرز کەرەوە لە سوجدەکەت و دانیشەو، دەستەکانت بەرز کەرەوە و بڵێ: **یا حيُّ یا قَیُّومٌ؛ یا ذَا الجَلالِ والإكْرامِ، یا إلهَ الأوَّلينَ والآخِرينَ یا رَحمانَ الدُّنیا والآخِرَة ورَحیمَهما، یا ربُّ یا رَبُّ یا رَبُّ، یا اللهُ یا اللهُ یا اللهُ.**

ئەی خودای زیندوی بەدەسەڵاتی کار بەدەست، خاوەنی شکۆمەندی و جەلال و ڕێزو کەرەم، ئەی خوداوەندی هەموو شتە سەرەتاکان و کۆتاکان کە دروست دەبن، کە بەزەییت دێتەوە بە موسوڵمان و بێباوەڕیشداو، لەو دونیایش بەبەزەیی و بە میهرەبانیش دەجوڵێیتەوە لەگەڵ ئیمانداراندا،

لەهەردودونیادا، ئەی پەروەدگار (سێ جار) ئەی زاتی بەرزی خوداوەند (یا الله، یا الله، یا الله). لە پاشان هەستەو بە دەستبەرزکردنەوەوە هەمان دوعا بە پێوەیشەوە بخوێنە، لەپاشان چۆن دەتەوێت ڕووە و قیبلە و لەسەر لای ڕاستت پاڵکەوەو بنوو، دەم بە صلاواتدانەوە لەسەر(حەزرەتی)پێغەمبەرﷺوە بەردەوام صلاواتی لێبدە تا خەو دەتباتەوە، وتم: پێم خۆشە ئەوەیشم پێ بڵێیت :

لە کێوە ئەمەت بیستووە؟ فەرمووی: من لە خزمەت پێغەمبەردا بووم ﷺ کاتێك ئەم دوعایان فێر دەکرد و بە وەحی بۆی دەهات لە حزوری خوداوە، بە ئاگاداری منیش بوو کە فێری بووم هەر لەو کەسەوە کە ئەویان فێر دەکرد[1].

وە دەڵێن: ئەم نوێژو دوعایە هەرکەسێك بەردەوام بێت لەسەری، بە متمانەو بڕوایەکی بەهێزەوە، پێش ئەوەی لە دونیا دەربچێت، لە خەویدا بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دەگات، وە هەندێك ئەم کارەی کردووەو بینیویەتی کە خراوەتە ناو بەهەشتەوە و، بە خزمەت پێغەمبەران گەیشتووە لە وێداو، بەخزمەتی (حەزرەتی) پێغەمبەریش گەیشتووەو قسەی لەگەڵدا کردووە و فێریشی کردووە.[2].

بەکورتی: ئەو ڕیوایەتانەی لە باسی گەورەیی زیندووکردنەوەی نێوانی مەغریب و عیشا هاتوون زۆرن، تا گەیشتە ئەوەی وتیان بە عوبەید کە بەردەست و مەولای (حەزرەتی) ڕەسولوڵلا بوو ﷺ : ئایا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەدا بە کردنی نوێژێك بێجگە لە نوێژە فەرزەکان؟ فەرمووی: بەڵێ نوێژی نێوانی مەغریب و عیشا[3]،

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (( مَنْ صَلَّى مابينَ المَغرِبِ والعِشاءِ

---

(١) قوت القلوب١/٣٠.

(٢) قوت القلوب ١/٣١.

(٣) رواه أحمد في المسند(٥/٤٣١)، وابن عساكر في تأريخ دمشق(٤/٢٧٤).

**فذَلِكَ صَلاةُ الأَوَّابِينَ))**[1]، ئەوەی نوێژی نێوانی مەغریب و عیشا بکات ئەو نوێژە پێی دەڵێن: نوێژی تۆبەکاران و، ئەوانەی دەگەڕێنەوە بۆ لای خودایان.

ئەسوەدی نەخەعی فەرموویەتی: هەرکاتێك هاتبم بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (خوای لێ ڕازی بێت) لەو کاتەدا دەمبینی کە نوێژی دەکرد، پرسیارم لێ کرد، فەرمووی: بەڵێ: ئەمە ساتێکە خەڵکی تیایدا بێئاگا دەبن[2]،

هەروەها ئەنەس(خوای لێ ڕازی بێت)بەردەوام بوو لەسەری، وە دەیفەرموو: ئەو ساتەیە کە خودا باسی کردووە (**ناشئة الليل**)کە نوێژێکە بەشەو بکرێت، واتە: نێوانی مەغریب و عیشا، وە دەفەرموێت:

لە عیبادەتی ئەو کاتەدایە کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: **﴿تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ﴾** (السجدة/١٦) واتە: بەشەو ڕاست دەبنەوە بۆ خوداپەرستی [3]،

هەروەها ئەحمەدی کوڕی(أبي الحواري)دەفەرموێت:

وتم بە ئەبو سولەیمانی دارانی: بەڕۆژدا بەڕۆژوو دەبم و لە نێوانی خۆرئاوابوون و نوێژی عیشادا نان دەخۆم، ئەمە لای تۆ باشترە، یان بەڕۆژا نان بخۆم و بەڕۆژوونەبم و، لە نێوانی ئێوارە و خۆرنشیندا تا نوێژی عیشا خەرکی عیبادەت بم و زیندووی بکەمەوە؟ فەرمووی: هەردووکیان پێکەوە کۆبکەرەوە، واتە: بەڕۆژوویش بەو نێوانەکەشیان زیندووبکەرەوە بە عیبادەت، وتم: ئەگەر بۆم ڕێنەکەوێت؟فەرمووی: بەڕۆژوو مەبەو، نێوانی مەغریب و عیشا بە نوێژ

---

(١) رواه ابن مبارك في الزهد(١٢٥٩) عن ابن منكدر مرسلا. باسی ژمارەی نوێژەکەی نەکردووە تا زۆری بکات، وە ئەووابین ئەوانەیە لە گوناە دەگەڕێنەوەو تەوبەی ڕاستەقینەیان کردووە.

(٢) (بۆیە پێویستە نوێژی تێدا بکرێت، چونکە خەڵکەکە بێ ئاگاو سەرقاڵی قسەو خواردن و شتی وان) رواه الطبراني في الكبير(٢٨٨/٩)، وابن المبارك في الزهد(١٢٦١)، وعبدالرزاق في المصنف(٤٤/٣)، والأسود هو: إبن يزيد النخعي والد عبدالرحمن.

(٣) رواه أبو داوود (١٣٢١)، والترمذي (٣١٩٦).

کردن زیندووبکەرەوە ئەوە خێری زیاترە[1].

# گەورەیی شەو نوێژ:

**ئایەتەکان لەبارەی گەورەیی شەونوێژەوە:** خودای گەورە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ اللَّيْلِ وَنِصْفَهُ وَثُلُثَهُ﴾ (المزمل/٢٠)

واتە: بێگومان خوداوەندت دەزانێت کە تۆ دووسێیەکی شەوو، جارجار نیوەی و جارجاریش سێ یەکی شەو بە پێوەیت و هەڵدەستیتەوە.

خودای گەورە فەرموویەتی:﴿إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْئًا وَأَقْوَمُ قِيلًا﴾( المزمل/٦) ئایا کەسێك کە بە سەعاتەکانی شەودا خەریکی هەموو شێوەکانی عیبادەتەو لە قیامەت دەترسێت و بەهیوای ڕەحمەتی خودایە، وەك کەسێکی بێباوەڕی کافروایە، ئایا ئەوانەی زانان و ئەوانەی هیچ نازانن وەك یەك وان؟!

هەروەها فەرموویەتی: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ الْمَضَاجِعِ﴾(السجدة/١٦) واتە: بەشەو لە جێگەی نووستن و حەوانەوەیان ڕاست دەبنەوە بۆ خوداپەرستی.

خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ (الزمر/٩) ئایا کەسێك کە بە سەعاتەکانی شەودا خەریکی هەموو شێوەکانی عیبادەتە. بە سوجدە وهەستانەوە و شەونوێژەوە، لەترسی دوا ڕۆژو بە هیوای ڕەحمەتی خودا.

یان فەرموویەتی:﴿وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًاوَقِيَامًا﴾(الفرقان/٦٤)هەروەها ئەوانەی شەوان بەسەردەبەن بە سوجدە بردن و نوێژو ڕاوەستان لە نوێژدا بۆ خودا.

یان فەرموویەتی: ﴿وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ﴾ (البقرة/٤٥)، داوای یارمەتی لەخودا بکەن و پێگەی خۆتان بە نوێژکردن و خۆگرتن و خۆڕاگری بەهێزو خۆڕاگر بکەن.

---

(١) قوت القلوب،( ١/ ٢٩).

دەڵێن: ئەمەیش بۆ هەستانەوەی شەوە بۆ شەو نوێژ، بە صەبرو خۆڕاگرتن دەتوانێت زاڵ ببێت بەسەر نەفسیداو ڕیازە و موجاهەدەی بکات.

## لەفەرموودەکان:

فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ (( يَعقِدُ الشَّيطانُ على قَافِيَةِ أَحَدِكم إذَا هُوَ نَامَ ثلاثَ عَقدٍ، يَضرِبُ مكانَ كُلِّ عَقدَةٍ : عليكَ لَيْلٌ طَويلٌ فَارْقُدْ. فَإِنِ استَيقَظَ وذَكَر اللهَ عَزَّوجَلَّ انحَلَّتْ عُقدَةٌ، فإنْ تَوضَّأَ.. انْحلَّتْ عُقدَةٌ، فإنْ صَلَّى.. انحَلَّتْ عُقدَةٌ، فأصبحَ نَشيطاً طَيِّبَ النَّفسِ، وإلاَّ... أَصْبَحَ خَبيثَ النَّفسِ كَسْلاَنَ))[١]،

واتە: شەیتان لەپشتی سەری هەریەکەتانەوە سێ گرێ و گۆڵ دەبەستێت، یان وەك گرێی جادووگەری، کە نوست گرێی دەدات و لەشوێنی هەریەکێك لەگرێکان وەك مۆری لێبدات ئاوا دەخوێنێت بەسەریدا، یان دەستدەدات بەسەر گرێکەدا کە بەئاگا نەیەتەوە، کە شەوگارێکی درێژت لەبەردەمدایەو بخەوە، جا ئەگەر بەئاگا هاتەوە و زیکرێکی خودای کرد، ئەوا گرێیەکیان دەکرێتەوە و، دەزانێت کە شەوگارێکی درێژی بەسەر بردووە و، کات کەم ماوە با هەستێت، ئەگەر زیکر نەکات، ئەوەندەی تر خەوەکەی لا قورس دەبێت و گرێکەی ناکرێتەوە، وە ئەگەر هەستاو دەستنوێژێکی گرت، گرێیەکی تر هەڵدەوەشێتەوە، وە ئەگەر نوێژیشی کرد، ئەوا گرێی سێیەمیشی نامێنێت و چالاك و ڕۆح سووك و وریاو دڵخۆشدەبێت، ئەگەر ئەم کارانە ئەنجام نەدات ئەوا تابێت نەفسی پیس و لغاو کراوو تەمەڵ دەبێت و ناتوانێت بزوێت.

وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: کە باسی کابرایەك کراوە تا بەیانی بە شەو گارێکی درێژ نوستووە تا ڕۆژی لێ هەڵاتووە، فەرمووی: (( ذاكَ رَجلٌ بالَ الشَّيطانُ فِي أُذُنِهِ ))[٢]،ئەوە کەسێکە کە شەیتان میزی بە گوێچکەیدا کردووە.

(١) رواه البخاري (١١٤٢)، ومسلم(٧٧٦).

(٢) رواه البخاري (١١٤٤)، ومسلم(٧٧٤).

وه له هەواڵدا هاتووه: (( إنَّ للشَّيطانِ سَعوطاً ولَعوقاً، وذَرُوراً، فَإذا أسعَطَ العَبدُ..ساءَ خُلَقهُ، وإذا ألْعَقَهُ ..ذَرِبَ لِسانُهُ بالشَّرِ، وإذا ذَرَّهُ ...نامَ الليلَ كُلَّهُ حتَّى يَصبَحَ))[1]، واته: شەیتان جۆره دەرمان و توتناوێکی وردی هەیه دەیخاته ناو لووتەوه، وه کەوچك و مراگێکی تایبەتی هەیه دەیخاته ناو دەمەوه، وه خۆڵێکی تایبەتیشی هەیه دەیخاته ناو چاوەوه. ئەگەر تووتناوی کرد به لووتیا، ئەوا ڕەوشتی زۆر خراپ و ناڵەبار دەبێت، وه ئەگەر کەوچکەکەیشی کرد به گەروویدا؛ ئەوا زوبانی دەپژێت به شەڕو قسەی خراپ و ناجۆر. وه ئەگەر چاویشی پڕ کرد له تەپ و تۆز، ئەوا خەو دایدەگرێت و تەمبەڵ دەبێت و، ناتوانێت تا خۆر هەڵدێت هەڵبستێت و خەبەریشی نابێتەوه.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (( رَكعَتانِ يَركعُهُما العَبدُ في جَوْفِ اللَّيلِ الأَخيرِ، خَيرٌ لهُ مِنَ الدُّنيَا ومَا فِيهَا، ولَولاَ أنْ أشُقَّ عَلَى أُمَّتي لَفَرضْتُهما عَلَيهِم)) [2] واته: دووڕکات له ناوەندی تاریکایی شەو دا، که سێیەکی شەوی مابێت، باشتره بۆ ئەو کەسە له هەموو دونیاو ئەوەش له ناویدا بێت، وه ئەگەر به زەحمەت نەگەڕایه بەسەر ئوممەتەکەمدا، پێویستم دەکرد له سەریان که ئەو دووڕکاته نوێژه بکەن.

---

(١)القوت( ١/ ٤٠)وقد رواه الطبراني في الكبير(٢٠٦/٧)وابن عدي في الكامل(٣٧٤/٣)ولفظه: **إنَّ للشَّيطانِ كُحلاً ولَعوقاً، فإذا كَحلَ الإنسان من كحلهِ نامَت عَيناهُ عنِ الذِّكرِ،وإذا لَعَقَهُ مِن لَعزقهِ ذَرَبَ لِسانَهُ بالشَّرِّ**،ونحوه عند البيهقي في الشعب(٢٨٣٧)وانظر الإتحاف ١٨٥/٥.

(٢) رواه ابن مبارك في الزهد (١٢٨٩)، وابن أبي الدنيا في التهجدوقيام الليل (٢٩٤) عن حسان بن عطية مرسلاً، ورفعه الديلمي في مسندالفردوس( ٤٤٥/٣(٥٤٠٤) قال الزبيدي(١٨٥/٥): حسان بن عطية أبو بكر المحاربي عن أبي امامة وسعيد بن المسيب وعنه الأوزاعي وأبوغسان، ثقة عابد نبيل، لكنه قد رُمي، رَوى له الجماعة قال الذهبي في الكاشف من حديث ابن عمر (رضي الله عنهما) وأخرجه آدم بن إياس في الثواب(كما في كنز العمال للمتقي الهندي(٣٢٦/٧)(٢١٤٣٥)، ومحمد بن نصر المروزى في كتاب قيام الليل (ص/١٠٥)،

له ڕیوایەتی دروستدا هاتووە، لە جابیرەوە (خوای لێ ڕازی بێت) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((**إنَّ مِنَ اللَّيلِ سَاعَةً لا يُوافِقُها عبدٌ مُسلمٌ يسألُ اللهَ تعالَى خَيراً إلاَّ أعْطاهُ أيَّاهُ**). وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە:
(**يَسألُ اللهُ تعَالَى خَيراً مِنَ الدُنيَا والآخِرَةِ وذلِكَ كُلَّ لَيلَةٍ**))[1]،واته: ساتێك هەیە لە شەودا هیچ بەندەیەکی موسوڵمان نیە کە لەو ساتەدا داوای شت لە خودای گەورە بکات و پێی نەبەخشیبێت، یان داوای هەر کارێکی خێری دونیایی یان قیامەتی بکات و پێی نەدابێت، هەموو شەوێکیش دووبارە دەبێتەوە.

هەروەها موغیرەی کوڕی شوعبە (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:
ئەوەندە پێغەمبەر ﷺ بە پێوە ڕاوەستاوەو(شەونوێژی)کردووە، تا پێی هەمووی شەق بوو،قڵیشی بردبوو،وتیان:ئایا خودالەگوناهی بەرودوات خۆش نەبووە؟**قَد غَفَر اللهُ لكَ مَا تقدَّمَ مِنْ ذَنبِكَ ومَا تأخَرَ،قَالَ:أفَلاَ أكُونُ عَبداً شَكُوراً**[2]،

واته: ئەگەر لەبەر ئەوەی خودا لەمن خۆش بووە نابێت منیش واز لەو ناڕەحەتییە بهێنم،ئەگەر وازبهێنم بەندەیەك نەبووم کە شوکرانەبژێری خودابم.

لە واتاکەیەوە وا دەردەکەوێت کە ئەمە کینایەیە بۆ زیادە پلەیەك کە بیەوێت و پێی درابێت، چونکە شوکری زیادە، هۆکاری ڕژانی نیعمەتی زیادەیە بەسەری دا، وەك خودای گەورە فەرموویەتی:﴿**لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ**﴾ (إبراهيم/٧).

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:
(( **أتُرِيدُ أنْ تَكونَ رَحمَةُ اللهِ علَيكَ حَيَاً ومَيِّتاً ومَقبُوراً ومَبعُوثاً؟ قُم مِنَ اللَّيلِ فَصَلِّ وأنتَ تُرِيدُ رِضَاءَ رَبِّكَ، يا أبَا هُرَيرَةَ صَلِّ فِي زَوَايا بَيتِكَ، يَكُنْ نوُرُ بَيتِكَ فِي السَّماءِ كَنورِ الكَواكِبِ والنَّجْمِ عِندَ أهْلِ الدُنيَا**))[1]، واته: ئایــا دەتەوێت کە

---

(١) رواه مسلم(٧٥٩) وأحمد في المسند(٣/٣١٣).
(٢) رواه البخاري (١١٣٠)، ومسلم(٢٨١٩).

ڕەحمەتی خودات لەسەر بێت؟ لەو کاتەدا کە لەژیانداییت و لە ناو گۆڕەکەتدایت و زیندوو دەکرێیتەوە؟ کەواتە هەڵسە و نوێژ بکەو، تەنها مەبەستت ڕەزامەندی خودات بێت، ئەی ئەبوهورەیرە لە سوچ و کەنارەکانی ماڵەکەتدا نوێژ بکەو، نووری ماڵەکەت لە ناو ئاسماندا وەك نووری نەجم و ئەستێرەکان وایە کە لەسەر زەوی یەوە دیارن.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**((عَليكُم بقِيامِ اللَّيلِ، فإنَّهُ دأبُ الصَّالِحينَ قَبلَكُم، وإنَّ قِيامَ اللَّيلِ قُربةٌ إلى اللهِ (عَزَّ وجَلَّ) وتَكفيرٌ لِلذُّنوبِ، ومُطرِدةٌ للدَّاءِ عَنِ الجَسَدِ، ومنهاةٌ عَنِ الإثمِ))**[2]،

پێویستە لەسەرتان کە هەستنەوە بۆشەو نوێژ، چونکە ئەوە نەریت و ئادابێکی صاڵحەکانەو وازیان لێ نەهێناوە، وە بزانن کە شەو نوێژ لە خوداوە نزیکتان دەکاتەوە، وە گوناهەکان دەسڕێتەوە، وە دەردو نەخۆشی ڕاودەنێت لە جەستەدا، گوناهەکانیش بە کۆتا دەگەیێنێت.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **(( ما مِن امْرىءٍ تَكونُ لَهُ صَلاةٌ باللَّيلِ فَغلَبَهُ عَليها النَّومُ، إلاَّ كُتِبَ لَهُ أجرُ صَلاتِهِ، وكانَ نَومُهُ صدَقَةً عَليهِ))**[3]، واتە: هەر کەسێك کە شەو نوێژو هەستانی شەوی هەبێت، ئەگەر

---

(١) هذا قطعة ممّا يُسمى بوَصيَّة أبي هريرة. قال الزبيدي: ١٨٦/٥: هذا الحديث من جملة الاحاديث التي يقول فيها: يا أبا هريرة افعل كذا وكذا، يا أبا هريرة لا تفعل كذا وكذا.

(٢) رواه الترمذي(٣٥٤٩). من حديث بلال وقال غريب ولا يصح.قال الزبيدي ١٨٦/٥: ورواه الطبراني في المعجم الكبير(٩٢/٨)(٧٤٦٦)، والبيهقي في السنن الكبرى(٥٠٢/٢)(٤٤٢٣)ورواه في شعب الإيمان(١٢٧/٣)(٣٠٨٩)،وابن عساكر في تأريخ دمشق(٣٨٣/٥٢)، عن سلمان بنحوه، ورواه الطبري في الأوسط(٣١١/٣)(٣٢٥٣)، من حديث أبي أمامة بسند حسن وقال الترمذي أنه أصح، وكذلك رواه أحمد والنسائي وابن ماجه وابن السني وأبو نعيم في الطب عن الخولاني عن أبي امامة وقال الترمذي وهذا أصح من حديث أبي ادريس عن بلال.

(٣) رواه أبو داوود(١٣١٤)، والنسائي (٢٥٧/٣)، ونحوه ابن ماجه(١٣٤٤). من حديث أبي

خەویش بیباتەوە و زۆری بۆ بهێنێت، ئەوا خێری نوێژەکەی هەر دەگات، وە ئەو نوستنەیش بۆی دەبێت بە چاکە صەدەقە بۆی.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بە ئەبووذەڕ:

**((لَو أردتَ سفَراً أعددْتَ لَهُ عُدَّةً؟ قالَ: نَعَم، قالَ: فكَيفَ سفرُ طريقِ القيامَةِ؟! ألاَ أُنبِّئُك يَا أبَا ذَرٍّ بِمَا ينْفَعُكَ ذلِكَ اليومَ؟ قالَ: بلَى بأَبِي أَنتَ وأُمِّي، قالَ صُمْ يَوماً شَديدَ الحَرِّ، ليَومِ النُّشورِ، وصَلِّ رَكعتَينِ فِي ظُلمَةِ اللَّيلِ، لِوَحشَةِ القُبورِ، وحَجَّ حَجَّةً لعَظائِمِ الأُمورِ، وتَصدَّق بصَدَقةً علَى مِسكينٍ. أَوْ كَلمةَ حَقٍّ تقُولُها، أو كَلمةَ شَرٍّ تَسكُتُ عَنهَا))**[1]،

ئەگەر گەشتێکت لەڕێدا بێت، خۆتی بۆ ئامادە دەکەیت، کەرەستەیشی بۆ دابین دەکەیت، ئەی بۆ سەفەری قیامەت چیت کردووە؟ پێت خۆشە ئەی ئەبو زەرر هەواڵت پێ بدەم؛ چ توێشوویەك بۆ ئەو سەفەرە بەکەڵکت دێت؟

فەرمووی: بەڵێ، باوك و دایکم بە قوربانت بێت، فەرمووی:

لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا بەڕۆژوو ببە ، بۆ ئەوەی لە گەرمای ڕۆژی حەشر و زیندووبوونەوە بەکەڵکت بێت، وە دوو ڕکات لە تاریکایی شەودا نوێژ بکە، با لە کاتی بێ کەسی و تەنهایی ناو گۆڕدا فریات بکەوێت، حەجێکی باشی ماڵی خودایش بکە، بۆ کارە گەورەکان، وە چاکەو صەدەقەیەکیش بکە بۆ هەژارێك، یان وتەیەکی حەق و ڕاست کە بیڵێیت، یان خۆت بپارێزیت لە وشەیەکی شەڕەنگێزی کە لێی بێدەنگ بیت و نەیڵێیت، کە هەموو ئەمانە دەبنە فریاڕەس بۆ دواڕۆژت.

---

الدرداء نحوه بسند صحيح.

(١) رواه أحمد في الزهد(٨٠٣)، وأبو نعيم في الحلية(١٦٥/١)، من طريقه موقوفا على أبو ذر، ورفعه ابن أبي الدنيا في التهجد وقيام الليل ص/١١٥(١٠).من رواية السري بن مخلد مرسلا، والسري ضعفه الأزدي (كما في ميزان الإعتدال) للذهبي ١٧٥/٣.

وه دەگێڕنەوە کە لە چەرخی (حەزرەتی) پێغەمبەردا ﷺ پیاوێك بووە، ئەگەر خەڵکەکە بچوونایەتە سەر جێگەی نوستنیان و، چاوەکانیان خامۆش ببوایە، ئەو هەڵدەستاو دەستی دەکرد بە نوێژکردن و قورئان خوێندن، وە دەیفەرموو: یا ڕەببی ئاگر: پەنام بگرە لە ئاگر، ئەم بابەتەیان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: ((إذا كانَ ذلِكَ فَآذوني))، ئەگەر جارێکی تر بینیتان هەواڵم پێ بدەن، دوای ئەوەی ئاگاداریان کردووە هاتە لایەوە و گوێی لێ ڕاگرت و ، کاتێك ڕۆژ بوویەوە بانگی کرد، ئەی فڵان:

((يا فُلانْ: هَلاَّ سَألتَ الجَنَّة )) قال: يارسولَ الله: إنِّي لَستُ هُناكَ، ولاَ يَبلُغُ عَمَلي ذلِكَ، فَلَم يلبَث إلاَّ يَسيراً، حتَّى نزلَ جبيريلُ (عليه السلام) وقال: أخبِرْ فُلاناً، أنَّ اللّهَ (عَزَّوجَلَّ) قَد أجارَهُ مِنَ النَّارِ وأدخَلَهُ الجَنَّة))[1]،

ئەوە بۆچی تەنها پەنادەگریت لە ئاگر، ئایا ناتوانیت داوای بەهەشت بکەیت، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، کردەوەکانی من ئەوە نیە بمگەیێنێتە بەهەشت، ئەوەندەی پێینەچوو، (حەزرەتی) جوبرەئیل (سەلامی خودای لەسەر) دابەزی و فەرمووی: هەواڵ بە فڵان بدە، کە خودا پەنای داوە لە ئاگرو، خستیشیە ناو بەهەشتەوە.

وە دەگێڕنەوە کە جوبرەئیل (سەلامی خودای لەسەر) فەرمووی بە پێغەمبەر ﷺ: بەڕاستی (ئیبنو عومەر)پیاوێکی باشە، ئەگەر شەونوێژی بکردایە. پێغەمبەریش ﷺ ئەم هەواڵەی پێدا، ئەویش ئیتر بەردەوام بوو لەسەر هەستانەوە و شەو نوێژکردن[2]، نافیع دەفەرموێت:

شەو هەڵدەستاو نوێژی زۆری دەکرد و، لە پاشان دەیفەرموو: ئەی نافیع؛ بەرەبەیانمان لەسەر نەهات؟ منیش دەمووت:

---

(١) قال الحافظ العراقي: لم أقف له على أصل، الإتحاف ١٨٧/٥.

(٢) رواه البخاري (١١٢٢) ومسلم(٢٤٧٩) وليس فيه ذكر جبيرئيل (عليه السلام).

نەخێر ماویەتی، ئەویش دەستی دەکردەوە بە نوێژ کردن، لەپاشان دەیفەرموو: ئەی نافیع ڕوژمان لیٚ نەبوویەوە ، منیش دەمووت:

بەڵێ: ئیتر دادەنیشت و دەستی دەکرد بەداوای لێخۆش بوون و(أستغفر الله) کردن تا گزنگی دەدا و کاتی نوێژی بەیانی دەهات[1]،

هەروەها عەلی کوڕی (أبي الحَرِّ) فەرمووی: ڕۆژێکیان (حەزرەتی) یەحیای کوڕی (حەزرەتی) زەکەریا لە خواردنی نانێکی جۆ تێری خوارد، لەپاشان بەسەر خوێندنەوەی ویردەکەیەوە خەوی لێکەوت و تا بەیانی داهات، خودای گەورە وەحی بۆ کرد: ئەی یەحیا؛

ئایا خانوویەکی ترت دەسکەوتووە باشتر بێت لە خانووەکەی من، یان دراوسێیەکت بینیوەتەوە لە دراوسێیەتی من باشتر بێت؟! سوێند بە عیززەت و جەلالی خۆم دەخۆم ئەی یەحیا؛ ئەگەر تەنها چاوێکت بخشاندایە بە بەهەشتی بەرین و ئامادەکراودا، ئەوا جەستەت دەتوایەوە و، ڕۆحیشت بێ پەروا لەشەوقی ئەو بەهەشتە دەردەچوو بۆی.

وە ئەگەر تەنها یەك جاریش سەیرێکی دۆزەخت بکردایە، هەموو دووگ و چەوری گیانت دەتوایەوە و، بە چاوەکانت فرمێسکی کێم و زوخاوو جەراعەتت دەڕشت و، لە دوای بەرگی خوری ڕەش، بەرگی ئاسنینت دەپۆشی [2]،

عەرزی پێغەمبەریان کرد ﷺ کە فڵان کەس بەشەودا نوێژدەکات، بەڵام کە ڕۆژی لێبوویەوە دزی دەکات، فەرمووی: ((سَيَنْهَاهُ ماتَقُول) واتە: شەو نوێژەکەی ، ڕێگری لێدەکات و، لەو دزییە دوری دەخاتەوە.[3]

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية (٣٠٣/١)، وأبو الحسين الطيوري في الطيوريات (٦٩٣).

(٢) رواه ابن أبي الدنيا في (التهجد وقيام الليل) (٢٦٩) وأبو نعيم فى الحلية ٣٣٤/٨).

(٣) رواه أحمد في المسند(٤٤٧/٢)وابن حبان في صحيحه(٣٠٠/٦ (٢٥٦٠)من حديث أبي هريرة.

**((رحِمَ اللهُ رجلاً قامَ مِنَ اللَّيل فصَلى، ثُمَّ أيقَظ امْرأتَه فصَلّت، فإن أبَت: نضَحَ في وَجهِهَا المَاء، ورَحِمَ الله امْرأةً قامَت مِنَ اللَّيلِ فصَلَّت. ثُمَّ أيقظَتْ زوجَها فصَلَّى، فإنْ أبَى نضَحَت في وَجهِهِ المَاءَ)**[1]،ڕەحمەتی خودا لە پیاوێك بێت بەشەودا هەستێت و نوێژ بكات، لە پاشان خێزانی خەبەركاتەوە و نوێژ بكات، ئەگەر هەڵنەستا ئاو بپرژێنێت بەسەر دەم وچاویدا تا خەبەری دەبێتەوە، وە ڕەحمەتی خودایش لە ئافرەتێك بێت لەشەودا هەستێت و نوێژێك بكات و، لە پاشان مێردەكەی خەبەركاتەوە، ئەگەر هەڵیش نەدەستا، ئەوا ئاو بپرژێنێت بە دەموچاویدا بۆ ئەوەی بە ئاگای بێنێتەوە.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی:

**(( مَنِ استَيقَظَ مِنَ اللَّيلِ، وأيقَظَ امْرأتَهُ، فصَلَّيَا رَكعتَينِ. كُتِبَا مِنَ الذَّاكِرِينَ اللهَ كَثيـراً و الـذَّاكِراتِ))**[2]،هەركەسێك بەشەو بەئاگابێتەوە و خێزانەكەیشی خەبەركاتەوە، وە دووڕكات نوێژ بكەن، ئەوا لە ناو كۆمەڵی ئەوانەدا ناونووس دەكرێت، كە زۆر زیكری خودایان كردووە لە پیاوو ژنان.

هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: **(( أفضَلُ الصَّلاةِ بَعدَ المكتوبَةِ، صَلاةُ الليلِ))**[3]، واتە: گەورەترین نوێژ دوای نوێژە فەرزەكان شەونوێژە.

هەروەها (حەزرەتی) عومەر (خودای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(( مَنْ نامَ عَنْ حِزْبِهِ أو عَنْ شَيْءٍ مِنهُ باللَّيلِ، فقَرأه بَينَ صَلاةِ الفَجرِ**

---

(١) رواه أبو داوود(١٣٠٨)(١٤٥٠)، والنسائي (٢٠٥/٣)، وابن ماجه(١٣٣٦).وابن حبان في صحيحه(٣٠٠/٦)(٢٥٦٠) من حديث أبي هريرة..قال الزبيدي (١٨٧/٥): وكذلك رواه أحمد في مسنده(٧٣٦٣)، والنسائي كتاب قيام الليل(١٦١٠)، والحاكم في المستدرك(٤٥٣/١)(١١٦٤).

(٢) رواه أبو داوود(١٤٥١)(١٤١٥) والنسائي في الكبرى (١ /٤١٣) (١٣١٢)، وابن ماجه(١٣٣٥) من حديث أبي هريرة وأبي سعيد بسند صحيح، قال الزبيدي(١٨٨/٥): وكذلك رواه الحاكم في المستدرك(٤٦١/١)(١١٨٩)، والبيهقي في السنن الكبرى(٥٠١/٢)(٤٤٢٠).

(٣) رواه مسلم(١١٦٣).

والظُّهـرِ، كُتِـبَ لَـهُ كَأَنَّمَـا قَـرأَهُ مِـنَ اللَّيـلِ))[1]، واتە: ئەوەی بنوێـت بەسـەر خوێندنەوەی ئەو بەشە دوعاو خوێندنەی کە بەشەودا دەیانخوێنێت. نەتوانێت هەمـووی یـان هەنـدێکی تەواو بکـات و، لەپاشـان لە نێـوانی نـوێژی بەیـانی و نیوەڕۆدا بیخوێنێت، وەك بەشەو خوێندبێتی، ئاوا بۆی دەنوسرێت.

# ئاسارەکان:

دەگێڕنەوە کە (حەزرەتی) عـومەر (خودای لێ ڕازی بێت) دەڕۆیشـت بەسـەر ئایەتێکـدا لە ویردەکـانی شـەوی، وە لەسـەری ڕادەوەسـتاو، نەیـدەتوانی خـۆی ڕابگرێت و دەکەوت، چەنـدین ڕۆژ دەهـاتن و سـەردان و عیادەیـان دەکـرد، وەك چۆن سەردانی نەخۆشێك دەکرێت[2].

هەروەهـا حاڵی(ئیبنـو مەسعود) وابـوو: ئەگەر چاوەکان بە شـەودا خامۆش ببونایە، هەڵدەستا و، تا بەیانی دەنگێکیان لێوە دەبیست، وەك پوورەی هەنگ ئاوا دەنگی نوێژو نزاکانی دەهات تا ڕۆژی لێدەبوویەوە[3].

وە دەگێڕنەوە کە سوفیانی سەوری (خودای لێخۆش بێت) شەوێکیان تێری خواردبوو، لەپاشان فەرمووی:

گوێدرێژ ئەگەر ئاڵفی زیاتری پێبدرێت، دەبێت باری گرانتریشی لێبنرێت، بەم شێوەیە هەستاو دەستی کرد بەشەو نوێژ تا ڕۆژی لێبوویەوە[4].

هەروەهـا (طـاووس) ی یەمـانی (خـودای لێخـۆش بێـت) ئەگەر لەسـەر جێگەی نوستنەکەی پاڵ بکەوتایە، دەلەرزی و هەرگیز نەدەحەوایەوە، وەك

---

(١) رواه مسلم (٤٧٩).

(٢) رواه الدينوري في المجالسة وجواهر العلم(ص/٩١)،وابن عساكر في تأريخ دمشق٤٤/٣٠٩).

(٣) رواه ابن مبارك في الزهد (٩٧)، والحاكم في المستدرك(٣/٣١٥).

(٤) رواه الدينوري في المجالسة وجواهر العلم(ص/٦١)، والبيهقي في الشعب (٢٩٦٤).

چۆن دانەوێڵە لە ناو مەنجێڵێکدا لەسەر ئاگربێت دەکوڵێت و خۆی ڕاناگرێت، لە پاشان ڕادەپەڕی و دەستی دەکرد بە نوێژ کردن تا ڕۆژی لێدەبوویەوەو دەیفەرموو: بەڕاستی تەنها بیر کردنەوە لە ئاگری دۆزخ، خەوو ئیسراحەتی بەندەکانی خودای هەڵفڕاندووە [1]

حەسەنی بەصری (خودای لێخۆش بێت) فەرموویەتی:
هیچ کردارێك ناکەین لەسەرمان توندتربێت لە ڕوبەڕوبوونەوەی نارەحەتیەکانی شەو و نوێژکردن تێیاندا، وە لە سەرفکردنی ئەوماڵەی هەمانە، [2]. وتیان پێی: ئەوانەی کە زۆر تێکۆشاون لە عیبادەتدا، بۆچی دەموچاویان لەهەموو کەسێك جوانترە؟ فەرمووی: ئەوانە لە حاڵەتی خەڵوەتیدا ژیاون لە حزوری خوادی خۆیاندا، بۆیە لە نووری خۆی پۆشاکی نوورینی کردووە بەبەرگ بۆیان[3]،

یەکێك لە پیاو صاڵحان لە گەشتێك گەڕایەوە، جێگەیەکی بۆ ڕاخراو لەسەری خەوی لێ کەوت و، ویردێکی هەبوو فەوتا، سوێندی خوار تا ماوە لەسەر هیچ دۆشەك و ڕایەخێك نەنوێت[4]،

هەروەها عەبدولعەزیزی کوڕی (أبي داوود) (خودای لێخۆش بێت) ئەگەر شەوی لێبهاتایە، دەهاتە سەر جێگاکەی و دەستێکی بەسەردا دەهێناو دەیفەرموو: بەڕاستی زۆر نەرم و شلی، وە سوێند بەخوا ئەوەی بەهەشت نەرم شل و جوان ترە، بەم شێوە لە جیاتی حەوانەوە بەردەوام نوێژی دەکرد تا ڕۆژی لێدەبوویەوە[5].

---

(١) رواه ابن أبي الدنيا في التهجد وقيام الليل(٩١).

(٢)رواه ابن أبي الدنيا في التهجد وقيام الليل(١٧).

(٣)رواه الدينوري في المجالسة وجواهر العلم(ص/٢٨).

(٤)رواه ابن أبي الدنيا في التهجد وقيام الليل (١٣٧)، والدينوري في المجالسة ص/٧٩.

(٥)وقد روا ابن أبي الدنيا في التهجد وقيام الليل(١١٨) صبره على قيام الليل.

هەروەها فوضەیلی کوڕی عەیاض (خودای لێخۆش بێت) فەرموویەتی:

کاتێ لەسەرەتاوە پێشوازی لەشەو دەکەم، درێژییەکەی دەمترسێنێت، کە دەستدەکەم بە قورئان خوێندن، ئەوەندەی پێ ناچێت بەیانی دەبێتەوەو هێشتا کاری خۆمم لە خزمەتی قورئاندا تەواو نەکردووە[١].

هەروەها حەسەنی بەصری (خودای لێخۆش بێت) فەرموویەتی:

پیاوی واهەیە جۆرێك گوناه دەکات مەحرومی دەکات لە هەستانەوەی شەو، ئیتر شەو نوێژی بە نسیب نابێت[٢].

هەروەها فوضەیل دەفەرموێت:

ئەگەر نەتتوانی شەونوێژ بکەیت و بەڕۆژیش بەڕۆژوو بیت، بزانە ئەوە هەڵەو گوناهەکانت زۆرن و تۆ بێبەش کراویت لەو کردەوە چاکانە[٣].

صیلەی کوڕی ئەشیەمی عەدەوی (خودا لێی خۆش بێت) شەو تابەیانی نوێژی دەکرد، کە بەرەبەیان دادەهات، دەیفەرموو: ئەی خودایە؛

کەسێکی وەك من شیاوی ئەوەنیە کە داوای بەهەشت بکات، ئەوەندە هەیە داوات لێدەکەم؛ بە میهرەبانی خۆت لە ئاگری دۆزەخ بمپارێزە[٤]

بەیەکێك لە حەکیمەکانیان وت: چارم چییە، توانای شەو نوێژم نیە؟ ئەویش فەرمووی: ئەی برام؛ بەڕۆژ گوناه مەکەو بەشەویش شەو نوێژ مەکە![٥]

حەسەنی کوڕی صالحی هەمەدانی (خودای لێخۆش بێت) کەنیزەکێکی هەبوو، فرۆشتی بە تاقمێك، کاتێك نیوەی شەو داهات، کەنیزەکەکە بانگی

---

(١)رواه ابن أبي الدنيا في التهجد وقيام الليل(٨٨) عن محمد بن المنكدر، قاله لأمه.

(٢)رواه ابن أبي الدنيا في التهجد وقيام الليل (٣٦٣)، والدينوري في المجالسة ص/٧٠.

(٣) رواه أبونعيم في الحلية ٩٦/٨.

(٤)رواه أبونعيم في الحلية٢/٢٤٠.

(٥) أورد نحوه المروزي في قيام الليل(٦/١).

کرد، ئەی ئەهلی ماڵ، کاتی نوێژە نوێژ (شەو نوێژ). وتیان بۆچی ڕۆژ بووەتەوە؟ فەرمووی: بۆچی ئێوە جگە لە نوێژە فەرزەکان نوێژی تر ناکەن؟!

وتیان: نەخێر، ئەویش گەڕایەوە بۆ لای حەسەنی هەمەدانی و فەرمووی:[1]

ئەی گەورەم؛ منت داوە بە کۆمەڵێك کە شەونوێژ ناکەن، حەزدەکەم بمگێڕیتەوە، ئەویش گێڕایەوە.

ڕەبیعی مورادی (خودای لێخۆش بێت) فەرمووی:

لەماڵی شافعی (خودای لێ ڕازی بێت) چەندین شەو ماومەتەوە، نەم بینیوە بەشەودا بخەوێت مەگەر بەدەگمەن و کەمیی[2]،

هەروەها (أبوالجویریه)ی کوفی دەفەرموێت: ماوەی شەش مانگ هاوڕێیەتی ئیمام ئەبو حەنیفەم کرد، نەمبینی شەوێك شان لەسەر زەوی دابنێت[3]،

وە حاڵی ئەبوحونیفە وابوو کە نیوەی شەوی بە عیبادەت زیندوو دیکردەوە، دای بەلای کۆمەڵێکدا وتیان: ئەمە ئەو پیاوەیە شەو تابەیانی نانوێت و زیندووی دەکاتەوە!

دەفەرموێت: منیش شەرمم کرد لە حزوری خوادا، بە شتێك وەصفم بکەن و تیامدا نەبێت، ئیتر لەو کاتەوە تەواوی شەوەکانی بە بەندایەتی زیندوو دەکردەوە[4]، وە هەرگیز بەشەودا جێگەی بۆ دانەدەخرا[5]،

وە دەڵێن: کە مالیکی کوڕی دینار (خودای لێ ڕازی بێت) شەوێك تابەیانی ئەم ئایەتەی دەخوێندەوەو دەیووتەوە:

---

(١) أوردها العجلي في الثقات،١/٢٩٥.

(٢) رواه البيهقي في مناقب الشافعي(٢/١٥٧).

(٣) رواه أبو نعيم في مسند أبوحنيفة(٢١).

(٤) رواه الخطيب في تأريخ (١٣/٣٥٣).

(٥) أورده الذهبي في مناقب أبي حنيفة وصاحبيه ، ص/٢١.

﴿أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَنْ نَجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ، سَوَاءً مَحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾ (الجاثية/٢١)

ئايا ئەوانەی کاری تاوانکاریان ئەنجامداوە، واگومان دەبەن کە وەك بڕوادارو چاکەکاران مامەڵەیان لەگەڵ دەکەین و، ژیان و مردنیان چون یەك بێت، وەك لە دونیادا ڕایانبواردووە و، ئازارو نارەحەتیش نەچێژن، هەرگیز وانابێت، بەڕاستی بڕیارێکی نابار و ناپەسەند دەدەن. [1]،

هەروەها موغەیرەی کوڕی حەبیب فەرموویەتی:

سەرنجی مالیکی کوڕی دینارم دا، دوای نوێژی عیشا دەستنوێژی گرت، لەپاشان چووە جێگای نوێژکردنی، دەستی گرت بە ڕێشی خۆیەوەو، قسەکان لە قوڕگیدا وشك بوون و، نەیدەتوانی دەری ببڕێت و، بە چاوی پڕ لە گریانەوە فەرمووی: ئەی خودایە؛ مالیك پیربووە، بیپارێزە و ئاگری لێ حەرام بکە.

ئەی خودایە؛

تۆ دانیشتوانی بەهەشت و ئەهلی جەهەنمی دەناسیت و پێیان دەزانیت، ئایا مالیك لەکام تاقمیانە؟ کام ماڵیان دەبێتە ماڵی مالیك؟ بەم شێوە تابەیانی دادەهات ئەم قسانەی بە گریانەوە دووبارە دەکردەوە[2]،

هەروەها مالیکی کوڕی دینار فەرمووی: شەوێکیان ویردەکەمم لەبیر چوو وە نووستم، لە خەومدا کەنیزەکێکی زۆر جوانم بینی، پارچەیەك نامەی بەدەستیەوە بوو، فەرمووی: ئەزانیت بە جوانی بیخوێنیتەوە؟

وتم:

بەڵێ، نامەکەی دایە دەستم تیایدا نوسرابوو:[1]،

---

(١) رواه ابن مبارك في الزهد(٩٤)، والطبراني في الكبير(٢/٥٠) عن تميم الداري. وە بنوارە خۆلاصەی تەفسیری نامی (٥٠١).

(٢) رواه أحمد في الزهد(١٨٧٦) وأبو نعيم (في الحلية) ٢/٣٦١ بنحوه.

ءَأَلْهَتــكَ اللَّـــذائِذُ والأَمـــاني عَــنِ البيضِ الأَوانسِ في الجِنـانِ
تَعيـــشُ مُخَلَّداً لاَ مَوتَ فيــها وتَلْهُــوا في الجِـــنانِ معَ الحِسانِ
تَنَبَّــه مِــنْ مَنامِكَ إنَّ خَــيراً مِنَ النَّـــومِ التَّهَــجُدُ بالقُـــرانِ
واته:

خەریـــکە لەززەتـــی چــــێژی ئەمەل پچڕاوی ئەم ژینە
لە (حووری عیــن)ی مـــەحروم کا، کە ڕێ گـیراوە پەرژینە
دڵــت بـــەولا بــدەی بـــاشە، دەمێـــنی تۆ هەتا هەرکا
بەهــەشت مابێ، ئەتۆش چاوت لەسەر ئەو شۆخە سەنگینە
لە خەو ڕابەو ئەوی خێرە، لە قـــورئـــان و لە شەو نوێژە
بەهەشت با پڕ لە حۆری بێ، کەسی بێبەش چ غەمگینـە!
دەبـــێ (ئەحـســـەن) لەنـــاو ئاپـۆڕی غەمباری بناڵێنی
ئەنـــا بینیـــنی ئەو جێــگە، دە ساڵ فرمێـسکی خوێنینە[2]،

دەڵێن: مەسروقی خودا ناس، ساڵێکیان حەجێکی کرد، هیچ شەوێك نەماوەتەوە لە حەرەمدا ئەگەر تا بەیانی سەری لەسەر سوجدەدا نەبوبێت.[3]،

وە دەگێڕنەوە لە ئەزهەری کوڕی موغیث، کە لەوانەبوو شەو تابەیانی لە

(١) رواه ابن أبي الدنيا، في التهجد وقيام الليل، (٢٥١) والدينوري في المجالسة وجواهر العلم (ص/٢٤)، عن بعض العابدين، والخبر في الحلية (١٠/١٥)، عن أبي سليمان الداراني، وهي عند الرافعي في (التدوين في أخبار قزوين) (٤/٩٩) عن الحسن البصري.
(٢) هۆنراوەی ئەحسەن موفتی)، وەرگێڕانی ئەو چەند دێڕەی سەرەوە.
(٣) رواه ابن المبارك (٩٧٥)، وابن أبي الدنيا، في (التهجد) (٦٩) وأبو نعيم في الحلية (٢/٩٥).

شەو نوێژدا دەمایەوە، دەفەرموێت:

لە خەومدا ئافرەتێکم بینی لە ژنانی دونیا نەدەچوو، پێم وت: تۆ کێیت؟ وتی: من حۆرییەکم، وتم خۆتم لێ مارە بکە، وتی:

داخوازیم بکە لە گەورەکەم و مارەییەکەیشم بدە، وتم: مارەییەکەت چییە؟ وتی: مانەوەی زۆری شەونوێژە[1]،

یوسف ی کوڕی مەهران فەرمووی: پێم گەیشتووە کە مەلائیکەیەك لە ژێر عەرشدایە، لەسەر شکڵی کەڵەشێرێك، چونگوڵەکانی لە گەوهەربوو، بەرزایی پشتی و جقەی پێی لە زوبورجودی سەوزبوو، ئەگەر سێیەکی یەکەمی شەوبڕوات، دەدا لە شەقەقەی باڵ و هاواردەکات و دەڵێت:

با ئەوانەی هەڵدەستن بۆ شەو نوێژ بێداربنەوە و هەستن، ئەگەر نیوەی یەکەمی شەو ڕۆشت، دیسان دەدا لە شەقەقەی باڵ و هاوار دەکات:

ئەوانەی دەیانەوێت بۆ نوێژی(تەهەجود)و (شەونوێژ) ئامادەبن، با هەستن.

ئەگەر دووبەشی شەو ڕۆیشت، دیسان دەدا لە شەقەقەی باڵ و هاوار دەکات:

با ئەوانەی دەیانەوێت ئامادەی نوێژ ببن هەستن، بەڵام کە بانگی بەیانی دا، دیسان دەدا لە شەقەی باڵ و هاوار دەکات:

با غافڵ و بێ ئاگاکان هەستن و گوناهی خۆیان لەسەر شانی خۆیانە.[2]

وە دەڵێن: کە وەهبی کوڕی مونەببیهی یەمانی [1]،(خودای لێخۆش بێت) ماوەی سی ساڵ شانی لەسەر زەوی دانەدا، وە دەیفەرموو:

---

(١) رواه ابن أبي الدنيا في التهجد وقيام الليل(٢٥٥).

(٢) رواه أبـو الشـيخ في كتـاب (العظمـة) ٣/١٠١٠)، وأورده صـاحب القـوت_٣٦/١)وقـد روى الحافظ الزبيدي: حديث الديك الذي تحت العرش مسلسلا في إتحافه بالتفصيل( ١٩١/٥).

ئەگەر لەماڵەکەما شەیتانێك ببینم، پێم خۆشترە لەوەی کە پشتی و سەرینێك ببینم، چونکە بانگەشەی نوستن دەکات و ڕێگەی خەو خۆش دەکات.

وە سەرینێکی هەبوو(پشتی) ناوەکەی پڕبوو لە پوش و پەڵاش، ئەگەر خەو زۆری بۆ بهێنایە، ئەوا سنگی دەخستە سەر بالیفە زبرەکەو، ماوەیەك لەسەری دەجوڵێت و تووشی دڵە تەپە دەبێت و بە خێرایی ڕادەچڵەکێت و دەڕوات.

وە کەسێکی تریان دەفەرموێت:

لە خەومدا پەروەردگاری بەدەسەڵاتم بینی، بیستم کە دەیفەرموو:

سوێند بە عیززەت و جەلالی خۆم:

دەبێ ڕێز لە جێگاو مەنزیلەی سولەیمانی تەیمییە بگرم، چونکە بۆ ماوەی چل ساڵی تەواو نوێژی بەیانی بە دەستنوێژی نوێژی عیشاوە کردووە [٢]،

وە مەزهەبیشی وابوو کە نوستن ئەگەر لەگەڵ دڵدا تێکەڵ ببێت، ئەوا دەستنوێژ بەتاڵ دەکاتەوە.

وە لەهەندێك پەڕاوە کۆنەکانەوە دەگێڕنەوە لە خوداوە ﷻ کە فەرموویەتی: بەندەی ڕاستەقینەی من ئەوەیە:

کە چاوەنواڕی خوێندنی کەڵەشێری (عەرش) ناکات بۆ هەستانی شەونوێژو بەئاگابوونی [٣].

---

(١) ماوەی بیست ساڵ وەهب قسەی نەوتووە بە شتێك کە ڕۆحی تیا بووبێت، وە بیست ساڵیش لە میانی نوێژ عیشا و بەیانیدابە دەست نوێژێك نوێژی کردووە، بنواڕە: قوت القلوب ٣٧/١.

(٢) القائل هو رقبة بن مصقلة، رواه أبو نعيم في الحلية ٣٢/٣، والبيهقي في الشعب(٢٩٥٢).

(٣) قوت القلوب ٣٨/١.

# ڕوونکردنەوەی ئەو هۆکارانەی کە بەهۆیەوە دەتوانێت بە ئاسانی شەو نوێژ بکات

بزانە: هەستانەوە بۆ شەو نوێژ، هەروا ئاسان نیە، مەگەر بۆ کەسێك کە خودا یارمەتی دابێت و هەستێت بە جێبەجێکردنی مەرجەکانی. کە ئاسانکاری بۆ کراوە لەڕووی ئاشکراو پەنهانیەوە.

## هۆکارە ئاشکراکان: چوار فرمان دەبن:

**یەکەم:** نابێت زۆر بخوات، تا بتوانێت زۆر ئاو نەخواتەوە و خەو زۆری بۆ بهێنێت، وە هەستانەوەی لەسەر ببێتە بارگرانیەکی زۆر.

یەکێك لە شێخەکان هەموو شەوێك لەسەر سفرەی خواردن ڕادە وەستاو، دەیفەرموو: ئەی کۆمەڵی موریدەکان؛ زۆر مەخۆن و زۆر مەخۆنەوە، بۆ ئەوەی خەوەکەیشتان زۆر نەبێت، تا لە کاتی مردندا زۆر ئاخ و خەفەت هەڵنەکێشن[1]، ئەمەیش بنەمای سەرەکییە کە گەدەی مورید سووك بێت و قورسایی خۆراك تەمبەڵی نەکات[2].

**دووهەم:** با بەڕۆژدا ئەوەندە خۆی ماندوونەکات، کە ئەندامەکانی جەستەی گیرۆدە ببێت و، مێشکی ماندوو ببێت، ئەمەیش کاریگەری دەبێت

---

(١) رواه أحمد في الزهد(٥٢٨) في نفر من بني إسرائيل. وهو في القوت( ٩٨/١)، وفيه: **فتخسروا**.

(٢) بەشوێن ئەم هۆکارە ئاشکرایەدا، هۆکارێکی تری شاراوەیش دێت، کە دەبێت ئەو ئەندازەیش کە خۆراك دەخوات، بەزیکرو یادی خوداوە بیخوات، کە هاوکاری دەبێت لەسەر هەستانەوەی شەو، چونکە بە زیکرەکە دەردەکەیشی دەڕوات، وە خواردنی زۆر ئەگەر گەدەی قورسی بکات، دیارە قورساییەکەی لەسەر دڵی زیاتر دەبێت، کەواتە با نەنوێت تا خۆراکەکانی بتوێنێتەوە بە زیکرو خوێندنەوەی قورئان و داوای لێ بوردن لە خودا، بنواڕە: (إتحاف٥/ ١٩٢).

لەسەر ڕاکێشانی خەو کە نەتوانێت بە ئاسانی هەستێت و شەو نوێژ بکات.

**سێیەم:** نابێت واز لە نوستنی پێش نیوەڕۆ(قەیلولە) بهێنێت، چونکە سوننەتیشە و یارمەتیشی دەدات بۆ هەستانەوەی شەو.

**چوارەم:** نابێت بە ڕۆژدا گوناهـ و تاوان ئەنجام بدات، کە دڵی ڕەق دەکات و دەبێتە ڕێگر لە نێوانی ئەوو ڕەحمەتی خوادا کە بەری بکەوێت.

پیاوێك فەرمووی بە حەسەنی بەصری: ئەی باوکی سەعید؛ من کە شەوم بەسەردا دێت، لەشم ساغەو دەمەوێت کە شەونوێژ بکەم، وە هۆکاری تارەت و دەستنوێژیش ئامادەدەکەم، نازانم بۆچی ناتوانم هەستمەوە، فەرمووی: ئەوە گوناهەکانتە وەك کۆت و زنجیر پێوەنی کردویت و ناتوانیت هەستیتەوە[١].

حەسەنی بەصریش(خودای لێ ڕازی بێت)هەرکاتێك بچوایەتە بازاڕەوە، گوێی بە دەنگ و هەراو ژاوەژاویان بوایە دەیفەرموو: واگومان دەبەم کە شەوی ئەمانە شەوێکی خراپە کە بەنسیبیان دەبێت، ئێستە ناخەون و ناحەوێنەوەو شەویش بەئاگانایەنەوە[٢].

سوفیانی سەوریش دەفەرموێت: بەهۆی گوناهێکەوە کە کردم، ماوەی پێنج مانگ بێبەش بووم لە هەستانەوەی شەوو شەونوێژکردن، وتیان: ئەو گوناهەت چی بوو؟ فەرمووی: بینیم پیاوێك دەگریا، لە دڵی خۆمدا وتم: ئەم پیاوە ڕیایی و ڕوپامایی دەکات[٣].

یەکێکی تر لەو خوداناسانە دەفەرموێت: چوومە خزمەتی کورزی کوڕی وەبرە، بینیم دەگریا، وتم: هەواڵی مردنی هەندێك لە خێزانەکەتت پێ گەیشتووە وا دەگریت، فەرمووی: لەوە سەخت و نارەحەتتر، وتم: ئازارێکە

---

(١) قوت القلوب ٣٩/١ وسبق نحوه عنه قريبا.

(٢) رواه أحمد في الزهد(١٥٣٥) وهو في القوت (٣٩/١).

(٣) رواه أبو نعيم في الحلية (١٧/٧)، وهو في القوت(٣٩/١) بتمامه.

هێندە ئێشت پێدەگەیێنێت؟ فەرمووی: لەوەیش سەختترە، وتم: کەواتە ئەوە چییە؟ فەرمووی: دەرگاکەم داخراوە و، چەترو سایەکەم لەسەر لادراوە، چونکە دوێنێ ئەو بەشە ویردەم نەخوێندووە، دیارە ئەوەی کە ویردەکەم لە کیس چووە، بە هۆی گوناهێکەوە بووە کە کردوومە[1] .

**هۆکاری ئەمەیش ئەوەیە:**

کە خێر خێر ڕادەکێشێت، شەڕیش شەڕ ڕادەکێشێت، هەرکامیان بەکەمی بوونی هەبێت، خاوەنەکەی ڕادەکێشێت بۆ زیادکردنی. بۆیە سولەیمانی دارانی ڕەحمەتی خودای لێبێت فەرمووی:

هەرکەسێك نوێژێکی جەماعەتیشی بفەوتێت، ئەوە بەهۆی گوناهێکەوەیە کردوویەتی.

هەروەها دەیفەرموو:

ئەگەر بەشەودا کەسێك تووشی ئیحتیلام ببێت و غوسڵی لەسەر پێویست ببێت، ئەوە تۆڵەیەکی خودایە، لەشپیس بوونیش جۆرێکە لە دوورکەوتنەوە[2]

یەکێك لە زانایان فەرموویەتی:

ئەی هەژار؛ ئەگەر بەڕۆژوو بویت، بنواڕە لای کێ بەربانگ و ئیفطار دەکەیتەوە، وە بەچی ڕۆژووەکەت دەشکێنیت، چونکە جاری واهەیە بەهۆی پاروویەکەوە کە کەسێك دەیخوات، گۆڕانێکی تەواو دێت بەسەر دڵیدا، ئەوەندە دووری دەخاتەوە ، ناچێتەوە سەر حاڵەتە پێشووەکەی.

کەواتە هەموو جۆرەکانی گوناە، دڵڕەقییەك بۆ ئەو کەسە پەیدادەکەن، وە دەبنە ڕێگر لە هەستانەوە بۆ شەونوێژ، بەتایبەتی کاریگەری زیاتر لە خواردنی پارووێکی حەرامدایە، بەڵام پارووی حەڵاڵ دڵی پاڵفتەدەکات و

---

(١) رواه أبو نعيم في الحلية (٧٩/٥)، وهو في القوت (٣٩/١).

(٢) هەردوو فەرموودەکە قوت القلوب ٤٩/١.

دەبزوێنێت بۆ کاری خێرو، هیچ هۆکارێکی تر بەو شێوە کاریگەری لەسەری نابێت، زانینی ئەم حاڵەش زیاتر نەهلی موراقەبە دەیزانن، کە چاودێرن بەسەر حاڵی خۆیاندا، بە تاقیکردنەوە و شایەتیدانی شەرع لەسەر تاقیکردنەوەکەیان.

بۆیە هەندێك لە زانایانە فەرموویانە: زۆرجار بووە تەنها پاروە نانێك شەونێژێکی لەکیس داوین، یان سەیرکردنێکی حەرام، لە خوێندنەوەی سوورەتێکی کردووین، بەندە جاری وا هەیە پارووەك دەخوات، یان کارێکی خراپ ئەنجام دەدات، یەك ساڵ بێبەشی دەکات لە هەستانەوەو شەو نوێژکردن[1]،

هەروەك چۆن نوێژی ڕاستەقینە دەبێتە ڕێگر لە کردنی کاری خراپەو ناپەسەند، هەر بەوشێوەیەش کاری خراپ و ناڕەوا دەبێتە ڕێگر بۆ کردنی کاری خێر و چاکەکان.

**یەکێك لە فەرماندەکانی زیندانی (دینەوەر)دەفەرموێت:**

ماوەی سی و ئەوەندە ساڵ مامەوە لەسەر ئەو زیندانە، هەرکەسێکیان بهێنایە بۆ ناو زیندان، دەمپرسی: ئەو کەسە نوێژی خەوتنانی بە جەماعەت کردووە؟ دەیانووت نەیکردووە.

کەواتە ئەمە جۆرێکە لە بێدارکردنەوە ، کە بەرەکەتی جەماعەت لە کاری خراپەو ناپەسەندی دووری دەخاتەوە[2]،

---

(١) ئەم ڕیوایەتانە هەمووی لەسەرچاوەی پێش و وەرگیراون.

(٢) شێخی زوبەیدی (خودای لێ ڕازی بێت) لە إتحافدا باسی زۆر لەو حاڵەتانە دەکات کە ناسانکاری عیبادەتی بۆ پەیدا دەکات، وەك دەستنوێژی دوای مەغریب و ، پێشوازی کردن لەشەو لەسەر تەهارەت و پاکی. دەم بە زیکری خوداوە.وە زیندووکردنەوەی نێوانی هەردوو نوێژەکەی نێوارەدو خەوتنان، وە قسەنەکردنی دوای عیشا، وە تازەکردنەوەی دەست نوێژ، وە زیکرو صلاواتدان و گۆڕینی شێوەی نوستن. ئەمانە هەمووی هۆکارن بۆ یارمەتی دانی بۆ هەستانەوە بۆ (شەو نوێژ) بۆ درێژتر.بنوارە:الإتحاف(٥/١٩٤).وە بنوارە: قوت القلوب( ٤٠/١)

## هۆكاره ئاسانكاریيه شاراوەكان، ئەمیش چوار فرمانه:

**يەكەم:** دڵی خاڵی بێت لەوەی كه كینەو ڕقی تێدا بێت بەرامبەر به يەكێك له موسوڵمانان، وه خاڵی بێت له بیدعەو داهێنراوی نادروست، وه له زیاده خەمخواردن بۆ كاروباری زیادەی دونیا، چونكه ئەوەی كارو فیكری سەرقاڵ كردووه، تەنها بەبیركردنەوه له دونیا، ئیتر بۆی ئاسان نابێت هەستێتەوه بۆ شەونوێژ، وه ئەگەر هەڵیشسێتەوه ناتوانێت بیر بكاتەوه، مەگەر لەو شته گرنگانەی كه له ڕێگەی وەسوەسەوه دێن به خەیاڵیدا، كه بەنموونەی ئەم حاڵەتانه دەوترێت:

**يُخَبِّرُنِي البَوَّابُ أَنَّكَ نائِمٌ     وأنتَ إذا اسْتَيقَضْتَ أيضاً فَنائِمٌ**[1]،

**دەرگاوان دەڵێت: ئەتۆ خەوتوویت   تۆیش بێدار بیتۆ، هەروا نوستوویت**

**دووهەم:** ترسێك كه زاڵ ببێت بەسەر دڵیدا، وەك ئەوەی هیوای به ژیان كەم بێتەوه، چونكه چەندێك زیاتر بیر له مەترسییەكانی قیامەت و شیوەكانی دۆزەخ بكاتەوه، ئەوەنده خێراتر خەوەكەی دەڕوات و ترسی بۆ زیاد دەبێت، وەك طاووس فەرموویەتی: بەڕاستی یادكردنەوەی دۆزەخ خەوی بەندەكانی خودای هەڵفڕاندووه و، ناتوانن بیریشی لێبەكەنەوه[2]،

دەگێڕنەوه گەنجێك له بەصرەدا ناوی صوهەیب بوو، شەو تابەیانی شەونوێژی دەكرد، گەورەكەی پێی وت: تۆ كه شەوان تا بەیانی شەونوێژ بكەیت، كار لەسەر ئیشەكانی ڕۆژت دەكات، فەرمووی: بەڕاستی صوهەیب كه بیر له ئاگر دەكاتەوه، خەوی نامێنێت تا بتوانێت بنوێت.

هەروەها هەمان قسەیان وت به غوڵامێكی گەنجی تر كه شەو تابەیانی

---

(١) البيت لمحمد بن عمرو الحربي(ت:٢٤٠)هـ، انظر معجم الشعراء، للمرزباني ص/٤٦٦.

(٢) رواه ابن أبي الدنيا في التهجد وقيام الليل(٩١).

شەونوێژی دەکرد: ئەویش وەڵامی دانەوە کە: ئەگەر بیر لە ئاگر بکەمەوە، ترسم بۆ زیاتر دەبێت، وە ئەگەر بیر لە بەهەشت بکەمەوە شەوق و خۆشی دڵم بۆ زیاد دەبێت، بۆیە لەهەردوو حاڵەتەکەدا ناتوانم بنووم[1].

(ذا النُّونِ)ی میصریش (خودای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: [2].

**مَنَعَ القُــرآنُ بِوَعــدِهِ وَوَعيدِهِ        مُقَلَ العُيُونِ بِلَيـلِها أَنْ تَهجَعا**

**فَهِمُوا عَنِ المَلِكِ الجَليلِ كَلامَهُ        فَـرِقابُهُم ذَلَّــتْ إِلَيـهِ تَخَضُّعا**

واتە: [3]. **قورئان ڕێ دەگرێ، کەچـاو بسرەوێ**

**بەو هەڕەشانەی لە چـاو دەســرەوێ**

**کە تێ گەیشتـن لە فەرمـوودەی خوا**

**دەبێ ملکەچ وێ، نەوا سەرکەوێ**

هەوەها ئەم هۆنراوەشیان وتووە:

**يَا طَـوِيلَ الرُّقادِ وَالغَفَــلاتِ        كَثْرَةُ النَّومِ تُورِثُ الحَسَـــراتِ**

**إِنَّ فِي القَبرِ إِنْ نَزَلْـــتَ إِلَيـهِ        لَــرَقاداً يَطُولُ بَعْدَ المَـمَـــاتِ**

**وَمَهَاداً مُمَـــهَّـداً لَـــكَ فيهِ        بِذُنُــوبٍ عَمِـلْتَ أَوْ حَـسَنَـاتِ**

**ءَأَمِنْتَ البَيَاتَ مِنْ مِلَكِ المَوْ        تِ، وَكَـمْ نَــالَ اَمِـناً بِبَيَـــاتِ**

لە واتاو وەرگێڕانی ئەم هۆنراوەیشدا دەڵێم:

**ئاکامی کەسێ خەو کە بە زۆری لەسەری دا**

**نازانێ کـــەوا بەرگـــی خەفــەت وا لەبەری دا**

**لەو گۆڕە بەیەکجاری سەرت نایەوە، مـردی**

**خەونێـــکی درێژ. وا لە پەزێـــر و گوزەری دا**

---

(١) ئەوە غوڵامی ڕیباحی قەیسی بووە، بنوارە: البصائر والذخائر لأبي حبان التوحيدي( ٨٨/٨)

(٢) رواه أبو نعيم في الحلية(١٣/١).

(٣) وەرگێڕانی ئەم شیعرانە لەلایەنی بەندەوە (ئەحسەن).

ئەو لانکەیە ، ئامادەیە بۆ کاری گوناهی

یا چاکەیە کردوویە لە باخی بە بەری دا

ئاسوودە دەبی! نوستی کەوا قەت نەبی ئاگا

وا (مەلەکولمەوت)ە کە دێ، وەك خەبەری دا

وا چاکە بە ئاگابی، دڵت هەردەمێ وریا

(ئەحسەن)کە دەژی، پڕ بە دڵی وا سەمەری دا[1].

هەروەها عوبدوڵلای کوڕی موبارەك فەرموویەتی:

إذا ما اللَّيـلُ أظلَمَ كَابَدوهُ    فَيُسفِرُ عَنْهُمُ وَهُمَ رُكُوعُ

أَطَارَ الخَوفُ نَومَهُمْ، فَقَامُوا    وَأهلُ الأَمنِ فِي الدُّنيا هُجُوعُ

لە واتاو دەرخستنی مەبەستنەکانی ئەم فەرموودەدا دەڵێم:[2].

وتراوە کە شەو قەڵای مێردانە    شەونوێژ و کڕنووش، دەوای دەردانە

بە کەمەربەندی زیکر و عیبادەت    شەوی تاریکە، کۆڕی ڕەندانە

لە ترسی خودا، خەویان تار بووە    هەستاون خێرا، ئەمری یەزدانە

ئەوەی ناترسێ، دایم خەمۆشە    شەوانی غەفڵەت، وەکو زیندانە

یەك شەو بێدار بوون، بە هەزار دانە    شەوگاری درێژ ماڵی بێ دانە

هەستە خێراکە، پاك و کوردانە    بۆ لیقای خودا، کاتی سەردانە

دڵی پڕ نوورە، کاتی تەنگانە    چاتر لە زێڕ و پڕی جیزدانە

دڵی بێ نووریش، تاریکە شەوە    وەکو ڕوخساری دز و جەردانە

شەو بۆ (ئەهلوڵلا)کاتی هەستانە    شایی و شادییە، کاتی خەندانە

ئەحسەن دەزانێت کە پەشیمانە    شەوگاری غەفڵەت گوڵی بێ دانە

**سێیەم**: دەبێت بە بیستنی ئەم ئایەت و فەرموودە و ئاسارانەی هێنامانەوە،

---

(١) وەرگێڕاوی بەندە(ئەحسەن موفتی) ٢٠١٦/٩/٢١.

(٢) هۆنراوەی (ئەحسەن) موفتی.

بزانێت، چەندێك خێری شەو نوێژ هەیە، تا زیاتر هیواو شەوق و دڵخۆشیشی بۆ زیادببێت و تامەزرۆی پاداشتەکەی بێت، بۆ ئەوەی زیادبوونی شەوقەکەی بیوروژێنێت و، هانی بدات بۆ وە دەست هێنانی پاداشتی زیاتر و پلەی بەرزتر لە بەهەشتی بەریندا.

وەك دەگێڕنەوە کە پیاوچاکێك لە یەکێك لە غەزاکانەوە گەڕایەوە. کاتێك کە شەو داهات، خێزانەکەی جێگای بۆ ڕاخست و، چاوەنواڕی هاتنەوەی بوو، بەڵام ئەو بەردەوام لە مزگەوت بوو، خەریکی نوێژکردن بوو تا بەیانی و نەگەڕایەوە بۆ لای خێزانەکەی، بۆ بەیانی پێی وت:

ماوەیەکی زۆر چاوەنواڕی گەڕانەوەتمان دەکردو، کە گەڕایشیتەوە تا بەیانی لە مزگەوت نوێژت کرد! ئەویش وتی:

وەڵلاهی : تا بەیانی بیرم لە یەکێك لە حۆریەکانی بەهەشت دەکردەوە، ئیتر بیرم لای خێزان و ماڵ و منداڵم نەمابوو، بەم شێوە تا بەیانی بەو شەوقەوە خەریکی شەونوێژکردن بووم و ، ئەو هیواو شەوقە پاڵنەری تایبەتیم بوو.

**چوارەم:** کە باشترین هاندەرەکانە: کە لە پێناوی ڕەزامەندی خوادا خودای خۆش بوێت، وە هێزی بڕوایشی بەو شێوە بێت، کە هەستانەوەکەی بۆ بەنرخترینی هۆکار و هاندەری هەستان بێت بۆ شەونوێژ، خۆش ویستنی خوداو بە هێزی ئیمان و بڕوایە، کە هەر قسەیەك لە زاری دێتە دەرەوە تەنها موناجات و پاڕانەوەیە لە خودا، کە خودایش بەم نیەتە ئاگادارە، وە ئاگای لە خەتەرەکانی ناو دڵە، وە ئەو خەتەرانەی دڵیشی جۆرێکە لە گوتار و فەرموودەی خودایی لەگەڵیدا، بۆیە ئەو کاتەی کە لەبەر خودا شتەکانی خۆش دەوێت، ئاشکرایە ئەوەیشی پێ خۆشە کە لە حزوری خوادا لە خەڵوەدا بێت، وە چێژ لە موناجات و پاڕانەوەکانی وەردەگرێت، ئەو تام و چێژی وتەو پاڕانەوە و موناجاتە لە حزووری خوادا، ئەوەندەی تر مانەوە و شەونوێژکردنی لە دڵا شیرین دەکات.

**لەبەر ئەوەی بەڵگەی بوونی فەرموودەکانی قورئان و حەدیس و بەڵگە ئەقڵییەکانیش هەیە، کەواتە نابێت بوونی ئەم تام و چێژە بە دوور بزانرێت:**

## بەڵگە ئەقڵی

با لەو حاڵەتەیە پەندێکی باش وەربگرێت: کە کەسێك یەکێکی زۆر خۆش بوێت لەبەر جوانیەکەی، یان پادشایەکی خۆش بوێت لەبەر بەخشین و ماڵ و دەستبڵاویەکەی، ئایا کەسێك لە بیرکردنەوەیەکی وادابێت، هەرگیز بیر لە نوستن دەکاتەوە؟ یان بیر لەوە دەکاتەوە زیاتر بە شێوەیەکی تایبەتی لە خەڵوەدا بێت لەگەڵیدا و، بە هۆی موناجاتەوە چێژی زیاتری لێ وەربگرێت، بۆ ئەوەی بە هێچ شێوەیەك ڕێگە نەدا نوستن ئێخەی بگرێت و زاڵ ببێت بەسەری دا.

**ئەگەر وتت:** شتی جوان بەسەرنج دان و تێڕامان و سەیرکردنی چێژی زیاتر وەردەگرێت، دەی خۆ خودا ﷻ نابینرێت ئیتر چێژی چی لێ وەردەگرێت؟!

**ئەوە بزانە:** ئەگەر کەسە جوانە خۆشەویستراوەکە لە پشتی پەردەیەکەوە بێت، یان لە ناو خانوویەکی زۆر تاریکدا بێت، ئەوا کەسی عاشق تەنها بەوەی دراوسێیشی بێت و سەیریشی نەکات چێژ لەوە وەردەگرێت کە تەنها قسەیەکیشی لەگەڵدا بکات، تەنانەت ئەگەر تەماداری بینینیشی نەبێت، یان بە هیوای هیچی تر نەبێت لێ یەوە، تەنها بەوە دڵخۆش دەبێت کە خۆشەویستی خۆیی بۆ دەردەبڕێت، وە ناوی ئەو دەهێنێت بەسەر زوبانیدا، لە و جێگەدا کە دەزانێت گوێی لێیەتی، با ئەمەش لای ئەو خۆشەویستەی زانراوو ئاشکرابێت.

ئەگەر وتت: ئەو چاوەنواڕی وەڵامەکەی دەکات، وە چێژ لە بیستنی دەنگی ئەو وەردەگرێت، بەڵام خۆ دەنگی خودا نابیستێت: ئیتر چێژی چی وەردەگرێت؟!

بزانە: هەرچەندە دەشزانێت کە وەڵامی ناداتەوە، وە بێدەنگە بەرامبەری، بەڵام ئەوەندەی کە دەتوانێت حاڵی خۆی بخاتە بەرچاوی و نهێنیەکانی بۆ لا بەرزبکاتەوە، تەنانەت ئەو کەسەی خاوەنی متمانەی تەواوە لە حزوری خوادا،

له کاتی موناجاتەکانیدا گوێی لەو هەموو ئیلهام و دەنگۆیانەیشە کە دادەبارێت بەسەر دڵیدا، وە چێژیان لێ وەردەگرێت، هەروەها ئەو کەسەیش کە بەتەنها لە لای پادشاکەی دانیشتووە و، داواو پێداویستییەکانی لە تاریکی شەودا دەخاتە بەرچاوو، چاوەنواڕی لوتف و بەخشینی پادشاکەیەتی ئیتر ناتوانێت خۆی ڕادەستی خەو بکاتەوە، دیارە کەسێك هیوای بەخشینی خودای هەبێت، ئەم هێوایە بەهێزترە لە هیوای ئەوەی کە پادشاکە شتێکی پێ بدات، ئەوەی لای خودایە زیاتر دەمێنێتەوە و سوود بەخشتریش دەبێت، ئیتر چۆن چێژ وەرناگرێت لەو کاتانەی داواو مەبەستەکانی دەخاتە حزووری خوداوە.

## بەڵگە نەقلییەکان:

ئەوەی دەبێتە شایەت بۆ ئەم ڕاستییە، ئەوانەی شەونوێژ دەکەن، تام و چێژ لە شەونوێژەکەیان وەردەگرن، وە ماوەکەیان زۆر بەکەمی لەسەر دەڕوات، وەك چۆن کەسێك لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا کات بەسەرببات، چۆن هەست بە ڕۆشتنی کاتەکەی ناکات، ئاوا بە خۆشی و خێرایی لەسەری دەڕوات، تا گەیشتە ئەوەی وتراوە بە هەندێکیان: چۆن شەوت لێدەڕوات؟ دەفەرموێت: نەمتوانیوە هەرگیز چاودێری بکەم، هەرئەوەندە ڕوخساری خۆیم پێ نیشان دەدات و دەڕوات، هێشتا دەرفەتی ئەوەم نەبووە کە بە باشی سەرنجی بدەم[1]،

یەکێکی تر دەڵێت: من و شەو وەك ئەو دوو ئەسپە واین کە لە گرەودان، کەڕەتێکیان ئەو پێشم دەکەوێت تا کاتی بەیانی، واتە بە خێرایی لەسەرم دەڕوات، وە جارێکیش دوورم دەخاتەوە و دەمپچڕێنێت لە بیرکردنەوە.

وتیان بە یەکێکی تر: شەو چۆن لێت دەڕوات؟ فەرمووی: ساتە وەختێك من لە شەودا لە نێوانی دووحاڵەتدام، شادومانم بەداهاتنی تاریکییەکەی کە دێت و کاری تێدا دەکەم، وە ئەو ساتەیش کە ڕۆژم لێدەبێتەوە و بە خۆشـــی

---

(١) قوت القلوب ١/٣٨.

دەیقۆزمەوە کە هەرگیزیش نەمتوانیوە لێی تێر ببم.

عەلی کوڕی بەککار فەرموویەتی: ماوەی چل ساڵە تەنها هەلاَتنی گزنگی بەرەبەیان خەفەتباری کردووم، (چونکی بەدڵی خۆی تێری لە شەوەکەی نەخواردووە)

فوضەیلی کوڕی عەیاض فەرموویەتی: ئەگەر کاتی خۆر نشین هاتە پێشەوە، بەداهاتنی تاریکییەکە شادومان دەبم، چونکە دەتوانم بە خەڵوەتی لە حزوری خودای خۆمدا بژیم، بەلاَم کە ڕۆشنایی هەلاَت، خەفەتبار دەبم، چونکە سەرقاڵ دەبم بە هاتنی کەسانێکی تر.[1]

ئەبوسولەیمانی دارانی فەرموویەتی: ئەوانەی ئەهلی بەندایەتین لەشەودا خۆشحاڵ ترن لەوانەی ئەهلی گەمەو گاڵتەن لە ڕۆژدا، بەڕاستی ئەگەر تام و چێژی شەوان نەبوایە، بەدڵنیاییەوە حەزم لە ژیان نەدەکرد [2]،

هەروەها دەرفەرموێت: ئەو چێژەی لە بەندایەتی وەری دەگرن، زۆر زیاترە لەو پاداشتەی کە هەقیانە وەری بگرن، کەواتە ئەگەر خودای گەورە بیخاتە بری چێژو خۆشیەکانیان، ئیتر مافی پاداشتی تریان نامێنێت کە وەری بگرن.

یەکێکی تر لە زانایان دەفەرموێت: لە دونیادا کاتێك نیە وەك نیعمەتەکانی ناو بەهەشت بێت، جگە لەو کەسانە نەبێت کە ئەهلی نزاو پاڕانەوەن لە حزوری خوادا، کە بەدڵ لەگەڵ شیرینی نزاو موناجاتەکانیاندا دەژین [3]،

وە یەکێکی تر دەفەرموێت: خۆشی ئەو موناجاتە کە بە دڵ دەگات، لە نیعمەتەکانی دونیا نیە، بەڵکوو پەیوەندارە بە نیعمەتی بەهەشتەوە، کە خودا بۆ دۆستانی خۆی ئاشکرای دەکات و، تەنها ئەولیاکان هەستی پێدەکەن.

محەممەدی کوڕی مونکەدیر فەرموویەتی: ئەوەی کە مابێتەوە لە تام و

---

(١) هەموو ڕیوایەتەکان لە سەرچاوەی پێش و وەرگیراون.

(٢) رواه الدينوري في المجالسة وجواهر العلم ، ص/٣١، وأبونعيم في الحلية(٩/٢٧٥).

(٣) بۆ هەموو ڕیوایەتەکان بنواڕە: قوت القلوب(١/٣٦).

چێژێکی خۆشی لە دونیادا کە بەکەڵك بێت سێ شتە: هەستانەوە و شەونوێژ، وە بەیەك گەیشتنی برایانی ئەهلی طەریق، وە کردنی نوێژی جەماعەت.(١)

یەکێك لە عاریفەکان فەرموویەتی: خودای گەورە لە بەرەبەیاندا دەنوارێت بۆ ئەو دڵانەی کە بەخەبەرن،پڕیان دەکات لە نور، سوودو قازانجکەی دەڕژێت بەسەر دڵیانداو، ڕۆشن و نورانی دەبێت، لەپاشان لەو نوورەیش دەڕژێت بەسەر دڵی ئەو کەسانەدا کە غافڵن لە زیکری خودا، بەئاگایان دەهێنێتەوە.

هەروەها یەکێك لە زانا پێشینەکان فەرموویەتی:

خودای گەورە نیگای بۆ یەکێك لە صددیقەکان کرد فەرمووی پێیان: لەو عەبدانەی هەمە، هەندێکیان منیان خۆش دەوێت و، منیش ئەوانم خۆش دەوێت، زۆر تامەزرۆن بگەن بەمن و منیش شەوقی بینینی ئەوانم هەیە، زیکری من دەکەن و منیش یادیان دەکەم، سەیرم دەکەن و منیش بۆیان دەنوارم، ئەگەر بەڕێگەی ئەواندا بڕۆیت، ئەوا تۆیشم خۆش دەوێت، خۆ ئەگەر لە ڕێگەکەیان لابدەیت، ئەوا لێت تۆڕەدەبم . فەرمووی: ئەی خودایە: نیشانەی ئەوانە چییە؟ فەرمووی: ئەوانە چاودێری کاتەکانی خۆرهەڵاتن دەکەن، تا لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان و، ویردەکانی بە چاکی تیا دەخوێنن، وە سۆز و خۆشەویستی و دڵیشیان وا لای ئێواران و خۆرنشین، وەك چۆن پەلەوەرەکان حەزدەکەن بگەڕێنەوە بۆ هێلانەکانیان، ئەگەر شەو داهات و تاریکی باڵی کێشا بەسەریاندا، وە هەموو خۆشەویستێك گەڕایەوە بۆ لای خۆشەویستەکەی، ئەوانیش دەکەونە حاڵەتی خەڵوەوە لە گەڵ مندا و ، پێیان ڕادەگرن و شەو نوێژدەکەن و، ڕۆخساریان وەك ڕایەخ ڕادەکێشن و، سوجدەم بۆ دەبەن و، بە کەلامی خۆم موناجاتم لەگەڵدا دەکەن و ، بە نیعمەتەکانی من دەپاڕێنەوە لە دەرگامدا، هەندێکیان هاواردەکەن و هەندێکیشیان دەگرین و، هەیشە ئاهو ناڵەی لێبەرز دەبێتەوەو، هەیشە سکاڵای حاڵی خۆی بەرزدەکاتەوە، ئەوەیان بۆ لەبەرچاو دەگرم کە لە پێناوی مندا خۆیان ماندوودەکەن، ئەو سکاڵاو لاڵەو

پاڕانەوەیان دەبیستم و لێیان بەئاگام، یەکەم شت کە پێیان دەبەخشم، ئەوەیە کە لە نووری خۆم دڵیان ڕووناك دەکەمەوە، ئەوانیش دەتوانن هەواڵ لە بارەی منەوە ڕاگەیێنن، وەك چۆن من هەواڵی ئەوان بڵاو دەکەمەوە.

وە دووهەم شت ئەوەیە ئەگەر حەوت ئاسمانەکان و حەوت تەبەقەی زەوی و ئەوەش لە ناویاندایە لە کێشانەی کاری ئەواندا بێت، ئەوا بۆیان هەڵدەگرم و بۆیان حیساب دەکەم، وە سێیەمیش ئەوەیە کە بە ڕوخساری خۆم ڕوویان تێ دەکەم، دەبینیت ئەوەی بە خۆم ڕووی تێ بکەم: ئایا کەس هەیە بزانێت کە دەمەوێت چی پێببەخشم؟![1].

هەروەها مالیکی کوڕی دینار (خودای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی:

ئەگەر بەندەی خودا هەستا بۆ شەونوێژکردن، خودای (عَزَّ وجَلْ) لێی نزیك دەبێتەوە، کاتی خۆی کە حاڵەتی وەجدو خۆشەویستی و دڵنەرمی و شیرینی ئیمان و دڵخۆشییان بۆ دەهات، دەیانزانی ئەوە هەمووی بە هۆی نزیکی مەعنەوی و لوتفی پەروەردگارەوەیە لێیانەوە[2]،

ئەمەی کەباسمانکرد؛

نهێنیەك و لێکدانەوەیەکی تری لەسەرە، کە ڕوونیان بکەینەوە، پشت بەخودا لە پەراوی خۆشەویستی دا هێمایان بۆ دەکەین.

لەفەرموودەدا هاتووە کە خودای (عَزَّ وجَلْ) فەرموویەتی:

ئەی بەندەکەم؛ من ئەو خودایەم کە نزیك بوومەتەوە لە دڵتەوە، وە تۆیش نوری منت بە شاراوەیی و پەنهانی بینیوە[3]، یەکێك سکاڵای درێژی شەوی بۆ خزمەتی مامۆستاکەی دەکرد، داوای پلانێکی لێ کرد، بەهۆیەوە بتوانێت خەوی

---

(١) بۆ پەراوێزی ژمارە یەکی ئەو دیویش بنوارە: قوت القلوب( ١/٣٧)

(٢) هەمان سەرچاوە.

(٣) رواه أبونعيم في الحلية٢/٣٥٩)،مالیکی کوڕی دینار فەرموویەتی: خوێندومەتەوە لە تەوراتدا:

لێبکەوێت، مامۆستاکەی فەرمووی:

ئەی کوڕم؛ نەفەحات و لوتفی تایبەتی خودایی هەیە، کە لەشەوو ڕۆژدا دەکەونە ناو دڵە هۆشیارەکانەوە، وە دڵە نوستووەکان بەرناکەون، خۆت بدەرە بەر ئەو سۆز و نەفەحاتی خودایە، ئەویش وتی: ئەی مامۆستا؛ وات لێکردم کە ئیتر نەبەشەوو نەبەڕۆژ نەنوم و خەوم لێ نەکەوێت.

وە بزانە؛ شەوان زیاتر تەمادارە کە بەری ئەو نەفەحاتی خودایە بکەویت، چونکە لە شەونوێژو صەفای دەرونیدا دووریشی تێدایە لە سەرقاڵ بوون بە دونیاوە، وەك لە فەرموودەی دروستدا هاتووە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ساتێك هەیە لەشەودا، هەر بەندەیەکی موسوڵمان نزاکانی یەك بگرێتەوە لەگەڵ ئەوساتەدا، وەداوای کارێکی خێری تیا بکات، خودا (عَزَّ وجَلْ)پێی دەبەخشێت، وە لە ڕیوایەتێکی تردا:

هەمووشەوێك داوا لە خودای (عَزَّ وجَلْ)بکات، بۆ خێری دونیاو پاشەڕۆژی، بەدڵنیاییەوەخودا پێی دەبەخشێت[1] **إنَّ مِنَ اللَّيلِ ساعَةً لايُوافِقُها عَبدٌ مُسلِمٌ يسأَلُ اللهَ (عَزَّ وجَلَّ)خيراً،إلاَّ أعطاهُ إيَّاهُ. وفي رِوايَةٍ:**

**يسأَلُ اللهَ عَزَّ وجَلَّ خيراً مِنْ أمرِ الدُّنيا والآخِرَة،إلاَّ أعطاهُ إيَّاهُ، وذلِكَ كُلَّ ليلَةٍ.**

وە ئەو ساتەیەش وەك شەوی قەدری ڕەمەزان شاراوەتەوە، بۆ ئەوەی هەموو شەوەکە لە ئامادەباشیدا بێت، هەروەها وەك سەعاتەکەی ڕۆژی جومعە وایە کە نزای تێدا وەرگیراوە، کە ئەو ساتەیە نەفەحات و ڕەحمەتی خودای تێدا دەڕژێت بەسەر بەندەکانیدا، وە خودای گەورە زاناترە.

---

ئەی ئـادەمیزاد؛ وامەکە، کە نەتوانیـت بە گریـانەوە لە بەینـی دوودەسـتەی قودرەتیمـدا ڕابووەسـتیت، مـن ئەو خـودایەم کە لە دڵـتەوە نزیـك بـوومەتەوە، وە لەغەیـبەوە نـوری منـت بینیوە، واتە: ئەو نوورەی کە دڵتی ناسك کردۆتەوە، ئەوە فەتح و میهرەبانی خودایە.

(١) رواه مسلم(٧٥٧).

# ڕوونکردنەوەی ڕێگای دابەشکردنی پارچەکانی شەو

**بزانە: بەپێی ئەندازەکان، زیندوکردنەوەی شەو حەوت پلەی هەیە:**

**پلەی یەکەم:** زیندووکردنەوەی تێکڕای شەوەکەیە:

کە حاڵی پێشینە صاڵحە بەهێزەکان بەم شێوەبووە، کە خۆیان تەرخان کردبوو بۆ بەندایەتی خودای(عَزَّ وجَلَّ). وە چێژیان لەموناجات وپاڕانەوە لەحزوری خوادا وەردەگرت، وە ئەم بەندایەتییە بوویە خۆراکی ڕۆحی بۆیان، بۆیە شەوگاری درێژ ماندووی نەدەکردن، بەڵکوو دڵەکانیانی دەژیاندەوە، وەکاتی نوستنیان دەگواستەوە بۆ ئەو ساتانەی لە ڕۆژدا خەڵکی سەرقاڵ ئیش و کار بوون.

گۆمەڵێك لە زانایانی سەلەف(خوای لێ ڕازی بێت) ئەمە پیشەیان بووە، نوێژی بەیانییان بە دەستنوێژی عیشا دەکرد، وەك ئەبوطالیبی مەککی دەیگێڕێتەوە: کە چل کەس لە خوداناسەکان لەوکاتەدا بەم شێوە ناوبانگیان دەرکردبوو، تابەیانی نەدەخەوتن و بەندایەتیان دەکرد.

وە هەندێکیان ماوەی چل ساڵ بەردەوام بوون لەسەر ئەم بەردەوام بوونە تا بەیانی، (کە هەر دووکەسێکیان خەڵکی شارو وڵاتێك بوون، وەك: سەعیدی کوڕی موسەیەب و صەفوانی کوڕی سەلیم ی مەدینەیی و ، فوضەیلی کوڕی عەیاض و وەهیبی کوڕی وەردی مەککەیی، وە طاووس و، وەهبی کوڕی مونەببیهی یەمەنی و، ڕەبیعی کوڕی خوسەیم و، حەکەمی کووفی و، ئەبوسولەیمانی دارانی و عەلی کوڕی بەککاری شامی و، ئەبوعەبدوڵلای خەوواص و، ئەبوعاصمی عەبەدانی و، حەبیبی عەجەمی(أبومحمد)و، ئەبوجابیری سەلمانی فارسی و، مالیکی کوڕی دینار و، سولەیمانی تەیمییە و، یەزیدی ڕەقڤاشی و حەبیبی کوڕی ئەبی سابیت و، یەحیای بەککائی بەصری و، کەهمەسی کوڕی مینهال، کە هەموو مانگێك نەوەد خەتمی قورئانی دەکرد،

